- ناوی کتێب: ئینسکلۆپیدیای هەولێر «ئەربیل»
- ئامادەکردنی: لیژنەی باڵای ئامادەکار:
د. عەبدوڵلا عەلیاوەیی، د. مەولود ئیبراهیم حەسەن، فەرید ئەسەسەرد،
د.ئومێد جۆزەلی، حەمید ئەبوبەکر بەدرخان.
- سەرپەرشتیاریی هونەریی و خۆشنووسی: محەمەد زادە.
- دەرهێنانی هونەری: عوسمان پیرداود.
- جێبەجێکردنی هونەری: عصام موحسین نادر، رزگار موحسین نادر.
- نەخشەکان:سەردار محەمەد - وشیار حەمەدەمین
- هەڵەبڕی و پێداچوونەوە: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل، عەبدولڕەحمان مەعرووف، ڕەحیمی سورخی.
- هەڵەبڕی کۆمپیوتەر: مەسعود ئیبراهیم، ئەیوب یوسف.
- سکەنەری وێنەکان و ڕێکخستن: بەدرخان یوسف.
- سەرپەرشتیاری گشتیی چاپ: حەمید ئەبوبەکر بەدرخان.
- چاپ: چاپی یەکەم ٢٠٠٩ لوبنان
- چاپخانە: گرین گالۆری- لوبنان
- تیراژ: ٢٥٠٠ دانە.
- ڕۆژی دەستپێکردن: ٢٠٠٥/١٢/٢٦ - ڕۆژی تەواو بوون ٢٠٠٩/٩/٢٥
- لە کتێبخانەی گشتی ژمارە «١٨٣٢» ساڵی ٢٠٠٩ی دراوەتێ.

- نرخ: (١٥٠٠٠٠) دیناری عیراقی

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان

# جوگرافیاو مێژووی هەولێر پێش شەڕی یەكەمی جیهان ١٩١٤-١٩١٨

مەهدی محەمەد قادر
كۆلیژی ئاداب - زانكۆی سەلاحەدین

هەولێر دەكەوێتە نێوان هەردوو ناوچەی چیایی لە باكووری ڕۆژهەڵات و ناوچەی دەشتایی لە خوارووی[١]، لە سەر بازنەی پانی (١١.٣٦) لە باكوور و بازنەی درێژی (٢.٤٢) لە ڕۆژهەڵات[٢]، تارادەیەک بە دووری یەكسان لە نێوان هەردوو زێی گەورە[٣] و زێی بچووک[٤]، مەڵبەندی موسڵ لە ڕۆژئاوای كە درێژییەكەی (٤٠) سەعاتە ڕێ و پانییەكەی (٢٠) سەعاتە، لە باكووریش قەزای ڕەواندزو لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ناحیەی پردێ (ئاڵتون كوپری) و لە باكووری ڕۆژهەڵات قەزای كۆیە و لە ڕۆژئاوای سنجەقی موسڵ سنووری شارەكە پێک دێنێت زێی گەورە لە موسڵ و دۆڵی بەستۆڕە لە قەزای ڕەواندز جیای دەكاتەوە[٥]. ئاووهەوای هەمان ئاووهەوای دەریای سپی ناوەڕاستە و وەرزی هاوینی گەرمەو وەرزی زستانی ساردو باراناوییە و دەریای ناوەڕاست تاكە دەریایە كە كاریگەری بەسەر ناوچەكە بەگشتی و هەولێر بە تایبەتی هەیە[٦]، بای زستانەش كە سەرچاوەكەی لە دەریای سپی ناوەڕاست هەڵدەكات بریتییە لە بای باكووری ڕۆژ ئاوا (پێچەوانە)[٧].

ناوەكەی كە بە واتای (ڕۆژ) دێت بە زۆر جۆر لە سەرچاوە مێژووییەكان هاتووە[٨]، لە نووسراوەكانی پاشای سومەری (شولگی٢٠٩٤ پ.ز) بە شێوەی (ئۆربیلیوم) یان (ئوربیلۆو) هاتووە، لەو كاتەی كە بەشێک بووە لە شارستانیەتی سۆمەرییەكان، و لە سەردەمی بابلی و ئاشوورییەكان بە (ئەربائیلو) هاتووە[٩] بە واتای شاری (چوار خواوەند)، كە خەڵكەكەی چوار خواوەندیان پەرستووە، لەوانە (خواوەندی عەشتار) كە خواوەندی خۆشەویستی و بەرەكەت بووە[١٠]، هەندێ سەرچاوەش بوونی چوار خواوەند لەم شارە ڕەت دەكەنەوە[١١]، و لە تەورات ناوەكەی بە (ئەربائیلا) هاتووە[١٢] وفارسەكان بە (ئەربایلوو) و دواتر بە (ئەربیرا - ئەربیرە) ناویان بردووە و لە سەرچاوە یونانییەكانیش بە تایبەتی لەم سەردەمەی كە ئەسكەندەری مەقدۆنی هەولێر داگیر دەكات ئەربۆش تێكدەشكێنێ، لە شەڕی (گوگامێل) تا سەردەمی سترابوون (٥٨ -٢٥ پ.ز) ناوەكەی بە (ئەربیلا و ئەربیلاس) دێت[١٣]، و لە سەرچاوە توركییەكان بە (ئەربل، ئەبرل، بیربل) و لە سەرچاوە عەرەبییەكان بە (ئەربل) هاتووە[١٤]، بەڵام سەبارەت بە بیروڕای عەبدولڕەزاق ئەلحەسەنی كە دەڵێت ناوەكەی لە (ئەربائیلۆ) وەرگیراوە و دواتر گۆڕانی بە سەر داهاتووە، بە شێوەی (ئەربائیلۆ،

ئەربیلا، ئەربیل، هەوریل، هەولێر)[١٥]، دەکرێت بڵێین ئەم بۆچوونە لە راستییەوە نزیکە بە بەراورد لەگەڵ بیرو بۆچوونەکانی تر.

شوێنەوارەکانی هەولێر، کۆنترینیان قەڵاکەیتی کە دەکەوێتە ناوەراستی شارەکە، بەرزییەکەی لە ئاستی رووی دەریاوە دەگاتە (٤٤٥م)، و لە سەر ئاستی شارەکەش دەگاتە (٢٦,٢٥ م)، و رووبەرەکەی دەگاتە (١٠٢,١٩٠م٢)[١٦]. گردی (قالیچ ئاغا)ش کە نیشتەجێیەکی کۆنە شێوەیەکی نیمچە بازنەیی هەیە و دەکەوێتە بەشی خوارووی قەڵات بە دووری یەک میل،[١٧] بەڵام سەبارەت بە شوێنەوارەکانی سەردەمی ئیسلامی، دیارترینیان (المئذنة المظفرية) یە کە بە منارەی چۆلی ناسراوە و دەکەوێتە خوارووی رۆژئاوای هەولێر و سەردەمەکەی دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی (ئەتابەکەکان) و ناوەکەشی دەگەرێتەوە بۆ ناوی (مظفرالدين کوکبری) کە لە ماوەی ساڵانی ٥٨٦-٦٣٠هـ حوکمی هەولێری کردووە[١٨]، و بەرزی ئەو بەشەی کە ماوەتەوە دەگاتە (٣٧م)، و تیرەکەی دەگاتە (٢,٥م)، بوونی ئەم منارەیەش لەم شوێنە دەگەرێتەوە بۆ فراوانی شارەکە لە سەردەمی ئەتابکەکان[١٩].

دوای سەرکەوتنەکانی دەوڵەتی عوسمانی بەسەر شا ئیسماعیلی سەفەوی لە شەری چالدێران لە ساڵی ١٥١٤ز، تەرازووی هێز لە ناوچەکە گۆرا و دەوڵەتی عوسمانی بەشێکی زۆری کوردستانی کەوتە ژێر دەسەڵات و بەشێکی کەم لە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی سەفەوی مایەوە، لە درێژەی هەڵمەتەکانی دەوڵەتی عوسمانی بۆ سەر ناوچەکانی کە لە لایەن شا ئیسماعیلی سەفەوی دەستی بە سەردا گرتبوو لە ٣١ی کانوونی یەکەمی ١٥٣٤ز شاری بەغدای داگیر کرد، لە کاتی گەرانەوەشیدا بە شاری هەولێردا گەرایەوە کە ئەو کات سەر بە میرنشینی سۆران بووە و لە لایەن (عیزەدین شێر) حوکمرانی دەکرا، دوای گەیشتنی سوڵتان سلێمانی قانوونی (١٥٢٠ - ١٥٦٦) بۆ هەولێر میر (حوسێن بەگی داسنی) کە یەزیدی بوو، لە شوێنی میر (عزەدین شێر) دەکاتە حاکمی هەولێرو (میر عیزەدین) یش دەکوژێت کە بیرورای جیاواز هەن لەبارەی ئەم کوشتنە[٢٠].

هەولێر لە سەرەتاکاندا یەکێک بووە لە سنجەقەکانی سەر بە ویلایەتی لورستان، بەڵام دواتر لە سنووری نێوان ساڵانی (١٥٦٣-١٥٧٤ز) دەبێتە سنجەقێکی سەر بە ویلایەتی بەغدا کە هەندێ جار لە لایەن بابانییەکان و هەندێ جار بە شێوەیەکی راستەوخۆ لە لایەن دەوڵەتی عوسمانی حوکمرانی کراوە، بەڵام دوای کۆتایی هێنان بە دەسەڵاتی میرنشینە کوردییەکان لە سنووری ساڵانی (١٨٣٦ - ١٨٥١ز) والیی بەغدا سوور بووە لە سەر مانەوەی هەولێر وەک سنجەقێکی سەر بە ویلایەتی بەغدا لە رووی کارگێری و پشتیوانییەکی بە هێزی سەربازی عوسمانی لێ دادەنێت، هەولێر بەم جۆرە مایەوە تا ساڵی ١٨٧٩ز کاتێک ویلایەتی موسڵ جیا بۆوە لەگەڵ ویلایەتی بەغدا هەولێریش بوو بە یەکەیەکی کارگێری سەر بە ویلایەتی موسڵ و لە سیستەمی نوێی کارگێری دەوڵەتی عوسمانی دەبێتە قەزایەکی سەر بە لیوای شارەزوور تا کۆتایی شەری یەکەمی جیهانی بەم جۆرە دەمێنێتەوە[٢١].

بەم جۆرە دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی بەسەر شاری هەولێر چەسپا و لە سەردەمی حوکمرانی عوسمانیدا گرنگییەکی تایبەتی نەبوو، و بایەخی پێویستیشی پێ نەدراوە بە بەراوردکردن لەگەڵ سەردەمە مێژووییەکانی پێش حوکمرانی عوسمانییەکان کە لە سەردەمێکی پێشکەوتن و گەشەکردندا بووە،[٢٢]، سەرەرای ئەوەی کە حکومەت باج و سەرانەی لە دانیشتوانی شارەکە وەرگرتووە و بەرامبەر ئەمەش خزمەتگوزارییەکی پێویست پێشکەش بە دانیشتوانەکەی نەکراوە و لە هەمان کاتدا دەستیان بە سەر زەوییە پیتەکان داگرتووە و بە ناوی زەوی سوڵتانی تۆمار دەکران[٢٣]. جێگای ئاماژەیە کە ئەم بارودۆخە گۆرانێکی بەرچاوی بەسەردا نەهات دوای هاتنی ئیتحادییەکان و راگەیاندنی دەستووری عوسمانی لە ساڵی ١٩٠٨ ز چونکە لەژێر سایەی حوکمرانی و دورشمەکانی ئیتیحادییەکان و دەستووری تازەی وڵات هیچ پێشکەوتنێکی لە ئاستی سیاسی و ئابووری و رۆشنبیری

بەخۆوە نەدیت، بەڵام هەندێک لە کەسایەتییەکانی شاری هەولێر لە لایەن سولتان (محەمەد رەشادی پێنجەم) نازناوی پاشایەتییان پێدرا وەک (عەلی کوڕی مەحمود ئاغا دۆغرەمەچی، ئەحمەد ئاغای دزەیی، عەبدوڵلا ئاغای کوڕی عەباس ئاغا) نازناوی (پاشا)یان بە پلەی پێنج پێ درا، هەروەها (رەشید ئاغا کوڕی وەیسی ئاغا) نازناوی پاشایەتی بە پلەی سێ پێ دەدرێت، جێگای ئاماژەیە ئەو کەسانەی ئەم پلەیان وەردەگرت دیارییەکی سوڵتانیشیان بۆ دەهات. کە بریتی بوو لە (فەروێکی سمۆرە و شیرێک) کە لە لایەن خودی سوڵتانی عوسمانی رەوانە دەکرا و ئەم کەسانەش لە چینەکانی کۆمەڵگادا رێزێکی تایبەتییان هەبوو[٢٤]، بەم جۆرە بارودۆخی هەولێر لەسەر ئەم شێوەیە مایەوە کە تێیدا بوو، تا دەستپێکردنی جەنگی یەکەمی جیهانی لە ساڵی ١٩١٤ز[٢٥].

**پەراوێزەکان:**

(١) الجمهورية العراقية، وزارة البلديات، مديرية التخطيط والهندسة العامة – التصميم الاساسي لمدينة اربيل لغاية عام ٢٠٠٠، بغداد، ١٩٧٧، ص.٤

(٢) زبير بلال اسماعيل، تاريخ اربيل (دراسة تاريخية عامة لاربيل وانحائها منذ اقدم العصور حتى الحرب العالمية الاولى)، ط (١)، مطبعة الثقافة، بغداد، ١٩٧٦، ص.٩

(٣) درێژییەکەی دەگاتە نزیکەی (٣١٦) کم لە ناوچە چیایەکاندا سەرچاوەی گرتووە لە نێوان (ئەرمێنیا و ئازربێجان و دەریاچەی ئورمیە و وان)، بەرەو خواروو بە ئاراستەی عێراق دێت و لە نێوان هەولێر و موسڵ تێدەپەڕێت و لە خوارووی گوندی نمرود لە موسڵ دەچێتەوە رووباری دجلە.

(٤) بە زێی (المجنون) ناودەبردرێت بە هۆی توندوتیژی شەپۆلەکانی، درێژی ئەم زێیە دەگاتە نزیکەی (٣٠٠)کم بە نێوان هەولێر و کەرکوک تێدەپەڕێت و تا لە شارۆچکەی شەرگات (الشرقات) تێکەڵ بە رووباری دجلە دەبێت. عبدالرزاق الحسني، العراق قديما وحديثا، ط (٣)، مطبعة العرفان، صيدا، ١٩٥٨، ص٢٣٥، هاشم خضر الجنابي، مدينة اربيل دراسة في جغرافية الحضر، ط(١)، موصل، ١٩٨٧، ص٩، أحمد عبدالعزيز محمود، الامارة الهذبانية الكردية، ط(١)، اربيل، ٢٠٠٦، ص ٣١.

(٥) فەیسەڵ دەباغ، هەولێر لە ساڵنامەکانی ویلایەتی موسڵ دا، هەولێر "گۆڤار"، ژ(٥)، زستانی ٢٠٠٠، ل ٩٨-٩٩.

(٦) المصدر نفسه، ص ٣١.

(٧) محسن محمد حسين، اربيل في العهد الاتابكي ٥٢٢-٦٣٠ هـ ١١٢٨/-١٢٣٣ م، بغداد، ١٩٧٦، ص.٣٠

(٨) محسن محمد، المصدر السابق، ص٣٢١، ئيسماعيل شكر رسول، اربيل (دراسة تاريخية في دورها الفكري والسياسي ١٩٣٩-١٩٥٨)، ط (٢)، سليمانية، ٢٠٠٦، ص.١٩

(٩) زبير بلال ئيسماعيل، اربيل في ادوارها التاريخية، ط(١)، النجف، ١٩٧٠، ص.٦١

(١٠) فەرهاد پیربال، کرۆنۆلۆژیای پەرەسەندنی وشەی هەولێر، هەولێر "گۆڤار"، ژ (٥)، زستانی ٢٠٠٠، ل ١٠٨.

(١١) عبدالرزاق الحسني، العراق قديما و....، ص.٢٣٧

(١٢) هاشم خضر الجنابي، المصدر السابق، ص.٩

(١٣) فەرهاد پیربال، پەرەسەندنی وشەی...، ل ١٠٩.

(١٤) جمال رشيد، دراسات في بلاد سوبارتو، بغداد، ١٩٨٩، ص١٢٧-١٣٨.

(١٥) المصدر نفسه، ص.٢٦٣

(١٦) عبدالباقي عبدالجبار امين الحيدري، التجديد الحضري لقلعة اربيل (دراسة اجتماعية – اقتصادية وعمرانية)، ط(١)، مطبعة جامعة الموصل، موصل، ١٩٨٥، ص ٦٤.

(١٧) ئيسماعيل حجارە، دمى من تل قالينج آغا في اربيل، سومر"مجله"، بغداد، ١٩٧٠، مج (٢٦)، ص ٣١.

(١٨) محسن محمد حسين، المصدر السابق، ص.٣٠

(١٩) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: المصدر نفسه، ص٢٣٢-٢٣٥.

(٢٠) زبير بلال ئيسماعيل، تاريخ اربيل....، ص١٥٩-١٦٠.

(٢١) عبدالعظيم عباس نصار، بلديات العراق في العهد العثماني ١٥٣٤-١٩١٨، ط(١)، ص ٢٦٤.

(٢٢) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: المصدر نفسه، ص ١٥٩، سعدي عثمان هروتي، كوردستان والامبراطورية العثمانية (دراسة في تطور سياسة الهيمنة العثمانية في كوردستان ١٥١٤-١٨٥١م)، ط (١)، مطبعة خاني، دهوك، ٢٠٠٨، ص ٥٧.

(٢٣) عبدالجبار قادر، اربيل في السالنامات العثمانيه، كاروان"مجله"، عدد(٩١)، ١٩٩٠، ص.١١٦

(٢٤) چاوپێکەوتنێک لەگەڵ پ. د. ارسن موسى رشيد، لە ٢٠٠٧/١١/٧.

(٢٥) رەمزی قەزاز، بزووتنەوەی سیاسی و رۆشنبیری کورد لە کۆتایی چەرخی نۆزدەهەم تا ناوەڕاستی چەرخی بیستەم، چاپخانەی ئەژین، سلێمانی، ١٩٧١، ل ٨٣.

# هەولێر لە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهانی ١٩١٤-١٩١٨

مەهدی محەمەد قادر
کۆلیژی ئاداب - زانکۆی سەلاحەددین

### باروودۆخی کۆمەڵایەتی ١٩١٤-١٩١٨

لە رووی پێکهاتەی نەتەوەییەوە، کورد زۆرینەی دانیشتوانی شاری هەولێر پێک دەهێنی و بە زمانی کوردی دەدوێن[١]، دواتریش تورکمان بە پلەی دووەم دێت کە بە زمانی تورکی دەدوێن[٢] لەبارەی پەیدابوونیان بیروڕای جیاواز هەیە[٣]، و دانیشتوانی عەرەبیش بە پلەی سێیەم هاتووە کە ژمارەیان زۆر کەم بووە[٤]. کلد و ئاشووریش بە رێژەیەکی کەم لە کۆنەوە لە هەولێر ژیاون، ئەوانەی لە ناو قەزای هەولێر بوون لە گەڕەکی عەرەبیان نیشتەجێ بوون، بەڵام ئەوانی تر لە دێی (عەینکاوە) نیشتەجێ بوون[٥]. دەتوانین بڵێین کۆڵەکەی سەرەکی و زۆرینەی دانیشتوانی هەولێر بە درێژایی مێژوو لە سەردەمە جیاوازەکاندا کورد بوونە، بەڵام بە هۆی داگیرکردنی شارەکە و مانەوەی هەیمەنەی داگیرکەران تێیدا بۆ چەند سەدەیەک کاریگەریی لە سەر پێکهاتەی دانیشتوانی کردووە، بە تایبەتیش سەردەمی حوکمڕانی دەوڵەتی عوسمانی کە تا ساڵی



١٩١٨ی خایاندووە[٦]، ئەمەش کاریگەریی زۆری هەبووە لە سەر بەشێکی دانیشتوانی شارەکە کە زمانی تورکی فێر بێن و قسەی پێ بکەن، هەروەها کاریگەریی پرۆگرامەکانی خوێندن بە تایبەتی کردنەوەی مەکتەبی روشدیە و زمانی فەرمی دامودەزگاکانی حکومەت کە بە زمانی تورکی بوون، پلە و پایە سەربازی و کارگێرییەکانی وەک قائیمقام و سەرۆکی سوپا و گەورە فەرمانبەران بە رەگەز تورک بوونە ئەمەش بۆتە هۆی زاڵبوونی رۆشنبیری تورک بۆ ماوەیەک لە شارەکە.

سەبارەت بە کۆنترین بنەماڵەکانی هەولێر، بنەماڵەی (مەلا فەندی) کە خۆی لە دێی باداوە دانیشتووە، و بنەماڵەکانی (یەعقوب ئاغا، حاجی رەشید ئاغا وەیس ئاغا[*]، عومەر ئاغای حاجی ئەحمەد، عەبۆ ئاغای عوزێری، مەردان مەحمود ئاغا، محەمەد ئاغا مێرەم خان، دەباغەکان، پیریاڵ ئاغا، عەبدوڵڵا چەلەبی، عەبدولرەزاق ئاغا، سەید ئەحمەد ئاغا نەقیب، حەسەن ئاغا ساڵح سوور چاوشلی، زیوەر ئاغا، حەیدەرییەکان، شێخانی خانەقا، شێخ محیەدین شێخ ساڵح، بنەماڵەی تەیرۆ، حەمە عەلی زەمو، عەلی پاشا دوغرەمەچی) بوونە کە زۆربەیان موڵکداری زەوی بوونە لە هەولێر و گوندەکانی دەوروبەریدا[٧].

دانیشتوانی هەولێر لە رووی نیشتەجێبوونەوە لە ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانی (١٩١٤- ١٩١٨) بە سەر دوو بەش دابەش ببوون، بەشێکیان نیشتەجێی سەر قەڵات بوون کە لە سێ گەڕەکی سەرەکی (سەرای، تۆپخانە، تەکیە) پێک دەهات[٨]، گەڕەکی (سەرای) کە ناوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ بوونی

(سەرای حکومەت-دار الحکومە) تێیدا و گەڕەکی (تۆپخانە)ش ناوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ بوونی تۆپخانەی عوسمانییەکان لەم گەڕەکە کە لە بەرامبەر ڕێگای هەولێر-موسڵ داندرا بوو، گەڕەکی (تەکیە)ش ئەمەش ناوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ بوونی تەکیەی شێخ ئیبراهیم (ئیبراهیم بابا) کە تا ئەمڕۆش مەزارەکەی لەم گەڕەکە ماوە[9]. دیارترین ئەو ماڵانەی کە نیشتەجێی گەڕەکی سەرای بوون (ماڵ و دیوەخانی حاجی ڕەشید ئاغا، شێخ جەمیل ئەفەندی، فەتاح چاوڕەش، حاجی پیرداود ئاغای دزەیی، ماڵ و دیوەخانی عەلی پاشا دۆغرەمەچی، خەلیفە فاتیمە خان، شێخۆ ئاغای عەبدوڵلا ئاغا، یونس ئاغای سەعید ئاغا، مستەفا عوزێری)، لە گەڕەکی تۆپخانەش ماڵەکانی (داود ئاغای قەساب، عەبدولوەهاب ئاغا حیکمەت ئاغا، وەهاب حاجی ئەحمەد ئاغا، عەلی ئەفەندی، ساسەنی سالح ئاغا، سەلیم کارەسول، مەجید ئاغا، حاجی عوسمان حاجی ئەلیاس) تێدا بووە، هەروەها لە گەڕەکی تەکیە ماڵی (عەبدولرەزاق ئاغا پیرداود ئاغا، موسا سەمەد و محەمەد مستەفا صەفار، توخمە سەعۆ، حاجی عوسمان نەجار، حاجی نادر حاجی کەریم، مەلا یاسین الیاس ئەفەندی) چەند ماڵی تری تێدا نیشتەجێ بوونە[10].

جێگای ئاماژەیە کە چەند گەڕەکێکی بچووک لە ناوەوەی ئەم گەڕەکانەی قەڵات هەبوون، لە



گەڕەکی تۆپخانە (گەڕەکەکانی (حرام کوچاسی)، ناوەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ بوونی ماڵی قائیمقام و خانووی میوانداری (دار الضیافة)، گەڕەکی (کلیسە کوچاسی) بە هۆی بوونی کەنیسەی جوولەکەکان تێیدا ناونراوە، حەبیب نەجار بە هۆی بوونی گۆڕەکەی لەم گەڕەکە ناو نراوە، لە گەڕەکی تەکیەش گەڕەکەکانی (خرابا کوچاسی، دار بورغ کوچاسی، ئیمام کوچاسی، جامع کوچاسی، بیدی قزلر کوچاسی) تێدا بووە، و گەڕەکی (ئاغا کوچاسی) کە زۆربەی دانیشتوانی لە ئاغاکانی هەولێر بوونە دەکەوتە گەڕەکی سەرای[11].

بەشی خوارەوەش کە پێی وتراوە (کورتەک) لە سێ گەڕەک پێک دەهات، گەڕەکی (خانەقا) کە یەکەمین گەڕەکە لە خوار قەڵات دروست کراوە[12] و مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەتابکەکان ناوەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ناوی مزگەوتی (خانەقا) کە دەکەوێتە ڕۆژئاوای گەڕەکەکە، دوورترین شوێنی ئەم گەڕەکەش تاوەکو قەیسەری (عەتائولڵاغا)[*] لە رووی ڕۆژهەڵاتی و مزگەوتی شێخ ابو بکر لە ڕووی ڕۆژئاوای بووە[13]. گەڕەکی عەرەبان بە درێژی لە پشت پارێزگای کۆن دەستی پێکردووە تاوەکو بازاڕی گەورە و بە پانی لە مزگەوتی شێخی چۆلی بە لێواری بەستێدا تا ڕووبەڕووی گەڕەکی تەعجیل دەگرێتەوە[14]، سەبارەت بە ناوەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لە سەرەتای دروست کردنیدا لە لایەن ئەم عەرەبانەوە بنیات نراوە کە لە (حەویجە و موسڵ) هاتوونەتە هەولێر. بە پێی سەرچاوە مێژووییەکان وا دەردەکەوێت کە سەرەتای نیشتەجێبوونی عەرەبەکان لە سنووری حەوت خێزان بووە و لە یەک کۆڵان بوون بۆیە هەندێ ج-ار پێی وتراوە (کۆڵانی عارەبان)[15]، گەڕەکی تەعجیل کە ناوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ناوی (ئیمام تەعجیل) کە تا ئێستا مەزارەکەی لەم گەڕەکەدا ماوە،

دەکەوێتە نێوان گەڕەکی (عەرەبان و سەعدوناوە) ودەبێتە دوو بەش، بەشێکیان پێی دەڵێن (تەعجیلی ئیسلام) کە خەڵکی ئیسلام تێیدا ژیاون و بەشی دووەمیش پێی وتراوە (تەعجیلی جوولەکان) وەک لە ناوەکەی دەردەکەوێت خەڵکی جوولەکەی تێدا ژیاوە[16]. دەکرێت بڵێین دروستکردنی گەڕەکەکانی خوارووی قەڵات لە بەشی رۆژهەلات و رۆژئاوای قەلات دەگەڕێتەوە بۆ هەڵکەوتنی شوێنی قەڵا و دەرگای سەرەکی (دەرگای خواروو) و شێوە نیمچە کەوانەیی گەڕەکەکانیش لە سەر بنەمای شێوەی ئەندازەیی قەڵاتەوە بنیات نراوە، جگە لەمەش هۆکارەکانی زیادبوونی دانیشتوان ودەستپێکردنی کۆچکردنی دانیشتوان بەرەو شارەکان لە ئەنجامی گۆڕانکارییە ئابووری و کۆمەلایەتییەکان فاکتەرێک بووە بۆ فراوانبوونی شارەکە.

لەبارەی ژمارەی دانیشتوانی هەولێر، ئامارێکی دروست و فەرمی لە بەر دەستدا نییە بە تایبەتی لە ماوەی سالانی جەنگی یەکەمی جیهانی (١٩١٤-١٩١٨)، کە دەتوانین بڵێین هۆکارەکەی لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە دەوڵەتی عوسمانی بایەخیان بە سەرژمێری دانیشتوانی شارەکە نەداوە، ئەگەر بەرژەوەندی و مەرامی سیاسی تێدا نەبووبێت، هەروەها تۆمار نەکردنی بارودۆخی کوردستان لە سالنامەکانی عوسمانیدا لە سالانی جەنگ بە تایبەتی، بەلام بە پێی ئەو زانیارییانەی کە سەرچاوەکان پشتیان پێ بەستووە ژمارەی دانیشتوانی هەولێر لە سالی ١٨٤٧ز نزیکەی (٦٠٠٠) کەس بووە[17]. لە سالی ١٩١٦ ژمارەی دانیشتوانی قەلات نزیکەی (٤٠٠٠-٤٥٠٠) کەس بووە، کە دابەشی سەر گەڕەکەکانی (سەرای و تۆپخانە و تەکیە) بوون و ژمارەی دانیشتوانی بەشی خواروو (کورتەک) کە لە گەڕەکەکانی (خانەقا وتەعجیل بە هەردوو بەشەکەی و عەرەبان) نیشتەجێ بوون لە سنووری (٥٥٠٠) کەس بووە، بەم جۆرە وا دەردەکەوێت کە سەرجەمی دانیشتوانی هەولێر لە سالی ١٩١٦ لە سنووری (١٠٠٠٠) کەس بووە[18]، لەمەش دەردەکەوێت کە بەشی دانیشتووی خوارەوەی شارەکە ژمارەیان زیاتر بووە لە دانیشتوانی سەر قەلات.

سەبارەت بە چینە کۆمەلایەتییەکان، هەولێر لەم ماوە مێژووییە بە جیاوازییەکی چینایەتی دیار نەناسراوە، وەکو ناوچەکانی تری ژێر دەسەلاتی دەوڵەتی عوسمانی کە تێیدا دیار دەکەوت. بە تایبەتی ناوچە گوند نشینەکان، بەلام دەتوانین دابەشی بکەینە سەر سێ چین، چینی خۆشگوزەران یان (ئەرستۆکراتی) کە زۆربەیان دانیشتووی سەر قەلات بوون لە ئاغاکان و گەورە بازرگانەکان و زانا گەورەکان و خاوەن دیوەخان و کۆشک و خانووی گەورە بوون[19]، چینی ناوەڕاست کە بەشی زۆری دانیشتوانی هەولێری پێک دەهێنا و بازرگانە بچووکەکان و دوکاندارەکان و فەرمانبەرانی میری و پیاوانی ئاینی و کەمینەیەکی رۆشنبیریشی دەگرتەوە[20]، چینی هەژاریش کە کاسبکارو کرێکارو خاوەن پیشە دەستکردەکانی دەگرتەوە لە بارودۆخێکی کەم دەرامەت دەژیان کە هۆکارەکەشی دەگەڕایەوە بۆ ئەو سیاسەتەی کە دەوڵەتی عوسمانی پیادەی دەکرد و ئەو باج و سەرانەی کە بەسەر بێ دەرامەتانیش دەچەسپا کە ببووە هۆی سستی جوولەی پێشکەوتن و بەڕێوەبردن بە تایبەتیش لە سالانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا ئەو چینە ژیانیان زۆر هەراسان ببوو[21].

لە رووی ئاینیشەوە هەولێر هەر لە کۆنەوە مەڵبەندێکی ئاینی بووە[22]، ئیسلام ئاینی زۆرینەی دانیشتوانەکەی بە (کورد و تورکمان و عەرەب) بووە و پەیڕەوی مەزهەبی سوننەیان کردووە[23]، ئاینی نەسرانی (مەسیحی) دووەم ئاین بووە و کەنیسەش شوێنی تایبەتیان بووە بۆ جێبەجێکردنی ئەرکە ئاینییەکانیان[24]، ئاینی جوولەکەش سێیەم ئاین بووە، جوولەکەکان لە سەرەتادا لە سەر قەلات نیشتەجێ بوون دواتر لە دوا سالانی حوکمڕانی عوسمانییەکان گواستراونەتەوە بۆ بەشی خوارەوەی قەلات و لە گەڕەکی (تەعجیل) نیشتەجێ بوون، تەنها کەنیسەیەکیان لە قەلات ماوەتەوە[25]، جوولەکەکانی هەولێر شوێنی تایبەتی بەجێگەیاندنی ئەرکە ئاینییەکانیان هەبووە، کەنیسەکانی جوولەکەش بە پێی قەبارەکەی ناوەکانیان جیاوازی لەگەڵ یەکتردا هەبووە، کەنیسەی گەورە پێی وتراوە (کنیشتا رتە) و کەنیسەی

بچووکیش پێی وتراوە (کنیشتا زورتا)[٢٦]، رۆژانی شەممەش لە هەفتەدا لە هەموو رۆژێک پیرۆزتر بووە و لەم رۆژەدا پشوویان دەدا و هیچ جۆرە کارێکیان نەدەکرد، تەنانەت ئەگەر جل و بەرگی تازەیان بدوورییایە، ئەوا بۆ یەکەم جار لەم رۆژەدا لەبەریان دەکرد[٢٧]، هەروەها لەم رۆژە هیچ ئاگرێکیان پێنەدەکرد و ئەو جوولەکەی سەرپێچی بکردایە، سزای پارەیان بەبڕی (٨٠ قرش)[*] دەخستە سەری و سەربڕینی ئاژەڵ و پەلەوەر لەم رۆژەدا قەدەغە بووە، ئەگەر کارێکیان ببوایە، ئەوا موسڵمانەکان بۆیان جێبەجێ دەکردن[٢٨].

سەبارەت بە جەژنە ئاینییەکان، موسڵمانەکان ساڵانە یادی هەردوو جەژنی (رەمەزان و قوربان) یان دەکردەوە و جەژنی لەدایکبوونی پێغەمبەر(د.خ) لە مزگەوتەکان یاد دەکرایەوە و ئەمەش ببووە نەریتێکی ئەم شارە، مەسیحیەکانیش ساڵانە یادی جەژنی قیامەیان دەکردەوە و لە سەری ساڵی زایینی هەموو ساڵێک ئاهەنگیان بە بۆنەی جەژنی لەدایکبوونی حەزرەتی عیسی (خ.ل) دەگێڕا[٢٩]، جوولەکەکان چەند جەژنیان هەبوو، لە دوای رۆژی شەممە پیرۆزترینیان جەژنی (کەپرە شینە)[*] بوو کە ساڵانە رێکەوتەکەی دەکەوتە مانگی تشرینی دووەم و ماوەی (١٠) رۆژی دەخایاند[٣٠].

بازاڕیش، کە دەکەوێتە بەشی خوارەوەی رۆژئاوای قەڵات پێی دەوترێت (قەیسەری) کۆنترین بازاڕی هەولێرە و کە بە تەرزێکی بیناکاری گرنگ و دەگمەن دروست کراوەو بە شێوەیەکی لوولەیی دەردەکەوێت[٣١]، قەیسەری گەورە لە سێ بەشی سەرەکی پێک هاتووە، بەشی یەکەمی چەند بازرگانێکی ناودار کاری تێدا کردووە و چەند کاری دەستچنیان تێدا ئەنجام داوە وەک (بەڕە، مافوور، لێفە، جاجم، دووگورد، جەڵ، تێروتال)[٣٢]. بەشی ناوەڕاست بە (خەفاف) ناسراوە، و بەشی سێیەمی کە جوولەکەکان کاریان تێدا کردووە، قەیسەری دووەم پێی وتراوە (قەیسەری بەرگدرووان- قیصرية الخياطين) کە دەکەوێتە خوارووی قەڵات و بازاڕی بەزاز و عەتارەکان لەگەڵ قەیسەری گەورە لێکیان جیا دەکاتەوە و لە لای باکووری دەرگایەکی گەورەی هەبووە و لەلای مزگەوتی گەورەی بازاڕ چەند دەرگای تری هەبووە[٣٣].

حەسارەکانی هەولێر کە هەر یەکێکیان لە (٤-١٠) ژوور پێک هاتبوو (ژوورێک، کە رەنجبەر و خێزانەکانیان تێیدا دەژیان کە ژمارەیان لە سنووری (٣-٧) کەس بووە، عەنبار کە شوێنی هەڵگرتنی (گەنم و جۆ) بووە و دوای وەرزی دروێنە تێیدا هەڵدەگیرا، تەویلەش ژوورێک بووە، بەکاردەهات بۆ بەستنەوەی ئاژەڵەکانی کارکردن، کادێنیش (لەودە) شیان پێ وتووە، کای تێدا هەڵدەگیرا[٣٤]، و مەرج نەبوو کە هەموو حەسارێک خانی هەبێت، حەسارەکانی هەولێر، بریتی بوون لە چەند حەساری بەناوبانگ کە لە رووبەریان جیاوازییان لەگەڵ یەکتردا هەبوو، وەک حەساری (نورەدین ئاغا، جووت حەساری داود ئاغا و ئەحمەد عەلی ئاغای یەعقوبی، مەردان ئاغای سەید مەحمود ئاغا، حاجی رشید ئاغا، عەبدولڕەحمان چەلەبی، شێخی چۆلی، عەلی وەیس ئاغا، حسن ئاغا چاوشلی) کە دەکەوتنە گەڕەکی عەرەبان. و حەساری (عەلی پاشا، حمد ئاغا، حاجی مستوی دارتاش، حسن ساڵح سۆری چاوشلی، حاجی ئەحمەد ئاغا، حەمۆ عەلی زەمۆی قەساب) دەکەوتنە گەڕەکی خانەقا[٣٥].

خانەکانی هەولێر بە پێی ساڵنامەکانی ویلایەتی موسڵ ژمارەیان (٦) خان بووە[٣٦]، ئەو کەسەی کە خانی بەڕێوەبردووە، پێی وتراوە (خانچی)[٣٧]، دوو جۆری هەبووە: یەکەمیان چەند ژوورێکی تێدا بووە کە هەر ژوورێک تایبەتمەندی خۆی هەبووە، هەندێک ژوور وەک (ئوتێل) بۆ حەسانەوە و مانەوەی شەو بەکار هاتووە، چونکە تا ساڵی ١٩٢٦ هیچ ئوتێلێک لە هەولێر نەبووە. دووەم جۆری خان تایبەت بووە بە داکردنی ئاژەڵ و کڕین و فرۆشتنی لێ کراوە[٣٨]. خانەکانیش بریتی بوون لە خانی (سپی) کە خانێکی گەورەو دوو نهۆم بووە و دیوارەکەی بە قوڕی سپی (گەچ) سواغ دراوە، هەر بۆیە بە خانی سپی ناونراوە، شوێنەکەی کەوتۆتە تەنیشت باتای ئێستاو دەرگای قەنتەرەکەی زۆر بەرز بووە، حوشترەوان لەم خانە دابەزیوە[٣٩]، و خانی (حەسەن بەیرام) کە شوێنەکەی دەکەوتە پشت مزگەوتی خانەقا و

شوێنی خستنی باری سەوزە و میوە بووە کە زۆربەیان لە ناوچەکانی خۆشناوەتی دەهات و لە وەرزی هاویندا بەفریان هێناوەتە ئەم خانەو لە ناو کادا دانراوە[٤٠]، و خانی(عوسمان کەردز) دەکەوتە پشت بانکی رافدەینی ئێستا کە شوێنی خستنی باری رەژوو فرۆشان بووە[٤١]، خانی (سلێمان خدر) ی گێچ فرۆش دەکەوتە تەنیشت خانی (عوسمان کەردز) کە خەڵکی ناوچەی کەندێناوە بووە، گەچیان هێناوەتە هەولێر و لەم خانەدا خستوویانە[٤٢]، خانی (قۆجە) کە دەکەوتە نزیک مزگەوتی خانەقا و لە تەنیشت خانی حەسەن بەیرەم بووە، لە لایەن (مام قوربانی) سەرپەرشتی کراوە و لەم خانەدا خەمچییە جوولەکەکان کاریان کردووە، دیارترینیان (خدرۆکە جوو، یۆنە، بەبۆ، ئیسحاق) بوون[٤٣]، و خانی (حاجی سعید جامباز) دەکەوتە گەڕەکی جوولەکان و مامەڵە کردنی کڕین و فرۆشتنی مەڕومالاتی لێ دەکرا، و خانی (عەلی حاجی ئەحمەد ئاغا) کە دەکەوتە بەرامبەر مزگەوتی (ئالتی بەرماغ) و چەند ژوورێکی تێدا بووە. لە شێوەی دوکان بوون و زۆربەی پەنیر و ژاژی فرۆشەکان دەهاتنە ئەو خانە[٤٤].

لەبارەی خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکان، رەوشی تەندروستی لە ئاستێکی خراپدا بووە، بە هۆی گرنگی نەدانی دەوڵەت بە رێنماییە تەندروستییەکان وەک پاک وخاوێنی و مانەوەی پاشماوەکان و گرنگی نەدانی پێویست بە ئاوەڕۆ و رێگا و شەقامەکان ئەمەش کاریگەری بە سەر بڵاوبوونەوەی نەخۆشیدا هەبوو، بە تایبەتی نەخۆشی (سیل) کە چارەسەرکردنی لەو کاتدا نەبوو[٤٥]، دەتوانین بڵێین لە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهانیش بە هۆی بەکارهێنانی زۆربەی خەرجییەکانی دەوڵەت لە بواری شەڕدا و نەبوونی داودەرمان و نەخۆشخانەی پێویست لە شارەکە ئەو بارودۆخە خراپتر بوو هەر بۆیە چارەسەرکردنی نەخۆشیش بە شێوەیەکی سادە بووە و دانیشتوانی هەولێر پێش کردنەوەی نەخۆشخانە پشتیان بە دەرمانە میللییەکان دەبەست، چارەسەرکردنی نەخۆشییە جەستەیی و دەروونی و ئەقڵییەکان زۆر سادە بوون، پشتیان بە دوعاکردن و نوشتەکردن بەستووە، و کاتێک منداڵێک تووشی نەخۆشی لەوزەتێن بهاتایە بە هاڕاوەی قاوە کە پێی دەوترا (ئاغز دەرمانی) قورگی منداڵەکەیان چەور دەکرد، و ئەگەر یەکێک پەنجەی دەست یان پێی بریندار ببوایە، پەنکریاسی بەرخیان لە شوێنی برینەکە دەپێچا، و بۆ لێدان و ژانی جومگە و هەڵزرانی ماسوولکەکان (نیوەنمەکیان)(*) دروست دەکرد و شوێنەکەیان چەور دەکرد لە سەر شوێنی ژانکردنەکەیان دادەنا[٤٦].

دەتوانین بڵێین ئەو جۆرە دەرمانانەی کە بە دەرمانی میللی ناسراون، تا رادەیەک سەرکەوتوو بوون بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکان، سەبارەت بە بیروباوەڕی بەکارهێنانی نوشتەو دوعاش لەمەوە سەرچاوەی گرتووە کە خەڵکەکە بیروباوەڕێکی بە هێزی ئاینییان هەبووە، دەکرێت بوترێت ئەم شێوازە تا ئەمڕۆش لە شاری هەولێر و ناوچەکانی دەوروبەری هەولێر، بە تایبەتی گوندنشینەکان ماوەتەوە.

یەکەمین نەخۆشخانەش کە شوێنەکەی دەکەوتە تەنیشت فەرمانگەی شارەوانی، مێژووی دروستکردنی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٠٨ دوای راگەیاندنی دەستوری عوسمانی[٤٧] لە لایەن شارەوانی هەولێر لە ماوەی سەرۆکایەتی (عەلی پاشا مەحمود ئاغا ١٩٠٧-١٩١٣) دامەزراوە[٤٨]، کە لە سەرەتای دامەزراندنی هیچ پزیشکێکی تێدا دانەمەزراوە، بەڵام دوای تێپەڕبوونی ماوەیەک یەکەم پزیشک بە ناوی (عەبدولئەحەد عەبدولنور) کە خەڵکی شاری موسڵ بووە، لەم نەخۆشخانە دامەزراوە و ماوەی چەند ساڵێک تێیدا ماوەتەوە، جێگای ئاماژەیە کە یەکەم پزیشکە لە هەولێر لە کۆتاییەکانی سەردەمی حوکمڕانی عوسمانییەکان خەڵکی هەولێری ئاشنا کردووە بە دەرمانی نوێ و خۆپاراستن و چارەسەر کردنیان[٤٩]، دواتر لە ساڵی ١٩١٨ پزیشکێک بە ناوی (ولیم سون) لە هەولێر دامەزراوە[٥٠]، تا ساڵی ١٩١٩ هیچ نەخۆشخانەی تر لە هەولێر دانەمەزراوە[٥١].

رەوشی خوێندن، هەر چەندە لە ئاستێکی نزمدا بوو، بەڵام بە بەراوردکردن لەگەڵ ئاستی خوێندن لە ویلایەتەکان (بەغدا و بەسرا) باشتر بوو، بە تایبەتی لە ساڵانی شەڕی

یەکەمی جیهانی (١٩١٤-١٩١٨) چونکە لە ئەنجامی داگیرکردنی ناوچەکانی هەردوو ویلایەتی بەسرا و بەغدا مامۆستاکان لەم ناوچانە روویان لە ناوچەکانی ویلایەتی موسڵ کردووە و قوتابخانەکانیش تووشی تاڵان وتێکدان هاتن[٥٢]، بە پێی ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ لە ساڵی ١٣٣٠ هـ / ١٩١٢ ز لە قەزای هەولێر قوتابخانەی (روشدی) هەبووە و عبدالقادر ئەفەندی مامۆستای ئەم قوتابخانەیە بووە و ژمارەی قوتابییانی (٢٩) قوتابی بووە[٥٣]، و دوو قوتابخانەی سەرەتایی هەبووە کە یەکەمیان (قوتابخانەی قەڵاتی سەرەتایی) بووە کە (رۆوف ئەفەندی و مستەفا ئەفەندی) دەرسیان تێدا وتوتەوە و ژمارەی قوتابییانی(٦٩) قوتابی بووە، و خوێندن تێیدا بە زمانی تورکی و ماوەی خوێندنیش چوار ساڵ بووە، و بنکەی قوتابخانەکەش لە نزیک مزگەوتی (مەلا رسول ئەفندی) بووە(٥٤) ئەم بابەتانەی کە لە قۆناغی سەرەتاییدا خوێندراون (قورئانی پیرۆز، زانستە ئاینییەکان و تەجوید، جوگرافیا ومێژووی عوسمانی و رەوشت و حساب و ئیملاو نسخ) بووە[٥٥]. قوتابخانەی دووەمیش (مەولود ئەفەندی وعەبدولکەریم ئەفەندی) دەرسیان تێدا وتوتەوە و ژمارەی قوتابییانی نزیکەی (٨٦) قوتابی بووە[٥٦]. لە کاتی کۆتایی هاتنی دەسەڵاتی عوسمانییەکان و هاتنی ئینگلیزەکان بۆ هەولێر قوتابخانەکان داخراون تا ئەو کاتەی (کابتن فارل) گەڕانێکی پشکنینانەی لە هەندێ ناوچەی کوردستانی باشوور کرد، قوتابخانە سەرەتاییەکانی هەولێریش کرانەوە[٥٧]. دەکرێت بڵێین ئەم زانیارییانەی کە لە ساڵنامەکانی ویلایەتی موسڵدا هاتووە، رەوشی خوێندن لە هەولێر پێش ساڵانی جەنگ دەردەخات، بەڵام لە ساڵانی جەنگیشدا تەنها دوو قوتابخانەی سەرەتایی هەبووە لە هەولێر بە بەڵگەی سەرژمێری ساڵی خوێندنی ١٩٢٠-١٩٢١ ژمارەی قوتابخانەکانی هەولێر دوو قوتابخانەی سەرەتایی بووە[٥٨].

خوێندنی ئایینیش، جۆرێکی تری خوێندن بووە کە لە حوجرەی مزگەوتەکاندا دەخوێندرا، و بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ تاکە رێگای بڵاوکردنەوەی خوێندەواری بووە لە کوردستان. بەشێکی زۆری روو تێکردن و رێزلێگرتنی ئەم جۆرە خوێندنەش بۆ سۆزی لایەنە ئاینییەکەی دەگەڕێتەوە و ئەو قوتابییانەی کە لە مزگەوتەکان دەیانخوێند، مەرج نەبووە هەموویان خوێندن تەواو بکەن و ببن بە فەقێ و مەلا، بەگوێرەی پلەی خوێندنیش ناسناوییان دەگۆڕا، لە سەرەتادا بە (سوختە)[٥٩] ودواتر بە (موستەعید)[٦٠] دەناسران، کە هەردووکیان هاوواتای فەقێ بوون[٦١]. مزگەوتەکانی هەولێر لەم بوارەدا رۆڵی بەرچاویان گێڕاوە، لە دیارترینیان (مزگەوتی قەڵات)ە، کە مەلا ئەبوبەکر ئەفەندی ناسراو بە(مەلا فەندی) لە وتارخوێنەکانی بووە و هەروەها مزگەوت و قوتابخانەی(ئەحمەدیە) کە لە قەڵات بووە، لە لایەن باپیرانی (مەلا رەسوول ئەفەندی) دروست کراوە[٦٢]، و مزگەوت و قوتابخانەی (حاجی داود) کە دەکەوتە ناوەڕاستی بازاڕ و مێژووی دروستکردنی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٢٠٥ ک/ ١٧٩٠ز) کە نوێژی هەینی و نوێژی هەردوو جەژنی (رەمەزان و قوربان)ی لێ دەکرا، بەڵام لە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهانی خوێندنەوەی وتاری هەینی تێدا قەدەغە کراوە[٦٣]، و (مزگەوتی شێخ ئەبوبەکر نەقشبەندی) کە مێژووی دروستکردنی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٣٠١ ک/١٨٨٦ز و ئەم مزگەوتەش لە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا خوێندنەوەی وتاری هەینی تێدا قەدەغەکراوە[٦٤]، مزگەوتی (شێخی چۆلی) کە مێژووی دروستکردنی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٣٠١ ک/١٨٨٦ز بۆیە بە ناوی چۆلی ناونراوە، چونکە ئەو کاتەی کە دروست کراوە لە شوێنێک بووە چۆڵ بووە، تا ئەمڕۆش بە مزگەوتی شێخی چۆلی دەناسرێت[٦٥]، مزگەوتی (خانەقا) لە ساڵی ١٢٣٠ک /١٨١٥ز لە گەڕەکی خانەقا دامەزراوە و مزگەوتی (پاشا) لە لایەن سەید مەحمود ئاغا لە گەڕەکی عەرەبان دروست کراوە کە کۆنترین مزگەوت بووە لەم گەڕەکە، ئەم مزگەوتانەش قوتابخانەی زانستە ئاینییەکان بوون[٦٦].

سەبارەت بە تەکیەکانی هەولێر، تەکیەی (شێخ زادە) بە کۆنترین تەکیەکانی هەولێر دادەنرێت و دەکەوێتە گەڕەکی سەرای لە باکوری

ڕۆژهەڵاتی قەڵات و نزیک بووە لە دەرگای (ئەحمەدیە) کە سەردەمی دوروستکردنی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەتابکەکان ٥٢٢-٦٣٠ک[٦٧]، و تەکیەی (شێخ حاجی مەلا خدر تەلەعفەر) ی دەکەوێتە گەڕەکی تەکیە لە خوارووی قەڵات ومێژووی دروستکردنی دەگەڕێتەوە بۆ کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەم[٦٨]، و تەکیەی (شێخ محیەدین بەرزنجی) دەکەوێتە ناوەڕاستی گەڕەکی عارەبان لە ڕۆژئاوای قەڵات لە سنووری ساڵی ١٣٠٠ک / ١٨٨٥ز دروست کراوە[٦٩]، تەکیەی (خەلیفە حسن رشید) دەکەوتە باشووری ڕۆژئاوای گەڕەکی عەرەبان لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەم دامەزراوە[٧٠]، و تەکیەی (شێخ تەها رەفاعی) دەکەوتە گەڕەکی تەعجیل لە نزیک قەیسەری بووە و مێژووی دروستکردنی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی سەدەی بیستەم[٧١]، تەکیەی (خەلیفە ئیسماعیل) دەکەوێتە گەڕەکی خانەقا لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم لە لایەن ئیسماعیل نەجار دروست کراوە (٧٢)، و تەکیەی (خضر نەعیمی) دەکەوتە گەڕەکی عارەبان و مێژووی دروستکردنی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی سەدەی بیستەم[٧٣].

دەکرێت بڵێین بوونی ژمارەیەکی زۆر لە مزگەوت و قوتابخانەی ئاینی و تەکیە و خانەقا لە شاری هەولێر لەم ماوە مێژووییە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو تایبەتمەندییەی کە لە کۆنەوە ئەم شارە پێی ناسراوە و هەڵوێستی خەڵکی ئەم شارە بۆ ڕێز گرتنیان لە ئاینی ئیسلام و بەرز ڕاگرتنی و گرنگیدان بە زانستە ئاینییەکان.

سەبارەت بە حەمامەکانی هەولێر، لە ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا بێجگە لە حەمامی قەڵات تەنها سێ حەمامی تێدا بووە[٧٤]، (حەمامی قەڵات) ناوەکەی دەگەڕایەوە بۆ شوێنەکەی کە دەکەوتە تەنیشت مزگەوتی قەڵات و مێژووی دروستکردنی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٢٠٠ک/ ١٧٧٥ز) و دواتر لە لایەن (قاسم ئاغا عەبدوڵڵا ئاغا) چاک کراوەتەوە و بیرێکی بە قووڵی (٦٠م) و بە تیرەی (٥م) بۆ لێداوە کە سەرچاوەی ئاوی بۆ دابین کردووە[٧٥]، لە بەشی خوارەوەش حەمامی یەکەم (حەمامی گەورە) بووە کە شوێنەکەی دەکەوتە بەرامبەر مزگەوتی خانەقا و حەمامی دووەمیش (حەمامی گچکە) بووە کە لە لایەن (حاجی رشید ئاغا وەیس ئاغا) دروست کراوە[٧٦]و حەمامی سێیەم بە ناوی (حاجی قادر دەباغ)[*] کە بە هاوبەشی لەگەڵ قازی داود فەهمی ئەفەندی کوڕی مەلا هیدایەت دروست کراوە و مێژووی دروستکردنی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٣١٤ک /١٨٩٦ز)[٧٧].

گۆڕستانیش کە بریتییە لەم زەوییە تەرخانکراوەی کە مردووی تێدا دەنێژن و لە تۆماری زەوییە ڕاگیراوەکان تۆمار دەکرێت، هەولێر لەو ماوە مێژووییە چەند گۆڕستانی تێدا بووە، گەورەترینیان ناسراوە بە (گۆڕستانی گەورە) دەکەوتە خوارووی قەڵات و لە سەردەمی ئەتابکەکان پێی وتراوە (مقبرة الصوفیة) و موزەفەرەدین گۆکبری لە ساڵی ٦١٥ ک / ١٢٠٠ز ئامادەی ناشتنی تەرمی دامەزرێنەری یەکەم تەکیەی قادری لە هەولێر (شێخ ابو محەمەد عبداللطیف البکری) بووە[٧٨]، و (گۆڕستانی ئیمام محەمەد) دەکەوێتە خوارووی ڕۆژئاوای قەڵات لە گەڕەکی عەرەبان بەرامبەر منارەی چۆلی لە ساڵانی



سییەکان و چلەکانی سەدەی بیستەم سنووردکەی گەیشتۆتە مەزاری (عوزێر پێغەمبەر)[٧٩]، و (گۆڕستانی عوزێر پێغەمبەر) دەکەوێتە خوارووی رۆژئاوای قەڵات و نزیک مزگەوتی (شێخی چۆلی) لە گەڕەکی عارەب[٨٠] و (گۆڕستانی شێخی چولی) بە ناوی شێخی چۆلی کراوەو مەزارەکەی دەکەوێتە ناو مزگەوتەکە[٨١]و (گۆڕستانی شێخ عەبدوڵلا قطب) دەکەوێتە خوارووی قەڵات لە نزیک گۆڕستانی گەورە و (گۆڕستانی شێخ مەحەمەدی خوراسانی) دەکەوێتە گەڕەکی تەعجیل بەرامبەر وێستگەی ئاسنینی کۆن و (گۆڕستانی شێخ محەمەد واسطی) دەکەوێتە خوارووی گۆڕستانی خوراسانی[٨٢] و گۆڕستانی (اوسكۆچە دلوكی) شوێنەکەی بە (کندە کوخ)[*] ناسراوە[٨٣] و گۆڕستانی (ستی ئیمام) کەوتۆتە ناو وێستگەی شەمەندەفەری هەولێر و گۆڕەکەی لە ژوورێکی بچووکدایە، ئافرەتان لە رۆژانی شەممەو چوار شەممە سەردانیان کردووە بە مەبەستی چاکبوونەوەیان لە نەخۆشی[٨٤] و گۆڕستانی (شێخ عومەر) دەکەوێتە گەڕەکی خانەقا و لە پشت مزگەوتی (شێخ ئەبوبەکر نەقشبەندی) یە و مەزاری ئەم شێخەشی تێدایە[٨٥]، و گۆڕستانی (چراغ) کە یەکێکە لە گۆڕستانە کۆنەکانی هەولێر، کەوتۆتە رۆژئاوای قەڵات و رۆژهەڵاتی گۆڕستانی جوولەکەکان کۆنترین گۆڕیش تێیدا گۆڕی (مەحمود ئاغا پیرداود)ە کە لە بەهاری (١٢٦١ ک /١٨٣٦ز) مردووە[٨٦]. هەروەها دوو



گۆڕستانی تریش تایبەت بوون بە (مەسیحییەکان) کە کەوتۆتە دێی عینکاوە و (گۆڕستانی جوولەکان) کە کەوتۆتە لێواری دۆڵی خوارووی شارەکە تەنیشت گۆڕستانی (چراغ) مێژووی دروستبوونیان دەگەڕێتەوە بۆ پێش ئیسلام[٨٧]. دەکرێت بڵێین بوونی ئەم گۆڕستانانەش بەڵگەنە لە سەر بەیەکەوە ژیان و رێز گرتنی خەڵکی ئەم شارە بۆ هەموو ئایین و نەتەوەکان.

### تەوەری دووەم
### باروودۆخی ئابووری
### ١٩١٤-١٩١٨

هەولێر وەک زۆربەی ناوچەکانی تر لە کوردستان کشتوکاڵ بەشی سەرەکی ئابووری دانیشتوانەکەی پێک دەهێنێت[٨٨]، زەوی کشتوکاڵیش لە سەردەمی عوسمانیدا دابەش دەبوو بۆ سێ بەش، یەکەمیان (تاپۆ) ئەم زەوییانەی دەگرتەوە کە بە پێی بەڵگەنامەی (السند) فەرمی دەوڵەت بە ناوی گەورە دەرەبەگەکان بوو، دووەمیان پێی وتراوە (التحریر) کە شوێنەکەی دوور بووە لە مەڵبەندی شارەکان بە ناوی ئەو کەسانە تۆمار کراوە کە لە سەر زەوییەکە بوونە و جۆری سێیەمیان پێی وتراوە (السنیە) کە زەوی سوڵتانن مافی گەڕانەوەی بۆ دەوڵەتە[٨٩].

گرنگترین بەرهەمە کشتوکاڵەکانی هەولێر بریتی بوون لە (گەنم و جۆ)[٩٠]، بە بەراوردکردن لەگەڵ بەرهەمی گەنمی ناوچەکانی تر لە عێراقدا، ئەم گەنمەی لە هەولێر و ناوچەکانی دەوروبەری بەرهەم دەهێندرا بە یەکێک لە باشترین جۆرەکانی گەنم دادەندرا، کە ئەوەش دوو جۆری هەبووە یەکەمیان پێی وتراوە (رەشگوڵ) کە بۆ دروستکردنی ساوار بەکار هاتووە، جۆری دووەم کە پێی دەوترا (قەندەهاری) بۆ دروستکردنی نان بەکار هاتووە[٩١]، رادەی باران بارینیش پێوەرێک بوود بۆ رێژەی

بەرهەم هێنان[٩٢]، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆربەی کشتوکاڵییەکانی هەولێر دێمین، کاتی باران بارین کاریگەریی زۆری بەسەر توانای بەرهەمهێناندا هەبووە[٩٣].

(برنج و پەمۆ)ش جۆرێکی تری بەرهەمی کشتوکاڵی هەولێر بووە[٩٤]، لە لایەن ئەم بنەماڵانە بەرهەم هێنراوە کە خاوەن ئاوی تایبەت بوونە وەک بنەماڵەی (حاجی رەشید ئاغا)[٩٥]، ئاژەڵداریش کە لایەنێکی گرنگی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵییە و رۆڵێکی گرنگی لە پێکهاتەی ژیانی ئابووری هەبووە بە تایبەتی بەخێوکردنی مەڕومالات[٩٦].

بازرگانیش یەکێک لە لقە دیارەکانی لایەنی ئابووری بووە، لە سەرەتاکانی ساڵانی سەدەی بیستەم هاوکات لەگەڵ کۆتاییەکانی حوکمڕانی عوسمانییەکان هەولێر چالاکی بازرگانی بەخۆوە دیتووە، شوێنی جوگرافی شارەکەش فاکتەرێکی یارمەتیدەر بووە لەم بارەیەوە کە بووە بە شوێنی کۆکردنەوەی بەرهەمی هەردوو جەمسەری ئابووری لە کوردستان یەکەمیان بەرهەمەکانی ناوچە چیاییەکان و دووەمیان بەرهەمی گوندەکانی (دەشتی هەولێر)(*) بوون[٩٧].

بازاڕی هەولێر (قەیسەری) مەڵبەندێکی بازرگانی دانیشتوانی شارەکە بووە و پیشەی دەستکردیش کە بەشێک بووە لە چالاکییەکانی ئابووری لە لایەن خەڵکی شارەکە ئەنجام دەدرا وەک پیشەکانی (چەخماخچی، بەرگدروو، سەفارچی، زێڕینگر، دارتاشی، ئاسنگەری) کە لە ناو بازاڕەکەدا شوێنیان لەگەڵ یەکتردا جیاواز بووە لە لایەن دانیشتوانی شارەکە بەڕێوە دەچوو[٩٨].

ڕێگای بازرگانیش فاکتەرێکی تری بەهێزبوونی چالاکییە بازرگانییەکان بووە، هەولێریش دەکەوتە سەر ڕێگای کاروانەکانی بازرگانی گرنگترینیان ڕێگای (بەغدا-کەرکووک-ئاڵتون کۆپری ـ هەولێر) و ڕێگای (هەولێر ـ موسڵ ـ حەلەب) و هەمان ڕێگاش لە هەولێر دوو ڕێگای تری لێ دەبێتەوە کە بە ئاراستەی ڕۆژهەلات و باکووری ڕۆژهەلات دەڕوات تا دەگەیشتە ئازربێجان، یەکەمیان بە ڕەواندز لە باکووری ڕۆژهەلات، و ئەوی تر بە شارۆچکەی کۆیەدا تێدەپەڕی لە ڕۆژهەڵات، سەبارەت بە بازرگانی لە هەولێر (شترک) لە وتارێکی کە دوای ساڵی ١٩٢٠ نووسیویەتی دەڵێت:

"... شاری هەولێر وێستگەیەکی بازرگانی بووە و مەڵبەندێکی چالاکی ژیانی بازرگانی بووە، و شوێنی بەیەکگەیشتنی ڕێگای چەند کاروان بووە و لەمانەش، ڕێگای کۆن کە سەرەتای لە بەغدا دەست پێدەکات و بەرەو کەرکووک و ئاڵتون کۆپری و هەولێر و تا مووسلا کە نزیکترین ڕێگا بووە لە نێوان بەغدا - موسڵ کە پێشتر بابلی بە نەینەوا (موسڵ) دەبەستەوە، و لە هەولێر دوو ڕێگای تری لێ دەبۆوە بەرەو ڕۆژهەڵات و باکووری ڕۆژهەڵات کە کۆتاییان لە ئازربێجان دەهات کە ڕێگای یەکەمیان بە ڕەواندزدا تێدەپەڕی لە باکووری ڕۆژهەڵات و دووەمیان بە کۆیا تێدەپەڕی لە ڕۆژهەڵات..."[٩٩].

بنەماڵەکانی هەولێر لە بواری بازرگانی ڕۆڵی گرنگیان گێڕاوە دیارترینیان بنەماڵەی (دەباغەکان) کە بازرگانی (پێستە و سوف) یان کردووە دوای ئەوەی بەرهەمەکانیان لە ناوچەکانی کوردستان دەکڕیەوە



ڕەوانەی شاری بەسرا دەکرا و لەوێش بەرەو ئەوروپا دەنێـــــردران[١٠٠]، و بەرهەمی (گـــەنمە شـــامی) ش لە هەولێر بۆ مـەبەسـتی بازرگانیکردن ڕەوانەی شارەکانی بەغدا و موسڵ کراوە[١٠١].

دوای دەستپێکردنی جەنگی یەکەمی جیهانی (١٩١٤- ١٩١٨) کە تەواوی ناوچەکانی کوردستانی ژێر دەسەلاتی دەولەتی عوسمانی دووچاری نەهامەتی و گرانی بوونەوە، هەولێریش بەدەر نەبوو هەمان سەختی ئابووری و گرانی تووش هات، چونکە دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ دەستپێکردنی شەڕدا پەیرەوی سیاسەتێکی ئابووری نوێی کرد دژ بە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی بە تایبەتیش ناوچەکانی کوردستان کە لە کاولکردنی ولاتێکدا دەچوو کە لە خاکی دوژمندا ئەنجام بدرێت[١٠٢]، لە سالانی شەڕدا بە تایبەتی لە ١٩١٧ -١٩١٨ ناوچە کوردییەکان تەوژمێکی برسێتی و گرانییەکی گەورەی بە خۆوە بینی کە پێشتر پێیدا تێنەپەڕیبوو، تەنانەت کاری کردە سەر بەروبوومە ناوخۆییەکان بە جۆرێک لە دوای تەواوبوونی جەنگیش پێداویستی دانیشتوانی پڕ نەدەکردەوە[١٠٣] ناوچەکانی کە لە بەرەکانی جەنگەوە دوور بوون، هەمان تەنگژەی ئابوورییان تووش هات، لەمانەش هەولێر کە خەڵکەکەی بە تایبەتی چینی ناوەند و هەژار ژیانیان هەراسان ببوو کە دەتوانین بلێین زیاتر دانیشتووی بەشی خوارووی شارەکە بوون و زۆربەیان خاوەنی پیشەکاری دەستی و بازرگانی بچووک و فەرمانبەر و هەندێکیان بە کاری ڕۆژانە خەریک بوون، دەکرێت بلێین چینی خۆشگوزەران کە زۆربەیان دانیشتووی قەڵات بوون وەک (ئاغاکان و دەولەمەندەکان) ئەم بارە سەختە ئابوورییە کاریگەری لە سەریان نەبووە. لەم کاتەش کە نرخی دانەوێڵە بە ڕادەیەکی زۆر بەرز دەبێتەوە لەوانەش (گەنم) کە پێش دەستپێکردنی شەڕەکە هەر تەنێکی بە (٤٠ ڕوپیە)(*) و جۆش بە (٢٤ ڕوپیە) بووە[١٠٤]، بەلام لەو کاتەی کە گرانی شارەکە دەگرێتەوە و بە تایبەتی لە سالی ١٩١٧-١٩١٨ نرخەکەی زۆر بەرز دەبێتەوە هەر تەنێکی گەنم دەگاتە (١٥٠٠ڕوپیە) و تەنی جۆ دەگاتە (١٢٠٠ڕوپیە) ئەم نرخەش لە توانای کڕینی چینی کەم دەرامەت دەردەچێت (٢). بۆ نموونە بە پێی وتەی مامۆستایانی ئاینی لە ڕۆژانی گرانیدا بە تایبەتی لە سالی ١٩١٧ فەقێ کە لە لایەن مامۆستایانی ئاینی دەیانخوێند ڕۆژێ تەنها کەرتێک نانی بەرکەوتووە[١٠٥]، بەلام دەکرێت بلێین ئەمە زیاتر لە گوندەکاندا پەیڕەو کراوە، چونکە داهاتی سەرەکی گوندەکانی کوردستان بە تایبەتی دەشتی هەولێر کشتوکاڵکردن بووە. سەبارەت بە بەرهەمی ئاژەڵداریش لە ئاستێکی زۆر نزمدا بووە بەهۆی نەبوونی پێداویستییەکانی خۆراک و پاراستن و بەتالانبردنیان لە لایەن سوپای عوسمانی بە تایبەتی لە سالانی جەنگدا[١٠٦].

بە مەبەستی یارمەتیدان وچارەسەرکردنی ئەم بارودۆخە ترسناکەی کە ببووە سەرچاوەیەکی هەڕەشە بە سەر ژیانی هەژارانی شارەکە هەندێک لە بنەماڵەکانی هەولێر یارمەتی زۆری هەژاران و لێقەوماوانیان داوە، وەک (حاجی ڕەشید ئاغا) کە جگە لە یارمەتیدانی خەڵکی هەولێر ئەم خێزانانەی کە لە ناوچەکانی مەندەلی و دەوروبەری کەرکوک بە هۆی شەڕەکەوە ناوچەکانیان جێهێشتووە لە هەولێر نیشتەجێ بوون یارمەتی داون و جێگای حەوانەویان بۆ دابین دەکات[١٠٧]، هەروەها (حەسەن ئاغا چاوشلی) بەرهەمە کشتوکاڵییەکانی دەهێنێتە بازار وبە نرخێکی هەرزان دەیفرۆشێتە هەژاران، و ئەوانەی توانای کڕینیان نەبووە بە بێ پارە وەرگرتن دابەشی کردووە بە سەریان کە ئەمەش بۆتە هۆی کەمکردنەوەی ئەم برسێتییەی کە خەڵکی کەم دەرامەت تێیدا دەژیا[١٠٧]، هەروەها (جەمیل ئەفەندی ١٨٧٨-١٩١٩ ز) کە موفتی هەولێر بووە، ڕۆڵێکی گەورەی ناندانی هەژارانی هەولێر و پەرگەندەکانی شارەکانی تری داوە کە بە هۆی شەڕەکەوە روویان کردبووە هەولێر[١٠٨]، جێگای ئاماژە پێکردنە هەولێر یەکێکە لەم شارانەی کە لە ڕاستیدا کەم وێنەیە لە ڕێز گرتنی غەریب و گرتنەخۆی لێقەوماوان و یارمەتیدانیان لە هەموو سەردەمەکان، ئەمەش تا ئەمڕۆ وەک نەریتێکی بەرز خەڵکی ئەم شارە شانازی پێوە دەکەن و بەردەوامن لە سەر ئەم ئادابە، ئەمەش تەنها بۆ لێقەوماوانی ناوچەکانی خواروو و ناوەڕاستی عێراق یان کوردەکانی

ناوچەکانی دەوروبەر بێت، بەڵکو بۆ ئەو بێگانانەش هەمان هەڵوێستیان نواندووە کە روویان لە هەولێر کردووە، نموونەش لەم بارەیەوە زۆرن، مستەر زیبیچ لە ساڵی ۱۹۲۰ کە بۆ یەکەمین جار سەردانی شاری هەولێری کردووە، لەبارەی سەردانەکەی و هەڵوێستی خەڵکی ئەم شارە دەڵێت:

"... گەلێک لە خەڵکی هەولێر دەوریان دام و لە قسەیان نەدەگەیشتم بەڵام هیچێکی وا نزیکم نەکەوتن کە پێم ناخۆش بێ، منیش بە روویەکی خۆشەوە لێیان ورد ئەبوومەوە لەم شارە غەریب بووم بەڵام خۆم بە ئەمین دەزانی بە بێ نۆبەتچی و پاسەوان..."[١٠٩].

دەتوانین بڵێین شاری هەولێر بە بەراوردکردن لەگەڵ ناوچەکانی تر تارادەیەک باری ئابووری باشتر بووە، بۆ نموونە لە زستانی ساڵانی ۱۹۱۷-۱۹۱۸ لە ئەنجامی برسێتی لە لیوای موسڵ ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوانەکەی مردوون، لە پاڵ ئەمەشدا بڵاوبوونەوەی نەخۆشی هەرەشەیەکی تر بووە، بە تایبەتی نەخۆشی (طاعون وکولیرا و تیفۆ) کە لە ئەنجامی هەژاری و برسێتی تووشی دەبوون وەک دەردەکەوێت بە پێی سەرچاوە مێژووییەکان شارەوانی موسڵ لەم کاتدا نەیتوانیوە ئەرکەکانی خۆی وجێبەجێ بکات[١١٠].

## سیستەمی کارگێڕی دەوڵەتی عوسمانی ۱۹۱٤- ۱۹۱۸

هەولێر بە پێی سیستەمی کارگێڕی دەوڵەتی عوسمانی لە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهانی یەکێک بووە لە قەزاکانی سەر بە سنجەقی شارەزوور و ئەویش سەر بە ویلایەتی موسڵ بووە[١١١]. یەکە کارگێڕییەکانی (ویلایەتی موسڵ) لە ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا (١٩١٤-١٩١٨) لە سێ لیوا و(١٤) قەزا و(٣٣) ناحیە و(٣٢٠٧) گوند پێکهاتبوو[١١٢].

ساڵنامەکانی عوسمانی، کارگێڕی قەزاکانی سەر بە ویلایەتەکان بە جۆرێک دەردەخات کە تا رادەیەک جیاوازی لەگەڵ بەشەکانی تری یەکە کارگێڕییەکاندا هەبوو، وەک لیواکان، قەزای هەولێر لە لایەن (قائمقام)ەوە بەڕێوەدەبردرا، کە بە پێی پلەکانی کارگێڕی لە لایەن والی ویلایەتی موسڵ دیاری دەکرا[١١٣]، جێگای ئاماژەیە کە زۆربەی قائیمقامەکانی قەزای هەولێر بە رەگەز تورک بوون، بەڵام لە هەندێ کاتدا کوردیش ئەم پۆستەیان وەرگرتووە و لەلایەن سولتانەوە هەڵبژێردراون. لەمانەش (عەبدوڵڵا پاشای کوڕی عەباس ئاغای ئەحمەدی) کە لە ساڵی ۱۸۹۰ کراوە بە قائیمقامی هەولێر[١١٤]. قائیمقامی هەولێر لە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا بە رەگەز تورک بووە[١١٥]، و لە رووی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵ بنەماڵە دیارەکانی هەولێر تێکەڵی کۆمەڵایەتی هەبووە[١١٦]. پلەی دووەمی کارگێڕی لە قەزاکان جێگری قائیمقام بووە کە بە پێی ساڵنامەکانی دەوڵەتی عوسمانی ئەم پۆستە لە لایەن دانیشتوانی قەزاکەوە بە تایبەتی لە بنەماڵە دیارەکان داندراوە[١١٧]، و موفتیش کە بریتییە لە پلە و پایەیەکی ئاینی و ئەرکی جێبەجێکردنی شەریعەتی ئیسلامی و چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکان بووە لە چوارچێوەی شەریعەتی ئیسلامدا لەم ماوە مێژووییە سپێردراوە بە (جەمیل فەندی کوڕی عەلی فەندی)[١١٨]. ئەنجومەنی بەڕێوەبردن، کە ئەرکی بەدواداچوون و لێکۆڵینەوەی کارەکان بووە و قائیمقامی قەزا سەرۆکایەتی کردووە بە ئەندامێتی جێگری قائیمقام و موفتی و مودیری ماڵ و کاتبی تەحریرات ئەمانە وەک ئەندامی هەمیشەیی بوون لە ئەنجومەنەکەدا، بەڵام سەبارەت بە ئەندامە هەڵبژێردراوەکانی کە لە ئەنجومەندا بوون ژمارەیان لە سێ تا چوار ئەندام تێنەپەڕیوە[١١٩].

دەتوانین بڵێین ئەم ئەنجومەنە وەک (ئەنجومەنێکی نوێنەران)ی بچووک بووە، چونکە نوێنەرانی رەسمی دەوڵەت و دانیشتوان و ناودارانی تێدا بووە و کارەکانی تایبەت بووە بە قەزای هەولێر، بەڵام سەبارەت بە جیاوازی نەتەوەیی و ئاینی و شوێنیان لەم ئەنجومەنە، دەکرێت بڵێین پەیوەندی بە پلەوپایەی کۆمەڵایەتی و ئاینی هەبووە.

کاروباری داراییش، کە هۆبەیەکی تایبەت بووە، دەکەوتە ناو باڵەخانەی قائمقامیەت، لە لایەن مودیری ماڵ (مەحمود جەلالەدین ئەفەندی) بەڕێوەبردراوە و جێگرەکەی (مستەفا ئەفەندی) بووە و ئەمین

سەندوق (رشید ئەفەندی) و کاتبی تەحریریش (نوری ئەفەندی) بووە[140].

دادگاش یەکێکە لە دەزگاکانی کارگێڕی و بەڕێوەبەرایەتییەکی سەربەخۆی هەبووە، کە لە لایەن سەرۆکی دادگا بەڕێوە بردراوە و وەرگرتنی ئەم پلەیەش پەیوەندی بە پلەو توانای زانستی و ئاینی هەبووە، جێگری سەرۆکی دادگاش هاوکار و یارمەتیدەری سەرۆکی دادگا بووە، لێکۆڵەرەوەش لە تاوان و داواکارییەکان ئەرکێکی تری دادگا بووە و کەسێکی تایبەت ئەنجامی داوە کە پێی وتراوە (مستنطق)[121].

دادگای سەرەتایی (محکمە بدایت) کە ئەرکی لێکۆڵینەوەی سەرەتایی بووە لە ڕووداوەکان، لە پێنج ئەندام پێکهاتووە (باش کاتب) کە تۆماری ڕووداوەکانی کردووە و جێگرەکەی پێی وتراوە (مستنطق معاونی) و موحەریری موقاوەلات و کاتبی دووەمی هەبووە[122].

دووەمیان دادگای شەرعی بووە کە دادگایی کردووە و بڕیاری لە سەر ڕووداوەکان داوە، لە ساڵی ١٩١٤ تا ١٩١٦ (عەلی بەهائەدین) حاکمی شەرعی (قازی) هەولێر بووە[123] و هەر یەک لە (عبدالکریم ئەفەندی و محەمەد داود ئەفەندی) باشکاتب بوون[124]، لە ساڵی ١٩١٦-١٩١٨ (محەمەد ڕەشید) دەبێتە حاکمی دادگای هەولێرو (یونس ناجی و عەبدولکەریم ئەفەندی) لەو ماوەیەدا باشکاتبی دادگا بوونە[125] (عەبدولقادر حیشمت) جێگری باشکاتب بووە[126]، بڕیاری دادگاش



لە لایەن حکومەتەوە جێبەجێ کراوە، بەندیخانەش کە بەشێک بووە لە سەرای حکومەت و لە نهۆمی یەکەمی باڵەخانەی قایمقامییەتدا لە سەر قەڵات بووە، ئەوانەی بڕیاری بەندکردنی دادگایان بە سەردا سەپێندراوە، لەم بەندیخانەدا بە پێی ماوەی دیاریکراویان تێیدا بەند کراون[127].

شارەوانیش، کە مێژووی دامەزراندنی لە عێراق بۆ ساڵی ١٨٦٩ ز دەگەڕێتەوە، هاوکاتە لەگەڵ سەردەمی حوکمڕانی والی بەغدا (مەدحەت پاشا ١٨٦٩ - ١٨٧٢)[128]، بەڵام لە هەولێر پێش ساڵی ١٨٧٥ز دامەزراوە[129] و لە سەرەتای دامەزراندنیشیدا سەرۆکایەتی شارەوانی بە بنەماڵەی (ئەحمەد نەقیب) سپێردراوە، (عەباس ئاغای نەقیب) بووە بە یەکەم سەرۆکی شارەوانی

هەولێر[130]. لە ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا (١٩١٤-١٩١٨) بۆ جاری دووەم (عەبدوڵڵا پاشای کوری عەباس ئاغای نەقیب) دەبێتە سەرۆکی شارەوانی هەولێر[131].

لە دیارترین کارەکانی شارەوانی دورستکردنی یەکەمین شەقامە لە هەولێر کە ناسراوە بە شەقامی سەرای[132]، هەروەها بە مەبەستی چارەسەرکردنی کێشەی ئاو حەوزێکی بە قەبارەی (٦م) چوار گۆشە لە ناو شاردا دروست کردووە لە نزیک دەرگای خوارووی قەڵات و مزگەوتی (ئاڵتی بەرماغی - ئێستا) کە سەرچاوەی ئەم ئاوەش لە کارێزی کەسنەزانەوە هاتووە[133] کە دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی هەولێر و بەرینییەکەی نزیکەی (٣م) بووە، ڕێڕەوی ئەم ئاوەش بە قەراخ ڕێگای هەولێر - کۆیە بەرەو گوندی حەساڕۆک شۆڕ بۆتەوە، بە ڕێگای بۆریی لە قوڕی سوورەوکراو (انابیب من فخار) کە لە دروستکراوی ناوخۆیی بووە، دەگەیەندرایە ناوەڕاستی شارو چووتە ناو ئەم حەوزە[134]، دانیشتوانی شار بە هەردوو بەشەکەی (قەڵات و کورتەک) بەکاریان دەهێنا بۆ خواردنەوە و کاری تر، ئەو کەسانەش کە ئاویان لەم حەوزەوە دەبردە سەر قەڵات بە (سەقایە) ناسرابوون[135]، هەروەها ئاوی ئەو حەوزە سەرچاوەی ئاوی هەردوو مزگەوتی (شێخەڵڵا و خانەقا) بووە[136]. جێگای ئاماژەیە ئەو پرۆژەیە بە یەکەمین پرۆژەی سەرەتایی زامنکردنی ئاوی خواردنەوە دادەندرێت کە لە سەردەمی

دەوڵەتی عوسمانی دروستکراوە. کاپتن (های)(*) فەرمانڕەوای ئینگلیز لە هەولێر لە ساڵانی (١٩١٨-١٩٢٠) لەبارەی باشترین کارێز هەڵکەنی هەولێر دەڵێت:

"... پیرەمێردێک دەژیت ناوی وەستا فەتاحە، ئەم کابرایە لە کاروباری کارێز هەڵکەندندا بە پسپۆر ناسراوە و بۆ نموونە لە توانایدا هەیە ئەم شوێنە دەستنیشان بکات کە ئاوی ژێر زەوی زۆرە و پێویستە کارێز لەوێ لێبدرێت... جا چ بۆ دەردانەوەی کارێزێکی کوێربووەوەی کۆن یان هەڵکەندنی کارێزێکی نوێ بێت و بنەماڵەی ئەم وەستا فەتاحە هەر لە کۆنەوە لەم پیشەیەدا بە پسپۆڕ و زانا ناسراون... ئێستاش کوڕەکەی وەستا فەتاح ئامادەیە شوێنی باوکی بگرێتەوە..."(١٣٧).

لە ساڵی ١٩١٨ (ئەحمەد عوسمان ئەفەندی) دەبێتە سەرۆکی شارەوانی هەولێر(١٣٨)، و لە دیارترین کارەکانی کردنەوەی دەرگای دووەمی قەڵاتە کە ئەم دەرگایە بە (دەرگای ئەحمەدی) ناسراوە و دەرگای باکووریشی پێ دەوترێت. هەروەها لە کارەکانی تری چاکردنی کۆڵانەکانی شار بووە بە بەرد و راستکردنی، کە ئەمەش یارمەتی زۆری هاتوچۆی دانیشتوانی داوە، هاتوچۆی خەڵکی تا رادەیەک ئاسان کردووە(١٣٩).

پۆلیس کە ئەرکی پاراستنی دانیشتوان و بەرقەرارکردنی ئاشتی شارەکە بووە، بەشێکی گرنگی یەکەی کارگێڕی لەم شارە پێک دەهێنا، بەشێکیان کە بە شەو ئەرکی پاسەوانییان هەبووە، پێیان وتراوە (حەس حەس)، کە جلی کوردییان لەبەر کردووە و لەسەر جلەکەیان (بدلە)یەکی تایبەتییان لەبەر کردووە، ئەستێرەیەک وەک نیشانەی پۆلیس پێیەوە دیار بووە، ئەوانەی تریش لە دەزگاکانی حکومەتدا بە رۆژ ئەرکی خۆیان جێبەجێ کردووە(١٤٠)، پۆلیسی تایبەتیش هەبووە کە دوای رۆژئاوا بوون ئامێرەکانی رووناکییان داگیرساندووە بۆ رووناککردنەوەی شارەکە، هەروەها شارەوانی نۆبەچی بۆ بازاڕ و گەڕەکەکان دادەنا، ئەو جۆرە نۆبەچییانەش لە ژێر چاودێری فەرمانگەی پۆلیس دابوون، پاسەوانی شاریان دەکرد(١٤١).

فەرمانگەی تاپۆ (تۆماری زەوی)، کە مێژووی دامەزراندنی دەگەڕێتەوە سەردەمی والی (مەدحەت پاشا) کە ئامانجی دامەزراندنی ئەم فەرمانگەیەش لە هەر سێ ویلایەتەکەی عێراق (موسڵ، بەغدا، بەسرا) دەگەڕایەوە بۆ نیشتەجێکردنی هۆزەکان(١٤٢). بە پێی نەخشەی بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عوسمانی هەولێریش فەرمانگەیەکی تایبەتی تۆماری زەوی (تاپۆ) ی هەبووە، ئەرکیشی تۆمارکردنی ناوی خاوەن زەوییەکان و پێدانی موڵکایەتی زەوییەکانیان بوو.

دەکرێت بڵێین ئاغاکانی هەولێر خاوەن زەوییەکی زۆر بوون بە تایبەتی ئەوانەی کە لەگەڵ دەسەڵاتی عوسمانییەکان بوونە بە بەڵگەی ئەوەی زۆر لە دانیشتوانی کۆنی ئەم شارە کە لەگەڵ عوسمانییەکان نەبوون لە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا و بە تایبەتی لەو کاتەی کە گرانی ناوچەکانی کوردستانی گرتەوە و بەتایبەتی شاری هەولێر خەڵکێکی زۆر بە بەراوردکردن لەگەڵ ژمارەی خەمڵێنراوی ئەو کاتەی دانیشتوانی شارەکە دووچاری مەترسی برسێتی و هەڕەشەی ژیان بوونەتەوە، خاوەن زەوی و ئاغاکان و بنەماڵە دەوڵەمەندەکان یارمەتییان داون.

بەڕێوەبەرایەتی تەلەگرافیش کە بۆ پەیوەندیکردن لە نێوان (قەزاکان و لیواکان) و ئاگادارکردنەوەی کارەکان بەکار هاتووە، لە لایەن بەڕێوەبەر بەڕێوەبردراوە و مەئموری تایبەتی



هەبووە، جێگای ئاماژە پێکردنە پەیوەندی و هێڵی تەلەگراف لە ناو شاردا نەبووە[١٤٣]. هەروەها پۆستەچی کە ئەرکی گەیاندنی ئەو پۆستانە بووە بۆ خاوەنەکانیان کە دەهاتە فەرمانگەی گواستنەوە و گەیاندن یەکەمین و پوستەچی لە هەولێر (کەریم عەباس عومەر) بووە کە بە (کەریم فەندی پۆستەچی) ناسراوە لە ساڵی ١٩١٩ دادەمەزرێت بە مووچەی مانگانە (٤٠) روپیە[١٤٤].

وەک دەردەکەوێت سیستەمی بەڕێوەبردنی کارگێڕی هەولێر لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی سیستەمێکی سەرکەوتوو بووە، چونکە دوای داگیرکردنی شارەکە لە لایەن ئینگلیزەوە لە دوای کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی لە ساڵی ١٩١٨ز لەسەر هەمان یەکەی کارگێڕی مایەوە و تا ساڵی ١٩١٩ کە بە پێی بڕیاری حاکمی سیاسی لە بەغدا، هەولێر دەبێتە موتەسەرفیە و (ئەحمەد عوسمان ئەفەندی) دەبێتە یەکەمین موتەسەرفی هەولێر لە سەردەمی داگیرکردنیدا[١٤٥].

نەقابەی ئەشراف کە یەکێکە لە دەزگا ئاینییەکان و مێژووی دروستبوونی لە ناو دەوڵەتی ئیسلامی دەگەڕێتەوە سەردەمی دەوڵەتی عەباسی (١٣٢-٦٥٦ ھ)، سەرۆکی ئەم دەزگایەش ناودەندرا (النقیب)، و مەرجی پێدانی ئەم پلەیەش دەگەڕایەوە بۆ بنچینە و رەگەزی بنەماڵەکە کە دەبوایە بگەڕێتەوە بۆ سەر (آل البیت)، نەقیبی ئەشراف شوێنێکی تایبەتی هەبووە لە لایەن خەلیفەکانی عەباسی کە گەیشتۆتە پلەی راوێژکاری خەلیفە، بەڵام زۆری نەبردووە پەیوەندی نێوان خەلیفەی عەباسی و نەقیبی ئەشراف تێکدەچێت و دەبێتە هۆی رەتکردنەوەی ئەم دەزگا ئاینییە لە ناو دەوڵەت[١٤٦].

دوای دامەزراندنی دەوڵەتی عوسمانی وجێگیربوونی ئەمن و ئاسایش لە دەوڵەتەکەدا سوڵتانی عوسمانی بڕیاری دا کە نەقابە (الاشراف) بکرێتەوە، سەبارەت بە شاری بەغدا و بەسرا و موسڵ زوو دامەزران، بەڵام سەبارەت بە مێژووی دامەزراندنی لە هەولێر دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١١٩٠ھ / ١٧٦٩ز بە فەرمانی سەردەمی سوڵتان (عبدالحمیدی دووەم) و بە مۆری (محەمەد نورەدین نەقیب) دامەزراوە، سەبارەت بە جیاوازی ماوەی مێژوویی دامەزراندنی لەگەڵ شارەکانی تر ئەمە پەیوەندی بە باری ئەمنی و ئاسایشی ناوچەکان هەبوو[١٤٧].

دەوڵەتی عوسمانی بە هەمان شێوەی دەوڵەتی عەباسی مەرجی وەرگرتنی سەرۆکایەتی ئەم نەقابەی دەگەڕاندەوە بۆ ئەوەی کە هەر کەسێک ببێتە سەرۆکی ئەم نەقابەیە دەبێت لە بنەڕەتدا بگەڕێتەوە بۆ سەر (آل البیت). هەر بۆیە دەکرێت بڵێین کە زۆر بنەماڵەی ناودار و ئاین پەروەری هەولێر هەبوون، بەڵام لەبەر ئەوەی بنەچەیان نەدەگەڕایەوە بۆ سەر (آل البیت) مافی وەرگرتنی ئەم پۆستەیان نەبوو، بنەماڵەی (سەید ئەحمەد رەفاعی) کە خاوەن پلە وپایەکی ئاینی و کۆمەڵایەتی بەرز بوون لە هەولێر بە رەگەزیش دەگەڕانەوە بۆ سەر (آل البیت)، و مێژووی هاتنیان بۆ هەولێر دەگەڕێتەوە بۆ سنووری ساڵانی (٥٠٠ ھ) و دوای جێگیر بوونیان قوتابخانەی ئاینییان لە شارەکە دامەزراندووە و تەریقەتی (رەفاعی) یان تێدا بڵاوکردۆتەوە، و (سەید ئەحمەد ئاغا نەقیب) بە فەرمانی سوڵتانی عوسمانی دەبێتە یەکەم سەرۆکی نەقابەی ئەشراف لە هەولێر[١٤٨].

هەر چەندە نەقابەی ئەشراف دەزگایەکی ئاینی بوو، بەڵام لە کارەکانیدا وەک دەزگایەکی ئاینی-کۆمەڵایەتی کاری دەکرد، و هەوڵیان دەدا کە چارەسەری کێشە کۆمەڵایەتییەکانی خەڵک بکەن کە بۆ چارەسەرکردن روویان تێ دەکردن[١٤٩]، هەروەها بە هۆی ئەرکە ئاینییەکانی و پەیوەندییەکانی نێوان هەردوو بنەماڵەی عوسمانی و سەید رەفاعی، سەید ئەحمەد ببووە حاکمی تەواوی شارەکە و لە لایەن (باب العالی) روخسەتی پێدرابوو کە بڕیاری لابردنی والی و لێپرسراوان بکات ئەگەر کارەکانیان پێچەوانەی ئاین بێت، هەروەها ئەم فەرمانانەی کە لە لایەن سوڵتانەوە دەردەچوو دەگەیشتە لای سەرۆکی (نقابة الاشراف) و پێی ئاگادار دەبوو[١٥٠].

سەبارەت بە ماوەی کارکردنی ئەم نەقابەیە لە هەولێر، بەردەوام بوو تا کۆتایی هاتنی دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی لە هەولێر لە ساڵی ١٩١٨ز، و هاتنی ئینگلیز بۆ

هەولێر، لەم ماوە مێژووییەشدا هەشت لە ئەندامانی بنەماڵەی (سەید ئەحمەدی رەفاعی) پۆستی سەرۆکایەتی ئەم نەقابەیان پێ سپێردراوە کە ئەمانەن:

١- سەید ئەحمەد ئاغا رەفاعی ١٧٦٩-١٧٨٢ز
٢- محەمەد ئەحمەد ئاغا نەقیب ١٧٨٢-١٨٠٥ز
٣- عەلی محەمەد ئەحمەد ئاغا نەقیب ١٨٠٥-١٨٢٦ز
٤- ئەحمەد ئاغای رەفاعی دووەم ١٨٢٦-١٨٥١ز
٥- مەجید ئەحمەد ئاغای دووەم ١٨٥١-١٨٧٦ز
٦- عەباس محەمەد ئاغای نەقیب ١٨٧٦-١٨٨٧ز
٧- مەحمود محەمەد ئاغای نەقیب ١٨٨٧-١٩٠٣ز
٨ - عەبدوڵلا پاشای عەباس ئاغای نەقیب ١٩٠٣-١٩١٨ز[١٥١].

## بارودۆخی سیاسی (١٩١٤-١٩١٨)

هەولێر وەک بەشێک لە ناوچەکانی باشووری کوردستان (ئەمڕۆ بە هەرێمی کوردستانی / عێراق) دەناسرێت، لە ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا (١٩١٤-١٩١٨) بە شێوەیەکی راستەوخۆ مەیدانی ململانێی هێزە شەڕکەرەکان نەبوو[١٥٢]، بەڵام بەدەر نەبوو لە کاریگەری ئەم جەنگە بە سەر ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی شارەکە وەک زۆربەی ناوچەکانی تر لە کوردستان[١٥٣].

دەوڵەتی عوسمانی دوای چوونی بۆ ناو شەڕەکە لە ٥ی تشرینی دووەمی ١٩١٨ شان بە شانی هێزەکانی وڵاتانی میحوەر دژی وڵاتانی هاوپەیمان[١٥٤] ئەمەش بووە هۆی دڵەڕاوکێی بەریتانیا لە سەر بەرژەوەندییە سیاسی و ئابوورییەکانی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بەم جۆرە بە مەبەستی داگیرکردنی عێراق لە ٦ی تشرینی دووەمی ١٩١٤ هێزەکانی لە فاو دابەزاند و دواتر بەرەو شاری بەسرا کشان و لە ٢٢ی تشرینی دووەمی ١٩١٤ شارەکە گیرا، دواتر هێزەکانیان بە هەردوو ئاراستەی زێی دیجلە و فورات بۆ داگیرکردنی شارەکانی تر بەرەو ناوچەکانی سەروو کشان و لە ١١ی ئاداری ١٩١٧ شاری بەغدا بە سەرکردایەتی جەنراڵ (مۆد) داگیر کرا[١٥٥]، هاوکات لەگەڵ داگیرکردنی شاری بەغدا ئینگلیزەکان کەوتنە بڵاوکردنەوەی پروپاگەندەی پیاوەتی ئینگلیز و دژایەتی دەوڵەتی عوسمانی و بۆ ئەم مەبەستەش چەند رۆژنامەیەکیان دەرکرد وەک (العرب) بە زمانی عەرەبی و (تایمس) بە زمانی ئینگلیزی و (ایران) بە زمانی فارسی و (تێگەیشتنی راستی) بە زمانی کوردی کە لە بەغدا دەردەچوون، هەروەها هەوڵی ئەوەیان دەدا کە هەستی ئیسلامی ببزوێنن بۆ نموونە لە ژمارە (٤)ی کانوونی دووەمی ١٩١٨ رۆژنامەی تێگەیشتنی راستی هەواڵی بە ئیسلامبوونی (مستر ل. ج. ستیوارت) و گۆڕینی ناوی بۆ (جمال الدین) بڵاو دەکاتەوە

بە مەبەستی سەرنجڕاکێشانی دانیشتوانی عێراق بە گشتی و کورد بە تایبەتی بەلای خۆیان[١٥٦]، دەوڵەتی عوسمانیش هەر لە سەرەتای شەڕەکە کەوتە پەیڕەوکردنی شێوازی جۆراوجۆر بۆ رووبەڕوو بوونەوەی هێزەکانی هاوپەیمانان سوڵتان (محەمەد رەشادی پێنجەم) لە بەیاننامەیەکدا کە ئاراستەی ئەمیر و زانایانی موسڵمانان و سەرۆک هۆز و خێڵەکان و سەرجەم دانیشتوانی سنووری دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی دەکات، داوا دەکات کە جیهاد بکەن دژی کافر و داگیرکەران و ئەم جەنگەش بە دەرفەتێک دادەنێت کە هاتۆتە پێش موسڵمانان و نابێت لە دەست خۆیان بدەن وەک لە بەشێکیدا هاتووە:

"... ئەی موسڵمانان بە باشی بڕوانە دەوروبەرتان وڵاتەکەتان کە تاکە وڵاتی ئیسلامە دەوڵەتی خەلافەتی عوسمانی رێککەوتووە لەگەڵ هەردوو دەوڵەتی ئەڵمانیا ونەمسا بۆ شەڕکردن لەگەڵ توندترین دوژمنی موسڵمانان ئینگلیز و فەڕەنسای بێ باوەڕ و بێ بەخت، کە وڵاتەکەمان چەند زوڵم و ناخۆشی توش هاتووە بە هۆی ئەوانەوە... بۆ تۆڵە سەندنەوە لەم کافرانە و مانەوەی بەدەستهێنانی شەرەف و کەرامەتمان لە دونیا و خۆشی و بەختەوەریمان لە دواڕۆژدا، بۆیە جیهادمان بە پێی فەتوای شەرعی راگەیاند...داوا لە هەموو موسڵمانان دەکەم بە هێز و وره پۆڵاینەکەتان بەشداری لەم بانگەوازە بکەن کە خۆبەختکردنە لە پێناوی خوادا..."[١٥٧].

دەکرێت بڵێین دەوڵەتی عوسمانی بە مەبەستی سوود وەرگرتن لە روانگەی دڵسۆزی ئاینەوە (جیهاد)ی راگەیاند، کوردیش هەر لە ژێر کاریگەری و دڵسۆزی بۆ ئاینی ئیسلام بەشدارییان لە شەڕەکە کردووە[١٥٨]، خەڵکی هەولێریش لە ژێر سەرکردایەتی (شێخ مەحمودی حەفید) بەشداری شەڕی شوعێبە لە خواروی عێراق دەکات[١٥٩] بۆ نموونە (حوسێن حەتک عەولا زێدبەگی ١٨٨٠-١٩٤٩) ناسراو بە (عارەب ئاغا) بەشداری شەڕەکەی کردووە[١٦٠]، هەروەها کاتێک سوپای روسیا لە ژێر فەرماندەی (چیوەرنزوبوف) دەگاتە ناوچەکانی رەواندوز[١٦١]، سەرکردەی سوپای عوسمانی (عەلی ئیحسان پاشا) دێتە هەولێر و پێشوازی لێ دەکرێت و ژمارەیەک لە ناوداران و خەڵکی شاری هەولێر و هەندێک لە ئاغاکانی دزەیی وەک (ئەحمەد پاشای دزەیی) ئامادەیی خۆی پیشان دا بۆ رووبەڕوو بوونەوەی سوپای رووس[١٦٢]، بەڵام مانەوەی هێزەکانی رووس لە ناوچەی رەواندز درێژەی نەکێشا بە هۆی بەرگری دانیشتوانی ناوچەکەو رووداوی شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە ساڵی ١٩١٧ کە بووە هۆی کشانەوەی رووسیا لە شەڕەکە[١٦٣]، هەروەها لە هەولێر (حاجی رەشید ئاغا وەیس ئاغا) فەوجێک لە خەڵکی هەولێر و گوندی تەرجان پێک دەهێنێت بۆ بەرگریکردن لە دژی ئینگلیزەکان، ئەم فەوجەش (فەوجی شەمامک) ناونراوە، هەروەها هەندێک لە ناودارەکانی هەولێر و خێزانەکانیان کە باری ئابوورییان زۆرباش بووە، ئامادە بوون کە چەک بکڕن بۆ ئەو کەسانەی کە ئامادەی ئەوەن بچنە بەرەکانی شەڕ لە دژی ئینگلیز[١٦٤]، جێگای ئاماژەیە کە ئەو کەسانەی بەشدارییان لە شەڕی دژ بە ئینگلیز کردووە نازناوی (غەزایی)یان پێوتراوە بۆ نموونە (مستەفا غەزایی) کە خەڵکی گوندی قوڵتەپەی رەشید بوو، بەشداری شەڕەکەی کردووە و دواتر بەم ناوە ناسراوە[١٦٥].

هەر چەندە کورد لە ژێر کاریگەری ئاینەوە بەشداری لە شەڕەکانی دژی ئینگلیز دەکرد، بۆ بەرگریکردن لە دەوڵەتی عوسمانی، بەڵام بە پێچەوانەی ئەم هەڵوێستەی کورد دەوڵەتی عوسمانی لە شارەکانی کوردستاندا پەیڕەوی سیاسەتێکی زۆرەملێیان کردووە، کە لە کردەوەی دەوڵەتێک دەچوو کە لە سەر خاکی دوژمنانی ئەنجامی بدات[١٦٦]، دەتوانین بڵێین ئەم هەڵوێستەش لە دوای رووداوی کودەتای ئیتحاد و تەرەقی لە ساڵی ١٩٠٨ لە ناو دەوڵەتی عوسمانیدا بە روونی پەیڕەو کرا، چونکە پەیڕەو کردنی سیاسەتی نەتەوە پەرستی لە دەوڵەتی عوسمانیدا دوای هاتنی ئیتحادییەکان بە ئاشکرا دەرکەوت.

شاری هەولێریش بەدەر نەبووە لەم سیاسەتەی عوسمانییەکان کە خەڵکیان بە زۆر دەبرد بۆ بەرەکانی شەڕ و ئەوەی سەرپێچی بکردایە سزایان دەدا[١٦٧].

(حاجی جەمیل قاپقاپچی ١٩٠٤-١٩٩٦) لە بارەی دەستگیرکردنی حاجی ئیبراهیمی باوکی دەڵێت:

"... لە ساڵی ١٩١٤ جەنگی یەکەمی جیهانی دەستی پێکرد و رەشبگیری لەم شارەدا دەگەڕا و خەڵکێکی زۆر دەستگیر دەکرێن بۆ ئەوەی رەوانەی شەڕی سەفەر بەلکی بکرێن، یەکێک لەوانە حاجی ئیبراهیمی باوکم بووە و دەستگیر کراوە و رەوانەی ئەم شەڕە کراوە، هەروەها دەڵێت من و دایکم و خوشکم بە دوای باوکمدا کەوتین تاوەکو مەعەسکەری رەشکێن چووین، پاشان باوکم شوێن بزر بوو کەس نەیزانی چی بە سەر هات... منیش ناچار بووم لەم تەمەنە بچووکەدا دەست بە کاسبی بکەم لەگەڵ دایکم ئیشی (سەقا)ییمان دەکرد، هەموو رۆژێک بە ولاخ ئاومان بۆ سەر قەڵات دەبرد بە سەر ماڵە گەورەکانمان دابەش دەکرد، لە هەر کاروانە ئاوێک عانەیەکمان وەردەگرت... "[١٦٨].

بە مەبەستی هاوکاری کردنی دەوڵەتی عوسمانی چەند کەسێک لە خەڵکی هەولێر بوونەتە چاوساغی دەوڵەت بۆ گەڕان بە دوای لاوەکانی شارەکە و بردنیان بۆ بەرەکانی شەڕ لەوانەش ئافرەتێک بووە بە ناوی (خیریە) کە دەچووە ئەو ماڵانەی گومانی لێ هەبوایە کە بووبێتە شوێنی خۆحەشاردانی گەنجەکان، هەروەها (ئیبراهیم سیرجە)ش لەم بوارەدا خزمەتێکی زۆری دەوڵەتی عوسمانی کردووە لە هەولێر لە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا.[١٦٩] جێگای ئاماژەیە کە هەندێک لە ناودارانی هەولێر وەک

(مەلا فەندی) رۆڵی گەورەیان بینیوە لە رزگارکردنی چەندان گەنجی ئەم شارە بۆ رەوانەکردنیان بۆ بەرەکانی جەنگ (شەهابەی هەولێری) یەکێک لەم گەنجانەی هەولێر بووە کە (مەلا فەندی) رزگاری دەکات لە رەوانەکردنی بۆ بەرەکانی شەڕ و لە (جوق موسیقا)ی دەوڵەتی عوسمانی وەردەگیرێت کە هەموو رۆژانی دووشەممە لە بەر دەرگای سەرای هەولێر کە ئەو کات لە قەڵات بوو موسیقا و مارشی دەوڵەتی عوسمانی لێدەدرا و ئاڵای دەوڵەتی عوسمانییان بەرز دەکردەوە کە نیشانەی مانگ و ئەستێرەی لە سەر نەخش کرابوو، ئەم مەراسیمە لە ساڵانی شەڕیش بەردەوام بوو تا ساڵی ١٩١٨ ئەم تیپە هەولێری جێهێشت و گەڕایەوە تورکیا[١٧٠] هەروەها هەندێ لە ئاغاکانی هەولێر لەوانەش (عەلی پاشا دوغرەمەچی) کەسانێکی لە پەنای خۆی حەشارداوە و دووریانی خستوونەتەوە لەم رەشبگیرییە. لە لایەکی تر هەولێر یەکێک لەم شارانە بووە کە لە کاتی شەڕەکە لێقەوماوەکانی ناوەوە و دەرەوەی کوردستان روویان تێ کردووە و تێیدا نیشتەجێ بوون، بنەماڵەی چەخماخسازەکانی هەولێر کە لە بنەڕەتدا خەڵکی شاری (وان)ن، لە ساڵانی شەڕدا ئاوارەی ئەم ناوچەیە بوونە بە هۆی پەیوەندی ئەم بنەماڵەیەش لەگەڵ (یەعقوبییەکان) روویان لە شاری هەولێر کردووە نیشتەجێ بوون(١٧١)، هەروەها یەکێک لە شەرکەرەکانی ئینگلیز لە سەختترین و نالەبارترین رۆژانی ئەم سەردەمە هاتۆتە عێراق و رووی کردۆتە ناوچەی کوردستان، دوای ئەوەی ئەم ناوچەیەی پەسند کردووە و ناوی لە خۆی ناوە عەبدوڵلا سکۆتی[١٧٢].

سەبارەت بە رۆڵی مەلا و شێخەکانی کورد، بە تایبەتی ئەوانەی کە لە راستیدا لە سیاسەتی ئەستەمبول دوور بوون، تەنها لە باری سەرنجی ئاینییەوە سەیری شەڕەکەیان دەکرد، بانگەشەی جیهادیان دەکرد، بەڵام ئەوانەی کە لە سیاسەتدا دوور نەبوو هەستی نارەزاییان بەرامبەر ئەم جۆرە فتوایانە دەردەبڕی بۆ غەزاکردن، چونکە پێیان وابوو کە ئەم شەڕە لە سەر راستی نییە[١٧٣].

دەتوانین بڵێین لە ساڵانی جەنگدا هەستی هۆشیاری سیاسی لە هەولێردا سست بووە بە هۆی نەبوونی هیچ پارتێکی سیاسی لە شارەکە کە خاوەن پەیڕەو و پرۆگرامێکی نیشتمانی یان نەتەوەیی بێت، بە پێچەوانەی ناوچەکانی تر لە کوردستان کە چەند پارت و رێکخراوی سیاسی لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم تێیدا دامەزرا بوو[١٧٤]، بەڵام دەتوانین بڵێین تێکۆشەرانی هەولێر دریغییان نەکردووە لە پێکهاتەی رێکخستنی پارتە سیاسییەکانی پارچەکانی تر لە کوردستان، بۆ نموونە (مەلا عەلی ئەفەندی) یەکێک بووە لە دەستەی کارگێڕی (کۆمەڵەی تەعالی کوردستان) کە لە ساڵی ١٩١٨ دامەزراوە (٣). بۆیە دەکرێت بڵێین هەولێر لە بواری رێکخراوەیی سیاسیدا لەم ماوە مێژووییەدا رۆڵی نەبینیوە، بەڵام سەبارەت بە بەشداربوونی لە جووڵانەوەی سیاسیدا رۆڵی گێڕاوە[١٧٥].

**پەراوێزەکان:**

(١) هادی رشید چاوشلی، هەولێر لەگەڵ کاروانەی فەلەک، چ (١)، چاپخانەی الجاحظ، بەغدا، ل٨٣-٨٤.

(٢) فەیسەل دەباغ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٩.

(٣) لەبارەی ئەم بیروڕایانە بڕوانە: یوسف ئەحمەد دەرگەڵەیی، مێژووی شاری هەولێر لە کۆنەوە تا ساڵانی شەست، چ (١)، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل٩٣.

(٤) سید مولود بێخاڵی، هەولێرم وا دیوە، چ (١)، بەغدا، ١٩٩١، بەرگی یەکەم، ل٤٨.

(٥) بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی مەسیحییەکان لە هەولێر بڕوانە: عزیز عبدالاحد نباتي، تاريخ عينكاوه، راجعه: البير ابونا، ط (١)، مطبعة جامعة صلاح الدين، اربيل، ص٢٩-٣٠.

(٦) دوای سەرکەوتنی عوسمانییەکان بە سەر سەفەوییەکان لە شەڕی چاڵدیران لە ساڵی ١٥١٤ز هەولێریش کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: سعدی عثمان هروتی، کوردستان و.....، ص٢٦ -٣١.

(*) لە ساڵی ١٨٦٣ لە هەولێر لە دایک بووە، لە سەردەمی حوکمڕانی دەوڵەتی عوسمانی لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٨٩٩-١٩٠٤) سەرۆکی شارەوانی هەولێر بووە و لە ساڵی ١٩٣٩ مردووە.

(٧) هادی رشید چاوشلی، هەولێر لەگەڵ...، ل٦٢، بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی ناودارەکانی هەولێر بڕوانە:

یوسف ئەحمەد دەرگەلەیی، ناودارەکانی هەولێر، هەولێر "گۆڤار"، ژ (١)، سالی (٣)، ١٩٧٢، ل١٢ -١٦.
(٨) تاریق جامباز و نەژاد بەرزنجی، ئاماری دانیشتوانی قەلاتی هەولێر (سەرای ـ تەکیە ـ تۆپخانە)، چ (١)، چاپخانەی بینایی، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل٩.
(٩) هەولێر لە یادی سەد سالەی دامەزراندنی شارەوانی هەولێر ١٨٨٥-١٩٨٥، چ (١)،چاپخانەی علا و، بەغدا، ١٩٨٥، ل١٢٨.
(١٠) سید مولود بێخالی، بنەماڵە ناسراوەکانی قەلاتی هەولێر و چەند زانیارییەک، هەولێر "گۆڤار"، ژ(٣)، ١٩٩٩، ل ١٣٠-١٣٢.
(١١) برهان جبار صالح، قلعة اربيل بين الماضي والحاضر، ط(١)، اربيل، ٢٠٠٤، ص١٠-١١.
(١٢) هاشم خضر الجنابي، المصدر السابق، ص٧٥.
(*)
(١٣) ئیسماعیل شكر رسول، المصدر السابق، ص٢٦.
(١٤) سید مولود بێخالی، هەولێرم وا....، بەرگی یەکەم، ل٤٦.
(١٥) هەولێر لە یادی سەد......، ل١٣٠.
(١٦) هەمان سەرچاوە، ل١٣١.
(١٧) خلیل ئیسماعیل محەمەد، اربيل (دراسات ديموغرافية-اقتصادية)، ط (١)، اربيل، ٢٠٠٤، ص١٠٨-١٠٩.
(١٨) ساكار بهاءالدين عبدالله، الانماط السكنية في مدينة اربيل، رسالة ماجستير (غ.م)، كلية الاداب، جامعة صلاح الدين ـاربيل، ٢٠٠٣، ص٤٦.
(١٩) ئیسماعیل شكر رسول، المصدر السابق، ص٢٥، سید مولود بێخالی، هەولێرم وا....، بەرگی یەکەم، ل٧٦-٧٧.
(٢٠) سید مولود بێخالی، هەمان سەرچاوە، ل ٨٣.
(٢١) سي.جي. ادموندز، كورد وترک وعرب، ت: جرجيس فتح الله، ط (٢)، اربيل، ١٩٩٩، ص٧٩.
(٢٢) زبير بلال ئیسماعيل و اخرون، اربيل (هەولێر) بين الماضي والحاضر، ط(١)، اربيل، ١٩٨٧، ص٣٨.
(٢٣) هادی رشید چاوشلی، هەولێر لەگەڵ...، ل١٢، فەیسەل دەباغ، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٠.
(٢٤) هاشم خضر الجنابي، المصدر السابق، ص٣٣.
(٢٥) سید مولود بێخالی، هەولێرم وا دیوە وبیستووە، چ(١)، هەولێر، ٢٠٠٥، بەرگی سێیەم، ل ٣٥٤.
(٢٦) بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی جەژنەکانی جوولەکەکان بڕوانە: ایرک براور، یهود کردستان، ت: شاخوان کرکوکی وعبدالرزاق بوتاني، ط(١)، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠٤، ص٢٩٩، ٢٨٦، ٨٣، ٦٢.
(٢٧) سید مولود بێخالی، هەولێرم وا....، بەرگی سێیەم، ل٣٥٨.
(*) یەک قرش دەکاتە (١٠) فلس، یەک لیرەی زێڕی عوسمانی دەکاتە ١٠٠ قرش.
(٢٨) ایرک براور، المصدر السابق، ص٣٠٩-٣٢٤.
(٢٩) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: خليل ابراهيم السامرائي، احتفالات المولد النبوي في اربيل، كاروان "مجلة"، عدد(٥)، ١٩٨٣، ص١٠٠-١٠٤.
(*) بە جەژنی سەری ساڵی عیبری و ڕۆژی تۆبە و غوفران دادەندرا، جولەکەکان بۆ ڕۆژانی ئەم جەژنەیان کەپرێکی خنجیلانەیان لە لک و پۆپی داری مورتک دروست دەکرد، موسڵمانەکانیش بۆ پیرۆزباییکردن سەردانیان کردوون، ئێستاش جوولەکەکانی ئیسرائیل ساڵانە یادی ئەم جەژنە دەکەنەوە. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: سید مولود بێخالی، هەولێرم وا....، بەرگی سێیەم، ل٣٦١- ٣٦٢، عباس سلێمان سمایل، ڕیشەی جوولەکەکانی کوردستان و دابو نەریتیان لە پارێزگای هەولێر، هەولێر "گۆڤار"، ژ(١٤)، ٢٠٠٢، ل ٩٦ - ١٠٠.
(٣٠) سید مولود بێخالی، هەولێرم وا....، بەرگی سێیەم، ل٣٦١.
(٣١) جلال سنجاوی، هونەری بیناسازی و نەخش و نیگار لە بازاڕی قەیسەری و قەلاتی هەولێردا، هەولێر"گۆڤار"، ژ(١٦)، ٢٠٠٢، ل ٧٦ ـ٧٧.
(٣٢) سید مولود بێخالی، هەولێرم وا دیوەو بیستووە، چ(١)، هەولێر، ١٩٩٨، بەرگی دووەم، ل ٣٠٢.
(٣٣) هەمان سەرچاوە، ل ٣٠٣.
(٣٤) پیرداود مەخموری، پیرە هەولێر، چ(١)، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٤، ل١٢.
(٣٥) سید مولود بێخالی، هەولێرم وا....، بەرگی دووەم، ل٢٩٨-٢٩٩، هادی رشید چاوشلی، هەولێر لەگەڵ...، ل٦٣.
(٣٦) موصل ولایتی ساڵنامە رسمیسیدر، ١٣٣٠هـ/١٩١٢م، ص٢٢٨.
(٣٧) سیفەتێکە دەدرێتە پاڵ ئەو کەسەی کە کاروباری خان بەڕێوە دەبات و ساخبێری دەکات و مەرج نییە هەموو خاوەن خانێک خانچی بێت. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: پیرداود مخموری، هەولێر (خان و حەسار)، هەولێر "گۆڤار"، ژ(٢)، ١٩٩٩، ل٨٩.
(٣٨) پیرداود مخموری، پیرە هەولێر....، ل ١٢، هادی رشید چاوشلی، هەولێر لە....، ل١٦.
(٣٩) هەولێر لە یادی سەد......، ل ١٤٦، پیرداود مخموری، پیرە هەولێر....، ل ١٤.
(٤٠) هەمان سەرچاوە، ل١٤٦.
(٤١) هەمان سەرچاوە، ل١٤٦.

(٤٢) هەمان سەرچاوە، ل١٤٧.
(٤٣) هەولێر لە یادی سەد......، ل ١٤٧، پیرداود مەخموری، پیرە هەولێر....، ل ١٤.
(٤٤) هەمان سەرچاوە، ل ١٤.
(٤٥) هادي رشيد الجاوشلي، تراث اربيل التاريخي، ط(١)، مطبعة جامعة الموصل، موصل، ١٩٨٥، ص٤٨.
(*) بریتییە لە پارچە هەویرێک کە دوای پانکردنەوەی لایەکی هەندێک گەرم دەکرا و لایەکەی تریش چەور دەکرا، دواتر دەخرایە سەر شوێنەکەی ژانی هەبوو بە پارچەیەک لە قوماش دەبەسترایەوە.
(٤٦) عوسمان مفتی، ژیانی کۆمەڵایەتی قەڵاتی هەولێر لە سەدەی بیستەمدا، هەولێر "گۆڤار"، ژ(٢)، ١٩٩٩، ل٣٧.
(٤٧) پەرژین سادق چەخماخچی، ئەو هۆکارە کۆمەڵایەتییانەی کار لە ئامادەکردنی نەخشە بنەرەتییەکانی شاری هەولێر دەکەن، هەولێر "گۆڤار"، ژ (٣)، هاوینی ١٩٩٩، ل ٣٥.
(٤٨) هەولێر لە یادی سەد......، ل١١.
(٤٩) ماهیر عبدالواحد عزیز، ژیانی کۆمەڵایەتی بەر لە شارستانیەت لە شاری هەولێردا، هەولێر"گۆڤار"، ژ(٦)، ٢٠٠٠، ل ٣٢.
(50) D.K.Fieldhouse, Kurd, Arabs and Beltons (The memdir of Wallace lyon inIrag 1918-1994), London, 2002, P 90.
(٥١) هادي رشید چاوشلي، هەولێر لەگەڵ....، ل ١٥.
(٥٢) محەمەد عبداللە کاکەسور، گەشەکردنی خوێندنی فەرمی لە لیواکانی کوردستانی عێراقدا (١٩٢١-١٩٥٣)، نامەی دکتورا (بڵاوکراوە)، کۆلیژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەدین-هەولێر، ٢٠٠٣، ل ٢٤.
(٥٣) فەیسەل دەباغ، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٦.
(٥٤) زبیر بلال ئیسماعیل، اول مدرسة ابتدائية في اربيل، زاگروس"مجلە"، عدد (٩)، اب ١٩٩٨، ص٢٣.
(٥٥) مكاتب ابتدائيە شهادتنامەسی، محەمەد سعيد افندی، اربيل قلعة مكتب ابتدائي، ١٣٢٢هـ /١٩٠٧م.
(٥٦) فەیسەل دەباغ، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٦، محەمەد عبداللە کاکەسور، سەرچاوەی پێشوو، ل١٥.
(٥٧) هەمان سەرچاوە، ل ٢٦.
(٥٨) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ل ٢٨.
(٥٩) وشەیەکی فارسییە بە واتای سووتاو دێت وا باوە کە ئەم جۆرە فەقێیانەی لە خزمەت و بەردەستی موستەعیدەکاندا لەکارو خوێندندا دەسووتان. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: عەزیزی مەلای ڕەش، فەقێیاتی لە دەشتی هەولێر، ڕۆشنبیری نوێ "گۆڤار"، ژ(١١٠)، ١٩٨٦، ل١١٥.
(٦٠) وشەیەکی عەرەبییە بە واتای ئامادە دێت. بڕوانە: هەمان سەرچاوە و لاپەرە.
(٦١) بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی خوێندن لە مزگەوتەکان بڕوانە: محەمەد عبداللە کاکەسور، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤-٥.
(٦٢) شيرزاد شيخ محەمەد، الاثار الدينية في اربيل (المقابر والمساجد والجوامع والتكايا القديمة في اربيل)، ط(١)، اربيل، ٢٠٠٢، ص٧-٢٥.
(٦٣) عبداللە حداد، وەقف و مزگەوتی حاجی داود (مزگەوتی گەورەی بازاڕی کۆنی هەولێر)، هەولێر"گۆڤار"، ژ(١٦)، ٢٠٠٢، ل٤٥ـ٥٢.
(٦٤) عبداللە محەمەد حداد، معلومات نادرە عن اربيل قبل قرن، کاروان "مجلە"، عدد(٥)، شباط ١٩٨٣، ص٩٩.
(٦٥) زبير بلال ئيسماعيل، شيخ الجولي، ط(١)، اربيل، ١٩٨٩، ص٣٢، شيرزاد شيخ محەمەد، المصدر السابق، ص٨٣-٨٧.
(٦٦) شيرزاد شيخ محەمەد، المصدر نفسە، ص١٧٩، عبداللە محەمەد حداد، المصدر السابق، ص٩٩.
(٦٧) شيرزاد شيخ محەمەد، المصدر السابق، ص٢١٠.
(٦٨) المصدر نفسە، ص١٣٢.
(٦٩) المصدر نفسە، ص١٤٣.
(٧٠) المصدر نفسە، ص١٦٠.
(٧١) المصدر نفسە، ص١٦٩.
(٧٢) المصدر نفسە، ص١٧٥.
(٧٣) المصدر نفسە، ص١٧٧.
(٧٤) موصل ولايتی سالنامە رسميسيدر، ١٣٣٠هـ/١٩١٢م، ص٢٢٨.
(٧٥) عبدالرحمن ئەحمەد گەزنەیی، اربيل و ما و الشرب......، ص٢٠، جلال سنجاوی، هونەری بیناسازی و نەخش و نیگار لە بازاڕی قەیسەری و قەڵاتی هەولێر، هەولێر "گۆڤار"، ژ(١٦)، ٢٠٠٢، ل ٧٥.
(٧٦) پیرداود مەخموری، حەمامەکانی هەولێر، هەولێر "گۆڤار"، ژ (٧)، ٢٠٠٠، ل ٧٧ -٧٨.
(*) حەیران بێژەکانی دەشتی هەولێر لە حەیرانەکانیان باسیان لە حەمامی حاجی قادر کردووە.
(٧٧) عبداللە حداد، لە پێناو کرۆنۆلۆژیایەکی ڕێکوپێک بۆ شاری هەولێر، هەولێر "گۆڤار"، ژ(١)، ١٩٩٨، ل٥٥.
(٧٨) شيرزاد شيخ محەمەد، المصدر السابق، ص٨ -٩.
(٧٩) هەولێر لە یادی سەد......، ل ١٦٣ -١٦٤.
(٨٠) شيرزاد شيخ محەمەد، المصدر السابق، ص١٦.
(٨١) زبير بلال، شيخ الجولي، ص٢٧ - ٤٧.
(٨٢) شيرزاد شيخ محەمەد، المصدر

السابق، ص١٧-١٨.
(*) خەلکی هەولێر بۆ چاکبوونەوەیان لە نەخۆشی کۆخە دەچوونە سەر ئەم مەزارەو هەندێک بریشکەیان لە سەر گۆڕەکە روو دەکرد بە نیازی ئەوەی کە بالندە ئەم بریشکەیە بخۆن بۆ ئەوەی کۆخەکە بچێتە ئەوان.
(٨٣) هەولێر لە یادی سەد..... ل ١٦٧.
(٨٤) تاڤگە عمر ئەحمەد، تیشکێک بۆ سەر چەند مەرقەدێکی شاری هەولێر، هەولێر "گۆڤار"، ژ(١)، ١٩٩٨، ل ١٥٨ -١٥٩.
(٨٥) عومەر عەلی ئەحمەد و ئەوانی تر، داب و نەریتی بەخاکسپاردن لە هەر دوو شاری هەولێر و عەنکاوە، هەولێر "گۆڤار"، ژ(٦)، ٢٠٠٠، ل٨٨.
(٨٦) شیرزاد شێخ محەمەد، المصدر السابق، ص٧-٨.
(٨٧) المصدر نفسە، ص٣٣. بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی گۆڕستانەکانی هەولێر بڕوانە: ئەرخەوان محەمەد عوبەید، رەمز و نووسینی سەرگۆڕەکان (چوار گۆڕستانی باشووری کوردستان بە نموونە)، چ(١)، چاپخانەی خانی، دهۆک، ٢٠٠٨، ل ١٣٣ ـ١٤٧.
(٨٨) بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی بارودۆخی ئابووری لە سالانی جەنگدا بڕوانە: کمال مظهر ئەحمەد، کردستان في سنوات الحرب العالمیة الاولی، ترجمة: محمد الملا عبدالکریم، ط(٢)، بغداد، ١٩٨٤، ص٢٢٩ - ٢٣٠.
(٨٩) دبلیو.ار.هی، سنتان في کردستان، ترجمة: فؤاد جمیل، ط(١)، بغداد، ١٩٧٣، ج (١)، ص١٢١.
(٩٠) فەیسەل دەباغ، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٠.
(٩١) دبلیو.ار.هی، المصدر السابق، ج (١)، ص١٢٣.
(٩٢) بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی رادەی باران بارین لە هەولێر بڕوانە: ازاد جلال شریف، مناخ منطقة اربیل (دراسة مقارنة في المناخ المحلي)، اطروحة دکتوراه (غ.م)، کلیة الاداب، جامعة صلاح الدین ـ اربیل، ١٩٩٨، ص٩٥-٩٧.
(٩٣) اربیل في ظلال بیان اذار التاریخي، ط(١)، مطبعة الصباح، حلة، ١٩٧٢، ص١٦.
(٩٤) المصدر نفسە، ص١٧.
(٩٥) چاوپێکەوتنێک لەگەڵ پ.د. نەرسن موسی رشید، ١٣ /٤ /٢٠٠٧.
(٩٦) اربیل في ظلال.....، ص١٧.
(*) بریتییە لە دەشتێکی پان و فراوان و گوندەکانی ناحیەی قوشتپە و گوێر و دیبەگە و قەزای مخمور دەگرێتەوە کە دەشتی پشت رێ (سەرووی رێگای کەرکوک-هەولێر) و مولکیە و شەمامک و کەندێناوە و قەراج، هەردوو زێی گەورە و بچووک نێوانی رۆژ هەلات و رۆژئاوای بۆ دەکێشێت و چیای قەرەچوغ دەشتی (قەراج و کەندێناوە) و زوورگەزراو (کەندێناوە و مولکیە) لێک جیا دەکاتەوە. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: مەهدی محەمەد قادر، پێشهاتە سیاسییەکانی کوردستانی عێراق ١٩٤٥-١٩٥٨، چ(١)، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل ٢٤١.
(٩٧) خلیل اسماعیل محمد، اربیل.....، ص١٨٧.
(٩٨) بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی پیشە دەستکردەکان بڕوانە: برهان جبار سالح، المصدر السابق، ص٥٧-٨٨.
(٩٩) زبیر بلال اسماعیل، تاریخ اربیل......، ص٢٠٧- ٢٠٨.
(١٠٠) عبدالرزاق دەباغ، مامەکانم قەیسەری هەولێریان دروست کرد، بارش "گۆڤار"، ژ(٦)، تشرینی دووەمی ٢٠٠١، ل ٦١.
(١٠١) فەیسەل دەباغ، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٠.
(١٠٢) کمال مظهر احمد، کردستان في سنوات.....، ص١٩٧، ٢٢٢.
(١٠٣) المصدر نفسە، ص٢٢٧.
(*) هەر روپیەک دەکاتە (٧٥) فلس، واتە عەلبەی گەنم لە سالانی شەڕدا بە (٢) دینار و (٤٠٠) فلس بووە.
(١٠٤) دبلیو.ار.هی، المصدر السابق، ج (١)، ص١٢٣.
(٢) المصدر نفسە، ص١٢٤.
(١٠٥) مەلا محەمەد عەلیاوەیی، ژیانی فەقێیاتی لە کوردستاندا لە سەدەی ١٣ و١٤ ی کۆچیدا، چ(١)، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل٤٨.
(١٠٦) زهیر عبدالملك، الاکراد وبلادهم کردستان بین السؤال والجواب، سوید، ١٩٩٩، ص٥٣، کمال مظهر ئەحمەد، المصدر السابق، ص٢٢٩.
(١٠٧) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: موسی عمران، مندلي عبر التاریخ، ط(١)، مطبعة الحریة، بغداد، ١٩٨٣، ص٩٢-٩٥.
(١٠٧) هادي رشید، تراث اربیل......، ص٢٨.
(١٠٨) هەولێر لە یادی سەد......، ل ٣٠٣.
(١٠٩) هادي رشید چاوشلي، هەولێر لە......، ل٩٤.
(١١٠) عبدالعظیم عباس، المصدر السابق، ص٢٩٨.
(١١١) عێراق بە گشتی دابەشی سەر(٣) ویلایەت کرا بوو، ویلایەتی (موسل، بەغدا، بەسرا)، هەر یەک لەم ویلایەتانەش دابەش کرابوو بۆ سعز چەند سنجەقێک و هەر سنجەقێک بۆ سەر چەند قەزا و هەر قەزایەک بۆ سەر چەند ناحیەیەک و بەڕێوەبەری ناحیە بەڕێوەی بردووە، هەر ناحیەکیش سەر چەند گوند دابەش کرابوو کە (موختار) لێپرسراوی گوندەکان بووە لە رووی کارگێری: ألبرت.م. منتشاشغیلي،

العراق في سنوات الانتداب البريطاني، ط(١)، مطبعة جامعة بغداد، بغداد، ١٩٧٨، ص٢١-٢٢.
(١١٢) راپۆرتی كارگێری دەڤەری كەركوك ماوەی (١ ی كانوونی یەكەم تا ٣١ ی كانوونی دووەم ١٩١٩)، وەرگێرانی سەربەست كەركوكی، چ(١)، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل ٢٣.
(١١٣) ألبرت. م. منتشاشغیلی، المصدر السابق، ص٢١-٢٢. بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی سیستەمی كارگێری عوسمانییەكان لە سالآنی جەنگی یەكەمی جیهانی بڕوانە: المس بیل، فصول من تاریخ العراق القریب بین سنتي ١٩١٤-١٩٢٠، ترجمة: جعفر الخیاط، ط(٢)، بیروت، ٢٠٠٤، ص١٧-٦٤.
(١١٤) شێرزاد محەمەد، المصدر السابق، ص١٨٥.
(١١٥) چاوپێكەوتنێک لەگەڵ كەنعان موفتی، لە ٢٠٠٧/٤/٨، چاوپێكەوتنێک لەگەڵ ناظم یونس، لە ٢٠٠٧/٣/٢٦.
(١١٦) لەوە دەچێت كە ناوەكەی (عبدالودود) بێت. چاوپێكەوتنێک لەگەڵ پ.د. ئەرسن موسی رەشید، لە٢٠٠٧/٤/١٣
(١١٧) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: موصل ولایتی سالنامە رسمیسیدر ١٣١٢ھ/ ١٨٩٤م، ص١٦٧، موصل ولایتی سالنامە رسمیسیدر ١٣٢٥ھ/١٩٠٧م، ص٢١٩، موصل ولایتی سالنامە رسمیسیدر ١٣٣٠ھ /١٩١٢م، ص٢٧٤.
(١١٨) عباس العزاوي، اربیل في مختلف العصور (اللواء والمدینة)، راجعة: محمد علي القرەداغي، ط (١)، بغداد، ٢٠٠١، ص١٥٠.
(١١٩) موصل ولایتی سالنامە رسمیسیدر ١٣٣٠ھ /١٩١٢م، ص٢٧٤.
(١٢٠) موصل ولایتی سالنامە رسمیسیدر ١٣٣٠ھ /١٩١٢م، ص٢٧٥.
(١٢١) المصدر نفسه، ص٢٧٤ -٢٧٥.
(١٢٢) المصدر نفسه، ص٢٧٥.
(١٢٣) محكمة اربیل، سجل قسامات والحجج والوثائق الشرعیة، ١٣٣٤ھ/١٩١٦م- ١٣٣٥ھ/١٩١٧م، ص٤٥.
(١٢٤) المصدر نفسه، ص٥٧.
(١٢٥) المصدر نفسه، ص١٠٥، ٨٦.
(١٢٦) المصدر نفسه، ص٩١.
(١٢٧) هادي رشید الجاوشلي، تراث اربیل....، ص٢٨.
(١٢٨) ستیفن هیمسلي لونكریک، اربعه قرون من تاریخ العراق الحدیث، ت: جعفر الخیاط، بیروت، ١٩٤٩، ص٢٨٤.
(١٢٩) عبدالعظیم عباس، المصدر السابق، ص٢٦٤.
(١٣٠) بوتان جلال، اسرة السید احمد اغا النقیب (من الاسر المعروفة في اربیل)، بارش "مجلة"، عدد (١٢)، نیسان ٢٠٠٣، ص٥٧.
(١٣١) دەگەڕێتەوە سەر بنەماڵەی (الأحمدیة) لە سالّی ٥٠٠ كۆچی هاتوونەتە هەولێر و نیشتەجێ بوون و لە ماوەی ژیانیدا دوو جار سەردانی سولتانی عوسمانی (عبدالحمیدی دووەم) ی كردووە و نازناوی (پاشا) ی پێداوە و لە سالّی ١٩٢١ لە هەولێر مردووە و لە گۆڕستانی (ئیمام محەمەد) نێژراوە.بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: شێرزاد محەمەد، المصدر السابق، ص١٨٥، سید مولود بیخالّی، هەولێرم وا دیوەو.... بەرگی دووەم، ل٥٣.
(١٣٢) بوتان جلال، المصدر السابق، ص٥٧.
(١٣٣) عبدالرحمن احمد گەزنەیی، اربیل وماء الشرب في الماضي والحاضر، ط(١)، اربیل، ١٩٩٧، ص٣٧.
(١٣٤) هەولێر لە یادی سەد......، ل٨٣-٨٤.
(١٣٥) اربیل فی اربعە اعوام (١٩٦٤-١٩٦٧)، بغداد، ١٩٦٦، ص٣٨.
(١٣٦) هەولێر لە یادی سەد......، ل٨٣.
(*) جێگری حاكمی سیاسی بووە لە هەولێر دوای داگیر كردنی لە سالّی ١٩١٨، دوای ئەوەی لە سالّی ١٩١٩ دەبێتە لیوا پلەی حاكمی سیاسی وەردەگرێت، (ئەحمەد عوسمان) دەبێتە یەكەم موتەسەریفی هەولێر. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە لەبارەی كارەكانی لە هەولێر: دبلیو.ار.هی. المصدر السابق، الاجزا و (١، ٢).
(١٣٧) المصدر نفسه، ج(١)، ص٣٩.
(١٣٨) زبیر بلال، تاریخ اربیل....، ص٢١٢.
(١٣٩) سید مولود بیخالّی، هەولێرم وا......، بەرگی دووەم، ل٥٣.
(١٤٠) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: پیرداود مخموری، پیرە هەولێر....، ل ٢٢-٢٨.
(١٤١) ماهیر عبدالواحد، سەرچاوەی پێشوو، ل ١١.
(١٤٢) لونكریک، اربعه قرون....، ص٣٠٣.
(١٤٣) موصل ولایتی سالنامە رسمیسیدر، ١٣٣٠ھ/١٩١٢م، ص٢٧٦.
(١٤٤) طارق ابراهیم شریف، یەكەمین پۆستەچی هەولێر لە بیری خەڵكدا، هەولێر "گۆڤار"، ژ(٦)، بەهاری ٢٠٠٠، ل ١٨٠-١٨١.
(١٤٥) دبلیو.ار.هی. المصدر السابق، ج(١)، ص٢٢٣، هادی رشید الجاوشلی، تراث اربیل....، ص٢٨.
(١٤٦) یلماز اوزتونا، تاریخ الدولة العثمانیة، ترجمة: عدنان محمود

سلمان، منشورات مؤسسة فيصل للتمويل، تركيا، ١٩٩٠، مج (٢)، ص٤٧٧، بوتان جلال، أسرة السيد أحمد اغا النقيب، بارش "مجلة"، ع(١١)، ٢٠٠٣، ص٣٦.
(١٤٧) شیرزاد محەمەد، المصدر السابق، ص١٩٠.
(١٤٨) المصدر نفسه، ص١٩٢، سەید مولود بێخاڵی، هەولێرم وا دیوە و....، بەرگی سێیەم، ل٢٠٠.
(١٤٩) هەمان سەرچاوە، ل ٢٠١- ٢٠٢.
(١٥٠) بوتان جلال، المصدر السابق، ص٣٧.
(١٥١) المصدر نفسه، ص٣٧.
(١٥٢) بۆ زیاتر زانیاری لە رووی کارگێری عوسمانییەکان لە عێراق بڕوانە: البرت. م. منتشاشفيلي، العراق في سنوات الانتداب البريطاني، ط(١)، مطبعة جامعة بغداد، بغداد، ١٩٧٨، ص٢١-٢٢، موصل ولایتی سالنامە رسمیسیدر ١٣٣٠هـ /١٩١٢م، ص٢٧٤.
(١٥٣) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: کمال مظهر ئەحمەد، كردستان في سنوات....، ص٢٢٩-٢٣٠.
(١٥٤) سروە اسعد صابر، كوردستان من بدايه الحرب....، ص٣٧.
(١٥٥) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە:عبدالرحمن بزاز، العراق من الاحتلال الى الاستقلال، ط(٢)، بيروت، ١٩٦٧، ل ٧٣-٧٦.
(١٥٦) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: م. ر. هاوار، شێخ مەحمودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، چ(١)، لەندن، ١٩٩٠، بەرگی یەکەم، ل٣١٦-٣٢٢.
(١٥٧) بەیاننامەی دەوڵەتی عوسمانی لە لایەن سوڵتان محەمەد رەشادی پێنجەم.
(١٥٨) ئەم شەڕە لەناو خەڵکدا بە شەڕی (سەفەر بەلەک) ناسراوە.
(١٥٩) بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی شەڕی شوعێبە بڕوانە: کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد....، بەرگی دووەم، ل ١٣-٢٢. المس بيل، المصدر السابق، ص١٠-١٥، سروە اسعد، المصدر السابق، ص٤٣،
(١٦٠) چاوپێکەوتنێک لەگەڵ جەلال خدر، لە ٣٠ /٢٠٠٧/٨.
(١٦١) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: ممدوح مزووری، مێژووی رواندز، چ(١)، هەولێر، ٢٠٠٦، ل ٢٧٦- ٢٧٩.
(١٦٢) ئیسماعیل بشیر چیچۆ، اربيل ايام...زمان، خەبات " رۆژنامە "، عدد (٨٢٠).
(١٦٣) م.س.لازاریف، کێشەی کورد ١٨٩٦-١٩١٧، چاپخانەی حافظ، بەغداد، ١٩٨٩، بەشی دووەم، ل ٦٦١.
(١٦٤) چاوپێکەوتنێک لەگەڵ پ.د.نارسن موسا رەشید، لە ٢٠٠٧/٥/٢٥، چاوپێکەوتنێک لەگەڵ حاجی تاهیر تەرجانی، لە ٢٠٠٧/٤/١٨.
(١٦٥) چاوپێکەوتنێک لەگەڵ عبداللە مستەفا غەزایی، لە ٢٠٠٧/٥/٢٩
(١٦٦) کەمال مظهر احمد، المصدر السابق، ص٢٢٦.
(١٦٧) چاوپێکەوتنێک لەگەڵ کنعان موفتی، لە٢٠٠٧/٤/٨، چاوپێکەوتنێک لەگەڵ نورالدين دەباغ، لە ٢٠٠٧/٥/٢٤.
(١٦٨) جەلال خدر، حاجی جەمیلی قاپقاپچی (مولود خوێن و قۆریات بێژ)، بارش"گۆڤار"، ژ(٣)، کانوونی دووەمی ٢٠٠١، ل ٨٥-٨٦.
(١٦٩) چاوپێکەوتنێک لەگەڵ جلال خدر، لە ٣٠ /٢٠٠٧/٨.
(١٧٠) جەلال خدر، ژیاننامەی شەهابەی هەولێری، ل١٨٦، ٣٦.
(١٧١) سەید مەولود بێخاڵی، هەولێرم وا......، بەرگی دووەم، ل ١٨٩-١٩٠.
(١٧٢) هەمان سەرچاوە، ل ١٨٥.
(١٧٣) محەمەدی مەلا کەریم، نیکتین لە مەسەلەی کورد دەدوێ، بەیان "گۆڤار"، ژ (٧)، ١٩٧٢، ل٦.
(١٧٤) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: عەبدوللا عەلیاوەیی، کوردستان لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا (لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە تا جەنگی یەکەمی جیهانی، چ (١)، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل ١٩٥ـ ٢٠٧.
(٣) مەلا عەلی ئەفەندی لە ساڵی ١٨٨٠ لە هەولێر لە دایک بووە و لە ساڵی١٩١١ دوای تەواوکردنی خوێندن دەبێتە قازی لە هەندێ ناوچەی باکووری کوردستان و دواتر دەچێتە ئەستەنبول و دوای تێکچوونی باری سیاسی کوردەکان لە باکوری کوردستان لە ساڵی ١٩٢٥ هیچ جموجۆڵی سیاسی نامێنێت، لە سییەکانی سەدەی رابردوو دەبێتە عەمیدی کۆلیژی شەریعە لە ئەستەنبول تا ساڵی ١٩٣٧ کۆچی دوایی دەکات. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: عبداللە حداد، مەلا عەلی ئەفەندی هەولێری و کۆمەڵەی تەعالی کوردستان ساڵی ١٩١٨، هەولێر"گۆڤار"، ژ(٦)، بەهاری ٢٠٠٠، ل١٢٣-١٢٥.
(١٧٥) بۆ نموونە کاتێک (شێخ عبدالسلام بارزانی) لە ساڵی ١٩١٤ جووڵانەوەیەکی سیاسی دژی عوسمانییەکان هەڵگیرساند (مستەفا هەولێر)ی یەکێک لەم سەرکردانە بووە کە بەشداری تێدا کردووە بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: بی رەش، بارزان وحركة الوعي القومي الكوردي (١٨٢٦-١٩١٤)، ١٩٨٠، ص١٢٨.

# هەولێر لە سەردەمی داگیرکردنی ئینگلیزدا ١٩١٨ - ١٩٢٠

مەهدی محەمەد قادر
کۆلێژی ئاداب - زانکۆی سەلاحەددین

**هاتنی ئینگلیز بۆ هەولێر و کۆتایی سەردەمی عوسمانییەکان**

شەڕی یەکەمی جیهانی (١٩١٤ - ١٩١٨) دوای ڕێکەوتنامەی (مۆدرۆس) لە ٣٠ی تشرینی یەکەمی ١٩١٨ بە سەرکەوتنی هاوپەیمانەکان کۆتایی هات[١]، کە لە ئاکامیدا هێزە هاوپەیمانەکان ناوچەیەکی فرەوانیان داگیر کرد کە لە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیدا بوو، دوای داگیرکردنی شاری بەغدا لە ١١ی ئازاری ١٩١٧[٢]، هێزەکانی هاوپەیمانان ناوچەکانی کوردستانیان داگیر کرد[٣]، هەروەها دوای ڕاگەیاندنی ئاگر بەست هێزەکانی ئینگلیز لە٨ی تشرینی دووەمی ١٩١٨ چوونە ناو شاری موسڵ بە پێی بەندەکانی ڕێکەوتنی مۆدروس و(عقید لجمن) کرا بە حاکمی سیاسی و سەربازی شارەکە[٤].

سەبارەت بە داگیرکردنی هەولێر هەر چەندە لە ساڵانی شەڕدا بە هۆی هەڵکەوتنی شوێنی جوگرافی نەببووە مەیدانی وڵاتانی شەڕکەر وەک زۆر لە ناوچەکانی تر لە کوردستان[٥]، هەروەها لە لایەکی تریش کاتێک هێزە هاوپەیمانەکان گەیشتنە سنووری ناوچە کوردییەکان (مەبەست کوردستانی خواروو)ە، کە لە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیدا بوو قۆناغی یەکلابوونەوەی شەڕەکە گەیشتبووە کۆتایی و بەشێکی زۆری ناوچە کوردییەکان دوای شەڕەکە داگیر کران کە ئەمەش بووە هۆی کەمتر زەرەرمەندی ئەم ناوچانە لە ڕووی وێرانکارییەوە[٦].

بەم جۆرە دوای ئەوەی هێزەکانی هاوپەیمانان گەیشتنە (التون کوپری)[*]، پاشماوەکانی سوپای عوسمانی لە شاری هەولێر پاشەکشەیان کرد بەرەو دیاربەکر بە ڕێگای (هەولێر - موسڵ) و بەشێکی کەمیان لە شارەکە مایەوە، چونکە دوای داگیر کردنی شاری کەرکوک (کابتن نویل) حاکمی سیاسی کەرکوک هەواڵی گەیشتنی هێزەکانی بۆ هەولێر گەیاندە سەرۆکی شارەوانی هەولێر (ئەحمەد عوسمان)[٧]. دەتوانین بڵێین هۆی ئاگادار کردنەوەی سەرۆکی شارەوانی لەوەوە سەرچاوەی گرتبێت کە لەم کاتەدا بەرپرسانی کارگێڕی عوسمانییەکان لە شارەکە نەماون و سەرۆکی شارەوانی وەک بەرپرسی یەکەم لە شارەکەدا هاتووە.

دوای بڵاوبوونەوەی هەواڵی گەیشتنی هێزەکانی ئینگلیز بۆ شاری کەرکوک و هاتنیان بۆ هەولێر لە ناو خەڵکدا، ناودارانی هەولێر و سەرۆک خێڵەکانی دەوروپشتی هەولێر بە مەبەستی وەرگرتنی هەڵوێستێکی یەکگرتوو لەم بارودۆخەدا کۆبوونەوە، دوای گفتوگۆ کردن سەبارەت بە بیرۆکەی بەرگریکردن لە دژی ئینگلیزەکان، دوو بیروڕا دەرکەوتن کە یەکەمیان لەمەوە سەرچاوەی دەگرت کە هێزەکانی عوسمانی لە هەموو بەرەکانی شەڕ شکاون و لە

شارەکەش کشاونەتەوە و بەشێکی کەم نەبێت کە تێیدا ماوە و خەڵکی هەولێر لە توانایدا نییە کە بەرگری هێزێکی وەک ئینگلیز بکات و ئەوەیان پەسەند کرد کە بەرگری نەکەن بۆ ئەوەی شارەکەش لە کاولکاری رزگاری ببێت و لەگەڵ ئەم ردوشە مامەڵە بکرێت کە خۆی سەپاندووە، بەڵام بیرورای دووەم وایان دیار خست کە هەڵوێستی بەرگری لە دژی هاتنی ئینگلیزەکان وەربگرن لە ژێر فەرمانڕەوایی (حاجی ڕەشید ئاغاو عەلی پاشا دۆغرەمەچی و عەبدوڵلا پاشا ئەحمەدی و جەمیل ئاغای گەردی و ئەحمەد پاشا دزدیی و حاجی پیرداود دزدیی) لەگەڵ هەندێک لە سەرۆک هۆزەکانی سورچی و زراری و خۆشناو)[8]، بەڵام ·وانر ئەم بیرۆکەیە چەسپا کە بەرگری نەکەن و شارەکە بە بێ شەڕ ئینگلیزەکان وەری بگرن. شایەنی باسکردنە ئەم کەسانەی خاوەنی بیرۆکەی بەرگری بوون، ئەوانەبوون کە لە روانگەی ئاینییەوە دەیانڕوانییە رووداوەکان. هەروەها هەندێکیش ئەوانە بوون کە لەم بڕوایەدا بوون، بە نەمانی دەسەڵاتی عوسمانییەکان و هاتنی ئینگلیزەکان بۆ شارەکە بەرژەوەندییەکانیان لە ناو دەچێت هەر چەندە هەڵسوکەوتی ئینگلیز لە شارەکە بەدەر نەکەوتبوو بەڵام دەتوانین بڵێین لە لایەک لە روانگەی داگیرکردنی شارەکە و دوژمنایەتی بۆ ئینگلیز لە لایەکی تر وەک لایەنگری بۆ دەوڵەتی عوسمانی لێک دەدرایەوە[9].

بە مەبەستی هاتنی ئینگلیزەکان بۆ هەولێر و وەرگرتنی کاروباری شارەکە لە دەوڵەتی عوسمانی و دەرچوونی پاشماوەی هێزەکانیان تێیدا کە ڕێژەیەکی کەم مابوونەوە، سەرکردەی هێزی سەربازی ئینگلیز لە کەرکووک یاداشتێکی نووسراوی لە ڕێگای کابتن (های) ڕەوانەی هەولێر کرد کە لە کاتی هاتنیدا هیچ هێزێکی سەربازی لەگەڵدا نەبوو، تەنها ئەفسەرێکی بەریتانی لە (وحدة الخیالة/ ١٢) ئەندازەیی و دوو فەرمانبەری گەیاندنی بەریتانی نەبێت[9]، لەم بارەیەوە کابتن (های) سەبارەت بە چۆنیەتی هاتنی بۆ هەولێر دەڵێت:

"...سەرەتا نزیک بوونەوە لە هەولێر لە ڕێگایەکی هەڵەوە... دوای ئەوەی گەیشتینە هەولێر سەرەڕای نالەباری کەش وهەوا خەڵکێکی زۆر و جەندرمەکان هەموویان ڕیزیان بەستبوو و ئامیرەکەیان یەکەم کەس بوو بەخێرهاتنی کردین و دواتر سەرۆکی شارەوانی پێشوازی کردین و سەربازەکانیش لە شێوەی سڵاو وەرگرتنەوەدا بوون... دواتر بەرەو سەرای چووین کە لەم شوێنە دیمەنێکی جوانی شارەکە دەبیندرا..."[10].

بەم جۆرە دوای گەیشتنی کابتن (های) و پێشوازی لێکردنی لە لایەن هەندێک لە خەڵکی هەولێر و سەرۆکی شارەوانی لە هەمان ڕۆژی گەیشتنیدا، یاداشتەکە دەگەیەنێتە سەرکردەی سوپای عوسمانی لە سەربازگەی عوسمانییەکان لە هەولێر کە دەکەوتە ڕۆژئاوای شارەکەوەو ئاگاداری دەکاتەوە کە دەبێت شارەکە بەجێ بهێڵێت دوای رەزامەندی سەرکردەی سەربازی عوسمانی بە پێی ڕێکەوتنی ئاگر بەستی (مۆدرۆس) کاروباری کارگێڕی و سەربازی قەزای هەولێر بە ئینگلیزەکان دەدرێت، بەڵام ئەفسەری سەربازی سوپای عوسمانییەکان داوای ئەوە دەکات ڕێگایان پێبدەن نەخۆشەکانیان بۆ ماوەکی کاتی لە هەولێر بهێننەوە، سەرەتا ئینگلیزەکان رازی نابن بەڵام دواتر داوا دەکەن کە پزیشکێکی خۆیان لەگەڵیان بهێنێتەوە. بەم جۆرە وەرگرتنی کاروباری کارگێڕیش کەوتە دەست ئینگلیزەکان. شارەکە لە هێزەکانی عوسمانی وەرگیرایەوە، کۆگاکانی دانەوێڵەش کە لە لایەن حکومەتەوە سەرپەرشتی دەکرا، درا بە ئینگلیزەکان کە ڕێژەیەکی زۆری (گەنم وجۆ) ی تێدا بوو[11].

دوای جێبەجێ کردنی ئەرکی وەرگرتنی شارەکە، کابتن (های) لە ١١ی تشرینی دووەمی ١٩١٨ لە باڵەخانەی قائمقامیەت (سەرای - دار الحکومە)[12] کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ ناودارەکانی هەولێر کرد و لەبارەی ڕەوشی شارەکە و هاتنی هێزەکانی ئینگلیز لەگەڵیان دەدوێت، لە ڕۆژی ١٣ ی تشرینی دووەمی



١٩١٨(نەقیب مۆری) دەگاتە هەولێر و ئەرکی یاریدەدەری حاکمی سیاسی لە هەولێر پێ دەسپێردرێت[١٣]، بەم جۆرە قۆناغێکی نوێ لە مێژووی شاری هەولێر لە دوای کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانی (١٩١٤-١٩١٨) دەست پێدەکات.

**هەولێر لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئینگلیزدا**

دەسەڵاتی ئینگلیز لە هەولێر بە دوو قۆناغ تێپەڕی، یەکەمیان هاتنی کابتن (های)و وەرگرتنی شارەکە بوو لە سوپای عوسمانی و دووەمیان بریتی بوو لە هاتنی نەقیب (مۆری) و دەستبەکاربوونی وەک جێگری حاکمی سیاسی لە شارەکە، ئینگلیزەکان هەر لە سەرەتای داگیرکردنی هەولێر جەختیان لە سەر ئەوە کردەوە کە بارودۆخی شارەکە بە ئارامی لە پێناو پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان بروات[١٤]، بە مەبەستی هێنانە کایەوەی ئەم ئامانجەش، هەوڵیاندا کە سەرۆک عەشیرەتەکان بۆ لای خۆیان راکێشن لە رێگای پاراستنی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانیان لە سەر حسابی بەرژەوەندی گشتی خەڵکەکە[١٥]. وەک لە بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا دەردەکەوێت کە ئینگلیزەکان بە مەبەستی جێگیرکردنی دەسەڵاتیان بری (١٧٠ روپیە)(*) تەرخان دەکەن بۆ ئەو سەرۆک عەشیرەت و ناودارانەی هەولێر کە لەگەڵ حوکمڕانی ئینگلیز و پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان بوون[١٦]، هەروەها بۆ پاراستنی ئاسایشی شارەکەش پشت بەم پۆلیسانە دەبەستێت کە لە ژێر فەرماندەی (مستر روبنز) دا بوونە و ژمارەیان (٣٥) پۆلس بووە، لە لایەکی تریش خەریکی مەشق پێکردنی نزیکەی (١٥٠) پۆلیسی تر بووە لە لایەن عەریف (کینارد)، کە دواتر ئەم ئەرکە دەدرێت بە عەرەبێکی سووری، بە ناوی (سەید عەلی ئەفەندی)[١٧]. جێگای ئاماژەیە کە ئینگلیزەکان هەر لە سەرەتای هاتنیان بۆ هەولێر هەوڵی چاندنی تۆوی دووبەرەکییان لە نێوان خەڵکی شارەکە داوە و هەوڵیان داوە بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتیان سوود لە کەمە نەتەوەیی و ئاینییەکان وەربگرن[١٨]، لە کاتی بۆنە تایبەتەکاندا جێگری حاکمی سیاسی بە جیا پێشوازی لە چینەکانی هەولێر کردووە بە تایبەتی (مەسیحی و یەهودی) یەکان[١٩].

لە رووی کارگێڕیشدا دوای وەرگرتنی شارەکە ئینگلیزەکان دەستیان کرد بە رێکخستنەوەی کاروبارەکان و هەمان دام ودەزگاکانی عوسمانییان هێشتەوە و لەسەر هەمان سیستەمی بەڕێوەبردن کە لە شارەکەدا هەبوو و هۆکارەکەشی دەگەڕایەوە بۆ رێک و دورستی دەزگاکان و ئەرکەکانیان و داوایان کرد کە فەرمانبەرەکان بگەڕێنەوە سەر کارەکانیان و مووچەیان بکرێتە دوو ئەوەندەی کە وەریان گرتووە[٢٠]، هەروەها هەر بە مەبەستی رێکخستنەوەی کاروبارەکان (ئەحمەد عوسمان) کە ئەرکی سەرۆکی شارەوانی پێدرا بوو، لە هەمان کاتدا کرا بە جێگری یاریدەدەری حاکمی سیاسی و متمانەیان پێ بەخشی بۆ پشتگیری کردنی ئینگلیزەکان لە بەڕێوەبردنی کارەکانیان لە هەولێر[٢١].

کابتن (های) لە کاتی پشوی فەرمیشدا کە رۆژانی (هەینی و یەکشەممە) بوو، پێشوازی لە ناودارەکانی شار دەکرد و گفتوگۆی لە سەر کارەکان لەگەڵدا دەکردن و بیروراکانیان دەخستە روو، ئەمەش لە شێوەی ئەنجومەنێکدا بووە، دیارترینی ئەم کەسانەی ئەنجومەنەکەش (مەلا فەندی، سەید عەبدوڵلا پاشا، محەمەد ئەفەندی موفتی هەولێر، عەلی پاشا، حاجی رەشید ئاغا) بوون[٢٢].

ئەم بارودۆخە تا رادەیەک جووڵانەوەیەکی هێنا کایەوە وەک دەستکردنەوە بە کاروباری حکومەت و گەڕانەوەی فەرمانبەران بۆ سەر کار و کردنەوەی ئەم قوتابخانانەی کە بە هۆی شەڕەوە داخرابوون[٢٣]. بەڵام سەبارەت بە یاساکانی دەوڵەت لە سەر هەمان ئەم یاسایانە مانەوە کە لە سەردەمی عوسمانییەکان پەیڕەو دەکران بەرەچاوکردنی شەرعیەتی ئیسلامی بە تایبەتی لە کێشە دادوەرییەکان[٢٤]، بەڵام کاروباری کارگێڕی و سیاسی شارەکە بە پێی بڕیارەکانی (ویلسن) حاکمی سیاسی لە بەغدا بەڕێوە دەچوو. بەم جۆرە هەولێر لە قەزایەکی سەر بە لیوای کەرکوک بوو بە یەکەیەکی ئیداری سەربەخۆی سەر بە بەغدا، لە رووی سەربازیش دوای وەرگرتنی شارەکە لە لایەن ئینگلیزەکان تیپێکی سەربازییان هێنا کە زۆربەیان

(هیندی ســـیـغی) بوون، جگە لەم هێزەش بە مەبەستی بەهێزکردنی ڕەوشی ئاسایشی شارەکە، گەورە پیاوانی ناوچەکانی (حەریر و شەقڵاوە و مەخمور) دەکاتە فەرمانبەر لە ناوچەکانی خۆیان بە پلەی (قائیمقام و بەڕێوەبەری ناحیە)[25].

هەر چەندە پێش هاتنی ئینگلیزەکان بۆ هەولێر دوای هاتنیشیان هەوڵی ئەوەیان دەدا کە هەموو ناودار و ئاغاکانی هەولێر بە لای خۆیان ڕاکێشن، بە مەبەستی دوور خستنەوەی گیانی بەرگری و دژایەتی نەکردنی ئینگلیز لە شارەکە. وەک لە بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا دەردەکەوێت (سەید تەها نەهری) لە ڕێگای چوونی بۆ بەغدا لە سەر داوای حاکمی سیاسی ئینگلیز لە بەغدا، سەردانی هەولێر دەکات و لە ماڵی (مەلا فەندی) کۆبوونەوەیەک لەگەڵ ئاغاکان و ناودارانی هەولێر دەکات و داوایان لێ دەکات کە داواکارییەکانی ئینگلیز جێبەجێ بکەن لە شارەکەدا، بەڵام ئامادەبووانی کۆبوونەوەکە زۆر بەتوندی دژی هەڵوێستەکەی (سەید تەها) دەوەستن[26]. هەر بۆیە هەوڵەکانی ئینگلیز سەری نەگرت وەک ئەوەی کە دەیانویست، چونکە هەندێک لە کەسایەتی و ئاغاکانی هەولێر ئامادەی ئەوە نەبوون کە بێنە ژێر ڕکێفی فەرمانڕەوایی ئینگلیز بەڵکو هەر لە سەرەتای هاتنیان بە داگیرکەری شارەکەیان داناون و ئامادە نەبوون هیچ جۆرە یارمەتی و مووچەیەک لە ئینگلیز وەربگرن، لە



هەمان کاتیشدا بیرۆکەی دروستکردنی کۆمەڵەی بەرگریکردن لە لایان گەڵاڵە ببوو، دیارترینیان ئەو کۆمەڵەیە بوو کە بۆ دژایەتیکردنی ئینگلیز لە هەولێر لە لایەن (حاجی ڕەشید ئاغا) دامەزرێندرا، هەر چەندە وەک ڕێکخراوێکی سیاسی خاوەنی پەیڕەو و پرۆگرامی نەخشە بۆ کێشراو نەبووە[27] بەڵام ئامانج و ئەرکی سەرەکییان دژایەتی ئینگلیز بووە و دان نەنانیان بە شەرعیەتی حوکمی ئینگلیز لە هەولێر، سەبارەت بەو کەسانەش کە لەم بوارەدا هاوبیروڕا بوون (عەتائوڵلاغای کوڕی حاجی ڕەشید ئاغا) کە ڕۆژانە خەریکی بڵاوکردنەوەی پروپاگەندە بوو دژی ئینگلیزەکان و (عەلی پاشا دوغرەمەچی و ئەحمەد پاشا دزەیی و پیرداود ئاغای دزەیی)[28]، دەتوانین بڵێین لە بەر ئەوەی ئەو کەسانەی لەم کۆمەڵەیە بوون لە ئاغاکانی هەولێر و ناوچەکانی دزەیی بوونە، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە خەڵکێک لە ناوەوەی هەولێر و ناوچەکانی دەردوەی هەولێر لەگەڵ ئەم ڕێکخراوەدا کار بکەن دژ بە ئینگلیز، لە لایەکی تریش دەکرێت بوترێت خەڵکی ڕەسەنی هەولێر بەدرێژایی مێژووی شارەکە دژی داگیرکردنی شارەکە بوونە.

هەر چەندە چالاکی ڕووبەڕووبوونەوە لە نێوانیان ڕووی نەدا، بەڵام کۆبوونەوەی نهێنی لە نێوان ئەندامەکانی ئەم کۆمەڵەیە بارودۆخی شارەکە و چۆنیەتی کارکردن لە دژی داگیرکەرانی ئینگلیز دەکرا لەبارەی، یەکێک لە شوێنەکانی کۆبوونەوەکانیان مزگەوتی شێخی چۆلی بووە کە لەم کاتدا شوێنێکی چۆل بووە، بە مەبەستی ڕێگا گرتن لە چالاکی و کۆبوونەوەکانی دژ بە داگیرکەری ئینگلیز، ژمارەیەک لە مزگەوتەکانی هەولێر داخران کە ژمارەیان نزیکەی (١٠) مزگەوت دەبوو بە بیانووی ڕێگا گرتن لە بڵاوبوونەوەی نەخۆشی[29].

دوای گەڕانەوەی کابتن (های) بۆ هەولێر و وەرگرتنی پۆستی یاریدەدەری حاکمی سیاسی، بارودۆخی هەولێر بەم جۆرە نەبوو کە

دەیانویست، بڵاوكردنەوەی نارەزایی وپروپاگەندەكردن دژ بە بوونی ئینگلیز لە شارەكە بەردەوام بوو[٣٠]، گەلێك لە ئینگلیزەكان كە هاتنە ناوچەكانی عێراق و لەوانەش هەولێر ویستیان بێ ئەوەی گوێ بدەنە داب و نەریتی ئاینی و نەتەوەیی تەنانەت هۆزایەتی ناوچەكە چۆن بیانەوێت وا رەفتار بكەن لەم بارەیەوە چەندین نمونە هەن كە لە شوێنە جیاجیاكانی عێراق ئەنجام دراون، بەڵام سەبارەت بە شاری هەولێر ئینگلیزەكان رێگەیان بە زۆر كەس دا نەك تەنها مەی و مەیخانە دابمەزرێنن، بەڵكو تیاترۆیەكیشیان دانا كە شوێنی تایبەتی تێدا هەبووە بۆ كاری رابواردن، كە ئەمەش یەكەمین جار بوو شوێنێكی ئاشكرا و تایبەت لە هەولێر دابمەزرێت[٣١]، لە تەمموزی ١٩١٩ كاتێك ئینگلیزەكان بۆ بەسەربردنی كاتی شەو خەریكی یاری و رابواردن بوونە. لەم تیاترۆیەی كە دایانمەزراندبوو، چونكە پێش داگیركردنی ئینگلیز لە هەولێر ئەم جۆرە شوێنە تایبەتیانە بە ئاشكرا نەبووە، (یونس سەعید ئاغا) و چەند كەسێك لە هاورێكانی ئامادەی ئەم شوێنە دەبن، هەر بۆیە لەم كاتەی كە پەیوەندیان لەگەڵ ئینگلیزەكان تێك دەچێت و ئینگلیزەكان هەوڵی ئەوە دەدەن كە دەستدرێژی بكەنە سەریان، بەڵام ئەمان ئەمە قەبوڵ ناكەن و لە ئەنجامی رووبەرووبوونەوەیان یەكێك لە پیاوانی ئینگلیز بە ناوی (میپوین) ؟؟؟ دەكوژرێت و عەریف (كینارد) بریندار دەبێت لەگەڵ (یونس ئاغا)[٣٢]. سەبارەت بەم رووداوە لە ١٤ی ئابی ١٩١٩ لقی موسڵی (كۆمەڵەی عەهد)(*) نامەیەكی تایبەت دەنێرێتە شام كە بارەگای بەرزی كۆمەڵەكەی لێ بووە و ئەم هەواڵە لە بارەگاكەی رادەگەیەنێت لەبارەی رەفتارەكانی ئینگلیز لە هەولێر تێیدا هاتووە:

"... بەر لە چەند رۆژێك ئینگلیزەكان لە هەولێر سەعید ئاغا و كورەكەی و ژمارەیەك هاورێیانیان بە تۆمەتی كوشتنی چاوەشێكی ئینگلیز و بریندارکردنی دوو پۆلیس و دوو جەندرمە گرت، یەكێك لە پۆلیسەكان ئینگلیزی و ئەوی تریان عێراقییە، هەروەها ژمارەیەك لە پیاوەكانی سەعید ئاغاش بریندار بوون، ئەو هەرایە لە سەر ئەوە بوو كە رۆژێك لەوە پێش چاوەشەكە لە تیاترۆ لە كوری سەعید ئاغای داوە و گەلێك جنێوی ناشرینی پێداوە.... "[٣٣].

كابتن (های) خۆی بە مەبەستی بە دواداچوون لە رووداوەكە هەوڵی لێكۆڵینەوە دەدات، دوای پشكنینی ئەم ماڵانەی كە شوێنی گومان دەبن لە لای ئینگلیزەكان (یونس ئاغا) بە بریندار لە رۆژی ١٠ ی تەمموز دەستگیر دەكەن، هەروەها (ئەحمەد ئەفەندی) روو لە ناوچە چیاییەكان دەكات و دەستگیر ناكرێت. بەڵام سەبارەت بە چارەنووسی (عەبدوڵڵا ئەفەندی) كە خەڵكی كۆیە بوو، بە هۆی دۆزینەوەی دەمانچەیەك لە ماڵەكەی لە كاتی پشكنیندا تاوانباریان كرد كە بكوژی (میپوین) ە، هەر بۆیە فەرمانی لەسێدارەدانی دەدرێت لە مانگی ئەیلول سزاكەی جێبەجێ دەكرێت، كە لە راستیدا تەنها ئامادەی شوێنەكە بووە، هیچ پەیوەندی بە كوشتنی (میپوین) نەبووە و (سەعید ئاغا) حوكمی (٥) ساڵ و (یونس ئاغا) ش حوكمی هەتا هەتایی بە سەردا دەدرێت[٣٤]، كە دوای دامەزراندنی حكومەتی كاتی عێراق بە سەرۆكایەتی (عەبدولرەحمان نەقیب) فەرمانی لێبوردنیان بۆ دەردەچێت و ئازاد دەكرێن[٣٥].

هەولێر لە سەردەمی ئینگلیزدا جۆرە پێشكەوتنێكی بەرچاوی بە خۆوە نەدیوە، بەڵام لە رووی كارگێڕیدا دوای ئەوەی (مستر بل) حاكمی سیاسی موسڵ پێشنیاری ئەوەی كرد كە هەولێر بكرێت بە (موتەسەرفییە) و هەردوو قەزای (كۆیە و رەواندز) لە خۆ بگرێت، كابتن (های) بە یاوەری سەرۆكی شارەوانی (ئەحمەد عوسمان)، چوونە بەغدا بۆ ئەوەی ئەم پێشنیارە بخەنە بەردەم (ویلسن)ی حاكمی سیاسی، كە لە سەرەتادا رەزامەندی لە سەر دەرنەبری، بەڵام دواتر بریار درا كە ببێتە موتەسەرفییە بەم جۆرە لە ١ی تشرینی دووەمی ١٩١٩ هەولێر بووە موتەسەرفییە[٣٦] و (ئەحمەد عوسمان) بوو بە یەكەم موتەسەرفی هەولێر[٣٧].

جێگای ئاماژەیە ئینگلیزەكان لە نێوان ساڵانی ١٩١٨-١٩٢٠ سیاسەتێكی روون و ئاشكرایان نەبوو بەرامبەر بە ناوچە كوردییەكان بە گشتی و هەولێریش بە تایبەتی، ئەمەش ببووە هۆی پیادەكردنی سیاسەتێكی تێكگیراو و ئاڵۆز دژ بە یەك، هەروەها (ویلسن) حاكمی

سیاسی گشتی لە عێراق هەمان ئەو سیاسەتەی پەیڕەو دەکرد کە لە وڵاتی هیند پیادەی دەکرد[٣٨]، دەتوانین بڵێین لە هەولێریش هەر لە سەرەتای هاتنیان هەوڵی چەسپاندنی دەسەڵاتی خۆیان دەدا و گەران بە دوای دروستکردنی بنکەیەکی بەهێز کە بتوانن لە سەری بوەستن و پەیرەوکردنی سیاسەتێکی شاراوە لە دانیشتوانەکەی و هەوڵدان بۆ دروستکردنی هێزێکی کوردی سەر بە ئینگلیز لە هەولێر کە فەرمانەکانیان جێبەجێ بکات.

بە پێی بروسکەیەکی وەزیری دەرەوەی بەریتانی کە ئاراستەی مەندوبی سامی لە بەغدا کراوە بە ژمارەی (٧٤٩٥) لە ڕێکەوتی ٢٢ی تشرینی دووەمی ١٩١٩ تێیدا هاتووە کە سیاسەتی بەریتانییەکان تا ئەم لە هەولێر و کوردستان بە گشتی سیاسەتێکی چارەنووساز نەبووە، چونکە هیچ جۆرە بڕیارێکی لەبارەی ناوچەکە دەرنەکردووە، چونکە وەک لەم بروسکەدا هاتووە کە تا ئەو کاتەش خەریکی هەڵسەنگاندنی ڕەوشەکەن بەڵام ئەوەی بە ڕوونی تێیدا دەردەکەوێت، ڕێگا نەدانە بە گەڕانەوەی تورک بۆ هەولێر.کە بە بیروڕای (میجەر نوئێل) ئەم سیاسەتەش ئەو کاتە جێبەجێ دەبێت کە کوردستان دابەش بکرێت وەدەسەڵاتی تورک دوور بخرێتەوە و کێشانی هێڵی سنووری نێوان کورد و عەرەب[٣٩].

جێگای ئاماژەیە کە بیروڕاکانی نوئێل لەمەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئەگەر کورد کاروباری خۆیان بەڕێوە



ببەن، ئەوا پێویست بە هاندانیان ناکات کە دژایەتی تورک بکەن یان یارمەتی بدرێن، بەڵام دابەشکردنی وڵاتەکەیان دەبێتە هۆی بزواندنی هەستی نەتەوایەتی ودژایەتیکردنی ئینگلیز کە ئەمەش کاردانەوەی لە ناوچەکانی تر دەبێت.هەر بۆیە دیاریکردنی سنوورێک پێویستە لە نێوان کورد و عەرەب بە جۆرێک کە هەولێر بکەوێتە لای کورد و کەرکووک و ئاڵتون کۆپری بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی ئینگلیز[٤٠].

سەبارەت بە وەڵامی مەندوبی سامی لە بەغدا لەبارەی پێشنیارەکان وای دەردەخات کە دابەشکردنی کوردستان هیچ گرنگییەکی نییە بە بەڵگەی ئەوەی کە کوردستان لە ماوەکانی پێشوودا هیچ کاتێک یەکگرتوو نەبووە و سەبارەت بە هەولێر ئەوە دەردەخات کە دانیشتوانی هەولێر هیچ جۆرە شتێکی هاوبەشی نییە لەگەڵ شاری سلێمانی و ناوچەکانی تر، تەنها چەند شتێکی کەم نەبێت، بەڵام جێگای ئاماژە پێکردنە کە مەندوبی سامی لە ڕوونکردنەوەکەی سەبارەت بە هەولێر تا ڕادەیەک چەواشەی

ڕاستییەکان دەکات کە زۆربەی دانیشتوانی هەولێر بە تورک دادەنێت کە دەڵێت:

"... دانیشتوانی هەولێر کە زۆربەیان بە زمانی تورکی قسە دەکەن بەڵام هیچ کردارێک و مەیل و ئارەزوویەکیان تێدا دەرنەکەوتووە کە حەز بە جیابوونەوە لە عێراق بکەن..."[٤١].

دەکرێت بڵێین ئەم بیروبۆچوونەی مەندوبی سامی لە دوو لایەنەوە سەرچاوەی گرتووە. هەر چەندە خۆی سەردانی هەولێری نەکردووە تا ئەو کاتەی کە ئەم بیروڕایە دەردەخات، بەڵام حاکمی سیاسی (هی) لە هەولێر وە پیاوەکانیان ڕادەی تێکەڵبوونیان لەگەڵ تەواوی خەڵکی شارەکە ببووە نزیکترین شوێنی بەیەکگەیشتنی ئەو کەسانەی کە هاتوونەتە هەولێرو خەڵکی هەولێر (خەڵکی بازاڕەکە) وە کە زۆربەی خاوەن دوکانەکان بە زمانی تورکی قسە دەکەن و ئەمەش نابێتە پێوەر بۆ ئەم بیروڕایە دووەمیان هیچ جۆرە ڕاپرسییەک نەکراوە، ئەمە دەریخات کە ئایا لەگەڵ مانەوەیانن لەگەڵ عێراق یان دەیانهەوێ دەوڵەتی کوردی دابمەزرێنن. سیستەمی بەڕێوەبەرایەتی زەوی و یاساکان لە هەولێر لە بنەڕەتدا لە بەغدا دەردەچوون و بەشی زۆری دانیشتوانی شارەکەش لە دانیشتوانی ڕەسەنن و نیشتەجێی ئەم شارەن، نەک پێکهاتەی هۆزە گەڕۆکەکان بن کاتێک ڕاپەڕینەکانی شاری سلێمانی سەری هەڵدا هەروەها ناوچەکانی سەرووی موسڵ هیچ جۆرە

هاوسۆزییەک بەدی نەکراوە لە لایەن خەڵکی هەولێرو ئەم ناوچانە، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە هەولێر جۆرە تایبەتمەندییەکی جیاوازی هەیە لەگەڵ ناوچەکانی تری عێراق[٤٢]، مەندوبی سامی لەبارەی بارودۆخی هەولێرو سلێمانی گفتوگۆی لەگەڵ (ئەحمەد بەگ) کرد لەسەر پێشنیارەکانی (میجەر نوئێل) کە دانیشتوانی ئەم دوو ناوچەیەش مافی خۆیانە کە خاوەنی حکومەتێک بن و کوردەکانی هەولێر ئامادەییان تێدایە بۆ بەرەو پێش چوون و پێشکەوتن[٤٣].

وەزارەتی هیندی لە بروسکەی ژمارە (٧٧٠١) لە ٢٠ی کانونی یەکەمی ١٩٢٠ کە ئاراستەی وەکیلی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانی کردووە لەبارەی هەولێر تێیدا هاتووە، سەبارەت بە بەشدار بوونی هەولێر لە دەوڵەتی کوردستانی خواروو یان هاتنی بۆ ناو دەوڵەتی عێراق ئەوا ئاغاکانی هەولێر بڕیاری لە سەر دەدەن، لە هەمان کاتیشدا عەقید (لیچمان) بە بیروڕای خۆی وای دەردەخات کە لەگەڵ دەوڵەتی عێراقدا دەمێننەوە[٤٤].

جێگای ئاماژەیە کە (سی. ای. راندول) جێگری حاکمی سیاسی بەریتانی لە کۆیە لە نووسراوێکی ڕۆژی ٧ی مارسی ١٩٢٠دا کە ئاراستەی ئەفسەری سیاسی ئینگلیز لە هەولێر دەکات، ئەوەی تێدا دەردەخات کە حاکمی شەرعی کۆیە (مەلا محەمەدی گەورە)و جێگرەکەی (جەمیل ئاغا) پێشنیاری ئەوە دەکەن کە یەکێک لە بنەماڵەی بابانییەکان کە خاوەن ڕێزن لە ناو خەڵکی کوردستاندا دابندرێت وەک حوکمدار بۆ کوردستان تەنانەت مەلای گەورە کەسایەتی (حەمید بەگی بابانی) دەستنیشان دەکات، ئەشرافەکانی هەولێریش سەبارەت بە پێشنیاری مەلای گەورەی کۆیە هاوبیروڕا بوون و پێیان وابوو کە لە بەرژەوەندی کوردا کار دەکات[٤٥]، هەروەها دەسەڵاتی ئەم حوکمدارەش بە سەر لیواکانی هەولێر و سلێمانی و کەرکوکدا هەبێت ئەگەر دانیشتوانی ئەم لیوایانە ئارەزوویان هەبێت وەدەبێت پێش دانانی (حەمید بەگ) ڕاوێژ بە ئەشرافەکانی ئەم لیوایانە بکرێت ورایان وەربگیرێت[٤٦].

جێگای ئاماژەیە لەم کاتەی کە پێشنیارەکان و بیروڕا جیاوازەکان دەردەکەوتن لەبارەی دواڕۆژی کورد و چارەنووسی هەولێر لە نێو سیاسەتی ئینگلیز بیرۆکەی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردستان و دەوڵەتی عێراق هەروەها ئەگەرەکانی کشانەوەی هێزەکانی ئینگلیز لەم ناوچانە، سەرۆک هۆزەکان لە هەولێر شان بە شانی سەرۆک هۆزەکانی تر لە موسڵ و سلێمانی بروسکەیەکیان ئاراستەی مەندوبی سامی کرد لە بەغدا بە ژمارەی ٨٠٢٠ ڕۆژی ٣ی تەموزی ١٩٢٠ کە واژووی ٦٢ کەسی بەسەرەوە بوو کە داوایان کردبوو کە دەوڵەتی کوردستان لە ژێر چاودێری ئینگلیز دابمەزرێن کە لەگەڵ عێراقدا بێت و هەمان مامەڵەی ئینگلیز بەرامبەر بە عێراق چۆن هەمان مامەڵەش لەگەڵ ئەم حکومەتەدا بکرێت وەک لە ناوەرۆکی بروسکەکەدا هاتووە:

"... ئێمە سەرکردەکانی گەلی کورد ڕەغبەتمانە لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ لە وڵاتەکەمان و لە ژێر وصایەی بریتانی بێت و هەمان مامەڵە بکات لەگەڵ ئەم دەوڵەتەی کە چۆن لەگەڵ عێراق دەیکات، لە سەر بنەمای بەرژەوەندی هاوبەش و ڕێساکانی ناوچە کوردییەکان بگەڕێتەوە بۆ ئەو دەستوورەی کە پێمان دەدرێت و پەیمان دەدەین کە هەڵسوکەوتمان بەردەوام لە سەر ڕەغبەتی حکومەتی خاوەن شکۆ دەبێت..."[٤٧].

بە پێی ئەم بروسکەیەش ئەمەمان بۆ روون دەبێتەوە کە تێکڕای دانیشتوانی ناوچەکانی کوردستان بە گشتی و هەولێریش بە تایبەتی ئەگەر لە کاتی ڕاپەڕینەکاندا کە لە شوێنە جیاوازەکانی کوردستان ئەنجام دەدرا و هۆکارەکانیان لە ناوچەیەک تا ناوچەیەکی تر جیاوازییان هەبوو و لە هەندێ خاڵیشدا هاوبەش بوون. ئەگەر چی هیچ جۆرە بەیەکەوە بەستن و هاوکارییەک لە نێوان هەولێر و ناوچەکانی تردا نەبووبێت، بەڵام لە کاتی چارەنووسی هەموو نەتەوەی کورد لە چوارچێوەی وڵاتێکدا هاودەنگ و بیروڕا بوون. دەکرێت بڵێین ئەم هەڵوێستەش هەموو ئەم بیروباوەڕانە ڕەت دەکاتەوە کە شاری هەولێر هەوڵی مانەوەی داوە لەگەڵ عێراق یان دژایەتی ئینگلیزی بە مەبەستی گەڕانەوەی تورک کردووە.

حکومەتی بەریتانیا دوای هەرەس پێهێنانی دەسەڵاتی (شێخ مەحمود) لە تەواوی کوردستان پەنای

برده بەر دەسەڵاتی راستەوخۆ، کاپتن (هی) لە هەوڵی بانگەوازی سەربەخۆییدا بوونە و هەوڵی زیندووکردنەوەی دەسەڵاتی ناوەندی لە هەولێردا دەدا لە دوای چەند گۆڕانکارییەک لە سەر هەمان رۆژگاری دەسەڵاتی ئیتحادییەکانی تورکیا لە هەولێر، هەر لەم بارەیەوە (مێجەر سۆن) دەڵێت:

" لە سەرمان پێویستە ئەگەر بمانەوێت حوکمی هەولێر بکەین بە تەنها بە ئەوەندە لێنەگەڕێین بەڵکو دەبێت حوکمی رواندزیش بکەین، سەیری کورد دەکەم ئەو قەناعەتەم لا دروست دەبێت نە ویستوویانە و نە شایستەن بە حوکمی زاتی.."[48].

دەتوانین بڵێین رووداوەکانی نێوان ساڵانی ١٩١٨ تا ١٩٢٠ لە هەولێر ئەوە دیار دەخەن کە سیاسەتی بەریتانیا لە شارەکە، لە سەر بنەمایەکی راست و دروست نەبوو لە مامەڵەکردنیان لەگەڵ خەڵکی شارەکە و ئەو پەیمانانەی کە بە کوردیان دا، بە تایبەتی دوای ئەوەی کە دەسەڵاتە کوردییە ناوخۆییەکانی ناوچەکانی تریان لە ناوبرد و سیستەمی حوکمڕانی راستەوخۆیان پیادە کرد ئەمە سەرەڕای جیاوازی بیروڕاکانی نێوان دانیشتوان و گروپی بەرگری لە هەولێر لەگەڵ ئینگلیز و جیاوازی بیروڕا لە نێوان وەزارەتەکانی (دەرەوە و هیندی و داگیرگەکان) لە نێوان خۆیاندا، بۆیە دەتوانین بڵێین بۆچوونەکانی ویلسن و حکومەتی بەریتانی تووشی دەستەوەستان بوون، بەرامبەر تەوژمی هەڵگەڕانەوەی خەڵکی هەولێر لە دژیان و تۆمارکردنی مێژووەکی گرنگ لە شارەکە.

### هەڵوێستی هەولێر لە داگیرکردنی ئینگلیزدا

دوا بە دوای وەرگرتنی شارەکە ئینگلیزەکان بە مەبەستی رێکخستنەوەی کاروباری بەڕێوەبردنی شارەکە بانگەشەی سەرجەم فەرمانبەرەکانیان کرد کە بگەڕێنەوە سەر کارەکانیان و بڕیاریان دا کە مووچەکانیان بکرێتە دوو ئەوەندەی پێشوو[49]، ئەم سیاسەتەی ئینگلیز لەمەوە سەرچاوەی دەگرت کە وا دەربخات کە مەبەستیان رزگاربوون وخۆشگوزەرانی خەڵکەکەیە و هەروەها هەوڵی ئەوەیان دەدا کە گیانی بەرگری کەم بکەنەوە و رەوشی شارەکە بەرەو ئارامی ببەنەوە، بەڵام وەک لە بەڵگەنامەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا دەردەکەوێت، بەر لە هاتنی ئینگلیزەکان گیانی بەرگریکردن لە شارەکەدا هەبوو[50].

جێگای ئاماژەیە لە سەردەمی حوکمڕانی دەوڵەتی عوسمانیدا بە تایبەتی لە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا، ئەو هێزانەی کە ئاسایشی شارەکەیان دەپاراست لە دوو هێز پێکهاتبوو یەکەمیان ئەم هێزە سوپاییە بوو کە لە ژێر فەرماندەی (خەلیل پاشا) و ئەفسەرێکی قەفقازیدا بوو و حامییەکەیان لە رۆژئاوای شار بوو، دووەمیان هێزی پۆلیس بوو، کە ژمارەیان کەم بوو، بەشێکیان لە خەڵکی هەولێر بوون و بەشێکیش تورک بوون. پۆلیسە تورکەکان لەگەڵ فەرمانبەرە تورکەکان لە کاتی کشانەوەی ئیدارەی دەوڵەتی عوسمانی لە هەولێر ئەوانیش شارەکەیان بەجێهێشت. تەنها پۆلیسەکانی هەولێر مانەوە کە ژمارەیان زۆر کەم بوو[51].

ئینگلیزەکان بە مەبەستی پتەوکردن و چەسپاندنی دەسەڵاتیان لە هەولێر، متمانەیان خستە سەر ئەو سەرۆک هۆزانەی کە بەرژەوەندییەکانیان دەپارێزن و بڕێک پارەیان تەرخان کرد کە وەک مووچە مانگانە پێیان بدەن بەرامبەر بە دڵسۆزییان بۆ ئینگلیز[52]، لە لایەکی تر متمانەیان کردە سەر ئەو سوپایەی کە ئینگلیز لە شارەکە هەیبوو کە پێکهاتبوو لە فەوجێکی سەربازی (هیندی) کە دوای دەرچوونی سوپای عوسمانی لە شارەکە بە هەفتەیەک هاتبوونە هەولێر، وەک سەرچاوەیەکی تر بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتیان (٥٣)، بەڵام سەبارەت بە هێزی پۆلیس لە شارەکە، کە ژمارەیان کەم بوو، بریتی بوون لە وانەی کە لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی هەبوون و دوای داگیرکردنی شارەکەش ئینگلیز سیستەمێکی نوێی پۆلیسی دانا[54]، بە تێپەڕ بوونی کات ژمارەیان بەرەو زیادبوون چوو، ئەم هێزەش بە ناوی (هێزی لیڤی) ناو دەبردرا و لە هەولێر لە ژێر فەرماندەیی (نەقیب لیتلدیل) بوون. سەرچاوەی سەرەکی پاراستن و چەسپاندنی دەسەڵاتی ئینگلیز لە شارەکە و سەرچاوەی هێزی بەرگری و وەستان دژی نەیارانی ئینگلیز بوو، جێگای ئاماژە پێکردنە کە ئەم هێزە سەرەتای دروستبوونی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی

١٩١٥ز لە رووی ژمارەشەوە زۆر کەم بوو، بە ناوی (خیالة العرب) دەناسرا، چونکە رەگەزی عەرەب تاکە رەگەزی پێکهاتەی ئەم هێزە بوو، بەڵام لە ساڵی ١٩١٨. ژمارەیان گەیشتە هەزاران چەکدار و ناوەکەشی بوو بە (الشبانە)، لەم کاتەشدا بەشداری کورد لەم هێزە دەرکەوت و خەڵکی هەولێریش لە ژێر فەرماندەی سەرۆک هۆزەکان لەم هێزە بەشدارییان کردووە، کە ئامانجی سەرەکی پاراستنی دەسەڵاتی ئینگلیز و شکۆمەندی ئینگلیز بوو لە هەموو ناوچەکانی عێراق[٥٥].

هەولێر شارێکی تا رادەیەک هێمن بوو، بەڵام شارێک نەبوو کە بە ئاسانی کارگێری ئینگلیز تێیدا بچەسپێ وکاروباری بەرێوە ببەن چونکە دەتوانین بڵێین ماوەی سەدان ساڵ لە حوکمڕانی تورک لەم شارە، هەڵبەت ببووە هۆی دروستکردنی پێگەیەک و لایەنگرانی. ئەمجار چ ئەوانەی لە رێگای پلەو پایە و پاداشتەکانەوە بۆیان، یان بە هۆی ئاینییەوە کە خەڵکیان وا تێگەیاندبوو، بە تایبەتی کەسانی سادە و ساکار کە دەوڵەتی عوسمانی تەواوکەری گەیاندنی پەیامی ئیسلام و پاراستنێتی، بەڵام لە راستیدا و بە تایبەتیش دوای کودەتای ئیتحادییەکان لە ساڵی ١٩٠٨. راگەیاندنی دەستووری عوسمانی مەسەلەی نەتەوەیی زیاتر دەرکەوت و مەسەلەی ئاینی گرنگییەکەی پێشووی نەما.

سەبارەت بەسەرەتاکانی رووبەڕووبوونەوە لە نێوان هەولێر و ئینگلیزەکان لە چوارچێوەی نارەزایی دەربڕین لە داگیرکردنی شارەکە و کۆڕ و کۆبوونەوەکان و بڵاوکردنەوەی پروپاگەندە دژی ئینگلیز تێپەڕی نەدەکرد، دەکرێت بڵێین قۆناغێکی هێمنانە و نەهێنی بوو[٥٦]. بەڵام ئەم شێوازەش بەردەوام نەبوو، بەڵکو لە سەرەتاکانی ئابی ١٩٢٠ گەیشتە رادەی ئاشکرابوون و هەوڵدان بۆ دەرکردنی ئینگلیز لە شارەکە[٥٧]، بەڵام سەبارەت بە هۆکارەکانی ئەم رووبەڕووبوونەوە، سەرەڕای بیرۆکەی بەرگری لە شارەکە هەندێک پەیوەست بوو بە هەڵسوکەوتی ئینگلیزەکان لە هەولێر و نارەزایی بوون لێیان لە لایەکی تریشەوە هاوکات بوو لەگەڵ ئەم پەشێوییەی کە ناوچەکانی تری کوردستانی گرتەوە و شۆڕش دژی ئینگلیز لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان و خواروو و ناوەڕاستی عێراق دەستی پێکرد[٥٨] کە رەنگدانەوەی ئەم واقیعە بوو کە گەلی کورد لە کوردستان و گەلی عەرەب لە ناوەڕاست و خوارووی عێراق لە ژێر سایەی ئینگلیز و بەڵێنەکانی تێیدا دەژیان.

سەرەتاکانی راپەڕین دژی دەسەڵاتدارانی ئینگلیز لە کوردستان لە ناوچەی بادینان دەستی پێکرد، دوای ئەوەی هۆزی (کۆیان) لە ئاداری ١٩١٩ لە زاخۆ دژی ئینگلیز راپەڕین و لە شارەکە دەریان کردن، کە ببوە رێخۆشکردن و هاندان بۆ ناوچەکانی تر و لە ٤ی نیسانی هەمان ساڵدا لەلایەن کۆمەڵە چەکدارێک بە هاندانی سەرۆک عەشیرەتێک بە ناوی (حسو دینو)[*] توانییان جێگری حاکمی سیاسی لە شارەکە (بیرسن) بکوژن[٥٩]، دواتر هۆزەکانی (سندی، کلی، سورچی، سلیڤانی، قشوری، زێباری) دەستیان بە جموجۆڵ دژ بە ئینگلیزەکان کرد و ناچاریان کردن کە شوێنەکانیان جێ بهێڵن و لە شارەکانی تر خۆیان قایم بکەن، بەرامبەر هەر رووبەڕووبوونەوەیەکی راستەوخۆ، شۆڕشگێڕەکان لە شاری ئامێدی کاپتن (ویلی) و مولازم (ماکدونالد) یان کوشت و دەستیان بەسەر شارەکەدا گرت[٦٠]، لە شاری کۆیەش بارەکە بەرەو خراپی چوو تا گەیشتە رادەی ئەوەی کە جێگری حاکمی سیاسی کاپتن (ف ـ س ـ کیرک) شارەکە جێ بهێڵێت[٦١]. لە شاری سلێمانیش بە فەرمانی شێخ مەحمودی حەفید لە ئایاری ١٩١٩ سەرۆک هۆزی هەورەمان (مەحمود خان دزڵی) ئاڵای ئینگلیزی لە شارەکە داگرت و لە شوێنیدا ئاڵایەک کە پێکهاتبوو لە پارچە قوماشێکی سەوز کە مانگێکی سووری تێدا بوو بەرز کرایەوە[٦٢]. هەروەها لە ٢٨ ی ئابی ١٩٢٠ ئەفسەری سیاسی ئینگلیز (ج ـ هـ ـ سالمون) کوژرا، جێگری حاکمی سیاسی ئاکرێ (کی ـ سکوت) و حاکمی سیاسی لە موسڵ (مستر بل) لە تشرینی دووەمی ١٩١٩ کوژرا[٦٣]. بەم جۆرە راپەڕین زۆربەی ناوچەکانی کوردستان و عێراقی گرتەوەو چاوەڕوانی شۆڕشێکی سەرانسەری دەکرا.

جێگای ئاماژەیە هەڵگەڕانەوەی کورد بە گشتی لە کوردستان، دژی

دەسەڵاتی ئینگلیز و لە هەولێریش بە تایبەتی سەرچاوەکەی پەیوەندی بە رژێمی پێشووی حوکمڕانی ناوچەکەوە نەبوو، تەنانەت بە بیروباوەڕەکانی عەرەبەکانی دژ بە ئینگلیزیش نەبوو، بەڵام تا رادەیەک کاریگەری ناوچەکان لە سەر یەکتریدا هەبوو، لەژێر بۆچوونی وەستان دژ بەداگیرکردنی وڵات بەڵام سەرچاوەی بەرهەڵستیکردنی داگیرکەران لە هەولێر هەڵوێستێکی ناوخۆیی بوو، چونکە پێش هەموو ناوچەکانی تر، ئەم رووبەڕووبوونەوەی تێدا دەرکەوت(٦٤)، بە بەراورد لەگەڵ ناوچەکانی خوارووی عێراق بارودۆخی هەولێر بە خێرایی بەرەو گۆڕانکاری دەچوو. هەر چەندە چالاکی و جموجۆڵەکان لە هەولێر زووتر روویان دا لەگەڵ ناوچەکانی تر بەڵام نەگەیشتە رادەی هەڵگیرساندنی شۆڕش لە شارەکە کە چەندان هۆکاری تایبەت رۆڵی تێدا گێڕا، بە شێوەیەک رەوشەکە ئاڵۆز بوو کە گۆڕانکارییەکان بە شێوەیەکی خێرا دەهاتنە پێش، بە جۆرێک ئینگلیزەکان نەیاندەتوانی باری سیاسی هەولێر و خوارووی عێراق لێک جیابکەنەوە(٦٤)، جێگای ئاماژەیە پێش دەستپێکرانی شۆڕش لە خوارووی عێراق، نەیارانی ئینگلیز لە هەولێر کەوتنە کۆبوونەوە و دەرکردنی بڕیارەکان و چاودێریکردنی رووداوەکان، ئەم کۆبوونەوانەش کە لەم ماوەیەدا لە هەولێر ئەنجام دەدران، لە سەر ئەم ئامانجە بوو کە داوایان لە سەرجەم نەتەوە و چین و توێژەکانی کۆمەڵگا دەکرد کە رووبەڕووی ئینگلیز بوەستن بێنە ناو بزووتنەوەی دژایەتیکردنی داگیرکەران و چەک لە دژی کافران هەڵگرن(٦٥).

سەبارەت بە هەوڵە کردارییەکانیش لە رۆژی ١٢ ی ئابی ١٩٢٠ کاتێک کابتن (هی) لە رێگای گەڕانەوەی لە رەواندز بەرەو هەولێر دێت لە بۆسەیەکدا لە ناوچەی گەلی عەلی بەگ دەدرێتە بەر دەستڕێژی گوللە و بە شێوەیەکی سەر سوڕهێنەر رزگاری دەبێت لە مردن(٦٦)، بە پێی سەرچاوە مێژووییەکان ئەم بۆسەیە لە لایان شۆڕشگێرانی هەولێر نەخشەی بۆ کێشراوە و بەشێکیش لە نەیارانی ئینگلیز لە شاری رەواندز، لەمانەش (نوری باویل ئاغا وخدر ئاغا) تێیدا بەشدار بوون(٦٧)، بەڵام ئەوانەی لەگەڵ کابتن (هی) بوونە لە کاتی کە هێرشی کراوەتە سەر (مستەفا ئاغا و عەلی ئەفەندی و کوێخا عەبدوڵڵا و مەجید و کانەبی) بوونە، پێش گەڕانەوەشی پەیوەندی بە پیاوەکانی لە هەولێر دەکات بۆ ئەوەی یارمەتی بدەن، کابتن (هی) لەم بارەیەوە دەڵێت:

"... پەیوەندیم لەگەڵ هەولێر کرد و داوام کرد کە سەید عەلی و کۆمەڵێک لە پۆلیسەکان و کۆمەڵێک لە سوار چاک بێنن، لە ئێوارەی هەمان رۆژ بە سوار لەگەڵ مستەفا ئاغا گەیشتمە شەقلاوە... کۆمەڵێک لە خەڵکی شەقلاوە پێشوازییان لێکردم وپیرۆزباییان لێ کردم... "(٦٨).

هەروەها چەند جارێک هەوڵ درا بۆ کوشتنی یاریدەدەرەکانی کابتن (هی) لە هەولێر، بەڵام جێبەجێ نەبوو(٦٩)، لەم کاتەش کە گەڕایەوە هەولێر لە ١٥ ی ئابدا بارودۆخی شار ئاسایی نەبوو، چەندین پروپاگەندە تێیدا بڵاوبۆوە کە رووبەڕووبوونەوە لە نێوان خەڵکی کەرکووک و دەسەڵاتدارانی ئینگلیز رووی داوە و هەواڵی ئەمەش بڵاوبۆوە کە شۆڕش لە هەولێریش دەست پێدەکات، جێگای ئاماژەیە ئەم هەواڵ و کۆبوونەوانە بە شێوەیەکی ئاشکرا لە چایخانە و شوێنە گشتییەکان بڵاو دەکرایەوە و هانی خەڵکییان دەدا کە دژی ئینگلیز راپەڕن(٧٠). هەر لەم ماوەیەدا خانووەکەی کابتن (هی)یان سووتاند و دوای ئەمەش نەیتوانی لە خانووەکەی دانیشێت و کەوتنە بەر هەڕەشەی کوشتنی. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کەوا لە سەربازگەی ئینگلیز لە هەولێر بمێنێتەوە، ئەم شوێنەشی هەڵبژارد بۆ ئەوەی هەر کاتێک بارودۆخەکە گەیشتە رادەی ئەوەی شارەکە بەجێ بهێڵێت، خۆی دەرباز بکات بە پاڵپشتی ئەو هێزانەی کە لە ناو شارەکەوە هەبوون لەگەڵ پاڵپشتی کردنی پیاوەکانی لە شارەکە(٧١). لە لایەکی تریش هەر لەم ماوە پەشێوییەدا هەندێک لە کۆنە ئەفسەر و دەرەبەگەکانی هەولێر کەوتبوونە بڵاوکردنەوەی هەواڵی گەڕانەوەی تورک بۆ هەولێر لە ماوەیەکی کورتدا و کاروباری شارەکە دەگرنەوە دەست و دەسەڵاتی ئینگلیز کۆتایی دێت(٧٢).

دەکرێت بڵێین بڵاوبوونەوەی ئەم

جۆرە هەوالانە لە ناو شارەکە ببووە سەرچاوەیەکی پەشێوی ئینگلیزەکان لە هەولێـر، بە تایبەتی لە لایەن حاکمی سیاسی (هی) لە هەمان کاتدا زۆر لە دانیشتوانی هەولێر بە تایبەتی ئەوانەی سەنگەری بەرگرییان دژی ئینگلیز گرتبوو، دژی داگیرکردنی شارەکە بوون. لە هەمان کاتدا حوکمڕانی و داگیرکردنی تورکیشیان ڕەت دەکردەوە. بەلام هەندێک هەبوون کە بە ئاواتی گەڕانەوەی تورک بوون بە تایبەتی ئەوانەی خاوەن بەرژەوەندیی سیاسی و ئابووری بوون، بۆیە دەکرێت بلێین هەموو توێژەکان لە هەولێر تێکەڵ بە شۆڕشی دژی ئینگلیز نەبوون و هەمان ئامانجیان نەبووە و سنووری چالاکیی شۆڕشگێڕەکان تا رادەیەک قەتیس مابوو، بەلام پێویستە ئەوەش بخەینە روو کە پیاواتی ئینگلیز و ئەوانەی بەرژەوەندییان لەگەڵیان یەکی دەگرتەوە دژی شۆڕش وگەڕانەوەی تورک بوون. بەلام دەتوانین بلێین ئەو کەسانەی سەرکردایەتی بەرگری و دژایەتی ئینگلیز بوون لە هەولێر مەبەستیان گەڕانەوەی تورک نەبوو، بەڵکو هەردوو هەستی نەتەوەیی و ئایینی ببووە، سەرچاوەی دژایەتی ئینگلیز و راپەڕینەکەیان.

ئەم ماوە مێژوویییەی نێوان سەرەتاکانی مانگی ئاب تا ناوەڕاستی ئەیلول ئینگلیز دەسەلاتی لە هەولێر تەنها بە شێوەی هێمایەک بووە. تەنانەت نەیارانی ئینگلیز لە رووی بەرێوەبردنی شارەکە چەندین فەرمانبەریان لە شوێنی فەرمانبەرانی



ئینگلیز داناوە، و ئەوەی ئەرکەکەشی ئەنجامداوە (حاجی رەشید ئاغای وەیس ئاغا) بووە، هەروەها هەر یەک لە (حاجی رەشید ئاغا و عەبدوللا ئاغا و ئەحمەد پاشا و حاجی پیرداود) هەوڵی ئەوە دەدەن بەردیەکی یەکگرتوو پێک بهێنن بە بەشداربوونی سەرۆک هۆز و ئاغاکانی ناوەوەو دەرەوەی هەولێر، هەر بۆ ئەم مەبەستەش هەر یەک لە (ئەحمەد پاشا وحاجی پیرداود) سەردانی بەحرکە دەکەن بۆ دیدەنی و گفتوگۆکردن لەگەڵ (جەمیل ئاغا) بۆ ئەوەی یارمەتییان بدات و بێتە ریزی بزووتنەوەی بەرگری لە دژی ئینگلیز و داروودەستەکانیان لە هەولێر و ناوچەکانی تر لە کوردستان [٧٣].

دەسەلاتی کاپتن (هی) تەنها لە چوارچێوەی خۆپاراستنەوە بووە، نەیتوانیوە فەرمانەکانی جێبەجێ بکات، ئەوکاتەی ویستی ڕۆژی یەکشەممە بکات بە پشووی رەسمی، (حاجی رەشید ئاغا) بە قازی هەولێر

رادەگەیەنێت کە نابێت ڕۆژی یەک شەممە ببێتە پشوو، چونکە تەنها ڕۆژی هەینی پشووی موسڵمانانە، ئەوەی جێگای سەرنجە (حاجی رەشید ئاغا) لە کاتی گفتوگۆی لەگەڵ قازیدا پێی دەڵێت:

"... ئێستا من حاکمم و بە سەرجەم فەرمانبەران بڵێ کە بە تەواوی دەوامی خۆیان بکەن..."[٧٤].

دەکرێت بلێین دەسەلاتی ئینگلیز لەم کاتەدا لە شارەکە زۆر لاواز بووە و حوکمڕانی شارەکە لە ژێر دەسەلاتی نەیارانی ئینگلیز بووە و لە تواناشیاندا نەبووە رووبەڕوویان ببنەوە، حوکمڕانی شارەکە بخەنەوە ژێر دەسەلاتیان. هەروەها هۆکارێکی تریش دەگەڕێتەوە بۆ دەرخستنی ئەم وتەیەی کە کاتێک عوسمانییەکان شارەکەیان بەجێهێشتووە وەک جێگری خۆیان (حاجی رەشید ئاغا)یان کردبێتە حاکمی شارەکە تا ئەو کاتەی کە دەگەڕێنەوە، هەر وەک چۆن ئەم بیرۆکەیان لە شاری سلێمانی جێبەجێ کرد.

لە ڕۆژی ١٦ی ئابدا کە هاوکات دەبێت لەگەڵ ڕۆژی لەدایکبوونی پێغەمبەری ئیسلام، محەمەد (د. خ)، کۆبوونەوە لە مزگەوتەکان بەم یادەوە دەکرێت و لەهەمان کاتدا لەوە دەچێت کە ئەم بۆنەیەش هاندەرێکی تر بووبێت کە راگەیاندنێک لە شارەکەدا بلاو دەکەنەوە کە بریتی بووە لە داواکاری بۆ شۆڕش دژی ئەم حکومەتەی کە بە حکومەتی (کافران) ناوی دەبەن و چەندین کەس ئیمزا بە سەر راگەیاندراوەکەوە

دەکەن، هەروەها داوا دەکەن کە چەک هەڵبگرن دژی ئینگلیز لە هەولێر[٧٥].

وەک دەردەکەوێت ئەم کۆبوونەوەیە ژمارەیەکی زۆری خەڵک تێیدا بەشدارییان کردووە و ژمارەیەک کەسانی تێدا بووە کە چەکیان هەڵگرتووە، بۆیە کابتن (هی) هەوڵی ئەوە دەدات کە هەندێک لەم کەسانە دەستگیر بکات کە لە کۆبوونەوەکەدا بوون بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەش کۆبوونەوەیەک لەگەڵ ناودارەکانی هەولێر و پیاوانی نزیکی خۆی دەکات و هەموویان بەشدار دەبن تەنها (حاجی رەشید ئاغا) نەبێت ئەمەش لەوە دەچێت کە داوای لێ نەکرابێت ئامادە بێت[٧٦]. دوای ئەنجامدانی کۆبوونەوەکە بەشداربووان پیرۆزبایی رزگاربوونیان لە حاکمی سیاسی کرد، یەکێک لە بڕیارە گرنگەکانی ئەم کۆبوونەوەیە بریتی بوو لە بڕیاردان لە سەر دەستگیرکردنی چەند کەسێک کە کاریگەرییان بە سەر رووداوەکاندا هەبووە لە هاندانی خەڵک دژی ئینگلیز کە دووان لەم چوار کەسە، بە بێ ئامادەبوون، حوکمی بەندکردنیان درا و دووانەکەی تریش چوونە دەرەوەی هەولێر، ئەمەش کاریگەریی زۆری کردە سەر بارودۆخەکە، بە تایبەتی دوای ئەوەی کە (حاجی رەشید ئاغا)ش کە ئامانجی سەرەکی ئینگلیز بوو، بۆ دووركەوتنەوە لە هەولێر دەچێتەوە گوندی (تەرجان)[٧٧].

هاوکات لەگەڵ ئەم بارودۆخە حاکمی سیاسی داوا لە (خورشید ئاغا)[*] دەکات کە چەند کەسێکی وەک پاسەوان بۆ رەوان بکات کە بەردەوام لەگەڵیدا بن، خورشید ئاغاش داواکەی جێبەجێ دەکات[٧٨]. بارودۆخی شارەکە بە جۆرێک ئاڵۆز بوو، بە مەبەستی چارەسەرێک کابتن (هی) پەیوەندی بە حاکمی گشتی لە بەغدا دەکات بۆ ئەوەی یارمەتی بدات، بەڵام لە وەڵامی بروسکەی حاکمی سیاسیدا ئەوەی پێ رادەگەیەنێت کە باری گشتی لە ناوچەکانی عێراق لە خراپیدایە، لە توانایدا نییە کە یارمەتی بدات، تەنانەت ئەگەر بە یەک فڕۆکەش بێت و رێنمایی ئەوەی کرد کە خۆی و فەرمانبەرەکانی بە هەر بیانوێک بێت، شارەکە بەجێ بهێڵن[٧٩]. جێگای ئاماژەیە ئەم هەڵوێستەی (ویلسن) بەڵگەیە لە سەر بێ توانایی ئینگلیز لە هەولێر و ناوچەکانی خوارووی عێراق بەرامبەر بە شۆڕشگێڕەکان، بە بەڵگەی ئەوەی هەر چەندە حکومەتی بەریتانی لە ساڵانی ١٩١٨-١٩٢٠ سیاسەتێکی روونی نەبوو بەرامبەر بە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی بە هۆی نەبوونی شارەزاییەکی تەواو لە ناوچەکان، هەروەها بیروڕای جیاواز هەبوو لە نێوان وەزارەتەکانی (دەرەوە و داگیرگەکان و هیندی) سەبارەت بە سیاسەتی ئینگلیز لە عێراق بە گشتی و کوردستان بە تایبەتی، حاکمی گشتی هەردەم لە هەوڵی بەهێزکردنی دەسەڵاتەکەی دابوو لە عێراق کە لە داڕۆژدا بچێتە چوارچێوەی ئیمپراتۆریەتی (بەریتانی - هیندی) و چەند جارێک داوا لە حاکمی گشتی کراوە کە لە ناوچەکانی کوردستان و هەولێریش بکشێنەوە، بەڵام رازی نەبووە کە ئەم بڕیارە جێبەجێ بکات چونکە پێی وا بوو کە کشانەوەی هێزەکانی ئاکامێکی خراپی بە سەر سیاسەتی بەریتانییەوە دەبێت، بەڵام کاتێک باری سیاسی هەولێر دەگاتە رادەی ئەوەی کە حاکمی سیاسی هەولێر داوای یارمەتی بکات لە (ویلسن) ئەویش تاکە رێگای کە پیشانی حاکمی سیاسی دەدات لە هەولێر کشانەوەیەتی لە شارەکە، هەر بۆیە دەکرێت بڵێین ئینگلیز لە هەولێر هیچ دەسەڵاتێکی نەماوە و بووە بە سەرچاوەی دەرکردنیان لە ناوچەکانی تریش[٨٠]، ئەم هەڵوێستەی حاکمی گشتی (ویلسن) دەبێتە هۆی زیاتر دابەزینی وورەی کابتن (هی)، هەر بۆیە دەست دەکات بە گواستنەوەی فەرمانبەرەکانی ئەوانەی (بەریتانی و هیندی)ن کە پێویستی بە خزمەتیان نەمابوو، بۆ هەردوو لیوای کەرکووک و موسڵ. هاتوچۆی خۆی لە هەولێر بە جۆرێک بوو ئەگەر لە ژێر چاودێری ژمارەیەکی زۆری پاسەوانەکانی نەبووایە، ئەوا نەیدەتوانی بە شەقامەکان بڕوات، چونکە هەڕەشەی کوشتنی لە سەر بوو[٨١].

### دامرکاندنەوەی راپەڕینی هەولێر و رۆڵی هۆزە کوردییەکان

بارودۆخی هەولێر لەگەڵ سەرەتاکانی مانگی ئەیلولی ١٩٢٠ گەیشتە رادەیەک کە ئینگلیزەکان چیتر لە توانایاندا نەما کە بتوانن کاروباری شارەکە بەڕێوە ببەن،

بەرامبەر بە شۆڕشگێڕانی شارەکە، وەک هەنگاوی یەکەمیش لە رۆژی ٤ی ئەیلول حاکمی سیاسی کەرکووک (رائد لونگریک) بە یاوەری (مولازم بیکنول)[*] و قافلە شاحنەیەک لە جۆری فۆرت، گەیشتە شاری هەولێر کە مەبەستی سەرەکییان گواستنەوەی ئەو پارانە بوو کە پێی دەوترا (الروبیات) و لە خەزینەی حاکمی سیاسی بوو لە کەرکووک کە هەمووی لە زیو دروست کرابوو[٨٢]، هەروەها گواستنەوەی ئەم دانەوێڵانەی بە تایبەتی (گەنم وجۆ) کە لە کۆگاکانی شاردا هەبوون[٨٣]، دەکرێ بڵێین ئەم هەڵسوکەوتەی ئینگلیز زیاتر شکاندنی شکۆمەندی و دەسەڵاتیانی پیشاندا بەرامبەر خەڵکی هەولێر، چونکە ئەمە جۆرێک بوو لە هەرەسهێنانیان بەرامبەر بە شۆڕشگێڕانی هەولێر و کابتن (هی) لەبارەی ئەم بارودۆخەی کە تیایدا بوو دەڵێت:

"...لەم کاتەدا دەسەڵاتەکەم وەک حاکمی سیاسی تا رادەیەک خنکێنراو بوو، لە رێگای ناوبژیکردنێکی باش کە (خورشید ئاغا و ئەحمەد ئەفەندی) کردیان توانیم دەسەڵاتم بۆ سەر کارەکانم بگێڕمەوە... " [٨٤].

لە هەمان رۆژدا (نەقیب برادشۆ) جێگری حاکمی سیاسی لە شارۆچکەی کۆیە هەڵدێت و روو دەکاتە هەولێر، لەم کاتەی کە برادشۆ دەگاتە هەولێر و شەویش لەگەڵ کابتن (هی) بەسەردەبەن و بێ ئومێدییان دەگاتە ئەو رادەیەی کە لەنێوان خۆیاندا دەڵێن: " بابخۆین و بخۆینەوە و خۆش رابوێرین، مادام بەیانی دەمرین " [٨٥].

لەم وتەیەی (هی و برادشۆ) ئەمە دەردەکەوێت کە جگە لەوەی دەسەڵاتیان لە شارەکاندا نەماوە، کەوتوونەتە گومان لە مانی خۆشیان ئەمەش ئەوە دەردەخات کە شارەکە لە کۆنترۆڵی ئەواندا نەماوە و توانای رزگاربوونیان زەحمەت بووە.

لە رۆژی ٥ی ئەیلول هەواڵی کۆبوونەوەی هۆزەکانی (سورچی و گەردی و خۆشناو) لە ناوچەی کۆیە گەیشتە هەولێر کە بە نیازن هێرش بکەن بۆ دەرپەڕاندنی ئینگلیزەکان لە هەولێر، لەم کاتەدا ئینگلیزەکان لە هەولێر کەوتنە بەستنی کۆبوونەوەیەکی بەپەلە بۆ دانانی پلان و نەخشەیەک بۆ دەرچوون لەم بارودۆخە، (لونگریک و مولازم بینکۆل) هەولێریان جێ هێشت و پارەیەکی زۆریان لەگەڵ خۆیان برد، ئەو برە پارەیەش کە لەلایەن (هی) مابۆوە، نزیکەی (٣٠) هەزار روبیە دەبوو کە خەریکی گواستنەوەی بوون بەرەو کەرکووک[٨٦]، هەروەها (نەقیب برادشۆ و مولازم بوا) بەرەو موسڵ چوون و هەندێک لە فەرمانبەرانی هیندی کە لە شارەکە مابوونەوە رۆیشتن و تۆمارە نهێنییەکانیان لە شاردا نەهێشت و بەرەو وێستگەی شەمەندەفەری هێڵی ئاسنین لە شەرگات چوون[٨٧]، بەڵام سەبارەت بەم کەسانەی کە لەگەڵ حاکمی سیاسی مانەوە لە هەولێر لەم بارە ترسناکە (نەقیب لیتدیل) بوو کە فەرماندەی هێزی لیڤی دەکرد و (رەئیس عرفا و کینارد و مستر روبنز) کە داوایان لێ کرابوو کاروباری پولیسی هەولێر بەڕێوەببەن و (نەقیب دیکنسن) کە زۆر بە وریایی لەگەڵ رووداوەکان مامەڵەی دەکرد و رۆژ هەبوو دوو تا سێ جار سەردانی ناحیەی گوێڕی دەکرد بۆ دڵنیایی لە رەوشی ناوچەکە و رێگا و هێزەکان و فەرمانبەرەکانی کە رەوانە کرابوون لەم رێگایەوە بۆ موسڵ، هەروەها فەرمانبەرێکی هیندی بە ناوی (مستر دلی جاند) کە ئەمین خەزینە بوو مایەوە لەگەڵ (مستر بلوج) کە لێپرسراوی کاروباری فەرمانگەی پۆستەو گەیاندن بوو، و دوای دوو رۆژ ئەوانیش بەرەو گوێڕ چوون، تەنها کرێکارەکانی گواستنەوە مانەوە لە بارەگاکانی گواستنەوە بۆ پارێزگاریکردن لە پەیوەندییەکان لە نێوان (هەولێر و کەرکووک) و (هەولێر و موسڵ) بۆ ئاگادار بوون لە بارودۆخەکە[٨٨].

سەبارەت بە هێزی سەربازی و پۆلیس کە لە شارەکە مابۆوە، بریتی بوو لە(٥٠) سەرباز و(٢٠) کەس لە هێزی (دەرەک) و نزیکەی (٣٥) پۆلیسی شارەکە، جێگای ئاماژەیە ئەوانەی کە هێشتا لە شارەکە مابوونەوە، دووچاری هەڕەشەکانی شۆڕشگێڕان دەبوونەوە بە تایبەتی لە کاتی دەرچوونیان لە شوێنی کاریان و بۆ ناو شەقامەکانی شار[٨٩].

سەبارەت بە هەڵوێستی سەرۆک هۆزە کوردییەکان، لەم بارودۆخە ناهەموارەی کە شاری هەولێر پێیدا تێدەپەڕی بە تایبەتی دەسەڵاتی حاکمی سیاسی کە بە سەر شارەکەوە نەمابوو، دوو جۆر هەڵوێستیان نواند، ئاغاکانی دزەیی دیارترینیان

(خورشید ئاغا) رۆڵێکی گەورەی گێڕا لە پاراستنی دەسەڵاتی ئینگلیز لە هەولێر و مانەوە و گەڕانەوەی هەیمەنەیان بەسەر شارەکەدا لە کاتێکدا کە هیچ دەسەڵاتێکیان نەمابوو و بە تایبەتیش لە پاراستنی گیانی کاپتن (هی)[(٩٠)].

وەک دەردەکەوێت خورشید ئاغا خاوەنی رێزێکی زۆر بووە لە لایەن ئینگلیزەکان و بە کەسێکی دڵسۆزی خۆیان داناوە، تەنانەت ئەگەر کەسێک هەر کارێکیان بە ئینگلیزان ببوایە، داوایان دەکرد کە خورشید ئاغا داواکارییەکەیان بۆ بکات، بەتایبەتی لە کاتی رووداوەکان کەس وکاری گیراوەکان پەنایان دەبردە لای خورشید ئاغا بۆ رزگارکردنیان و زۆر داوایان جێبەجێ دەکرد[(٩١)]. هەروەها (حوسێنی مەلای)[(*)] بە مەبەستی یارمەتیدانی حکومەت، خۆی و پیاوەکانی دەگەنە هەولێر و ئەرکی پاراستنی شارەکە وەک سەرکردەی سوپای ناوچەکە لە ئەستۆ دەگرێت و میوانخانەی (حەسەن ئاغا چاوشلی) دەکاتە بارەگای هێزەکەی و ئەم ماوەیە لە ناو خەڵکدا بە ماوەی حوکمی (حوسێنی مەلا) ی لە هەولێر ناسراوە[(٩٢)].

حاکمی سیاسی هەوڵی ئەوەشی دەدا کە هەندێک لە سەرۆک هۆزەکان دوور بخاتەوە لە نەیارەکانی و بەڵای خۆیدا رایانکێشێت لەوانەش هەوڵی ئەوەی دا کە (قادر بەگ) دوور بخاتەوە لە دوژمنەکانی چونکە لە بەرەی دوژمنانی ئینگلیز بوو و پەیوەندی بە (کەریم خان) کرد لە کۆیە بۆ هەمان مەبەست، ئەمە جگە



لە لایەنگرانی خۆی و هێزەکانی کە لە شارەکەدا مابوو[(٩٣)].

سەبارەت بە رۆڵی گەورە بەرپرسانی حکومەت لە شارەکە دیارترینیان موتەسەریف (ئەحمەد عوسمان) کە رۆڵی دیاری دەبینی بۆ ئەوەی هێرش نەکرێتە سەر شارەکە لە لایەکی تریشدا بەردەوام چاودێری بارودۆخەکەی کردووە کە شارەکە پێیدا تێپەڕیوە وحاکمی سیاسی متمانەی تەواوی پێکردووە و لە کاتە توند و ناخۆشەکانیشدا شەوان یاوەری حاکمی سیاسی دەبێت[(٩٤)].

هاوکات لەگەڵ ئەم رەوشە نائاساییە هەواڵی ئەوە بڵاو دەبێتەوە کە هۆزەکانی (سورچی و خۆشناو) چەکدارەکانیان لە سنووری (١٠٠٠) کەس بوون و هەندێک لە سەرۆک هۆز و ئاغاکانی ناوچەکە یارمەتییان دەدەن و پشتگیری خۆیان دەردەبڕن، لەمانەش (عەبدوڵلا پاشا و حاجی پیرداود ئاغای دزەیی و جەمیل ئاغای گەردی) کە ژێر دەستیی ئینگلیزیان رەت دەکردەوە[(٩٥)].

سەبارەت بە رەوشی سیاسی ناوەوەی هەولێر، پیاوان و لایەنگرانی حاجی رەشید ئاغا و عەلی پاشا لە ئامادەباشیدا بوون بەرامبەر هەر گۆڕانکارییەک کە روو بدات، بەڵام حاکمی سیاسی وا دەردەکەوێت کە پشت ئەستوور بووە بە هەوڵ و تواناکانی خورشید ئاغا ولە سەرنەکەوتنی هێرشبەران بۆ سەر شاری هەولێر[(٩٦)].

خورشید ئاغا رۆڵێکی بەرچاوی گێڕاوە، لەم کاتەی کە هێزەکانی هۆزی سورچی لە دیرە لە نزیک بەستۆرە بە سەرۆکایەتی شێخ عوبەیدوڵلا کۆدەبنەوە و نوری باویل ئاغاش ئامادە دەبێت، و هۆزی خۆشناویش لە مەلا ئۆمەر کۆدەبنەوە ـ هەواڵی ئەمەش لە ناو شاردا بڵاودەبێتەوە کە لە لای رۆژهەڵاتدا هێرش دەکەنە سەر هەولێر، کاپتن (هی) ترسی گەورەی لەسەر دروست دەبێت، بەڵام کاتێک (خورشید ئاغا و مشیر) دەچنە لای، دڵنیای دەکەنەوە کە بە هیچ جۆرێک رێگا نادەن هێرش بکرێتە سەر هەولێر، و خۆیان و هێزەکانیان لە ئامادەباشیدان بۆ هەر کارێک کە روو بدات وچەند جارێک دەورییەی دەنارده دەرەوەی هەولێر بۆ چاودێری کردنی بارودۆخەکە و دواتر (شێخ مەعروف) رەوانەی لای (شێخ عوبەیدوڵلا) دەکەن و ئاگاداری دەکەنەوە کە هێرشی سەر شاری هەولێر نەکات[(٩٧)].

وەک دەردەکەوێت شەوی ٦ لە سەر ٧ ی مانگی ئەیلول یەکێک لە ناخۆشترین کاتەکانی حاکمی سیاسی و داارودەستەکەی بوویێت، کاتێک تیپێک لە چەکدارەکانی ئاغاکانی دزەیی دەگەنە هەولێر داوای فیشەک دەکەن و بڕیار دەدرێت لە پاشماوەکانی عوسمانی (١٥٠٠) فیشەکیان پێ بدەن لەبارەی ئەم کاتە

هی دەڵێت:
"...شەوێکی ناخۆشمان بەسەر برد و جلەکانمان بە تەواوی لەبەر کردبوو و ئەحمەد ئەفەندی و دوو لە ئاغاکانی دزەییم لەگەڵدا بوو و ئامادە بووین کە لە هەر چرکەیەکدا بڕۆین..." [98].

بەم جۆرە دەسەلاتداران لە هەولێر لە چاوەڕوانی جێهێشتنی شارەکە بوون، لەم کاتەی کە شۆڕشگێڕان دەستیان بە سەر شارەکەدا گرت، حاکمی سیاسی هیچ ئومێدی نەمابوو و چاوەڕوانی هیچ یارمەتییەکیشی نەکرد، پێی بگات.

### هاتنی حاکمی مەلەکی گشتی (ویلسن) بۆ هەولێر و گەڕانەوەی دەسەلاتی ئینگلیز

هەولێر لەم کاتەی کە لە ناو بارودۆخێکی نائارام و پەشوکاودا تێدەپەری و دەسەلاتی ئینگلیز ببووە دەسەلاتێکی بە ناو، وەک هێمایەک مابوونەوە لە چاوەڕوانییەکی بێ ئومێدیدا بوون، ڕۆژی ٨ی ئەیلول لە ڕێگای ئاسمانییەوە بە سێ فڕۆکە حاکمی سیاسی گشتی (ویلسن) لە بەغداوە گەیشتە هەولێر بە یاوەری شاندێک لە ئەفسەرانی هێزی ئاسمانی مەلەکی [99].

مەوکیبی (ویلسن) بە پاسەوانی سوارەکانی خورشید ئاغا و ئەحمەد عوسمان ئەفەندی گەیشتە ماڵی کابتن (هی) و دەست کرا بە باس و گفتوگۆ سەرباری ئەم بارە خراپەی کە لە هەولێر لە ئارادایە، چونکە هۆکاری سەرەکی هاتنی (ویلسن) دەگەڕایەوە بۆ توند وتیژی و هەڕەشەکان لە سەر حاکمی سیاسی و دەسەلاتی ئینگلیز لە شارەکە، هەروەها هەوڵ بدات متمانە بخاتەوە، دڵی لایەنگرانیان و چاویشی بە ناودارەکانی شار بکەوێت و لە ئامانجەکانیان بگات و بارودۆخەکە شی بکاتەوە بۆ ئامادەبووان وەک ڕێگا چارەیەک بۆ دەرچوون لەم مەینەتەی کە پێیدا تێدەپەڕین [100].

هەر بۆیە (ویلسن) و شاندی یاوەری بەرەو سەرای حکومەت هاتن بۆ ئەوەی چاویان بە ناودارانی شارەکە بکەوێت و لەگەڵ ئەفسەر و کاربەدەستانی ئینگلیز و ژمارەیەک سەرۆک هۆزی کورد و گەورە پیاوانی شار کۆ دەبێتەوە و باس لە سەرکەوتنەکانی ئینگلیز لە ناوچەکانی فوراتی ناوەڕاست دەکات و باس لە هێمنی شاری سلێمانی دەکات [101]، و لەو کەسانەی لە کۆبوونەوەکە بەشدار بوون (ئەحمەد پاشا و حاجی پیرداود و جەمیل ئاغا و مەلا فەندی و خورشید ئاغا و ئەحمەد ئەفەندی) بوون و پێشنیارەکان خرانە ڕوو بۆ ڕێگا چارەیەک لە دەرچوون لەم بارە سەختە [102]، دوای بیروڕا گۆڕینەوە، هەریەک لە (مەلا فەندی و خورشید ئاغا) پێشنیاری هێنانی هێزی سەربازی دەکەن بۆ هەولێر بۆ پاراستنی شارەکە دوورخستنەوەی شەڕ تێیدا و مانەوەی حکومەت تێیدا و بتوانێت کاروباری شارەکە بە دەست بگرێت و ئامادە بوونی هاوکاریشیان پیشان دا [103] جێگای ئاماژەیە کە (ویلسن) لە کاتی کۆبوونەوەکەی لەگەڵ ئامادەبووان پرسیاری ئەوە دەکات کە ئایا هیچ کەسێک هەیە ئامادە نەبووبێت لە ناودارەکانی ئەم شارە و یەکێک لە ئامادەبووان بە (ویلسن) ڕادەگەیەنێت کە (عەبدوڵڵا پاشا) ئامادە نییەو دوای ئەوەی حاکمی گشتی شوێن و پلە و پایەی عەبدوڵڵا پاشا و بنەماڵەکەی دەزانێت و ئەو شوێنەی لە دەوڵەتی عوسمانیدا هەیان بووە بڕیار دەدات کە سەردانی ماڵەکەی بکەن کە دەکەوتە گەڕەکی سەرای لە سەر قەلات و دوای گەیشتنیان بە دیوانی عەبدوڵڵا پاشا ئەمجار خۆی دێت وبەخێرهاتنی حاکمی گشتی و یاوەرەکانی دەکات و دوای گفتوگۆ کردنیان داوا لە عەبدوڵڵا پاشا دەکات کە سەردانی بەغدا بکات، دەکرێت بڵێین ئامادەنەبوونی حاجی ڕەشید ئاغاش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە کابتن های بە سەرکردەی بەرگری و دژایەتی ئینگلیزی لە هەولێر دادەنا و ئەمانەی ئامادەی کۆبوونەوەکەش بوون، نەیانتوانی باس لە ئامادە نەبوونی بکەن.

دوای ئەوەی کۆبوونەوەی ویلسن و خەڵکی ناودار و پیاوماقوڵانی شارەکە کۆتایی هات، ویلسن بە شێوەیەکی تایبەت لەگەڵ هەر یەک لە (ئەحمەد ئەفەندی و خورشید ئاغا) کۆبۆوە و سوپاسی خۆی وەک حاکمی گشتی بەرامبەر ئەم خزمەت و دڵسۆزییەی کە پێشکەشیان کردووە، پێ ڕاگەیاندن [104]، و ئەمانیش بەڵێنییان دا بە بەردەوامی هەوڵەکانیان بۆ گەڕانەوەی ئاسایش بۆ شارەکە و دوو مەرجیان هێنا

پێشەوە بۆ بە ئەنجام گەیاندنی کارەکەیان، یەکەمیان داوایان لەحاکمی گشتی کرد، هێزێکی بە پەلە رەوانەی هەولێر بکات، بۆ ئەوەی هەر لە ئێستاوە بۆ نەیارانی ئینگلیز ئاشکرای بکەن کە تا ئێستاش بالی بەریتانییەکان بە هێز و درێژە و داواکاری دووەمیان، وەرگرتنی بەلێنێک بوو کە رێگا بە تورک نادرێت بۆ گەرانەوەیان و حوکمرانی شارەکە بکەن[١٠٥].

دوای کۆتایی هاتنی کۆبوونەوەکان ویلسن و شاندی یاوەری گەرانەوە مالی کابتن (هی) کە نزیک بوو لە فرۆکەخانە و سەربازگەی ئینگلیز لە شارەکە، بەلام مەترسییان هەر لە دلدا هەبوو کە شۆرشگێرەکان هێرشیان بکەنە سەر، هەر بۆیە کابتن (هی) لە بیرەوەرییەکانیدا لەبارەی هاتنی ویلسن دەلێت:

"...ئەو مالەمان هەلبژارد کە شایستەی میوانداری حاکمی گشتی بوو، بە هۆی نزیکی لە فرۆکەخانەوە...بەلام تووشی هێرشێکی خراپی دەمارگیری بووم، کە ئەمەش بۆ جاری دووەم بوو کە هەستم کرد کە مالەکە ئاشکرا بووە و لە لایەن کۆمەلێک لە سوپای هۆزەکان بە سەرمان دادەدەن...."[١٠٦].

هەر چەندە لە کاتی دانیشتنی ویلسن و شاندەکە و کابتن های و پیاوەکانیان بۆ نان خواردنی نیوەرۆ لە ژێر چاودێری و پاسەوانی (مستر روبنز) ژمارەیەک سەرباز دابوون، بەلام لە ناوەراستی دانیشتنەکەدا (روبنز) نووسراوێک رەوانە دەکات بۆ دانیشتوان تێیدا دەردەخات کە هێرش بۆ سەر شارەکە دەستی پێکردووە و هێزەکان بەرەو هەولێر لە رێگادان، ئەمەش دەبێتە هۆی دورستبوونی پەشێوییەکی زۆر لە نێوانیان، بەلام دواتر کە سەیر دەکەن ئەمە هێز نییە بەلکو مێگەلی مەر ومالاتە لە گەرانەوەیە و تۆزی لە دوای خۆی جێهێشتووە مەترسییەکەیان کەم دەبێتەوە[١٠٧]، هەر لە هەمان رۆژدا دوای تەواوکردنی ئەرکەکەی ویلسن و شاندەکەی یاوەری لە رێگای فرۆکەوە دەگەرێنەوە بەغدا. لە کاتی بەرێخستنی ویلسن هەر یەک لە (هی و خورشید ئاغا و ئەحمەد ئەفەندی) ئامادە دەبن، هەر لەم کاتیش (حوسێنی مەلا) ی کە بە مەبەستی رێکخستنەوەی پەیوەندییەکانی نێوان حکومەت و قادربەگ لە سەردانی ناوچەی خۆشناوەتی گەرابۆوە و نامەیەکی هێنابوو لە قادر بەگەوە کە داوای دەکرد حکومەت هیچ غەرامەیەکی نەخاتە سەر و لێی ببوورێت و بەرامبەر ئەمەش ئامادەیە گوێرایەلی فەرمانەکانی حکومەت بێت، بۆ جێبەجێ کردنی ئەم داوایەش کابتن (های) داوا دەکات کە (ئەحمەد ئەفەندی) داوایەکەی قادر بەگ بە (ویلسن) رابگەیەنێت بەر لە رۆیشتنی و (ویلسن) یش داوایەکە قبول دەکات[١٠٨].

جێگای ئاماژەیە کە نە سەردانەکەی (ویلسن) و نە هەرەشەکانی نەبووە هۆی چاوترسێن کردنی دانیشتوانی هەولێر و دەوروبەری، چونکە دوای گەرانەوەی حاکمی گشتی بۆ بەغدا بە چەند رۆژێک ئەم پلانە ئاشکرا دەبێت کە لەلایەن شۆرشگێرانی هەولێر دارێژرابوو بۆ دەرکردنی ئینگلیزەکان لە هەولێر و دامەزراندنی حوکمێکی ناوخۆیی تێیدا[١٠٩]. جێی ئاماژەیە کە دوای رۆیشتنی ویلسن، کابتن های سەردانی شارەوانی دەکات بۆ بەدواداچوونی هۆکاری ئامادە نەبوونی ئەحمەد پاشا و هاورێکانی لە کۆبوونەوەی ویلسن لەگەل ناودارەکانی هەولێر کە لە سەرا ئەنجام درا، چونکە ئەم کارە ببووە هۆی سەرسورمانی حاکمی سیاسی[١١٠].

دوای گەرانەوەی ویلسن رۆژی ٩ی ئەیلول کۆبوونەوەیەک لە مالی مەلا فەندی لە باداوە ئەنجام درا، کە سەرکردەکانی هۆزی خۆشناو تێیدا ئامادە بوون. ئەحمەد عوسمان وەک نوێنەری حکومەت چووە کۆبوونەوەکە و بەشداری تێدا کرد، بەلام ئامادەبووان هەلوێستێکی توندیان بەرامبەر ئەحمەد عوسمان پیشان دا و بە هەلگەراوەو کافر و خائینیان دانا، بەرامبەر ئەم دەورەی کە لە پال ئینگلیز گێراویەتی، بەلام ئەوەی جێی ئاماژەیە کە زۆربەی ئامادەبووان لە بیرۆکەی گەرانەوە و واز هێنان لە هەلگەرانەوەکانیان بوون، ئەمەش راست دەرکەوت دوای ئەوەی کە سەرانی خۆشناو ئامادەییان پیشان دا کە بێنە ژێر بالی ئینگلیز و سەردانی (هی) بکەن، ئەمەش وەک موژدەیەک لەلایەن ئەحمەد ئەفەندی درا بە حاکمی سیاسی[١١١]، و لە هەمان رۆژدا هەر یەک لە (قادر بەگ و

ساڵح بەگ و مستەفا ئاغا و خدر بەگ) سەردانی حاکمی سیاسییان کرد و ئامادەبوونی خۆیان پیشان دا کە لە ژێر فەرمانەکانی حکومەت بن و بڕیاریان دا کە هێزەکانیان ڕەوانەی ماڵەکانیان بکەنەوە و ئەم کەلوپەلانەش کە حکومەت خاوەنێتی و دەستیان بەسەر داگرتووە ئامادەن بیگەڕێننەوە و ئەمەی ڕوویدا، دووبارە نابێتەوە و دەبێت حکومەتیش وەک پێش ڕاپەڕین و دژایەتی کردنی ئینگلیز لەگەڵ هۆزی خۆشناو مامەڵە بکات، هەروەها سەبارەت بە هۆزی سورچی دوای ئەوەی (شێخ مەعروف) وەک نوێنەری حکومەت سەردانی شێخ عوبەیدوڵلای کرد، ئەویش بە شێخ مەعروفی ڕاگەیاند ئامادەیە واز لە دژایەتیکردنی ئینگلیز بهێنێت و ببێتە گوێڕایەڵی حکومەت بەرامبەر بە چەند مەرجێک کە بۆی جێبەجێ بکرێت، وەک دانانی لە لایەن حکومەت بە سەرۆکی هۆز و پێدانی مووچە و هێزێک لە شەڕکەرانی هۆزەکەی پێک دێنێت[١١٢].

هاوکات لەگەڵ ئەم بارودۆخە (عەلی پاشا) هەڵوێستی خۆی ڕاگەیاند کە دوژمنایەتی ئینگلیز ناکات و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی حکومەت دەبێت[١١٣]، دەکرێت بڵێین تا دەوروبەری کۆتایی هاوینی ساڵی ١٩٢٠ هێزی ئینگلیز توانییان ئاگری شۆڕش لە ناوچەکانی خواروو و ناوەڕاست دامرکێنێتەوە و ئەمەش کاریگەری بەسەر ناوچەکانی کوردستان بە گشتی و هەولێر بە تایبەتی هەبووە و ترسی خستۆتە دڵی سەرۆک هۆزەکان، هەر بۆیە هۆزەکانی (خۆشناو و گەردی) کەوتنە گفتوگۆکردن لەگەڵ دەسەڵاتدارانی ئینگلیز و پەیمانیان بەست کە چیتر دژی ئینگلیز نەوەستن و هەر زیانێکیان لەم ناوچانە لێ کەوتووە بۆیان بژمێرن، سوورچییەکان و ژمارەیەکی زۆر لە سەرۆک هۆزەکانی ناوچەکانی کەرکوک و سلێمانی کەوتنە خۆ نزیککردنەوە لە ئینگلیز[١١٤]، ئەم هەڵوێست گۆڕینانە دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی کە ئامانجەکانی هەڵگەڕانەوەکان دەسکەوتی تایبەتی بووە نەک دەسکەوتە نەتەوەیی و نیشتمانی و ئاینییەکان کە هەوێنی ڕاپەڕینەکان بوون دژ بە ئینگلیز[١١٥]، هەروەها ڕۆڵی هۆزەکانی کوردی لە هەرەس پێهێنانی ڕاپەڕینەکە ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو بە تایبەتی لە مانەوەی دەسەڵاتی ئینگلیز لە هەولێر بە هۆی هەڵوێست و پاڵپشتی کردنی هەندێ ئاغای دزەیی و پیاوانی ئینگلیز لە ناوەوەی هەولێر و ناوچەکانی دەوروبەری. هەر بۆیە کاپتن های دوای ئەوەی سەرکردەکانی هۆزە کوردییەکان لەگەڵیدا کۆدەبنەوە و بەڵێنی جێبەجێکردنی فەرمانەکانی حکومەتی ئینگلیز دەدەن، ئەگەر شەرعیش نەبێت لە ڕوانگەی ئاینییەوە هەر بۆیە (هی) لە یاداشتەکەیدا لەبارەی ئەم کەسانە دەڵێت:

"... ئەوانە ئامادەن فەرمانەکانم جێبەجێ بکەن، ئەگەر پێچەوانەی شەریعەتەکەشیان بێت، ئامادەشن لە پێناوی من بنە کافر..."[١١٦].

حاکمی گشتی لە ٩ ی ئەیلول لە ڕێگای بروسکەیەکەوە ڕەزامەندی ناردنی دوو هێزی سەربازی دەرخست بۆ هەولێر کە هێزێکیان لە موسڵ دێت کە پێکهاتووە لە سریەیەکی سوارەی هیندی و فەسیلێکی پیادەی هیندی و دوو تۆپ. هێزەکەی تر لە کەرکووک دێت کە پێک هاتووە لە سریەی پیادەی سوپای ئینگلیز و سریەیەکی سوارەی هیندی[١١٧]. جێی ئاماژەیە ژمارەیەک لەم کەسانەی کە دژی ئینگلیز بوون هەڵوێستیان گۆڕی و بوونە لایەنگری ئینگلیز پێش هاتنی هێزەکانیان. ئەو ئابڵوقەی کە دەسەڵاتی ئینگلیز لە هەولێر تێیدا دەژیا، بە گەیشتنی ڕەتلی هێزی موسڵ لە ڕێگای گوێڕ لە ١٣ی ئەیلول و گەیشتنی هێزی کەرکووک لە ڕێگای قوشتەپە نەما، دوای گەیشتنی ڕەتلی موسڵ لە ١٣ی ئەیلول بۆ هەولێر و گەیشتنی ڕەتلی کەرکووک لە ڕۆژی ١٤ ی ئەیلول، بارودۆخی شارەکە گۆڕا و ئینگلیز سەرلەنوێ جڵەوی دەسەڵاتیان بەدەست گرتەوە، هەر بەم بۆنەیەش سەرکردایەتی گشتی بەریتانی بڵاوکراوەیەکی دەرکرد کە تێیدا ئاماژە بەوە دەکات کە بارودۆخی هەولێر باشتر بووە، بەڵام خەڵکەکە بە تووڕەییەوە سەیری ئینگلیزەکان دەکەن بە تایبەتی ئەوانەی خەڵکی شار بوون[١١٨].

هەر چەندە تواندرا دەست بە سەر بارودۆخی ناوەوەی هەولێر دا بگیرێت لە لایەن هێزەکانی ئینگلیز و لایەنگرەکانیان، بەڵام بارودۆخی ناوچەکانی دەوروبەری هەولێر وەک (کۆیە، باتاس، ڕەواندز) هەر لە

پەشێوی و شڵەژاوی مایەوە و هەموو کارمەندەکانی ئینگلیز لە ناوچەکانی دەوروبەری هەولێــر گــەڕانەوە ناو شاری هەولێر ئەمەش لەم ڕاگەیاندنە ڕەسمییەی ئینگلیز دەرکەوت کە لە ١٥ ی ئەیلول بڵاوکرایەوە و تێــیدا هاتووە:

"... سـەقـامگیـری گـشـتی هەولێری گرتۆتەوە، هەر لەم کاتەی سـەربازەکـانمان گـەیشـتـوون، بەڵام شوێنی هێزەکانی ناو چیاکان هێشتا ناجێگیرە.."(١١٩).

لە هەمـان ڕۆژدا بروسکەیەکی حاکمی گشتی لە بەغدا گـەیشـتـە حاکمی سیاسی لە هەولێر کە تێیدا ئاماژە بە پێدانی مۆڵەت دەدات بۆ کابتن (هی) و دیاریکردنی جێگری حاکمی سیاسی لە ئاکرێ (مارشل) وەک حاکمی سـیاسی لە هەولێر لە شوێنی (هی) دا و پێش ڕۆیشتنی لە هەولێـر (هی) سـەردانی هەر یەک لە خورشـید ئاغا و ئەحمەد ئەفەندی دەکـات و سـوپاسی خـۆی پێیـان ڕادەگەیەنێت، جێگای ئاماژەیە کە هەر یەک لە خورشـید ئاغا و ئەحمەد ئەفەندی پاداشتی هەڵوێستەکانیان کـران لە لایەن حـاکـمی سـیـاسی یەکەمیان بە ئوتومبێلێکی (فۆرت) و دووەمیـان بە کاتژمێرێکی زێڕ وەک ڕێزلێنانیان(١٢٠).

ئینگلیـزەکـان هەوڵیـان دەدا بە هەمـوو شـێـوازێک ڕێگا بگرن لە دروستـبوونی بەرەیەکی یەکگرتوو لە نێـوان دوژمنەکـانیـان لە دژی، هەر بۆیە لە ڕێگای دووبەرەکیش هەوڵی ئەوەیان دەدا کە کێشە و ناکۆکی لە نێوان هۆزە کوردییەکانی لایەنگرانی



خۆیان و و شۆڕشگێڕەکـان بنێنەوە، هەروەها هەوڵی نانەوەی دووبەرەکی نێـوان کـورد و کەمـینەکـانی داوە لە کـوردسـتـان بە گـشـتی و هەولێـر بە تـایبــــــەتی، بە بەڵـگەی ئەم بڵاوکـراوەیەی کـە لە ٢٢ ی ئەیلولی ١٩٢٠ بڵاویان کـردۆتەوە و تێــیدا هاتووە:

"... کوردانی سورچی هێرشیـان کـردۆتە سـەر ئاشوورییەکـان لە ١٥ی ئەیلول و ئاشـوورییـەکـان توانیـویانە بەرەنگاریان ببنەوە و بیـانگێڕنەوە بۆ پشت زێ، ئەمانە توانیویانە (١٤٠) کــەســیــــان لێ بکوژن و (٦٠) کــەســیـــشــیـــان ژێر ئاو کەوتوون..."(١٢١).

سەبارەت بە چارەنووسی (حاجی ڕەشـیـد ئاغـا) کـە کـابتن های بە سـەرچاوەی ڕاپەڕین ودژایەتیکردنی ئینگلیـزی دادەنا لە هەولێـر لە ٧ی تشـرینی یەکـەمی ١٩٢٠ لە گـوندی تەرجـان دەسـتگیـر دەکـرێت لە لایەن ئەو هێـزەی کـە بە سـەرکـردایەتی (لیتلدیل) دەچێتە گوندەکەی، دواتر دەگـوازرێتـەوە بۆ سـەرای هەولێـر و فـەرمانی لە سێـدارەدانی دەدرێت، و کـاتێک لە بەندیخـانەی هەولێـر بە زنجـیـر کـراوی دەیهـێننە دەرەوە بۆ گـواستنەوەی بۆ بەندیخـانە لە شـاری بەغـدا کـە ئەفـسـەرێکی هیندی ئەم ئەرکەی پێ دەسپێردرێت و کابتن های تا دەرچوونیـان لە دەرگـای قـەڵات یاوەریـان دەبێت، کـاتێک لە سـەر قـەڵات بە کەلەبچە کراوی غـەریبی هەڵدەسـتێت و ڕووی لە گـۆڕسـتـانی گـەورەی شـارەکـەی دەکـات ودەسـتی بەردو ئاسمان بەرز دەکاتەوە و لە خوا دەپاڕێتـەوە کـە ڕزگـاری بکـات، لەم کـاتەدا کـابتن های پێی دەڵێت "... لەو بڕوایەدایـە ئـەو پاڕانەوەیە لـە ڕێگای ئەو مردووانەی گـۆڕسـتـان بە خـوا بگات "، و لەم کـاتەدا ڕەشـیـد ئاغا ڕوو دەکاتە وەرگـێڕەکەی کـابتن (هی) وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت:

"... بەم داگیـرکـەرە بەدفـەڕە بڵێ چۆن ســــەگــــێکی وەک ئـەو لـەو بڕوایەدایە کە قسەکانی بە لاسلکی و ئامێری دەستکردی ئادەمیزاد دەگاتە خزم و کەسوکار و ڕەئیسە گڵاوەکانی خۆی لە لەندەن... منیش دڵنیـام ئەم پاڕانەوە و نزایـەی مـنیش بـە هـۆی پیـاو چاکێکەوە بگاتە خالقی عالەم و بـە زووتـریـن کــــــات لـەم تەنگوچەڵەمەیەم ڕزگار بکات "(١٢٢).

سـەبارەت بە سـەرنەکـەوتنی هەوڵەکـانی نەیارانی ئینگلیـز لە هەولێر و ناوچەکانی تر لە کوردستان کـابتن های لە یاداشـتـەکـەیدا چەند هۆکارێک دەردەخات ودەڵێت:

"... ئەم سەرکەوتنانەی کورد بەردەوام نەبوو، بە هۆی چەند هۆکارێکەوە کە لە پێشەنگیان، بوونی بەشێ لە عەشیرەتەکان بە داردەست و بەکرێگیراوی ئینگلیز، دواتر نانەوەی شەڕی کورد کوژی لە نێوان شۆڕشگێران و بەکرێگیراوانی ئینگلیز، هەر وەکو نەبوونی رێکخستن و چەک و جبەخانەی پێویست... ئەوەتا لە سەرەتای ۱۹۲۰ نزیکەی هەزار کەس لە هێزی لیڤی هێرشیان بردە سەر هێزەکانی شێخ عوبەیدوڵڵای سورچی بە پشتیوانی هێزی ئاسمانی ئینگلیز و دوای روودانی شەڕی خوێناوی دوو ئەفسەری بەریتانی کوژرا، بە هۆی بۆردومانکردنی چڕی هێزی ئاسمانی ئینگلیز هێزی سورچییەکان گەڕانەوە پشت گوندەکان دوای ئەمەش ئینگلیزەکان گوندەکانیان سووتاند و ئاژەڵەکانیان تالان کردن... "(۱۲۳).

بەم جۆرە دوای گەڕانەوەی دەسەڵاتی ئینگلیز لە هەولێر و ناوچەکانی دەوروبەری قۆناغێکی نوێ لە مێژووی ئەم شارە دەستی پێکردەوە، دەکرێت بڵێین هەر چەندە شۆڕش و راپەرینەکانی هەولێر و ناوچەکانی تر لە کوردستان و عیراق نەبووە هۆی دەرکردنی ئینگلیز، بەڵام لە هەمان کاتدا بوو بە هۆی گۆڕانکاری گرنگ لە ژیانی سیاسی هەموو عیراق کە ئەم قۆناغە مێژووییەش بە دامەزراندنی یەکەمین حکومەتی کاتی نیشتمانی لە عیراق بە سەرۆکایەتی (عەبدولرەحمان النقیب) دەست پێدەکات.

**پەراوێزەکان:**

(۱) سروه اسعد، المصدر السابق، ص ٦٤.

(۲) لونکریك، اربعة قرون...، ص ۱٦۲.

(۳) وەک شارۆچکەی خانەقین و کفری و رواندز. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: مەمدوح مزووری، سەرچاوەی پێشوو، ل۲۷۷.

(٤) وەک لە بەندی حەوتەمی رێکەوتننامەی مۆدرۆسدا هاتووە کە لە هەر شوێنێک ئاسایشی هاوپەیمانەکان بکەوێتە مەترسییەوە، مافی ئەوەیان هەیە ئەو شوێنە داگیر بکەن. بڕوانە: فاضل حسین، کێشەی ویلایەتی موسل، و: محەمەد شاکەلی، سلێمانی، ۱۹۹۹، ل ۷-۸، عزیز الحاج، القضیة الکردیة في العشرينات، ط(۲)، مطبعة الانتصار، بغداد، ۱۹۸۵، ص۳۱.

(٥) بڕوانە: کمال مظهر أحمد، كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، ترجمة: محمد الملا عبدالكريم، ط(۲)، بغداد، ۱۹۸٤.

(٦) وەک ناوچەکانی (ئاکرێ، زێبار، ئامێدی، زاخۆ، دهوک، کۆیە، رواندز). بڕوانە: ستیفن همسلي لونكريك، العراق الحديث من سنة ۱۹۰۰الى سنة ۱۹٥۰، ترجمة: سليم طه التكريتي، ط(۱)، بغداد، ۱۹۸۸، ج(۱)، ص۱٥۹، خليل مصطفي عثمان، كوردستان الجنوبية (العراق) في السنوات الاحتلال والانتداب البريطانيين ۱۹۱۸-۱۹۳۲، رسالة ماجستير (غ.م)، كلية الاداب، جامعة دهوك، ۲۰۰٥، ص ۱۳-۱٥.

(*) وشەیەکی تورکییە بە مانای (پردی زێڕ) دێت و دەکەوێتە خوارووی هەولێر.

(۷) هادي رشيد الجاوشلي، تراث اربيل...، ص ۲۳.

(۸) خليل مصطفي، المصدر السابق، ص ۲۰.

(۹) هادي رشيد الجاوشلي، تراث اربيل...، ص ۲٤.

(۹) دبليو. ار. هي، المصدر السابق، ج (۱)، ص ۱٤٤.

(۱۰) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: المصدر نفسه، ص ۱٤۷ - ۱٤۸.

(۱۱) سەرکردەی سوپای تورک لە بنەڕەتدا خەڵکی قەفقاز بووە و بە زمانێکی تورکی نارێک قسەی کردووە. المصدر نفسه، ص۱٥۱.

(۱۲) قەزای هەولێر لە لایەن (قائیمقام)ەوە بەڕێوە دەبردرا کە زۆربەی قایمقامەکانی قەزای هەولێر بە رەگەز تورک بوون، بەڵام لە هەندێ کاتدا کوردیش ئەم پۆستەیان وەرگرتووە و لەلایەن سوڵتانەوە هەڵبژێردراون لەمانەش (عبدالله پاشای کوڕی عباس ئاغای ئەحمەدی) کە لە ساڵی ۱۸۹۰ کراوە بە قائیمقامی هەولێر. بڕوانە: ألبرت. م. منتشاشغيلي، المصدر السابق، ص۲۱- ۲۲، شیرزاد شيخ محەمەد، المصدر السابق، ص ۱۸٥.

(۱۳) دبليو. ار. هي، المصدر السابق، ج(۱)، ص۱٥۲.

(۱٤) المصدر نفسه، ص ۱۹۷.

(۱٥) ئیسماعیل شکر رسول، المصدر السابق، ص۳٤.

(*) پارەیەکی هیندییە تا دەرچوونی پارەی نیشتمانی عێراقی لە ساڵی ۱۹۳۲ کاری پێکراوە. یەک روپیە دەکاتە (۷٥) فلس.

(۱٦) مختارات من كتاب الموصل وكركوك في الوثائق العثمانية، ت: خليل علي مراد، ط(۱)، مطبعة شڤان، السليمانية، ۲۰۰٥، ص ۱۷٤.

(۱۷) دبليو. ار. هي، المصدر السابق، ج(۱)، ص ۲۱۱ - ۲۱۲.

(۱۸) كمال مظهر أحمد، المصدر السابق، ص ۳۹.

(۱۹) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: دبليو. ار.

هی، المصدر السابق، ج(١)، ص ٢١٤ - ٢١٥.
(٢٠) هادی رشید الجاوشلی، تراث اربیل...، ص ٢٤.
(٢١) مختارات من کتاب الموصل...، ص ١٧٤.
(٢٢) دبلیو. ار. هی، المصدر السابق، ج(١)، ص ٢١٢.
(٢٣) دوای گۆڕینی دەسەڵاتی عوسمانی بە دەسەڵاتی ئینگلیزەکان لە هەولێر قوتابخانەکان داخران و بەڵام دوای ئەوەی (کاپتن فارل) گەڕانێکی پشکنینانەی لە هەندێ ناوچەی کوردستانی باشوور کرد، قوتابخانە سەرەتاییەکانی هەولێریش کرانەوە. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: محەمەد عبدالله کاکەسور، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٤.
(٢٤) هادی رشید الجاوشلی، تراث اربیل...، ص ٢٤.
(٢٥) هادی رشید الجاوشلی، تراث اربیل...، ص ٢٤، مولود بێخاڵی، هەولێرم وادیوە.....، بەرگی دووەم، ل ٢٧.
(٢٦) مختارات من کتاب الموصل....، ص١٧٤
(٢٧) المصدر نفسه، ص ١٧٤، دبلیو. ار. هی، المصدر السابق، ج(١)، ص ١٩٩-٢٠٠.
(٢٨) المصدر نفسه، ص ٢٠٠، چاوپێکەوتنێک لەگەڵ پ. د. ئەرسن موسی رشید، لە ٢٥ /٢٠٠٧/٥.
(٢٩) مختارات من کتاب الموصل....، ص١٧٤
(٣٠) دبلیو. ار. هی، المصدر السابق، ج(١)، ص ١٩٧.
(٣١) کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەڕەیەک لە.....، بەشی یەکەم، ل١٨٥.
؟؟؟ لە دێی (عەنکاوە) لە سەر گردێک دەنێژرێت.
(٣٢) بۆ زیاتر زیاتر زانیاری بڕوانە: دبلیو. ار. هی، المصدر السابق، ج(١)، ص ٢٠١.
(*) یەکێک بوو لەو کۆمەڵە سیاسییانەی ڕووناکبیرانی عەرەب دایانمەزراند دوای شەڕی باردگای بەرزی لە شام بوو، لقی موسڵ یەکێک لە لقە هەرە چالاک و دڵسۆزەکانی بوو. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: عبدالفتاح علي البوتاني، الحياة الحزبية في الموصل ١٩٢١ ـ ١٩٥٨، ط(١)، اربيل، ٢٠٠٣، ص ٥٠ - ٦١.
(٣٣) کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەک......، بەشی یەکەم، ل١٨٦.
(٣٤) دبلیو. ار. هی، المصدر السابق، ج(١)، ص ٢٠٢، چاوپێکەوتنێک لەگەڵ حاکم ناظم یونس، لە ٢٠٠٧/٣/٢٦.
(٣٥) لەبارەی پێکهاتەی یەکەم حکومەتی کاتی عێراق بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، تاريخ العراق السياسي الحديث، ط (٦)، مطبعة دارالكتب، بيروت، ١٩٨٣، ج(١)، ص ١٩٢-١٩٣.
(٣٦) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە:دبلیو. ار. هی، المصدر السابق، ج(١)، ص ٢١٩-٢٢٣.
(٣٧) سەرەتاکانی دروستبوونی پەیوەندی کورد و ئینگلیز دەگەڕێتەوە ساڵی ١٩١٧ دوای داگیرکردنی شاری بەغدا و یەکەمین هەوڵیش لەم بوارەدا (شێخ مستەفا باشا باجلان) داویەتی لە خانقین، و دوای گەیشتنی هێزەکانی ئینگلیز بە کەرکوک شێخ مەحمودی حەفید پەیوەندی بە ئینگلیز کردووە، بەڵام یەکەمین پەیوەندی نێوان هەولێر و ئینگلیز دەگەڕێتەوە بۆ دوای گەیشتنی هێزەکانی ئینگلیز بۆ کەرکوک و ئالتون کۆپری کە ئاگاداری سەرۆکی شارەوانی هەولێر (ئەحمەد عوسمان) یان کردووە کە ئینگلیز بە نیازە بێتە هەولێر و شارەکە لە دەوڵەتی عوسمانی وەربگرێت. دوای ئەوەی هەولێر بوو بە موتەسەرفیەت ئەحمەد عوسمان بووە یەکەم موتەسەریف تا١ی نیسانی ١٩٢٧ بە موتەسەرفی هەولێر دەمێنێتەوە. بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی مێژووی موتەسەرفەکانی شاری هەولێر بڕوانە: اربيل (هەولێر) بين الماضي والحاضر، من منشورات المهرجان السنوي الثالث لمدينة اربيل، اربيل، ١٩٨٧، ص ٢٣-٣١.
(٣٨) عثمان علي، چەند لێکۆڵینەوەیەک لەبارەی بزاڤی هاوچەرخی کورد، وەرگێڕانی: کامەران جمال بابان، ج(١)، سلێمانی، ٢٠٠٦، بەشی دووەم، ل٣١ -٣٣.
(٣٩) وليد حمدي، الكرد وكردستان في الوثائق البريطانية (دراسة تأريخية وثائقية)، لندن، ١٩٩١،، ص ٧٨.
(٤٠) المصدر نفسه، ص٧٩.
(٤١) المصدر نفسه، ص ٨٢.
(٤٢) المصدر نفسه، ص٨٢.
(٤٣) المصدر نفسه، ص٨٥.
(٤٤) المصدر نفسه، ص ٨٧ -٨٨.
(٤٥) ڕاپۆرتی جێگری حاکمی سیاسی بەریتانی لە کۆیە بۆ حاکمی سیاسی هەولێر لە ٧ی مارس ١٩٢٠.
(٤٦) ڕاپۆرتی جێگری حاکمی سیاسی بەریتانی لە کۆیە بۆ حاکمی سیاسی هەولێر لە ٩ی ئاداری ١٩٢٠.
(٤٧) المصدر نفسه، ص ١٠٥.
(٤٨) عثمان علی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٦.
(٤٩) هادي رشيد، تراث اربيل...، ص٢٤.
(٥٠) مختارات من کتاب الموصل.....، ص ١٧٤.
(٥١) هادی رشید چاوشلی، هەولێر لەگەڵ...، ل ٢٠، دبلیو. ار. هی، سنتان فی کردستان...، ج(١)، ص١٥٢.

(٥٢) مختارات من كتاب الموصل....، ص ١٧٤.
(٥٣) هادي رشيد الجاوشلي، تراث اربيل...، ص٢٤.
(٥٤) سەرەتای دروستبوونی هێزی پۆلیس لە دەوڵەتی عوسمانی بە پێی سیستەمێکی تایبەتی بوو کە پلەکانی پێک هاتبوو لە (نامز بولیس، مأمور بولیس، معاون قومسیر، قومسیر، مأمور مرکز) و هەر ولایەتێکی (موسل و بەغدا و بەسرە) بەڕێوەبەری پۆلیسی هەبوو و ژمارەی پۆلیسەکانی ویلایەتی موسل پێش شەڕی یەکەمی جیهانی دەگەیشتە (١٠٠) پۆلیس، بەڵام سەبارەت بە قەزاکان لەوانەش قەزای هەولێر لە سنووری (٤-٥) پۆلیسی هەبووە و ئەم ژمارەیەش لە شوێنێ بۆ شوێنێکی تر جیاوازی هەبووە بە گوێرەی ژمارەی دانیشتوان و شوێنی جوگرافییەکەی و بەڕێوەبەری پۆلیس لە قەزاکەدا نەبووە، بەڵام بنکەی تایبەت بە پۆلیس هەبووە و بەڕێوەبەری بنکەی تێدا بووەو لە ناحیەکانیش پۆلیس نەبووە. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: المملكة العراقية، وزارة الداخلية، الدليل العراقي الرسمي لسنة ١٩٣٦ (موسوعة سنوية، ادارية، اجتماعية، اقتصادية، تجارية، زراعية، مصورة)، بغداد، ١٩٣٦، ص ٢٠٠-٢٠٢.
(٥٥) بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی سەرەتاکانی دروستبوونی هێزی لیڤی و بەرەو پێش چوونی بڕوانە: جی. گیلبرت. براون، قوات الليفي العراقية ١٩١٥-١٩٣٢، ت: مؤيد ابراهيم الونداوي، ط(١)، مطبعة شڤان، السليمانية، ٢٠٠٦.
(٥٦) دبليو. ار. هي، سنتان في كردستان...، ج(١)، ص١٩٩-٢٠٠، کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەڕەیەک....، بەشی یەکەم، ل ١٦٨.
(٥٧) عبدالرزاق محمد اسود، موسوعة العراق السياسية، ط(١)، لبنان، ١٩٨٦، مج(٢)، ص٣٦٢.
(٥٨) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: عبدالمنعم الفلاحي، ثورتنا في شمال العراق ١٩١٩-١٩٢٠، ط(١)، مطبعة شفيق، بغداد، ١٩٦٦، ج(١)، ص ٣٤-٩١، عزيز الحاج، المصدر السابق، ص ٣٤ - ٣٥
(*) (دینو) وشەیەکە بە مانای شێت دێت.
(٥٩) عبدالرزاق محمد اسود، المصدر السابق، ص ١٤٦، عبدالمنعم الفلاحي، المصدر السابق، ص٣٤ ـ ٣٥، خليل مصطفى، المصدر السابق، ص٣١-٣٥.
(٦٠) عمار يوسف عبدالله العكيدي، السياسة البريطانية تجاة عشائر العراق ١٩١٤-١٩٤٥، رسالة ماجستير (غ.م)، كلية الاداب، جامعة الموصل، ٢٠٠٢، ص ٣٠٠، سعدي عثمان حسين، بزاڤی رزگاریخوازی کوردی، چ(١)، هەولێر، ٢٠٠٦، ل٩٣.
(٦١) کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەک...، بەشی یەکەم، ل ١٦٨، السر ارنولد ويلسن، الثورة العراقية، ط(٢)، لبنان، ٢٠٠٤، ص ١١٦.
(٦٢) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: البرت فتشاشيغيلي، المصدر السابق ص٣٢١، عبدالرزاق الحسني، تاريخ العراق....، ص ٣٠٦- ٣٠٧.
(٦٣) دبليو. ار. هي، سنتان في كردستان...، ج(١)، ص٢٢١، عوسمان عبدالرحمن سمایل، هەولێر و شۆڕشی ١٩٢٠ ی عێراقی، هەولێر "گۆڤار"، ژ(١٦)، ٢٠٠٢، ل ١٠٩.
(٦٤) السر ارنولد ويلسن، المصدر السابق، ص ١١٦.
(٦٤) كمال مظهر أحمد، ثورة العشرين في الاستشراق السوفيتي، ط(١)، مطبة الزمان، بغداد، ١٩٧٧، ص ٧٤-٧٥.
(٦٥) عوسمان عبدالرحمن، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٩.
(٦٦) دبليو. ار. هي، سنتان في كردستان...، ج(٢)، ص ١٠٢.
(٦٧) اي. ام. هاملتون، طريق في كوردستان، ترجمه:جرجيس فتح الله، ط(٢)، اربيل، ١٩٩٩، ص٢٣-٢٤.
(٦٨) دبليو. ار. هي، سنتان في كردستان...، ج(٢)، ص١٠٢.
(٦٩) كمال مظهر أحمد، ثورة العشرين....، ص ٧٥، کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەک...، بەشی یەکەم، ل ١٦٨.
(٧٠) دبليو. ار. هي، سنتان في كردستان...، ج(٢)، ص ١٠٤، عوسمان عبدالرحمن، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٩.
(٧١) عوسمان عبدالرحمن، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٩.
(٧٢) السر ارنولد ويلسن، المصدر السابق، ص ١١٦.
(٧٣) دبليو. ار. هي، سنتان في كردستان...، ج(٢)، ص ١٠٤.
(٧٤) المصدر نفسه، ص ١٠٥.
(٧٥) المصدر نفسه، ص ١٠٥.
(٧٦) المصدر نفسه، ص ١٠٥.
(٧٧) چاوپێکەوتنێک لەگەڵ پ. د. ارسن موسى رشيد، لە ٢٧ی تەمووزی ٢٠٠٧، چاوپێکەوتنێک لەگەڵ حاجی تاهیر تەرجانی، لە ٥ی ئایاری٢٠٠٧.
(*) یەکێکە لە سەرۆکەکانی هۆزی دزەیی و لە ناوچەی کەندێناوەی سەر بە قەزای مەخمور دادەنیشێت، ڕۆڵی گرنگی هەبووە لە مانەوەی دەسەڵاتی ئینگلیز لە هەولێر و جێگای متمانەی کاپتن هی بووە و حاکمی گشتی ویلسن بە پیاوێکی کەللە ڕەق

وەسفی دەکات. بڕوانە: لوسیان رامبو، الكرد والحق، ترجمة: عزيز عبدالاحد نباتي، ط(١)، اربيل، ١٩٩٨، ص ٧٩.
(٧٨) دبليو. ار. هي، سنتان في كردستان...، ج(٢)، ص١٠٦.
(٧٩) السر ارنولد ويلسن، المصدر السابق، ص ١١٧، كمال مظهر احمد، ثوره العشرين....، ص ٧٦.
(٨٠) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: عوسمان علی، سەرچاوەی پێشوو، بەشی دووەم، ل ٣١ – ٤٠.
(٨١) دبليو. ار. هي، سنتان في كردستان...، ج(٢)، ص١٠٧، لونكريك، المصدر السابق، ج (١)، ص ٢٠٣.
(*) ئەفسەرێکی (مبيعات محليه) بوو.
(٨٢) دبليو. ار. هي، سنتان في كردستان...، ج(٢)، ص١٣٨.
(٨٣) السر ارنولد ويلسن، المصدر السابق، ص ١١٩.
(٨٤) دبليو. ار. هي، سنتان في كردستان...، ج(٢)، ص ١٣٨.
(٨٥) عوسمان عبدالرحمن، سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٣.
(٨٦) دبليو. ار. هي، سنتان في كردستان...، ج(٢)، ص٢٢١، عبدالرزاق محمد، المصدر السابق، ص٣٦٢.
(٨٧) یەکێکە لە هێڵەکانی ئاسنی عیراق بە هێڵی (بەغدا – شەرگات – موسڵ) دەناسرێت، درێژی ئەم هێڵە (٤٣٣)کم دەبێت. بڕوانە: دليل العراقي الرسمي....، ص ٤٨.
(٨٨) دبليو. ار. هي، سنتان في كردستان....، ج(٢)، ص١٣٩-١٤٠.
(٨٩) المصدر نفسه، ص ١٤١
(٩٠) دبليو. ار. هي، سنتان في كردستان...، ج(٢)، ص١٤٢.
(٩١) المصدر نفسه، ص١٤٤.
(*) ناوی حوسێن کوڕی محەمەد کوڕی بایز ئاغای دزەییە، لە ساڵی ١٨٧٠. لە دایک بووە لە خولی شەشەم و نۆیەمی وەک نوێنەری لیوای هەولێر دەبێتە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراق، حوسێنی مەلای ئاغای گوندی قازیخانە بووە و لە ساڵی ١٩٥٧ مردووە. چاوپێکەوتنێک لەگەڵ رەقیب حوسێن مەلا، لە ٢٤ ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٢
(٩٢) هەمان چاوپێکەوتن، هادی رشید، تراث اربيل....، ص ٢٥.
(٩٣) دبليو. ار. هي، سنتان في كردستان...، ج(٢)، ص١٤٥.
(٩٤) المصدر نفسه، ص١٤٣.
(٩٥) المصدر نفسه، ص١٤٥.
(٩٦) المصدر نفسه، ص ١٤٥.
(٩٧) المصدر نفسه، ص١٥١.
(٩٨) المصدر نفسه، ص١٤٦-١٤٧.
(٩٩) ارنولد ويلسن، المصدر السابق، ص١١٩.
(١٠٠) دبليو. ار. هي، سنتان في كردستان...، ج(٢)، ص١٤٩.
(١٠١) کەماڵ مەزهەر، چەند لاپەڕەیەک...، بەشی یەکەم، ل ١٦٨.
(١٠٢) ارنولد ويلسن، المصدر السابق، ص١١٩.
(١٠٣) دبليو. ار. هي، سنتان في كردستان...، ج(٢)، ص١٤٩.
(١٠٤) ارنولد ويلسن، المصدر السابق، ص١٢٠-١٢١.
(١٠٥) عوسمان عبدالرحمن، سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٠.
(١٠٦) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: دبليو. ار. هي، سنتان في كردستان...، ج(٢)، ص١٤٩.
(١٠٧) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: المصدر نفسه، ص ١٥٠، ارنولد ويلسن، المصدر السابق، ص١٢١- ١٢٢.
(١٠٨) دبليو. ار. هي، سنتان في كردستان...، ج(٢)، ص ١٥٠.
(١٠٩) عبدالرزاق محمد، المصدر السابق، ص ٣٦٢-٣٦٣، عوسمان عبدالرحمن، سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٠.
(١١٠) کەماڵ مەزهەر، چەند لاپەڕەیەک...، بەشی یەکەم، ل ١٦٨، دبليو. ار. هي، سنتان في كردستان...، ج(٢)، ص ١٥٠.
(١١١) المصدر نفسه، ص ١٥٣.
(١١٢) المصدر نفسه، ص ١٥٤.
(١١٣) المصدر نفسه، ص ١٥٥.
(١١٤) کەماڵ مەزهەر، چەند لاپەڕەیەک...، بەشی یەکەم، ل١٦٩ - ١٧٠.
(١١٥) ايوب بارزاني، المقاومة الكردية للاحتلال ١٩١٤-١٩٥٨، ط(١)، دار نشر حقائق المشرق، ٢٠٠٢، ص٣٠.
(١١٦) عوسمان عبدالرحمن، سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٠-١١١.
(١١٧) دبليو. ار. هي، سنتان في كردستان...، ج(٢)، ص١٥٨.
(١١٨) عبدالرزاق محمد اسود، المصدر السابق، ص ٣٦٣، کەماڵ مەزهەر، چەند لاپەڕەیەک...، بەشی یەکەم، ل١٦٨.
(١١٩) عوسمان عەبدولرەحمان، سەرچاوەی پێشوو، ل ١١١.
(١٢٠) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: دبليو. ار. هي، سنتان في كردستان...، ج(٢)، ص١٦٤، ١٧٢.
(١٢١) كاظم مظفر، ثورة العراق التحررية عام ١٩٢٠، ط(١)، النجف، ١٩٧٢، ج(١)، ص ١٩٣.
(١٢٢) ڕووداوی گرتنی ڕەشید ئاغا و گواستنەوەی بۆ بەغدا بووە بە هۆی گرنگی پێدانی لە لایەن نووسەران و ئەدیبانی هەولێر کە لە چوارچێوەی چیرۆک و ڕۆمان بنووسرێتەوە: بڕوانە: فەرهاد پیرباڵ، حیکایەتەکانی باوکم (ڕۆمان)، ج(١)، هەولێر، ٢٠٠٧، ل ١٣١.
(١٢٣) عوسمان عەبدلرەحمان، سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٤- ١١٥.

# تورکەکان[1]

تاهیر ئەحمەد حەوێزی

کە ئینگلیزەکان لە شەڕی دەربەندی شکان و گەڕانەوە کۆیە، لە «بیتوێن» زۆریان لە قوڕ و ئاوی برنجی عاسێ بوون[2]. ئینگلیزەکانی کە لە کۆیە بوون، هەندێکیان لەسەر گردی «شێخ مستەفا»ش هەڵیاندابوو. مەنجەڵی چێشتیان لەسەر ئاگری بوو و دەیانڕشت، بە پەلە باریان کرد و کۆیەیان بەجێهێشت، گەڕانەوە هەولێر.

ئینگلیزەکان لەبەر دەرکی مزگەوتی گەورە راوەستان. ئەوەی لە نوێژی دەهاتەدەر دەیانگرتن. لەجیاتی ولاغ، جەنازەی کوژراوەکانیان و بریندارەکانیان بە بێگار پێ هەڵدەگرتن. دارەبەستیان بۆ دەکردن، هەر بە چوار کەسان یەکێکیان هەڵدەگرت، هەتا «تەقتەق»یان دەبردن. زۆر پیاوی بە شان و عەبایان بەم چەشنە پێش خۆیان دا. هەندی ئەفسەری ئینگلیزی هیچیشیان نەبوو. لە ترسان خۆیان نەخۆش و شەل کردبوو، تا بە پێیان نەڕۆن، دەچوونە کۆڵی ئەو زەلامانە!

لەو شەڕەدا، کوردەکان خۆیان بە کوشت دەدا. کەچی چەند پەڕاگەندەیەکی تورک، هونەرەکەیان کردبووە ئی خۆیان. تورکیا بەو ناوەی کە «ویلایەتی موسل» بە شەڕ نەگیراوە، سوودی لێ ببینێ.

لەپاش شەڕی دەربەندی رانیە[3]، دەشتی «بیتوێن»ی مەیتێکی زۆری لەشکری «ئینگلیزی» لێ کەوتبوو. کێخوا «حەوێز»ی «شاخەپیسکە» دەیگوت: ("«سیک و بانی» ئێوە لە کوێ؟ چەقەڵی «بیتوێن» ئێوە لەکوێ؟!")[4].

کە ئینگلیزەکان رۆیشتن، «جەمیل ئاغا» و «عەولا ئاغا» - کە پیاوێکی زۆر بە دەم بوو - لە سەرایە کۆبوونەوە. «جەمیل ئاغا» گوتی: "با جەنابی «مەلا محەمەد»یش بانگ بکەین." «عەبدوڵڵا ئاغا» قیت دەبێتەوە و دەڵێ: "ئەو مەلا و دەست و پێ سپییە، حەقی بەسەر ئیشی واوە چییە؟" لەگەڵ ئەمەش مەجلیسێکی نیشتمانی بۆ ئیدارەی شارەکە دادەنێن و جەنابی مەلای دەکەنە سەرۆکی مەجلیسەکە و وەزیفەی قازییەتیشی هەر هەبێ، «جەمیل ئاغا» و «کەریم ئاغا»ی «حەوێزی» و «رەسول ئاغا» و مەلا حەوێز ئاغای غەفوریش ئەندام بوون. لە مزگەوتی گەورە کۆدەبنەوە و سوێند دەخۆن، کە خیانەت لە واجبات نەکەن[5].

«عەبدوڵڵا ئاغا» ویستی ببێتە قائیمقام، رەئیس مەجلیس

لایەنگیری «جەمیل ئاغا» بوو. ناخۆشی کەوتە بەینی ئەندامەکان، «مەلا حەویز ئاغا»ش ئیستفادەی لێ کرد.

«شێخ عەزیز»ی «شێخ مەعرووف»ی بە (٣٠ - ٤٠) سواری ویستی مالّی باریکا و بچێتە «هەڵەبجە». «جەمیل ئاغا» موافەقەتی کرد.

ئەوجا چوون تورکەکانیان لە دیوی «رانیە» هێنا. «کەریم ئاغای حەویزی» سەرکردەی سوارەی «حەویزی»یان، «مەلا حەویز ئاغا»ش سەرکردەی سوارەی غەفوورییەکان، ئەمانە هەتا لای «سەرخمە»ی چوون. پیاوانی تری کۆییش هەتا بن گونبەتی «هەیبەت سوڵتانی» چوون.

«رەمزی بەگ» بووە میوانی «مەلا ئەحمەد ئاغا»ی «مام سلێمانی» غەفووری، خۆی کردە قایمقام. «ناجی»ش کاروباری عەسکەری بە دەستەوە گرت، «حاجی ئاورەحمان ئاغا»ی مام سلێمانی بووە «مەئمور»ی «مەرکەز». قادری سوڵتانی، تۆفیقی خالیدی، عەزیزی مستەفا ئاغای رەسوڵی جەلیل ئاغای بوونە جەندرمە. «حەمەد»ی «مام خدر»ی چاکەتێکی عەسکەری لەبەرکرد و مەترەقێکی بەدەستەوە گرت و خۆی کردە قانوون[٦].

تورکەکانیش «عەبدولفەتاح ئاغای عەبدوڵلاّئاغا»یان کردە بەڕێوەبەری ناحیەی تەقتەق.

تورکەکان لەسەر قوڵغەکانی قشڵەی چەڵەگەی داری درێژیان دانابوو تا تەیارە بە لوولە تۆپی تێبگا. قەشەیان لە حەوشی سەرایە، «مالم»ی جوولەکانیشیان لە حەوشی قشڵەی بەستبۆوە. دەیان گوت: «ئەوانەش کافرن لەبەر ئەمانە «ئینگلیز» ئەو جێیانە بۆردومان ناکا. بەڵام دیانەکان مراجەعەیان بە «سالح ئاغا»ی «غەفوری» کرد و قەشەیان بەردا.

**پەراوێزەکان**

١. هەندێک دەڵێن: «ئینگلیز پیلانی شەڕی دەربەندی داناوە، تا ناوچەی «پشدەر» چۆڵ بکا و چەک و ئەسلەحەی بخاتە دەست عەشیرەتەکانی ئەو ناوە».

٢. تەماشای کتێبی مستەر ئەدمۆنس «کورد و تورک و عەرەب» بکە.

٣. کە پێشان بە دەربەندی «رەمکان» ناسراوە.

٤. ئینگلیزەکان ولاّغێکیان دابووە «حاجی کاک ئەسعەد» سەری رادەکێشا، «مەلا رەشیدی عەیشانی» دەڵێ: «کو دەبی ئەتوو ولاّغی رابکێشی، بیدە من»، ولاّغەکەی لێ وەردەگری، کە دەزانن هیچی پێ نییە، ئەوجا مردووەکی بە کۆڵی حاجی کاک ئەسعەد دادەدەن. هەتا تەقتەق، ئەوجا لە «مەلا رەشید»ی تووڕەببوو، هەموو جاری قسەی پێدەگوت.

٥. کە «جەمیل ئاغا» دەگەڕێتەوە ماڵ، بە حەوشی مزگەوتی گەورەدا دەڕوا، کە ئەوسا دەرگەی سەرایە بەرامبەر مزگەوتی گەورە دەبی، مەلای گەورەش لە حەوشی مزگەوتەکە هاتوچۆی دەکا و بە «جەمیل ئاغا»ی دەڵێ: «جەمیل ئاغا ئەوە چ بوو؟» - توومەز قسەکەی بیستبۆوە - «مادام ئەمن حەقم نەبی، پرسیشم پێ مەکەن». «جەمیل ئاغا»ش دەڵێ: «چ نەبووە، چ نەبووە».

٦. ئێستا (١٩٨٢) زۆر کەس ماون، کە ئەو دەورەیان بە باش و بە دووروودرێژی دیوە و لەبیرماوە، بەڵکو تێیدا بەشداریش بوون.

* ئەم بابەتە لە کتێبی «مێژووی کۆیە»ی، تاهیر ئەحمەد حەویزی، بەرگی دووەم، چاپی یەکەم، ١٩٨٤ وەرگیراوە.



# هەولێر و شۆڕشی «١٩٢٠»ی عیراق

عوسمان عەبدولڕەحمان سمایل

شۆڕشی بیستی عیراق یاخود وەکو لە هەندێ سەرچاوەی بیانی و بەرهەمی رۆژهەڵاتناساندا هاتووە، راپەڕینی بیستی عیراق رووداوێکی بێ بەها و بێ نرخ نییە، چونکە چەندین دەستکەوتی گەورەی لێکەوتەوەو گرنگترین دەستکەوتیشی دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقی عەرەبی بوو[٢].

ئەم شۆڕشە لە ماوەی کورتی ژیانیدا، کە نزیکەی پێنج مانگێکی خایاند، لە کۆتایی حوزەیران تا وەکو نزیک ناوەڕاستی تشرینی یەکەمی (١٩٢٠) چەندین پێکدادان و یاخیبوون و پەشێوی و خوێن رشتنی تێدا بەدی دەکرێت و کوردیش رۆڵی گرنگی تێدا بینیوە[٣]. لێرەشدا ئێمە بە پێی توانا باس لە بارودۆخی شاری هەولێر دەکەین، ئەوەش کە دەمەوێ لە سەرەتادا بیخەمە بەر چاو ئەوەیە لە سەردەمی ئەم شۆڕشە و، لە دواتریشدا چارەنووسی ویلایەتی موسڵ تا وەکو ساڵی ١٩٢٦ دیار نەکراو و نەزانراو بووە. هیچ پەیوەندییەکی لەگەڵ بەغدا و حکومەتی دانەمەزراوی عێراقی عەرەبیدا نەبووە، مەگەر تەنیا ئەوە بوو بێ کەوا بەرپرسی یەکەمی بەریتانی لەم ناوچانەدا لە بەغدا بووە، ئەگینا زیاترنا، پێشم وایە کوردستان ناوچەیەکی دابڕاو بووە و لەگەڵ دەوروبەرەکەی و ئەگەر چالاکی و کاری سیاسیشی ئەنجام دابێت، ئەوا سەربەخۆ و خۆکرد بووە، ئەگەر لەگەڵ دەوروبەریدا ببەسترێتەوە، ئەوا پێم راست نییە، ئەنجامدانی کاری سیاسیشی تەنها بریتی بوو لە رەخسانی بوارێک بە هۆی کزبوونی دوژمنی هەر دوو لایان. ئەویش ئەم بوارەی قۆستۆتەوە و نارەزایی خۆی دەربڕیوە. بە هۆی شڵەژانی بارودۆخی بەرپرسە بەریتانییەکان و بێ هێز بوونیان، چالاکانەتر هاتوونەتە دەست و کاری خۆیان ئەنجام داوە. هەر وەکو لە سەرچاوەکاندا هاتووە بزووتنەوەی نیشتمانی، لە دوای داگیرکردنی لە لایەن بەریتانیاوە، لەم ماوەیەدا مۆرکێکی ناوخۆیی بە خۆیەوە گرتووە، ئەم راپەڕینانەش، کە روویانداوە لە سنووری ئەو ناوچەیە تێپەڕی نەکردووە، کە لێی بەرپا بووە، هەروەکو یەکەمین راپەڕین لەم کاتەدا، راپەڕینەکەی عەشیرەتی گۆیان بوو لە زاخۆ لە کۆتایی ئاداری ١٩١٩. کەوا بە هۆی خراپی سیاسەتی دەسەڵاتدارە ئینگلیزەکانەوە بەرپا بوو لە

فراوانبووندا بوو تا وەکو لە کۆتایی هاوینی ئەو ساڵە زۆر بە گرانی توانییان لە ناوی بەن.[٤] ئەمەش لەوانەیە شتێکی تریش بە دیار بخات: کە ئەم راپەرین و رووبەروو بوونەوانە بە هۆی پاڵنەری نەتەوەیی و سەربەخۆیی بووە. هەرواش بوودوە دواتر بۆ دەستکەوتی ئابووری و کۆمەڵایەتی و ئایینی بووە، لە دواییشدا ئەم رووداو و چالاکییانە لە سەرچاوەکانی چوونەتە دامێنی رووداوەکانی دیکەی شۆرشی بیستی عێراقی و لەوێدا باس بکرێن لەگەڵ ئەم هەموو رووداو و چالاکییانەی کورد دژ بە داگیرکەرە ئینگلیزەکان. کەچی (د. عەبدوللا ئەلفەیاز)، رای وایە کەوا رۆڵی بەشەکانی باکووری عێراق - بەگشتی - لە شۆرشی بیستدا زۆر کەم بووە. یاخود نەبووە[٥] ئەم رایەش هەر چۆنێک سەرچاوەی گرتبێ دوورە لە راستییەوە، چونکە هەر لە سەردەمی ماوەی تەمەنی شۆرشەکەدا چەندین چالاکی دیارو بەرچاو ئەنجامدراوە، کە ناکرێ پشتگوێیان بخەین. ئەوەی ئێمەش لێرەدا لێی دەدوێین تەنیا ئەو چالاکیانەیە، کە لە شاری هەولێردا روویانداوە.

(عەبدولرەزاق محەمەد ئەسوەد) دەنووسێ: " لە راستیدا شۆرش لەم لیوایەدا - (لیوای هەولێر) - رانەگەیاندرا، تەنیا شێواوی گەیشتە ئەوپەری، بە شێوەیێ بارەکە لە سەر رۆخی شۆرشدا بوو".[٦] کەچی هەر ئەم نووسەرە لە شوێنێکی دیکەدا دەنووسێ " [٧]. دیارە راکان بێ هیچ خۆماندوو کردن و لێکۆڵینەوەیەک دەدرێن.

هەروا بەرای هەندێ لە لێکۆڵەران ئەم کۆبوونەوە فراوانانەی هەولێر، وا لەم سەردەمەدا کراون، لە کەربەلا و نەجەف و شامیە و هی دیکەی شارەکانی ناوەراستی عێراق و موسڵ بووە، کە ئەویش داواکاری بووە لە هەموو هاولاتیانی عێراق بۆ چوونە ناو بزوتنەوە دژ بە داگیرکەرو گاورەکان[٨].

بە شێوەیەکی گشتیش ساڵی ١٩٢٠ ساڵێکی شێواو بوو سەبارەت بە دەسەڵاتی داگیرکەری بەریتانی، زۆربەی بنکەکانی هێزی داگیرکەری بەریتانی، لە کوردستان هەرەشە لێکراو بوو، کاتێ "کاپتن لویر" لە ئابی ١٩٢٠ گیرا و، لە ١٢ ی ئابی ١٩٢٠ هێرش کرایە سەر کاپتن (و. ر. های) بەڵام زۆر بە گرانی دەرباز بوو. کاپتن (ف. س. کێرک) ناچار بوو لە کۆیە بکشێتەوە. لە ٢٨ ی ئابی ١٩٢٠ یشدا ئەفسەری سیاسی کاپتن (ج. هـ. سالمون) کوژرا. نێردەیەکی سەربازی لە کەرکووکەوە بۆ گەراندنەوە و داگیر کردنی شاری کفری نێردرا و هێزەکانی بەریتانی لە ژێر پاڵەپەستۆی جەنگ لە رەواندز کشانەوە بۆ هەولێر[٩]. ئەم بەرەنگاربوونانەش، کە لە کوردستان روویاندا بە رای نووسەر (پێ رەش) پاڵنەرەکەی زیاتر تێکەڵاوی لە پاڵنەری نەتەوەیی و ئایینی بووە، کە رازی نەبوون بۆ حوکمی بێگانە مل کەچ بکەن، هەروەکو لە لایەنی رێکخستنەوە لە رووی سیاسی و سەربازی رێکخراو نەبوون و پەیوەندیش لە نێوان لایەنە بەرەنگاربووەکاندا نەبووە، کە ئەمەشیان یارمەتی هێزەکانی داگیرکەری داوە تا بە سەر گشتیاندا زاڵ بێت[١٠].

چالاکییەکان لە هەولێر بەم شێوەیە دەست پێدەکات، لە سەرەتادا چەند کۆبوونەوەیەک لە هەولێر کرا، کە خەڵکەکە تێیدا باسیان لە بەرەنگاربوونەوەو نارەزایی دەکرد و پشێویش سەری هەڵدا، دواتریش کارەکە مۆرکێکی کاری ئاشکرای دژی بەریتانی وەرگرت، لە دابەشکردنی بلاوکراوە لە شارەکە و تێیدا داوایان لە هاولاتیان دەکرد، کە "چەک دژ بە گاوران هەڵگرن. "[١١]

لە رێکەوتی (٢٧ / ذي العقدة / ١٣٣٨ / ١٢ ئابی / ١٩٢٠) لە ناوچەی رەواندز هەوڵی کوشتنی کاپتن (های - حاکمی سیاسی هەولێر) درا، ئەویش بە هۆی بۆسەیەکەوە لە تەنگەبەری گەلی عەلی بەگ، بەڵام بەرنەکەوت. ئەو و خێزانەکەی زۆر بە سەیرو سەمەرەیی رزگاریان بوو. کاتێکیش گەرایەوە هەولێر لە (٢ / ذي الحجة) / (١٥ ئاب) بینی هەولێر پرییە لە قاو و جاری سەیرو سەمەرە[١٢] و خانووەکەی جەنەراڵ هایان لە هەولێر سووتاند. ئەویش تەلەگرافی بۆ ولسن کرد لە بەغدا کە بیگاتێ، ولسنیش وەرامی دایەوە! " ناتوانێ لەگەڵ فەرمانبەرەکانی لە شارەکە دەرچێ.[١٣] " دوای ئەمەش (های) چیتر نەیتوانی لە خانووەکەی دابنیشێ، بەڵکو ناچاربوو بەجێی بهێڵێ و لە سەربازگەیەکدا ژیان بەسەر ببات، تا وەکو هەموو کات ئامادە بێت لە چ کاتێ تەنگی پێ هەڵچنرا هەڵبێ، بەتایبەتی لە دوای ئەم قسەیەی ولسن پێی راگەیاند[١٤]

لە (٢٥ / ذي الحجة ١٣٣٨) / (٨ ئەیلوول ١٩٢٠) سێر ئارنۆلد ولسن حاکمی مەلەکی گشتی لەگەڵ سێ فڕۆکەی جەنگی گەیشتە هەولێر و تێیدا کۆبوونەوەی لەگەڵ بەرپرسانی شارو ژمارەیەکی زۆری خەڵک کرد. دواتر لە هەمان ڕۆژ بەجێی هێشت و تێیدا هەولی دا نێوانی هێزە لایەنگرەکانی چاک بکاتەوە.[١٥] لە کۆبوونەوەی ئەو ڕۆژێدا، کە چەندین سەرۆک هۆز ئامادەبوون و لە ناویشیان (خورشید ئاغا)[١٦] و(ئەحمەد ئەفەندی)[١٧] کە لەم کاتەدا دەستیان بە سەر بەڕێوەبەرایەتی شاری هەولێردا گرتبوو. بە ولسنیان ڕاگەیاند، کە ئەوان ئامادەن بۆ گەڕانەوەی ئاسایش بۆ شارەکە و زیاتریش، هەر وەها گوتیان: " بەڵام ئێمە دوو شت داوا دەکەین، ڕێ نەدان بە تورک بە گەڕانەوەیان و ئێمەی کوردیش حوکمڕانی نەکەن، دووەمیش ناردنی هێز بۆ هەولێر بە پەلەو هەر ئێستا بۆ ئەوەی بۆ ئاژاوەگێران ئاشکرا بێت، کە باڵی بەریتانییەکان هێشتا درێژ و بەهێزە."[١٨] بەڵام "های " دەنووسێ: لە ڕێکەوتی (٨) ی مانگدا حاکمی مەلەکی گەورە (سێر ئارنۆلد ولسن) گەیشتە هەولێر و[١٩] کەچی پاش چەند ڕۆژێکی کەم لە گەڕانەوەی ولسن بۆ بەغدا پیلانێک ئاشکرا بوو بۆ دەرکردنی بەریتانییەکان لە هەولێر و دامەزراندنی حوکمێکی ناوخۆیی تێیدا، ئەمەش بوو بە هۆی ناردنی دوو هێز بۆ هەولێر لە هەریەکە لە کەرکوک و مووسڵ، کەوا یەک لە دوای یەک گەیشتن، هێزی مووسڵ لە (١١ ی ئەیلوول) و هێزەکەی کەرکوکیش لە (١٤ ی ئەیلوول) گەیشتن[٢٠].

ئینگلیزەکان بە پشتیوانی خورشید ئاغا توانییان دەسەڵات لە شار پیادە بکەنەوە و(خورشید ئاغا) یارمەتی ئەم چەکدارانەشی دا، کە لایەنگیری ئینگلیز بوون و سەرۆکی شارەوانیش، کە (ئەحمەد عوسمان) بوو، توانی نێوانی کاپتن های و دوژمنەکانی چاک بکاتەوە. ئەویش لە پاداشتی ئەمەدا دواتر بە موتەسەریفی لیوای هەولێر دامەزراند.[٢١] هەروا لە دواییەکانی مانگی ئابیشدا (١٧) سەرکردەی هۆزە کوردەکان لەگەڵ (های) کۆ بوونەوە و بەڵێنی جێبەجێکردنی فەرمانەکانی حکومەتی ئینگلیزیان دا تا ئەو ڕادەیەی شتێکی شەرعی نییە، گەر بە فەرمانی حکومەتێکی نەسرانیش بێت و لەم کاتەدا هەندێ لە سەرۆکەکان لە چەندین مەلایان داوەو زۆریشیان لە زیندان کردوون، هەروا (های) بەردەوام دەبێ: " ئەوانە ئامادەن فەرمانەکانم جێبەجێ بکەن گەر پێچەوانەی شەریعەتەکەشیان بێت، ئامادەشن لە پێناوی من بینە کافر."[٢٢]

هەر لەم سەردەمەشدا فەرمانبەرەکانی پێشووی حکومەتی عوسمانی، دەستیان دەکرد بە پروپاگەندەی فراوان دژ بە بوونی بەریتانییەکان لە وڵات و مژدەی نزیکبوونەوەی گەڕانەوەی تورکەکان و دەرچوونی ئینگلیزیان لە ناوچەکە بڵاو دەکردەوە. هەروەکو بڵاوکراوەی نهێنی (مناشیر) مۆر نەکراویان بڵاودەکردەوە کە بانگی خەڵکیان دەکرد بۆ هەڵگرتنی چەک و دەرکردنی داگیرکەران. ئەمەش بوو بە هۆی بیرکردنەوە لە گرتنی حاکمی سیاسی و هاوڕێکانی لە هەولێر.[٢٣] بەڵام لە دوای ئەمەدا لە ڕێکەوتی (٢ ی محرم / ١٣٣٩) / ١٦ ی ئەیلوول / ١٩٢٠ سەرۆکایەتی گشتی بەریتانی ئەم بڵاوکراوەی دەرکرد: " هەڵوێست لە هەولێر تۆزێ چاکتر بووە."[٢٤] لەم کاتەشدا هەروەک سەرچاوەکان باسی لێوە دەکەن خەڵکەکە زۆر بە تووڕەیی سەیری ئینگلیزیان دەکرد، بە گشتی و بە تایبەتیش ئەو کەسانەی کە خەڵکی شار بوون و یارمەتی ئینگلیزیان دەدا.[٢٥]، لەگەڵ ئەوەدا لەم دەمە ئینگلیز توانی دەست بە سەر بارودۆخەکە لە ناو شاری هەولێردا بگرێتەوە، بەڵام لە ناوچەکانی دەوروبەریدا هەر بە پەشێوی و شڵەژانی مایەوە، کە وای کرد هەموو ئەو کار پێسپێردراو و فەرمانبەرە ئینگلیزانەی کاریان تێدا دەکرد بۆ ناو شاری هەولێر بکێشنەوە، ئەمەش بە ئاشکرا لەم ڕاگەیاندنە ڕەسمییەی ئینگلیزەکان، دەردەکەوێت کە لە (١٥ ی ئەیلوول) دا دەرچووە و تییدا هاتووە: " سەقامگیری گشت هەولێری گرتۆتەوە، هەر لەم کاتەوەی سەربازەکانمان گەیشتوون، بەڵام شوێنی هۆزەکانی ناو چیاکان هێشتا ناجێگیرە "[٢٦] لە ڕۆژی (١٧ ی ذي الحجة ١٣٣٨ ک / ئەیلوول ١٩٢٠ ز) سورچییەکان هێرشێکی دیکەیان کردە سەر شارۆچکەی باتاس لە ڕۆژهەڵاتی زێی گەورە و هەموو فەرمانبەرانی ئەوێیان کوشت لەگەڵ هەموو (حامیە) کان، سەبارەت بە خەمڵاندنی ئەم کوژراوانەش جیاوازی

هەیە لە نێوان پەنجا و حەفتا.

کاتێ هەواڵی ئەم ڕووداوە گەیشتە گوێچکەی دەسەڵاتداری سەربازی بەریتانی، هێزێکیان لە هەولێرەوە بۆ باتاس ڕەوانە کرد، کە زۆرینەیان لە دەرەک - پۆلیس - بوون بە سەرۆکایەتی (کاپتن لیتل دیل)، کەچی شۆڕشگێڕان بەرپەرچیان دانەوە و شەڕێکی گەرمیان لەگەڵ دەستپێکردن، کە بوو بە هۆی بەزاندنیان، بەزاندنێکی چاوەڕوان نەکراو، دوای ئەوەی زیاتر لە سەد کەس کوژرا، ئەم سەرکەوتنانەش سورچییەکانی هاندا بۆ فراوانکردنی ڕووبەری شۆڕشەکە، بۆیە هێرشیان کردە سەر ڕەواندز، پاش ئەوەی ئاگری شۆڕشیان لە نێوان عەشیرەتەکانی ئەوێ هەڵگیرساند و بە ساغ و سەلامەتی گەڕانەوە شوێنی خۆیان،[٢٧] هەر بە هۆی پەشێوی ئاسایشی ناوچەکەوە دەسەڵاتدارانی بەریتانی هەڵسان بە گواستنەوەی ئەو گەنجینە و داراییەی لە هەولێردا هەبوو بۆ کەرکوک، ئەمەش لە لایەن حاکمی کەرکوک (مێجەر لونگریک) ئەنجامدرا بە پارێزگاری و پشتیوانی ڕەتلێکی تەواو لە ئۆتۆمۆبیل و ژمارەیەکی زۆر لە پاسەوانان، هەروەکو زۆربەی فەرمانبەرانی بەریتانیش شارەکەیان چۆڵ کرد.[٢٨] ئەوەتا لەم بارەیەوە (های) نووسیویەتی لە ڕۆژی پێنجەمی ئەم مانگەدا هەواڵەکان وایان دەرخست، کە سورچییەکان و خۆشناو و گەردی لە ناوچەی کۆیە هێزەکانی خۆیان کۆکردۆتەوە بۆ هێرشکردنە سەر ئەم شارە. کەسە ناودارو سەرۆکەکان کۆنگرەیەکی خێرایان بەست، کە دەست بە سەر بارودۆخە پەشێوەکەدا بگرن. مێجەر لونگریک و ملازم بینکۆل کە زۆربەی هەرە زۆری داراییان لەدەستدا بوو ڕۆیشتن. ئەو پارەیەش کە مایەوە لە ئامادە کردندا بوو، بۆ دەربازبوون. هەروەکو زۆر لە بەرپرس و فەرمانبەرو هیندییەکان لەگەڵ تۆمارگە نهێنییەکان ڕۆیشتن، هەروەها ئۆتۆمۆبیلەکانیان لە هاتن و چوون و گواستنەوەی بەردەوامدا بوون.[٢٩]

سەبارەت بە بارودۆخی سەرکردە بەریتانییەکان لەم ڕۆژانەدا (کۆتۆلۆف) باس لەوە دەکات، کە ئەفسەری سیاسی بەریتانی لە هەولێردا نەیدەوێرا لە شەقامەکانی شاردا دەربکەوێ، مەگەر لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە پاسەوانان لە سەربازەکانی نەبوایە، هەر وەکو ئەو یەکە چەکدارییانەش کە ئینگلیزەکان دایانمەزراندبوون بۆ دژایەتیکردنی هۆزی شۆڕشگێڕی سورچی، ملکەچی فەرمانەکانی ئەفسەری ئینگلیزیان ڕەت دەکردەوەو هەر لە کۆتاییی ئاب تا وەکو سەرەتاکانی ئەیلوول ژمارەیەک گوندیان دەست بە سەر داگرت لەم ناوچانەی دەکەوتنە نێوان ڕەواندزو کۆیە. هەولێر نەیتوانی خۆی لە بەردەم شۆڕشگێڕاندا ڕابگرێ. تەنیا دوای ئەوە نەبێت، کە چەکدارەکانی خورشید ئاغای دزەیی بە لایەنگیری ئینگلیزی هاتە ناوەوە.[٣٠] لەگەڵ هاتنی ئەم چەکدارانەشدا، کەچی (های) ئەفسەری سیاسی هەولێر نەیتوانی لە جێی خۆیدا بجوولێ و نووسیویەتی: " هەر لەم ساتەوە دەسەڵاتەکەم لە لایەنی زانستییەوە وەک ئەفسەرێکی سیاسی گەیشتبووە سفر، نەمدەتوانی هیچ دەسەڵاتێک جێبەجێ بکەم، ئەگەر خزمەتە بەرزەکانی خورشید ئاغا و ئەحمەد ئەفەندی و یەکێ لە دەوڵەمەندانی عەرەب نەبوایە، کە پێشکەشیان کرد"[٣١]. داگیرکەرانی بەریتانی خۆیان دامەزراند بۆ ڕێگەگرتن لە هەر هێرشێک بۆ سەر بنکە سەربازییەکانیان. هێزی بەریتانی هەستی بە جێگیربوونی بنکەکانی دەکرد، بەڵام زوو بە زوو بارودۆخەکە پێچەوانە دەبۆوە، کاتێ ترس و تۆقین فەسیلەی پیاوەکانی خورشید ئاغای گرتەوە لە ترسی هێرشی شۆڕشگێڕان، پەشیمان بوونەوە، بەڵام دواتر خورشید ئاغا دەستی بە سەر کۆگاکانی چەک داگرت و شۆڕشگێڕانیشی شکاند. لەبەر ئەنجامی ئەوەشدا دەسەڵاتدارانی بەغدا ڕەزامەندییان لە سەر چۆلکردنی هەولێر دەربڕی، کەچی چۆلکردنی هێزەکانی بەریتانی تەواو نەبوو بە هۆی گەیشتنی یارمەتی سەربازی گەورە لە کەرکووک لە دوا ساتەکانی دەست پێکردنی جێبەجێکردنی چۆلکردنەکە[٣٢] لە دوای چۆلکردنی شار لە لایەن ئینگلیزەوە. وەک باسکرا های دەنووسێ: " لە دوای نیوەڕۆی ڕۆژی ٤ی ئەیلوول ڕائید لونگرێک لە کەرکووکەوە بە یاوەری ملازم بیتکۆل (ئەفسەری فرۆشتنی ناوخۆ) هاتوونەتە هەولێر بە چەندین شاحینەی فۆرد بۆ گواستنەوەی گشت خەزێنەی هەولێر و کەلوپەلەکان، کە مابوون، کە گواستنەوەی ئەمانەش کۆتایی بە سام و هەیبەتی حکومەتی بەریتانی لەم شارە هێنا و دەسەڵاتی

حاكمی سیاسی شارەكەش وەكو نەبووی لێهات، تەنیا بە هۆی (خورشید ئاغا) و (ئەحمەد ئەفەندی) یەوە نەبێت كە هەندێ هێزی مابوو "[٣٣]. لەم كاتەشدا خورشید ئاغا و ئەحمەد ئەفەندی دەسەڵاتی هەولێر دەگرنە دەست و دواتر بە ولسن رادەگەیەنن، كە خۆیان هێمنی و ئارامی هەولێر دەپارێزن[٣٤]، بارودۆخ لە دەوروبەری هەولێر و لە ناوچەی خۆشناو بە درێژایی مانگی ئاب و سەرەتای ئەیلول پەشێو بوو و واش مایەوە. ئەمەش پێویستی بە پیاوانی زۆر هەبوو، كە وای دەردەبڕی حاكمی سیاسی، لەگەڵ ئەم هەوڵ و كۆششەی هەندێ لە سەرۆك عەشیرەتە لایەنگرەكانی نەیتوانیوە بارودۆخەكە ئاسایی بكاتەوە[٣٥]. هەر لە رۆژی ٢٧ی ئابدا بەرپرسی بەرق بە " های" راگەیاندووە، كەوا پەیوەندی بە باتاس پچڕاوە. "های " دەنووسێ " لە رۆژی ٢٨ی ئاب لە مەخموور گەڕامەوە بزانم سورچییەكان (لەگەڵیشیاندا نووری و حەمەدەشین) زێیان بڕیوە، كە ژمارەیان (١٠٠) كەسە. هەروەكو هەموو كوڕانی هۆزەكانی دەشتی هەریر چوونەتە پاڵیان، ئەویش لە بەیانی رۆژی رابردووەوە، ئەمانە هەر لەم رۆژەدا توانییان باتاس رزگار بكەن و فەرمانگەكانی حكومەت و ماڵی پاشا تاڵان بكەن و (نەقیب هگنسن) بە هۆی ئەم راگەیاندنەوە لە رەواندز هەموو ماڵی حكومەتی كۆكردەوە لەگەڵ چەند كەسێكی كەم لە دەرەك هەڵات بۆ سیساوە و بە ساغی گەیشتن "[٣٦] لە باتاس و رەواندز بارودۆخەكە بە شێوەیەكی ترسناك تەقینەوە. كاتێ عەشیرەتی سورچی باتاسیان رزگار كرد، كە بنكەی ناوچەی (دێرە هەریر) ە لە (١٩ی ذي الحجة ١٣٣٨ ك / ئەیلوولی ١٩٢٠) نوێنەری دەسەڵاتدارانی بەریتانییان وەدەرنا، لە وێوە روویان كردە رەواندز، كاتێ كە حامیەیەكی بەریتانییان گەمارۆ دا دوای لە دەستدانی هەژدە كوژراو توانییان لەم شەرە بكشێنەوە بۆ هەولێر ٣٧ دوای ئەم شەرەش شۆڕشگێڕان توانییان رەواندز رزگار بكەن. لێرەشدا هاملتۆن ئاماژە بەمە دەكات، كە دوای رزگاركردنی رەواندز ئەوا باویل ئاغا و كوڕەكەی (نوری باویل ئاغا) حوكمڕانی رەواندزیان گرتە دەست، لە بارەشیانەوە بەم شێوەیە دەنووسێ و دەڵێ: " دوو شا بوون - واتە باویل ئاغا و كوڕەكەی - بە بێ رەعیەت، چونكە خەڵكی شارۆچكەكە كۆچیان كردبوو "[٣٨]. هەروا كۆمەڵێ لەم عەشیرەتە، كە ژمارەیان (٦٠٠) شەڕكەر بوون هێرشیان كردە سەر هێزێكی كوردی لایەنگیری دەسەڵاتدارانی ئینگلیز لە لای زێی گەورە و زەرەرو زیانی گیانی زۆریان پێ گەیاند[٣٩]. های لە سەردەمی پەشێوەكەیدا لە هەولێر دەنووسێ: سێ رۆژی (٢٩- ٣٠) ئاب بە سەرما تێپەڕی لە پەشێوییەكی گەورەدا بووم، گەرچی هەموو شتێ لە هەولێر ئارام بوو".[٤٠] یاخود هەر لەم رۆژانە لە شوێنێكی دیكەدا بێ هیوایی تەواوی خۆیان دەردەخەن و بەم شێوەیە دەنووسێ:
"با بخۆین و بخۆینەوە و خۆش رابوێرین، مادام بەیانی دەمرین"[٤١].

دوای رزگار بوونی رەواندز ئەم هێزەی بەریتانییەكانیش، كە بە سەرۆكایەتی نەقیب لیتل دیل لە نزیك دەشتی هەریر بوو - گوایە باتاس رزگار دەكات - لە دوای ئەوەی كوڕانی هۆزی خۆشناو هێرشیان بردوونەتە سەر، ناچار كشاونەتەوەو لە شەوێكی ئەنگوستەچاو زۆر بە سەیری رزگاریان بووەو تاكو لە رۆژی (٣) ی ئابدا هاتوونەتەوە هەولێر[٤٢]. لە دوای چۆڵبوونی رەواندز دواتر هێزێكی توركی بە سەركردایەتی ئۆزدەمیر پاشا هاتۆتە رەواندز بۆ فەرمانڕەوایی ناوچەكە و هەوڵیشی داوە، كە پیاوەكانی نوری باویل ئاغا بۆ لای خۆ رابكێشێ[٤٣]. لە شەوی (٢ی ئەیلوول) كۆمەڵێك لە كۆیە دەستدرێژی دەكەنە سەر نەقیب برادشۆ (یاریدەدەری حاكمی سیاسی) لە سەربازگەكەی خۆیدا، بەڵام سەركەوتوو نابن، بۆیەش لە رۆژی دواتردا كۆیە بە جێ دەهێڵێ و هەڵدێ، دواتر دێتەوە بۆ هەولێر[٤٤]. بەم شێوەیەش بارودۆخ لە كۆیەش شێواو بووە. بە شێوەیێ كە سەركردایەتی گشتی لە راگەیاندنەكانیدا ناچار بووە لە (٨) ی ئەیلوول شارەكە بە جێ بهێڵێ و بەڕێوەبردنی شارەكەش بە یەكێ لە سەرۆك عەشیرەتە لایەنگرەكانی بسپێرێ و شۆڕشگێڕانیش هێڵی تەلەگرافی نێوان هەولێرو كۆیەیان پچڕاند. ئینگلیزەكان نەیانتوانی دەسەڵاتەكەیان بۆ كۆیە بگێڕنەوە، تەنیا لە سەرەتاكانی تشرینی یەكەمی ١٩٢٠ نەبێت[٤٥]. هەر ئینگلیز تەنیا هەوڵی نەداوە، كە دووبەرەكی

لە نێوان عەشیرەتە کوردییەکانی لایەنگیری خۆیان و شۆڕشگێران بنێتەوە، بەڵکو دووبەرەکی لە نێوان کوردو کەمە نەتەوەکانی دیکەی کوردستان بە گشتی و هەولێر بەتایبەتی نایەوە، ئەوەتا سەرکردیەتی گشتی بەریتانی بلاوکراودیەکی لە (٨ ی محرم ١٣٣٩ ک / ٢٢ی ئەیلولی ١٩٢٠) بلاوکردۆتەوە، کە تێیدا هاتووە: " کوردانی سورچی هێرشیان کردۆتە سەر ئاشورییەکان لە (١٥ی ئەیلولول) و ئاشورییەکان توانیویانە بەرەنگاریان ببنەوە و بیانگێڕنەوە بۆ پشت زێ، ئەمانە(٤٦) دەڵێن توانیویانە (١٤٠) کەسیان لێ بکوژن و (٦٠) یشیان ژێر ئاو کەوتوون " ئەم چالاکیانەی هۆزی سورچی هەر بەردەوام لە بەرەو پێشڤەچوون و گەورە بووندا بوو، ناوچەیەکی گەلێ فراوانی بە خۆوە گرتبۆوە، تەنانەت هەندێ جار گەیشتۆتە دووری "١٢" میل لە هەولێر(٤٧).".های" لە دوای گەیشتنی هێزو چەکدارەکانی برادشۆ دەنووسێ: "بە هاتنی نەقیب برادشۆ بە ساغی لەگەڵ هەموو سەربازە بەریتانییەکان لە هەر دوو بنکەی دووری ڕەواندزو کۆیە دڵخۆش بووم، کە نەمدەتوانی هیچ هەنگاوێک باوێم بۆ پاراستنیان "(٤٨). شەڕو پێکدادان بەردەوام بووە و شۆڕشگێڕان توانیویانە دەست بە سەر ڕێی سپیلکدا بگرن و ناوچە چیاییە سەختەکانی ڕەواندز بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان(٤٩). بەلام بەداخەوە ئەم سەرکەوتنانەی کورد بەردەوام نەبووە، بە هۆی چەندین هۆکارەوە، کە لە پێشەنگیاندا بوونی بەشێ لە عەشیرەتەکان بە دار دەست و بەکرێگیراوی ئینگلیز، دواتر نانەوەی شەڕی کوردکوژی لە نێوان شۆڕشگێڕان و جاشەکان، هەروەکو نەبوونی ڕێکخستن و چەک و جبەخانەی پێویست و ئەوەتا لە ڕۆژی جەژنی لەدایکبوونی ١٩٢٠ دا نزیکەی هەزار کەس لە هێزی لیڤی هێرشیان کردە سەر هێزەکانی " شێخ عەبدوڵلای سورچی " بە پشتیوانی هێزی ئاسمانی بەریتانی شەڕی خوێناوی ڕوویدا و تێیدا دوو ئەفسەری بەریتانی کوژرا. بە هۆی بۆردمانکردنی چڕی هێزی ئاسمانی بەریتانییەوە، ناچار هێزی سورچییەکان گەڕانەوە پشت گوندەکان، دوای ئەوەش بەریتانییەکان گوندەکانیان سووتاند و ئاژەڵەکانیشیان تالآن کردن، ئینگلیز وای دادەنا کە جێی پەنجەی فەرەنسا لە پشت ئەم بەرەنگاریبوونەوەیەی کورددا هەیە و هێزەکانی لیڤیش زۆرینەی لە عەرەب پێکهاتبوو(٥٠). دوای چەندین هەنگاوی دیکەی لەم جۆرە، بەریتانیا بە سانایی دەستی بە سەر بارودۆخەکەدا گرت و هەر لە کۆتایی مانگی ئەیلولدا هەر دوو ناوچەی کۆیە و خۆشناوەتی و ناوچەی ڕەواندز تاوەکو باباجیجک بە شێوەیەکی ئاشتییانە کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئینگلیز(٥١). و لە ڕێکەوتی (١٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٠)دا سورچیش ئارەزوومەندی ملکەچی حکومەتی ئینگلیز بوون و کارەکەش زۆر سانا بوو. چونکە ڕەتلێک ناردرا بۆ دەشتی هەریر و باتاس و گرتیان، لەم کاتەشدا سەربازە ئینگلیزەکان ماوەرانیان سووتاند، کاتێ دەربەگێک کوژرا(٥٢). دوای ئەمانەش بەریتانیا توانی دەست بە سەر بارودۆخەکەدا لە کوردستان بگرێتەوە، بە شێوەیێ کە لە سەرەتای ساڵی (١٩٢١) دا هیچ شوێنێکی وا نەما، کەوا بە دەست شۆڕشگێڕانەوە بێت(٥٣). بەم شێوەیەش پرشنگی شۆڕشێک یاخود ڕاپەڕینێکی کوردی بە مەبەستی گۆڕانکاری و سەربەخۆیی، وەکو زۆربەی شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی دیکە دامرکایەوە، بێ ئەوەی هیواو ئامانجەکانی بێنێتە دی.

**سەرچاوە و پەراوێز:**

د. کەمال مەزهەر ئەحمەد ڕای وایە کەوا ڕاپەڕینە و شۆڕش نییە، هەر وەکو لای زۆربەی نووسەرانی ڕۆژئاوا، کەچی لای هەندێ نووسەران لە یاخیبوون زیاتر نییە، هەروەکو واش ناوی دەبەن، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: دور الشعب الكردي في ثورة العشرين.. ص ٣ - هـ - هەروا جەنەڕاڵ هۆڵدین (Haldan) ی سەرکردەی هێزەکانی بەریتانی کاتێ باسی ئەم ڕووداوانەی (١٩٢٠) دەکات، ئەوا بە ڕاپەڕین (انتفاضة) ناوی دەبات نەک شۆڕش. بڕوانە: د. حسن جمشير، من نتائج ثورة العشرين في العراق، مجلة " الثقافة الجديدة العدد" ١٩٣ " اذار - نيسان ٢٠٠٠، ص ١٠٣، هەر وەکو نووسەری وتارەکەش لە شوێنێکی دیکەی هەمان لاپەڕەی وتارەکەی ئەویش بە ڕاپەڕین ناوی دەبات

بروانە هەمان سەرچاوەی پێشوو و لاپەڕە، هەروا كتێبەكەی (ل. ن. كوتلوف، ثورة العشرين الوطنية التحررية في العراق، تعريب: الدكتور عبدالواحد كرم، مراجعة عبدالرزاق الحسني - مكتبة النهضة - بغداد، دار الفارابي - بيروت، الطبعة الثانية، الشركة تكنوبرس الحديثة بيروت، ١٩٧٥) ئەم كتێبەش لە سەرچاوە ئەسڵیەكەیدا بە ناوی (انتفاضة العشرين....) بەڵام وەرگێڕی عەرەبی كردوویەتی بە (ثوره العشرين....)

د. حسن جمشير، سەرچاوەی پێشوو، ص ١٠٣ - ١٠٤

سەبارەت بە رۆڵی كورد چەندین كتێب نووسراون

ا - د. كمال مظهرأحمد، دور الشعب الكردي في ثورة العشرين العراقية، مطبعة الحوادث بغداد، ١٩٧٨، ص ٢٠٠

ب- الدكتور مكرم الطالباني، ئیبراهیم خان ثائر من كوردستان، بغداد، ١٩٧١، ص ١٠٤

ج - مستەفا نەریمان، شۆرشی برایم خانی دەلۆ ١٩٢٠، چاپخانەی دار الحريه، بەغداد، ١٩٨٥، ل ٢١٦

٤- بۆ زیاتر زانیاری لەم بارەوە بڕوانە: د. كمال مەزهەر ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو، ص ٤١، ٨٠ - ٨١

٥- د. كمال مظهرأحمد، دور الشعب الكردي في ثورة العشرين.

٦- موسوعة العراق السياسية، المجلد الثاني، الدار العربية للموسوعات، الطبعة الاولى، بيروت، ١٩٨٦، ص ٢٦٢

٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە.

٨- ل. ن. كوتلوف، سەرچاوەی پێشوو، لا ١٠٣

٩- پێ رەش، العراق دولة بالعنف، مطبوعات كوردولوجيا، ١٩٨٦، ص ١٩

١٠- سەرچاوەی پێشوو، ص ٢٠، (فريق المزهر الفرعون) رای وایە كەوا شۆڕش لە لیوای دیالەوە چووەتەوە لیوای كەركووك...و لە كەركووكیش ئاگری شۆڕش چۆتە هەولێر، بەڵام پێكدادان و ڕووداوی گەورە لەم دوو لیوایەدا ڕووی نەداوە. بڕوانە: د. كمال مەزهەر ئەحمەد سەرچاوەی پێشوو، لا ١٠

١١- عبدالرزاق محمد اسود، موسوعة العراق السياسية، ص ٣٦٢، د. كمال مەزهەر سەرچاوەی پێشوو، لا ١٣٢. ١٩١٨ - ١٩٢٠

١٢- دبليو. ار. هي. سنتان في كوردستان، ترجمة: فواد جميل، الجز و الثاني الطبعة الاولى مطبعة دار الجاحظ بغداد، ١٩٧٣، ص ٧٤-٧٥، السيد عبدالرزاق الحسني، الثورة العراقية الكبرى، الطبعة السادسة الموسعة، مطابع دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ١٩٩٢، ص ٢٩٦، عبدالرزاق محمد اسود، سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٦٢، د. كمال مەزهەر، سەرچاوەی پێشوو، لا ١٣٢

١٣- السيد عبدالرزاق الحسني، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٩٦

١٤- د. كمال مەزهەر، سەرچاوەی پێشوو، لا ١٣٢

١٥- السيد عبدالرزاق الحسني، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٩٧، د. كمال مەزهەر، سەرچاوەی پێشوو، لا ١٣٣ - ١٣٤، عبدالرزاق محمد اسود، سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٦٢

١٦- خورشید ئاغا سەرۆكی هۆزی دزەیی نیشتەجێ لە قەزای مەخموور و ناوچەی قەرەچوغ و كەندێناوە، كە یەكێ لە هۆزە گەورە كوردیەكانی دەوروبەری ناوچەی هەولێرە، مانەوەی حاكمی سیاسی لە خراپترین بارودۆخ بۆ ئەو دەگەڕێتەوە، ولسن بە سەركردەیەكی كەللە ڕەق وەسفی دەكات، پارێزگاری لەم پەیمانەش كردووە كە لەگەڵ خۆیدا لە سەردەمی برایم ئاغا لەم كاتەی لە ئاوزینگان دابوو، كە بریتی بووە لە لایەنگیری حكومەتێكی نوێ لە بەرژەوەندی دانیشتوانی كورد. بڕوانە: لوسيان رامبو، الكرد والحق، ترجمه وقدم له ووضع حواشيه: عزيز عبدالاحد نباتي، الطبعة الاول، مطبعة وزارة الثقافة، اربيل ١٩٩٨، ص ٧٩ - الهامش.. شارەوانی هەولێری لە ساڵانی ١٩١٨ - ١٩٢٠ دا پێ سپێردراوە و دواتر لە پاداشتی خزمەتەكانی لە ساڵی ١٩٢٠ بۆ ئینگلیز كراوەتە پارێزگاری هەولێر، پاشان بۆ ئەندام لە ئەنجوومەنی پیران، هەمان سەرچاوەی پێشوو و لاپەڕە الهامش -

١٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو و لاپەڕە.

١٩- هي. سنتان في كوردستان، الجزء الثاني، ص ١٤٩

**ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەولێر/ ژمارە ١٦ی پاییزی ٢٠٠٢ وەرگیراوە.**

# مەلا ئەسعەدی خەیلانی و شۆڕشی بیست

**فریاد رواندزی***

دوا بە دوای هەڵگیرسانی ئاگری جەنگی جیهانی یەکەم و کۆتایی هاتنی، عێراق لە لایەن ئینگلیزەکانەوە داگیرکرا، رۆژ بەرۆژیش قین و بێزاری خەڵکەکە بەرامبەر بە بارودۆخی ژیان و گوزەرانیان لەلایەک و هەڵسوکەوت و رەفتاری ئینگلیزەکان لەلایەکی ترەوە زیاتر تەشەنەی دەکردو گەلێک جاریش لەم لاو ئەولای عێراق و کوردستاندا بە ئاشکرا دژایەتی لێپرسراوە ئینگلیزەکان دەکرا.

ئەوە بوو لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٠ شۆڕشێکی میللی، سەرانسەری عێراقی گرتەوە و ناوچەکانی فوراتی ناوەراست و نەجەف و دیالە و هەندێ شوێنی کوردستانیش بیونە بنکەی شۆڕش و شۆڕشگێران.

وەنەبێ میللەتی کورد لە کوردستانی خوارو چاوی لەبرا عەرەبەکان کردبێت و لە ناوچەکە دەستی بە شۆڕش هەڵگیرسان کردبێت، بەڵکو پێش ساڵەکانی بیست و پێش مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٠ لە زۆر ناوچەی کوردستاندا مشت و مڕو بەگژداچونەوەی ئینگلیزەکان هەر لە گۆڕێ دا بوو.

بەڵام زۆربەی مێژوونوسە بیانییەکان و تەنانەت مێژوونوسە عەرەبەکانیش نرخی خۆیان نەداوەتە رۆڵی کورد لە شۆڕی بیستدا[1]، هەر بۆیە تاکو ئێستا زۆر لایەنی نەزاندراو شاراوە ئەگەر ئاشکرا بکرێن ئەوە هەڵوێست و دەوری کورد نیشان دەدەن لەم شۆرشەدا، لەگەڵ ئەوەش هەڵوێستی ئەوساکەی خەڵکی شارەکانی مەندەلی و شارەبان و خانەقین و کفری و کەلار و کەرکوک و توزخورماتو و هەولێر و رواندز و کۆیە ئەم راستییە دەردەخەن کە کورد دەورێکی گرنگی هەبووە و سەرانی ئەم شوێنانەش نەخشەو پلانیان داناوە بۆ دژایەتی کردنی ئینگلیز و رەفتاری کاربەدەستەکانیان، بە تایبەتی لە ساڵەکانی ١٩١٩ و ١٩٢٠دا، ئەوە بوو تاکو دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد کتێبێکی بە ناونیشانی (دەوری گەلی کورد لە شۆڕشی بیستی عێراقدا) بە زمانی عەرەبی نوسیوو لە ساڵی ١٩٧٨ کەوتە دەست خوێنەران و توانی بە پێی ئەو سەرچاوە زانیاریانەی لە بن دەست بوون پەردە لەسەر زۆر لایەنی نەزانراو هەڵبداتەوە و زۆر بە شێوەیەکی زانستیانە و لەسەرخۆوە بەرپەرچی ئەم رایانە بداتەوە کە گوایە کورد هیچ دەوری نەبووە لە هەڵگیرساندن و سەرکردایەتی کردنی شۆڕشی بیستدا.

هەرچەندە تاکو ئێستا زۆر لەسەر کورد و شۆڕشی بیست نوسراوە، بەڵام لەبەر چەندین هۆ لە زۆر ناوچەی کوردستاندا روداوەکانی رۆژانی شۆڕشەکە نەنوسراوەتەوە، ئەم روداوانە لە بن گۆمی لێڵەوە ماونەتەوە.

لە ساڵی ١٩٨٥ دا بەدوای هەندێک زانیاری دەگەڕام دەربارەی کتێبێک بەناوی (مەلیخا) لەناوچەی رەواندز، کە گوایا ئەم کتێبە وەکو دەستنوس لای (مەلا ئەسعەد خەیلانی) بووەو دراوتە مامۆستای مێژوونوس حوزنی موکریانی. بەڵام نەک هەر سۆراخی کتێبەکەم بۆ روون نەبووەوە بەڵکو دوو سێ دەستنوسی چاکیشم لە دەستچوو بە تایبەتی یە کێکیان دەربارەی مەلای خەتێ بوو.

بەهەرحاڵێک ئەوەی کە لەم سەفەردا قازانجم کرد ئەو زانیاریە نوێیانە بوون کە بەدەستم کەوتن دەربارەی بنەماڵەی مەلایانی رەواندز و مەلا ئەسعەدی خەیلانی و رۆڵی لە شۆڕشی بیستدا، وابزانم تاکو ئێستاکە کەس دەربارەی رۆڵی ئەو پیاوە زانایە و بەناوبانگەی لە شۆڕشی بیستدا نەخستۆتە سەر پەڕی کاغەز و بەتەنها نوسەری ئەم چەند دێرە نەبێت لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٩٠ لە ژمارە (٦) (الشرارة) دا زۆر بە کورتی باسم لە دەورەکەی کردوە.

ئەگەر چی رەواندز ئەو کاتە

مەڵبەندێکی گرنگی سەربازی بوە، بەڵام دیارە لەبەر دوری ناوچەکە لەلایەک و نەبوونی هۆیەکانی راگەیاندن لەلایەکی ترەوە بۆتە هۆی ئەوەی ئەم رووداوانەی ئەو ساکەی رەواندز بەنیوە چڵی بنوسرێنەوە، تەنانەت کە باس دێتە سەر بارو دۆخی ناوچەی رەواندوز لەو کاتە، بە تایبەتی پێکداداان و شەڕەکانی ئینگلیزەکان و خەڵکی ناوچەکە، مێژوو نووسان تەنها بەڵگەنامەی ئینگلیزەکان دەکەنە سەرچاوە، کەچی ئەگەر لە خەڵکی ناوچەکە بپرسن بەتایبەتی ئەوانەی کە لەگەڵ رووداوەکان ژیاون ئەوا زۆر لایەنی ئەم بەڵگەنامانە بەدرۆدەخەنەوەو لایەنە شاراوەکانی رەوتی ئەوکات بەشێوەیەکی تر دەگێرنەوە.

مەلا ئەسعەدی خەیلانی کە خاوەنی زەوی و زارێکی زۆر بوو لە ناوچەی هەریر و باتاس و رواندز و مرۆڤێکی ئاینی بوەو تەنانەت قوتبێکی دینیش بوو لە ناوچەکەدا، قسەو ئامۆژگاریەکانی بە پەند لەسەر زاری خەڵک دەگێرنەوەو نوسراوەکانی وەکو یاسا وابوون بۆیە لە رووداوەکانی شۆڕشی بیستدا سەرکردایەتی رووداوەکانی ناوچەکەی کردو دەورێکی گرنگی سەرهەڵدانی خەڵکەکە هەبوو.

*** مەلا ئەسعەدی خەیلانی کێیە؟**

مەلا ئەسعەد کوڕی عومەر کوڕی حەمەد کوڕی ئیسماعیل کوڕی وەهاب کوڕی شەریف کوڕی رەسوڵ کوڕی شێخ جبرائیله(٢).

لە شاری رواندز لە دایک بووە باوکی مەلا عومەری خەیلانی زانایەکی پایە بەرز و زیرەک و بلیمەتی سەردەمی خۆی بووە، مامۆستای زۆر زانای بە ناوبانگی ناوچەکانی کوردستان بووە، حوجرەو مەردەسەیەکی گەورەی لە رواندز هەبووە و جار وابوو بە دەیان فەقێ و مەلا لە مەدرەسەکەیان خوێندویانە و ئیجازەی مەلایەتیان وەرگرتووەو چەندین مزگەوتی گوند و شارەکانی کوردستانیان پێ ئاوەدان کراوتەوە.

پاش مردنی مەلا عومەری خەیلانی مەلا ئەسعەدی کوڕی کە لە هەموو کوڕەکانی زیرەکترو بەتواناتربوەو دوانزە عیلم بوەو زمانی کوردی و عەرەبی و تورکی و فارسی زۆر بەچاکی زانیوە لە جێگای باوکی دانیشتووەو حوجرە و مزگەوتی گەورە لە جاران ئاوەدانتر بووەو ژمارەی فەقەیان و موستەعیدەکانی و مەلاکانی لە جاران زیاتر بووەو تەنانەت جارێکیان موستەعیدەکان ژمارەیان گەیشتبووە (٢٢) موستەعید و زیاتر لە (٥٠) فەقێ(٣).

وەنەبێ مەلا ئەسعەدی خەیلانی تەنها مەلای مزگەوت بوبێو بەدەرس وتنەوە خەریک بوبێ بەڵکو سەرکردەیەکی روحی ناوچەکە بوەو قسەو وتەکان و فەرموودەکانی وەکو یاسا لە ناوچەکەدا پەیڕەو دەکران.

مەلا ئەسعەدی خەیلانی کەبووە مەلای مزگەوتی گەورەی رواندز گەنجینەیەکی گەورەو دەوڵەمەندی لە کتێب و دەستنوسەکانی باوکی و مەلا محەمەدی خەتی بۆ مابووەوە، بەڵام بەداخەوە ئەو گەنجینەیە لە ١٧ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٦٣ هەمووی لەناوچو لەئەنجامی گڕگرتنی کتێبخانەکە لە کارەساتێکی دڵتەزێندا(٤).

مەلا ئەسعەدی خەیلانی پەیوەندیەکی بەهێزی لەگەڵ مەلا حسام الدین/ی تەوێڵەدا هەبوو هەر بۆیە رێچکەی نەقشبەندیشی گرتبوەبەر.

ماوەی حەوت ساڵ لە ناوچەی باڵەکایەتی ماوەتەوە و لەساڵی ١٩٢٧دا گەڕاوەتەوە رەواندز لە ساڵی ١٩٢٩ کۆچی دوایی کردووە تەمەنەکەی ئەو کاتە لە دەوروبەری هەشتا ساڵی بوە.

کوڕەکەی مەلا عبدالکریم لە شوێنی بوەتە مەلا و لەسەر رێوشوێنی باوک و باپیرانی رۆیشتووەو مزگەوتی گەورەو حوجرەکەیان هەر بە ئاوەدانی ماوەتەوە.

بەمردنی مەلا عبدالکریم لە ساڵی ١٩٧٧ سەردەمی مەلایەتی بنەماڵەی مەلاکانی رواندز کۆتایی هات و حوجرەو مەدرەسەکەش تێکچوون.

*** مەلا ئەسعەدی خەیلانی و شۆڕشی بیست:**

مەلا ئەسعەدی خەیلانی لە هەریرو باتاس زەوی و زارێکی زۆری هەبووە بۆیە زۆربەی ساڵەکان لە وەرزی درویێنەدا رواندزی بەجێ دەهێشت و دەهاتە سەر دەغڵ ودان و خەرمانەکەی.

لە ساڵی ١٩٢٠ تا کۆتایی مانگی تەمموز لەوێ ماوەتەوە ئەو کاتە بارو دۆخی عێراق بە گشتی لە شڵەژان و هەڵچووندا بو چونکە بەراستی کینەی خەڵک بەرامبەر ئینگلیز بە جارێ گەیشتبوو رادەیەک کە ئەنجامەکەی هەر ئاگری شۆڕشی بیست بوو.

ناتەواوی بارودۆخ لە عێراق،

کوردستانیش گرتبووەوە و ناوچەی هەولێریش لە هەڵچوندا بوو یاداشتی ئەفسەرە ئینگلیزەکان و کتێبەکانی مێژوو نوسەکان بە ئاشکراو روون، ئاماژە بۆ ئاژاوەو باروودۆخی کوردستان دەکەن.

ئەوەتا مستەر ولسن لە ١٣/ئاب/١٩٢٠ لە یەکی لە پەیامەکانیدا دەڵێت: هێرش کراوەتە سەر کارمەندانی ئینگلیز لە تەلەعفەرو هەولێرو رووماندی... [٥] هەروەها دەڵێت: شارەکان یەک لەدوای یەک دەکەون و دەسەڵات دەکەوێتە دەست خەڵک.

هەروەها دکتۆر کەمال مەزهەر بەم شێوەیە باسی وەزعی هەولێر دەکات: وەزع لە هەولێر گەلەک خەراپترە هێشتا لەناوچەی فوراتدا دەستی پێ نەکردبوو کە خەڵکی هەولێر چەند جارێک کۆبوونەوەو پشتگیری خۆیان دووپات کردەوە بەرانبەر داخوازیەکانی سەرکردایەتی شۆڕش.

کۆمەڵانی خەڵک هەر بەمە نەوەستان بەڵکو هەڵیان کوتایە سەر بنکە سەربازیەکانی ئینگلیزو بارێکی تۆقاویان لە دەرونی ئەفسەرو سەربازە ئینگلیزەکان دروستکرد.

بەم شێوەیە زەنگی شۆڕش و هەڵسانەوە لە ناوچەکە لێدراو هەولێرو دەوروبەریش کەوتە چوارچێوەی شوێنە راپەڕیوەکانی دژ بە ئینگلیز.

رۆژی ١٢ ئابی ١٩٢٠ هەندێک لە دانیشتوانی ئەم شارە نزیک رواندز هێرشیان بردە سەر ئەفسەری سیاسی هەولێر کاپتن هی، لەم بۆسەیەدا کاپتن هی و ژنەکەی بە قودرەتی قادر رزگاریان بوو.

بەدرێژایی مانگی ئاب و ئەیلول مشت و مرو هەراو هوریاکە بەرەبەرە دەهات باڵی بەسەر ناوچەی خۆشناوەتی دادەگرت، بۆ مەبەستی کپ کردنەوەی هەراو هوریاکە، ئینگلیزەکان چەندین پیاوی بەکرێ گرتەی خۆیانیان دەست نیشان کردبوون و بە پارەو پوول هەڵیان خەڵتاندبوون، بەڵام مشت و مڕ و هەراو هوریاکە ئی ئەوە نەبوو کپ ببێتەوە بەڵکو هەتا دەهات تەشەنەی دەکردو گەیشتە ناوچەکانی سورچیایەتی و رواندز.

باتاس ئەوکاتە سەربازگەیەکی ئینگلیزەکانی لێبوو سەرهەنگی سەربازگەکە پیاوێکی ئینگلیز پەرست بوو ناوی (ئەحمەد کەمال)بەوو[٦] ، وەکو باس ئەکەن ئەم ئەحمەد کەماله زۆر پیاوێکی دڵڕەق و توندو بێ بەزەی بوو، تەنانەت زۆر رقی لە جوتیارو هەژاران دەبوەو هەردەم شەڕی پێ دەفرۆشتن و خاوەی لێ وەردەگرتن بۆیە ترسێکی ئەوتۆی دارشتبوو کە قسەو فرمانەکانی بێ سێ و دوو ئەبوایە پیادە بکرێن.

ئەحمەد کەمال کە لە گردی (تەلی)[٧] ئەو شوێنەی کە حامیەی سەربازەکانی ئینگلیزی لێ بوو دەهاتە خوارەوە، خەڵک بەجارێ خۆی لێ دەشاردەوە، لەمانگی ئابی ساڵی ١٩٢٠ ئەحمەد کەمال دەچێتە ناو دەغلودانی جوتیارێک بەناوی (وسو)و داوای خاوەی لێ دەکات و ئەمری پێ دەکات کە بۆ نانی نیوەڕۆ دەبێت کاورێکی بۆ بکوژێتەوە، مام وسوی جوتیاریش نەک هەر تەنها کاوری نابێت بەڵکو خرمانی دەغڵو دانەکەشی ئی خۆی نابێت، بۆیە مام وسو داوای لێبوردن دەکت و بە ئەحمەد کەمال دەڵێت دەبی شوکر بیت بەوەی هەرچی لە پێشت دادەنێم، ئەحمەد کەمال بێ سی و دوو هەڵدەکێشێتە دەمانچەکەی و مام وسو دەکوژێت.

بە کوژرانی (مام وسو) یەکەم تریسکەی شۆڕشی بیست لە ناوچەکەدا هەڵدەگیرسێت، خەبەری کوشتنی مام وسو وەکو بروسکە لە ناوچەکە بڵاو دەبێتەوە، خەڵکی ناوچەکەش لە مزگەوتی هەریر کۆدەبنەوەو بەرێز لێنانێکی زۆرەوە تەرمی (مام وسو) لە دامێنی چیای بەنی هەریر دەنێژن و هەمووش بەیەک دەنگ هاواری تۆڵە سەندنەوە دەکەن.

مەلا ئەسعەدی خەیلانیش لە پێش هەموویان دەبێت و فتوای کوشتنی ئەحمەد کەمال و هاورێکانی دەردەکات و کوشتنیشیان بە حەلاڵ دەداتە قەڵەم بە پێی شەریعەتی ئیسلامی.

فەتواکەی مەلا ئەسعەدی خەیلانی کارێکی زۆری هەبوو بەسەر خەڵکی ناوچەکە بە تایبەتی عەشیرەتی سورچی و خەیلانی، هەر بۆیە لە ئێوارە یەکی ئەیلولی ١٩٢٠ زیاتر لە سەد پیاو لە عەشیرەتی سورچی و خەیلانی بەسەرکردایەتی مەلا ئەسعەد بەسەر گردی تەلی دادەن و هەژدە سەرباز و کرێ گرتەی ئینگلیزەکان دەکوژن، لەناو کوژراوەکاندا ئەحمەد کەمالیان لەگەڵدا دەبێت.

لەم شەڕەدا چوار شۆڕشگێری ناوچەکە شەهید دەبن و شۆڕشگێرەکان دەست بەسەر چەک و تفاقێکی زۆر دادەگرن.

پاش ئەم رووداوە، سەربازەکانی

ئینگلیز خۆیان لەسەربازگەکانیان قایم دەکەن و ترس و لەرزێکی زۆریش لە ناویاندا بڵاو دەبێتەوە کە دەبێتە ڕووخانی باری دەرونیان و وردیان دادەبەزێ.

دەنگ و باسی ڕووداوەکانی باتاس لەسەرانسەری عێراق بڵاو دەبێتەوە و ڕۆژنامەکانی ئەو کاتەی شۆڕش (الاستقلال[٨]) ی نەجەفی و (الفرات)[٩] پەنجەیان بۆ شەڕەکەی باتاس درێژ کردوە، بەڵام بەداخەوە زۆر بەکورتی و بە پچڕ پچڕی. ئینگلیزەکان کە زانیان ناتوانن هەستانەکەی ناوچەی هەریر دابمرکێنەوە سیاسەتی پشت بەستن بە ئاغاکان و کرێ گرتەکانیان کە سیاسەتێکی کۆنی ئینگلیزەکانە پیادە دەکەن، بەم سیاسەتەش توانیان ئامانجی پلانەکەیان بینەدی و زۆر لە ئاغاکانی هەولێرو پیاوە ناودارەکانی هەولێر خزینە ژێر سیاسەتەکەی ئینگلیز[١٠].

ئەم سیاسەتەی ئینگلیز و هەڵوێستی ئاغاکانی ناوچەکەو کرێ گرتەکانی ئینگلیز بەیەکێک لە هۆیە سەرەکیەکانی دامرکانەوەی هەستانەکە دادەنرێت وڕێگا خۆش بکات بۆ ئەوەی ئینگلیزەکان جارێکی تر دەست بەسەر کاروباری ناوچەکەدا بگرنەوە[١٤].

ئەرنۆڵد وڵسن حاکمی بەریتانیا لە عێراق دەورێکی گرنگی بینی بۆ جێ بەجێ کردنی نەخشەی دامرکاندنەوەی شۆڕشی بیست لە هەولێر.

هەر بۆ ئەم مەبەستە لە ڕۆژی هەشتی ئەیلول، سەری لە هەولێر داو لەگەڵ سەران و لێپرسراوەکانی ناوچەکە کۆبووەوە لە دوایش دەربارەی وەزع بۆ خەڵکی هەولێر قسەی کرد، لە هەمان کاتدا ئەرنۆڵد وڵسن، ئەحمەد عوسمانی سەرۆک شارەوانی ئەوساکەی هەولێری لەگەڵ دوو ئەفسەری ئینگلیز ڕەوانەی خرواتان کرد کە گوندی مەلا ئەسعەدی خەیلانی بوو و کۆپتەرەکەی ئەحمەد عوسمانی سەرۆک شارەوانی لە یەکێک لە زەویەکانی خرواتان نیشت و لە مزگەوتی گوند لەگەڵ مەلا ئەسعەد کۆبوەوەو سڵاوی ئەرنۆڵد وڵسنی پێ گەیاندو داوای لێ کرد کە وەزعی ناوچەکە ئارام بکاتەوە، لەگەڵ دوو ئەفسەرەکەش کۆببێتەوە و بەڵێن و وەفا بۆ ئەرنۆڵد وڵسن نوێ بکاتەوە و پشتگیری لە پلانەکەو نەخشەکەی بکات.

ئەحمەد عوسمانی سەرۆک شارەوانی خەڵات و ماڵاتێکی زۆری خستۆتە بن دەستی، بەڵام مەلا ئەسعەدی خەیلانی نەک هەر پێشنیازو قسەکانی ئەحمەد عوسمانی ڕەت کردۆتەوە بەڵکو بەهیچ جۆرێک ئامادە نەبوو لەگەڵ دوو ئەفسەرەکە کۆببێتەوە.

هەڵوێستەکەی مەلا ئەسعەدی خەیلانی وای لە لێپرسراوانی ئینگلیز کرد، بەسوپایەکی زۆرەوە بەسەر ناوچەکە دابدەن وە لە شەڕێکی نابەرامبەردا (١٠٠) کەس لە شۆڕشگێڕانی خەڵکی ناوچەکە شەهیدبوون و (٨٥) ئینگلیزو بەکرێ گیراویش کوژران.[١٥].

شکانی خەڵکی ناوچەکە لەم شەڕەدا بووەهۆی کشانەوەو کۆچکردنی خەڵکەکە بۆ ئەو دیوی زێ و بەرەو چیاو دێهاتە سەختەکانی کشان.

مەلا ئەسعەدی خەیلانیش بەرەو ڕواندز گەڕایەوەوبە جارێ خەڵکی شارەکە وروژان و هەموویان لە مزگەوتی گەورە کۆبوونەوەو مەلا ئەسعەدیش باسی وەزعی باتاس و شەڕەکەی بۆ کردن.

قسەکانی مەلا ئەسعەد زۆر کاریگەربون بە تایبەتی بەسەر گەنجە خوێن گەرمەکانی دژ بە ئینگلیز بۆیێ هەڵیان کوتایە سەر قونگری ئینگلیزەکان و سێ کەسیان لێ کوشتن.

دیارە مانەوەی مەلا ئەسعەد لە ڕواندز جێگای مەترسی بوو بۆیێ ڕواندزیشی بەجێ هێشت و بەروو گوندی (بلەی ژێری)[١٦]، چوو لەوێ ماوەیەک لەلای ماڵی پچراوە دێیەکە مایەوە، بەڵام لەبلەش خۆی نەگرت و بەرەو ناوچەی باڵەکایەتی ڕۆیشت و بووە میوانی شێخ مەلا حوسێنی داروسلام لە گوندی (دار السلام)[١٧]و دوایش بۆ ماوەی شەش ساڵ لە گوندی وەردێ[١٨] نیشتەجێ بوو و لەوێ مزگەوت و حوجرەیەکی گەورەی ئاوەدان کردەوە.

بەم جۆرە کڵپەو بڵێسەی شۆڕشی بیست لە هەریر و ناوچەی ڕواندوز دامرکایەوە بەڵام لەمەلا ئەولا جار جار مشتو مڕی پچڕاو پچڕاو سەری هەڵدەدایەوە.

بەڕاستی دامرکانەوەی شۆڕش لە ناوچەکانی خواروو و ناوەڕاست کارێکی تەواوی کردە سەر بارودۆخی شۆڕشگێڕان لە کوردستاندا وە ترس و لەرزێکی زۆری خستە دڵی سەرۆک هۆزەکان بە تایبەتی لە ناوچەی خۆشناوەتی و گەردی دا. بۆیە ملیان بۆ ئینگلیزەکان کەچ کردو دوا بەدوای

ئەوانیش سەرانی سورچیەکان هەمان ڕێڕەویان گرتەبەر[١٩].

**ئۆزدەمیرو**
**مەلا ئەسعەدی خەیلانی**

کەمالییەکان دەیانویست ئەم بارودۆخەی کە دروست ببوو لە ئەنجامی شکانی خەڵکی ناوچەکە لە زنجیرە هەستانەکانی شۆڕشی بیستدا بقۆزنەوەو شوێنێکیش بۆخۆیان دابین بکەن لە ناوچەکەو لەوێشەوە بەرەو ناوچەکانی تر هەڵکشێن.

لە ساڵی ١٩٢١ ئۆزدەمیر پاشایان نارده رواندز لەگەڵ کۆمەڵێک چەکدار، بەمەبەستی بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە دژ بە ئینگلیزەکان و هەڵگەڕاندنەوەی عەشیرەتە کوردەکان دژ بە ئینگلیز[٢٠].

دیارە ئەو کاتەش لەبەر تێکشکانی شۆڕشی بیست لەلایەن ئینگلیزەکانەوە رق و کینەی خەڵکەکە دژ بە ئینگلیز بە ئاشکرا دیاربوو هەربۆیەش ئۆزدەمیر پاشا بەهۆی پشتگیری خەڵکی ناوچەکەوە بەبێ پەروا لەو ناوەدا حوکمی ئەکردو لە ماوەیەکی زۆرکەما، بوو بە ئەمیری بێ فەرمانی ناوچەی رواندزو تورکە کەمالییەکان نفوزێکی گەورەیان لەوناوەدا پەیداکردوە[٢١].

ناوچەی باڵەک ئەوکاتە لە ئارامی و بێ دەنگێکی زۆر سەیردا دەژیاو کڵپەی ئاگری شۆڕشی بیستیش ئەوێی نەگرتبووەوە، چونکە ئینگلیزەکان لە تخوبی ناوچەکە نزیک نەببونەوە، بۆیێ ئۆزدەمیر پاشا ئەم وەزعە بەهەلزانی و نامەیەکی بۆ مەلا ئەسعەدی خەیلانی نوسی کە ئەوساکە لە گوندە وەردێ دەژیاو بە ناوی ئیسلامەتییەوە داوای ئەوەی لێ کرد کە خەڵکی ناوچەکە بچنە ژێر سێبەری کەمالستیەکانەوە، بۆئەوەی ببنە هێزێکی پاڵپشتی هێزە کەمالستییەکان بۆ رزگارکردنی ناوچەکە چەپۆکی ئینگلیزەکانەوە.

دیارە نامەکەی ئۆزدەمیر پاشا کاری خۆی لە مەلا ئەسعەد کردو ئەویش بە دەوری خۆی ئامادەی خۆی بۆ ئەم مەبەستە نیشاندا.

زیرەکی و لێهاتوویی ئۆزدەمیر پاشا و شارەزایی لە سروشت و دەستوری عەشیرەتەکانی ناوچەکە توانی تارادەیەک جموجۆڵ لە ناوچەکەدا دروست بکات ئەگەر چی لە ئاکامدا ئۆزدەمیر بۆی نەچووە سەرو لە پلانەکانی سەرکەوتوو نەبوو بەڵام دەیویست بە خەیاڵی کۆنەوە سەردەمی زێڕینی عوسمانییەکان بگەڕێنێتەوە.

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە مەلا ئەسعەدی خەیلانی سەربازێکی ونی رووداوەکانی شۆڕشی بیست بوو لە ناوچەکانی هەریرو رواندزدا، ئەگەر چی سەرکردایەتی رووداوەکانی کردووە، بەڵام لە هیچ شوێنێک ئاماژەی بۆ نەکراوە.

**سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

١- بۆ زیاتر بڕوانە الدکتور کمال مظهر احمد (دور الشعب الکردي في ثورة العشرین العراقیة) بغداد ١٩٧٨.
٢- درەختی بنەماڵەی مەلا عومەری خەیلانیم لە خوالێخۆشبوو جەمیل مەلا حسنی نەوەی مەلا ئەسعەد وەرگرتووە هەروەها هەندێک لە زانیاریەکانی هەستانەوەی باتاسیشی بۆ باس کردم.
٣- زبیر بلال اسماعیل، علماء ومدارس في اربیل / الموصل ٩٨٤.
٤- مامۆستا زبیر بلال لە کتێبەکەی علماء و مدارس فی اربیل بە هەڵە مێژووی سووتانی کتێبخانەی مزگەوتی گەورەی رواندزی نووسیوە کە دەڵێ لە ساڵی ١٩٥٧ روویداوە، راستییەکەی رۆژی ١٧/تشرینی یەکەم / ١٩٦٣ بوە.
٥- الدکتور ومیض جمال نظمي ثورة ١٩٢٠ - ط - ٩٨٥ بغداد.
٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٧- گۆڤاری برایەتی ژ٤٠ ساڵی یەک خولی دووەم.
٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٩- ئەحمەد کەمال چەندی کردم بۆم ساغ نەبووەوە کە ئەم ئەفسەرە کێ بووەو خەڵکی کوێ بووە؟ ئایا کورد بووە یان تورک بووە؟
١٠-گردی تەلی: گردێکی دەستکردەو نزیک گوندی باتاسە لە سەردەمی خانزادی سۆران دروست کراوە.
١١-١٢-/ الاستقلال و الفرات دوو گۆڤاری شۆڕشی بیست بوون و هەواڵ و رووداوەکانی شۆڕشی بیستیان بڵاو دەکردەوە.
١٣- هەموو سەرچاوەکانی نووسەرە عەرەبەکانی عێراقی و غەیرە عێراقی ئاماژەیان بۆ ئەم مەسەلەیە کردووە.
١٤- گۆڤاری برایەتی ژمارە( ٤٠) ساڵی یەک خولی دووەم.
١٥- پێم وایە دەربارەی ژمارەی کوژراوەکان بەڵگەنامەی ئینگلیزەکان لە راستی لایانداوە.
١٦- بلەی ژێری گوندێکە کەوتۆتە قەدپاڵی چیای کۆڕەک لە دۆڵی ئاڵانە نزیک خەلیفان.
١٧- دارالسلام گوندێکە کەوتۆتە ناوچەی باڵەکایەتی نزیکەی ١٥ کم لە گەڵاڵە دوورە.
١٨- وەردێ: گوندێکە سەر بە بەقەزای چۆمان بەرانبەر سەری سەکرا.
١٩- گۆڤاری برایەتی ژمارە( ٤٠ )ساڵی یەک خولی دووەم.
٢٠- رەفیق حلمی یادداشت بەرگی دووەم بەشی.
٢١- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

ئەم نووسینە لە ژمارە ( ٢٠ و ٢٦ )ی رۆژنامەی کوردستانی نوێ لە ساڵی ١٩٩٢ بڵاو بۆتەوە.

* ئەندام پەرلەمانی عێراق

# پەیوەندیی هەولێر بە بزووتنەوەکانی شێخ مەحمود لە نێوان سالانی (١٩١٨-١٩٢٦)

نەهرۆ محەممەد عەبدولقادر
ماستەر لە مێژووی هاوچەرخ

**زۆر بە کورتی:**
بزووتنەوەکانی شێخ مەحمود و قسەکردن لەسەر پەیوەندییەکانی ئەو بزووتنەوەیە، لەگەڵ دانیشوانی شار و ناوچەکانی تری باشووری کوردستان و هەڵوێستیان لە بەرامبەری، تاوەکو ئێستا ئاورێکی جدی لێ نەدراوەتەوە، دەخوازین ئەم نووسینە ببێتە دەستپێکێکی زانستی بۆ قسەکردن سەبارەت بەم پرسە، کە بێ گومان زەمینەسازی بۆ لە دایک بوون و هێنانەکایەی چەندین توێژینەوەی تر، بۆ خستەرووی ئەو پەیوەندییانە خۆش دەکات.

ئەم باسە بەرکوڵێکە بە خێرایی باس لە پەیوەندیی و هەڵوێستی دانیشتوانی هەولێر و دەوروبەری دەکات، لە بەرامبەر بزووتنەوەکانی شێخ مەحمود کە لە ناوچەی سلێمانی بەرپای کرد، لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی، تا یەکلایی کردنەوە کێشەی ویلایەتی موسڵ لە بەرژەوەندی دەوڵەتی عێراق.

شێخ مەحمود کوڕی شێخ سەعیدی کوڕی شێخ محەممەدی حاجی کاک ئەحمەدی کوڕی شێخ مەعروفی نۆدێی یە، لە ساڵی ١٨٨١ لە سلێمانی لە دایک بووە[١]. بنەماڵەی شێخ هەر لە سەردەمی میرنشینی بابانەوە، رە کوردستان.کانە دەگەڕنەو هەواو کردەوە تیرۆیستیە، ئاماژەیداوە ئەو هەوالی بێ هودانە دەیانەوێت ئایەلی پێکەوەژیانی برایانەی نێوپێگەیەکی ئاینی و کۆمەڵایەتی دیاریان هەبوو. دوای رووخانی میرنشینەکەش لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم، پێگەو دەسەڵاتیان لە پەرەسەندن دابوو[٢]. لە لای دەسەڵاتدارانی عوسمانیش رێزێکی زۆریان هەبوو، هەر بەو هۆیەوە (سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم)، بە فەرمی بانگهێشتی (شێخ سەعید)ی باوکی(شێخ مەحمود)ی کرد، بۆ ئەستەنبوڵ. لەکاتی گەڕانەوەیدا (شێخ سەعید) بە شاری هەولێردا تێپەڕ بوو، خەڵکێکی زۆر لە دانیشتوانی شاری هەولێر هاتنە پێشوازی[٣].

ئەم خانەوادەیە، پەیوەندییەکی لە مێژینەیان لەگەڵ تەکیەو خانەقاو بزووتنەوە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی کوردستان هەبوو٤، هەر لەم چوارچێوەیەدا، پەیوەندی نێوان هەولێرو ئەم بنەماڵە، تەنیا بۆ سەردەمی راپەڕینەکانی (شێخ مەحمود) ناگەڕێتەوە، بەڵکو ئەم پەیوەندییە ریشەیەکی درێژ تری هەیە، پەیوەندی بەتین لە نێوان (کاک ئەحمەدی شێخ) و (مەلا عومەر ئەبوبەکر- مەلا گچکەی هەولێری)

مەلای مزگەوتی گەورەی قەڵا هەبوو، بەردەوام هاموشۆی یەکتریان دەکرد، هەر بۆیە چەندین نامە لە نێوان (کاک ئەحمەدی شێخ) و (حاجی عومەرە فەندی هەولێر)ی ئاڵوگۆڕ کراون، کە تیایدا ڕەوشی زانستی ئاینی و قوتابیانی ئاینی و ڕەوشی خوێندن قسەو باسیان لەسەر کراوە ئەوکاتیش مزگەوتی گەورەی قەڵا ناوەندێکی زانستی بوو، دەیان قوتابی، کە لە ناوچەی جیاجیا هاتبوون، وانەیان تێدا دەخوێندو ئینجازەی مەلایەتیان پێدەدرا[٥].

لە ساڵی (١٩٠٨)دا، کاتێک خانەوادەی (شێخ مەحمود) بەهۆی فشاری ئیتحادییەکان، بۆ شاری موسڵ دوورخرابوونەوە، لەوێدا (شێخ سەعیدی باوکی شێخ مەحمود) و (شێخ ئەحمەد)ی برای لەپیلانێکدا کوژران[٦]. ئەم ڕووداوە کوردانی باشووری کوردستانی زۆر تووڕە کرد[٧]، دانیشتوانی شاری هەولێر لەپاڵ کەرکوک و سلێمانی بەجاریێ خرۆشان[٨]. لەم کاتەدا شاعیری قەڵای هەولێر (حوزنی)[٩]، لە هۆنراوەیەکدا خەم و ناسۆرییەکانی شاری هەولێری، سەبارەت بەم ڕووداوە دەربڕیوە، تەنانەت گەورەیی ڕووداوەکەی بەجۆرێک وێنا کردووە، کە تا ئێستا لە دوای کوشتنی (ئیمام حوسێنی کوڕی عەلی) لە کەربەلا، ڕووداوی لەم شێوەیە ڕووی نەدابێ کاتێ دەڵێ:

**کربلا حادثه موجعه سندن صنره**
**کس نەیداست نەبیندکه مگر شیخ سعید**[١٠].

هەرلەئەنجامی ئەم ڕووداوە (شێخ مەحمود) دوای ئەوەی ماوەیەک لە موسڵ دەست بەسەر کرا بوو، بەهەوڵی هەندێک پیاو ماقوڵانی موسڵ بە یاوەری مەفرەزەیەکی عوسمانی ڕەوانەی شاری هەولێر کرایەوە[١١]. دانیشتوانی هەولێر لە تەک کەرکوک و سلێمانی بەپێ و سوارە کەوتنەڕێ[١٢]، کە تووڕ بوون و بێزاری لە ڕوویان دەخوێندرایەوە. دوای ئەوەی شێخ گەیشتە هەولێر، لە وێ نەوەستاو یەکسەر بەرەو کەرکوک چوو[١٣]. بەپێی بۆچوونێک پیاوماقولانی هەولێریش، ڕۆڵیان لە هێنانەوەی شێخ هەبوو[١٤].

بەر لە هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانی، (شێخ مەحمود) لە زۆربەی ئەو هەوڵانەی کە دەیخستەگەڕ، بۆ بە دەستهێنانی مافەکانی کورد، هەولێری بە بەشێک لە دەسەڵاتی خۆی دانا بوو. هەر بۆیە، کاتێک لە ساڵی ١٩١٣، بە مەبەستی بەدیهێنانی سەربەخۆیی پەیوەندی بە ڕووسەکان کرد، هەولێری بە بەشێک لە دەسەڵاتی خۆی داناوەو بە ناوی سلێمانی و هەولێر و کەرکوک، ئەم داوایەی پێشکەش بە ڕووسەکان کردبوو[١٥]، ئەمەش کاتێک نوێنەری تایبەتی خۆی ڕەوانەی شاری بەغداو موسڵ کرد[١٦].

لەگەڵ هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانی، لە ساڵی (١٩١٤) و جاڕدانی جیهاد کردن، لە دژی کافران، لە لایەن دەوڵەتی عوسمانی، (شێخ مەحمود) بەشداری لە شەڕی (شوعەیبە)دا کرد، کاتێک سەرۆکایەتی هێزێکی کوردی کرد کە لە ژمارەیەک سەرۆک هۆز و سوارەکانی کەرکوک و سلێمانی و هەولێر پێکهاتبوون[١٧]. دیارترین ئەو کەسایەتیانەی هەولێر کە بەشداریان لەم هێزەدا کرد، (حوسێن عەوڵای حەتکی زێد بەگی) ناسراو بە (عارەب ئاغای کۆزەپانکەیی)[١٨]، هەروەها بەشێک لە سوارەکانی هۆزی دزەیی، لەوانە (پیرداود ئاغا)ی خەڵکی گوندی (مێرخوزار)ی ناوچەی دزەیی بوون[١٩].

لە دوای کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی و هاتنی دەسەڵاتی بەریتانییەکان بۆ ناوچەکە، کاتێک(مێجەر نوئێل) لە (١٩١٨/١١/١٧)، هاتە سلێمانی[٢٠]، وتارێکی درێژی بە زمانی فارسی خوێندەوە و ڕایگەیاند، کە (شێخ مەحمود) حکومداری کوردستانە[٢١]، سەبارەت بە سنوورو چوارچێوەی دەسەڵاتەکەشی، ڕایگەیاند، (شێخ مەحمود) حوکمداری هەرێمی نێوان سیروان و زێی گەورەیە، کە بەم پێیەش هەولێر خۆی لە چوارچێوەی دەسەڵاتی (شێخ مەحمود)دا دەبینیەوە[٢٢].

بەڵام بەریتانییەکان، دواتر، هەولێریان نەخستە سەر دەسەڵاتەکەی (شێخ مەحمود)، تەنانەت (کۆیە)ش کە لە سەرەتادا بڕیار بوو، لە چوارچێوەی دەسەڵاتی شێخ بێت، خستیانە سەر هەولێر، هەر ئەوەندەش نەوەستان، بەڵکو بە تێپەڕبوونی کات، بەریتانییەکان تادەهات دەسەڵاتەکەی شێخیان کەم دەکردەوە[٢٣].

لە لایەکی دیکەوە، شێخ بە مەبەستی یەکخستن نوێنەری خۆی بۆ هەولێر و کەرکوک و موسڵ و هەندێ ناوچەی دیکە نارد[٢٤]. لەگەڵ ئەوەی

دەسەڵاتی (شێخ) نەگەیشتۆتە شاری هەولێر[٢٥]، بەڵام بە پێی دۆکیۆمێنتێکی مێژوویی دەسەڵاتەکەی گەیشتۆتە ناوچەی (کۆڕێ)ی سەر بە هەولێر[٢٦]، ئەمەش کاتێک لە ساڵی ١٩١٩ (شێخ) بە فەرمانێکی تایبەتی خۆی، (مستەفا بەگی)[٢٧] بە سەرداری کۆڕێ دانا، بە ناوی خۆی دەستەبەرکردنی هێمنی و ئاسایشی دەڤەرەکەی پێ سپارد، مانگانەش (١٠٠) روپیەی وەک موچە بۆ بڕیبۆوە[٢٨]. ئەمەش ئەوە دوپات دەکاتەوە کە دەسەڵاتەکەی (شێخ) ناوچەکانی سەر بە هەولێریشی گرتۆتەوە ئەگەر بەشێوەیەکی کاتیش بێت.

دەنگ و سەدای حوکمداریەتی (شێخ)، لە نێو شاری هەولێر بڵاوبۆوە، ئەم پێشهاتەش، زۆربەی دانیشتوانی شارو دەوروبەری خۆشحاڵ کرد، تەنانەت بەشێک لە لاوەکانی شار حەزو خولیای ئەوەیان لەلا دروست بوو، بچنە شاری سلێمانی، بۆ ئەوەی ئەوانیش لە سێبەری ئەم دەسەڵاتە کوردییەدا بن[٢٩]. هەروەها بە بۆنەی حوکمداریەکەیەوە، (خدری پاشای دزەیی) بروسکەی پیرۆزبایی بۆ (شێخ) ناردو ئامادەیی و پشتگیری خۆی بۆ پیشاندا[٣٠].

لەم چوارچێوەیەدا، دەستەیەک لە گەنجانی شار پەیوەندیان بە دەسەڵاتەکەی (شێخ مەحمود) کردووە، لەوانە (حوسێن عەوڵای حەتکی زێد بەگی)[٣١] و (ئەحمەدی کوڕی حاجی مستەفای کوڕی حاجی محەممەدی کوڕی حاجی مەحمود)[٣٢]، هەروەها بەهۆی ئەو بارگرژییەی کە لەنێوان دزەییەکان و ئیدارەی بەریتانییەکان لە شاری هەولێر ئەو کات لە ئارادابوو، بەشێک لە دزەییەکان بڕیاریاندابوو لە دوای وەرزی دروێنەکردن لەساڵی ١٩١٩ پەیوەندی بە (شێخ مەحمود)ەوە بکەن، وەک لە بەڵگەنامەیەکی عوسمانیدا هاتووە[٣٣].

دیارە، هەموو خەڵکی پشتیوانیان لە دەسەڵاتەکەی (شێخ مەحمود) نەکردووە: لە بارەی نەیارانی شێخ لە هەولێر، رۆژهەڵاتناس (میتاچیڤیلی) دەڵێ:

"بۆرجوازەکانی هەولێر، نەیاری دەسەڵاتەکەی شێخ بوون، چونکە لەوە دەترسان دوای سەرکەوتنی دەسەڵاتەکەی شێخ، هەولێر ببێتە شوێنکەوتەو پاشکۆی شاری سلێمانی دواکەوتوو"[٣٤].

هەروەها لە دووتوێی راپۆرتێکی بەریتانی ئاماژە بەوە کراوە، کە خوێندەوارو رۆشنبیرانی هەولێر ئامادە نەبوون، بە دوای گوندێکی وەک سلێمانی بکەون[٣٥]. کەسایەتیە دیارەکان بەتایبەتی (مەلا فەندی)[٣٦] خۆی لە (شێخ) باڵاتر داناوەو تەنانەت لە هەڵس و کەوت بیرکردنەوەشدا جیاواز بوون[٣٧].

بە پێی دۆکیۆمێنتێکی بەریتانی، لە کاتی دیداری لەگەڵ (C.A.G.Rundle) ئەفسەری سیاسی بەریتانی لە کۆیەدا، (مەلامحەممەدی کۆیە) داوای کردووە کە (حەمید بەگی بابان)[٣٨] بکرێتە فەرمانڕەوای کوردستان، ئەوەشی راگەیاندووە کە پیاوماقوڵانی هەولێر هەمان بۆچوونیان هەیە و پاڵپشتی لێ دەکەن[٣٩]. لەبارەی سنووری ئەم فەرمانڕەوایەتیە، (مەلامحەممەدی کۆیە) داوای کرد، کە دەسەڵاتی بەسەر (هەولێر، سلێمانی، کەرکوک)دا هەبێت، هەروەها دڵنیاش بوو لە وەی کە رەواندزیش دەخوازێت بێتە ژێر دەسەڵاتی ئەو حوکمداریەتیە[٤٠]، لە هەمان کاتدا (مەلا محەممەد)، بە هەموو شێوەیەک دژی بیرۆکەی سەربەخۆی تەواوی کوردستانی باشوور بوو، چونکە بەپێی دۆکیۆمێنتێکی بەریتانی، ناوبراو بە باوەڕی بەوە بوو، وە بە پێویستیشی دەزانی، کە ئەو دەوڵەتە لە ژێر سەرپەرشتی بەریتانیادا بێت[٤١].

لە لایەن خۆیانەوە، بەرپرسانی بەریتانی لە شاری هەولێر، چەند جارێک، سەبارەت بە پرسی (شێخ مەحمود)، دیدارو کۆبوونەوەیان سازکرد، تیایدا بەربەرەکانێکردنی شێخیان تاوتوێکرد، هەر لەم نێوەندەدا، هەوڵیانداوە سوود لە (سەید تەهای نەهری) وەربگرن، بۆ ئەوەی (شێخ مەحمود)، نەتوانێت پانتایی دەسەڵاتەکەی بگەیەنێتە هەولێر[٤٢]. کاتێک (سەید تەها) لە ساڵی ١٩١٩هاتۆتە هەولێر، ئەم مەسەلەیە لە نێوان ئەو و بەریتانییەکان و پیاوماقوڵانی شار تاوتوێکرا، هاوکات لەگەڵ ئەمەشدا دەسەڵاتدارانی بەریتانی لە هەولێر دەستیان کردبوو، بە بڵاوکردنەوەی پروپاگەندە لە دژی (شێخ مەحمود)[٤٣].

یەکێک لە کەسایەتییە دیارەکانی دزەیی، (عەلی مەحمود کاکە خان) بوو[٤٤]، کە پەیوەندییەکی توندوتۆڵی، لەگەڵ (شێخ مەحمود)

هەبوو[٤٥]. لە ڕاستیدا پەیوەندییەکانی ئەم دوو خانەوادەیە بۆ سەردەمی (کاک ئەحمەدی شێخ) دەگەڕێتەوە[٤٦]. هەر بۆیە دوای ئەوەی پەیوەندی نێوان بەریتانییەکان و (شێخ مەحمود) دووچاری ئاڵۆزی دەبێت[٤٧]، لەگەڵ هەڵگیرسانی یەکەمین بزووتنەوەی (شێخ مەحمود)دا، لە ساڵی ١٩١٩دا (عەلی مەحمود کاکەخان)، لەگەڵ دەستەیەک لە سوارەکانی پەیوەندی بە شێخەوە کرد[٤٨]. تانانەت لەگەڵ سوارەکانی بەشداری شەڕی دەربەندی بازیانیان کرد[٤٩]، هەروەها، بە پێی، گوتەی نووسەرێک، هەریەک لە (حاجی ئەحمەد جامباز) و (دەرویش رەمەزان)یش بەشداربوونە لەم شەڕە[٥٠]. ئەمانەش وتەی نوێنەری باڵای بەریتانی لە عێراق ڕەتدەکەنەوە، کە ئاماژە بەوە دەکات، هیچ هاوسۆزیەک لە نێوان دانیشتوانی هەولێر و بزوتنەوەی (شێخ مەحمود) نەبووە[٥١].

دوای بەدیل گرتنی (شێخ مەحمود)و هەردەس هێنانی ئەم ڕاپەڕینە، (عەلی مەحمود کاکەخان) گەڕایەوە، گوندی مورتکە لە دەشتی هەولێر[٥٢]. هەروەها (حوسێن حەتکی زێد بەگی)ش دەگەڕێتەوە شاری هەولێر، بەڵام (حوسێن زێدبەگی) لە لایەن هەندێک لە دەست و پێوەندەکانی بەریتانییەکان، زمانی لێ دەدرێت، بەوەی چەکی لە دژی هێزەکانی بەریتانیا هەڵگرتووەو بەشداری لە بزووتنەوەکەی (شێخ مەحمود) کردووە، هەر بۆیە فەرمانی دەستگیرکردنی لە لایەن بەریتانییەکان لە شارەکە بۆ دەرچوو، ئەویش لە دوای زانینی ئەو هەواڵە، هەولێری بەجێ هێشت و لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی ڕوویان لە دەشتی قەراج و کەندێناوە کرد و کەوتنە دژایەتی بەریتانییەکان[٥٣].

لە دوای لەناوبردنی دەسەڵاتەکەی (شێخ مەحمود) لە ساڵی ١٩١٩دا، خەڵکی هەولێر بەشێوەیەکی گشتی تووشی نیگەرانی و بێزاری بوون، چونکە ئەو هیوایەی کە بەشێخیان هەبوو پوکایەوە[٥٤]. لەگەڵ ئەوەشدا دانیشتوان و کەسایەتیە دیارەکانی هەولێر، هاوسۆزییان بەرامبەر شێخ هەر مابوو[٥٥]. هەر بۆیە لەکاتی دوورخستنەوەی شێخ، بۆ هیندستان و بەرزبوونەوەی دەنگی ناڕەزایی لە زۆرلاوە، دانیشتوانی هەولێر و بەتایبەتی پیاوماقوڵانی لەوانە (مەلافەندی و محەممەد موفتی هەولێر، مەلا محەممەدی کۆیە) بەمەبەستی ئازادکردنی(شێخ)، ئیمزایان کۆکردەوە و یاداشتێکیان پێشکەش کرد. لەلایەن خۆیەوە (مەلافەندی) بۆ چەند جارێک داوای ئازاکردنی (شێخ مەحمود)ی لە دەسەڵاتدارانی بەریتانی کرد، وە لە زۆر دیدارو کۆبوونەوەکانی لەگەڵیاندا ئەم داوایەی دووپات دەکردەوە[٥٦]. (ئەحمەد خواجە) لە یاداشتەکانیدا ئاماژە بەو یاداشتەی هەولێر دەکات کە بۆ ئازادکردنی (شێخ مەحمود) ئاراستەی کاربەدەستانی بەریتانی کرا[٥٧].

(شێخ مەحمود) دوای ئازادکردنی لە (٣٠)ی ئەیلولی ١٩٢٢دا گەیشتەوە شاری سلێمانی[٥٨]. لەو بارەیەوە (ئەحمەد خواجە) زانیاری ئەوەمان دەداتێ کە لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان سەرۆک هۆزو پیاوماقوڵان بەبۆنەی پیرۆزبایی گەڕانەوەی سەردانی شێخیان کرد، هەر بۆیە خشتەیەک بۆ ڕێکخستنی وادەی سەردانەکان دیاری کرابوو، لەم چوارچێوەیەدا ڕۆژێک بۆ ئەو شاندانە دیاری کرابوون کە لە ناوچەی هەولێرەوە هاتبوون، کە بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:

لە کاتژمێر ٩ بەیانی بۆ ٩:١٥ بۆ سەرۆک عەشیرەتی خۆشناو.

لە ٩:٢٠ بۆ ٩:٣٥ بۆ دزەییەکان.

لە ٩:٤٠ بۆ ٩:٥٥ بۆ گەردییەکان دیاری کرابوو[٥٩]. هەروەها (ڕەفیق حلمی)یش دەڵێت:"لە هەموو لایەکی کوردستانەوە پۆل پۆل و دەستە دەستە ئەهالی و عەشائیر بە پێیان بەسوارە چوونەتە پێشوازی (شێخ مەحمود)"[٦٠].

بەر لە گەڕانەوەی شێخ، ژمارەیەک ئەفسەری کورد بۆ یارمەتی دانی لە (٢٥)ی ئەیلولی ساڵی ١٩٢٢ گەیشتنە شاری سلێمانی، کە یەکێک لەوانە (ئەمین ڕەواندزی) بوو، کە خەڵکی ناوچەیەکی سەر بە هەولێر بوو[٦١]، دوای گەڕانەوەشی (شێخ مەحمود) لە (١٠)ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٢دا، بە پێی فەرمانێکی حکومداری کابینەی حکومەتی کوردستانی ڕاگەیاند[٦٢]. سەبارەت بە هەڵوێستی هەولێر لەم حکومەتە، توێژەرێک ئاماژە بەوە دەکات، لە ئەنجامە سەرەتاییەکانی هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی دامەزراندن، لە ساڵی ١٩٢٣دا، حکومەت بۆی دەرکەوت کە هەولێر

بەشداری هەڵبژاردنەکان ناکات، لە بەرئەوەی بە شێوەیەکی گشتی سۆزیان بەلای (شێخ مەحمود)ەوە بوو، بەڵام حکومەت هەوڵیداوە ئەو هاوسۆزیە بە ئاقارێکی دیکەدا ببات[٦٣].

لەساڵی ١٩٢٣دا، دوای سەرهەڵدان و پەرەسەندنی بارگرژییەکانی نێوان شێخ و بەریتانییەکان و بڵاوبوونەوەی ئەو هەواڵە، (عەلی مەحمود کاکە خان) جارێکی دیکە لەگەڵ دەستەیەک لە سوارەکانی پەیوەندی بە شێخ کرد لە سلێمانی[٦٤]، لە شەڕێکدا لە ناوچەی سووورداش لەگەڵ هێزەکانی (شێخ مەحمود) جەنگاوە[٦٥]. بە فڕۆکە لە لایەن بەریتانییەکانەوە بۆردومان کراون. دوای پووکانەوەی هەوڵەکان، ناوبراو بۆ ماوەیەک دەچێتە ناوچەی پشدەر و لە لای (بابەکر ئاغای پشدەری) دەمێنێتەوە و پەیوەندییەکی بەهێزیشی لەگەڵیاندا هەبوو[٦٦]. کە ئەو پەیوەندە پێشتریش لە نێوانیان هەبوو.

(عەلی مەحمود کاکەخان)، دوای ئەوەی لەگەڵ دەستەیەک لە سوارەکانی دەگەڕێنەوە دەشتی کۆیە[٦٧]، لەوێ لە ناوچەی (گۆێتەپە)ی دەشتی کۆیە، پۆلیسی لێ ئاگەدارکرێتەوە[٦٨]، هەر بۆیە لە بناری دێدەوان، لەنزیک شاخەپیسکە لەگەڵ هێزەکانی پۆلیس پێکیانداداان ڕوویداو بەهۆیەوە چەند پۆلیسێک کوژران[٦٩]. لەم بارەیەوە سەرچاوەیەک ئاماژەیداوە لەو پێکدادانە ٦ پۆلیس کوژراون و یاوەرێکی (عەلی مەحمود کاکەخان)، بەناوی (حوسێن سیان) کوژراو یەکێکی تریش بەناوی (ڕەئوف سالح) برینداربوو[٧٠]، بۆ ئەم ڕووبەڕووبوونەوەیە، هێزێکی پۆلیس لە شاری هەولێردەوە ڕەوانەکرا بوو[٧١]. سەرچاوەیەکی دیکە باس لەوە دەکات، کە (حوسێن سیان) لە شەڕێکی دیکە کوژراوە کە لە گوندی میرەکان ڕوویدا، لەو شەڕەشدا فەرماندەی مەفرەزەکەی حکومەت بەناوی (مەحمود شاکر) کوژرا[٧٢]. بەڵام (عەلی مەحمود کاکەخان) و ئەو سوارانەی لەگەڵی دابوون خۆیان دەرباز کرد[٧٣].

ئەم پێشهاتە، زیاتر لایەنی بەریتانی و کاربەدەستانی خۆجێیی لێ تورە کردووە[٧٤]، تەنانەت حکومەتی عێراقی جاری ئەوەیدا، بە مردوویی یاخود زیندووی دەبێت (عەلی مەحمود کاکەخان) بکەوێتە بەردەستیان[٧٥]، بەڵام دواتر لە ساڵی ١٩٢٤ لە ڕێگای گەورە پیاوانی هەولێر و دزەییەکان بەتایبەتی (خورشید ئاغا) و (حوسێنی مەلا) و (خدری پاشا)، کە هەوڵێکی زۆریاندا، تا وەکو حکومەتی عێراقی لێبووردنی بۆ دەرکرد و گەڕایەوە گوندی مورتکە[٧٦]. سەرچاوەیەکی دیکە ئاماژە بەوە دەکات، لە ساڵی ١٩٢٤ لەکاتی هاتنی (مەلیک فەیسەڵ) بۆ شاری هەولێر، (مەلافەندی)ش داوای لە مەلیک کرد، لێبوردن بۆ (عەلی مەحمود کاکەخان) دەربکات، مەلیکیش ئەو داوایەی قبوڵکردو لێبووردنی بۆ دەرکرد[٧٧]، جێی ئاماژەیە ئەو پەیوەندییەی کە (عەلی مەحمود کاکەخان) و پیاوەکانی لەگەڵ (شێخ مەحمود) هەیانبوو، لە ئەدەبی فۆلکلۆری دەشتی هەولێر ڕەنگی داوەتەوە[٧٨].

(عەلی مەحمود)، لەمیانەی ئەو گفتوگۆیانەی، کە بەمەبەستی هاتنەوەی لەگەڵیدا ئەنجامدراوە، ڕەتیکردۆتەوە ئەو لێبوردنە بە تەنیا ئەو بگرێتەوە، بەڵکو داوایکردووە سەرجەم ئەو پیاوانەی لەگەڵیدابوونە و بەشداری بزووتنەوەکەی (شێخ مەحمود)یان کردووە، لێبوردن بیانگرێتەوە[٧٩].

(شێخ مەحمود)، لەوکاتەی لە (١٢)ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٣دا، بە مەبەستی بە دەستهێنانی یارمەتی، نوێنەری خۆی ڕەوانەی کونسڵخانەی ڕوسیا لە تەورێز کرد، ئەوەی بە ڕووسەکان ڕاگەیاند، کە بە مەبەستی دژایەتیکردنی بەریتانییەکان، بانگەوازێکی بۆ هۆزە عەرەبەکانی دانیشتووی میزۆپۆتامیا دەرکردووە و هەولێر و کۆیە و کەرکوک و کفری بەڵێنیان داوە، ئەگەر بێتوو شێخ دژی ئینگلیز ڕاپەڕێت تا (١٠) هەزار چەکداری دەدەنێ[٨٠]. تەنانەت دوای ئەوەی سێیەمین حکومەتی ڕاگەیاند، (شێخ مەحمود) لە (١٥)ی کانوونی دووەمی ١٩٢٣دا، بە مەبەستی دانانی نەخشەی کار بۆ حکومەتەکە، لەگەڵ (٤٣) سەرۆک هۆزی کوردی کۆبۆوە، کە چواریان لەوانە، لە سەرۆک هۆزەکانی هەولێرو کۆیە بوون[٨١].

هەر سەبارەت بە هەڵوێستی هەولێر لە ڕاپەڕینەکانی (شێخ مەحمود)دا، دەبێ ئاماژە بەوە بکەین، کە لە هەندێ باردا کەسایەتیە دیارەکانی هەولێر، ڕۆڵیان هەبوو لە چارەسەرکردنی کێشەکان لە

نێوان شێخ مەحمود و دەسەڵاتدارانی بەریتانی و عێراقی. لەمەشدا سوودیان لەو پەیوەندییە دۆستانە وەرگرتووە کە لەگەڵ شێخدا هەیانبوو[٨٢]. ئەمەش کاتێک هات، کە ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوخۆی عێراقی (کورنوالیس) لەساڵی ١٩٢٦دا، نامەیەکی ئاراستەی (مەلافەندی) کرد، تیایدا داوای لێکرد، ڕۆڵی نێوەند ببینێت بۆ چارەسەرکردنی پرسی (شێخ مەحمود)، هەر بۆیە ئەویش داوای پێشاندانی نیاز پاکی حکومەتی عێراقی کرد، بۆ چارەسەرکردنی ئەم مەسەلەیە، کە لەسەر بنەمای پارێزگاری مافەکانی کورد و پاراستنی گیان و شەرەفی شێخ بێت، بۆ ئەم مەبەستەش (مەلافەندی) دەستیکرد، بە پەیوەندی و نامە گۆڕینەوە، لەگەڵ (شێخ مەحمودا)، دوای گەیشتن بە ڕێککەوتن، داواشی لەوەزارەتی ناوخۆی عێراق کرد، (ئەحمەد عوسمان)[٨٣]ی ئامۆزای بکرێتە موتەسەریفی سلێمانی، بۆ ئەوەی بتوانێت کارەکان بە شێوەیەکی باش جێبەجێ بکات[٨٤]. ئەوکاتیش (ئەحمەد عوسمان)، لە نێو ئاپۆرایەکی زۆری خەڵکی هەولێر بەرەوە سلێمانی بەڕێ کرا[٨٥].

لەگەڵ گەیشتنی (ئەحمەد عوسمان) و دەست بەکاربوونی، وەک موتەسەریفی لیوای سلێمانی، هەوڵەکانی بە مەبەستی هێوکردنەوەی ڕەوشەکە خستەگەڕ و پەیوەندی بەشێخەوەکرد[٨٦]، لەبەر ئەوەی باسی ئەو هەوڵانە دەکەوێتە دەرەوەی چوارچێوەی باسەکەمان، بۆیە بە پێویستی نازانین لێرە باسی بکەین.

**پەراوێز**

١ - سەبارەت بە ڕۆڵ و کەسایەتی شێخ مەحمود بڕوانە: عبدالرحمان ادریس صالح البياتي، الشيخ محمود الحفيد البرزنجي والنفوذ البريطاني في كردستان العراق حتى عام ١٩٢٥، ط١، سلیمانیة، ٢٠٠٦: محمد رسول هاوار، شێخ مەحمودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، ب١-ب٢، لەندەن - بەریتانیا، ١٩٩٠.

٢ - ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی، شاری سلێمانی ١٩١٨-١٩٣٢،چاپخانەی زانست، سلێمانی،٢٠٠٢، ل ٢٨.

٣ - محمد رسول هاوار ، شێخ مەحمودی قارەمان و ....، ل ٢٠٩.

٤ - پشکۆ حەمەد تاهیر ئاغجەلەری، کەرکوک (١٩١٧ - ١٩٢٦)/ توێژینەوەکی مێژوویی سیاسییە، مەکتەبی بیروهۆشیاری(ی.ن. ک) سلێمانی، ٢٠٠٧، ل ١٨٧ .

٥ - احسان رشاد المفتي، رسائل من كاك احمد الشيخ الى حاج ملا عمر ابن ابي بكر ملا گچكە الاربلي، کاروان "گۆڤار"، ژ(٢٤)، ئەیلولی١٩٨٤، ساڵی دووەم، ل ل ١٥٠ - ١٥٣: ئیحسان موفتی نامەکانی کاک ئەحمەدی شێخ بۆ حاجی عومەر فەندی ناردووە کە نامەی شەشەم بۆ یەکەمین جار، بڵاودەکاتەوە، بەدرخان "مانگنامە"، ژ(٨٩ )، هەولێر، ٢٢/ ١/ ٢٠٠٨.

٦ - لە بارەی ئەم ڕووداوە بڕوانە: عەبدولمونعیم غولامی، سێ قوربانییەکە (شێخ سەعدی بەرزنجی، شێخ عەبدولسلامی بارزانی، شێخ زاری ئەلزەوبەعی)، و: ئیحسان نیروانی، چ١، هەولێر، ٢٠٠٤، ل ل ٢٢ - ٢٨.

٧ - شێخ لەتیفی حەفید، یاداشتەکانی شێخ لە تیفی حەفید لەسەر شۆڕشەکانی شێخ مەحمودی حەفید، چ١، ساغکردنەوەی: کەمال نوری مەعروف، دهۆک ١٩٩٥، ل ١٩.

٨ - ڕەفیق حلمی، یادداشت.چ٣، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی،٢٠٠٣، ل ٣٧.

٩ - حوزنی ناوی ئیسماعیل کوڕی دەرویش ئاغای کوڕی غەفوور ئاغای کوڕی مستەفا ئاغای کوڕی حاجی محەممەد ئاغای چاوشلییە، لە ساڵی ١٨٤١ لە دایک بووە، شیعری بە کوردی و تورکی و فارسی هەیە، لە ساڵی ١٩١٧ مردووە. تارق جامباز، پاش مردنی بە (٨٠) ساڵ ئینجا شیعرەکانی حوزنی (١٨٤١ -١٩١٧) شاعیری قەڵاتی هەولێر بڵاودەکەینەوە، رامان "گۆڤار"، ژ(١١٨)،ساڵی دووەم، هەولێر، کانونی دووەمی ١٩٩٧، ل ل ١٣٨ - ١٣٩.

١٠ - بۆ دەقی هۆنراوەکە بڕوانە:هـ.س، ل ١٤٠.

١١ - شێخ لەتیفی حەفید، س.پ، ل١٩.

١٢ - پشکۆ ئاغجەلەری، س.پ، ل١٩١.

١٣ - یاداشتەکانی شێخ لەتیف... ل ل١٩ - ٢٠.

١٤ - چاوپێکەوتن لەگەڵ جەلال خدر.

١٥ - د.كمال مظهر، كركوك... ج١، ص١٥٦.

١٦ - لازاریف، کێشەی کورد، و: کاوس قەفتان، ب١، بەغدا، ١٩٨٩، ل ٣٦٣.

١٧ - سروه اسعد صابر، الحرب العالمية الاولى الى نهاية مشكلة الموصل

(١٩١٤ - ١٩٢٦)، ط١، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠١،ص٤٣: جميل رۆژبەیانی، شێخ مەحمودی حەفید زادە، رۆشنبیری نوێ"گۆڤار"، ژ(١١٣)، بەغدا، ساڵی ١٩٨٧، ل ٦٣.
١٨ - جەلال خدر، حەسەنە شەل و پەتی قنارە. دەستنووسێکە لەلای جەلال خدر.
١٩ - هۆشیار عەبدوڵلا، دزەیی و ناوچەی دزەییاتی دەشتی هەولێر، هەولێر"گۆڤار"،ژ(٨)، پایزی ٢٠٠٠، ل ل ١٢٧ - ١٢٨.
20- A-r 20/5 12, Telegram, From Political Baghdad to India 1918 Office, No 1.9351 Novemr
سدیق ساڵح، حکومەتی کوردستان ١٩١٨ - ١٩٢٤، چ٢، سلێمانی ، ٢٠٠٦، ل ٣١:
٢١ - رەفیق حلمی، یادداشت، ب١، ل ل ٤٦-٤٧.
٢٢ - ب. هولت. مذكرة حول الشيخ محمود، ت: د. ازاد گرمیانی، مجلة (ئاڵای ئیسلام)، ع(١) اذار ١٩٩٦، ص ٤٨: سدیق ساڵح، حکومەتی...، ل ١١.
٢٣ - محمد رسول هاوار، شێخ مەحمودی قارەمان و ....، ل ٤٥.
٢٤ - د. ئەفراسیاو هەورامی، کورد لە ئەرشیفی رووسیا و سۆڤیەت دا، چ١، هەولێر، ٢٠٠٦،ل ٢٠٦.
٢٥ - البرت م. منشاشفيلي، العراق في سنوات الانتداب البريطاني، ت:د.هاشم صالح التكريتي، مطبعة جامعة بغداد، ١٩٧٨،ص ٣٠٦.
٢٦ - کۆرێ دەکەوێتە نێوان شەقلاوە و پیرمام (هاوینە هەواری سەلاحەدین).
٢٧ - مستەفا بەگ، مستەفا ئاغاشی پێ دەگوترا، کوری حەمەدەمین ئاغای کوری عەولا ئاغا ماوەلووی کوری وسوو رەحمان ئاغای کوری قادر خانە سەرۆکی عەشیرەتی کۆرێ، لە ساڵی ١٩١٩ لەمیانەی شەرێکدا کوژرا. سدیق ساڵح، ئەلبومی شێخ مەحمودی حەفید، ب١، سلێمانی ، ٢٠٠٦ ، ل ١٤٤.
٢٨ - هـ.س، ل ١٤٤: تارق جامباز، پێش (٨٢) ساڵ لە ١٩١٩ فەرمانێک لە حکومداری کوردستان (شێخ مەحمود) بە دانانی مستەفا بەگ بە رەئیسی عەشیرەتی کۆرە(کۆرێ) دەرچووە، برایەتی "رۆژنامە"، ژ(٣٣١٠)، هەولێر، ٢٠٠١/٢/١٣: بۆ دەقی ئەم دۆکیۆمێنتە بروانە پاشکۆی ژمارە (١).
٢٩ - چاوپێکەوتن لەگەڵ حاجی نوردەدین دەباغ، چاوپێکەوتن لەگەڵ حاجی نەجمەدین.
٣٠ - کەریم شارەزا، پیاوی بەجەرگی دزەییان خدری پاشا (١٨٨٠ - ١٩٨٦)، هەولێر"گۆڤار"، ژ(٤)، پایزی ١٩٩٩، ل ٩٤.
٣١ - جەلال خدر، حەسەن شەل و ....، دست نوس.
٣٢ - جەلال خدر، حاجی ئەحمەدی جامبازی لاوک و حەیران بێژ و مقامزان (١٨٨٢- ١٩٧٤)، رامان "گۆڤار" ژ(٧٦)، هەولێر، تشرینی یەکەم ٢٠٠٢، ل ١٢٦.
٣٣ - نامەیەکی جوفردکراو کە لە (وان)ەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ (نظارة الداخلية)ی عوسمانی رەوانە کراوە. لە بەرواری ١٣٣٥/٨/٦رۆمی لە: د.خليل علي مراد (ترجمة و تعليق)، مختارات من كتاب الموصل و كركوك في الوثائق العثمانية، منشورات مؤسسة ژين، مطبعة شڤان، السليمانية، ٢٠٠٠، ص ١٧٤.
٣٤ - البرت .م.متشاشفيلي، م.س، ص ٣٢٢.
35 -Report on Iraq Administration April, 1922-March, 1923 ,PP36
٣٧- وەرگیراوە لە د. كمال مظهر، كركوك و...، ص ١٧٠.
٣٦ - مەلا ئەبو بەکری کوری حاجی عومەری کوری مەلا ئەبوبەکری سێیەمە (١٨٦٣ - ١٩٤٢)، خاوەن پێگەیەکی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی بوو، پەیوەندیەکی بەتینی لەگەڵ کاربەدەستە باڵاکانی عێراقی هەبوو، چەند جارێک (مەلیک فەیسەڵ) سەردانی کردووە، لەبەر گرنگی پایەوپێگەکەی، ژمارەیەکی رۆژنامەی (فتى العراق) تایبەت کراوە بە چلەی مردنی. فتى العراق "الجريدة"، ع(٢٤٥ - ٥٤٤)، اشباط ١٩٤٣: محمد أمين زكي، مشاهير الكردو كردستان، نقله الى العربية: محمد علي عوني، ج١، بغداد ،١٩٤٧،ص ٨٣: حميد المطبعي، موسوعة اعلام العراق في القرن العشرين، ط١، ج١، وزارة الثقافة و الاعلام دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ١٩٩٥، ص ١٢.
٣٧ - چاوپێکەوتن لەگەڵ ئیحسان موفتی.
٣٨ - حەمید بەگ کوری حوسێن بەگی کوری محەممەد پاشای بابانییە، لە ساڵی ١٨٤٦ لە سلێمانی لە دایک بووە، دواتر چۆتە بەغدا و لە دیوانی ویلایەت کاری کردووە، ماوەیەک

داواکاری گشتی بوو لە موسڵ، دواتر بۆتە پشکێنەری دادی لە ویلایەتەکانی(موسڵ، بەغدا، بەسرە)، هەروەها چەند پۆستێکی تری وەرگرتووە، لە ساڵی ١٩٢٢ لە شاری بەغدا مرد. میر بصری، اعلام الکرد، ص ص ١٥٦ -١٥٧.

39 - 371-5069, Fro C.A.G.Rundle ,Captain, A.p.o.koi, To the Political Officer Arbil, N0 5,7March, 1920.

40 - F.O, 371-5069, From C.A.G.Rundle ,Captain, A.p.o.koi, To the Political Officer Arbil, N0 6,9March, 1920.

41- F.O, 371-5069, Confidentail memo, NO S.C/155/4 Dated 17July 1920, From The Political Officer, Arbil, To Civil Commissinner, Baghdad.

٤٢ - رفیق حلمی، یادداشت، ل ٩٦.

٤٣ - نامەیەکی جوفرەکراو کە لە (وان)ەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ (نظارة الداخلیة)ی عوسمانی رەوانە کراوە. لە بەرواری ١٣٣٥/٨/٦رۆمی لە: د.خلیل علی، مختارات من کتاب ... ص ١٧٤ : رەفیق حلمی، یاداشت، ل ل ٩٥ - ٩٦.

٤٤ - عەلی مەحمود کاکەخان، عەلی ئاغای کوری مەحمود ئاغای کاکەخانی کوری سمایلائاغای کوری کاکەخانی گەورەیە، لە ساڵی ١٨٩٩ لە گوندی (گرد مەلا)ی سەر بە ناحیەی قوشتەپەی شاری هەولێر لە دایک بووە، جگە لە پەیوەندی لەگەڵ شێخ مەحمود دواتر پەیوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ بزووتنەوەکانی بارزان و مەلا مەستەفا بارزانی و شۆرشی ئەیلول هەبووە. کەریم شارەزا، لەیادی کورد پەروەرێکی لەبیرکراودا عەلی مەحمود کاکە خانی دزەیی، برایەتی "رۆژنامە" ژ(٢٦٦٧)، هەولێر، پێنج شەممە ١٩٩٨/٩/١٠.

٤٥ - کەریم مستەفا شارەزا (ئامادەکردن و هەڵسەنگاندنی)، کورتەیەک لە مێژووی دزەییان لە دەستنووسێکی مێژوویی‌دا، کاروان "گۆڤار"، ژ(٦٧) ، بەغدا، ئابی ١٩٨٨، ل ٢١: طاهیر حەویزی، س.پ، ل١٦٨: بیرەوەرییەکانی ئەحمەد حەمەئاغای پشدەری، تۆمارکردن و ئامادەکردنی: عبدالرقیب یوسف و سدیق ساڵح، سلێمانی، ٢٠٠١، ل ٤٧.

٤٦ - لەتیف بەرزنجی، عەلی مەحمود کاکەخان و شۆڕشی شێخ مەحمودی نەمر، کوردستانی نوێ "رۆژنامە"، ژ(١٠٧٢) ساڵی چوارەم، دووشەممە ١٩٩٥./٨/٢٨

٤٧ - سەبارەت بەهۆکاری تێکچوونی ئەم پەیوەندییە، بڕوانە:د.سەعدی عوسمان، بزاڤی رزگاریخوازی کوردی...، ل ٨٩ - ٩٠.

٤٨ - دیارترین ئەو دەستە سوارەی کە لەگەڵی دابوون پێکهاتبوون لە (عەزیزی وسو ئاغا)، (سابیر ئاغای برای) و (هادی حوسێن ئاغا) و (سمایلی عەلی جەمرد) و (کوێخا مەجیدی شانشینی (لەشکری عەزیز محەمەد) عەزیز یوسف کاکەخان)ی خەڵکی گوندی مورتکەی گەورە،(رەئوف ساڵح) خەڵکی گوندی مورتکە، (عەولا غوزە) خەڵکی گوندی مورتکە، (ئیبراهیم ئاڵتون). (کەریمە گۆجی مامەند) ،(حوسێن سیان) ،(حەمە رەشید سیانی گردەسۆری) (ئۆمەرسیانی سەر بەشاخی)، (حەسەن کوردە)، (حاجی عەبدوڵلا شەلی سەربەشاخی). (عەلی عەبۆی)، (شێخە سابلاخی)، (حاجی رەشید). ناوەکانم لەم سەرچاوانە وەرگرتووە: چاوپێکەوتن لەگەڵ سەفیەخان، کە خێزانی عەلی مەحمود کاکەخانە، لە ناوەراستی ساڵانی حەفتا تارق جامبار پارێزەر و ئەندمی ئێستای پەرلەمانی کوردستان ئەو چاوپێکەوتنەی لەگەڵدا سازکردووە، دەقی چاوپێکەوتنەکە لەلای ناوبراو پارێزراوە: کەریم شارەزا، لەیادی کورد پەروەرێکی لەبیرکراودا...، برایەتی "رۆژنامە" ژ(٢٦٦٧)، هەولێر، ١٩٩٨:چاوپێکەوتن لەگەڵ هیمداد لەشکری رێکەوتی ٢٠٠٧/٩/٢٢، ناوبراو کوری لەشکری عەزیزە، ئێستاش فەرمانبەرە بە پلەی بەڕێوەبەر لە وەزارەتی رۆشنبیری لە شاری هەولێر: چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەحمەد عەزیز یوسف، ناسراو بەحاجی ئەحمەد داردتوو، ٢٠٠٧/١٠/٩. ناوبراو لە ساڵی ١٩٢٦ لە دایک بووە، تائێستا لە ژیاندا ماوە، باوکی ئامۆزای (عەلی مەحمود کاکەخان)ە: لەتیف بەرزنجی، عەلی مەحمود کاکەخان و شۆڕشی شێخ مەحمودی نەمر، کوردستانی نوێ "رۆژنامە"، ژ(١٠٧٢) ساڵی چوارەم، دووشەممە ١٩٩٥/٨/٢٨: عەباس سلێمان سمایل، بووژانەوەی ناوی جوگرافی دەشتی هەولێر بە لگەنامەی دوارۆژە، هەولێر "گۆڤار"، ژ(٧) هاوینی ٢٠٠٠، ل ٧٣.

٤٩ - کەریم شارەزا، لەیادی کورد پەروەرێکی لەبیرکراودا...، برایەتی "رۆژنامە" ژ(٢٦٦٧)، هەولێر،

.١٩٩٨.
٥٠ - جەلال خدر، حاجی ئەحمەدی جامباز.....، رامان"گۆڤار"، ژ(٧٦)، ل ١٢٦: جەلال خدر، دەرویش رەمەزان.....، رامان"گۆڤار"، ژ(٤٨)، ل ٢٤٩.

51-F.O, 371/4193,From Civi
27 Baghdad,, Commissioner
Novmber, 1991.

٥٢ - چاوپێکەوتن لەگەڵ سەفیەی خێزانی عەلی مەحمود کاکەخان.
٥٣ - جەلال خدر، حەسەنە شەل ....، دەستنووس.
٥٤ - چاوپێکەوتن لەگەڵ حاجی نورەدین دەباغ.
٥٥ - کەریم شارەزا، پیاوی بەجەرگی دزەییان...، هەولێر"گۆڤار"،ژ(٤)، ل ٩٤.
٥٦ - بەدرخان "رۆژنامە"ژ(٨٨)، کانوون یەکەم، ٢٠٠٧/١٢/٢٢، ل ١٩.
٥٧ - ئەحمەد خواجە، چیم دی، بەرگ١، ب١، بەغدا، ١٩٦٨، ل ٧٢.
٥٨ - رفیق حلمی، یادداشت، ل ٣٢٣: بانگ کوردستان"رۆژنامە"، ژ(٩)، سلێمانی، ٨/ ١٠/١٩٢٢.
٥٩ - ئەحمەد خواجە، چیم دی، بەرگ١، ب١، ل ١٠٦. جێگەی سەرنجە ئەم سەرچاوەیە بەرواری ٢٩ی ئەیلولی دیاری دەکات بۆ ئەم پێشوازەی و چاوپێکەوتنانە.بەڵام دیارە بەرواردکە هەڵەیە.چونکە وەک لەسەرەتاوە ئاماژەمان پێدا، شێخ لە ٣٠ی ئەیلول گەڕایەوە شاری سلێمانی.
٦٠ - رفیق حلمی، یادداشت، ل ٣٢٣.
٦١ - بانگ کوردستان"رۆژنامە"،ژ(٤)، سلێمانی، ٢٩/٨/١٩٢٢.
٦٢ - بانگ کوردستان"رۆژنامە"،ژ(١٠)، سلێمانی، ١٥/ ١٠/١٩٢٢.
٦٣ - بروانە: تەوەرەی دووەم لە بەشی دووەمی ئەم توێژینەوەیە.
٦٤ - چاوپێکەوتن لەگەڵ حاجی ئەحمەد ناسراو بە حاجی ئەحمەد داردتوو: چاوپێکەوتن لەگەڵ سەفیەی خێزانی عەلی مەحمود کاکەخان.
٦٥ - کەریم شارەزا، لە یادی کورد پەروەرێکی لە بیرکراودا....، برایەتی "رۆژنامە" ژ(٢٦٦٧)،١٩٩٨.
٦٦ - عبدالله رسول پشدری، یاداشتەکانم، بەشی یەکەم،چ١، دار الحریة للطباعة - بەغدا، ١٩٩٢، ٣٤: بیرەوەرییەکانی ئەحمەد حەمەئاغای پشدەری، ل ٤٧: چاوپێکەوتن لەگەڵ سەفیەی خێزانی عەلی مەحمود کاکەخان: چاوپێکەوتن لەگەڵ حاجی ئەحمەد دارەتوو.
٦٧ - چاوپێکەوتن لەگەڵ هیداد لەشکری.
٦٨ - چاوپێکەوتن لەگەڵ حاجی ئەحمەد دارەتوو.
٦٩ - طاهیر حەویزی،مێژووی کۆیە، ب٢، ل ١٦٨: چاوپێکەتن لەگەڵ سەفیەخان.
٧٠ - چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەحمەد دارەتوو.
٧١ - طاهیر حەوێزی،مێژووی کۆیە، ب٢، ل ١٦٨.
٧٢ - لەتیف بەرزنجی، عەلی مەحمود کاکەخان ... ، کوردستانی نوێ "رۆژنامە)، ژ(١٠٧٢) ساڵی چوارەم، دووشەمە ٢٨/٨/١٩٩٥.
٧٣ - طاهیر حەویزی،س.پ، ب٢، ل١٦٨.
٧٤ - چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەحمەد دارەتوو.

٧٥ - چاوپێکەوتن لەگەڵ ئیحسان موفتی.
٧٦ - کەریم شارەزا، لە یادی کورد پەروەرێکی لە بیرکراودا....، برایەتی "رۆژنامە" ژ(٢٦٦٧)،١٩٩٨: چاوپێکەوتن لەگەڵ سەفیەی خێزانی عەلی مەحمود کاکەخان.
٧٧ - بەدرخان "رۆژنامە"، چاوپێکەوتن لەگەڵ ئیحسان موفتی ، ژ(٨٨)، کانوون یەکەم، ٢٢/١٢/٢٠٠٧، ل ١٩.
٧٨ - لەم بارەیەوە لە بەیتی فۆلکلۆردا هاتوو:

**گردی گر مەلای بەینە هەنجیرە**
**عەلی گاز دەکا هێ برا سابیرە**
**وەرە دانیشین بکەین تەگبیرە**
**لە تالعی من و تۆ شێخ مەحمود گیرا**
**دەست لە کەلەپچە پێ لە زنجیرە**
**گردی گر مەلای بە شەنگەبییە**
**عەلی گاز دەکا هێ برام هادییە**
**تڤەنگی گچک چاپ لە دور دستییە**
**لە بۆم بکوژە ئەو ئەفەندییە**

عەباس سلێمان سمایل، بووژانەوەی ناوی ....، ل ٧٢.
٧٩ - چاوپێکەتن لەگەڵ سەفیەی خێزانی عەلی مەحمود کاکە خان.
٨٠ - د. ئەفراسیاو هەورامی، س.پ، ل ٢٩٦.
٨١ -د.کمال مظهر، کرکوك وتوابعها....، ج١، ص ١٧١.
٨٢ - المذکرات غیر المنشورة لعزالدین ملا فندي ، ص١٨.لەلایەن (ئازاد)ی کوری پاریزراوە. عزەدین کوری مەلافەندییە لە ساڵی ١٩١٧ لە شاری هەولێر لە دایک بووە، بڕوانامەی ماستەر لە بواری ئابووری لە زانکۆی لەندەن وەرگرتووە، لە خولەکانی ١١ تا ١٦ نوێنەری هەولێر بوو لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق، لە ساڵی ١٩٩٩ لە شاری هەولێر مردووە.
٨٣ - ئەحمەد عوسمان لە خانەوادەی

مەلای گچکەی هەولێر بوو لە ساڵی ١٨٧٩ لە دایک بووە، لە ساڵی ١٩٠٦ ئەندامی دادگای بەرایی هەولێر و لە ساڵی ١٩١١ ئەندامی دادگای کەرکوک بوو، دواتر بۆتە سەرۆکی دادگا، لەکاتی هاتنی دەسەڵاتی بەریتانی سەرۆکی شارەوانی هەولێر بوو، لە ساڵی ١٩٢١ دەبێتە یاریدەدەری موتەسەریفی هەولێر و لە ساڵی ١٩٢٣ دەبێتە موتەسەریف، لە ساڵی ١٩٢٧ بە موتەسەریفی سلێمانی دانرا، لە ساڵی ١٩٣٠ بۆتە ئەندامی ئەنجومەنی ماقوڵان، بۆ دوو جاریش لە ئەنجومەنی نوێنەران بە نوێنەری هەولێر هەڵبژێردرا، لە ١٠ کانوونی یەکەمی ١٩٤٦ لە شاری بەغدا مردووە. میر بصري، اعلام الكرد، ط١،لندن- قبرص، ١٩٩١، ص ص ١٦٨-١٦٩.

٨٤ - فرهاد عوني، صفحات مجهولة من حياة النائب الاول لرئيس مجلس النواب في العهد الملكي، گولان العربي"مجلة"، ع (٣٨) تموز ١٩٩٩، ص ٣٨.

٨٥ - بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بە چوونی ئەحمەد عوسمان و چۆنییەتی پێشوازی کردن و پەیوەندی کردن بەشێخەوە بروانە: بەدرخان "مانگنامە"، چاوپێکەوتن لەگەڵ نیسحان موفتی، ژ(٨٨)، کانوون یەکەم، ٢٢/١٢/٢٠٠٧، ل ١٩.

٨٦ - یاداشتەکانی شێخ لەتیف... ل ١٦٤-, ١٨٤.

## لیستی سەرچاوەکان

بەڵگەنامەی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانی:

-From 371-5069 -F.O, A.p.o.koi, ,Captain, C.A.G.Rundle N0 Arbil, Officer Political the To 371-5069, F.O, 1920. 5,7March, ,Captain, C.A.G.Rundle -From Officer Political the To A.p.o.koi, F.O, 1920. 6,9March, N0 Arbil, Confidentail -From, 371-5069 Dated 4/155/S.C NO memo, Political The From 1920, 17July Civil To Arbil, Officer, Baghdad. Commissinner.

### کتێبە کوردییەکان:

- ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی، شاری سلێمانی ١٩١٨-١٩٣٢،چاپخانەی زانست، سلێمانی،٢٠٠٢.
- د. ئەفراسیاو هەورامی، کورد لە ئەرشیفی رووسیا و سۆڤیەت دا، چ١، هەولێر، ٢٠٠٦،ل ٢٠٦.
- پشکۆ حەمەد تاهیر ئاغجەلەری، کەرکوک (١٩١٧ - ١٩٢٦)/ توێژینەوەکی مێژوویی سیاسییە، مەکتەبی بیروهۆشیاری (ی.ن. ک) سلێمانی، ٢٠٠٧.
- ١٩١٨ سدیق ساڵح، حکومەتی کوردستان ١٩١٨ - ١٩٢٤، چ٢، سلێمانی، ٢٠٠٦ .
- جەلال خدر، حەسەنە شەل و پەتی قەنارە. دەستنوسێکە لە لای جەلال خدر پارێزراوە.
- شێخ لەتیفی حەفید، یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید لەسەر شۆڕشەکانی شێخ مەحمودی حەفید، چ١، ساغکردنەوەی: کەمال نوری مەعروف، دهۆک ١٩٩٥ .
- رەفیق حلمی، یادداشت.چ٣، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی،٢٠٠٣.
- عبدالله رسول پشدری، یاداشتەکانم، بەشی یەکەم،چ١، دار الحريه للطباعه - بغدا، ١٩٩٢
- عەبدولمونعیم غولامی، سێ قوربانییەکە (شێخ سەعدی بەرزنجی، شێخ عەبدولسلامی بارزانی، شێخ زاری ئەلزەوبەعی)، و: نیحسان نیروانی،چ١، هەولێر، ٢٠٠٤
- لازاریف، کێشەی کورد، و: کاوس قەفتان، ب١، بغدا، ١٩٨٩.
- محەمەد رسول هاوار، شێخ مەحمودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خواروی کوردستان، ب١-ب٢، لەندەن - بەریتانیا، ١٩٩٠.
- بیرەوەرییەکانی ئەحمەد حەمەئاغای پشدەری، تۆمارکردن و ئامادەکردنی: عبدالرقيب يوسف و سدیق ساڵح، سلێمانی، ٢٠٠١، ل ٤٧.

### کتێبە عەرەبییەکان:

- البرت م. منشاشفيلي، العراق في سنوات الانتداب البريطاني، ت:د.هاشم صالح التكريتي، مطبعة جامعة بغداد، ١٩٧٨.
- خليل علي مراد (ترجمة و تعليق)، مختارات من كتاب الموصل و كركوك في الوثائق العثمانية، منشورات مؤسسة ژين، مطبعة شڤان، السليمانية، ٢٠٠٠.
- سروه اسعد صابر، الحرب العالمية الاولي الي نهاية مشكلة الموصل (١٩١٤ - ١٩٢٦)، ط١، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠١.
- عبدالرحمان ادريس صالح البياتي، الشيخ محمود الحفيد البرزنجي والنفوذ البريطاني في كردستان العراق حتي عام ١٩٢٥، ط١، سليمانية،

.٢٠٠٦
- حميد المطبعي، موسوعة اعلام العراق في القرن العشرين،ط١، ج١، وزارة الثقافة و الاعلام دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ١٩٩٥،
- محمد أمين زكي، مشاهير الكرد و كردستان، نقله الي العربية: محمد علي عوني، ج١، بغداد،.١٩٤٧
- مير بصري، اعلام الكرد، ط١،لندن-قبرص، ١٩٩١ .
- المذكرات غيرالمنشورة لعزالدين ملاقندي ، ص١٨.لەلایەن (ئازاد)ی کوڕی پارێزراوە

**چاوپێکەوتنەکان:**

- چاوپێکەوتن لەگەڵ سەفیەخان، کە خێزانی عەلی مەحمود کاکەخانە، لە ناوەراستی ساڵانی حەفتا تارق جامباز پارێزەر و ئەندمی ئێستای پەرلەمانی کوردستان ئەو چاوپێکەوتنەی لەگەڵدا سازکردووە، دەقی چاوپێکەوتنەکە لەلای ناوبراو پارێزراوە:
- چاوپێکەوتن لەگەڵ هیمداد لەشکری رێکەوتی ٢٠٠٧/٩/٢٢، ناوبراو کوری لەشکری عەزیزە، ئێستاش فەرمانبەرە بە پلەی بەرێوەبەر لە وەزارەتی رۆشنبیری لە شاری هەولێر:
- چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەحمەد عەزیز یوسف، ناسراو بەحاجی ئەحمەد دارەتوو، ٢٠٠٧/١٠/٩. ناوبراو لە ساڵی ١٩٢٦ لە دایک بووە، تائێستا لە ژیاندا ماوە، باوکی ئامۆزای (عەلی مەحمود کاکەخان)ە: لەتیف بەرزنجی، عەلی مەحمود
- چاوپێکەوتن لەگەڵ حاجی نوردەدین دەباغ، چاوپێکەوتن لەگەڵ حاجی نەجمەدین.

**گۆڤار و رۆژنامە کوردییەکان:**

- ئیحسان موفتی نامەکانی کاک ئەحمەدی شێخ بۆ حاجی عومەر فەندی ناردووە کە نامەی شەشەم بۆ یەکەمینجارە، بلاودەکاتەوە، بەدرخان "مانگنامە"، ژ(٨٩)، هەولێر، ٢٢/١/ ٢٠٠٨.
- تارق جامباز، پاش مردنی بە (٨٠) ساڵ ئینجا شیعرەکانی حوزنی (١٨٤١ - ١٩١٧) شاعیری قەلاتی هەولێر بلاودەکەینەوە، رامان "گۆڤار"، ژ(١١٨)،ساڵی دووەم، هەولێر، کانونی دووەمی ١٩٩٧ .
- تارق جامباز، پێش (٨٢) ساڵ لە ١٩١٩ فەرمانێک لە حکومداری کوردستان (شێخ مەحمود) بە دانانی مستەفا بەگ بە رەئیسی عەشیرەتی کوڕە(کۆری) دەرچووە، برایەتی"رۆژنامە"، ژ(٣٣١٠)، هەولێر، ٢٠٠١/٢/١٣:
- جمیل رۆژبەیانی، شێخ مەحمودی حەفید زادە، رۆشنبیری نوێ"گۆڤار"، ژ(١١٣)، بەغدا، ساڵی ١٩٨٧.
- جەلال خدر، حاجی ئەحمەدی جامبازی لاوک و حەیران بێژ و مقامزان(١٨٨٢- ١٩٧٤)، رامان "گۆڤار" ژ(٧٦)، هەولێر، تشرینی یەکەم ٢٠٠٢،
- کەریم شارەزا، پیاوی بەجەرگی دزەییان خدری پاشا (١٨٨٠ - ١٩٨٦)، هەولێر"گۆڤار"،ژ(٤)، پایزی ١٩٩٩
- کەریم شارەزا، لەیادی کورد پەروەرێکی لەبیرکراودا عەلی مەحمود کاکە خانی دزەیی، برایەتی "رۆژنامە" ژ(٢٦٦٧)، هەولێر، پێنج شەمە ١٩٩٨/٩/١٠ .
- کەریم مستەفا شارەزا (ئامادەکردن و هەڵەنگاندنی)، کورتەیەک لە مێژووی دزەییان لە دەستنووسێکی مێژوویدا، کاروان "گۆڤار"، ژ(٦٧)، بەغدا، ئابی ١٩٨٨،
- لەتیف بەرزنجی، عەلی مەحمود کاکەخان و شۆڕشی شێخ مەحمودی نەمر، کوردستانی نوێ "رۆژنامە"، ژ(١٠٧٢) ساڵی چوارەم، دووشەمە ١٩٩٥/٨/٢٨
- کاکەخان و شۆڕشی شێخ مەحمودی نەمر، کوردستانی نوێ "رۆژنامە"، ژ(١٠٧٢) ساڵی چوارەم، دووشەمە ١٩٩٥/٨/٢٨:
- عەباس سلێمان سمایل، بووژانەوەی ناوی جوگرافی دەشتی هەولێر بە بەڵگەنامەی دوارۆژە، هەولێر"گۆڤار"، ژ(٧) هاوینی ٢٠٠٠ .
- بانگ کوردستان"رۆژنامە"،ژ(٩)، سلێمانی، ١٩٢٢/١٠/٨.
- بانگ کوردستان"رۆژنامە"،ژ(٤)، سلێمانی، ١٩٢٢/٨/٢٩.
- هۆشیار عەبدوڵلا، دزەیی و ناوچەی دزەییاتی دەشتی هەولێر، هەولێر"گۆڤار"،ژ(٨)، پایزی ٢٠٠٠،

**گۆڤار و رۆژنامە عەرەبییەکان:**

- احسان رشاد المفتي، رسائل من كاك احمد الشيخ الي حاج ملا عمر ابن ابي بكر ملا گچكه الاربلي، كاروان "گۆڤار"، ژ(٢٤)، ئەیلولی١٩٨٤، ساڵی دووەم.
ب. هولت. مذكرة حول الشيخ محمود، ت: د. ازاد گرمياني، مجلة (ئالای ئیسلام)، ع(١) اذار .١٩٩٦ - فتى العراق "الجريدة"، ع(٢٤٥ - ٥٤٤)، اشباط ١٩٤٣.
- فرهاد عوني، صفحات مجهولة من حياة النائب الاول لرئيس مجلس النواب في العهد الملكي، گولان

# هەولێر کەی بۆتە "لیوا"

ئەحمەد حەیران

لە سەردەمی عوسمانییەکان هەولێر قەزایەک بووە سەر بە لیوای موسڵ، بەڵام دوای نەمانی عوسمانییەکان و هاتنی ئینگلیزەکان بۆ ناوچەکە، ئاڵوگۆڕ بەسەر شێوەی فەرمانداری دامودەزگاکان هاتووە و جۆری بەڕێوەبردنی نوێ هاتۆتە ئاراوە، دیارە هەولێریش سەردەستەی ئەم گۆڕانکارییانە بووە، لە سەردەمی ئینگلیزەکان، دادوەری رامیاری (حاکم سیاسی) لە لیواکان کاریان کردووە، یاریدەدەری دادوەری رامیاریش، واتە (مساعد الحاكم السياسي) لە قەزایەکان دانیشتوون، (دەبلیو - ئار - هی) کە ئەفسەرێکی ئینگلیزە، یەکەم یاریدەدەری دادوەری رامیاری بووە لە هەولێر، پاشان کە هەولێر بۆتە لیوا هەر بە خۆی بووە بە دادوەری رامیاری ئەم شارە، لە پەرتووکی (دوو ساڵ لە کوردستان) کە بیرەوەرییەکانی خۆیەتی، بەم جۆرە باس لەم ئاڵوگۆڕانە دەکات.

**هەولێر کەی بۆتە لیوا.....؟**

کاتێ سوپای ئینگلیز قەڵەمڕەوی عێراقی گرتە دەست، لە ٢٧/١٠/١٩١٨ شاری کەرکوکی گرت، لە کۆتایی هەمان مانگ (پردێ)شی کۆنترۆڵ کرد. پاشان لە ٣٠/١٠/١٩١٨ ئاگربەس لە نێوان هاوپەیمانەکان و تورکیا مۆر دەکرێ، بڕیارەکەش لە (٣١)ی هەمان مانگ کاری پێ دەکرێ، ئەو کاتە دەبلیو - ئار - هی لە مەندەلی دەبێت فەرمانی دەردەچێت بکرێتە یاریدەدەری دادوەری رامیاری لە پردێ، رۆژی ٣/١١/١٩١٨ دەگاتە پردێ و دەست بە کاری خۆی دەکات، لە ٧/١١/١٩١٨ بروسکەی بۆ دەکرێ بچێتە کەرکوک بۆ لای (موقەدەم نوئێل)، کە دادوەری رامیاری کەرکوک و هەڵسووڕێنەری رێنمایی سیاسەت دەبێ لە کوردستانی باشوور، بە مەبەستی ئامۆژگاریکردن لەبارەی ئەو سیاسەتەی کە پەیڕەوی دەکەن، لەم کاتەی لە کەرکوک دەبێ بروسکەیەک دەگاتە وێ بۆ ئەوەی ئەفسەرێکی سیاسی لەگەڵ هێزێکی بچووک رەوانەی هەولێر بکەن تاوەکو بە گوێرەی بەندەکانی ئاگربڕ هەولێر دەستبەجێ لە تورکەکان وەربگرن، ئەم کارەش (نوئێل) بە (دەبلیو - ئار - هی) دەسپێرێ، بەم جۆرە نامەیەکی سەرپێیی لە فەرماندەی هێزی کەرکوک وەردەگرێ و بەرەو هەولێر دێت. رۆژی ١٠/١١/١٩١٨ کاتژمێر (١)ی دوای نیوەڕۆ دەگاتە هەولێر، دوای پێشوازیکردن نیوەڕۆ لای (ئەحمەد ئەفەندی) میوان دەبێ، دوای نانخواردن کاتژمێر (٣)ی پاش نیوەڕۆ دەچێتە ئۆردوگای تورکەکان، کە دەکەوێتە رۆژئاوای هەولێر، نامەکەی دەداتە فەرماندەی هێزی تورکەکان، کە پیاوێکی کورتە بالای قەفقازی دەبێت، ئەویش دوای خوێندنەوەی نامەکە رەزامەندی دەردەبڕێ، کەوا بەیانی هەولێر جێبێڵێ، بەڵام پێشنیاز دەکات کەوا نەخۆشەکانیان لە هەولێر بهێڵنەوە. (هی) دەڵێ: منیش مکوڕ بووم لەسەر ئەوەی کەوا پزیشکێکیان لەگەڵ بەجێ بێڵێ، بەڵام فەرماندە تورکەکە ئەمەی رەت کردەوە و بەڵێنی دا کەوا نەخۆشەکان لەگەڵ خۆیان بەرن، بەڵام لە دواییدا دەرکەوت کەوا هەمووی بەسەر ماڵە هەولێرییەکان دابەش کردبوو، ئینجا دەڵێ: ئەفسەرێکی تورکم لەگەڵ خۆدا هێنا بۆ ئەوەی کۆگاکانم تەسلیم بکات، لە پاشان ئێوارە لە دیوەخانی ئەحمەد ئەفەندی میوان دەبێتەوە و بەیانی دەچێت فەرماندە تورکەکە بەرێ دەخات، لە دوایی چاوی بە پیاوە



ماقوول و ریش سپییەکانی هەولێر دەکەوێت و لەبارەی بارودۆخەکە قسەیان بۆ دەکات، لەم ماوەیەی کەوا (هی) لە هەولێر دەبێت، بروسکەیەک دەکرێ، کەوا (نەقیب موری) لە هەولێر دامەزراوە و پێویستە (هی) بگەڕێتەوە بۆ پردێ، بەم پێیە رۆژی ١٩١٨/١١/١٣ نەقیب موری دەگاتە هەولێر و (هی) جڵەوی کاروباری دەداتە دەست و بەخۆی دەگەڕێتەوە پردێ. لە رۆژی ١٩١٨/١٢/١٥ پردێ بەجێدەهێڵێ و دەچێتە کۆیە و تاوەکو ١٩١٩/٢/٢١ کاروباری ئەم ناوچەیە بەڕێوەدەبات، لە پاشان مۆڵەت وەردەگرێ و دەچێتەوە بۆ لەندەن، تاوەکو لە رۆژی ١٩١٩/٦/٣٠ لە رێگای حەڵەب دەگاتەوە موسڵ، لەوێ یەکسەر فەرمانی پێدەدەن بگەڕێتەوە هەولێر بۆ ئەوەی پلەی یاریدەدەری دادوەری رامیاری لە (مور) وەربگرێتەوە، لە رۆژی ١٩١٩/٧/٣ دەگاتەوە هەولێر و دەست بە ئیش و کاری خۆی دەکات، لەم ماوەیەدا چەندین پێشنیاز دەکرێ بۆ ئەوەی هەولێر بکرێتە لیوایەکی سەربەخۆی جیاواز لە موسڵ، کە قەزای کۆیە (تا ئەو وەختە سەر بە سلێمانی بوو) لەگەڵ رەواندز بگرێتە خۆ، دیارە ئەم جۆرە پێکهاتەش سوودی زۆر بوو، چونکە تاکە رێگایەکی لەبار و گونجاو بروات بۆ رەواندز بە هەولێر تێدەپەڕێ، کۆیەش ئاسانتر دەیتوانی پەیوەندی بە هەولێرەوە بکات، وەک لەگەڵ سلێمانی، چونکە زێیەکی بچووک سلێمانی و کۆیە لێک دادەبڕێ، لەبەر ئەم هۆکارانە (دەبلیو - ئار - هی) دەڵێ: لە رۆژی ١٩١٩/١٠/٢٩ لەگەڵ (ئەحمەد ئەفەندی) سەرۆک شارەوانی هەولێر بە شەمەندەفەر لە رێگای شەرگاتەوە چووین بۆ بەغداد، بۆ ئەوەی لەگەڵ (عەقید ویلسون)، دادوەری گشتی مەلەکی لە عێراق گفتوگۆ لەسەر ئەم پێشنیازانە بکەین و بگەینە بڕیارێک دەربارەیان، بە هەر جۆرێک بێ دەڵێ: ویلسون گێولی (رەغبەتی) لە وەرگرتنی پڕۆژە نوێکە نەبوو، بەر لەوەی دەرفەتی بۆ بڕەخسێ تاوەکو سەردانی (مستەر بل) بکات لە هەولێر و ئامۆژگارییەکانی پێشکەش بکات. دەڵێ: چوار پێنج رۆژ لە بەغدا ماینەوە لە ئێوارەی رۆژی ١٩١٩/١١/٣ یەک دوو کاتژمێر پێش ئەوەی بگەڕێمەوە، عەقید ویلسون جیای کردمەوە پێی راگەیاندم، کەوا بارەگای گشتی هەواڵێکی پێگەیشتووە دەڵێ: (مستەر بل) دادوەری رامیاری موسڵ لەگەڵ نەقیب (کی - سکوت) یاریدەدەری دادوەری رامیاری لە ئاکرێ هەردووکیان لە (بیرەکەپرا) لە ناوچەی زێبارەتی کوژران، بەم جۆرە دەڵێ: بە دڵێکی پڕ لە ژان و کەسەرەوە ئەم رووداوە چاوەڕوان نەکراوەمان پێگەیشت، لە پاشان دەڵێ: لە رۆژی ١٩١٩/١١/٤ گەیشتمەوە هەولێر، هەواڵی ئەم رووداوە لە ناو خەڵک بڵاو نەبووبۆوە، پاش چەند رۆژێک نەبێ نەکەوتە سەر زاری خەڵکی شار، رۆژی ١٩١٩/١١/١٥ بروسکەیەکم پێگەیشت، کە بە دادوەری رامیاری لیوای نوێی هەولێر دامەزراوم کە لە رۆژی ١٩١٩/١١/١ بڕیاری بوونی بە لیوا دەرچووە، بەم پێیە هەولێر لەو رۆژەوە بووە بە لیوا واتە رۆژی ١٩١٩/١١/١ بە گوێرەی ئەم قسانەش بێ (دەبلیو - ئار - هی) یەکەم حاکمی لیوای هەولێر بووە لە پاش نەمانی دەسەڵاتی عوسمانییەکان، بەڵام دوای پێکەوەنانی دەوڵەتی عیراق و لکاندنی کوردستان پێیەوە، ئەم جۆرە پلە و پایانە دەدرانەوە خەڵکی وڵاتەکە خۆی، ئەوەندەی من ئاگادارم (ئەمە یەکەمین جارە ئەو مێژووە ئاشکرا دەکرێ و بڕیاری رۆژی بە لیوا بوونی هەولێر دەخرێتە روو)، بۆیە پێویستە هەموو ساڵێک لەم رۆژەدا ئاهەنگی تایبەتی بەم بۆنەیەوە سازبکرێ و پڕۆژە و بنکەی فەرمانگوزاری نوێ بکرێتەوە و هەڵمەتی خاوێنکردنەوە و جوانکردنی شەقام و بازاڕگاکانی شار لە لایەن لێپرساوان دەستی پێبکرێ، پێشانگای تایبەت لەسەر وێنە کۆن و دەگمەنەکانی ئەم شارە دێرینە بکرێتەوە و کۆڕ و سیمیناری هەمە جۆر لەبارەی مێژووی شارەکە ببەسترێ، کەسایەتییە کۆمەڵایەتی و رۆشنبیرەکانی شارەکە خەڵات بکرێن، ئەمانە و چەندین چالاکی تر هەموو ساڵێک لەو رۆژەدا پێویستە ئەنجام بدرێن و ئەم یادە بکرێتە کەرنەڤاڵێکی گەورەی هونەری لە شاری هەولێر.

**سەرچاوەکان:**

١- دەبلیو - ئار - هی، سنتان في کوردستان، وەگێڕانی فوئاد جەمیل، بەشی یەکەم، بەغداد، ١٩٧٣.
٢- هادی رەشید چاوشلی، تراث أربیل التأریخي.
٣- رەفیق حلمی، یاداشت، بەشی یەکەم، هەولێر، چاپخانەی رۆشنبیری و لاوان، ١٩٨٨.
٤- هەولێر کۆمەڵە وتارێکی رۆشنبیری و مێژوویە، ئەمانەتی رۆشنبیری و لاوان، ١٩٨٥.
٥- د. موحسین محەمەد حوسێن، گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات، دەوری قەڵای هەولێر لە پاراستنی شارەکەدا لە مێژووی ئیسلامدا.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەولێر، ژمارە (١)ی زستانی ١٩٩٨ بڵاوبۆتەوە.

# هەولێر لە بیستەکاندا

ئیحسان رەشاد موفتی

هەولێر پێشان بەشێک بوو لە ویلایەتی شارەزوور و بەغدا و لە کۆتایی سەدەی نۆزدەم بووە بەشێک لە ویلایەتی موسڵ، لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم کە ئینگلیز ساڵی ١٩١٧ بەغدایان گرت و بەرەو ناوچەکانی کوردستان هاتن، ئەوکاتەش خەڵک لەکوردستان بەهۆی تاڵانی سوپای تورکانەوە تووشی گرانی گەورە ببوون، ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە ڕێگا خۆش بکات، ساڵی ١٩١٨ بەدیاریکراوی لەمانگی تشرینی دووەمی ئەم ساڵەدا، زۆر بەسووک و سانایی بێنە ناوشاری هەولێر.

ئینگلیز دوای هاتنیان بۆشاری هەولێر دەستیان کرد بە یارمەتیدان و قەرز پێدانی جووتیاران، لەگەڵ، بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی بنیاتنانەوەی کوردستان و، خۆ ناساندنیان وەکو سوپایەکی ڕزگارکەری کوردستان لەدژی ڕژێمی تورکیا، هەروەها پاشانیش کە دەوڵەتی عێراق لەساڵی "١٩٢١"دامەزراو هاتە دروستکردن، لە ڕاپرسییەکی یەکێ لە لیژنەکانی "عوسبەتو لئومەم" ویلایەتی


مەلافەندی

موسڵ بەیەکجارەکی لە تورکیا دابڕکرا، پاشان ئینگلیز لەو بەڵێن و پەیمانانەی کە دابوونی بەکورد وەکو دروستکردنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ، پاشەکشەی کرد لە بەڵێنەکانی بۆ ڕێبەرانی کورد، بەتایبەتیش شێخ مەحموود. بێگومان ئەمەش نائومێدییەکی لەناو کوردی باشوور دروست کرد، جا لەو قۆناغە ناسکەدا بەتایبەتیش خەڵکەکە سەرەتا دڵخۆش بوون بەو بەڵێنانە بەڵام پاش ماوەیەک و دوای بەرەوپێشچوونی بارودۆخەکە دووبارە خەڵکی نائومێد کردەوە، باشوور وەزعی بەم جۆرە بوو لەژێر فەرمانڕەوای ئینگلیز، لەباکووریش وڵاتی نوێی تورکان بەسەرۆکایەتی کەماڵ ئەتاتورک کەوتبووە گیانی کوردەکانی ئەو بەشەش، بۆیە پیاوە ئیداری و سیاسییەکانی هەولێر لەو نێوانە مابوونەوەو لەبیری ئەوەدا بوون کە لەنێوان تورک و ئینگلیز کامەیان زیاتر بەقازانجی کورد بشکێننەوە، ئەوان پشتگیری لەو بکەن...، ئینگلیزەکان شاری هەولێریان کرد بە لیواو "ئەحمەد عوسمان" سەرۆکی شارەوانی هەولێر کە دەکاتە برای باپیرم "محەمەد موفتی" کرا بە یەکەم موتەسەریفی لیوای هەولێر".

### مەلافەندی و مەلیک فەیسەڵ لە قەڵای هەولێر وتار دەخوێننەوە

هاتنی مەلیک فەیسەڵی یەکەم مەلیکی عێراق بۆ هەولێر لە ١٩ تشرینی دووەم ١٩٢٤بوو، لەکاتی هاتنی، پیاو ماقوڵانی شارو زانایانی ئایینی و سەرۆک عەشیرەتەکان و موتەسەریفی هەولێر، پێشوازیی گەرمیان لە مەلیک کردووە، مەلیک لەڕێگای شاری موسڵەوە هاتۆتە هەولێرو خەڵکەکە لە شارۆچکەی

کەلەک پێشوازییان لێ کردووەو هێناویانە تا سەنتەری شارو لەوێش قوتابیانی شارو مەئمورانی دەوڵەت و سەربازانی حکومی ئینگلیز لە پێشوازیکارەکانی ناو شار بوون، رەنگە یەکێ لەو هۆکارە گرنگەی کە مەلیک فەیسەڵ کوڕی شا حوسێن کە "شەریفی مەکە"بووە، لەو پێشوازییە گەرمەی کە لە هەولێر لێی کرا، بۆئەوە بگەڕێتەوە کە کورد بەشێوەیەکی گشتی رێزیان لێ گرتووە، ئەوە بوو بێت کە ئەو لە نەوەی پێغەمبەری ئیسلام بووە.

مەلیک لە هەولێر میوانی مەلا ئەفەندی دەبێت لە گوندی باداوە، من لە باوکم بیستووە، لە یەکێ لەتەمەن درێژەکان کە رووداوەکانی ئەو رۆژەو هاتنی مەلیک فەیسەڵی یەکەم بۆ شاری هەولێر، بەم جۆرە بووە: مەلیک فەیسەڵ پاش پێشوازی و بەخێرهێنانی لەلایەن خەڵکی هەولێر کە لەسەر شەقامی سەرەکی هەولێرو تا بەردەم پارێزگای هەولێرو ناوەڕاستی شار ریز ببوون، پاشان مەلیک هاتۆتە گوندی باداوەو لە قەسری مەلا ئەفەندی گیرسایەوە، ئەوانەشی کە لە قەسر لەپێشوازی مەلیکدا بوون، زۆر بوون، لەوانە: شێخ مەعروف هەڵەجە، ئیبراهیم بایز ئاغای دزەیی، میرانی قادربەگ شەقلاوە، شێخ مستەفای نەقشبەندی، هەروەها حاجی پیرداود ئاغای دزەیی و خورشید ئاغا دزەیی، ئیسماعیل بەگی رواندزی و ئەحمەد پاشای دزەیی، عەبدوڵلا پاشای نەقیب، حاجی رەسول ئاغا، عەبدوڵلا موخلیس بەگ، سەدیق میرانی قادر بەگ و عەلی پاشای



دۆغرەمەچی و داود ئاغای یەعقوبی، موحسین ئاغای ئەسعەدی حاجی رەشید ئاغا، مەلای گەورەی کۆیە "مەلا محەمەد"، و موتەسەریفی هەولێر ئەحمەد عوسمان و باپیرم محەمەد موفتی لەگەڵ چەندین پیاوی ئایینی ئیسلام و مەسیحی لە قەسری مەلا ئەفەندی لە پێشوازی مەلیکدا بوون.

بۆ رۆژی دواتر کە هەینی بوو، مەلیک لە باداوە دێتە قەڵات، جا ئەوکاتی رێگای سەیارەش نەبوو، بۆ قەڵات، مەلیک لەگەڵ مەلا ئەفەندی بەیاوەری ئەحمەد ئەفەندی موتەسەریفی شاری هەولێرو موفتی گەیشتنە قەڵات و چەند سەیارەی بەدواوە بوو، دووبارە خەڵکی هەولێر بۆ رۆژی هەینیش گەورەو بچووک ریز ببوون بۆ پێشوازیکردنی مەلیک. لەژێر دەرگای قەڵات بەردەم بازاڕی قەیسەری ئێستای شاری هەولێر تا مزگەوتی قەڵای هەولێر، مافووری عەجەمی رایەخرابوو، خەڵکی لەناو مزگەوت و خانووەکانی دەوروبەری قەڵاو مزگەوتی قەڵایان گرتبوو چووبوونە سەربانەکان بۆ بینینی مەلیک.

چاوەڕوانی بانگی نوێژی هەینی دەبن، دوای ئەوەی موفتی وتاری رۆژی هەینی دەخوێنێتەوەو پێش نوێژیان بۆ دەکا، ئینجا مەلیک فەیسەڵ دەچێتە سەر مینبەر و، وتارێک دەخوێنێتەوە، باس لە وەزعی سیاسی دەوڵەتی عێراق و جیاوازی پێنەکردنی تایفی و نەتەوەیی دەکا، لەوانە باسکردنی خوێندن بەزمانی کوردی.

دوای ئەو، "مەلا ئەفەندی" وتارێک پێشکەش دەکات کە باس لە برایەتی و مرۆڤایەتی نێو میللەتان دەکا هەروەها سوپاسی مەلیک فەیسەڵ دەکا و ئومێد دەخوازی کە ئەم گفتانەی داویەتی بە خەڵکی کوردستان جێبەجێ بکرێ.

## حاجی عومەر ئەفەندی پێشبینی مەلیکایەتی دەکات

راستییەک هەیە حەزدەکەم بیڵێم: ئەویش ئەوەیە کە حاجی عومەر ئەفەندی کوڕی مەلا ئەبوبکری مەلا گچکەی هەولێری، کە دەکا باوکی مەلا ئەفەندی و مامی ئەحمەد عوسمان و محەمەد موفتی بەر لەچەندساڵێک، پێش ئەوەی بە یەکجارەکی لەساڵی"١٨٩٢" کۆچی دوایی بکات، دەچێتە شاری حیجاز و لە گۆڕەپانی کەعبەی شەریف حەڵقەی دەرسی هەبووە، لەبەرئەوەی لە دەرسی تەفسیرو حەدیس وانەکانی زۆر بەقوەت و سەرنجراکێش بوون، خەڵکی حیجاز بەردەوام لەچواردەوری کۆبوونەتەوە کە یەکێ لەوان شا

حوسێنی باوکی مەلیک فەیسەڵی یەکەم مەلیکی عیراق بووە، کە ئەودەمە شا حوسێن لەتافی لاوێتیدا بووە، من ئەوەم لەسەر زاری عیزەددین مەلا ئەفەندی بیستووە، کە حاجی عومەر ئەفەندی رۆژێکیان بە دوو قوڵی دوای تەواوبوونی لە دەرسی حەدیس لە کەعبەی شەریف بە شا حوسێن دەڵێت وەک پێشبینییەک کە پاشان روودەدا دەڵێ: تۆ دوا رۆژ دەبی بە شەریفی مەککەو کورەکانیشت لەچەند شوێنێک دەبن بەمەلیک، ئینجا پاش جەنگی جیهانی یەکەم و بوونی شاحوسێن بە شەریفی مەککەو هاتنی مەلیک فەیسەڵی کوڕی بۆ عیراق، شاحوسێن ئەو قسەیەی بیر ناچێتەوەو دۆستایەتییەکەیان هەر دەمێنێ، بۆیە مەلیک فەیسەڵ خۆشی ئەمە دووپات دەکاتەوەو دەڵێ: بەرلەوەی بێمە عیراق، باوکم ئامۆژگاری کردم کە پەیوەندی بە بنەماڵەی ئێوە بکەم و دۆستایەتییەکە تازە بکەمەوە. جگە لەمەش موفتی حیجاز ئەحمەد زین دحلان ئیجازەی زانستی داوەتە حاجی عومەر ئەفەندی، ئەوکاتەش "١٨٨٥" کوردبوونی خۆی وەکو نەتەوە لە شاری حیجازیش زۆر لا گرنگ بووە، حاجی عومەر ئەفەندی ئەو زاتەیە کە کاک ئەحمەدی شێخ نامەکانی خۆی لە سلێمانییەوە بۆ رەوانە کردووە وەکو پێشووتر ئاماژەم پێدا.

### کەریە کوێر و موفتی و مەلیک فەیسەڵ

من لەباوکمم بیستووە کە مەلیک فەیسەڵ دێتە مزگەوتی قەڵات و دادەنیشێ، یەکێ لەپیاوەکانی ئیدارەی حکومەت دەچێتە لای موفتی زۆر بەنهێنی دەڵێ: قوربان، ئەوانەی لەریزی پێشەوە نوێژ دەکەن، با پیاوی پاک و خاوێن و شیاوبن، چونکە لە تەنیشت مەلیک نوێژ دەکەن. موفتیش وەڵامی دەداتەوەو دەڵێ: ئێرەماڵی خودایە هەمووش لەبەر خودا وەکو یەکن، لە بۆ بەجێهێنانی ئەو قسەی داوا لەدوو سێ رەشورووتەکانی قەڵا دەکا کە یەکێکیان ناوی "کەریە کوێر" دەبێ، موفتی دەڵێ: کەریم دەتەوێ لە دەرگای بەهەشت نزیک ببیتەوە، کەریمیش دەڵێ: بەڵێ، قوربان. موفتی دەڵێ: ئەمە مەلیک فەیسەڵە لەکاتی نوێژکردن لە تەنیشت ئەو نوێژ بکەو هەرچەندە شانت لە نزیک شانی ئەو بێت، پاداشتت لای خوا گەورەتر دەبێت، بەو رەفتارەی موفتی خەڵکی هەولێر زۆر دڵیان خۆش دەبێ، چەند ساڵێ پاش موفتی هەر باس کراوە.

### کێشەی ولایەتی موسڵ لە سەردانەکەی مەلیک فەیسەڵ بۆ هەولێر

بێگومان ئەم زیارەتەی مەلیک بۆ هەولێر و زیارەتەکانی دیکەش لەوانە ساڵی "١٩٣٠" گەلێ مەرامی سیاسی لەگەڵدا بووە، ئاشکرایە کە ئینگلیز ویلایەتی موسڵی بەبێ شەڕو تەقە گرت، کاتێ سوپای ئینگلیز گەیشتە "حەمام علیل" هێزەکانی تورکیا لەو ویلایەتە کشایەوە، ئینگلیز سنووری ویلایەتی موسڵی برد تا زنجیرە چیاکانی حەمرین و مەکحول، بەڵام پاشان لە پەیماننامەی لۆزان بڕیاردرا کە کێشەی ویلایەتی موسڵ بدرێتە "عوسبەتول ئومەم" کە پاشان دوای جەنگی جیهانی دووەم ناوەکەی بۆ "نەتەوە یەکگرتووەکان" گۆڕا، بڕیاردرا کە لیژنەیەک لە نەتەوە یەکگرتووەکان پێکبهێنرێت بۆ وردبوونەوە، پاشان بڕیاردان لەسەر کێشەی ویلایەتی موسڵ، لیژنەکە دوو پرسیاریان بۆ خەڵکی کوردستان دەستنیشان کردبوو، یا ئەوەتا ویلایەتی موسڵ بخرێتە سەر وڵاتی تورکیا، یا ئەم ویلایەتە ببێ بە بەشێک لە عیراق، ئەم لیژنەیە لە سەرەتای ساڵی ١٩٢٥ بۆ ماوەی سێ مانگ هاتنە کوردستان و لێکۆڵینەوەکەی خۆیان ئەنجامدا. بۆیە مەلیک فەیسەڵ لەکاتێکی زۆر چارەنووسساز هاتە هەولێر، پێش هاتنی ئەم وەفدە تا کورد رازی بکات کە بڕیاری مانەوە لەچوارچێوەی سنووری عێراق بدەن،، هەوڵدەدەن کە جگە لەپرسیاری لەگەڵ عیراق یا تورکیا دەبێت، ئیختیاری سێیەم ئەوە بوو، کە سەربەخۆ بێ، بەڵام کاتێ کە تێدەگەن کە لەگەڵ سیاسەتی ئەوکاتەی ئینگلیز هیچ چارەیەکیان نییە، ئەودەمەش شۆڕشەکەی شێخ مەحمودیش لە سلێمانی لە پاشەکشەدا بوو، خەڵکی کوردستان و رێبەرەکانی کە زانییان چارەیەکیان نییە لەو نێوانە، بۆیە وایان پێ باش بوو ئەوکاتە کە دەنگ بدەن لەگەڵ عیراق بن باشترە، چونکە ئەودەمە عێراق لەژێر دەسەڵاتی ئینگلیز بوو، ئومێدێکی زیاتر بۆ سەربەخۆیی هەبوو لە دوارۆژدا، ئەوەکو لەژێر حوکمڕانی تورک بن، بۆیە دوای هاتنی مەلیک فەیسەڵ و پاشان لەژێر کاریگەری مەلافەندی هەموو

سەرۆک عەشیرەت و، خەڵکی شارو دەشت بڕیاریان دا کــە دەنگ بەوە بدەن لەگەڵ عیراقدا بن، بێگومان ئەوەش هەیە کە ئێمە نابێت بەچاوی ئێستا لە شتێ بڕوانین کە "٩٠" ساڵ لەمەوبەر کراوە.

## پووچەڵکردنەوەی هەوڵی کۆمەڵکوژی خەڵکی عینکاوە ساڵی١٩١٧

بەڵێ ڕووداوی کــوشــتنی بە کۆمەڵی مەسیحییەکان لەلایەن هەندێ لە کەسانەوە کە نەفام بوون لە ئاینی ئیسلام لەم بوارە وا دەزانن ئەمە وەک جهاد وایە جا ئێمە دوای نزیکەی سەد ساڵ وا لە عێراق هەمان بیرو باوەڕ ماوە کە لەلایەن ئەوانەی قورئان بە هەوای خۆیان تەفسیر دەکەن، ئەم ڕووداوە کاپتن های لە کتێبەکەی "دوو ساڵ لە کوردستان" ئاماژەی بۆ کردووە. ڕووداوەکەش لەوەوە سەرچاوەی گرتووە، کە سوپای تورک لە پاشەکشە بووە لە بەرانبەر سوپای ئینگلیز لەو سەردەمە هانی هەندێ لە خەڵکی دەوروبەری شار دەدەن کە مەسیحییەکان پیاوی ئینگلیزن دەبێ لە ناو بچن.

ئەمەش وەک بۆچوونێک لەنێو سوپای دەوڵەتی عوسمانی هەر مابوو، دوای ئەنجامدانی کۆمەڵ کوژییەکەی ئەرمەنەکان لە تورکیا، دوای ئەوەی مەسیحییەکان گومانێکی لەو جۆرەیان لا دروست دەبێت، هەر هەموویان شارۆچکەی عەنکاوە چۆڵ دەکەن و دەڕۆن بۆلای موفتی لە هەولێر، موفتیش دەیانباتە گوندی باداوە بۆئەوەی لەژێر چاودێری چەکدارەکانی گوندی باداوەدا بن بەهەردوو گەرەکییەوە- باداوەی موفتی و باداوەی سەروو کە قەسری مەلا ئەفەندی لێ بوو. لەوێ موفتی و مەلا ئەفەندی بانگی پیاوە ئاینییەکان، سۆفی و مورییدانی تەریقەتی قادری و نەقشبەندی، سەرۆک عەشیرەتەکانی دزەیی و خۆشناوەتی و گەردی دەکەن، ئامۆژگارییان دەکەن کە کوشتنی هەر برا مەسیحییەک لەگەڵ کوشتنی ئیسلامک هیچ جیاوازی نییەو ئاینی ئیسلام لەسەر ئەوانی فەرزکردووە کە گیان و سەروەت و سامانی ئەوان بپارێزن، بەم جۆرە ئەم کۆمەڵکوژییە نەهێڵدرا لە کوردستان جێبەجێ بکرێت. گەر ڕێگەی پێ نەگیرابووایە، تا ئێستا لەمێژوودا وەکو لەکەیەکی ڕەشی شەرمەزاری بەنێوچەوانی کوردەوە دەمایەوە.

## گرانی گەورەی ساڵی ١٩١٧ لە هەولێر

بێجگە لەو گرانییە هەولێر لە ساڵی (١٧٥٦. و ساڵی ١٨٨٠). تووشی دوو گرانی زۆر قورس دەبێتەوە لەسەر ئەم بابەتە کاتی خۆی ساڵی ١٩٩٣ مانگی تەموز لە ڕۆژنامەی ئیتحاد لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتم سەبارەت بەم دوو ڕووداوە بڵاوکردۆتەوە.

بەڵام سەبارەت بە گرانی گەورەی ساڵی"١٩١٧"ی هەولێر، زانیارییەکانی منیش هەر ئەوەن کە هۆی جەنگی جیهانی یەکەم بووە و شکستی سوپای تورک و دەست بەسەرداگرتنی بەرو بوومی دێهات و شار لە لایەن سەربازانی دەوڵەتی عوسمانی کە دابڕابوون لە ئازووقە لە تورکیاوە، بەڵام ئەوەی کە باوکم بۆمی گێڕاوەتەوە، ئەوەیە لە سەر ڕۆڵی هەندێ لە سەرمایەدارەکان و خواناسەکان، لە پێش هەموویان شێخ جەمیل ئەفەندی کوڕی شێخ عەلی ئەفەندی کە خاوەن دەستنووسی مەولود نامە کوردییەکەیە، پێش ١١٨ ساڵ وەک پەخشان داڕێژراوەو لە قەڵاتی هەولێر نووسراوەتەوە، شێخ جەمیل ئەفەندی ئامۆزای مەلا ئەفەندی و ئەحمەد عوسمان و موفتی هەولێرە، خوا ناس بووە و خاوەنی"٢٥" گوند بووە لە دەشتی هەولێر، ئەو پیاوە لە یەکەم ڕۆژی گرانی گەورە تا کۆتایی، هەموو ڕۆژێک دووجار نان و شۆربای دابەش کردۆتە سەر خەڵکی هەژاری قەڵات و دەوروبەری، خەڵکی ڕۆژانە ڕیزیان گرتووەو نان و شۆربای خۆیان وەرگرتووە، شێخ جەمیل ئەفەندی پاشان خۆی لە ساڵی"١٩٢٤" کۆچی دوایی دەکات. خانووەکەی، هێشتا لە قەڵات شوێنی هەڵگرتنی گەنم و جۆی ئەو کاتەی لە خانووەکەیدا ماوە. شێخ جەمیل خوشکی شێخ حوسامەدینی تەوێڵەیی خواستووە، پاش مردنی ئەم ژنەی کچی شێخ حوسامەدینی خواستووە، هەروەها دەبێ ئەوەش لەبیر نەکەین کە لە گرانی گەورە خەڵکێکی زۆر لە کوردستانی باکووریش ڕوویان لە شارۆچکەکانی باشوور کرد، کە گرانییەکە بە جۆرێ بووە لەزۆر شوێن ڕوویان لە خواردنی گۆشتی کەر و سەگ و پشیلە کردووە.

## موتەسەڕیفی هەولێر بۆ سلێمانی دەچێ

مەلیک فەیسەڵ زانیاری لەسەر ئەوە هەبووە کە پەیوەندی نێوان

بنەماڵەی ئێمەو شێخ مەحموود، دەگەڕێتەوە سەردەمی کاک ئەحمەدی شێخ و شێخ مارفی نۆدەهی کە دەستخەتەکەی تائێستاش لامان ماوە، بۆیە لەسەر داوای مەلیک فەیسەڵ ئەحمەد عوسمان گواسترایەوە سلێمانی، مەلیک مەبەستی ئەوەبوو کە متمانەیەک بداتە شێخ مەحموود کە موتەسەریفی شار یەک لەو پیاوانەیە کە جێگای متمانەی ئەوە، بۆ گفتوگۆکردن.

بەڵێ قەدرییەخان کچی ئەحمەد عوسمان، کە بیری ئەم ڕۆژانەی وەک دۆێنێ لە بیر ماوە، لەسەر ڕۆیشتنەکەی باوکی بۆ سلێمانی دەڵێ: گشت خەڵک و پیاو ماقوڵانی هەولێر، لەو شوێنە کۆبوونەوە کە ئەوکات پێیان دەگوت: ئاوی میری، بۆ بەڕێکردنی ئەحمەد عوسمان، زیاتر لە دووهەزار کەس (نزیک هوتێل زەیتونەی ئێستا ) بەشدارییان لەو خوداحافیزییە کرد. ئەوکات "ئاوی میری" دوا شوێنی ئاوەدانی بوو لە هەولێر، ئەوەکەی دیکە هەمووی چۆڵەوانی بوو، پاشان بە یاوەری دوو سەیارەی سەربازی ئەحمەد عوسمان لە هەولێرەوە بەرەو سلێمانی بەڕێ کەوت. قەدرییەخان درێژە بە قسەکانی دەدا و دەڵێ: ئێمە چەند ڕۆژێک دوای ڕۆیشتنی باوکم بەردو سلێمانی بەڕێکەوتین، لە ڕێگادا سەیارەکەمان تووشی شکست هات و لەڕێگادا وەستا، خەڵکەکە دەڵێن: پیاوان و چەکدارانی شێخ ڕێگایان قەدەغە کردووە، بەڵام پاشان کە دەزانن ماڵ و منداڵی موتەسەریفی سلێمانین، بەبێ کێشە دەگەنە سلێمانی. پاش دەست بەکاربوونی وەکو موتەسەریفی سلێمانی، لەگەڵ حاکمی ئیداری ئینگلیز بە یاوەری شێخ قادر برای شیخ مەحموود کە ئەوکات ببووە ئەندامی دامەزرێنەری ئەنجومەنی دەوڵەتی عێراق، چەند جار پەیوەندی بە شێخ دەکەن پاشان پەیوەندی تەلەفۆنی نێوان مەلیک فەیسەڵ و مەندوبی سامی بریتانی و ئەحمەد عوسمان دەستپێدەکات و ئەو گفت و بەڵێنانەی کە مەلیک و مستشاری وەزارەتی داخلی کورنوالیس بە شێخیان دەدات، ئەحمەد عوسمانیش دواتر بە شێخ مەحموودیان ڕادەگەیەنێت، ئەحمەد عوسمان وەکو ناوبژیوانێک دەبێت لەنێوان مەلیک و شێخ مەحمووددا، (سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەحمەد عوسمان ڕۆژی ١٦ حوزەیرانی ١٩٢٧ گەیشتۆتە پێنجوێن و ٣ ڕۆژ لەوێ ماوەتەوە، ڕێو شوێن دانراوە بۆ تەسلیم بوونی پێشمەرگەکانی شێخ کە لێبووردن دەیانگرێتەوەو پاشان سەرۆک وەزیران جەعفەر عەسکەری بە یاوەری موتەسەریف ئەحمەد عوسمان ٢٨ حزیران ١٩٢٧ لەگەڵ شیخ کۆبوونەوە وە قەناعەتیان پێ کرد سەر لە بەغدا بدا و نامەی مەلیک فەیسەڵیان پێ گەیاند، شێخ ٢ی تموز ساڵی ١٩٢٧ بەڕێ دەکەوی لە خورماڵەوە بۆ سلیمانی وە لە ٤ی تەموز دەگاتە بەغدا.

### موفتی هەولێر بەشداری لەپێشوازی مەلیک مەحموود دەکا لە سلێمانی

بەڵێ ئەمە ڕاستە، کە گفتوگۆیەکان بۆ پێشەوە دەڕوا لەگەڵ شێخ هەواڵی هاتنی شێخ بۆ سلێمانی مسۆگەر دەبێ بۆ "موفتی " دەچێتە سلێمانی بۆ لای ئەحمەد عوسمانی برای کە ئەوکات موتەسەریفی شار بوو، بۆ ئەوەی بەشدار بێت بۆ ئەم پێشوازییەی کە خەڵکی شاری سلێمانی خۆیان بۆ ئامادە کردبوو.

هەروەها قەدرییە خان دەگێڕێتەوە و دەڵێ: کە مامم محەمەد موفتی هات، بەیەکەوە لەگەڵ شێخ قادری برای شێخ مەحموود لە ماڵی ئێمە بوون، گشتمان چاوەڕوانی هەواڵی شێخ بووین کە قەول وابوو لە "خورماڵەوە " بەڕێ بکەوێت بۆ شاری سلێمانی، بەڵام هاتنەوەکەی چەند کاتژمێرێک دوا کەوت، نارەحەتی و غەمباری بەسیمای هەمووماندیار بوو، بە تایبەتی حەپسە خانی نەقیب کە دەکاتە ئامۆزای شیخ مەحمود و خێزانی شیخ قادری برایی و، عائیشە خانیش کە دەکاتە خوشکی حەپسە خانی نەقیب و خێزانی دووەمی شیخ مەحمود بوو دەستیان کرد بە گریان، بۆیە کەس لە ئێمە نانی نیوەڕۆی ئەو ڕۆژەمان نەخوارد. زۆربەی ژنانی خانەوادەی شێخ مەحموود لە ماڵی ئێمە بوون و زۆربەیان لەسەر دوا کەوتنی شێخ زۆر نا ڕەحەت بووبوون.

مامم موفتی و شێخ قادریش لە ژووری میوان بوون ئەوانیش زۆر نارەحەت بووبوون، ئەم چەند ماوەیە زۆر ناخۆش بوو، دەترسان نەوەک حکومەت مەرامەکی هەبێ و ئینگلیز کارێک بکەن و شێخ لە ناو بەرن، ئەو نارەحەتییە بێ هۆ نەبوو، ئینگلیز پێشتر لە پیلانگێراندا بوو بۆ ئەم مەرامە گڵاوەی، هەروەها پێشتر خەڵاتیان تەرخان کردبوو بۆ گرتنی شێخ بە زیندوویی یان بە کوشتن، جا

قەدریە خان هەروەها دەیگوت: ئامینە خان پێی دەوتم بەخوای ئەگەر شێخ شتێکی بەسەر دابێت یەقەی مامت و بابت دەگرم (مەبەستی محەمەد موفتی باپیرم وئەحمەد عوسمانی باوکی بوو). بەڵام کە هەواڵی شێخ گەیشت کە نزیک بۆتەوە لە قەراغی شار بووە هەرایەک، گریانی خۆشی و فرمێسک و هەلهەلەو پێکەنین ئاوێزانی یەکتر ببوون.

قەدریەخان، باسی ئەو رۆژەش دەکاو دەڵێ: کە شێخ دەگەڕێتەوە سلێمانی و دێت بۆماڵی ئەوان، ئەمەش دوای ئەوەی کە مەلیک فەیسەڵ لەرێگای ئەحمەد عوسمان نامەیەک بۆ شێخ مەحموود دەنێرێت و داوا دەکا کە ئەو شەڕو کوشتاردی نێوانیان کۆتایی پێ بهێنرێت، رێگا خۆش بکا بۆ ئیمزا کردنی شێخ لەسەر رێکەوتن لەگەڵ حکومەت کە یەک لە مەرجەکانی ئەوە بوو کە بابا عەلی کوری شێخ، ئەوسا لە پۆلی چواری سەردتایی دەبێت، خوێندنی لە بەغدا تەواو بکا وەک متمانەیەک لە لایەن شێخەوە بەرانبەر حکومەتی عێراق، و داواش دەکا کە لەگەڵ شێخ بۆ ئەو مەبەستە یەکتر ببینن، جا قەدریە تەواو وردەکاریەکانی رۆژی هاتنەوەی شێخ بۆ سلێمانی دەگێڕێتەوە دەڵێ: نزیکەی هەزار عەسکەری لیفی ئینگلیز دەورەی جادەو رێگاو بانەکانی دەوری ماڵمانیان دابوو، لە هەمان کات گشت خەڵکی شار لە سەر شەقامەکان ریز ببوون بەگشت توێژەکانیەوە لەچاوەڕوانی شێخ وەستابوون، بەهەزاران خەڵک لە سەربان وەستابوون، دەروێشی تەکیەکان بەدەف، هەندێکیان بە تیپی مۆسیقا، هەندێکیشیان بە چەپڵەرێزان و هەلهەلەوە پێشوازییان لە شێخ کرد، ئەو رۆژە دەتوانم بڵێم وەک رۆژی حەشر وابوو، کە شێخ گەیشتە نزیک ماڵمان لە بەر قەرەباڵغی، رێگا نەبوو شێخ بێتە ژوورەوە بۆیە بە رێگای قاندرمەی خانووی هاوسێکەمان هاتە دیوەخانەکەمان، بابا عەلی کوری شێخ منداڵ بوو، هەندە هەرا بوو کەمێک مابوو بابا عەلی بەبەر سەیارەیەک بکەوێت، هەروەها قەدریەخان بەردەوام دەبێ و دەڵێ: شێخ کە هاتە ژوورەوە ئەو رۆژە رۆژی خۆشی وام نەدیوە، فرمێسک و گریانی حەپسە خان و عائیشە خان و ژنانی دی خانەوادە هەلهەلەیان و فرمێسکیان پێکەنینیان تێکەڵ یەکتر ببوو، شێخ بە یاوەری باوکم راوەستان لەگەڵ مامم محەمەد موفتی زۆر بە گەرمی دەستیان لە مل یەکتر کردو دوعای سەرکەوتنی بۆ خواست لە خوای مەزن، پاشان شێخ لەگەڵ خێزان و حەبسەخانی نەقیب و ئامینە خان چاک و خۆشییان لەیەک کردو ئینجا بەرەو ژووری میوان رۆیشتن، بە دوای ئەوان چەندین پیاوی بەرپرسی ئینگلیز و حکومەت چوونە ژوورەوە و دەستیان کرد بە گفتوگۆ، دەرگایان داخست، بابم ئەحمەد ئەفەندی پاشان گوتی: شێخ بەتەلەفۆن لەگەڵ مەلیک فەیسەڵ قسەی کرد، وە دوای ئەو گفتوگۆیە شێخ مەحمود بڕیاری دا بچێت بۆ بەغدا، جا دەڵێ (چەپمن) کە بەرپرسی ئینگلیز بوو وتی: باشتر وایە بابا عەلی بێتە لەندەن لەوێ بخوێنێ و بۆ ئەوەی چیتر حکومەت و شێخ شەڕ نەکەن، بۆ رۆژی دوایی شێخ مەحموود و شێخ قادر و حاکمی ئیداری ئینگلیز و ئەحمەد عوسمان بەسواری تەیارەیەک بەرەو بەغدا رۆیشتن.

سەرچاوەکان باس دەکەن کە سەرۆک وەزیرانی عێراقی ئەو سەردەمە جەعفەر عسکری لە تەموزی ساڵی ١٩٢٧ هاتۆتە سلێمانی بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ شیخ وە شێخ رۆژی ٤ تموز ١٩٢٧ بە تەیارە بەرەو بەغداد رۆیشتووە، شێخ کە دەگاتە بەغداد لە ماڵی میرزا فەرەجی حاجی شەریف مێوان دەبێ، و دوا رۆژ لەگەڵ ئەحمەد ئەفەندی و حسین زەکی بەگ دەچنە لای مەندوبی سامی بەریتانی و دوای ئەو دەچنە لای مەلیک فەیسەڵی یەکەم.

**مەلا فەندی و داوای لێبووردن**

من بەبیرم دێت کە عەلی مەحمود کاکەخان سەردانی باوکمی دەکرد، ئەو قسەیەشم هەر لەباوکم بیستووە، کە دوای ئەوەی مەلیک فەیسەڵ لەساڵی"١٩٢٤"دێتە هەولێر، مەلا ئەفەندی داوای لێ دەکا کە لێبووردنێک بۆ عەلی مەحمود کاکەخان دەربکات کە ئەو لە شۆڕشەکانی شێخ مەحمودی حەفید بە شداری کردبوو، ئەوەبوو مەلیک فەیسەڵ لەسەر داوای مەلا ئەفەندی ئەو لێبووردنە دەردەکا، هەروەها مەلا ئەفەندی دوای نەفیکردنی شێخ مەحمود، لەسەر داوای خەڵکی هەولێرو دەوروبەری، داواکاریەک ئاراستەی ئینگلیز دەکەن بۆ ئازادکردن و گەڕانەوەی شێخ مەحمود بۆ کوردستان.

## مەزیەتەی خەڵکی هەولێر بۆ گەڕانەوەی شێخ مەحمود

من لە عەزەددین ئەفەندیم بیستووە، ئەویش لە باوکی، هەروا نووسینەکانی خوالێخۆشبوو، ئەحمەد خواجە باس لەوە دەکات کە مەلا فەندی چەند پشتگیری دەکردن و یارمەتی دەدان، بۆ هەوڵ و کۆششیان، مەلا ئەفەندیش ناوی خۆی، و موفتی و مەلا گەورەی کۆیێ و ناوی زۆربەی پیاوماقوڵانی شار و سەرۆک عەشیرەتەکان دەخاتە پاڵ ئەم ناوانە کە ئیمزایان کۆکردبووەوە و پاشان ئەم داواکارییەی مەلا ئەفەندی ئاراستەی دەسەڵاتدارەکانی ئینگلیز دەکا و لە هەر کۆبوونەوەیەک ئەم داواکارییەی دووبارە دەکاتەوە، چونکە شێخ مەحمود چەندین جار هاتۆتە هەولێر لە باداوە لای مەلا ئەفەندی میوان بووە.

سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە شێخ لە هیندستانەوە بەرەو عێراق گەڕاوەتەوە ماوەیەک لە کوێت گیرسایەوە، تائینگلیز زەمینەیان بۆ خۆش بوو، بۆ بڕیاردان لە سەر گرنگی شێخ مەحمود بۆ ئەو سەردەمە کە تورکیا جموجۆڵی سەربازی هەبوو بۆ گەڕاندنەوەی ولایەتی موسڵ بۆ تورکیا، هەر ئەوەش بوو لە مانگی ئەیلولی ۱۹۲۲ شێخ مەحموود لە کوێتەوە گەڕایەوە کوردستان و ئیعلانی حکومەت و مەلیکی خۆی را گەیاند.

## بزووتنەوەی گەیلانی ساڵی ۱۹٤۱ و ناردنی مەلیک بۆ هەولێر

لە سەردەمی مەلا ئەفەندی هەولێر قورسایی خۆی هەبوو، باداوە گوندبوو، بەڵام والی ولایەتی موسڵ لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی و مەلیک شێخ مەحمودی حەفید و هەرسێ مەلیکی عێراق و سەرۆک وەزیران و سەرکردەکانی کوردو، وەزیرەکان دەهاتن بۆ باداوە بۆ چارەسەری و یەکلاکردنەوەی کێشەکانیان، ئەم رووداوەش لە مانگی نیسانی ساڵی"۱۹٤۱"بوو، کاتێ کە رەشید عالی گەیلانی لە کۆبوونەوەیەکی پەرلەماندا بڕیاری دا، وەسی لەسەر مەلیک فەیسەڵ، عەبدول ئیلاه خالی بوو لابرێت. رەشید عالی گەیلانی نەیدەویست مەلیک فەیسەڵ و خانەوادەی بکوژێت، چونکە لە ئەنجامەکەی دەترسا، بۆیە لەژێر چاودێری سەربازی لە بەغداوە رەوانەی هەولێریان دەکا، باوکم گوتی: ئەودەمە رەشید عالی گەیلانی بە تەلەفۆن پەیوەندی لەگەڵ مەلا ئەفەندی دەکاو داوای لێ دەکات کە مەلیک فەیسەڵ لەژێر چاودێری ئەودا بێت. بێگومان رەشید عالی گەیلانی و مەلا فەندیش پەیوەندییەکی توندوتۆڵیان لەنێواندا هەبوو، چونکە گەیلانی پێشووتر چەندین جار سەردانی هەولێریان کردبوو، لە قەسری باداوە میوانی مەلا ئەفەندی ببوو، یەکەم سەردانی گەیلانی بۆ هەولێر، یەکڕاست دوای سەردانەکەی مەلیک فەیسەڵ بوو، گەیلانی لەساڵی "۱۹۲٦" کە ئەوکات وەزیری ناوخۆ بوو لە حکومەتی جەعفەر عەسکەری سەردانی هەولێری کردبوو، بە یاوەری محەمەدئەمین زەکی بەگ کە لەهەمان حکومەتەکەی جەعفەر عەسکەری، ئەمین زەکی وەزیری ئیشغال بوو، لە یەکێ لەو سەردانانە، ئەمین زەکی بەگ و رەشید عالی گەیلانی و مەلا ئەفەندی و مەعروف جیاووک و قادری میران بەگ و خدری پاشا و مەعروف ئاغا پیرداود وێنەیەک بۆ یادگاری لە قەسری مەلا ئەفەندی دەگرن و من ئەم وێنەیەم لە ساڵی ۱۹۸٤ لە یادی سەد ساڵەی دامەزراندنی شارەوانی شاری هەولێر لە کتێبەکەی شارەوانی کە شێرزاد هەینی و تەحسین چیچۆ دەریانکرد، بەو بۆنەیەوە چاپ و بڵاوم کردەوە.



بۆیە ڕەشید عالی گەیلانی پێی باش دەبێت مەلیک فەیسەڵی دووەم و خانەوادەکەی بۆلای مەلا ئەفەندی بنێرێت و دووریان بخاتەوە لەبەغدا، قەسری مەلا ئەفەندیشی لا باشترین و دڵنیاترین شوێن بووە بۆ ئەم کارەو دوورخستنەوەیان، هەروەها حکومەتەکەی ڕەشید عالی گەیلانی بۆئەوەی زیاتر شەرعییەت بە حکومەتەکەی خۆی بدات، کە دژ بەئینگلیز بەرپایان کردبوو، پێیان باشبوو مەلیک فەیسەڵ و خانەوادەکەی هیچیان بەسەر نەیەت و لەوەش دەترسان کەوا کۆنترۆڵی بەغدایان پێ نەکرێت، عیزەدین مەلا فەندی لە یادەوەرییەکانی خۆی باسی دەکردو دەیگوت: پێش ڕۆژێک، ڕەشید عالی گەیلانی تەلەفۆن لەگەڵ مەلا ئەفەندی دەکاو هۆکاری ناردنی مەلیک فەیسەڵی بۆ ڕوون دەکاتەوە، هەروەها گەیلانی ئەوەش بە مەلا ئەفەندی ڕادەگەیەنێت کە ئەو لەگەڵ موتەسەریف و حامییە قسان دەکاو پێیان دەڵێ: کە لەژێر ئامۆژگاری مەلا ئەفەندی هەڵسوکەوت لەگەڵ مەلیک فەیسەڵدا بکەن. ئەوەبوو خانەوادەکەیی و مەلیک فەیسەڵ ڕۆژی ١٩٤١/٥/٢٨ لە بەغدا بە شەمەندەفەر بەرەو کەرکووک بەڕێدەکەون، ڕۆژی ١٩٤١/٥/٢٩ دەگەنە کەرکووک و پاشان بە سەیارە دێنە هەولێر.

بەر لە گەیشتنیان، مەلا ئەفەندی قەسری باداوەیان بۆ چۆڵ دەکاو ئەو کەسانە لەوێ دێڵێتەوە کە لەوێ خزمەتیان بکەن، هەروەها زۆر بەتوندیش ڕووبەڕووی ئامر حامییەی هەولێر دەبێتەوە، کاتێ دەیەوێت بیانبا بۆ ناو مەعەسکەر، وابزانم ئەوکات ئەمین ڕەواندزی ئامر حامیەی هەولێر دەبێت،

## ڕێگای خۆڵاوی باداوە و مەترسی لە کوشتنی مەلیک فەیسەڵ

خانەوادەی مەلیک فەیسەڵ کە دەگەنە هەولێرو بەرەو باداوە، ترسی ئەوەیان لێ دەنیشێت کە بیانکوژن، هەروەها عزەددین فەندی دەیگوت:

مەلیکە عالییەو کوڕەکەی و کچەکەی کە دەکاتە مەلیک فەیسەڵی دووەم و هەروەها دایکی مەلیکە عالییە، مەلیکە نەفیسەو خوشکەکانی مەلیکە عالییە، ئەمیرە عابیدەو ئەمیرە مەلیحە، ئەمیرە جەلیلەو پوورەکانی ئەمیرە سالحە، هەروەها مرافقیان عەبدولوەهاب عەبدوللەتیف سامەرایی و خێزانەکەی و، موقەدەم سالح زەکی ئەلتائی کە لەژێر چاودێری ئەودا بوون گەیشتنە باداوە، هەروەها لەگەڵ چەند خزمەتکارێک کە لەگەڵیاندا بوون، لەناو خانەوادەمان دەگێڕنەوە: مەلیکە عالییە دایکی مەلیک فەیسەڵ دەیگوت: ئێمە کە لەناو هەولێر بەرەو باداوە بەڕێگای خۆڵدا هاتین، زۆر دەترسام، نەوەکو لەبەر خۆم، بەڵکو لەوە دەترسام کە فەیسەڵ بکوژن.

ئەوانی لەو ماوەیە لە نزیکەوە لە ڕووداوەکە ئاگاداربوون، بۆیان دەگێڕامەوەو دەیانگوت: مەلیکە عالییە ژنێکی زۆر بەشەخسیەت بووە، هەموو کات دەیگوت: لەو ڕۆژەوەی هاتووینەتە مالی مەلا ئەفەندی حەساینەوە، لەبەر ئەوە قەسری باداوەیان تەنها بۆ ئەوان تەرخان کردبوو، خانەوادەی ئێمە بۆ نانی نیوەڕۆ و ئێواران دەچوونە لای ئەوان لە باداوەو پاشان دەگەڕانەوە بۆ هەولێر، بۆیە مەلیکە عالییە دوای ئەوەی کە بەڵێنی پارێزگارییان لەلایەن مەلا ئەفەندییەوە پێ دەدرێت زۆر بە مورتاحی ژیانی ئاسایی خۆیان لەناو قەسر دەگوزەرێنن. نزیکەی هەفتەیەک بەم جۆرە لەهەولێر دەمێننەوەو دەنگوباسی بەغدا لە ڕادیۆوە گوێبیست دەبن، بەڵام پاش هەرەسهێنانی شۆڕشەکەی ڕەشید عالی گەیلانی کە خۆی و سەرکردە سەربازییەکانی دیکەی دواتر بۆ دەرەوەی وڵات ڕایانکرد، وەسی کە خاڵی مەلیک فەیسەڵ بوو، گەڕایەوە بەغداو پەیوەندی تەلەفۆنی لەگەڵ خانەوادەی مەلیک لە باداوە کرد موژدەکەی پێڕاگەیاندن. هەروەها ئەو ماوەیەی کە لە باداوە بوون، هەموویان جلی ڕەشیان پۆشیبوو، بەڵام دوای گەڕانەوەی وەسی بۆ بەغدا، جلوبەرگی ڕەنگاوڕەنگیان لەبەر دەکرد. یەکێ لە خوشکەکانی مەلیکە عالییە کە ئێستا لە ژیاندا ماوەو ئەو لە ١٤ی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨ لەبەغدا نەبوو، بەر لە کۆمەڵکوژی بنەماڵەکەیان کە ئەو بەر نەکەوت. لەبیرەوەرییەکانی خۆی باس لە شەهامەتی کوردەکان دەکاو دەڵێ: مەلا ئەفەندی جوڕئەت و شەهامەتێکی گەورەی نیشان دا، کاتێ کە ئێمە چووینە باداوە، گوتی: گەر خۆم نەمێنم، ئەگینا بەهیچ شێوەیەک لێ ناگەڕێم مەلیک و خانەوادەکەتان زەرەرو زیانتان پێ بگات.

مەلیکی کوردستان شێخ مەحمود حەفید و مەلا مستەفای بارزانی و

مەلیک فەیسەڵی یەکەم و مەلیک غازی و مەلیک فەیسەڵی دووەم، ئەمەو جگە لەوەی کە بەر لەم مێژووەو دواتریش، زۆربەی وەزیرو بەرپرس و کاربەدەستانی ناوخۆو دەرەوە، هەروەکو والی عوسمانلی و حاکمی ئیدارەی ئینگلیز، سەردانی قەسری مەلا ئەفەندییان کردووەو کە ناوهێنانیان لەژمارە نایەت.

مەلا فەندی شەوی سەری ساڵی ۱۹٤۲/۱۲/۳۱کۆچی دوایی کردووە، رۆژنامەی "فتی العراق" ژمارەیەکی تایبەتی بەبۆنەی چلەی مەلا فەندی دەرکرد، کە چەندین لاپەڕەی تایبەتی بۆ مەلا ئەفەندی تەرخان کردبوو، رۆژنامەی "فتی العراق" رۆژنامەیەکی رۆژانەی سیاسی سەربەخۆ بوو، رۆژانی یەکشەممەو پێنج شەممە لە شاری موسڵ دەردەچوو، ، لە رۆژی ۱۱شوباتی ساڵی ۱۹٤۳ ژمارەیەکی تایبەت بەبۆنەی چلەی مەلا فەندی دەرکرد، لە لاپەڕەی یەکەم باس لەژیان و چالاکییەکانی مەلا فەندی دەکاو هەروەها باس لە رۆژی کۆچی دوایی دەکا کە چۆن خەڵکی هەولێر هەموویان خۆیان رەشپۆش کردبوو، ئەو شارە یەکپارچە رەش بوو، هەروەها بروسکەکانی بەبۆنەی کۆچی دوایی نێردرابوو، هەمووی تێدا بڵاوکردۆتەوە، بروسکەکەی عەبدولئیلا وەسی عەرشی عێراق و، سەرۆک وەزیرانی عێراق نووری سەعید، بروسکەی کورنوالیس سەفیری بەریتانیا لە عێراق، بروسکەکەی سەید سەدر سەرۆکی ئەنجومەنی ئەعیان، بروسکەی گشت وەزیرەکانی عێراق، هەروەها بروسکەی کۆلۆنێل لاین کە بەکوردی بروسکەکەی ناردووەو هەواڵی کۆچی مەلافەندی لە ئێزگەی بی بی سی بەریتانی بڵاو کراوەتەوەو بەدرێژی باسی ژیانی مەلا ئەفەندی کردووە.

**عەدنان موفتی و**
**عزەددینی مەلا فەندی**

عەزەددین مەلا فەندی هەر لە منداڵییەوە لە پۆلی یەکی سەرەتایی تا کۆچی دوایی باوکم، ساڵی ۱۹۹۲ بێجگە لە پەیوەندی خزمایەتی (کە باوکیان ئامۆزای یەکترن) دۆست و برادەر بوون، عەزەددین مەلافەندی دوای شۆڕشی ۱۹٥۸ عێراق بەجێدێڵێت، بەڵام ناوە ناوە دەگەڕایەوە، لە ساڵی ۱۹۷٥ کاتێ لە لوبنان بە یەکجاری گەڕایەوە هەولێر، لەبەر ئەو پەیوەندییەی نێوان باوکم و ئەو هەموو رۆژانی هەینی نانی نیوەڕۆیان بەیەکەوە دەخوارد، تا کۆچی دوایی باوکم، لە ساڵی ۱۹۹۱ -۱۹۹٦ من و کاکم عەدنان لە یەک ماڵ دەژیاین، کاکم ئامۆژگاری مام عەزەددینی دەکردو هەوڵی دەدا کە دەست بکا بە نووسینەوەی بیرەوەرییەکانی خۆی بۆ ئەم مەبەستە، رۆژنامەنووس شێرزاد شێخانی راسپارد بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە، ئینجا بە شێوەی دیداری راستەوخۆو تۆمارکردنی لە رێگای ریکۆردەرو شێوەکانی دیکەی نووسینەوە، بۆیە بۆ چەندین جار شێخانی دەچووە لای عەزەددین فەندی یادەوەرییەکانی نووسی، ئەم کارە، بەردەوام بوو تا ساڵی ۱۹۹٦ پاش ئەوەی من بۆ هەندەران رۆیشتم، هیچ ئاگاداریم نەما، بەڵام یادەوەرییەکانی زۆربوون، پێم وایە خۆی لە چەند بەشێک دەدات، لە پاشان کە کۆچی دوایی کرد، لە مانگی مایسی ساڵی ۱۹۹۹ خانەوادەکەیان سەرپەرشتی کتێبەکان و نووسینەکانیان کرد. یادەوەری زۆری بۆ من باس کردووە لەوانە هاتنی خوالێخۆشبوو مەلامستەفای بارزانی بۆ باداوە لە ناوەڕاستی چلەکانی سەدەی رابردوو و گفتوگۆکردنی لەگەڵ سەعید قەزاز کە ئەوکات وەزیری ناوخۆی عیراق بوو، هەروا باوکم لە چەندین یادەوەری یاوەری عەزەددین فەندی بوو، بە تایبەتی لە رووداوەکان ئاگادار بوو، ئەو گفتوگۆیەی نێوان ئەوان چەند جارێک لەهەردووکیانم بیستووە، لە ژمارەکانی داهاتوو ئەم باسە و باسی هاتنی خوالێخۆشبوو مەلا مستەفای بارزانی لە مایسی ساڵی ۱۹٦۰ بۆ قەڵای هەولێر و مانەوەی شەوێک لە ماڵی مامم شەمسەدین موفتی کە ئێستاش ئەم خانووە ماوە، کە لە تەنیشت مزگەوتی قەڵاتەو پاشان هاتنی بۆ ماڵی ئێمە بێجگە لە هەندێ رووداوەکانی ساڵانی پەنجاکان لەو چالاکییانەی کە بەرێزان مام جەلال و هەمزە عەبدوڵڵا و عومەر دەبابە و ئیبراهیم ئەحمەد کە لە خانووی مامم شەمسەدین موفتی، زۆر جار دەمانەوەو لە بەغدا ئەو کات حکومەت فرمانی گرتنی لە سەر هەندێکیان دەرکردبوو.

**لە هەفتەنامەی بەدرخان بڵاوکراوەتەوە.**




# هەولێر لە سەردەمی ئینتدابی بەریتانیدا ١٩٢١ - ١٩٣٠

مەهدی محەمەد قادر
کۆلیژی ئاداب - زانکۆی سەلاحەددین

### هەولێر و دامەزراندنی حکومەتی کاتی عێراق

دوای راگەیاندنی رژێمی ئینتداب بە سەر عێراق لە کۆنگرەی سان ریمۆ لە ٣ی ئایاری ١٩٢٠، عێراق بە شێوەیەکی فەرمی کەوتە ژێر سەروەری و دەسەڵاتی بەریتانیا، بەڵام سەبارەت بە کوردستان بە پێی مادەی شانزەم کە تێیدا هاتووە " ئەم سیستەمەی ئینتداب رێگا لە بەریتانیا ناگرێت کە حکومەتێکی سەربەخۆ لە رووی ئیداری لە ناوچە کوردییەکان دابمەزرێنێت " ئەم رژێمە نوێیەی بە سەردا نەچەسپا[١]، هەر بۆیە بە گشتی هەڵوێستی کورد لە چەسپاندنی سیستەمی ئینتداب گرنگییەکی ئەوتۆی نەبوو لە ژێر ئەم بۆچوونەی کە کوردستانی خواروو (ویلایەتی موسڵ) بەشێک نییە لە عێراق[٢].

رەوشی سیاسی هەولێر لەم کاتەدا لە ناوچەکانی تر باشتر نەبوو و دەسەڵاتی ئینگلیز تا ١٤ ی ئەیلول تەنها بە رواڵەت مابوو بەڵام دواتر دەسەڵاتیان بەسەر شارەکە گێرایەوە و چەند کەسێکیش دەستگیر کران و گواسترانەوە بۆ بەندیخانەی بەغدا کە تۆمەتبار کران بە راپەڕاندنی چالاکییەکان دژی ئینگلیز لە شارەکە، جگە لە هەولێر ناوچەکانی ناوەراست و خوارووی عێراقیش بە هەمان شێوە لە بارێکی سیاسی نائارامدا بوو[٣].

برسی کۆکس لە ١ ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٠ بە ئەرکی نەهێشتنی شۆڕش و پێکهێنانی حکومەتێکی عەرەبی لە عێراق گەیشتە بەغدا و دوای گفتوگۆکردن لەگەڵ (عەبدولرەحمان النقیب) و رەزامەندی ناوبراو لە ٢٥ ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٠ یەکەمین حکومەتی کاتی لە هەشت وەزیر و دوانزە وەزیری بێ وەزارەت پێک هێندرا، بەڵام ئەم وەزارەتە هیچ وەزیرێکی هەولێری تێدا نەبوو[٤].

سەبارەت بە هەڵوێستی هەولێر

بەرامبەر ئەم حكومەتە تازەیە گرنگییەكی ئەوتۆی نەبوو، بەڵام دەكرێت بڵێین ئەوانەی كە نەیارانی ئینگلیز بوون لە هەولێر هەوڵی هێنانە كایەوەی حوكمێكی نیشتمانییان دەدا، دەسەڵاتدارانی ئینگلیزیش لە شارەكە پاڵپشتی ئەم حكومەتە كاتییەیان دەكرد چونكە خۆیان دایانمەزراندبوو و خۆیان سەرپەرشتی كارەكانیان دەكرد، و بەشێك لە دانیشتوانی هەولێر لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەتی كوردی بوون كە لە سلێمانی بڕیاری لەسەر درابوو و بە شێوەیەكی گشتیش خەڵكی هەولێر دژی گەڕانەوەی تورك بوو بۆن حوكمڕانی شارەكە. بەڵام دەتوانین بڵێین هێنانە كایەوەی ئەم حكومەتە خزمەتی كردووە بە كەسایەتییەكانی ناوداری هەولێر كە لە ئەنجامی دژایەتی ئینگلیز كەوتنە بەندیخانە وەك (حاجی ڕەشید ئاغا) كە بە هۆی فەرمانی لێبووردنی ئەم حكومەتەی گەیلانی لە بەندیخانە نازاد كرا[٥].

دامەزراندنی حكومەتی كاتی لە عێراق دەرەنجامی ئەم ڕەوشە سیاسییە بوو كە عێراق دوای داگیر كردنی ئینگلیز بە تایبەتی دوای بەرپا بوونی شۆڕشی ١٩٢٠ پێیدا تێپەڕی كە زەرەروزیانی بە هەیمەنەی ئینگلیز گەیاند و ڕەنگدانەوەی ئەم شۆڕشە لە ناوەوەی بەریتانیاش بووە هۆی گفتوگۆ و ڕووبەڕوو بوونەوەی ڕاگەیاندن لە نێوان حكومەتی بەریتانی و بەرەی بەرهەڵستكاری حكومەت و دژایەتیكردنی ئەم سیاسەتەی كە لە عێراق پیادەی دەكات و داواكرا كە خەرجییەكانی




بەریتانیا لە عێراق كەم بكرێتەوە و چاو بە سیاسەتی ئینگلیز بخشێتەوە لە جێبەجێكردنی كارەكانیان لە عێراق[٦].

هاوكات لەگەڵ ئەم بارودۆخە سیاسییەی كە عێراق پێیدا تێدەپەڕی وەزارەتی داگیرگەكان بڕیاری بەستنی كۆنگرەیەكی دا بۆ دیاریكردنی ستراتیجیەتی دوارۆژی حكومەتی بەریتانیا لە داگیرگەكان و شاری قاهیرەش دیاری كرا بۆ شوێنی بەستنی كۆنگرەكە هەر بۆیە بە ناوی " كۆنگرەی قاهیرە " ناسرا[٧]. وەزیری بەرگری (ونستون تشرشل) سەرۆكایەتی كۆنگرەكەی كرد و بە بەشداری مەندوبی سامی لە عێراق (سیر برسی كوكس) و سەركردەی هێزەكانی ئینگلیز لە عێراق (جنرال هالدن) و (مس بیل) ودوو ڕاوێژكاری ئینگلیز لە وەزارەتەكانی عێراق هەر یەك لە (جەعفەر عەسكەری وەزیری بەرگری و ساسون حسقیل وەزیری دارایی) بەشدار بوون[٨].

دەتوانین بڵێین مەسەلەی كورد لە عێراق بابەتێكی سەرەكی كارەكانی ئەم كۆنگرەیە بوو، بەڵام هیچ نوێنەرێكی كورد تێیدا بەشدار نەبوو، بۆیە دەكرێت بڵێین یەكێك لە خاڵە لاوازەكانی ئەم كۆنگرەیە بووە بەرامبەر بە كورد، هەروەها دەستنیشانكردنی مەلیك بۆ سەر عەرشی عێراق تەوەرێكی تری گفتوگۆكان بوو، بەڵام لەم كەسانەی دەستنیشان كرابوون لە لایەن مەندوبی سامی بۆ عەرشی عێراق ناوی ئەم كەسەی تێدا نەبوو كە دواتر بڕیاری پێدانی پاشایەتییان پێ دا لە عێراق ئەمەش خاڵێكی تری لاوازی كۆنگرەكە بوو.

برسی كوكس كە یەكێك بوو لە بەرهەڵستكارانی جێبەجێكردنی بیرۆكەی دەوڵەتی كوردی لە كوردستانی خواروو و پشتگیری گەڕاندنەوەی ڕێكخستنە ئیدارییەكانی سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی دەكرد بە جۆرێك هەولێر ببێتە یەكەیەكی كارگێڕی كە سەر بە لیوای كەركووك بێت و لە لایەن یاریدەدەری موتەسەریف بەڕێوە ببردرێت، دوای گەڕانەوەی لە ٦ی مایسی ١٩٢١ بەیاننامەیەكی دەركرد

لەبارەی بڕیارەکانی کۆنگرەی قاهیرە و لە خاڵی دووەمی بەیاننامەکەدا لەبارەی هەولێر هاتووە و دەڵێت:

"... سەبارەت بە لیوای هەولێر دەسەڵاتدارانی بەریتانی بەڵێنییان داوە کە دەگەڕێن بە دوای ناردنی فەرمانبەرانی ئینگلیز بۆ هەولێر بۆ یارمەتیدانی بەڕێوەبردنی شارەکە و ناوچەکانی دەوروبەری، لەگەڵ ڕەچاوکردنی ڕەغبەتی کورد لە هەڵبژاردن و دامەزراندنی فەرمانبەران تێیدا، هەروەها هەولێر دەبێتە لیوایەکی سانەوی سەر بە لیوای کەرکووک و یاریدەدەری موتەسەرفی تێدا دادەمەزرێت و هەمان دەسەڵاتی موتەسەرفی دەبێت تەنها لە رووی کاروباری دارایی و سوپا و سیاسەتی دەرەکی و پەیوەندی لەگەڵ هۆزەکانی دەوروبەری هەولێر نەبێت، چونکە لەم بابەتانە دەبێت راوێژ بە موتەسەرفی کەرکووک بکات..."[9].

سەبارەت بە هەڵوێستی هەولێر لەم بیروڕایەی کە لە بەیاننامەی ناوبراو هاتووە دەبێت راپرسییەک بکرێت و بە پێی دەرەنجامەکانی وەک دەردەکەوێت هەولێر ئەم بیروڕایە پەسەند دەکات کە لە بەیاننامەی ٦ی مایسدا هاتووە بەم جۆرە دەبێتە بەشێک لە دەوڵەتی تازە دامەزراوی عێراق[10].

**هەڵوێستی هەولێر لە دانانی ئەمیر فەیسەڵ بۆ پاشایەتی عێراق**

دوای دامەزراندنی حکومەتی کاتی عێراق بە سەرۆکایەتی عەبدولڕەحمان گەیلانی لە ٢٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٠، بەریتانیا کەوتە بیرۆکەی دانانی یەکێک بۆ سەرۆکایەتی عێراق و ئەم بیرۆکەیەش بووە یەکێک لە بابەتەکانی کۆنگرەی قاهیرە لە سالی ١٩٢١، لەم کۆنگرەیە (برسی کوکس) ناوی پالێوراوەکانی خستە روو[11]، بەڵام ناوی (ئەمیر فەیسەڵ) لە لیستی کاندیدکراوەکاندا نەبوو کە دواتر بڕیاری کۆتایی لە سەر ئەو درا[12].

دوای گەیشتنی ئەمیر فەیسەڵ بۆ بەغدا، سەرەک وەزیران لە ١١ی تەمموزی ١٩٢١ بە ناوی حکومەتی کاتی عێراق ڕەزامەندی دا لە سەر دانانی (فەیسەڵی کوری حوسێن) وەک مەلیکی عێراق و بڕیاردرا کە راپرسییەکی گشتی ئەنجام بدرێت لە هەموو عێراقدا.

سەبارەت بە هەولێر دانیشتوانەکەی بڕیاریان دا کە پاڵپشتی ئەمیر فەیسەڵ بکەن و مەرجی ئەوەیان دانا کە کارگێڕییەکی کوردی مەڵبەندەکە بەڕێوە ببات وەک لە پەیاننامەی (سیڤەر) دا هاتووە[13]، دەنگدانی دانیشتوانی هەولێر بۆ ئەمیر فەیسەڵ جیاوازی هەبوو لەگەڵ ناوچەکانی تری وەک کەرکووک و سلێمانی کە دەنگیان بۆ نەدا، ئەمەش چەند هۆکارێک ڕۆڵی تێدا بینی لەوانەش راوێژکارانی ئینگلیز لە هەولێر وایان کرد کە کوردەکانی هەولێر بە پاشایەتی ئەمیر فەیسەڵ رازی بن[14]و هەروەها رۆڵی کەسایەتی بەناوبانگی هەولێر (مەلا فەندی) کە رۆڵێکی گەورەی دیت لە سەرخستنی راپرسییەکە[15]، هەروەها پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی لە نێوان بنەماڵەی مەلا فەندی و بەتایبەتی (مەلا عومەری باوکی) لەگەڵ شەریفی مەکەوە هەبووە کە هۆکاری دروستبوونی دەگەڕێتەوە بۆکاتی بەجێگەیاندنی مەراسیمی حەجکردن[16]، وەک لە یاداشتێکی (مێجەر یۆنگ)دا هاتووە لەبارەی کورد و هاتنی مەلیک فەیسەڵ بۆ حوکمڕانی عێراق دەڵێت:

"... لەگەڵ چاردایین نۆڵدەر (jardine nodler) لە مووسڵ و لەیتۆن (Lyton) لە هەولێرو لەگەڵ مارشال لە کەرکوک و گولد سمیس کە هاتبووە کەرکوک، گفتوگۆ کرا، کە شارەزاییان لە بارەی کوردستان هەبوو و دەڵێت ناوچەی هەولێر کە کوردێکی تەواوە جگە لە شوێنێکی زۆر کەم نەبێت کە دەکەوێتە لای چەپی رووباری دیجلە، ئەوانیش بە فەیسەڵ رازین بە مەرجێک دڵنیا بن لەوەی کە عێراق لە ژێر حوکمی بەریتانیادا بێت "[17].

دەتوانین بڵێین کە هۆکاری ئابووریش فاکتەرێکی تر بوو بێت، کە دانیشتوانی هەولێر دەنگدانەکەیان بۆ ئەمیر فەیسەڵ پەسەند کردبێت، چونکە چالاکییە بازرگانییەکانی هەولێر بەسترابۆوە بە شاری بەغدا زیاتر لە هەر ناوچەیەکی تر، و ئەمەیان پێ پەسەند بوو کە مافەکانی کورد لە لایەن دەوڵەتی عێراقەوە بپارێزرێت، نەک لە لایەن هەر دەوڵەتێکی تر[18].

دوای راگەیاندنی ئەنجامەکان و بەدەستهێنانی رێژەی ٩٦٪ ی دەنگدەران لە رێورەسمێکی پڕشکۆدا لە ٢٣ی ئابی ١٩٢١ ئەمیر فەیسەڵ تاجی پاشایەتی عێراقی خستە سەر، کە نوێنەری هەموو ئەو شارانە ئامادە بوون کە بەشدارییان لە راپرسییەکەدا کردبوو[19]، لە سەر داوای سەرەک وەزیران (عەبدولڵا پاشا ئەلنەقیب)

وەک نوێنەری شاری هەولێر بەشداری ئاهەنگەکەی کرد، و جێگای ئاماژەیە هەر لەم دیدەنییەی سەرۆک وەزیران و عەبدوڵلا پاشا، عەبدولرەحمان گەیلانی داوای لێ دەکات کە رەزامەندی پیشان بدات بۆ وەرگرتنی پۆستی وەزارەتی ئەوقاف هەر چەندە رەزامەندی خۆی پیشان دەدات بەڵام دواتر بە هۆی نەخۆشی و دواتر مردنی ئەم ئەرکە جێبەجێ ناکات[٢٠].

مەندوبی سامی لەبارەی بەشداری هەولێر لە راپرسییەکەدا ئەوەی بە مەلیک فەیسەڵ راگەیاند کە بەشداربوونی هەولێر و ناوچەکانی تر لەم دەنگدانە مانای ئەوە نییە کە وازیان لە مافەکانی خۆیان هێناوە بە پێی مادەی (٦٢)ی پەیماننامەی سیڤەر. هاوکات مەلیک فەیسەڵ رەخنەی گرت لە تێروانینی بەریتانیا بەرامبەر دوارۆژی کورد لە لیوای هەولێر و موسڵ و تێکەڵبوونیان لەگەڵ عێراق[٢١]. بەم جۆرە قۆناغێکی نوێ لە مێژووی عێراق دەستی پێکرد.

### هەولێر و دامەزراندنی ئەنجومەنی دامەزراندنی عێراقی

دامەزراندنی ئەنجومەنی دامەزرێنەری عێراقی یەکێک بوو لە مەبەستەکانی ئینگلیز کە هەوڵ و تەقەلای زۆری بۆ دەدا، بۆ ئەوەی ئەم ئەنجومەنە توانای ئەوەی هەبێت کە دەسەڵات بدات بە ئەنجومەنی وەزیران بۆ بەستنی پەیمانێکی نوێ لەگەڵ ئینگلیز کە شوێنی ئینتداب بگرێتەوە چونکە تا ئەو کاتەش ئەم وشەیە لەلایەن خەڵکی عێراقەوە بە داگیرکردن لێک دەدرایەوە[٢٢]، دوای ئەوەی رەشنووسی یاسای هەڵبژاردن ئامادەکرا بە پێی رێکەوتنی (چەرچل و فەیسەڵ) و بە پێی ئەو ئامۆژگاری و راسپاردانەی کە لە فەرمانبەران وکاربەدەستانی بەریتانی و عێراق گەیەندرابوو وا بە پێویست زاندرا هەوڵ بدرێ بە هەموو جۆرێک ئەوانەی هەڵدەبژێردرێن بۆ ئەندامێتی ئەنجومەن لەو کەسانە بن کە ئامادە بن پەیمانی نێوان بەریتانیا و عێراق مۆر بکەن[٢٣]. بەم جۆرە بە پێی مەرسومی پاشایەتی لە ١٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٢ سەبارەت بە دامەزراندنی ئەنجومەنی دامەزراندن، وەزیری ناوخۆ (عەبدولموحسن سەعدون) داوای لە هەموو موتەسەریفەکانی عێراق کرد کە رۆژی ٢٤ی تشرینی یەکەم هەڵبژاردنەکانی نوێنەرانی ئەنجومەنی دامەزراندن ئەنجام دەدرێت رێوشوێنی تایبەت بۆ ئەم مەبەستە بگرنە بەر[٢٤].

بنکەکانی هەڵبژاردن لە هەموو عێراق دابەشی سەر سێ ناوچەی سەرەکی کرا، هەولێر کە سەر بە لیوای کەرکوک بوو، دەکەوتە ناوچەی یەکەمی هەڵبژاردن، بەڵام بە هۆی بەرهەڵستی هەڵبژاردنەکان و هێنانە پێشەوەی چەند مەرجێک لە لایەن بەرهەڵستکارەکانی ئەم پرۆژەیە بووە هۆی سەرنەکەوتنی کارەکان و دەست لە کار کێشانەوەی گەیلانی و عەبدولمحسن سەعدون لە ٢٠ی تشرینی دووەمی ١٩٢٢ حکومەتێکی تازەی پێکهێنا و رۆژی ١٢ی تەمموزی ١٩٢٣ دیاری کرا بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردنەکان بەڵام بە هۆی تەواو نەبوونی کارەکان لە ١٥ی تشرینی دووەمی ١٩٢٣ دەستی لە کار کێشایەوە[٢٥] و جەعفەر عەسکەری یەکەمین وەزارەتێکی تازەی پێک هێنا و بریار درا کە تەواوکردنی هەڵبژاردنەکان لە ٥ی شوباتی ١٩٢٤ ئەنجام دەدرێت[٢٦]. جێگای ئاماژەیە ئەم هەڵبژاردنە بە دوو قۆناغ بەرێوە چوو، یەکەمیان لە ٢٤ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٢ کە پالێوراوی دووەم (منتخب الثانوي) هەڵبژێردرا و قۆناغی دووەم لە ١١ی تەمموزی ١٩٢٣ دەستی پێکرد و یەکەمین دانیشتن لە ٢٧ی ئاداری ١٩٢٤ دەستی بە کارەکانی کرد[٢٧].

ئینگلیزەکان بە مەبەستی



بەشداریکردنی کورد لە هەڵبژاردنەکاندا هەولیاندا رۆڵی بەرچاو ببینێت، هەر بۆ ئەم مەبەستەش ئەدمۆندزی رەوانەی کەرکوک کرد بۆ ئەوەی دڵنیا بێن لە بیروڕای خەڵکەکە، چونکە هەستیان بە لاوازی بەشداربوونی کورد دەکرد، سەبارەت بە شاری هەولێر زۆر لە سەرۆک هۆزەکان مەیلیان بەلای حکومەتەکەی (شێخ مەحمود) دادەچوو و تا رادەیەک هاوبیروڕا بوون لەگەڵ کەرکوک و سلێمانی لە رەتکردنەوەی هەڵبژاردنەکان، هەر بۆ مەبەستی بەشداری هەولێر لە هەڵبژاردنەکان مەندوبی سامی داوای کرد لە فەرمانبەرەکانی لە شارەکە کە رۆڵی گرنگ بگێرن کە خەڵکەکە بەشداری بکەن و بەڵێنیان پێ بدەن هیچ فەرمانبەرێکی عەرەب لە هەولێر دانامەزرێت و زمانی عەرەبیش بەکار ناهێنن، وەک زمانی رەسمی و مافەکانیان پارێزراو دەبێت[٢٨]. مەندوبی سامی پێشنیاری ئەوەی کرد بۆ مەلیک کە ئەو شارانەی بەشدارییان لە راپرسی مەلیک کردووە، هەر ئەو شارانە بەشداری هەڵبژاردنەکان بکەن، مەلیک فەیسەڵ لەسەر ئەم پێشنیارە رەزامەندی پیشاندا[٢٩].

ئەنجومەنی وەزیران لە دانیشتنێکی تایبەتیدا کە لە کۆشکی پاشایەتی بەرێوە چوو، بە سەرۆکایەتی مەلیک فەیسەڵ و سەرەک وەزیران و وەزیرەکان بریار درا کە رۆژی ١٢ ی تەمموز هەڵبژاردنەکان ئەنجام بدرێت، جێگای ئاماژەیە کە مەندوبی سامی داوای کرد نوێنەرێک لەم دوو نوێنەرەی کە دانراوە بۆ هۆزەکانی کەرکوک بدرێت بە هۆزەکانی هەولێر کە نوێنەرایەتی هۆزەکانی هەولێر بکات لە ئەنجومەنەکەدا و ئەمەش لە لایەن حکومەتی عێراقی پەسەند کرا[٣٠].

دوای دەست پێکردنی هەڵبژاردنەکان لە هەولێر و ناوچەکانی سەر بە هەولێر ژمارەی دەنگدەرانی گەیشتە نزیکەی (٧٧٣٢٧) دەنگدەر و ئەو قەزا و ناحیانەی کە دابرابوون لە سلێمانی بە هۆی دەنگ نەدانی لیوای سلێمانی، خرانە سەر هەولێر و کەرکوک[٣١]. دوا بە دوای راگەیاندنی ئەنجامەکان هەولێر ژمارەی نوێنەرانی لە ئەنجومەنی دامەزراندن بووە بە حەوت ئەندام کە پێک هاتبوون لە: (ئیبراهیم حەیدەری، سەبیح نەشئەت، مەلا محەمەد ئەفەندی کوری حاجی عەبدوڵلا، عەبدوڵلا موخلس، محەمەد شەریف، حاجی پیرداود، حوسێنی مەلای، داود حەیدەری). بە بەراورد لەگەڵ ژمارەی نوێنەرانی هەردوو لیوای کەرکوک و سلێمانی ژمارەی ئەندامانی هەولێر زیاتر بوو وەک لەم خشتەیەی خوارەوە دەردەکەوێت. بروانە خشتەی ژمارە (١).

ئەرکەکانی ئەم قۆناغەی ئەنجومەنی دامەزراندن بریتی بوون لە پەسەندکردنی پەیماننامەی ساڵی ١٩٢٢ ی نێوان عێراق و بەریتانیا و دانانی دەستوری عێراق کە بەرنووسی هەردووکیان لە لایەن کاربەدەستانی بەریتانییەوە ئامادە کرابوو وبریاردان لە سەر یاسای هەڵبژاردن وپێکهێنانی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق[٣٣]، پرۆژەی دەستور درا بە سەرۆک ئەنجومەن بۆ تاوتوێکردن وپەسەندکردنی لەلایەن ئەنجومەنەوە، بۆ ئەم کارەش لیژنەیەک پێک هێندرا کە هەر لیوایەک بە ئەندامێک تێیدا بەشداری کرد نوێنەرێکی هەولێریش بەشداری لیژنەکە دەکات و لە ١٠ ی تەمموزی ١٩٢٤ پەسەند کرا[٣٤].

دوا بە دوای جێبەجێکردنی ئەرکەکانی ئەم قۆناغە کە ماوەی کاری یاسایی تا ٣ی ئابی ١٩٢٤ بەردەوام بوو و دواتر بە مەرسومی پاشایەتی هەڵوەشایەوە و بریاردرا کە

| ناوی لیوا | ژمارەی نوێنەرانی شار | نوێنەری هۆزەکان | نوێنەری مەسیحیەکان | نوێنەری یەهودیەکان | کۆی نوێنەرانی لیواکە |
|---|---|---|---|---|---|
| موسڵ | ٩ | ٢ | ٢ | ١ | ١٤ |
| کەرکوک | ٣ | ١ | ٠ | ١ | ٥ |
| سلێمانی | ٣ | ٢ | ٠ | ٠ | ٥ |
| هەولێر | ٧ | ١ | ٠ | ٠ | ٨ |
| کۆی گشتی | ٢٢ | ٦ | ٢ | ٢ | ٣٢ (٣٢) |

**خشتەی ژمارە (١)**

هەڵبژاردنێکی نوێ ئەنجام بدرێت و لە ٨ی تشرینی دووەمی ١٩٢٤ هەڵبژاردن ئەنجام درا[٣٥].

نوێنەرانی هەولێر کە بۆ ئەم خولەی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق دەچوون، لە پێنج ئەندام پێک هاتبوون (سەبیح نەشئەت بەگ، داود بەگ حەیدەری، یوسف ئیبراهیم ئەفەندی، ئیسماعیل بەگ رەواندزی، عەبدوڵلا موخلس بەگ) یەکەمین دانیشتنی ئەنجوومەن لە ١٦ی تەمموزی ١٩٢٥ ئەنجام دا و ماوەی ئەم خولەش تا ١٨ی کانوونی دووەمی ١٩٢٨ ی خایاند[٣٦].

ماوەی یەکەمی خولی ئەنجومەنی نوێنەران چەند ئەرکێکی چارەنووسسازی کەوتە پێش بۆ هەڵسەنگاندن و پەسەندکردن یان رەتکردنەوەی، سەبارەت بە هەڵوێستی نوێنەرانی هەولێر دەکرێت بڵێین کە بیروڕای جیاواز لە نێوان خودی نوێنەرانی هەولێر لە لایەک و لەگەڵ نوێنەرانی تر لە لایەکی تر هەبوو، بۆ نموونە لەم کاتەی حکومەتی (عبدالمحسن سعدون) پرۆژەی پەیماننامەی ١٩٢٢ی نێوان بەریتانیا و عێراق خستە بەر دەم ئەنجومەنی نوێنەران بە مەبەستی پەسەندکردنی هەر چەندە لە دانیشتنێکی نهێنیدا ئەندامەکان ئاگادار کران کە ئەگەر پەسەندی ئەم پەیماننامەیە نەکەن، ئەوا ویلایەتی موسڵ لە دەست دەچێت[٣٧]، بەم جۆرە لە ژێر فشاری ئینگلیزدا ئەنجومەنی نوێنەران پەیماننامەی ١٩٢٢ ی پەسەند کرد[٣٨]، بەڵام (داود حەیدەری) بە پێچەوانەی بیروڕای نوێنەرەکانی تری هەولێر لەگەڵ هەندێک ئەندامی ئەنجومەن دەنگی بۆ پەسەندکردنی ئەم پەیماننامەیە نەدا[٣٩].

جێگای ئاماژەیە کە نوێنەرانی هەولێر لە بەرژەوەندی بەریتانیا دەنگیان بۆ ئەم پرۆژەیە دا، بەڵام دواتر تووشی دڵەڕاوکێ هاتن چونکە حکومەتی عێراق هیچ پابەندبوونێکی بە پەیمانی کۆمەڵەی گەلان تێدا دەرنەدەکەوت سەبارەت بە مافەکانی کورد کە دوای پەسەندکردنی ئەم پەیماننامەیە مەندوبی سامی کاتی بەریتانیا لە عێراق (ب.هـ.بوردیلون) جەختی لە سەر جێبەجێ کردنی کردەوە[٤٠].

ئەندامانی کورد لە ئەنجومەنی نوێنەران کە ژمارەیان (١١) ئەندام بوون[٤١] یاداشتنامەیەکیان لە تشرینی دووەمی ١٩٢٦ ئاراستەی ئەنجومەنی نوێنەران و مەندوبی سامی کرد کە داوایان کرد کە ئیلتزاماتیان بەرامبەر بە کورد هەبێت و چەند پێشنیارێکیان خستە بەردەم ئەنجومەن، وەک دانانی دامەزراوێکی تایبەت بۆ بەڕێوەبردنی کوردستان کە بارەگاکەی لە هەولێر یان لە کەرکوک بێت و پەیوەندی لیواکانی کوردستان لەگەڵ بەغدا لە رێگای مەندوبی سامی بێت[٤٢]، هەر لە درێژەی هەوڵەکانی نوێنەرانی هەولێر (ئیسماعیل رەواندزی) و (جەماڵ بابان)(*) لەگەڵ چەند نوێنەرێکی کورد لە نیسانی ١٩٢٨ یاداشتێک بە مەندوبی سامی و سەرەک وەزیران دەدەن کە تێدا داوا دەکەن قەزای دهۆک بکرێتە لیوا و لەگەڵ لیواکانی (هەولێر و سلێمانی و کەرکوک) لە یەک یەکەی کارگێڕیدا رێک بخرێت و بودجەیەکی تایبەتی بۆ تەرخان بکرێت و لە لایەن سەرپەرشتیارێکی کورد بەڕێوەببردرێت و هەر لە رێگای سەرپەرشتیارەکەوە ببەسترێتەوە بە بەغدا[٤٣].

لە سەردەمی کابینەی دووەمی (جەعفەر عەسکەری ١٨٨٥-١٩٣٦) کە لە ٢١ی تشرینی دووەمی ١٩٢٦ تا ٨ی کانوونی دووەمی ١٩٢٨ی خایاند[٤٤]، بڕیار درا کە یاسای بەرگری نیشتمانی بخرێتە بەردەم ئەنجومەنی نوێنەران بۆ پەسەندکردنی کە ناوەڕۆکەکەی بریتی بوو لە (التجنيد الالزامي)، ئیسماعیل رەواندزی لەبارەی ئەم بڕیارە نووسراوێکی لە رۆژنامەی (الاوقات البغدادية) کە بەزمانی ئینگلیزی دەردەچوو لە ١٢ی تشرینی دووەمی ١٩٢٧ بڵاوکردەوە بە ناوی هەموو کورد کە تێیدا هاتووە:

"...تکایە ئەم وشەی داهاتوو کە لە بەرژەوەندی راستیدایە بڵاو بکەنەوە... لەبارەی کورد و تەجنیدی ئیجباری کە هەندێک پێیان وایە تەنها برایانی شیعە دژین، بەداخەوە بۆ کەسانێک کە خۆیان غافل کردووە لەم راستییەی ئێستا، کە تا ئێستا هەستیان پێ نەکردووە کورد دژی تەجنیدی ئیجبارییە، ئێمەی کورد پێمان وایە کە یاسای تەجنیدی ئیجباری سوودبەخش نییە و لەم کاتەشدا زەرەرو زیانی زۆری هەیە، وەک بۆمبێکی گەورەیە بۆ وڵاتە خۆشەویستەکەمان، هەر بۆیە داواکارین لە حکومەت کە چاوپۆشی لەم بیرۆکەیە بکات لەم کاتەدا"[٤٥].

کێشەی خوێندن لە کوردستان بە گشتی و لە هەولێر بەتایبەتی

تەوەرێکی تر بوو لە گرنگی پێدانی نوێنەرانی هەولێر لە کارەکانیان لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق، لەم کاتەی کە ژمارەی قوتابخانەکانی هەولێر لە (٦) قوتابخانە تێپەڕی نەدەکرد لە ساڵی ١٩٢٦ (ئیبراهیم یوسف ١٨٩٧-١٩٧١) بە مەبەستی زیادکردنی ژمارەی قوتابخانەکان لە هەولێر یاداشتێکی بەرز کردەوە بۆ وەزارەتی مەعاریف و داوا کرا کە قوتابخانەیەکیش بۆ خوێندنی کچان لە هەولێر بکرێتەوە[٤٦] هەروەها ئیسماعیل رواندزی لە یاداشتێکدا بۆ بەردەم ئەنجومەنی نوێنەران، پێشنیاری کردنەوەی قوتابخانەیەکی سانەوی کرد، لە هەولێر بۆ ئەوەی ئەو قوتابییانەی قۆناغی سەرەتایی لە هەولێرو ناوچەکانی دەوروبەری تەواو دەکەن، بتوانن لە هەولێر درێژە بە خوێندنیان بدەن، هەر لە یاداشتەکەیدا ئاماژە بە ژمارەی قوتابییانی دەرچووی قۆناغی سەرەتایی هەولێر و کۆیە دەکات کە لە سنووری (١٧) قوتابین، چونکە ژمارەیەک لە قوتابییان بە هۆی کەم دەرامەتی وازیان لە خوێندن هێناوە. ئەمەش لە وەڵامی بەڕێوەبەری گشتی مەعارف (ساطع الحصري) دەیخاتە روو چونکە بەڕێوەبەری گشتی مەعارف رەزامەندی خۆی پیشان نەدا بۆ کردنەوەی قوتابخانەیەکی سانەوی لە هەولێر بە بیانووی کەمی ژمارەی قوتابییانی دەرچووی قۆناغی سەرەتایی کە لە هەشت قوتابی تێپەڕ ناکات[٤٧].

داواکارییەکانی ئەندامانی هەولێر لەبارەی چاککردنی رەوشی خوێندن لە هەولێر و کوردستان



بەردەوام بوو لە دانیشتنەکانی خولی دووەمی ئەنجومەن کە ماوەکەی لە ١٩ی ئایاری ١٩٢٨ تا ١ی تەمموزی ١٩٣٠ خایاند، نوێنەرانی هەولێر لەم خولەدا پێک هاتبوون لە (جەمال بابان ١٨٩٣- ١٩٦٥، داود حەیدەری، مەعروف جیاوک، ئیسماعیل رەواندزی، عەبدوڵلا ئەفەندی موفتی)[٤٨]. جێگای ئاماژە پێکردنە ئەگەر بەراوردێک بکەین لە نێوان خەرجییەکانی شارەکانی عێراق و کوردستان بۆ خوێندن جیاوازییەکی زۆر گەورە بەدی دەکرێت کە شاری بەغدا ٣٨٪ ی بۆ خەرجی داندراوە لە داهاتی شارەکە بەڵام هەولێر ٣.٢٪ ی بۆ داندراوە ئەمەش بەڵگەی پشتگوێ خستنی حکومەتە لە بەرەو پێش چوونی خوێندن لە هەولێرو مانەوەی شارەکە لە دواکەوتوویی[٤٩].

مەعروف جیاوک لە دانیشتنی ژمارە (٣٥) ی رۆژی ٣٠ی ئابی ١٩٢٨ پێویستی ناوچەکانی باکوور و باشوور بە کردنەوەی خانەی مامۆستایان تێیدا خستە بەردەم ئەنجوومەن، چونکە بوونی خانەی مامۆستایان لە ناوچەکانی ناوەڕاستی وڵات بە تەنها دەبێتە هۆی ئابلوقەی خوێندنی باڵا لە یەک ناوچە، کە ئەویش بەغدا بوو، کە لە توانای خانەی مامۆستایان نەدەبوو کە هەموو ئەو قوتابییانەی باکوور و باشوور وەربگرێت کە داواکارییان پێشکەش دەکرد[٥٠]. دەکرێت بڵێین نەبوونی ئەم ئاستەی خوێندن لە ناوچەکانی باکووری عێراق (زۆربەی ناوچەکە بریتی بوو لە کوردستانی عێراق) لە دواکەوتوویی دەمایەوە لە بواری پێشکەوتنی زانستیدا.

مەعروف جیاوک کە یەکێک بوو لە ئەندامە چالاکەکانی ئەنجومەنی نوێنەران، لە کۆبوونەوەی رۆژی ٢٦ی ئابی ١٩٢٨ لەو کاتەی نوێنەری کوت (عەتا ئەلخەتیب) باس لە مووچەی (سەید تەها نەهری) قائیمقامی رەواندز دەکات و مەحمود رامزی نوێنەری بەغداش پشتگیری لێ دەکات، بەڵام لە کاتی گفتوگۆکاندا جیاوک پێی دەڵێت:

"... پێم وایە نوێنەری بەڕێز عەتا ئەلخەتیب نازانێ پایە و مەقامی بڵندی میری (کوردان) سەید تەها ئەفەندی چییە... سەید تەها پیاوێکی گرنگ و ناسراوە شوێنی تایبەتی لە ناو کورداندا هەیە، ئەگەر ئەو نەبوایە ئەو ناوچەیە ئێستا سەر بە وڵاتێکی تر بووە... من پێم وایە ئەگەر حکومەت سێ چوار هەزار روپیەشی بداتێ، هێشتا بۆ ئەو هەر کەمە"[٥١].

هەروەها لە دانیشتنی رۆژی ١ی ئەیلول مەعروف جیاوک باس لە مانگانەی (ساطع الحصري) دەکات و دەڵێت:

" تێناگەم چۆن ئەشێ ئەو پیاوە مانگی ١٢٠٠ روپیە وەرگرێ، واتە هەندی وەزیرێک، نازانم ئاخۆ ئەو کابرایە لە سەرانسەری جیهان و عێراق و هەموو گەردووندا بێ هاوتایە تا ١٢٠ روپیە وەربگرێ، کەچی زانایانی عێراق مانگی ٢٠٠ روپیە یا شتێک زیاتر وەربگرن"[٥٢].

هەروەها کاتێک کە ئەندامانی کورد باسیان لە دواکەوتوویی کوردستان دەکرد لە رووی ئابووری، زۆر لە رۆژنامەکانی بەغدا لە سەریان دەنووسین وایان دەردەخست کە ئەم قسانە بێگانە فێری کردوون ئەگینا پارەی زۆر لە کوردستان خەرج دەکرێت لە وەڵامی یەکێک لەم وتارانە کە لە رۆژنامەی (البلاد)ی بەغدادی بلاو کرابۆوە نوێنەری هەولێر مەعروف جیاوک دەنووسێت:

"ئەو نووسەرە ئەڵێ: ولاتی کورد، لەو پارەیەی خەزێنە دەستی ئەکەوێ، پارەیەکی زۆری تێدا سەرف کراوە. بابچێت سەیری بودجەی گشتی بکا، بزانی جگە لە دروستکردنی مەخفەر و قەڵا کورد چی تری لێ دیوە ؟ منیش دەڵێم شارەکانی کوردستان شت کڕین و فرۆشتنیان هەر لەگەڵ شارەکانی عێراقە، ئەویش چونکە بە هەرزان دەستیان دەکەوێت "[٥٣].

نوێنەرانی هەولێر و کەرکوک و سلێمانی لەبارەی خوێندن لە کوردستان داواکارییەکیان بۆ وەزارەتی مەعارف لە ١ی حوزەیرانی ١٩٢٨ بەرز کردەوە کە تێیدا داوایان دەکرد کە دەزگایەکی تایبەتی دابمەزرێت کە سەرپەرشتی خوێندن لە لیوا کوردییەکان بکات و لێژنەیەک دابندرێت بۆ دانانی کتێب و وەرگێڕانی و کردنەوەی پەیمانگای مامۆستایان و کردنەوەی قوتابخانە بۆ کچان و کردنەوەی قوتابخانەی سەرەتایی و سانەوی لە شوێنەکانی کە پێویستێتی[٥٤]. جێگای ئاماژەیە کە ژمارەی قوتابخانەکانی کوردستانی عێراق لە ساڵی ١٩٢٥ دەگەیشتە (٢٥) قوتابخانە، بەڵام تەنها (١٦) قوتابخانە خوێندن تێیدا بە کوردی بووە، لە بەر گرنگی زیاتر بە خوێندن بە زمانی کوردی ئەم بابەتە چەندان گفتوگۆی لە ئەنجومەنی نوێنەران لە سەر کرا لە لایەن نوێنەرەکانی کورد هەر لەم بارەیەوە (ئیسماعیل رواندزی) لە ٢ی ئاداری ١٩٢٦ ئەوەی خستە بەردەم ئەنجومەن کە حکومەت بڕیاری خوێندن بە زمانی کوردی جێبەجێ نەکردووە و داوای جێبەجێ کردنی دەکات، هەروەها (ئیبراهیم یوسف) لە ١٦ ی ئایاری ١٩٢٧ جەخت لە سەر مەسەلەی خوێندن لە کوردستان دەکاتەوە[٥٥]. (داود حەیدەری)(*) ئەندامی ئەنجومەن رەخنە لە سیاسەتی وەزارەت دەگرێت لەبارەی خوێندن بە زمانی کوردی لە کوردستان کە وا دەردەخات کە پرۆگرامەکانی خوێندن بە ئاسانی دێتە گۆڕین بە جۆرێک کە ساڵێک بە زمانی عەرەبی و ساڵێک بە زمانی کوردی و ساڵێک بە زمانی تورکی، کە ئەم گۆڕانکارییانەش لە سەر داوای لێپرسراو و موتەسەریف و کەسانی لەم جۆرە دێتە جێبەجێ کردن[٥٦]، رۆژنامەی "ژیان" رەخنە لە قسەکانی دەگرێت و ئەمەش دەردەخات کە دژی خوێندن بووە بە زمانی کوردی لە کوردستان وەک لە سەر زاری (داود حەیدەری) هاتووە و لە رۆژنامەی " ژیان " بلاوکراوەتەوە دەڵێت:

"... لە ئیدیعای لزوومی تەدریسات بە زمانی کوردی، مەعاریف بە هەموو هێزی خۆم تەنقید ئەکەم. لە ئەلویەی سەرودا مەعارف زۆر ناتەواوە، قوتابییەکانی ئەو ناوە نە بە کوردی و عەرەبی و نە بە تورکی ئەتوانن قسە بکەن..." [٥٧].

رۆژنامەی نابراویش رەخنە لە بیروڕای (داود حەیدەری) دەگرێت و دەنووسێت:

"... لە بەر ئەوەی ئەم قسانە لە زبانی مەبعووسێکی کوردەوە لە مەجلیسی میللەت دا بەیان کراوە و بۆ عالەمی کوردایەتی تەجاوزێکە، مەجبوور بووین کە بڵێین ئەم بەیاناتە لیسان حاڵی هیچ فەردێکی میللەت نییە، ئیلا جەنابی مەبعوس خۆی نەبێ"[٥٨].

هەروەها هەندێک لە دانیشتوانی رەواندز لە نووسراوێکیاندا کە ئیمزایان لە سەر کردووە و داوا دەکەن کە نوێنەری هەولێر (داود حەیدەری) ئەم هەڵوێستانە نەنوونێت چونکە وا دیار دەکەوێت کە ئاگاداری پێویستی و ئارەزووی میللەت نەبێت، ئەوانەی ئیمزایان کردووە بریتی بوون لە: (سەرۆکی شارەوانی محەمەد عەلی، سەرۆکی دەرگەڵە، محەمەد ئەمین، سەرۆکی باڵەک. شێخ محەمەد، ئەندامانی ئیدارە - مستەفا محەمەد سالح ئەفەندی، سەرۆکی زراری، ئەسعەد)[٥٩].

خولی سێیەمی ئەنجومەنی نوێنەران لە ١١ی تشرینی دووەمی ١٩٣٠ یەکەم دانیشتنی بەست و

بەردەوام بوو تا ٨ی تشرینی دووەمی ١٩٣٢ و نوێنەرانی لیوای هەولێر پێک هاتبوون لە: (ئیبراهیم یوسف، داود حەیدەری، سەلاحەدین بابان ١٨٩١-١٩٥٠، عەلی پاشا، مەعروف پیرداود دزەیی ١٨٨٩-١٩٨٥) (٦٠)، داکۆکییان لە سەر مەسەلەی بەکارهێنانی زمانی کوردی دەکرد کە ببێتە زمانی خوێندن و بەڕێوەبردن و دادگا، جەمال بابان لە دانیشتنی ڕۆژی ٢٣ ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٩ لەبارەی دەرکردنی ئەو ئەفسەرە کوردانەی کە زمانی عەرەبی نازانن لە وەزیری بەرگری (نوری سەعید) پرسی، بەلام وەلامی وەزیر نەبوو بە هۆی بروا پێهێنانی هەمووو ئەندامەکان هەر بۆیە (مەعروف جیاوک) داوا دەکات کە هۆکاری دەرکردنی ئەم ئەفسەرانە بۆ خانەنشین یان دەرکردنیان بە بێ مووچە روون بکرێتەوە(٦١) و جێگای ئاماژەیە کە حکومەتی عێراق یاسای زمانە ناوەخۆییەکانی لە ساڵی ١٩٣٠ دەرکرد و دواتر بە ژمارەی (١٩٧٤) لە ساڵی ١٩٣١ پەسەند کرا(٦٢).

### هەولێر و کێشەی موسڵ ١٩٢٥

کێشەی موسڵ یەکێکە لەم کێشانەی کە لە دوای تەواو بوونی شەڕی یەکەمی جیهانی (١٩١٤-١٩١٨) سەری هەڵدا، لە ئەنجامی هەرەسهێنانی سیاسی و سەربازی دەوڵەتی عوسمانی لە شەڕەکەو دروستبوونی شانشینی عێراق لە ساڵی ١٩٢١ لە ژێر چاودێری بەریتانیا(٦٣)، هێزە هاوپەیمانەکان لە کاتی مۆرکردنی ئاگر بەستی مودرۆس لە ٣٠ی تشرینی یەکەمی ١٩١٨ لە دووری (٣٢) کم بوون لە شاری موسڵ، بەلام دوای وەستانی شەڕەکە بە پێی هەردوو مادەی (٧)و (١٦) ی ئاگر بەستەکە هێزەکانی بەریتانی بەرەو شاری موسڵ کشان و لە ٧ی تشرینی دووەمی ١٩١٨ شارەکەیان داگیر کرد(٦٤).

بەم جۆرە ویلایەتی موسڵ کەوتە ژێر دەسەلاتی هێزە هاوپەیمانەکان و حاکمی سیاسی و ئیدارییان تێدا دامەزراند، بەلام حکومەتی تورکیا ویلایەتی موسڵی بە بەشێکی جیانەکراوە لە تورکیا دادەنا، ئەمەش لە بنەماکانی نیشتمانی تورکی (الميثاق الوطني التركي) دەردەکەوێت کە لە ئەیلولی ١٩١٩ بڕیاری لە سەر دراوە و تێیدا هاتووە " ئەو بەشانەی کە زۆرینەی عوسمانییە متوسلمانەکانی تێدا نیشتەجێیە، یەکگرتوون لە ئاین و رەگەز و ئامانجییاندا و خاوەن سۆزداری و رێزن و ئەم بەشانەش جیانابنەوە بە هەر هۆکارێکی مەنتقی و یاسایی بێت "(٦٥).

رژێمی تازەی دەسەلاتدار لە تورکیا پابەند نەبوو بە مەرجە ئیمزا کراوەکانی کە لە (پەیمانی سیڤەر) لە ١٠ی ئابی ١٩٢٠ مۆری کردبوو(٦٦)، لە ژێر چەند بیانوودک، مافی خۆی لە ویلایەتی موسڵ جارێکی تر و روژاند، بەلام دەسەلاتدارانی ئینگلیز لە عێراق بە تایبەتی (لۆرد کیرزون ١٨٥٩- ١٩٢٥)(*) بەرهەڵستی ئەم پروپاگەندانەی دەکردو لە هەمان کاتدا ئەمەی دیارخست کە زۆرینەی دانیشتوانی ئەم ویلایەتە کوردن و لە رووی ئابووریشەوە بەستراونەتەوە بە عێراق(٦٧)، شۆڕشەکانی کورد لە ماوەی سالانی ١٩٢٠-١٩٢٤ دەکات بە بەڵگەی ئەوەی کە کورد حەز بە دەسەلاتی تورک لە ولاتەکەی ناکات(٦٨)، هەروەها هیچ کاتێک دانیشتوانی ئەم ناوچەیە خۆیان بە بەشێک لە عێراقیش نەزانیوە، هەر بۆیە ئینگلیزەکان لەم بارەیەوە دەڵێن: " ئەم ناوچە ئیدارییەی کە بە شارەزوور ناسراوە کە کەرکوک و رانیە و هەولێر و رەواندز و کفری و کۆیە دەگرێتەوە بەشێک نییە لە عێراق "(٦٩).

دەوڵەتی تورکیا و (دەوڵەتی عێراق بە پاڵپشتی بەریتانیا) هەر یەکەیان بەردەوام لە هەوڵی ئەوددا



بوون کە کێشەکە بە بەرژەوەندی خۆی تەواو بکات بەڵام بە هۆی بیروڕای جیاواز و نارەزایی هەردوو دەوڵەت لە یەکتری و رێک نەکەوتنیان لە سەر چارەسەرکردنی کێشەکە بە بێ چارە مایەوە، کێشەی موسڵ بووە یەکێک لە باسە سەرەکییەکانی نێوان (عیسمەت پاشا) ی نوێنەری تورکیا و (لۆرد کیرزون) ی راسپێردراوی پاشانشینی یەکگرتوو لە (کۆنگرەی لۆزان) کە لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٢٢ دەستی بە کارەکانی کرد[٧٠]، بەڵام بە هۆی دووری بیروڕایەکان لە یەکتری و ئامادە نەبوونی تورکیا لە دەست هەڵگرتنی لە ویلایەتی موسڵ بۆ عێراق، کێشەکە لە کارنامەی گفتوگۆکانیان خرایە دەرەوە و لە کاتی وتووێژی دووەمی لۆزانیش کێشەی موسڵ وەک کۆسپی بەردەم ئیمزا کردنی رێکەوتنەکە لە نێوان تورکیا و هاوپەیمانەکان مایەوە، بەڵام دواتر ماوەی (٩) مانگ دیاری کرا بۆ ئەوەی هەردوو وڵات لە نێوان خۆیان بگەنە چارەسەر کردنی کێشەکە، بەڵام ئەگەر لەم ماوەیەدا نەیانتوانی چارەسەری بکەن، ئەوا کێشەکە بەرز دەکرێتەوە بۆ کۆمەڵەی گەلان[٧١].

دوای تەواو بوونی ئەو ماوەی دیاریکراو و مانەوەی کێشەکە بە بێ چارەسەری لە ٦ی ئابی ١٩٢٤ لەندەن لە سەر زاری وەزیری دەرەوەی داوای لە سکرتێری گشتی کۆمەڵەی گەلان کرد کە بە بێ دواخستن کێشەی موسڵ بخاتە بەردەم ئەنجومەن و لە ١١ی ئابدا بەڕێوەبەرانی کارگێڕی کۆمەڵە (کێشەی موسڵ) یان خستە ناو لیستی کاری ئەنجومەن و ئەندامانی کۆمەڵە و تورکیایان لێ ئاگادار کردەوە، و یەکەمین کۆبوونەوە لە بارەگای کۆمەڵەی گەلان لەبارەی کێشەی موسڵ لە ٢٠ی ئەیلولی ١٩٢٤ بەسترا [٧٢].

کۆمەڵەی گەلان بە مەبەستی بەدواداچوون و کۆکردنەوەی زانیاری و لە نزیکەوە ئاگادار بوون لە بیروڕا و سەرنجەکان بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێکی گونجاو بۆ کێشەکە لە ٣٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٤ بڕیار درا بە پێکهێنانی لێژنەیەکی تایبەت کە پێک هاتبوون لە (ام. دی. ڤیرسن)[٧٣] سەرۆکی لێژنە و بە ئەندامێتی هەر یەک لە (کونت تیلکی)[٧٤] و (أ. باولس)[٧٥]و ژمارەیەک سکرتێر و یاریدەری شارەزا بۆ لێژنەکە داندرا [٧٦]، کە پێک هاتبوون لە (کونت بورتالیس لە سویسرا - السنیور.بو.رو. لە ئیتالیا -المسیو کادیر لە فەرەنسا-المسیو دید لە سویسرا- کرافۆر- رۆژهەلاتناسی هۆلەندی- جەواد باشا نوێنەری تورکیا)[٧٧].

بەم جۆرە لێکۆڵینەوە لە هەموو ئەو بەڵگانەی کە پەیوەندی هەبوو بە لایەنی جیاوازی ژیانی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی و ئابووری لە ویلایەتی موسڵ بوو بە ئەرکی لێژنەی (کۆمەڵەی گەلان)، بۆ گەیشتن بە راستییەکانیش دەبوایە سەردانی ناوچەکە بکەن و لە نزیکەوە پەیوەندی لەگەڵ نوێنەرانی دەستەو چینی جۆراوجۆری دانیشتوانیدا بکەن[٧٨]، جێگای ئاماژەیە پێش ئەوەی لێژنەکە بگاتە شاری هەولێر هەر یەک لە (حکومەتی عێراق و ئینگلیزەکان) و حکومەتی تورکیا کەوتنە هەوڵی بەهێز کردنی هەڵوێستیان بەرامبەر بە کورد، و ئینگلیزەکان لەم بوارەوە توانییان سوود لە هەندێ کەسێتی کورد وەربگرن وەک (بەکر سدقی ١٨٩٠ - ١٩٣٧) بۆ بڵاوکردنەوەی پروپاگەندەکانیان لە ناوچەکە و هەوڵدان بۆ سەرنج راکێشانی دانیشتوانەکەی بۆ بڕیاردان لە سەر مانەوەیان لەگەڵ عێراق[٧٩]، لە درێژەی هەوڵەکانی حکومەتی عێراق لە کانوونی دووەمی ١٩٢٥ وەزیری ناوخۆی عێراق (عەبدولموحسن سەعدون (١٨٨٠-١٩٢٩) سەردانی شاری هەولێر دەکات و هەر لە کاتی ئامادەبوونیدا لە هەولێر لە سەر پێشنیار و رەزامەندی بەریتانیا و بە ئامادە بوونی بەرپرسە سیاسییەکانی ئینگلیز و ناودار و گەورە بەرپرسانی ئیداری شارەکە کۆنگرەیەک بە مەبەستی سەرنج راکێشانی دانیشتوانی هەولێر بەسترا و لەم کۆنگرەیە چەند بڕیارێک درا کە هەندێک تایبەت بوو بە شاری هەولێر و هەندێک پەیوەندی بە کوردستان هەبوو لە پێناو بڕیاردانی دانیشتوانی هەولێر بۆ مانەوەیان لەگەڵ عێراق[٨٠]، لە گرنگترین بڕیارەکانی کۆنگرەی هەولێر بریتی بوو لە:

"... بژاردنەوەیەکی کەمی هۆزە کوردە زیان لێکەوتووەکانی ئەو هێرشانەی بۆ وریا کردنەوەی هێزەکانی بەریتانی و عێراقی دژی کورد کردیانە سەر شێخ مەحمود و مەلیک فەیسەڵ سەردانی ناوچەکە بکات تا زەمانەت بداتە کورد لە سەر پێدانی مافە نەتەوەییەکانیان لە چوارچێوەی عێراقدا، و

دەسەڵاتدارانی ویلایەتەکە لە بەشە کوردییەکان دەسەڵاتی زیاتریان پێ بدرێت بۆ ئاسانکاری کاروبار و هێڵی ئاسن لە کوردستان دابندرێت وەک متمانەی کورد بە ئینگلیز کە ناوچەکە بەجێ ناهێڵێت و لە کۆتایی کۆنگرەکە لە سەر هەندێ ڕێوشوێنی بە پەلە ڕێکەوتن بۆ بەرەنگاری هەر هەوڵێکی تورکی لە ناوچەکە لە ماوەی کارکردنی لیژنەکە کە نائارامی دروست بکات "[٨١].

شا فەیسەڵی کوڕی حوسێن (١٨٨٣ - ١٩٣٣) بە مەبەستی لە نزیکەوە ئاگادار بوون و چاوپێکەوتنی بە ناودارەکانی هەولێر و هاندانیان لە پێناو دەنگدانیان بۆ مانەوە لەگەڵ عێراق لە ١٩ی کانوونی ١٩٢٤ بۆ یەکەمین جار سەردانی شاری هەولێر دەکات بە مەبەستی پێشوازیکردن، قوتابییانی شار لە ڕێگای موسڵ دادەنێن، چونکە لە ڕێگای موسڵەوە دێت و قوتابییەکان جل وبەرگی دێدەوانی لەبەردەکەن و سروودی نیشتمانی دەڵێنەوە و دوای ئەوەی ڕێوڕەسمی ئۆتۆمبێلەکان دەگاتە بەر دەرگای سەرای هەولێر لە لایەن چەندان کەسایەتی هەولێرو پیاو ماقوڵان و سەرۆک هۆزەکان و پیاوانی ئاینی و کەسایەتی نیشتمانی پێشوازی لێدەکرێت[٨٢]، شەویش مەلیک میوانی مەلا فەندی دەبێت لە گوندی باداوە[٨٣] و بۆ بەیانی دێتە شار و بەردی بناغەی نەخۆشخانەی ئەمیر غازی دادەنێت و دواتر نوێژی نیوەڕۆ لە مزگەوتی قەڵات دەکات[٨٤] و ئاڵای عێراق بۆ یەکەمین جار لە سەر دام ودەزگای ڕەسمی حکومەت هەڵدەکات[٨٥]، و باس لە گرنگی دانیشتوانی هەولێر دەکات لە دەنگدانیان بۆ مانەوە لەگەڵ هەولێر و بە دیارخستنی دابینکردنی مافەکانی کورد لە چوارچێوەی عێراق. هەر بە مەبەستی دیدەنی مەلیک مەلا محەمەدی کۆیە، ناسراو بە (مەلای گەورە) سەردانی هەولێر دەکات و باس لە بارودۆخەکە دەکەن کە ئایا لەگەڵ عێراق بمێننەوە یان لەگەڵ تورک[٨٦]. دەکرێت بڵێین سەردانی (شا فەیسەڵ) بۆ هەولێر جێبەجێکردنی یەکێک لەم بڕیارانە بوو کە لە کۆنگرەی هەولێر بڕیاری لەسەر درا و بەڵێنیکیشە بۆ جێبەجێیی هەموو ئەو بڕیارانەی کە لە کۆنگرەکەدا هاتبوو.

ئینگلیزەکان لە درێژەی هەوڵەکانیان بۆ دەستەبەرکردنی دەنگدانی خەڵکی هەولێر کەوتنە بانگەشەی ئەو کەسانەی کە دۆستایەتییان لەگەڵ تورک هەبوو و ئاگاداریان کردن کە ناڕەزاییان دژی تورک بەرامبەر بە لیژنەکە دەربڕن، جێگای ئاماژەیە کە ئەم بانگەشە و هەڕەشانەی بەرپرسانی ئینگلیز بەرفراوان بوو بە ڕادەیەک کە بووە هۆی ئەوەی هەندێک لە کەسایەتییە سیاسی و ئاینییەکان ناڕەزایی دەربڕن وەک (شێخ ئەحمەدی بارزانی) کە لە ١٠ی ئاداری ١٩٢٥ ناڕەزاییەکی ئاڕاستەی حکومەتی عێراق کرد و ئاماژە بەمە دەکات کە ئەگەر شاڵاوی ئەم هێرشانە نەوەستێت، ژمارەیەک لە هۆزەکان ناچار دەبن بە کۆمەڵ بەرەو تورکیا بڕۆن[٨٧]، هەروەها لە کاتی کارکردنیان لیژنەکەش سکاڵانامەیەکیان خستە بەردەم بەرپرسانی ئینگلیز و حکومەتی عێراق بەرامبەر بە هەڕەشەکانی دەکرێتە سەر ناودار و پیاوماقووڵان و پیاوانی ئاینی و سەرۆک هۆزەکان ئەوانەی دۆستایەتییان لەگەڵ تورکدا هەبوو بۆ نموونە سەید ئەحمەدی خانەقا (١٨٦٨ - ١٩٥٢) یان لە کەرکوک دەستگیر کرد[٨٨].

سەبارەت بە هەوڵەکانی تورکیاش بەر لە هاتنی لیژنەکە بۆ ویلایەتی موسڵ کەوتنە جێبەجێکردنی چالاکییەکانیان، بۆ نموونە چەندین نامە و نووسراویان بە هێمای تایبەت بۆ لایەنگرانیان لە هەولێر ڕەوانە دەکرد، بە مەبەستی جێبەجێکردنی ئەرکەکانیان لە شارەکە، بەڵام هەندێکیان بەر لەوەی بگاتە دەست خاوەنەکانیان دەستگیر دەکران[٨٩]، هەر لە میانی چالاکییەکانی تورک لە هەولێر لیژنەیەکی نهێنی دۆستی تورک پێک دەهێندرێت کە ئەندامەکانی دۆستی تورک بوون لە هەردوو شاری هەولێر و کەرکوک وەک (فەتاح بەگ و نازم تووتنچی)، و بەردەوام هەوڵیان دەدا کە سەرنجی خەڵکەکە ڕابکێشن بۆ ئەوەی هاوسۆزی خۆیان لەگەڵ تورکدا ڕابگەیەنن، و یەکێک لە چالاکییەکانیان بڵاوکردنەوەی بەیاننامەیەک بووە لە هەولێر لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٢٥ کە لە بەشێکیدا هاتووە:

"...ئەی موسڵمانانی کورد، ئەوانەی حکومەتی ئینگلیز وا دەزانێ حورمەتی ئایین و محەممەد نازانن بۆ مەبەستی شەڕ و دوژمنکاری لە نێوان ئەم دوو کۆمەڵەیە (کورد و تورک)،

حوکمی خۆجێیان داناوە ئەمەش بە تەنهـا بۆ خـزمـەتی بەرژەوەندی خـۆیان...بێ ئاگـا لەوەی کـورد و تورک برای ئایینی یەکـتـر و یەک ئومەتن.کاتێک بەریتانییەکان بەم راستییەیان زانی، حوکمی زاتییان هەڵوەشـاندەوە و بە تۆپ ناو شـاری سلێمـانییـان بۆردومـان کـرد، منداڵەکانیان کوشتن و کەلوپەلیان وێران کردن....تورکان دەگەڕێنەوە بۆ رزگـارکردنی ئێوە لە کـافران....بە لێژنەکە (لێژنەی لێکۆڵینەوە) بڵێن ئێمە موسڵمانین، پێکەوە لەگەڵ تورکە موسڵمانەکان دەژین، ئەوانەی خزمەتی ئیسلام دەکەن، نامانەوێ لەگەڵ عەرەب و کافران بژین...ئەگەر هاوکـاری حکومـەتی عـێراق بکەن، دەبنە هاوپەیمانی عەرەب و کافران... پەشیمانی دادتان نادات... "[٩٠].

هەر چەندە ئەم بەیاننامـەیە بووە هۆی وروژاندنی سـۆزی ئـاینی دانیشـتوانی شـارەکە لە لایەک و ئاگاداربوونەوە لە مەترسی پشتگیری ئینگلیـز بۆ کـورد و دوای بڵاوبوونەوەی بەیاننامـەکـە چەندین پروپاگەندە لە هەولێرو ناوچەکانی تر لە ویلایەتی موسڵ بڵاوبۆوە لەبارەی چالاکی هێزەکانی تورک لە ناوچەکە، بەڵام لە رووی کـرداری، هیچ ئەنجامێکی نەبوو[٩١]، جێگای ئاماژە پێکردنە هەر لە کاتی کاری لێژنەکە بە هەزاران پەنابەری کـورد سنووری تورکـیایان بەزاند بۆ ناو سنووری ویلایەتی مـوسڵ و باسـیـان لە دڕندەیی سیاسەتی تورک دەکرد[٩٢].

سەرەتای کارەکانی لێژنەکە لە کۆتاییەکانی تشرینی دووەمی ١٩٢٤ بە سەردانی لەندەن دەستی پێکرد، و لە سـەرەتاکـانی ١٩٢٥ گـەیشـتنە ئەنقەرە و لە ١٦ ی کانوونی دووەمی ١٩٢٥ گەیشـتنە شاری بەغدا و تا ٢٧ی هەمـان مـانگ مـانەوە، لەم مـاوەیە چاویان کـەوت بە بەرپرسە سیاسی و سەربازییەکانی بەریتانی و کـاربەدەسـتانی حکومـەتی عـێراق و سـەردانی چەندین وەزارەت و دام وەدزگایان کرد و رۆژی ٢٧ی کانوونی دووەم لێژنەکە گەیشتە شاری موسڵ و بنکەی سـەرەکی مـانەوەیان لەم شارە رێکخـست[٩٣]، جـێگای ئامـاژەیە (سـەبیح نەشـئـەت)[*] ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق لە لیوای هەولێـر وەک نوێنەری حکومـەتی عـێراق بۆ کـارکردن لەگـەڵ لێژنەکە دەستنیشـان کرا و (جەواد پاشا)ش نوێنەرایەتی حکومـەتی تورکـیـای دەکرد[٩٤].

شـاری مـوسڵ بوو بە بنکەی سـەرەکی لێـژنەکـە و بۆ گـەیشتن بە ناوچەکانی ویلایەتەکە و لێکۆڵینەوە لەگـەڵ دانیـشـتوانی ناوچە دوور و نزیکەکـان چەند لێـژنەیەکی فـەرعی پێـک هێنران، بە لێـژنەی هەولێـر لە (کونت بول تلکی) سەرۆکی لێژنەو بە ئەندامـێتی هەر یەک لە ئەفـسـەری سـەربازی ئینگلیـز (لیـونزو) وناظم بەگ و وەرگـێرێک بە ناوی (کرامرز) پێـک هاتبـوو، دوای گـەیشـتنی لێژنەکەش بە شـاری هەولێـر (میـجر لاین)[*] بەرپرسی ئینگلیز لە شارەکە پەیوەندی بە لێژنەکە دەکات[٩٥].

هەولێر ئەو شارەی کە پێکهاتەی دانیشتوانی زۆرینەی کورد و تورکمان و عـەرەب و مـەسیـحی و جوولەکـەی تێـدا دەژیا بە رێژەی جـیـاواز، و بەرپرسـەکـانی حکومـەت و سـەرۆکی دام وەدەزگـاکـانی حکومـەت زۆربەیان کـورد و لە دانیـشـتـووی شـارەکـە بوون[٩٦]، لێـژنەکـە بۆ مـاوەی دوو هەفتە لە شارەکە و ناوچەکانی سەر بە لیـوای هەولێـر مانەوە و چاویان بە زۆر لە کـەسێـتی و ناودارانی ناوەوە ودەرەوەی هەولێـر کـەوت وەک (مـەلا فـەندی، قـادر مـیـران بەگ، مـەلای گـەورەی کـۆیە) و لێـژنەکـە سـەردانی هۆزەکانی دزەیی و خـۆشناو و کورە و گەردی و شـێخ بزێنی کـوردی کـرد[٩٧] ئەدموندز کە دواتر دەبێتە یەکێک لە ئەندامەکانی لێژنە فـەرعییەکەی کە هاتۆتە هەولێر لەبارەی گـەیشتنی بە هەولێر دەڵێت:

"... کـاتێـک ئێـوارەی ئەو رۆژە ئەگـــەڕام بە هـاوڕێـتی (بـاولس و بورتالییە) لە بازاڕ وکۆڵانەکانی قەڵا ئارامـیــیـەک تێـدا بەدی دەکـرا لە بینینـی ئێـمـــە و وەڵامـی پرسـیـارەکانمان، کە خـاوەن کارەکـان خەریکی کاری رۆژانەی خۆیان بوون، هیـچ سـەرسـوڕمـانێک لێـیـان بەدی نەدەکرا.... لەم ش-وەدا (میـجەر لاین و لیـتلدیل) بانگهـێـشـتی نان خواردنی ئێوارەی کردین لە ماڵەکەی خـۆیدا کە دەکـەوتە دەرەوەی شـار لە هەمـان کاتدا مـوتەسـەریف (ئەحمـەد عوسمـان) هەڵسا بە میواندارێکردنی چاودێرە تورکەکان... " [٩٨].

سەبارەت بە دەرەنجامەکانی کاری لێـژنەکـە لە لیـوای هەولێـر بە شـێـوەیەکی گـشـتی زۆرینەی دانیشتوان لەگەڵ گەڕانەوەی حوکمی تورکـدا نەبوون کـە جـارێکی تر حوکمڕانی وڵاتەکەیان بکاتەوە[٩٩]، بەڵام سـەبارەت بە شـاری هەولێـر هەڵوێستی دانیـشـتوانەکـەی یەک

هەڵوێست نەبوو و جیاوازییان لەگەڵ یەکتردا هەبوو سەبارەت بە مانەوەیان لەگەڵ عێراق یان جارێکی تر گەڕانەوەی تورک بۆ شارەکە، هەندێ لە سەرۆک هۆزەکان داوای ئەوەیان دەکرد کە دەوڵەتێکی کوردی لە ژێر چاودێری بەریتانیا دابمەزرێت چونکە ئەم چینە بەوە رازی نەبوون کە لەگەڵ عێراق و تورک بژین[١٠٠]، بەڵام دەتوانین بڵێین بە هۆی نەبوونی ئەم پرسیارە لە لایەن لێژنەکە دەنگی ئەم کەسانە کە دەتواندرێت بە زۆرینە دابندرێت لە هەولێر و کوردستان بە گشتی بە فیڕو چوون. هەندێکیش لە دانیشتوانی هەولێر لەگەڵ ئەوەدا بوون کە لەگەڵ عێراقدا بمێننەوە و مافەکان لە چوارچێوەی عێراقدا بەدی بهێندرێت، جێگای ئاماژەیە (مەلا فەندی) کە یەکێک لە زانا بەناوبانگەکانی هەولێر بوو، لە کاتی دەنگدانەکەدا رۆڵێکی گەورەی بینیوە کە خەڵکی هەولێر دەنگ بە مانەوەیان لەگەڵ عێراق بدەن[١٠١]، چونکە سەبارەت بە ئاماری پێکهاتەی رەگەزی هەولێر بە دوو جۆر بەدیار کەوتووە، یەکەمیان بریتییە لەو ئامارەی کە حکومەتی بەریتانیا لەساڵی ١٩٢١ کە پێشکەشی کۆمەڵەی گەلانی کردووە کە لە لایەن کۆمەڵەی گەلان خراوەتە ناو ئەو راپۆرتەی کە تایبەت بوو بە ویلایەتی موسڵ و دووەم ئامار بریتی بوو، لەو ئامارەی کە کارگێری حکومەت لە هەولێر لە ساڵی ١٩٢٩ دەری خستووە و بریتییە لە سەرژمێرییەکی دانیشتوانی هەولێر وەک لەم خشتەیەدا هاتووە: بڕوانە خشتەی ژمارە (٢)

وەک لەم خشتەیە دەردەکەوێت، ئەم جیاوازییەی کە لە نێوان هەردوو ئاماردا هەیە بە تایبەتی لەبارەی بوونی ژمارەی تورکمان لە شارەکە لە ساڵی ١٩٢٩ کەمترە لە ساڵی ١٩٢١ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ خوێندنەوەیەکی هەڵە لە لایەن ئینگلیزەکان بۆ ئەم مەسەلەیە لە هەولێر و هەروەها فەرمانبەرانی ئینگلیز وئەو گەشتیارانەی کە سەردانی ئەو ناوچەیەیان کردووە، زانیاری هەڵەیان لە یاداشتەکانیان تۆمار کردووە، چونکە بە پێی ئامارێکی ساڵی ١٩٢٤ ژمارەی تورکمانەکانی هەولێر بە (٣٠٠٠) کەس دادەندرێت کە بە بەراورد زۆر کەمترە لە ئاماری ساڵی ١٩٢٩ کە لە لایەن کارگێڕی هەولێر تۆمار کراوە و زیاتر متمانەی لە سەر دەکرێت. هەر سەبارەت بە دابەشبوونی رەگەزی لە هەولێر جێگری مەندوبی سامی گشتی لە عێراق لە راپۆرتێکیدا ئەوە دەردەخات کە کردنەوەی دۆسیەی دابەشکردنی رەگەزی لە ناوچە کوردییەکان لە نێوان کورد و عەرەب و کەمینەکانی تر، دەبێتە هۆی ئاڵۆزبوونی کێشەکە، نەک چارەسەرکردنی چونکە لەو کاتە کورد مافی ئەوەی دەبێت کە ناوچەکانی خوارووی رۆژهەڵاتی کەرکووک و باکووری رۆژئاوای لیوای موسڵ بکات و لە کۆتایی راپۆرتەکەدا ئەوە دەردەخات کە لیوای هەولێر وەک لیوای سلێمانی لیوایەکی کوردییە و بوونی عەرەب تێیدا زۆر کەمن کە کەوتوونەتە ناوچەیەکی بچووک لە گوێڕ وگەڕەکێکی بچووک لە ناوەوەی شار، سەبارەت بە تورکمانەکانی هەولێریش دەڵێت لە قەڵات نیشتەجێ بوون، هەروەها ئەوەش دەردەخات کە هەرسەهێنانی دەرەبەگایەتی کاریگەری خراپی لە سەر بوونی زۆری تورکمان لە ناوەوەی هەولێر کرد، بۆیە هیچ بوارێک لە ئارادا نییە کە ئەم شارە لە سەر بنەمای رەگەزی دابەش بێت، سەبارەت بە بوونی ئەم ژمارە کەمەی عەرەبیش نابێتە بنەمایەک بۆ بەعەرەبکردنی شارەکە[١٠٢].

هەروەها هۆکاری ئابووریش فاکتەرێکی گرنگ بوو بۆ پەسەند کردنی بیروڕای مانەوەی ویلایەتی موسڵ لەگەڵ دەوڵەتی تازەی عێراق[١٠٣]، چونکە پەیوەندییە ئابوورییەکان لە نێوان هەولێر و شارەکانی عێراق بە تایبەتی بەغدا و شاری موسڵ (ئەو کات نەخرابووە سەر عێراق) پەیوەست بوو بە ژیانی دانیشتوان وبازرگانیکردنیان لەگەڵ ئەو شارانە بە تایبەتی بازرگانیکردنی بەروبوومە

| ساڵ | کورد | تورکمان | عەرەب | مسیحی و جوولەکە | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٩٢١ | ٧٧٠٠٠ | ١٥٠٠٠ | ٥١٠٠ | ٨٩٠٠ | ١٠٦٠٠٠ |
| ١٩٢٩ | ٨٧٤٢٩ | ٩٦٤٤ | ٤١٤٨ | ٥٣٧٦ | ١٠٦٥٩٧ |

**خشتەی ژمارە (٢)**

کشتوکاڵییەکان و ئاژەڵییەکان کە هەولێر و ناوچەکانی دەوروبەری پێی بەناوبانگ بوو، سەرەڕای ئەوەی کە چەند فاکتەری تر رۆڵی بینی لە پەسەندکردنی بیرۆکەی مانەوە لەگەڵ عێراق وەک هیوای بەرەوپێشچوونی ئاستی ئابووری و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری لە هەولێر لەسایەی نەمانی حوکمی عوسمانییەکان و هاتنە کایەوەی حکومەتێکی نوێ لە عێراق[١٠٤]، بەڵام سەبارەت بەوانەی کە دۆستایەتی تورکیان هەبوو لە هەولێر دەنگیان بۆ ئەوە دا کە ویلایەتی موسڵ بخرێتەوە سەر تورکیا[١٠٥]، بەڵام ئەم رێژەیەی کە دەنگی بۆ گەڕانەوە بۆ سەر تورکیا دا هەر چەندە بەرامبەر بە رێژەی دانیشتوانی هەولێر زۆر بوو، بەڵام بە بەراوردکردن لەگەڵ رێژەی گشتی لیوای هەولێر لە ئاستێکی زۆر نزمدا بوو.

جێگای ئاماژەیە لە کاتی کارکردنی لیژنەکە لە هەولێر بە نووسراوێکی نهێنی لە ٤ ی شوباتی ١٩٢٥ وەزیری ناوخۆی عێراق داوای کرد لە (عەبدولعەزیز قەساب) موتەسەریفی موسڵ کە بە بەردەوامی پەیوەندی بە موتەسەریفی هەولێر بکات و لە کارەکانی لیژنەکە ئاگادارمان بکاتەوە[١٠٦]، موتەسەریفی هەولێر رۆڵی دیاری گێڕاوە و لەکاتی سوورانەوەی لیژنەکە لە شارەکە نووسراوێکی بە نهێنی بلاوکردۆتەوە لە ناو پیاو ماقوولان و سەرۆک هۆزەکان کە تیایدا ئەم پرسیارانەی روون کردۆتەوە کە لە لایەن لیژنەکە پێشکەش بە دانیشتوان دەکرێن و لە هەمان کاتدا وەڵامەکەشی دیار کردبوو کە رازی بوون بە مانەوە لەگەڵ عێراقدا، ئەم کارەی موتەسەریفی هەولێر لە لایەن (روشدی بەگ) نوێنەری حکومەتی تورک لە کۆمەڵەی گەلان لە ٣ی ئەیلول ١٩٢٥ لە کاتی گفتوگۆکردن لە سەر راپۆرتی لیژنەکە رەخنەی لێ گیرا بە پێشێلکاری کاری لیژنەکەی دانا[١٠٧].

بەم جۆرە دوای تەواوبوونی کاری لیژنەکە لە هەولێر و ناوچەکانی دەوروبەری هەولێر راپۆرتێکی تێروتەسەل لەمەڕ بارودۆخەکە ئامادە کرا و لەگەڵ راپۆرتی کۆتایی لیژنەکە بەرز کرایەوە بۆ کۆمەڵەی گەلان، دوای تاوتوێکردنی راپۆرتەکەو هەڵسەنگاندنی و دەرخستنی بیروڕایە جیاوازەکان لە سەری، کۆمەڵەی گەلان لە دانیشتنی رۆژی ١٦ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٥ بڕیاری بە لکاندنی ویلایەتی موسڵ بە دەوڵەتی تازەی عێراق دا[١٠٨]، دوای دەرچوونی بڕیارەکە بەرێوەبەری شارەوانی هەولێر (عەبدوللای کوڕی عەبدولرەحمان موفتی) برووسکەیەکی سوپاسنامەی ئاراستەی (ئیمری)[*] کرد بەرامبەر بە هەوڵەکانی و بەرگریکردنی لە کێشەکە بۆ بەرژەوەندی عێراق[١٠٩]، هەروەها نوێنەری لیوای هەولێر لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق (ئیسماعیل رواندزی) بۆ هەمان مەبەست سوپاسنامەیەکی ئاراستەی (ئیمری) کرد[١١٠]، بەم جۆرە لەم مێژووەوە هەولێریش بوو بە بەشێک لە دەوڵەتی تازەی عێراق قۆناغێکی نوێ لە مێژووی ئەم شارەش دەستی پێکرد.

**هەولێر و پەیماننامەی ١٩٣٠**

ماوەی دوای چارەسەرکردنی کێشەی موسڵ تا ساڵی ١٩٣٠ بە ئارامییەکی رێژەیی دادەندرێت، هەر چەندە پەیماننامەی ساڵی ١٩٢٦ ی نێوان حکومەتی عێراق و بەریتانیا ئەو مەرجەی تێدا بوو کە ماوەی ئینتدابی بەریتانی (٢٥) ساڵ درێژ دەبێتەوە بەڵام لە ساڵی ١٩٢٧ پەیماننامەیەکی تازەیان مۆر کرد کە بە پێی ئەم پەیماننامەیە بەریتانیا پابەند دەبێت بە بوونی عێراق بە ئەندام لە کۆمەڵەی گەلان، بەڵام بە هۆی ناکۆکییەکانی نێوان عێراق و بەریتانیا کە پەیوەست بوون بە سەربازگیری ئیلزامی و باری دارایی و بوونی عێراق بە ئەندامی کۆمەڵەی گەلان پەیمانەکە پەسەند نەکرا[١١١].

سەبارەت بە هەڵوێستی حکومەتی عێراق لەمەڕ جێبەجێکردنی مافە ئیداری و رۆشنبیرییەکانی کورد هیچ هەنگاوێکی گرنگ ئەنجام نەدرا کە ناوەرۆکی بڕیاری کۆمەڵەی گەلان بگرێتەوە، ئەم هەڵوێستەی حکومەتیش بووە هۆی ئەوەی کە ئەندامانی هەولێر لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق (جەماڵ بابان و ئیسماعیل رەواندزی) لە نیسانی ١٩٢٨ یاداشتێک ئاراستەی سەرەک وەزیران و مەندوبی سامی بەریتانیا بکەن کە چەند داواکارییان تێدا خستە روو بۆ جێبەجێکردنی، چونکە فەرامۆشکردنی مافەکانی کورد و بەڵێنەکانی حکومەت بوون بە شتێکی هەست پێکراو[١١٢]، هەروەها سەبارەت بە رەوشی خوێندن و پێشخستنی لە کوردستان هەر یەک

له (مەعروف جیاوک، جەماڵ بابان، عەبدوڵڵا فەندی) یاداشتیان پێشکەش بە وەزارەتی مەعاریف کرد.[١١٣]

حکومەتی عێراق هەر چەندە مەبەستی دانان نەبوو بە مافەکانی کورد لە کوردستانی عێراق، بەڵام هەندێک هەنگاوی سەرەتایی نا وەک دیارخستنی باشی مەرامەکانی بەرامبەر بە کورد، لەوانەش کردنەوەی فەرمانگەیەکی تایبەت بە کورد بۆ خوێندن کە مەڵبەندەکەی لە کەرکوک بوو دوای ئەوەی فەرمانگەی فێرکردنی هەولێر جیاکرایەوە لەگەڵ فەرمانگەی فێرکردنی موسڵ، و چەند قوتابخانەیەک کرانەوە لە شارەکە[١١٤]، هەروەها هەولێر لە بواری تەندروستیدا جۆرێک پێشکەوتنی بەخۆوە دیت و چەند پزیشک هێندرانە هەولێر لەوانە (د. ریچ جونسن) کرا بە سەرۆکی تەندروستی هەولێر و د. محەمەد خان کە بە رەچەڵەک هیندی بوو،[١١٥]، هەروەها لە کاتی سەردانی مەلیک فەیسەڵ بۆ هەولێر بەردی بناغەی نەخۆشخانەیەکی نوێ لە ناوەوەی شاردا داندرا[١١٦]، و لە بواری ئاوەدانیدا لە ساڵی ١٩٢٩ تەلاری سەرای هەولێر دروست کرا[١١٧]، هەروەها یاسای زمانە خۆجێیەکان لە ١٠ی نیسانی ١٩٣٠ دەرکرا بەم بۆنەیەش سەرۆکی شارەوانی هەولێرو سەرۆکی شارەوانی سلێمانی لە ١٧ی نیساندا پیرۆزباییان ئاراستەی یەکتر کرد[١١٨] ولە ساڵی ١٩٣١ پەسەند کرا وەک زمانی رەسمی ناوچە کورد نشینەکان[١١٩].

هاوکات لەگەڵ ئەم کارانەش حکومەت لە هەوڵی بەستنی پەیماننامەیەکی نوێ بوو کە دوارۆژی پەیوەندییەکانی لەگەڵ بەریتانیادا دەستنیشان بکات، دوای دەستپێکردنی گفتوگۆکان لە ٣٠ی حوزەیران گەیشتنە رێکەوتن و پەیماننامەکە مۆر کرا[١٢٠]. ئەوەی جێگای ئاماژەیە لە هیچ بەندێکی پەیماننامەکەدا باس لە مافەکانی کورد نەکراوە و ئەمەش بووە هۆی نارەزایی کورد بە گشتی. لە دانیشتنی ژمارە (٢٦) دەمینی خولی دووەمی ئەنجومەنی نوێنەران لە ١٣/٢/١٩٣٠ مەعروف جیاوک نوێنەری هەولێر لەبارەی بنچینەکانی ئەم پەیماننامەیە کە لە لایەن حکومەتی عێراقەوە داندراوە بۆ بەستنی پەیماننامەی ١٩٣٠ و ئەو مەرجانەی کە کۆمەڵەی گەلان دانی پێدانابوو لەبارەی ناوچە کوردییەکان رووی پرسیاری لە سەرەک وەزیران ناجی سویدی دەکات و پێی دەڵێت:

" تکام وایە ئەم پرسیارانە لە سەرەک وەزیران بکرێت بۆ ئەوەی بە دەم، لەبەر دەم مەجلیسی بەرزدا وەڵامیان بداتەوە. ئەو بنچینەو رێوشوێنانە چین کە حکومەت دایناون بۆ گفتوگۆی ویستراو بۆ بەستنی پەیمانە تازەکە ؟ ئایا هیچ ئیعتیرازی لە سەر ئەم مەرجانە هەیە کە کۆمەڵەی گەلان لە بابەت ناوچەکانی سەروو سەلماندوویەتی؟ ئایا حکومەت بەتەمایە لە ناواخنی پەیماننامەکەدا جێگیری بکا؟ هەر وەکو خوالێخوشبوو عەبدولمحسن سەعدون بەگ لە ساڵی ١٩٢٦ لە بەردەمی مەجلیسی بەرزدا پشتیوانی لێکرد"[١٢١].

دوای وەڵامی سەرەک وەزیران جارێکی تر رەخنەی لێ دەگرێت و دەڵێت:

"... وەڵامی پایەبەرز سەرۆکی وەزیران ناتوانێ نە من و نە مەجلیسی بەرز قانیع بکات. لێرەدا روونی دەکەمەوە کە هەندێک ماف هەن کۆمەڵەی گەلان سەلماندوویەتی و حکومەتی عێراقیش سوورە لە سەر پشتیوانی و چەسپاندنی، لەو مافانە کە خوێندن لە هەموو ناوچەکانی سەروو بە زمانی کوردی بێ و فەرمانبەرەکان لەو کوردانە بن کە بە باشی کوردی دەزانن بۆ ئەوەی خەڵک و فەرمانبەران لە یەکتری تێبگەن. باوەڕم وایە ئەو بڕیارانە خراونەتە نێو قانونی ئەساسییەوە کە سوێندمان بۆ پشتیوانی خواردووە هەروەها خراونەتە ناو پەیماننامەی ساڵی ١٩٢٢ ئەم مافانە یەکگرتووی عێراق دابین ئەکا "[١٢٢].

هەروەها لە کاتی پەسەندکردنی پەیماننامەکە لە ئەنجومەنی نوێنەران و نوێنەرانی هەولێر (ئیبراهیم یوسف، داود حەیدەری، صلاح الدین بابان، عەلی پاشا، مەعروف حاجی پیرداود) رەزامەندییان لەسەر پەسەندکردنی پەیماننامەکە دا[١٢٣].

دەتوانین بڵێین هەڵوێست لە هەولێر لەبارەی پەیماننامەی ١٩٣٠ لە دوو لایەنەوە سەرچاوە دەگرێت، یەکەمیان ئەوانەی ئەندامانی نوێنەران بوون لەگەڵ پەیماننامەکەدا بوون کە هۆکارەکەی دەگەڕایەوە بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان لە چوارچێوەی حکومەتدا و فەرامۆشکردنی مافەکانی گەلی کورد

کە ئەوان نوێنەرایەتییان دەکرد، دووەمیان هەڵوێستی نارەزایی ئەم چین و توێژانە بوو، کە لە چوارچێوەی رێکخراوە نهێنییەکان و ئەو کۆمەڵانە بوون کە لقیان لە هەولێر هەبوو وەک کۆمەڵەی پشتیوانی و ئەو رۆشنبیرانەی هەولێر کە لە شاری بەغدا لە یانەی سەرکەوتن کاریان دەکرد، هەمان هەڵوێستی دژایەتی پەیماننامەکەیان هەبوو. هەروەها ئەشرافەکانی هەولێر لە برووسکەیەکدا لە ٣٠ی تەمموزی ١٩٣٠ کە ئاراستەی ئەشرافی سلێمانی دەکەن، تێیدا جەخت لە سەر مافە نەتەوەییەکانی کورد دەکەنەوە لە پەیماننامەی نوێی نێوان عێراق و بەریتانیا.[١٢٤]

دوای ئەوەی حکومەت هەڵبژاردنی ئەنجومەنێکی نوێی راگەیاند، کۆمەڵەی پشتیوانی کوردان لە ٩ی تەمموز بەیاننامەیەکی راگەیاند کە لە سەرەتای بەیاننامەکەدا نووسراوە " بۆ هەموو لقەکانی ک.پ.ک " و لە ناوەرۆکی بەیاننامەکەدا هاتووە کە پێویستە کورد بەشداری لە هەڵبژاردنی نوێ نەکات لەبەر ئەوەی ناتوانین دان بە رژێمێکدا بنێین کە دان بە مافەکانماندا نەنێت، جێگای ئاماژەیە هەر یەک لە (مولازم کامل حەسەن، مولازم رەووف ئەفەندی، رەئیس ئەوەل مەحمود جەوەدەت، رەئیس ئەوەل ئەحمەد فەخری، بەشیر موشیر، رەووف ناوێک) لە ئامادەکارانی بەیاننامەکە بوون[١٢٥].

دوای ئەوەی (دەستەی نیشتمانی)[*] لە ١٦ی تەمموزدا بەشداری هەڵبژاردنەکانی نەکرد لە سلێمانی، دانیشتوانی هەولێریش هەمان هەڵوێستی وەرگرت لە تەمموزی ١٩٣٠ بەشداری هەڵبژاردنی نوێنەرانی نەکرد، هەروەها ناودارانی هەولێر برووسکەی پشتگیری و یارمەتییان بۆ هەڵوێستی شاری سلێمانی بەرز کردەوە و هەر بۆ هەمان مەبەست مەزبەتەیەکیان ئاراستەی (دار الاعتماد البريطاني) کرد[١٢٦].

هەر لە درێژەی هەوڵە نارەزاییەکان لە هەولێر لە دژی پەیماننامەی ١٩٣٠ ئەندامانی کۆمەڵەو رێکخراوەکان هەوڵی شکست پێکردنی چالاکییەکانی حکومەتیان لە شارەکەدا داوە، بۆ نموونە لەو کاتەی دەستەیەکی لاسایی (تمثيل) بە سەرۆکایەتی (حقی شبلي) بە رەزامەندی حکومەت بە فەرمی دێتە هەولێر و بە ئامادەبوونی بەرپرسانی شارەکە لە ئێوارەی گەیشتنیان هەوڵی نمایشکردنی چالاکییەکان دەبن بەڵام (ئاسف و ئەحمەد خواجە) پیاوێکی زۆر کۆدەکەنەوە و رێگا نادەن خەڵکەکە بچنە شوێنی دیارکراو و لە هەمان شەودا چەند دەسترێژێک دەکرێت بە سەر شوێنی پۆلیسی سوارە و باری شارەکە تێک دەچێت، موتەسەریف (حەمید سەرسەر)و بەرێوەبەری پۆلیس (درويش لطفي) دەکەونە ئامادەباشی و سەربانی سەرا بە متراليوز هەر چوار لایان تەنی و ئەحمەد خواجە لە یاداشتەکانیدا دەڵێت "بێ حکومەتی ماوەی بیست و دوو رۆژی خایاند"[١٢٧].

لەبارەی ئەو خواستنامەی کە کوردەکانی هەولێر نووسیبوویان بۆ داواکردنی سەربەخۆیی (لامەرکەزی) شاکر فەتاح لە یاداشتەکانیدا لەبارەی هەڵوێستی مەعروف جیاوک دەڵێت:

"... لە ساڵی ١٩٣٠ مەعروف جیاوک ئەو خواستنامەیەی کە کورد پەروەردەکانی هەولێر نووسیویانەتەوە بۆ سەربەخۆیی (لا مەرکەزی) ی کورد، لە (ئەحمەد ئەفەندی) ی گەورەی ئاغاکانی هەولێری سەندووە بە هەرەشە کە ئەگەر نەیدا گیانی دەردەهێنرێ، پاشان داویەتی بە راسپێرراوی هەرە گەورەی ئینگلیز..." [١٢٨].

حکومەت بۆ ئاساییکردنەوەی رەوشەکە لە کوردستان شاندێکی ناردە کوردستان کە پێک هاتبوون لە (جەعفەر عەسکەری- جێگری سەرەک وەزیران، مێجەر یونگ، کانیا هولت- وەکیلی حاکمی سیاسی لە سلێمانی، جەماڵ بابان- وەزیری داد)[١٢٩].

لە رۆژی ٩ی ئابدا شاندەکە گەیشتە هەولێر و لە باڵەخانەی موتەسەریفییەی هەولێر لە لایەن حەمید سەرسەر پێشوازی کران و لە هەمان رۆژدا کۆبوونەوەیەک لەگەڵ ناوداران و ئەشراف و سەرۆک هۆزەکانی هەولێر بەرێوەچوو کە لە سەر داوای موتەسەریف ئامادە بوون، لەوانە (خدر ئەحمەد پاشا، ئیسماعیل رەواندزی، مەعروف جیاوک) و چەندانی تر[١٣٠]، جێگای ئاماژەیە پێش ئەوەی کۆبوونەوەکە ئەنجام بدرێت هەر یەک لە (ئیسماعیل رەواندزی و مەعروف جیاوک و ئەحمەد ئەفەندی) لەگەڵ سەرۆک هۆزەکان و کەسایەتی و ئەشرافەکانی هەولێر کۆدەبنەوە لە

مالی (حاجی سەعید ئاغا)(١٣١).

مێجەر یونگ و جەعفەر عەسکەری لە کاتی گفتوگۆکاندا بە ناوی حکومەتی عێراقەوە ئەو بەیاننامەیەیان بۆ ئامادەبووان خوێندەوە کە تێیدا جەختیان لە سەر ئەوە کردەوە کە بەڵێنەکانی بە کورد دراون جێبەجێ دەکرێن، تەنانەت ئەگەر دوای ساڵی ١٩٣٢ بێت، جێگای ئاماژەیە شاندی حکومەت مەبەستی لەوە بوو کە ئەگەر عێراق ببێتە ئەندام لە کۆمەڵەی گەلان ئەوا پابەند دەبێت بە جێبەجێکردنی بەڵێنەکانی کە بە کورد دراوە و کورد وا هەست نەکات کە مافەکانیان دەخرێتە پشتگوێ. ئەم بیرو بۆچوونەی کورد جموجۆڵێکی سیاسی لە کوردستاندا دروست کرد کە لە هەموو لاوە خەڵک خرۆشان و رووناکبیر و سەرەک هۆزەکان چەندین برووسکەیان ئاراستەی مەندوبی سامی و مەلیک و سەرەک وەزیران کرد(١٣٢)، مێجەر یۆنگ لە بەشێکی بەیانەکەیدا دەڵێت:

"... وەکو بۆم بەدیار دەکەوێ، هەندێ کەسی نامەسئول پروپاگەندەیان بڵاوکردۆتەوە کە حکومەت هاندەری نەتەوەخوازیەتی کوردە، ئەمە بە تەنها حکومەتی عێراق ناخاتە قەیرانەوە بەڵکو ئێران و تورکیای دۆستیش دەخاتە قەیرانەوە. ئەمە زۆر لەو راستییەوە دوورە و کەس نییە لە بەرامبەرم تا بۆ ئایندەش سیاسەتی لەو جۆرە بداتە پاڵ بڵاوکەرەوەی ئەو پروپاگەندەیە هەڵەیەکی گەورەی ئەنجام داوە..."(١٣٣).

جەعفەر عەسکەری هەر لە میانی کۆبوونەوەکەدا ئەوەی دەرخست کە مۆرکردنی پەیماننامەی ١٩٣٠ هیچ گۆڕانێکی بە سەر سیاسەتی حکومەتدا نەهێناوە بەرامبەر بە مافەکانی کورد لە کوردستانی عێراق وەک لە بەشێکی قسەکانیدا هاتووە: "... حکومەتی عێراقی سوورە لە سەر ئەو بەڵێنانەی بە کوردی داوە، بە کردەوەش بە هێندی هەڵدەگرێ، ئەمەش بە مەبەستی رەزامەندی خواستەکان بە برایانمان...و رایدەگەیەنم بۆ دەست پێکردنی کردەیی بۆ دانانی یاسای زمانی کوردی و خستنە باری جێبەجێکردن.دەبێت بە دڵنیایی هەست بکەین بەریتانیا و حکومەتی عێراق بە تەواوی رێککەوتوون لە سەر ئەو سیاسەتەی ئێستا من رامگەیاند..." (١٣٤).

دوای خستنە رووی بیروبۆچوونی حکومەت لە لایەن شاندەکە، ئەحمەد ئەفەندی داوای کرد کە رێگا بدەن بە سەرۆک هۆزەکان قسە بکەن، چونکە ئەوانیش مەزبەتەیان ئاراستەی مەندوبی سامی و حکومەتی عێراق کردبوو، (خدر ئەحمەد پاشا) لە جیاتی سەرۆک هۆزەکان بیروڕاکانی دەرخست و جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە هەموو هۆزەکانی هەولێر لەگەڵ داواکارییەکانی شاری سلێمانین و ژیان و مردنمان لەگەڵ ئەواندایە و داوای کرد کە نابێت هەر سێ لیوای کەرکووک و هەولێر و سلێمانی لە یەک جیا بکرێتەوە(١٣٥).و دواتر ئەحمەد بەگ هەڵسا وتی "ئیمە کوردین حقوقی خۆمان ئەوێ بەندە چەند ساڵە لە خزمەتی حکومەتام و تێگەیشتووم کە کورد بە عومری لە سەر حقوقی خۆی ئیصرار ئەکات و ئەم حەقە بە قەراری عیسبەتول ئومەم دامەزراوە، پێویستە بماندرێتێ "و لە سەر ئیعتیراز و تەئسیری جەعفەر پاشا پێی وت " پاشا تۆ بۆ عەرەبەکان دوو پەنجەت دانا، ئێمەش حەقی خۆمانە لە رێی ئەم حەقە میللییەمانا روحی خۆمان فیدا بکەین کەس حەقی عیتابی نییە و قەراری عیصبەتول ئومەم ئەوەیە، لوغەتی کوردی رەسمی بێت، ئێمە بۆ ئەم حەقە موسیررین"(١٣٦).

سەبارەت بە هەڵوێستی (ئیسماعیل رەواندزی) رەخنەی لە وتەکانی شاندی حکومەت گرت دەربارەی کاتی جێبەجێکردنی بەڵێنەکانیان کە بە کوردیان داوە و ئەوەی روون کردەوە کە جێبەجێکردنی بەڵێنەکان چ بەیانی بێت، یان دە ساڵی تر یان هەتا هەتایێ بێت هەر بە دوارۆژ دادەندرێت(١٣٧). هەروەها مەعروف جیاوک کە لە سەرەتادا رێگای ئامادەبوونی کۆبوونەوەکەی پێ نادرێت، بە هۆی دیارخستنی هەڵوێستەکانی بە تایبەتی لە کاتی کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی نوێنەران، بەڵام دواتر بەشدار دەبێت و رەخنە ئاراستەی قسەکانی جەعفەر عەسکەری دەکات و دەڵێت:

(.... جەعفەر پاشا چاکی ئەزانێ ئێمە لە کولکی عەرەبا مومکین نییە بە شێوە (صورت)ی تەوحید بژین... فەقەت بە سورەتێکی وەکو ئوستریا و مەجارستان بژین... و هەموو کەسێک ئەمەی ئیدراک کردووە، میللەت لە حاڵی ئینتیباهدایە. لە پاش ئەمە جەریدەکانی بەغدا هاوار

ئەکەن، ئێمە عەرەبین و حکومەتمان عەرەب. دەبێ وەکو ئەرمەنییەکانیان لێ بکەین. ئیتر مومکین نییە پێکەوە بژین.....)

جێگای ئاماژەیە قسەکانی مەعروف جیاوک بووە هۆی تووڕە بوونی وەکیلی سەرەک وەزیران و پێی وت حەقت نییە ناوی عەرەب بینی هەروەها مەندوبی سامی پرسی ئەوەی کرد لە قسەکانی مەعروف جیاوک کە ئایا مەبەستی لە ئەجنەبی کێیە لە وەڵامی مەندوبی سامیدا وتی "ئەجنەبی یەعنی ئێوە: ئینگلیز، وە دەڵێم ئەوەیە کە پار ساڵ ئەم جەماڵ بابانە، کە دانیشتوە کە وەزیرە بە مەزبەتە داوای حقوقی میللی کرد. بۆ دیسان بەم تەرحە ئیهتمامیان ئەکرد بچینەوە سەر حقوقمان جەنابی فەخامەت مەئاب وەکیلی مەندوبی سامی چاک ئەیزانی کە حکومەتی بەریتانیا بە شەرەفی خۆی تەعەهودی کردبوو کە موقەرەراتی عیسبەتول ئومەم تەطبیق بکات ئیستا هەموو کوردێک مونتەزیرە ئەمینە کە حکومەتی بەریتانیا تەعەهودی خۆی دێنێتە جێ. زۆر ئارەزوو دەکرا کە جەعفەر پاشا لە باتی ئەو کاغەزەی لە جانتاکەی دەری دەهێنێ، موقەرەراتی عوسبەتول ئومەمی لەگەڵ خۆی بهێنایە و عەلەنەن بیخوێندایەوە کە هەموو کەس تێی بگەیشتایە "(١٣٩)، قسەکانی مەعروف جیاوک دەبێتە هۆی سەرنج ڕاکێشانی ئامادەبوان و جەعفەر پاشا لەگەڵ مەندوبی سامی و موفەتیشی ئیداری کەوتنە سرکەسوک و موفەتیشی ئیداری چووە دەرەوە و پرسیاری ئەوەی کرد کە مقەرراتی عسبەتول ئومەم چییە. دواتر لە ناو فایلەکدا موقەرەراتی عوسبەتولئومەم تەسلیم بە مەندوبی سامی دەکات، جێگای ئاماژەیە کە پێشتر جەعفەر پاشا موسیر بوو لە سەر ئەوەی کە قەرارەکە ناڵێت مەئمورەکانی کورد و وەرگیرێدرا ئاشکرا بوو بووە هۆی شلەژاو بوونی جەعفەر پاشا(١٤٠). دەکرێت بڵێین هەڵوێستی ئامادەبووان تا رادەیەک هاو هەڵوێست بووە بەرامبەر بە شاندی حکومەت لە پێناو بەدیهێنانی مافەکانی کورد.

دوای گەڕانەوەی لیژنەکە بۆ بەغدا چەند بڕیارێکیان دەرکرد کە تیایدا چەند کەسایەتییەکی کوردیان لە کارەکانیان لابرد و هەندێک بڕیاری دەستگیرکردنیان درا و چەندین پروپاگەندەیان بە ناوی ئاین دژ بە داواکارییە نەتەوەییەکانی کورد بلاوکردەوە(١٤١).

گەشتی هاوبەش (یونگ و عەسکەری) بۆ هەولێر و شارەکانی تری کوردستان نوشستی هێنا و نەبووە هۆی چارەسەر کردنی بارودۆخی کوردستان، بەڵکو رەوشەکەی ئاڵۆزتر کرد، بەجۆرێک کە بە درێژایی مانگی ئەیلولی ١٩٣٠ باری گرژی پێویستی بە گرێک هەبوو بۆ تەقینەوە بەڵام ئەوەی جێگای ئاماژەیە، بڕیاری ئەنجامدانی هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی نوێنەران ئەو بڵێسەی گرگرتنی دابین کرد، دوای ئەوەی ئەنجومەنی خۆجێیەتی لە سلێمانی کە ئەندامانی نەتەوەدخوازانی کورد دەستیان بەسەردا گرتبوو بڕیاریاندا بۆ نوێنەرانی عێراق بەشداری هەڵبژاردن نەکەن، بەڵام دوای ئەوەی لە ٦ی ئەیلوولدا بە پێی یاسای هەڵبژاردن (٣٠) کەس لە پیاوماقوڵانی سلێمانی بانگ کران بۆ بارەگای حکومەت بۆ دیاریکردنی لیژنەی چاودێری، بەڵام جەماوەر لە شەقامەکان بە دروشمی دژی هەڵبژاردن دەهاتن بەرەو خانەی حکومەت (دار الحکومة) کە لە ئەنجامدا رووبەڕوو بوونەوە لە نێوانیاندا روویدا و چەند کەس تێیدا کوژرا و بریندار بوون (١٤٢) سەبارەت بە هەڵوێستی هەولێر لە ڕووداوەکانی ٦ی ئەیلولی شاری سلێمانی دژ بە هەڵوێستی حکومەت وەستان و بە پێی بەڵگەنامەیەکی بەریتانی کە لە ١٤ی ئەیلول لە لایەن پشکێنەری ئیداری هەولێر ئاراستەی (کنهان کورنوالیس) راوێژکاری ئینگلیز لە وەزارەتی ناوەخۆی عێراق کراوە، تێیدا هاتووە کە خەڵکی هەولێر داوا دەکەن کە بەشداری هەڵبژاردن نەکەن ئەمەش وەک هەڵوێست وەرگرتنێک بووە دژی حکومەت(١٤٣).

**پەراوێزەکان:**

(١) عبدالرزاق الحسني، العراق في دوري الاحتلال والانتداب، ج(١)، ص ٢٥.

(٢) ماجد عبدالرضا، المسالة الكردية في العراق حتي عام ١٩٦١، بغداد، ١٩٧٠، ص٤٨.

(٣) عبدالرزاق محمد اسود، المصدر السابق، مج (٢)، ص٣٦٢.

(٤) عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، ج(١)، ص١٥.

(٥) المصدر نفسه، ص ٤١.

(٦) ادموندز، المصدر السابق، ص١٠٩، خليل مصطفى، المصدر السابق، ص٦٦.

(٧) بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی کۆنگرەی

قاهیره بڕوانه: سها طارق الجبوري، مؤتمر القاهرة والاستراتيجية البريطانية في العراق، مجموعة باحثين (مفصل في تاريخ العراق المعاصر)، بغداد، ٢٠٠٢، ص٢٤٥.
(٨) عبدالرزاق محمد اسود، المصدر السابق، ص ١٤٦.
(٩) کوردستانی عێراق لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا، بەشی (١)، ل ١٢.
(١٠) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: م. ر. هاوار، شێخ مەحمودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، چ (١)، لندن، ١٩٩١، بەرگی یەکەم، ل٩٥-٩٦.
(١١) کاندید کراوەکان (عەبدلرەحمان نەقیب، عەبدالهادی ئەلعومەری، طالب نەقیب، لە ناوەوەی عێراق و برهان الدین کوری سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم، اغا جان- والی پشتکوەی ئێران، شێخ خزعل - ئەمیری محمرە، ئەمیر عبدالعزیزی حاکمی نجد، یەکێک لە بنەماڵەی میسر) بوون. بڕوانە: عبدالرزاق محمد اسود، المصدر السابق، مج (٢)، ص ٤٦٨.
(١٢) لەبارەی هەڵبژاردنی ئەمیر فەیسەڵ رۆڵی سیاسی لە عێراق بڕوانە:عبدالمجيد كامل، الملك فيصل الاول ودورة في تاسيس الدولة العراقية الحديثة، بغداد، ١٩٩١.
(١٣) سی.جی.ادموندز، المصدر السابق، ص ١١١.
(١٤) م.ر.هاوار، سەرچاوەی پێشوو، بەرگی دووەم، ل١٠٨.
(١٥) کریم شارەزا، زانای گەورەوناوداری کورد مەلا فەندی ١٨٦٣-١٩٤٢، هەولێر "گۆڤار"، ژ(٣)، هاوینی ١٩٩٩، ل٨٢.
(١٦) کریم شارەزا، هەولێر و دەنگدانی بۆ مەلیک فەیسەل ویلایەتی موسل، بارش "گۆڤار"، ژ(١٧)، ٢٠٠٤، ل ١٢٨-١٢٩.
(١٧) م. ر. هاوار، سەرچاوەی پێشوو، بەرگی دووەم، ل١٠٥
(١٨) خليل مصطفى، المصدر السابق، ص ٧٨، کریم شارەزا، زانای گەورەو ناوداری......، ل٨٢.
(١٩) السر برسی کوکس، تكوين الحكم الوطني في العراق، ت: بشير فرجو، ط(١)، ١٩٥١، ص٥١-٥٢، عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات....، ج(١)، ص ٦١، عبدالمجيد كامل، المصدر السابق، ص٤٥.
(٢٠) چاوپێکەتن لەگەڵ پ. د. ارسن موسی رشید لە ٢٠٠٧/١١/٧.
(٢١) خليل مصطفى، المصدر السابق، ص ٧٨.
(٢٢) م. ر. هاوار، سەرچاوەی پێشوو، بەرگی دووەم، ل١١٥.
(٢٣) هەمان سەرچاوە، ل ١٢١.
(٢٤) محمد مظفر الادهمي، مجلس التاسيسي العراقي، ط(١)، بغداد، ١٩٧٢، مج (٢)، ص١١-١٩، عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات....، ج(١)، ص٧٤.
(٢٥) المصدر نفسه، ص ١٨٤، ١٧٤، ١٤٩.
(٢٦) لەبارەی پرۆگرامی کارەکانی وەزارەتەکە بڕوانە: المصدر نفسه، ص ١٨٩ - ١٩١.
(٢٧) م.ر.هاوار، سەرچاوەی پێشوو، بەرگی دووەم، ل١٢٤.
(٢٨) سی. جی. ادموندز، المصدر السابق، ص ١١١، محەمەد رسول هاوار، سەرچاوەی پێشوو، بەرگی دووەم، ل٢٨٢-٢٨٦.
(٢٩) خليل مصطفى، المصدر السابق، ص ٩٢.
(٣٠) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات....، ج(١)، ص ٧٤- ٧٨.
(٣١) محمد مظفر، المصدر السابق، ج(٢)، ص٤١١، نوشیروان مستەفا ئەمین، ژیان بە تەمەنترین رۆژنامەی کوردی ١٩٢٦-١٩٣٨، چ(١)، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل ٩٦.
(٣٢) خليل مصطفى، المصدر السابق، ص٩٧-٩٨.
(٣٣) عبدالرزاق الحسني، العراق في ظل المعاهدات، ط(٣)، لبنان، ١٩٧٨، ص ٩٨-٩٩، أحمد محمدامين قادر، موقف مجلس النواب العراقي من القضية الكردية في العراق ١٩٢٥- ١٩٤٥، ط(١) سليمانية، ٢٠٠٧، ص ٥٠.
(٣٤) خليل مصطفى، المصدر السابق، ص ١١٧.
(٣٥) المصدر نفسه، ص ١١٧- ١٢٠.
(٣٦) نوشیروان مستەفا ئەمین، ژیان بە تەمەنترین....، ل ١٠٧.
(٣٧) خليل مصطفى، المصدر السابق، ص ١٢٤.
(٣٨) لەبارەی پەیماننامەکانی نێوان عێراق و بەریتانیا بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، العراق في ظل المعاهدات، ط(٤)، بغداد، ١٩٨٠.
(٣٩) عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات......، ج(٢)، ص ٤٥.
(٤٠) عبدالرزاق الحسني، العراق في ظل....، ص ١٣٢-١٣٣.
(٤١) بڕوانە ناوەکانی ئەندامەکان لە: خليل مصطفى، المصدر السابق، ص ٩٩.
(٤٢) نوشیروان مصطفى امين، كردستان

العـــراق (عـــصــــر القلم والمراجـعـات)١٩٢٨- ١٩٣١، ترجـمـة: حـمـه سـالح گـلالي، السليمانية، ٢٠٠٠، ص٢٤.
(*) کەسایەتییەکی کوردە لە ساڵی ١٨٩٣ لە شاری بەغدا لە دایک بووە و لە ساڵی ١٩١٤ خوێندنی مافی تەواو کردووە و چالاکی رۆشنبیری هەبووە و گۆڤارێکی بە ناوی "بانگی کورد "بە هەردوو زمـانی کـوردی و تورکی دەرکــردووە و چەند جـارێک بە نوێنەری هەولێر هەڵبـژێردراوە و بووە بە ئەندام لە ئەنجـومـەنی نوێنەرانی عێراق و لە یەکەمین کابینەی وەزاری نوری سعید (١٨٨٨-١٩٥٨) کراوە بە وەزیری داد و لە سـاڵی ١٩٦٥ مردووە. بڕوانە: میر بصري، المصدر السـابق، ٢١٨-٢١٩، عـبـدالرزاق الحـسني، تاريخ الوزارات...، ج(٣)، ص٧.
(٤٣) بۆ زیاتر زانیـاری لەبارەی ناوەرۆکی یاداشتەکە بڕوانە: عبدالفتاح علي يحيي البوتاني، وثائق عن الحركة القومية الكردية التحررية، ط(١)، اربيل، ٢٠٠١، ص ٥٦.
(٤٤) لەبارەی پێکهـاتەی وەزارەتەکـە بڕوانە: عـبـدالرزاق الحسني، تاريخ الـوزارات......، ج(٢)، ص ٨٥-٨٦.
(٤٥) عـبـدالرزاق الحـسـني، تاريخ الوزارات...، ج(٢)، ص ١٠٠.
(٤٦) احمد محمدامين قـادر، المصدر السابق، ص ٧٣.
(٤٧) المصدر نفسه، ص ٧٥.
(٤٨) نوشـيـروان مـصطفی، ژیان درێژترین...، ل١٦٠.
(٤٩) نوشيروان مـسـتـەفـا، کـوردسـتـانی عـێـراق (سـەردەمی قـەڵەم و موراجەعات)، چ(١)، سلێمـانی، ١٩٩٩، ل١٨.
(٥٠) معروف چیاوک، نیابتی (١٩٢٨-١٩٣٠)، ط(١)، بغـداد، ١٩٣٧، ص٨٨.
(٥١) کـمـال مـەزهەر ئەحـمـەد، چەند لاپـەڕەیـەک....، بـەرگـی دووەم، ل ٤٨٢-٤٨٣.
(٥٢) هەمان سەرچاوە، ل ٢٨٣-٢٨٤.
(٥٣)) نوشيروان مـسـتەفـا، کوردستـانی عێراق...، ل١٩.
(٥٤) نوشيروان مصطفى امين، كردستان العـــراق....، ص ٢٢، أحـمـد محمدامين، المصدر السـابق، ص ٨٠-٨١.
(٥٥) المصدر السابق، ص ٨٥.
(*) کـوڕی ئیـبـراهیم حەیدەری یە کـە لە ســاڵانی دوا دوایی حـوکـمـڕانی عـوسـمـانیـیـەکان نازناوی (شـێخ ئیسلام) وەردەگرێت، داود حەیدەری لە ساڵی ١٨٨٦ لە هەولێر لە دایک بووە و لە سـاڵی ١٩٠٨ خـوێندنی مافی لە استنبول تەواو کردووە و لە ساڵی ١٩٢١ دەگەڕێتەوە عێراق و دەبێـتـە ئەندامی ئەنجـومـەنی دامەزراندنی عێراق لە ساڵی ١٩٢٤ و لە چوار خولی یەکەمی ئەنجومەنی نوێنەران دەبێتـە ئەندام، لە سـاڵی ١٩٦٥ مردووە. بڕوانە: میر بصري، اعلام الكرد، ص١٨٩.
(٥٦) احمد محمدامين، المصدر السابق، ص ٨٩.
(٥٧) نوشـيـروان مـسـتـەفـا، ژیان درێژترین....، ل ١٣٢.
(٥٨) هەمان سەرچاوە، ل١٣٢.
(٥٩) بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣٤.
(٦٠) عـبـدالرزاق الحـسـني، تاريخ الـوزارات....، ج(٣)، ص ٨٣-٨٤.
(٦١) خليل مصطفى، المصدر السابق، ص ١٠٦-١٠٧.
(٦٢) بڕوانە دەقی یاسـاکـە لە: فـريد اسـرد، المسالة الكردية بعد قانون ادارة الدولة العـراقـيـة، ط(١)، السليمانية، ٢٠٠٤، ص ١٢٠-١٢٣.
(٦٣) فـاضل حـسـين، مشكلة الموصل (دراسة في الدبلوماسية العراقية - الانكليزية - التركية وفي الراي العام)، ط(٣)، بغداد، ١٩٧٧، ص ٢٣.
(٦٤) جرجيس فتح الله المحامي، يقظة الكرد (تاريخ سـيـاسي ١٩٠٠ - ١٩٢٥)، ط(١)، اربيـل، ٢٠٠٢، ص١٢٣، المس بيل، المصدر السابق، ص ١٥٤.
(٦٥) خليل مصطفى عثمان، المصدر السابق، ص ١٠١.
(٦٦) لە نێوان تورکیـا و هاوپەیمانەکان بەسـتـرا مـافـەکـانی کـورد لەم پەیمانـامـەیە لە بەندی (٦٤، ٦٣، ٦٢) دیاری کـرا. بۆ زیاتر زانیـاری بڕوانە: بلەچ شـێـرکـو، کـێـشـەی لەمـێـژینە و ئێـسـتـای کـورد، و: مـحـەمـەد حـەمـە باقی، چ(٣)، کوردستانی عێراق، ١٩٩٢، ل٦٨-٦٩.
(*) یەکێک لە سیاسییە بەناوبانگەکانی بەریتـانیـا بووە و ڕۆڵی گـرنگی لە سیاسەتی دەرەوەی وڵاتەکەی دیوە بە تایبـەتی لە سـەرەتاکـانی سـەدەی ڕابردوو تا سەرەتاکانی ساڵی ١٩٢٤ و ڕۆڵی بەرچاوی لە کێشەی موسڵدا بینیوە.
(٦٧) عوسمان علی، سەرچاوەی پێشوو، بەشی دووەم، ل ١٩٦-١٩٧.
(٦٨) هەمان سەرچاوە، ل ١٩٧.
(٦٩) فاضل حسين، المصدر السابق، ص ١٠٧.

(٧٠) عوسمان علي، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩٦.
(٧١) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: فاضل حسين، المصدر السابق، ص ٤١-٥٥.
(٧٢) المصدر نفسه، ص ٥١.
(٧٣) یەکێتیک بوو لە کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوەی سوید، و لەم کاتدا بالۆێز بوو لە ڕۆمانیا.
(٧٤) کەسایەتییەکی سیاسی و شارەزایەکی جوگرافی بوو و ماوەیەک سەرەک وەزیرانی مەجەر بووە.
(٧٥) ئەفسەرێکی خانەنشینی بەلجیکی بووە.
(٧٦) جرجيس فتح الله، المصدر السابق، ٣٢٥-٣٢٩، کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەڕەیەک....، بەشی یەکەم، ل ١١٣.
(٧٧) عبدالرزاق محمد اسود، المصدر السابق، ص٦٠٢.
(٧٨) کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەک لە....، بەشی یەکەم، ل ١١٣-١١٤.
(٧٩) رجا و حسين الخطاب، تاسيس الجيش العراقي وتطور دوره السياسي من ١٩٢١-١٩٤١، بغداد، ١٩٧٩، ص٤٨٧.
(٨٠) بيار مصطفى سيف الدين، السياسة البريطانية تجاه تركيا واثرها في كوردستان ١٩٢٣- ١٩٢٦، ط(١)، اربيل، ٢٠٠٤، ص ١٩١.
(٨١) عثمان علي، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١٠.
(٨٢) جەلال خدر حوسێن، ژیاننامەی شەهابەی....، ل٤٥.
(٨٣) هەر لەم شەوە بۆ ڕێز لێنان لە هاتنی مەلیک ئاهەنگێک ساز دەکرێت و شەهابەش بەشداری تێدا دەکات کە دەبێتە هۆی سەرسوڕمان بوونی مەلیک پێی بۆیە داوا لە مەلا فەندی دەکات کە ڕێگا بە شەهابە بدات لەگەڵ خۆیدا بیبات بۆ قەسری پاشایەتی لە بەغدا بەڵام مەلا فەندی ڕازی نابێت. بڕوانە: جەلال خدر حوسێن، ژیاننامەی شەهابەی....، ل ٤٥-٤٦.
(٨٤) طارق ابراهيم شريف، اوائل الاحداث في اربيل خلال القرن العشرين، زاگروس"مجلة"، ع(٣)، ١٩٩٧، ص ٥٩.
(٨٥) عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، ط(٧)، من منشورات اليقظة العربية، ١٩٨٢، ج(١)، ص٢٤٦.
(٨٦) مسعود محەمەد، گەشتی ژیانم، چ(١)، ستوکهولم، ١٩٩٢، ل ١٠٣.
(٨٧) عثمان علي، سەرچاوەی پێشوو، ل٢١٦.
(٨٨) هەمان سەرچاوە، ل ٢١٦، سی. جی. ادموندز، کرد وترک وعرب (سياسة ورحلات وبحوث عن الشمال الشرقي من العراق ١٩١٩ - ١٩٢٥)، ت: جرجيس فتح الله، ط(١)، بغداد، ١٩٧١، ص٣٤٨.
(٨٩) جرجيس فتح الله، المصدر السابق، ص٤٤٥.
(٩٠) عثمان علي، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١٣-٢١٤.
(٩١) هەمان سەرچاوە، ل ٢١٤.
(٩٢) هەمان سەرچاوە، ل ٢١٧.
(٩٣) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: فاضل حسين، المصدر السابق، ص٥٩ - ٦٠.
(*) لە ساڵی ١٨٨٢ لە سەماوە لە دایک بووە وساڵی ١٩٠٠ لە قوتابخانەی جەنگی ئەستەنبوڵ دەردەچێت ودەبێتە ئەفسەر لە سوپای عوسمانی و بەشداری جەنگی یەکەمی جیهانی کردووە. دوای دامەزراندنی حکومەتی عێراق چەند پلەی وەزاری وەرگرتووە وەک وەزیری ئەشغال وبەرگری ودارایی وچەند جار بووە بە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق وەک نوێنەری هەولێر و لە ساڵی ١٩٢٩ لە ئەستنبوڵ مردووە. بڕوانە: میر بەسری، ناودارانی کورد، و:عبدالخالق علاءالدين، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل ١٦٨-١٧٠.
(٩٤) ادموندز، المصدر السابق، ص ٣٦٧، ٣٧٧.
(*) لە کاتی هاتنی لێژنەکە بۆ هەولێر وەک ئەفسەری سەربازی ئینگلیز لە هەولێر بوو و دواتر ماوەیەکی درێژ موفەتیشی ئیداری بووە لە حکومەتی عێراقی و ڕۆڵی هەبووە لە ڕووداوە سیاسییە کوردییەکان و چەند ساڵ دوای شەڕی دووەمی جیهانیش لە عێراق ماوەتەوە.
(٩٥) فاضل حسين، المصدر السابق، ص ٦٦، ادموندز، المصدر السابق، ص٣٦٥.
(٩٦) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە. جرجيس فتح الله، يقظة الكرد، ص٤٥٧، ٣٧٩.
(٩٧) سروه اسعد صابر، المصدر السابق، ص٣٠٠.
(٩٨) ادموندز، المصدر السابق، ص ٣٦٧، جرجيس فتح الله، المصدر السابق، ص٤١٠-٤١١.
(٩٩) جرجيس فتح الله، المصدر السابق، ص ٣٥٧.
(١٠٠) سروه اسعد صابر، المصدر السابق، ص ٣٠٦.
(١٠١) بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی ڕۆڵی مەلا فەندی بڕوانە. کەریم شارەزا، زانای گەورە و ناوداری کورد مەلا

فەندی (١٨٦٣ - ١٩٤٢)، هەولێر " گۆڤار"، ژ(٣)، هاوینی ١٩٩٩، ل ٧٤ -٩٢.
(١٠٢) تقرير عن نائب المندوب السامي في العراق (التقرير الثالث حول الوضع في كردستان)، اعداد: س. ج. ادموندز، في ١٤/٦/١٩٢٩، فقرات ٣٠، ٣٢، ٣٥-٣٦.
(١٠٣) جرجيس فتح الله، المصدر السابق، ص ٤٥٧.
(١٠٤) كەریم شارەزا، هەولێرو دەنگدانی بۆ مەلیكایەتی مەلیك فەیسەڵ و ویلایەتی موسڵ، بارش "گۆڤار"، ژ(١٧)، تەمموزی ٢٠٠٤، ل١٢٩.
(١٠٥) عزيز قادر الصمانجي، التاريخ السياسي لتركمان العراق، بيروت، ١٩٩٩، ص٧٩.
(١٠٦) جرجيس فتح الله، المصدر السابق، ص ٤٥٧.
(١٠٧) فاضل حسين، المصدر السابق، ص١٤٨- ١٤٩.
(١٠٨) بۆ زیاتر زانیاری بروانە. سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٢-١٧٦.
(*) نوێنەری بەریتانیا بوو لە كۆمەڵەی گەلان.
(١٠٩) فاضل حسين، المصدر السابق، ص٢٣٧.
(١١٠) خليل مصطفى، المصدر السابق، ص١١١.
(١١١) بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی پەیماننامەكانی نێوان عێراق و بەریتانیا بروانە: عبدالرزاق الحسني، تاريخ العراق....، ج(٢)، ص ١٤٩-١٥٢، ١٦٢، ١٩٧-٢٠٤.
(١١٢) عبدالفتاح البوتاني، وثائق من...، ص٥٦.
(١١٣) بۆ زیاتر زانیاری بروانە: ژیان "رۆژنامە"، ژ(١١١)، ساڵی (٣)، ٢١ /١٩٢٨/٦.
(١١٤) خليل مصطفى، المصدر السابق، ص ١٣٣.
(١١٥) ئیسماعیل شكر، المصدر السابق، ص٣٨.
(١١٦) عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات...، ج(١)، ص ٢٥٠.
(١١٧) ئیسماعیل شكر، المصدر السابق، ص٣٨.
(١١٨) نوشیروان مستەفا، سەردەمی قەلەم و...، ل ١٩٥.
(١١٩) عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات...، ج(٣)، ص١٢-١٣.
(١٢٠) بروانە پەیماننامەكە لە:عبدالرزاق الحسني، العراق في ظل...، ص ١٤٧ -١٥٧.
(١٢١) المملكة العراقية، مجلس النواب العراقي، محاضر مجلس النواب، الدورة الثالثة، الجلسة (٢٦)، ١٩٣٠، ص٣٥٦-٣٥٧.
(١٢٢) بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی گفتوگۆكانی نێوان نوێنەری هەولێرو سەرەك وەزیران لەم كۆبوونەوەیەدا بروانە: المملكة العراقية، مجلس النواب العراقي، محاضر مجلس النواب، الدورة الثالثة، الجلسة (٢٦)، ١٩٣٠، ص٣٥٦-٣٥٧.
(١٢٣) عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات...، ج(٣)، ص١٤-١٨.
(١٢٤) نوشیروان مستەفا، كوردستانی عێراق....، ل٨٩.
(١٢٥) كەمال مەزهەر، مامۆستا بەشیر لە بەڵگەنامەیەكی نهێنی بەریتانیای گەورەدا، رەنگین "گۆڤار"، ژ(٢٧)، ساڵی ١٩٩٠، ل٢٧.
(*) ئەم دەستەیە لە شاری سلێمانی دامەزرا، ئامانجی سەربەستی وسەربەخۆیی كوردستان بوو، لە ئەندامەكانی شێخ قادر حفید، حمە ئاغا عەبدولرەحمان، تۆفیق قەزاز، چەندانی تر بوونە). بروانە: نوشیروان مستەفا، كردستان...، ص٦٢.
(١٢٦) بۆ زیاتر زانیاری بروانە: سروە اسعد، المصدر السابق، ص١١٥، ١١٢.
(١٢٧) ئەحمەد خواجە، سەرچاوەی پێشوو، بەرگی (٣)، ل٢٩.
(١٢٨) ئاوێنەی ژینم، بەرگی (١)، ل٦٩.
(١٢٩) وليد حمدي، المصدر السابق، ص٢٢٨.
(١٣٠) ئیسماعیل شكر، المصدر السابق، ص٤٤.
(١٣١) ئەحمەد خواجە، سەرچاوەی پێشوو، بەرگی (٣)، ل٦٤.
(١٣٢) كەمال مەزهەر، مامۆستا بەشیر...، ٢٧، عبدالرزاق الحسني، تاريخ العراق...، ج(٢)، ص ١٨٨.
(١٣٣) عثمان علي، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٦٨.
(١٣٤) هەمان سەرچاوە، ل ٢٦٨.
(١٣٥) ئەحمەد خواجە، سەرچاوەی پێشوو، بەرگی (٣)، ل ٥٩ - ٦٠.
(١٣٦) نوشیروان مستەفا، سەردەمی قەلەم و...، ل ١٠٠.
(١٣٧) ئەحمەد خواجە، سەرچاوەی پێشوو، بەرگی (٣)، ل ٦٠.
(١٣٩) نوشیروان مستەفا، سەردەمی...، ل ١٠١.
(١٤٠) بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی گفتوگۆی نێوانیان بروانە. هەمان سەرچاوە، ل ١٠١.
(١٤١) بۆ زیاتر زانیاری بروانە: عثمان علي، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٦٨-٢٦٩.
(١٤٢) هەمان سەرچاوە، ل ٢٩٠-٢٩٤، ئەحمەد خواجە، سەرچاوەی پێشوو، بەرگی (٣)، ل ٨٢ - ٨٣.
(١٤٣) تقرير من المفتش الاداري البريطاني من اربيل الى كنهان كورنوالس المستشار في وزارة الداخلية في بغداد- بتاريخ ١٩٣٠/٩/٤.

# ڕۆڵی هەولێر لە مانگرتن و چالاکییە سیاسی و ڕۆشنبیرییەکان

مەهدی محەمەد قادر
کۆلیژی ئاداب - زانکۆی سەلاحەددین

### تەوەری یەکەم
### مانگرتن و چالاکییە رۆشنبیری و جەماوەرییەکان
### دامەزراندنی یانەی فەرمانبەران لە هەولێر

دوا بە دوای چەسپاندنی دەسەڵات لە لایەن ئینگلیزەکان و حکومەتی عێراق بە سەر کوردستان و ناچار کردنی (شێخ مەحمودی حەفید) بە دەرچوونی لە شاری سلێمانی، هەروەها تەواو بوونی ئەرکی لیژنەی چارەسەر کردنی (کێشەی موسڵ) بە گەڕانەوەی ویلایەتی موسڵ بۆ دەوڵەتی عێراق بە رەچاوکردنی مەرجەکانی کۆمەڵەی گەلان بە دابینکردنی مافە نەتەوەییەکانی کورد لە ناوچە کوردییەکان لە لایەن حکومەتی عێراقەوە، رۆشنبیرانی کورد دوای ئەوەی هەستیان بە نیازەکانی حکومەت کرد بەرامبەر بە جێبەجێ نەکردنی مافەکان و پشتگوێ خستنی داواکارییە (کارگێڕی و رۆشنبیری)یەکان بە تایبەتی پەیرەو کردنی زمانی عەرەبی لە خوێندن و دامەزراندنی فەرمانبەرانی عەرەب لە ناوچە کوردییەکان و بەستنەوەی چەندین قەزا و ناحیەی کوردستان بە لیواکانی عەرەبی[1].

رۆشنبیرانی شاری هەولێر بە مەبەستی رێگا گرتن لەم سیاسەتەی حکومەت و کۆتایی پێهێنانی هۆکارەکانی و کەمکردنەوەی شوێنەواری ئەم سیاسەتە، رێک کەوتن لە سەر دامەزراندنی رێکخراوێکی (رۆشنبیری -کۆمەڵایەتی) بۆ گۆڕینەوەی بیروڕاکان لە نێوانیاندا و یەکگرتنی ریزەکان لە پێناو بەرگریکردن لە هەر هەوڵێکی حکومەت کە ئامانجی رۆشنبیری و نەتەوەیی کورد بێت[2].

دوا بە دوای ئاڵوگۆڕکردنی بیروڕاکان و گفتوگۆکان لە نێوان ئەو کۆمەڵەیەی کە خاوەنی بیرۆکەی دامەزراندنی یانەکە بوون، داواکارییەکی فەرمییان پێشکەش بە حکومەت کرد کە تێدا هاتبوو رەزامەندی دەربخات لە سەر کردنەوەی یانەیەک لە ناو شاری هەولێر بە ناوی (یانەی هەولێر) کە چالاکییەکانی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری تێیدا بەرێوە دەچێت. دوا بە دوای لێکۆڵینەوە لە داواکارییەکە رەزامەندی حکومەت بە نووسراوی فەرمی، لە ١٩ی تشرینی دووەمی ١٩٢٨ یانەی هەولێر کرایەوە کە ژمارەیەکی زۆر لە رۆشنبیرانی هەولێر و شارەکانی تر ئامادەی بوون، هەر لەم مەراسیمەدا (مەعروف جیاوک) وتەیەکی پێشکەش ئامادەبووان کرد کە لە بەشێکی وتەکەیدا هاتووە:

"... اوه لە پیش چاوتانه ! همـوتان ازانن کە ادم جیگایه له پشدا چەن بو وامروکه اوه بوته گولزار ارواحی پاکی مردوکانمان له باتی هراسان بن امرو بوونی هر جوره گول وچیمەن اکەن، وا امیدم هەیه بە نظری تقدیری ایوه وهمت و کوششی گەورە و کار بەدەستەکان کە زور زور بەهەشتی دونیای وا بینیته وجود چونکە عمرانی مملکت اوینەی زکای ملتـه هر بژی ملت هر بژی گەورەی خاوەند اثر..."[3].

بێکەسی شاعیریش کە ئامادەی کردنەوەی مەراسیمەکە دەبێت هۆنراوەیەکی بۆ ئامادەبووان دەخوێنێتەوە کە لە بەشێکیدا دەڵێت:

**بە نووری عەدل و ئاسایش مونەووەر بوو هەموو هەولێر**
**لە ژێر کابووسی غەم دەرچوو خەلایق شاد و خەندانە**
**ئومێدم لای خودا وایە کە ئەشرافی هەموو هەولێر**
**لە بەرزیدا بژین تا سەر لەگەڵ ئەم قەومی کوردانە[4].**

ئامانجەکانی یانەی هەولێر بریتی بوو لە پێشخستنی

ئاستی رۆشنبیری لە کوردستان و یەکگرتن و کاری هاوبەش و بەرەو پێش بردنی خوێندن لە کوردستان. هەر چەندە ئامانجەکانی یانەی هەولێر لە چوار چێوەی چالاکی کۆمەلایەتی و رۆشنبیریدا بوون بە هۆی بەرهەلستی حکومەت لە هەر کارێکی سیاسی، بەلام رۆل و چالاکییەکانی هەر یەک لە مەعروف جیاوک و بێکەس کاریگەرییان لە سەر بەرنامە و ئاراستەی یانەکەوە هەبوو وەک گرنگیدان بە مەسەلەی نەتەوەیی، بە جۆرێک کە تەنانەت یانەی هەولێر ببووە شوێنی چالاکی سیاسی لە لایەن کوردە نەتەوەییەکان بە شێوەیەکی نهێنی. بەلام بە هۆی چاودێری کردنی حکومەت بۆ کارو چالاکییەکانی یانەکە راپەراندنی کارە سیاسییەکان ببووە ئەرکێکی گران هەر بۆیە نەتواندرا لەم قۆناغەدا جێبەجێ بکرێت، بەلکو بەردەوام بوونە لە چالاکییە رۆشنبیری و زانستییەکان لە پێناو خزمەتکردنی نەوەیەکی نوێ کە خاوەنی هەستی نەتەوەیی بێت[٥].

**- یانەی سەرکەوتنی کوردان.**

سەرەتای سییەکانی سەدەی بیستەم شاری بەغدا ببووە مەلبەندی چالاکییە سیاسی و رۆشنبیری کوردی بە تایبەتی چالاکی ئەو قوتابییانەی کە لە بەغدا دەیانخوێند، کە توانییان چەند کۆمەلەی رۆشنبیری و زانستی دابمەزرێنن کە ئامانجیان بلاوکردنەوەی رۆشنبیری کوردی و هەستی نەتەوەیی بووە لە نێوان قوتابییانی کۆلێژ و پەیمانگاکان.

سەبارەت بە دامەزراندنی یانەی سەرکەوتنی کوردان کە دوای گفتوگۆ و راوێژکردن لە نێوان رۆشنبیرانی کورد لە بەغدا، نوێنەری هەولێر لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق (مەعروف جیاوک) یاداشتێکی پێشکەش بە وەزارەتی ناوەخۆ کرد[٥]، کە داوای کردنەوەی یانەیەکی کوردی لە خۆگرتبوو، دوای لێکۆلینەوە لە داواکارییەکە وەزارەتی ناوەخۆ لە ٩ی مایسی ١٩٣٠ رەزامەندی کردنەوەی یانەی سەرکەوتنی کوردان لە شاری بەغدا درا و لە ٣٠ی مایس لە هۆلی سینەما رویال بە ئامادەبوونی ژمارەیەک لە لێپرسراوانی حکومەت و رۆشنبیرانی کورد (٦)وەک (جەمال بابان ــ وەزیری داد، عەبدولحوسێن چەلەبی ــ وەزیری مەعاریف، نەقیبی ئەشرافی بەغدا، جەمیل صدقی زەهاوی، ئیبراهیم حەیدەری، مەحمود جودت، عەبدوللا لوتفی، خەلەف شەوقی ئەفەندی، محەممەد عارف ئەفەندی، محەممەد ئاغا کەرکوکی)[٧]بە سورەتێکی قورئانی پیرۆز و سروودێکی مەلەکی و گۆرانییەکی نیشتمانی کوردی یانەی سەرکەوتن کرایەوە[٨].

مەعروف جیاوک وتارێکی پێشکەش ئامادەبووان کرد کە تێیدا ئامانجەکانی یانەی دیارخست کە بریتییە لە خزمەتکردنی زمانی کوردی و بلاوکردنەوەی زانست و زانیاری لە کوردستان[٩] و دواتر دەستەی کارگێری یانە هەلبژێردرا کە پێک هاتبوون لە (ئیبراهیم حەیدەری - سەرۆکی یانە، مەعروف جیاوک- سکرتێر) و ئەندامێتی هەر یەک لە (محەممەدامین زەکی، مەحمود جودت، ئەحمەد ئاغا کەرکووکی، عەبدوللا لوتفی بەگ، میرزا فرج شریف، شێخ عەلی قەرەداغی، خەلەف شەوقی داودی، بشیر مشیر)[١٠].

جێگای ئاماژەیە رۆشنبیرانی هەولێر لە بەغدا بە تایبەتی مەعروف جیاوک رۆلێکی گرنگی گێراوە لە کارو چالاکییەکانی یانەی سەرکەوتن تەنانەت ژوورێکی لە مالەکەی خۆی لە بەغدا تەرخان دەکات بۆ کۆبوونەوە و چاوپێکەوتنەکانی نێوان ئەندامانی یانە، بۆ بەرێوەبردنی کارو چالاکییەکان و پشتگیری دارایی بۆ یانەکە بریار درا کە ئەندامانی ئابوونەی مانگانە بدەن و خەلکی کوردستان بە تایبەتی ئەوانەی دەولەمەندن یارمەتی یانەکە بدەن. چونکە دەتوانین بلێین سەرچاوەی سەرەکی داهاتی یانەکە شارەکانی کوردستان بوون، هەولێریش یەکێک لەم شارانە بوو کە پشتگیری دارایی بۆ یانەکە کردووە وەک (عیزەدین مەلا فەندی، خدری ئەحمەد پاشا، عەتائوللاغای کوری رەشید ئاغا، مشیر ئیبراهیم عزیز، عەبدوللا ئاغا عەمەر ئەفەندی، عزیزی حاجی صادق، حوسێنی مەلا، ئەحمەد چەلەبی)[١١].

دەستەی کارگێری یانەکە چەند لیژنەیەکی دامەزراند بۆ جێبەجێ کردنی کارەکان و بە پێی پسپۆری کە نووسینەوەی کتێب و وەرگێرانی کتێبی بیانی بۆ سەر زمانی کوردی لە کارە گرنگەکان بوون، هەروەها هەول دەدرا کە شوێنی حەوانەوە بۆ قوتابییان دابین بکەن کە لە بەغدا دەیانخوێند بۆ ئاسانکردنی کارەکانیان و لە ژێر چاودێری یانەکەدا بێننەوە[١٢].

سەبارەت بە کردنەوەی لقی یانەی سەرکەوتن لە هەولێر نەهاتە بواری جێبەجێ کردن هەر چەندە بیرۆکەی دامەزراندنی لقەکانی لە هەموو شارەکانی کوردستان لە لایەن دەستەی کارگێری یانەکەوە پەسەند کرابوو، کە هۆکاری نەکردنەوەشی دەگەرایەوە بۆ ئەو کێشانەی کە

یانەكـە دووچاری هات دوای تێـپـەڕبوونی سـاڵێک لە كردنەوەی كە بریتی بوون لە كێشەی مردنی سەرۆكی یانەكە (ئیبـراهیم حـەیدەری) لە ٣ی حـوزەیرانی ١٩٣١ [١٣] و هەروەها ئەو كـێشـە داراییەی كـە دووچاری یانەكـە هات و ڕێگای زۆر لە چالاكییەكانی گرت، بۆ چارەسەر كردنی ئەم قـەیرانە داراییەی كە یانەكـە پێیدا تێدەپەڕی (مـەعـروف جیاوک) لە كۆبوونەوەی هەڵبژاردنی دەستەی كارگێڕی نوێ بۆ یانەكە دوای مردنی سـەرۆكی یەكـەمی داوا دەكـات كـە (ئەحـمـەد ئەفـەندی) ئەندامی دەسـتـەی كـارگـێڕی یەكـەمی یانەكە[١٤] لە شاری هەولێر دەست بە كۆكردنەوەی بەخشین (تبرعـات) بكات لە لایەن كـەسـایەتیـیـەكـانی هەولێـر بۆ بەردەوامـبـوونی كـاری یانەكـە، ئەم هەڵـمـەتە لە هەولێـر جێبەجێ كرا و نزیكەی (٥٠٠٠) ڕوپیە كۆكرایەوە بەڵام بە هۆی دەست بەسـەرداگرتنی لە لایەن حكومـەتەوە نەگـەیشـتـە یانەكە[١٥].

هەر چەندە ئامـانجی یانەكـە ڕۆشنبـیـری بوو، بەڵام چالاكـیـیـەكـانی یانەی سەركـەوتن دوور نەبوون لە چالاكی سـیـاسی بە شـێـوەی ئاشكراو نەهێنی و پەیوەندی لەگـەڵ كۆمەڵەی خۆیبوون هەبووە تەنانەت مـانگانە یارمەتی داوە، سەبارەت بە چالاكـیـیـەكـانی یانەی سەركـەوتن ڕۆژنامـەی (الاحرار) ی لوبنانی لەبارەی ئەم یانە دەڵێت:

"... ئەم یانەیە هەوڵدەدات ببـێـتـە بنكەیەكی سـەرەكی بزووتنەوەی ڕزگـاریخـوازی نەتەوەیی كـورد لە توركـیـا و عێـراق و سوریا و ئێران، بۆ بەدەسـتـهـێنانی دەسـەڵاتێكی سەربەخۆ..."[١٦].

یانەی سـەركـەوتن تا بوونی عـێـراق بە ئەندام لە كـۆمەڵەی گـەلان و سـەربەخـۆیی بوونی لە سـاڵی ١٩٣٢ چالاكـیـیـەكـانی بەردەوام دەبێت، بەڵام دواتر بە فـەرمـانی حكومەت دادەخرێت و چالاكییەكانی دەوەستێت تا دوا جار لە نیـسـانی ١٩٤٣ جـارێكی تر مـۆڵەتی كـردنەوەی پێدەدرێت[١٧].

## مانگرتنی شاری هەولێر بۆ دابەزینی نرخی كارەبا

یەكـێک لە ڕووداوە گـرنگەكـانی سـەرەتاكـانی سـەدەی بیـسـتـەم گـەیشـتـنی ڕووناكی كـارەبا بوو بۆ عـێـراق و لە كـۆتاییـەكـانی بیـسـتـەكـانی هەمـان سـەدە كـارەبا گـەیشـتـە شـارەكـانی كـوردسـتـانی عـێـراق. سـەبارەت بە گـەیشـتـنی كـارەبا بۆ هەولێر دەگەڕێتەوە بۆ هەوڵ و كۆششی (ئەحمەد چەلەبی)؟؟؟ دوای ئەوەی داواكـارییـەكی بە پشـتـگـیـری ئەنجومـەنی شارەوانی وموتەسەریف و وەزارەتی كاروباری ناوەخۆ پێشكەش كـرد بە مـەبەسـتی دانانی مـەكـینەیەكی كـارەبایی بۆ پێـدانی كـارەبا بە دانیـشـتـوانی شـاری هەولێر[١٨].

دوای وەرگـرتنی ڕەزامـەندی حكومـەت بە دانانی مەكینەی كارەبا لە ناو شار لە ڕۆژی ٨ی تشرینی دووەمی ١٩٣٠ پڕۆژەی كارەبای ناو شاری هەولێر دامەزرا. هەر لە یەكەم ڕۆژدا كارەبا گەیشتە چوار ماڵ لە دانیشتوانی شار ئەوانیش مـاڵی (عـەبدولحـەمـیـد بەگ ـ مـوتەسـەریف، دەرویش لوتفی بەگ ـ بەڕێوەبەری پۆلیس، یونس ئەفەندی ـ ئەفـسـەری پۆلیس، زیا ئەدهەم ـ خـاوەن ئاش)، دواتر چەند ماڵی تر كارەبا ڕادەكێشن وەک ماڵی (حاجی ڕەشید ئاغا وەیس ئاغا، شەهاب چەلەبی، زەكی ئەمین ئەفەندی، حاجی شریف خلیل، داود ئاغا سعید ئاغا)[١٩].

سـەبارەت بە نرخی هەر كـیلۆواتێک لە هەولێـر زیاتر بوو بەرامبەر نرخەكەی لە بەغدا و سلێمانی، ئەمەش ببووە هۆی ئەوەی كە كەم دەرامەتەكان نەتوانن سوود لەم كارەبایە وەربگرن، ئەم جـیـاوازی نرخـەش لە نێـوان هەولێـر و شـارەكـانی تر بوو بە هۆی دورست بوونی بزووتنەوەیەكی ڕێكخراوەیی نارەزایی كە لە سەرەتاكانی ١٩٣١ دەركەوت كە نوێنەرانی گـشت دەسـتـەو چینەكـانی ناو شـار تێـیـدا بەشدار بوون[٢٠]. دەتوانین بڵێین ئەگەرچی مەكینەی كارەبا لە لایەن (ئەحـمـەد چەلەبی) داندرابوو، بەڵام حكومـەت دەیتـوانی كاربكاتە سـەر كەمكردنەوەی نرخی كارەباكـە بە جۆرێک كە تەواوی خەڵكی شارەكە سوودی لێ وەربگرن، هەروەها بەشدار بوونی زەنگینەكانی هەولێر لەم مانگرتنە و پاڵپـشـتی كـردنیـان بۆ مـانگرتنەكـە بەڵگەی یەک هەڵوێستی و دڵسۆزی هەموو چینەكان یشارەكە بوو.

سـەرەتای دەسـتـپـێكردنی مـانگرتنەكە بە نارەزایی و دەست هەڵگرتن لە كـارەبا و بەكـارهێنانی لە لایەن هەندێ لە كـاسبكارانی شـار دەستی پێكرد لەمانەش (محـەمـەد ئەحمەد چایچی، وەستـا ئاكۆیی پێڵاودروو، وەستا خەلیل سەعـاتچی، سـەرداوودی محـەمـەد چایچی) بوون[٢١]. دوای ئەوەی گروتینی مـانگرتنەكە پەرە دەسـتێنێت موتەسەرسفی هەولێر (عـەبدولحـەمـید صرصر) لە ٢٠ی تەمموز نامەیەكی نهێنی ئاراسـتـەی وەزیری ناوەخـۆی ئەو كـات (جـەمـیل مـەدفـەعی) دەكـات بارودۆخی هەولێـری تێـدا ڕوون دەكاتەوە[٢٢]، لە سەرەتای مانگی ئابدا مانگرتنەكە فراوان

دەبێت و زۆر لە گەورە پیاوان و رووناکبیرانی هەولێر بەشداری تێدا دەکەن وەک (رەفیق حلمی ـ ئەو کات لە هەولێر مامۆستا بووە، زەکی ئەمین، محەمەد دۆغرەمەچی، داود ئاغا سعید ئاغا، کەماڵ ئەفەندی) و (مەلا ئەبو بەکر) ناسراو بە مەلا فەندی لایەنگری مانگرتنەکە دەکات[٢٣].

جێگای ئاماژەیە شاری هەولێر یەکەمین شار بوو لە هەموو عێراق کە مانی گرت بۆ داشکانی نرخی کارەبا، لەم کاتەش کە سەرەک وەزیرانی عێراق (نوری سەعید) لە ١٦ی ئابی ١٩٣١ مانگرتووەکان سکاڵانامەیەک بە ناوی (٤٤٨) کەس لە دانیشتوانی هەولێر بە مۆری (٣٨٠) کەس و ئیمزای (٦٨) کەس بۆ سەرەک وەزیران بەرز دەکەنەوە و داخوازییەکانیان تێدا تۆمار دەکەن[٢٤] کە بریتی بوو لە:

"... داشکانی نرخی هەر کیلۆواتێکی کارەبا لە دە (عانە)؟؟؟ بۆ چوار عانە یا هیچ نەبێت بۆ شەش عانە، واتا لە چل فلسەوە بۆ شازدە یان ئەو پەڕەکەی بۆ بیست و چوار فلس...ئەگەر ئەو داخوازییە جێبەجێ نەکرا ئەوسا شارەوانی بۆ خۆی مەکینەی کارەبا بهێنێت یا رێگە بدات خەڵکەکە بۆ خۆیان مەکینە بهێنن یا هەردوو لا بە هاوبەشی و گواستنەوەی مودیری تەحریرات جەمال رەفعەت کە بە چاو ساغ و لایەنگری ئەحمەد چەلەبی دەباغیان دادەنا"[٢٥].

لەو کەسانەی کە ئیمزای سکاڵایەکەیان کردووە (قوریشە فەندی بەیتار، سەید کاکۆی ئۆتراخچی، حمدی ئەفندی حاکم، نوری باویلاغا، نیسان کانونی (زمانحاڵی جوولەکەکان)، مستەفا حمد شابانی، کوێخا همزە کاکەشین، عوسمان یونس ناڵبەند، عوسمانی سۆفی کوێخا وسوو، یەعقوب ئاغای محامی، رەمزی نافیع ئاغا(**)، حەسەن چاوشلی، تحسین بەگ دۆغرەمەچی، حەسەن خەدیج)[٢٦].

هەر چەندە موتەسەریفی هەولێر دژی مانگرتووەکان بوو و پاڵپشتی لە (جەمال رەفعەت و ئەحمەد چەلەبی) دەکرد، ئینگلیزەکان بایەخیان بە مانگرتنەکە دا و دەقی سکاڵایەکەیان وەرگێڕایە سەر زمانی ئینگلیزی پێیان وانەبوو کە بزووتنەوەیەکی لەم جۆرە بۆ شارێکی وەک هەولێر کارێکی ئاسان بێت و لە راپۆرتی نەهێنی مانگی ئابی ١٩٣١دا هاتووە:

"... داخوازییەکی لەو بابەتە (داشکانی نرخی کارەبا) لە رێگای مانگرتنەوەیەکی گشتی دیاردەیەکی نائاساییە بۆ شوێنێکی وەک هەولێر و نیشانەی ئەوەیە کە جۆرە بزووتنەوەیەکی رێکخراوی گەورە شێوێن لە ئارادایە..."[٢٧].

هەر لە میانی درێژەپێدانی مانگرتنەکە لە ٢٧ی ئابدا مانگرتووەکانی هەولێر دوو سکاڵایان رەوانەی بەغدا کرد یەکەمیان بۆ سەرەک وەزیران و دووەمیان بۆ وەزیری ناوەخۆ کە مۆر و ئیمزای (٥٠٥) کەسی بەسەرەوە بوو، مانگرتووەکان کۆبوونەوەکانیان لە چایخانەی عەبۆ ساز دەکرد، بە پێی نامەی موتەسەریفی هەولێر بۆ وەزیری ناوەخۆ لە ٢٦ی ئابدا (حاجی شەریف دۆغرەمەچی، مەلا ئەمین بەقال، یاسین حاجی ئەلیاس بەزاز، حاجی یونس ئاسنگەر، حاجی محەمەد قەرۆکی ئاسنگەر) هاندەری مانگرتنەکە بوون[٢٨].

سەرەک وەزیران "نوری سەعید" بە مەبەستی بەدواداچوون لە کێشەکە داوا دەکات لە موتەسەریفی موسڵ کە پشکێنەری کارگێڕی موسڵ رەوانەی هەولێر بکات، بەڵام دواتر ئەم ئەرکە دەخرێتە ئەستۆی پشکێنەری کارگێڕی هەولێر و کەرکووک (میستەر لاین). جێگای ئاماژەیە وەزیری ناوەخۆ داوای کرد لە موتەسەریفی هەولێر کە بە توندی رەفتار لەگەڵ مانگرتووەکان بکات وەک لە نامەکەی بۆ موتەسەریف لە ٣١ی ئابدا هاتووە:

"... نیشانە بە نامەی ژمارە ١٣٢ ی رۆژی ٢٦ی ئابی ١٩٣١ تان ئێمە گشت تێبینیەکانتانمان رەچاو کرد وپێتان رادەگەیەنین کە چاو لە هیچ جۆرە بزوتنەوەیەک یان هەنگاوێک ناپۆشین ببێتە هۆی جۆرە بزوتنەوەیەک یان لاواز کردنی دەسەڵاتی میری، تکامان وایە بایەخی تەواو بدەن بەم لایەنە..."[٢٩].

دوای ئەم روونکردنەوەی وەزیری ناوەخۆ کاربەدەستانی حکومەت لە هەولێر دەستیان کرد بە فشار خستنە سەر مانگرتووەکان وچەند سکاڵای ساختەیان لە دژی مانگرتووەکان ئامادە کرد و پشتگیری (جەمال رەفعەت) یان تێدا دەرخستبوو و چەند کەسێک راپێچ کران بۆ لێپێچینەوە لەگەڵیاندا. جێگای ئاماژەیە ئەم توند وتیژیەی حکومەت نەبووە هۆی کۆتایی هاتنی مانگرتنەکە و لە ٩ی تشرینی دووەم دوو بروسکەی تر لە لایەن (مەلا محەمەد قەتاچی، مەلا خدر خەفاف، حاجی عەلی خەیات، حاجی شریف دوغرەمەچی، سۆفی ئیسماعیل، عەبدلوەهاب حەلاق، عیزەدین حەماڵ، حاجی یونس ئاسنگەر، عەبدوڵڵا

نالبەند، محەمەد فارس دەلال، داود ئاغا قەساب، شێخ یونس، فیض الله دارتاش، محەمەد سالح نانەوا، سالح یوسف نوری لە بریتی جوولەکەکان) لە کەرکووکەوە رەوانەی بەغدایان کرد یەکەمیان بۆ نوری سەعید و دووەمیان بۆ موزاحیم پاچەچی کە داواکارییەکانیان تێدا دووبارە خستبۆوە روو[٣٠].

لە لایەکی تر هەر بە مەبەستی پشگیری کردن لە داواکارییەکانی مانگرتووەکان رۆژی ١١ی تشرینی دووەم سەرۆک هۆزەکانی ناوچەکانی دەوروبەری هەولێر کە پێک هاتبوون لە (سەرۆک میر یوسفی خۆشناو، سالح بەگی میران، جەمیل ئاغای گەردی، مەجید ئاغای کۆڕێ، قادر بەگی میران، خورشید بایز ئاغای دزەیی، (حوسێنی مەلای) ؟؟؟، سلێمان ئۆمەر ئاغا، رسول محەمەد صادق ئاغا) لە دژی هەڵوێستی موتەسەریفی هەولێر بروسکەیەکیان ئاراستەی (نوری سەعید) کرد. بەم جۆرە سەرەڕای درێژ بوونەوەی مانگرتنەکەو هەڕەشەکانی کاربەدەستانی حکومەت لە مانگرتووەکان، داواکاری مانگرتووەکان جێبەجێ کرا و (جەمال رەفعەت) لە هەولێر رابگوازرێت و ئەحمەد چەلەبیش ناچار کرا کە نرخی هەر کیلۆ واتێک لە کارەبا (٢) عانە دابشکێنێت و مانگرتووەکان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا[٣١].

## تەوەری دووەم
## کۆمەڵە و رێکخراوە سیاسییەکان لە هەولێر

کوردستانی عێراق لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی وەک مەڵبەندێکی کاری سیاسی و جەماوەری شان بە شانی گۆڕانکارییەکان لە تەواوی ناوچەکە و عێراق چالاکی نواندووە، چەند کۆمەڵە و رێکخراوی سیاسی و یانەی رۆشنبیری تێدا دامەزراوە، هەولێریش لەم قۆناغەدا شوێنی چالاکییە سیاسییە نهێنییەکان بووە و چەندین کەسایەتی ناودار و روشنبیرانی شارەکە لە رێکخستنە سیاسییەکان و رۆشنبیرییەکان رۆڵی بەرچاویان گێڕاوە، سەبارەت بە کۆمەڵە و رێکخراوە سیاسییەکان کە لەم ماوە مێژووییەدا چالاکی سیاسییان لە هەولێر هەبووە ئەمانەی خوارەوەن:

**- کۆمەڵەی خۆیبوون.**

مێژووی دامەزراندنی دەگەڕێتەوە بۆ کانوونی یەکەمی ١٩٢٧[٣٢]، دامەزرێنەرانی پێکهاتبوون لە پانزە ئەندام کە (کامل حسن و کریم روستم شالوم) لە کوردەکانی کوردستانی عێراق بوون[٣٣]، ئامانجی سەرەکی خۆیبوون پێکهێنانی دەوڵەتێکی کوردی بوو لە کوردستان و هەوڵی داوە چالاکییەکانی لە هەموو ناوچە کوردییەکان ئەنجام بدات[٣٤].

سەبارەت بە رێکخستنەکانی کۆمەڵەکە لە شاری هەولێر بە پێی بەڵگەنامەکانی بەریتانی وا دەردەکەوێت کە لقێکی کۆمەڵەکە لە هەولێر دامەزراوە و لێپرسراوی ئەم لقەش (مامەند رەمزی ئەفەندی)[**] بووە[٣٥]. لە جێبەجێ کردنی ئەرکەکانیش لقی هەولێر شێوازێکی نهێنی پەیڕەو کردووە و (شوعبەی ئەوەل)ی وەک ناوێکی نهێنی بەکار هێناوە بۆ یەکتر ناسینی ئەندامەکانی و خۆپاراستنیان لە ناوەوەی شاردا[٣٦]، چونکە لەم سەردەمەدا کە خۆیبوون چالاکییەکانی لە هەولێر و ناوچەکانی کوردستان ئەنجام دەدا هەندێک لە کوردەکانی شارە کوردییەکانی عێراق کاری سیخوڕییان بۆ کاربەدەستانی ئینگلیز لە ناوەوەی شارەکان دەکرد و راپۆرتی تایبەتییان لەبارەی چالاکییەکانیان دەدا بە بەریتانییەکان[٣٧]، جێگای ئاماژەیە هەولێر وەک مەڵبەندێکی کاری ئەم کۆمەڵەیە بووە هەروەها شوێنی گواستنەوەی ئەندامەکانی بووە بۆ ناوچەکانی تر لە کوردستان بۆ نموونە هەندێک لە ئەندامەکانی کە دەیانەوێت پەیوەندی بە شێخ مەحمودی حەفید بکەن لەو کاتەی کە لە چیای سورداش بوو هەوڵ دەدرێت لە رێگای هەولێرەوە ئەنجام بدرێت، بەڵام بە هۆی چاودێری کردنی حکومەت لە سەر چالاکیەکانی ئەندامانی خۆیبوون لەو کاتەی کە ئەندامەکان کە پێکهاتبوون لە (شێخ عەبدولڕەحمان الکارسی ـ سەرۆکی لقی موسڵ، عوسمان سەبری؟؟؟، خالد بەگ سبیکی، ئەحمەد شوزی) دەگەنە هەولێر دەستگیر دەکرێن[٣٨].

بە مەبەستی فراوانکردنی بنکەی جەماوەری کۆمەڵەکە لە هەولێر (شکری محەمەد صگبان) داوای پەیوەندی کردنی هەر یەک لە (ئیبراهیم حەیدەری و ئیسماعیل رەواندزی) دەکات[٣٩]. هەر چەندە رێکخستنەکانی "خۆیبوون" لە هەولێر بە شێوەیەکی نهێنی بەڕێوە دەچوو، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەم شێوازەی خەباتیش ببووە هۆی بزر بوونی زۆر لە چالاکی ئەندامەکانی لەم شارە، لە دیارترین ئەندامەکانی لقی هەولێری کۆمەڵەی خۆیبوون پێک هاتبوون لە (مەعروف جیاوک کە پەیوەندی بەردەوامی هەبووە و ئابوونەی مانگانەی داوەتە کۆمەڵە، ئیسماعیل

بەگ ڕەواندوزی، حاجی ڕەشید ئاغا ودیس ئاغا، ئەحمەد ئاغای نەقیب) و هەندێک لە ئاغاکان و سەرۆک هۆزەکانی هەولێر ئەندامی کۆمەڵەکە بوونە[40]، هەندێک لە سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە عەبدوڵڵا عزیز محەمەد ناسراو بە (عەبە هەولێری) ئەندامی کۆمەڵەی خۆیبوون بووە[41]. بەم جۆرە کۆمەڵەی خۆیبوون چالاکییەکانی بە شێوەیەکی نهێنی بۆ ماوەیەک لە هەولێر دەمێنێتەوە.

**- کۆمەڵەی زەردەشتی.**

کۆمەڵەی زەردەشتی لە لایەن چەند لاوێکی کوردەوە دامەزراوە و بیروڕای جیاواز لەبارەی ساڵی دامەزراندنی هەیە[42]، ئامانجی سەرەکی ئەم کۆمەڵەیەش بەدیهێنانی بەڕێوەبردنێکی خۆجێیی (الادارة الذاتیة) وەک لە پرۆگرامەکەیدا هاتووە کە لە (١٦)بەند پێک هاتووە[43]. سەبارەت بە شێوازی خەباتی ئەم کۆمەڵەیەش وەک لە نامە و داواکاریەکانی بۆ شێخ مەحمود دەردەکەوێت کە پەیڕەوی هەڵوێستێکی توندڕەوی کردووە بۆ جێبەجێ کردنی ئامانجەکانی[44].

مەڵبەندی سەرەکی ئەم کۆمەڵەیە لە شاری بەغدا بووە و دواتر لقێکی لە هەولێر کردۆتەوە، بەڵام سەبارەت بە ناوی ئەندامەکان و چالاکییەکانی لە هەولێر بەڵگەیەکی بڕوا پێکراو لە بەر دەستدا نییە کە ئەم زانیارییە شاراوەیە دەربخات[45].

**- کۆمەڵەی پشتیوانی کوردان.**

کۆمەڵەی پشتیوانی کوردان لە لایەن ڕۆشنبیرانی کورد لە شاری بەغدا لە تەمموزی ١٩٢٧ دامەزرا لە شوێنی کۆمەڵەی پێشکەوتن[46]. دەستەی کارگێڕی لە ماڵی (ئەحمەد خواجە) بڕیاری لە سەر درا، کە پێکهاتوون لە سەرۆک و دوو سکرتێر و نۆ ئەندام، ئامانجی کۆمەڵەش یەک ڕیزی و ڕێکخستنی کورد بوو بۆ داکۆکیکردن لە پێناو بەدیهێنانی مافە نەتەوەییەکانی[47].

دەستەی کارگێڕی کۆمەڵە لە پێناو فراوانکردنی چالاکییەکانی هەوڵی داوە کە لقەکانی لە کوردستان بکاتەوە و یەکەمین لقی کۆمەڵەی پشتیوانی کوردان لە شاری هەولێر کرایەوە و لە ماڵی (ئەحمەد فخری) دوای ئەوەی کۆبوونەوەیەک بەسترا بۆ دانانی دەستەی کارگێڕی لقی کۆمەڵە لە شاری هەولێر پێک هاتبوون لە (ڕەفیق حیلمی - سەرۆکی لقی هەولێر، محەمەد شوقی - سکرتێر، مستەفا چیچۆ - ئەمین سەندوق، اصف رؤوف، ئەحمەد خواجە، ئەحمەد خری ئەندام) پێک دەهات[48].

کارەکانی کۆمەڵە لە هەولێر بە شێوەیەکی نهێنی بەڕێوە دەچوو، بەڵام لە هەندێ کاتدا چالاکییەکان دەبوونە شوێنی گومان لێکردن لە لایەن کاربەدەستانی حکومەت وەک لەم ڕاپۆرتەدا دەردەکەوێت کە بەرز کراوەتەوە بۆ موتەسەریفی هەولێر ئەوە دەردەخات کە چالاکییەکانی هەر یەک لە (ئەحمەد خواجە و اصف رؤوف) لە نێوان ڕۆشنبیران و سەرۆک هۆزەکان ئامانجی سیاسی بەدواوەیە، هەر بۆیە حکومەت بۆ ماوی سێ ساڵ لە فەرمانبەرێتی دەریان دەکات. دەکرێت بڵێین چالاکی ئەم دوو ئەندامە زیاتر بووە لە ئەندامەکانی تر کە بووە بە هۆی هەست پێکردنی حکومە و هەڵوێست وەرگرتن لێیان[49].

حکومەتی عێراق بە مەبەستی سست کردن و بنبڕکردنی چالاکییەکانی کۆمەڵە لە هەولێر پەیڕەوی سیاسەتی گواستنەوەی ئەدامەکانی کۆمەڵە بۆ ناوچەکانی خوارووو و ناوەڕاستی عێراقی گرتەبەر بە تایبەتی ئەو ئەندامانەی کە لە دام و دەزگاکانی حکومەت و لە ڕیزی سوپا بوونە، چونکە وەک لە قسەکانی موتەسەریفی هەولێر دەردەکەوێت کە ئەم کۆمەڵەیە چالاکییەکانی لە ناو سوپادا بە هێز بووە[50].

جێگای ئاماژەیە لە ساڵی ١٩٢٩بیرۆکەی دامەزراندنی حزبێکی سیاسی لە هەولێر لە ئارادا بووە بە پێی ڕاپۆرتێکی تایبەتی ئەفسەرێکی بەریتانی کە ئەوەی تێدا دەرخستووە کە لە ١٦ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٩ پێشوازی لە (مەلا فەندی) دەکات، لە دانیشتنی لەگەڵ ئەفسەری سەربازی ئەوە دەردەخات کە نامەیەکی لە (ئیبراهیم حەیدەری و داود حەیدەری) پێگەیشتووە کە وا دەردەخەن لە توانایاندایە حزبێکی سیاسی دابمەزرێنن و داوای ئەوە دەکەن کە بیروڕای مەلا فەندی لەم بارەوە بزانن و داواش لە عەبدوڵڵا فەندی بکات کە بێتە ڕیزی ئەم حیزبە، بەڵام مەلا فەندی ئامۆژگارییان دەکات کە لەم بارەیەوە ڕاوێژ بە بەریتانییەکان بکەن[51].

**- کۆمەڵەی زانستی.**

کۆمەڵەی زانستی ئەم کۆمەڵەیە بە مۆڵەتی وەزارەتی ناوەخۆی عێراق لە ١٩٢٦ دامەزرا[52]. کە ئامانجی بڵاوکردنەوەی زانست و زانیاری بووە لە کوردستان لە ڕێگای هۆکارەکانی ڕاگەیاندن (ڕۆژنامە و وەرگێران و

نووسینی کتێب) و هەوڵدان بۆ کردنەوەی قوتابخانە و کتێبخانە و هەوڵدان بۆ ناردنی قوتابییان بۆ خوێندن لە دەرەوەی ولات[٥٣].

سەبارەت بە کردنەوەی لقەکانی لە کوردستان، لە هەولێر لقێکی کۆمەڵە دامەزراوە و عەبە هەولێری ئەندامی کۆمەڵەکە بووە و مانگانە باربوی (١٠) روپیەی داوەتە کۆمەڵە، هەروەها توانیویەتی کتێبێک وەرگێرێتە سەر زمانی کوردی لە تورکییەوە بە ناوی (لاوان وریا بن)و دواتر بە نامیلکەیەکی (٢١٤) لاپەڕی چاپی کردووە کە ناوەڕۆکەکەی باس لە خۆ دوور خستنەوەی لاوان دەکات لە رەوشتی نالەبار، هەروەها لە وتارێکی کە لە رۆژنامەی ژیان بلاوی کردۆتەوە کە باس لە کێشەی نەبوونی کتێبی قوتابخانە دەکات و کۆمەڵەی زانستی خستۆتە ژێر لێپرسینەوەی لەچاپدانی کتێب[٥٤]. بەلام دوای ئەوەی کە دەسەلاتدارانی عێراق و بەریتانی هەست دەکەن کە ئەندامانی ئەم لقەی کۆمەڵەی زانستی لە هەولێر هەوڵ دەدەن بۆ بلاوکردنەوەی بیری نەتەوەیی کورد لە ناو خەڵکدا بۆیە چالاکییەکانیان دادەخەن[٥٥].

### - کۆمەڵەی لاوانی کورد.

کۆمەڵەی لاوانی کورد یەکێکە لە رێکخراوە سیاسییەکانی کە بنکەی سەرەکی لە شاری هەولێر لە ١٩٢١ دامەزرا، و بلاوکراوەیەکی دەستنووسی بلاو کردەوە کە داخوازی و رەخنەکانی تێدا دیاری کرابوو، لە ماوەی کارەکانی ئەم کۆمەڵەیە لە شاری هەولێر (عەبدوڵلا عزیز کارگەچی، ئەحمەد فەخری، حسام الدین یحیی، عبدالخالق قوتب، محەمەد محمود قدسی، تاهیر سدیق، مستەفا خۆشناو، سید نزیف کۆیی، خیرالله عبدالکریم، عبدالقادر ئەحمەد سامی) چالاکییان تێدا نواندووە.[٥٦].

ئەم کۆمەڵەیە گرنگییان بە چالاکییەکانی لاوان داوە و لە پایزی ١٩٢١ لە هەولێر شانۆگەریەکیان پێشکەش کردووە کە قوتابییانی قوتابخانەی یەکەمی هەولێر نمایشیان کردووە و ئەوانەی بەشدارییان تێدا کردووە (عەبدوڵلا عزیز کارگەچی، غریب سلیم، حسام الدین یحیی، عبدالموتەلیب سید جمیل، عەلی ادیب) بوون[٥٧]. بەلام چالاکییەکانی بۆ ماوەیەکی درێژ بەردەوام نەبووە.

### - کۆمەڵەی دۆزینەوە و گەردانی قسەی کوردی.

دوای چارەسەرکردنی کێشەی موسڵ حکومەتی عێراق پەیوەست نەبوو بە جێبەجێکردنی ئەو مەرجانەی کە بۆ کورد لە لایەن کۆمەڵەی گەلان داندرابوو کە مافە ئیداری و رۆشنبیرییەکانی دابین دەکرد بەرامبەر بە رەزامەندی کورد بە مانەوەی ویلایەتی موسڵ لەگەڵ دەوڵەتی نوێی عێراق[٥٨]. هەروەها پابەند نەبوو بەرامبەر بە یاسای زمانە ناوخۆییەکان کە لە حوزەیرانی ١٩٣١ دەرچوو کە زمانی کوردی زمانی فەرمییە لە ناوچە کوردییەکان[٥٩]، چونکە دوای دەرکردنی ئەم فەرمانەش حکومەت گرنگی بە زمانی عەرەبی دەدا لە ناوچە کوردییەکان[٦٠].

کوردە نەتەوەییەکان بەرامبەر بەم سیاسەتەی حکومەت دەستیان کرد بە چالاکی و جموجۆل بۆ پاراستنی زمانی کوردی، کۆمەڵێک لە رۆشنبیران لەم پێناوەدا لە حوزەیرانی ١٩٣٢ کۆمەڵەیەکیان لە شاری هەولێر دامەزراند بە ناوی" کۆمەڵەی دۆزینەوە و گەردانی قسەی کوردی" کە زۆربەی ئەندامەکانی قوتابی بوون لە خانەی مامۆستایانی بەغدا[٦١].

سەبارەت بە ئامانجی ئەم کۆمەڵەیەش پاراستنی وشەی رەسەنی کوردی و دەرهێنانی وشەی بێگانە لە زمانی کوردی و دانانی وشەی کوردی لە شوێنی ئەوەدا. هەروەها کۆمەڵە یارمەتی قوتابیە هەژارەکانی دەدا بۆ ئەوەی بتوانن درێژە بە خوێندن بدەن و بروانامە بەدەست بهێنن و بەرز کردنەوەی ئاستی رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی هەستی نەتەوەیی[٦٢]. دەتوانین بلێین رۆشنبیرانی کورد لەم ماوەیە لە کوردستان بە گشتی و هەولێر بە تایبەتی لە هەوڵ وچالاکیدا بوونە لە پێناو پاراستنی زمانی کوردی و بەکارهێنانی وەک زمانی فەرمی لە کوردستان.

### - کۆمەڵەی یاریدەدەری کورد.

کۆمەڵەی یاریدەدەری کورد لە ١٨ی ئاياری ١٩٣١ لە شاری هەولێر لە لایەن کۆمەڵە لاوێکی کوردپەروەر دامەزرێندرا[٦٣]، کە (رەفیق حلمی) یارمەتی و پشتگیری دامەزراندنی کردووە، چونکە ئەو کاتە رەفیق حلمی بە هۆی رۆڵ و کاریگەری لە راپەڕینی رۆژی ٦ی ئەیلول لە سلێمانی گواسترابۆوە بۆ هەولێر[٦٤]، (جەلال نوری) بوو بە سەرۆکی کۆمەڵەکە[٦٥].

ئامانجەکانی ئەم کۆمەڵەش پێک هاتبوو لە بلاوکردنەوەی هەستی نەتەوەیی و بەرەوپێش خستنی زمانی کوردی و هەروەها یارمەتیدانی قوتابییانی هەژار بۆ تەواوکردنی خوێندنیان[٦٦]. جێگای ئاماژەیە کە زانیاری

لەبارەی ئەندامەکان و چالاکییەکانی کۆمەڵە کەمن بە هۆی کارەکانی کە بە شێوەیەکی نهێنی بەڕێوە دەچوو، هەروەها چاودێری حکومەت بەرامبەر بە چالاکی کۆمەڵە و ڕێکخراوەکان[٦٧]. دەکرێت بوترێت کە دروستبوونی کۆمەڵەیەکی لەم جۆرە بۆ پاراستنی زمانی کوردی و بلاوکردنەوەی هەستی نەتەوەیی لەم قۆناغە مێژووییەدا لە هەولێر سەلماندنی بوونی هەستی نەتەوەییە لەم شارە و هەوڵدانە بۆ چەسپاندنی ئامانجەکانی کورد.

**ئەنجام**

لە ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەیە دەگەینە ئەم خالانەی خوارەوە:

١ / پێکهاتەی نەتەوەیی و ئاینی لە شاری هەولێر بووە بە هۆی دروستبوونی خاسیەتێکی تایبەت لە پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکان کە جیاوازی لەگەڵ ناوچەکانی تری کوردستان هەیە، ئەمەش بووە بە جۆرە پێناسەیەکی کۆمەلایەتی هەولێر، هەروەها سەرمایە و پلەوپایەی کۆمەلایەتی و ئابووری نەخشەی پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکانی نەکێشاوە بەڵکو بنەماکانی ئاینی و نەتەوەیی و هاوکاری و ڕێزگرتن لە نێوان سەرجەم چینەکان پێوەری دیاریکردنی پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکان بووە.

٢ / بوونی ڕێگاکانی بازرگانی و ئەم بازاڕەی کە بە قەیسەری ناسراوە کاریگەری هەبووە لە سەر ئەوەی وەک بنکەیەک لە پەیوەندییە ئابوورییەکانی نێوان ناوچە چیاییەکان و دەشتی هەولێر لە لایەک لە نێوان ناوچەکانی باکووری عێراق و خوارووی عێراق لە لایەکی تر ڕۆڵێکی گرنگی هەبێت.

٣ / سیستەمی بەڕێوەبردنی شارەکە لە سالانی شەڕی یەکەمی جیهانی وەک خۆی ماوەتەوە، چونکە شارەکە نەبوویتە مەیدانی شەڕ کردن.

٤ / پێش هاتنی ئینگلیز بۆ شارەکە بیرۆکەی دژایەتیکردنی ئینگلیز دروست بوو کە ئەمەش دوو فاکتەر ڕۆڵی خۆی تێدا بینیوە یەکەمیان دەگەڕێتەوە بۆ نەمانی ئەو بەرژەوەندییانەی کە لە سەردەمی عوسمانییەکان هەندێک لە خەڵکی شارەکە هەیانبوو دووەمیان کاریگەری ئاین لە سەر خەڵکی شارەکە و گروپەکانی بەرگری لە ژێر ئەم بۆچوونەی کە ئینگلیز کافرن و حوکمڕانی موسڵمانان بکەن.

٥ / خەڵکی هەولێر بە تایبەتی ئەوانەی کاریان لە بازاڕ بووە و بە تورکمانی قسەیان کردووە لەگەڵ ئەوە بوونە کە لە کاتی هاتنی لێژنەی کۆمەڵەی گەلان بۆ چارەسەرکردنی کێشەی موسڵ زۆربەیان دەنگیان بۆ ئەوە داوە کە شارەکە بگەڕێتەوە سەر دەوڵەتی تورکیا بەلام ژمارەی دەنگەکانیان بەرامبەر بە خەڵکی هەولێر هیچ کاریگەریەکی بە سەر چارەنووسی ئەم کێشەیە نەکرد.

٦ / ئەندامانی هەولێر لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق چالاکترین ئەندام بوونە لە داکۆکیکردن لە مافە سیاسی و رۆشنبیری یەکانی کورد.

٧ / هەڵوێستی هەندێک لە سەرۆک هۆزە کوردییەکان ئەگەر هاوبیروڕا بوونایە و بەرژەوەندی خۆیان ڕەچاو نەکردبوایە، ئەوا ئەم هەڵوێستەی کە هەولێر دژی ئینگلیز دەریخست چی لە شۆڕشی سالی ١٩٢٠ی ناوچەکانی ناوەڕاست و خوارووی عێراق کەمتر نەبوو کە ئاکامەکەی بووە هۆی دامەزراندنی حکومەتی کاتی عێراق و پێداچوونەوەی ئینگلیز بە سیاسەتەکەی لە عێراق.

٨ / خەڵکی هەولێر خۆی بە هاوچارەنووسی شارەکانی تر زانیوە وەک لە هەڵوێستی بەرامبەر بە ڕووداوەکانی ٦ی ئەیلول لە سلێمانی.

٩ / هەولێر بنکەیەکی سەرەکی کارە سیاسییە نهێنییەکانی کۆمەڵە کوردییەکان بوو لە سالانی بیستەکانی سەدەی بیستەم و هەروەها لە بواری چالاکییە ڕۆشنبیرییەکانیش دڕێخییان لە چالاکی سیاسی نەکردووە وەک لە یانەی فەرمانبەران و یانەی سەرکەوتن لە بەغدا.

١٠ / ڕۆشنبیران و ئەشراف و ناودارانی ئەم شارە هەڵوێستێکی بوێرانەیان دەرخستووە بەرامبەر چەوساندنەوەی خەڵکی، ئەمەش بە بەڵگەی ئەوەی کە یەکەمین شار بووە لە عێراق مانی گرتووە لە دژی بەرزی نرخی کارەبا کە لە توانای کەم دەرامەت نەبووە سوودی لێ وەربگرێت.

**پەراوێزەکان:**

(١) خليل مصطفى، المصدر السابق، ص١٩٨ .

(٢) کریم شارەزا، گۆڤاری زاری کرمانجی و دەوری لە پێشخستنی هونەری ڕۆژنامەڤانی کوردی دا، ڕۆژنامەڤانی "گۆڤار"، ژ(٩)، هەولێر، ٢٠٠٢، ل٢٤٩.

(٣) زاری کرمانجی "گۆڤار"، ژ(٥)، سالی دووەم، ١١ی تشرینی دووەمی ١٩٢٨، ل٦.

(٤) بڕوانە هۆنراوەکە لە : دیوانی بێکەس، ئامادەکردنی محەمەدی

مەلا کەریم، ج(٣)، بەغدا، ١٩٨٦، ل٩٦.
(٥) خليل مصطفى، المصدر السابق، ص ١٩٩ .
(٥) (ئەحمەد مختار زەهاوی، محامی عارف پشدەری، محەمەد علی بگ عبدالعزیز) ئیمزای یاداشتەکەیان کرد .
(٦) بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی کردنەوەی یانەی سەرکەوتن بڕوانە :باربو، یادگاری یانەی سەرکەوتن، ژ(١)، چاپخانەی نجاح، بەغدا، ١٩٤٣-١٩٤٤، ل٢٦-٣٢ .
(٧) نەوشیروان مستەفا، ژیان ....، ل٢٥٥ .
(٨) باربو، ل٣١ .
(٩) بڕوانە ئامانجەکانی لە : هەمان سەرچاوە، ٣٧-٣٨ .
(١٠) سروه اسعد، المصدر السابق، ص٣٥٣.
(١١) بڕوانە ناوی ئەو کەسانەی یارمەتییان داوەتە یانەی سەرکەوتن لە هەولێر لە : باربو، ل٧٢-٧٥ .
(١٢) باربو، ل٣٧-٣٨ .
(١٣) مصطفى نریمان، یانەی سەرکەوتنی کوردان، رۆشنبیری نوێ "گۆڤار"، ژ(١٣٤)، بەغدا، ١٩٩٤، ل٧٢ .
(١٤) دوای مردنی سەرۆکی یانە دوو دەستەی کارگێری هەڵبژێردرا، دەستەی یەکەم پێک هاتبوو لە (محەمەدامین زەکی سەرۆکی یانە، مەعروف چیاوک، ئەحمەد ئەفەندی، عبداللە لوتفی علی ئاغا، ئەمین رەواندوزی، محەمەد علی سقا، شکری محەمەد، شیخ غیاث الدین نقشبندی) و دەستەی دووەم پێک هاتبوون لە (توفیق وەهبی، جمال بابان، میرزا فرج، شێخ علی قرەداغی، صبری علی ئاغا، مصطفى شوقی، بشیر مشیر، عارف پشدری، داود حەیدەری). بڕوانە: مصطفى نریمان، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٢.
(١٥) شاکر فتاح، سەرچاوەی پێشوو، بەرگی سێیەم، ل١١٣ .
(١٦) وەرگیراوە لە :کونی رەش، جمعیە خویبوون ١٩٢٧ و وقائع پورە ارارات ١٩٣٠، تقدیم ومراجعە: عبدالفتاح علی یحیی البوتانی، اربیل، ٢٠٠٠، ص١٣١.
(١٧) گەلاوێژ "گۆڤار"، ژ(٥-٦)، ١٩٤٢، ل ٩٥.
(*) لە بنەماڵەیەکی ناوداری هەولێرن و خاوەنی چەند موڵک و گوند بوونە هەروەها لە زەنگینەکانی بازاڕ بوونە لە دیارترین ناسراوەکانیان فەتاح چەلەبی، شەهاب چەلەبی، مەلا سالح چەلەبی و لە گەورە بازرگانەک-انی نێوان (هەولێر و دەرەوەی عێراق) بوونە بە تایبەتی (ئەحمەد چەلەبی) و ئەم بنەماڵەیە شوێنەواریان لە قەڵاتی هەولێر هەیە .
(١٨) اربیل في اربعة ....، ص ٥٥ .
(١٩) کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەک ....، بەرگی دووەم، ل٣١٨.
(٢٠) هەمان سەرچاوە، ل ٣١٨- ٣١٩.
(٢١) هەمان سەرچاوە، ل٣٢٠.
(٢٢) عبدالرزاق الحسني، تاریخ الوزارات ....، ج(٣)، ص٧، سید مولود بیخالی، هەولێرم وا....، بەرگی دووەم، ل ٢١.
(٢٣) کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیک ....، بەرگی دووەم، ل٣٢١.
(٢٤) ئیسماعیل شکر، المصدر السابق، ص٤٧.
؟؟؟ یەک عانە دەکاتە چوار فلس.
(٢٥) کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەک ....، بەرگی دووەم، ل٣٢٢.
(**) رەمزی کوڕی نافیع ئاغای کوڕی حاجی رەشید ئاغایە لە ساڵی ١٩١٧ لە هەولێر لە دایک بووە، بنەماڵەکەیان هەر لە سەرەتای هاتنی ئینگلیز بۆ هەولێر و داگیر کردنی شارەکە دژی دەسەڵاتیان وەستاون و حاجی رەشید ئاغاش لەم بوارە رۆڵێکی زۆر دیاری بینیوە، رەمزی خۆشی هەر لە تەمەنی گەنجێتیدا تێکەڵ بە کاری سیاسی بووە بە مەبەستی رزگاری نەتەوەکەی کاری کردووە و لە ئەنجامی دەستگیرکردنی تووشی نەخۆشی دەبێت و لە ساڵی ١٩٤٧ مردووە. بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی بنەماڵەی حاجی رەشید ئاغا و چالاکییەکانی رەمزی نافیع بڕوانە: دبلیو. ار. هی، المصدر السابق، ج (١-٢)، مۆللەر، لە رۆژهەڵاتی گڕگرتوودا، و: بدران احمد حبیب، هەولێر، ١٩٩٢،
(٢٦) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: فەرهاد پیربال، حیکایەتەکانی باوکم ....، ل ٢٢٠-٢٢٢.
(٢٧) کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەک....، بەرگی دووەم، ل٣٢٣.
(٢٨) هەمان سەرچاوە، ل٣٢٤، ئیسماعیل شکر، المصدر السابق، ص ٤٧-٤٨ .
(٢٩) کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەک....، بەرگی دووەم، ل ٣٢٦.
(٣٠) هەمان سەرچاوە، ل ٣٢٧.
(*) ناوی حوسێن کوڕی محەمەدە و ناسراوە بە (حوسێنی مەلای) ئاغای گوندی قازیخانە بووە و لە خولی شەشەم و نۆیەمی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق بە نوێنەرایەتی لیوای هەولێر ئەندامی ئەنجومەن بووە، لە ساڵی ١٩٥٣ جوتیارەکانی گوندەکەی دژی هەڵدەستنەوە و سوێند دەخۆن کە چیتر کاری سوغرەی بۆ نەکەن و ئەو برە گەنمەی داوای کردبوو لە جوتیارەکان

پێی نەدەن، دواتر ئەم راپەرینە تەشەنە دەکات زۆربەی گوندەکانی دەشتی هەولێر دەگرێتەوە هەر بۆیە بە سالی سوتێند خواردن ناسراوە. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: مەهدی محەممەد قادر، پێشهاتە سیاسییەکانی کوردستانی عێراق ١٩٤٥-١٩٥٨، چ(١)، سلێمانی، ٢٠٠٥ ، ل ٢٣٩ ـ٢٥٩.

(٣١) کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەک ....، بەرگی دووەم، ل ٣٢٨.

(٣٢) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: محمد ملا احمد، خويبون والعلاقات الكردية ـ الارمنية، اربيل، ٢٠٠٠، ٣٩-٤٩.

(٣٣) خليل مصطفى، المصدر السابق، ص ٢٢٧.

(٣٤) سروه اسعد، المصدر السابق، ص٣٣٨.

(**) خەڵکی کەرکوک بووە و لە کۆیە بووە مامۆستا و دواتر گواستراوەتەوە بۆ هەولێر و گرنگی بە شیعر نووسین داوە و نازناوی (مامند کەرکوکی) هەبووە و بەشداری لە ژیانی سیاسی کردووە دوای دامەزراندنی حزبی هیوا. بڕوانە: کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەک....، بەرگی دووەم، ل ٢٩٦.

(٣٥) هەمان سەرچاوە، ل ٢٩٧، سروه اسعد، المصدر السابق، ص ٣٤٠.

(٣٦) خليل مصطفى، المصدر السابق، ص٢٣٢، کمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەک ....، بەرگی دووەم، ل٢٩٧.

(٣٧) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: المصدر نفسه، ص٢٨٩- ٢٩٢.

(*) ماوەیەک دەبێتە سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردی سوریا.

(٣٨) خليل مصطفى، المصدر السابق، ص٢٣١.

(٣٩) سروه اسعد، المصدر السابق، ص٣٤٠.

(٤٠) خليل مصطفى، المصدر السابق، ص ٢٣٢.

(٤١) عبدالله زەنگەنە، عەبە هەولێری و کۆمەڵەی لاوانی کورد، هەولێر "گۆڤار"، ژ(١٠)، بەهاری ٢٠٠١، ل٩١.

(٤٢) سروه اسعد، المصدر السابق، ص ٣٤٣-٣٤٤.

(٤٣) المصدر نفسه، ص٣٢٤.

(٤٤) کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەک ....، بەرگی دووەم، ل٢٩٩.

(٤٥) ئاکۆ عبدالکریم شوانی، شاری سلێمانی ١٩١٨-١٩٣٢، چ(١)، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل٢٢٥.

(٤٦) هەمان سەرچاوە، ل ٢٢٣.

(٤٧) پێک هاتبوون لە (مستەفا شەوقی- سەرۆک، رشید نجیب- سکرتێری یەکەم و ئەحمەد خواجە- سکرتێری دووەم، خلف شوقی داودی، محمود جودت، عزتی تەل، علی عرفان، حمید جودت، امین رواندوزی، فائق کاکە امین، روف بگ جلالی، بشیر مشیر) بوون. ئەحمەد خواجە، چیم دی، بەرگی سێیەم، ل٣٠.

(٤٨) هەمان سەرچاوە، ل٣١ .

(٤٩) ئەحمەد خواجە، چیم دی، بەرگی سێیەم، ل٣١، خليل مصطفى، المصدر السابق، ص٢١٨ .

(٥٠) خليل مصطفى، المصدر السابق، ص ٢٢١، سروه اسعد، المصدر السابق، ص ٣٥٠.

(٥١) المصدر نفسه، ص ٣٥٦ .

(٥٢) بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی دەستەی دامەزرێنەرانی بڕوانە: خليل مصطفى، المصدر السابق، ص ١٨٢-١٨٣.

(٥٣) سروه اسعد، المصدر السابق، ص٣٣٣.

(٥٤) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: عبدالله زەنگەنە، سەرچاوەی پێشو، ل٩٠-٩٢.

(٥٥) وليد حمدى، المصدر السابق، ص ٢٠٧، سروه اسعد، المصدر السابق، ص ٣٣٧.

(٥٦) عبدالله زەنگەنە، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٤-١٠٥.

(٥٧) هەمان سەرچاوە، ل ١٠٤.

(٥٨) خليل مصطفى، المصدر السابق، ص٢٤٤.

(٥٩) على سيدو گورانى، من عمان الى العمادية أو جولة في كردستان الجنوبية، ط(١)، مصر، ١٩٣٩، ص١١٤.

(٦٠) محەممەد عبدالله کاکەسوور، سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٦.

(٦١) خليل مصطفى، المصدر السابق، ص٢٤٤.

(٦٢) هەمان سەرچاوە، ل ٢٤٤، شاکر فتاح، ئاوێنەی ژیانم، هەولێر، ٢٠٠٣، بەرگی یەکەم، ل ١٦٦.

(٦٣) شاکر فتاح، سەرچاوەی پێشوو، بەرگی یەکەم، ل١٣١.

(٦٤) لەبارەی رۆژی ٦ی ئەیلول بڕوانە: نەوشیروان مستەفا، کوردستانی عێراق ....، ل ٦١ ـ٦٢.

(٦٥) خليل مصطفى، المصدر السابق، ص ٢٤٢، شاکر فتاح، سەرچاوەی پێشوو، بەرگی یەکەم، ل ١٣١.

(٦٦) هەمان سەرچاوە، ل ١٣١.

(٦٧) بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی سیاسەتی حکومەتی عێراق بەرامبەر پارت و رێکخراو و کۆمەڵەکان بڕوانە. کەمال مەزهەر، چەند ....،

(*) بەرگی دووەم، ل ٣٣١-٣٣٤، عبدالفتاح علي البوتاني، الحياة الحزبية ....، ص٢٩٩-٣٠٠.



# نەورۆزی ساڵانی ١٩٣٢-١٩٥٨ لە هەولێر

**دکتۆر ئیسماعیل شوکر**

دیارە هەموو نەتەوەیەک لەجیهاندا رۆژێکی تایبەتی هەیە و بە جەژنێکی تایبەتی خۆی دادەنێ، جا ئەم رۆژە دەشێ بۆنەیەکی نەتەوەیی و نیشتمانپەروەری، یان بۆنەیەکی ئایینی، یا کۆمەڵایەتیش بێت.

بەڵام مەرج نییە ئەم رۆژە پیرۆزە لەنێو نەتەوەیەکدا بە "نەورۆز" یان "نوروز" ناوببرێت، بۆ نموونە: میسرییە کۆنەکان بەر لە دایکبوونی مەسیح جەژنێکیان هەبووە و ساڵانەش تا ئەمڕۆ لە میسر یادی دەکرێتەوە و ئاهەنگی بۆ دەگێڕن، لاشیان رۆژێکی پیرۆزە و بە (شەم و ئەلنەسیم) ناوی دەبەن، لە رێکەوتی ٢٥ی ئادار ساڵانە ئاهەنگی بۆ دەگێڕن، چونکە پێیان وایە گەردوون لەو شەو و رۆژە دروست بووە و بەپێی زانستی گەردوونناسیش لەلای ئەوان لەم رۆژەدا شەو و رۆژ بەرانبەر دەبێت، واتە وەرزی بەهار دادێت، تەنانەت خەلیفەی فاتمی (معز الدولة) بەشداری ئەم ئاهەنگەی کردووە[١]. هەروەها هیندۆسییەکانیش ساڵانە یادی جەژنێکی پیرۆز دەکەنەوە بۆ ماوەی سێ رۆژ، لای ئەوان دەوام دەگیرێ و بەپێی داب و نەریتی کۆمەڵایەتییان ئاهەنگی بۆ دەگێڕن و بە جەژنی "هۆلی" ناوی دەبەن. ئەم جەژنە لە رۆژی (٢٥)ی ئادار دەست پێدەکات، ئەوان پێیان وایە لەو رۆژەدا خوداوەند خێر و بەرەکەت و رەحمەت بەسەریاندا دەبارێنێ، لەلایەکی دیکەشەوە بەپێی زانستی گەردوونناسی لەم شەوەدا، شەو و رۆژ، بەرامبەر دەبێت و وەرزی بەهار دەستپێدەکات[٢].

هەروەها فارسیش جەژنێکی تایبەتییان هەیە، پێی دەڵێن سیانزەبەدەر، کە لە (٢١)ی ئادار دەستپێدەکات و لە (٣)ی نیسان کۆتایی پێدێت[٣]، هۆی بەشداربوونی کوردەکانیش تێیدا دەگەڕێتەوە سەر ئەوەی: کورد و فارس لە بنچینەدا یەک رەگەزن و لەلایەکی دیکەشەوە دوو نەتەوەن پێکەوە بە هاوبەشی لە وڵاتێکدا دەژین و مێژوویێکی هاوبەشی لەمێژینەشیان هەیە.

دیارە نەتەوەی کوردیش ساڵانە جەژنێکی نەتەوەیی پیرۆزی خۆی هەیە، کە ساڵانە یادی دەکەنەوە و ئاهەنگیشی بۆ دەگێڕێ، گەر تەنانەت ئاگرەکەشی بە جەستەی خۆی کردبێتەوە[٤] ئاهەنگیشی بۆ گێڕاوە، هەر چەندە ناحەز و دوژمنانی کورد و

دەسەڵاتداران و داگیرکەرانی کوردستان بە گشتی-باشووری کوردستان-بەتایبەتی یادی ئەم جەژنەیان قەدەغە کردووە، یا هەوڵی قەدەغەکردنیان داوە و گەلێ جاریش بە بڕیاری تایبەتی ڕۆژی (١)ی ئاداریان ناو ناوە جەژنی دار و درەخت، تا سیما و مۆرکی کوردایەتی پێوە نەمێنێ و ئاهەنگیشیان بۆ گێڕاوە، یاخود گەلێ بیانووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئایینییان هێناوەتەوە تاکو قەدەغەی بکەن، لە نێوان ئەم ماوە مێژووییەی کە ئێمە دەستنیشانمان کردووە بۆ نووسینی باسەکە، واتە -١٩٣٢- ١٩٥٨- بیانووی ئایینی لە پێشەنگی بیانووی سیاسی بووە، هەوڵی ئەوەش دراوە لە ڕێگای ئایینییەوە جەژنی نەورۆز قەدەغە بکرێت و پروپاگەندەی ئەوەیان دەکرد، کە کردنەوەی ئاگری نەورۆز مانای یادکردنەوەی ئایینی زەردەشتییە، واتە دەبن بە ئاگر پەرست، هەندێ لە پیاوە بەناو ئایینییەکان و کۆڵکە خوێندەوارێکی ئایینیش پشتگیری ئەم بۆچوونەیان دەکرد، دەشێ بڵێین ئەمانە یا بە تەواوی لە ئایین نەگەیشتوون، یا بەکرێگیراوی ڕژێمی ئەوسابن، لەلایەن ڕژێمەوە هاندرابن بۆ ئەم مەبەستە.

بەڵام ئەوەی ڕاستییە، کورد بەر لە ئایینی ئیسلامیش ئاگر پەرست نەبوو، چونکە بەپێی سەرچاوە مێژووییە ئیسلامییەکان، کە بە ناوی-کتب الفتوح-ناو دەبردرێن ئەم ڕاستییە دەسەلمێنن و ئەوەشمان بۆ بەدیار دەخەن کە کورد بەر لە ئایینی ئیسلام، سێ جۆرە باوەڕی ئایینی هەبووە، ئایینی زەردەشتی[٥]، ئایینی مەسیحی، ئایینی ئیبراهیم خەلیل[٦]. دوای باوەڕهێنانی کورد بە ئایینی ئیسلامیش، دەتوانین ڕێ بەخۆمان بدەین-بەبێ دەمارگیری نەتەوایەتی- کە کورد یەکێکە لە نەتەوە دەگمەنەکانی نێو ئیسلام، کە پابەندی ئایینی ئیسلامە-ئەگەر لە پێشەنگی هەمووان نەبێت، ئەمەش باشترین سەروەری و شکۆمەندییە بۆ نەتەوەی کورد، ئەمە لەلایەک، ئاگر کردنەوەی جەژنی نەورۆز لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ بە واتای ئاگر پەرستی نایەت، بەڵکو لە سەرەتا، کە ئاگر لە شوێنە بەرزەکان کراوەتەوە نیشانەی سەرکەوتن بووە و مژدەدەری خۆشی بووە و لە جیاتی هۆیەکانی ڕاگەیاندنی ئەمڕۆ ئاگر بەکارهێنراوە، لەلایەکی دیکەوە، بێجگە لەم بەڵگانەش، یەکەم کەس لە نێو موسڵمانان باجی جەژنی نەورۆزی لادابێ خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب (خوا لێی ڕازی بێت) بووە[٧]، هەموو کەس ئەم ڕاستییەش دەزانن، کە ئەم پیاوە سەروماڵ و گیانی خۆی لە ڕێی ئیسلام بەخت کردووە، جا ئەگەر ئەم جەژنە و ئاگر کردنەوەکەی دژی ئایینی ئیسلام بوایە، ئەوا-نەک هەر تەنانەت باجەکەی لانەدەدا، بەڵکو بەیەکجارەکیش قەدەغەی دەکرد، پێشمان وانییە ڕژێمەکانی ئەم سەردەمە لە خەلیفە عومەر موسڵمان تر بن و بەتەنگ ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوەبن.

جا لێرەدا ئەم ڕاستییانە بەڵگەی ڕاست و دروستن بۆ ئەوەی ئاگرکردنەوەکە بۆ یەکەم جار کە کاوەی ئاسنگەر بەسەر زوحاکدا[٨] زاڵ بووە، ئاگرەکەش نیشانەی مژدەی خۆشییە[٩]. بەپێی سەرچاوە مێژووییەکان دوای خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب-بەتایبەتی لە سەردەمی ئەمەوییەکان و عەباسییەکاندا دووبارە باجی نەورۆز خراوەتەوە سەر کوردەکان و باشترین داهات بووە بۆ دەوڵەتەکانیان[١٠].

دیارە شاری هەولێری کوردایەتی، بە بەردەوام یادی جەژنی نەورۆزی کردۆتەوە، بە تایبەتی لە ماوەی ئەم ساڵانەی کە تایبەتمەندە بە باسەکەمان، بەپێی ئەو زانیارییانەی کە لەبەر دەستن، ئەوە دەسەلمێنن هەر لە ساڵانی ١٩٣٣ تا سەرەتای ساڵی ١٩٤٠، بەردەوام لە قەڵای هەولێر یادی جەژنی نەورۆزی پیرۆز کراوەتەوە-بە (نهێنی) لە ماڵی یەکێ لە گەنجەکانی قەڵای کوردایەتی، بەناو "سەلیم سەیدۆک" سەرەتای ئاهەنگەکە لە ئێوارەی ٢٠ لەسەر ٢١ی ئادار دەستی پێدەکرد، بەناوی یادی لە دایکبوونی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ)و گەلێ لە دەنگ خۆش و دەفژەن و زانا ئایینییە کورد پەروەرەکانیش بەشدارییان دەکرد-تا کاتی خەوتنی شەوان، لە دواییشدا، دەستدەکرا بە ئاهەنگ گێڕان و یادکردنەوەی جەژنی پیرۆزی نەورۆز تا بەیانی، بە قسەی عیززەدین فەیزی کوردپەروەر،

مامۆستای مێژوونووس حوسێن حوزنی موکریانی سەرپەرشتی زۆربەی ئاهەنگەکانی دەکرد و بابەتی زۆر بەپێزی لە مێژووی شۆڕشەکانی نەتەوەی کوردی دەخوێندەوە، بێجگە لە هۆنراوەی نیشتمانپەروەری شاعیرە کورد پەروەرەکان[11]. بۆ ئەوەی مێشکیان بە کوردایەتی زاخاو بدات.

هەرچەندە بەداخەوە نەمانتوانی زانیاری تەواو پەیدا بکەین، بۆ زانینی هەموو ئەوانەی بەشدارییان کردییە لەم ئاهەنگێڕانەی نێوان سالآنی ١٩٣٣- ١٩٤٠، بەڵام لێرەدا بە پێویستییەکی مێژوویی دەزانم، کە ناوی هەندێک لەوانە بێنینەوە وەکو: عەونی یوسف (١٩٠٨-١٩٨٨) جەلیل هوشیار مستەفا عوزێری (١٩١٨-١٩٨٥) تەحسین یاسین ئەسعەدی عومەر عوسمان (١٩١٧-١٩٤٧) بە ئۆمەر بەختیار ناسراوە، هادی چاوشلی (١٩١٩-١٩٩٦) عزەدیین فەیزی (١٩١٧-١٩٨٥) حوسێن حوزنی موکریانی (١٨٩٣-١٩٤٧).

مەلا عەبدولڕەحمان هەولێری و دەروێش ئیسماعیل، ئەحمەد حەمەدەمین دزەیی و نازم سەعید ئەسعەدی و چەندانی دیکە، تا نەورۆزی سالّی ١٩٤٠ بەردەوام بەشدارییان کردووە، بەڵام هەر لەم سالّەدا ڕژێمی ئەوسای عێراقی لە ڕۆژی سێیەمی دوای نەورۆز، سەلیم سەیدۆک دەگرێ بە تۆمەتی ئەوەی سالآنە ئاهەنگی نەورۆز ئەنجام دەدرێت[12]. بەپێی ئەو زانیارییانەی




کە (د. مارف خەزنەدار) بلاّوی کردۆتەوە لە ڕاپۆرتێکدا بە ناوی "هەندێ لە یادگارییەکانی نەورۆز" دیارە هەر لە شاری هەولێر لەو ماوەیەدا لە زۆر مالآن شەوان و ڕۆژانی نەورۆز دراوسێیەکان بەنهێنی ئاهەنگیان گێڕاوە لەو ماوەیەدا[13].

لەبەر ڕۆشنایی گۆڕانکارییە سیاسییەکانی سالآنی چلەکان لەناوە و لە ولآتە جیهانییەکان و سەرهەلّدانی شەڕی جیهانی دووەمی و پەیدابوونی چەند پارتێکی سیاسی، نەتەوەیی و نا نەتەوەیی لە هەولێر و سەرگەرمی ڕژێمی ئەوسای عێراق بە بەشداربوونی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە شەڕی دووەمی جیهاندا و داگیرکردنەوەی عێراق لەلایەنی بەریتانیاوە بوو بەهاندەرێک کە گەنجە ڕۆشنبیرە هەولێرییەکان بڕیاری ئەوە بدەن لە سالّی ١٩٤١ بۆ یەکەم جار سەیرانێکی "نهێنی" بۆ دێی قەتەوی، لەسەر سەروچاوەی ئاوی دێیەکە، دوای گەیشتن بەم شوێنە دەست بکەن بە ئاهەنگگێڕان و یادکردنەوەی جەژنی نەورۆز، سیاسەتمەداری کورد ڕێزدار (عەزیز محەمەد) ئەم ئاهەنگە بەم شێوەیە دەگێڕێتەوە:

"لە ئاداری سالّی ١٩٤١ لە ڕۆژی پێنج شەممە کە ڕێککەوتی ٢٠ی ئادار بوو بەڕێوەبەری قوتابخانەی هەولێری یەکەمی سەرەتایی -عزەدین فەیزی- بە گشتمانی ڕاگەیاند بەتایبەتی قوتابییانی پۆلی پێنجەم و شەشەم کە نزیکەی زیاتر لە ٣٠ خوێندکار دەبووین، کە دەبێ بەیانی ئامادەبن بۆ سەیران بۆ سەرچاوەی ئاوەکەی قەتەوی[14]، ئێمەش بەیانی گشتمان ئامادەبووین و بەڕێوەبەر و چەند مامۆستایەکی دیکەش لەگەلّمان هاتن بۆ گەشتەکە و دوای پشوودان مامۆستا عزەدین فەیزی لێی پرسین کێ دەزانێ ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە؟ ئێمە هەر یەکە وەلآمەکمان دایەوە و وتی: (ڕۆلّەکانم ئەمڕۆ نەورۆزە) ئینجا

دەستی کورد بەباسی نەورۆز و پەیوەندی بەکورد و پیرۆزی ئەم رۆژە لە مێژووی کورد"[١٥].

دەکرێ بڵێین ئەم نەورۆزە یەکەم نەورۆزە بەنهێنی لە سەیرانێک لەدەرەوەی شاری هەولێر کرابێت، هەرچەندە (د. مارف خەزنەدار) لەو رایە دایە کە نەورۆزی ساڵی ١٩٤٥ی (زار مفتاح)[١٦]. بەیەکەم نەورۆزی نهێنی دادەنێ کە لەسەیرانێک لەلایەن گەنجە رۆشنبیرە هەولێرییەکانەوە ئەنجام درابێ[١٧]. بەڵام راستییەکەی نەورۆزی ساڵی (١٩٤١)ە، جا دەشێت مامۆستای بەڕێز ئەم یادکردنەوەیەی نەبیستبێت یاخود لەیادی کردبێت، چونکە ئەو لە باسەکەی تەنیا پشتی بە بیرەوەرییەکانی خۆی بەستووە، ئەگەر نا خەزنەدار لە ساڵی ١٩٣٩ لەگەڵ چەند هەواڵێکی دیکە بەچکە شێران بوون لە پارتی (هیوا)[١٨]، هەروەکو خۆی دانی بەم راستییەوە ناوە[١٩].

دەتوانین بڵێین لە نێوان ساڵانی (١٩٣٩-١٩٤٥) وەرچەرخانێک لە یادکردنەوەی جەژنەکانی نەورۆز سەری هەڵداوە، ئەوەتا لە نێوان ئەو ساڵانە لەجیاتی لە ماڵان ئاهەنگەکان ئەنجام بدەن لە دەرەوەی شار بە ژمارەیەکی زۆری بەشداربوان ئەنجام دراون، دەشێ ئەم وەرچەرخانە بگەڕێتەوە سەر چەند هۆیەکی دی، جگە لەوانەی کە لە پێشەوە باسمان کرد، لەوانە دامەزرانی پارتی هیوا لە کۆتایی سییەکان و سەرهەڵدانی چەند شانەیەکی پارتی کۆمەنیستی عیراق لە هەولێر. لە سەرەتای ساڵی (١٩٤٣)دا[٢٠].

سێیەم ئاهەنگی جەژنی نەورۆز لەسەر ئاوی تووڕەق[٢١]. لەلایەن زۆربەی گەنجەکانی هەولێر - بەنهێنی- ئەنجامدرا، لە ٢١ی ئاداری ساڵی ١٩٤٦دا. لەم نەورۆزەدا ئەندامانی پارتی کۆمۆنیستی کوردستان (شۆڕش)[٢٢] و پارتی کۆمەنیستی عێراق رۆڵی کاریگەریان گێڕا لە یادکردنەوەی ئەم نەورۆزەدا، هەروەها دەبێ ئەم راستییەش بوترێت کە گەلێ لەو گەنجانەی کە بیری نەتەوەیی لە دڵ و دەروونیان رەگی داکوتابوو، لەم ئاهەنگە بەشدارییان کردووە، لەوانە وەکو: مەلا عەبدوڵڵا ئیسماعیل و ساڵح شێرە و ئەحمەد حەمەدەمین و (د. مارف خەزنەدار و مەحمود عوسمان و حەیدەر عوسمان و تەحسین یاسین ئەسعەدی و عەلی فەتاح دزەیی و محەمەد شەهاب دەباغ) و چەندانی دیکە.

شێخ محەمەد محەمەد (شێخە شەل) و جەمال حەیدەری، کە وەک سەرپەرشتیاری ئاهەنگەکە و رێکخەری یادەکە هەڵسوکەوتیان دەکرد[٢٣]. دیارە لە دوای نەورۆزی ساڵی ١٩٤٥. جەنگی جیهانی دووەم بەرەو دوا هەناسە هەنگاوی دەنا و گۆڕانکارییەکی بنچینەیی لە رووی بیری کوردایەتی سەری هەڵدا، هەڵوێستی میللەت بەرانبەر بە ئیمپریالیزم و داگیرکەرانی کوردستان گەیشتبووە لوتکەی رق و کینە. لە کاتێکدا تازە شۆڕشی کورد لە باشووری کوردستان بەرەو کۆتایی و دامرکاندنەوە دەڕۆیی(*). ئەمانە هەموو بوونە هۆی ئەوەی کە ئەم بارە نالەبارە ببێتە زیادبوونی هەوڵ و تەقەلادانی رۆشنبیرانی شاری هەولێر بەتایبەتی و هەموو شارەکانی دیکەی کوردستان بە گشتی بۆ وەدەستهێنانی ئامانجە سەرەکییەکانی نەتەوەکەمان و چەندین سروودی نیشتمانپەروەریش هاتنە کایەوە بۆ ئەم مەبەستە[٢٤].

بە پێی ئەو زانیارییانەی کە هەن دەتوانین چەند ناوێکی بەشداربووان دەستنیشان بکەین، کە رۆڵی کاریگەریان هەبووە لە ئاهەنگێڕانی نەورۆزی ساڵی ١٩٤٦، لەوانە: دکتۆر مارف خەزنەدار، تەحسین یاسین ئەسعەدی، جەماڵ حەیدەری (١٩١٨-١٩٦٣)، حەمید عوسمان، حەیدەر عوسمان، ئۆمەر بەختیار، عەزیز محەمەد، ئەنوەر تاهیر بەکر، خەلیل خۆشناو، شێخ محەمەد محەمەد (شێخە شەل)، عەبدولوەهاب حاجی حەسەن، نازم سەعید ئەسعەدی، حوسێن رەشوانی، چەندانی دیکە[٢٥].

کۆتایی هاتنی شەڕی دووەمی جیهانی و ژێرکەوتنی فاشییەکان بە سەرەتایەک دادەندرێت بۆ قۆناغێکی نوێ لەمێژووی جیهانیدا، چونکە وەک دەڵێن ئەگەر بەرئەنجامی شەڕی یەکەمی جیهانی، سەرهەڵدان و بەرەو پێش چوونی هەستی نەتەوایەتی بێ، ئەوا شەڕی دووەمی جیهان بووە هۆی لەدایکبوونی شۆڕشی نەتەوایەتی لە جیهان بەگشتی و لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست

بەتایبەتی، ئەمەش کاریگەریی خۆی لەسەر کورد بەگشتی و هەولێر بەتایبەتی، هەبووە، بۆیە دەبینین نەورۆزی ساڵی ١٩٤٦، وەرچەرخانێکی مێژوویی بەخۆیەوە دەبینێ و جەماوەر زیاتر بەشداری دەکەن، تێیدا بەراشکاوی جەمال حەیدەری هێرشی دەباتە سەر حکومەتی بەریتانیا و رژێمی پاشایەتی ئەوسا و رەخنە لە بەرپرسە کوردەکان دەگرێ. ئەم نەورۆزە لە ٢١ی ئادار لەسەر ئاوی تووڕەق ئەنجامدراوە و تێیدا بێجگە لە جەمال حەیدەری، شێخە شەل رۆڵی کاریگەریی بینیوە[٢٦].

دوای تێپەڕبوونی زیاتر لە ١٥ ساڵ بەسەر سەربەخۆیی عێراق بۆ یەکەم جار لە باشووری کوردستاندا رێدرا بەشاری هەولێر بە ئاشکرا ئاهەنگ بگێڕن. بە هەوڵ و تەقەلای عەونی یوسف و چەند لاوێکی رۆشنبیری هەولێر، نەورۆزە کرا لە گۆڕەپانی ئەوسای پشت سینەمای سەلاحەدینی ئێستا کرا، کە ئەوکات یاریگەی قوتابخانەی شاری هەولێر بوو، ئەم ئاهەنگە بەسەرپەرشتی ئەندامانی پارتی کۆمۆنیستی عێراق و پارتی دیموکراتی کورد بوو[٢٧].

دەتوانین بڵێین لەدوای نەورۆزی ئەم ساڵەدا قۆناغێکی تازە لە مێژووی هەولێر و نەورۆزەکانی دەست پێدەکات، چونکە لە راستیدا نەورۆزی ساڵی ١٩٤٧ گۆڕانکارییەکانی بەرچاو و وەرچەرخانێکی مێژوویی بەخۆوە بینی، لەبەرئەوەی هەولێر یەکەم شار بوو کە توانی رەزامەندی رەسمی لە میری وەربگرێت و بە ئاشکرا زۆرینەی جەماوەری شاری هەولێر بەشداری تیا بکات. هەرچەندە هەندێ لە پیاوە ئاینییەکان بوونە بەرهەڵستکاری، بەڵام توانرا کێشەکە چارەسەر بکرێت، دەشێ بەرهەڵستکارییەکە بگەڕێتەوە سەر ئەوەی، کە ژنان بەشداری ئاهەنگەکەیان کردبێت، چونکە ئایینی ئیسلام تا رادەیەک رێ نادات ژنان بەهەموو شێوەیەک بەشداری پیاوان بکەن، ئەمە جگە لە داب و نەریتی کۆمەڵایەتی ئەو سەردەم لە شاری هەولێردا[٢٨]. هەروەها دەشێ بوترێت ناحەزان و بەکرێگیراوانی رژێم رێ خۆشکەر بوون بۆ بەرهەڵستکارییەکە یا ئاگرەکەیان خۆش کردبێت، بۆ یەکەم جار لە مێژووی شاری هەولێر ژنان بەشداری ئەم نەورۆزەیان کردووە وەک (تەماشاکەر)[٢٩]. بەڵام دەبێ ئەوەشمان لەیاد نەچێت، کە ژنانی هەولێر لە هەمان ئەم ماوە مێژووییەدا وەکو براکانیان بەشداریی ئەم جەژنە پیرۆزەیان کردووە، بەڵام بەتەنیا، چونکە بەپێی داب و نەریتی کۆمەڵایەتی ئەوسا ماوە نەدەدرا بە ئافرەت بەشداری ئاهەنگگێڕان بکات، ئەوەتا هەر لە ساڵی (١٩٣٧-١٩٤٣)، سەربانی ماڵی نافیع یونس کە قەڵای کوردایەتی بووە، بەباشترین گۆڕەپانی ئاهەنگگێرانی کچە رۆشنبیرەکانی ئەو سەردەم کە هەموو ئەو ساڵانە بە نهێنی لە شەوی (٢٠ لەسەر ٢١)ی یادی ئەم جەژنە پیرۆزیان کردۆتەوە، لێرەشدا بەپێویستی دەزانم ناوی هەندێ لەو کچە دڵسۆزانە بێنم کە توانیمان لە وێنەیەکی فۆتۆگرافی کە لە ئەرشیفی ماڵی هاشم عەبدوڵلایە ناوەکان بزانین لەوانە:

(ساکینە سلێمان، فەریدە یونس، بەسێ سابیر، نەسرین و پەروین عومەر ئەمین، رەمزیە عەدلی، غەریبە نادر، فەتحیە محەمەد و چەندانی دیکە)[٣٠].

دیارە دوای ئەم نەورۆزە لەبەر توندوتیژیی سیاسەتی کۆنەپەرستانەی ئەوسای رژێم ماوە نەدراوە بە کورد بەگشتی و بە هەولێر بە تایبەتی، کە بە ئاشکرا ئاهەنگی نەورۆز بکرێت، بۆیە تا ساڵی ١٩٥٣ نەورۆز بەنهێنی کراوە، بەڵام لە ساڵی ١٩٥٣ لە هەولێر تواندرا نەورۆز دووبارە بە ئاشکرا بکرێت، بە هەوڵ و تەقەلای چەند ئەندامێکی پارتی دیموکراتی کورد، دڵسۆزانی نەتەوەکەمان، لەوانە: عەونی یوسف و جەلال حوسامەدین تاڵەبانی و چەندانی دیکە.

لە راستیدا نەورۆزی ساڵی ١٩٥٣ دەبێ شوێنێکی تایبەتی بۆ دابندرێت لە مێژوویی کورد بە گشتی و لە مێژووی شاری هەولێر بەتایبەتی، چونکە هەولێر یەکەم شار بوو لە باشووری کوردستان توانی رەزامەندی میری وەربگرێت، بێجگە لەمە لەو ساڵەدا تواندرا نەورۆزەکە لەجیاتی نەورۆزێکی ناوچەیی بکرێت بە نەورۆزێکی کوردستانی، چونکە نوێنەری زۆرینەی شارە

کوردییەکانی تێیدا ئامادە بوو، تەنانەت نزیکەی (١٧٦) کەس لە[٣١] کوردەکانی شاری بەغداش بەشدارییان تێدا کرد و ئامادە بوون، بێجگە لەمەش بۆ یەکەم جار ژنانی هەولێر بەکردار بەشداری ئەم ئاهەنگەیان کرد، تێدا رەمزییە عەدلی وەک ئەندامێکی سەرپەرشتیاری ئاهەنگەکە و لەگەڵ تیپی هەڵپەرکێی کچان بوو[٣٢].

بەشداریبووانی ژنانیش بە کردەوە لەم نەورۆزەدا، دەتوانرێت بە شۆڕشێک دابندرێت لەسەر داب و نەریتی کۆمەلایەتی کوردەواری ئەوسای شاری هەولێر، بوو بەرێ خۆشکەر بۆ ئەوەی ئیتر ژنان، تەنانەت بەشداری لەکاری سیاسیش بکەن.[٣٣]

ئاهەنگی یەکەم نەورۆزە ئاشکرایە لە شوێنی ئوتێلی زەیتوونەی ئەمڕۆ ئەنجامدرا، لەو سەردەم باشترین سەیرانگای هەولێر بوو، لەم ئاهەنگەدا جەلال حیسامەدین تاڵەبانی وتارێکی خوێندەوە -زیاتر لە سەعاتێکی خایاند و تێیدا باری نالەباری کوردی خستە ئەستۆی داگیرکەرانی کوردستان و ئیمپریالیزمی جیهانی و داوای لە دانیشتووانی هەولێر کرد، کە دەبێ زیاتر تەبا و یەکگرتوو بن و هەوڵ بدرێت ئاستی رۆشنبیریی بەرەو پێشتر هەنگاو بنێت، بۆ ئەوەی بتواندرێت ئامانجە سەرەکییەکانی کورد بهێندرێتە دی[٣٤].

ئەم وتارەش بوو بە یەکێ لە هۆیەکانی هەولدانی دەستگیرکردنی لە ساڵی ١٩٥٤ لەلایەن حکومەتی نوری سەعیدەوە، بۆیە بە ناچاری سیاسەتمەداری کورد رێزدار (جەلال تاڵەبانی) بە نهێنییەوە عێراقی بەجێهێشت و رووی کردە سوریا، لەوێ وەک پەنابەرێک مایەوە، شایەنی باسە، جەلال تاڵەبانی، یەکەم ئەندامی لیژنەی ناوەندی پارتی بوو، کە هەوڵی دەستگیر کردنی درا لەلایەن رژێمی ئەوسای عێراق و بوو بەپەنابەر.

دیارە نەورۆزی ساڵی ١٩٥٤یش شوێنێکی تایبەتی هەیە لە مێژووی نەتەوەی کورددا، چونکە لە سەرتاپای باشووری کوردستان ماوە درا، کە نەورۆز بە ئاشکرا بکرێت، بە تایبەتی دوای ئەوەی کە محەمەد فازل جەمالی پۆستی وەزارەتی لە ١٧ی ئەیلوولی ١٩٥٣ وەرگرت، کوردستان بەتایبەتی و عێراقیش بەگشتی، لە ماوەی کەمتر لەساڵێک هەناسەیەکی ئازادی و دیموکراسی هەڵمژی، هەروەها سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی نوێ مێشکی زاخاو درابوو بە بیرۆکەی دیموکراسی، هەروەها باوەڕیشی بە لیبرالیەت هەبوو، کە ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ماوەیەک لە وڵاتانی ئەوروپا ژیانی بەسەر بردووە و لە ساڵی ١٩٣٥ توانیبووی بڕوانامەی دکتۆرا لە بەشی زانستی دەروون و پەروەردە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەرگرێت، کە بووە جێی رەزامەندی زۆرینەی دانیشتووانی عێراق بەگشتی و کورد بەتایبەتی[٣٦]. هەر بۆیەش لە سەرتاپای کوردستان ئاهەنگی نەورۆز بەشێوەیەکی دیکە و بە جۆرێکی دیکە گێردرا و تێیدا گەلێ وتاری سیاسی و سروودی نیشتمانپەروەری دەوترا و زەماوەند و هەڵپەرکێ ساز دەکرا.

دیارە لە دوای ئەم ساڵە، دووبارە نوری سەعید جڵەوی دەسەلاتداری دەگرێتەوە و رژێمی پاشایەتی دژی هەموو بۆنەیەکی نیشتمانپەروەری نەتەوەی کورد دەوەستێت، چونکە ئەم بابەتانەی وا لێکدەداوە کە هاندەرن بۆ زیادبوونی هەستی نەتەوایەتی کورد، دەبن بە لەمپەر لە دژی دەسەلاتی پاشایەتی، دیارە دووبارە نەورۆز بە نهێنی ئەنجامدراوە تا ساڵی ١٩٥٨.

بە هاتنی رژێمی کۆماری لە عێراق، کۆتایی هاتنە بە رژێمی پاشایەتی و وەرچەرخانێکە لە مێژووی گەلی عێراق بە گشتی و نەتەوەی کورد بە تایبەتی، کورد بە گشتی و هەولێریش بە تایبەتی زۆر بە دڵخۆشییەوە پێشوازییان لەم گۆڕانکارییە کرد، بەمەش قۆناغێکی نوێ لە مێژووی کورد بە گشتی و مێژووی هەولێر بەتایبەتی دەست پێدەکات.

**پەراوێزەکان:**

١- لەبارەی وشەی (نەورۆز) بڕوانە: محمدامین رشید، النوروز في الأدب الفارسي حتى نهاية العصر الغزنوي، رسالة ماجستير، غير منشورة، جامعة عين شمس قسم اللغات الشرقية، ١٩٧٦، ص٢-١٠، د. حسين قاسم

عـزیز. نوروزیات، "کـۆڕی زانیـاری عـێراق" (دەسـتەی کـورد)، گـۆڤـار، بەرگی یەکەم، ١٩٨٠، ل٤٥٠-٤٥١.
٢- دیمانە لەگـەڵ دکـتـۆر نازم جـەلال ئیـسمـاعـیل لە ڕۆژی ٢٧ کـانوونی دووەمی ٢٠٠٠.
تێبینی/ نازم جەلال بڕوانامەی دکتۆرای لە هیندستان وەرگرتووە و بۆ ماوەی پێنج ساڵ لەوێ ژیاوە.
٣- دیمانە لەگەڵ عەبدوڵلا حەسەن زادە لە ١ی ئاداری ٢٠٠٠، ناوبراو سکرتێری دەفـتـەری سیـاسی پارتی دیموکـراتی کـوردسـتـانی ئێران بوو، دیمانە لەگـەڵ هاشم سەعـید قـادر بۆکـانی لە ١٣ی نیـسانی ١٩٩٧، دیمانە لەگـەڵ خالید مـحەمـەد (هێدی) لە ٢١ی تشـرینی یەکەمی ١٩٩٥.
٤- خۆ سووتاندنی شۆخەکانی کوردسـتانی تورکـیـا لە هەندەران و لە ناوەوەی تورکـیـا باشـتـرین بەڵگەی ڕوون و ئاشکران، کە ئەم ڕاسـتیـیە دەسەلمێنن.
٥- ئاییـنی زەردەشتی بەهیچ شـێـوەیەک بە واتای ئاگـرپەرسـتی نایەت، بەڵکو بە هۆیەکی ڕووناککردنەوە دادەنرێت.
٦- طبـري، تاريخـه، تحـقـيق ابو الفـضل ابراهيم، مطبعـة دار المعارف، مـصـر، ١٩٧٠، ص٤، ٤٨-٥٦، خليـفـة بن خياط، تـاريخه، تحقيق د. اكرم ضيـاء العـمـري، دار القلم بيـروت، ١٩٧٥، ص١٦٩، البـلاذري فـتـوح البلدان، تحقيق صلاح الدين المنجد، مطبعة لجنة البـيـان العـربي، القـاهرة، بلا، ت١، ص٢٤٣، للمزيد من التفاصيل ينظر: فائزة محمد عزت، الكورد في اقليم الجـزيرة وشـهـروزر في صدر الاسـلام، رسـالة مـاجسـتـر غيـر منشـورة، كلية الاداب/ جامعة صلاح الدين، ١٩٩١.
٧- د. حـسين قـاسم، المصـدر نفـسـه، ص٤٦٧.
٨- لە سەرچاوە فارسییەکان بە (بیوراسب و لە سـەرچاوە ئیـسـلامـیـیـەکـان بە ئەژدەهاک یان ئەزدەحاق یان ضوحاک).
هاتووە.
٩- لەبارەی چۆنیـەتی سـەرکـەوتنی کـاوە بەسەر زوحاک و مێژووە ئەفسانەکەی بڕوانە: دکـتـۆر حـسین قـاسم عـزیز: المصدر نفـسـه، ل٤٤١-٤٥٩، مـحمـد امين رشـيـد: المصـدر نفـسـه، ص١٧-٣٣.
١٠- د. حسين قاسم عزيز، المصدر نفسه، ص٤٦٧.
١١- سلیم سـەیدۆک، کـوڕی عـەبدوڵلا کوڕی حەسـەن کوڕی عیـسـای کـوڕی فەقێ وسوێ جوولەمێرگییە، لە ساڵی ١٩١٠ لە قـەڵای هەولێـر لەدایک بووە و لە ڕێکەوتی ٢٤ی ئەیلوولی ١٩٧٠ کـۆچی دوایی کـردووە. چاوپێکەوتن لەگەڵ سـەلاح سەلیم سەیدۆک لە ١٨ی کانوونی یەکەمی ١٩٩٧ بۆ زیاتر زانین بڕوانە: تاریق جامباز، نەورۆز ساڵانی ١٩٣٣-١٩٤٠ لە قەڵای هەولێر ئاڵای ئازادی، "ڕۆژنامـە" ژمـارە ٦٦، ئاداری ١٩٩٣.
١٢- یادی عـزەدین فـەیزی، ئامـادەکـردنی سـۆران عـزەدین فـەیزی، ١٩٨٠، هەولێـر، ل٨٥-٨٨، تاریق جـامبـاز، هەمان سەرچاوەی پێشوو، دیمانە لەگەڵ تەحسین یاسین ئەسعەدی لە ڕۆژی ٣ی ئەیلوولی ١٩٩٨. سـاکـینە سلێـمـان، ٣ی ئەیلوولی ١٩٩٧، دیمانە لەگـەڵ فـەریدە یونس لە ١٣ی ئەیلوولی ١٩٩٧، ئەم دوو خـاتوونە وتیـان ناوەکانیـان لە براکانیـان موسا سلێمان و نافیع یونس وەرگرتووە.
١٣- د. مـارف خـەزنەدار، هەندێ لە یادگـارییـەکـانی نەورۆز "مـیـدیا" "ڕۆژنامـە" ژمـارە ٦٣ سـاڵی چوارەم، ٢٧-٢-٢٠٠٠.
١٤- قەتەوی دێیەکە لە خوارووی هەولێر، لەسـەر ڕێگای هەولێـر-مـەخـمـوور، نزیکەی ٣ کـیـلۆمـەتر دوورە و سەرچاوەی ئاوەکەشی وشک بووە.
١٥- چاوپێکەوتن لەگەڵ عەزیز محەممەد لە ٢٠ی ئەیلوولی ١٩٩٩.
١٦- زار مفتاح-باشترین سەرچاوەی ئاوی هەولێر بووە ئەو سەردەم. کە شوێنەکەی گۆڕستـانی شێخ ئەحمـەدی ئێـستـایە. دەکـەوێتـە بەشی خـۆرهەڵاتی شـاری هەولێر.
١٧- د. مارف خەزنەدار، هەندێ یادگاری نەورۆز-هەمان سەرچاوەی پێشوو.
١٨- لەبارەی ڕۆڵی هەولێر لە پارتی هیـوا بڕوانە: ئیـسمـاعیل شکر، اربيل دراسة تاريخية في دورها الفكري والسياسي ١٩٣٩-١٩٥٨، رسالة دكتوراه غيـر منشـورة، كلية الاداب/ جامعـة صلاح الدين، ١٩٩٩، ل١١١- ١١٥.
١٩- دیمانە لەگەڵ دکتۆر ئەحمەد عوسمان ئەبو بەکـر، لە ٣ی ئاداری ١٩٩٧. دیمانە لەگەڵ دکتۆر مارف خەزنەدار لە ٣ی ئاداری ١٩٩٧.
٢٠- سـاڵح حـەیدەری: لمحات من تاريخ الحركة الوطنية والثورية في كوردستان العراق، عزالدين ملا افندي، مذكراته مخطوط، دفتر الخامس.
٢١- ئاوی تووڕەق دەکـەوێتـە نزیک دێی تووڕەق لە بەشی خـۆرئاوای هەولێـر نزیکەی سێ کـیلۆمـەتر لە هەولێـرەوە

دوورە.
٢٢- لەبارەی پارتی شۆڕش بڕوانە: دکتۆر عبدالستار تاهیر شەریف، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٨١-١٣٣.
(*) مەبەستمان ڕاپەڕینی کوردە لە ساڵانی (١٩٤٣-١٩٤٥) لە باشووری کوردستاندا بە سەرکردایەتی مەلا مستەفا کە هەولێر ڕۆڵی کاریگەریی هەبووە تیایدا، بۆ زیاتر زانین بڕوانە: ئیسماعیل شوکر، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٤-١٧١، ٢٠١-٢٠٣.
٢٣- دکتۆر مارف خەزنەدار، هەندێ لە یادگارییەکانی نەورۆز، هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٢٤- لەوانە ئەی ڕەقیب هەر ماوە قەومی کورد زوبان و ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە.
٢٥- دیمانە لەگەڵ عەزیز محەمەد لە ٢٠ی ئایاری ١٩٩٦، دیمانە لەگەڵ شێخ محەمەد محەمەد (شێخە شەل) لە ١٦ی حوزەیرانی ١٩٩٦، دیمانە لەگەڵ حوسێن ڕەشوانی لە ١٦ی ئەیلوولی ١٩٩٦، دیمانە لەگەڵ نازم سەعید ئەسعەدی لە ٣ی کانوونی یەکەمی ١٩٩٧، دیمانە لەگەڵ دکتۆر مارف خەزنەدار لە ٣ی ئاداری ١٩٩٧، دیمانە لەگەڵ حەیدەر عوسمان لە ١٧ی گەلاوێژی ١٩٩٧، دیمانە لەگەڵ خالیس جەواد لە ٣ی ئاداری ١٩٩٧، دیمانە لەگەڵ مەلا عەبدوڵڵا ئیسماعیل (مەلا ماتۆڕ) لە ١٦ی ئایاری ١٩٩٧.
٢٦- دیمانە لەگەڵ شێخ محەمەد محەمەد لە ١٦ی حوزەیرانی ١٩٩٦، دیمانە لەگەڵ کانەبی عەزیز لە ١٧ی ئاداری ١٩٩٨، دیمانە لەگەڵ جەلال شەریف لە ١٧ی ئابی ١٩٩٦.
٢٧- لە کۆنگرەی سێیەمی ساڵی ١٩٥٣ ناوی گۆڕا بوو بە (پارتی دیموکراتی کوردستان) بۆ زیاتر زانین بڕوانە: جلال الطالباني، كردستان والحركة التحررية الكردية، الطبعة الثانية، دار الطليعة، بيروت، ١٩٧١، ص١٥٢-١٥٤، دکتور عبدالستار طاهر شريف، المصدر نفسه، ص١٧٧-١٨٠.
٢٨- دیمانە لەگەڵ عەبدولوەهاب حاجی حەسەن لە ١ی ئاداری ١٩٩٧، دیمانە لەگەڵ خالیس جەواد لە ٣ی ئاداری ١٩٩٧، دیمانە لەگەڵ حەیدەر عوسمان لە ١٧ی گەلاوێژی ١٩٩٧.
٢٩- دیمانە لەگەڵ ساکینە سلێمان لە ٣ی ئەیلوولی ١٩٩٧، دیمانە لەگەڵ فەریدە یونس لە ٣ی ئەیلوولی ١٩٩٧، دیمانە لەگەڵ حوسێن ڕەشوانی لە ١٦ی ئەیلوولی ١٩٩٦، دیمانە لەگەڵ بەستێ سابیر لە ٧ی نیسانی ١٩٩٧.
٣٠- لە دیمانەیەک کە لەگەڵ خاتوو ساکینە سولەیمان، هاوسەری خوالێخۆشبوو هاشم عەبدوڵا چەند وێنەیەکی نەورۆزی ساڵانی ١٩٣٧و ١٩٣٨و ١٩٣٩، لەگەڵ چەند دیکۆمێنتێکی دیکە وەک دیارییەک پێشکەش بە خاوەنی ئەم باسە کرا لە ٣ی ئەیلوولی ١٩٩٧.
٣١- حەبیب محەمەد کەریم یەکێک بوو لەنێوان وەفدەکە.
٣٢- دیمانە لەگەڵ جەلال تاڵەبانی لە ٢٦ی حوزەیرانی ١٩٩٧، دیمانە لەگەڵ دکتۆر کەماڵ فوئاد لە ٢٤ی حوزەیرانی ١٩٩٧، دیمانە لەگەڵ مەلا عەبدوڵڵا ئیسماعیل لە ١٦ی ئایاری ١٩٩٧، دیمانە لەگەڵ خالیس جەواد لە ٣ی ئاداری ١٩٩٧، دیمانە لەگەڵ ڕەمزییە عەدلی لە ٧ی نیسانی ١٩٩٧، دیمانە لەگەڵ ساکینە سلێمان لە ٣ی ئەیلوولی ١٩٩٧.
٣٣- لەوانە ساکینە سلێمان و فەریدە یونس بوون بە ئەندامانی پارتی کۆمەنیست و بەستێ سابیر و ڕەمزییە عەدلی و چەندانی دیکە بوون بە ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستان، دیمانە لەگەڵ حەیدەر عوسمان لە ١٧ی گەلاوێژی ١٩٩٧، دیمانە لەگەڵ حوسێن ڕەشوانی لە ١٦ی ئەیلوولی ١٩٩٦، دیمانە لەگەڵ خالیس جەواد لە ٣ی ئاداری ١٩٩٧، دیمانە لەگەڵ شێخ محەمەد محەمەد لە ١٦ی حوزەیرانی ١٩٩٦، دیمانە لەگەڵ ساڵح شێرە لە ٤ی نیسانی ١٩٩٦.
٣٤- دیمانە لەگەڵ مەلا عەبدوڵڵا لە ١٦ی ئایاری ١٩٩٧، دیمانە لەگەڵ ڕەمزییە عەدلی لە ١٧ی نیسانی ١٩٩٧، دیمانە لەگەڵ دکتۆر کەماڵ فوئاد لە ٢٤ی حوزەیرانی ١٩٩٧، دیمانە لەگەڵ نازم سەعید ئەسعەدی لە ٣ی کانوونی یەکەمی ١٩٩٧، دیمانە لەگەڵ ساڵح شێرە لە ٤ی نیسانی ١٩٩٦.
٣٥- لەبارەی زیاتر زانین لەسەر ژیان و ڕۆڵی سیاسی دکتۆر محەمەد فازڵ جەماڵی بڕوانە: رحيم كاظم محمد، الدكتور محمد فضل الجمالي، نهجه ودوره السياسي، رسالة دكتوراه غير منشورة، كلية الاداب - جامعة البصرة، ١٩٩٧.
٣٦- بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: ئیسماعیل شوکر ڕەسول، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٨٥.



# هەولێر لە نێوان سالآنی ١٩٣٥-١٩٥٨

**گۆران سۆران عزەددین فەیزی**

**باسی یەکەم**

**(باری سیاسی شاری هەولێر لە نێوان سالآنی ١٩٣٥-١٩٥٨)**

بێگومان سەرهەڵدانی هەر بزووتنەوەیەکی رۆشنبیری یا ئەدەبی پێویستی بە پێشخانێک هەیە، ئەمەش زیاتر خۆی لە دروستبوونی بارێکی سیاسی یاخود نەتەوەیی دەبینێتەوە، چونکە باری رۆشنبیری و سیاسی راستەوخۆ کار لە یەکتر دەکەن و هەردووکیان هۆکاری سەرەکین بۆ بەرەو پێشچوونی بزووتنەوەکانیان و "لە هەندێ باردا شۆرشی رۆشنبیری و ئەدەبی پێش شۆرشی سیاسی دەکەوێ و ئاووهەوای تەقینەوەی شۆرشەکە ئامادە دەکات، بەڵام پاش تەقینەوەی شۆرشەکە رووداوە سیاسییەکەی ئەو بزووتنەوەیە دەنگدانەوەیەکی زیاتری دەبێ لە بزووتنەوە ئەدەبییەکەی"[١].

بوونی کیانێکی تایبەت بۆ هەر میللەتێک، تا لە چوارچێوەیدا مافە نەتەوەییەکانی خۆی بەدەست بێنێت، هۆکارێکی سەرەکییە بۆ بەرەو پێشچوونی باری رۆشنبیری و ئەدەبی ئەو میللەتە و هەستە نەتەوەییەکەشی شێوەیەکی ئاسایی خۆی وەردەگرێت، بەڵام لەبەرئەوەی ئێمەی میللەتی کورد کیانێکی سیاسی تایبەتیمان نەبووە، بۆیە باری رۆشنبیری و ئەدەبیمان و گرنگیدانمان بە زمانەکەمان زیاتر بەستراوەتەوە بە باری سیاسی بە شێوەیەکی گشتی و بەو بزووتنەوە رزگاریخواز و شۆرش و حزب و رێکخراوانەی، کە ئامانجیان دابینکردنی مافەکانی میللەتی کورد و بوونی کیانێکی تایبەت بووە بۆ کورد.

بۆیە باسکردنی باری رۆشنبیری و ئەدەبی شاری هەولێر پێویستی بە ئاوڕدانەوەیەک بە باری رامیاری ئەو سەردەمە هەیە، بۆ ئەوەی کاریگەری ئەو لایەنە لەسەر باری رۆشنبیری و ئەدەبی شارەکە روون بکەینەوە. لە کۆتاییەکانی حوکمی دەوڵەتی عوسمانی لە سەرەتای سەدەی بیستەم، هەولێر وەک قەزایەکی پشتگوێ خراو دەهاتە بەرچاو، کە لەگەڵ ئاوبانگ و مێژووی دەوڵەمەندەکەی نەدەگونجا، لەسەرەتای فەرمانڕەوایەتی دەوڵەتی عوسمانی شاری هەولێر راستەوخۆ سەر بە (والی بەغدا) بووە، تەنانەت هەندێ جار راستەوخۆ لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە فەرمانڕەوایەتی دەکرا[٢].

شاری هەولێر لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی تا هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانی لە ساڵی ١٩١٢ مایەوە، بەڵام لەئەنجامی

تێکەڵبوونی دەوڵەتی عوسمانی لە جەنگی ناوبراودا، ئینگلیز لە ساڵی ۱۹۱۷ بەغدایان داگیر کرد و[3] بەرەبەرە بەرەو ویلایەتی موسڵ هەڵکشان[4].

لە رۆژی سی مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ۱۹۱۸ پەیماننامەیەک بەناوی (مۆدروس) لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئینگلیزەکاندا بە مەبەستی راگرتنی شەڕ بەسترا. پێش بەستنی ئەم پەیماننامەیە زۆربەی ناوچەکانی (ویلایەتی موسڵ)[5] هەر لەژێر دەسەڵاتی عوسمانییەکاندا بوو، تەنیا شاری کەرکووک نەبێ، کە لە (۲۵/ ۱۰/ ۱۹۱۸) ئینگلیزەکان خستبوویانە ژێر دەسەڵاتی خۆیان، بەڵام دوای پەیماننامەکە و بەهۆی ناوەڕۆکەکەیەوە ئینگلیزەکان بە مافی خۆیان دەزانی، هەر شوێنێکی ستراتیجی داگیر بکەن، کە بزانن هەڕەشە لە بوونیان دەکات[6]. بەم شێوەیە بەرەبەرە ئینگلیزەکان زۆربەی شار و شارۆچکە و ناوچەکانی ویلایەتی موسڵیان خستە ژێر کۆنترۆڵی خۆیان[7]. ئەوەبوو لە رۆژی دەی مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ۱۹۱۸ هەولێریشیان داگیر کرد و، لە حوزەیرانی ساڵی (۱۹۱۹)شدا کاپتن (های)یان وەکو یەکەمین حاکمی سیاسی لە هەولێردا دەستنیشان کرد، لە یەکەمین رۆژی مانگی تشرینی دووەمی (۱۹۱۹)شدا لیوای هەولێر پێکهێنرا و، هەردوو قەزای کۆیە و رواندزیشی خرایە سەر و، پاش پێکهێنانی دەوڵەتی عێراقیش[8] (ئەحمەد ئەفەندی عوسمان)یان، کە کەسایەتییەکی ناسراوی ناو شاری هەولێر و سەرۆکی شارەوانی هەولێریش بوو لە سەردەمی عوسمانییەکاندا کرد بە یەکەمین موتەسەریفی هەولێر[9].

هاتنی ئینگلیزەکان گۆڕانکارییەکی لە بواری سیاسی و رۆشنبیری و کۆمەڵایەتیدا بە بەراورد لەگەڵ سەردەمی عوسمانییەکاندا دروست کرد، لە سەردەمی داگیرکردنی هەولێر لەلایەن ئینگلیزەکان شارەکە تارادەیەک جۆرە بووژانەوەیەکی بەخۆوە دیت، ئەمەش لەبەر هەندێ هۆ لە سەرووی هەموویان گۆڕانکاری لە رووی فەرمانڕەوایەتی لە رژێمێکی عوسمانی پاشکەوتووی نا ناوەندی، کە بەزۆری گرنگی بە کۆکردنەوەی باج و دەرامەت دەدا لەو ناوچانەی لەژێر دەسەڵاتی دابوو. بۆ رژێمێکی پێشکەوتووی سەرمایەداری، کە بۆ بەرژەوەندی خۆی بەباشی دەزانی هەندێ لە هۆیەکانی پێشکەوتن بۆ ناوچەکە بگوازێتەوە، بەشێوەیەکی گشتی نەک تایبەتی واتە بۆ هەموو ئەو ناوچانەی لەژێر دەسەڵاتیدایە، نەک بۆ ناوچەیەکی تایبەت، ئەو پێشکەوتنەش زیاتر بوارەکانی فێرکردن و تەندروستی و دروستکردنی هەندێ کۆشک و تەلاری حکومی و دروستکردن و ئاوەدانکردنەوەی رێگاوبان و دابینکردنی هۆیەکانی هاتوچۆ و.... هتد دەگرێتەوە[10].

لەم بارەیەوە د. مارف خەزنەدار دەڵێت: «دامودەزگای دەوڵەتی لە هەولێر لەگەڵ دروستبوونی حکومەتی عێراقی لە ساڵانی ۱۹۲۰-۱۹۲۱ دامەزرا، چەند بینایەک دروست بوو و جۆرە شارستانییەتییەک کەوتە هەولێر»[11].

ئەمە لەلایەک، بەڵام لەلایەکی تر ئینگلیز و دەوڵەتی عێراقی بەهەموو شێوەیەک دژی کورد و بزووتنەوەی رزگاریخوازی و شۆڕشەکان و کەسایەتییە نیشتمانپەروەرەکان بوون. سیاسەتیان بەرامبەر کورد و



کێشەی کورد، بەدرێژایی حوکمی خۆیان لە نێوان سالآنی ١٩٢٠-١٩٥٨ لەسەر یەک ڕێچکە ڕۆیشتووە، تەنیا بەدەگمەن نەبێ هەندێ جار جۆرە هەڵوێستێکی نەرمیان نواندووە، ئەویش لەبەر چەند هۆیەکی تایبەتی، لە سەرووی هەموویان بەرژەوەندی خۆیان[١٢].

لە شاری هەولێر بزووتنەوەی (کوردایەتی) لە سەرەتای سییەکان بووژایەوە و لە کۆتایی سییەکان و سەرەتای چلەکان بەرەو تەکاموول بوون و پێشکەوتن ڕۆیشت تا قالبی خۆی وەرگرت و چەندین کەسایەتی ناوداری کوردپەروەر لەناو شار پەیدا بوون، ئەم بزووتنەوە کوردپەروەرییەی لەناو شار لەم ماوەیەدا سەری هەڵدا، بە هۆکارێکی یەکجار سەرەکی گەشەسەندنی باری ڕۆشنبیری و ئەدەبی دادەنرێت. لەبەرئەوەی ئەم هەستە نەتەوەییە وەکو هاندەرێک بوو پاڵی بەدەیان کەس و خەڵکی ئەم شارەوە نا، بە تایبەتی لاوان و ڕۆشنبیران، کە گرنگی بە زمان و ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردی بدەن[١٣]. لێرەدا بە پێویستی دەزانم تیشک بخەمە سەر چەند هۆکارێکی سەرەکی، کە بەهاوبەشی کاریگەرییەکی گرنگیان لەسەر بووژانەوەی گیانی نەتەوەیی و نەشونماکردنی باری ڕۆشنبیری و ئەدەبی و گرنگیدان بە زمانەکەمان لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم لەم شارەدا هەبووە، یەکێک لەو هۆکارە هەرە گرنگانەش بریتییە لەو بارودۆخە ناهەموارەی میللەتی کورد لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم تیایدا ژیاوە و بۆتە هۆی جیاکردنەوەی لە میللەتانی تر. لەبەرئەوەی لە دەست وڵاتانی دراوسێ و داگیرکەرانەوە تووشی چەندین زوڵم و زۆرداری بووە، بۆیە کورد وەکو میللەتێکی بێ ماف و بەشخوراو سروشتێکی تێکۆشینانەی بەخۆوە دیوە، کاتێ مرۆڤی کوردیش لە چوارچێوەی ئەم جۆرە بارودۆخە گەشە بکا، شتێکی زۆر ئاساییە پێیانەوە کاریگەر بێت و ئەمە وای لە شۆڕشگێران و ڕۆشنبیرانی کورد کردووە، کە شۆڕش و ڕاپەڕینی یەک لەدوای یەک ئەنجام بدەن دژی ئەو وڵاتانەی کە کورد لەژێر ئاڵایاندا دەیناڵاند، لەو شۆڕشە ناودارانەش، کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم کاریگەریان لەسەر شاری هەولێر هەبووە، شۆڕشەکانی (شەهید شێخ عەبدولسەلامی بارزانی) لە نێوان سالآنی ١٩٢٧-١٩٣٢، هەروەها شۆڕشەکانی شێخ مەحمودی نەمر[١٤].

ئەم ڕاپەڕین و شۆڕشانەش بە فاکتەرێکی سەرەکی بووژانەوەی هەستی کوردایەتی دادەنرێت، کە ئەمەش بەدەوری خۆی ڕۆڵی سەرەکی هەیە لەبەرەو پێشبردن و گەشەسەندنی باری ڕۆشنبیری و ئەدەبی و بایەخدان بە زمانەکەمان.

هۆکارێکی بەهێزی تری ورووژانی هەستی (کوردایەتی) و گەشەسەندنی باری ڕۆشنبیری و ئەدەبی لە شاری هەولێر لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم قەڵەمی ڕۆژنامەنووسانە لەم بارەیەوە گۆڤار و ڕۆژنامەکان ڕۆڵێکی بەرچاویان بینیوە.

ڕۆژگار و تاقیکردنەوە و بزووتنەوەکانی کورد بە هەموو لایەکی سەلماند، کە خەبات لەپێناو گەل و نیشتمان تەنیا بە چەک هەڵگرتن نایەتە دی، بۆیە ڕۆشنبیرەکانی کورد و لاوە خوێنگەرمەکانی لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەم بیریان لە ڕێگەی تر کردەوە بۆ خەباتکردن لە پێناوی بەدیهێنانی سەربەخۆیی و ڕزگاریی کورد. ئەوەبوو چەندین کۆمەڵە و ڕێکخراوی رامیاری و یانەی ڕۆشنبیریان پێکهێنا روویان دایە قوتابخانەی کوردی، بەو ڕێگایە نوێیەش، کە ڕۆشنبیرە دڵسۆزەکانی کورد گرتیانە بەر بۆ خەبات و کۆشش، بزووتنەوەی کوردایەتی و باری ڕۆشنبیری رادەیەکی بەرزتری وەرگرت و شێوەیەکی پوختە و ڕێکوپێکی گرتەبەر[١٥]. لەم بارەیەوە مامۆستا عەلائەدین سووجادی دەڵێ: «تا ئاخر و ئۆخری سەدەی نۆزدەهەم کورد هەر لەو عالەمەدا بوو... لەم مێژووە بەدواوە عالەمێکی تری زیادکرد کە عالەمی ڕۆژنامەیە[١٦]. ڕۆژنامە و گۆڤارە ئاشکرا و نهێنییەکانی شارەکانی (بەغدا و سلێمانی و هەولێر و دیمەشق)[١٧] و ئیتریش، بەتایبەتی بلاوکراوەکانی پارت و ڕێکخراوە سیاسییە نهێنییەکان، ڕۆڵی بەرچاویان لە بلاوکردنەوەی هەستی کوردایەتی و پرنسیپەکانی ڕۆشنبیری و ئەدەبی لە شاری هەولێردا بینی هەریەک بەپێی ئاستی خۆی بۆ نموونە هەردوو گۆڤاری زاری کرمانجی ڕواندز و ڕووناکی هەولێر[*] کاریگەریی تایبەتی خۆیان لەسەر شاری هەولێر هەبوو. گۆڤاری گەلاوێژی بەغداش ١٩٣٩-١٩٤٩ لە ڕاستیدا زمانحاڵی پێشکەوتنخوازانی بزووتنەوەی

نەتەوەیی رزگاریخوازی گەلی کورد بوو لە عێراقدا[18]. هەروەها ئەو گۆڤار و رۆژنامە غەیرە کوردییانەی، کە دەگەیشتنە هەولێر هەندێکیان بیری پێشکەوتنخوازی و ئازادی دەخستە بەرچاو، کە ئەمەش کاریگەری هەبوو لەسەر رووناکبیران و رۆشنبیرانی ناو شاری هەولێر، ئەوەش بەدەوری خۆی کاریگەری لەسەر بیری نەتەوەییدا هەبووە[19].

لێرەدا پێویستە بە ئاماژەکردن بە هۆکارێکی دیکەی پێشخستنی باری نەتەوایەتی و رۆشنبیری و ئەدەبی لەم شارەدا دەکات. ئەویش دەرکەوتنی چەند کەسایەتییەکی رابەر و خاوەن ئەزموون و رۆشنبیر، یاخود خاوەن بروانامەی زانستی لەم شارەدا، دیارترینیان رۆشنبیر و مێژوونووس و کوردپەروەری خوالێخۆشبوو (حوسێن حوزنی موکریانی)یە، کە بە رێگەی هەلۆێست و نووسینەکانی و چاپەمەنییەکانی توانی باری رۆشنبیری و زمانەوانی لەم شارەدا بزوێنێ، کە ئەمەش راستەوخۆ کار لە باری ئەدەبی و نەتەوەیی بۆچوونی خەلکەکە دەکات[20].

هەر لەبارەی نەشونماکردنی گیانی کوردایەتی و گەشەکردنی باری رۆشنبیری و گرنگیدان بە زمانی کوردی لەناو شاری هەولێر، هەولی چەند مامۆستایەکی پێشەنگی پەروەردەیی نابێ لەبیر بکرێت کە (فەزلی) سەرەکییان هەبوو، بەتایبەتی لە رێگەی سرووودی نەتەوایەتی بە جۆش و بزواندنی گیانی نەتەوایەتی لە دل و دەروونی قوتابییان، توانییان چینێکی نەتەوەپەروەری رۆشنبیر لە دەیان لاوی خوێنگەرمی هەولێری لەناو قوتابییانی ناو شار پەیدابکەن، کە ئەوانیش دەوری پێشەنگیان بینی لە بزووتنەوەکانی رزگاریخوازی کورد لەم شارەدا، بەتایبەتی لە سییەکان و چلەکانی سەدەی بیستەم و بەرەو پێش، رەگی بیروباوەڕیان لە خاکەکەدا چەقاند و بەری خۆشی هەبوو[21]. هەروەها لە رێگەی بەکارهێنان و گرنگیدان بە زمان و ئەدەبی کوردی لە وانەوتنەوەدا توانییان خۆشەویستی ئەم زمان و ئەدەبە لە دل و دەروونی سەدەها قوتابی بچەقێنن، بەتایبەتی مامۆستایانی قوتابخانەی یەکەمی هەولێر کە وانەوتنەوە تیایدا بە زمانی کوردی بوو[22]، لە نموونەی ئەم مامۆستا رابەر و کوردپەروەرانەش (سەعدی جەلال، ئەحمەدە فەندی، مستەفا بەهجەت، عەبدوللا عەزیز، برایان شێخ حەسەن و شێخ مستەفا نیعمەتوللا، سەید نەزیف عەبدولکەریم بەرزنجی، عیزەدین فەیزی، موسا سەمەد، زاهیر هەناری، برایان کەمال و سەدیق عەبدولقادر، حەیدەر عوسمان، جومعە محەمەد سەفار، یونس مستەفا چەلەبی، خدر مەولود، کەریم رەئوف، یوسف شێخ یەحیا، سەلیم موختار و دەیانی تر).

خالێکی گرنگی تری گەشەسەندنی هەستی کوردایەتی و بەرەوپێش بردنی زمانی کوردی لە شاری هەولێر بریتییە لە کۆتایی هێنان بە تەنگەژەی (ویلایەتی موسل). هەروەکو ئاشکرایە (ویلایەتی موسل)، کە ناوچەکانی بادینان و هەولێر و کەرکووک و سلێمانی و موسل دەگرێتەوە، پاش کێشەیەکی زۆر و دوای رازیبوونی حکومەتی بەریتانی بە بڕیارێک لەلایەن (عصبة الأمم)ەوە، واتە نەتەوە یەکگرتووەکان لە (١٦)ی کانونی یەکەمی سالی ١٩٢٥ درایە حکومەتی عێراقی، ئەو حکومەتەش بە چەندین پەیماننامە لەگەل حکومەتی بەریتانیادا بەسترابووەوە و پابەند کرابوو بە رەچاوکردنی مافە نەتەوەییەکانی کورد لە عێراقدا[23] کۆمەلەی نەتەوەکانیش (عصبة الأمم) لە سالی ١٩٣٢ هەمان مەرجی فەرز کردەسەر عێراق ئینجا عێراقی وەکو ئەندام وەرگرت.

بۆیە ئەم حکومەتە ناچار بوو دان بە هەندێ لە مافەکانی کورد بنێ (ئەگەر بە شێوەیەکی کاتیش بایە)، لەوانەش دەرکردنی یاسای بەکارهێنانی زمانی کوردی لە سالی (١٩٣٠)دا، بەمەش زمانی کوردی لە قوتابخانە و فەرمانگە میرییەکانی کوردستان بەکارهات[24].

جگە لە دانانی نووسینگەیەکی تایبەت بۆ وەرگێڕان لە وەزارەتی ناوخۆی عێراقی بۆ وەرگێڕانی دەق و یاساکان و سیستەمەکان و فەرمانەکان بۆ سەر زمانی کوردی، سەرەڕای دانانی قوتابخانەیەکی هەولێر و کەرکووک و سلێمانی لەژێر چاودێری یەک (سەرپەرشتیار)ی پەروەردەیی لە کۆتایی سالی (١٩٣٠)دا[25].

ئەم فاکتەرانەی پێشتر باس کران بە سەرچاوەی سەرەکی دروستبوونی تۆوی کوردایەتی و پەیدابوونی چینێکی رۆشنبیر لە نێوان لاوان و قوتابییان و خەلکانی تری ناو جەرگەی ئەم شارە دێرینە دادەنرێن،

ئەم چینە رۆشنبیرە توانییان بزووتنەوەیەکی رۆشنبیری لەناو ئەم شارە دروست بکەن و لەدواڕۆژیشدا نووسەر و شاعیری بەتوانا و هونەرمەندی لێهاتوویان لێ دەرچوو. دەبوایەش ئەم چینە رۆشنبیرە ئەو هەست و بیروباوەڕەیان لە رێگەی کارکردن و دامەزراندنی چەند حزب و رێکخراوێکی سیاسی دەرببڕن، ئەمەش بۆ رێکخستن و پلاندانانێکی رێکوپێک بۆ گەیشتن بەو ئامانجەی، کە مەبەستیان بوو.



### حزب و رێکخراوەکان:

لە ساڵی ١٩٣٧ رێکخراوێکی نەتەوەیی سیاسی (نهێنی) بەناوی (دارکەر) دروست بوو، زۆربەی لاوە رۆشنبیرە خوێنگەرمەکانی ناو شاری هەولێر بەگەر ئەم رێکخراوە نەتەوەییە کەوتن[٢٦].

ئەم رێکخراوە بەناوی رێکخراوێکی نەتەوەیی، کە کاتی خۆی لە ئیتالیادا کاری دەکرد و داوای یەکێتی ئیتالیای دەکرد ناو لێنراوە[٢٧]. سەرەتای دروستبوونی ئەم رێکخراوە لە شاری هەولێر دەستی پێکرد، چونکە کۆمەڵێک لە قوتابی خاوەن بیروبۆچوونی نەتەوەیی بڕیاریاندا رێکخراوێکی نەتەوەیی پێکەوەبنێن[٢٨]. دامەزرێنەرە بەراییەکانی ئەو رێکخراوە ئەمانە بوون: (یونس رەئوف دڵداری شاعیر، مستەفا عوزێری، جەلال قادر، موسا سەمەد، ئیحسان حاجی ئەحمەد باغچەچی... هتد) وە لە ئەندامە چالاکەکانیشی خوالێخۆشبووان فەتاح و رۆستەم عەبدولجەبار بوو[٢٩]. گشتیان خەڵکی هەولێر بوون، تەنیا یونس رەئوف دڵدار خەڵکی کۆیە بوو.

لە زۆربەی سەرچاوەکاندا باسی رۆڵی نەتەوەپەروەری پێشکەوتنخوازی شاعیری نوێخوازی ناسراو (یونس رەئوف دڵدار) دەکرێ لە دامەزراندن و هەڵسووڕاندنی رێکخراوەکە، هەر خۆیشی ماوەیەک سەرۆکی ئەم رێکخراوە بوو[٣٠]. شایانی باسە لەم ماوەیەدا شاعیری ناوبراو لە شاری هەولێردا دەژیا.

ئەم رێکخراوە پەرەی سەند و ئەندامانی لە زۆربەی شار و شارۆچکەکانی کوردستان پەیداکرد و زۆربەی ئەندامانیش لە قوتابییانی ناوەندی و ئامادەییەکان پێکهاتبوون، کە سەر بە لیواکانی هەولێر و کەرکووک و سلێمانی بوون[٣١]. بەڵام زۆربەی زۆری ئەندامانی لە ساڵی ١٩٣٧ کە لە (٦٠) ئەندام پێکهاتبوو، بریتی بوون لە قوتابییانی ئامادەیی و ناوەندی شاری هەولێر[٣٢].

هۆی بەگەرکەوتنی لاوانی رۆشنبیری هەولێر بەتایبەتی و کوردستان بە گشتی لەگەڵ رێکخراوی (دارکەر) ئەو دروشمانەبوو کە بەرزی کردبۆوە. لەبارەی یەکێتی نەتەوەیی کورد و بزووتنەوەی رزگاریخواز و مافەکانی گەلی کورد. (دارکەر) هەنگاوێکی بەرەوپێشەوەچوون بوو لەبارەی بیر و رێکخستن و تێکۆشینەوە[٣٣]. بۆیە کاریگەرییەکی یەکجار تەواوی لەسەر باری رۆشنبیری بەگشتی لەم ماوەیەدا هەبوو.

سەرکردایەتی (دارکەر) بە پێویستییەکی مێژوویی زانی، کە رێکخراوەکەیان بکرێت بە حزبێکی نەتەوەیی سیاسی گەورەتر و کەسی دیار و ناسراوی ئەو سەردەمەی کورد لە رێکخراوەکە نزیک بکرێتەوە[٣٤]. بۆیە لە ئەنجامی کۆشش و پێشکەوتنی ئەو رێکخراوە و کۆمەڵی کورددواری لە عێراقدا گەیشتبووە ئەو پلەیەی، کە حزبێکی نەتەوەیی کوردی دروست بکات، وابوو لە ئەنجامدا لە ساڵی ١٩٣٩ حزبی هیوا دروست بوو[٣٥]. کە ئەو ناوەش لە کۆمەڵەی (هێڤی)[٣٦] وەرگیراوە، کە لەپێش جەنگی یەکەمی جیهانی قوتابییانی کورد لە ئەستەمبوڵ وەکو

کۆمەڵەیەکی نەتەوەیی ڕێکیان خستبوو[٣٧].

لەبارەی حزبی هیواوە پرۆفیسۆر د. مارف خەزنەدار دەڵێ: «بەڕاستی حزبی هیوا ڕەنگدانەوەی ویست و ئارەزووی هەموو نەتەوەی کورد بوو به هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵەوە لەناو ڕیزەکانیدا کەسانی هەموو پیشەیەک دەبینران، قوتابی و ماموٚستا و کرێکار و جوتیار و دەوڵەمەند و هەژار و سەرباز و ئەفسەری سوپا و مووچەخۆری میری و مەلا و شێخ و زۆرانی تر»[٣٨].

ڕۆشنبیرانی هەولێر ڕۆڵێکی بەرچاو و سەرەکی و گرنگیان بینی لە دامەزراندن و بەرەو پێشەوەچوونی ئەم حزبە و هەروەها لە نەمانیشی لە کۆتاییدا[٣٩].

لقی هەولێری حزبی هیوا لە چالاکترین لقەکانی ئەو حزبە بوو، بەتایبەتی لە چەسپاندنی بیروبۆچوونەکانی حزب و تا ماوەیەک ئەم لقەی هیوا ڕۆڵێکی دیار و گرنگی هەبوو لە بڵاوکردنەوەی گیانی نەتەوایەتی و ڕۆشنبیری لەناو خەڵکی شاری هەولێر بەگشتی و لاوان بە تایبەتی[٤٠]. لەم بارەیەوە بەڕێز کاک زیوەر خەتاب دەڵێ: «هەولێر شارێکی سیاسییە و مێژووی سیاسی نوێی هەولێریش لە کۆتایی سییەکان لەگەڵ حزبی هیوا دەستی پێکرد و خەڵکێکی زۆر لە هەولێر لەگەڵ حزبی هیوا بوون»[٤١].

ماموٚستا (دڵزار) دەڵێ: "زۆربەی هەرە زۆری لاوانی ڕۆشنبیری هەولێری لەناو حزبی هیوا بوون"[٤٢].

بێگومان کۆبوونەوەی ئەندامانی حزبی هیوا لە شاری هەولێر لە ماڵانی قەڵاتێ ئەنجامدەدرا، ئەم جۆرە کۆبوونەوانە وەکو کۆڕی ڕۆشنبیری و ئەدەبی بوون لەو سەردەمەدا، لەبەرئەوەی چەندین بابەتی ڕۆشنبیری جیاجیا تاوتوێ دەکرا و باسی شیعر و شاعیرانی نیشتمانپەروەر و باسی ئەدەب بەگشتی دەکرا[٤٣].

شایانی باسە ماموٚستایان کە چینێکی ڕۆشنبیری ناو شار بوون سەرەڕای ڕۆڵی سەرەکییان لەناو ئەم حزبەدا، بەرپرسیارێتی ئەم حزبەش لەناو شار هەر بەوان سپێررابوو، ئەوەتا لە ساڵی ١٩٣٩ تا ساڵی ١٩٤١ ماموٚستا (عیزەدین فەیزی) (معتمد)ی، واتە بەرپرسی یەکەمی ئەم حزبە بوو لەناو شاری هەولێر[٤٤]. پێش ئەویش ئەم ئەرکە بە ماموٚستا (مەجید ئەمین)، کە ناسراوە بە (مەجید کۆفێت). سپێررابوو[٤٥]. هەر لە ڕێگەی گەڕان و پرسین و هەروەها بەهۆی ئەو سەرچاوانەی لەبەردەستدان دەرکەوت زۆربەی لاوە خوێنگەرمەکانی بنەماڵەکانی هەولێر سەر بە حزبی هیوا بوون، بەشێکی باش لەمانەش خاوەن ڕۆشنبیرییەکی باش بوون و توانییان لە ڕێگەی ئەم حزبەوەش جووڵانەوەیەک لەبارەی گرنگیدان بە زمانی کوردی و ڕۆشنبیری و ئەدەبی کوردی دروست بکەن، تیایاندا چەندین نووسەر و ڕۆژنامەنووس و شاعیری لێهاتوویان لەو سەردەمەدا و لەدوارۆژدا لێ دەرچوو، کە ئەمەش شتێکی ئاساییە بۆ ئەندامانی حزبێکی نەتەوەیی، دیارترین و چالاکترین ئەندامە ڕۆشنبیرەکانی (حزبی هیوا) لەناو شاری هەولێر بریتی بوون لە بەڕێزان: (ڕەئووف مەلا ئیبراهیم، سەید ئیبراهیم سەید یوسف (هوشیار)ی شاعیر، حوسێن حوزنی موکریانی، گیوی موکریانی، عەونی یوسف، ڕەمزی نافع ئاغا، عومەر عوسمان، عیزەدین فەیزی، مستەفا عوزێری، زەید ئەحمەد عوسمان، مەجید ئەمین، حەیدەر عوسمان، یونس مستەفا چەلەبی، شیت مستەفا چەلەبی، نافع یونس، ئیحسان شێرزاد، فەتاح جەبار ئەسعەدی، ئەنوەر عەبدوڵڵا دڵسۆز، عەبدولقادر دۆغرەمەچی، شێخە شەل، موسا سەمەد، ڕەشید عەبدولقادر، ڕەئووف مەعروف سەربەستی، مستەفا عوسمان دزەیی، ڕۆستەم جەبار ئەسعەدی، جەلال عەبدوڵڵا حاجی دەباغ، جەلال شەریف، عەزیز محەمەد، خەیروڵڵا عەبدولکەریم، ئەمین ڕواندزی، مارف جیاوک، هاشم عەبدوڵڵا، ئەنوەر فەیزی، جەلیل هوشیار، خدر مەولود، قەرەنی نافیع ئاغا، عەبدولوەهاب حاجی حەسەن، فەیسەڵ ئەحمەد عوسمان، مەلا شەریف ڕەنگەڕێژانی، موسا سلێمان، یەحیا سەلیم، عادل سەلیم، قەرەنی دۆغرەمەچی، جەماڵ جەمیل، جابیر پیرداود، ئەحمەد حەمەدەمین دزەیی، برایانی دزەیی بایز و کانەبی و ئیبراهیم عەزیز ئاغا، ئەنوەری حوسێنی مەلا، عوسمان قۆجە قەساب، عومەر ساقی، سەید ئەحمەد بەرزنجی، عەزیز فەتاح، هادی ڕەشید چاوشلی، ئیسماعیل یەعقوبی، سەلیم سەیدۆک، ئیبراهیم یەعقوبی، عەلی مەحمود کاکەخان دزەیی، مولازم جەلال قادر، نازم سەعید ئەسعەدی، شێخ حوسێن شێخ قازی، مەجید فەتاح، ناسیح ڕەشید، سەید فەتاح

سەید عەزیز، رەفعەت ئیسماعیل توتنچی، تاهیر رەشید ئاغا، فایق نادر، مارف خەزنەدار، خالس جەواد، عومەر گەردی، عەلی فەتاح دزەیی، ئەحمەد عوسمان و زۆرانی تر)[٤٦].

هەر ئەندامێکی حزبی هیوا دوای سوێند خواردن نازناوێکی کوردی بۆ دانراوە، نازناوەکەش نە هی بنەماڵە نە هی عەشیرەت نە هی شارەکەیان، یان ناوچەکەیان، یان کار و پیشەیان بووە، بەڵکو وشەکە دڵسۆزی و خەمخۆری و خۆشەویستی بۆ کورد و کوردستان دەرخستووە، بۆ نموونە ئەم بەڕێزانە ئەم نازناوانەیان بۆ داندراوە و هەندێکیان پێوەی ناسراون[٤٧]:

١. عەزیز محەمەد (کورد).
٢. عەبدولقادر دۆغرەمەچی (ئاگر).
٣. مستەفا عوزێری (دلاوەر).
٤. حەیدەر عوسمان (شێرزاد).
٥. عومەر عوسمان (بەختیار).
٦. نافیع یونس (غەمگین).

ئەندامانی حزبی هیوا لە هەولێر بڵاوکراوە و گۆڤاری نهێنییان دەرچوواندوە و بە دەستخەت نووسیویانە و بە شێوەیەکی نهێنی ئەندامانیان لەناو شار و خەڵکی شار بڵاویان کردۆتەوە، خۆیشیان لە رووی رۆشنبیرییەوە سوودمەند بوون پێیانەوە، لەوانە بڵاوکراوەیەک بەناوی (دەنگی کورد) بە قەبارەیەکی بچووک کە لە چوار لاپەڕە تێنەدەپەڕی لەلایەن ئەندامانی حزبەوە لە هەولێر بڵاوکراوەتەوە و بە دەستخەت نووسراوە، لەچەند دانەیەک زیاتری لێ دەرنەچووە[٤٨].

هەروەها ئەندامانی هیوا لە هەولێر هەفتەنامەیەکی نهێنییان دەرچوواندووە بەناوی (گۆڤار)، کە هەفتەنامەیەکی سیاسی کۆمەڵایەتی کوردییە، (یەک) دانە ژمارەی لێ دۆزراوەتەوە و لە کتێبێکدا لەلایەن رۆشنبیرێکی بەڕێزی هەولێری(**) بڵاوکراوەتەوە، کە ئەویش ژمارە (T) ئەو گۆڤارەیە. وادیارە ئەم ژمارەیە ژمارە (٢٠)ی ئەم گۆڤارە بێت، ئەویش بەپێی زنجیرەی پیتەکانی زمانی ئینگلیزی[٤٩]. تیایدا نووسراوە: (هەموو گەنجانی هەولێر یاریدەی نووسین و بلاوکردنەوەی دەکەن لەتەک ناونیشانەکەش لەلای راستی هەفتەنامەکەدا نووسراوە ساڵی یەکەم، لەلای چەپی ژمارە (T)دا ئاڵای رەنگکراوی کوردستان بە قەڵەمی رەنگاورەنگ کراوە، بەڵام جێی داخە، کە ساڵی دەرچوونی ئەم گۆڤارە دیارنییە، لەبەرئەوەی ساڵی دەرچوونی لەسەر نییە، هەروەها هەموو نووسینەکانی هەفتەنامەکە بەناوی (نهێنی) بڵاوکراونەتەوە، بۆیە دیار نییە کێن ئەوانەی وتارەکانی هەفتەنامەکەیان بڵاوکردۆتەوە. بەڕێز خوالێخۆشبوو (شێخە شەل) دەڵێ: "مامۆستایان نافع یونس و قەرەنی دۆغرەمەچی لێپرسراوی راگەیاندن بوون لە حزبی هیوا، بۆیە ئەوان بەدەستی خۆیان بڵاوکراوەکانیان دەنووسییەوە و بڵاویان دەکردەوە"[٥٠].

لەبەرئەوەی ئەم هەفتەنامەیە لەگەڵ چەندەها دەستنووسی تر لەلایەن مامۆستا (نافع یونس)ەوە پارێزراوە، کە ئەویش ئەندامێکی کارامەی حزبی هیوا بوو، لەدواییشدا رۆڵ و جێ پەنجەی چاکی لە رۆژنامەنووسی کوردیدا هەبووە، بەتایبەتی لە رۆژنامەی (ئازادی)دا[٥١]، لەبەرئەوەی هەفتەنامەکە ئاڵای کوردستانی لەسەر لاپەڕەی یەکەمی نەخشێنراوە، وەکو ئاشکراشە ئەندامانی حزبی هیوا سوێندیان بە قورئانی پیرۆز دەخوارد، کە ئاڵای کوردستان و خەنجەری دەبانی رووت و گوڵەگەنمی لەتەک داندرابوو، هەروەها ئەم هەفتەنامەیە هەموو بابەتەکانی بەناوی نهێنی بڵاوکراوەتەوە، ئەم ناوە نهێنییانەش نزیکن لە ناوە نهێنییەکانی ئەندامانی حزبی هیوا، کە لەو سەردەمە بۆ هەر ئەندامێک لەناو حزب ناوێکی نهێنی هەبوو. ناوەڕۆکی بابەتی وتارەکانیش پڕن، لە هەستی نەتەوەیی، بۆ نموونە لە یەکەم وتاری ئەو ژمارەیەدا نووسراوە "گەنجی کورد لەو سەردەمەدا دەبێ چۆن بێ؟ ئەی غەمخۆرانی نیشتمان و ئەی خوێن وەرگیرانی باب و باپیر و ئەی ئومێدان و مایەی کوردانی کوردستان ویستم بە دڵێکی خۆش و سەرێکی بەرز ئەم دوو سێ وتەی دڵی رازاوەی خۆمتان بۆ بگێڕمەوە و بنووسم...."[٥٢].

لە بەشێکی تری ئەم تاکە ژمارەیەدا شیعرێکی نیشتمانی بڵاوکراوەتەوە بە ناوونیشانی " محاوەرە لە بەینی شیعر و نەسر: لە بەینی نیشتمان و نیشتمانپەروەرێک[٥٣]. هەروەها هۆنراوەیەک بەناوی "گۆری (تضحیە) بۆ رێگەی وڵات"[٥٤]، هەر لەو تاکە ژمارەیەدا بڵاوکراوەتەوە.

ئەم جۆرە بابەت و هۆنراوە نیشتمانییەش لەگەڵ بیروبۆچوونەکانی حزبی هیوا یەک

دەگرێتەوە، ئەمە جگە لە جۆشدانی بیری لاوی کورد بە ڕێبازە ڕووناکبیرە تازەکانی ئەو سەردەم و چارەسەرکردنی نەخۆشییە کۆمەلایەتییەکان و خۆ بەرەو پێشەوەبردن و هاوچەرخ کردن و ڕۆشنبیرکردنی لاوی کورد لەو سەردەمەدا، کە ئەم بیرۆکانەش بریتین لەو هیوایانەی، کە حزبی هیوا نیازی بوو جێگیریان بکات. ئەم هۆکارانەی پێشوو هەموو بەڵگەی دیار و ئاشکران، کە ئەم هەفتەنامەیە بلاوکراوەیەکی (حزبی هیوا)یە لە هەولێر، پێش دەچێ، کە هەردوو ئەندامانی دیاری ناو ئەم حزبە نووسەران و شەهیدان: (نافع یونس و قەرەنی دۆغرەمەچی) ڕۆڵی سەرەکییان هەبووە لە دەرچوواندن و نووسین و بلاوکردنەوەی ئەم هەفتەنامەیە[٥٥].

شایانی باسە وتارەکانی ئەم تاکە ژمارەیە، چوار وتارە و بە زمانێکی کوردی پتەو و تارادەیەک باشیش پاراو بەپێی سەردەمی خۆی و هەروەها شێوازێکی ڕێکوپێکیان بەکارهێناوە لە دارشتنی بیرۆکە و بابەتەکان، کە هەندێ جار لە زمان و شێوازی گۆڤاری گەلاوێژی ناوداری ئەو سەردەم باشترە[٥٦]. بەلام جێی داخە، کە لە بلاوکراوەکانی حزبی هیوا تەنها ئەم هەفتەنامەیە دۆزراوەتەوە و لەبەردەستدایە، گوایە هی تریش هەبووە، بەلام لەبەرئەوەی لەبەر دەستدانین ناتوانین باسیان لێوە بکەین، لە ئەنجامی چەندین چاوپێکەوتن و پرسین و گەڕان لە کتێبخانەکان هیچ سەرەداوێکم لەبارەی ئەم بلاوکراوانە نەدۆزییەوە، بەتایبەتی ژمارەیەکی تری هەفتەنامەی گۆڤار، ئەمەش بەهۆی تۆقاندن و هەڕەشەی حکومەت لەم سەردەمە، گوایە بلاوکراوەکانیان دوای خوێندنەوەی دەسووتاند، یاخود فڕێیان دەدا، ئەم بلاوکراوانەش لەبەرئەوەی بەدەستخەت و لەسەر وەردەقەی کۆن نووسراون پاراستنیان بۆ ئەو ماوە دوور و درێژە شتێکی سەختە.

حزبی هیوا لە سالی (١٩٣٩)ەوە ڕۆژ بە ڕۆژ لە گەشەکردن و بەرەو پێشەوەچووندا بوو، لەو سەردەمەدا بە یەکێک لە بەهێزترین پارتە سیاسییەکانی مێژووی ڕزگاریخوازی گەلی کورد دادەنرێ.

لەگەڵ ئەوەشدا لە سالی (١٩٤٣)ەوە دووبەرەکی و جیاوازی بیروبۆچوون کەوتە ناو حزبەوە لە کۆتاییشدا لە سالی ١٩٤٤ بەرەو نەمان چوو، لێرەدا بە پێویستی دەزانم سێ هۆکاری سەرەکی لەناوچوونی حزبی هیوا دەستنیشان بکەم، کە بەپێی گرنگییان بریتین لەمانەی خوارەوە:

١. بەهێزبوونی بیری مارکسی لەو سالانەدا و بەگەڕکەوتنی بەشێکی زۆری ڕۆشنبیرانی ئەو سەردەم لەگەڵ ڕێکخراوە مارکسییەکان بە خالێکی سەرەکی لاوازبوونی حزبی هیوا و پاشان نەمانیشی دادەنرێت[٥٧].

بێگومان بیری مارکسی لەو سەردەمەدا لە تەشەنەکردندا بوو، ئەویش بەهۆی باری گرانی ژیان و جیاوازی لە نێوان باری ئابووری خەلکەکە، هەروەها سەرکەوتنی یەکێتی سۆڤیەت، کە هەلگری ئالای مارکسییەت بوو، بەسەر نازییەت، سەرەڕای ئەوەی، کە لاوان و مرۆڤ بەگشتی لە تەمەنێکی دیاریکراودا ئارەزووی بیردۆز و ڕوونکردنەوە و شیکردنەوەی ئەم جۆرە بیرەن[٥٨].

٢. لەبارەی یارمەتیدانی شۆڕشی بارزان ١٩٤٣-١٩٤٥ دوو بۆچوون لەناو حزبدا هەبوو، یەکێکیان بە هەموو توانایەوە لەگەڵ یارمەتیدانی شۆڕشەکە بوو ئەمانە زیاتر بالە نەتەوەییەکەی حزبی هیوا بوون. ئەوانی تر لەو ڕایە بوون، کە حزبی هیوا پێویستە هەلوێستێکی بێلایەنی هەبێت[٥٩].

٣. ئینگلیزەکانیش لە ڕێگەی بەکرێگیراوانیان توانییان دووبەرەکی و ناخۆشی بخەنە ناو ریزەکانی حزب[٦٠].

جا بالی ڕاستی ناو حزبی هیوا توانی ماوەیەک بەردەوام بێ لە چالاکییەکانی خۆی، هەر بەناوی حزبی هیواوە، بەلام زۆری نەبرد ئەمانەش بڕیاری هەلوەشاندنەوەی خۆیان دا و لەو کاتەدا ڕۆلی حزبی هیوا لە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردی کۆتایی پێهات[٦١].

بالی چەپی ناو حزبیش بوون بە چەند بەشێک بەشێکی زۆرکەمیان بەگەر حزبی شیوعی عێراقی کەوتن کە (فهد) سکرتێر و ڕۆژنامەی (القاعدة)ش زمانحالی حزبەکەیان بوو. دیارترینیان (مەلا شریف مەلا عوسمان) بوو، کە ناسراوە بە (مەلا عەروس)، خەلکی شاری هەولێرە و بەماوەیەکی کەم جێگای خۆی لەناو حزبدا کردەوە و تا دەرچواندنی ڕۆژنامەی (ئازادی) ئۆرگانی لقی کوردستانی حزبی شیوعی عێراقی پێ سپێررا، کە لە سالی ١٩٤٤ بە

شێوەیەکی نهێنی لە بەغدا دەردەچوو(٦٢). شایانی باسە (مەلا شەریف) نووسەر و وەرگێرێکی بە توانا و رۆشنبیرێکی لێهاتوو و دانەری کتێب و شاعیرێکی نیشتمانپەروەریش بوو(٦٣).

ئەندامانی تری بالی چەپی حزبی هیوا لە هەولێر کە بەشی زۆرینەی ئەندامانی چەپی ناو حزب بوون، بەگەر ئەو رێکخراوە مارکسییە کوردییانە کەوتن، کە بە کاریگەری ئەو حزبە مارکسییانە دروست ببوون، کە لە حزبی شیوعی عێراقی جیابووبوونەوە و وەکو حزبی شیوعی سەربەخۆ کاریان دەکرد(٦٤). دیارترینیان و چالاکترینیان (کۆمەڵەی میللەت) بوو، کە لە کۆتایی سالی ١٩٤٣ لەناو شاری هەولێر و لەلایەن رۆشنبیران و لاوانی هەولێرییەوە دروست ببوو(٦٥). کۆمەڵێک لە دیارترین رۆشنبیرانی هەولێری بەخۆوە گرتبوو، لەوانە "سالح حەیدەری، موسا سلێمان، رەشید عەبدولقادر، قەرەنی دۆغرەمەچی، حەیدەر عوسمان، زەید ئەحمەد عوسمان، عەزیز محەمەد، هاشم عەبدوڵلا، ئەنوەر دڵسۆز، حەمید عوسمان، نافع یونس، شێخە شەل، یەحیا سەلیم، کەریم ئەحمەد، عەبدولقادر حاجی مەمەد، جەوهەری حوسێنی مەلا و زۆرانی تر"(٦٦). ئەم کۆمەڵەیە بلاوکراوەیەکی نهێنی دەستنووسیان بەناوی (دەنگی کورد) هەبوو بۆ رۆشنبیرکردنی خەڵک بەکاریان دەهێنا، ئەم کۆمەڵەیە پاش چەند مانگێک لەگەڵ رێکخراوێکی تری جیابووەوە لەگەڵ حزبی شیوعی عێراقی یەکیان گرت، ئەویش

رێکخراوی (وحدة النضال) بوو، لقی ئەمانە لە کوردستان ناوی (یەکێتی تێکۆشین) بوو، رۆژنامەیەکیشیان هەر بەم ناوە دەردەکرد(٦٧). کۆمەڵێک لە لاوان و قوتابییانی رۆشنبیری هەولێر، کە کاریگەربوون بە بیری مارکسی چوونە ناو ریزەکانی ئەم رێکخراوە و رۆڵی سەرەکییان لە بەهێزکردنی بینی، سەرکردایەتی لقەکەش لە بەرێزان (سالح حەیدەری و نافع یونس و رەشید عەبدولقادر) پێکهاتبوو، کە هەرسێکیان خەڵکی هەولێرن(٦٨). لە بارەی رۆژنامەکەیان (سالح حەیدەری) دەڵێ: "رۆژنامەیەکی کوردیمان بەناوی لق و هەر بە ناوونیشانی یەکێتی تێکۆشین دەردەکرد و دەچووین هەندێ وتاری عەرەبیمان لە رۆژنامەی مەرکەزی وەردەگێرا و هەندێ وتاری تایبەتیشمان لەبارەی بارودۆخی کوردستانەوە دەنووسی وەک مەسەلەی بارزان و کێشەی جوتیارانی دەشتی قەراج و.... هتد"(٦٩).

(یەکێتی تێکۆشین) لە پایزی سالی ١٩٤٥ بریاری گۆرینی ناوی لقەکەیان دا بۆ (حزبی شیوعی کوردستان-عێراق)، بۆ ئەوەی وەکو حزبێکی سیاسی شیوعی سەربەخۆ کاربکەن(٧٠). رۆژنامەیەکیشیان دەرکرد بەناوی (شۆرش) کە زمانحاڵی حزبەکەیان بوو، هەر بۆیە لەناو خەڵک بە حزبی (شۆرش) ناسراوە(٧١). حزبی شۆرش بەماوەیەکی کەم لە گۆرەپانی سیاسیی کوردی بوو بە حزبێکی بەهێز و کاریگەر و خاوەن پرۆگرام و سیستەمێکی ناوخۆیی دیاریکراو و تارادەیەکی باشیش گونجاو لەگەڵ

بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد لە کوردستاندا، زۆربەی زۆری ئەندامانیشی، کە گەیشتۆتە ٣٥٠ ئەندام خەڵکی شاری هەولێر و دەوروبەری بوون(٧٢). تەنانەت هەندێ بۆچوون ئەم حزبە بە رێکخراوێکی سیاسی تایبەت بە کوردی هەولێر دادەنێت(٧٣). راستیشە رۆژنامەی (شۆرش) لەسەر هەمان شێواز و پرۆگرامی رۆژنامەی (یەکێتی تێکۆشین) دەرۆیشت، بەڵام زیاتر گرنگی بە چەسپاندنی بیروبۆچوونی (مارکسی)دەدا، لەبەرئەوەی ئەم حزبە بە حزبێکی شیوعی کوردی سەربەخۆ دادەنرا(٧٤).

حزبی شۆرش هەوڵێکی زۆری دا بۆ دروستکردنی حزبێکی جەماوەری و نەتەوەیی پێشکەوتنخوازی پێشرەو، ئەم هەوڵانەشی لە سالی ١٩٤٥ لە دروستکردنی (حزبی رزگاری کورد) بە ئەنجام گەیاند، ئەم حزبە رۆڵێکی سیاسی و نەتەوەیی زۆر گرنگی بینی، بەشدارییەکی تەواوی کرد لە ناساندنی کێشەی کورد لە جیهاندا(٧٥).

ئەندامانی حزبی رزگاری لە شاری هەولێر رۆڵێکی دیار و بەرچاویان هەبوو، هەردەم لەژێر چاودێری پۆلیس بوون بەتایبەتی لە چایخانەکان، یاخود لە هەندێ مالان، کە تیایاندا کۆدەبوونەوە، یا لە کتێبخانەی بەرێز خوالێخۆشبوو (شێخە شەل) کە زۆر جاران لەوێ کۆبوونەوەکانی خۆیان دەکرد(٧٦).

ئەم رۆشنبیرە بەرێزانەی خوارەوەش لە ئەندامە هەرە دیارەکانی حزبی رزگاربن لە هەولێر: (عەونی یوسف، شوعە مەخلوف، مارف

خەزنەدار، عیزەدین فەیزی، سالح حەیدەری، نافع یونس، رەشید عەبدولقادر، عومەر عوسمان، فائق نادر، ئەنوەری حوسێنی مەلا، برایان جەمال و عاسم حەیدەری، عەزیز محەمەد، یونس یەحیا، عەلی فەتاح دزەیی، حەمید عوسمان، عەلی قادر، رەقیبی حوسێنی مەلا، ئەحمەد عوسمان، خالس جەواد، رەفعەت ئیسماعیل توتنچی، نیازی عومەر ئەمین، مونیر عەزیز، فاتیح مەزهەر، حەیدەر عوسمان، کەریم رەئوف، موسا سلێمان، شێخە شەل، جەمال عزەت، جەلیل هوشیار، بورهان شێخ نەجمەدین، مەولوود شێخ محەمەد و زۆرانی تر)[٧٧].

حزبی رزگاری رۆژنامەیەکیشیان دەردەکرد بەناوی (رزگاری)[٧٨]، کە زمانحالی حزبەکەیان بوو، لەو رێگەیەوەش پرنسیپە سەرەکییەکانی حزبەکەیان بە جەماوەر دەگەیاند، بابەتە بنەرەتییەکانیشی ریسواکردنی فەرمانڕەوایەتی ئەو سەردەم و ئیمپریالیزمی ئینگلیزی بوو، سەرەرای پارێزگاری کردنی لە بەرژەوەندییەکانی جەماوەری کورد و هاوکاریکردنی گەلی کورد[٧٩].

لەلایەکی تر دوابەدوای هەڵگیرسانی شۆڕشی بارزان ١٩٤٣-١٩٤٥ بە سەرۆکایەتی جەنابی (مەلا مستەفای بارزانی)[٨٠]. شاری هەولێر یەکێک بوو لە کاریگەرترین شارەکانی کوردستان بەو شۆڕشە، ئەوەش زیاتر بەهۆی ئەو گرژی و ئالۆزییە بوو لەو ماوەیەدا، کە هەولێر بەخۆیەوەی بینی، بەتایبەتی شارەکە لەسەر رێگەی نێوان بەغدا و ناوچەی بارزان بوو، لێرەدا پێویستە بۆ مێژوو بوترێت خەڵکانێکی زۆر لەناو شاری هەولێر هەڵوێستی جوامێرانەیان بەرامبەر بەو شۆڕشە مەزنە نواند[٨١]. لەلایەکی تر لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکارییە سیاسییانەی، کە لە جیهان روویدا، بەتایبەتی لەپاش کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهانی و هەروەها ئەو بارودۆخەی کە گەلی کورد لە کوردستانی عێراقدا تیایدا دەژیا، بەتایبەتی لەدوای شۆڕشی بارزان (١٩٤٣-١٩٤٥). دەبوایە وەکو پێویستییەکی مێژوویی حزبێکی پێشڕەوی شۆڕشگێڕی خاوەن پرۆگرامێکی گونجاو لەگەڵ بارودۆخەکە دروست ببێ ئەوەبوو لە زستانی ساڵی (١٩٤٦)دا لە شاری مەهاباد لێژنەی دامەزرێنەری (پارتی دیموکراتی کورد) بە سەرۆکایەتی جەنابی (مەلا مستەفای بارزانی) پێکهات و ئەم لیژنەیەش پرۆگرام و پەیڕەوی ناوخۆی حزبەکەیان دانا و پەیوەندیشیان بە حزبەکانی (شۆڕش و رزگاری) و (ژ-ک)یش کرد[٨٢].

شایانی باسە یەکێک لە دیارترین ئەندامانی ئەو لیژنەیە ئەفسەری شەهید (خەیروڵلا عەبدولکەریم)ە، کە یەکێک بوو لە لاوە کوردپەروەرە رۆشنبیرە دیارەکانی قەڵاتی هەولێر، بۆ ئەم مەبەستە هەریەکە لە حزبەکانی شۆڕش و رزگاری لە مانگی ئابی ١٩٤٦ لە شاری بەغدا کۆنگرەی خۆیان بەست و هەردوو حزبیش بڕیاری خۆهەڵوەشاندنەوە و چوونە ناو پارتیان دا[٨٣]. بەڵام لەناو کۆنگرەکان بەتایبەتی کۆنگرەی حزبی شۆڕش جیاوازییەکی تەواو لەبارەی بیروبۆچوونەوە دروست بوو، بۆیە لەکۆتایی کۆنگرەکەدا بەشێک لە ئەندامانی هەردوو حزب چوونە ناو حزبی شیوعی عێراقی و ئەوانی تریش چوونە ناو (پارتی)[٨٤].

یەکەم کۆنگرەی (پارتی دیموکراتی کورد) لە (١٦)ی مانگی ئابی ساڵی ١٩٤٦ لە شاری بەغدا بەشێوەیەکی نهێنی ئەنجامدرا و ئەندامانی کۆنگرەکەش لە نوێنەرانی هەردوو حزبی (شۆڕش و رزگاری) پێکهاتبوون[٨٥]. کۆنگرەکە کارەکانی بە سەرکەوتوویی ئەنجامدا و بڕیاری رەزامەندی لەسەر پرۆگرام و پەیڕەوی ناوخۆی حزب درا و لە کۆتایی کۆنگرەدا سەرکردایەتی (پارتی دیموکراتی کورد)ی عێراق هەڵبژێردرا و هەروەها بڕیار درا (رۆژنامەی رزگاری) زمانحاڵی حزبی رزگاری کورد، ببێت بە رۆژنامەی ناوەندی پارتی و زمانحاڵی حزبی نوێ[٨٦]. ئەوەش لەبەر ئەو ئاستە جەماوەرییە بەرزە بوو، کە رۆژنامەی ناوبراو لەناو خەڵکدا هەیبوو، لەم مێژووەوە (پارتی) وەکو حزبێکی نەتەوەیی رۆڵێکی سەرەکی و مێژوویی بینیوە لە رابەریکردنی بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد لە کوردستانی عێراقدا.

لە ساڵی (١٩٤٦)ەوە دوو باڵی جیاواز لە گۆڕەپانی سیاسی کوردی لە ئارادا بوو، یەکێکیان نەتەوەیی کە خۆی لە (پارتی) دەنواند و ئەویتریان (مارکسی) کە لە رێگەی حزبی شیوعی عێراقییەوە، کارەکانی خۆی بە ئەنجام دەگەیاند، جا دەیان کەس لە سیاسەتمەدارانی ناو شاری هەولێر بەگەر ئەم دوو حزبە کەوتن و رۆڵێکی دیار و بەرچاویان دیوە لەناو هەردوو

حــــزبەکــــەدا، تەنانەت لەناو سەرکردایەتییەکانیشیان. ململانێی فـیکری لە نێـوان هەردوو حزبەکـەدا یەکێک بوو لە دیاردە هەرە دیارەکانی ئەو سـەردەمـە، بەتایبـەتی لەبارەی قـۆزتنەوەی رووداوە رۆشنبـیـری و نەتەوەییـەکـانـدا. ئەم دیاردەیە لە پەنجاکـانی سـەدەی بیـسـتـەم زیاتر رەنگی دایەوە. شایانی باسە زۆربەی سیاسەتمەدارانی ئەو سەردەمە چ لەناو (حزبی شیوعی) و چ لەناو (پارتی) تاڕادەیەکی باش رۆشنبـیـرانی ئەو سـەردەمـەیان پێکدەهێنا شاعـیـر و نووسـەری لێـهـاتوویان تێدا هەبوو، رۆشنبـیـری باش بـوون و کـاریگەریشـیـان لەسـەر بواری رۆشنبیریدا هەبوو.

### هەولێر و راپەڕینەکەی مایسی (١٩٤١)ی عێراق

راپەڕینی نیسـان-مـایس ١٩٤١ لە عـێـراقـدا بە یەکـێک لە لاپەڕە گـرنگەکـانی مـێـژووی نوێی عـێـراق دادەنـدرێـت[٨٧]. ئـەم راپـەڕیـنـە رەنگدانەوەیەکی زۆری بەسەر هەمـوو شـارەکـانی عـێـراق هەبوو. هەرچەندە سەرکردەکـانی بزووتنەوەکـە دژایەتی خۆیان بە ئاشکرا بەرامبـەر بە کـورد دەردەبـڕی، بـەڵام لـەبـەرئـەوەی ئینگلیزەکان هەڵوێسـتێکی خراپیان بەرامبەر بە بزووتنەوەی رزگاریخوازی کــورد هەبوو، بۆیە گــەلی کــورد پشتگیرییـەکی تەواویان لەو راپەڕینە کرد[٨٨].

شـاری هەولێـر رۆڵێکی دیاری لە راپەڕینەکـەدا بینی، بە بەراوردیش لەگەڵ شارە کوردییەکانی تر بە پلەی یەکـەم دێت و تایبـەتمەندی خـۆی هەبوو[٨٩]. تەنانـەت هەندێ جــار گـەیشـتـۆتە رادەی بەکـارهێنانی توندوتیژی[٩٠]. بۆ ئەم مەبەستە چەند جـارێک رێپـێـوان و خـۆپیـشـاندانی جەمـاوەری لەناو شـار سـازدراوە[٩١]. تیایاندا قـوتابییـان و مـامۆسـتـایان و کـاسبکاران و پیـاوانی ئاییـنی و هی دیکەش بەشدارییان تێدا کردووە.

هەروەها ئافـــرەتانـیش رۆڵێکی دیار و بەرچاویان هەبووە، بەتایبـەتی لەو سـەردەمـەدا هەندێ لە ئافـرەتانی رۆشنبـیـری چاوکـراوەی هەولێـری تێکەڵا بە سیـاسـەت ببوون، ئەمـەش جۆرە گـۆڕانکارییـەک بوو بۆ شارێکی پارێزەری وەک هەولێر[٩٢].

شـاری هەولێـر چەند جـارێک لە رۆژانـی بزووتـنـەوەکـــــە لەلایـەن فـڕۆکـەکـانی ئینگلیـزەوە بۆردومـان کراوە و سەرباری هاوێشتنە خوارەوەی چەنـدیـن بـڵاوکــــــراوەی دژ بـە بزووتنەوەکە، تەنها لە رۆژی (١٦)ی مـانگی مـایسی سـاڵی ١٩٤١ دوو جـاران فـڕۆکـەکـانی ئینگلیـز فڕۆکەخانەی هەولێریان بۆمبباران کرد و بەربادیان کـرد[٩٣]. بۆیە لەو رۆژەدا خـۆپیـشـاندانێکی توندوتیـژ بە رێنمایی و سەرپەرشتییەکی تەواوی کوردپەروەری خوالێخۆشبوو مامۆستا (شـێخ حـەسـەن نیـعـمـەتوڵڵا) بەڕێوەبەری قـوتابخـانەی دووەمی هەولێر ئەنجامدرا. مامۆستا (شێخ حـــەســـەن) داوای لە هەندێ مـامـۆسـتـایان کـرد، کە لەگەڵیـدا بەشـــــداری بکـەن، هەنـدێ لە مـامـۆسـتـایانیش لەگەڵیـدا چوون و روویان لە سـەرا کـرد و لە رێگەدا لەسەر شەقامەکە خەڵکێکی گەلێ زۆریان بەگەر کەوت و هێرشیـان بردە سـەر سـەرا و، بەتایبـەتی سـەر پارێزگای هەولێر و کاربەدەستانی تر و ئۆتۆمبیلەکەی پارێزگاریان سووتاند و چەند شـوێنێکیـشـیـان بەردباران کرد[٩٤]. لێرەدا ئەوەی شایانی باسە ئەگەر (ساڵح زەکی ساحێبقران)ی پارێزگـاری هەولێـر و کـوردپەروەری خوالێخۆشبوو (ئەمین رواندزی) ئامر فـــەوجی هەولێـــر نەبوونایە، ئەوا ژمــــــارەیەکی زۆر لـە لاوانـی خـوێنگەرمی هەولێـری دەکـوژران، شـێـوەی کـۆتایی پێـهـێنانی ئەم



خۆپیشاندانە لەلایەن ئەم دوو زاتەوە وای لێ کردوون، کە هەردەم شایانی رێز و سوپاس بن[95].

شایانی باسە شاری هەولێر بە دووەم شار لە عێراقدا دادەنرێت، سەبارەت بە ژمارەی ئەو کەسانەی، کە لە ئەنجامی پشتگیری کردن لە راپەرینەکەدا گیراون و بەندکراون، ژمارەی بەندکراوەکانیشی گەیشتۆتە (٤٢) بەندکراو، ئەم ژمارەیەش چوار بەقەد ژمارەی بەندکراوەکانی شاری (موسڵ)ە، کە ناسراون بە بۆچوونی نەتەوەییان[96].

## شاری هەولێر و شۆڕشی (١٩٤٣-١٩٤٥)ی بارزان

بێگومان شۆڕشی (١٩٤٣-١٩٤٥)ی بارزان[97] بە سەرکردایەتی جەنابی (مەلا مستەفای بارزانی) یەکێکە لەو شۆڕشە کوردییە هەرە مەزن و مێژوویی و کاریگەرییەی کە بەهۆکارێکی گرنگ دادەنرێت بۆ زۆر رووداو و گۆڕانکاری مێژوویی لە گۆڕەپانی کوردستانی عێراق بەتایبەتی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی کوردی بەگشتی. هەر لەگەڵ سەرهەڵدانی شۆڕشەکە لە مانگی تەموزی ساڵی (١٩٤٣)وە گروتینێکی نەتەوەیی کەوتە نێو زۆربەی شارەکانی کوردستان، لەوانەش شاری هەولێر، کە لەم بارەیەوە تایبەتمەندیی خۆی هەبوو، هەروەکو لە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد[98]. ئەمەش لەبەر ئەو بارودۆخە نائاساییەی، کە کەوتە نێو شار و بووە هۆی وروژانی هەستی نەتەوەیی زۆربەی خەڵکی شارەکە[99]، ئەمە لەلایەک لەلایەکی تر شارەکە کەوتبووە نێوان رێگای ناوچەی بارزان و شاری بەغدا[100]، کە تاکە رێگایە بۆ گەیاندنی هێز و چەک و تەقەمەنی بۆ ناوچەکە، هەروەها گواستنەوەی بریندارەکانی حکومەت بۆ نەخۆشخانەکانی هەولێر، بۆ نموونە لەیەک لە رۆژەکانی مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٤٣)دا پازدە سەربازی عێراقی بریندار بۆ نەخۆشخانەکانی هەولێر گواستراونەتەوە[101]، بێگومان شاری هەولێر دوابەدوای شۆڕشی مایسی (١٩٤١)ی عێراق و ئەو بارودۆخە تایبەتییەی بەسەر شارەکەدا هات لەکاتی شۆڕشەکەدا، دووچاری توندوتیژییەکی زۆر هاتبوو، ئەمەش کاری کردبووە سەر دامرکاندنەوەی بزووتنەوەی نەتەوەیی[102]. بۆیە ئەم شۆڕشە گروتینێکی سەرلەنوێ و هاندەر بوو بۆ جوولانەوەی هەستی نەتەوەیی و رزگاریخوازی لەم شارەدا.

لەدوای هەڵگیرسانی شۆڕشەکە ئەندامانی لقی هەولێری (حزبی هیوا) بە تایبەتی باڵە نەتەوەییەکەی ناو حزب، چالاکییەکی بێوچانیان بەخۆوە بینی بۆ پشتگیری کردنی شۆڕشەکە، لەم بارەیەوە چەندین بلاوکراوەی نهێنییان دەرکرد، راوبۆچوونی خۆیان بۆ رای گشتی خەڵک و بەتایبەت بۆ حکومەتە عەرەبییەکان لەبارەی شۆڕشەکەوە روون کردەوە، ئەمە و سەرەڕای ئەوەی حزبی هیوا لە یاداشتێکدا بۆ حکومەتی عێراق، کە لە رێگەی (ئەمین رواندزییەوە) گەیاندییە (نووری سەعید)ی سەرەک وەزیرانی عێراق و داخوازییەکانی هیوای تێدا بوو.

لەمەوەش (نووری سەعید) بۆی دەرکەوت، کە ئەمە شتێکی رێکخراوی سەرتاسەری کوردستانە و هیوا دەسەڵاتێکی تەواوی بەسەر رۆشنبیران، ئەفسەران، قوتابییان، مامۆستایان، مەلا، فەقێ،.... تاد هەیە و ئەوەی لە ناوچەی بارزانیش روودەدات یاخی بوونێکی خێڵایەتی نییە، بگرە بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی چەکدارە و میللەتی کورد پشتگیری تەواوی لێدەکات، بۆیە پێویستە لە رێگەیەکی ترەوە بۆیان بچێت ئەم رێگەیەش لاوازکردنی مەلا مستەفا و تێکدانی هیوا بوو[103]. لەبەرئەوەی جەنابی (بارزانی) کۆمەڵێک لە داخوازییەکانی میللەتی کوردی خستە بەردەم کاربەدەستانی ئەو سەردەمە، ئەم داخوازییانەش مەرجی سەرەکی بوو بۆ کۆتایی هێنان بە شۆڕشەکە لەمانەش[104]:

پێکهێنانی ویلایەتی کوردستان لە کەرکووک و هەولێر و سلێمانی و قەزایەکانی لیوای موسڵ و زاخۆ و ئامێدی و دهۆک و ئاکرێ و شێخان و شنگار. هەروەها قەزاکانی دیالە (خانەقین و مەندلی).

زمانی کوردی ببێ بە زمانێکی رەسمی لە ویلایەتەکەدا.

دامەزراندنی بریکارێکی کورد بۆ هەر وەزارەتێک.

پێکهێنانی وەزارەتێکی نوێ بە مەرجێ وەزیرەکەی کورد بێ، تا سەرپەرشتی کاروباری ویلایەتی کوردستانی پێشنیارکراو بکات.

ئاوەدانکردنەوەی ناوچەکە، بە کردنەوەی قوتابخانە و نەخۆشخانە و رێگەوبان و... تاد.

قەرەبووكردنی زیانی ئەو كەسانەی، كە بەهۆی شۆڕشەوە زیانیان پێكەوتبوو.
گواستنەوە و دوورخستنەوەی ئەو فەرمانبەرانەی، كە بە بەرتیلخۆری ناسراون و بەشێوەیەكی خراپ دەسەڵاتیان لە ناوچەكەدا بەكاردەهێنا.

ئەم داواكارییانە هەر لەسەرەتاوە جۆرە هیوایەكی بە رۆشنبیرانی هەولێر و هەناسەیەكی نەتەوەییانەیانی پێ بەخشی تا وای لێهاتبوو خەڵكی شار لە زۆربەی كۆڕ و كۆبوونەوە و ژیانی رۆژانەی خۆیاندا ئاماژەیان بەو شۆڕشە مەزنە دەكرد و چاوەڕوانی زیاتریش بوون.

خەڵكی شاری هەولێر هەڵوێستی یەكجار جوامێرانەیان بەرامبەر بەو شۆڕشە نواند لە رووی ماددی و مەعنەوییەوە[105]. پشتگیرییەكی تەواویشیان لە شۆڕشەكە كرد و چەندین كەسایەتی ناو شاریش بە فیعلی بەشدارییان لە شۆڕشەكەدا كرد.

## هەولێر و رووداوەكانی كانونی ١٩٤٨ لە عێراق

لە (٢٩)ی مانگی ئاداری ساڵی ١٩٤٧ وەزارەتێكی نوێ لە عێراق دروست بوو، بە سەرۆكایەتی (ساڵح جەبر). زۆربەی وەزیرەكانی ناو ئەم وەزارەتە بە دڵ و هەوەسی سەفارەتی ئینگلیزی بوو لە بەغدا[106]، جا ئەم وەزارەتە چەند هەنگاوێكی یەك لەدوای یەكی نا بەمەبەستی ئەنجامدانی پەیماننامەیەك لە نێوان عێراق و ئینگلتەرا. وابوو دوای زنجیرەیەك كۆبوونەوە و گفتوگۆ لە نێوان حكومەتی عێراقی و حكومەتی ئینگلتەرا پەیماننامەیەك لە رۆژی (١٥)ی مانگی كانونی دووەمی ساڵی ١٩٤٨ لە نێوانیاندا بەسترا بەناوی پەیماننامەی (پۆرتسمۆث)[107].

جا بەهۆی بەستنی ئەم پەیماننامەیە نارەزاییەكی جەماوەری سەرتاسەری عێراقی گرتەوە، رۆژانە رێپێوان و خۆپیشاندانی خوێناوی ئەنجامدەدرا و بەماوەی مانگێك شێوەی راپەڕینێكی جەماوەری گشتی بەخۆوە بینی و دەیان لاوی نیشتمانپەروەر تووشی كوشتن و گرتن هاتن، ئەم خۆپیشاندانە جەماوەرییانە تەنیا بەهۆی بەستنی پەیماننامەكە نەبوو بەڵكو هۆكاری گرنگی تریش هەبوو لە سەرووی هەموویان باری ئابووری عێراق، كە لەو سەردەمەدا كەوتبووە ژێر باری گرانی و برسیەتییەكی دژوارەوە[108].

بەم شێوەیە ئەم راپەڕینە بوو بە یەكێك لە لاپەڕە گەشەكانی مێژووی نوێی عێراق. لە كۆتاییشدا وەزارەتەكەی (ساڵح جەبر) لە ٢٧/١/ ١٩٤٨ رووخا[109]. شارە كوردییەكان رۆڵێكی گرنگ و بەرچاویان لە راپەڕینەكەدا بینی و رێكخستنی ئەم جووڵانەوەیەش لەلایەن هەردوو حزبی سەرەكی ئەو سەردەمە (پارتی دیموكراتی كوردستان) و (حزبی شیوعی) رێكدەخرا[110].

ئەم راپەڕینە وەكو هێزێكی بزوێنەر بوو بۆ رۆشنبیران و لاوانی نەتەوەپەروەری هەولێری، بۆیە لاوان بەتایبەتی و خەڵكی شاری هەولێر بەگشتی لەم بارەیەوە رۆڵێكی گرنگ و بەرچاویان بینی چ لە بەغدای پایتەخت[111] و چ لەناو شاری هەولێر.

لەناوی شاری هەولێر رۆژانە خەڵك دەڕژانە ناو شەقامەكان و زنجیرەیەك خۆپیشاندانیان دژی (ساڵح جەبر) و (پەیماننامەی پۆرتسمۆث) ئەنجامدا، سیفەتی هەرە دیاری ئەم خۆپیشاندانانەی هەولێر بەشداریكردنی زۆرینەی خەڵكی شار بوو، بە تایبەتی چینە هەژارەكەی، كە لەو كاتەدا، لەژێر بارێكی ئابووری زۆر خراپ دەیانناڵاند[112].

شایانی باسە رۆشنبیران و شاعیرانی هەولێر بە پلەی یەكەم دێن، لە هاندان و رێكخستنی



خۆپیشاندان و ڕێپێوانەكان، چەندین وتار و هۆنراوەی ئاگرینی پڕ لە بیری پێشكەوتنخوازی و نەتەوەییان لەسەر ئەم ڕاپەڕینە نیشتمانییە دانا و بەجۆشەوە بۆ جەماوەر دەیانخوێندنەوە[113]. ئافرەتانیش لەم بارەیەوە ڕۆڵیان هەبوو، بەڕێز خاتوو (فەریدە یونس) دەڵێ: "لەكاتی ڕاپەڕینی كانونی ساڵی ١٩٤٨، چەندین خۆپیشاندانی بەگوڕ لەناو شاری هەولێر ئەنجامدرا، من یەكێ لەوانە بووم، كە وتارێكی نیشتمانی پڕ هەستم پێشكەش بە خەڵكەكە كرد"[114].

لەدوای هەڵوەشانەوەی حكومەتەكەی (ساڵح جەبر) جۆرە ئازادییەك هاتە ئاراوە، هەموو شارەكان كەوتنە سازدانی بۆنەی تایبەتی[115]. خۆپیشاندان و ڕێپێوان بۆ ماوەی چەند مانگێكیش لەدوای ڕاپەڕینەكە بە شتێكی ئاسایی دادەنرا، بە ڕێژەی خۆپیشاندانێك لە هەر هەفتەیەكدا لەناو شار ئەنجامدەدرا[116].

## شاری هەولێر و ڕێكخراوی قوتابییان

بێگومان قوتابییان بە توێژێكی ڕۆشنبیر و چاوكراوە دەژمێردرێن بەتایبەتیش لە كۆمەڵگەیەكی ئەوتۆ، كە زۆربەی نەخوێندەوار بن و دووریش بن لە كاریگەری هۆیەكانی ڕاگەیاندن و دەروازەكانی ڕۆشنبیری، وەك كۆمەڵگەی هەولێر، جا ئەگەر قوتابییانیش بە چەند پرنسیپێكی سیاسییەوە ئاراستە بكرێن و لە قاوغی یەكێتییەكدا كۆبكرێنەوە و سەرەڕای ئەو ڕۆشنبیرییەی، كە لە قوتابخانە وەریانگرتووە، بە پەروەردەیێكی سیاسییەوەش مێشك فراوانتر بكرێن و گیانی ئیلتیزام و پابەند بوون بە مەسەلەیەك لە مێشكیاندا بچەسپێت، ئەوا دەورێكی گرنگیان لە بەرەو پێشخستنی كۆمەڵگە بە گشتی و ڕۆشنبیری بە تایبەتییەوە دەبێت، چ بە ڕێگەی ئەو بڵاوكراوانەی لە نێوان خۆیاندا یا بۆ خەڵك پەخشیان دەكرد یا بە هۆشمەندكردنی خەڵك بۆ ئەو بیروباوەڕەی، كە مەبەستیان بوو.

یەكێتی گشتی قوتابییان كە لەلایەن حزبی شیوعی عێراقییەوە لە ڕۆژی (١٤)ی مانگی نیسانی ساڵی (١٩٤٨)دا یەكەم كۆنگرەی خۆی لە گۆڕەپانی (بیاع) لە شاری بەغدا بەست[117]. ژمارەیەك لە قوتابییان تیایدا خۆیان دۆزییەوە، بە پرەنسیپی سۆشیالیستییەوە لە چوارچێوەی یەكێتییەكەیاندا مێشك و دەروونیان ئاودراو و ئەمەش ڕەنگی دایەوە سەر توێژێكی فراوانتر لەناو كۆمەڵ، كە لە ئەنجامدا بوو بەهۆی بەرزبوونەوەی ئاستی ڕۆشنبیری، بە هەمان شێوە ژمارەیەك لە قوتابییانی ناو شاری هەولێر بوون بە ئەندام تیایدا و هەمان ڕۆڵیان بینی، لەم بارەیەوە بەڕێز عومەر فەرهادی دەڵێ: "لە ساڵی ١٩٥٢ كە قوتابی بووم لە قوناغی دواناوەندی، بووم بە ئەندام لە یەكێتی گشتی قوتابییان، شانەكەی ئێمە لە (٥) كەس پێكهاتبوو و پێش ئێمەش چەندین شانەی تر هەبوو، زۆر چاونەترسانە كارمان دەكرد و نەشماندەزانی كێ بەرپرسمانە، بەڵام ئەندامەكان یەكتریمان دەناسی، هەندێ لە كۆبوونەوەكانیشمان لە ماڵان لە قەڵا ئەنجامدەدا و هەندێ جاریش دەچووینە دەرەوەی شار و لە دەوروبەری منارەی چۆڵی كۆدەبووینەوە، مەنشوراتمان بۆ دەهات و بڵاومان دەكردەوە، زۆر جارانیش هەر بەخۆمان دەماننووسی، جێگای ئاماژە پێكردنە، كە هەندێ لە كوڕە ئاغاكانیش دەوریان هەبوو لەناو یەكێتییەكەدا"[118].

بەهەمان حاڵیش لەبارەی دامەزراندنی دووەم ڕێكخراوی نهێنی قوتابییان لە عێراق، كە ئەویش (یەكێتی قوتابییانی كوردستان) بوو، كە لە (١٨)ی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٥٣ بە بەرگێكی نەتەوەییەوە دامەزرا و ئامانجەكانی (پارتی دیموكراتی كوردستان)، لە ڕێگەی ئەم یەكێتییەوە خرایە قوتابییان و بیریان بە بۆچوونی نەتەوەییەوە پەروەردە كرا. ئەم یەكێتییە خزمەتێكی گەورەی توێژی قوتابییان بەتایبەت و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی كوردی بەگشتی كردووە. بەرە بەرە ئەندامانێكی زۆری لەنێو قوتابییانی ناو شاری هەولێر پەیداكرد. لێرەدا لەبەر فراوانی ئەم بابەتە و گرنگی و دەوڵەمەندییەوە لە ڕووی مێژوویی، بۆیە ناتوانم هەقی تەواوی بدەم، لەبەرئەوەی پێویستی بە لێكۆڵینەوەیەكی ئەكادیمی و تایبەتی و تێروتەسەل هەیە.

## شاری هەولێر و جەژنی نەورۆز

گەر قەڵای هەولێر هێمای، مێژینەی كورد بێ، ئەوا نەورۆز تازەكردنەوەی ژیان و گیانی كوردایەتییە. ڕۆژی (٢١)ی مانگی

ئادار، لەلای میللەتی کورد ڕۆژێکی تایبەت و بە جەژنێکی نەتەوەیی و نیشتمانی دادەنرێت، شاری هەولێری کوردپەروەریش بەردەوام یادی ئەم ڕۆژە مەزنەی کردۆتەوە، بەتایبەتی لە ماوەی ئەو سالانەی، کە تایبەتە بە باسەکەمان.

بەپێی ئەو زانیارییانەی، کە لەبەردەستدان لە نێوان سالانی ١٩٣٣-١٩٤٠ بە شێوەیەکی بەردەوام و هەموو سالێ بە نهێنی[١١٩]، لە قەلاتێ لە مالی یەکێ لە گەنجە کوردپەروەرەکانی ئەو سەردەم، کە ئەویش مالی خوالێخۆشبوو (سەلیم سەیدۆک)[١٢٠] بوو ئەنجامدەدرا[١٢١].

لە مبارەیەوە مامۆستا (عیزەدین فەیزی) دەلێ: "لە (٢١)ی ئاداری سالی ١٩٣٣ مامۆستا (حوزنی موکریانی) داوای لە بەشێک لە قوتابییانی ناوەندی کرد لە مالی خوالێخۆشبوو (سەلیم سەیدۆک) لە قەلای هەولێر کۆببنەوە، هاوڕێیەکی دلسۆزی بوو، منیش یەکێک بووم لە ئامادەبووان، لەو کۆبوونەوەیەدا، مامۆستا موکریانی کتێبێکی کۆنی لەدەست بوو بۆ ئێمەی ڕوون کردەوە، نەورۆز چییە و لە چییەوە هاتووە؟ بۆچی کورد بە جەژنی خۆی دادەنێت؟ بەم جۆرە لام ئاشکرا بوو، ئەو ڕۆژە چییە و پێویستی یادکردنەوەی وەک جەژنێکی نیشتمانی لە مێشکمدا چەسپا، بەنیسبەت منەوە وابزانم ئەمە یەکەم یادکردنەوەی جەژنی نەورۆزە لە هەولێر"[١٢٢].

ئەم یادە شەوی (٢٠) لەسەر (٢١)ی مانگی سێ، واتە شەوی نەورۆز ئەنجامدەدرا و پاقلاوە و زۆر جۆرە خواردەمەنی ئامادەکرا، هەندێ لە بەشداربووان کورتەک و شەروالی موورادخانییان لەبەردەکرد و مشکی ڕەشیان لەسەر دەنا، ئاهەنگەکە بە مەولوود خوێندنەوەی پێغەمبەر (د.خ) دەستی پێکرد و ئینجا دەستیان بە گوتنی سروودی نەتەوەیی دەکرد و وتاری پڕ هەستی نیشتمانی دەخوێندرایەوە و گۆرانییان دەچڕی و تەمسیلیان دەکرد[١٢٣]. لەم بارەیەوە مامۆستای بەڕێز خوالێخۆشبوو (گیوی موکریانی) دەلێ: "لەسەرەتا ئەو بیرەوەرییە پیرۆزەمان لە مالی (سەیدۆک)دا بەدزییەوە دەکردەوە و ئاهەنگمان بۆ دەکرد، لەوێدا شیعر و وتاری بینراوی شانۆییمان تیا دەکرد و یەکێکیش چاودێری مالەکەی دەکرد لە ترسی پۆلیس و پیاوخراپی ئەو سەردەمە"[١٢٤]. ئەم یادکردنەوەیە تاکو بەرەبەیانی ڕۆژی نەورۆز بەردەوام بوو، تا سالی ١٩٤٠ هەموو سالێ بە بەردەوامی ئەنجامدەدرا، بەلام لەپێش نەورۆزی سالی ١٩٤١ بە چەند ڕۆژێک (سەلیم سەیدۆک) گیرا بەو تاوانەی هەموو سالێ یادی نەورۆز لە مالی ئەواندا ئەنجام دەدرێ[١٢٥].

کۆمەلێک لە دیارترین ڕۆشنبیرانی ئەو سەردەم بەشدارییان لە ئاهەنگگێڕانی یادی نەورۆزی نێوان سالانی (١٩٣٣-١٩٤٠)دا کردووە و بریتین لەم زاتە بەڕێزانە: (سەلیم سەیدۆک، حوسێن حوزنی موکریانی، گیوی موکریانی، عیزەدین فەیزی، عەونی یوسف، ئەحمەد محەمەد ئەمین دزەیی، عومەر ساقی، ئەسعەد ئاغای زراری، فەتاح جەبار ئەسعەدی، عەبدولوەهاب حەمەد ئاغا، دەروێش ئیسماعیل ڕەمەزان، مەلا عەبدولرەحمان هەولێری و جەلیل هوشیار، تاهیر عەبدوللا، عومەر عوسمان، عاسم حەیدەری، فایق نادر، هادی ڕەشید چاوشلی و زۆرانی تر)[١٢٦].

یەکەم یادکردنەوەی جەژنی نەورۆزیش بە شێوەی سەیران گێڕان لە دەرەوەی شار دەگەڕێتەوە بۆ سالی ١٩٤٠ لە نەورۆزی ئەم سالەدا بۆ یەکەم جار سەیرانێکی نهێنی بۆ دێی (قەتەوی) و بۆ سەر کارێزی دێیەکە ئەنجامدرا، سەیرانەکەش لەلایەن قوتابییان و هەندێ لە مامۆستا سەرەتاییەکانی ناو شار ئەنجامدرا[١٢٧].

لەم بارەیەوە یەکێک لە قوتابییانی بەشدار بوو لەو سەیرانە، کە ئەویش سیاسەتمەدار و کەسایەتی ناسراوی هەولێری کاک (عەزیز محەمەد) بوو دەلێ: "وەک لە یادم بێت سالی ١٩٤٠ کە قوتابییانی پۆلەکانی (٤، ٥، ٦)یان بردە دەرەوە بەناوی گەڕیدە (جوالە)، بەهار بوو، گیا لە چۆکان بوو، دیاربوو (نەورۆز بوو)، بەو بۆنەیەوە مامۆستای بەڕێز (عیزەدین فەیزی) هەستا وتارێکی کورتی ئاراستە کردین، هانی داین، دەروونی جۆشداین، مەستی کردین، لەوکاتەدا خۆمان گرانتر و گەورەتر هاتە بەرچاو، خۆشەویستی گەل و نیشتمان دلی پڕ و سارێژ کردین، ئەم ڕۆژە تامی خۆی هەبوو، ئەم هەنگاوە بوو منی بەرەبەرە خستە سەر ڕێی خەبات"[١٢٨].

دووەم یادکردنەوەی جەژنی نەورۆز بەنهێنی لە سالی ١٩٤٤دا بوو، ئەمجارەیان یادەکە لەسەر ئاوی (زار موفتاح)[***]، لە سەیرانێک لەلایەن

گەنجە کوردپەروەرە رۆشنبیرە هەولێرییەکانەوە ئەنجامدرا، لە نەورۆزی ساڵی پاشتریش ١٩٤٥ سێیەم ئاهەنگی جەژنی نەورۆز لەسەر ئاوی (تووڕەق) لەلایەن زۆرینەی گەنجانی رۆشنبیری هەولێری بەنهێنی ئەنجامدرا[١٢٩]. لەم سەیرانانەدا چەندین هۆنراوە و پەخشانی هونەری بەپێز خوێندراونەتەوە و زیاتر سەیرانەکانی پێ رازێنراوەتەوە.

لەو ساڵانەدا لەناو شاری هەولێر بەنهێنی لە زۆر ماڵان، شەوان و رۆژانی نەورۆز دراوسێیەکان ئاهەنگیان گێڕاوە[١٣٠] و یادی ئەم جەژنەیان کردۆتەوە، ئەندازیاری بەڕێز خاتوو فەریدە یونس دەڵێ: "ئێمە لە ماڵەوە یادی جەژنی نەورۆزمان دەکردەوە و جلی سوورمان لەبەردەکرد، ئاگرمان دەکردەوە و کاکم (نافع) شیعری شاعیرە نیشتمانپەروەرەکانی بۆ دەگوتین و باسی ئەو رۆژەی بۆ دەکردین"[١٣١].

لەبەر رۆشنایی گۆڕانکارییە سیاسییەکانی ساڵانی چلەکان و کۆتایی هاتن بە شەڕی دووەمی جیهانی و لەناوبردنی فاشییەت و دیکتاتۆریەت و تەشەنەکردنی بیری ئازادی و دیموکراسی و مافی سەربەخۆیی وەرگرتنی چەندین میللەتانی جیهان و پەیدابوونی چەند پارتێکی یەک لەدوای یەکی سۆشیالیستی و نەتەوەیی بەتایبەتی (هیوا، یەکێتی تێکۆشین، شۆڕش، رزگاری)، لەناو شاری هەولێر لەو ماوەیەدا و هەروەها کاریگەرە تایبەتییەکەی شۆڕشی (بارزان) ١٩٤٣-١٩٤٥ لەسەر شاری هەولێر، گشتیان بوون بە هاندەرێک کە بۆ یەکەمین جار کورد وەکو پێویستییەکی مێژوویی بتوانێ لە رێگەی رۆشنبیران و کوردپەروەرانی هەولێر ئاهەنگی نەورۆزی ساڵی ١٩٤٦ و پاشانیش ١٩٤٧ و ١٩٤٨ بە ئاشکرا لە گۆڕەپانەکانی ناو شاری هەولێر بگێڕێ[١٣٢]. هەرچەندە ئاهەنگگێڕەکان لەسەرەتا تووشی بەرهەڵستکارییەکی زۆر بوونەوە و چەندین گیروگرفت و تەنگوچەڵەمەیان تووش هات، چونکە میری ئەوکاتە لەبەر کۆنەپەرستان و تەسک بیران و ناحەزان و هەندێ لە پیاوانی ئایینیش رێگەی نەدەدا، کە ئەم جۆرە ئاهەنگانە سازبدرێت، بەڵام لە کۆتاییدا بەهۆی هەندێ لە بەرپرسە دڵسۆزەکان و سووربوونی خەڵکێکی زۆر لەسەر ئەنجامدانی، توانرا ئەم کێشانە چارەسەر بکرێن و ئاهەنگەکانیش زۆر بە رێکوپێکی لە گۆڕەپانەکانی شاری هەولێر ئەنجامدرا[١٣٣]، هەزاران کەسیش لەناو شاری هەولێر و دەوروبەری بە پیاو و ئافرەتەوە بەشدارییان تیایاندا کرد و چەندین وتاری نەتەوەییش خوێندرایەوە، زۆربەی ئاهەنگەکانیش بە شیعر و گۆرانی گوتن و هەڵپەرکێ کۆتایی پێدەهات[١٣٤].

هەر بۆ نموونە گۆڤاری گەلاوێژی ناوداری ئەو سەردەم بەم شێوەیە باسی ئاهەنگی نەورۆزی ساڵی ١٩٤٧ دەکات: "جەژنی نەورۆز لە کوردستان: هەولێر و گەنجانی هەولێر لەبەرئەوەی پلێتی بانگێشتی نەورۆزیان کردبووەوە لە رۆژی ٢٢/ ٣/ ١٩٤٧دا سعادەتی موتەسەریف و کاربەدەستانی حکومەت لەگەڵ هەموو ئەشرافی ناو شار و عەشایری دەرەوەی شار لە سەعات (٣)ی پاش نیوەڕۆدا لە مەیدانی ماڵی داود ئاغا، پیاوان لەبەری رۆژئاوا و ژنان لەبەری رۆژەوە موستاریان گرت و جگەرە و خواردەمەنییان بەسەرا بلاوکردن و لەلایەن جەوهەر عەزیزەوەش وتارێک لەبارەی نەورۆزدا وترا و پەیتا پەیتا چەپڵەی بۆ لێدەدرا و لەپاشان بۆرە لاوێک دەستیان بە هەڵپەرکێ و هەموو جۆرە یاریکردنێک کرد، پاش هەندێ یاری لەلایەن چەند گەنجێکی قوتابییەوە بە شیعر و گۆرانی گوتن دڵی دانیشتوانەکەیان کردەوە، لە سەعات پێنجدا هەموو بە دڵخۆشی و رووخۆشییەوە بلاوەیان لێکرد"[١٣٥]، ئەو بەرێزانەی کە رۆڵی دیار و بەرچاویان هەبوو لە رێکخستن و ئەنجامدانی ئاهەنگی نەورۆزی ساڵانی (١٩٤٦، ١٩٤٧، ١٩٤٨)، بریتین لەم کەسایەتی و لاوە رۆشنبیرە هەولێرییانە: (عەونی یوسف، جەوهەر عەزیز ئاغا، ئەحمەد حەمەدەمین دزەیی، شێخە شەل، فایق نادر، د. مارف خەزنەدار، نافع یونس، ئەنوەر فەیزی، زیوەر خەتاب، عاسم حەیدەری، موسا سلێمان، عەزیز محەمەد، عەلی فەتاح دزەیی، یونس یەحیا، تاهیر عەبدوڵڵا، محەمەد شەهاب دەباغ، جەماڵ حەیدەری، نەژاد بەرزنجی (سەید محێدین)، عەبدولوەهاب حاجی حەسەن، حەمید عوسمان، مەلا عەولا حاجی سمایل، نازم سەعید ئەسعەدی، عومەر عوسمان

عەبدوڵڵا، تەحسین یاسین ئەسعەدی، خەلیل خۆشناو، ساڵح شێرە، مەولود شێخ محەممەد و زۆرانی تر)(١٣٦).
لەدوای نەورۆزی ساڵی ١٩٤٨دا ماوەی رەشبگیری لە عێراقدا دەستی پێکرد و دەیان کەسیان لەناو شاری هەولێر گرت و حوکم دا، بەتایبەتی ئەندامانی حزبی شیوعی و پارتی دیموکراتی کورد، ئەو سیاسەتە توندوتیژە و کۆنەپەرستانەی رژێمی عێراقی وای کرد، کە بۆ ماوەی چەند ساڵێک یادی جەژنی نەورۆز نەکرێتەوە، بەڵام لە نەورۆزی ساڵانی ١٩٥٣ و ١٩٥٤ بە هەوڵ و کۆششی خەمخۆران و رۆشنبیرانی هەولێر، دوو ئاهەنگی گەورە و قەشەنگ لەناو شاری هەولێر ئەنجامدرا(١٣٧).
هەزاران کەس لەناو شاری هەولێر بەشداریان لەم ئاهەنگانە کرد، سەرەڕای بەشداریکردنی جەماوەرێکی زۆری شار و شارۆچکە کوردییەکانی تریش، کە ئەمەش یەکێک بوو لە سیفەتە هەرە دیارەکانی ئەم ئاهەنگانە(١٣٨)، ئەم ئاهەنگانەی جەژنی نەورۆز لەناو شاری هەولێر وەک دیاردەیەکی رۆشنبیری بەهێز کاریگەری خۆی هەبوو لەسەر بیروهۆشی خەڵکەکە بەگشتی و بە تایبەتیش لەسەر باری ئەدەبی، ئەوەش لە رێگەی ئەم هەموو وتار و پەخشانە هونەرییە جوانانەی، کە لەناو ئاهەنگەکان دەخوێندرایەوە، ئەو هەموو پارچە هۆنراوە نەتەوەییە بەهێزانەی شاعیرە نەتەوەپەروەرەکان، کە وەک هاندەرێک بوون بۆ لاوان و قوتابییان بۆ ئەوەی بایەخ بە زمانی نەتەوەیی خۆیان بدەن.

### باسی دووەم
### باری ئابووری و کۆمەڵایەتیی شاری هەولێر لە نێوان ساڵانی ١٩٣٥-١٩٥٨

لە ساڵانی سییەکان و چلەکانی سەدەی بیستەم، شاری هەولێر لە رووی ئابوورییەوە لە ئاستێکی نزمدا بوو و لە زۆر رووەوە پشتی بە بەرهەمی خۆی دەبەست و بە تایبەتیش لە رووی کشتوکاڵییەوە، کە بە شێوەیەکی سەرەتایی و تارادەیەکی دوور لە هەموو تەکنیکارێکی کشتوکاڵی و بەند بوو بە سیستەمێکی نیمچە دەرەبەگی باو، واتە چینی جووتیارانی دەوروبەری هەولێر لەوپەڕی کەم دەرامەتی و هەژاریدا بوون، سەرەڕای ئەمەش کۆمەڵێک لە خاوەن زەویوزاران، کە بەشی زۆریان لەناو شاردا دەژیان و هەندێکیشیان لە دێیەکانی دەوروبەری هەولێر بە شێوەیەکی جیا بەرزتر لە زۆربەی خەڵکە رەشورووتەکەدا گوزەرانیان بەسەر دەبرد، ئەوانەی لەناو شاردا دەژیان و سەرکاریان لە گوندەکانیان هەبوو، ئەو گوندانەی، کە بەناوی خۆیان بوو، ئەم چەند خێزانە هەولێرییەش کە بە ئاغاکانی هەولێری ناسرابوون سیمایەکی نیمچە تێکەڵیان هەبوو لە نێوان شارستانیەتی و دەشتەکیەتیدا، ئەمەش بە حوکمی خاوەنداریەتییان بۆ زەویوزارەکانی دەوروبەری هەولێر و ئەنجامدانی کاروباری کشتوکاڵ(١٣٩)، لە ئەنجامی ئەوەشدا ببوون بە خاوەن بڕیار و دەست رۆیشتوو لەناو خەڵکدا، هەر لەم چینەش نوێنەرانی ناو شاری هەولێر بۆ پەرلەمانی عێراقی هەڵدەبژێردران(١٤٠)، تارادەیەکی زۆریش هەر کوردەکانی ئەم توێژەش بۆیان دەرەخسا خوێندن تەواو بکەن و بە تایبەتیش بڕوانامەی کۆلیژی ماف بەدەست بێنن و لەدوا رۆژیشدا پلە و پایەی کارگێری و دادوەری وەربگرن، هەر ئەمانەش تارادەیەک بەشێک لە توێژی رۆشنبیرانی ئەو سەردەمەیان پێکدەهێنا.
سەرەڕای ئەم چینەش کە چینی یەکەم بوون لە دەوڵەمەندی چەند



بازرگانێکی تریش لە هەولێرییان و جوولەکەکان هەبوون، کە ئالوگۆڕی بازرگانییان لەگەڵ شارەکانی عێراق و تا وڵاتانی دەرەوەش هەبوو، تەنیا بۆ نموونە، چەلەبییەکانی هەولێر واتە بازرگانە گەورەکان پێستە و خوری کوردستانیان لە خەڵکی ئەو دەڤەرە دەکڕی و دەیانناردە بەسرە، لەوێش بۆ ئەورووپا، بۆیە ئێستا چەند بنەماڵەیەک بە (دەباغ) ناوزەد دەکرێن[141]، جا ئەم چینە تارادەیەکی باش باری دارایییان لە ئاستێکی بەرزدا بوو.

لەنێو ئەم چینانەی سەرەوە (ئاغاکان و موڵکدارەکان و بازرگانەکان)، هەندێ کەسایەتی هەبوون لە رێگەی دروستکردنی چەندین مزگەوت و قوتابخانەی ئایینی توانییان جووڵانەوەیەکی خوێندەواری و رۆشنبیری دروست بکەن، بەتایبەتی رۆشنبیری ئایینی، لەم قوتابخانە ئایینییانە دەیان مەلا و فەقێ پێگەیشتن و دەیان کەس فێرە خوێندەواری و زانستە گواستراوە و هزری و فەلسەفییەکان بوون.

هەندێ لە دەوڵەمەندەکانی شاری هەولێر پشتگیرییەکی ئابووری تەواویان لەم قوتابخانانە کرد و یارمەتییەکی باشیشیان پێشکەش بە فەقێیەکان لە رووی دابینکردنی جلوبەرگ و خواردەمەنی و هەندێ پێداویستی تر کرد[142]. لەو سەردەمەدا ١٩٣٥-١٩٥٨ زۆربەی مزگەوت و قوتابخانە ئایینییەکانی ناو مزگەوتەکان لەلایەن هەندێ لە دەوڵەمەندەکانی ناو شار دروست کرابوون، دیارترین ئەو بنەماڵانەی، کە رۆڵیان لەم بارەیەوە هەبووە بنەماڵەی (مەلا فەندی)، کە بەگشتی خاوەن مزگەوت و مەدرەسەی ئایینی بوون، هەروەها بنەماڵەی (شێخ ئەبوبەکرە فەندی نەقشەبەندی) مزگەوت و قوتابخانەی ئایینییان هەبووە و خۆی تیایدا دەرسی دەگوتەوە و دوای ئەویش کوڕەکەی (شێخ مستەفای نەقشبەندی) لە جێگای ئەو. هەروەها بەم شێوەیە چەندین مزگەوت و قوتابخانەی تریش لەناو شاری هەولێر هەبوون[143].

بێگومان هێنانی کارەباش بۆ شاری هەولێر کاریگەرییەکی زۆری هەبوو لەسەر بووژاندنەوەی ژیانی شارستانی و رۆشنبیری، بەڕێز خوالێخۆشبوو (ئەحمەد محەمەد چەلەبی) کە لە بنەماڵەیەکی ناسراوی هەولێرە و کەسایەتییەکی ناودار و رۆشنبیریش بوو، داوای مافی دامەزراندنی مەکینەیەکی کارەبای کرد بۆ ناو شاری هەولێر[144]. ئەنجومەنی شارەوانی و موتەسەریفی ئەوسای هەولێر و وەزارەتی ناوخۆ بە گەرمی پشتگیری داواکەیان کرد. بەپێی تەقدیری بەڕێز (ئەحمەد چەلەبی) خۆی، هێنان و دامەزراندنی مەکینەکە و ئەو خانووەی بۆی تەرخان کرابوو بەسەریەکەوە دەورووبەری یازدە هەزار و دوو سەد و پەنجا دیناری تێ چوو، کە بۆ رۆژگاری خۆی پارەیەکی یەکجار زۆر بوو، هەموو پارەکەش هەر خۆی سەرفی کرد. بەو جۆرە پرۆژەی کارەبای ناو شاری هەولێر دامەزرا و رۆژی هەشتی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٠ ئاشی ئەلیکتریکی شار کەوتە کار و گڵۆپ داگیرسا، هەرچەندە سەرەتا تایبەت بوو بە رووناککردنەوەی شەقامەکان و هەندێ لە فەرمانگە میرییەکان و هەندێ لە ماڵە دەوڵەمەندەکان[145].

بەڵام بەگشتی کاریگەرییەکی زۆری هەبوو لەسەر بووژانەوەی بیری خەڵکەکە و هەڵبەت دامەزراندنی ئاشی ئەلیکتریکی کارەبا لە گشت رووێکەوە هەنگاوێکی ژیاریی گەورە بوو بۆ ژیانی هەولێر و هەولێرییەکان[146]. سەرەڕای ئەمەش (ئەحمەد چەلەبی) یەکەم کەس بوو کە ئاشی ئارد و کارگەی بەفر دروستکردنی لەناو شار دامەزراند[147].

سینەماش کە یەکێکە لە دەزگا رۆشنبیرییە گرنگەکان لە ساڵی ١٩٣٥ لەلایەن بنەماڵەی (یەعقوبییەکان) دروست کرا، ئەویش سینەمایەکی هاوینی بوو، بەڵام پاش ساڵێک زستانییەکەشی دروست کرا و هاوینییەکەی رووخێنرا، دووەم سینەماش سینەمای حەمرایە، کە لە ساڵی ١٩٤٦ لەلایەن (تەحسین عەلی پاشا) دروست کرا، کە یەکێ بوو لە دەوڵەمەندەکانی ناو شار، ئێستاش ئەم سینەمایە هەر ماوە[148].

بەشەکەی تری خەڵکی شاری هەولێر بەجۆرەها کاسبکارییەوە خەریک بوون و زۆربەیان لەناو بازاڕی هەولێر پیشەکانی خۆیان بە ئەنجام دەگەیاند، ئەمانەش لە رووی دارایییەوە چینێکی مام ناوەندی بوون، وەک دارتاش و ئاسنگەر و ناڵبەند و ئۆتراغچی و کوورەچی و سەبزەچی و بەقاڵ و نانەوا و جامباز و کورتاندروو و چایچی و بەزاز و کوتاڵفرۆش و خانچی و زۆری تر[149].

واتە هیچ کۆگایەکی هاوچەرخ و پێشکەوتوو یا بازاڕگایەکی مۆدێرنی تێدا نەبوو لەگەڵ ئەوەشدا بازاڕێکی شێوە قەیسەری و تارادەیەک ڕێکوپێکی هەبوو کە تا ئێستاش هەر ئاوەدانە و لەم بارەیەوەش بەڕێز (د. عەبدولرەزاق دەباغ) دەڵێ: "بەر لە بەرپابوونی جەنگی یەکەمی جیهانی لەسەردەمی عوسمانییەکاندا کاتێ مامەکانم (حاجی سالح) و (حاجی مەحموود) دەچنە حەجێ لە ڕێگەدا، کە بە شاری دیمەشقی سووریادا دەگەڕێنەوە، بازاڕی (حەمیدییە) دەبینن، کە بازاڕێکی بازرگانی ڕێکوپێکی هەبووە، لەسەر شێوەی خانی جزیری دروست کراوە، زۆر بەو بازارە سەرسام دەبن، بۆیە کە دەگەڕێنەوە هەولێر بازاڕی قەیسەری لەسەر هەمان شێوەی بازاڕی حەمیدییەی سووری دروست دەکەن، ئەو بازارە سەربانێکی پتەو و تۆکمەی هەبووە، گەلێک بەسوود بووە بۆ پاراستنی ئەو دوکانانە لە با و بۆران و باران و سەرما و گەرما هەتا ئێستاکەشی لەگەڵدا بێت ئەو بازارە قەیسەرییانە لە هەولێر هەر ماون، کە وێڕای ئەوەی سەنتەرێکی بازرگانییە، لەهەمان کاتیشدا شوێنەوارێکی بە پێز و مێژوویی ئەو شارەشە"[١٥٠].

لەلایەکی تریش لەبەر باری بازرگانی و هاتوچۆ کردن بۆ هەولێر لە سالانی ١٩٣٥-١٩٥٨، شەش خان و چوار ئوتێلی پلە نزم لە دەوروبەری بازاڕی هەولێر هەبوون[١٥١]، لەگەڵ ئوتێلێکی تارادەیەک پێشکەوتووتر لە وێستگەی شەمەندەفەر بەناوی (ڕێست هاوس)، کە ئەویش لە سالی ١٩٤٧ دامەزرا[١٥٢]، بەو بۆنەیەوەش پێویستە ئاماژە بەوە بکەین، کە بەستنی هەولێر بە بەغدا بە هێڵی ئاسنین کاریگەرییەکی زۆری لەسەر جووڵەی بازرگانی و کۆمەڵایەتی و بەرزبوونەوەی ئاستی ئابووری ناو شار هەبوو، هەروەها لەناو شار ژمارەیەک حەمام و ئاش و کەبابخانە و کارگەی لباد و دەباغخانە و کوورەی کەرپووچ دروستکردن و قەسابخانەیەکیشی تێدا هەبوو.

ئەمانەی پێشوو گشتیان جۆرە جووڵانەوەیەکی لەباری ئابووری ناو شاری هەولێری دروست کردبوو[١٥٣]، ئەم جووڵانەوە ئابوورییەش بوو بەهۆی بووژانەوەی شارەکە و پێشکەوتنی لە رووی بیناسازی و رۆشنبیری و ژیارییەوە جگە لەمانەی کە باسمان کرد، چینێکی هەژار و رەشورووت هەبوو، کە بە خزمەتکاری ماڵە دەولەمەندەکان و بارهەڵگری و کرێکاری ژیانیان بەسەر دەبرد.

جگە لەمانەش ژمارەیەک لە مووچەخۆرانی دەولەت لە فەرمانگەکانی میری کاریان دەکرد، مووچەیەکی دیاریکراوی مانگانەیان هەبوو، کە گوزەرانێکی تارادەیەک گونجاوی بۆ دابین دەکردن، ئەمانەش بەپێی خوێندەوارییان لە رووی رۆشنبیرییەوە لەگەڵ خەڵکەکە جیاواز بوون، تەنانەت لەمانەش (مامۆستایان) دەوری کاریگەر و سەرەکییان لە بلاوکردنەوە و بەرەو پێشبردنی باری رۆشنبیریدا هەبوو، ئەمەش لەبەر ئەو بارە ئابووری و کۆمەلایەتییە باشە بوو، کە مامۆستایانی ئەم سەردەم تیایدا دەژیان.

شاری هەولێر لە رووی کۆمەلایەتییەوە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم بریتی بوو لە شارێکی پارێزەر و داخراو، واتە خەڵکی شارەکە پابەند بوون بە رەچاوکردنی دابونەریتە جۆراوجۆر و نەگۆڕەکان، هاتوچۆ و تێکەڵ و هاموشۆی خەڵکەکەش زیاتر لە ناوەخۆی بوو، تەنانەت خەڵکی شارەکە بە زۆری گشتیان یەکتریان دەناسی ئەم کەمی تێکەڵبوونەش لەگەڵ دەرەوەی شار کارێکی زۆری کردە سەر باری رۆشنبیری و ئەدەبی لەو شارەدا[١٥٤]، لەگەڵ ئەوەشدا لەناو شار چەند بنکەیەکی کۆمەلایەتی هەبوو، کە هەر یەکەیان بەپێی ئاستی خۆی کاریگەرییان لەسەر بواری رۆشنبیری و ئەدەبی ئەم شارەدا هەبووە، یەکێ لەوانەش چایخانەکانە، کە وەک دەزگایەکی رۆشنبیری لەو سەردەمەدا خۆیان دەنواند[١٥٥]، لەبەر ئەوەی خەڵکانێکی زۆر و هەمەجۆر دەچوونە ئەم چایخانانە، لەوانەش دەولەمەند و هەژار و رۆشنبیر و مووچەخۆری میری و کاسبکار و زۆرانی تر، بەزۆری لەناو چایخانەکانیش (رادیۆ) هەبوو، کە لەو سەردەمەدا بە ئامێرێکی رۆشنبیری دادەنرا[١٥٦]، هەروەها لە هەندێ چایخانانەدا حیکایەتخوانی تایبەت هەبوو، کە حیکایەتی جۆراوجۆریان بۆ خەڵکەکە دەچری، هەندێ لەم حیکایەتخوانانەش بەشێوەیەکی وا حیکایەتەکانیان دەگێڕایەوە خەڵکەکە پێیانەوە سەرسام دەبوون[١٥٧]، ئەم حیکایەتانە جۆرە سەرەتایەک بوون بۆ

سەرهەڵدانی چیرۆکی هونەری نوێ.

لەلایەکی تر خەڵکی شاری هەولێر لە کۆنەوە گرنگییەکی زۆریان بە بۆنە ئاینییەکان داوە و یەکێک لەو بۆنە کۆمەڵایەتی و ئاینییانەش، کە بە سەرچاوەی بووژانەوەی باری ئەدەبی و رۆشنبیری لەناو شاردا دادەنرا، بریتی بوو لە سازدانی مەولوودی پێغەمبەر (د. خ)، کە بێگومان بریتییە لە بەرهەمێکی ئەدەبی، کە بەشێوازێکی تایبەت و بە سێ چوار زمان پێشکەش دەکرا، لەوانەش: (کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی)، مەولوودی پێغەمبەر (د. خ) لە دواییدا بووە هۆکارێک بۆ نووسینی مەلوودنامەی کوردی(١٥٨).

لە شاری هەولێر لەو سەردەمەدا تەکیە و خانەقا و مزگەوت دەوری دیاریان لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا هەبوو، بەتایبەتی ژیانی ئەدەبی و دەورکردنەوەی شیعری کلاسیکی کوردی(١٥٩)، لە هەولێر دوو تەکیەی گەورەی تەریقەتی قادری هەبوو، تەکیەی شێخ عەبدولکەریمی دارەخورما لە گەڕەکی خانەقا و تەکیەی شێخ محێدینی شێخساڵح لە گەڕەکی عارەبان، هەردوو بنەماڵە لە نەژادەوە بەرزنجەیی بوون، هەروەها تەکیەکانی شێخ شەریف و شێخ عەبدولکەریم مەلا خضر تەلەعفەری لە قەڵاتێ، جگە لەمانە مزگەوت و خانەقای نەقشبەندییانیش لە شاردا هەبوو، لەمانە خانەقای شێخ مستەفا هەرشەمی و هەروەها خانەقای شێخ تاجەدین و خانەقای شێخە رەشکە(١٦٠)، لەگەڵ هەندێ وردە تەکیە و خانەقای تر نەوەکو تەنیا سەر بە دوو تەریقەتەکە، بەڵکو تەریقەتەکانی تریشیان تێدابوو، باسی شیعر و ئەدەب و خوێندەواری و رۆشنبیری کوردی لە کۆڕەکانی ئەم تەکیە و مزگەوت و خانەقایانە دەکرا، بەتایبەتی تەکیەی بەرزنجییەکان(١٦١).

بەڵام لە دیوەخانەی ماڵە هەولێرییە دەوڵەمەند و ئاغاکان باسی ئەدەب و شیعر و رۆشنبیری کوردی نەکراوە، مەگەر بەدەگمەن نەبێ، هەر بۆیە دیوەخانەکانی ناو شار جۆرە کاریگەرییەکی ئەوتۆیان لە بواری رۆشنبیری و ئەدەبی کوردی لەم شارەدا نەبووە، هەرچەندە چەندین دیوەخانەی جیاجیاش لەناو شار هەبوون، بەڵام لێرەدا نابێ رۆڵی دیوەخانەی مەلایان لە مزگەوتەکان لەبیر بکەین، چونکە (کۆبوونەوەی) مەلایان لەم جۆرە دیوەخانانە لەو سەردەمەدا گۆشەیەکی ئەدەبی گرنگ بوو، مەلایەکان لەم دیوەخانانە وتوویژ و ئاڵوگۆڕی رۆشنبیری و ئەدەبی جۆراوجۆریان دەکرد.

لەلایەکی تر یەکێک لە بنکە و دەزگا کۆمەڵایەتییە هەرە دیارەکانی شاری هەولێر (یانەی فەرمانبەران) بوو، کە لە ساڵی ١٩٢٨ز کرایەوە و فەرمانبەران و مامۆستایان ئێوارە و شەوانیان لەم یانەیە بەسەر دەبرد و تا هەشتاکانی سەدەی رابردووش هەرمابوو، دەتوانین بڵێین ئەم یانەیە سەرەڕای ئەوەی، کە بنکەیەکی کۆمەڵایەتی بوو شوێنێکی رۆشنبیریش بوو، لەبەر ئەوەی تیایدا وتوویژ و ئاڵوگۆڕی چەندین راوبۆچوونی جیاجیا لە بارەی بابەتی ئەدەبی و رۆشنبیری کراوە.

## سەرچاوە و پەراوێزەکان

(١) لە چاوپێکەوتنی تایبەت لەگەڵ بەڕێز مامۆستا (کەریم شارەزا) لە ١/ ٢٠٠١/١١.

(٢) هادي رشيد چاوشلي، تراث اربيل التاريخي، اربيل، ١٩٨٥، ص (٢٢).

(٣) زبير بلال ئیسماعیل، تاريخ اربيل، اربيل، ١٩٩٨، ص (٢١٥).

(٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل (٢١٥).

(٥) (ویلایەتی موسڵ) لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە دووبارە لە ساڵی ١٨٧٩ پێکهێنرایەوە، شاری هەولێریش سەر بەم ویلایەتە بوو، بۆ زیاتر شارەزا بوون لە بارەی (ویلایەتی موسڵ) سەیری (مشكلة الموصل، تأليف الدكتور فاضل حسين، بغداد، ١٩٥٥) بکە.

(٦) ستيفن هيمسلي لونكريك، العراق الحديث من سنة ١٩٠٠ الى سنة ١٩٥٠، ترجمة وتعليق سليم طه التكريتي، الجزء الأول، بغداد، ١٩٨٨، ص (١٥٦).

(٧) د. فاضل حسين، المصدر السابق، ص (٣).

(٨) لە (٢٦) نیسانی ساڵی (١٩٢٠) عێراق بووە یەکێک لە وڵاتانی ئینتیدابی بەریتانی و لە (٢٣)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٢٠) یەکەم وەزارەتی کاتی بە سەرۆکایەتی (نەقیبی ئەشرافی بەغداد- عەبدولڕەحمان گەیلانی) دامەزرا و لە (٢٣)ی مانگی ئابی ساڵی ١٩٢١ (شا فەیسەڵی یەکەم)ی کوڕی شەریفی حوسەینی شەریفی مەکە بوو بە یەکەم شای عێراق.

(٩) زبیر بلال ئیسماعیل، هەولێر لە مێژوودا، گۆڤاری هەولێر، ژمارە (١)

زستانی ١٩٩٨، ل (١٣).
(١٠) ئیسماعیل شكر رسول، اربیل دراسة تاریخیة في دورها الفكري والسیاسي (١٩٣٩-١٩٥٨)، اطروحة دكتوراه، قسم التاریخ، كلیة الاداب، جامعة صلاح الدین، اربیل، ١٩٩٩، ص (٢٩).
(١١) لە چاوپێكەوتنێكی تایبەت لەگەڵ بەڕێز پرۆفیسۆر د. مارف خەزنەدار.
(١٢) لە چاوپێكەوتنێكی تایبەت لەگەڵ بەڕێزان (زیوەر خەتاب ٣/ ١١/ ٢٠٠١، حاجی حەیدەر عوسمان ٦/ ١١/ ٢٠٠١، ئەحمەد دڵزار ٢٨/ ١١/ ٢٠٠١، عومەر فەرهادی ٣/ ١٢/ ٢٠٠١).
(١٣) لە چاوپێكەوتنێكی تایبەت لەگەڵ بەڕێزان (زیوەر خەتاب، حەیدەر عوسمان، د. مارف خەزنەدار ٢٠/ ١١/ ٢٠٠١، سەید مەولود بێخاڵی ٣٠/ ١١/ ٢٠٠١، نەژاد بەرزنجی ٢٢/ ١١/ ٢٠٠١).
(١٤) لە بارەی كاریگەری ئەم شۆڕشانەی لەسەر شاری هەولێر سەیری (ئیسماعیل شوكر ڕسوڵ، هەمان سەرچاوەی پێشوو) بكە.
(١٥) عەبدولجەبار جەباری، مێژووی ڕۆژنامەگەری كوردی، سلێمانی، ١٩٧٠، ل (٥٢-٥٣).
(١٦) عەلائەدین سوجادی، مێژووی ئەدەبی كوردی، بەغداد، ١٩٥٢، ل (١٥٥).
(١٧) سەیری (جەماڵ خەزنەدار، ڕابەری ڕۆژنامەگەری كوردی، بەغدا، ١٩٧٣) بكە.
(١٨) ساڵح حەیدەری، یاداشت و چاوپێخشاندن بە مێژووی بزووتنەوەی نیشتمانی و شۆڕشگێری كوردستان و عێراقدا ١٩٤٠-١٩٥٣، گۆڤاری هەولێر، ژمارە (١)، زستانی ١٩٨٨.
(١٩) لە چاوپێكەوتنی تایبەت لەگەڵ بەڕێزان (د. مارف خەزنەدار و زیوەر خەتاب).
(٢٠) دەستنووسێكی مامۆستا (عیزەدین فەیزی)، كە تیایدا باسی چەند سەربردەیەكی خۆی دەكات.
(٢١) لە چاوپێكەوتنی تایبەت لەگەڵ بەڕێزان (د. مارف خەزنەدار، زیوەر خەتاب، كەریم شارەزا، حەیدەر عوسمان، نەژاد بەرزنجی، عەلی جوكل بەریبە ٢٠/ ١١/ ٢٠٠٢، سەید مەولوود بێخاڵی، عومەر فەرهادی، مەحموود زامدار ١٠/ ١/ ٢٠٠٢، محەمەد عارف ٢/ ٢/ ٢٠٠٢، قەدریە عەزیز ٣٠/ ١/ ٢٠٠٢)، ممتاز حەیدەری، مامۆستا عیزەدین فەیزی بۆ هاوكاری ئەدەبی، ڕۆژنامەی هاوكاری، ژمارە (١١٧)، ١٩٧٢.
(٢٢) مەغدید حاجی، یەكەمین قوتابخانەی هەولێر، ڕۆژنامەی (برایەتی)، ژمارە (٢٢٥٠).
(٢٣) زبیر بلال ئیسماعیل، ثورات بارزان ١٩٠٧-١٩٣٥، هەولێر، ١٩٩٨، ل (٨٠).
(٢٤) عبدالرزاق الحسني، تاریخ الوزارات العراقیة، الجزء الثالث، بغداد، ص (١١-١٢).
(٢٥) سەرچاوەی پێشوو، ل (١٢).
(٢٦) چاوپێكەوتنی تایبەت لەگەڵ بەڕێزان (زیوەر خەتاب، نەژاد بەرزنجی، ئەحمەد دڵزار، كەریم شارەزا، ممتاز حەیدەری ١١/ ١٢/ ٢٠٠١، حەیدەر عوسمان).
(٢٧) ساڵح حەیدەری، سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٧.
(٢٨) ساڵح حەیدەری، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل (٨٥)، فەیسەڵ دەباغ، حزبی هیوا و شۆڕشی (١٩٤٣-١٩٤٥)ی بارزان، هەولێر، ١٩٩٧، ل (١١).
(٢٩) هەمان سەرچاوەكانی پێشوو.
(٣٠) كەریم شارەزا، المناضل القومي والشاعر المجدد (دلدار) (١٩١٨-١٩٤٨)، ڕۆژنامەی خەبات، ژمارە (١٠٠١)، ١٠/ ١١/ ٢٠٠٠.
(٣١) حبیب محمد كریم، تاریخ الحزب الدیمقراطي الكردستاني-العراق (في محطاط رئیسیة) (١٩٤٦-١٩٩٣)، دهوك، ١٩٩٨، ص (٢٦).
(٣٢) ئیسماعیل شوكر ڕەسول، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل (١١٢).
(٣٣) سەرچاوەی پێشوو، ل (١١٢-١١٣).
(٣٤) ساڵح حەیدەری. سەرچاوەی پێشوو، ل (١٩).
(٣٥) د. مارف خەزنەدار، حزبی هیوا، گۆڤاری گوڵان، هەولێر، ژمارە (٣٦٤)، (١٠)ی كانوونی یەكەمی ٢٠٠٢، ل (٥٦).
(٣٦) لە بارەی كۆمەڵەی (هێڤی) سەیری د. بلەج شێركۆ، القضیة الكردیة، ماضي الكرد وحاضرهم، القاهرة، ١٩٣٠، ص (٥١-٥٢) بكە.
(٣٧) د. مارف خەزنەدار، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل (٥٦).
(٣٨) سەرچاوەی پێشوو، ل (٥٦).
(٣٩) لەبارەی چالاكی حزبی هیوا لە شاری هەولێر سەیری (تاریق جامباز، لاپەڕەیەكی شاراوە لە مێژوویی حزبی هیوا لە هەولێر، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە (١)، ئابی ساڵی ١٩٩٧، هەولێر، ل (٢٥-٣١)، هەروەها (تاریق جامباز، هۆشیاری نەتەوایەتی گەنجانی هەولێر لە كۆتایی سییەكان و ناوەڕاستی

چلەکان لە نێو حزبی هیوادا، گۆڤاری هەولێر، ژمارە (١)، هەولێر، زستانی ١٩٩٨، ل (٥٧-٦٦).

(٤٠) ئیسماعیل شوکر رەسول، سەرچاوەی پێشوو، ل (١١٦).

(٤١) لە چاوپێکەوتنێکی تایبەت لەگەڵ بەڕێز (زیوەر خەتاب).

(٤٢) لە چاوپێکەوتنێکی تایبەت لەگەڵ بەڕێز (ئەحمەد دڵزار).

(٤٣) لە چاوپێکەوتنێکی تایبەت لەگەڵ بەڕێز حاجی (حەیدەر عوسمان)، تاریق جامباز هەردوو سەرچاوەی پێشوو.

(٤٤) تاریق جامباز، لاپەڕەیەکی شاراوە لە مێژووی حزبی هیوا لە هەولێر، سەرچاوەی پێشوو، ل (٢٨)، کەریم شارەزا، المربي والاديب والصحفي عزالدين فيضي (١٩١٧-١٩٨٥)، جريدة (خەبات)، العدد (١٠١٦)، اربيل، ٢/ ٣/ ٢٠٠١ ص (١٣).

(٤٥) نجاة ياسين نجار، مجید ئەفەندی، (١٩١١-١٩٦٨) الشخصية السياسية المنسية، مجلة (گولان)، العدد (١٧) اربيل، ٢٥/ ١٠/ ١٩٩٧، ص (٤٩).

(٤٦) لە چاوپێکەوتنێکی تایبەت لەگەڵ بەڕێزان (حەیدەر عوسمان، زیوەر خەتاب، ئەحمەد دڵزار، نەژاد بەرزنجی، عەلی جوکل بەریە)، ئیسماعیل شوکر رەسوڵ، سەرچاوەی پێشوو، ل (١١٤-١١٥)، تاریق جامباز، وشیاری نەتەوایەتی گەنجانی هەولێر، سەرچاوەی پێشوو، ل (٦٠-٦٢)، تاریق جامباز، لاپەڕەیەکی شاراوە لە مێژووی حزبی هیوا، سەرچاوەی پێشوو، ل (٢٥-٣١)، بەکر شاکر عەبدوڵلا، عەلی فەتاح دزەیی، (نامەی ماستەر)، کۆلیجی ئاداب، زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ٢٠٠٠، ل (٢٠).

(٤٧) تاریق جامباز، هەفتەنامەی گۆڤار، هەولێر، ١٩٩٨، ل (١٢-١٣).

(٤٨) ئیسماعیل شوکر رەسوڵ، سەرچاوەی پێشوو، ل (١١٦).

(٤٩) تاریق جامباز، هەفتەنامەی گۆڤار، هەولێر، ١٩٩٨، ل (٩).

(٥٠) تاریق جامباز، سەرچاوەی پێشوو، ل (١١).

(٥١) لە دەستنوسێکی خاتوو (فەریدە یونس) لەبارەی ژیاننامەی (نافع یونس)ی برای.

(٥٢) تاریق جامباز، هەفتەنامەی گۆڤار، هەفتەنامەیەکی حزبی هیوا لە هەولێر، گۆڤاری (سەنتەری برایەتی)، ژمارە (٥)، هەولێر، نیسان ١٩٩٨.

(٥٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٥٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٥٥) ئیسماعیل شوکر رەسوڵ، سەرچاوەی پێشوو، ل (١١٦).

(٥٦) سەرچاوەی پێشوو، ل (١١٧).

(٥٧) دەستنوسێکی مامۆستا (عیزەدین فەیزی) کە تیایدا باسی چەند سەربردەیەکی خۆی دەکات.

(٥٨) لە چاوپێکەوتنی تایبەت لەگەڵ کاک (زیوەر خەتاب).

(٥٩) علي عبدالله، تاريخ الحزب الديمقراطي الكردستاني-العراق انعقاد مؤتمره الثالث ايلول، ١٩٦٨، اعيد طبعه سنة ١٩٩١، ص (٢١).

(٦٠) حەبیب محەمەد کەریم، سەرچاوەی پێشوو، ص (٢٧).

(٦١) سەرچاوەی پێشوو، ل (٢٧).

(٦٢) ئەحمەد دڵزار، پاشکۆی بیرەوەرییەکان، بەشی دووەم، هەولێر، ٢٠٠١، ل (١١).

(٦٣) کەریم شارەزا، مەلا شەریف رەنگەڕێژانی شاعیر و نووسەر و وەرگێڕ، گۆڤاری هەولێر، ژمارە (١)، ل (١٧٩).

(٦٤) سمير عبدالكريم، أضواء علي الحركة الشيوعية في العراق، بغداد، ص (٥٧-٦٨).

(٦٥) ساڵح حەیدەری، سەرچاوەی پێشوو، ل (٧٥-٧٧).

(٦٦) ئیسماعیل شوکر رەسول، سەرچاوەی پێشوو، ل (١٢٥)، چاوپێکەوتنی تایبەت لەگەڵ بەڕێز (حاجی حەیدەر عوسمان).

(٦٧) عەلی عەبدوڵلا، سەرچاوەی پێشوو، ل (٢١).

(٦٨) صالح الحيدري، مذكراته، جريدة (الاتحاد)، العدد (١١)، اربيل، ٣/ ٤/ ١٩٩٣.

(٦٩) ساڵح حەیدەری، سەرچاوەی پێشوو، ل (٧٨).

(٧٠) لە چاوپێکەوتنی تایبەت لەگەڵ بەڕێز (زیوەر خەتاب)، سەمیر عەبدولکەریم، سەرچاوەی پێشوو، ل (٦٦-٦٧).

(٧١) سەمیر عەبدولکەریم، سەرچاوەی پێشوو، ل (٦٧).

(٧٢) ئیسماعیل شوکر رەسول، سەرچاوەی پێشوو.

(٧٣) صامد الكردستاني، كفاح الاكراد، د. م، د. ت، ص (٣٦).

(٧٤) ئیسماعیل شوکر رەسول، سەرچاوەی پێشوو، ل (١٣١).

(٧٥) لە چاوپێکەتنی تایبەت لەگەڵ بەڕێزان (ئەحمەد دڵزار، زیوەر خەتاب)، عەلی عەبدوڵلا، سەرچاوەی پێشوو، ل (٢٦).

(٧٦) ئیسماعیل شوکر رەسول، سەرچاوەی پێشوو، ل (٢٢١).

(٧٧) لە چاوپێکەوتنی تایبەت لەگەڵ بەڕێزان (زیوەر خەتاب، حەیدەر عوسمان، ئەحمەد دڵزار)، ئیسماعیل

شوکر رەسول، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل (٢١٨-٢١٩)، عاسم حەیدەری، لاپەڕەیەکی شاراوە لە مێژووی خەباتی نەتەوایەتی شاری هەولێر بیرەوەری ئاهەنگی نەورۆزی ١٩٤٦، گۆڤاری (دەفتەری کوردەواری)، ل (٨).
(٧٨) چاوپێکەتنی تایبەت لەگەڵ بەڕێزان (ئەحمەد دلزار، زیوەر خەتاب)، سەمیر عەبدولکەریم، سەرچاوەی پێشوو، ل (٦٧).
(٧٩) ساڵح حەیدەری، حزبی رزگاری کورد (١٩٤٥-١٩٤٦)"، گۆڤاری هەولێر، ژمارە (٢) هەولێر بەهاری ١٩٩٩، ل (٥-٣٢).
(٨٠) بۆ زیاتر شارەزابوون لەبارەی ئەم شۆڕشە سەیری (فەیسەڵ دەباغ، حزبی هیوا و شۆڕشی بارزان) (١٩٤٣-١٩٤٥) هەولێر، ١٩٩٧، بکە.
(٨١) لەبارەی رۆڵی شاری هەولێر لە شۆڕشی بارزان (١٩٤٣-١٩٤٥)دا، سەیری (ئیسماعیل شوکر رەسول، سەرچاوەی پێشوو، ل (١٥٨-١٩٠)، بکە.
(٨٢) عەلی عەبدوللا، سەرچاوەی پێشوو، ل (٤٥).
(٨٣) عەلی عەبدوللا، سەرچاوەی پێشوو، ل (٤٧-٥٢).
(٨٤) لە چاوپێکەوتنی تایبەت لەگەڵ بەڕێزان (حەیدەر عوسمان، زیوەر خەتاب).
(٨٥) حەبیب محەمەد کەریم، سەرچاوەی پێشوو، ل (٣٥).
(٨٦) لە چاوپێکەوتنی تایبەت لەگەڵ بەڕێز کاک (زیوەر خەتاب)، حەبیب محەمەد کەریم، سەرچاوەی پێشوو، ل (٢٥).
(٨٧) لەبارەی ئەم راپەڕینەوە سەیری (عبدالرزاق الحسني، الاسرار الخفية في حركة مايس ١٩٤١، الطبعة الخامسة، مركز الأبجدية التحررية، بيروت، ١٩٨٢) بکە.
(٨٨) د. سلمان لفة الزبيد، مساهمة الكرد في ثورة مايس التحررية، جريدة (العراق)، بغداد، ٢/ ٥/ ١٩٩٧.
(٨٩) د. کەماڵ مەزهەر، چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد، هەولێر، ٢٠٠١، ل (١٧٨).
(٩٠) ئیسماعیل شوکر رەسول، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل (١٤٣-١٥٧).
(٩١) سۆران عیززەدین فەیزی، یادی عیززەدین فەیزی، هەولێر، ١٩٨٨، ل (٩٠).
(٩٢) ئیسماعیل شوکر رەسول، سەرچاوەی پێشوو، ل (١٤٨).
(٩٣) دەستنووسێکی مامۆستا (عیزەدین فەیزی)، کە تیایدا باسی چەند سەربردەیەکی خۆی دەکات.
(٩٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو، د. کەماڵ مەزهەر، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل (١٧٨).
(٩٥) سۆران عیززەدین فەیزی، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل (٩٢)، سەید مەولوود بێخاڵی، بزووتنەوەی رەشید عالی گەیلانی لە بەغدا و هەرایەکەی شێخ حەسەن ئەفەندی لە شاری هەولێردا، گۆڤاری هەولێر، ژمارە (٢) هەولێر، ١٩٩٩.
(٩٦) ئیسماعیل شوکر رەسول، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل (١٥٢-١٥٣).
(٩٧) لەبارەی ئەم شۆڕشە سەیری (فەیسەڵ دەباغ، حزبی هیوا و شۆڕشی (١٩٤٣-١٩٤٥)ی بارزان، ١٩٩٧، هەولێر) بکە.
(٩٨) بگەڕێوە لاپەڕە ٢٩.
(٩٩) ئیسماعیل شوکر رەسول، سەرچاوەی پێشوو، ل (١٦٧).
(١٠٠) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل (١٦٧).
(١٠١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل (١٦٧-١٦٨).
(١٠٢) لەم بارەیەوە سەیری فەیسەڵ دەباغ، سەرچاوەی پێشوو، بکە.
(١٠٣) فەیسەڵ دەباغ، سەرچاوەی پێشوو، ل (٣٥).
(١٠٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو.
(١٠٥) ئیسماعیل شوکر رەسول، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل (١٦٨، ١٦٩، ١٧٠، ١٧١).
(١٠٦) عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، الجزء السابع، ص (١٧٦).
(١٠٧) ئەم پەیماننامەیە لە شاری (پۆرتسمۆثی) کەنار دەریا ئیمزا کرا، بۆ زیاتر شارەزا بوون لە ناوەڕۆکی ئەم پەیماننامەیە و دەرئەنجامەکانی بڕوانە:
(١٠٨) خميس خزام والي، وثبة كانون الوطنية في العراق ١٩٤٨، رسالة ماجستير، كلية القانون والسياسة، جامعة بغداد، ١٩٧٩.
(١٠٩) كامل الجادرجي، سجل الحركه الوطنيه ضد معاهده (جبر-بيفن) ودور الحزب الوطني الديمقراطي فيها، بغداد، ١٩٦٠.
(١١٠) عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، الجزء السابع، ص (١٧٥-٣١٠).
(١١١) بەکر شاکر عەبدوللا، عەلی فەتاح دزەیی، شاعیر و نووسەر، (نامەی ماستەر)، زانکۆی سەلاحەدین، کۆلیژی ئەدەبیات، بەشی زمانی کوردی، هەولێر، ٢٠٠٠.
(١١٢) د. فاروق صالح العمر، المعاهدات

العراقية البريطانية وأثرها في السياسة الداخلية ١٩٢٢-١٩٤٨، بغداد، ١٩٧١، ص (٣٧٧-٤٢٣).
(١١٣) لەو سەردەمەدا جۆرە رکەبەرایەتییەک لە نێوان ئەم دوو حزبە هەبووە، تەنانەت هەندێ جار گەیشتۆتە رادەیەک هەر لایەنێ، بە تەنیا خۆپیشاندان ئەنجام بدات، ئەمەش بەزۆر دەشکاوە سەر رۆڵی ناوچە کوردییەکان لە راپەرینەکەدا، لە چاوپێکەوتنی تایبەت لەگەڵ بەڕێزان (زیوەر خەتاب، عومەر فەرهادی، نەژاد بەرزنجی، فەریدە یونس ٢٢/ ١/ ٢٠٠٢، حەیدەر عوسمان).
(١١٤) ئیسماعیل شوکر رەسول، سەرچاوەی پێشوو، ل (٢٤٦-٢٤٩).
(١١٥) لە چاوپێکەوتنی تایبەت لەگەڵ بەڕێزان خاتوو (فەریدە یونس، حەیدەر عوسمان، نەژاد بەرزنجی).
(١١٦) کەریم شارەزا، دەوری کورد لە راپەرینە نیشتمانییەکەی (١٩٤٨)ی عێراقدا، رۆژنامەی (برایەتی)، ژمارە (٢٢٦٣)، هەولێر، ٢٧/ ١/ ١٩٩٧.
(١١٧) لە چاوپێکەوتنی تایبەت لەگەڵ بەڕێز خاتوو (فەریدە یونس).
(١١٨) محسن دزەیی، احداث عاصرتها، اربيل، ٢٠٠١، ص (٩١-٩٢).
(١١٩) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل (٩١-٩٢).
(١٢٠) ساسان عەونی، یەکێتی قوتابییانی کوردستان چەند لایەنێکی تێکۆشان و مێژوو، هەولێر، ١٩٩٨، ل (٩).
(١٢١) لە چاوپێکەوتنی تایبەت لەگەڵ بەڕێز کاک (عومەر فەرهادی).
(١٢٢) رژێمی شاهانەی ئەو سەردەم یادکردنەوەی جەژنی نەورۆزی لا قەدەغە بوو، ئەوەی باسی نەورۆزی بکردبایە، ئەوا زیندانی دەکرا و ئەوانەی ئاگری نەورۆزیشیان دەکردەوە بە ئاگرپەرست لە قەڵەم دەدران.
(١٢٣) سەلیم سەیدۆک کوڕی عەبدوللای جولەمێرگییە، لە ساڵی ١٩١٠ لە قەڵای هەولێر هاتۆتە دنیاوە، لە ساڵی ١٩٢٧ لەبەردەستی (مەلا فەندی) هەولێری ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، ئەو کەڵەمێردە سێ زمانی کوردی و عەرەبی و فارسی بە نووسین و خوێندن دەزانی، شاعیرێکی کارامە بوو، زۆر وتاری لە رۆژنامەکانی (خەبات، صوت الاكراد، المبدأ والاستقلال... هتد) بلاوکردۆتەوە، لە ئەنجامی نەخۆشییەکی کوشندە لە رۆژی (٢٢)ی ئەیلولی ساڵی ١٩٧٠ کۆچی دوایی دەکات.
(١٢٤) بروانە (تاریق جامباز، نەورۆزی ساڵانی ١٩٣٣-١٩٤٠ لە قەڵای هەولێر لاپەڕەیەکی شاراوەی شکۆمەندی کوردایەتییە، رۆژنامەی (ئاڵای ئازادی)، ژمارە (٦٦)، هەولێر ٢١/ ٣/ ١٩٩٣.
(١٢٥) تاریق جامباز، هەمان سەرچاوەی پێشوو.
(١٢٦) تاریق جامباز، هەمان سەرچاوەی پێشوو، د. ئیسماعیل شوکر، نەورۆزی ساڵانی ١٩٣٢-١٩٥٨ لە هەولێر، گۆڤاری (هاڤیوون)، ژمارە (٩)، دهۆک، ٢٠٠١، ل (١٢٦-١٢٧)، دەستنووسێکی مامۆستا عیزەدین فەیزی، کە تیایدا باسی چەند سەربردەیەکی خۆی دەکات.
(١٢٧) تاریق جامباز، هەمان سەرچاوەی پێشوو.
(١٢٨) حەسەن تەنیا، شانۆ و شانۆی کوردەواری، هەولێر، ١٩٨٥، ل (٩٢).
(١٢٩) تاریق جامباز، هەمان سەرچاوەی پێشوو، د. ئیسماعیل شوکر رەسول، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل (١٢٧).
(١٣٠) ممتاز حەیدەری، مامۆستا عیزەدین فەیزی بیرەوەری خۆی بۆ هاوکاری دەگێڕێتەوە، رۆژنامەی هاوکاری، ژمارە (١١٧) ٢٠/ ٥/ ١٩٧٢، ل (٣)، تاریق جامباز، هەمان سەرچاوەی پێشوو، د. ئیسماعیل شوکر رەسول، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل (١٧)، سەید مەولوود بێخاڵی، هەولێر و بەهار و نەورۆز، گۆڤاری هەولێر، ژمارە (٦)، هەولێر، بەهاری ٢٠٠٠، ل (١٠١).
(١٣١) تاریق جامباز، نەورۆزانەی ساڵی ١٩٤٠، رۆژنامەی خەبات، ژمارە (١٩٠)، هەولێر، ٢١/ ٣/ ١٩٩٤، ل (٦)، د. ئیسماعیل شوکر رەسول، سەرچاوەی پێشوو، ل (١٢٧-١٢٨).
(١٣٢) چاوپێکەوتنێک لەکەڵ مامۆستا عەزیز محەمەد، گۆڤاری مامۆستای کورد، ژمارە (٤)، سوید، ١٩٨٧.
(١٣٣) عاسم حەیدەری، لاپەڕەیەکی شاراوە لە مێژووی خەباتی نەتەوایەتی شاری هەولێر، بیرەوەری ئاهەنگی نەورۆزی ١٩٤٦، گۆڤاری (دەفتەری کوردەواری)، ل (٩).
(١٣٤) د. مارف خەزنەدار، هەندێ لە یادگارییەکانی نەورۆز، رۆژنامەی (میدیا)، ژمارە ٦٣، هەولێر، ٢٧/ ٣/ ٢٠٠٠.
(١٣٥) چاوپێکەوتنی تایبەت لەگەڵ بەڕێز خاتوو (فەریدە یونس).
(١٣٦) عاسم حەیدەری، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل (٨-١٤)، عیزەدین فەیزی، یادگارەکانم لەگەڵ

جەژنەکانی نەورۆزدا، رۆژنامەی هاوکاری، ژمارە ٤١٧، ١٧/ ٣/ ١٩٧٨، سەید مەولود بێخاڵی، هەولێر و بەهار و نەوروز، گۆڤاری هەولێر، ژمارە ٦، هەولێر، بەهاری ٢٠٠٠، ل (١٠١).
(١٣٧) عاسم حەیدەری، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل (٩)، عیزەدین فەیزی، هەمان سەرچاوەی پێشوو، چاوپێکەوتنی تایبەت لەگەڵ بەڕێزان (د. مارف خەزنەدار، حەیدەر عوسمان، زیوەر خەتاب، عومەر فەرهادی، سەید مەولود بێخاڵی، نەژاد بەرزنجی، عەلی جوکل بەرییە).
(١٣٨) لە چاوپێکەوتنی تایبەت لەگەڵ بەڕێزان (حەیدەر عوسمان، زیوەر خەتاب، عومەر فەرهادی، نەژاد بەرزنجی).
(١٣٩) گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٤، ساڵی هەشتەم، بەغدا، ١٩٤٧.
(١٤٠) لە چاوپێکەوتنی تایبەت لەگەڵ بەڕێزان (نەژاد بەرزنجی، حەیدەر عوسمان، عومەر فەرهادی)، ئیسماعیل شوکر رەسول، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل (١٢٩-١٣٠)، عاسم حەیدەری، هەمان سەرچاوەی پێشوو.
(١٤١) بۆ زیاتر شارەزا بوون لەبارەی ئەم ناهەنگانەوە سەیری (مەلا عەولای حاجی سمایل، سەربردەی ژیانی سیاسیم، بەغداد، ١٩٩٠، ل (١٠٢-١١٤) بکە.
(١٤٢) مەلا عەولا حاجی سمایل، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل (١٠٢-١١٤)، د. ئیسماعیل شوکر رەسول، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل (١٣٢).
(١٤٣) هادي رشيد چاوشلي، تراث أربيل التاريخي، الموصل، ١٩٨٥، ص (٨٧).
(١٤٤) سەیری (عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، الجزء العاشر) بکە.
(١٤٥) د. عەبدولڕەزاق دەباغ، مامەکانم قەیسەری هەولێریان دروست کرد: یوسف نانەکەلی گۆڤاری بارش، ژ (٦)، هەولێر، ٢٠٠١، ل (٦١).
(١٤٦) زبير بلال إسماعيل، علماء ومدارس في اربيل، الموصل، ١٩٨٤، ص (١٠).
(١٤٧) زوبێر بیلال ئیسماعیل، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل (٢١-٢٢)، هەروەها سەیری (سەید مەولوود بێخاڵی، هەولێرم وادیوە، بەغدا، ١٩٩١، ل (٦٦-٧١).
(١٤٨) د. کەماڵ مەزهەر، هەولێر نەک بەغدا یەکەم شاری عێراق بوو لە بواری مانگرتندا بۆ داشکاندنی نرخی کارەبا، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژ (١٤٢)، بەغدا، ١٩٩٩.
(١٤٩) هەمان سەرچاوەی پێشوو.
(١٥٠) لە چاوپێکەوتنی تایبەت لەگەڵ بەڕێزان (زیوەر خەتاب، نەژاد بەرزنجی، عومەر فەرهادی).
(١٥١) لە چاوپێکەوتنی تایبەت لەگەڵ بەڕێز (نەژاد بەرزنجی).
(١٥٢) هەولێر، سەرپەرشتی و رێکخستنی (تەحسین چیچۆ و شێرزاد قادر)، کۆمەڵە وتارێکی رۆشنبیری و مێژوویە شارەوانی هەولێر ئامادەی کردووە هەولێر، ١٩٨٥، ل (١٦٨).
(١٥٣) سەید مەولود بێخاڵی، سەرچاوەی پێشوو، ل (٧٦-١٢٧).
(١٥٤) یوسف نانەکەلی، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل (٦١).
(١٥٥) لە چاوپێکەوتنی تایبەت لەگەڵ بەڕێز کاک (نەژاد بەرزنجی).
(١٥٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو.
(١٥٧) لەم بارەیەوە سەیری مەولود بێخاڵی، هەولێرم وادیوە، بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٩١، بکە.
(١٥٨) لە چاوپێکەوتنی تایبەت لەگەڵ بەڕێزان (زیوەر خەتاب، نەژاد بەرزنجی).
(١٥٩) د. مارف خەزنەدار، هەولێری جاری جاران و چەند یادگارییەک، گۆڤاری هەولێر، ژمارە (٩)، زستانی ٢٠٠١، ل (٣١).
(١٦٠) لە چاوپێکەوتنی تایبەت لەگەڵ بەڕێزان (عەلی جوکل بەرییە، نەژاد بەرزنجی، مەحموود زامدار).
(١٦١) لە چاوپێکەوتنی تایبەت لەگەڵ بەڕێزان (د. مارف خەزنەدار، مەحموود زامدار، زیوەر خەتاب، عومەر فەرهادی).
(١٦٢) رەشاد موفتی، مەولوودنامەی کوردی، هەولێر، ٢٠٠١.
(١٦٣) د. مارف خەزنەدار، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل (٣٢).
(١٦٤) لە چاوپێکەوتنی تایبەت لەگەڵ بەڕێزان (نەژاد بەرزنجی، د. مارف خەزنەدار، عەلی جوکل بەرییە، عوسمان موفتی، ٢٣/ ١٢/ ٢٠٠١).
(١٦٥) د. مارف خەزنەدار، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل (٣٢).
* لەبابەت باری رۆشنبیری شاری هەولێرەوە، بە تێروتەسەلی باسی دەکەم.
** بەڕێز کاک (تاریق جامباز).
*** زار موفتاح، لە شوێنی گۆڕستانی شێخ ئەحمەدی ئێستایە، باشترین سەرچاوەی ئاوی هەولێر بوو.



# لافاوەکەی شاری هەولێر لە ساڵی (١٩٣٦)دا

**هوشیار عەبدوڵڵا**

لەئاخرو ئۆخری تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٦ لەشاری هەولێرو دەوروبەری بارانێکی زۆر بەتاو باری، دەشت و دنیای کردە ئاو، هەندێ لەخانووەکانی ناوشار زیانیان پێگەیشت. لەم بارەیەوە گەلێک گەرەک رووداو و بەسەرهات دەگێڕنەوە، مامۆستا "نەژاد بەرزنجی" لەدایکبووی ساڵی ١٩٢٠ی شاری هەولێر بۆی گێڕامەوەو گوتی: من لەپۆلی شەشەمی سەرەتایی بووم بارانێکی زۆر باری و ئاو هەستاو تا بەستەکەی تەعجیل هات و هاشەی دەهات و شەپۆلی دەدا، سەروچاوەکەشی لەدۆڵە زوورگەکانی"کەسنەزان" و گوندی باغچە"یە. لەدەو بەستەکەی لای قەبرستانی گەورە بەرامبەر قەسابخانەی کۆن لەگەڵ خەڵکانێکی زۆر راوەستابووین، تەماشای شەپۆلی ئاوەکەمان دەکرد. دارو بەردو کاریتەو شەقردو بەڕەو بالیف و مافوور و لبادی لەگەڵ خۆی هێنابوو رایدەماڵی، دیتمان لانکێک لەسەر ئاوەکە بوو دەهات گەمەی دەکرد، ئاوەکە شەپۆلەی دەدا بەکاری خوا، شەپۆلی ئاو لانکەکەی لادایە دەو بەستەکەو شوێنەکە تەنگ بوو خۆم گەیاندێ و لانکەکەم راکێشاو ئاوەکە بەهێزتر بوو، خوالێخۆشبوو موسای حاجی عوسمان لەپشتمەوە بوو، هاوارم کرد: کوڕە رامکێشە! ئەویش بەخێرایی رایکێشام توانیمان لانکەکە لەئاوەکە دەربێنین، تەماشامان کرد منداڵێکی

تێدایە، منداڵەکە لەسەرمان و لەبرسان دەستی لەدەوی خۆی دەنا. بەخێرایی بردمان تەسلیمی پۆلیسمان کرد.

ڕووداوێکی دیکە لەبارەی لافاوەکە مام حاجی جەمیل سمایل کە لەدایکبووی ساڵی ١٩١٦یە، بۆی گێڕامەوەو گوتی: ڕەمەزان بوو لەپێش مەغریبێ بوو، دەچوومە ماڵەوە، ماڵمان لەگەڕەکی "تەعجیل" بوو، لەڕێیێ تووشی مام شەهابی حاجی مکاییلی کوورەچی بووم. لەگەڵ پۆلیسان دیاربوو گارەو قڕە قڕیان بوو. پۆلیس دەگەڕاو خەڵکیان بەزۆری دەگرت و بۆ سوغرە و ئیش پێکردن دەیانبردن، چونکە لەهەندێ شوێن و جێگادا لەناو شاردا مەترسی هەبوو. مام شەهاب دەیگوت: "باوکەکەم بەرۆژیە لێمگەڕێن بچمە ماڵێ فتاری بکەمەوە، وەڵڵا بەخۆم دێم". هەرچی پۆلیسەکان بوون دەیانگوت: نابێ بابم نابێ بەگەڵمان کەوە. بوو بەشەڕیان. ئەمنیش بەغاردان چوومە دوکانی سەمەدی برایان کە لەنزیک دەرکەی مزگەوتی ناوبازاڕی بوو. خەبەرم دایێ و ئەویش بەهەڵەداوان هات، لەگەڵ پۆلیسەکان بووە شەڕیان بەرەو "سەرا"یان بردن. ئێ خۆ ئەو زەمانیش وەکو هەنووکە نەبوو، قوڕ بەسەر ئەوکەسەی قۆپچەیەکی لەچاکەتی پۆلیسێکدا دەپچڕاند! کونە ڕەشەی بەچاوی خۆی دەدیت! ئەو بەستەزمانە وابزانم ماوەی زیاتر لەمانگێک گیرا، پاشان تەشەبوزیان بەخوالێخۆشبوو مەلا ئەفەندی کرد بەریدان.

ئەو بۆڕییە ئاوانەی بەناو بەستەکەو لەبەینی ماڵی مەحموود حیلمی و پردەکەی بەنزینخانەدا ڕاکێشرابوو بۆناو حەوزەکەی سەر قەڵاتێ. ئاوەکە بۆڕییەکانی شکاندبوو هەندێکیشی بردبوو، ئەوەبوو شاری هەولێر بۆماوەی "٢٠" بیست ڕۆژان ئاوی نەبوو. لەم بارەیەوە مام نەژاد بەرزنجی دەڵێت: لەپۆلی شەشەمی سەرەتایی بووم لەقوتابخانەی یەکەمی هەولێرم دەخوێند، بەڕێوەبەری قوتابخانەکەمان ناوی شێخ حەسەنی شێخ نیعمەتوڵڵا بوو. چوومە لای و گوتم: مامۆستا ئاومان نییە کەسیش نییە ئاومان بۆ بێنێ. لەبەرئەوەی باوکمی دەناسی، گوتی: سەید بڕۆ ئەتو زیرەکی، بابت مەلایە. کەینێ دێیەوە، وەرەوە قەیدی ناکە. داپیرم زراری بوو گوێدرێژێکی پەیدا کردبوو، چوار جەڕەمان لێنا. دوو جەڕە لەولای دووش لەملای، بەڵام وادیار بوو کەرەکە ئەو تاقەت و تێنەی نەبوو، بۆیە کردمانە دوو جەڕە، یەک لەولای یەک لەملای. دەچووم لەناعوری شێخی چۆلی ئاوم دەهێنا لۆ سەر قەڵاتێ، هەنووکەش ناعورەکە ماوە. بەڵام سەرەکەیان قەپات کردووە. ئەوکەسەی سەرپەرشتی ناعورەکەی دەکرد ناوی "محەمەد عەرەب" بوو، بەڕەسەن خەڵکی وڵاتی مەغریبی عەرەبی بوو. لەباکووری ئەفریقیا کەوتبووە ماڵی شێخی چۆلی، هەر لەدوورەوە ئەمنی دەدیت دەیگوت: "سەید وەرە"چونکە بابمی دەناسی، منیش هەر هەفتەیەک توانیم ئاوی بینم پاشان بێتاقەت بووم نەمتوانی، داپیرم بەستەزمانەی بەو ئیختیارییەی دەچوو ئاوی دەینا. لەکاتی کە ئاوم دەکێشا لەدەرکەی قەراتێ پیرێژنەکان ڕێیان لێ دەگرتم و دەیانگۆ: " ئۆغڵانەکە ئەو ئاوەی نافرۆشی" دەمگوت ناوەڵڵا لۆخۆمانە. پاش "٢٠" بیست ڕۆژان ئەوجا تواندرا بۆڕییەکان چاک بکەنەوە.

*

# گەنجانی هەولێر و حزبی هیوا (١٩٣٧- ١٩٤٥)

تاریق جامباز

بۆ پەردەلادان لەسەر لاپەڕەیەکی شاراوە و نەزانراوی خەباتی نەتەوەکەمان لە کۆتایی سییەکان و ناوەڕاستی چلەکاندا لە شارێکی باشووری کوردستان، پاش خوێندنەوەی ئەوەی لە بارەی حزبی هیوا نووسراوە، هەستم کرد ڕۆڵی ولاتپارێزانی هەولێری تەمەن پێنج هەزار ساڵ کە تا ئەمڕۆش نیشتەنی تێدایە، بە تێروتەسەلی باسی لێوە نەکراوە، بۆیە بە پێویستم زانی بۆ نووسینی ئەم چەند دێرە دیدەنی ئەو بەڕێزانە بکەم لە ئەندامانی حزبی هیوا کە لە ژیاندا ماون، ئەوانیش بە سەنگێکی فراوانەوە بیرەوەرییەکانیان بۆ گێڕامەوە و ئەو وێنانەی ئەو کاتەشیان خستە بەر دەستم، بەڵام بەداخێکی زۆردوە هەر چەند پرسیم و هەوڵم دا جگە لەو هەفتەنامەیەی (گۆڤار) کە بە بۆنەی سەد ساڵەی ڕۆژنامەنووسی کوردی بڵاوم کردەوە، تا ئەم نووسینەش دۆکیۆمەنتێکی تری ئەم حزبە نەدۆزراوەتەوە، بەڵام هەندێ لەو وێنانەی لەبەر دەستماندان نووسینیان لەپشت نووسراوە و ئێمەش سوودمان لێ وەرگرتن چ لە زانینی ناوی کەسەکان یان مێژووی گرتنی یان ناوی نهێنی هەندێ لە ئەندامانی حزبی هیوا، ڕێکخستنی حزبی هیوا لە شاری هەولێر پەیوەندییەکی بەتینی لەگەڵ قوتابییانی کۆیە و ڕەواندز و شەقڵاوە هەبووە و لەم سێ شوێنەش حزبی هیوا پەلوپۆی هاویشتووە و هەریەک لەم شوێنانە بڵاوکراوەیەکی دەسخەتی هەبووە، بەڵام هیچ کامیان بە دەستمان نەکەوتووە یان بڵاو نەکراونەتەوە و هی ڕواندزیش بە ناوی (کوردستان) بووە و (جەلال عەبدوڵڵا حاجی)ش دەڵێ: بڵاوکراوەیەکی هەفتانە لە هەولێر بە ناوی (ژمارە) دەرچووە.

**ساڵی دامەزراندنی حزبی هیوا:**

سێ ساڵی جیاواز بۆ دامەزراندنی دادەنرێ ١٩٣٧ و ١٩٣٨ و ١٩٣٩، بە ڕای من ساڵی ١٩٣٧ ڕاسترە و هەم لەم ساڵەشدا دامەزراوە، چونکە ئەم حزبە تەواوکەری (دارکەر)ە و (دارکەر)یش لەو ساڵە دامەزراوە و دوایی بۆتە هیوا.

ئەم حزبە زێتر لە (دارکەر) توانی خەڵک بۆ لای خۆی ڕاکێشێ، کە هەر هەموویان هیوای قەوارەیەکی کوردییان خواستووە و لەم بارەیەوە حاجی حەیدەر عوسمان ئال قازی دەفەرموێ: لە دارکەر بووم، ئینجا لە ساڵی ١٩٣٧ هاتمە نێو حزبی هیوا، کە لەو ساڵەدا دامەزرا.

هەروەها "کاک عەزیز محەمەد" دەفەرموێ: وابزانم لە ١٩٣٧ حزبی هیوا دامەزرا و جەلال عەبدوڵڵا حاجیش دەڵێ ١٩٣٧ بووم بە ئەندام لە حزبی هیوا.

**شوێنی کۆبوونەوە و ئابوونەی مانگانە:**

بەڕێز عەبدولقادر دۆغرەمەچی دەفەرموێ: کۆبوونەوەکانمان لە ماڵان دەکرد، حەفتانە یان دە پازدە ڕۆژ جارێ و لە هەموو کۆبوونەوەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکرایەوە، کە خەڵکی دڵسۆز هانبدەین تاکو بێنە نێو حزبی هیوا و ئابوونەش بە گوێرەی توانا بوو، من ڕوبعێک یان ٣٠٠ فلسم دەدا و هەر شانەیەک لە ٧ یان ٨ کەس پێکدەهات.

بەڕێز یونس مستەفا دەفەرموێ:

پاش سوێند خواردنم ڕەسمێکیان لێ وەرگرتم و مانگانە ۳٥۰ فلس ئابوونەم دەدا و لە ماڵان کۆدەبووینەوە.

بەڕێز ڕەشید عەبدولقادر دەفەرموێ: ئابوونە بە گوێرەی توانا دەدرا و کۆبوونەوە لە ماڵی ئێمە و ماڵی مەجید ئەمین لە قەڵا دەکرا.

بەڕێز عەزیز محەمەد دەفەرموێ: لێپرسراوی قوتابخانەی (أربیل الثانیة) بووم، هەندێ جار پازدە ئەندام لە ئۆردوو یان لە ماڵان کۆبوونەوەمان دەبەست، حاجی حەیدەر عوسمان ئال قازیش دەڵێ: کۆبوونەوە لە ماڵمان دەکرا و، کە سوێندم خوارد پێیان گوتم: دەبێ کوردیش وەکو میللەتانی تر بە مافی ڕەوای خۆی بگات و چیتر لە کاروانی میللەتان دوانەکەوێت و ئابوونەش بە گوێرەی توانای ئەندامەکە بوو.

### گەنجان لە چ تەمەنێ لە هیوا وەردەگیران؟ یان لە چ قۆناغێکی خوێندن؟

لەگەڵ دەستپێکردنی شەڕی دووەمی جیهانی بە هەستێکی پاکی کوردانە گەنجان ڕوویان لە حزبی هیوا کرد (بە تایبەتی لە ساڵانی ۱۹٤۱ و ۱۹٤۲دا)و لە دوا قۆناغی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی دەهاتنە نێو حزبی هیواوە.

بەڕێز عەبدولقادر دۆغرەمەچی دەڵێ: لە سێی ناوەندی بووم، کە لە حزبی هیوا وەرگیرام و پێشتر دەمانبیست (لە گەنجانی هاوتەمەنمان) کە حزبێک بە ناوی هیوا بۆ کوردایەتی خەبات دەکات.

بەڕێز ڕەشید عەبدولقادریش لەم بارەیەوە دەڵێ: لە تەمەنی ۱۲ یان ۱۳ ساڵان دەبووم لە یەکی ناوەندی چوومە ڕیزی حزبی دارکەر پاشان لە حزبی هیوا وەرگیرام.

### سوێند خواردنی ئەندامانی حزبی هیوا:

بەڕێز ڕەشید عەبدولقادر دەڵێ: ئەندامانی حزبی هیوا سوێندیان بە ئاڵای کوردستان دەخوارد.

بەڕێز عەبدولقادر دۆغرەمەچی دەڵێ: کە بە ئەندام لە هیوا وەرگیرام لە ڕێوڕەسمێکی تایبەت لە ماڵێک سوێندم بە (قورئان و ئاڵای کوردستان و خەنجەر و گوڵە گەنم) خوارد، کە دەبێ خەبات بۆ نەتەوەکەم بکەم.

بەڕێز شێخ محەمەد (شێخە شەل)یش دەڵێ: سوێندمان بە قورئان و خەنجەر و گوڵە گەنم و ئاڵای کوردستان دەخوارد.

بەڕێز عەزیز محەمەدیش لەم ڕووەوە دەڵێ: ڕۆژێ لای سینەمای سەلاحەدین لە هەولێر لەگەڵ ئەندامێکی حزبی هیوا چووینە ماڵێک، لە ژوورێکدا و لەسەر مێزێک ئاڵای کوردستان و خەنجەرێکی ڕووت و قورئان داندرابوو و سێ چوار کەس لەوێ بوون سوێندم بە ئاڵای کوردستان و خەنجەری کوردی خوارد.

بەڕێز عەبدولقادر بەکر دەڵێ: ڕۆژێ لە نزیک شێخی چۆلی لەگەڵ کاک عەزیز فەتاح چووم و سوێندم بە قورئان و ئاڵای کوردستان و گوڵە گەنم خوارد و گوتم نابێ بە قسە و کردەوە خیانەت لەگەڵ کورد و کوردستان بکەم.

### پەیوەندی ڕێکخستنەکانی حزبی هیوا:

بەڕێز حاجی حەیدەر عوسمان دەڵێ: پەیوەندیمان لەگەڵ ڕواندز و شەقڵاوە و کۆیە لە ڕێگەی ئەو قوتابییانەی کە لەگەڵمان دەیانخوێند هەبوو.

ئاشنایەتیمان زۆر باش بوو، بۆیە یەکسەر داوای هاتنە نێو حزبی هیوامان لێکردن و پاشان کە دەگەڕانەوە لەوێش دەستیان بە ڕێکخستنی گەنجانی ئەوێ دەکرد.

بەڕێز جەلال بەگی میر حەمەدەمینی دەرگەڵەیی دەڵێ: من و کاک ڕەشید عەبدولقادر لیژنەی پەیوەندی نێوان هەولێر و موسڵ و شوێنەکانی تر بووین.

بەڕێز جەلال عەبدوڵڵا حاجیش دەڵێ: پەیوەندیمان لەگەڵ ڕواندز و کۆیە و کەلار و کفری هەبوو.

### بۆ زۆربەی ئەفسەرانی کورد بوونە ئەندام لە حزبی هیوا؟

لەم بارەیەوە ڕێزدار فوئاد عارف دەفەرموێ: چونکە ئەفسەرە کوردەکان زیاتر نازییەتیان خۆشدەویست و دژی ئینگلیز بوون، بۆیە زۆربەیان ئەندام بوون لە حزبی هیوا.

**ناوی ئەو ئەفسەرانەی لە بیرم ماون:**

١- میر حاج، ٢- مستەفا خۆشناو، ٣- کاکەمین خانەقا، ٤- رەشید باجەلان، ٥- عزەت عەزیز، ٦- مەحموود تەها، ٧- مەجید عەلی، ٨- مستەفا سالح ژاژڵەیی، ٩- ئیسماعیل عەلی، ١٠- محەمەد سالح محەمەد.

منیش هەر دوو مانگ لە حزبی هیوا مامەوە، چونکە گومانم لە هەندێ ئەندامانی دەکرد، بۆیە ئیستیقالەم کرد.

**ئایا چوونە ریزی ئەم ئەفسەرە کوردانە بۆ نێو حزبی هیوا قازانجی هەبوو یان زیان؟**

لەم بارەیەوە ئەندامی حزبی هیوا بەڕێز جەلال بەگی میر حەمەدەمینی دەرگەڵەیی دەفەرموێ: کاتێ ئەفسەرە کوردەکان هاتنە ناو ریزەکانی حزبی هیوا، ئەمە بەلای منەوە بە زیانی حزب تەواو بوو، نەک قازانج، چونکە وای لێ هاتبوو لە ساڵی ١٩٤٣ لە ناو نیزامی حزب گەورەترین پلەی سەربازی دەکرایە لێپرسراوی یەکەمی حزب.

**ژمارەی ئەندامانی حزبی هیوا لە هەولێر چەند دەبوو؟**

تا ئیمرۆش ژمارەی ئەندامانی حزبی هیوا بە رێکوپێکی ساغ نەبۆتەوە، هەندێ کەس بە سەدان ئەندامی دەزانن و هەندێکی تریان دەڵێن سێ هەزار ئەندام دەبوون، گەنجانی کوردیش، کە چوونەتە ریزی حزبی هیوا بۆ ئەوە بووە نەتەوەکەیان بە مافە رەواکانی بگات و ئاڵای لەنێو ئاڵاکانی میللەتاندا بشەکێتەوە، لێرەدا حەفتا ناو وەک ئەندامانی حزبی هیوا لە هەولێر لەگەڵ ناوی نهێنی هەندێکیان بڵاودەکەینەوە:

مستەفا عوزێری (دلاوەر)، ٢- رەئووف مەلا ئیبراهیم، ٣- سەید یبراهیم سەید یوسف، ٤- عومەر عوسمان (بەختیار)، ٥- حاجی حەیدەر عوسمان (شێرزاد)، ٦- زەید ئەحمەد عوسمان، ٧- مەجید ئەمین، ٨- موسا سەمەد، ٩- عیزەدین فەیزی، ١٠- ئیحسان شێرزاد، ١١- یونس مستەفا، ١٢- نافیع یونس (غەمگین)، ١٣- شیت مستەفا، ١٤- فەتاح جەبار ئەسعەدی (خەسرۆ)، ١٥- ئەنوەر عەبدوڵلا (دڵسۆز)، ١٦- عەبدولقادر دۆغرەمەچی (ئاگر)، ١٧- عەزیز محەمەد (گورد)، ١٨- قادر ئیبراهیم، ١٩- هاشم عەبدوڵلا، ٢٠- عەبدولقادر بەکر، ٢١- رۆستەم جەبار ئەسعەدی، ٢٢- یەحیا سەلیم، ٢٣- فەتاح سەلیم، ٢٤- سلێمان حەمید، ٢٥- عەونی یوسف، ٢٦- ئەنوەر فەیزی، ٢٧- شێخ حوسێن شێخ قازی، ٢٨- مەجید فەتاح، ٢٩- ئەنوەر حوسێن مەلا، ٣٠- حوسێن حوزنی موکریانی، ٣١- گیو موکریانی، ٣٢- ناسح رەشید، ٣٣- ئەحمەد حەمەدەمین دزەیی، ٣٤- عومەر ساقی، ٣٥- ئیبراهیم ئیسماعیل، ٣٦- سەلیم سەیدۆک، ٣٧- عەبدوڵلا عەزیز، ٣٨- عارف جەرجیس، ٣٩- سەعدوڵلا شەریف، ٤٠- ئەنوەر خوداداد حەداد، ٤١- محەمەد مستەفا مەعرووف، ٤٢- بایز عەزیز ئاغا دزەیی، ٤٣- ئیبراهیم عەزیز ئاغا دزەیی، ٤٤- کانەبی عەزیز ئاغا دزەیی، ٤٥- جەوهەر عەزیز ئاغا دزەیی، ٤٦- سەعدەدین شەریف، ٤٧- رەئووف سەلیم قۆجە، ٤٨- عەزیز فەتاح، ٤٩- رەمزی نافع، ٥٠- قەرەنی نافع، ٥١- شێخ محەمەد (شێخە شەل)، ٥٢- سەید فەتاح سەید عزیز، ٥٣- رەفعەت ئیسماعیل توتنچی، ٥٤- جەلال عەبدولقادر، ٥٥- شەهاب سەلیم کورەچی، ٥٦- تاهیر رەشید ئاغا، ٥٧- جابر پیرداود، ٥٨- نازم سەعید ئەسعەدی، ٥٩- هاشم عەبدولڕەحمان، ٦٠- موشیر عەدۆ دزەیی، ٦١- عەبدوڵلا ئیسماعیل، ٦٢- مەلا شەریف عوسمان، ٦٣- فائیق نادر، ٦٤- جەلیل وشیار، ٦٥- رەشید عەبدولقادر (راستی)، ٦٦- قەرەنی رەفیق دۆغرەمەچی، ٦٧- جەلال عەبدوڵلا حاجی (دەباغ) (بێکەس)، ٦٨- جەماڵ جەمیل، ٦٩- عەبدولقادر ئەحمەد، ٧٠- فەیسەڵ ئەحمەد عوسمان.

**زیندانیکردنی چەند ئەندامێکی حزبی هیوا بۆ ماوەی (٢٤) رۆژ؟**

لە بارەی زیندانیکردنی ئەندامانی

حزبی هیوا لەو سەرچاوانەی خوێندومەتەوە بە هیچ جۆرێک باسی لێوە ناکرێ، بەڵام حاجی حەیدەر عوسمان ئال قازی دەڵێ: لە ساڵی ١٩٤٢ (عەونی یوسف و حەسەن کەتانی و جەعفەر فەیلی) هەرسێکیان گیران، بۆیە یەکسەر ئەندامانی حزبی هیوا لە هەولێر کۆبوونەوە و بڕیارمان دا بچینە لای موتەسەریف (مستەفا یەعقوبی)، بەڵام بە پێویستمان زانی پێشتر بچینە لای ئەفسەری (پەیوەندی) ئینگلیز، بۆ ئەم مەبەستە من (واتە حاجی حەیدەر و ڕەشید عەبدولقادر و نافیع یونس) چووینە لای و پێمان گوت: موتەسەریف دژی کوردە و دەمانویست بچینە لای، بەڵام چوونە لای بێ سوودە، بۆیە هاتووینەتە لای تۆ و ئەوانەی گیراون هیچیان نەکردووە تەنیا لەسەر کوردایەتی گیراون.

وەڵامێکی وای نەدایەوە کە بە دڵمان بێت، بۆیە کە هاتینەدەر توانیمان ٨٥ قوتابی بۆ نارەزایی دەربڕین کۆبکەینەوە و بەرەو قشڵە چووین... بینیمان پۆلیس بەرەو ئێمە دێ و ئێمەیان بردە ژوورێکی گەورە، هێندەی پێنەچوو، یەکێ لە پۆلیسەکان هاتەوە و گوتی: دوو کەس هەڵبژێرن لەنێو خۆتان تاکو بتانبەم بۆ لای جەنابی بەڕێوەبەری پۆلیس (من واتە: حاجی حەیدەر و نافیع یونس) چووینە لای، کە (سەبری عەبدوڵڵا کۆیی) بوو و بەڕێوەبەری قوتابخانەکەشمان (ڕەفعەت ئەفەندی دۆغرەمەچی) لەوێ بوو.

بەڕێوەبەری پۆلیس بە توانجەوە بە بەڕێوەبەری قوتابخانەکەمانی گوت: ئەوانە تەڵەبەی ئێوەن؟ منیش گوتم: عەیبە ئەمە بە ئێمە دەڵێن، ئێمە بۆ کوردایەتی تێدەکۆشین.

بەڕێوەبەری پۆلیس تووڕە بوو، بۆیە ئێمەیان بردە لای تەڵەبەکان و دەرگایان لەسەر داخستین و بۆ ترساندنمان (پۆلیسەکان) بان نەجمەی تفەنگەکانیان تەقە تەق پێدەکرد، لەوساتەدا من و نافیع یونس بەدەنگ هاتین و گوتمان: ئێمە بەوە دەترسێنن، گەر ڕاست دەکەن بمانکوژن.

لە وەڵامدا مفەوەزێک وەستابوو پێی گوتین: پاشا (واتە موتەسەریف) چاوتان دەردێنێ، (حاجی حەیدەر) دەڵێ: خۆم پێ نەگیرا و بەرۆکم گرت و یەک دوو جار بەدیوارم دادا و خێرا پۆلیسەکان هاتن و لەدەستیان دەرهێنام و بەلێدان کەلەپچەیان لە دەست کردم، ئینجا من و نافیع یونسیان لە ژوورێک زیندانی کرد و پاشان ڕەشید عەبدولقادر و تاهیر ڕەشید دزەییان هێنا و پاشتر دوو کەسی تریان هێنا و ژمارەمان بوو بە شەش و تا بەیانی لە ژوورەکە کردمانە هەرا و هەڵلایەک و نەمانهێشت ئەو شەوە کەس بخەوێ، بۆ بەیانی یەکە یەکە بانگیان دەکردین و هەموویان بەرەڵڵا کردین تەنیا ئێمە شەش کەس لە زیندان ماینەوە (من و ڕەشید عەبدولقادر و عارف جەرجیس و سەعدوڵڵا شەریف و عەزیز فەتاح و یەکێکی تر کە خەڵکی سلێمانی بوو بەداخەوە ناوەکەیم لە بیر نەماوە)، ئینجا ئیفادەی ئەو شەشەمانیان وەرگرت و مەرجێکیان بۆ بەردانمان دانا: ئەوەی کەفالەی ٢٠٠ دینار بدات بەردەدرێت (لەبەر ئەوەی ڕەشید عەبدولقادر و سەعدوڵڵا شەریف) دەوڵەمەند بوون، کەفالەتیان دا و بەردران، چوار کەسەکەی تر لە زیندان ماینەوە، لەو ماوەیەدا هەندێ ڕۆژ پۆلیسەکان پێیان دەگوتین: خۆتان ئامادە بکەن هەر ئەمڕۆ دەتان بەینە موسڵ، ئەمەیان تەنیا بۆ (شەڕی دەروونی) بوو، دەنا بۆ ژوورێکی تریشیان نەدەبردین، شەوان سروودی کوردستانمان دەگوت، پاش ٢٤ ڕۆژ بەیانییەکیان بانگیان کردین و ئێمەیان بردە ژووری موتەسەریف، بینیمان باوکی هەر چوارمان لەوێ دانیشتوون.

موتەسەریف گوتی: ئەوە کوڕەکانتانە، بەڕاستی زۆر مەجالتان داونەتێ، ئێوەش بزانن کە باوکتان لە هەڵسوکەوتتان قایل نین، ئینجا بە کەفالەت بەردراین.

**هۆیەکانی هەڵوەشاندنەوەی حزبی هیوا:**

هۆیەکانی زۆرن، جگە لە ڕاو بۆچوونی ئەوانەی، کە قسەیان لەبارەی حزبی هیوا کردووە، بەڕای من:

سەرکردایەتی حزبی هیوا نەیتوانی ڕێکخستنێکی پتەو و بەهێز دروست

بکات.

لایەنێکی سیاسی بەهەموو جۆرێ هەوڵی لاوازکردنی دەدا بەبیانووی ئەوەی، کە گوایە حزبی هیوا پێویست نییە و حزبی کاریان گەرەکە.

ئەمەیش راو بۆچوونی هەندێ لە ئەندامانی حزبی هیوایە:

بەڕێز رەشید عەبدولقادر: لاوازیی رێکخستن، کەمی دارایی، چاودێری پۆلیس.

بەڕێز عەزیز محەمەد: تەمەنی حزبی هیوا کورت بوو، کە تەوژمی فاشییەت و نازییەت کەوتە لێژی ئەوا حزبی هیواش بەرەو لێکهەڵوەشانەوە چوو و سەرکەوتنی وڵاتانی سۆسیالیست و سەرهەڵدانی مارکسییەت بە گوڕتر، دەرئەنجام گەنجان بەرەو ریزەکانی مارکسییەت چوون.

بەڕێز جەلال عەبدوڵڵا حاجی: زۆربەیان گیران ژمارەیەکیشیان بوون بە شیوعی و یانەی سەرکەوتن داخرا.

بەڕێز عەبدولقادر بەکر: پاش ئەوەی بۆمان دەرکەوت کە (......) حزبی هیوا، فەرمانەکانی لە ئەفسەری سیخوڕی ئینگلیزی (شۆرتەر) وەردەگرێ، بۆیە ئێمە و زۆر کەسی تریش لە هیوا پاشەکشەمان کرد.

بەڕێز فوئاد عارف: پاش دوو مانگ لە ئەندامیەتیم، گومانم لە هەندێ کەس کرد، کە پەیوەندییان بە موخابەراتی عێراقی و بەشی سیخوڕی لە باڵیۆزخانەی بەریتانیا و ئەمەریکا هەبوو، بۆیە لە حزب کشامەوە.

بەڕێز تاهیر ئەحمەد حەوێزی: کە جەنگی دووەمی جیهانی کۆتایی هات، هاوپەیمانەکان ئیشیان بەکەس نەما و ئەڵمانیا سەری چووە قوڕێ، ئێمەی کوردیش لە جێی خۆمان کەوتینە (مراوحە).

بەڕێز دڵزار: لە ساڵی ١٩٤٥ کۆمەڵەی هیوا پەرت بوو.

بەڕێز جەلال بەگی دەرگەڵەیی: موتەسەریفەکانیش دەستیان خستە ناو کاری حزبی هیوا و لە لیواکانی خۆیان دەستیان لە کاروباری حزب وەردەدا، بۆیە بەرە بەرە رووەو لاوازی دەچوو، تا لە ئەنجامدا حزبی هیوایان هەڵوەشاندەوە.

تا ئیمڕۆش پەیڕەو و پرۆگرامی هیوا و لیستی ناوی ئەندامانی حزبی نەدۆزراوەتەوە، چونکە هەر ئەندامێک، کە چۆتە نێو حزبەکە ئەوا وێنەیەکیان لێ داوا کردووە و ناوێکی نهێنی بۆ دانراوە و ئابوونەی مانگانەی بەپێی توانا داوە و بەشداری لە کۆبوونەوەی حەفتانە یان دە پازدە رۆژ جارێ کردووە و چۆنیەتی نواندنی چالاکییەکانی تریش بەداخەوە زۆر کەمیان لە بارەوە زانراوە، هەروەها چۆنیەتی هەڵبژاردنی باوەڕپێکراوی شارەکان.

**سەرچاوەکان:**

دیدەنی ئەم بەڕێزانەم جارێ یا دووان یان پتر کردووە.

- حاجی حەیدەر عوسمان ئال قازی.
- عەبدولقادر دۆغرەمەچی ١٩٩٧/٨/١١.
- عەزیز محەمەد ١٩٩٧/٩/٩.
- فوئاد عارف ١٩٩٨/٧/٣ هاوینەهەواری سەلاحەدین.
- عەبدولقادر بەکر ١٩٩٧/٨/١٦ لە ١٩٩٨/٧/٣٠ وەفاتی کردووە.
- جەلال عەبدوڵڵا حاجی ١٩٩٨/١١/١٥.
- ئەحمەد دڵزار ١٩٩٧/٤/٢٦.
- شێخ محەمەد (شێخە شەل) ١ و ١٩٩٧/١١/٢ و مانگی ٧ و ٨ی ١٩٩٧.
- رەشید عەبدولقادر١٩٩٧/٨/٣١ و ١٩٩٨/١١/٧.
- یونس مستەفا ١٩٩٧/٤/٧.
- رۆژنامەی کوردستانی نوێ ژ ٥ ساڵی یەکەم ٣٠ کانونی دووەمی ١٩٩٢. (حزبی هیوا و چەند بیرەوەرییەک)، ل٥.
- هەفتەنامەی گۆڤار: (هەفتەنامەیەکی حزبی هیوا لە هەولێر) تاریق جامباز ١٩٩٨.
- گۆڤاری سەنتەری برایەتی ژ ١ ساڵی یەکەم ئابی ١٩٩٧.
- نامەیەکی تایبەت لە بەڕێز مامۆستا تاهیر ئەحمەد حەوێزی بۆ نووسەری ئەم باسە لە بابەت حزبی هیواوە.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەولێر، ژمارە (١)، زستانی (١٩٩٨) بڵاوبۆتەوە.

# مێژووی حزبی هیوا لە هەولێر

نەجات یاسین قادر

ئێستا تۆمارکردنی مێژووی هاوچەرخی هەولێر پێویستی بە هەوڵێکی زۆری مێژوونووسان و نووسەران هەیە، بە رێڕەوە فیکرییە جۆراوجۆرەکانیان، راستی رووداوەکان بچەسپێنین. ئەمەش هەوڵێکە لە لایەن ئەندازیار (نەجات یاسین) بۆ تۆمار کردنی لایەنێک لە مێژووی حیزبی (هیوا) لە هەولێر، کە رێگا خۆشکەرێک بوو بۆ بڵاوکردنەوەی هۆشیاری سیاسی و نەتەوایەتی لە نێو رۆڵەکانی شاری هەولێر بە هیوای گەیاندنی ئەو زانیارییانە بۆ دەوڵەمەند کردنی مێژووی پڕ لە شانازی.

سوور بووم لە سەر ئەوەی کە خزمەتێک پێشکەش بە مێژووی گەل و شارەکەم بکەم، هەرچەندە کەڵە مێژوونووسێکی پسپۆر نیم بەڵام بە پێویستم زانی چەند زانیارییەک بخەمە بەردەستتان، ئەمەش لە کاتی چاوپێکەوتنم لەگەڵ (نازم سەعید ئەسعەدی)، لە ماڵی ناوبراودا، لە رێکەوتی ١٨ / ١١ / ١٩٩٧ پێش کۆچی دواییکردنی بە ماوەیەک بە دەستم کەوتبوو[1]. ئەوە بوو لە کاتی گفتوگۆو پرسیارکردنم لە رۆڵی ناوبراو لە هاتنە ریزی حیزب و هاوەڵە گەنجەکانی لە خەڵکی هەولێر، گوتی: «هێشتا کە ناوی حیزبەکە (کۆمەڵەی دارکەر) بوو، لە ساڵی ١٩٣٧ لە رێگای هەردوو خوالێخۆشبوو (عومەر عوسمان و سەید ئیبراهیم سەید یوسف) کە ئەندام بوون لە حیزب، کە من پەیوەندیم بە حزبەوە کرد، لەو کاتەشدا من لە پۆلی دووەمی ناوەندی بووم، دەبوایە هەر ئەندامێک، کە پەیوەندی بە حیزب دەکات سوێندبخوات لە بەرامبەر دەستەیەک کە پێکهاتبوو لە چەند ئەندامێک. رەوشەکەش ئەوەبوو، کە قورئانی پیرۆز لە سەر مێزێک دادەنرا و خەنجەرێکی کوردی و ئاڵای کوردستانیش لە تەک قورئانەکەوە دادەنرا، ئامانجیش لە سوێند خواردنەکە لە لایەن ئەندامەکانەوە ئەوە بوو، کە خیانەت لە بنەماکانی حیزب و نیشتمان و گەلەکەیان نەکەن.

خوالێخۆشبوو (نازم سەعید) بەو جۆرە وەسفی رەنگەکانی ئاڵاکەی کرد:

سەوز کشتوکاڵ دەنوێنێ و سوور خوێنی شەهیدان و سپی بەفر دەنوێنێ و زەردیش واتە مانگ. هەموو ئەندامەکانیش ناوی خواستراوی نهێنییان هەبوو، ئەو ناوە نهێنییانەش هەروەک خووێک وا بوو لای کورد، خوالێخۆشبوو (نازم) خۆشی ناوێکی نهێنی هەبوو، کە ئەویش (جەنگاوەر) بوو.

لەبارەی دامەزراندنی حیزبی هیوا لە هەولێر دەڵێ: «حیزبی هیوا لە ساڵی ١٩٣٦[2] لە هەولێر و کەرکووک و هەندێ شاری تری کوردی دامەزرا، هەروەها ناوی چەند ئەندامێکی تری حیزبی هێنا، کە لە هۆشیدا حەشاری دابوون و لە حیزبدا هاوەڵی بوون، لە وانەش:

سەید ئیبراهیم سەید یوسف، فەیسەڵ ئەحمەد عوسمان، زەید ئەحمەد عوسمان، مەجید ئەمین

(موعتەمەدی هەولێر بوو)، حەمید فەتاح، عیزەدین فەیزی، عومەر عوسمان، حەیدەر عوسمان، ئەنوەر عەبدوڵلا دڵسۆز، سەلیم سەیدۆک (ئەندامێکی ناودار بوو) و شێخ محەممەد محەممەد (ناسراو بە شێخە شەل) و یوسف جەلیل و موسا سەمەد و ئیحسان شێرزاد کە پێنج جار پلەی وەزیری وەرگرت لە ساڵانی شێستەکان و حەفتاکان لە سەدەی رابردوودا. هەروەها نافیع یونس و جەلال قادر و رەشید عەبدولقادر[٣] کە دوایی بوو بە سەرۆکی دادگای تەمیز و حوسێن موکریانی، کە بە (حوزنی) ناسراو بوو نووسەری ناوداری کورد و ئیبراهیم عەزیز دزەیی و بایز عەزیز و عاصم حەیدەری و ساڵح حەیدەری و کانەبی عەزیز، ئەم سێیەی دوایی لە دانیشتوانی گەڕەکەکانی خوارووی قەڵات و دەوروبەری بوون وەک: (گەڕەکی عەرەب و سەعدووناوە و تەعجیل و خانەقا و تەیراوە).

لەبارەی لێپرسراوی حیزبی هیواش لەوکاتەدا وتی: مەجید ئەمین ئەفەندی بوو، کە بە (کوفیت)[٤] ناسراو بوو، وەک (موعتەمەد) بۆ حیزب لە هەولێر، هەر لە دامەزراندنی کۆمەڵەی دارکەر هەتا ساڵی ١٩٣٩، بە (موعتەمەد) لە بری (لێپرسراو) لە حیزب ناودەبردرا، مەجید ئەفەندی لێپرسراوی شاری هەولێر بوو، پاشان ڕێوڕەسمی گواستنەوەی لێپرسراویەتی لە مەجید ئەفەندی بۆ عیزەدین فەیزی کرا، بەئامادەبوونی خۆشی لەو ڕێوڕەسمە، کە لە باخچەدا، کە پاشان باڵەخانەی دادگای ئێستای لە شوێندا دروست کرا، فەرمانی حیزبی خوێندرایەوە، کە لە لایەن سەرۆکایەتی حیزبەوە لە ساڵی ١٩٣٩ دەرکرابوو، بە ئامادە بوونی ژمارەیەک لە ئەندامانی حیزب لەو دانیشتنەی کە لە ژێر سێبەری ئەو داردا بەسترابوو، کە لە تەکییەوە چەرخێکی ئاو هەبوو بۆ ئاودانی باخچەکە. خوالێخۆشبوو مەجید ئەفەندی فەرمانەکەی بە دڵێکی فراوانەوە خوێندەوە و رۆڵی ناوبراویش لە ماوەی لێپرسراویەتی لە حیزب لە (١٩٣٦-١٩٣٩) دیاری کرا[٥]، کاتێ پرسیارم لەبارەی هۆی ئەو گۆڕانکارییە لێ کرد، وتی: «هیچ هۆیەک نازانم بۆ ئەو گۆڕانکارییە»، (مەجید ئەفەندی) لەم بارەیەوە وتی[٦]: «ڕێکەوتی هاتنە ریزی ئەو بۆ حیزب لە ئێمە کۆنتر بوو»، ستایشی ڕۆڵیشی کرد لە حیزب و وتی: مەجید ئەفەندی و حوزنی موکریانی و هەندێ ئەندامانی خەڵکی کۆیەو فەتاح جەبار و رەفیق تۆفیق، کە ئەفسەرێکی خانەنشین بوو دەستگیر کران، هۆی گرتنیشیان چالاکی و چاوپێکەوتنەکانیان بوو، لە ئەنجامدا لە لایەن ناوبراو شێخ حەسەن نەقشبەندییەوە، خەبەریان لێدرا و بۆ ماوەی (١٥) پانزە رۆژ بەند کران، بەڵام بە هۆی نەبوونی بەڵگەی پێویست بۆ تۆمەتبارکردنیان بە کەفالەت ئازاد کران. هەروەها خوالێخۆشبوو (نازم ئەسعەدی) باسی لایەنێکی دیکە لە چاوپێکەوتنەکانی ئەندامەکان لەگەڵ سەرۆکی حیزب کرد، هەروەکو دەڵێ: «رەفیق حیلمی کەسایەتی ناوداری کورد لە بەغدا دادەنیشت و ناوبەناو پەیوەندی بە ئەندامەکانەوە لە هەولێر دەکردو سەردانە پشکنەرەکانی بە هەڵ دەزانی-چونکە خۆی پشکنەری گشتی (مفتش عام) بوو، بۆیە لە کاتی سەردانی کردنی بۆ هەولێر چاوپێکەوتنی لەگەڵ هەندێ لە ئەندامانی حیزبی هیوا دەکرد بۆ تاوتوێکردن و بیروڕا گۆڕینەوە بە گوێرەی پرۆگرام و پلانەکانی حیزب، چاوپێکەوتنەکانیش لە شوێنی جۆراوجۆر لە خوارووی قەڵا، دوور لە چاوی پیاوانی هۆبەی تایبەت (الشعبة الخاصة)[٧] و هەواڵ گەیەنەرەکان رووی دەدا.

هەروەها ئاماژەی بۆ لایەنێکی تریش کرد لە کۆشش و خەباتیان و بەشداریکردنیان لە خۆپێشاندانە جەماوەرییەکەی، کە لە ساڵی ١٩٤١ بە سەرکردایەتی هەریەکە لە (شێخ حەسەن نیعمەتوڵلا و مەجید ئەفەندی و رۆستەم جەبار و ئەنوەر عەبدوڵلا) روویدا، لە کاتی پرسیارکردنیشم لە بارەی ژمارەی بەشداربووانی خۆپێشاندانی ناوبراودا وتی: زیاتر

لە (١٠) دە هەزار کەس بەشدارییان تیادا کرد(٨) بە جۆرێ، کە هێزی پۆلیس نەیانتوانی خۆپیشاندەرەکان پەرت و بلاو بکەن، بۆیە داوای هێزی سەربازی دیکەیان کرد کە سەر بە پاریزگای هەولێر بوون، بەلام فەرماندەی پاریزگا (ئەمین بێگ رواندزی) هیچ لێپێچینەوەیەکی توندی دژی خۆپیشاندەران ئەنجام نەدا، بەلکو رۆلێکی پۆزەتیڤی هەبوو و توانی بە شێوەیەکی هێمن و ئاشتیخوازانە بارودۆخەکە ئارام بکاتەوە و کۆتایی پێ بهێنێ و باوەڕ بە لێپرسراوان بهێنێ، بەوەی کە وازیان لێ بێنن و وتی: «ئەوانە رۆلەی ئێمەن و هەلەیان نەکردووە»، بەلام هەندێ لە دەسەلاتداران بەردەوام بوون لە هاندانی لێپرسراوان، وەک موتەسەریف و بەڕێوەبەری پۆلیس، کە لێپێچینەوەیەکی توندوتیژ بکرێ لەگەلیان، بەم جۆرە خۆپیشاندەران دەستگیر کران، بە تایبەتی خۆپیشاندەرە بەرچاو و کاریگەرەکان لە حیزب، هەر بەوەش نەوەستان بەلکو لێپێچینەوەکان لە دژی خەلکدا بە شێوەیەکی کوێرانە بوو و هەندێ لە دانیشتوانی شاری هەولێریشی گرتەوە، کە هەرچەندە لە ریزی حیزبەوەش نەبوون، لە نێو ئەمانەشدا، کە دەستگیر کران: شێخ حەسەن نیعمەتوللا و مەجید ئەفەندی و نازم سەعید ئەسعەدی و رۆستەم جەبار و ئەنوەر عەبدوللا و قاسم سەعید باجگر و فائق نادر و نورەدین یونس و حەیدەر حەسەن هیدۆش و حاجی یادگار و جیهاد بەکرو مەجید فەتاح و بەشیر مستەفا و ئەحمەد چایچی و عەزیز نەداف و دەرویش قادر نالبەند(٩) و سەید ئەحمەد یاسین و کوڕی برای حاجی یادگار و عەبدولوەهاب ضائع، کە عەرەب بوو و دانیشتووی هەولێر بوو.

لە پاشانیشدا بۆ بەندیخانەی موسڵ رەوانە کراین و لەوێش بۆ ماوەی شەش مانگ بەند کراین و لە وێشەوە بۆ بەندیخانەی کەرکووک رەوانە کراین و سالێ و نیوێکیش لەوێدا بەند کراین، واتە من و هاوەلەکانم هەتا کۆتایی ١٩٤٢ لە بەندیخانەدا ماینەوە و دادگاییکردن بۆ ماوەی زیاتر لە سالێک بەردەوام بوو و دادوەری دادگای گەورەش (المحكمة الكبرى) لە کەرکووک (جەمال بابان) بوو، کە هەولیدا رەزامەندی وەزیری داد وەرگرێ بۆ ئازاد کردنمان، هەروەها بەر لە ماوەیەکیش ژمارەیەکی تریش ئازاد کران بە هۆی ناکۆکی و ناهاودەنگ بوونیان لە تۆمەت لە لایەکەوە و لە لایەکی تریشەوە بە هۆی هەولی هەندێ لە کەسایەتییە کۆمەلایەتییەکان لە هەولێر بۆ ئازادکردنیان، لە سەرووی هەمووشیانەوە (مەلا ئەفەندی)(١٠)، لە کاتی پرسیارکردنیشم لەبارەی هۆی ئەو خۆپیشاندانەوە و ئالۆزبوونی بارودۆخ بەو شێوەیە و بە دوادا هاتنی ئەو لێپێچینەوە توندوتیژانەوە وتی: موتەسەریف (سالح زەکی ساحیبقران) لەم رووداوانە سەبەبکار بوو.

لەبارەی زیندووکردنەوەی جەژنی نەورۆزی نەتەوەییشەوە وتی: لە چەند شوێنێک لە هەولێرێ جەژن دەکرا، هەروەکو لە شوێنێک لە نزیک کاریزی ئاو و لە نزیک گۆڕستانی شێخ ئەحمەد و لە (ئاوی میری) و لە گۆڕستانی چراغ و ئاغاباغی. هەروەها دەلێ: لە سالی ١٩٤٨ دا هەروەک باو بوو، کە گەنجانی هەولێر خۆیان ئامادە دەکرد بۆ زیندووکردنەوەی جەژنی نەورۆز و لە سەرووی هەمووشیانەوە (عەونی یوسف و مەجید ئەفەندی و رۆستەم جەبار)، لە لایەکی تریشەوە هەندێ لە مامۆستایانی ئایینی رەخنەیان لەبارەی زیندووکردنەوەی جەژنی نەورۆز هەبوو(١١)، زۆر جاریش رووبەڕووبوونەوەی چەکداری لە نێوان هەردوو لادا روویدەدا، بۆیە دەسەلاتداران بە پالپشتی پیاوە ئایینییەکان ئاهەنگێڕانی نەورۆزیان قەدەغە کردو ئاهەنگگێڕانیان بۆ بەندیخانە رەوانە کرد.

دواتر پرسیارم سەبارەت بە ئازاد کردنی کرد، لە وەلامدا وتی: هەردەم بەردەوام بوو لە چالاکییەکانی تا سالی ١٩٤٦ لە ریزی حیزبدا، لە

دوای ئەمەوە حیزب تووشی سستی و لاوازی بوو، ئەوەش بە هۆی چەند هۆکارێکەوە بوو، لەوانەش:

دەست لە کار کێشانەوەی سەرۆکی حیزب (رەفیق حیلمی).

پێکهێنانی هەندێ حیزبی نەتەوەیی تر، وەک شۆڕش و رزگاری کورد و پارتی دیموکراتی کوردستان لە ئێران بە سەرکردایەتی (قازی محەمەد) و لە پاشانیش لە کوردستانی عێراقدا و حیزبی شیوعی عێراقیش.

بەرفراوان بوونی جموجۆلی هۆبەی تایبەت (الشعبة الخاصة) بۆ ترساندن و تۆقاندنی خەڵک و کرینەوەی هەڵوێستی چەند ئەندامێکیش.

لە دوای ئەو رووداوانەی، کە باسیانم کرد لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٤٦ وازم لە جموجۆل و چالاکی لە حیزبی هیوا هێنا، هەروەها هەندێ ئەندامی تریش هەمان هەڵوێستیان هەبوو، بەڵام هەر دڵسۆزو بە ئەمەک بووم بۆ ویست و ئامانجەکانی گەلەکەم.

**پەراوێز و تێبینییەکان:**

(١) لە ساڵی ١٩٩٠ کۆچی دوایی کرد.

(٢) حیزبی هیوا لە سەر بناغەی (کۆمەڵەی دارکەر) دامەزرا، کە لە ساڵی ١٩٣٧ دا لە لایەن هەندێ گەنجانی شای هەولێر و کەرکووک و سلێمانی و کفری و خانەقین و کۆیە دامەزرابوو.

(٣) فەرمانێک لە لایەن سەرۆکایەتی حیزب بە لێسەندنەوەی ئەندامیەتی هەریەکە لە: (نافیع یونس و حەیدەر عوسمان و رەشید عەبدولقادر)، پاش ئەوەی زانرا، کە پەیوەندییان بە حیزبی شیوعی عێراقی کردووە دەرچوو.

(٤) پرسیم واتای وشەی (کوفیت) چییە ؟ لە وەڵامدا وتی: بە مانای (ئازا) دێت.

(٥) ئەو حیزبە لە هەولێر لە ساڵی ١٩٣٧ سەری هەڵدا، پێش ئەو مێژووەش رێکخراوێکی تری سیاسی (دارکەر) هەبوو. بڕوانە گۆڤاری (گولان العربی)، ژمارە ١٩، ساڵی ١٩٩٧، بە پێنووسی (تاریق جامباز)، لە وتارێکدا بە ناونیشانی (چەند لاپەڕەیەکی نهێنی لە مێژووی حیزبی هیوا لە هەولێر).

(٦) هەروەها لێم پرسی، کێ کاریگەری لە سەر (مەجید ئەفەندی) هەبوو تا وای لێ کرد کە بێتە ریزی حیزبەوە، وتی: پەیوەندی لەگەڵ (رەفیق حیلمی) بە شێوەیەکی نهێنی هەبوو، هەروەها پەیوەندی لەگەڵ چەند ئەندامێکی کاریگەریش هەبوو، وەک: (حوزنی موکریانی، فەتاح جەبار، جەلال قادر، عزەدین فەیزی، ئیبراهیم دزەیی).

(٧) لەو ماوەیەدا فەرمانگەی ئاسایش (دائرة الامن) پێی دەوترا هۆبەی تایبەت (الشعبة الخاصة).

(٨) ژمارەی خۆپێشاندەران نزیکەی (١٠-٢٠) هەزار کەس بوون. بڕوانە گۆڤاری (گولان العربي)، ژمارە ١٧، ساڵی ١٩٩٧، (مەجید ئەفەندی کەسایەتی سیاسی لەیادکراو) بە پێنووسی (نەجات یاسین خورشید نەجار)

(٩) حوسێن ناڵبەند، بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشووی ژمارە (٨)

(١٠) ئەمیش زانای پلە بەرز و کەسایەتی کۆمەڵایەتی ناودارە.

(١١) هەندێ لە زانایانی ئایینی وایان دەزانی، کە زیندووکردنەوەی جەژنی نەورۆز دژی بنەماکانی ئایینی پیرۆزی ئیسلامە، لەوانەش (شێخ موحیەدین بەرزنجی و مەلا ساڵحی کۆزەپانکەیی).

ئەم بابەتە لە گۆڤاری (ینابیع)، ژمارە ١٣، ئایاری ٢٠٠٥ بڵاوکراوەتەوە.

# خۆپیشاندانی ١٩٤١ لە هەولێر

## نەژاد عەبدوڵڵا عەزیز

**رووداوەکەی شاری هەولێر:**

لەبەینی ئینگلیز و ئەڵمان ناخۆشییەکی تەواو هەبوو، زۆربەی سیاسەتمەدارانی عێراق بەتایبەتی کوردستان وایان دەزانی، کە مەسەلەی نەتەوەیی و بەتایبەتی سەربەخۆیی کورد بەستراوە بە ئەڵمانەوە، نەوەک بە ئینگلیز و سیخورەکانی، هەردوولا لە پروپاگەندە و خەڵک راکێشان دوا نەدەکەوتن.

خەڵکی هەولێر و کوردستان ئینگلیزیان بەدوژمن دەزانی و ئەڵمانیان بەدۆست دەزانی. لەوکاتەدا (میولەر و رەمزی نافیع ئاغا) خەڵکیان هاندەدا بۆ لای ئەڵمانەکان، ئەو کاتە موتەسەریفی هەولێر- ئەدیبی مەشهوور و کوردی راستەقینە" سالح زەکی ساحێبقران" بوو.

رۆژێک پێش رووداوەکە فرۆکەیەکی ئینگلیز هاتبوو چەند بۆمبێکی فرێدابوو، لێرە (ئەڵمان پەرستەکان) ئەمەیان بەهەل زانی، گوتیان حکومەت یان بڵێین سالح زەکی ئاگاداربووە لەم رووداوە. سەرۆکی خۆپیشاندانەکەش بەرەحمەت بێ شێخ حەسەن بوو، کە مامۆستا بوو، ئاژاوە بە خۆپیشاندانێک دەستی پێکرد، کە چەند کورە ئاغایەکی هەولێری و لەژێرەوەش چەند سیاسەتمەدارێکی کورد، وەکو خوالێخۆشبوو مستەفا عوزێری و عەلی ئەحمەد ئاغا و چەندانی دیکە هانی خەڵکیان دەدا بۆ ئاژاوەنانەوە دژی حکومەت و موتەسەریف، ئەوە بوو ئاژاوە گەیشتە بەر دەرگای سەرا و پۆلیس نەیتوانی بەرامبەر ئەم خۆپیشاندانە بوەستێ.

لەو کاتە مامم " عەبدولرەحمان عەزیز " مفەوەز پۆلیس بوو لەلای موتەسەریف، وەکو ئەم زەمانە گوتەنی (پاسەوان) بوو، من منداڵ بووم، نەچووبوومە مەکتەب، بەرەحمەت بێ سالح زەکی بەگ زۆری خۆش دەویستم لەژووری ئەو بووم مامیشم لەبەر دەرگا راوەستابوو.

لەو دەمە بەرێوەبەری پۆلیس ناوی (عەزیز بەرقی) بوو، وا بزانم خەڵکی کەرکووک بوو، هاتە ژوورێ، موتەسەریف داوای لێ کرد، کە رێگە بدات بەعەسکەر (سەرباز)، چونکە ئیش لەدەستی پۆلیس نەماوە و پاش ماوەیەک سەربازی عەسکەری هاتن، کە (آمر حامیە)ی ئەو کاتە خوالێخۆشبوو (ئەمین رەواندزی) بوو. رەشاشەکان لە جۆری (لویس) بوون- تۆزێک لە ئار.بی.جی بچووکتر بوو، لوولەی گەورەبوو.

بە موتەسریفیان گوت ئۆتۆمبێلەکەت، کە لەبەر دەرگا راوەستابوو- سووتێنرا، لەو وەختەش لە هەولێر چوار ئۆتۆمبێل هەبوو- (موتەسەریف، مەلا ئەفەندی..). داوایان لە سالح زەکی بەگ کرد، کە فەرمان بدا بۆ لێدانی خۆپیشاندەران، چونکە فەرمانی لێدان بەدەست موتەسەریف بوو، هەتا پێیان گوت، کە ئاژاوە بەرەو قەسر دەروا و لەوانەیە قەسر و ماڵ و منداڵەکانیشت بسووتێنرێن، بەڵام خوالێخۆشبوو چی وەڵام دانەوە:

"نەخێر، نابێ خوێنی یەک کورد برێژرێ، با ئۆتۆمبێلم و یان خۆم و یان ماڵ و منداڵیشم بفەوتێت، بەڵام کوشتنی یەک کەس لەدانیشتوانی شاری هەولێر دەبێتە مێژوو بۆ من، بڵێن لە کاتی سالح زەکی فلان کەس کوژرا".

ئەمەیە کوردایەتی و هەستی کوردایەتی راستەقینە، بەڵێ ئۆتۆمبێلی سووتا خۆی تووشی لەناوچوونیش بوو، بەڵام نەیویست خوێن برێژرێ.

ئاژاوەکە هەرچۆنێک بوو بەواستەی پیاوانی عاقڵی وەکو (مەلا ئەفەندی) و چەندانی دیکە هێمن کرایەوە.

لە پاش ئەو رووداوە، حکومەت موتەسەریفی بە بێهێز زانی و بۆ بەغدای گواستەوە، بە پلەیەکی نزمتر کردیان بەموفەتیشی ئیداری، موتەسەریفێکی دیکە هاتە هەولێر دەستی کرد بە توندوتیژی.

* ئەم بابەتە لە رۆژنامەی برایەتی، ژمارە ٢٢٢٥ لە ٣/ ١٢/ ١٩٩٦ وەرگیراوە.



# بارودۆخی سیاسی هەولێر لە نێو پارت و ڕێکخراوە سیاسیەکان و ڕووداوەکاندا ١٩٣٩ - ١٩٥٨

**شوان محەممەدئەمین خۆشناو(*)**
**کۆلیژی ئاداب- زانکۆی سەلاحەددین**

لە سییەکانی سەدەی ڕابردوودا، ژیانی پارتایەتی و بزاڤی نەتەوەیی و نیشتمانی لە عێراق و کوردستاندا تاڕادەیەک نەش ونمای کرد، جەنگی دووەمی جیهانیش کاریگەری لەسەر هەموو بوارەکانی ژیان دەبینرا، کە عێراقیشی گرتەوە بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردیش بەرەو قۆناغێکی نوێ هەنگاوی نا، لە باشوری کوردستانیش هەولێر و هەولێرییەکان نەخشیان لەنێو هەنگاوەکاندا دەبینرا، لەسالی ١٩٣٧ لاوە ڕۆشنبیر چالاکەکانی ڕێکخراوێکی سیاسیان بەنێوی (دارکەر) دامەزراند کە زۆربەیان قوتابی ناوەندی و دواناوەندی (ئامادەیی) بوون و هەلگری بیروڕای کوردایەتی بوون.بەرپرسەکانی کۆمەلەی نێوبراو لە هەولێر پێکهاتبوون لە "مستەفا عوزێری، یونس ڕەئوف (دلداری شاعیر)، جەلال قادر، موسا عەبدولسەمەد، ئیحسان حاجی ئەحمەد پاچەچی و ڕۆستەم عەبدولجەبار". بەڕای هەندێ توێژەر کۆمەلەکە لە کەرکووک دامەزراوە بەلام سالح حەیدەری لەسەر زاری دوو لە دامەزرێنەرانی کۆمەلەکە ئەوە پشت ڕاست ئەکاتەوە کە هەولێر بنکەی دامەزراندنی کۆمەلەکە بووە و تەنانەت ڕەفیق حیلمی لە شەقلاوە لە باخچەی جەمیل میران سوێندی بە خەنجەر و قورئان خواردووە و هاتۆتە ڕیزی کۆمەلەکە و پاشان وەک پێویستیەک کردویانە بە سەرۆکی حیزبی هیوا، چونکە کەسایەتیەکی ناوداری

گۆڕەپانی سیاسی باشوری کوردستان بوو و مێژوونوسی عەرەب (عەبدولڕەزاق حەسەن)یش بنکە و بیرۆکەی دامەزراندنی کۆمەڵەکە بۆ هەولێر دەگەڕێنێتەوە و، هەمان بۆچوون دووپات دەکاتەوە دوای فراوانبوونی کۆمەڵە جگەلە هەولێر و کەرکووک، لقەکانی خۆی لە کۆیە، شەقلاوە، کفری، چەمچەماڵ، بەغدا و خانەقینیش کردەوە.

ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە خانەی بچوکی پێنج کەسی پێکدەهات، ئەندامەکانی ناوی نهێنی و خوازراویان هەبوو، بەرپرسی هەرخانەیەکیش ئەندام بوو لە خانەی سەرووتر. دیارە ئەو شێوازە ڕێکخستنە نهێنیانە لەسەردەمی پاشایەتیدا باوو بووە، بەهۆی نەبوونی ئازادی سیاسی و نەدانی مۆڵەتی فەرمی بە پارت و ڕێکخراوە سیاسییەکان.

دوابەدوای فراوانبوونی کۆمەڵە لە ساڵی ١٩٣٩ لەپاش کۆبوونەوەی قوتابیان لە کەرکوک، حیزبی هیوای لێکەوتەوە، بەهۆی لەبارببوونی هەلومەرجی بابەتی بزوتنەوەی کوردایەتی و دەستپێکی جەنگی دووەمی جیهانی، حزبی هیوا گۆڕەپانی سیاسی هەولێری داپۆشیبوو، ئەوکاتە هزری مارکسیزم و تیۆریای سۆسیالیزمی بەگشتی، پێشوازی لێنەدەکرا لەلایەن گەنجانی هەولێر ئەویش بەهۆی حیزبی هیوا بوو. بەتایبەتی حیزبی هیوا لەسەرەتای جەنگ هەڵوێستی خۆی بەچاکی دژی فاشیزم و نازیزم دەربڕیبوو، هەربۆیەش دوای



ماوەیەکی کەم لە دامەزراندنی، ژمارەی ئەندامانی گەیشتە هەزار و پێنج سەد کەس، کە بەشی هەرەزۆری ئەفسەر و جێگری ئەفسەر و سەرباز و توێژی ڕۆشنبیران و خوێندەوار بوون، کە پارێزەر و دکتۆر و مامۆستا و قوتابی بەخۆوە گرتبوو.

لقی هەولێری حیزبی هیوا لە لقە چالاکەکان بوو، هەفتەنامەیەکی دەستنووسیان بەنێوی (گۆڤار) دەردەکرد، لەلایەن دوو ڕۆشنبیر و ئەندامی کارای ناو حیزب سەرپەرشتی دەکرا ئەوانیش (نافع یونس و قەرەنی دۆغرەمەچی) بوون.

شایەنی باسکردنە کەسایەتی ناسراوی هەولێر (ڕەمزی نافیع رشید ئاغا) ئەندام بوو لە حیزبی هیوا، کە لەپێناو دۆزی ڕەوای میللەتەکەی لەسەر ئاستی تاکەکەسی پردێکی پەیوەندی لەگەڵ ئەڵمانەکان بەست، ئەگەرچی لە کردەی (مامۆت) کۆتایی بەهەوڵەکەی هات و سەرەنجام دەستگیرکرا و لەوپێناوەشدا سەری نایەوە. بەڵام لاپەڕەیەکی شکۆدار و پرشنگداری بۆ مێژووی میللەتەکەی تۆمارکرد.

دیارە لەپێش ئەو بەروارە دا لە بزوتنەوەی مایسی (١٩٤١) دا، هەڵوێستی هەولێر هاوسۆزی بزوتنەوەکە بوو دژی بەریتانیا، لە خۆپێشاندانێکی گەورەدا بەبەشداری قوتابیان و مامۆستایان و کاسبکار و پیاوانی ئاینی و چین و توێژەکانی دیکە پاڵپشتی بزووتنەوەکە بوون، و لە نێو خۆپێشاندەرانیش ((فەتاح جەبار و ڕۆستەم جەبار و جەلیل هۆشیار و عەونی یوسف و جیهاد بەکر و عەلی ئەحمەد ئاغا و عومەر عوسمان و نازم سەعید ئاغا و عیزەدین فەیزی)) بەشداربوون کە هەموویان ئەندامی حیزبی هیوا بوون. خۆپیشاندانەکە دواتر توندوتیژی لێکەوتەوە و پاش گەڕانەوەی باروودۆخەکە و هاتنەوەی ئینگلیز ژمارەیەکی زۆری خەڵکی هەولێر گیران، کە لەدوای شاری بەغدا هەولێر بە دووەم شار دەهات لەڕووی ژمارەی گیراوەکانەوە.

ڕەشید عالی گەیلانی کە سەرکردەی بزووتنەوەکە بوو، بۆ

پاراستنی گیانی شا فەیسەلی دووەم و بنەماڵەکەی شاری هەولێری هەڵبژاردووە لە پەیوەندییەکی تەلەفۆنیدا لەگەڵ کەسایەتی ناسراوی خاوەن پێگەی ئاینی و کۆمەڵایەتی هەولێر (مەلافەندی) ئارەزووی حوکمەتی بەرگری نیشتمانی نیشاندا بۆ گواستنەوەیان بۆ ماڵی خۆیی و دڵدەدانییان لەگەڵ ئەوەی خۆپیشاندەران دەیانزانی مەلیک و خانەوادەکەی لە هەولێرە بەڵام بەهۆی پلەوپایەی مەلافەندی لەنێو شاردا وازیان لێهێنابوون.

دیارە دوای بزووتنەوەکە بارودۆخی ئابووری تێکچوو بوو، سوپای عێراقیش بۆ چاوشکاندنی میللەت سەیری عێراقیان دەکرد، دام ودەزگاکانی کارگێری گەندەڵییان پێوەدیار بوو، نارەزایی و بێزاری دانیشتوانی گرتبۆوە، خەڵکی نزیک بە ئینگلیز و رژێمی پادشایەتی تێروتەسەل دەژیان و زۆرینەی میللەتیش گوزەران و بژێویان خراپ بوو.

لەو سەروبەندەدا ئاراستە و تەوژمێکی جەماوەری لەهەولێر هەبوو، بەهۆی دوژمنایەتی ئەڵمان و ئینگلیزەکان، هەوەسییان بە ئەڵمانەکان دەهات، هەرچەندە دەیانزانی ئەوانیش رژێمێکی کۆلۆنیایین. دواتر ئەو ئاراستەیە رووی لە کزی کردو بە هۆی وشیاربوونەوەی خەڵک و گۆڕانی بارودۆخی سیاسی بەرەو ئاقارێکی دیکە چوو.

لە شۆڕشی بارزان (١٩٤٣-١٩٤٥)دا، حیزبی هیوا رۆڵێکی کاریگەری هەبوو بە کۆکردنەوەی جەماوەر لە دەوری بارزانی و بڵاوکراوە و بەیاننامەی لە بەغدا و شارەکانی دیکەی عێراق بڵاودەکردەوە، کە تێیدا پشتی راپەڕینی دەگرت و نیازخراپی حکومەتی دژی گەلی کورد دەخستە روو هەولێر و هەولێرییەکانیش بەپەرۆشەوە دەیانڕوانیە ئەو شۆڕشە و چاوەڕوانی ئەوەبوون هەرکاتێک بێت لەژێردەستی حکومەت دەربچن کاتێک ناکۆکی کەوتە نێو ریزەکانی حیزبی هیوا، تادەهات جیاوازی ئایدیۆلۆژی لەنێوان بەرەی چەپڕەو و بەرەی راستڕەوی هیوا قوڵتر دەبۆوە، تا بەو ئاستە گەیشت لە کۆنفرانسی کەرکووکی ١٩٤٤ چەپڕەوەکان بەیەکجاری دابڕان و بەرەی راستڕەویش ماوەیەک پارێزگاریان لە حیزبەکە کردو پاشان بڕیاری توانەوەی خۆیاندا.

بیرۆکەی کۆمۆنیزمی لە هەولێر لە ساڵانی ١٩٤١- ١٩٤٢ لەپێش شارەکانی دیکەی کوردستاندا لەدایک بوو، مامۆستایان رۆڵی کارایان گێڕا لە بڵاو کردنەوەی هۆشیاری چینایەتی لەنێو ریزەکانی قوتابیان و جەماوەردا، ئەوانەی لە کۆلیژەکانی بەغداش دەیانخوێند، لەکاتی گەڕانەوەیان لە پشووی هاویندا، بیرۆکەی نوێیان دەهێنایەوە و پەیوەندییان بەرۆشنبیرانی دیکەی شار دەکرد.

یەکەم خانەی مارکسی لەهەولێر بە هەولێی ساڵح حەیدەری پێکهات کاتێک پەیوەندی بە رەشید عەبدولقادر کرد (ئەندامێکی بەرەی چەپی هیوابوو)، دوایی پەیوەندی بە شۆعە مەخلوف (مامۆستابوو) و قوتابی ئەرمەنی ئەواکیم ئەواکیمیان کرد لە ساڵانی ١٩٤٢- ١٩٤٣دا، ئەوانە لەرێگەی پشتیوانەکانیان لەبەغدا بڵاوکراوەی نهێنی حیزبی شیوعی عێراقیان دەست دەکەوت و پەیوەندیان بە کۆمەڵەی (إلى الامام) هەبوو، لە کاتی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەکەش لە هاوینی ١٩٤٣، کۆمەڵەی هەولێر بەردەوامییان بە هەوڵەکانیان دا و توانییان مەلا شەریف عوسمان (مەلا عەروس)



بێننە ریزی كۆمەڵەكەیان بەپچڕانی پەیوەندییان، توانییان ژمارەیەكی زیاترلە قوتابی وگەنجانی حیزبی هیوا لە هەولێر بێننە ریزی كۆمەڵەكە و لە هاوینی ١٩٤٣ بڕیاریاندا (كۆمەڵەی میللەت) وەكو ڕێكخراوێكی سەربەخۆ و ناوچەیی كاربكات و دژی هەموو شێوازەكانی چەوساندنەوە بێت و مۆركێكی نیشتمانی و دیموكراتی هەبێت و بلاوكراوەیەكیشیان بەناوی (دەنگی كورد) دەردەكرد، ئەو گەنجانەی هاتنە ناو كۆمەڵەكە چالاك بوون و قوتابی و ڕۆشنبیرانی هەولێر بوون كە لەنێوانیاندا ((نافیع یونس، حەمید عوسمان (١٩٢٦- ١٩٩٣)، موسا سلێمان (١٩٢٦- ١٩٥٣)، هاشم عەبدوڵلا (١٩٢٨- ١٩٨٣)، شێخ محەمەد ناسراو بە (شێخە شەل) (١٩٢٣- ٢٠٠٢)، عەزیز محەمەد (١٩٢٤- ؟)، قەرەنی دۆغرەمەچی، یەحیا سەلیم، ئەنوەر عەبدوڵلا (دڵسۆز) و جەوهەر حوسێن و زۆرانی تر بوون لەو ماوەیەدا كۆمەڵەی (الشراره الجدیده) (بڵێسەی نوێ) توانییان پێش هەڵوەشانەوەیان جێ پێیان لەنێویاندا بكەنەوە و بلاوكراوەیەكی نهێنی بەناوی (بڵێسە) دەربكەن، بەلام لەگەڵ هەڵوەشانەوەیان بلاوكراوەكەش وەستا.

دواتر كۆمەڵەكە چوونە پاڵ ڕێكخراوی (وحده النضال) ئەویش لە ئەنجامی سەردانێكی ڕابەری لقەكە (صفاء مصطفی) بۆ هەولێر و دوای گفتوگۆكردن لەگەڵ سەرانی كۆمەڵەی میللەت لەسەر ئەوە ڕێككەوتن كە لقێك لە كوردستان دابمەزرێنن



بەمەرجێك لقی كوردی ئەو ڕێكخراوە بلاوكراوەیەكی تایبەت بەنێوی (یەكیەتی تێكۆشین) دەربكەن و دوو ئەندامی كوردیش لە لیژنەی ناوەندی ڕێكخراوەكە بەشدار بێت، ڕەزامەندی نیشاندراو (سالح حەیدەری و نافیع یونس)یش بۆ ئەو پلەیە پاڵێوران، بەلام یەكگرتنی ئەو دوو گروپە وای لە مەلا شەریف عوسمان كرد، بچێتە بەغدا و چاوی بە (فەهد) بكەوێ، هەوڵبدات لقێكی تایبەت بە حیزبی شیوعی عێراق لە كوردستان و هەولێر دابمەزرێنێ، توانی هەریەك لە یەحیا سەلیم و جەوهەر حوسێن و ئەنوەر عەبدوڵلا (دڵسۆز) بۆ لای خۆی رابكێشێ.

جێگەی ئاماژەیە (مەلا شەریف عوسمان) توانی وەكو نوێنەری كورد بەشداری لە كۆنفرانسی یەكەمی شوباتی ١٩٤٤ی حیزبی شیوعی عێراقی بكات و لە كۆنگرەی نیشتمانی ١٩٤٥یشدا بچێتە لیژنەی ناوەندی و ببێتە سكرتێری لیژنەی لقی كوردی، وە بەرپرسیارێتی و سەرپەرشتی ڕۆژنامەی (ئازادی) ئۆرگانی لقی كوردستانی پێ ڕاسپێردرا. بەلام ئەو لقە كوردیە زۆر لاواز بوو تەنها وەكو ڕێكخراوێكی بچووك جگە لە هەولێر، لە كەركووك و سلێمانیش هەبوو

بۆیە بەشی هەرە زۆری ڕۆشنبیرانی هیوا، بەپەسەندیان زانی لەریزی (یەكیەتی تێكۆشین) درێژە بە خەباتیان بدەن و زۆربەی سەرانی یەكیەتی تێكۆشین لەبەرامبەریدا ئەندامی بەرزی هیوابوون و بیروباوەڕی كوردایەتیان لە بیروباوەڕی دیموكراسی و پێشكەوتنخوازی موتوربەكرابوو.

دوای هەڵوەشانەوەی (وحدة النضال)، لقی كوردی (یەكیەتی تێكۆشین) بەنوێنەرایەتی سالح حەیدەری و نافیع یونس و عەلی عەبدوڵلا (ئەندازیار)، لەگەڵ نوێنەرانی حیزبی شیوعی عێراقی لەسەروویان (فەهد) و ئەوانی دیكە، بە بەشداری مەلا شەریف عوسمان كەوتنە گفتوگۆ لەسەر ڕێكخستن و ڕابەرایەتی لقی كوردی، بەلام

نەگەیشتنە ڕێکەوتن و دواجار لە پایزی ١٩٤٥دا (حیزبی شیوعی لە کوردستانی عێراق)یان دامەزراند و مەکتەبی سیاسییان لە سالح حەیدەری (سکرتێر)، نافیع یونس، عەلی عەبدوللا، عەبدولکەریم تۆفیق و رەشید عەبدولقادر پێکهێنا کە ئەو حیزبە لەنێوەندی سیاسی و لەنێو جەماوەر بە شۆڕش ناسرا، چونکە بلاوکراوەیەکی مانگانەیان بەزمانی کوردی بەناوی (شۆڕش) دەردەکرد و بە رۆنیۆ چاپیان دەکرد، دیارە زۆربەی پارت و ڕێکخراوە سیاسییەکان لەو سەردەمەدا بەناوی بلاوکراوە و رۆژنامەکانیان ناویان دەهات و دەناسران.

دیارە بەهۆی بالادەستی هەولێرییەکان لەنێو حیزبی (شۆڕش)دا، هەندێ بۆچوون ئەو حیزبە بە ڕێکخراوێکی تایبەت بە شاری هەولێر و هەولێرییەکان دادەنێن.

بەڕای عەلی عەبدوللا پەیڕەوی ناوخۆ و پرۆگرامی ئەو حیزبە ئارادەیەکی زۆر گونجاو بوو لەگەڵ بزووتنەوەی دیموکراسی لەعێراقدا و بزووتنەوەی کوردایەتی لە کوردستاندا، پشتگیری لە شۆڕشی بارزان کرد و بەرامبەر ئەو پروپاگەندانەش دەوەستا کە ڕژێمی داگیرکەری ئینگلیزی و شۆڤێنییەکان و کۆنەپەرستانی عەرەب و ڕژێمی پاشایەتی بەرامبەر شۆڕشی بارزان بلاویان دەکردنەوە

لەگەڵ ئەوەشدا زیاتر جەختی لەسەر ڕێبازی مارکسیزمی دەکردەوە، چونکە خۆیان بە ڕێکخستنێکی کۆمۆنیزمی کوردی سەربەخۆ دادەنا، دوای سەرنەکەوتنی گفتوگۆیان لەگەڵ (فەهد)دا، سەرانی شۆڕش دەرکیان بەو ڕاستیەکردبوو کە پێویستە لەگەڵ کەسانی نەتەوەیی و نیشتمانی ڕێک بکەون بۆ پێک هێنانی بەرەیەک کە هەموو پێکهاتە وشیارەکانی ناو کۆمەڵگەی کوردی لەخۆ بگرێ بەشێوەیەک بەرەی نوێ لەشێوەدا نەتەوەیی بێت و لە ناوەڕۆکیشدا مارکسی بێت و بتوانێ جەماوەر ئاراستە بکات. واتە ئامانجی شۆڕش کۆکردنەوەی هێزە پێشکەوتنخوازەکان بوو لە کوردستاندا، و پتەوکردنی خەباتی کورد و عەرەب دژی دوژمنی هاوبەشیان کە ئیمپریالیزم و کلکەکانی بوو، لەپێناو هێنانە ئارای سیستەمێکی دیموکراسی و دەسەلاتێکی ئازاد لە وولاتدا.

بۆیە رۆلێکی هەرە گرنگی نواند و پێشڕەوی کرد لە دامەزراندن و ڕێکخستن و ئاراستەکردنی (حیزبی رزگاری کورد)، وەکو بەرەیەکی یەکگرتوو هەموو هێزە سیاسییەکانی کوردستان کۆیکاتەوە و شان بەشانی بزوتنەوەی نیشتمانی و دیموکراسی عێراق خەبات بکات.

لەم پەیوەندییانەدا حیزبی رزگاری لە پاشماوەی حیزبی هیوا و بەشداری کەسایەتیە دیارەکان و قوتابیانی کورد لە بەغدا پێکهات لە زستانی ١٩٤٥ دا سەرکردایەتی حیزب لە : ((سالح حەیدەری، نافیع یونس، دکتور جەعفەر محەمەد، نووری شاوێس، نووری محەمەد ئەمین، رەشید باجەلان و تەها محێدین)) پێک هات لەکاتێکدا سالح حەیدەری و نافیع یونس دوو نوێنەری دیاری هەولێری حیزبی شۆڕش بوون لەسەرکردایەتی دا، نووری شاوێس و نووری محەمەد ئەمینیش ئەندامی شۆڕش بوون بەلام خۆیان ئاشکرا نەکردبوو، بۆئەوەی سەرکردایەتی رزگاری بەتەواوەتی لەلایەن (شۆڕش)دوە ئاراستە بکرێ. هەربۆیەش حیزبی شیوعی کوردستان (شۆڕش) بەیانێکی دەرکرد و لە دەستپێکی بەیاننامەکەدا هاتووە:



"یەکگرن بۆ دامەزراندنی حیزبی رزگاری کورد- تێکۆشن بۆ تێکدانی پیلانی ئیمپریالیزم وکۆنەپەرستی"، تێیدا پالپشتی تەواوی شۆرش بۆ دامەزراندنی بەردی نوێ و تێکۆشان بۆ چارەنووس و رزگارکردنی کوردستانی گەورە و هاندان بۆ هاوکاری حیزبی نوێی راگەیاند.

سەرکردایەتی دامەزرێنەری حیزبی رزگاریش بەیاننامەیەکی بلاو کردەوە کە ئامانجی ستراتیژی و تاکتیکی نەتەوەی کورد و حزبەکەی تێدا روون کردبۆوە حیزبی رزگاری دەست بەکاربوو، چالاکیەکانی بەرفراوان بوو، لەئاستی نێوخۆیی و دەرەکیدا، بەشێکی زۆری گەنجانی کورد چوونە پال حزب و جگە لە هەولێر لقەکانی لە کەرکووک و سلێمانیش کردەوە، سەرەرای کردنەوەی لق لە قەزاکانی کۆیە، رەواندز، ئامێدی، زاخۆ. لە دیارترین ئەندامە چالاکەکانی رزگاری لە هەولێر، کە دەزگای هەوالگری و ئاسایش دوای چاودێری کردن ناردوویانە کە لە (٣٢) ئەندام پێکهاتووە زۆربەیان کە توێژی رۆشنبیران و قوتابیان و فەرمانبەرانن. رێکخستنی حیزبی رزگاری لەهەولێر جگە لە چینی هەژار و چەوساوە بگرە شالاوی ئەو رێکخستنە گەلێ لە ئاغا و خواپێداوەکانی خاوەن هەستی کوردایەتی گرتبۆوە، لقی (عەشائیری) لقێکی تایبەت بوو خاوەن مولک و ئاغا و کەسایەتیە دیارەکانی ئەو شارە هاریکاریەکی تەواوی رزگاریان کرد. لە



دۆکیۆمێنتی بارەگای حامیەی هەولێر کە بۆ فەرماندەی تیپی دووەم لە ١١/ ٧/ ١٩٤٦ ئاراستە کراوە هاتووە: "لە شوێنێکی متمانە و باوەرپێکراوەوە بۆمان هاتووە ئەوانەی لە لیوای هەولێر هاوکاری دارایی حیزبی رزگاری دەکەن ئەو کەسانەن، ناودکانیان: قاسم مەلافەندی و عیزەدین مەلا فەندی (لەخانەدانانی هەولێر)، خدری ئەحمەد پاشا و کورەکانی، عەزیزی ئەحمەد پاشا و کورەکانی، حوسێن مەلا و کورەکانی، ئاغای جوکل ئاغا (لەسەرۆک هۆزەکانی دزەیی)، هەروەها سالحی رەشید بەگی خۆشناو لە (خانەدانانی شەقلاوە). لەبرگەیەکی دیکەی هەمان نوسراوی فەرمی باسی پەیوەندی هەولێر و سەرانی حزبی نێوبراو لەبەغدا دەکات لەرێگەی پارێزەران عەونی یوسف و رۆستەم عەبدولجەبار، کە دوو رۆشنبیر و ئەندامی کارای ئەو حیزبە بوون.

دەردەکەوێت ئەوانەی بە رووکەش لەگەل دەسەلاتبوون لە ژێرەوە هاوکاری بزاڤی رزگاریخوازی کوردیان کردووە، ئەوەش جێگەی سەرنجە و هەستی نەتەوەیی بەدەردەخات سەرەرای مەترسی و چاودێری دامودەزگاکانی ئاسایش لە پێگەی خۆیان خزمەتیان کردوە. دیارە ئەو دوو ئەندامە چالاکەی رزگاری، هەست بە جموجول و چاودێری دەسەلاتدارانی هەولێر دەکەن، هەر بۆیە لەگەل قاسمی مەلافەندی روودەکەنە هەوارگەی سەلاحەدین و لەوێ لە پەیوەندی و رێکخستنەکانیان بەردەوام دەبن. بەهۆی جموجول و چالاکی ئەو رۆشنبیرانە، لقی هەولێری حزب بەردەوام چاودێری توندوتۆلی لەسەر دەبێ.

دەردەکەوێ ئەو حیزبە وەکو پێویستیەکی مێژوویی لەدوای جەنگی دووەمی جیهانی لەدایک بوو، ئەو بۆشاییە سیاسییەی پرکردەوە کە بە هۆی هەلوەشاندنەوەی هیواوە دروست بووبوو، هەروەها ئەو بەربەستەشی بریبوو کە تەنها هەلگرانی ئایدیۆلۆژیایەکی دیاریکراو بەخۆوە بگرێ، بەلکو بووە بەردیەکی راستەقینەی نەتەوەیی نیشتمانی. هەروەها حیزب ئۆرگانی ناوەندی کە رۆژنامەی (رزگاری) بوو، دەری دەکرد و دەگەیشتە هەولێر و هەموو شارو شارۆچکەکانی دیکەی کودستان، لە هەولێریش لەگەل بوونی چاودێرییەکی توندی دەزگا ئەمنیەکان، بەلام دەگەیشتە دەست رۆشنبیرانی شار، زیاتریش لەلایەن

خاوەن کتێبخانەی هەولێر شێخ محەممەد محەممەد ناسراو بە (شێخە شەل) بلاو دەکرایەوە لەپاڵ رۆژنامە چەپەکانی دیکە کە لە بەغداچاپ دەکران، ئەمە و جگە لە بلاوکردنەوەی وێنەی بارزانی بەجل وبەرگی جەنەراڵێ لەهەمان دۆکیۆمێنتدا سەبارەت بە وێنەی فۆتۆگراف هاتووە: "وێنەیەکی فۆتۆگرافی مستەفا بارزانی بەجل و بەرگی جەنەراڵی سوپای رووسی، لەلایەن قاسم مەلافەندی بینراوە، هەورەها لەلایەن هەواداران و ئەندامانی دیکەش بینراوە".

ئەندامانی رزگاری و رۆشنبیر و کەسایەتیە نیشتمانیەکان لەهەولێر بەپەرۆشەوە دەیانڕوانیە رووداوەکان، لەدوای سەرکوتکردنی شۆڕشی بارزان (١٩٤٣- ١٩٤٥) کە وەرچەرخانێک بوو بۆ بوژانەوەی هەستی نەتەوایەتی، سەرکردەی شۆڕشیش لەگەڵ ئەفسەرانی حزبی هیوا لەدوای پەیوەندی کردنیان بە کۆماری کوردستان لە مەهابادا، بەتەنگ وەرگرتنی زانیاری و هەواڵەوە بوون، هەربۆیەش وێنەی بارزانی بەنهێنی لە هەولێر بلاو دەکرایەوە کەوا جێگەی سەرنج و چاودێری بوو لەلایەن دەسەلاتیشەوە. کاتێکیش بارزانی لەگەڵ دەستەیەکی دامەزرێنەر لە ئەفسەرەکان، بیرۆکەی دامەزراندنی حیزبێکی دانا (پارتی دیموکراتی کورد- عێراقی) لێکەوتەوە.

دەستەی دامەزرێنەر بەیاننامەیەکی بلاوکردەوە، بانگهێشتی یەکگرتنی گروپ و لایەنە کوردییەکانی عێراقی کرد، بۆ دامەزراندنی پارتێکی پێشرەوی نوێ و تێکۆشان لەو پارتەدا. کەسایەتییە دیارەکانی هەولێری نێو هەردوو حیزبی شۆڕش و رزگاری، لە پەیوەندیکردن بە هەمزە عەبدوڵلا ی نێردەی بارزانی بۆ دامەزراندنی پارتی نوێ و پەیوەندیکردن بە ئیبراهیم ئەحمەدی بەرپرسی لقی ژ. ک لە سلێمانی، رۆڵی دیاریان بینی.

دوای ئەوەی راسپاردەکانی دەستەی دامەزرێنەر و بارزانی، لەلایەن هەمزە عەبدوڵلا لەگەڵ نوێنەر و لایەنەکان تاوتوێ کرا، جیاوازی بیروڕا و بۆچوونەکان لەمەڕ راسپاردەکان هاتە کایەوە. حیزبی شۆڕش و رزگاری بڕیاری خۆهەڵوەشاندنەوەیان دا، لە هەفتەی یەکەمی ئابی ١٩٤٦ حزبی شۆڕش کۆنگرەی بەست، لەنێو سەرانی شۆڕش (ساڵح حەیدەری و جەمال حەیدەری و حەمید عوسمان) هاتنیان بۆ نێو ریزی پارتی بەجێبەجێ نەکردنی راسپاردەکان بەند کرد، بەڵام (عەلی عەبدوڵلا، عەبدولکەریم تۆفیق و رەشید قادر) لەگەڵ نوێنەرانی کۆیە و سلێمانی و کەرکووک لەگەڵ بڕیاری گشتی بوون، نافیع یونسیش سەرەتا پشتگیری کردن بەڵام دوایی بە بیانوی ناسەنگی کارکردن بە پەسەندیزانی لەپاڵ گروپی یەکەم بچنە ریزی حیزبی شیوعی عێراقی و کۆتایی بە حیزبی شۆڕش هات، حیزبی رزگاریش لە هەفتەی دووەمی ئابدا، جگە لە نافیع یونس لە کۆنگرەدا بەکۆی دەنگ بڕیاری خۆهەڵوەشانەوە و چوونە ریزی پارتی نوێیان دا.

لەگەڵ ئەوەی کۆمەڵێک کادیری گەنج و بەتوانای هەولێر، جیابوونەوە و لە کاروانەکە دابڕان، کە کاریگەری نێگەتیڤی لەسەر بزاڤی رزگاریخوازی گەلی کورد هەبوو لەو سەردەمەدا بەڵام کۆنگرەی دامەزراندن لە ١٦ی ئابی ١٩٤٦بەشێوەیەکی نهێنی لە بەغدا لە ماڵی (سەعید فەهیم) بەئامادەبوونی نوێنەرانی پێشووی شۆڕش و رزگاری و بەشداربوونی



هەمزە عەبدوڵڵای نوێنەری بارزانی بەستراو (ئیبراهیم ئەحمەد) یش وەکو چاودێری لقی حیزبی کوردستانی ئێران بەشداربوو، لە کۆنگرەکەدا ٣٢ ئەندام ئامادەبوون.

کۆنگرە کارەکانی بەسەرکەوتوویی بەڕێوەبرد و ڕەزامەندی و بڕیار لەسەر پرۆگرامەکانی نێوخۆی حیزب دراو، ناوی حیزب بوو بە (پارتی دیموکراتی کورد- عێراق)، دوای ئەوەش لیژنەی مەرکەزی و مەکتەبی سیاسی هەڵبژێردران، بڕیاردرا ڕۆژنامەی (ڕزگاری) بکرێتە ئۆرگان و زمانحاڵی پارتەکە، بەهۆی ناوبانگی و بایەخی ئەو ڕۆژنامەیە لەنێو جەماوەردا ئەو بڕیارە درا.

دواتر لەڕووی ڕێکخستنەوە لیژنەکان بەپێی ناوچەکان پێک هێنران، بۆ لیژنەی هەولێریش (ڕەشید عەبدولقادر، عەلی عەبدوڵڵا و عەونی یوسف) دانران بۆ سەرپەرشتی کردنی ڕێکخستنی نێو شار و دەروبەری. لەساڵی ١٩٤٦ بەدواوە، دوو ڕوانگە و ئاراستەی بنەڕەتی، نوێنەرایەتی بزاڤی ڕزگاریخوازیان دەکرد، ئەوانیش: دیدگای چینی کارگەرانی عێراق: کە لە حیزبی شیوعی عێراقی خۆی دەنواند، هەروەها دیدگای نەتەوەیی (بۆرژوازی ناوەند و بچووک) کە خۆی لە پارتی دەنواند. چارەنوسی گەلی کورد، وەکو ستراتیژی کارکردن بووە ئەرکی سەرشانی پارتی و ئامانجی نەتەوەیی بە پارتیەوە گرێدرا.

لەگەڵ بوونی ململانێ و ناکۆکی ئایدیۆلۆژی و هەڵبەزودابەز لە پەیوەندییەکانی نێوان ئەو دوو پارتە، بەدرێژایی سەردەمی پادشایەتی، بەڵام لە ئامانجی دژ بە ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستی ڕژێمی پاشایەتی هاوبەش بوون پارتی ئامانجی نەتەوەیی لەسەروو ئامانجی چینایەتی دانابوو، بەتایبەت لەو قۆناغە مێژووییەدا، واقیعی کۆمەڵگەی کوردی و خەباتی نەتەوایەتی ئەوەی دەخواست، کە سوود لە توانای هەموو چین و توێژەکان وەربگیرێ و ڕۆڵی کۆمکارێک ببینێ کە کەسایەتیە نەتەوەیی و نیشتمانیەکانی تێدا کۆبکرێتەوە.

دیڤید مەکدوال ئاماژەیەک دەخاتە ڕوو دەڵێت: "دزەییەکانی دەشتی هەولێر وەک هەورێک بەسەر پارتیدا سێبەری کردبوو، تەگەرەیەک بوو بۆ گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتی و ئابووریەکان و گرژی و ناکۆکی لەگەڵ حیزبی شیوعی عێراقی حەتمی دەکرد". بەڵام لەڕاستیدا کوڕ و منداڵەکانی ئەو فیودال و ئەرستۆکراتانە، نەک تەنها لەگەڵ پارتی بەڵکو زۆربەیان لەگەڵ حیزبی شوعیدا بوون و ڕۆڵیان هەبوو، چونکە هزری چەپ لە چل و پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا، وەکو دیاردەیەکی تێبینیکراو و گشتی، جگەلە کوڕانی پیاوە نیشتمانپەروەرەکان، زۆرجار کوڕانی کەسایەتیە نزیکەکانی ڕژێمی پاشایەتی لەباوکیان جوێ دەبوونەوە و ڕێی چەپڕەوییان دەگرت، کە بەپێچەوانەی خواستی باوکیان لایەنگیری گەلیان دەکرد.

بەهەر شێوەیەک بوبێت لە گۆڕەپانی سیاسی کوردستان دا، زۆربەی چین و توێژەکان ئەندام و لایەنگریان لەنێو ئەو دوو حیزبەدا هەبوو. بەدرێژایی سەردەمی پاشایەتی لەعێراقدا، یەکێک لە سیما و خەسڵەتەکانی ئەو شارە، قۆستنەوەی بۆنە نەتەوەیی و ڕووداوە نیشتمانیەکان بوو. جەژنی نەورۆزیش وەکو جەژنێکی نەتەوەیی و هێمایەک بۆ دەرباز بوون لە ستەم و هەڵاتنی خۆری ئازادی، بەشێوازی نهێنی و ئاشکرا لەو شارەدا زیندوو ڕاگیراوە.

نەورۆزی ساڵی ١٩٤٧ کە بەهەوڵ و کۆششی عەونی یوسف مۆڵەتی بۆ وەرگیرا ئەو نەورۆزە دوای ماوەیەکی کورت تێپەڕ بوو بەسەر دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کورد، بەڕێککەوتن لەگەڵ حیزبی شیوعی عێراقیدا بڕیاری ئاهەنگ گێڕانیان دا، قۆستنەوەی ئەو بۆنەیە لەنێوان ئەو دوو لایەنەدا جۆرێک لە ململانێ و ڕەنگدانەوەی هەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئاهەنگێکی فراوان و گەورەیان گێڕاو جەماوەرێکی بەرفراوان و بەرچاوی خەڵکی هەولێر جەژنیان پیرۆز کرد و بەشدارییان تێداکرد.

لەگەڵ ئەوەی هەندێ لە مەلا و شێخەکانی هەولێر دژی ئاگرکردنەوەبوون، کۆمەڵێک لە هەوادارانی کۆمەڵەی برایانی مووسڵمان (إخوان المسلمین) یش پشتگیریان دەکردن، دژایەتی نەورۆزیان دەکرد، بەڵام نەورۆزی ساڵی ١٩٤٧ بەگەرمی لەلایەن زۆرینەی دانیشتوانی هەولێرەوە

پیرۆزکرا.
شایەنی ئاماژەیە بەشێک لە چالاکیەکانی کۆمەڵەی نێوبراو لە کوردستان هەبوو، لەساڵی ١٩٤٧ دوای بریاری دابەشکردنی فەلەستین، هەوادارانیان لە هەولێر خۆپیشاندانیان ئەنجام داو دروشمی (نرید من الحکومە سلاح) چەکمان لە میری دەوێت و (عاش فلسطین حرة اسلامیة) بژی فەلەستینی ئازاد و(الله ربنا محمد رسولنا)یان بۆ پشتگیری فەلەستین وکێشەکەی بەرزکردبۆوە، ئەوانەی بەشداریان کرد (عبدولوەهاب حاجی حەسەن، ئەکرەم شاکر، زێوەر خەتاب، محەمەد سادق موختار، عوبدوڵا سەلیم) کە هەندێکیان بەرپرسانی رێکخستنی کۆمەڵەکە بوون.

ئەوەی تێبینی دەکرێ ئەو گروپە چەند کەسێک بوون چالاکیەکانیان لەمزگەوتەکان تاوتوێ دەکرد و دژایەتی پارتی و شیوعیەکانیان دەکرد، تەنها خۆپیشاندانیان بۆ کێشەی فەلەستین کرد و هیچ هەڵوێستی نەتەوایەتیان نەبوو. لەکاتێکدا خۆپیشاندانی گەورە گەورە لەلایەن پارتی وشیوعی بۆ نارەزایی دەربرین دژی حکومەتی پاشایەتی، لەوماوەیەدا دەکران. بەتایبەتی دوای گەرانەوەی ژمارەیەکی زۆری بارزانیەکان بۆ هەولێر و دەوروبەری لەدوای رووخانی کۆماری کوردستان، بەهۆی خراپی گوزەرانیان چەندین دروشمیان بەرزکردبۆوە کە مۆرکی نیشتمانی و نەتەوەیی هەبوو، بوونە هەوێنی راپەرینەکان تا رووخانی رژێمی پاشایەتی.

لە ٢٩ی ئازار (مارت)ی ١٩٤٧، کابینەی وەزارەتی چلەمین بەسەرۆکایەتی ساڵح جەبر پێکهێنرا، کە زۆربەی زۆری وەزیرەکان لەلایەن خۆیەوە هەڵبژێردرا و بەدڵ و هەودسی باڵوێزخانەی ئینگلیزی بوون لەبەغدا. هەر زوو لە کارنامەی وەزارەتەکەیدا جەختی لەسەر درێژەپێدان و پتەوکردنی پەیوەندی عێراقی - ئینگلیزی کردەوە، تا مۆرکردنی پەیمانی(پۆرتسمۆپ)ی لێکەوتەوە، ئەو پەیمانەش نارەزایی و راپەرینی جەماوەریی گەورەی لێکەوتەوە باشوری کوردستانیش بەگەرمی بەشداری و پاڵپشتی ئەو راپەرینە جەماوەریەی کرد گەنجە رۆشنبیر و نەتەوەپەروەرەکانی هەولێریش رۆڵی کارایان گێرا، چ لە ناوەوەی شارە کوردیەکان و چ لە راپەرینەکانی بەغداد، بۆنمونە: لە رۆژانی راپەرینی گەورە (وەسبە) ٢٧ی مانگ دا عاسم حەیدەری لێپرسراوی رێکخستنەکانی بەری (کەرخ) بوو، مەجید رەئوف رێکخەری خۆپیشاندانەکانی خانەی مامۆستایان بوو، جەودەت ئەحمەد ناجیش بەرپرسی رێکخستنەکانی ئافرەتان بوو لە ئەعزەمیە. هەروەها عومەر مستەفا ناسراو بە (عومەر دەبابە) ئەندامی لیژنەی ناوەندی پارتی بوو لێپرسراوی کۆلێژ و ئامادەییەکان بوو کە لە خۆپیشاندانی کۆلێژی ماف بریندار بوو. لەشارە کوردیەکانیش (یوسف حەنا) لێپرسراوی کەرکووک بوو، (حەمید عوسمان)یش لێپرسراوی سلێمانی بوو، لەهەولێریش زنجیرەیەک خۆپیشاندانی گەورەی جەماوەری کرا

بە بەشداری گشت چین و توێژەکانی، وەکو دیاردەیەکی نوێ و بەرچاویش ئافرەتان بەشداریان تێدا کرد.
جێگای ئاماژەیە بەشداری کاریگەری کورد لە راپەرینەکە دەگەرێتەوە بۆ پێک هێنانی (لیژنەی هاریکاری نیشتمانی) کە پارتی دیموکراتی کورد هاوشانی حیزبی شیوعی عێراقی و حیزبی گەل وباڵی پێشکەتوخوازی حیزبی دیموکراتی نیشتمانی ئەو لیژنەیەیان پێک هێنابوو، کە تێیدا پارێزەری هەولێری رەشید عەبدولقادر نوێنەرایەتی پارتی دەکرد. لەگەڵ بوونی هەندێ کێشە لەنێو ئەندامانی پارتی و شیوعی لەکاتی کارکردندا، بەڵام راپەرین سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێنا و هاوکاری کردنی پارتە نیشتمانیەکان و هەماهەنگی بوونیان بووە جێگەی رەزامەندی گەلانی عێراق. ئەندامانی کوردیش هەڵوێستی ئەرێنیان نواند لە ئەنجومەنی نوێنەرانی بەغدا، لە رووداوەکانی ٢٧ی مانگ لە بەغدادا کە بە رۆژی راپەرینی گەورە (وەسبە) ناسرا، لەنێوانیاندا نوێنەری هەولێر (محەمەد نەقیب) و نوێنەری کۆیە (محەمەد زیاد ئاغا) دەست لەکارکێشانەوەیان راگەیاند.
بە هەر جۆرێک بێت لە ئاکامی ئەو راپەرینە جەماوەرییەی بەغدا و شارەکانی کوردستان و شارەکانی تری عێراق، بووە هۆی ناچارکردن و رووخانی کابینەکەی ساڵح جەبر و پوچەڵکردنەوەی پەیماننامەی پۆرتسمۆپ و دامەزراندنی حکومەتێکی نوێ بەسەرۆکایەتی

محەمەد سەدر کە چەند کەسایەتیەکی نیشتمانپەروەری تێدا بەشدار بوو.
لە شــوباتی ١٩٤٨دا نوێنەری چین و توێژەکانی شار و شارۆچکە کوردیەکان بەمەبەستی ڕێزلێنان لە گیانی قوربانیانی ڕاپەڕینەکە، بەچەپکە گوڵی وەفادارییەوە بەرەو مەزارگەی شەهیدان بەڕێکەوتن، لە ١٣ی شوباتدا نوێنەرانی هەولێر و کۆیە گەیشتنە بەغدا و بەشداری ڕێوڕەسمەکانیان کرد.
بەم شێوەیە هاوکاری پارتی و شیوعی لەو سەردەمە نموونەیەکی باشی تێکۆشان و خەباتی هاوبەشیان پێشکەش کرد و گیانی وشیاربوونەوەی سیاسی و پێشکوتنخوازی و نەتەوەخوازی بوژایەوە. ئەو نیمچە ئازادیەی لە ئەنجامی وشیاری و فیداکاری جەماوەر و ڕاپەڕینی کانونی ١٩٤٨ هاتەکایەوە، زۆری نەخایاند، بەهۆی دروستبوونی کێشەی فەلەستین بەبیانووی بارودۆخی وڵات و پاراستنی سوپای عێراقی شەڕکەر! بۆ ئازاد کردنی فەلەستین، ڕژێمی پاشایەتی حوکم و دادگای عورفی ڕاگەیاند و کەوتە پەلاماردان و ڕاوەدونانی نیشتمانپەروەران لەسەرتاسەری عێراق بە کورد و عەرەبەوە، بەندیخانەکانیان بە زیندانی پڕکردەوە
دەسەڵاتدارانی سەربازی و پۆلیسی نهێنی لە هەولێر لە ٢٤ی ئایاری ١٩٤٨ هەڵمەتێکی ڕاوەدونان و دەستگیرکردنیان لە هەولێر دەست پێکرد، کە ٥٤ کەس دەستگیر کران، کە لە ٢٠ی تەممووزی ١٩٤٨دادگایکران، لە دیارترینیان: (عەونی یوسف، شێخ محەمەد محەمەد، جوهەر حوسێن مەلا، عەلی فەتاح، ئەنوەر محەمەدین، ڕەقیب حوسێن مەلا، خالید شێخ جەواد، عاسم حەیدەری و فایەق نادر) حوکمدران. هەڵمەتی تیرۆر و تۆقاندن لەسەردەمی کابینەی نووری سەعید گەیشتە ئەوپەڕی کە ژمارەیەکی بەرچاوی هەولێر حوکم دران، لەنێویاندا (عەزیز محەمەد، جەمال حەیدەری (١٩٢٦-١٩٦٣)، نافیع یونس، شێخ محەمەد محەمەد و عەلی فەتاح دزەیی).
لەنێوان ساڵانی ١٩٤٩- ١٩٥٤ دوو حیزبی دەسەڵاتداری دەرباری پادشایەتی هەبوو، ئەوانیش پارتی یەکێتی دەستوری (حزب الإتحاد الدستوري) و پارتی ئوممەی ئیشتراکی (حزب الأمة الأشتراكي) بوون، ئەندام و لایەنگرانیان لە دەرەبەگ و میر و ئاغا و شێخ و موڵکدارە گەورەکان و بنەماڵە دیارەکان پێکهاتبوون، دەسەڵاتیان بۆ پاوان دەکرا و بەردەوام نوێنەری درێژخایەن بوون لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقدا و بە تەزکیە دادەنران. لەساڵی ١٩٤٩ ئەندامانی کارگێڕی باڵای حزبی ئیتحادی دەستوری لە هەولێر پێکهاتبون لە: (سەدیق قادر میران، عەلی ئەحمەد ئاغا، عیزەدین مەلا و محەمەد عەلی مەحموود). ئەوانەی لەگەڵ حیزبی ئوممەی ئیشتراکی بوون: (سەید محەمەد نەقیب) و (مەعروف پیرداود) و چەندانی دیکە. بەلام دانیشتوانی هەولێر کە زۆرینەبوون، لەگەڵ ئەو حیزبانەدا نەبوون بەڵکو دژایەتیشیان دەکردن، چونکە لە بەرەی گەل و میللەتدا نەبوون. بۆنموونە بەگوێرەی بەڵگەنامەیەکی حکومی هەڵوێستی خەڵکی هەولێر بەم شێوەیە دەخاتە ڕوو: "دانیشتوانی هەولێر پێشوازی ساڵح جەبریان نەکرد، کاتێک لە٥/٥/١٩٥٢ سەردانی شارەکەی کرد، ئامادەی ئەو خوانەش نەبوون کە لە ماڵی شێخ محێدین شێخ ساڵح بەرزنجی (خاوەنی تەکیەی هەولێر) بۆی ئامادەکرابوو، وە بەشداری چایی خواردنەوەکەشیان نەکرد کەلە خانەی پشوودان (دار الأستراحة) لەوێستگەی شەمەندەفەر بۆی ئامادەکرابوو". هەروەها هاتووە: "زۆرینەی خەڵکی هەولێر شارەکەیان جێهێشت بەبیانووی سەرقاڵبوون بە ئیش وکارەکانیان، تەنانەت بابەتی پێشوازی شێخی ئاماژەپێکراو لەسەرۆکی حیزب تائێستاش لەگەڕەک و بازاڕ بووە بە قسە و باسی سەر زاران و ئەوەش وایکرد ڕووبەڕووی ڕەخنەی توند ببێتەوە: دانیشتوانی هەولێر دابڕ دابڕ ببێت لە بەرامبەریدا".
ئەوەش بەڵگەیەکی ڕوونە کە دانیشتوانی هەولێر چەند ڕقیان لە کاربەدەستانی دەرباری پادشایەتی بووە، کەسایەتیەکی وەکو شێخ کە پلە و پایەیەکی دیاری ئاینی و کۆمەڵایەتی هەبووە لەنێو شاری هەولێردا، بەڵام بەو کارەی خەڵکی لێدابڕاوە. لەگەڵ ئەوەی لەلایەن گەورەپیاوانی ئەو شارە پێشوازی

گەرمیان لێکرا، بەپێی راپۆرتە تایبەتیەکانی دەزگاکانی وەزارەتی کاروباری ناوخۆی هەولێر ئەو رۆژە ٥٢ کەس لە ناسراوانی شار بەرەوپیری چوون، کە ٢٢یان لە ئاغاکانی دزەیی بوون.

پارتی بۆ ئەو سەردانە بەیاننامەیەکی دەرکرد و هێرشی توندوتیژی کردە سەر رژێمی پاشایەتی و سالح جەبر و ئەو کوردانەی دابوویانە پالی، لە بەیاننامەکە لە سێدارەدانی ٤ ئەفسەرەکە و دەربەدەربوونی عەشیرەتی بارزانی و بارودۆخی خراپیان خرابووە روو کە هەموو لە سایەی سالح جەبردوەیە.

لە سالانی ١٩٤٩- ١٩٥٥ کوردەکان رۆلیان دیاربوو لەنێو بزووتنەوەی نیشتمانیدا، لەنێو حیزبی شیوعی عێراقیدا بەجارێک بالادەست بوون، توێژەرێک ئەو ماوەیە بەماوەی بووژانەوەی کوردەکان لەناو حیزب وەسف دەکات. چونکە لەدوای نسکۆ گەورەکەی بەسەر حیزبی شوعیدا هات لەنیوەی یەکەمی سالی ١٩٤٨ رێکخستنەکانی حیزب لەبەریەک هەلوەشایەوە، لەنیوەی دووەمی هەمان سالدا ئەو کەسایەتیە حیزبیانەی کە دەستگیر نەکرابوون، دەستیان بە خۆرێکخستنەوە کرد، بەهادین نوری توانی بەرپرسیاریەتی ئەو حیزبە دەستەبەر بکات لە ئەیلوولی ١٩٤٩ تا شوباتی ١٩٥٣ بالادەست بێت، لەدوای ئەویش هەردوو کەسایەتی هەولێر: کەریم ئەحمەد داود لە نیسانی ١٩٥٣ تا حوزەیرانی ١٩٥٤ سکرتێری ئەو حیزبە بێت، دوای ئەویش حەمید عوسمان لە حوزەیرانی ١٩٥٤ تا حوزەیرانی ١٩٥٥ پلەی سکرتێری دەستەبەر بکات

جێگای ئاماژەیە لەو ماوەیەدا جیابوونەوە و کەرتبون لەنێو ئەو حیزبەدا سەری هەلدابوو، لەوێشدا هەولێرییەکان رۆلیان هەبوو، عەزیز محەمەد و جەمال حەیدەری لەگەل بالی جیاخواز بوون سەرکردایەتی بالی ئالای کارگەران (راية الشغيلة) یان دەکرد هەولێریەکان لە بزوتنەوەی ئاشتیخوازان (أنصار السلام) لەسالی ١٩٥١ لیژنەیەکیان دامەزراندبوو کە ژمارەیەک لە کەسانی نیشتمانی و دیموکراتخوازی تێدابوو، لەئەندامە دیارەکانی (جەلیل وشیار، مستەفا خدر مستەفا، قادر رەشید، موهیب حەیدەری، فائق نادر، شەریف محەمەد سەعید جامباز، ئەسعەد خدر، سالح حەیدەری، شەریف عوسمان)، شێخ محەمەد محەمەد، مەجید قادر، ئیسماعیل رەسول، عەباس سیامەند، شێخ لەتیف، زێوەر خەتاب، عەونی یوسف، ئەحمەد حەمەدەمین دزەیی ١٩٢٥- ١٩٧٦)، ئافرەتانیش بەشداربوون لە دیارترینیان (خەیریە نادر، ساکنە سلێمان و فەریدە یونس)، جێگای ئاماژەپێکردنە دواتر هەلمەتێکی واژوو کۆکردنەوەش لەلایەن (عاسم حەیدەری) دژی بەکارهێنانی بۆمبای ئەتۆمی کۆکرایەوە و رەوانەی لیژنەی ئازادیخوازانی بەغدا کرا. لەسالی ١٩٥١ لە ناوەراستی شاری هەولێر پەیکەری کۆتری ئاشتی لەلایەن هونەرمەند (جەواد رەسول) دروست کرا و (فایەق نادر و محەمەد سەعید جامباز) خەرجیەکەیان لە ئەستۆ گرت.

بارودۆخی خراپی ئابووری و سیاسی و داواکاری خەلک بۆ چاکسازی کردن لەو بوارانەدا بەردەوام بوو، تا لە تشرینی دووەمی ١٩٥٢، هەلومەرجەکە پەرەی سەند و قوتابیان زنجیرەیەک خۆپێشاندانیان لە بەغدا کرد و پێکدادان روویدا بەتایبەت لە ٢٠- ٢٤ ی تشرینی یەکەمدا کە بووە هۆی رووخانی کابینەی (مستەفا عومەری) و پێک هێنانی کابینەیەکی سەربازی کاتی بەسەرۆکایەتی سەرۆک ئەرکانی سوپا نورەدین مەحمود (٢٣ تشرینی دووەمی ١٩٥٢- ٢٩ کانونی دووەمی ١٩٥٣) کە رووبەوونەوەی هێزە نیشتمانیەکان بۆوە و حوکمی عورفی داسەپاند و بلاوکراوە و پارتە بەرهەلستکارەکانی لەکارخست.

خۆپێشاندان و راپەرینەکان سنوری بەغدایان بەزاند، لە ٢٠ی تشرین لەهەولێر هەوادارانی پارتی و شیوعی، بە بەشداری قوتابیان و پیشەگەران و کاسبکاران رژانە نێو بازاری گەورەی هەولێر و بەرەو سەرا بەرێکەوتن و رووبەرووی هێزەکانی پۆلیس بوونەوە، لەهەردوو لا بریندار هەبوو، لەهەمان رۆژدا هەلمەتێکی راوەدوونان لەهەولێر دەستی پێکرد

دیارە ئەو راپەرینە هەرچەندە لەرووی قەبارە و گەورەیی وەکو راپەرینی ١٩٤٨ نەبوو، بەلام بەدووەم راپەرینی گەورەی جەماوەری

و وشـیـاربوونەوە دادەنرێ. لەگـەڵ داواکـاری خـەڵک بۆ ئازادیە دیموکـراتیـەکـان و لادانی حـوکـمی عـورفی و نەمـانی ڕاوەدوونان و چاککردنی بارودۆخی گـوزەرانی خـەڵک بەڵام ڕژێمی پاشـایەتی بەتەنگ کێشەکان نەهات و زنجیرەی نارەزایی هەر بەردەوام بوو.

لە ٢٢ی نیـسـانی سـاڵی ١٩٥٣دا، لەناوچەی دەزەییـایەتی دەشتی هەولێردا بەرهەمی جوڵانەوەی وشـیـاریی چینایەتی هاتەبەر، ڕاپەڕینێکی فراوانی جـوتیـاران لە گـوندی قـازیخـانەدا هەڵگیـرسا و بڵێسەکەی ٣٠٠ گوندی گرتەوە، کە دەنگ و ڕەنگێکی کـاریگەری لە ناوچەکە و لە عێراق دایەوە.

حیزبی شیوعی عێراقی و پارتی دیموکراتی کوردستانی- عراق هاندەر و پاڵپـشـتی ڕاپەڕینەکـە بوون، وشیـاری چینایەتی جـووتیـارانیش، بەهۆی ڕێکخـسـتنەکـانی ئەو دوو حـیـزبە لە ڕێگەی کـادیر و ڕۆشنبیـرانیـان بەڕێوە دەچوو، دەشتی هەولێـریش وەکو زەمینەیەکی لەبار و گونجاو بیروباوەڕی حیزبە نهێنییەکانی تێـدا بڵاو دەبۆوە، بەتایبـەت لە پەنجـاکـانی سـەدەی ڕابردوودا، هەروەها بڵاوکـراوە و ڕۆژنامـەکـانی تایبەت بە چینی کارگەر و جووتیاران وەکـو (بانگی فـەلاح) و (دەنگی داس) لەلایەن حـیـزبی شـیـوعی دەردەچوو، پـارتی دیموکـراتی کـوردسـتـانیش (نرکەی جووتیـار)ی دەرکـردبوو، کـە ئەو بڵاوکـراوانە بووبوونە هەوێنی کـامڵ بوونی هەسـتی شـۆڕشگێـڕی لەناو جووتیاراندا تارادەیەک وشیاری لەنێو داخوازی جووتیـارانیش بەدی دەکرا، لەپاڵ داخـوازی هەڵگرتنی جـەور و ستەم و ڕەفتای خراپی موڵکدارەکان و مـانەوەی جـووتیـاران لەسـەر زەوی خـۆیان و هەڵگرتنی سـەرانە و سوخرەکاری و.. هتد، جووتیـارانیش داوای کـردنەوەی قـوتابخـانە و نەخـۆشخـانە و پەیێنی کـیـمیـاوی و قیرتاوکردنی ڕێگاوبانەکانیان دەکرد هەربۆیە هەندێ بیـروبۆچوون هۆکـاری وشیـاربوونەوەی جووتیارانی دەشتی هەولێر بەبەراورد لەگەڵ جوتیـارانی ناوچەی دیکە، دەکـەنە هۆکـاری ڕاپەڕینەکە.

دیارە هەر لە سـاڵی ١٩٥٢ دا کـاتێک دەرەبەگـەکـان ئامـێـری کـشـتوکـاڵی (تراکـتۆر)یان هێنایە دێهـاتەکـان، زیاتر ئەو ئامـێـرەیان قۆستەوە و دەسـتیـان بەسـەر زەوییە چاکـەکـاندا گـرت و بەوهۆیەوە ژمـارەیەکی زۆری جـووتیـارانیـشی بێکارکرد

لەکاتی ڕاپەڕینەکـەشدا، زۆر لە پیـاوانی ئایینی هانی خـەڵکیـان دا پاڵپشتی جووتیـاران بن و لە وتاری ڕۆژی هەینی هەڵوێسـتی دروسـتی ئاینیـیـان نواند کـاتێکیش بەهۆی دەستڕۆیی ئاغاکـان و تاوانبارکردنی جووتیاران بە دژایەتی کردنی ڕژێمی پاشایەتی، بە پاڵپشتی حکومەت، ڕاپەڕینەکـە بە هێنانی پۆلیـسی گەڕۆک لە خواروی عێراق بۆ دەشتی هەولێـر کپ کـرایەوە و ژمـارەیەک خـاوخـێـزانی گـوندە ڕاپەڕیوەکـان دوورخـرانەوە و دێ بەدەر کـران ژمارەیەکیش خرانە بەندیخانەکانەوە.

لە پاش سـەرکـوتکردنی ڕاپەڕینەکـەش هەندێ لە پارێزەران خۆبەخشانە کەوتنە بەرگری کردن لە جووتیـاران و ڕۆڵی گەورەیان گێڕا، کە دواتر بووە هۆی دەسگیـرکـردنیـان لەنێوانیاندا (عەونی یوسف، ڕەشید عەبدولقادر هەروەها زێوەر خەتاب) بوون.

ئەو ڕووداوە لە دانیشتنی ٢٥ی کـۆبوونەوەی ئاسـایی ئەنجـومـەنی نوێنەران لە ١٣ی ئایاری ١٩٥٣دا لەلایەن (مـەسـعـود مـحـەمـەد)ی ئەندامی ئەنجـومـەن بە چاکی وروژێنرا، هەردوو بابەتی گـیـرانی پارێزەران و چەوسانەوەی جووتیارانی کردە یەک و هەڵوێستی حکومەتی بە ناڕەوا و دژی دادپەروەری خستەڕوو.

دیارە (مەسعود محمد) لەپێش ئەو بەروارەدا پاڵێوراوی کویسنجەق بوو، دەرچووبوو کـە بنک یەکـەم هەڵبـژاردنی نوێنەران بە ٧ی کـانونی دووەمی ١٩٥٣ کـرا بەشـێـوەیەکی ڕاستەخۆ ئەنجام درا لە سەرتاسەر عـێـراقـدا، کـە خـولی سـێـزدەی ئەنجـومـەنی نوێنەران بوو، لە ٢٤ی کـانوونی دووەمی ١٩٥٣ دەسـتی پێکرد تا ٢٨ی نیـسـانی ١٩٥٤ بەردەوام بوو، لەو ماوەیەدا مەسعود مـحـەمـەد وەکـو داکـۆکـیکارێکی بەتوانا، کێشە گرنگەکانی گۆڕەپانی کـوردی دەخـسـتـەڕوو وەک بابەتی بارزانییە حوکم دراو و دوورخراوەکان و کـێـشـەی جـوتیـارانی دزەیی و چاندنی توتن لە کـوردسـتـاندا کـە حکومەت باجێکی قورسی خستبووە سەر.

کاتێکیش فازل جەمالی (٨ی ئازاری ١٩٥٤- ٢٩ی نیسانی ١٩٥٤) سەرۆک وەزیران دەستی لەکارکێشایەوە، ئەرشەد ئەلعومەری (٢٩ی نیسانی ١٩٥٤- ٣ی ئابی ١٩٥٤) کابینەیەکی نوێی پێکهێنا، بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنی نوێنەرانی پێشوو و ئەنجامدانی هەڵبژاردنێکی نوێی دا. پارتە ئۆپۆزسیۆن و نیشتمانییەکان بڕیاری پێکهێنانی بەرەیەکی نیشتمانیان بۆ هەڵبژاردن دا تا بەشداری هەڵبژاردنەکان بکەن، ئەو بەرەیە پارتی دیموکراتی کوردستانی پشتگوێ خستبوو، لە گەڵاڵە نامەکەیدا هیچ ئاماژەیەکی بە مافی ڕەوای گەلی کورد نەکردبوو پارتی بۆ پاریزگاری ڕێکخستنەکانی ئەندامانی بڕیاریاندا بەشێوەیەکی نهێنی لەڕێگای پاڵێوراوەکانی (ئیبراهیم ئەحمەد، مەسعود محەمەد، عومەر مستەفا، مەعروف بەرزنجی) بەروکەشێکی بێلایەنانە بەشداری هەڵبژاردنەکە بکەن.

لە هەولێر فشار خستنە سەر پاڵێوراوان بەردەوام بوو، بە جۆرەها شێواز ناچاری خۆکشاندنەوە دەکران، ئەوانەی کە پروپاگەندەشیان بۆ پاڵێوراوان دەکرد چاودێریی توند دەکران بۆ نموونە کادیرانی پارتی لە هەولێر (عەبدوڵڵا ئیسماعیل، ساڵح شێرە و کەریم عارەب) دەستگیرکران بە بیانووی جۆراو جۆر کە لە هەولێر و دەروبەری بە مەبەستی دەنگدان دەگەڕان.

پاڵێوراوانی بەرەی نیشتمانی بەهەمان شێوە، عەونی یوسف بە تۆمەتی نانەوەی ئاژاوە دەسگیرکرا و (ساڵح میران)یش دوای گیرانی ئەو لە پاڵێوراوی خۆی کشایەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا کاتێک هەڵبژاردن لە هەموو شارەکانی عێراقدا لە ١٩ی حوزەیرانی ١٩٥٤ تەواو بووهەرچەندە لەژێر توندوتیژی و تۆقاندن ئەنجامدرا، پارتی توانی سەرکەوتنێکی گرنگ بەدەست بهێنێ، کاندیدی خۆی بگەیەنێتە ئەنجومەنی نوێنەران، بەڕێگای پاڵێوراوی شارۆچکەی کۆیەی سەر بە لیوای هەولێر مەسعود محەمەد بۆ جاری دووەم ببێتە نوێنەر لە ئەنجومەن و بەرەیەکی بەرهەڵستکاری نیشتمانی لە ئەنجومەن بە هاوکاری نوێنەرانی پارتی دیموکراتی و پارتی سەربەخۆیی پێک بهێنێ بەم شێوەیە بەرەی نیشتمانی هەڵبژاردن توانی ١٠ دە کورسی بەدەست بهێنێ و بەهاتنە پاڵ مەسعود محەمەدیش بوون بە ١١ کورسی.

بەڵام ئەنجامەکانی هەڵبژاردن جێگەی ڕەزامەندی سەرانی دەرباری پادشایەتی نەبوون. هەربۆیە تەمەنی خولی چوارەمینی ئەنجومەنەکە لە دوو مانگ تێپەڕی نەکرد کە تەنها کۆبوونەوەیەکی بەست لە ٢٦ی تەمووز و بە وتارێکی دەربار (العرش) ئەنجومەن پشووی ڕەسمی وەرگرت تا کابینەیەکی نوێی وەزارەت لەلایەن نووری سەعیدەوە (٣ی ئابی ١٩٥٤- ١٧ی کانونی یەکەمی ١٩٥٥) پێک هێنراو ئەنجومەن هەڵوەشێندرایەوە و بەچەند مەرسوومێکی سەیر ئەو ئازادییە سنووردارەی کە هەبوو ڕیشەکێش کرا.

لەو ماوەیەدا هێزە نیشتمانیەکان سەرکۆنەی سیاسەتی حکومەتیان دەکرد، بەتایبەتی سیاسەتی دەرەوەی حکومەت کە بە ئاراستەی بەستنەوەی عێراق بە هاوپەیمانێتیەکانی ڕۆژئاوا دەڕۆیشت، بەتایبەتی دوای ئەوەی گەڵاڵەنامەی عێراقی- تورکی ئامادەکرا و لە ٢٤ی شوباتی ١٩٥٥ واژۆکرا، حیزبی شیوعی عراقی بەتووندی دژی وەستا و پرۆتستۆی کرد، بەهەمان شێوە پارتی دیموکراتی کوردستانیش، ئەو پەیمانە کە بە پەیمانی بەغدا ناسرا، بە دژی بزاڤی کوردی لە عێراق و تورکیا و ئێرانی دانا، وە بە دوژمنێکی سەرسەختی کورد و عەرەب و ئاشتیخوازانی دانا لە ڕۆژهەڵات.

بۆیە دژایەتی میللەتی کورد بۆ ئەو پەیمانە شاراوە نەبوو، تەنانەت لەماوەی سێ ساڵی کۆتایی دەسەڵاتی پاشایەتی لە عێراق، یەکێک لە دروشمە گرنگەکانی کۆبوونەوە و خۆپیشاندانەکانی شاری هەولێر دژایەتی کردنی ئەو پەیمانە بوو، بەو هۆیەش ژمارەیەکی بەرچاوی گەنجانی شار دەستگیرکران لەوانە: جەمال حەیدەری، عادل سەلیم، شێخ محەمەد محەمەد، زوبێر بیلال، حوسێن ڕەشوانی و ئیسماعیل ڕەسول و چەندانی تر.

دیارە لەو ساڵەدا ڕووداوێکی گەورە سەری هەڵدا کە لەسەر ئاستی وڵاتانی ناوچەکە و جیهان دەنگی دایەوە، ئەویش خۆماڵی کردنی کەناڵی (سوێس) بوو لە میسر لە ٢٦ی تەمووزی ١٩٥٦ لە وتارێکدا

ڕاگەیەنرا گەلانی عێراق بە دڵ پێشوازی و پشتگیرییان لەو پرۆژەیە کرد هێزە نیشتمانیەکانیش بەهەمان شێوە بزوێنەری چالاکیە سیاسییە جەماوەرییەکان بوون.

بەپێی بەڵگەنامەیەک پارێزەرانی هەولێر بۆ پشتگیری گەلی میسری و بڕیاری خۆماڵی کردنەکە مان دەگرن و ئامادەی ژوورەکانی دادگا نابن، تەنانەت پارێزەر (زێوەر خەتاب) بروسکەیەکی هاوسۆزی و پاڵپشتی گەلی کورد ئاراستەی سەرۆکی میسری جەمال عەبدولناسر کرد و خودی سەرۆکی میسری وەڵامی بروسکەکەی بۆ نێویراو داوەتەوە، دواتریش نێویراو لەگەڵ لێپرسراوی ڕێکخستنەکانی پارتی لە هەولێر (مەلا عەبدوڵلا ئیسماعیل) و بەئامادەبوونی نوێنەرێکی حیزبی شیوعی عێراقی بەناوی (محەمەد خەیات)، یاداشتێکی ئیمزا کۆکردنەوە ئامادە دەکەن و لەدیدارێکی کورت و نهێنی سەردانی باڵوێزخانەی میسری دەکەن لە بەغدا و یاداشتەکەیان پێشکەش دەکەن

سەران و ئەندامانی پارتی بەهۆی پشتگیریکردنیان لە خەباتی گەلی میسری، دووچاری ڕاوەدونان و گرتن هاتن و خرانە بەردەم دادگای عورفی، لەوانە: ئیبراهیم ئەحمەد، عومەر مستەفا و حیلمی عەلی شەریف بوون، کە خرانە ژێر چاودێری پۆلیسەوە، هەروەها مەلا عەبدوڵلا ئیسماعیل گیرا و داوای کەفالەتی لێکرا.

لەکاتی هێرشی سێ قۆڵیدا بۆسەر میسر، تەواوی گەلی کورد هاوسۆزی خۆی دەربڕی، تەنانەت خودی بارزانی، ئەو کاتە لە یەکیەتی سۆڤیەت دەژیا، ئامادەیی خۆی و هاوڕێکانی دەربڕی بۆ خۆناونووس کردن وچوونیان بۆ میسر بە مەبەستی داکۆکیکردن و بەرگریکردن دژی ئەو دەست درێژییە سێ قۆڵییە.

دیارە ئەو هەڵوێستە نیشتمانیەی بزاڤی ڕزگاریخوازی و گەلی کورد نواندی، لەپاڵ هێزە نیشتمانیەکانی دیکەی عێراقدا، بەرامبەر بە کێشەی عەرەب، پەیامێکی برایانە و هاوسۆزی بوو دژی دەست درێژیەکانی ڕۆژئاوا، کە ئەو کاتە لەلایەن زۆربەی کۆمەڵگاوە وا دەخوێندراوە کە ڕۆژئاوا دژی گەلانی چەوساوەن و یاری بە چارەنووسیان دەکەن، لەلایەکی ترەوە هۆشداری یەکیەتی سۆڤیەت بۆ ئەو وڵاتانە زیاتر پێگەی پارت و گرووپە چەپەکانی بەهێزتر کرد، بەتایبەتی حیزبی شیوعی توانی ئەو دەرفەتە بقۆزێتەوە و کەمپی سۆسیالیزمی بە فریادڕەسی گەلانی چەوساوە لە قەڵەم بدات.

دوای ئەوەی ڕاپەڕینی تشرینی ١٩٥٦ی گەلانی عێراق سەرکوتکرا، بزاڤی نیشتمانی زیاتر پەرەی سەند، هەر لەو چوارچێوەیەشدا هێزە سیاسییە نیشتمانییەکان کەوتنەخۆ بۆ پێک هێنانی بەرەیەکی بەرهەڵستکاری یەکگرتووی نیشتمانی و نهێنی، بۆ ئەو مەبەستە هەر چوار حیزبی عێراقی (هەڵوەشاوە بەیاسا)، کە پێک هاتبوون لە حیزبەکانی (سەربەخۆیی، نیشتمانی دیموکراتی، حیزبی بەعس و حیزبی شیوعی عێراقی نهێنی)، (بەرەی یەکیەتی نیشتمانی)یان پێکهێنا لە شوباتی ١٩٥٧یش بەرەی (لیژنەی نیشتمانی باڵا) و (لیژنەی جێبەجێکردنی باڵا)یان لە زۆربەی لیواکان پێک هێنا، دواتریش لە ناوەڕاستی هەمان ساڵدا پەیوەندییان بە (ئەفسەرە ئازادیخوازەکان) کردو (لیژنەی سەربازی باڵایان) دامەزراند.

بەڵام ئەو لیژنانەی لە لیواکانی عێراق پێک هێنران، لە کوردستان (لەسەروویان هەولێر) سەرکەوتوو نەبوو، بەهۆی بەشداری پێنەکردنی پارتی لەو بەرەیەدا. ئەوە تا (سالح حەیدەری) ئەوکاتە بەرپرسی لقی کوردستانی حیزبی شیوعی بوو، دەڵێت: "لەگەڵ بوونی ڕاسپاردەکانی سەرکردایەتی بۆ پێکهێنانی لیژنەکانی بەرە لە بازاڕو شوێنە گشتیەکان و فەرمانگە و قوتابخانەکان و.. هتد، نەمانتوانی پشت بە هێزە تایبەتیەکانمان ببەستین، ئێمە دووپاتمان کردەوە بۆ پاڵپشتی و ڕاکێشانی جەماوەر پێویستمان بەهاوکاری پارتی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستانی عێراق دەبێ...".

لە ٩ی ئازاری ١٩٥٧ گەلاڵەنامەی بەرە لە شێوەی بەیاننامەیەکدا دەرچوو، کەلە ٥ خالی هێور پێکهاتبوو، بەهیچ شێوەیەک مەسەلەی مافە نەتەوایەتیەکانی کوردی تێدا نەبوو، بەڵکو گرنگی دابوو بە بەدیهێنانی خەونی یەکیەتی عەرەب وئازادی گەلی عەرەبی لە عێراقدا و گەشەسەندنی سیاسیانەی هەرێمە

عەرەبییەکان، بەرنامەیەکی وای تێدا نەبوو ئاماژە بە ڕووخانی دەسەڵاتی پاشایەتی بدات.

بەشدارنەبوونی پارتی لەپاڵ نارازی بوونی هەردوو حیزبی (سەربەخۆیی و بەعس) بەبیانووی ئەوەی پارتی ئامانجی جیاخوازی هەیە و دروشمی مافی چارەنووسی بەرزکردۆتەوە و باوەڕی بە بیری (بێلایەنی ئەرێنی) نییە، لەلایەک و خەمساردی خودی حیزبی شیوعی عێراقیش هۆکارێکی دیکەی بەشدارنەبوونەکە بوو.

جگە لە خودی پارتی و تێبینییەکانی لەسەر بەیاننامەی بەرە کە داخوازی کوردی تێدانەبوو، دیارە لەگەڵ بوونی پێگەی حیزبی شیوعی عێراقی لە کوردستان، بەڵام بەشدارنەبوونی پارتی کار و چالاکیەکانی بەرەی سست و خاو کردبوو. وە سەرەڕای هەڵوێستە نیشتمانیەکانی پارتی و هەماهەنگ بوونی لەگەڵ ڕەوتی بزاڤی نیشتمانی عێراقی، دوورخستنەوەی لەنێو بەرەدا بووە خاڵێکی لاوازی ئەو بەرەیە، کەمال مەزهەر لەو بارەیەوە ئاماژە دەکات و دەڵێت: "لەو بوارەدا نەتەوەپەرستانی عەرەب کەوتنە هەڵەیەکی تەکنیکی و ستراتیژی گەورەوە بەوەی ڕازی نەبوون ئەو هێزە نیشتمانیە کاریگەرە ڕاستەوخۆ ببێتە ئەندامی بەرە".

دیارە دواتر پارتی وەک چارەیەکی مامناوەندی نوێنەرایەتی خۆی بە حیزبی شیوعی عێراقی سپارد لەدوای ڕێککەوتنێکی دوو قۆڵی، بەڵام دواتر ساردیەک کەوتە نێوان ئەو دوو لایەنە، کاتێک لە هاوینی١٩٥٧ سەرانی لقی کوردستانی حیزبی شیوعی عێراقی (ساڵح حەیدەری، حەمید عوسمان) و (کەمال فوئاد) لەگەڵ هەندێ ئەندامانی دیکەی حیزبی شیوعی، هاتنە نێو پارتی. کە دووبارە کارەکانی ئەندامانی لیژنەی مەرکەزی دابەشکرایەوە، هەردوو کەسایەتی سیاسی هەولێر (ساڵح حەیدەری و حەمید عوسمان) گەیشتنە پلەی مەکتەبی سیاسی ساڵح حەیدەری لە ساڵی ١٩٥٧ کرایە بەرپرسی ڕێکخستنەکانی پارتی لە هەولێر کەلەدوای گیرانی مەلا عەبدوڵلا ئیسماعیل ئەو ئەرکە بە حەسەن مستەفا سپێردرا، بەڵام نێوبراو بەهۆی گرفتێکی خێزانی و کۆمەڵایەتی، هەواڵی لێدەدرێت و ناوی ڕاستەقینە و خوازراو و نهێنی ئەندامانی پارتی لە هەولێر لە ماڵەکەیدادەستی بەسەردا گیرا، کە دواتر توانی خۆی لەدەست هێزی حکومەت دەرباز بکات. حەسەن مستەفا دەڵێت: "بەهاتنی ئەو ڕۆشنبیرانە ڕێکخستنەکانی هەولێر بووژانەوەی بەخۆوە بینی" دوا ڕووداو لەسەردەمی پاشایەتیدا، یەکیەتی عەرەبی نێوان عێراق و ئوردن بوو، کە بە یەکیەتی هاشمی دەناسرێ، کە لە ١٤ی شوباتی ١٩٥٨ ڕاگەیەنرا. کە بەپێی ڕاپۆرتێکی باڵوێزی بەریتانیا لە عێراق کوردەکان بەرامبەر ئەو یەکیەتیە نیگەرانن و لە خەمی ئەوەدان کورد دەکەوێتە کوێی ئەو یەکگرتنەوە. هەر بۆ ئەو مەبەستە سەرکردایەتی پارتی لە کەرکووک کۆدەبێتەوە، باسی یەکگرتنەکە و چارەنووسی گەلی کورد دەکەن، تێیدا هەردوو کەسایەتی ناسراوی هەولێر (ئەحمەد حەمەدەمین دزەیی) و (زەید ئەحمەد عوسمان) بەشداری تێدا دەکەن.

بەم شێوەیە هەولێر لە سەردەمی پاشایەتیدا، بەشداری کارای لە بزاڤی ڕزگاریخوازی گەلی کورد کردووە، مۆرکی ئەو سەردەمە نەبوونی ئازادیە سیاسیە دیموکراتیەکان، هەڵمەتی ڕاوەدونان و گرتن، ڕێکخستنی نهێنی و چاودێریکردنی جووڵەی ڕۆشنبیر و سیاسییەکان، لەلایەکی دیکە لە دوا دەیەی ئەو سەردەمەدا بڵاوبوونەوەی وشیاری سیاسی و بەگوڕبوونی حیزبە نیشتمانیەکان، هەربۆیەش شۆڕشی ١٤ی تەمووزی گەلانی عێراق بەزادەی پاشخانێکی شۆڕشگێڕی گەلانی عێراق دەژمێردرێت و وەرچەرخانێکی دراماتیکی و خۆڕسک نەبوو بەڵکو لە هەناویدا کۆمەڵێک فاکتەر هەبوو.

تێبینی: ئەو باسە بەشێکە لە ماستەرنامەی بڵاونەکراوە،بۆ نووسینی پشت بە زیاتر لە سەد سەرچاوەی ڕەسەن و دەگمەن بەستراوە.

(*) ماستەر لە مێژووی نوێ و هاوچەرخی کورد






# فایلی (کردەوەی ماموت)

**فرسەت رۆژبەیانی**

مێژووی کورد زۆر لایەنی شاراوەی تێدایە، کە پێویست دەکات باسکاران بە دوایدا بگەڕێن. لە هەموو ئەرشیف و کتێبخانەکانی ئەوروپادا زۆر ماتریالی مێژووی دەگمەن هەیە، کە پێویست دەکات بدۆزرێنەوە و بڵاوبکرێنەوە، ئێمە لێرەدا تەنها باس لە یەکێک لەو لایەنە زۆر شاراوانەی مێژووی کورد دەکەین، کە لە لایەن کوردەوە خۆی هەقی نەدراوەتێ، هەندێ رۆشنبیری کوردیش هەن کە لەبەر ئایدیۆلۆجیایەکی تەسکی خۆیان نەیان هێشتووە ئەم باسە بوروژێنرێ.

مەبەستیشمان فایلی کردەوەی ماموتە، کە لە ساڵی ۱۹٤۳ دا سێ ئەفسەری ئەڵمانی لەگەڵ رەمزی نافیعدا خۆیان بە پەرەشووت هەڵدا لە باشووری کوردستاندا، مەبەستیشیان هاندانی هۆز و لایەنە سیاسییەکانی کورد بوو بۆ بەرپا کردنی شۆڕشێک دژی ئینگلیز.

ئەڵمان لە گەرمەی شەڕی دووەمی جیهانیدا ئەم پلانە دادەڕێژن بۆ کۆنترۆڵ کردنی بیرەکانی نەوت لە ناوچەی موسڵ و کەرکووکدا، چۆنیەتی دروستبوونی بیرۆکەکە راپۆرتی یوهانس گۆتفرید میوولەر بۆ سەرۆکایەتی سوپای ئەڵمانی و هەموو خۆ ئامادەکردنێک بۆ ئەم ئۆپەراسیۆنە لە دووتوێی فایلێکدا لە ئەرشیفی عەسکەری ئەڵمانی هەڵگیراوە.

لەم نووسینەماندا دەمانەوێ خوێنەری کورد ئاگاداری لایەنە گرنگەکانی ئەم فایلە بێت و لە داهاتوویەکی نزیکدا بە کوردی سەرجەم فایلەکە ئامادە کراوە و وەرگێڕدراوە بۆ زمانی کوردی دەخەینە بەردەست.

ئەم ئۆپەراسیۆنە ناوی بە ئەڵمانی **Unternehmen Mammut** لە راستیدا وەک لەم فایلەدا دەردەکەوێت مویللەر پێشنیازی ناوێکی تری کردبوو، ئەویش **Said Schahswar** سید شاسوار، بەڵام سەرانی سوپا ئەو ناودیان گۆڕی بۆ

(ئونتەرنێمن ماموت- كردەوەی ماموت) لاپەڕەی ١ تا ٣ ی ئەم فایلە وەک پێرستێکە کە باس لەوە دەكات، كە ئەم فایلە چی تێدایە، بەم شێوەیەی خوارەوە:

أ. نیاز لەم ئۆپەراسیۆنە: مەبەست گەیشتنە بە ئەنجامدانی خالی ( د ) و ( ل ) لە هەرێمی كەركووک و سلێمانی.

ب. چۆنیەتی گەیشتن بە ئامانج:

١. پەیوەندیكردن بە شێخ مەحموود و شێخانی تری كورد.

٢. كارێكی وا بكرێ، كە ڕێگا خۆش بێ بۆ ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆنی تر.

٣. كاری تێكدەری بكرێ لەو ناوچانەی، كە دوورن لە كوردستان بۆ پەرتكردنی هێزی دوژمن، كە نەتوانێت هێزەكانی هەمووی دژمان بە كار بهێنێت.

٤. هەڵسان بە كاری تەقینەوە و ئاژاوە دروستكردن لە ناوچە نەوتییەكانی كەركووک.

٥. پچڕاندنی هێڵی تەلەفۆن.

٦. تەقاندنەوەی شەقام و فرۆكەخانەو عەمباری خواردنی دوژمن.

٧. پەیرەوكردنی هەموو شێوەیەكی كاری ئیستخباراتی وەک پاراستنی چاڵە نەوتییەكان ئەمەش بەستراوەتەوە بە هاتنی هێزەكانی ئەڵمانی لە قەفقاسیاوە، هەروەها پەیوەندی بە هەڵوێستی توركیا...هتد هەیە.

٨. كاری ئیستیخباراتی (یەک) (OKW/ABW I) - دەبێ بریتی بێت لە زانینی هەڵوێستی دوژمن، شەقامەكان، خالی سنووری، شێوەكانی بەرگری ( دیوار یان شتی تر)، هەروەها هەڵوێستی عەشیرەتەكانی تری كورد.

ج. چارەسەركردنی گرفتی ڕۆژانەی ئەم ئۆپەراسیۆنە ئەركی سەر شانی ئیستیخباراتی (دوو) ە (OKW/ABW II) لە ڕێگای ئەفسەری پەیوەندیدارەوە ( VO).

د. لایەنی دارایی و پەیوەندییان بە بەشی Z/F ەوە هەیە .

هـ. پەیوەندی لاسلكی : لە ڕێگای ( VO ) ئەفسەری پەیوەندییەوە دەبێ، كە لە یەكێک لە سێنتەرەكانی OKW/ABW لە قەفقاسیاوە دەبێ دروست بكرێت،

---

U.Mammut — Berlin, den 26.Juni 1943

**Vortragsnotiz.**

Der kurdische V-Mann Ramsi Rafi Raschid hat sich vorzüglich entwickelt und verspricht, den Einsatz U.Mammut hervorragend zu unterstützen. Er stammt aus einer angesehenen Scheichfamilie, die als englandfeindlich bekannt ist. Persönlich ist er ein hochgebildeter Mensch (3 Jahre amerikanische Universität Beiruth).

V-Raschid legte in eingehenden Besprechungen dar, dass beim Aufbau des kurdischen Staates Unterstützung durch einige deutsche Fachleute notwendig sein und auch seitens der jungkurdischen Nationalisten begrüsst wird. Dieses kann nur im deutschen Interesse liegen, da auf diese Weise ein tiefgreifender prodeutscher Einfluss auf die dortige Bevölkerung garantiert ist.

V-Raschid bittet uns daher, jetzt schon entsprechende Vorbereitungen zu treffen und in Kürze die vom Einsatzführer vorgeschlagenen Leute ebenfalls nach Kurdistan zu bringen:

1.) Einen deutschen Arzt.

Aufgabe: a) Behandlung U.Mammut und der angeschlossenen Organisation, notfalls auch hoher kurdischer Scheichs mit Angehörigen.

b) Ausbildung von jungen Kurden als Krankenhelfer ("Sanitäter"). – Dadurch Schaffung einer weiteren, über ganzes Einsatzgebiet verbreiteten, uns dienlichen Organisation.

2.) Wegen hoher Geburtensterblichkeit (Kind und Mutter):
Eine deutsche Ärztin. (Frauen lassen sich nach der Landessitte nur von Ärztinnen behandeln).

Aufgabe: a) Behandlung der weiblichen Angehörigen unserer kurdischen Organisation, sowie der weiblichen Angehörigen hoher kurdischer Scheichs.

b) Ausbildung von kurdischen Mädchen zu Krankenhelferinnen und Hebammen.
Dadurch Schaffung einer über ganzes Einsatzgebiet verbreiteten weiblichen uns dienlichen Organisation.

Etwas Ähnliches konnte von den Feindmächten überhaupt noch nicht aufgezogen werden.

3.) Einen deutschen Ingenieur für Hoch- und Tiefbau.

Aufgabe: Landesaufnahme und Anfertigung von Plänen für späteren Staatsaufbau. (Wo Kanäle, wo Strassen, E-Werke etc. etc?) Dadurch eingehendes Landesstudium f. unsere Zwecke mögl.

4.) Einen deutschen Geologen (aus Tarnungsgründen aber nur als Gehilfe obigen Ingenieurs eingebaut).

Aufgabe: Geologische Landesaufnahme, für unsere Zwecke dienlich. (Wo Erdöl, wo Kupfer, Eisen, Silber etc. etc.?)

5.) Einen deutschen Volkswirtschaftler.

Aufgabe: Laufende Beratung der jungkurdischen Organisation in Fragen des wirtschaftlichen Staatsaufbau.

-2-

Kopie aus dem Bundesarchiv



هەروەها شیـفـرەکـەشی دەبێت بە گـوێرەی فـەرمـانێکی تایبـەت بۆ دابنرێت.

و. پێـویـسـتی ئۆپەراسـیـۆن بە کـەسـان و کـاری تەکنیکی : ئەم ئۆپەراسـیـۆنە لە رێگای چەند ئەفسـەرێکی ئەڵمانی ئەنجام دەدرێت، دوو گـرووپ لە خـۆ دەگـرێت، کـە شـارەزاییـان لە جوگـرافیـاو زمـانی کوردیدا هەیە.

١. دەبێت ئەفـسـەرێکی ئەڵمان لەگـەڵ یەکـێکی تر و کـوردێکی باوەڕپێکراو بە پەڕەشـووت خـۆیان هەڵدەنە خوارەوە.

٢. دوای ئەوەی کە گرووپی یەکەم جێگا پێی خـۆیان دەکەنەوە، دەبێت گرووپی دووهەم، کە لە نزیکەی پێنج ئەفـسـەر پێکهـاتووە و ئەوانی تر لەگـەڵیـاندان بە پەڕەشـووت خـۆیان هەڵدەنە خوارەوە، کە ئەمانە ئەرکیان بریتییە لە کارکردن لە لای عەشیرەتە کـوردەکـان وەک مـەشـقـپـێـکەری سـەربازی، یان سـەرکردایەتی کردنی ئەو کـوردانەی، کە لە خـاڵی( ب )دا ڕوونکراوەتەوە، یان ئەو کوردانەی کە دوایی دێن و پەیوەندییـان پێـوە دەکەن.

ز. دەبێ ئەو کـــەلو پەلـە سـەربازییـانەی بۆ ئەم ئۆپەراسـیـۆنە پێویستە بە شێوەیەکی تایبەتی دیاری بکرێت جۆریان جیابێت.

ح. ناوی نهێنی ئەم ئۆپەراسیۆنە مـامـوت دەبێت (Unternehmen Mammut).

ی. پارە: بڕێک پارە بۆ شـێـخ مـەحمـوود ١٠٠٠ فونـدی ئینگلیـزی (پاوەند).

بڕێک پارە بۆ شێخ حاجی بەسار ٥٠٠ فوند.

بڕێک پارە بۆ شێخانی تر، یان بۆ کڕینیان!...هتد ٥٠٠ فوند.

پارەی خۆ ئامادە کردن ١٥٠٠٠ رایشمارکی ئەڵمانی.

ئەمـەی سـەرەوە بە کـورتی بریـتی بوو لە هێڵـە سـەرەکـیـەکـانی ئەم ئۆپەراسیۆنە، کە لە سەرەتادا ئامادە کـرابوو بۆ ئەنجـامـدانی، هەرچەندە فـایلەکە زۆر لایەنی دیکەی تێدایە، کـە نهـێنی ئەم ئۆپەراسـیـۆنە دەردەخات.

زۆر زانیـاری نوێ لەم فـایلەدا هـەیـە وەک هـەوڵـدانـی ئـەڵمان بۆ پەیوەندیکردن بە شێخ مەحمـوودەوە، هەروەها گەڕانیان بە دوای کوردێکدا وەک وەرگـێـڕی زمـان، یەکـەم جـار کـوردێکی سـەقـزی دەدۆزنەوە، بەڵام هەر زوو وازی لێ دەهێنن، ئینجـا داوا لە ئیـسـتیـخبـاراتی ئەڵمانی لقی ئیـسـتـەمبـوڵ دەکرێت، کە کوردێک بدۆزنەوە بۆ ئەم ئۆپەراسیۆنە.

ئەوە بـوو کـە رەمـزی نافـعـیـان دۆزییـەوە، لە سـەرەتادا رەمـزی تا دەگـاتە ناو ئەڵمانیـاش پێی ناڵێن چ کاریان پێیەتی، دوایی موێللەر داوای لێ دەکـــات، کــە بەشــداری ئۆپەراسـیـۆنەکـە بکات، ئەویش رەزامەندی خۆی نیشان دەدات دوای ئەوەی لە مـەبەسـتە سـیاسـییـەکەی ئۆپەراسیۆنەکە تێدەگات، کە ئەویش وەدەرنانی ئینگلیـزە لە کـوردسـتـانی باشوور.

هەروەها ئەم ئـۆپەراسـیـۆنە پەیوەندی بە کەسایەتی کوردی ترەوە کـردووە جگە لەوانەی کـە باسـمـان کـردن وەک بەگـزادەکـانی جـاف کـە ناویان لەم فـایلەدا هاتووە وەک: عیزەت بەگی عوسمان پاشا و حەسەن بەگی فـەهمی بەگی جـاف، ئەمـانە نامـەی تایبـەتیـان بۆ چووە، کـە یارمەتی ئەم ئۆپەراسیۆنە بدەن.

ئەم فایلە گرنگییەکەی لەوە دایە، کە باس لە هەمـوو ئەو زانیـارییـانە دەکات، کە مـیوللەر بە درێژی باسی لێـوە نەکردووە لە کـتێـبـەکـەی ( لە رۆژهەڵاتی گـڕگـرتوودا)، ئەم فـایلە ٦٧ لاپەڕە دەبێت.

**لەهەفتەنامەی (بەدرخان) بڵاوکراوەتەوە**

# مەلا مستەفای بارزانی لە مەهاباد بە پێی دیكۆمێنتە عێراقییەكان ١٩٤٦-١٩٤٧

دكتۆر فەوزیە سابیر
كۆلیژی ئاداب - زانكۆی بەغداد

**پێشەكی**

دوابەدوای بەكۆتاهاتنی شەڕی دووەمی جیهانی دۆزی كورد ڕێڕەوێكی تایبەتی وەرگرت و بایەخێكی زۆری لەلایەن توێژینەوە ئەكادیمییەكان و ناوەندە سیاسییەكان پێ درا. خۆ ئەگەر سەرنجی ئەو لایەنە لە چوارچێوەی فراوانی ڕۆژهەڵاتی ناوینی هاوچەرخدا بدەین. دامەزراندنی كۆماری كوردستانی دیموكراتی سەربەخۆ، كە لەلایەنی مێژووییەوە بە كۆماری مەهاباد ناسراوە، ڕووداوێكی مێژوویی و دیار بوو لە ڕێڕەوی جووڵانەوەی نەتەوەی كورددا، ناتوانین لەبەرپابوون و لەناوچوونی ئەو كۆمارە بگەین، تاوەكو لە گۆڕانكارییەكانی ناوەوە نەگەین، كە ئاراستەی جووڵانەوەی ئازادیخواز و نیشتمانی كورد كراوە، هەروەها دەبێ ئاگاداری ئەو پەیوەندییانەی ئەوكات بین، كە لە نێوان لایەنە نێودەوڵەتییەكان كاریگەری هەبووە. بەتایبەتی هەر



سێ دەوڵەتە گەورەكان، بەریتانیا و یەكێتی سۆڤیەتی پێشوو و وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و ڕەهەندەكانی ئەو پەیوەندییانە و كاریگەرییان و هەروەها كاریگەری گۆڕانكارییەكانی كوردان، كە لەزۆر پارچەكانی كوردستانی بەشبەشكراو ڕوویان دەدا و، لە ڕەنگدانەوەی پەیوەندی كوردەكان بە ڕژێمی حوكمڕانی ئەو دەوڵەتانەی، كە بەسەریاندا دابەش كراون. ئەو ڕووداوانەی دەكەونە نێوان بەرپابوونی كۆماری مەهاباد و ڕووخانیدا، هەر لە پەرینەوەی مەلا مستەفای بارزانی و هاوڕێكانی لە سنووری عێراقەوە بۆ ئێران و ئەو ڕۆڵە كاریگەرەی لە كاروباری ئەو كۆمارە نوێیە گێڕایان، تا دەگاتە ئەو ڕووداوانەی، كە تایبەتمەندن سەبارەت بە مانی بارزانی لە كوردستانی ئێران لەدوای ڕووخانی كۆمارەكە، ئەوەش مەیدانێك لەبەردەم توێژەرانی مێژوو و سیاسەت دەكاتەوە، بۆ ئەوەی بەدوای داوە ورد و ئاوێتەكانی ئەو فاكتەرانەدا بچن، كە جووڵێنەری ڕووداوەكانی ئەو سەردەمە بوون، كە دبلۆماسییەتی لایەنە نێودەوڵەتییەكانی كاریگەر چ بەئاشكرا و چ بەنهێنی بەرپایان كرد.

لە هەمان كاتدا كلاوڕۆژنەوە ڕێككەوتنێكی گشتی هەبوو، چ لەلایەن هەڵوێستی فەرمی عێراقییەوە و چ لە پێوانەی بەریتانییەكانەوە، لەبەر ئەوەی بەریتانییەكان هێزی باڵادەستی ناوچەكە بوون، هەروەها فاكتەری

سەرەکی بوون لە ئاراستەکردنی سیاسەتی حکومەتەکانی عێراق، لەبارەی کاریگەری ترسناکی پەرەسەندنی رووداوەکانی هەردوو سنووری عێراق و ئێران، سەبارەت بە عێراق بەتایبەتی.

بەشێوەیەکی سەرەکی لەو بارودۆخە توندە هەڵدەقولاّ کە خەڵکی کوردستانی عێراقی پێدا دەڕۆیشتن لە ئەنجامی راپەڕینی بارزان لە نێوان سالانی (١٩٤٣- ١٩٤٥) و دەربەستبوونی بارزانی بۆ رووکردنە کوردستانی ئێران لەبەر رووبەڕووبوونەوەی ئەو راپەڕینە بە داپڵۆسینێکی توندوتیژ لەلایەن دەسەڵاتی حوکمڕانی عێراقەوە. ئەو هۆیانە و هۆی دیکەش وایان کرد ناوەندە فەرمی و غەیرە فەرمییەکانیش بایەخێکی نائاسایی بە پەرەسەندنی ئەو رووداوانە و ئەنجامەکانی بدەن، هەروەها بەدواداچوونی دبلۆماتی ورد بەردەوام، بڕێکی زۆری دیکۆمێنتی لێ بەسەر یەکدا کەوت، ئەوەش سەرچاوەیەکی باش و رەسەنی خستە بەردەست توێژەرەکانی مێژوو.

بۆ وێنە راپۆرتەکانی کونسوڵی عێراق لە تەبرێزی پایتەختی ئازەربایجانی ئێرانی، هەروەها راپۆرتەکانی رێپێدراوی پادشایەتی عێراق لە تارانی پایتەخت زانیاری زۆر گرنگ و کەم وێنەی جێهێشت، لە هەندێ بارودۆخی زۆر کەم نەبێ کەم جار وا بووە- وەکوو ئێمە زانیاریمان لا هەیە- لە سەرچاوەکانی خۆمان و بیانی کەم جار باس لە رووداوەکانی ئەو سەردەمە گرنگە کراوە.

ئەوەی پتر سەرنجمان رادەکێشی، وێنەی بارزانی شوێنێکی تایبەتمەندی هەیە بەسەر وێنەی رووداوەکانی دیکەدا زاڵە، کە لە راپۆرتە دبلۆماتییەکانی عێراقیدا ئاماژەی بۆ دەکرێ و، لە میانەی ئەو رووداوانەی هاتنە پێشی بەر لە پەڕینەوەی بارزانی بۆ یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو. ئێمە لە راستی دوور ناکەوینەوە ئەگەر بڵێین: ئەو زانیارییانەی لە راپۆرتەکانی دبلۆماتییەکانی عێراق بەدەستمان گەیشتووە، بە دووردرێژی و گشتگیر هەڵوێستی حکومەتە یەک لەدوای یەکەکانی عێراقی بەرامبەر بەراپەڕین بەتایبەتی و کوردەکان بەگشتی دەربڕیوە، بۆچوونی دەسەڵاتی حوکمڕان بۆ مەسەلەکە، تاکڕەو و سەلبی و شۆڤێنیستانە بوو، هەروەها لە چارەسەرکردنی هۆیە سەرەکییەکانی هەڵگرتنی چەک لە لایەن کوردەوە بەرەوویدا کورتبین بوو، بۆیە هەموو چارەسەرییەکانی بێ کەم و کورتی و هۆشیارانە نەبوو، بەڵکو بەکارهێنانی هێز بەشێوەیەکی بنەڕەتی بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەکان بەکار هێنا، بەمانەش کەوتە ناو گێژاوێکی توندوتیژی و، باری ئاسایشی لە کورد و عەرەبان تێکدابوو.

دەتوانین بڵێین ئەو دیکۆمێنتانەی تاوەکو ئێستا ئاشکرابوون لەمەڕ ساڵەکانی دوورخستنەوەی بارزانی و رۆیشتنی بۆ کوردستانی ئێران، شتێکی زۆر کەمان لێ دەست کەوتوون. لەگەڵ ئەوەی بایەخی خۆیان هەیە، بەڵام لە کتێبخانەکانی دیکۆمێنتی عێراقیدا پارێزراون. کە سالانێکی زۆر لە توێژەرەکان دەسکارییان حەرام کرابوو.

بەو هیوایەم ئەو دەورە بپێچرێتەوە و رێگا ئاوەڵا بکرێ، بۆ ئەوەی توێژەرەکان، بەتایبەتی کوردەکان بتوانن تیشک بخەنە سەر ئەو ماوە گرنگ و ترسناکەی ژیانی بارزانیی مەزن، کە بەوەرچەرخانێکی مێژوویی گرنگ لە مێژووی کورد دادەنرێت و، لاپەڕەیەکی رەسەن و گرنگە لە خەباتی نەتەوەیی لە پێناو رزگاربوون و هێنانەدی ئامانجە رەواکانی گەلی کوردمان.

### کورتەیەک لە راپەڕینی بارزانی ١٩٤٣- ١٩٤٥[1]

لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٣ بارزان بە سەرۆکایەتی مستەفا بارزانی بووە نیشتمانی راپەڕینێکی گرنگ، هەر لەو ساڵەدا پێشەوای کورد لە بارەگای دەستبەسەری لە شاری سلێمانی جوولایەوە و سنووری ئێرانی بە پێیان بڕی پاشان گەڕایەوە عێراق و چووە بارزان، ماوەیەک لەوێ مایەوە و نیشتمانپەروەران لێی کۆبوونەوە، تاوەکو هەلومەرجەکان رەخسان بۆ ئەوەی دژ بە حکومەتی ناوەندی سەرلەنوێ دەست بە خەبات بکاتەوە، لەو کاتەدا چەند ئەفسەرێکی کوردی ناو سوپای عێراق پەیوەندییان پێوەکرد[2].

لە بەرامبەر ئەوەدا حکومەت هەندێ رێکاری دژ بەو کارانە ئەنجام دا، بۆیێ شێخ ئەحمەد بارزانی (پێشەوای رۆحی بارزانییەکان) لەگەڵ (١٨) کەس لە پەیڕەوانی گرت

و بۆ (حلە) دووری خستنەوە، هەروەها دەستی بە ئامادەکاری سەربازی کرد بۆ هێرشکردن بۆ سەر راپەڕینی بارزان[٣].

لە بەرامبەر ئەوەدا. مەلا مستەفا بەهێزێکی چەکدارەوە هێرشی کردە سەر بنکەکانی پۆلیس لە بارزان و مێرگەسۆر و رەواندز، پاشان هێرشەکانی پەرەی سەند بۆ زۆر لە دەزگاکانی حکوومەت لە ناوچەکەدا.

ئەو هێرشە سەربازییانەی حکوومەتیشی تێک شکاند. بەم کارە شکۆ و شەوکەتی حکوومەتی لەبەر چاوی خەڵکی بارزان، بەڵکو لە هەموو کوردستان سووک و ریسوا کرد[٤].

دەسەڵاتەکانی ناوەندی لەسەرەتاوە هەوڵیان دا بەر لە راپەڕینەکە بگرن، بۆیێ دەستیان کرد بە گفتوگۆکردن لەگەڵ بارزانیدا.

بەتایبەتی بەریتانییەکان لە عێراقدا بەدڵەڕاوکێیەکی زۆرەوە چاودێری بارودۆخەکەیان دەکرد، چونکە لە کاریگەری ئەو راپەڕینە دەترسان بۆ تێکدانی ئاسایشی ناوخۆ چ لە کوردستان و چ لە عێراق بەگشتی.

ئەوەش کاریگەرییەکی خراپی بۆ سەر خەرجییەکانی شەڕی بەریتانی لە رۆژهەڵاتی ناویندا دەکرد[٥].

لە ئەنجامی گفتوگۆکەدا حکوومەت رەزامەندی نواند بۆ رێگەدان بە مەلا مستەفا، کە لە گوندی پیرانی دەرەوەی بارزان نیشتەجێ بێ و، شێخ ئەحمەدی بارزانی و پیاوەکانی ئازاد بکرێن، هەروەها حکوومەت بەڵێنی دا کە هەندێ چاکسازی لە ناوچەکانی کوردستاندا ئەنجام بدا، هەندێ ئەفسەری کوردیش بۆ پەیوەندییەکان دەسنیشان بکات بۆ هێورکردنەوەی بارودۆخی ناوچەی بارزان[٦]. تاوەکو بەهاری ساڵی ١٩٤٥ بارودۆخەکان بەرەو گەڕژی دەچوون، زۆر بە ئاشکراش بەدیارکەوت، کە حکوومەتی عێراق خەریکی خۆ ئامادەکردن بوو بۆ هێرشێکی سەربازی فراوان بۆ سەر ناوچەکە، ئەو گیروگرفتانەی کە لە مێرگەسۆر و بارزان روویان دا کردیان بە بەهانە بۆ داگیرکردنی ناوچەی زێبار و بارزان لەساڵی ١٩٤٥ دا، لە ١٩ی ئابی هەمان ساڵ ئەنجومەنی وەزیران بڕیاری ئەحکامی عورفی لە شارەکانی مووسڵ و هەولێر و قەزای زێبار و ناوچەکانی چواردەوریان دەرکرد، بەتالیۆنەکانی سوپای عێراق بەرەو کوردستان هەڵکشان بەپشتیوانی هێزی ئاسمانی بەریتانی : کە دەستیان کرد بە بۆمبابارانکردنێکی خەستی شوێنی بارزانییەکان[٧].

بەرە بەرە بەدیارکەوت کە هێزی بارزانی دەکەوێتە نێوان مقاشی سوپای عێراقەوە بە پشتیوانی فڕۆکە جەنگییەکانی بەریتانی، ئەگەر ئەو پشتیوانییەیان بۆ پەیدا نەبوایە نەیان دەتوانی هێرش بکەنە سەر بارزانییەکان لە شوێنە چیاییەکانی خۆیان، لەو شەڕانەدا نەبەردی و ئازایەتییەکی بێ هاوتایان نواند، دلێرانە بەرگرییان لە خۆیان کرد.

لە ژێر ئەو هەموو پاڵەپەستۆیە زۆرەوە، بارزانی و کۆمەڵێکی زۆر لە پیاوەکانی بەخاو و خێزانەوە کشانەوە بەرەو سنوور و چوونە ناو خاکی ئێرانەوە، پاشان روویان کردە مەهاباد، کە یەکەم حکوومەتی کوردی نوێ لە مێژووی کورددا لە دایک ببوو، کوردەکانی ئەوێ بەوپەڕی بەخێرهێنانی گەرمەوە پێشوازییان لێ کردن.

### بارودۆخی بارزانییەکان لە دوای کۆچکردنیان بۆ ئێران

هەر لە سەرەتای گەیشتنی بارزانییەکان بۆ کوردستانی ئێران راپۆرتەکانی عێراق زۆر بەوردی بەدوایاندا چوون، لە راپۆرتێکی نێردراوی کونسوڵی عێراق لە تەورێزدا، ژمارەی خێزانە کوردەکانی هاوڕێی بارزانی بوون، کە خاکی عێراقیان جێ هێشت و روویان کردە ئێران، بەم شێوەیە دیاری دەکات:

(١٥٠) خێزان لەبۆکان نیشتەجێ کران، (١٥٠) خێزان لەناوچەی نێوان سولدز و مەهاباد، (١٠٠) خێزان لە مهاباد، لەهەمان کاتدا (١٠٠٠-١٥٠٠) خێزان لە شنۆ و نەغەدە نیشتەجێ کران[٨].

لە راپۆرتێکی دیکەی رێپێدراوی پاشایەتی عێراق لەتاران کە بۆ وەزارەتی دەرەوە نێردراوە، هاتووە: ژمارەی ئەوانەی لەگەڵ بارزانی چوونە ناو ئێران (٢٠٠٠) کەسن لە نێوانیاندا (١٠٠٠) چەکدار هەبوو، هەر لە راپۆرتەکەدا هاتبوو، کە ژمارەی پەنابەران لە زیادبووندایە[٩].

بایەخدانی دەسەڵاتەکانی سۆڤیەتی بە بارزانی و یاوەرانی، سەرنجی وەزیری رێپێدراوی عێراقی

بۆ خۆی راکێشا(١٠) ئاماژەشی بەوە کرد، کە پزیشکەکانی رووس بریندارە کوردەکان کە ژمارەیان بە (٢٠٠) بریندار مەزەندە دەکرێ تیماریان دەکەن، (٢٦) کەس لەو بریندارانە برینەکانیان کاریگەربوون(١١) بەڵگەنامەیەکی دیکەی عێراق وەسفی بارودۆخی ئەو کوردانەی چوونە مەهاباد، بەم شێوەیە دەکات: " ئەوانە پێخواس بوون، هیچ پێداویستییەکی ژیانیان نەبوو، لەبەر ئەوەی ئەوانە هیچ هۆیەکی دابینکردنی ژیانیان لە دەستدا نەبوو، بۆیە دەستیان کرد بەهەوڵدان بۆ هاندانی کوردەکان بۆ ئەوەی یارمەتییان لە پارە و پوول و خۆراک پێشکەش بکەن.."(١٢).

بارودۆخی خراپی بارزانییەکان هەست و سۆزی کوردەکانی ئێرانی هێنایە جۆش و خرۆش، یەکێک لە راپۆرتە دبلۆماتییەکانی عێراق ئاماژە بۆ عەشیرەتی شکاک دەکات، کە ناسراوە لە ئێراندا، کۆی (٥٠٠٠٠) تومەنیان بۆ یارمەتی بۆ ئەم مەبەستە کۆکردەوە(١٣).

هەموو شایەتی و بەڵگەکان ئەوە دەسەلمێنن، کە لە ئەنجامی زوڵم و ستەم و بێدادی لە لایەن دەسەڵاتەکانی عێراقەوە رووبەڕوویان بووەوە، بۆیە مەلا مستەفا و بارزانییەکان پەڕینەوە ناو ئێران، بەڵام راپۆرتە دبلۆماتییەکانی عێراق ئەم وێنەیان بەپێچەوانەی راستییەکان دەربڕی، تەم و مژاوی و پێچەوانەی یەکتر بوون.

هەر لە ٢٣ی تشرینی یەکەم/ ١٩٤٥ ڕێپێدراوی پاشایەتی عێراق لە تاران لە راپۆرتێکی یەکسەریدا بۆ سەرۆکایەتی ئەرکانی سوپای عێراقدا هاتووە: "کشانەوەی بارزانی و یاوەرانی بۆ بارەگای (کۆمەڵە)(١٤) لە ناوچەی سابلاغ (مەهاباد) بەڵگەیەکی دیارە، کە مەلا مستەفا و یاوەرانی لە لایەن کۆمەڵەوە هان دەدران، بۆ یاخیبوون و راپەڕین لە دژی دەوڵەتی عێراقەوە ڕێنمایی دەکران"(١٥).

دوای چەند رۆژێک ڕێپێدراوی عێراق لە راپۆرتێکی دیکەدا بانگەشەی ئەوەی کرد، کە گیروگرفت کەوتۆتە نێوان مەلا مستەفا و کۆمەڵەوە "لە رۆژانی دادێ هۆیەکانی بەدیاردەکەوێ" هەروەها گوتی: "کۆمەڵە قبووڵ ناکا کوردەکانی عێراق بچنە ناو ریزەکانییەوە"(١٦).

هەر لە رۆژانی سەرەتاوە بەگەیشتنی بارزانی بۆ ئێران، دبلۆماتییەتی عێراق لە تارانەوە رایگەیاند، کە سۆڤییەتییەکان دەستیان لە جموجۆڵەکانی بارزانیدا هەیە، راپۆرتە دبلۆماتییەکانی عێراق کە لە تاران و تەورێزەوە بۆ بەغدا ردوانە دەکران، جەختیان لەسەر رۆڵی سۆڤییەتییەکان لە هاندان، بەڵکو پڕچەککردنی کوردە عێراقییەکان دەکرد لەڕێگای بریکارەکانیان لە ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوین دەسووڕانەوە.(١٧) لە راپۆرتێکی زۆر نهێنی هەڵسووڕێنەری کاروباری عێراق لەتاراندا هاتووە:

"یەکێک لەو بریکارانە چووتە ناو کوردستانی عێراق و پەیوەندی بە مەلا مستەفا و یاوەرانی کردووە، هەر خۆشی پڕچەکی کردوون و، بۆ یاخیبوون و راپەڕین هانی داون(١٨).

ئەو راپۆر ـە لەو راپۆرتە هاوشێوانەبە، کە دبلۆماتە عێراقییەکان لە ئێرانەوە بۆ حکوومەتی بەغدایان رەوانە دەکرد، لەکاتێکدا هیچ بەڵگەیەک لەلای دبلۆماتە رۆژئاواییەکانیش نییە بوونی هیچ جۆرە پەیوەندییەک لەنێوان بارزانی و سۆڤیەت بسەلمێنێ بەڵکو پێچەوانەکە راستە.

لە میانەی نیوەی یەکەمی چلەکاندا پەیوەندیکردن بە سۆڤیەت لە بیر و خەیاڵی بارزانیدا نەبووە، بەڵکو بیری لە پەیوەندیکردن بە بەریتانییەکانەوە کردۆتەوە بۆ ئەوەی کار لە هەڵویستیان بکات لەبەرئەوەی ئەوکات هێزێکی بالادەست بوون لە عێراقدا، بەڵام سۆڤیەتییەکان بایەخیان بەکوردی عێراق نەداوە تەنیا لەو کاتە نەبێ، کە گەیشتوونەتە ئێران، دوای ئەوەی سۆڤیەتییەکان بوونە لایەنێکی کاریگەر لە رووداوەکانی گۆڕەپانی کورد لە ئێران و، لە ئەنجامی دامەزراندنی کۆماری مەهاباد.

هەروەها لە دوای بەدیارکەوتنی سەروسەودای شەڕی سارد بەشێوەیەکی بەرفراوان لە نێوان سۆڤیەت لە لایەک و نەیارەکانی لە بەریتانی و ئەمریکییەکان لەلایەکی دیکەوە و، بە دیارکەوتنی رەهەندی کورد لە سیاسەتی رۆژهەڵاتی ناویندا.

گەیشتنی بارزانی بۆ ئێران دڵەڕاوکێیەکی زۆری بۆ دەسەڵاتەکانی عێراق دروست کرد، مەسەلەی گرتنی و بەدەستەوەدانەوەی

بۆ دەسەلاتەکان بووە کار و پیشەی دبلۆماتییەکانی عێراق لە تاران.

دوای ئەو یاداشتنامانەی پێشکەش بە وەزارەتی دەرەوەی ئێران کران، ئێرانییەکانیش بە دبلۆماتەکانی عێراقیان راگەیاند، کە ئەوان لە بارودۆخێکی وا نین، کە بتوانن حاڵی حازر مەلا مستەفا بگرن[١٩] ئەوەیان گەڕاندەوە بۆ هۆی رازی نەبوونی دەسەلاتەکانی سۆڤیەت بۆ پەڕینەوەی یەکەکانی سەربازی ئێران بۆ ئەو ناوچانەی کە مەلا مستەفای لێ بوو[٢٠].

وەزیری رێپێدراوی عێراق لە ئێران پێشنیازێکی خستە بەردەم وەزارەتی دەرەوە لە بەغدا، کە داوا لە سۆڤیەتییەکان بکەن (لەبەر ئەو پەیوەندییە دۆستانەیەی ئێستا لەنێوان ئێمە و یەکێتی سۆڤیەتەوە هەیە) هانیان بدەن بۆ ئەوەی بارزانی لە ناوچەکانی ژێردەسەلاتیان دەربکەن و، پاشان بیگرن و بیدەنەوە دەست دەسەلاتەکانی عێراقەوە. لە پێشنیازێکی دیکەدا وەزیری رێپێدراو سەرپشک بکرێ بۆ هەمان مەبەست قسە لەگەڵ سەفارەتی سۆڤیەتی لەتاران بکات[٢١].

بەرپرسە ئێرانییەکان هەستیان بە مەترسییەکی زۆر کرد، لەبەرئەوەی بارزانی و پیاوەکانی لە کوردستانی ئێران بوون، لە کاتێکدا ئەو ناوچەیە گۆڕانکاری بە پەلەی ئەوتۆی بەخۆیەوە دەدیت، کە گەف و گوڕی تێکدانی پەیوەندییەکانی لەگەڵ حکوومەتی ناوەندی لە تاران دەکرد، لەگەڵ ئەوەی ئارەزوویان لە دەرکردنی بارزانی بۆ دەرەوەی سنووریان هەبوو، بەلام لەهەمان کاتدا، هەوڵی ئەوەیان دەدا ئەو بوونەی بارزانییەکان لەوێدا وەکو لاپەڕەیەکی پاڵەپەستۆ بەکاری بهێنن بۆ گرەوکردن لەگەڵ حکوومەتی عێراق لەکاتی گفتوگۆکانی نێوانیاندا. ئەو زانیارییانەی لە نووسراوی رێپێدراوی پاشایەتی عێراقیدا لە تاران بۆ وەزارەتی دەرەوە هاتووە پشتگیری ئەو بیروبۆچوونە دەکات.

بەپێی بیروڕای وەزیری رێپێدراو لە تاران، دەسەلاتەکانی ئێران ئارەزوویان لە هێشتنەوەی بارزانی وەکو بارمتەیەک لە دەستیان هەبوو. لە بەرامبەر ئەوەشدا گەڕاندنەوەی حەمە ڕەشید خانی شۆڕشگێڕ[٢٢] دوای ئەوەی لە جووڵانەوەکەیدا[٢٣] سەرنەکەوت پەنای بردە بەر عەردی عێراق، دەسەلاتەکانی ئێران دەیانویست بەدەستیانی بدەنەوە[٢٤].

## رۆڵی مەلا مستەفای بارزانی لە مەهاباد

لە کۆتایی هاوینی ساڵی ١٩٤٥ دا شاری مەهاباد ببووە سەنتەرێکی سەرەکی چالاکییەکانی جووڵانەوەی نەتەوەی کورد، (کۆمەڵە) کاریگەرییەکی زۆری لە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی ئەو شارەدا دەست پێ کردبوو، دەسەلاتەکانی حکوومەتی ناوەندی بەشێوەیەکی بەرچاو بێ هێز ببوو. لە کاتێکدا بوونی سۆڤیەتییەکان لە باکووری ئێران بەشدارییان لە ئامادەکردنی بارودۆخەکان کرد، بۆ دامەزراندنی دوو کۆماری شێوە ئۆتۆنۆمی لە ئازەربایجان و[٢٥] کوردستاندا[٢٦].

لە (٢٢)ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٦دا قازی محەمەد کەسایەتی ناسراوی کورد لە گۆڕەپانی چوارچرا لە مەهاباد دامەزراندنی کۆماری مەهابادی راگەیاند. لە بەشی زۆری ئەو بیروبۆچوونانەی لەبارەی کۆماری کوردی نووسراون دامەزراندنی کۆمارەکە دەگەڕێتەوە بۆ گەورەبوونی هەستی نەتەوایەتی کوردان، کە ئارەزوویان لە هێنانەدی ئامانجەکانیان بۆ دروستکردنی قەبارەیەکی نیشتمانی کورد هەبوو هەتا ئەگەر شێوەی سەربەخۆیش بێ، لە پاڵ ئەوەشدا رق و کینە و وەڕسی خەڵک دژ بە سیاسەتی شۆڤێنی حکوومەتی ناوەندی لە تاران پەرەی سەندبوو، هەروەها پشتگوێ خستنی بە ئەنقەستی داوا رەواکانی هاوولاتیانی کوردستان.

سەرۆک خێڵەکان لە پاڵ توێژە رۆشنبیرە تازە پێگەیشتووەکان رۆڵێکی گرنگیان لە پێکهاتەی وەزارەتەکان و ئاراستەکردنی رووداوەکانی کۆمارە ساواکە دەگێڕا.

ئەوەش بە ئاشکرا لە (وەزارەتی شەڕ) بەدیارکەوت، کە کوڕی مامی قازی محەمەد، کە ناوی سەیفی قازی بوو بەڕێوەی دەبرد، کە بەردەوامی لەگەڵ سەرۆک هۆزە دەستڕۆ بووەکانی وەکو، شکاک و هەرکی لە پەیوەندیکردندا بوو، وەکو لە پێشەوە باسمان کرد عەشیرەتی بارزانی بەسەرۆکایەتی مستەفا بارزانی رۆڵێکی گرنگ و ترسناکیان لەو مەیدانەدا گێڕا.

وەکوو ئاماژەمان بۆ کرد بارزان مێژوویێکی رەنگینی لە بەرپاکردنی

راپەڕین دژ بە حکوومەتی ناوەندی بەغدا هەبوو، هەروەها مستەفا بارزانی وەکو سیاسەتمەدارێکی زیرەک و پێشمەرگەیەکی خاوەن ئەزموون، ڕۆڵێکی کاریگەری زۆر گرنگی وەکوو سەرکردەیەکی سەربازی بالادەست لە کۆمارەکەدا گێڕا.

دەتوانین لەو ڕۆڵەی بارزانی دڵنیابین لەمیانەی دامەزراندنی بەسەرکردەی بەرەی خواروو و[٢٧] بەرەی سەقز، کە یەکێک بوو لە گرنگترین بەرەکان، هەروەکوو بەڵگەنامە عێراقییەکانیش ئاماژەی بۆ دەکەن روتبەی ژەنەڕاڵی پێ بەخشرا[٢٨].

هێزی بارزان کە بەسەرکردایەتی بارزانی بوو ڕۆڵێکی گرنگی گێڕا لە رووداوە و پەرەسەندنە سەربازییەکاندا چ لەسەردەمی کۆمارەکەدا چ لە ڕۆژە ڕەشەکانی رووخان و کارەساتەکانی بە دوایدا هاتن.[٢٩] هەواڵی بارزانییەکان بەتایبەتی سەرکردەکەیان جێگای تێڕامان و بەدواداچوونی بەردەوامی دبلۆماتە عێراقییەکانی تاران و شارەکانی دیکەی ئێران بوو. وەکوو راپۆرتی دبلۆماتە عێراقییەکان ئاماژەی بۆ دەکەن، چوونە ریزی هێزی بارزانی بۆ پاڵ سوپای مەهاباد و، بەشداریکردنیان لەو کورتە شەڕانەی لەگەڵ سوپای ئێرانی روویان دەدا، "پەیوەندییەکی بەهێزی بە جووڵانەوەی کوردەوە هەبوو" (واتە ئامانجەکانی نەتەوەی کورد- ف.س)[٣٠] هەروەها راپۆرتەکە باسی لە مەترسییەکانی یەکبوونی هەوڵی کوردی دەکات و ئارەزوویان بۆ کۆنترۆڵکردنی خوارووی کوردستان، بۆ ئەوەی کۆنترۆڵی سنووری نێودەوڵەتی ئێران و عێراق و ناوچەکانی باکوور، ناوەڕاست بکەن، چونکە کوردەکان لە سنووری هەردوولا هەن و، بۆ ئەوەی بتوانن پەیوەندی بە وڵاتی کوردەکانی کەوتوونەتە ناو پاشایەتی عێراقەوە بکەن.[٣١] لەهەمان کاتدا بەڵگەنامەکانی عێراق زۆر لە زانیاری دیکەشی لەخۆ گرتبوو لەبارەی دەستڕۆیشتنی زیاتری بارزانی، کە رۆژ لە دوای رۆژ پەرەی دەسەند.

هەروەکوو لە بەڵگەنامەیەکی عێراقیدا هاتووە، کە لە سەرچاوەکانی ئێرانی لە مەهابادەوە وەریگرتووە، کە بارزانی "هەمان جێگا و مەقامی قازی محەممەدی وەرگرتبوو"[٣٢] بەڵگەنامەکە لەبارەی ئەو بابەتە لەوە زیاتریشی تێپەڕاندبوو، تا ئەو رادەیەی لە دەقەکەیدا هاتووە: "قازی محەممەد لە مەودوا (ئەوکات) لە پشت پەردەوە ون دەبێ"[٣٣].

بەپشت بەستن بەهەمان بەڵگەنامەوە، هۆی ئەو شوێنە تایبەتییەی کە بارزانی هەیبوو دەیگەڕاندەوە بۆ دەستڕۆیشتنی زۆری بارزانی لە نێوان کوردەکانی ئێران و عێراق و تورکیاوە[٣٤] دەستڕۆیشتنی مەزنی بارزانی و ئەو پاڵپشتییەی، کە بۆی دەکرا وایان لێکدەدایەوە ئەمە "هەولێکە بۆ جێبەجێکردنی پلانی نوێی بارزانی لە هەریەک لە عێراق و تورکیا"[٣٥] دڵەڕاوکێ و هەستکردن بە مەترسییەکی راستەقینە لەو بیروڕایانەدا رەنگ دەدەنەوە، ئەویش پەیدابوونی مەترسی هەوڵە نەتەوەییەکانی کورد لە دابینکردنی بیری یەکگرتنەوەی نیشتمانە بەشبەش کراوەکەیان.

لە ناو بەڵگەنامە عێراقییەکاندا، بەڵگەیەکی زۆر هەیە، پشتیوانی ئەو رایە دەکەن لەبارەی ڕۆڵی کاریگەری بارزانی و ئەو هێزەی لەگەڵیدا بوون، ئەوەش تەنیا رای دبلۆماتەکانی عێراق لە ئێران نەبوو، بەڵکو رای سەرکردە و بەرپرسە ئێرانییەکانیشی گرتەوە، لە نووسراوێکی نهێنی و بەپەلەی ڕێپێدراوی پاشایەتی عێراق لە تاران، کە بۆ وەزارەتی دەرەوەی رەوانە کردووە بە ناونیشانی (هەواڵی بارزانییەکان) هەڵسووڕێنەری فەرمانەکانی عێراق دەڵێ: "حکوومەتی ئێران وا دەبینێ، کە بەشێکی زۆری هێزی قازی محەممەد دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پشتگیرییەی مەلا مستەفا و هێزەکانی پێشکەشی دەکەن" ، بیروڕای حکوومەتی ئێرانی لەسەر ئەو بیرۆکەیە بنیات نرابوو، ئەویش ئەوە بوو: "دابڕینی قازی محەممەد لەو هێزە، بەسەرکەوتووترین فاکتەری رووخانی کەسایەتی قازی محەممەد دادەندرێت، بەتایبەتی حزبی دیموکراتی، کە خۆی سەرکردایەتی دەکرد"[٣٦].

پێش وەخت ئەوە دابنێ کە حکوومەتی ئێران دەتوانێ درز بخاتە نێوان قازی محەممەد و خێڵە کوردەکانی باکوور، کە هاوپەیمانی قازی محەممەد بوون و پاڵپشتیان دەکرد، پاشان لەو مەیدانەدا

سەرکەوتوو بوو، بەڕای ئەوان قازی محەممەد هیچ حیسابێک بۆ ئەو خێڵانە ناکات، بەڵام ئەوان لەدەست وەشاندنی هێزەکانی مەلا مستەفای بارزانی دەترسان، کە ئەو هێزانە تەنیا پەیڕەوی فەرمانەکانی بارزانییان دەکرد.[37] هێنانەدی ئەو ئامانجەش تا ڕادەیەکی زۆر پشت بە دوورخستنەوەی ئەو هێزە (هێزە یاوەرەکەی بارزانی) لە ئێرانەوە دەبەستێ"[38] لەمەڕ دوایین برگەوە دبلۆماتە عێراقییەکانیش لە ئێران هاوڕایان بوون، وایان چاوەڕوان دەکرد بۆ گەیشتن بەم ئامانجە پێویستە چ بەهێز چ بە نەرمی کار بۆ ئەم مەبەستە بکرێ، چونکە دوورخستنەوەی بارزانی لە قازی محەممەد ئامانجێکی دوو لایەنە دەپێکێ بۆ هەردوو حکوومەتی ئێران و عێراق.

سەبارەت بەوەی یەکەمیان نەهێشتنی هێزی بارزانی و پاڵنان و دوورخستنەوەی لە ئێران واتە: نەهێشتنی شان و شەوکەتی قازی محەممەد لەلای رووسەکان (سۆڤیەتەکان)[39].

بەو باوەڕەی، کە سۆڤیەتەکان سەرچاوەی پاڵپشتی کردنی سەرەکی قازی محەممەد و حکوومەتەکەی بوون، ئەوە بیروڕای حکوومەتی ئێران و هەروەها دەوڵەتەکانی دیکەی هاوسێی ئێران بوو، بەڵام سەبارەت بە حکوومەتی عێراقەوە، دیارە لەو دەترسا، کە بارزانی و پیاوەکانی لەکوردستانی ئێراندا لە داوڕۆژدا ببنە هۆی یەکبوونی کوردەکان، پێ بەپێ یەکێتییەک پێکبهێنن و، لە ئایندەدا جمووجوڵی دوژمنکارانە دژ بە پاشایەتی عێراق و تورکیا ئەنجام بدەن لە پێناو داواکردنی سەربەخۆییان[40]، دبلۆماتە عێراقییەکان گومانەکانی خۆیان لە هێنانەدی ئەو ئامانجەیان نەشاردەوە، ڕووداوەکانی دواییش ئەوەی سەلماند، کاتێ بارزانی و پیاوەکانی لە چرکەکانی دوایی ڕووخانی مەهاباد شان بەشانی قازی محەممەد مابوونەوە. دەتوانین ئاماژەش بۆ ئەوە بکەین، کە مەترسییەکانی عێراق لەبارەی ئەو مەسەلەیە شێوەی دیکەی بەخۆیەوە گرتبوو.

دبلۆماتە عێراقییەکان لە تاران و شارەکانی دیکەدا بەپێی توانا هەوڵیان دا بوونی مەلا مستەفا لە کوردستانی ئێران بە مەترسییەکی بەرچاوی دابنێن، لە هەموو دانیشتنەکانیاندا لەگەڵ بەرپرسە ئێرانییەکاندا، ئەو دبلۆماتانە لە هەڵنەنگاندنی ئەو مەترسییە لەسەر ئێرانییەکاندا زێدەڕۆییەکی زۆریان کرد.

شێوازی هاندانی حکوومەتی ئێران بۆ ئەوەی ڕێکارەکانی تەمبێکردنی بارزانییەکان بگرێتەبەر، ئەو مەسەلەیە هەڵوێستی (قوام السلطنة)[41] سەرۆک وەزیرانی ئێران لێکدەداتەوە، لەوکاتەی بۆ جاری یەکەم چاوی بە قازی محەممەد کەوت لە تاران، هانی دا بۆ ئەوەی کوردە بیانییەکان دووربخاتەوە، کاتێ بەنوێنەریی چوونە مەهاباد، ئەوەش مەرجی سەرەکییان بوو بۆ هەر ڕێککەوتنێک لەگەڵ حکوومەتی مەهاباد و[42] کۆماری ئازەربایجان[43]، ئەو کوردە بیانییانە، بارزانییەکان بوون، کە لە کوردستانی عێراقەوە هاتبوون، ئەوەش ئەوە دەگەیەنێ، کە بارزانی و هاوڕێکانی لە کوردستانی ئێراندا ڕەگەزێکی گرنگیان لە گۆڕەپانی سیاسی و سەربازی پێک هێنابوو، ئەوەش شێوەیەکی تایبەتی لە مەهاباد دروست کردبوو، کە بەسەرەدەمێکی دژوار لە مێژووی کوردی نوێ دادەندرێت، جێگای تێڕامانی پتر بوو لەبەر ڕووداوەکانی.

هیچ هاتن و چوونێک لە هەواڵی مەلا مستەفا بارزانی و پیاوەکانی نەمابوو جێگای بایەخی ڕاپۆرتەکانی دبلۆماتە عێراقییەکان نەبێت، تەنیا بایەخیان بەلایەنی سیاسی و سەربازی بارزانییەکان لە مەهاباد نەدەدا، بەڵکو بچووکترین دەنگوباسەکانی ژیانی ڕۆژانە و شێوازی ژیانیانی دەگرتەوە. لە یەکێک لە ڕاپۆرتەکانی کونسوڵی عێراق لە کرمنشاوە زانیاری پتری لەبارەی بارودۆخی بارزانییەکان داوە، بۆ وێنە ڕاپۆرتەکە ئاماژە بۆ ئەوەی دەکات "مەلا مستەفا لە بارێکی زۆر خراپدایە و، نەخۆشی گرانەتا (تایفۆئید) لە نێو پیاوەکانیدا بڵاوبۆتەوە، پێویستییەکی زۆریان بە خۆراک و ئازووقە هەیە"[44].

هەروەها ئەو کونسوڵە لە ڕاپۆرتەکەیدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکا، کە هەندێک لە پەیڕەوانی بارزانی ئەگەر لە وڵاتی خۆیان کەمێک هەست بەدڵنیایی بکەن ئارەزووی گەڕانەوەیان هەیە[45].

بەگەڕانەوە بۆ بەڵگەنامەکانی عێراق دەبینین زۆر ئاماژە بۆ ئەوە کراوە شێخ ئەحمەد لەگەڵ چەند خێزانێکی بارزانی ئارەزووی گەڕانەوەی بۆ عێراق هەبووە، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو گەڕانەوەیە مەترسییەکی زۆری دێتە ڕێگا، لەبەر ئەو حوکمانەی لەلایەن دەسەڵاتەکانی عێراقدا بەسەریاندا سەپابوو، ئەو ڕاپۆرتانە هۆی ئەو گەڕانەوەیە بەوە لێکدەدەنەوە، کە ئەو بارزانییانە ناتوانن بەو ژیانە خراپە بژین، چونکە لە ماڵ و حاڵی خۆیان لە عێراقدا بەتێروتەسەلی دەژیان[46].

لە زانیارییەکانی ئەو ڕاپۆرتەدا بەدیاردەکەوێ. کە کوردەکانی ئێران کاروباری بژێوی بارزانییەکانیان گرتبووە ئەستۆ، ئەویش (نەمرو نەژین) بوو[47] و دامرکاندنەوەی گەدەیان بوو[48].

پێداگرتنی شێخ ئەحمەد بۆ گەڕانەوە بۆ عێراق، وای لە دبلۆماتەکانی سۆڤیەت کرد، کە هەوڵ بدەن شێخ ڕازی بکەن واز لە بیرۆکەی گەڕانەوە بهێنێ و بگەڕێتەوە بۆکان، کە هەر لە ڕۆژی پەنابەرییەکەی بۆ ئێران لێی نیشتەجێ ببوو، نوێنەرەکانی سۆڤیەت لە ئازەربایجان یەکسەر دەستیان کرد بەکارکردن بۆ کەمکردنەوەی ئەو ئێش و ئازارانەی کە ببووە هۆی بێزاربوونی بارزانییەکان، بۆیێ ئازووقە و پارەیان بەسەردا دابەش کردن. لە میانەی مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٦ ئەو یارمەتییانە گەیشتە بڕی ١٠ تەن شەکر (٥٠٠) تۆپە قوماش و (١٢) ئۆتۆمبێلی لۆری لەگەڵ (١٠٠٠٠٠ تومەن)[49].

وەزیری ڕێپێدراوی عێراق لە تاران گوتی: "بەشی زۆری ئەو بارزانییانەی لە ئێران بوون متمانەیان بە یارمەتییەکانی رووسی (سۆڤیەتی) نەبوو، چونکە پێیان شتێکی کاتی بوو" دەسەڵاتەکانی سۆڤیەت کاتێ زانییان شێخ ئەحمەد و پەیڕەوانی بڕیاریان داوە بگەڕێنەوە بۆ عێراق[50] دەربەست بوون ئەو یارمەتییانەیان بۆ دابین بکەن. گومان لەوەدا نییە لە بایەخدانیان بە مەلا مستەفا و ئەو هێزەی لەگەڵیدا بوو لە ئێران بەڵگەی تایبەتی خۆیان بەدەستەوە بوو، سۆڤیەتییەکان بە تەواوتی لەو باوەڕەدابوون، کە بارزانی یاریزانێکی سەرەکی گۆڕەپانی کوردانە لە مەهاباد، هەروەها هەستیان بە دڵەڕاوکێی بەریتانییەکان لە پەنای ئەوانیشەوە عێراقییەکان کردبوو، کە دڵخۆش نەبوون بە مانی بارزانییەکان لە ئێراندا، بۆیە سۆڤیەتییەکان هەوڵی ڕاکێشانی مەلا مستافایان بۆ لای خۆیان دەدا، بۆ ئەوەی کار لە سیاسەتی بەریتانییەکان لە عێراقدا بکەن، هەروەها ترسی ڕەنگدانەوەی بارودۆخی کوردستانی ئێران لەسەر بارودۆخی کوردستانی عێراقیش لە گۆڕێدابوو، بۆیێ سۆڤیەتییەکان دەستبەرداری ئەو وەرەقەیە نەدەبوون، کە بردنەوەکەی مسۆگەر بوو، لە کاتێکدا لە هەوڵی بەردەوامدا بوون شوێن پێی ستراتیژی و سیاسی خۆیان لە ئێراندا لە سایەی ئەو ئاڵۆزییە نێو دەوڵەتییەی ئەوکات قایم بکەن. بەتایبەتیش لە پەیوەندییەکی کێبڕکێدا بوون لەگەڵ بەریتانی و ئەمریکییەکاندا.

هەر لەو کاتەوە کە مەلا مستەفا چووە مەهاباد حکوومەتەکانی ئێران و عێراق کەوتنە مەترسییەوە، ئەو مەترسییەش بەردەوام بوو تاوەکو رووخانی کۆمارەکە و گەڕانەوەی حکوومەتی ناوەندی بۆ کوردستانی ئێران، بەڵکو بارزانی وەکو مەترسییەک لەبەرچاویان گەورە دەبوو، وەکو گۆڕانکارییەکانی دواتر ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێ.

## گفتوگۆکانی ئێران لەگەڵ مەلا مستەفای بارزانی

کۆتایی ساڵی ١٩٤٦ پێشبینی ڕووداوی گەورەی لێ دەکرا، دوای ئەو مانۆڕە توندانەی کە (قوام السلطنة) کردی ئازەربایجان رووخا و، پاڵپشتی نەکردنی سۆڤیەتییان لە کورد و ئازەرییەکانی مسۆگەر کرد، لە کاتێکدا لە دژ بە حکوومەتی ناوەندی دەجەنگان. کاتێکی زۆر بەسەر ئەو ڕووداوە بەپەلانەی ئازەربایجاندا ڕەت نەبوو، تاوەکو کوردستانیشی گرتەوە. لە ١٧ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٦ سوپای ئێران چواردەوری شاری مەهابادی گرت، دوای خۆ بەدەستەوەدانی قازی محەممەد و پیاوانی حکوومەتەکەی، حەملەیەکی داپلۆسینی دڕندانە دژ بەکوردەکان دەستی پێکرد، بۆ ماوەیەکی کورت وا دیار بوو کە تاران دەسەڵاتی خۆی بەسەر کوردستاندا سەپاندووە، بەڵام لە ڕاستیدا وا نەبوو، چونکە لەگەڵ

ئەوەی حکوومەت هێرشێکی وردی چەککردنی خەڵکی دەست پێکرد، عەشیرەتە کوردەکانی پێ چەک نەکرا و ئەوانیش چەکیان دانەنا، گیروگرفتی لەوەش گەورەتر ئەوەبوو، کە رووبەڕووی سوپای ئێرانی ماندوو و پەرپووتیش لە چەک و تفاق بووەوە، ئەویش چەک دانەنانی بارزانییەکان بوو و، رازی نەبوون ئەو چەکانەیان بە سوپای ئێران بدەن، سوپاکەی ئێرانیش خۆی لە رووبەڕووبوونەوەی ئەو هێزە گەورەیەی بارزانییەکان دەپاراست، لەجیاتی ئەوە دەسەڵاتەکانی ئێران هەوڵیان دا بەشێوەیەکی ئاشتییانە کۆتایی بەو مەسەلەیە بهێنن، هەر بۆیێ نوێنەری تایبەتی خۆیان رەوانەی مەهاباد کرد بۆ ئەوەی چاوی بە بارزانی بکەوێ، کونسوڵی عێراق لە تەورێزدا گوتی: "بە چاکی و نەرمی مامەڵە یان لەگەڵ بارزانییەکاندا دەکرد، هەریەکە (١٠) تومەنیان بەسەردا دابەش کردن و نیمچە ئازاد بوون"(٥١).

لە ٢٠ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٦ دا مەلا مستەفا نامەیەکی ئاراستەی سەرکردەی هێزەکانی ئێران لەکوردستان ژەنەراڵ هەمایۆنی کرد، تیایدا مەرجەکانی خۆبەدەستەوەدانی بۆ حکوومەتی ئێران خستەڕوو.

ژەنەراڵ هەمایۆنیش بۆ کەمکردنەوەی کات و نامە گۆڕینەوە و، بەو باوەڕەی مەسەلەی گفتوگۆکردنی لەگەڵ بارزانییەکان لەوە ئاڵۆز و گەورەترە خۆی رایپەڕێنێ، بۆیێ پێویست بەوە دەکات پەیوەندی راستەوخۆ بکەوێتە نێوان بارزانی و دەسەڵاتەکانی حکوومەت لە تاران، بۆیێ سەرۆک بارزانی و چەند پیاوێکی رەوانەی تاران کرد(٥٢).

مەلا مستەفا گەیشتە تاران، لەو گفتوگۆیانەی، کە لەگەڵ ئێرانییەکاندا کردی، مەرجەکانی خۆ بەدەستەوەدانی خستە بەردەمیان: کە پێویستە حکوومەتی ئێران رەزامەندی حکوومەتی عێراق وەربگرێ بۆ دەرکردنی لێبووردنی گشتی لە بارزانییەکان و سەرکردەکانیان، خۆ ئەگەر حکوومەتی عێراق ئەو پێشنیازەی رەت کردەوە، دەبێ حکوومەتی ئێران لەخاکی خۆیان لەو شوێنەی خۆیان هەڵی دەبژێرن نیشتەجێیان بکەن(٥٣).

لە راستیدا حکوومەتی ئێران نەیدەویست لەگەڵ بارزانییەکان رووبەڕووی یەکتر ببنەوە، بەڵکو پێیان خۆشبوو بگەنە چارەسەرێک هەموو لا پێی رازی بن، باشترین رێگاش بۆ ئەم مەسەلەیە، رازیکردنی حکوومەتی عێراق بوو. بۆ گەڕانەوەی بارزانییەکان و دوای دەرکردنی لێبووردنی گشتی لێیان، لەهەموو گفتوگۆکانی نێوان بەرپرسە ئێرانییەکان و دبلۆماتە عێراقییەکان لە تاراندا، داوایان لێ دەکرد رازی بن لەسەر گەڕانەوە و دەرکردنی لێبووردن، بەڵام رووبەڕووی رازی نەبوونی حکوومەتی عێراق دەبوونەوە، بەڵکو رێپێدراوی عێراق لە تاران یاداشتێکی توندوتیژی ئاراستەی وەزارەتی دەرەوەی ئێران کرد لەبارەی بابەتەکە، بۆی روون کردنەوە، کە حکوومەتی عێراق ناتوانێ لێبووردن بۆ بارزانییەکان دەربکات و، چەند جارێک داواکارییەکانی دووبارە کردنەوە بۆ بەندکردنیان و دواجار وەزارەتی دەرەوەی عێراق پەڕاوی گەڕاندنەوەدیان بۆ رەوانە دەکات(٥٤).

لە دوای ئەوەی وەزیری دەرەوەی ئێران چاوی بە هەڵسووڕێنەری کاروباری عێراق لە تاران کەوت، جەختی لەسەر دەرکردنی لێبووردن لە بارزانییەکان کردەوە، وەزیری ئێران پەیمانی دا، کە حکوومەتەکەی بەڵێننامەیەکی نووسراو بۆ حکوومەتی عێراق رەوانە بکات، کە مەلا مستەفا و براکەی و پەیڕەوانی یاخیبوون دژ بە حکوومەتی عێراق بەرپا نەکەنەوە، لە بەرامبەر ئەوەشدا مەلا مستەفا و لایەنگرانی هەمان بەڵێننامەی نووسراو لەبەردەم نوێنەری حکوومەتی ئێران مۆر بکەن.(٥٥) هەروەها حکوومەتی ئێران پەیمانی دا سنووری خۆی دابخا و ئەگەر بارزانییەکان دیسان ئاژاوە و یاخیبوونیان بەرپا کرد نەیەڵێ بێنە ناو خاکی ئێرانەوە(٥٦).

وەزیری دەرەوەی ئێران لە بەغدا ئەو بەڵێنانەی گەیاندە بەرپرسەکانی وەزارەتی دەرەوەی عێراق، بەڵام هەوڵی ئێرانییەکان لەو مەیدانەدا بەرازی نەبوون وەڵام درایەوە، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی بە لێبووردنی بارزانییەکانەوە هەبوو.(٥٧) لەگەڵ ئەوەشدا بەرپرسە ئێرانییەکان لە هەوڵەکانیاندا بەردەوام بوون، بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە و رەزامەندی هەردوو لا ئێران و عێراق وەدەست بێنێ، هەر لەو مەیدانەدا وەزیری

دەرەوەی ئێـــران لەگـــەڵ وەزیری ڕێپێـــدراوی عــێـــراق لە تاران کۆبوونەوە، هەمان پێشنیازەکانی پێشووی خستە بەردەمی وەزیری ئێران ئەو مەترسییانەی روون کردەوە کە لە ئەنجامی رازی نەبوونی حکوومەتی بەرپا دەبێت، خۆ ئەگەر حکوومەتی عێراق هەر پێ لەسەر ئەو رایەی خۆی دابگرێ، بەپێی بیروڕای ئەو وەزیرە حکوومەتی ئێران لە نێوان دوو خاڵی گرنگدا سەرپشک دەبێ: یان دەبێ قبووڵی داوای بارزانییەکان بکەن، کە بەپێی مەزەندەی ئێرانییەکان دە هەزار کەس دەبن. ئەویش بە نیشتەجێکردنیان لەخاکی ئێران لە دواییشدا دەبێ رەگەزنامەی ئێرانییان پێ بدرێ، بە ئارەزووی خۆشیان زەوییان بۆ دەستنیشان بکرێ، کە ئەویش بە حکوومەتی ئێران قبووڵ ناکرێ، لەبەر ئەو پەیوەندییە بەتین و برایانەیەی لەگەڵ عێراق بە یەکیان دەبەستێتەوە[٥٨].

خۆ ئەگەر بە خاڵی یەکەم رازی نەبن ئەوکاتە حکوومەتی ئێران دەربەست دەبێ بارزانی و پەیڕەوانی بەهۆی هێزی چەک بگەڕێنێتەوە، ئەگەر مەسەلەکە وا بخوازێ، هەروەها وەزیرەکە گوتی: "بۆ هێنانەدی ئەو مەبەستە پێویستیمان بە یارمەتی سوپای عێراق هەیە، بەڵام کاتێک بە بیری هاتەوە گوتی: ئەو خاڵەی دوایی بارگرانییەک بۆ هەر دوو حکوومەت ئێران و عێراق دروست دەکات، ئەوەش ئاڵۆزی و گیروگرفتێکی بێ ژمارە دەنێتەوە"[٥٩] هەروەها وەزیری ئێران لە هەمان چاوپێکەوتندا ئەوەی خستە بەردەم دبلۆماتی عێراق، کە حکوومەتی ئێران ئامادەیە بۆ گێڕانی رۆڵی پێناویەتی و دەوری پیاوچاک وەربگری (لە کاتێکدا ئەگەر حکوومەتی عێراق لێبووردن بۆ بارزانییەکان دەربکات، بەو مەرجانەی کە حکوومەتی عێراق بەسەریاندا دەیسەپێنێ، هەرچەندە توندیش بن)[٦٠] [٦١] لە چاوپێکەوتنێکی دیکەدا لەگەڵ وەزیری ڕێپێدراوی عێراق، جارێکی دیکە وەزیری دەرەوەی ئێران جەختی لەسەر ئارەزووی وڵاتەکەی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی بارزانییەکان کردەوە، هەروەها باسی لەوە کرد، کە "مەلا مستەفا و پەیڕەوانی ئامادەن بۆ پێشکەشکردنی داواکارییەکی بەزەیی پێداهاتنەوە لە لایەن خاوەن شکۆ (وەسی) لەسەر عەرشی عێراق" بەهۆی حکوومەتی ئێرانەوە، بانگەشەی ئەوەشی کرد کە "داواکاری بەزەیی پێداهاتنەوەکە بەپێی بیر و بینینێک ئامادەکراوە، کە حکوومەتی عێراق پێی رازی دەبێ"[٦٢] لە لایەنی عێراقیشەوە بەرپرسەکانی وەزارەتی دەرەوەی بەغدا جەختیان لەسەر ئەوە کردەوە، کە پێویستە دبلۆماتە عێراقییەکان لە تاران، بایەخی بوونی بارزانییەکان لە ئێران کەم بکەنەوە و بانگەشەکردن بۆ راپەڕین و چالاکییەکان تەنیا "لە کاری خراپەکاری دزی و ڕێگری بەولاوە هیچی دیکە نییە و هیچ پاڵنەرێکی سیاسی لە دواوە نییە، وەکو داواکردنی سەربەخۆیی و هاوشێوەکانی"[٦٣]، وەزیری دەرەوە بە وەزیری ڕێپێدراوی عێراقی لە تاران ڕاگەیاند: پێویستە بە بیری ئێرانییەکان بێننەوە: کە ژمارەی بارزانییە پەنابەرەکانی ئێران لە (٣٠٠) کەس تێپەڕ ناکات و، (١٠٠٠٠) کەس نین وەکو وەزیری دەرەوەی ئێران گوتبووی[٦٤]. بەتوندی جەختی لەسەر ئەوە کرد[٦٥] "ئەو کارانەیان سێ جار دووبارە بووەتەوە"[٦٦]، بۆیە حکوومەتی عێراق ناتوانێ لێیان خۆش بێت، وەزیری دەرەوە بەتوندی باسی لەوە کرد، کە دەبێ بارزانییەکان بەپێی ڕێککەوتنی (گەڕاندنەوەی تاوانباران)، کە لە نێوانماندا مۆرکراوە بۆمان بگەڕێننەوە، وەزارەتی دەرەوەی عێراق پێشنیازی کرد، لە حاڵەتێکدا ئەگەر حکوومەتی ئێران پێ دابگرێ لەسەر بەدەستەوە نەدانەوەی بارزانییەکان، دەبێ دووریان بخاتەوە بۆ سنووری ئەفغانستان یان بلوجستان[٦٧] دوور بکرێنەوە لە سنووری عێراقەوە[٦٨].

لە ڕاستیدا ئێرانییەکان بیروبۆچوونی تایبەتی خۆیان بەرامبەر بە بیروڕای عێراقییەکانەوە هەبوو، بەپێی رای وەزیری دەرەوەی ئێران، کە بە وەزیری ڕێپێدراوی عێراقی لە تاران گوتبوو، حکوومەتەکەی ناتوانێ بارزانییەکان بداتەوە دەست حکوومەتی عێراق، چونکە ڕێککەوتننامەی (گەڕاندنەوەی تاوانباران) لەسەر ئەوان پیادەناکرێ، چونکە ئەوان پەنابەری سیاسی و سەربازین، ئەوەش ئەوە دەگەیەنێ سیفەتی تاوانباری ئاسایی نایانگرێتەوە[٦٩]

هەروەها وەزیری ئێران ئەوەشی

روون کردەوە حکوومەتەکەی بارزانی و پیاوەکانی بە دیل دانانی (دیلی شەڕ- ف.س)، بەڵکو دەتوانن پێیان بڵێین پەنابەر بۆ ئەوەی بیانپارێزین، چونکە پەنایان بۆ حکوومەتی ئێران هێناوە و مەرجەکانی خۆ بەدەستەوەدانیان خستۆتە ڕوو، ئەگەر قبووڵیان نەکەین دەیانگەڕێنینەوە بۆ کوردستانی عێراق[٧٠].

ئەوەی کە زۆر جێگای هەڵوەستەیە لە گفتوگۆکانی وەزیری ئێران لەگەڵ دبلۆماتە عێراقییەکاندا، ئەوەبوو ئاگاداری کردنەوە لەو مەترسییانەی، کە لە ئەنجامی بەدەستەوەدانی بارزانییەکان بۆ حکوومەتی عێراق پەیدا دەبێ، هەروەها ئاماژەی بۆ ئەوە کرد، کە تەنیا ئەو هەنگاوە دەبێتە هۆی وروژاندنی هەستی نەتەوایەتی لە بەشەکانی دیکەی کوردستاندا، تەنانەت لەو دەوڵەتانەی جالییەی کوردی لێ نیشتەجێن دەوروژێنێ، بۆی هەیە ئەوەش پاڵیان پێوەبنێ بۆ ئەوەی دۆزەکەیان بۆ ڕێکخراوە نێو دەوڵەتییەکان بەرز بکەنەوە، "بە بەهانەی ئەوەی کە مەلا مستەفای بارزانی و یاوەرانی داوای مافی نەتەوایەتییان لە حکوومەتی عێراق کردووە" هەروەها وەزیرەکە پتریش لەسەری ڕۆیشت و گوتی: "بۆی هەیە کوردەکانیش ئەو هەلە بقۆزنەوە لە دوای ئەوانیشەوە هەندێ دەوڵەت[٧١] پروپاگەندە لە ڕۆژنامە و ڕادیۆ دژ بە حکوومەتەکەمان بڵاو بکەنەوە"[٧٢].

بەپێی ئەو برووسکە نهێنییەی، کە لە ڕێپێدراوی عێراق لە تارانەوە بۆ وەزارەتی دەرەوە لە بەغدا نێردراوە، دوای ئەوەی حکوومەتی ئێران هەموو ڕێگاکانی گرتەبەر لەگەڵ لایەنی عێراقدا بۆ لێبووردنی بارزانییەکان، رای حکوومەتی ئێران جێگیربوو لەسەر "ئەوەی خاوەن شکۆ شای ئێران پەیوەندی بە خاوەن شکۆ پاشا و وەلی عەهدی مەزن بکا"[٧٣] لە وەڵامی وەزارەتی دەرەوەی عێراقدا هاتووە، ئەو بابەتە پێویست بە دەرکردنی یاسایەکی تایبەت لەلایەن ئەنجومەنی نیابییەوە دەکات، بەهانەشیان ئەوە بوو، کە ئێستا ئەنجومەن گرێ نادرێ، ئەوەش مانای ئەوەیە حکوومەتی عێراق بە تەنیا ناتوانێ باس لە مەسەلەی لێبووردن بکات[٧٤]. وەزارەت جەختی لەسەر داواکارییەکەی پێشتری کرد، ئەویش "بەدەستەوەدانی گەورە پیاوانی بارزانی بەبێ هیچ کۆت و مەرجێک"[٧٥].

پێداگرتنی ئێران لەسەر کۆتایی هێنان بەگیروگرفتی بارزانییەکان، بەشێکی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی حکوومەتی ئێران بەتایبەتی سوپاکەی حەزیان لە ڕووبەڕووبوونەوەی ڕاستەوخۆ نەبوو لەگەڵ هێزێکی گەورە و چەکداری باش وەکوو هێزی بارزانییەکان، لە کاتێکدا ئێرانییەکان خەریکی ڕێکخستنەوەی کاروباری کوردستان بوون، بەتایبەتی دوای لەناوبردنی کۆماری مەهاباد، هەروەها بە بیروبۆچوونی حکوومەتی ئێران ئەو جۆرە ڕووبەڕووبوونەوانە، لە دژی ئەوەدا ئاگری هەستی نەتەوایەتی کورد خۆش دەکات، کە لە مەهاباد بە توندی خەنجەری لێدرا و، بۆی هەیە بارزانییەکان بخاتە جموجۆڵ و بەرەیەکی تازە لە دژیاندا بکاتەوە، لەلایەکی دیکەشەوە لەوە دەترسان، پێکدادان لەگەڵ مەلا مستەفا، جارێکی دیکەش سۆڤییەتەکان بێنێتەوە بۆ دەست خستنە ناو کاروباری ئێرانەوە. هەوڵدان بۆ ڕاکێشانی مەلا مستەفا بەلای خۆیاندا بۆ ئەوەی ببێتە هۆی نانەوەی گیروگرفتی نوێ بۆ حکوومەتی ئێران، ئەوەش پێچەوانەی ئەو (ڕاپۆرتە نهێنی و بەپەلەیە) بوو، کە هەڵسووڕێنەری کاروباری عێراق لە تاران ڕەوانەی کرد، کە بە هەڵە تیایدا هاتبوو، کە حکوومەتی ئێران سیاسەتێکی ئاشتیخوازانە بەرامبەر بە کورد چ کوردی وڵاتی خۆیان چ کوردە پەنابەرەکان بێت[٧٦] پەیرەو دەکات، لە پێناو جێبەجێکردنی ئارەزووی دەسەڵاتەکانی ڕووی (سۆڤیەت)[٧٧].

ئەو ڕەگەزەی کە زۆرترین بایەخی هەبوو لەو مەیدانەدا، ئێرانییەکان گەیشتنە ئەو باوەڕە، کە چارەسەرکردنی مەسەلەی بارزانییەکان، دەبێ پێش هەموو شتێک دانوستاندن لەگەڵ حکوومەتی عێراق بکەن، کە هەڵوێستی عێراق لەگەڵ هەڵوێستی حکوومەتی ئێران لەو بابەتەدا یەکتربڕ بوون، بەم شێوەیە بارزانییەکان بوون بە فاکتەرێکی سەرەکی لە دەسنیشانکردنی پەیوەندییەکانی لە نێوان ئێران و عێراق، ماوەی زیاتر لە ساڵ و نیوێک کە لەو ماوەیەدا لەکوردستانی ئێران مانەوە.

گومانیش لەوەدا نییە هەڵوێستی توندی عێراق هەندێکی بە پاڵپشتی

بەریتانیا بوو، هەرچەندە بەریتانییەکان سۆزی خۆیان بۆ داخوازییەکانی کوردان دەربڕی و دانیان بەو زوڵم و ستەمانە کرد، کە کورد بەدەستییەوە ئازاری چێشتووە، لەگەڵ ئەوەشدا لە کلاوڕۆژنەی بەرژەوەندییەکانی ستراتیژی ئابووری درێژخایەن لە عێراق و ڕۆژهەڵاتی ناویندا سیاسەتەکانی خۆیان بەرامبەر بە کورد پەیڕەو دەکرد، ترسی ئەوەشیان هەبوو، کە بۆی هەیە (پەتای شۆڕش) لە کوردستانی ئێرانەوە بگوازێتەوە بۆ کوردستانی عێراق، ئەوەش ببێتە هۆی ئەوەی بەرهەڵستی کردنێکی گەورە بەرامبەر بەریتانییەکان دروست ببێ، مەترسیدارترینیشیان ئەوەیە کوردەکانی عێراق لە پێناو هێنانەدی ئامانجەکانیان داوای یارمەتی لە سۆڤییەت بکەن، ئەو کاتە دەبنە ئامێرێک بۆ دابینکردنی پرۆژەکانی سۆڤییەت لەناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناویندا.

بە هەرحاڵ لەگەڵ بەسەرچوونی کات، دەسەڵاتەکانی تاران و مەلا مستەفا دەرگای دانوستاندنیان لە نێواندا داخست، ئەگەر بۆ ماوەیەکیش بێت، بەلام لە ئاسۆوە ڕووبەڕووبوونەوەیەکی نزیک بەدی دەکرا.

### سەرنەگرتنی گفتوگۆکان و ڕووکردنە توندوتیژی

بارزانی گەڕایەوە مەهاباد، خۆئامادەکردن بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ سوپای ئێران. لە کاتێکدا دبلۆماتە عێراقییەکان لە ئێراندا لە نزیکەوە بەدوای گفتوگۆکانی نێوان مەلا مستەفا و حکوومەتی ئێراندا دەچوون، زۆر بەوردی چاودێری جموجوڵەکانی سەرکردەی کوردیان دەکرد.

وەکوو لە برووسکەیەکی نهێنی ڕێپێدراوی عێراق بۆ وەزارەتی دەرەوەدا هاتووە، بەپێی بیر و بینینی ئێمە گەڕانەوەی بارزانی بۆ مەهاباد یان بۆ چەککردنە "چونکە پەیڕەوانی بارزانی بەبێ ئامادەبوونی بارزانی چەکەکانیان دانانێن" یان بۆ پەیوەندیکردنە بە هاوڕێکانی "بۆ ئەوەی لە کاتی توانەوەی بەفردا چالاکی دوژمنکارانە دژ بە عێراق ئەنجام بدەن"[78] هەر ئەوەش بەلای ڕێپێدراوەوە پەسندبوو.

دوای چەند ڕۆژێکی دیکە بەدیارکەوت کە بارزانییەکان چەکەکانیان بەدەستەوە نەداوە، بۆیێ سوپای ئێران بە دوایان کەوت لە چوونە ناو (بسوە) سەرکەوت و هێزی بارزانییەکان کشانەوە بۆ نەغەدە، دوایی سوپای ئێران نەغەدەیان داگیرکرد، گەڕانەوە بۆ شنۆ[79].

دوابەدوای ڕازی نەبوونی بارزانییەکان لە بەدەستەوەدانی چەکەکانیان، کۆبوونەوەیەک لە بارەگای تیپی چوارەمی ئێران لە مەهاباد گیردرا، سەرکردەی بارزانییەکان و کونسوڵی ڕووسی لە تەورێز ئامادەبوون.

لەو کۆبوونەوەیەدا هەموو سەرکردەکان پشتگیری پێشنیازی ئێرانیان کرد، ئەویش گەڕانەوەی بارزانییەکان بە چەکەکانیانەوە (جگە لە سەرکردە حوکمدراوەکانیان لە عێراقدا) بۆ عێراق. بڕیاردرا حوکمدراوەکان لە ئێران نیشتەجێ بکرێن[80].

وا دیار بوو تەنیا ڕێگایەک، کە لە بەردەمیاندا بێ گەڕانەوە بۆی هەیە تاکە ڕێگا بێت لەبەردەم مەلا مستەفا بۆ ئەوەی تووشی ڕووبەڕووبوونەوەی سوپای ئێران نەبێت.

بارزانییەکان دەستیان کرد بە کشانەوە لەبەردەم هێزەکانی ئێران، بەبێ بەرگریکردن بەرەو ڕۆژئاوا و سنووری عێراق، خێزانەکان و سەرکردەکانیان بارزانیشیان لەگەڵدابوو، سەرکردەکانی بارزانییان بۆیە لەگەڵدابوو، بۆ ئەوەی تووشی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ سوپای ئێراندا نەبن، بڕیار وابوو سەرکردە ناوبراوەکان بگەڕێنەوە بۆ جێنشین بوون لە ئێران دوای ئەوەی ئافرەت و منداڵ و پیرەکان لە سنوور دەپەڕنەوە بۆ عێراق[81].

ئەو گۆڕانکاریانە حکوومەتی عێراقی ترساند، بۆیێ وەزارەتی دەرەوە برووسکەیەکی ئاراستەی هەڵسووڕێنەری کارەکان لە تاران کرد، بۆ ئەوەی یەکسەر پەیوەندی بە وەزارەتی دەرەوەی ئێران بکات بۆ جەختکردن لەسەر "پێویست بوون بەڕەوانە کردنەوەی بارزانییەکان یەکسەر بۆ عێراق یان چەککردنیان و دوورخستنەوەیان لە سنووری عێراق" و "زانیاری تەواو بەوەزارەت بدەن"، کە مانەوەی بارزانییەکان بەچەکەوە "زیانێکی گەورە بە عێراق دەگەیەنن و سەرئێشەش بۆ حکوومەتی عێراق پەیدادەکەن"[82] لەو کاتەدا بارودۆخی

کوردستانی ئێران بەگشتی و بارودۆخی بارزانییەکان بەتایبەتی جێگای بایەخی تایبەتی نێردراوی ئەمەریکییەکان بوو لە ئێراندا[83].

لە کۆتایی مانگی ئاداری سالی ۱۹٤۷ کونسولی ئەمەریکا لە تەوریز گەشتێکی بەناو کوردستاندا کرد و دوو رۆژی خایاند و پەیوەندی بە ژمارەیەک سەرۆک خێلی کوردەکان کرد، هەروەها کونسولی عێراق لە تەوریز رایگەیاند دوای ئەوەی کونسولی ئەمەریکا لە گەشتەکەیدا گەراوەتەوە سەردانی کردووە.[84] کونسولی ئەمەریکی لە گفتوگۆکردنیدا لەگەل کونسولی عێراق وەسفی پەیوەندی نێوان کوردی ئێران و حکومەتی ناوەندی کردووە "، کە لەسەر باوەر بەیەک بوونی هەردوولا دانەمەزراوە"[85] ئاماژەی بۆ ئەو کۆبوونەوەیە کرد کە بەشی زۆری[86] سەرەک عەشیرەتی کوردەکانی لە خۆ گرتبوو، هەروەها نوێنەرێکی بارزانی بەشداری تێدا کرد، لەو کۆبوونەوەیەدا بریان دا بەدەستەوە نەدانی بارزانی بەسوپای ئێران، هەروەها یارمەتیدانی بارزانییەکان لەلایەنی ماددی و مەعنەوییەوە، لەوەش گرنگتر هاندانیان بۆ بەدەستەوە نەدانی چەکەکانیان بە سوپای ئێران[87] عەشیرەتەکانی کورد بە بەردەوامی یەکێک بوو لە داردەستە بنەرەتییەکانی راپۆرتی سیاسی حکومەتی ناوەندی لەتاران لەبەر سیستەمی عەشیرەتی زال لە کوردستاندا.

لەبەر ئەوەی حکومەت بێ هێز بوو بۆیێ هەولی دا لەگەل سەرەک عەشیرەتەکان پێک بێ بۆ ئەوەی پشتگیری لە پلانەکانی بکەن بۆ گێرانەوەی دەسەلات بەسەر کوردستاندا، هەروەها کونسولی ئەمەریکی لە گەشتەکەی رابوردوویدا تێبینی ئەوەی کرد، کە دەسەلاتی حکوومەت لە شارە سەرەکییەکان پتر بر ناکا، هەتا دەوریەی سەربازیشی لەنێوان گوندەکانی ئەو ناوچەیەدا نەبوو،[88] ئەو کونسولە دانی بەوەدانا، کە بارزانییەکان لەو شوێنانەی خۆیان هەلیانبژاردبوون لەنزیک شنۆ جێگیر ببوون و، چەکەکانیشیان بەدەستەوە نەدەدا، ئەرتەشی ئێرانیش لەنزیکەوە چاودێری دەکرن "نەیدەوێرا هیچ کارێک دژیان ئەنجام بدات"[89] حکوومەتی ئێران توانی هەندێک لە سەرەک عەشیرەتە کوردەکان بکرێ و هەندێکیان بتوێنێتەوە بەم جۆرە سەرکەوت لە کۆکردنەوەی هێزێکی باش لەو عەشیرەتانە و بیانکاتە پشتگیری خۆی، کونسولی عێراق لە تەوریزدا ئەو هێزانە بە (۳۵۰۰) چەکدار مەزندە دەکات، بەسەرۆکایەتی حەوت لە ئاغاکانی عەشیرەتی: ئەیبوکلی و، هێزێکی دیکە بە (٤۰۰) چەکدار مەزندە دەکرێ، لەگەل (۲۲) لە ئاغاکانی عەشیرەتی مەنگور، لە پال ژمارەیەکی زۆر لە عەشیرەتی مامەش.[90] وەکو کونسولەکە روونی دەکاتەوە، لەلایەکی دیکەشەوە، بەشێک لە عەشیرەتی هەرکی هاتنە پال بارزانییەکان، هەندێ کۆمەل لە ئەرمەنی و ئاشووری و ئازەرییەکان هاتنە پالیان، هەروەها هەندێ لە سۆزدارانی پارتی دیموکراتی ئازەربایجان ئەوانیش بە (٤۰۰-٥۰۰) چەکدار مەزندە دەکرێن[91] بەپێی رای کونسولەکە لەگەل ئەوەی "هێز و داهاتەکانیان سنووردار و کەم بوون" توانیان ترس و کاولکاری لەناوچەی رەزاییە و [92] مەهاباد[93] بلاو بکەنەوە.

ئەو کارانە بەرە بەرە رێگایان خۆش کرد بۆ تەقینەوەی بارودۆخەکە، لەئەنجامدا هەردوولا کەوتنە رووبەرووبوونەوەی چەکدارییەوە و ئەنجامی ترسناکی لێ کەوتەوە.

## رووبەرووبوونەوە سەربازییەکان و بریاری کۆچکردن لە ئێران

ئەرتەشی ئێران بە پشتیوانی هێزی عەشیرەتەکانی هاتنە پالیانەوە، بە هێرشبردنێکی یەک لە دوای یەک بۆ سەر بارزانییەکان، ئەوانیش بەرگرییەکی مەردانەیان کرد، هەتا والی ئازەربایجان عەلی مەنسوور[94] لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەل کونسولی عێراق لە تەوریزدا وەسفی کردوون بە (کێوی- الوحوش) ئەوانەی کە "خۆیان بە زیندوویی بەدەستەوە نادەن، بەلکو پێیان باشترە لە گۆرەپانی شەردا بمرن"[95] پێشمەرگە بارزانییەکان دەستێکی باش و کوشندەیان لە هێزەکانی ئێران و هاوپەیمانەکانیان وەشاند، دوای ئەوەی ئەو هێزانە و مەفرەزەیەکی ئێران، کە (۲۰۰) سەرباز دەبوو گەیشتنەوە یەک (۱٥۰) کەس لە عەشیرەتی دیبوکری کوردیشیان لەگەلدابوو، بەلام بارزانییەکان لێیان

هاتنە دەست و چواردەوریان گرتن ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن و فەرماندەی مەفرەزەکەشیان کوژرا و ئەوانەی دیکەش هەموویان بە دیل گیران(٩٦).

لە شوێنێکی دیکەدا بارزانییەکان هێرشیان کردە سەر لقێکی سوارەی سەربازی و یەکێکی دیکە لە تۆپی قورس لە خواروی رۆژئاوای شنۆیێ، لەو شەڕانەدا پێنج ئەفسەر و سی سەرباز کوژران و هەردوو سریەکەش پەرت و بلاو بوون(٩٧).

کونسوڵی عێراق لە تەورێز ئاماژەی بۆ ئەوە کرد، کە بارزانییەکان "شەڕی پارتیزانی، کە لێی شارەزان بەکاری دێنن" بۆ رووبەڕووبوونەوەی هێزەکانی ئێران(٩٨).

سەرکردە سەربازییە ئێرانییەکان لەلای خۆیانەوە هەوڵیان دا سوپای عێراق تووشی شەڕەکە بکەن، بۆ ئەوەی لە پاڵ ئەواندا لەخاکی ئێراندا دژ بە بارزانییەکان شەڕ بکەن، وەکو لە راپۆرتێکی نهێنی عێراقیدا هاتووە: نوێنەری سوپای ئێران کاتێ چاوی بە فەرماندەی فەوجێکی عێراق لە رایەت کەوت داوای لێ کرد یەکەکانی سەربازی عێراق هاوبەشی بکەن لە شەڕەکاندا دژ بە بارزانییەکان، بەڵام ئەو داوای لێبوردنی کرد لە جێبەجێکردنی ئەو داواکارییەیدا، لەگەڵ ئەوەشدا ئامادەباشی خۆی دەربڕی بۆ شەڕکردن دژ بە بارزانییەکان، ئەگەر لە سنوور بپەڕنەوە بۆ ناو خاکی عێراق(٩٩).

وەکو لە پێشەوە ئاماژەمان بۆ کرد حکوومەتی ئێران بەرهەندی دەرەوەی مەسەلەی بوونی بارزانی لەسەر خاکی ئەواندا ئاگادار بوو، کاتێ کونسوڵی عێراق لە تەورێزدا لەگەڵ ئیسماعیل شفائی جێگری سەرۆکی ئەرکانی سوپای ئێرانیدا لە چاوپێکەوتنێکدا گومانی خۆی لە هەوڵی راستەقینەی سوپای ئێران بۆ لەناوبردنی بارزانییەکان و دەربەست کردنیان بۆ خۆ بەدەستەوە دان، دەربڕی، وەڵامی بەرپرسە ئێرانییەکەش ئەوە بوو: گیروگرفتەکە تەنیا بە بارزانییەکانەوە بەند نییە، بەڵکو گیروگرفتی کوردە و پەیوەندی بەهەموو کوردستانەوە هەبوو، هەروەها روونی کردەوە، کە ئەوە پێویستی بە کردەوەی سەربازی گەورە هەیە، کە دەبێ "حیسابی بەشی زۆری عەشیرەتە کوردەکانی بۆ بکرێ (هەڵوێست. ف. س)(١٠٠) کە چەند ساڵێک دەبێ و تا ئێستاش پروپاگەندەکان کاریان لێیان کردووە"(١٠١) شفائی جارێکی دیکە جەختی لەسەر ئەوە کردەوە، کە فاکتەری نێودەوڵەتی رۆڵی خۆی لە ئاراستەکردنی سیاسەتی حکوومەتی ئێران بەرامبەر بەکوردی ئێران و بارزانییەکان دەگێڕێت، ترسی ئەوەشمان هەیە (سیاسەتی بەکارهێنانی هێز دژ بە کوردەکان) هەڵمەتەکانی سیاسی دژ بە ئێران بورووژێنێ(١٠٢).

هەروەها ژەنەراڵی ئێرانی ئەوەشی گوت بە گەڕانەوەی بارزانییەکان بۆ عێراق کێشەکە نامێنێ، هەروەها گوتی: "ئەوانە هۆی خراپەکاری نانەوەی گیانی یاخیبوونن لە نێو کوردەکاندان، چونکە یارمەتییان دەدەن و دەیان پارێزن لەبەر بیری نەتەوەپەرستی و عەشیرەتگەرییان"(١٠٣).

بەهەرحاڵ لە میانەی بەڵگەنامە عێراقییەکاندا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ لەگەڵ هەموو ئەو رووداوانەشدا ئێرانییەکان ئامادەن جارێکی دیکەش لەگەڵ بارزانییەکاندا گفتوگۆ بکەن، دوای دانوستاندنێکی دوورودرێژ لەنێوان هەردوولادا، حکوومەتی ئێران مەرجەکانی خۆی خستە بەردەم بارزانییەکان، کە لە دوو پرەنسیپی گرنگ پێک دێت: یەکەمیان رازیبوونی حکوومەتی ئێران بە مانەوەیان لە ئێران لەو ناوچەیەی حکوومەت بۆیان دەستنیشان دەکات، بەڵێنیش دەدات یارمەتی و ئازووقەیان پێ بدات، بەمەرجێک چەکەکانیان بەدەستەوە بدەن. دووەمیان: لە حاڵەتێک ئەگەر بارزانییەکان بەو خاڵە رازی نەبن، سەربەستن(١٠٤) لە جێهێشتنی ئێران و رۆیشتن بۆ هەر شوێنێک، کە خۆیان هەڵی دەبژێرن(١٠٥). بەپێی بیروبۆچوونی کونسوڵی عێراق لە تەورێزدا: حکوومەتی ئێران "لە پێشنیازەکانیدا چاوتێربوو، هەتا لە پێشنیازی دووەمیدا کاتێ رێگای حەوانەوەی بەو چەکدارانە دا، کە ناویان بە کۆمەڵەی چەکدار دەبا لەو کارەیدا ئەرکەکانی هاوسێیەتی و دۆستایەتی ترازاندبوو، چونکە بارزانییەکان سنووری گوێڕایەڵبوونیان بەرامبەر بە حکوومەتی عێراق بەزاندبوو، لەسەر ئەوەش بە خۆیان و چەکەکانیانەوە بگەڕێنەوە بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە لێپرسینەوەیان دەرهەق بکرێ"(١٠٦).

مەلا مستەفای بارزانی رای وابوو، کە لەو بیروبۆچوونەشیدا تا رادەیەکی زۆر راست بوو و نیشانەکەی پێکابوو، چونکە دوا پێشنیازی ئێران ئێش و ئازاری بارزانییەکان لە ئێراندا کەم ناکاتەوە، چارەسەری راستەقینەی گیروگرفتەکانیان لەو وڵاتەدا ناکات، هەروەها چەککردنیان دەیان خاتە ژێر زەحمەتی حکوومەتی ئێرانەوە، ئەگەر لەسەر خاکی ئەوان بمێننەوە، بەڵام ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ عێراق، ئەوەش ئەوە دەگەیەنێ خۆ بەدەست سوپای عێراقەوە بدەن، کە لەسەر سنوور چاوەڕێیان دەکەن. بارزانییەکان دوای ئەوەی بە پێشنیازەکەی ئێران رازی نەبوون دەستیان کرد بەخۆ ئامادەکردن بۆ رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ هێزەکانی ئێراندا. بەرامبەر بەوەش ئەرتەشی ئێران دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی هێزەکانیان لە تۆپ و فڕۆکەی جەنگی بۆ بۆردومانکردنێکی توند و تیژ و بەردەوام بۆ سەر شوێنی قایمی بارزانییەکان. لە راستیدا هێزەکانی ئێران کە دوو تیپ دەبوو لەناوچەی مەهاباد و رەزاییە کۆبوونەوە، بارزانییەکان بێچارە کشانەوە نەغەدە و شنۆ پاشان بۆ سنووری عێراق پاشەکشەیان کرد تاوەکو لە مەرگەوەڕ جێگیربوون(١٠٧).

ئێرانییەکان لە پاڵ پاڵەپەستۆ سەربازییەکەیاندا ئابڵووقەیەکی ئابووری خنکێنەریان لەسەر ئەو ناوچە و گوندانە دانا، کە بارزانییەکانی تێدا جێگیر بوون، یان ئەو شوێنانەی ئازووقەیان لێ پەیدا دەکرد، ئافرەت و منداڵ و پیرەکان بارگرانییەکی گەورەی دیکەیان بۆ بارزانییەکان نابووەوە، لەو کاتەشدا بارزانییەکان لە حاڵەتی کشانەوە بوون بۆ سنووری عێراق. بارزانییەکان لەکاتی کشانەوەیاندا بەرەو باکوور هەولیان دا پەیوەندی بە عەشیرەتەکانی شکاک و هەرکی و جەلالی بکەن، چونکە ئەوانیش دژ بە حکوومەتی ئێران بوون،* بۆ ئەوەی ئەوانیش پشتیوانیان لێ بکەن بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەرتەشی ئێران و، رێگایەک بدۆزنەوە (بۆ راکردن بەرەو رووسیا) بەپێی ئەو برووسکە نهێنییەی، کە رێپێدراوی عێراق بۆ وەزارەتی دەرەوەی رەوانە کردبوو(١٠٨).

لە کاتی کشانەوەیاندا بارزانییەکان زۆر بە ئازایەتییەکی کەم وێنە و بە لێزانی و داهێنەرانە شێوازی شەڕەکەیان بەڕێوە برد و، لە بارودۆخێکی زۆر ناخۆشدا بەجۆرێک ئێرانییەکان نەیانتوانی لە ناویان بەرن یان وایان لێ بکەن خۆبەدەستەوە بدەن، ئەوەش کونسوڵی عێراقی لە تەورێزدا بە هەڵەدا برد کاتێ گوتی"سوپای ئێران بە قوربانییەکی کەم دەتوانێ لە چەند رۆژێکدا بارزانییەکان لەناو بیات"(١٠٩) کونسوڵەکە بانگەشەی ئەوەی دەکرد سوپا ئارەزووی لە دواهێنانی کێشەی بارزانییەکان بەشێوەیەکی ئاشتییانە هەیە، پێی باشتر بوو لە گەڕانەوەیان بە چەکەکانیانەوە بۆ عێراق "لە شەڕی ئەوان رزگار بێن" بە تەنیا "ئەوەبوو مەسەلەکەی وا لێ دەکرد درێژە بکێشێ و بەبێ چارەسەرێکی یەکجارەکی بمێنێتەوە"(١١٠).

بە بەسەرچوونی کات بۆ مەلا مستەفا ئاشکرابوو، کە باشترین شت ئەوەیە ئەوانەی چەکدارنین بیان گەڕێنێتەوە بۆ عێراق، شێخ ئەحمەدی بارزانی و ژمارەیەکی کەم لە بارزانییەکان ئەو بیرۆکەیان پێ باش بوو، چوار لە ئەفسەرانی پێشووی سوپای عێراقیان لەگەڵدا بوون.(١١١) لەسەر سنوور دەسەڵاتەکانی عێراق شێخ ئەحمەد و ئەوانەی لەگەڵیدا بوو دەستگیریان کردن و دەستبەسەری کردن(١١٢). دوای ئەوەی مەلا مستەفا روانی بای تۆڵەسەندنەوە ئاسمانی بارزان و کوردستانی تەنیبووەوە(١١٣) لەگەڵ بەشی زۆری چەکدارە بارزانییەکان ئەوانەی لەگەڵیدابوون و پەڕیبوونەوە بارزان و لە چیاکاندا خۆیان قایم کردبوو، دەبێ ناوچەکە بەجێ بێڵن. مەسەلەی داواکردنی پەنابەری لە ئێران شتێکی دوور بوو، چونکە لەگەڵ سوپاکەی لە چەند بەیەکدادانێکی خوێناویدا کە چەند کوژراو و برینداری لە سوپای ئێران لێ کەوتەوە، مەحاڵە تورکیاش مافی پەنابەرییان بداتێ، بۆیە بیروڕای لەسەر ئەوە جێگیربوو، کە رووبکاتە یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو(١١٤).

بارزانی لەگەڵ سەدان لە پیاوەکانی مەڵبەندی بارزانییان جێهێشت بەناو چیا عاسێکان چوونە ناو خاکی تورکیا نزیک تخوبی ئێران، لەوێشەوە جارێکی دیکە چوونەوە ناو کوردستانی ئێران. کونسوڵی عێراق لە تەورێزدا لەو راپۆرتەی، کە بۆ وەزارەتی دەرەوەی لە بەغدا رەوانە کردبوو وەسفی

چۆنیەتی پەڕینەوەی بارزانییەکان بۆ یەکێتی سۆڤیەت دەکات و باسی ڕووبەڕووبوونەوەکانیان لەگەڵ هێزەکانی ئێران بەم شێوەیە دەکات: "بارزانییەکان سوپای ئێرانیان نزیکەی سێ حەفتە خەریکی شەڕ کرد، ئەوانیش بۆ ئەم شەڕانە نزیکەی دە هەزار سەربازیان لە ناوچەی ماکۆ کۆکردەوە، لەو شەڕانەدا نزیکەی (١٠٠) کەسیان لە سەرباز و ئەفسەر لێ کوژرا و بریندار بوون"(١١٥).

دوای ئەوەی لە ڕووباری ئاراس پەڕینەوە، ئەو ڕووبارەی کە ئێران لە یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو جیادەکاتەوە، لە ١٧ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٧ یەکەم پێشەنگی بارزانییەکان گەیشتە یەکێتی سۆڤیەت، لاپەڕەیەکی سەرنج ڕاکێش و ترسناک هەڵدرایەوە، کە پڕە لە عیبرەت و وانە لە مێژووی کورد و ڕۆژهەڵاتی ناوینی نوێدا، بۆ ئەوەی لاپەڕەیەکی دیکەی پڕ لە نەبەردی و خەباتی درێژخایەن بکرێتەوە، کە شوێن پەنجە و شوێنەواری بۆ ساڵانێکی دوورودرێژی داهاتوودا لە مێژووی کوردستان و عێراقدا جێهێشتووە.

### هەڵسەنگاندن و دەرئەنجام

هۆکارێکی زۆر هەیە وامان لێ دەکات ڕێککەوتن لەسەر ئەو بیرۆکەیەی کە لەسەر توێژینەوەکانی نوێ بەشێوەیەکی فراوان زاڵە و، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، دامەزراندنی کۆماری کوردستانی ئۆتۆنۆمی (کۆماری مەهاباد) ترسناکترین ڕکابەری کوردەکان بوو بەسەر ڕژێمی پەهلەوی ئێرانیاندا سەپاند، لە هەمان کاتدا شتێکی دیار بوو ناوی سەرکردەی کورد مستەفا بارزانی بە زۆرترین ڕووداوی دراماتیکییەوە پەیوەست بوو چ لە ڕۆژانی بەر لە ڕووخانی کۆمارەکە ساواکە و، چ لە میانی مانگەکانی دوای ڕووخانی کۆمارەکە.

بەپێی ئەو توێژینەوەیە، کە لەبارەی ڕۆڵی بارزانی و بارزانییەکان لەو ساتەوەختەدا لەژێر ڕۆشنایی بەڵگەنامەی دبلۆماتە عێراقییەکان نووسراوە لەسەر بنەڕەتی زانیاری ئەو بەڵگەنامانەوە دەتوانین بگەینە ئەو دەرئەنجامە زانستییە نوێیە تازەیەی تیشک دەخاتە سەر ئەو ڕۆڵە کاریگەر و ترسناکەی بارزانی گێڕای لە ناسکترین قۆناغ لە مێژووی کوردی هاوچەرخ لە عێراقدا، بەتایبەتی لە ئێران. بەپشت بەستن بەهەمان بەڵگەنامەوە دەتوانین پەرە بەو دەرئەنجامە بدەین، کە لە سەرچاوە هەمە جۆرەکانەوە زۆر لایەنی ئەو بابەتانەیان بەشێوەیەکی هەستیار و چڕ لەخۆگرتووە.

لە میانەی لێ وردبوونەوە و بەدواداچوونی ئەو زانیارییانەی لەناو ئەو بەڵگەنامانەدا نووسراوە، توێژەر دەتوانێ جەخت لەسەر ئەوە بکات، کە کەسایەتی بارزانی و جموجۆڵەکانی و پەیوەندی لەگەڵ بەرپرسە ئێرانییەکان و سەرەک عەشیرەتە کوردەکانی ئێران و قازی محەممەد و بەرپرسەکانی کۆماری کوردستان، جێگای چاودێری و بەدواداچوونی دبلۆماتە عێراقییەکانی پایتەختی ئێران و کونسوڵە عێراقییەکانی تەوریز و کرماشان بوو، دوورنین لە ڕاستی ئەگەر بڵێین بایەخی دبلۆماتە عێراقییەکان بە کەسایەتی بارزانی بەدرێژایی مانگەکانی دوای ڕووخانی کۆماری مەهاباد لە هەموو شتێکی دیکە بە بایەختر بوو، ئەویش لە میانەی ئەو هەموو ڕاپۆرت و یاداشت و نووسراوانەی بۆ وەزارەتی دەرەوەی عێراقیان ڕەوانە دەکرد. لە میانەی ئەو بەڵگەنامانەوە دەتوانین وێنەیەکی ڕاستەقینە و وردی ئەو کەسایەتییە مەزنە بەرجەستە بکەین، کە لە جیهانی سیاسەت و دبلۆماسییەتدا توانی لێزانیی خۆی بسەلمێنێ و دەیزانی چۆن کاروبارەکان هەڵسووڕێنێ لە گفتوگۆکردن و پەیمان بەستن لە ئاڵۆزترین بارودۆخی هەرێمایەتی نێودەوڵەتیدا. گومان لەوەدا نییە کورد بێتە ڕەگەزێکی گرنگ و ڕۆڵی هەبێت لەو پەیوەندییانەی لە نێوان لایەنە پەیوەندیدارەکان بە مەسەلەی کوردەوە، کوردەکانی سەر سنووری هەردوولا لە عێراق و ئێران بەچاوی هێماوە سەیری بارزانییان دەکرد. چونکە بارزانی بەشێوەیەکی تایبەت و بنەڕەتی پاڵپشتی خەباتی کوردی لە قۆناغێکی ناسک و دژوار لە مێژووی هاوچەرخیاندا کرد.

ئەو ڕاستییانەش لایەنەکەی دیکەی وێنەکە ناشارێتەوە، کە بەشی زۆری ئەو ڕاپۆرتانە دەرهەق بەکەسایەتی بارزانیدا ڕاستگۆ نەبوون، تەنیا بەخراپە باسی بارزانییان کردووە، کە پشتیان بەهەندێ بۆچوونی نادروست و

نابەجێ بەستووە، لە حوکمەکانیاندا زێدەڕەوییەکی زۆریان کردووە، بە چاوێکی شۆڤێنیستانەی دیار باسی بارزانییان وەکوو سەرکردەیەکی عەشایری (یاخیبوو) دەیەوێ لە عێراق جیابێتەوە، بەبێ ئەوەی هیچ هەڵسەنگاندنێکی بابەتی و راستەقینە بۆ ئەو هۆیانە بکەن، کە بارزانی و کوردیان هاندا بۆ جووڵانەوە دژ بە حاکمە زۆردارەکانیان، ئەوانەی لە چارەسەرکردنی ئەو هۆیانە سەرنەکەوتن، چارەسەرکردنێکی هۆشمەندانە و راستەقینە مافی یەکسانی بۆ رۆڵەکانی وڵات دابین بکات.

دەتوانین لە میانەی ئەو راستییانەی لەو راپۆرت و یاداشتنامە دبلۆماتیانەدا هاتووە، وێنەیەکی راستەقینەی رەهەندەکانی چوونی بارزانی بۆ کوردستانی ئێرانمان دەست کەوێ، کە لە ئەنجامی سەرکوتکردنەوەی راپەڕینی بارزان ئاوارە بوون. پەڕینەوەی بارزانی بۆ کوردستانی ئێران و راپەڕینەکەی بارزان رەهەندێکی نێودەوڵەتی وەرگرت، دوای ئەوەی ئەم مەسەلەیە وەکو کێشەیەکی ناوخۆیی تایبەت بە عێراق تەماشا نەدەکرا.

لە خوێندنەوەی ئەو دیکۆمێنتانەدا نارەحەتییەکی بەردەوامی عێراق و ئێران بەدی دەکرێ، هەردوو وڵات لەسەر ئەوە کۆک بوون، کە هەر داواکارییەک و جموجۆڵێکی کوردی هەڕەشەکردنە بۆ سەر یەکپارچەیی خاکەکەیان، ئەو گۆڕانکارییانەش چ لە کوردستانی عێراق و چ لە کوردستانی ئێران روویان دا، بۆی هەیە هەڕەشە بێت بۆ دروستکردنی کاریگەری لەسەر هەردوولا، بۆیێ زێدەڕۆیی نییە ئەگەر بڵێین فاکتەری کورد (بەتایبەتی بارزانی) بووە رەگەزێکی سەرەکی لە دەستنیشانکردنی پەیوەندییەکانی نێوان عێراق و ئێران لە میانەی ئەو چەند مانگەی دوای رووخانی کۆماری کوردی و پەڕینەوەی بارزانییەکان بۆ خاکی سۆڤیەت.

لەسەر ئاستێکی دیکەدا، بەشی زۆری راپۆرتە دبلۆماسییەکانی عێراق لە راستییەکان دوور دەکەوتنەوە کاتێ باسی تێوەگلانی سۆڤیەتییەکانیان بەشێوەیەک لە شێوەکان لە مەسەلەی بارزانییەکان دەکرد، هەر لەکاتی پەڕینەوەیان بۆ کوردستانی ئێران، ئەویش چ لە رێگای پاڵپشتیکردن یان هاندانیان. بەڵکو راستییە مێژووییەکان ئەوەیان سەلماند، کە خودی بارزانی جێگای خۆشحاڵی سۆڤیەتییەکان نەبوو، چونکە لە سەرەتاوە وەکوو سەرکردەیەکی عەشایری سەیریان کرد، بارزانی لەلای خۆیەوە باوەڕی زۆری بە سۆڤیەت نەبوو و، هیوای بە یارمەتی ئەوان نەبوو و، ئەو گومانەی هەردوولا قابیلی گۆڕان نەبوو، تەنیا دواجار کاتێ پەرەسەندنی رووداوەکانی ئێران و رۆژهەڵاتی ناوین بە گشتی خۆیان بەسەر سۆڤیەتییەکاندا سەپاند و وایان کرد هەڵوێستیان بەرامبەر بە بارزانی بگۆڕن، بەرادەیەک مافی پەنابەرییان بۆ خاکی خۆیان بەسەرکردەی کورد رەوا دیت کە بۆ ماوەی (١٢) ساڵی داهاتوو لە خاکی سۆڤیەتدا مایەوە، تا ئێستاش زانیاری زۆر کەمن لەبارەی هۆیەکانی راستەقینەی ئەو هەڵوێستەی سۆڤیەت. ئەگەرچی دەتوانین بەشێکی بگەڕێنینەوە بۆ گۆڕانکارییەکانی شەڕی سارد، کە رەشەبایەکی رۆژهەڵاتی ناوین و بەشی دیکەی لە جیهاندا گرتەوە، کە هاوپەیمانەکانی دوێنێ بەیەکەوە هەڵکردن و گونجان گۆڕا بۆ رکابەری و ململانێی دژوار لە پێناو بەرژەوەندی جێگا، لە راستیدا کوردەکان بەشێکی گەورەیان لە گۆڕەپانی ئەو ململانێیە توندوتیژە بەرکەوت، ئەویش بە حوکمی ئەو شوێنە جیوستراتیژییە ترسناکەی لە دڵی رۆژهەڵاتی ناویندا هەیانە.

**پەراوێزەکان:**

١- دوای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق زۆر راپەڕین لە بارزان روویان دا، یەکەمیان لە ١٩٣١- ١٩٣٢ دووەم لە ١٩٤٣- ١٩٤٥ دەتوانین بزووتنەوەکانی بارزانییەکان لە کوردستانی ئێران لە ساڵی ١٩٤٦- ١٩٤٧ بە بەردەوامبوونی راپەڕینی دووەمی دانێین.

**2-W.Eagleton the Kurdish Republic of 1964, London, 1963. p.51.**

**3- Fo. 371, 35013 (E 70 4/484/93) sir. K. corn my Eolen, 26 nov./1943.**

لە: حامد محمود عیسی علی (المشكلة الكردية في الشرق الاوسط منذ بدايتها حتى سنة ١٩٩١- القاهرة ١٩٩٢ ص ١٦٧ وەرگیراوە.

4- Fo.. 3/350/43 E
(93/74041489) sir. K. cornzomr
1943, F. O., 371,.Eden 26 No
Ibid.12 No. 1949.
لە حامد محمود عیسی علی هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٦٧ وەرگیراوە.
٥- معروف جیاووک. مأساة بارزان المظلومة- بغداد ١٩٥٤، ص ١٥٦-١٥٧.
Eagleton, op. cit., pp. 52.
٦- عبدالرزاق الحسني- تأريخ الوزارات العراقية: ٦٢، ط٧، بغداد /٩٨٨ ص٢٩١- ١٩٢.
٧- معروف جیاووک- سەرچاوەی پێشوو ل١٨٣- ١٨٤: عبدالرزاق الحسني ص٢٩٥- . ٣٠٢.
Eagleton, op. cit., pp. 52-54.
٨- دار الكتب والوثائق العراقية، الوحدة الوثائقية، ملفات البلاط الملكي الملف ٥/٢/٥ في التسلسل ٤٩٥٣ تقرير القنصلية الملكية العراقية في تبريز الى وزارة الخارجية المرقم ش/١٥١١/١٥١١/٦/١٢٥٣٠ والمؤرخ في ١٩٤٥/١٢/١ الوثيقة رقم ١٧٥، ص.٣٢٠.
لە پەراوێزەکانی داهاتوودا هێمای (د.ک.و) بۆ دار الكتب والوثائق بەکاردێنین.
٩- (د.ك.و) الملف نفسه المفوضية الملكية العراقية في طهران الى وزارة الخارجية المرقم س/١٥١١/١٥١١/٦١١٧٦٧ والمؤرخ في ١٩٤٥/١/٢١ الوثيقة رقم ١٨٥، ص. ٣٣٣
١٠- سۆڤیەتییەکان لە باکووری ئێران بوون هەر لە ساڵی (١٩٤١)ەوە دوای دامەزراندنی یەکێتی سۆڤیەت لە ٢٥ی ئابی/١٩٤١ بەریتانیا ئێرانی داگیرکرد دوای شەڕی جیهانی دووەم بەریتانیا بەتەواوەتی لە ئێران کشایەوە، واتە ئاداری ١٩٤٦، بەڵام هێزی سۆڤیەت لەباکوور هەر مایەوە پاشان کشایەوە.
١١- (د.ك.و) الوحدة الوثائقية، ملفات البلاط الملكي الملف ٥/٢/٥ التسلسل ٤٩٥٣ تقرير المفوضية الملكية العراقية في طهران الى وزارة الخارجية المرقم ش/١٥١١/١٥١١/٦/١٧٦٧ والمؤرخ في ١٩٤٥/١/٢١ الوثيقة رقم ١٨٥، ص٣٣٣.
١٢- (د.ك.و) الملف نفسه تقرير المفوضية الملكية العراقية في طهران الى وزارة الخارجية المرقم ٢/٢/أ/١٢٩٧ والمؤرخ في ١٩٤٥/١١/١١ الوثيقة رقم ١٣٥، ص ٢٣٢. (عملة ايرانية من اجزاء الريال).
١٣- (د.ك.و) الملف نفسه تقرير القنصلية الملكية العراقية في تبريز الى وزارة الخارجية المرقم ش/١٥١١/١٥١١/٦/٢٥٣٠ المؤرخ في ١٩٤٥/١٢/١ الوثيقة رقم ١٧٥، ص. ٣٢٠.
١٤- (کۆمەڵە) لە ئەدەبیاتی سیاسی و مێژوویی بەناوی (ژ.ک) ناسراوە لە ٦ی ئەیلوولی ١٩٤٢ دامەزراوە، پێشکەوتنێکی چۆنیەتی خەباتی کورد بوو لە ئاستی بیروهۆشی نەتەوەیی، کە رۆشنبیری کورد لە ئێراندا پێی گەیشتبوو، دەستەی دامەزرێنەری لە (١١) ئەندام پێک هاتبوو لە مامۆستا و شاعیر و پیاوی ئایینی و قوتابی و بازرگان و چینی ناوەندی تازە پێگەیشتوو، بنکەکەی لە مەهاباد بوو لایەنگرانیشی لەهەندێ ناوچەکانی موکریان بوون، گەورەترین لایەنگرانی رۆشنبیری رووناکبیر عەبدولڕەحمان زەبیحی و شاعیری ناسراو هەژار بوون، کاتێ قازی محەممەد پەیوەندی بە کۆمەڵە کرد، کۆمەڵە هەنگاوێکی گەورە چووە پێشەوە، (ژ.ک) گۆڤاری نیشتمانی دەرکرد، کە شوێنێکی تایبەتەندی لە رۆژنامەگەری داگیرکرد، بۆ ئەوەی بەتەواوەتی شارەزای کۆمەڵە بی ئەم سەرچاوانە بخوێنەوە:
القضية الكردية في ايران في ضوء المصادر والمراجع العراقية ١٩٢١-١٩٤٧ عبدالاله حميد فاضل.- رسالة ماجستير غير منشورة- معهد التاريخ العربي والتراث العلمي للدراسات العليا، بغداد ١٩٩٨، ص٩٦- ٩٩.
فائزة حسين عباس- التطورات السياسية والفكرية للحركة القومية الكردية في ايران ١٩٣٩- ١٩٧٨ رسالة ماجستير، كلية العلوم السياسية، جامعة بغداد- بغداد ١٩٩٥- ص٨٤- ٨٦- ٨٩- ٩٠.
Eagleton, op. cit., pp. 33-39.
١٥- (د.ك.و) الوحدة الوثائقية الملف ٥/٢/٥ تسلسل ٩٥٣ كتاب المفوضية الملكية العراقية في طهران الى وزارة الخارجية المرقم ٢/٢/أ/١٢٣٥ والمؤرخ في ١٩٤٥/١١/٢٩ الوثيقة رقم١٨٣، ص٣٣٠.
١٦- (د.ك.و) الملف نفسه كتاب المفوضية الملكية العراقية في طهران الى وزارة الخارجية المرقم ٢/٢/أ/٢٥٩ والمؤرخ في ١٩٤٥/١١/٥ الوثيقة رقم ١٨، ص٣٢٧.
١٧- (د.ك.و) نفس الملف والوثيقة ص٣٢٧ (د.ك.و) الملف نفسه تقرير

المفوضية الملكية العراقية في طهران الى وزارة الخارجية المرقم ٢/٢/أ/١٢٩٧ والمؤرخ في ١١/١١/١٩٤٥ الوثيقة رقم ١٣٥، ص٢٣٢: د.ك.و، الملف نفسه تقرير المفوضية الملكية العراقية في طهران الى وزارة الخارجية المرقم ش/١٥١١/١٥١١/٦/٦/١٧٦٧ المؤرخ في ٢١/١١/١٩٤٥ الوثيقة رقم ١٨٥، ص٣٣٣.

١٨- (د.ك.و) الوحدة الوثائقية، ملفات البلاط الملكي الملف ٢٥/٢/٥ التسلسل ٤٩٥٣ تقرير المفوضية الملكية العراقية في طهران الى وزراة الخارجية المرقم ٢/٢/أ/١٢٩٧ والمؤرخ في ١١/١١/١٩٤٥ الوثيقة رقم ١٣٥، ص٢٣٢.

١٩- (د.ك.و) الملف نفسه تقرير المفوضية الملكية العراقية في طهران الى وزارة الخارجية بتاريخ ٢١/١٠/١٩٤٥ الوثيقة رقم ١٨٥، ص٣٣٣.

٢٠- (د.ك.و) الملف نفسه كتاب وزارة الخارجية العراقية الى رئاسة الديوان الملكي المرقم ش/١٥١١/١٥١١/٦/١٣٨٢ والمؤرخ في ١١/١٢/١٩٤٥، الوثيقة رقم ٦٢، ص٢٩٩.

٢١- (د.ك.و) الملف نفسه كتاب المفوضية الملكية العراقية في طهران الى وزارة الخارجية المرقم ٢/٢/أ/١٢٥٩ والمؤرخ في ٥/١١/١٩٤٥ الوثيقة رقم ١٨١، ص٣٢٧.

٢٢- دیکۆمێنتەکانی بەهەڵە ناماژەیان بۆ ئەو ناوە کردبوو بە رەشید حەمەخانیان ناو بردبوو لە راستیدا (حەمە رەشید خان)ە.

٢٣- دوای رووخانی رژێمی رەزا شا لە ساڵی ١٩٤١ حەمە رەشید خان، کە یەکێکە لە سەرەک عەشیرەتی یونس خانی لەگەڵ هاوپەیمانەکانی لە عەشیرەتەکانی دیکەدا راپەری، هەر بە گەورەی ئەو ناوچەیەی درێژ دەبێتەوە لە نێوان بانە و سەردەشت هەتا کۆتایی ساڵی ١٩٤٤ مایەوە و نیدارەیەکی کوردی لەو ناوچەیەدا دامەزراند کە شوێنی دەوڵەتی ئێرانی گرتبووەوە، بەڵام لە دواییدا دەسەڵاتەکانی ئێران بە یارمەتی عەشیرەتەکانی کوردی دوژمنی ئەو توانییان راوی بنێن، ئەویش لە سنوور پەرییەوە بۆ خاکی عێراق، دوای ماوەیەک لە ساڵی ١٩٤٥ گەرایەوە ئێران، بەڵام نەیتوانی ناوچەکانی پێشتر لە ژێر دەسەڵاتی ئەودا بوون بیان گەرێنێتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی، جارێکی دیکەش بەدیارکەوتەوە لەناو رووداوەکانی مەهابادا لە دوای شەری دووەمی جیهانیدا، بۆ ئاگاداربوون لە درێژەی ئەم باسە ئەم سەرچاوانە بخوێنەوە:

فوزية صابر- المسألة القومية في ايران، مجلة كلية التربية، ع ٦ بغداد/ ٢٠٠٠، ص٧١- ٧٢- ٧٥- ٧٦:

**H. Arfa, under five shahs, London 1964, p.p. 7-70.**

٢٤- (د.ك.و) الوحدة الوثائقية: ملفات البلاط الملكي الملف ٥/٢/٥ التسلسل ٩٥٣ كتاب المفوضية الملكية العراقية في طهران الى وزارة الخارجية المرقم ٢/٢/أ/١٢٥٩ والمؤرخ في ٥/١١/١٩٤٥ الوثيقة رقم ١٨١، ص٣٢٧.

٢٥- کۆماری ئازەربایجانی ئۆتۆنۆمی لە ١٢ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥ دامەزرا کەسایەتی پێشکەوتنخوازی ناسراو جەعفەر پیشەوەری بە سەرۆک هەڵبژێردرا، پاڵپشتییەکی باشی لەلایەن سۆڤیەتەوە لێ کرا، ئەو کۆمارە رووخا دوای ئەوەی هەندێ مانۆری دبلۆماتی لەلایەن سەرۆک وەزیرانی ئێرانییەوە (قوام السلطنة) بەتایبەتی لەگەڵ سۆڤیەتییەکان بەڵێنی ئیمتیازێکی نەوتی لە باکووری ئێران پێدان (قوام) ئەوەی وەکوو پاڵپشتێک بەکارهێنا و بە پشتیوانی ئەمریکاش هێرشێکی بردە سەر ئازەربایجان لەسەرەتای تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٦.

لە (١٣)ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٦ تەوریز، کە پایتەختی هەرێمی ئازەربایجان بوو داگیری کرد، بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەم باسە ئەم سەرچاوانە بخوێنەوە: میر جەعفەر پیشەوەری، سنیجلمیش اثرلری، آذربایجان روزنامەسنی نشریەسی، باکو ١٣٤٤ش- ١٩٦٥ عبدالصمد کامبخش، انخستین لنگرە تا جنبش اذربایجان (دنیا) (مجلە) دورە دوهم سال نهم، شمارە چهارم، زمستان سال ١٣٤٣.

**E. Abrahamiom, communsim and communlism in Iran: the tuden and the Firactahi Dimukrat, "International younanal of middle Est studies" l, No. 4, October 1970,-Vol pp. 310-332.**

٢٦- درێژی کۆماری کوردستان لە: عەبدولرەحمان قاسملۆ، چل ساڵ

خەبات لە پێناوی ئازادی، کورتەیەک لە مێژووی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، بەرگی یەکەم ١٩٨٥، ل٧٠-٢٧- ٣٥.
مەحموود مەلا عیزەت کۆماری میللی مەهاباد، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە، سلێمانی ١٩٧٩.
**Eagleton, op. cit.**
٢٧- لە هەمان کاتدا عومەر ئاغای شکاک کرا بەسەرکردەی بەرەی باکوور و حەمە رەشید خان کرا بە سەرکردەی بەرەی رۆژئاوا.
٢٨- (د.ك.و) الوحدة الوثائقية، ملفات البلاط الملكي التسلسل ٥٩٢٥ كتاب وزارة الخارجية العراقية الى رئاسة الديوان الملكي المرقم ش/٢٧٣/٤/٥٥٩٦ والمؤرخ في ٢٥ مايس ١٩٤٦ الوثيقة رقم ٢٩، ص٦١.
٢٩- دیکۆمێنتە عیراقییەکان وەسفی ئەو کردەوە سەربازییانەی، کە بارزانییەکان هاوبەشیان تێدا دەکرد بە (شەڕکردن لە پاڵ هێزەکانی کۆمار) ناویان دەبردن.
٣٠- (د.ك.و) الوحدة الوثائقية، ملفات البلاط الملكي الملف رقم ٢٧٢، تسلسل ٤٩٩٣ تقرير المفوضية الملكية العراقية في طهران الى وزارة الخارجية المرقم ١٣١/١١/٢/٢ والمؤرخ في ١٦ مارت ١٩٤٦ الوثيقة رقم ٤٦، ص٦٨.
٣١- (د.ك.و) الوحدة الوثائقية، ملفات البلاط الملكي الملف رقم ٢٧٢، تسلسل ٤٩٩٣ تقرير المفوضية الملكية العراقية في طهران الى وزارة الخارجية المرقم ١٣١/١١/٢/٢ والمؤرخ في ١٦ مارت ١٩٤٦ الوثيقة رقم ٤٦، ص٦٨.
٣٢- (د.ك.و) الوحدة الوثائقية، ملفات البلاط الملكي الملف ٥/٢/٥، تسلسل ٥٩٢٥ تقرير المفوضية الملكية العراقية في طهران الى وزارة الخارجية بتأريخ ١٩٤٦/١/١٦ الوثيقة رقم ٩، ص١٩.
٣٣- (د.ك.و) الملف نفسه، الوثيقة نفسها ص١٩.
٣٤- (د.ك.و) الملف نفسه الوثيقة نفسها ص١٩.
٣٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٣٦- (د.ك.و) الملف نفسه، تقرير المفوضية الملكية العراقية في طهران الى وزارة الخارجية المرقم ٥٤٢/١/٢ والمؤرخ في ١٩٤٦/٣/٢٠ الوثيقة رقم ١٨٧، ص٥٠٢.
٣٧- (د.ك.و) الملف نفسه، الوثيقة نفسها ص٥٠٢.
٣٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٣٩- هەمان سەرچاوە، ل٥٠٢- ٥٠٣.
٤٠- هەمان سەرچاوە، ل٥٠٣.
٤١- ئەحمەد قوام ئەلسەلتەنە: لە تاران لە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەند و خاوەن موڵکێکی زۆر لە دایک بووە. دەسەڵاتێکی سیاسی گەورەی بەدەست هێنا، خوێندنی لە پاریس تەواو کردبوو، دوای ئەنجامدانی کودەتا بەناوبانگەکەی لە ساڵی ١٩٢١، رەزا خان (رەزا شا) بەندی کرد پاشان ئازاد کرا و، بۆ ئەوەی بۆ ماوەیەکی کورت ببێ بەسەرەک وەزیران، کە لە مانگی حوزەیرانی ١٩٢٢ تا حوزەیرانی ١٩٢٣ بەردەوام بوو، جارێکی دیکەش هەمان پۆستی پێ سپێردرایەوە، کە لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٢ تا کانوونی دووەمی ساڵی پاشتر بەردەوام بوو، لە سەردەمی رەزا شا لە ژیانی سیاسەت دوورخرایەوە بۆ ئەورووپا، لە سەرەتای حوکمی رەزا شادا لە هەموو سیاسەتمەدارەکان دەسەڵاتی پتر بوو، رۆڵێکی ترسناکی لە رووخانی کۆماری مەهاباد و ئازەربایجاندا گێڕا، بۆ زانیاری پتر بروانە:
**F. Rzimi, Iran, The crisis of Democracy 1941- 1953- London, 1989. p. 72,.**
دایره المعارف دانش، بشر تهران ١٣١٩ش، ص٥٠٦.
٤٢- بەپێی بیروڕای (قوام) کوردستان بەشێک بووە لە ئازەربایجان، هەتا ئەگەر رێگا بە کورد بدرێ هەرێمی تایبەت بە خۆیان پێک بهێنن دەبێ لە رێگای رێککەوتن لەگەڵ ئازەرییەکانەوە بێت، بەم شێوەیە (قوام) بەزیرەکی خۆی هەوڵی دا مەسەلەی کورد بکاتە مەسەلەیەکی ...انەوەی، دەتواندرێ لە رێگای مەسەلەی ئازەربایجانەوە چارەسەر بکرێ، ئامانجیشی لەو بیرۆکەیەی ئەوە بوو، کە دووبەرەکی بخاتە نێوان کورد و ئازەرییەکانەوە. بۆ زانیاری زیاتر بروانە: الوثيقة: د.ك.و. الوحدة الوثائقية ملفات البلاط الملكي، الملف ٥/٢/٥ كتاب المفوضية الملكية العراقية في طهران الى وزارة الخارجية المرقم ٣٦٩/١/٢ والمؤرخ ١٩٤٦/٧/٢٣ الوثيقة رقم ١٥٢، ص١٩٣.
٤٣- د.ك.و الملف نفسه، والوثيقة نفسها، ص١٩٣- ١٩٤.
٤٤- د.ك.و الوحدة الوثائقية، ملفات البلاط الملكي، الملف ٢٧٢، تسلسل ٤٩٩٣، كتاب القنصلية الملكية العراقية في كرمنشاه الى وزارة

الخارجية المرقم س/٢/٩١.
٤٥- د.ك.و الملف نفسة، والوثيقة نفسها، ص١٥٣.
٤٦- د.ك.و الوحدة الوثائقية، ملفات البلاط الملكي، الملف ٥/٢/٥، تسلسل ٧٣٧ كتاب المفوضية الملكية العراقية في طهران الى وزارة الخارجية المرقم ٥٤٣/١/٢ والمؤرخ في ٢/١٠/١٩٤٦ الوثيقة رقم ١٨٧، ص٥٠٢.
٤٧- كەوانەكان لە دەقەكەدا هاتووە.
٤٨- د.ك.و الملف نفسة، والوثيقة نفسها، ص٥٠٢.
٤٩- د.ك.و الملف نفسه كتاب المفوضية الملكية العراقية في طهران الى وزارة الخارجية المرقم ٢٥٣/٢١/٣ والمؤرخ في ٨/١٠/١٩٤٦ الوثيقة رقم ٢٠٠، ص٥٤٠، د.ك.و الملف نفسه كتاب المفوضية الملكية العراقية في طهران الى وزارة الخارجية المرقم ٥٤٢/١/٢ والمؤرخ في ٢٠/١٠/١٩٤٦ الوثيقة رقم ١٨٧، ص٥٠٢.
٥٠- د.ك.و الملف نفسه كتاب المفوضية الملكية العراقية في طهران الى وزارة الخارجية المرقم ٥٤٢/١/٢ والمؤرخ في ٢٠/١٠/١٩٤٦ الوثيقة رقم ١٨٧، ص٥٠٢.
٥١- د.ك.و الملف نفسه تقرير قنصلية العراق الملكية في تبريز الى وزارة الخارجية المرقم ٢/١/٢ والمؤرخ في ٨ كانون الثاني ١٩٤٦ الوثيقة رقم ١٢٣، ص٣٣٧.
٥٢- د.ك.و الملف نفسة، كتاب المفوضية الملكية العراقية في طهران الى وزارة الخارجية المرقم ٢١/٣/٢١ والمؤرخ في ١٣/١/١٩٤٧ الوثيقة رقم ١١٠، ص٢٩٣.
٥٣- د.ك.و الملف نفسة، والوثيقة نفسها، ص٢٩٣- ٢٩٤.
٥٤- (د.ك.و) الملف نفسة، كتاب وزارة الخارجية العراقية الى وزارة الداخلية المرقم س/١٠٧/٤ والمؤرخ في ٥ كانون الثاني ١٩٤٧ الوثيقة رقم ١٤٥، ص٣٩٤.
٥٥- (د.ك.و) الملف نفسه كتاب وزارة الخارجية العراقية الى وزارة الداخلية المرقم ش/١٠٧/٤/١٣٦ والمؤرخ في ٨ كانون الثاني ١٩٤٧ الوثيقة رقم ١٣٩، ص٣٨١.
٥٦- (د.ك.و) الملف نفسة، والوثيقة نفسها، ص٣٨٨.
٥٧- هەمان سەرچاوە، ل٣٨١، د.ك.و الملف نفسه كتاب المفوضية الملكية العراقية في طهران الى وزارة الخارجية المرقم ٢١/٣/٢١ والمؤرخ في ١٣/١/١٩٤٧ الوثيقة رقم ١١٠، ص٣٩٣.
٥٨- (د.ك.و) الوحدة الوثائقية: ملفات البلاط الملكي الملف ٥/٢/٥، التسلسل ٧٣٧، كتاب المفوضية الملكية العراقية في طهران الى وزارة الخارجية المرقم ٢١/٣/٢١ والمؤرخ في ١٣/١/١٩٤٧، الوثيقة رقم ١١٠، ص٢٩٣.
٥٩- (د.ك.و) الملف نفسة، والوثيقة نفسها، ص٢٩٣.
٦٠- كەوانەكان لە ئەسڵی دەقەكان هاتوون.
٦١- (د.ك.و) الوحدة الوثائقية: ملفات البلاط الملكي، الملف ٥/٢/٥، التسلسل ٧٣٧، كتاب المفوضية الملكية العراقية في طهران الى وزارة الخارجية المرقم ٢١/٣/٢١ والمؤرخ في ١٣/١/١٩٤٧، الوثيقة رقم ٩، ص٢٩٥.
٦٢- (د.ك.و) الملف نفسة، كتاب المفوضية الملكية العراقية في طهران الى وزارة الخارجية المرقم ٢١/٣/٢٢ والمؤرخ في ١٤/١/١٩٤٧ الوثيقة رقم ١١٠، ص٢٩١.
٦٣- (د.ك.و) الملف نفسة، كتاب وزارة الخارجية الى رئاسة الديوان الملكي المرقم ش/١٠٧/١٠٧/١٤/٣٥٧ والمؤرخ في ١٨/١/١٩٤٧ الوثيقة رقم ١٥٣، ص٤٠٨.
٦٤- وەزیری دەرەوەی عێراق لەو ژمارەیەدا ورد نەبوو، لە كاتێكدا ئەو ژمارەی، كە ئێرانییەكان هێنایان تا رادەیەكی زۆر لە راستییەوە نزیک بوو.
٦٥- مەبەست لە راپەرین و بزووتنەوەكانی بارزانییەكانە.
٦٦- (د.ك.و) الوحدة الوثائقية: ملفات البلاط الملكي، الملف ٥/٢/٥، التسلسل ٧٣٧، كتاب وزارة الخارجية الى رئاسة الديوان الملكي المرقم ش/١٠٧/١٠٧/١٤/٣٥٧ والمؤرخ في ١٨/١/١٩٤٧، الوثيقة رقم ١٥٣، ص٤٠٨.
٦٧- هەرێمێكە كەوتۆتە قوولایی باشووری ئێران لەسەر سنوور لەگەڵ پاكستاندا.
٦٨- (د.ك.و) الوحدة الوثائقية: ملفات البلاط الملكي، الملف ٥/٢/٥، التسلسل ٧٣٧، كتاب وزارة الخارجية العراقية الى رئاسة الديوان الملكي المرقم ش/١٠٧/٤/٣٥٧ والمؤرخ في ١٨/١/١٩٤٧، الوثيقة رقم ١٥٣، ص٤٠٨.
٦٩- راجع بهذا الخصوص: د.ك.و الملف نفسه الوثيقة نفسها ص٤٠٨. والملف نفسه كتاب المفوضية الملكية العراقية في طهران الى وزارة الخارجية المرقم ٢١/٣/٢١ والمؤرخ في ١٣/١/١٩٤٧ الوثيقة رقم ٨١٠،

ص٢٩٣.
٧٠- (د.ك.و) الوحدة الوثائقية: ملفات البلاط الملكي الملف ٥/٢/٥، التسلسل ٧٣٧، كتاب المفوضية الملكية العراقية في طهران الى وزارة الخارجية المرقم ٢١/٣/٢١ والمؤرخ في ١٩٤٧/١/١٣ الوثيقة رقم ١١٠، ص٢٩٣.
٧١- مەبەست تەنیا سۆڤیەتە.
٧٢- (د.ك.و) الوحدة الوثائقية: ملفات البلاط الملكي، الملف ٥/٢/٥، التسلسل ٧٣٧، كتاب المفوضية الملكية العراقية في طهران الى وزارة الخارجية المرقم ٢١/٣/٢١ والمؤرخ في ١٩٤٧/١/١٣ الوثيقة رقم ١١٠، ص٢٩٤- ٢٩٥.
٧٣- (د.ك.و) الملف نفسة، كتاب وزارة الخارجية العراقية الى رئاسة الديوان الملكي المرقم ش/١٠٧/١٠٧/٤/٣٥٧ والمؤرخ في ١٩٤٧/١/١٨ الوثيقة رقم ١٥٣، ص٤٠٨.
٧٤- هەندێک لە وەزیرەکانی عێراق و ئەندامەکانی ئەنجومەنی پیاوماقووڵان پێیان وابوو، بەدەنگەوە چوونی حکومەت بەداواکارییەکانی بارزانییەوە واز هێنانە لە سەروەری عێراق لە خاکی کوردستان و، هەڕەشەکردنیشە لە یەکگرتوویی خاکی عێراق: بڕوانە:
Eagleton, op. cit., p52, 371, 40038,.F. o c1369/26/93/,sir k. cor. to mr Eden. Feb 29 1944.
٧٥- (د.ك.و) الوحدة الوثائقية، ملفات البلاط الملكي، الملف ٥/٢/٥، التسلسل ٧٣٧، كتاب وزارة الخارجية العراقية الى رئاسة الديوان الملكي المرقم ش/١٠٧/١٠٧/٤/٣٥٧ والمؤرخ في ١٩٤٧/١/١٨ الوثيقة رقم ١٥٣، ص٤٠٨.
٧٦- مەبەستی لەوانە بارزانییەکانە.
٧٧- (د.ك.و) الوحدة الوثائقية، ملفات البلاط الملكي، الملف ٥/٢/٥، التسلسل ٧٣٧، كتاب المفوضية الملكية العراقية في طهران الى وزارة الخارجية المرقم ٨٥/١/٢ والمؤرخ في ١٩٤٧/٢/٢٠ الوثيقة رقم ١٢٦، ص٣٥١.
٧٨- (د.ك.و) الملف نفسة، كتاب وزارة الخارجية العراقية الى رئاسة الديوان الملكي المرقم ش/١٠٧/١٠٧/٤/١٤٥٩ والمؤرخ ٢ شباط١٩٤٧/ الوثيقة رقم ١٥٠، ص٤٠٣.
٧٩- (د.ك.و) الملف نفسة، كتاب وزارة الخارجية العراقية الى وزارة الداخلية المرقم ش/١٠٧/١٠٧/٤/٢٥١٨ والمؤرخ في ٢٧/شباط١٩٤٧/ الوثيقة رقم ١١٢، ص٣٠٠.
٨٠- (د.ك.و) الملف نفسة، والوثيقة نفسها، ص٢٩٩.
٨١- هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٨٢- هەمان سەرچاوە، الوثيقة رقم ١١٢، ص٣٠٠.
٨٣- هەڵوێستی ئەمریکا بەرامبەر بە دۆزی کورد، تا رادەیەکی زۆر لە هەڵوێستی بەریتانیاوە نزیک بوو، کە هەردووکیان لەسەر پاڵپشتی کردنی حکومەتە ناوەندییەکان کۆک بوون، لە مەسەلەی کەمە نەتەوەکانیان، ترسی ئەوەشیان هەبوو ببێتە فاکتەرێکی نارەحەتی بۆ ناوچەکە و وا بکات وڵاتانی بێگانە دەست بخەنە ناو کاروباری ناوچەکە، بەتایبەتی دەست خستنە ناو کاروباری ئەو ناوچانە لەلایەن سۆڤیەتەوە، هەروەها جەختیان لەسەر گرنگی رازیکردنی ئەو کەمە نەتەوانە دەکرد بۆ بەدەنگەوەهاتنی داواکارییەکانیان بۆ هەندێ چاکسازی.
٨٤- (د.ك.و) الوحدة الوثائقية، ملفات البلاط الملكي، الملف ٥/٢/٥، التسلسل ٧٣٧، كتاب قنصلية العراق الملكية في تبريز الى وزارة الخارجية المرقم ١٦/٧٢ والمؤرخ في ١٩٤٧/٣/٢٠ الوثيقة رقم ١٢٢، ص٣٢٧.
٨٥- د.ک.و ، هەمان سەرچاوە، ل٣٢٧.
٨٦- مەبەست سەرەک عەشیرەتەکانی باکووری کوردستانی ئێرانە.
٨٧- (د.ك.و) الوحدة الوثائقية، ملفات البلاط الملكي، الملف ٥/٢/٥، التسلسل ٧٣٧، كتاب قنصلية العراق الملكية في تبريز الى وزارة الخارجية المرقم ١٦/١/٢ والمؤرخ ١٩٤٧/٩/٢٠ الوثيقة رقم ١٢٢، ص٣٢٧.
٨٨- (د.ک.و) هەمان سەرچاوە، ل٣٢٨.
٨٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٩٠- (د.ك.و) الملف نفسة، كتاب قنصلية العراق الملكية في تبريز الى وزارة الخارجية المرقم ٢٤/١/٢ والمؤرخ في ١٩٤٧/٤/٢ الوثيقة رقم ١٣١، ص٣٦٧.
٩١- هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٩٢- شارێکە دەکەوێتە باکووری رۆژئاوای کوردستانی ئێران، لە رۆژئاوای دەریاچەی ورمێ.
٩٣- (د.ك.و) الوحدة الوثائقية، ملفات البلاط الملكي، الملف ٥/٢/٥، التسلسل ٧٣٧، كتاب قنصلية العراق الملكية في تبريز الى وزارة الخارجية المرقم ٢٤/١/٢ والمؤرخ ١٩٤٧/٤/٢ الوثيقة رقم ١٣١،

ص٣٦٧.

٩٤- لە مـاوەی (ئاداری ١٩٥٠- حوزەیرانی ١٩٥٠) بوو بە سەرەک وەزیران.

٩٥- (د.ك.و) الوحدة الوثائقية، ملفات البلاط الملكي، الملف ٥/٢/٥، التسلسل ٧٣٧، كتاب قنصلية العراق الملكية في تبريز الى وزارة الخارجية المرقم ٣٣/١/٢ والمؤرخ ١٩٤٧/٣/٢٥ الوثيقة رقم ١٣١، ص٣٦٤.

٩٦- (د.ك.و) الملف نفسه، كتاب قنصلية العراق الملكية في تبريز الى وزارة الخارجية المرقم ٢٤/١/٢ والمؤرخ ١٩٤٧/٤/٢ الوثيقة رقم ١٣١، ص٣٦٨.

٩٧- (د.ك.و)، الملف نفسه كتاب وزارة الخارجية العراقية الى وزارة الداخلية المرقم ش/١٠٧/١٠٧/٤ والمؤرخ في ٢ نيسان ١٩٤٧ الوثيقة رقم ١١٥، ص٣٠٣.

٩٨- هەمان سەرچاوە، كتاب قنصلية العراق الملكية في تبريز الى وزارة الخارجية المرقم ٢٤/١/٢ والمؤرخ في ١٩٤٧/٤/٢ الوثيقة رقم ١٣١، ص٣٦٨.

٩٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١٠٠- (د.ك.و) الوحدة الوثائقية، ملفات البلاط الملكي الملف ٥/٢/٥، التسلسل٧٣٧، تقرير قنصلية العراق الملكية في تبريز الى وزارة الخارجية المرقم ٣٣/١/٣ والمؤرخ ١٩٤٧/٣/٢٥ الوثيقة رقم ١٣١، ص٣٦٥.

١٠١- مەبەست پروپاگەندەی کۆمۆنیستەکانە، بەپێی بیروڕای ئەوان، کۆماری مەهاباد و ئازەربایجان بە پاڵپشتی سۆڤیەتییەکان دامەزران.

١٠٢- هەمان سەرچاوە، ل٣٦٦.

١٠٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١٠٤- بەم شێوەیە لە دەقەکەدا هاتووە.

١٠٥- (د.ك.و)، الوحدة الوثائقية، ملفات البلاط الملكي، الملف ٥/٢/٥، التسلسل ٧٣٧، تقرير قنصلية العراق الملكية في تبريز الى وزارة الخارجية المرقم ٣٢/١/٣ والمؤرخ ١٦ مارت ١٩٤٧، الوثيقة رقم ٥٨، ص١٥٠.

١٠٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١٠٧- (د.ك.و) الملف نفسه الوثيقة نفسها ص١٥٠، د.ك.و الملف نفسه كتاب وزارة الخارجية العراقية الى وزارة الداخلية المرقم ش/١٠٧/١٠٧/٤/٣٧٢٦ والمؤرخ ١٩ مارت ١٩٤٧، الوثيقة رقم ١٣٤، ص٣٧٣.

١٠٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١٠٩ (د.ك.و) الملف نفسة، تقرير قنصلية العراق الملكية المرقم ٣٢/٧٣ والمؤرخ في ١٦ مارت ١٩٤٧، الوثيقة رقم ٥٨، ص١٥٠.

١١٠- هەمان سەرچاوە، ل١٥١.

١١١- لە کاتی ڕاپەڕینی بارزان، ئەو ئەفسەرانە پەیوەندییان بە مەلا مستەفاوە کرد پاشان لە پەڕینەوە بۆ کوردستانی ئێران هاوڕێیەتی بارزانییان کرد، کە ئەوانە بوون: عەقید مستەفا خۆشناو، رائد خەیروڵڵا عەبدولکەریم و نەقیب محەمەد مەحموود قودسی و رائد عیزەت عەبدولعەزیز، شایەنی باسە هەر چوار ئەفسەر لە کۆماری مەهاباددا ئەو ڕوتبە سەربازییانەیان پێ بەخشرا.

١١٢- حوکمی لە سێدارەدان بەسەر شێخ ئەحمەد سەپێندرا، پاشان لەبەر گەورەیی تەمەنی، حوکمەکەی کرا بە هەتا هەتایی، لەگەڵ کۆمەڵێک لە بارزانییەکان (١٢) ساڵ لە بەندیخانەکانی عێراقیان بەسەر برد تا شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ کاتێ بارزانی و هاوڕێیانی گەڕانەوە عێراق، بەڵام حوکمی لە سێدارەدان تا مردن بەسەر هەر چوار ئەفسەرەکە لە ١٩ی حوزەیران/١٩٤٧ جێبەجێ کرا.

١١٣- کاتێ بارزانییەکان لە سنووری عێراق پەڕینەوە بۆ ئێران، دەسەڵاتەکانی عێراق بەیانێکی لە ١٤ی ئایاری ١٩٤٧دا دەرکرد، کە تیایدا حوکمی عورفی لە قەزاکانی ڕەواندز و زێبار و ناوچەکانی دیکەی قەرە بە قەرەی سنووری ئێران ڕاگەیاند، هەروەها حوکمی لە سێدارەدانی دەرهەق بە بارزانی و (١١٠) لە یاوەرانی دەرکرد، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (محمود الدرة- القضية الكردية والقومية العربية في معركة العراق، القاهرة، ص٢١٥).

١١٤- بەڵگەنامەکانی عێراق زانیارییەکی زۆری ئەو جموجۆڵانەی تێدایە، بۆ وێنە بڕوانە:

(د.ك.و) الوحدة الوثائقية، ملفات البلاط الملكي ٥/٢/٥، تسلسل ٧٣٧، ..الخ.

١١٥- (د.ك.و) الوحدة الوثائقية، ملفات البلاط الملكي، الملف ٥/٢/٥، التسلسل ٧٣٧، تقرير قنصلية العراق الملكية في تبريز الى وزارة الخارجية المرقم ٣٧/١/٣ والمؤرخ في ٥ حزيران ١٩٤٧، الوثيقة رقم ١٠٠، ص. ٢٧١

* ئەم بابەتە لە کتێبی کۆنگرەی یادەوەریی سەد ساڵەی بارزانی ئەمر لاپەرە ٨٧ - ١٢٨ وەرگیراوە.

*

# ڕۆڵی بارزانییەکان لە کۆماری کوردستان (بە گوێرەی چەند بەڵگەنامەیەک)

حامید گەوهەری

مەبەست لەڕووکردنی چەند بەڵگەنامەیەک لەسەر ڕۆڵی بارزانییەکان لە کۆماری کوردستان و پەڕینەوەیان لە رووباری ئاراس، پەردە لادانە لەسەر خەبات و تێکۆشانی نەتەوەی کوردمان، کە پتر لەیەک سەدەیە بۆ بەدەستهێنانی مافی نەتەوایەتی و رزگاربوونی لە کۆیلەیەتی هەوڵ دەدات، هەر لەو حاڵەشدا پەروەردەکردنی نەوەکانمانە لە یەکەیەکی نەتەوەیی و شۆڕشگێڕیدا بۆ بە ئەنجام گەیاندنی ئەو ڕێبازە.

بارزانییەکان دوای شکاندنی شۆڕشی بارزان، ڕۆژی ١١/١٠/١٩٤٥ باشووری کوردستانیان بەجێهێشت و ڕوویان کردە بەشی ڕۆژهەلات، هاتنیان بۆ ڕۆژهەلاتی کوردستان ڕەخنەی توندی ئینگلیز و عێراقی بەدواوە بوو.

مستەفا بارزانی بۆ هێورکردنەوەی ئەم بارە، لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەک چوو لەگوندی میراوای ناوچەی سەردەشت دابەزی و تا کۆتایی ساڵی ١٩٤٥ لەوێ مایەوە و ئینجا لە شنۆ نیشتەجێ بوو.

ڕۆژی ٢٢/١/١٩٤٦ کۆماری کوردستان لەمهاباد جاڕدرا، ڕێبەرانی حیزبی دیموکرات بەشێوەی ڕەسمیی داوایان لە مستەفا بارزانی کرد، کە بەشداری بکات لەڕێوڕەسمی ڕاگەیاندنی کۆماردا، بارزانی بەشداری کرد و دوایی گەڕایەوە شنۆ.

ڕێبەرانی کۆمار دوای گەڕانەوەی بارزانی بۆ شنۆ چەند دیداری نهێنییان لەگەڵ شێخ ئەحمەد و مستەفا بارزانی پێکهێناو داوایان لێ کردن پشتی کۆمار بگرن و ڕۆڵی خۆیان لە گەشەپێدان و سەقامگیرکردنیدا بگێڕن. مەبەستی ڕێبەرانی کۆمار لەو داوایە، ئەوە بوو کە کۆماری کوردستان پاڵپشتێکی قایم و باوەڕپێکراوی خۆیی هەبێ،

ڕۆژنامەی کوردستان ئۆرگانی حیزبی دیموکراتی کوردستان لەلاپەڕەی ٤ ژمارەی ٢١، شەممە ١١/١٢/١٣٢٤-٢/٣/١٩٤٦دا سەبارەت بەهاتنی بارزانی بۆ مهاباد دەنووسێ:

(جەنابی ئاغای مەلامستەفا قائدی کوردی بارزان ڕۆژی ٩/١٢/١٣٢٤- ٢٨/٢/١٩٤٦ ساتی ٥ پاش نیوەڕۆ واردی مهاباد بوو، وەختێ گەیشتە نیو باغان ئەندامانی کۆمیتەی مەرکزی پێشوازیان لێ کرد. وەختێ جەنابی مەلا مستەفا لەچۆمی پەڕیەوە بە ئیحترامی ئەندامانی کۆمیتەی مرکزی دابەزی لەم کاتەدا کۆمیتەی ناوەندی هەنگاویان توندتر کرد و لەقەراخ چۆمی پێک گەیشتن، برای خۆشەویست صدیق حەیدەری مەراسمی بەخێرهاتنی بەجێ هێناو هەموو ئەندامانی کۆمیتەی مرکزی بە مەلامستەفا ناساند، و ئەویش دەستی لەنێو دەستی هەموان ناو لەنهایەتی خۆشی دا بۆ کانگای حیزبی دیموکرات هاتن و لەسالۆنی ئەنجومەنی فەرهەنگی دانیشتن و لە ساعەتی ٦ حەزرەتی پێشەوای کوردستان تەشریفی بۆ کانگا هات و ملاقاتی دەگەڵ مەلا مستەفا فەرمو، لەو وەختەدا محەمەد ئەفەندی خەتاب بەحەزرەتی پێشەوا، خیتابێک کە وێنەی ئیحساساتی قەلبی مەلا مستەفا بوو لەخسوس خۆ دەپێناونانی کوردی بارزان و دەوروبەری ئەم قەومە نەجیبە لەڕێی سەربەستی کوردستاندا خوێندەوە و جەنابی پێشەواش وەلامی دانەوە و ئەوانی بێ ئەندازە بەحکومەتی کوردستان و حیزبی دیموکرات ئومێدەوار کرد، پاشان حەزرەتی پێشەوا تەشریفی بردە سالۆنی تایبەتی خۆی، ئەمجار مەلا مستەفا بە حزوری شەرفیاب بوو ماوەی دوو ساعەت پێکەوە خەریکی گفتوگۆبوون).

هاتنی ئەم جارەی بارزانی بۆ مەهاباد بەدوای ئەو پەیوەندییە نهێنییە و سازدانەدا ئەنجامی گرت، کە بارزانییەکان و ڕێبەرانی کۆماری کوردستان لەسەری ڕێککەوتبوون. محەمەد قودسی لەهۆڵی ئەنجومەنی فەرهەنگیی مهاباد، کە پێشەوا قازی و ڕێبەرانی کۆمار و حیزبی دیموکراتی لێی کۆببوونەوە، ئەو وتارە زۆر گرنگەی مستەفا بارزانی پێشکەش کرد، ئەمە یەکەم وتاری بارزانی بوو لە کۆماری کوردستاندا، وتاری بارزانی باس لە ڕێککەوتنی بارزانییەکان لەگەڵ پێشەوا قازی محەمەد و هاتنیان بۆ ریزی کۆماری کوردستان دەکات بەمەبەستی گەشەپێدانی دیموکراسی، گەشەپێدانی باری ئابووری گەل، دابینکردنی ئازادییە دیموکراتییەکان و هەوڵدان بۆ ئازادکردنی بەشەکانی تری کوردستان و سەربەخۆیی گەلی کورد لە چوارچێوەی کوردستانی مەزندا، ڕۆژنامەی کوردستان لەلاپەڕەی ٣، ژمارە ٢٣، چوارشەممە ١٥/١٢/١٣٢٤- ٦/٣/١٩٤٦دا دەقی وتاری بارزانی بڵاوکردۆتەوە:

"بەناوی کوردی وریا بووەوە لەژێر ماوەی پەیڕەوی کۆنی زەبر بەدەستی، بەناوی سەرکردەی شۆڕشی گەل لەبارزان، شۆڕشی بەرهەڵستی سەرکەوتن، شۆڕشی نەهێشتنی زوڵم و ئیستبداد، ڕۆژباش پێشکەشی دانیشتوانی ئەم کۆبوونەوەیە دەکەم، کە ئالای پیرۆزیان لە سییەیەکی نیشتمانی گەورەدا بڵند کردووە، هاوارتان دەکەینێ، کە ئەم بەرە پیرۆزە بەئازادی و سەربەخۆیی پێ بگەینێن، بەناوی فرمێسکی چاوی بێوەژنان و ئاهو ناڵینی هەتیوانەوە هاوارتان دەکەین کە پەیمانی حقوقی گەل بدەن، ئیقتصادیان بپارێزرێت، پشتی فەرهەنگ بگرن بە پەروەردە کردنیان بەگیانی دیموکراتییەوە، پارێزگاری لە دیموکراتی بفەرموون کە کاریگەری پێشخستنی گەل و سەربەخۆیی نیشتمان و ڕۆیشتنە بەرێوەیە لەگەڵ کاروانی گەلانی ئازادە و تەواویەتی و مروانی.

بێگومان لەبیر ناکرێت، کە حکومەتی کوردستانی ئازاد هێشتا لەیەکەم قۆناغییەتی و کۆششی ئێوەی پێ دەوێت، بۆ سەرکەوتنی کوردستانی مەزن و ڕزگاربوونی یارمەتی گەلیشی پێویستە، ئەو بەشانەی نیشتمانی مەزنمان، کە لەژێر دەستی بێگانەدان، گەلی کوردستانی مەزن چاوی بڕیوەتە یارمەتی ئەو ئالایە، کە لەسەر ئەم حکومەتە دەشەکێتەوە، دەیەوێت بێتە ژێر سێبەرییەوە، لە پیاوەکانی حکومەت دەخوازین، کە براکانیان لەپەیوەندی ئاسنینە ڕزگار بکەین، کە تێدا دەناڵێنن.

پێشەوای معظم: گەورەکانم

ئەو سیاسەتە حەکیمە جوانەی کە پارتی دیموکراتی کوردستان لەسەری ڕۆیشت و سەربەخۆیی نیشتمان و ئازادی کوردی وەرگرت، ئامادەیە کە بچێت بەهاواری نیشتمانی گەورە و گەلی کورد سەرتاپا ڕزگار بکا، لەم کاتەدا لەهەموو کانی دڵمانەوە و یاریدەی ڕاستیمانەوە بەردو گەورەترین شەخسیەتی کورد، ئەو شەخسیەتەی، کە گەلی کوردی بەبیری بەهێزی و سەرکردەیەکی حەکیمانەوە بەڕێگای دیموکراتیدا بردو گەیاندییە سفەری ئازادی. بە کۆششێکی عەبقەری و عەزمێکی قایم و سەرکردەی دیموکرات، پێشەوای موعەزەمی کوردستان جەنابی قازی محەمەد، خۆمان پێشکەش دەکەین.

با هەموو پێکەوە هاوار کەین بژی سەرکردەی موخلیسی کوردستان، بژی گەلی کوردی پشت بەست بەدیموکراتی بژی پارتی ئازادی کوردستان و پارتی گەل بژی پارتی دیموکرات، بژی نیشتمانی مەزن بەسەربەخۆ و ئازادی، بژی یەکەتی سۆفیاتی مەزن هەتابی گەلانی خۆش بەختی ئازادی و سەربەخۆیی".

هەروەک گوتم، بەرلەوەی، کە بارزانی بچێتە مهاباد، بارزانییەکان لەسەر پەیمانێکی دوو لایەنە ڕێککەوتبوون، کە هاوکاری کۆمار بکەن، لەم چوارچێوەیەدا بارزانییەکان لەڕۆژی ١/٣/١٩٤٦ و هەڵسووڕانی خۆیان لەکۆماری کوردستاندا دەست پێکرد، ڕۆژنامەی کوردستان لەلاپەڕە ٣، ژمارە ٢٦، دووشەممە ٢٧/١٢/١٣٢٤- ١٨/٣/١٩٤٦دا ئاماژەی بۆ ئەم دیدارانە کردووە و پەنجەی بۆ بەشێک لەدیدار و سەرلێدانەکانی بارزانی لەدەزگا حکومیی و مەدەنییەکانی کۆماری کوردستان ڕاکێشاوە، بە مەبەستی خۆپێناساندن و بەرزکردنەوەی

وردی بەرپرسان و راکێشانی گەل بەردو پشتگیریکردنیان لەکۆمار:

**رۆژی جومعه ١٠/١٢/١٣٢٤ واته ١/٣/١٩٤٦.**

ئەندامانی حیزب و ئەشراف و ئاغایانی شاری مهاباد و رونەسای عەشایر یەک بەدوای یەکدا چوونه خۆ پێناسینی میوانی خۆیان، هەر کە کاتی نوێژی جومعه هات زەعیم مەلا مستەفا لەگەڵ ئەندامێکی هەیئەتی مەرکەزی حیزب تەشریفی بردە مزگەوتی جامعە و فریضەی خودای مەزنی لەگەڵ هەموو موسڵمانانی شاری مهابادا لەسەرخۆ لابرد و دوایی لەناو قەڵەباڵغێکی زۆردا گەڕایەوە یانەی فەرهەنگی مەرکەزی حیزب.

**رۆژی شەممو ١١/١٢/١٣٢٤:**

بەیانی ١١/١٢/١٣٢٤ زەعیم مەلا مستەفا و ئەفسەرانی و یەکێک لە ئەندامانی هەیئەتی مەرکەزی ئاغای ئەحمەد ئیلاهی تەشریفیان چووە هێزی کوردستان و هەرکە گەیشتە ئەوێ لەلایەن قەرەوڵی تایبەتییەوە رەسمی تەعظیمی بۆ کراو، سەرکردانی هێز بەسەرکردەی فەرماندەی هێزی مەرکەزی محەمەد نانەوازادە پێشوازی کراو، یەکە یەکە سەرکردەکانی پێ ناسرا. نزیکی نیو سەعاتێک لەگەڵ سەرکردەکاندا رای بوارد و لەدواییدا یەکە یەکە چووە لای سەرکردەکان لەجێگای خۆیاندا و پیرۆزبایی خۆی پێشکەش کردن و داوای لێ کردن، کە هەموو بەگیانێکی پاکی نیشتمان پەروەرانەوە ببنە سپری نیشتمان و پێشخزمەتی پێشەوای موعەظم، کانگای هێزی بەجێ هێشت و بەبزوکی حەضرەتی پێشەوا رووی کردە دەبیرستان و لەوێ قوتابییەکان هەموو کۆببوونەوە لە دوای زیارەتی مامۆستاکان و رەئیسی هەیئەتی فەرهەنگ ئاغای رەشید ئاغای هەمزە ئاغا تەشریفی بردە لای شاگردەکان و لێرەدا ئەفسەر عەبدولڕەحمان تەیب موفتی چەند ئامۆژگاری و پیرۆزباییەکی بەناوی زەعیم مەلا مستەفاوە پێشکەش کردن لەدواییدا رووی کردە[1] ئیدارەی شارەوانی و مەئمورانی ئەو ئیدارەی زیارەت فەرموو... هەروەها رووی کردە مەدرەسەی گەلاوێژ و بەهۆی ئاغای ئەحمەد ئیلاهیەوە مامۆستایانی ناسین و یەکە یەکە بە پۆلەکاندا گەڕاو لە هەموو پۆلێک ئەفسەر محەمەد مەحمود بەناوی زەعیم مەلا مستەفاوە ئیزهاری خۆش وەختی و ئامۆژگاری بۆ شاگردەکان کرد.

لە دواییدا تەشریفی بردە مەدرەسەی کوردستان دیسان لەگەڵ مامۆستایان خۆناسینیان کرد و بەیەک یەک پۆلەکاندا گەڕاو لەهەر پۆلێک سروودێک دەخوێندرایەوە. ئینجا زەعیم مەلا مستەفا گەڕایەوە مەرکەزی حزب. ئێوارەی ئەو رۆژە، بارزانی و محەمەد مەحموود قودسی لەگەڵ ئەحمەدی ئیلاهی سەردانی چاپخانەی کوردستان دەکەن و لەلایەن قادری مدرسی مودیری چاپخانەی کوردستانەوە پێشوازیان لێ دەکرێ.

رۆژی ٣/٣/١٩٤٦، بارزانی لەگەڵ ئەفسەرانی هاوڕێی و ئەحمەدی ئیلاهی سەردانی حاجی سەید بابە شێخ سەرۆکی هەیئەتی رەئیسەی میللی کوردستان دەکات و دوای سەعاتێک گفتوگۆ دەگەڕێتەوە ناوەندی حزب.

رۆژی ٤/٣/١٩٤٦، بارزانی لەگەڵ کەریم نەجمەدین دەچێتە شارەداری شاری مهاباد و لەلایەن میرزا غەنی خەسرەوی سەرۆکی شارەوانییەوە پێشوازی لێ دەکرێ، لەوێوە لەگەڵ محەمەد مەحموود و عەبدولڕەحمان تەیب موفتی سەردانی پێشەوا قازی کردووە.

هەروەها رۆژنامەی کوردستان لەلاپەرەی ٤، ژمارە ٢٨، چوارشەممە ٧/١/١٣٢٥ - ٢٧/٣/١٩٤٦دا، وتارێکی سەرۆک بارزانی بلاوکردووەتەوە، کە لەلایەن محەمەد مەحمووددەوە ئاراستەی لاوان کراوە، کوردستان دەنووسێ:

برا خۆشەویستەکانم:

بەناوی زەعیمی خۆشەویستەوە بەناوی جوانانی کوردستانی مەزنەوە، کە لەژێر باڵی زوڵم و دیکتاتۆرەتیشدا هێشتا واز لە تەعەصوبی میللی ناهێنن و تێدەکۆشن و خۆیان تووشی تاریکی گرتیخانە و پێوەندی ئاسنین دەکەن پیرۆزباییتان پێشکەش دەکەین.

لەلایەن هەموو چینەکانی گیتییەوە زانراوە، کە بۆ ئاسودەگی هەموو میللەتێک کۆششی شەو و رۆژی جەوانان

و پلاندانی پیرە خاوەن بیرەوەرییە بەنرخەکانیەتی. لەبەر ئەوە ئەی لاوانی رەوشەن فکری کورد، بەرەو یەکیەتی، بەرەو کۆششێکی شەو و رۆژیی بۆ بلاوکردنەوەی شارستانیەتی، بۆ بلند کردنەوەی نیشتمان ئەو نیشتمانەی کە سەدەها ساڵ بوو کاول و ویرانەی دەستی دوژمنی بەدفەڕ بووە ئیمڕۆ، ئا لەم چاخی بیستەمەدا کە بەهۆی عەبقەریەت و دووربینی پێشەوای موعەظمی کوردستان و ئەندامانی بەشەرەفی حزبی دیموکراتەوە بەهۆی لاوانی بازوو ئاسنینی کوردەوە گەیشتە ئازادی نابێ ئەوەتان لەبیر بچیت کە ئیستا پێویستی کۆششە لەژێر سێبەری باڵی یەکەتی بەگیانێکی دیموکراتی راستەوە.

لاوان: لاوان کوردی ژێر دەستە چاوەڕوانی کۆششی ئێوەن بۆ رزگارکردنیان، بۆ ئازاد کردنیان، لە دواییدا دەڵێم بژی پێشەوای موعەظمی کوردستان بژی جەوانانی کورد و کوردستانی مەزن، بژی هەموو میللەتێکی ئازاد.

چالاکیی بارزانییەکان لەکۆماری کوردستاندا بەو وتارانەی مستەفا بارزانی دەستی پێکرد، دوای ئەو، بارزانییەکان لەهێزی پێشمەرگەی کوردستان و دەزگاکانی پەروەردە و بەرێوەبەرایەتی کۆماردا جێیان گرت. بارزانی پلەی ژەنەراڵیی پێبەخشرا و ئەفسەرە هاورێکانیشی پلەی بالای سەربازییان وەرگرت، چوار بەتالیۆنیان لە بارزانییەکان پێکهێناو بەهۆی ئەفسەرەکانیانەوە، کە پێشتر لەسوپای عێراقدا بوون مەشقی سەربازییان پێکرا، سێ بەتالیۆنیان رەوانەی بەرەی شەڕی سەقز کران، کە بەرەیەکی پڕ لە مەترسی بوو بۆ کۆماری کوردستان و چەند ئەفسەریش لەدەستەی ئەرکاندا رێکخران و لەگەڵ بارزانیدا بوون و بەتالیۆنەکەی تریشیان ناردە بەرەی شەڕی سەردەشت.

بارزانییەکان یەکەم هێزی پارێزەری کۆماری کوردستان بوون، کە بەدڵپاکیی قورسایی شەرەکانیان خستە سەرشانی خۆیان، ئەم فیداکارییەی بارزانییەکان راستەوخۆ کاری کردە سەر کوردەکانی رۆژهەلاتی کوردستان و سەرۆک هۆزەکانی کێشایە ژێر سێبەری ئالای کوردستانەوە و لە راپەرین رزگاری کردن. بەچەشنێک لەشکرێکی ٨٨٠٠ پیادەو ١٧٠٠ سوارەی لێ پێکهێنان[٢].

بارزانییەکان لە چەند شەڕ و پێکدادانی سەخت و دژواری وەک شەڕی (مامەشا) و (ملقەرەنی) و (قاراوا)دا سەرکەوتنی مەزن و سەرسوڕهێنەریان بەدەست هێنا. لەشەڕی (قاراوا)دا ٨٠ کەسیان لە لەشکری ئێران کوشت و ١٢٠ کەسیشیان بە دیل گرت و چەک و تەقەمەنییەکی زۆریشیان دەست کەوت، حەمە رەشیدخان فەرماندەی هێزی بۆکان و سەرا لەنامەی رۆژی ١٣٢٥/٢/١٢-١٩٤٦/٥/٢ بۆ پێشەوا قازی دەنووسێ:

**بابەت: سوپاسکردن لە قارەمانەتی هێزەکانی بارزانی**

١- بە کەماڵی رووسووری و سەربەستی و سەربەرزی کردەوەی خارەقی عیلی بارزانی و ئەفسەر و سەرکردەکانتان بەعەرز دەگەیەنم. هەرچەندە بە نووسینی ژمارە ١٤٦- ١٣٢٥/١٢/١١- ١٩٤٦/٥/١ موختەسەری ئەوم تەقدیم بە (ستادی کل) کردووە، بەلام بۆ ئەوەی پێشەوای بەرزیش لە رەشادەتی ئەم برا بەقیمەتانەم ئاگادار بکەم ئەوە نموونەیەکی قابلەتیان عەرز دەکەم.

٢- لەرۆژی ١٣٢٥/٢/٩ سەعات ١٠ر١١ پێش نیوەڕۆ دوژمن بۆ جیبهەتی سەرچاوە و جیبهەتی سەرا لەناکاو هجومی کردە سەر ملقەرەنی، کە لەژێر نزارەتی بەکر ئاغای حەویزیدا بوو و لە جیبهەتی سەرا هجومی ئیستحکاماتی سەرای کرد، کە لەژێر نزارەتی میرحاجدا بوو. جیبهەتی تریشیان رووی کردبووە ئەو شانەی، کە جنابی راستە کێوی بالوقای پێ دەڵێن و لەژێر نظارەتی مستەفا خۆشناودا واقع بوو.

لەو وەختەی کە دوژمن لەهەموو لایەکەوە خەریکی تەقدم (پێشرەوی)و ئاگرباران بوو، پێشمەرگەکانی هێزی بارزانی یەک بەیەک بە نهایەتی حەماسەتی و نەشلەژان گوێیان لە ئەوامری فەرماندە و قیادەی خۆیان راگرت و بە وێنەی نظامی مودەربی دەوڵەتی و صرفا تەتبیقی ئەو پرۆگرامانەیان دەکرد، کە لە تەرەف قیادە و سەرکردە و ئەفسەران دەبێژرا بە ئەندازەیەک لە ئیقدام و فنونی جەنگ و نیشان گرتن و هەڵمەت بردن شارەزا بوون، کە قەڵەم لە نووسینی عاجزە.

٣- سەرکردەی بارزانی، ئاغای میرحاج، ئاغای حەویزی، ئاغای مستەفا خۆشناو و وەهاب ئاغای ناوە فوق العادە سەربەرزیان کردم حەقیقەتەن خزمەتی ئەو چوار زابتە گەنجە بەهەموو مەعنایەکەوە تقدیری دەکرێ. ئەوە لە شەرەفێکی سیاسەتی خاوێن دەبن و هەرچواریان شایستەی سوپاس و خەڵات کردنن و رێورەسمی سەربازی حوکم دەکات بە بارەگای مەزنی کۆمار بناسرێن و سوپاس لە پاڵەوانەتیان بکرێ. لەبەر ئەوەدا داوا دەکەم چۆنیەتی ئەو عەمەلیاتە سەرکەوتووە لەدۆسیەی پێشمەرگایەتی ئەواندا راگرن، بەپێویستی دەزانم، کە جەنابتان بەشێوەی رەسمی ئەم فەرماندانە خەڵات بفەرموون.

٤- جێگرەکانی ئەو فەرماندانە، بەڕێزان محەمەد ئەمین میرخان، مامەند مەسیح، ساکۆو خۆشەوی خەلیل، کە ئەوپەڕی نیشتمانپەروەریان پێشاندا، خەڵات کردنیان پێویستە. لەبەر ئەوە داوای دانی پلەی باڵا بۆ ئەو پاڵەوانە حەماسە خوڵقێنەرانە دەکەم، کە لەعەمەلیاتی ئەوان سوپاس بکرێ.

٥- لەم بارەیەوە لەگەڵ زەعیمی گەورە مەلا مستەفا قسەم کردووە، بەڕێزیان لەگەڵ ڕای من هاودەنگن.

**فەرماندەی هێزی بۆکان و سەرا**[٣]

شەڕی مامەشا و قاراوا سەرەڕای هۆشیار کردنەوەی دوژمن، تێیگەیاندن، کە ئەوان لەو هەلومەرجەدا ناتوانن لەرێگای شەڕەوە چۆک بەگەلی کورد دابدەن. بەگەلی ئێمەشی سەلماند، کە تەنیا لەرێگای یەکێتی ریزەکانی، دیسپلینی دەرک کراوە. ئیمانی بەهێز و سەرکردەیەکی خاوەن ئەزموونی بەتوانا و نەترسەوە دەتوانێ بەسەر دوژمندا زاڵ بێت. دیسپلینی قایم و دەرککراوی بارزانییەکان و هەست بە بەرپرسایەتی کردنیان لەبەرەکانی شەڕو بنکەکانی پاراستن و چاودێریدا بۆ رێبەرانی کۆمار و سەرۆک عەشیرەتەکانی رۆژهەڵاتی کوردستان و بەگشتیی بۆ گەلی کوردمان جێگەی سەرسوڕمان بوو، تەنانەت کاتێک ئەو شێوازە بۆ سەدری قازی روون بووەوە، بەڕێزیان بەم جۆرە هەڵوێستی گرت:

لە یەکێک لە رۆژەکانی ناوەڕاستی مانگی مای ساڵی ١٩٤٦، پێشمەرگەکانی بازگەی مامەشا لە کاتژمێر ١٢ی نیوەڕۆدا، ئۆتۆمبیلی سەدری قازی رادەگرن، سەدر دەڵێ: من برای پێشەوا قازیم و لێیان دەپرسێ: ئەگەر منتان بناسیبایە دیسان چاوتان لە ئۆتۆمبیلەکەم دەکرد؟ پێشمەرگەکان دەڵێن: بەڵێ! چونکە ئێمە دەبێ بەتووندیی دەستووری فەرماندەکانمان بەجێ بگەیەنین، سەدر لە بیستنی ئەم قسەیە بەخۆشحاڵییەوە ناوی فەرماندەکەیان دەپرسێ. ئەوانیش دەڵێن فەرماندەی ئێمە بەکر عەبدولکەریمە، سەدری قازی سوپاسیان دەکات و ئەم نامەیەی خوارەوە دەنووسێ و دەیدات بە یەکێک لە پێشمەرگەکان، کە بۆ فەرماندەکەیان بگەیەنێ:

پێشمەرگەکانی کوردستانم بینی، لەخۆشییان لەپێستی خۆمدا نەدەگونجام، باوەڕبکە بیست ساڵ جوانتر بوومەوە، نازانم چۆن و بە چ شێوەیەک سوپاسی خۆمتان ئاراستە بکەم، دیسپلین و ئەرک شناسی پێشمەرگەکانی کوردستان جێگەی سوپاس و پێزانینە، پێمخۆش بوو لەنزیکەوە بەخزمەتتان بگەم، بەڵام چونکە دەبێ بچمە بۆکان و مهاباد، هەلی ئەوەم بۆ نارەخسێ. ئۆتۆمبیلەکەم دەنێرمە لاتان، دیتنی ئێوە بۆ من زۆر جێگەی خۆشحاڵییە.

**سەدری قازی**[٤]

ئەوە نموونەیەکی بەرچاوە لە خزمەتی بارزانییەکان لەکۆماری کوردستاندا، کە هەمیشە ئەوانی لای دۆست و دوژمن سەربەرز راگرتووە، بۆ ئەوەی پتر هەڵسوکەوتی ئەو فەرماندە زانایە لەبەرچاوبگرن، کە چۆن لەبەرامبەر دوژمندا سەری خۆی و بارزانییەکان و رێبەرانی کۆماری کوردستانی بەرز راگرتووە، هێزەکانی سوپای ئێران لە سەردەشت رۆژی جەژنی قوربانی ساڵی ١٩٤٦ هێرش دەکەنە سەر ناوچەی سوێسنایەتی و بەتوندی دەشکێن، سەرلەشکر ئایروم دوای شکانی هێزەکانیان داوای بینینی فەرماندەی پێشمەرگەکان لە پێشەوا قازی دەکات و ئەویش ئەم نامەیە بۆ بەکر عەبدولکەریم حەوێزی دەنووسێ:

- سەر لەشکر ئایروم لەتارانەوە دەیەوێ جەنابتان ببینێ بەمەبەستی چارەسەر کردنی کێشەی نێوانتان، لە تارانەوە بۆ ئەم مەبەستە پەیوەندییان بە ئێمەوە گرتووە، ئێمە هیچ کۆسپێک لەسەر رێگای ئەو دیدارەدا نابینین.

سەعاتێک دوای گەیشتنی نامەی پێشەوا، نامەیەکی سەر لەشکر ئایروم بە بەکر عەبدولکەریم حەوێزی دەگات، ئایروم لە نامەیەکدا دەڵێ: ئێمە ئامادەین فڕۆکەیەکتان بۆ بنێرین کە ئێوە بگەیەنێتە سەردەشت، بەکر لە وەڵامدا پێی رادەگەیەنێ: پێویست ناکا ئێمە لە سەردەشت یەکتر ببینین، قوڵتێ بۆ هەردوولامان باشترە، چونکە یەکەیەکی ئێوەی لێیەو لە رەبەتیش دوور نییە و ناردنی فڕۆکەشی ناوێ، ئەم دیدارە لەسەر پێشنیازی بەکر عەبدولکەریم لە قوڵتێ پێکدێ، سەرەتا ئایروم دەڵێ:

- ئێمە ئێستا وەک دوو دۆست لە پەنای یەکتر دانیشتووین، حکومەتی شاهنشاهی خودموختاری کۆنفدراڵی کوردەکانی بە رەسمی ناسیوە، من لەپلەی سەر لەشکرێکی حکومەتی شاهنشاهیدا و ئێوە لە پلەی فەرماندەی پاسدارانی سنووری کوردستانی خودموختار لە چوارچێوەی سنوورەکانی ئێراندا، لە جەنابت داوا دەکەم، کە کارێک بکەن پێش بە تێکهەڵچوونی نێوانمان بگیرێ، بۆ ئەوەش چەند پێشنیازتان ئاراستە دەکەم و هیوادارم قبوڵیان بفەرموون.

١- ئەو بنکەیەی کە لەنێوان قوڵتێ و سەردەشت داتانناوە، گەلێک دژوارییە بۆ سەربازەکانی ئێمە پێکهێناوە، لەبەر ئەوە دەبێ ئەو بنکەیە کۆبکەنەوە.

٢- ئیزن بە نوێنەرانی ئێمە بدەن هاتوچۆی گوندەکانی ژێر دەسەڵاتی ئێوە بکەن و بۆ کرینی ئازووقە و گیاوگۆڵ، کە سوپا پێویستی پێیانە، من لەبەرامبەر ئەو کارانەتان دوو ملیۆن تمەنتان بەدیاری پێشکەش دەکەم تا تۆش پێداویستییەکانی خۆتی پێ دابین بکەی، وەڵامی بەکر عەبدولکەریم بەم جۆرە لە بەڵگەنامەکانی ئێراندا راگیراوە:

١- ئەگەر تاران حکومەتی فیدراڵی کوردستانی لە چوارچێوەی سنوورەکانی ئێراندا بە رەسمی ناسیوە، هێرشی هێزەکانی سوپای ئێران بۆ ناوچەی سوێسنایەتی لە رۆژی موبارەکی مانگی قورباندا چ مانایەکی هەیە؟ ئایا ئەو رۆژە موبارەکە بۆ هەموو موسڵمانانی جیهان نییە؟

٢- هۆی پروپاگەندەی بەربڵاوی سەرهەنگ پزشکیان لە سەردەشت و بانە و ناوچە کوردنشینەکانی ژێردەسەڵاتی ئێوە و تاوانبارکردنی رێبەرانی کۆماری کوردستان و هێزی پێشمەرگەی کۆمار بە خودانەناسیی واتای چییە؟ ئایا ئێمە ناوچەکەمان تووشی شەڕ و ئاژاوە کردووە یان عەشیرەتەکانی بانە کە بە فەرمانی ئێوە گوندەکان دەسووتێنن و بەزەبیان بەگیان و ماڵ و نامووسی خەڵکدا نایە؟ مەگەر ئەوان (گوندی) ئێران نین؟ ئەگەرنا بۆچی ئاوا هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکەن؟ ئێمە لەهەر کردەوەیەک کە ئاشتی و ئەمنیەت دابین بکات پێشوازی دەکەین.

٣- یەکەم داوای ئێوە بۆ هەڵگرتنی بنکەی قوڵتێ- سەردەشت قبوڵ دەکەم بۆ ئەوەی بزانن ئێمە لایەنگری شەڕ و ئاژاوە نین، سەعید زادە ئەو بنکەیەی دانابوو، کە جێگەکەی ناهەموارە و ئەمنییەتی سەربازی نییە.

٤- لەبارەی دووەم داواتان، پێویستە بڵێم، هیچ پێویست بەوە ناکات نوێنەرانی ئێوە زەحمەت بکێشن و بۆ کرینی ئازووقە بچنە گوندەکان، من هەوڵ دەدەم جوتیارەکان بەرهەمەکانیان بۆ فرۆشتن بێننە سەردەشت.

٥- لەبارەی یارمەتی پێشنیازکراوتان، ئەو پارەیەتان لێ قبوڵ دەکەم و سەر لەنوێ پێشکەشی سەربازانی سوپای شاهنشاهی دەکەمەوە، چونکە رام وایە سەربازانی ئێوە کە مانگی تمەنێک معاشیانە، پتر لە پێشمەرگەکانی ئێمە، کە مانگی ١٢٠ تمەن وەردەگرن، پێویستیان پێیەتی، داواکارییەکانی بەکر عەبدولکەریم بەم جۆرە بوو:

١- گواستنەوەی سەرهەنگ پزشکیان لە سەردەشت.

٢- گەڕاندنەوەی کەسێک بەناوی محەممەد قادرخان، کە ئێستا لە سەردەشت لەلای سەرهەنگ پزشکیانە، ئەو کەسە ئەسپێک و تفەنگێک و دەمانچەیەکی لە شارەبانی مهاباد دزیوە.

٣- ئیزن بدەن پێشمەرگەکانی کوردستان بۆ دابینکردنی پێویستییەکانیان و بینینی خزم و کەسیان هاتوچۆی سەردەشت بکەن.

٤- هەر کەسێک بە بەڵگەی کۆماری کوردستان بێتە سەردەشت بەرگری لێ مەکەن.

دوای نزیکەی سەعاتێک هەردوولا ڕێککەوتن و دوای تێپەڕبوونی دوو ڕۆژ بەسەر ئەو دیدارەدا، سەرهەنگ ئایروم نامەیەکی لەگەڵ ئەو شتانەی لە شارەبانی مهاباد دزرابوون ڕەوانەی بەکر عەبدولکەریم کرد، ئایروم نووسیبووی: شتە دزراوەکانم ناردووە، بەڵام محەممەد قادر ڕایکردە عێراق و هەروەها سەرهەنگ پزیشکیانیش بۆ ناوچەیەکی تر نەقڵ کرا[٥].

شەڕی بەرگریکەرانەی بارزانییەکان لە کاتێکدا ئەنجامیان دەگرت، کە نەخۆشی تایفۆئید وەک گەڵای دار بارزانییەکانی دەوەراندە سەر زەوی و ڕۆژ نەبوو، کە چەند کەسیان لێ نەمرێت، لە شەش مانگی یەکەمی ساڵی ١٩٤٦دا ١٥٠٠ بارزانی و هەتا کۆتایی ١٩٤٦، نزیکەی ٢٠٠٠ ژن و منداڵ و پیاوی بارزانی مردن و هیچ گوند و ئاواییەکی ناوچەی بۆکان، مهاباد و شنۆ نەبوو، کە گۆڕستانێکی تایبەت بە بارزانییەکانی لێ نەبی، کەچی بارزانییەکان لەگەڵ ئەو کارەساتەشدا قورسایی ئەرکی مەزنی خۆیان هەڵگرت، کە پاراستنی کۆمار بوو[٦].

دەوڵەتی ئێران دوای شکانی هێزە چەکدارەکانی لە شەڕی مامەشا لە ١٩٤٦/٢/١٥ و شەڕی قاراوا لە ١٩٤٦/٤/٢٩دا، لە فکری فێڵ و تەڵەکە و کات گوزەراندن و خۆ تەیارکردن کەوت بەو هیوایەی سوپای سۆڤیەت ئێران بەجێبهێڵێ و پەلاماری گەلی کورد و ئازەربایجان بدات، بەم مەبەستە، سەرەڕای پتەوترکردنی پەیوەندییەکانی بە سەرۆک هۆزە خۆبەدەستەوە دەرەکانەوە، داوای وتووێژی لەگەڵ ڕێبەرانی کۆماری کرد، بە ڕواڵەت بۆ ئەوەی کێشەی تێکهەڵچوون لەبەرەکانی شەڕدا نەهێڵێ، ڕۆژنامەی کوردستان لەبارەی وتووێژی ڕۆژی ١٣٢٥/٣/٢٦- ١٩٤٦/٦/١٦ پێشەوا قازی لەگەڵ کاربەدەستانی سوپای ئێران دەنووسێ:

– ڕادیۆی کوردستان ڕایگەیاند حەزرەتی پێشەوای کوردستان لە تەورێزەوە چووەتە سەرا، کە لەگەڵ سەرتیپ ڕەزمئارا وتووێژ بکات و فەرمانی پێویست بۆ بەرەی شەڕ، ڕابگەیەنێ، لە ئەنجامی ئەو وتووێژەدا، پێشەواو ڕەزمئارا لەسەر ئەو خاڵانەی خوارەوە ڕێککەوتن:

١- ئیزن بە هێزەکانی سوپای ئێران دەدرێ، کە ئازووقە لە سەقزەوە بۆ هێزەکانیان لە میرەدێ و بانە و سەردەشت بەرن.

٢- هێزەکانی ئێران مافی ئەوەیان نابێ، کە چەک و تەقەمەنی بۆ ئەو ناوچانە بەرن و ئەفسەر و سەربازی ئەو جێیانە بگۆڕن بە هۆی نەخۆشی و بریندار بوونیان.

٣- نوێنەرێک لە حکومەتی کوردستان لەگەڵ ئەو ئازووقانەی حکومەتدا دەبێ لە ڕێگاکاندا.

٤- ئەگەر سوپا ئەو پەیمانە لە ژێر پێ بنێ، ئەوە کوردەکان مافیان دەدرێتێ، کە پێش بە هەموو هاتوچۆ و ڕاگواستنێک بگرن و ڕێگا ببەستن[٧].

دوای ڕێککەوتنی پێشەوا لەگەڵ ڕەزمئارا، پێشەوا قازی ڕۆژی ١٩٤٦/٦/٢١ بەفڕۆکە چووە تاران و چاوی بە قەوامولسەڵتەنە و ڕەزمئارا فەرماندەی بەرەی شەڕی کوردستان کەوت، قەوام بەقازی محەممەدی ڕاگەیاند، کە دەیەوێ لەشکری ئێران بگەڕێنێتەوە سەر دۆخی بەر لەشەهریوەری ١٣٢٠ یولی ١٩٤١ و کوردستانی ئێران. لەهەرێمێکی جوگرافیاییدا کۆبکاتەوە و فەرمانداریێک بکاتە سەرپەرشتی و تەنانەت پێشنیازی بەقازی کرد، کە ئەو بەرپرسایەتییە لە ئەستۆ بگرێ.

دوای گەڕانەوەی پێشەوا قازی بۆ مهاباد، هەلومەرجی کوردستان گۆڕا، ئەگەر تا ئەو کاتە فەرماندەکانی سوپا و کاربەدەستانی حکومەتی ئێران بۆ جێبەجێکردنی پیلانەکانیان بەشێوەی نهێنی پەیوەندییان بەسەرۆک عەشیرەتە جاشەکانەوە دەگرت، لەمەودوا بەشێوەی ئاشکرا پیلانەکانیان بەڕێگای بەرپرسانی حیزبیی و حکومەتییەوە بە ئەنجام دەگەیاند.

لەو پەیوەندییەدا بوو کە محەممەدی نانەوازادە فەرماندەی لەشکری ٣ی هێزی ناوەندیی کۆماری کوردستان سواری فڕۆکەی دوژمن بوو و ڕۆژی ١٩٤٦/٧/١٧ کاتی گەڕانەوە لەبانە بۆ سەقز، فڕۆکەکەی

بەڕواڵەت سوتا لەنزیک کەلیخان کەوتە خوارێ و شەهید بوو، ئەم کارانەی ڕێبەرانی کۆماری کوردستان کاردانەوەی ڕاستەوخۆیان هەبوو لەسەر چالاکیی بارزانییەکان و ڕێگای بەرەنگار بوونەوەی دوژمن پاراستنی بەرژەوەندەکانی کۆماری کوردستانی لێ گرتن. بۆ ڕوونکردنەوەی پتری ئەم باسە سەیری ئەم دوو نامەیەی خوارەوە بکەن:

**نامەی یەکەم:**

**لە سەرتیپ هومایونی بۆ حەمە رەشید خانی بانە**

ژمارە ٧٢٣- ٢٦/٤/١٣٢٥ واتە ١٧/٧/١٩٤٦

بە گوێرەی ڕاپۆرتی سەرهەنگ غەفاری ئەو کەلوپەلانەی خوارەوە، کە بە لۆری بۆ سەربازگەی بانە رەوانە کراون، لەتەمۆغە بەهۆی چەکدارەکانی بارزانی نیشتەجێ لەقشلاق زەوت کراون، دەستوور بدەن بۆ گێڕانەوەی کەلوپەلەکان و هەنگاوی پێویست هەڵگرن.

١- ناڵ و بزمار

٢- سەماعەیەکی بێتەل.

٣- دەمانچەیەکی سەرهەنگ غەفاری.

**فەرماندەی لەشکری چواری کوردستان**

**سەرتیپ هومایونی**[٨]

**نامەی دووەم:**

**لە سەرتیپ هومایونی بۆ حەمە رەشید خانی بانە**

ژمارە ١٢٧٦- ٢٨/٤/١٣٢٥ واتە ١٩/٧/١٩٤٦

بۆ ناردنەوەی ئەو هەشت دەزگا لۆرییانەی دەوڵەت، کە ڕۆژی پێشوو لەلایەن کوردەکانەوە بەبێ هۆ لە تەمۆغە گیراون و لەوێوە نارداونەتە ناقکەندی سوپاستان دەکەم، و...

**فەرماندەی لەشکری چواری کوردستان**

**سەرتیپ هومایونی**[٩]

دوژمن لەژێر پەردەی ئەو ڕێککەوتنە ڕواڵەتییەیدا لەگەڵ پێشەوا قازی، لەلایەک جاسووس و خۆفرۆشە بەزیوەکانی لەدەوری خۆی کۆکردەوە و لەلایەکی تریشەوە بەو دەرەتانەی کە ڕێبەرانی کۆماری کوردستان بۆیان ڕەخساند، سەربازگەکانی بانە و سەردەشتی بەتانک و تۆپ و زرێپۆش و تەنانەت فڕۆکەی بۆمبهاوێژ و ژمارەیەکی زۆر سەرباز و پسپۆری جەنگی تەیار کرد. پەیتاپەیتا پەلاماری گوندەکانی دەدا، تاڵانی دەکردن، دەیسووتاندن و دانیشتوانی ئاوارە دەکرد، پێشەوا قازی لەدوو بروسکەی جیاوازدا بۆ کاربەدەستانی حکومەتی ئێران بەڕوونی ئاماژە بۆ ئەم کارەساتە دەکات.

**بروسکەی یەکەم:**

بۆ جەنابی سەرۆک وەزیرانی ئێران، کۆپییە بۆ سەرکردایەتی سوپای ئێران، بۆ سەدری قازی نوێنەری کوردستان لەپەرلەمانی ئێراندا و بۆ نوێنەرانی ئازەربایجان.

بەدرێژەی بروسکەکانی پێشوودا، سەقز، بانە و سەردەشت کە لەدابەشکردنەکانی پێشوودا لەگەڵ گەروس سەر بە ئازەربایجان بوون- سەردەشت هەروا سەر بە ئازەربایجان ماوەتەوە، دەوڵەت چەند لەشکر و ژمارەیەکی زۆر فڕۆکە، تانک، زرێپۆش و تۆپی لێ کۆکردووەتەوە و هەموو ڕۆژێش ژمارەی چەکدارەکانی لەوێ زیاد دەکات و خەریکی پیلانگێڕیی و هاندانە، بەنوێنەری ئێمەیان گوتووە، ئامادە نین تەنانەت یەک سەربازی خۆیان لەوێ لابەرن و گشت تانک، فڕۆکە و زرێپۆشەکانمان لەو جێیە دەمێننەوە، کەوا بوو، بۆ ئێمە دەرکەوت دەوڵەت کە بەڵێنی دابوو دوای وتووێژ بڕیار دەدا دەستبەجێ هێزەکانی لەو ناوچانە بگوازێتەوە سەر دۆخی بەر لەشەهریور ١٣٢٠ (یولی ١٩٤١)، بۆ ئەوە بوو کە بڵاوە بەهێزەکانی کورد بکات و سوپای شاهنشاهی وەک پێشوو ئازاد بێ لەکوشتنی براکانی، ئەگەرنا بۆچی بەڵێن و پەیمانەکانیان بەڕێوە نەبرد. ١٣٢٤- ٣١/٥/٢٥- ٢٢/٨/١٩٤٦

**محەممەدی قازی**[١٠]

کۆماری کوردستان کە ڕۆژگارێک جێگای هیوا و ئومێدی کوردی هەموو بەشەکانی کوردستان بوو، بەرە بەرە لەبەرامبەر پیلانگێڕییەکانی دەوڵەتی ئێران تاقەتی لێ برا، سوپای ئێران بەیارمەتی جاش و جاسوسەکانی و سەرۆک

عەشیرەتە خۆبەدەستەوەدەرەکان، کۆماریان هەڵۆڵ کرد، ئەگەر سەردەمێک کۆماری کوردستان لەتوانایدا هەبوو سەقز، بانەو سنە ئازاد بکات بەشێک لەرێبەرانی و بارزانییەکان بیری ئازادکردنی بەشەکانی دیکەی کوردستانیان لە مێشکدابوو، ئیتر ئەمڕۆ بەتووندی دەستیان بەکڵاوی خۆیانەوە گرتبوو کە با نەیبات و کەوتبوونە ناو هەلومەرجێکەوە کە توانای پاراستنی هەرێمی ئازادکراوی کۆماریشیان نەبوو، پێشەوا قازی محەمەد بەرپرسایەتییەکی مەزنی کەوتبووە سەرشان و ئەوانەش کە دڵپاک بوون لەگەڵی ژمارەیەکی کەم لەکاربەدەستانی کۆمار و بارزانییەکان بوون، کە ناوچەی خۆیان لە هەر چەشنە دەستدرێژییەک پاراستبوو. بۆ روونکردنەوەی پتری ئەو مەسەلەیە بروانە ئەو نامانەی خوارەوە. بزانن چۆن شیرازەی کارەکان هەڵوەشاوە و پێشەوا بۆ پاراستنی شوێنەکانی تر جیا لە داوای یارمەتی لە قەوامولسەلتەنە چارەیەکی بۆ نامێنی پێشەوا قازی لەبروسکەی خوارەوەدا بۆ قەوام دەنووسێ:

جەنابی سەرۆک وەزیر، هەرچەندە لە نامەی ژمارە ٢٩١٧دا بەراشکاوی فەرمووتان لەرووداوی دەستدرێژ کردنی سەربازگەی سەردەشت و قەتل و عام و تالانکردنەکانی دەکۆڵنەوە، بەداخەوە هێشتا ئاوڕتان لەو مەسەلەیە نەداوەتەوە. خەڵکی گوندی کەڵوێی سەردەشت بەهۆی پەلاماری هێزەکانی دەوڵەت رایان کردووە. چەند گوندی دیکەش تالان کراون و سووتێنراون و ژمارەیەکی زۆریش لەخەڵکی سەردەشت هێشتا لەزینداندا راگیراون و شکنجە دەدرێن، لەتارانەوە فەرمانتان بەلەشکری چوار دا، کە کۆتایی بەدەستدرێژییەکان و پەلاماردانەکانی بێنێ، کەچی بەداخەوە هەنگی سوارە هێشتا بەگزادە و فەیزوڵلا بەگی و ئەوانی تری بۆ سەقز بانگهێشت نەکردووە و بەشێک لەماڵێک و دانیشتوان بەژن و منداڵەوە رایان کردووە و پەنایان بۆ مهاباد هێناوە. کاتی هێرشکردن بۆ سەر رەعییەتە هەژارەکان سێ سەد تەن کای ئەوانیان بەولاغی گوندییەکان بردووەتە سەقز. چونکە لەبەهاری ئەمساڵدا بەهۆی لەشکرەکەشی هێزەکان گیا نەما، رەنگە بردنی کای گوندییەکان هۆی لەناوچوونی ئاژەڵەکان پێکبێنێ. لەبەر ئەوە داوای رەحم و تێڕوانینتان لێ دەکەم.
٤٢٠٤- ٧/٩/٢٥- ٢٨/١١/١٩٤٦

**محەممەدی قازی**[11].

سوپای سۆڤیەت لە سێپتەمبەری ١٩٤٦ کوردستان و ئازەربایجانی بەجێهێشت. لەگەڕانەوەیدا بۆ سۆڤیەت ئەو بەیاننامەیەی خوارەوەی بڵاوکردەوە:

(برا ئازیزە کورد و ئازەرییەکانی نیشتەجێ لەئازەربایجان، ئێوە دەزانن، کە دەوڵەتی سۆڤیەتی مەزن هەمیشە پشتیوانی نەتەوە چەوساوەکانی جیهانە. ئێمە کاتی هاتنمان بۆ ئازەربایجان، هەرگیز لە یارمەتیدانی خەڵکی خۆشەویستی ئازەربایجان لەبوارەکانی سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئابووریدا کۆتاییمان نەکرد. ئێستا کە بەرژەوەندی سۆڤیەت و ئێران لەوە دایە، کە هێزە سیاسی و سەربازییەکانمان لە ئێران بەرینە دەر و بیانگێڕینەوە سۆڤیەت، بەپێویستی دەزانین کە لەمیوانداربیەتی ئێوە لەو ماوەیەدا سوپاس بکەین)[12].

پاشەکشەی سوپای سۆڤیەت لەکوردستان و ئازەربایجان و دوابەدوای ئەو هەڕەشەی قەوامولسەلتەنە، رێبەرانی کۆماری کوردستان و ئازەربایجانی ناچارکرد، کە مەسەلەکە زۆر بەجیددی بگرن، لەبەرئەوە رۆژی ١٦/ ١٠/١٩٤٦ پەیمانێکی سەربازیی هەشت خاڵەیان پێکەوە مۆرکرد، لە خاڵی چوارەمی ئەو پەیمانەدا، سەرۆک مستەفا بارزانی بەسەرۆکی گشتیی هێزە هاوبەشەکانی کۆماری کوردستان و ئازەربایجان لەبەرەی شەڕی سەقز هەڵبژێراوە.

دوای پاشەکشەی سوپای سۆڤیەت، کە ئاواتی سەرەکی دەوڵەتی ئێران بوو، قەوامولسەلتەنە بەیاننامەیەکی بۆ خەڵکی ئێران بڵاوکردەوە و رایگەیاند: چونکە دەمانەوێ لە ئێران هەڵبژاردن بکەین، لەبەر ئەوە پێویستە هەموو ئێران بەبێ جیاوازی لەلایەن هێزەکانی دەوڵەتەوە ئیدارە بکرێ.

نوێنەرانی کۆمار بەئاگاداربوون لەو بەیاننامەیە، چوونە ورمێ و چاویان بەهاشمۆف کونسوڵی سۆڤیەت لەورمێ کەوت. ناوبراو ئاگاداری کردنەوە، کە تاران بەنیازە هێزێکی بچووک بنێرێتە مهاباد تا سەرپەرشتی هەڵبژاردن بکات، بەڵام رواڵەتی کارەکە بەو جۆرە نەبوو. سوپای

ئێـران لە تارانەوە بەرەو زەنجـان بەڕێکەوت و دوای چەند هەرەشـەی توند، ڕۆژی ٢٤/١١/١٩٤٦، ئەو شـارەی گـرتەوە، دوکـتـۆر جـاوید پارێزگـاری تەورێز ڕۆژی ١١/١٢/١٩٤٦، لە بروسکەیەکدا بۆ قەوام ڕایگەیاند:

-... من هەمیشە هەوڵمداوە بەنیەتی پاکی بەڕێزتان مەسەلەی ئازەربایجان چارەسەر بکەم، ئەو مەسەلەیەم لەگەڵ بەڕێز سەیفی قازیش هێناوەتە گۆڕێ، کە ئەویش تووشی براکوژیی نەبێ، هەر ئێستا دەستوورم بەهێزە یارمەتیدەرەکانی بەرەی شەڕی سەقز داوە کە بگەڕێنەوە، تا بەم جۆرە پێشگیریی لەشەڕو پێکهەڵپڕژان بکرێ. هێزەکانی ئێران بەبێ شەڕ دەگەنە تەورێز. ئەگەر ئیزن بدەن بۆ پێشوازیی لێکردنیان دەچمە شاری میانە.

ڕۆژی ١٣/١٢/١٩٤٦، سوپای ئێران بە سەرۆکایەتی سەرتیپ هاشمی گەیشتە تەورێز و پیشەوەری و ژمارەیەک لە ڕێبەرانی کۆماری ئازەربایجان ڕایانکردە ئازەربایجانی سۆڤیەت.

ڕۆژی ١١/١٢/١٩٤٦ بارزانی بەهۆی ئەو نامەیەی کە دوکتۆر جاوید بۆ ئەفسەرانی کۆماری ئازەربایجانی ناردبووە بەرەی شەڕی سەقز، ئاگاداریی پەیدا کرد، کە سوپای ئێران بۆ گرتنەوەی تەورێز چووە و لەنێوان شاری میانە و تەورێزدا شەڕ بەرپا بووە، بارزانی دەستبەجێ فەرمان بەحەمەدەمین میرخان فەرماندەی بەتالیۆنی یەکەم دەدات، کە بەرەو میاندواو بچێ و بۆ خۆشی هەر ئەو ڕۆژە خۆی دەگەیەنێتە میاندواو، بەڵام لەوێ پێدەزانێ کە هیچ بەربەرەکانییەک لەنێوان موجاهیدەکانی کۆماری ئازەربایجان و سوپای ئێران ڕووی نەداوە و بگرە سەرکردەکانی ئازەربایجان ڕایان کردووەتە باکۆ، بارزانی حەمەدەمین میرخان دەنێرێتەوە سەرا و خۆشی دەگەڕێتەوە ئەوێ، لە سەرا میرخان ڕەوانەی مهاباد دەکات کە ئاگای لە خێزانی بارزانییەکان بێ.

بارزانی بەشێک لە هێزەکانی لە بەرەی شەڕی سەرا ڕاگرت و فەرمانی بۆ دەرکردن کە بەرپەرچی هاتنە پێشەوەی هێزەکانی ئێران بدەنەوە و چاودێروانی فەرمان بن، بەشەکەی تری نارد، کە خێزانەکانی دێهاتی نێوان بۆکان و مهاباد بەرنەوە مهاباد و لەوێ کۆیان بکەنەوە.[١٢]

ڕۆژی ١٦/١٢/١٩٤٦، بارزانی دەگاتە مهاباد و چاوی بە پێشەوا قازی و لێپرسراوان دەکەوێ و بۆی دەردەکەوێ کە هیچکام لە لێپرسراوانی مهاباد نیازی بەربەرەکانی سوپای ئێرانیان نییە و هەموویان خۆیان بەدەستەوە دەدەن، دوای ئەوە بارزانی چاوی بە قازی محەمەد دەکەوێ و لێی دەپرسێ دەتەوێ چی بکەی؟ پێشەوا لە وەڵامدا دەڵێ دەمەوێ خۆم فیدا بکەم.

بۆ ئەوەی خوێنی خەڵکی مهاباد نەڕژێ، خۆم بەدەستەوە دەدەم، تەنانەت بۆ ئەم مەبەستە پەیوەندییم بە ژەنراڵ هومایونییەوە کردووە، لەو کاتەدا فرمێسک لە چاوەکانی قازیدا قەتیس دەبێ، بە بارزانی دەڵێ: جیا لە پیاوەکانی خۆت پشت بەکەس مەبەستە، زۆرن ئەوانەی سوێندیان بۆ من خواردبوو، کەچی ئێستا بۆ خزمەتی سوپای ئێران پێشبڕکێیانە، هەروەها دەمەوێ لەسەرۆک هۆزەکان وریا بی و بڕوایان پێ نەکەی، تکاش دەکەم بەزووترین کات مهاباد بەجێبهێڵە تا لێرەدا لەگەڵ لەشکری ئێران بەگژ یەکدا نەچن، بارزانی دەڵێ:

- "قازی هەستایە سەر پێ و بەگریانەوە ماچی کردم و گوتی: لە خوا دەپاڕێمەوە بتپارێزێ و سەرکەوتوو بی، با ژیانی من فیدای هاونیشمانەکانم بێت و ببێتە هۆی دوورخستنەوەیان لەو بەڵایەی هەڕەشەیان لێ دەکا... ئەوەی گوت و ئاڵایەکی کوردستانی لە گیرفانی دەرهێناو دایمێ و گوتی: ئەمە ڕەمزی کوردستانە دەتدەمێ وەکو سپاردەیەک لات بێ، چونکە پێموایە تۆ لەهەموو کەس باشتر پارێزگاری دەکەی[١٣].

بنەماڵەی بارزانییەکان لە ناوچەی مهاباد و بۆکانەوە دەبەن لە نەغەدەو شنۆ و گوندەکانی نزیکیان کۆیان دەکەنەوە و شێخ ئەحمەدیش دەگاتە شنۆ، کۆبوونەوەیەک لەگەڵ سەرکردەکان پێک دێنن، بڕیار دەدەن دوو هێڵی بەرگریش لە دۆڵی بەراندز و دۆڵی قاسملوو دانێن و هەتا بۆشیان بکرێ بەهۆی سەرما و سۆڵی زستان خۆ لە تێکهەڵچوونی هێزەکانی جاش و سوپای ئێران بپارێزن، دیارە سوپای ئێرانیش ئەزموونی شەڕی بارزانییەکانی هەبوو و خۆی لە قەرەیان نەدەدا.

پاشەکشەی بارزانییەکان لە مهاباد، گەڕانەوەی سوپای ئێرانی بۆ ئەوێ و رووخانی کۆماری کوردستانی بەدواوە بوو.

بەرلەوەی کە مهاباد بکەوێتە دەست دوژمن ژمارەیەک لە سەرۆک عەشیرەتەکان و دەوڵەمەندەکانی شاری مهاباد، لەوانە میرزا رەحمەتی شافعی، شێخ حەسەنی شەمسی بورهانی، عەلی ئاغای ئەمیر عەشایری (ئەمیر ئەسعەد) رۆژی ١٩٤٦/١٢/١٤، بۆ پێشوازیکردن لە سەرتیپ هومایونی چوونە میاندوئاو.

رۆژی ١٩٤٦/١٢/١٦، قازی محەمەد، سەیفی قازی و حاجی سەید بابە شێخ پەیمانی تەسلیم بوونی کۆماری کوردستان و دوورخستنەوەی بارزانییەکانیان مۆر کرد.

رۆژی ١٩٤٦/١٢/١٧، قازی محەمەد و سەرکردەکانی تری کۆماری کوردستان، تا نزیک گوندی "گۆگ تەپە" لە ١٣ کیلۆمەتری باکووری رۆژهەڵاتی مهاباد، بە پێشوازی سوپای ئێرانەوە چوون و هێزەکانی ئەرتەشیان بە سەرۆکایەتی سەرهەنگ (غەفاری) هێنایەوە مهاباد.

پێشەوا قازی لەگەڵ محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازی و سەدری قازی چەند رۆژ دوای جێگیربوونی لەشکری ئێران لە مهاباد، دەستبەسەر کران و لە شەوی ٣٠- ١٩٤٧/٣/٣١، لە دادگایەکی فەرمایشی ئێراندا، کە لە مهاباد پێکهات، بە فەرمانی راستەوخۆی محەمەد رەزا شا، سەر لەبەیانی رۆژی ١٩٤٧/٣/٣١، لەو جێیەی کە کۆماری دیموکراتی کوردستانیان لێ دامەزراندبوو، لە سێدارە دران.

دوای کشانەوەی بارزانییەکان لە مهاباد، ژەنراڵ هومایونی فەرماندەی لەشکری چواری ورمێ داوای بینینی شێخ ئەحمەد و مستەفا بارزانی کرد، هومایونی و سەرگورد غەفاری بەیەکەوە لە ماڵی قوڵیخانی نەغەدە، چاویان بە شێخ ئەحمەد و مستەفا بارزانی کەوت، لەو کۆبوونەوەیەدا، هومایونی لە شێخ ئەحمەدی پرسی: دەتانەوێ چی بکەن؟ شێخ گوتی نامانەوێ لەگەڵ سوپای ئێران بەشەڕ بێین... هومایونی لە وەڵامدا رایگەیاند: باشترە ئەو مەسەلەیە لەگەڵ کاربەدەستانی تاران باس بکەن[١٥].

شێخ ئەحمەد پێشنیازی هومایونی قبوڵ کرد و بڕیار دەدا بارزانی بچێتە تاران، بارزانی رۆژی ١٩٤٦/١٢/٢١، بەرەو تاران کەوتەڕێ، عیززەدین عەبدولعەزیز، نوری ئەحمەد تەها، میرحاج ئەحمەد، حەمەدەمین میرخان، جەمیل تۆفیق بامەڕنی و خاڵد زراری لەگەڵ خۆی برد و سەرگورد غەفاریشیان لەگەڵ چوو.

لە تاران زۆر بەرێزەوە پێشوازییان لە بارزانی و هەڤاڵانی کرد، لەوێ چاوی بە سەرۆک وەزیران و سەرۆکی سوپای ئێران کەوت، ئەوان دوو رێگایان لەبەردەم بارزانییەکاندا دانا، یان چەک بن و لەناوچەی هەمەدان نیشتەجێ بن، یان بە پەلە بگەڕێنەوە عێراق، بارزانی پێیان رادەگەیەنێ، کە من ناتوانم بڕیار بدەم، تا نەچمەوە لای شێخ ئەحمەد، کە ئەو دەسەڵاتدارە.

حکومەتی ئێران دەیویست بۆ جێبەجێکردنی پیلانەکانی مەلا مستەفا بە بارمتە رابگرێ لەو رێگایەوە شێخ ئەحمەد و بارزانییەکانی پێ تەسلیم بکات، بەم مەبەستە لیژنەیەکی رەوانەی لای شێخ ئەحمەد کرد، لیژنەکە پێی راگەیاند: یان بەپەلە بگەڕێنەوە عێراق یان چەک بن و ئامادەی گواستنەوە بۆ هەمەدان بن، ئەگەرنا بارزانی ناگەڕێتەوە، وەڵامی شێخ ئەحمەد ئەوە بوو، کە دوای کەوتنی سەرما و توانەوەی بەفر لە بەهاردا ئێران بەجێ دێڵین، لەبارەی مستەفا بارزانیش رایگەیاند: ئێمە سەر بۆ هەڕەشە دانانێین، هەرکام لە بارزانییەکان مستەفایەکن، حکومەتی ئێران بە بیستنی هەڵوێستی شێخ ئەحمەد، ناچار بوو هێور بێتەوە و رۆژی ١٩٤٧/١/٢٩، بارزانی و هەڤاڵانی گەڕاندەوە.

ترسی حکومەتی ئێران لەبارزانییەکان سەبارەت بەچەک نەبوون و بەجێ نەهێشتنی ئێران، سوپای ئێرانی تووشی زنجیرە شەڕێکی ناخواستە کرد، هەروەکو پێشتر ئاماژەم بۆ کرد، سوپای ئێران تەجروبەی رووبەڕوو بوونەوەی لەگەڵ بارزانییەکان هەبوو و دەیزانی بەشەڕ ناتوانێ بەسەریاندا زاڵ بێ، لەو زنجیرە شەڕانەدا کە بەهێرشی هێزەکانی ئێران و بەیارمەتی سەرۆک هۆزە جاشەکان بۆ سەر بارزانییەکان لە نەڵۆسە، گۆجار، مەرگەوەڕ و چەند بەرزایی ناوچەی شنۆ ئەنجامی گرت. بارزانییەکان زەبری قورسیان لە سوپای

ئێران وەشاند و تا ئەو رۆژەش کە بۆ خۆیان دەسنیشانیان کردبوو لە ئێران دەرنەچوون.

رۆژی ۱۰/٤/۱۹٤۷، بارزانییەکان بەگوێرەی بڕیاری سەرکردەکەیان گەیشتە سەر سنووری دەستکرد و لە رووباری گادەر پەڕینەوە و بۆ خولقاندنی حەماسەیەکی تر، کە مێژووی گەلی کورد شانازی پێوە دەکات بەشێوەی کاتی ئێرانیان بەجێهێشت. بۆ ئەوەی بەدروستی ئاگاداری رۆڵی بارزانی و بارزانییەکان بین لە کۆماری کوردستاندا باشتر ئەوەیە گوێ لەپێشەوا قازی بگرین و بزانین چۆن و بە چ شێوەیەک لەبارەی بارزانی بۆ سەرهەنگ عەتایی سەرۆک دادگای رژێمی پەهلەوی دەدوێ:

- لە چەند رستەیەکدا دەتوانم بڵێم مەلا مستەفا بارزانی، ئەوی لە پیاوەتی و کەرامەت و شەرافەت و ئینسانییەت و شوجاعەت و نەبەزی و سەخاوەت و نەترسی لەمێژوودا کەسانی مەزن بوویێتیان، مەلا مستەفاش هەیەتی، ئەوەی موسڵمانانی سەدری ئیسلام لەباوەڕ و راستی و پاکی و دڵسۆزی بۆ خودا و ئایین و خەڵکی هەژار و داماوی میللەت بوویانە، بارزانی هەموو ئەوانەی تێدایە، هەروەکو سەعدی دەڵێ: "هر آنچه خوبان همه دارند، او بتنها دارد"، جا حەز دەکەن باوەڕ بکەن و پێتان خۆش بێ یا حەز دەکەن پێتان ناخۆش بێ، هەموو ئەوانەی لەدادگەدا بەهەف بوون، سەریان لەو تاریفەی قازی محەمەد سوڕما.

لە باشووری کوردستان، ژن و منداڵ و بەساڵداچووەکانی دەگەڕێنەوە عێراق و ٥۰۰ پێشمەرگەی گیانفیدا بەگوێرەی بڕیارێک کە پێشتر دابوویان، لە بەرامبەر سێ دەوڵەتی داگیرکەری عێراق، تورکیا و ئێراندا، داستانێکی وەها لەبیرنەکراویان تۆمارکرد، کە لەمێژووی نەتەوەی کورد و نەتەوە کۆلۆنییەکانی جیهاندا جێگەی شانازییە و لەبیر ناچێ.

دەوڵەتی ئێران لە راپۆرتێکدا، ناوی ئەو هێزانەی دەنووسێ، کە بۆ سەرکوتکردنی بارزانییەکان و گرتنی مستەفا بارزانیی رەوانەی کردبوون، ئەوانە بریتی بوون لە: هەنگێک و دوو گورهانی سوارە، ۱۱ گوردانی پیادە، ۳ دەستەی خومپارەهاوێژ، ۱٤ تانک، گورهانێک و دوو دەستە تۆپخانەی ۷٥ میلیمەتری، دوو دەستە رەشاش، ۱۲٥ سوارەی چەکدار لە عەشیرەتی شکاک و ۱۰۰ سوارەی چەکدار لە عەشیرەتەکانی هەرکی و بەگزادە، ژمارەی گشتیی ئەو هێزانە پتر لە پێنج هەزار چەکدار بووە و سەرهەنگ نیساری، سەرهەنگ فولادوەند، سەرهەنگ سەرداروەر، سەرتیپ بێگلەری و سەرتیپ زەنگەنە فەرماندەی لەشکری ورمێ و دەیان ئەفسەری تر سەرۆکایەتییان دەکرد.

رێبەرایەتی کردنی دروستی بارزانی و وردەی بەرزی بارزانییەکان لەو کەش و هەوا سارد و بەفرینەی ئەو کاتدا، شکانی هێزەکانی دوژمنی مسۆگەر کرد و بەدەوڵەتی ئێرانی سەلماند، کە هێزی پرچەکی داگیرکەر ناتوانی گەلی مافخوراوی کورد بەچۆکدا بدات. شای ئێران شکستی سوپاکەی بۆ قبوڵ نەدەکرا و فەرمانی دا بەوەزارەتی جەنگ، کە لێپرسراوانی ئەو شکستەی پێ بناسێنێ. لەم روانگەیەوە وەزارەتی جەنگ لەنامەی ژمارە ۲۰٤۳/نا - ۲۱/۳/۱۳۲٦دا بە سپەبود شابەختی راگەیاند:

بەئەمری شاهەنشا بەئێوە رادەگەیەنین، هەر وەک ئاگادارن بارزانییەکان رۆژی ۱۳۲٦/۳/۸-۲۷/٥/۱۹٤۷ خزاونەتە ناو خاکی ئێران و بەڕاگەیاندنی پەیتاپەیتامان بە لەشکری چوار بۆ راونان و سەرکوتکردنیان. لەشکر تەنیا توانی رۆژی ۱۳۲٦/۳/۱۹ تووشی سەربزێوەکان بێ، ژمارەی ئەندامانی لەشکر دە بەرابەری ژمارەی سەربزێوەکان بووە و چەکی هەمە جۆرە و ئۆتۆمبیل و شتی تریان پێ بووە و بارزانییەکان بەتێکڕا پیادە بوون و هیچ چەشنە وەسیلەیەکی گواستنەوەیان پێ نەبووە. خاوەن شکۆ شاهەنشا کە بەو کارەساتەی زانی، فەرمووی: دەبێ لەماوەی ٤۸ کاتژمێردا کۆتایی بەو مەسەلەیە بهێنرێ، ویستی بەرێزتان قەت بەجێ نەگەیشت و تەنانەت رۆژی ۱۳۲٦/۳/۱۹ سەربزێوەکان لەناوچەی (شوت) تووشی لەشکر دەبن و لە پێکهەڵچوونێکدا کە لەشکر رایگەیاندووە، ۳۱ کەسی لێ کوژراوەو ۳٥ کەسیشی بریندار بووە و بارزانییەکانیش توانیویانە بەرەو باکوور درێژە بەڕەوتەکەیان بدەن، لەبەر ئەوەی ئەو مەسەلەیە

گەلێک گرنگ و سەرنجڕاکێشە، شاهەنشا ئەمری فەرموو، کە کۆمیسیۆنێک بەسەرۆکایەتی ئێوە و ئەندامەتی سەر لەشکر خەسرەوانی، سەرتیپ گەرزەن، سەرتیپ وسوق پێکبێت و بچنە ناوچەکە و لەوێ بەوردیی لەهەموو ڕووداوەکە بکۆڵنەوە و ڕوون بکرێتەوە:

١- بۆچی لەشکر لەکاتی خۆیدا فەرمانەکەی بەجێ نەگەیاندووە؟

٢- بۆچی کاروانەکان بەو هەموو چەک و کەرەستانەیانەوە، سەرنەکەوتن؟

٣- کێ لەو عەمەلیاتەدا کەمتەرخەمی کردووە؟

٤- هۆی دواکەوتنی عەمەلیات چی بووە و کێ کەمتەرخەمی لە بەڕێوەبردنیدا کردووە؟

ئەو ڕووداوە، ئابروو و کەرامەت و پلەو پایەی سوپای ئێرانی لەلای دراوسێکان و تەنانەت لەلای عەشایری ناوچەکەش دابەزاند و دەری خست، کە سوپای ئێران تا چ ڕادەیەک لاواز و بێدەسەڵاتە، زۆر زوو ئاکامی لێکۆڵینەوەتان ڕابگەیەنن تا بە خزمەتی شاهەنشا بگات.؟

سەرۆکی سەرکردایەتی سوپای ئێران- سەرلەشکر ڕەزمئارا[١٦].

**سوید ٢٠٠٢/١٢/٤**

* سکرتێری فیدراسیۆنی کۆمەڵە کوردییەکان لە سوێد

**سەرچاوەکان:**

١- ماوەی ئەم ڕاپۆرتە لەلاپەڕەی ٣، کوردستانی ژمارە ٢٧، دووشەممە ١٣٢٥/١/٥- ١٩٤٦/٣/٢٥ دا نووسراوە.

٢- بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد ١٩٣١- ١٩٥٨، لاپەڕەی ١٥٢، ١٥١، نووسینی مەسعود بارزانی.

٣- لەبەر ئەوەی کە نامەی دەستنووسی حەمە ڕەشید خان لە کتێبی دەوڵەتی جمهوری کوردستان (نامە و دۆکومێنت)، کۆکردنەوەی مەحموود مەلا عززەتدا بە تەواوی نەدەخوێندرایەوە بەشێک لەنامەکەم لە وەرگێڕاوی فارسی وەرگرتووە، بڕوانە لاپەڕەی ١٠٢- ١٠٣، کتێبی قازی محەمەد و کۆمار لە ئاوێنەی بەڵگەنامەدا، نووسینی بەهزادی خۆشحالی، هەمەدان ١٣٨٠.

٤- قازی محەمەد و کۆمار لە ئاوێنەی بەڵگەنامەدا، لاپەڕەی ٢٣٧- ٢٣٨، نووسینی بەهزادی خۆشحالی، هەمەدان ١٣٨٠.

٥- هەمان سەرچاوە لاپەڕە ٢٤٠- ٢٤٤.

٦- بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد ١٩٣١- ١٩٥٨، لاپەڕەی ١٥٦، نووسینی مەسعود بارزانی.

٧- قازی محەمەد و کۆمار لە ئاوێنەی بەڵگەنامەدا، لاپەڕەی ٢٤٨، نووسینی بەهزادی خۆشحالی، هەمەدان ١٣٨٠.

٨- قازی محەمەد و کۆمار لە ئاوێنەی بەڵگەنامەدا، لاپەڕەی ٢٢٧، نووسینی بەهزادی خۆشحالی، هەمەدان ١٣٨٠.

٩- بەڵگەی دەستنووسی هومایونی، بڕوانە لاپەڕەی ٣٢٦، دەوڵەتی جمهوری کوردستان (نامە و دۆکومێنت) کۆکردنەوەی مەحمود مەلا عززەت و لاپەڕەی ٢٣٩، قازی محەمەد و کۆمار لە ئاوێنەی بەڵگەنامەدا، نووسینی بەهزادی خۆشحالی، هەمەدان ١٣٨٠.

١٠- بروسکەی پێشەوا لە کتێبی (نهێنییەکانی موحاکەمەی قازی و دۆستانی)، کۆکراوەی محەمەد ڕەزا سەیف قازی وەرگیراوە، بەڵگەکە بەژمارەی ١٤٩٨- ١٥- ١١٦٠٠٧، لە ئەرشیوی ڕێکخراوی بەڵگەنامەکانی نەتەوەیی ئێراندا ڕاگیراوە.

١١- هەمان سەرچاوە بە ژمارەی بەڵگەنامەی ١٥٠١- ١٥- ١١٦٠٠٧.

١٢- قازی محەمەد و کۆمار لە ئاوێنەی بەڵگەنامەدا، لاپەڕەی ٨٠، نووسینی بەهزادی خۆشحالی، هەمەدان ١٣٨٠.

١٣- بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد ١٩٣١- ١٩٥٨، لاپەڕەی ١٦٨، نووسینی مەسعود بارزانی.

١٤- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ١٦٩.

١٥- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ١٧٢.

١٦- لە کوردستانی عێراقەوە تا ئەوبەری ڕووباری ئاراس، مورتەزا زەربەخت، لاپەڕەی ٩٤- ٩٥ چاپی تاران، ساڵی ١٩٩٧.

* ئەم بابەتە لە کتێبی (بارزانی لە ویژدانی ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا) وەرگیراوە.

# باری ئابووری هەولێر لە کاتی جەنگی دووەمی جیهاندا

مەغدید حاجی

بێگومان دووەمین جەنگی جیهانی کاریگەرییەکی زۆری لەسەر وڵاتە جۆر بە جۆرەکانی جیهان جێهێشتووە، بەتایبەتی وڵاتە بەشداربووەکان لەم جەنگەدا، چونکە بۆ یەکەمین جار بوو بە شێوەیەکی فراوان فرۆکەی جەنگی بەکاربێت، جگە لە هەموو جۆرە چەکێکی دیکە کە لە جەنگی یەکەمینی جیهان بەکار نەهاتبوون. بۆیە قەبارەی وێرانکاری و کوشتن و برین لەم جەنگەدا یەکجار فراوان بوو، ژمارەی کوژراوانی گەیشتە (٥٠) ملیۆن کەس.

باشووری کوردستان و شاری هەولێر و دەوروبەری بەشێک بوون لە عێراق، عێراقیش لەگەڵ دەستپێکردنی جەنگی جیهانی لە ئەیلولی ١٩٣٩ باری دارایی و بازرگانی خاو بوونەوە و پاشاگەردانی بەخۆوە بینی، پارەدارەکان پارەکانیان لە بانکەکان دەردەهێنا و هەموولا ڕاکەڕاکەیان بوو بۆ کڕین و هەڵگرتنی دانەوێڵە و کەلوپەلی خواردەمەنی.

لەبەر ئەوەی عێراق دەوڵەتێکی سەربەخۆ نەبوو، لەژێر چاودێری و داگیرکردنی هێزەکانی بەریتانیادا بوو خاوەن حکومەتێکی ئەڵقە لە گوێی بەریتانیادا بوو، بۆیە لەلایەک ڕووداوەکانی جەنگ (١٩٣٩-١٩٤٥) ڕاستەوخۆ کاریان لە عێراق دەکرد و باری ئابووری عێراق لە خراپییەوە بەرەو خراپتر دەچوو بەتایبەتی هەرێمی کوردستان، لەلایەکی تریشەوە، کە هەرێمی کوردستان هەر لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە بە عێراق لکێنراوە. هەمیشە نە لە رووی سیاسی و نە لە رووی ئابووری بارودۆخی ئەم هەرێمە سەقامگیری و پێشکەوتنی بەخۆوە نەدیوە، جەنگی دووەمی جیهان بەردەوام بوو، کە لەشکری حکومەتی عێراق بە پشتیوانی بەریتانیا لە زەمینی و لە ئاسمان هێرشی کردە سەر ناوچەی بارزان بۆ دامرکاندنەوەی شۆڕشی بارزان بەسەرکردایەتی مەلا مستەفای بارزان و پشتیوانی حزبی هیوای نەتەوە پەروەری کورد، کە هەولێر بنکەیەکی بەهێزی بوو، جا لێرەدا پارێزگای هەولێر دووجار دووچاری دەرئەنجامەکانی جەنگ بوودوە، لەلایەک جەنگی جیهانی و لایەکی دیکە جەنگی حکومەتی بەغدا بۆ سەر کورد لە ناوچەی ئاکرێ و بارزان و مێرگەسۆر، جگە لە پەلاماردانی سەربازی، گەمارۆی ئابووریش دەسەپێنرایە سەر ئەم ناوچانە. گرانی و قات و قڕی زیاتر لە دوای ساڵی ١٩٤١ دەستی پێکرد، دوای ئەوەی یەکێتی سۆڤیەتیش لە دژی ئەڵمانیا چووە ناو شەڕەکە و لێرەدا مێژوونووس عەبدولرەزاق حەسەنی دەڵێ: جل و بەرگ و شەکرو چا نرخیان زۆر بەرز بوودوە، حکومەت ناچار بوو بە بیتاقە دابەشیان بکات، بەڵام ئەو بڕەی دەهات ڕۆژ بە ڕۆژ کەمتر دەبوودوە، نرخیش بەرادەیەکی بێوێژدانانە لە بازاڕی ڕەش بەرز دەبوودوە، بە ڕادەیەک خەڵک ناچار بوون لە جیاتی شەکر قەسپ و خورما بەکاربێنن.

خێزانە مام ناوەندییەکان لە بواری گوزەرانەوە چەرچەف و بەرگی لێفە و دۆشەکیان دەکردە کفن بۆ مردووەکانیان بە بەرگی خۆیان دەناشت، چونکە قوماشی کفنیان دەست نەدەکەوت"!!

ئەم تەنگژە ئابوورییە لە عێراقدا بە زۆری بە هۆی کەمبوونی بازرگانی هاوردە لە ساڵانی جەنگی دووەمی جیهان سەری هەڵداوە. بە تایبەتیش ئەو کەلوپەلە گرنگانەی، کە دەبوایە لە دەرەوە بهێنرێت بۆ عێراق، وەکو جل و بەرگ و شەکر و چای، کە بەڕێژەی ٥٠ ٪ هاوردنیان لە کورتی داوە. پارێزگای هەولێریش لەو کاتەدا هەمان ئەو بارە نالەبارەی عێراقی بە زیادیشەوە بەخۆ بینیوە. بەتایبەتی خێزانە هەژار و کەم دەرامەتەکان.

لێرەدا (دکتۆر ئیسماعیل شوکر) لە کتێبی "هەولێر لە ماوەی (١٩٣٩- ١٩٥٨)دا "کە بە زمانی عەرەبی دایناوە، پشتی بە رۆژنامەی (قاعیدە)، ئۆرگانی نهێنی (پارتی کۆمونیستی عێراق) بەستووە، کە لە هەشتەمین ژمارەی ساڵی ١٩٤٢ دا نووسیویەتی: "نرخی نان لە هەولێر چوار هەندی نرخەکەی بووە لە بەغدا، بۆیە هەندێ خێزانی هەژار منداڵەکانیان فرۆشتووە تاکو لە برسان نەمرن". رۆژنامەی (شەرارە)ی نهێنیش نووسیویەتی، کە خێزانە دەستڕۆیشتووەکان بە گرێبەست منداڵیان لە خێزانە هەژارەکان دەکڕییەوە.

دیارە لە ئەنجامی گرانی و نەبوونی و پەلاماردانی سوپای عێراق بە پشتیوانی بەریتانیا بۆ ناوچەکانی رواندز و مێرگەسور و بارزان باری ئابووری ئەم ناوچانە لە ساڵی ١٩٤٢ دا زیاتر تەنگی بە خەڵکی هەژار هەڵچنیوە، بۆیە (جەمال بابان) نوێنەری هەولێر لە پەرلەمانی عێراق و وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی لەو کاتەدا، بە ناوی وەزارەتەکەی داوای لە وتەسەریفەکانی هەرێمی کوردستان کردووە، کە هەڵمەتێکی پیتاک کۆکردنەوە بۆ قەزای (رواندز) ئەنجام بدەن و هەموو لیواکانیش بە پیر ئەم بانگەوازەدا چوون(*).

لێکۆڵەرەوەیەکی دیکە لە مێژووی هەولێر، ئەویش بەڕێز (گۆران سۆران فەیزییە) لە ماستەرنامەکەیدا بەم شێوەیەی خوارەوە باسی باری ئابووری هەولێری کردووە لەو قۆناغەی ئێمە مەبەستمانە:

شاری هەولێر لە رووی ئابوورییەوە لە ئاستێکی نزمدا بوو و لە زۆر رووەوە پشتی بە بەرهەمی خۆی دەبەست و بەتایبەتیش لە رووی کشتوکاڵییەوە، کە بە شێوەیەکی سەرەتایی و تا رادەیەکی دوور لە هەموو تەکنیکارێکی کشتوکاڵی و بەند بوو، بە سیستەمێکی نیمچە دەرەبەگی باو بوو. واتە چینی جوتیارانی دەوروبەری هەولێر لەوپەڕی کەم دەرامەتی و هەژاریدا بوون. سەرەڕای ئەمەش کۆمەڵێک لە خاوەن زەویوزاران، کە بەشی زۆریان لە ناوشاردا دەژیان و سەرکاریان لە گوندەکانیان هەبوو، ئەو گوندانەی کە بە ناوی خۆیان بووە.

ئەم چەند خێزانە هەولێرییەش، کە بە (ئاغاکانی هەولێری) ناسرابوون، سیمایەکی نیمچە تێکەڵیان هەبوو لە نێوان شارستانیەتی و دەشتەکیەتیدا، ئەمەش بە حوکمی خاوەندارێتیان بۆ زەویوزارەکانی دەوروبەری هەولێر و ئەنجامدانی کاروباری کشتوکاڵ...

سەرەڕای چینی دەرەبەگی شارنشینی، کە چینی یەکەم بوون لە دەوڵەمەندی، چەند بازرگانێکی دیکەش لە هەولێرییان و جوولەکەکان هەبوون کە لەکاتی ئاساییدا، کە ئاڵوگۆڕی بازرگانییان لەگەڵ شارەکانی عێراق و تا وڵاتانی دەرەوەش هەبوو، تەنیا بۆ نموونە چەلەبییەکانی هەولێر، واتا بازرگانە گەورەکان پیستەو خوری کوردستانیان لە خەڵکی ئەو دەڤەرە دەکڕی و دەیاننارده بەسرە، لەوێش بۆ ئەورووپا. بۆیە ئێستا چەند بنەماڵەیەک بە (دەباغ) ناوزەد دەکرێن. جا ئەم چینە تارادەیەکی باش باری داراییان لە ئاستێکی بەرزدا بوو.

هەروەها لە ساڵانی جەنگی دووەمی جیهان و لە هەر دوو دەیەی (سییەکان و چلەکاندا) لە هەولێر هیچ کۆگایەکی هاوچەرخ و پێشکەوتوو یا بازگەیەکی مۆدێرنی تێدانەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا بازاڕێکی شێوە قەیسەری و تارادەیەک رێکوپێکی هەبووە، کە تا ئێستاش هەر ئاوەدانەو لەم بارەیەوەش بەڕێز (د. عەبدولڕەزاق دەباغ) بۆ بەڕێز (یوسف نانەکەلی) دواوە و دەڵێ: (بەرلە بەرپابوونی جەنگی یەکەمی جیهانی لە سەردەمی عوسمانییەکاندا کاتێ مامەکانم (حاجی ساڵح) و (حاجی مەحمود) دەچنە حەجێ لە رێگەدا، کە بە شاری دیمەشقی سووریادا دەگەڕێنەوە، بازاڕی (حەمیدییە) دەبینن، کە بازاڕێکی بازرگانی رێکوپێکی هەبوو، لەسەر شێوەی (خانی جزیری) دروست کراوە، زۆر بەو بازاڕە سەرسام دەبن، بۆیە کە دەگەڕێنەوە هەولێر (بازاڕی قەیسەری) لەسەر هەمان شێوەی بازاڕی حەمیدییەی سووری دروست دەکەن).

بەڕێز (گۆران سۆران فەیزی) لەدرێژەی لێکۆڵینەوەکەیدا لەبارەی باری ئابووری هەولێر ئاماژە بۆ چەند لایەنێکی دیکەش دەکات و دەنووسێت: (لەلایەکی تریش لەبەر باری بازرگانی و هاتوچۆکردن بۆ هەولێر شەش خان و چوار ئوتێلی پلە نزم لە دەوروبەری بازاڕی هەولێر هەبوون، لەگەڵ ئوتێلێکی تارادەیەک پێشکەوتووتر لە وێستگەی شەمەندەفەر، بەناوی (رێست هاوس)، کە ئەویش لە ساڵی ١٩٤٧ دامەزراوە. بەو بۆنەیەش پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە بەستنی هەولێر بە بەغدا بە هێڵی ئاسنین کاریگەرییەکی زۆری لەسەر جوولەی

بازرگـــــانی و کــــۆمــــەڵایەتی و بەرزبوونەوەی ئاستی ئابووری ناوشار لە دوای جەنگی دووەمـیـنی جـیـهـان هەبوو.

هەروەها لە ناوشــار ژمــارەیەک حەمام و ئاش و کەبابخانە و کارگەی لباد و دەباخانە و کوورەی کەرپووچ دروستکردن و قەسابخانەیەکیشی تێدا بوو).

جگە لە توێژو دەستەی بازرگان و خـاوەن پـیـشــەســازی دەســتـکـردی بچـــووک و خـــــاوەن دوکــــــان و کاسبکارەکانی شـار، کە سەرەڕای نەهامەتییەکانی جەنگ ئەمانە باری ئابووری و ئاستی ژیانیان باش و مام ناوەندی بووە. هەروەها مووچەخۆر و مامۆستایانیش تارادەیەک گوزەرانیان مام ناوەندی بووە، بەڵام بەسەدان لە کاسبکاری بێ سەرمایە و کرێکار و شاگرد و خزمەتکار و سەپانەکان ژیانێکی پڕ لە کولەمەرگییان بە هۆی کەمی رۆژانە و گرانی لە رادەبەدەری بازاڕ، بەتایبەتی لە ساڵانی جەنگدا بەسەردەبرد.

ژیانی جـوتیـار و کـرمـانجـەکـانی خۆشناوەتی و دەوروبەری هەولێریش لەژێر سـێــبــەری چەوســانـدنـەوەی دەرەبەگــــایەتی زۆر نالەبار بووە. زۆربەی ساڵ داهاتیان لە گەنم و جۆ یان ئەوەندەی بە سـەپانی دەسـتـیـان دەکەوت پێی نەدەژیان، بۆیە ئەوانەی خۆشناوەتی دارو رەژوویان دەهێنایە شـــار و دەیانـفـرۆشت، جــوتیــارە هەژارەکـانی دەوروبەری شـاریش لە دەشتی هەولێر ماست و هێلکە و کا و قـــشـــپـلـیــان دەهێنایە شـــار و دەیانفرۆشت.

(سـەید مـەولوود بێـخـاڵی) لە کـــتـــێـــبی (هەولێـــرم وا دیوە) لەم بارەیەوە نووســـــویەتی و دەڵێ: "دانیشتوانی دێهاتەکانی بناری کێوی ســـەفین لە دیوی بە رۆژییــــەوە لە پیـرمـامـەوە تا سـووسـەو کـێـشـکێ، لەبەری نزاریشەوە لە ئاژگە و زرگوێز تا کـــاوانیـــان دارو رەژوویان بە بار دەهێنایە شـاری بۆ فـرۆشتن. ئێـواران کـــــــاروانی ئـەو دارفـــــــرۆش و رەژووفرۆشانەی سەرەوە لە لای کۆیە و مـەلا ئۆمـەرەوە رێچکەیان دەبەست بەرەو مـەیدانی داران. بەڵام کـافـرۆش و قـشـپـل فـرۆشـەکـان لە پێـدەشـتی دەوروبەری هەولێــرەوە بەیانیـــــان دەهاتنە شـــارو مـــاوەک لە مـــەیدان چاوەڕوانی فـرۆشـتنی بارەکـانیـان بوون".

ئەوەی جـێـگـای ئامــاژە بۆ کــردنە بەشێکی فراوان لە دانیشتوانی شاری هەولێــــر و دەوروبەری کـــەتنە ژێر کـاریگەرییـە خـراپەکـانی دووەمین جـەنگی جـیـهـانی، بەرهەمـهـێنانی دانەوێڵەو بازرگانی لە کورتیان داوە. بـۆ نمونـە لـە ســــــــــاڵـی ١٩٤٣ بەرهەمـهـێنانی گەنم و جۆ لە عێـراق ١٠٠ هەزار تەن بە بەراورد لەگـــەڵ پێـشی جـەنگ کـەم بۆتەوە. ناردنە دەرەوەی دانەوێڵە بۆ دەرەوە کەم بووە، ســــــــەرەڕای بـەرزبـوونـەوەی نـرخ و پێـویسـتی وڵات بە دراوی قـــورس و کـــەلوپەلی دروســـتـکراوی هاوردە، چونکە بەشـێـکی زۆر لە دانەوێڵـەی عـێـــراق بۆ بەخـێــوکـــردنی ســوپای بەریتـانیـا لە عـێـراق و پۆلۆنیـیــە ئاوارەکــان تەرخـان کــراوە، هەروەها دەوڵەتی عـێـراق لە ساڵی ١٩٤٢ بە دواوە ناردنـە دەرەوەی (جــــۆ)ی بە فەرمی قەدەغە کردووە.

لە کـۆتاییـدا پێـویسـتـە ئامـاژە بۆ ئەوە بکرێت، کە تەنگژەی ئابووری و خراپتربوونی ژیان و گوزەرانی خەڵک بەتایبەتی کەم دەرامەتەکان لە جوتیار و کـــرێکارانی هەژار و چەوســـاوە، سەرەڕای هەژارەکانی دیکە و ئەوانەی بێ کــارو کـــاســبی بوون لە مـــاوەی ساڵانی دووەمین جەنگی جـیـهـانی و دواتریشــــدا، ئەم بارودۆخــە نالـەبارە بـوو بـە هـۆی بزوانـدنـی هـێــــــزە بەرهەڵســـتـکارەکــان، بەتایبـــەتی چەپڕەوەکـان تاکـو کاری جـەمـاوەری شـۆڕشگێـڕانە لە دژی جـەنگ و دژی بەریتـــانیـــا و ئەڵمـــانیـــا و دژی حکومـەتی ئەڵقـە لە گـوێی بەغـدا ئەنجام بدەن و داوای چارەسەرکردنی باری ئابووری وڵات بکەن.

سـەرچاوەکان:
١-(اسمـاعـيل شكر رسول، اربيل، دراســـة تاريخـــيـــة في دورها الفكري و الســيـاسي، ١٩٣٩-١٩٥٨)، سليمانی، ٢٠٠٥.
٢-گۆران سۆران فەیزی، باری ئەدەبی کوردی لە شاری هەولێر لە نێوان ساڵانی ١٩٣٥- ١٩٥٨، هەولێر ٢٠٠٦.
٣- مـەولود بێـخـاڵی، هەولێـرم وادیوە، بەغدا ١٩٩١.
٤- عەبدولرەزاق حەسەنی، مێژووی وەزارەتەکانی عێراق.
٥- هەولێـر، لەیادی سـەد سـاڵەی شـــارەوانی هەولێـــر، ١٨٨٥-١٩٨٥، کـتـێـبێکی هاوبەشە لە ئا. شێرزاد قادر هەینی، هەولێر، ١٩٨٥.
* (سـەیری مـێـژووی وەزارەتەکـانی عێراق، بەشی شەشەم، بکە).

* ئەم بابەتە لە گۆڤـاری (بارش) ژمارە ٣٥ تەمموزی ٢٠٠٧ وەرگیراوە.



# راپەڕینی جوتیارانی دەشتی هەولێر ١٩٥٣

مەهدی محەمەد قادر
کۆلیژی ئاداب -زانکۆی سەلاحەددین

دوای جێگیربوونی سیستەمی دەرەبەگایەتی لەکوردستانداو بەهێزبوونی بنەماکانی لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم[١] تەوژمێکی گەورەی چەوسانەوەو زوڵم و زۆرداری تەواوی ناوچەکانی کوردستانی گرتەوە کە لەگەڵ سەرەتای پەنجاکانی سەدەی رابردوو کاریگەریی ئەم سیستەمە لە گوندەکانی کوردستانەوە گەیشتە شارە گەورەکانیش، کە جگە لەکاریگەرییە کۆمەڵایەتییەکان، بوو بەفاکتەرێکی سەرەکی دیارخستنی سیاسەتی دەوڵەت[٢].

کێشەی زەوی، لەئەنجامی هەوڵەکانی ئیستعماری ئینگلیزی و حکومەتەکانی پاشایەتی، کە بەمەبەستی دارشتنەوەی کۆمەڵگایەکی نوێ، لەدوای بوونی جەنگی یەکەمی جیهانی (١٩١٤-١٩١٨) لەعێراقدا بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان بوو بەکێشەیەکی سەرەکی لەزۆربەی ناوچەکانی عێراقدا[٣]، دوابەدوای لکاندنی کوردستانی خوارووش بەدەوڵەتی نوێی عێراق لەساڵی ١٩٢٥[٤]، ئەم کێشەیە بوو بەکێشەیەکی سەرەکی لەنێوان جوتیارانی کوردستانیش، بەتایبەتی دوای ئەوەی هەوڵ درا بۆ سوود وەرگرتن لەسەرۆک هۆزو شێخەکانی هۆزەکان و گەورە بازرگانەکان بۆ جێبەجێ کردنی ئامانجەکانیان، کە پشتگیری کران بۆ چۆنیەتی هەڵسوکەوت کردنیان بەو زەوییانەی کەتا ئەو کا تە لەژێر دەستی جوتیارەکاندا بوو، لەرێگای دەرکردنی چەندین یاسای تایبەت بەرێکخستنی زەوی، کە بەهۆیەوە جوتیارەکان لەخاوەندارێتی زەوی بوون بەکرێکاری کشتوکاڵی[٥]. زۆرجاریش ئەم کێشەیە بەکێشەی (جوتیارو دەرەبەگ) ناو دەبردرا.

لەئەنجامی ئەم بارودۆخەش چەند راپەڕینێکی جوتیاری لە ساڵانی (بیستەکان- سییەکان- چلەکان) لە کوردستان و ناوچەکانی تری عێراقدا روویاندا بۆ بەدیهێنانی مافەکانیان، کە بوونە هۆی رووبەڕوو بوونەوەیان لەگەڵ دەسەڵاتداران و زۆرجار توانا سەربازییەکان بەکاردەهێنرا بۆ سەرکوتکردنیان[٦].

جوتیارانی کوردستان بەگشتی و جوتیارانی (دەشتی هەولێر)[*] بەتایبەتی لەژێر چەوساندنەوەی زۆرداریی دەرەبەگەکانی (دزەیی)[**]، دووچاری نالەبارترین ژیانی

چەوسانەوەیی هاتبوون. کە لەهەندێ کاتدا لەرووی سروشتی کشتوکاڵ کردنەوە دەرەبەگەکان لەسایەی (سیستەمی بەش وەرگرتن- نظام المحاصصة)، بەهۆی باج و سەرانەوە کە بەسەر جوتیاران سەپاندرا بوو دەگەیشتە (٥٠٪)ی بەرهەمی جوتیارەکان[٧]. هەروەها کاری (سوخرە)یان بەخۆڕایی بەجوتیاران دەکرد. لەپاڵ ئەمەشدا دەرکردنی جوتیارەکان لەسەر زەوی و گوندەکان و سزادانیان بەئەرکێکی ڕەوا دەزانی[٨].

بەدرێژایی ساڵانی چەوساندنەوەی جوتیاران لەکوردستاندا، ڕادەی هۆشیاری جوتیاران لەم ئاستەدا نەبوو کە ڕێکخراوێکی دیموکراتی جوتیاری لەرووی ڕێکخراوەییەوە لەکوردستاندا پێک بهێنن بۆ پاراستن و بەرگریکردن لەمافەکانیان، بەڵام دوای کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهانی (١٩٣٩-١٩٤٥)، بەرەی تێکۆشانی جوتیاران لەدژی دەرەبەگەکان لەرووی سیاسییەوە چووە قۆناغێکی گەشەکردنەوە، چونکە بزووتنەوە بەرهەڵستەکانی دژ بەچەوساندنەوەو زوڵم و زۆری دەرەبەگەکان سنووری بەشداربوونی خودی جوتیارانی بەزاند[٩].

حزبە سیاسییە نهێنییەکان بەپێی هێڵی سیاسی و بیروباوەڕی تایبەت بەخۆیان خزینە ناو بازنەی تێکۆشانی جوتیاران و، بوون بەهۆکارێکی سەرەکی بەرزبوونەوەی ئاستی ڕۆشنبیری و باوەڕ بەخۆبوونی جوتیاران، حزبی شیوعی عێراق لەم رووەوە ڕۆڵێکی سەرەکی گێڕاوە لەرێگای ڕێکخستنی جوتیاران لەناو شانە حزبییەکان و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەکانی تایبەت بەخەباتی جوتیاران وەکو (بانگی فەلاح، دەنگی داس) کە بوونە سەرچاوەیەکی سەرەکی هاندانی خەباتی شۆڕشگێری و دژایەتیکردنی دەرەبەگەکان. لەم چوارچێوەیەدا دەشتی هەولێر کە مەڵبەندێکی سەرەکی کاری سیاسی حزبە نهێنییەکان بوو کەوتبووە ژێر کارتێکردنێکی زۆر بەهێز[١٠]. پارتی دیموکراتی کوردستانیش جموجۆڵی سیاسی خۆی لەناو جوتیاران و هەندێ لەدەرەبەگە نیشتمانپەروەرەکان دەستپێکردبوو، ڕۆژنامەی (نرکەی جوتیار)ی لەشارەزوور دەردەکرد، شان بەشانی ڕۆژنامەکانی حزبی شیوعی باسیان لەکێشەی جوتیاران دەکردو بەناویاندا بڵاودەبوونەوە[١١].

ڕۆشنبیرانی کوردیش لەم بوارەدا ڕۆڵی بەرچاویان گێڕا، بەتایبەتی هەندێ لەکوڕە ئاغاکان کە بەهۆی خوێندنەوە لەشارەکانی هەولێرو بەغدا تێکەڵ بەبیروباوەڕی دیموکراتی و سیاسی ببوون بەتایبەتی لە ڕێکخستنەکانی (حزبی شیوعی عێراق و پارتی دیموکراتی کوردستان)[١٢]. ئەم چینە ڕۆشنبیرە کارتێکردنێکی زۆریان خستە سەر جوتیارەکان لەرووی وشیارکردنەوەو ڕاکێشانیان بۆ نێو ڕێکخستنەکان، بەتایبەتی لەو کاتانەی لەپشووی خوێندن دەگەڕانەوە گوندەکانیان تێکەڵ بەجوتیارەکان دەبوون[١٣].

هێنانی ئامێرەکانی کشتوکاڵی لەلایەن دەرەبەگەکان بۆ بەکارهێنانیان لەبواری بەرهەمهێنانی کشتوکاڵیدا ببووە سەرچاوەیەکی تری پشێوی نێو جوتیاران، چونکە بە هێنانی ئەم ئامێرانە جوتیارەکان بێکار دەمانەوە، دووچاری هەڕەشەی دەرکردن دەهاتن[١٤]. هەرچەندە بەکارهێنانی ئامێر لەبوارەکانی بەرهەمهێناندا پێشکەوتنێکی سەردەمانە بوو لەو کاتدا، بەڵام بەکارهێنانیان لەسایەی ڕژێمی دەرەبەگایەتی ببووە فاکتەرێکی سەرەکی بەدەست دەرەبەگەکان بۆ ئەوەی زەوی لەژێر دەستی جوتیارەکان دەربهێنن، بۆ بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیان و گەورە بازرگانەکان و مەلاکەکان[١٥].

سەبارەت بەدەستپێکردنی ڕاپەڕینەکە، لەئەنجامی (کێشەی گوندی قازیخانە)وە بوار ڕەخسا بۆ تەقینەوەی جوتیاران بەرووی ئاغاکانی دزەیی. کاتێک لەبەهاری ١٩٥٣ جوتیارانی گوندەکە دووچاری داسەپاندنی باجێکی نوێ دەبنەوە لەلایەن (حوسێن مەلا)ی ئاغای گوندەکە کە پێی دەگوترا (ئەستەمبولانە)[*]، بەتێکڕایی بڕیار دەدەن کە داواکارییەکەی ئاغا جێبەجێ نەکەن، لەسەر ڕێنمایی ئەو لیژنە چوار کەسییەی کە لەساڵی ١٩٤٨ لە (حەمەدئەمین قادر حەسەن، نوری وەسمان قەرەنی، حەسەن تەها فەتاح، عەبدوڵڵا حەمەدئەمین) پێکهێنرابوو، جوتیارەکان سوێند دەخۆن کە (شەرمان شەڕ بێت خێرمان خێر بێت)، شەپۆلێکی نارەزایی تێکڕای جوتیارەکانی گرتەوە[١٦].

بەم جۆرە هەواڵی نەمانی بێکاری و سوخرە بەگوندەکانی دەوروبەردا بڵاودەبێتەوە، جوتیاران لەدەوری یەکتر کۆدەبنەوەو ریش سپی لەنێوان خۆیان دەستنیشان دەکەن و سوێند دەخۆن، ڕاپەڕینەکە زۆر بەخێرایی تەشەنە دەکات[١٧]. زیاتر لە ٦٠ کەرت دەگرێتەوە کە نزیکەی ٢٠٠ گوند دەبوو کە زیاتر لە ٦ هەزار خێزانی جوتیاران بەشدارییان تێدا کردووەو، سنووری ڕاپەڕینەکە لەناوچەی

مەخمور تا کۆیە دەگرتەوە[١٨]. لەگوندە ڕاپەڕیوەکان (بیرە عارەبان، هەرەجە، باشتەپە، دووکەرە، پارانیان، مورتکە، یەدی قزلەر، سۆربەش، قورشاغلو، گەڕەشێخان، سێقوچان، گردە ڕەشە، عەلیاوە، ئۆمەرە سوور، گردلانکە، قوچە بلباس، شێراوە، گردلانکەی مەجید، ئاودەلۆک، دووسەرەی فەتاح، قولتەپە، کەسنەزان و باقرت و چەندانی تر)[١٩].

تەوژمی ئەم ڕاپەڕینە کە لەلایەن خودی جوتیارەکان پێشڕەوی دەکرا، چەندین ئامانجی سەرەکی لەخۆ گرتبوو وەک (کەمکردنەوەی مولکانە لە ٥٠٪ بۆ ٢٠٪، قەدەغەکردنی دەرکردنی جوتیارەکان لەگوندەکانیان، نەهێشتنی باج و سەرانەو کاری سوخرە، سەندنەوەی زەوییە ئەمیرییەکان و دابەشکردنەوەیان بەسەر جوتیاران[٢٠].

دەتوانرێ بوترێ هۆکارەکانی دەستپێکردنی ڕاپەڕینەکە لەناوچەی دەشتی هەولێر، تەنها ناگەڕێتەوە بۆ هۆکاری زوڵم و زۆری دەرەبەگەکانی ناوچەکە، بەڵکو پێگەیشتنی هەستی چینایەتی و ڕادەی هۆشیاری جوتیارەکان لەم ناوچەیەدا پێگەیشتوو بوو بەرامبەر بەناوچەکانی تر لەکوردستان، چونکە ئەگەر تەنها فاکتەری زوڵم و زۆری لەبەرچاو بگرین دەبووایە ئەم ڕاپەڕینە لەناوچەکانی تر ڕووی بدایە وەکو ناوچەکانی دەوروبەری شاری کەرکوک[٢١]. هەر بۆیە ئەم ڕاپەڕینە بەپەرەسەندنێکی گرنگی مێژووی بزاڤی جوتیارانی دەشتی هەولێر بەتایبەتی و کوردستانی عێراق بەگشتی دادەنرێت.

بەمەبەستی کپکردنەوەی ڕاپەڕینەکە، دەرەبەگەکان پەنایان بردە بەر حکومەت و لەژێر چەندین ناودا جوتیارەکانیان تاوانبار کرد. حکومەتیش بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ تێکەڵ بەرووداوەکان بوو، بەمەبەستی دانانی سنوورێک بەرێوەبەری پۆلیسی هەولێرو موتەسەریفی هەولێر (مستەفا یەعقوبی) سەردانی گوندەکانیان کردو چەند خاڵێکیان لەنێوان جوتیارەکان و ئاغاکان دانا[٢٢].

بەڵام لەئەنجامی بەردەوامی هەڕەشەی ئاغاکان و درێژە کێشانی ڕاپەڕینەکە، حکومەت بۆ پارێزگاری کردنی ئاغاکان و سەرکوتکردنەوەی جوتیارەکان، ژمارەیەکی لە جوتیارەکان دەستگیر کردو گواسترانەوە بۆ بەندیخانەکانی کەرکوک و موسڵ. بەتۆمەتی بوونی پەیوەندییان بەکاری سیاسی و ڕێکخستنەکانی حزبی شیوعی بەڵام لە ڕاستیدا زۆربەی جوتیارەکان سەر بەهیچ حزبێکی سیاسی



نەبوون[٢٣].

جێگای باسە دەرەبەگەکان ئەمەشیان بەهەل زانی کە زۆر لەجوتیارە گەنجەکان پەیوەندییان بەحزمەتی سەربازییەوە نەبوو، لەم ڕووەشەوە بۆ دەستگیرکردنیان یارمەتی زۆری دەزگا پۆلیسییەکانیان دا بۆ ڕاپێچکردنیان بەکۆمەڵ بۆ خزمەتی سەربازی، بەجۆرێک کە ماڵی وا هەبوو تەنها منداڵ و ئافرەتی تێدا مابوو[٢٤].

لەلایەکی تریشەوە حکومەت بۆ دڵنیایی دەرەبەگەکان و پاڵپشتی کردنیان دوای ئەو ڕووبەڕوو بوونەوانەی کە لەنێوان جوتیارەکان و ئاغاکان ڕوویاندا، بەبەردەوامی پۆلیسەکانی سوارەو ئۆتۆمبێلی چەکداری بەگوندەکاندا دەسووڕانەوە، تەنانەت لەهەندێ لەگوندە گەورەکان مەڵبەندی پۆلیسی (مرکز شرطة)ی دانا[٢٥]، ئەمەش بوو بەهۆی توندوتیژتر بوونی باروودۆخەکەو جوتیارەکان لەئەنجامی دەستدرێژییەکانی پۆلیس و ئاغاکان لەسنووری بەرگریکردن دەرچوون چەند جارێک هێرشی سەر ماڵە ئاغاکانیان کرد، چەند شەڕێک لەنێوانیاندا ڕوویاندا وەک شەڕەکانی گوندی (قازیخانە، ماجدئاوا، دێمەکار، بیستانە، دووگردکان، کەردز، میرزائاغا) کە چەند جوتیارێک بوونە قوربانی ڕاپەڕینەکە لەمانەش (مەولود ڕەسوڵ، حوسێن ڕەسوڵ- لەگوندی میرزا ئاغا، ئەبو زێد مەولود- لەگوندی کەردز، شێخ محەمەد عەباس- لەگوندی ماجدئاوا)[٢٦].

جوتیارانیش بۆ داکۆکیکردن لەمافەکانیان چەند سکالایەکیان پێشکەش بەحکومەت کرد، ئامانجەکانیان تێدا دەستنیشان کرد، لەکاتی هاتنی وەزیری ناوەخۆ (حسام الدین جمعة) بۆ شاری هەولێر، جوتیارەکان نووسراوێکیان خستە بەردەم وەزیرو داوایان کرد کە ئەو

پۆلیسانەی کە لەگوندەکاندا داندراون جوتیارەکان پێویستییان پێی نییە، ئەگەر ئاغاش بۆ پاراستنی خۆی دەیانهێڵێتەوە دەبێت خزمەتیان بکات و خەرجییان بۆ بکات، دواتر حکومەت ئەم داواکارییەی جێبەجێ کرد[٢٧].

لەپایزی هەمان ساڵدا (حەسەن حاجی سمایل سوراحی) کە یەکێکە لەجوتیارەکانی گوندی قازیخانە لەکاتی گەڕانەوەی شا فەیسەڵی دووەم لە هاوینەهەواری سەلاحەددین، لەسەر ڕێگای (هەولێر- کەرکوک) نووسراوێکی پێدەدات. کە لەناوەڕۆکی سکاڵانامەکەدا بارودۆخی جوتیارەکان روون کرابۆوەو داوای ئازادکردنی جوتیارە گیراوەکان و هێرش نەکردنی ئاغا بۆ سەر جوتیارەکان کردو هەروەها حکومەت راستەوخۆ سەرپەرشتی بارودۆخەکە بکات و سنوورێک بۆ دەستدرێژییەکان و فەرمانەکانی ئاغا دابنێت. بەڵام داواکارییەکە هیچ وەڵامێکی لێ نەکەوتەوە[٢٨].

لە ئەنجامی بەدەنگەوە نەهاتنی حکومەتی جەمیل مەدفەعی (٢٩ کانوونی دووەمی ١٩٥٣- ٥ی ئاداری ١٩٥٣)[٢٩] لەبەرامبەر داواکارییەکانی جوتیاران، هەندێک لەپارێزەران ڕۆڵی جوامێرانەیان نواندو کەوتنە بەرگریکردن لەجوتیارە گیراوەکان لەوانەش (عەونی یوسف، رەشید عەبدولقادر، مەعروف بەرزنجی، حوسێن بەرزنی، جەبار پیرۆزخان، ئیبراهیم ئەحمەد) کە بەخۆڕایی کاریان بۆ جوتیارەکان دەکرد[٣٠].

هەروەها لەکاتێک کە پارێزەرەکان بەهۆی هەڵوێستە نیشتمانییەکانیان و تاوانبار کردنیان لەلایەن حکومەتەوە بەهۆی پشتگیری کردنیان بۆ جوتیارەکان لەکاتی راپەرینەکەدا هەندێکیان رادەگیرێن. ئەم هەڵوێستەی حکومەت بوو بەهۆکارێکی سەرەکی کە نوێنەرانی کورد لەئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق (پەرلەمان)دا، کێشەی جوتیارەکان و راپەرینەکە بخەنە بەرباس و لێکۆڵینەوە لەدانیشتنەکانیاندا، لەم بوارەش (مەسعود محەممەد)[*] رۆڵێکی دیاری بینی کە زۆر بەراشکاوی لەدانیشتنی ژمارە (٢٥)ی رۆژی ١٣ی ئاباری ١٩٥٣، کەوتە بەرگریکردن لەمافی جوتیارەکان، کە لەبەشێکی وتەکانیدا دەڵێت:

"...ئەو بزووتنەوەی کە لەهەولێر هەیە، ناوەڕۆکەکەی نەچوونی جوتیارانە بۆ ژێر باڵی ئەو زوڵم و زۆردارییەی کە بەسەریاندا چەسپاوە. ئەوەی گوێم لێ بووە راست دەرچووە کە حکومەت هەڵوێستێکی ناڕاستی وەرگرتووە کە دژی دادوەرییە. هەروەها گوێم لێ بووە کەسێ لەپارێزەرەکان راگیراون کە نازانم چ تۆمەتێک خراوەتە پاڵیان... وابزانم ئەرکی حکومەتە کە بەشێوەیەکی راستەقینە بڕوانێتە ئەم کێشەیە، بڕوانێتە داواکارییەکانیان بەشێوەیەکی راست و دروست بۆ تەئمین کردنی ژیانی جوتیاران لە هەولێرو ناوچەکانی تر، بەتێڕوانینێکی سەر پێیی سەیری نەکات..."[٣١].

پیاوانی ئایینیش رۆڵێکی دیاریان لە رۆژانی راپەڕینەکە گێڕاوە، لەبڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی نیشتمانی و ریسواکردنی جەورو ستەمەکانی دەرەبەگەکان و لەوتارەکانی رۆژانی هەینی هانی جوتیارەکانیان داوەو پشتگیری داواکارییەکانیان کردووە وە "مەلا عەلی یەحیا، مەلا عەبدوڵڵا لەگوندی قازیخانە، مەلا محەممەد شێروانی لەگوندی قەبلان، مەلا شەریف لەگوندی عەبدوڵڵا کوجیلان"[٣٢] هەروەها هەندێ لەپیاوە ئاینییەکان لەئەنجامی هەڵوێستەکانیان لەلایەن حکومەتەوە خراونەتە بەندیخانەن وەک (مەلا یەحیای گوندی ماجیداوە) کە لە رۆژانی راپەرینەکە هانی جوتیارانی داوەو وەک بزوێنەری راپەرینەکە بووە لەگوندەکەیدا[٣٣].

ئافرەتانی کوردیش لە رۆژانی راپەرینەکەدا رۆڵێکی گەشەداریان گێڕاوە، شان بەشانی جوتیارەکان داکۆکییان لە بەرژەوەندییەکانیان کردووەو لەهەندێ گونددا چەکیان هەڵگرتووەو دژی ئاغا وەستاون، لەزۆربەی گوندەکانیش شەوانە پاسەوانی ماڵەکانیان کردووە و شان بەشانی پیاوان وەستاون[٣٤]. ئافرەتانی گوندی قازیخانە نموونەیەکی زیندووی تێکۆشانی ئافرەتانن لەرۆژانی راپەرینەکەدا. لەو کاتەی ئاغای گوندەکە دەیەوێت زەوی جوتیارە گیراوەکان بکێڵێت، ئافرەتانی ئەم گوندە یەک دەگرن و هێرش دەبەنە سەر (واحدی مستەغا بۆر)ی شوفێری تراکتۆرەکە، ناچاری دەکەن زەوییەکە جێبهێڵێت و بەرەو دیوەخانی ئاغا بگەڕێتەوە. لەو ئافرەتانەش کە رۆڵی جوامێرانەیان نواند (زاریێ عەزیز- پێشەوایەتی هەموو ئافرەتەکانی کردووە، زەرێخ حەمەدئەمین، ئامینە قادر حەسەن، خەجیجە ئۆمەر، بەسێ قادر حەسەن، ئامینە ئەحمەد، ئامینە عەولا سلێمان، هاجەر محەممەد کوێخا، عایشە ئیسماعیل سوراحی، مامز عەلی خەجێ، خەجیجە ساڵح ئەمین، زولێخا وەسمان قەرەنی....) چەندانی

تر[٣٥].

سەبارەت بەهەڵوێستی ناوچەکانی تر، جوتیارانی ناوچەی قادر کەرەم هەستی نارەزایی و پشتگیرییان بۆ راپەڕین و ئەنجامەکەی دەربڕیوەو نووسراوێکی پشتگیری بەئیمزای نزیکەی ١٨٠ جوتیار پێشکەش بە شا فەیسەڵی دووەم دەکەن کە تیایدا هاتووە:

"ئێمە جوتیارانی ناوچەی قادر کەرەم کە ئیمزامان کردووە پشتگیری تەواوی خۆمان بۆ برا جوتیارە دزەییەکانمان رادەگەیەنین لەتێکۆشانیان لەپێناو داواکارییە راست و رەواکانیان و نارەزایی خۆمان دەردەخەین بەرامبەر بەپشتگیری کردنی دەسەڵاتی میری بۆ دەرەبەگە شەڕانگێزەکان و نارەزایی دەردەبڕین بەرامبەر کردارە پۆلیسەکان دەرحەق بەجوتیارەکان لە بەندکردنیان... و داوا دەکەین بەدابەشکردنی زەوی میری بەسەر جوتیاران... و هەڵگرتنی کاری سوخرەو سەرانەو ئازادکردنی هەموو برا جوتیارە گیراوەکانمان...."[٣٦].

بەم جۆرە جوتیارە راپەڕیوەکان توانییان بۆ ماوەی چەند مانگێک بەردەوامی بەراپەڕینەکە بدەن. بەڵام راپەڕینەکە هەموو ئامانجەکانی نەهێنانەدی، لەئەنجامی هۆکارە بابەتی و خۆیی (موضوعي- ذاتي)یەکان لەوانەش هەڵگەڕانەوەی هەندێ لەجوتیارەکان و کاریگەری هەندێ لەپیاوانی ئاینی بەسەر راپەڕینەکەو هەروەها جوتیارەکانیش کە خودی سەرکردایەتیکردنی راپەڕینەکە بوون، نەیانتوانی بەشێوەیەکی چەسپاو کۆمیتەیەکی هاوبەش لەنێوان خۆیاندا پێک بهێنن بۆ ئەوەی ببێتە فاکتەرێکی سەرەکی بەڕێوەبردن و گەشەپێدانی راپەڕینەکە، تا ببێتە راپەڕینێکی سەرتاسەری و لەسنووری خۆیدا قەتیس نەمێنێت.

سەبارەت بەکاریگەری حزبە سیاسییەکانیش بەسەر راپەڕینەکەدا، لەسەرەتاوە پشتگیرییان لەمافی جوتیارەکان کرد، بەڵام بەهۆی بیروبۆچوونی جیاوازی ئەم حزبانە نەتوانرا جوتیارەکان یەک ڕێچکەی خەبات بگرنە بەر، بۆ نموونە (حزبی شیوعی عێراق) وەک لەبەیاننامەکانیدا دەردەکەوێت هەوڵی دەدا کە جوتیارەکان شێوازێکی شۆڕشگێڕانە بگرنە بەرو سنووری راپەڕینەکە فراوان ببێت و بانگەشەی پێکهێنانی بەرەی نیشتمانی لەنێوان حزبە سیاسییەکان دەکرد، بۆ ئەوەی ببنە پاڵپشتێکی گەورەی راپەڕینەکەو لەهەمان کاتیشدا راپەڕینەکە شێوازێکی




سیاسی وەربگرێت، لەپێناو هێنانەکایەی حکومەتێکی نیشتمانی و دیموکراتی[٣٧]. بەڵام (پارتی دیموکراتی کوردستان) کە هەر لەسەرەتای راپەڕینەکەدا لەرێگای رۆژنامەو بەیاننامەکانیدا پشتگیری ئامانجەکانی راپەڕینەکەی دەکردو هەوڵی دەدا کە بەشێوازێکی ئاشتییانەو لەرێگای بەرزکردنەوەی داواکارییان بۆ حکومەت مافەکانیان دەستەبەر بکەن[٣٨]. بۆیە دەکرێ بوترێ جیاوازی فیکری لەنێوان جوتیارەکان فاکتەرێکی سەرەکی بوو، کە زۆر لەگوندەکانیش سوێند نەخۆن و بەرەو رووی دەرەبەگەکان راست نەبنەوە.

(مەلا عەولا حاجی ئیسماعیل) کە یەکێک لەکادرەکانی سەر بەپارتی دیموکراتی کوردستان بوو لەکاتی راپەڕینەکەدا، سەردانی زۆر لەگوندەکانی دەشتی دزەیی دەکرد بۆ کاری حزبی، لەم بارەیەوە دەڵێت:

"...مەلا محەمەدی شێروانی خاڵمان لەگوندی قەپلانی کەندێناوەدا بەقسەی مەعروفە شەل و چەند برادەرێکی سەرکردایەتی راستبوونەوەی گوندەکەی کردبوو... دوای گیرانی لەبەندیخانەی پۆلیسی دیبەگە چوومە سەردانی.. دواتر ناردیانە کەرکوک و هەرایەکە دامرکایەوە دیسان لەوێش چوومەود سەردانی ئەو جارە زۆر وەرس و بێزارو پەشیمانم دیت، منیش دڵم دەداوەو پێم دەگوت: خاڵە گوێت لێ نەبێ... هەرچی بەسەر هاتییە هەمووی لەپێناوی گەلەو جێی شانازییە... لێم تووڕە بوو و تێی خوڕیم و پێی گوتم... گەلی چی و حزبی چی؟... پێم گوت: خاڵە... خۆ جەنابت بەقسەی حزبی ئێمە نەوهات بەسەر نەهاتییە!..."[٣٩].

بەڵام سەبارەت بەحکومەت، دوای دامرکاندنەوەی راپەرینەکە ژمارەیەک لە ماڵە جوتیارەکانی لە گوندەکانیان دەرکردو زەوییەکانیان لێ سەندنەوەو، پێنج لەم ماڵە جوتیارانەش ئاوارەی شارۆچکەی رانیە کران، کە ماڵی (قادری مام حەسەن، عەبدوڵلا حەمەدەمین تەها، قادر سمایل سوراحی، حاجی ئەحمەد چۆمەزەردەیی لەگوندی قازیخانە، کوێخا وەیسی لەگوندی یەدی قزلر) بوون(٤٠).

بەڵام کاریگەری راپەرینەکە بەزیندوویی مایەوەو دوای ماوەیەکی کەم لەراپەرینەکە جوتیارانی دەشتی دزەیی، جوتیارانی هورین و شێخان و دارماوە لەساڵی ١٩٥٤ دژی زوڵم و زۆرداری دەرەبەگەکان وەستان، بەڵام حکومەت لەرێگای هێزەوە لەناوی بردن(٤١).

شایانی باسە راپەرینی جوتیارانی دەشتی هەولێر بوو بەسەرچاوەی هەست و سۆزی شاعیران و بۆ پشتگیری و رێزلێنانیان چەندان هەڵبەستیان بۆ هۆنیوەتەوە، لەوانە (کەکەی فەلاح) لەو کاتەی لەبەندیخانەی نوگرە سەلمان دەبێت بەهۆنراوەیەک بەشداری لە راپەرینەکەدا دەکات و پشتگیری جوتیارانی گەلەکەی دەکات(٤٢). هەروەها راپەرینەکە بۆتە هەوێنی شیعری زۆر لەشاعیرە میللییەکانیش، هەروەک یەکێک لەکورە جوتیارە راپەریوەکان بۆ راپەرینەکە هۆنیوەتەوە(٤٣).

بەم جۆرە جوتیارانی دەشتی هەولێر مێژوویەکی پڕ لە شانازییان تۆمار کرد، کە بووە جێگای گرنگی پێدانی زۆر لەتوێژەرەکان، رێگا خۆشکەرێک بوو بۆ شکاندنی تەوقی زوڵم و زۆرداری و سەرەتایەکی کاریگەر بۆ کۆتایی پێهێنانی سەردەمی پاشایەتی لە عێراقدا.

### سەرچاوە و پەراوێز:

١- لەبارەی دەرەبەگایەتی لەکوردستان بڕوانە: أ. شامیلوف، حول مسالة الاقطاع بين الکرد، ترجمة کمال أحمد، بغداد، ١٩٨٧، ص١١-١٥.

٢- قيس عبدالحسين الياسري، الثقافة العراقية والحرکة الوطنية في نهاية الحرب العالمية الثانية حتى ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨، بغداد، ١٩٧٨، ص٢٠١.

٣- عادل غفوري، احزاب المعارضة العلنية في العراق ١٩٤٦-١٩٥٤، ط(١)، بغداد، ١٩٨٤، ص٢٤٦.

٤- لەبارەی چۆنیەتی چارەسەرکردنی کێشەی موسڵ و لکاندنی کوردستانی خواروو بەدەوڵەتی نوێی عێراق، بڕوانە: فاضل حسين، مشکلة الموصل دراسة في الدبلوماسية العراقية- الانکليزية، الترکية والرأي العام، مطبعة الرابطة، بغداد، ١٩٥٥.

٥- یاساکانی ژمارە (٥)ی ساڵی ١٩٣٢ و یاساو ئەرکەکانی جوتیاران لەساڵی ١٩٢٣ و یاسای مافی زەوی ژمارە (٢٩)ی ١٩٣٨ و یاسای ژمارە (٤٢)ی ساڵی ١٩٥٢. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: نصير سعيد الکاظمي، الحزب الشيوعي والمسالة الزراعية في العراق، مرکز دراسات وابحاث والاشتراکية في العالم العربي، دمشق، ١٩٨٦، ص١٨٩-١٩٥، جعفر الخياط، القرية العراقية- دراسة في اصوله واحواله، دار الکشاف، بيروت، ١٩٥٠، ص٢٠-٢١.

* بەکێشەی (ئاغاو کرمانج) و (ئاغا و فەلاح) ناو دەبردرا.

٦- وەکو راپەرینی جوتیارانی (ال فتلة) لەساڵی ١٩٢١-١٩٢٢ و راپەرینی جوتیارانی سەماوە لەساڵی ١٩٢٣، ١٩٢٧ و راپەرینی جوتیارانی سوق الشيوخ لە ١٩٣٥ و راپەرینی جوتیارانی فوراتی ناوەڕاست و قەزای قورنە لە ١٩٣٥-١٩٣٦ و راپەرینی جوتیارە ئێزدییەکان لەساڵی ١٩٤١ لەگوندی رومبوس و جوتیارانی عەربەت لە سلێمانی لەساڵی ١٩٤٢. بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی ئەم راپەرینانە بڕوانە: ليث عبدالحسن الزبيدي، ثورة ١٤ تموز في العراق، ط ٢)، بغداد، ١٩٨١ ص٣٣، جعفر حميدي، التطورات السياسية في العراق ١٩٤١-١٩٥٣، مطبعة الضمان، النجف، ١٩٧٦، ص٢٩٢-٢٩٤، ب. هەوراز، راپەرینی جوتیارانی دەشتی هەولێر، کوردستانی عێراق، ١٩٧٧، ل٨، خالد عبدالمنعم المعاني، موسوعة العراق الحديث، ط(١)، بغداد، ١٩٧٧، المجلد الاول، ص٣٠٨، علي الثوري، افاق تطور الحرکة الفلاحية في العراق، "الثقافة الجديدة" (مجلة)، عدد (٢٦٢)، ١٩٧٤، ص٧٤.

* دەشتێکی پان و فراوانەو گوندەکانی ناحیەی قوشتەپە و گوێڕو دیبەگە و قەزای مەخمور دەگرێتەوە، کە بریتییە لەدەشتی پشت رێ (سەرووی رێگای کەرکوک- هەولێر) و مولکیە و شەمامک و کەندێناوەو قەراج هەردوو زێی گەورەو بچووک نێوانی رۆژئاواو رۆژهەڵاتی بۆ دەکێشێت و چیای قەرەچوغ دەشتی (قەراج و کەندێناوە) و زوورگی زوورگەزراو (کەندێناوەو مولکیە) لێک جیا دەکاتەوە.

** بەناغاکانی دزەیی ناسراون، کە لەبنەڕەتدا خەڵکی ناوچەی (دزە)ن لە دوای کۆچکردنیان لەناوچەکانی دەشتی هەولێر نیشتەجێی بوون. چاوپێکەوتنێک لەگەڵ رەقیب حوسێن مەلا، لە ٦ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٢.

٧- سعاد خيري، من تاريخ الحرکة الثورية في العراق (١٩٢٠-١٩٥٨)، ط(٢)، بغداد، ١٩٧٨، ص٢٠٥.

٨- چاوپێکەوتنێک لەگەڵ حەسەن تەها فەتاح، لە ٤ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٢. لەساڵی ١٩٣٠ لەدایک بووە، لەناوەڕاستی

چلەکانەوە تێکەڵ بەکاری سیاسی بووە پەیوەندی بەحزبی شیوعی عێراق کردووە، بەشداری لەم لێژنەیە کردووە کە لەساڵی ١٩٤٨ لەگوندەکەی دادەنرێت بۆ رێنماییکردنی جوتیارەکان، ئێستا ئەندامی سەرکردایەتی بزووتنەوەی دیموکراتی گەلی کوردستانە، چاوپێکەوتنێک لەگەڵ سلێمان ئەحمەد مورتکەیی، لە ١٤ی تەموزی ٢٠٠٣ لەساڵی ١٩٢٢ لەگوندی مورتکە لەدایک بووە، چالاکانە لەراپەرینی جوتیاراندا رۆڵی بەرچاوی گێراوەو ئەندامێکی چالاکی حزبی شیوعی عێراق بووە، ئێستا لەهەولێر دادەنیشێت، چاوپێکەوتنێک لەگەڵ حەسەن حاجی سمایل سوراحی، لە ٢٢ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٣، لەساڵی ١٩٢٥ لەدایک بووە، لەساڵی ١٩٤٧ پەیوەندی بەحزبی شیوعی عێراق کردووە، لەماوەی ساڵانی ١٩٥٨-١٩٨٥ کرێکاری هێڵی شەمەندەفەر بووە، دواتر خانەنشین دەکرێت و ئێستا لەهەولێر دادەنیشێت.

٩- حزبی شیوعی کوردستان، راپەرینی جوتیارانی دەشتی هەولێری ساڵی ١٩٥٣ وەکو خۆی، کۆکردنەوەی حەسەن تەها، سەلیم شێخ محەمەد، باباعەلی جەباری، هەولێر، ٢٠٠٢، ل٦-٧.

١٠- م. و.د، القلم السري، رقم الاضبارة ٤/٢٩، القسم الثاني، العنوان: الدعايات الضارة، الموضوع: الدعايات الشيوعية، صورة كتاب وزارة الشؤون الاجتماعية المرقم ٣٦٥٣ و المؤرخ في ١٩٥٣/٧/١٨.

١١- مەلا عەولای حاجی سمایل، سەربردەی ژیانی سیاسیم، بەغدا، ١٩٩٠، بەرگی یەکەم، ل٧٦-٧٧.

١٢- چاوپێکەوتنێک لەگەڵ رەقیب حوسێن مەلا، لە ٦ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٢، چاوپێکەوتنێک لەگەڵ مەلا حەسەن، لە ٤ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٢، موحسن دزەیی، م.س، ص٩٧-٩٨.

١٣- چاوپێکەوتنێک لەگەڵ حەمەدەمین قادر حەسەن، لە ٩ی نیسانی ١٩٩٨، چاوپێکەوتنێک لەگەڵ حەسەن تەها، لە ٤ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٢، چاوپێکەوتنێک لەگەڵ خدر قادر خدر ناسراو بە (خدر روسی)، لە ٦ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٢. لەساڵی ١٩٤٧ لەدایک بووە، لەسەرەتاکانی شەستەکانەوە پەیوەندی بەحزبی شیوعی عێراق کردووە، لەساڵی ١٩٩٣ دەبێتە ئەندامی لێژنەی پارێزگای هەولێری حزبی شیوعی، لەساڵی ١٩٩٥ دوای دامەزراندنی بزووتنەوەی دیموکراتی گەلی کوردستان دەبێتە سکرتێری بزووتنەوەکە.

١٤- چاوپێکەوتنێک لەگەڵ نوری وەسمان قەرەنی، لە ٢٣ی ئاداری ١٩٩٣، ئیسماعیل شکر، اربیل- دراسة تاريخية في دورها الفكري والسياسي (١٩٣٩-١٩٥٨) اربيل، ٢٠٠٣، ص٢٦٧.

١٥- سعاد خيري، من تاريخ.............، ٢٠٦.

جوتیارەکان لەکاتی بۆنەو یادە تایبەتییەکان و سەفەرکردنی ئاغاکاندا دەبوایە دیاری پێشکەش بەئاغاکان بکەن، لەساڵی ١٩٥٣ (حوسێنی مەلای) بەمەبەستی چارەسەرکردنی نەخۆشی دەیەوێت سەفەری ئەستەنبوڵ بکات بەم بۆنەیەوە داوای گەنم لەجوتیارانی گوندەکەی دەکات بۆیە ناویان لەم باجە نا (ئەستەمبوڵانە) چاوپێکەوتنێک لەگەڵ حمدامین قادر حەسەن، لە ٩ی نیسانی ١٩٩٨.

١٦- چاوپێکەوتنێک لەگەڵ حەسەن تەها، لە ٤ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٢، چاوپێکەوتنێک لەگەڵ حەسەن سمایل سوراحی، لە ٢٢ی نیسانی ٢٠٠٣، چاوپێکەوتنێک لەگەڵ ئەحمەد قادر حەسەن، لە ٢ی تەموزی ٢٠٠٣. لەساڵی ١٩٣٦ لەدایک بووە، لەساڵانی پەنجاکان تێکەڵ بەکاری سیاسی بووە، یەکێک بووە لەجوتیارە راپەریوەکان، ئێستا لەهەولێر دادەنیشێت.

١٧- بەهۆی خێرا بلاوبوونەوەی راپەرینەکە بەگوندەکانی تر زۆر لەمێرد منداڵ و گەنجەکانی گوندەکان ئەم دێرە هۆنراوەیان دەوتەوە:

**سەنیەو مرکیە و کەندیناوە**
**بە سێ رۆژان دەنگیان داوە**

١٨- سەرچاوەکان لەبارەی ژمارەی گوندە راپەریوەکان بیروڕای جیاوازیان هەیە، هەندێ بە (٣٠٠) گوندی دادەنێن، بەڵام لەبارەی ئەوانەی بەنزیکەی (٢٠) گوندی دەخەمڵێنن لەراستی نزیکترە، چونکە ژمارەی گوندەکانی کە ئاغاکانی دزەیی تێدابوون لەم سنوورە بووە. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: سعاد خيري: من تاريخ...، ج(١)، ص٢٠٦، ليث عبدالحسن الزبيدي، م.س، ص٣٣، قيس عبدالحسين، م.س، ص٢١، حزبی شیوعی کوردستان، راپەرینی.......، ل١٠.

١٩- بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی راپەرینەکانی ئەم گوندانە بڕوانە: هـ.س، ل٢٣-٨٠.

٢٠- زەکی خەیری، راپۆرتێک لەبارەی ئیسلاحی زراعی، لەبلاوکراوەکانی رۆژنامەی (ئازادی)، ١٩٦٠، ل٢٣، جعفر عباس حميدي التطورات والاتجاهات السياسية الداخلية في العراق ١٩٥٣-١٩٥٨، ط(١)، بغداد، ١٩٨٠، ص٤٠، راپەرینەکەی جوتیارانی دزەیی "بیری نوێ" (گۆڤار)، ژ(١٨٥)، ١٩٧٦، ل٢.

٢١- مسعود محەمەد، گەشتی ژیانم، چاپی یەکەم، ستۆکهۆلم، ١٩٩٢، ل٣٠٢، محسن دزةيي، احداث عاصرتها، الجزء الاول، اربيل، ٢٠٠١، ص٩٧.

٢٢- چاوپێکەوتنێک لەگەڵ حەسەن تەها، لە ٤ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٢، چاوپێکەوتنێک لەگەڵ رەقیب حوسێن مەلا، لە ٦ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٢، چاوپێکەوتنێک لەگەڵ ئەحمەد قادر حەسەن، لە ٢ی تەموزی ٢٠٠٣.

٢٣- لەبارەی ناوی جوتیارە گیراوەکان بڕوانە: پاشکۆی ژمارە (٢).

٢٤- لەیادی راپەرینەکەی دەشتی دزەییدا، "بیری نوێ" (گۆڤار)، ژ(٤٦)، ١٩٧٣/٥/٨، ل٤.

٢٥- حزبی شیوعی کوردستان، راپەرینی.............، ل١٨.
٢٦- هـ.س، ل٦٣، راپەرینەکەی جوتیارانی دزەیی، "بیری نوێ" (گۆڤار)، ژ(١٨٥)، ١٩٧٦، ل٣.
٢٧- چاوپێکەوتنێک لەگەڵ حەمەدەمین قادر حەسەن، لە ٩ی نیسانی ١٩٩٨، چاوپێکەوتنێک لەگەڵ حەسەن حاجی سمایل سوراحی، لە ٢٢ی نیسانی ٢٠٠٣، چاوپێکەوتنێک لەگەڵ حەسەن تەها، لە ٤ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٢.
٢٨- نووسراوەکە لەلایان (سەعید فەرەج) کە ئەندامێکی حزبی شیوعییە دەنووسرێت. چاوپێکەوتنێک لەگەڵ حەسەن حاجی سمایل، لە ٢٢ی نیسانی ٢٠٠٢.
٢٩- عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، بيروت، ١٩٨٢، الجزء (٩)، ص٦.
٣٠- چاوپێکەوتنێک لەگەڵ رەشید عەبدولقادر، لە ٥ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٢، ئیسماعیل شکر، اربیل......، ص٢٦٩، حزبی شیوعی کوردستان، راپەرینی.....، ل١٩-٢١، راپەرینەکەی جوتیارانی دزەیی "بیری نوێ" (گۆڤار)، ژ(١٨٥)، ١٩٧٦، ل٧.
* یەکێکە لە کەسێتییە کوردییە ناسراوەکان لەساڵی ١٩١٩ لەشارۆچکەی کۆیە لەدایک بووە، دەرچووی کۆلیژی مافە لەبەغدا، لەچلەکاندا ئەندامێکی چالاکی یانەی سەرکەوتنی کوردان لەبەغدا بووە، لەخولی سێنزەمینی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقدا ئەندام دەبێت لەنیسانی ٢٠٠٢ لەهەولێر مردووە. لەبارەی هەڵوێستەکانی لەکاتی کۆبوونەوەکانی پەرلەمان بڕوانە: ئیسماعیل شکر، اربیل.....، ص٢٧٣-٢٧٧.
٣١- المملكة العراقية، محاضر مجلس النواب الدورة الانتخابية الثالثة عشرة، بغداد، ١٩٥٣، ص٤٧٧.
٣٢- ئیسماعیل شکر، اربیل......، ص٢٢، راپەرینەکەی جوتیارانی دزەیی "بیری نوێ" (گۆڤار)، ژ (١٨٥)، ١٩٧٦، ل٧.
٣٣- بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: عبدالفتاح علي يحيى بوتاني، اضاءة جديدة علي حركة فلاحي سهل اربيل في ٢٢ نيسان ١٩٥٣، "گولان العربي" (مجلة)، عدد (٢٠٤)، السنة الخامسة، ٣٠ تشريني الثاني ٢٠٠٠، ص٩١.
٣٤- راپەرینەکەی جوتیارانی دزەیی "بیری نوێ" (گۆڤار)، ژ(١٨٥)، ١٩٧٦، ل٧.
٣٥- چاوپێکەوتنێک لەگەڵ نامینە قادر حەسەن، لە ١٣ی ئابی ٢٠٠٣، لەساڵی ١٩٣٤ لەگوندی قازیخانە لەدایک بووە، لەکاتی راپەرینەکە یارمەتی جوتیارەکانی داوە، ئێستا لەهەولێر دادەنیشێت، چاوپێکەوتنێک لەگەڵ بەسێ قادر حەسەن، لە ٢ی تەمموزی ٢٠٠٣. لەساڵی ١٩٤٢ لەدایک بووە شان بەشانی ئافرەتەکانی گوندەکەی رۆڵی لەراپەرینەکەدا بینیوە، ئێستا لەهەولێر دادەنیشێت، چاوپێکەوتنێک لەگەڵ زولیخا وەسمان قەرەنی، لە ٧ی نیسانی ٢٠٠٢. لەساڵی ١٩٢٢ لەدایک بووە، یەکێک بووە لەم ئافرەتانەی لەکاتی راپەرینەکەدا شان بەشانی جوتیارەکان وەستاوە شەوانەش پاسەوانی ماڵەکەی کردووە لە دەستدرێژی کردنی ئاغا بۆ سەر جوتیارە راپەڕیوەکان، لە ١٦ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٢ مردووە.
٣٦- م.و.د، القلم السري، رقم الاضبارة: ٤/٢٩، القسم الثاني العنوان: الدعايات الضارة، الموضوع: الدعايات الشيوعية، صورة كتاب وزارة الشؤون الاجتماعية المرقم ٣٦٥٣ و المورخ في ١٩٥٣/٧/١٨، المرفق: صورة عريضة فلاحي منطقة قادر كرم الى حضرة صاحب الجلالة مللك العراق المعظم.
٣٧- بيان الحزب الشيوعي العراقي، بتاريخ ٢١ مارس ١٩٥٣، الموضوع: ساندوا نضال فلاحي دزەيي في اربيل.
٣٨- م.و.د، وزارة الداخلية، رقم الملف، بلا، عنوان الملف: حركات الشمال ١٩٥٠-١٩٥٣، ص١٨٣-١٨٥، من مديرية التحقيقات الجنائية- الشعبة الخاصة الى مدير الشرطة العام، العدد (٥٢٥١) السري، ١٩٥٣/١٠/٩.
٣٩- مەلا عەولای حاجی سمایل، س.پ.، ل٧٨-٧٩.
٤٠- لەبارەی ماڵە دەرکراوەکان بڕوانە: حزبی شیوعی کوردستان، راپەرینی.....، ل٨٢، ٥٨، ٦٠، ٦٢، ٤٨، ٥٠، ٥٣، ٥٥، ٥٦، ٤٦، ٢٩، ٢٦، ٢١، ٢٦.
٤١- سعاد خيري، من تاريخ..........، ج(١)، ص٢٠٧، ئیسماعیل شکر، اربیل.....، ص٢٧١.
٤٢- لە بەشێکی هۆنراوەکەدا دەڵێت:

**گوێ بگرن بانگتان دەکەم کاکی پاڵەو سەپانم**
**هەرچەندە لێتان دوورم لەناو ریشەی دڵتانم**
**لە یەکێتی و هەوڵدان هاتوومە لەگەڵتانم**
**فیدای قوربانی رێگای ئازادی و شادیتانم**

بڕوانە دەقی هۆنراوەکە لە: "هەولێر" (گۆڤار)، ژ(١٢)، پایزی ٢٠٠١، ل١١٤-١١٥.
٤٣- لە بەشێکیدا دەڵێت:

**رەشمەی (٥٣) بوو، ئێمەی جوتیار راپەڕین**
**لە گوندی قازیخانە وەک شێر لە لانە دەرپەڕین**
**هەموو سوێندمان بۆ یەک خوارد خێرمان خێرو شەرمان شەر**
**چیدی بەرامبەر ئاغا، خۆمان ناکەین لاڵ و کەر**
**تا رۆژی ٤ی تەمموز کە شۆڕش بەرپا کرا**
**هێزی گەل هاتە مەیدان دەرەبەگ ریسوا کرا**

بڕوانە دەقی هۆنراوەکە لە: حزبی شیوعی کوردستان، راپەرینی جوتیارانی......، ل١٠٢-١٠٣.



# هەولێر لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلولدا

سازگار رەشید ئیبراهیم

بیروڕاکان لەسەر ئەوە کۆکن کە یازدەی ئەیلولی ١٩٦١ سەرەتای شۆڕشی ئەیلول بووە[١]. ئەم شۆڕشە لە بارێکی ناوچەیی و نێودەوڵەتی دیاریکراو لە ئەنجامی ستەم و چەوساندنەوەی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی دەیان ساڵەدا سەری هەڵداوە. ئەم شۆڕشە وەڵامدانەوەیەکی مێژوویی بوو، بەرامبەر بە سیاسەتی سەرکوتکەرانەی حکومەتی عەبدولکەریم قاسم[٢].

دەتوانین بڵێین شۆڕشەکە کە لە سەرەتای هەڵگیرسانی لە ئەیلولی ١٩٦١، بەرنامەیەکی داڕێژراوی نەبوو، هەروەها هیچ تاقیکردنەوەیەکی شۆڕشگێڕی پێشتر و هیچ نیەتێکی خۆ ئامادەکردن بۆ شۆڕش لەبنەڕەتدا نەبوو. لەسەرەتا کۆمەڵێک چەکدار بوو، کە ئەوەی پێکی دەبەستنەوە تەنها ڕقبوونەوە و دژایەتیکردنی ڕژێم بوو، لەوکاتەدا قورسایی گرنگی پێکهێنانی ڕێکخستنێکی سیاسی کەوتە ئەستۆی ئەندامانی حزب و بارزانییەکان و هەروەها هەندێک لەو سەرۆک عەشیرەتانەی، کە خۆیان بە دەستەوە نەدا، بەڵکو لە چیا مانەوە، هەتا شۆڕش سەرکەوتنە گەورەکانی بەدەست هێنا[٣].

لەکاتی هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول لە ١١ ئەیلولی ١٩٦١ حکومەتی دەسەڵاتدار زۆر ڕێگا و هۆکاری بەکارهێنا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی شۆڕش، یان کاریگەری لەسەر مەعنەویاتی ئەوانەی کە پەیوەندی بە شۆڕشەوە دەکەن، بە هەڵخەڵەتان و کڕینیان و هاندانی کورد لە دژی کورد، تاوانبارکردنی جوتیاران بە تایبەتی لە وەرزی بەروبووم بە پشتگیری کردنیان لە شۆڕش، ئەوەش بە گرتنیان و دەستبەسەرداگرتنی بەروبوومەکانیان بوو. هەروەها نیوە کۆچەرەکان کە قەدەغە بوو کۆچ بکەن و ناچاریان دەکردن کە چەک هەڵبگرن لە دژی شۆڕش، لە هەمووی گرنگتر ڕژێم و دەسەڵات دەستیان بەسەر موڵک و ماڵی ئەوانەی کە شۆڕش دەکەن داگرت یان فەرمانبەرانیان لە کارەکانیان دابڕی، تاکو کاریگەرییان لەسەر ئاستی بژێوی خانەوادەی ئەوانەی پەیوەندی بە شۆڕشەوە دەکەن هەبێ[٤].

لەم قۆناغەدا دانایی و وردبینی و سووربوونی بارزانی لەسەر بەرز کردنەوەی دروشمی ئەقڵانی وەک

(دیموکراتی بۆ عێراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان) رۆڵێکی گرنگیان بینی لە کۆکردنەوەی پشتیوانیکردنی کێشەی کورد[٥].

ئەوەتا لە ١٩٦٣/٧/٩ حکومەتی یەکێتی سۆڤیەت یاداشتێکی رەسمی دایە لیژنەی ئابووری و کۆمەلایەتی دەستەی نەتەوە یەکگرتووەکان، کە داخوازی دەرکرد بۆ گفتوگۆ کردنی نارەزاییەکی رەسمی دژی دەسەلاتدارانی بەغدا[٦].

لە ١١ی ئەیلولی ١٩٦١دا جەنەراڵ قاسم دوو لەشکری بۆ ناوچەکانی باکووری ولات نارد و گوندەکانی بۆمباران کرد. ئەم هێرشە نزیکەی هەزار قوربانی بوو، لە تشرینی دووەمی هەمان سالادا بۆ دوو بەرامبەر زیادی کرد. سەرچاوەکانی دەولەتی رایدەگەیەنن، کە لە بۆمبارانەکانی شوباتی ١٩٦٣دا (٦٠) گوند ویران و هەزاران کەس دەستگیر کران[٧].

لە رۆژی ١١ی ئەیلولی ١٩٦١ لە هەموو ناوچەی کوردستان لە نێوان هێزی حکومەت و عەشایر و حزبی بوو بەشەر، پێشمەرگە بە جەرگەکانی عەشایر چوونە ناو پێشمەرگەوە. هێزی میری بە تەیارە و تۆپ و چەکی تازە پەلاماری سەنگەرەکانی پێشمەرگەی دەدا، کە پێشمەرگەکان لە سەنگەردا هەلقەنێ، بۆ ئەوەی رێگاکە بکاتەوە کە هێزی میری پێدا بڕوات[٨].

بەو سەرکەوتنە یەک لەدوای یەکانەی کە پێشمەرگە و شۆڕش بەدەستی هێنا، بە هەوڵدانی حزب و لایەنی سیاسی و رێکخستنەوەی شۆڕش و بلاو کردنەوەی بیروباوەڕی نەتەوەیی و ئامانجەکانیان لەنێوان چینەکانی کۆمەڵ کاریگەری شۆڕش لە هەموو پارچەکانی کوردستان دەرکەوت، نەبوونی هێزی پێشمەرگە لەو ناوچانەی کوردستان کە لەژێر دەسەلاتی حکومەت بوون، ئەنجامەکەی بووە هۆی ئەوەی، چینێکی لاواز و ناپاک و خۆپەرست جیا بکرێتەوە لە چینێکی دلسۆز و بەباوەڕ بەرامبەر بە کێشەی کورد[٩].

دەشتی هەولێر وەک هەر دەڤەرێکی کوردستان توانی بەشداری ئەم شۆڕشە بکاتەو رۆڵێکی کاریگەر ببینێت، ئەم بەشداری کردنەشی زیاتر لە رێگای جەماوەری دەشتی هەولێرەوە بوو، کە چالاکی زۆر گەورەیان ئەنجامداوە، پاش ئەوەی بڕیاردرا کە بەتالیۆنی دەشتی هەولێر بکرێت بە هێز و (فارس باوە) کرا بە فەرماندەی هێز و سێ بەتالیۆنی لێ دروست کرا. یەکەم بنکەی ئەم هێزە لەقەرەچوغ بوو، کە لەو ناوچەیە توانی شەڕێکی زۆر بەهێز دژی حکومەتی عێراقی بکات، بەناوبانگترین شەڕەکانیش شەڕی (دارەخورما) بوو. بەلام لەپاشان لەبەر نەبوونی چەک و ئازووقەی تەواو و بێ ئاوی بنکەی خۆیان گواستەوە بۆ ناوچەی بێستانە و دێدەوان[١٠].

لە رۆژی ١٥ی نیسانی ١٩٦٨ شەڕەکانی دەشتی هەولێر زۆر بە توندی دەست پێدەکات، لەوکاتەدا سەرکردایەتی شۆڕش تۆپی ١٠٦ملیمی دژی دەبابەی بەدەستهێنابوو، هەروەها یەکێک لە داستانەکانی دەشتی هەولێر، کە پێویستە رۆشنایی بخەینە سەر، ئەویش داستانی شەڕی شاخولان بوو (شاخولان گوندێکە دەکەوێتە خۆرئاوای هەولێر)[١١].

ئەوەی پێویستە داکۆکی لەسەر بکرێ، ئەو هێرشە بەربلاوە بوو کە بۆ سەر ناوچەکانی دەشتی هەولێر لە ئەیلولی ١٩٦٩، بە بەشداری دەیان دەبابە و بنکەی تۆپخانە و فڕۆکەی جەنگی دەستی پێکرد و بەرەکەش ئەم گوند و ناوچانەی گرتەوە: (لە کۆیە: بێستانە، قەشقە، خورخور. رێگای هەولێر: دێگەلە، لەگەل گوندی باخچە لە هەولێر)، شەڕێکی خوێناوی بۆ ماوەی یەک هەفتە بەردەوام بوو[١٢].

دەشتی هەولێر وەکو دەرگایەکی شۆڕش بوو، زۆربەی چالاکییە سەربازییەکان و کاری نهێنی لەناو شاری هەولێر لەلایەن هێزی دەشتی هەولێر ئەنجام دەدران، یەکێک لە چالاکییەکانی ئەو هێزە، کوشتنی سەرۆک جاشی گەورە (حەمەی سابیر) بوو، هەر لە سەرەتای سەرهەلدانی شۆڕشی ئەیلول لە هەولێر، دوو کەس لە بنەماڵەکانی دزەیی بە ناوی (حەمەی سابیر و رەشید گۆسکە) چەکی جاشایەتییان کردە شان و بەهەموو توانایانەوە کەوتنە ئەنجامدانی کاری دژ بە

جەماوەر و شۆڕش، جا چ سووتاندنی دێهاتەکان، کە دەتوانین بڵێین وەک گورگی هاریان لێهاتبوو[١٣].

لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٦٧ پێشمەرگەکانی هێزی دەشتی هەولێر کەمینێکی بەهێزیان بۆ داناوە لەسەر ڕێگای هەولێر-کەرکووک، کە لە ئەنجامدا توانییان لەگەڵ جاشێکی تریش بیانکوژن، هەروەها پێشمەرگەیەکیش بەناوی (عەلی تەکتریۆفیش)، کە یەکێک بوو لە پاڵەوانەکانی هێزی دەشتی هەولێر لەم شەڕەدا گوللەیەکی بەسەری دەکەوێ و شەهید دەبێ[١٤].

## ڕێککەوتنی ١١ی ئاداری ١٩٧٠

لە ئەنجامی ئاڵۆزبوونی کێشە نێوخۆیی و ناوچەییەکانی حکومەتی عێراق لەلایەک و، سەرکەوتنە یەک لەدوای یەکەکانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد لەلایەکی تر و بە ئاگاداری سۆڤیەت لە ١٠ی ئاداری ١٩٧٠ لە ناوپردان، ڕێککەوتننامەیەک لە نێوان مەلا مستەفای بارزانی و سەدام حوسێن لە شەوی ١١/١٢ی ئاداری ١٩٧٠ مۆرکرا، ئەحمەد حەسەن بەکری سەرکۆمار لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆنی عێراق خوێندییەوە، کە بەڕێککەوتننامەی ١١ی ئادار ناسراوە، ئەم ڕێککەوتننامەی، لەسەر ئاستی ناوخۆ و دەرەوە پێشوازییەکی گەورەی لێ کرا، لە هەموو کەناڵەکان ڕاگەیاندرا و لە سەرتاسەری جیهاندا دەنگی



دایەوە[١٥].

پێشمەرگەکانی هێزی دەشتی هەولێریش توانییان چالاکی خۆیان ئەنجام بدەن، لە ڕۆژی (١٠)ی ئادار ١٩٧٠ فارس باوە، کە فەرماندەی هێزەکە بوو، داوای لە گشت بەرپرسی پێشمەرگە و حزبییەکانی ناوچەکە کرد، ئامادەبن بۆ گرتنی کۆبوونەوەیەک، پێی ڕاگەیاندن کە ئەمشەو بەیانێک لە بەغدا دەردەچێت، بۆ ئەم مەبەستەش کاک ئیدریس و کاک مەسعود ئێستا لە بەغدان، بۆیە ئامادەبن، بەیانی ئێمە لە شێوەی هەیئەتێک دەچینە ناو شاری هەولێر، بۆ ئەوەی لەگەڵ پارێزگار دابنیشین و بەرنامەی داهاتوومان دابڕێژین[١٦].

لە کۆتاییدا دوای نۆ ساڵ لە تەمەنی شۆڕشی ئەیلول، بارزانی و سەرکردەکانی شۆڕش توانییان لە ڕێگای وتووێژ و ئاشتی لەگەڵ حکومەتی عێراق ڕێکەوتننامەی ١١ی ئاداری مێژوویی مۆر بکەن، کە تێیدا نەوەی کورد بە مافە ڕەواکانی شادبێت[١٧].

دوای ئەو ڕێککەوتننامەیە، ڕۆژگارێک کورد بۆ ماوەیەکی کورت توانی فەرمانڕەوایی خۆی بکات، تەنها لەوکاتەدا هێمنی و ئاشتی باڵی بەسەر کوردستاندا کێشابوو، گەر کۆتایی شەستەکان و سەرەتای حەفتا بهێنینەوە یاد، کە شۆڕشی ئەیلول بزاڤی ڕزگاریخوازی ئەو سەردەمە بوو، هەر کەسێ سەرنجی دەدا چۆن هێمنی و ئاشتی باڵی بەسەر کوردستان کێشابوو، هەروەها چۆن ناکۆکییە کۆمەڵایەتییەکان شەڕی چەکدارییان لێ نەکەوتەوە[١٨].

ڕێککەوتننامەی ئادار تا ڕادەیەک گیانی وەبەر هەندێ گۆشە و کەناری کوردستانی عێراقدا هێنایەوە، ئەویش بەدەرەنجامی کۆمەڵێک هۆکاری دیارن، وەک بەدەنگەوەچوونی لایەنی حکومەت بۆ ئەو بەندانەی ڕێککەوتننامەکە، کە مەسەلەی بنەڕەتی نین، هەروەها هەوڵ و تەقەلای ڕۆشنبیران و دڵسۆزانی کوردیش لەم بوارە جێی پەنجەی خۆی هەبوو[١٩].

**بارودۆخی ئابووری**

وەک لایەنێکی گرنگی ژیانی مرۆڤ و بنەمایەکی پتەوی رەورەوە شارستانییەتەکە، کوردیش وەک هەر نەتەوەیەکی دی لەم بایەخەدا بەدەر نییە، دەشتی هەولێر بەهۆی ستراتیژی شوێنەکەی و بەپیتی زەوییەکەی بووە، پشتێنەی شاری هەولێر و ناوچە شاخاوییەکان بە تایبەتی لەم دواییەدا کە نەوتی تێدا دۆزرایەوە، هەروەها هەواری گەرمیانی هەوارگەی هۆزانی کورد بوو، تەواوکاریی ناوچە شاخاوییەکان بووە و لە رووی ئابووری و ئالوگۆڕی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان و دابینکردنی رێژەیەکی بەرزی ئاژەڵ و گەنم و جۆ. هەروەها دەشتی هەولێر بە هۆی شوێنە ستراتیژییەکەی رۆڵێکی سەرەکی هەبووە لە بازرگانی بە هۆی هەڵکەوتنی لە نێوان ئێران و سوریا و بەیەک بەستنی ناوچە کوردنشینەکان بە ناوچە عەرەبییەکان و بەستنی ناوچە شاخاوییەکان بە ناوچە دەشتاییەکان، سەرەڕای بە پیت و بەرەکەتیی ئەم دەشتە، ساڵانە بەرهەمهێنانی دەغڵ و دانێکی زۆر، رۆڵێکی باڵای لە بازرگانیدا گێڕاوە، جا بە هۆی ئەم ئەگەرانە جۆرە رووداو و تێکهەڵچوونی تێدا رووداوە و جۆرەها حزب و رێکخراوی تێدا دروست بووە[٢٠].

لەسەر ئەم بنەمایە دەتوانین بڵێین هەر لێکۆڵینەوەیەک لە بارەی بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد ئەنجامێکی تەواو بەدەستەوە نادات، ئەگەر ئەم هۆکار و خاڵانەی باسمان کرد رەچاو نەکرێت، لەبەر ئەوەشە عێراق زۆرترین بنەماکانی ئابووری ستراتیژی لە دەست دەدات، ئەگەر کوردستانی پێوە نەما[٢١].

شاری هەولێر بەر لە شەش هەزار ساڵ، یەکەم بێشکەی سەرهەڵدانی کشتوکاڵ و شارستانی بووە، کشتوکاڵ نەخشێکی گرنگ لە پەرەسەندنی ئابووری وڵات و کۆمەڵدا دەگێڕێ، مێژووی ئابووری وڵاتە پێشکەوتووەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە کشتوکاڵ سەرچاوەیەکی گرنگی پێکهێنانی زێدە ئابووری و دەستەبەر کردنی سەرمایەی پێویست و سەرمایە گوزاری ئابووری نەتەوەییە، کۆمەڵانی کارکەری کەرتی کشتوکاڵی لە زۆربەی دەوڵەتە گەشەسەندووەکاندا بازاڕی ساغکردنەوەی بەروبوومی پیشەسازی نیشتمانین[٢٢].

کاتێک شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ هەڵگیرسا و سیستەمی پاشایەتی هەڵوەشایەوە، یەکێک لەو چاکسازییانەی کە ئەنجامدرا لە بواری زەویوزاری کشتوکاڵی بوو، دەبوایە سەرکردەکانی شۆڕش بە بارودۆخی رەوشی زەویوزاری کشتوکاڵییدا بچنەوە، لەبەرئەوەی لەسەرووی ئەو مەسەلانە بوو، کە پێویستی بە چارەسەر کردن هەبوو، جا هەرواش دەرچوو، زۆری نەبرد تاکو یاسای چاکسازی کشتوکاڵی ژمارە (٣٠) بۆ ساڵی ١٩٥٨ دەرچوو لە رێکەوتی ١٩٥٨/٩/٣ کاری پێکرا[٢٣].

حکومەت ئەوەی دەزانی کە کوردستان وزەیەکی کشتوکاڵی و پیشەسازی و مرۆیی هەیە، دەتوانێ نەک هەر تەنیا خۆشگوزەرانی بۆ دانیشتوانەکەی خۆی دابین بکات، بەڵکو دەتوانێ فەرو خۆشی بۆ سەرپاکی گەلی عێراق بگەڕێنێتەوە[٢٤].

ئەگەرچی کوردستان خۆی یەکێک لە شوێنە دەوڵەمەندەکانی جیهان بەدەر لەو هەموو سەرچاوە سروشتییانەی هەیەتی، خاکەکەشی بەشێوەیەکی باش بە کەڵکی رەنێوهانینی کشتوکاڵی دێت، بەڵام لەبەر ئەوەی حکومەتە یەک لەدوای یەکەکانی هەر لە رۆژگارێکی کۆنەوە هەوڵی خاپووركردنی ئاوەدانی و سووتاندنی دارستان و باخ و کێڵگەکان و پەرتەوازە کردنی دانیشتووانەکەیان داوە، لە باشترین بواریشدا ئاوڕیان لە بووژاندنەوە و پێشخستنی نەداوەتەوە، هەربۆیە نەیتوانیوە لە رووی ئابوورییەوە وەک پێویست گەشە بکات، هەلومەرجی شەڕ و کوشتاری پێش رێککەوتننامەی ئاداریش تا رادەیەکی باش کێشەکەی قووڵتر کردبوو، کە بووە هۆی ئاوارە بوونی زیاتر لە (٦٠) هەزار کەس لە دانیشتوانی ناوچەکە، زۆربەی ئەوانە وازیان لە کاری کشتوکاڵی خۆیان هێنابوو و روویان کردبووە شارە سەرەکییەکانی کوردستان یان دەرەوەی کوردستان، بەمەش بەرهەمی کشتوکاڵی لە کورتی داوە، بارێکی قورسی لەسەر ئابووری ناو هەموو

شارەكان دروست كرد[٢٥].

دەشتی هەولێر وەک ناوچەیەكی بەپیت بۆ كشتوكاڵی كردن ناسراوە، لە گرنگترین ناوچەكانی ناوچەی كەندێناودیە، كە دەشتاییەكی فراوان و بە پیتە، لایەنە كشتوكاڵییە زانستییەكان وای بۆ دەچن، گەر هاتوو بە شێوەیەكی زانستییانە توانرا كەڵک لە هەردوو زێی (بچووک و بادینان) وەربگیرێ بۆ ئاودێری ناوچەكە، ئەوا لەو ناوچەیە دەتوانرێ دانەوێڵەی پێویستی باشووری كوردستانی لێ دابین بكرێ[٢٦].

نەوت وەک سامانێكی نیشتمانی و كانزایەكی بەنرخ بایەخێكی تایبەتی پێدراوە، بە هۆی ئەو رۆڵەی كە لە هەڵسووڕانی سیاسەتی نێودەوڵەتی هەیەتی[٢٧].

ئەگەر هەبوونی نەوت لە هەر وڵاتێكدا وەک سامانێكی نەتەوەیی بایەخدار و ستراتیژی رۆڵێكی ئیجابییانەی هەبێت بۆ بەرەوپێشبردنی كۆمەڵگای ئەو وڵاتە، ئەوا لە كوردستان بە بەردەوامی وەک سامانێكی بە بەڵا بووە و رۆڵێكی سلبییانەی بینیوە لە ژیانی كوردەواریدا[٢٨].

دەشتی هەولێریش وەک پارچەیەک لە كوردستان بە هۆی بوونی نەوتێكی زۆر، تووشی ئەو بەڵایە بووە و كاریگەریی خراپی هەبووە، نموونەی ئەوەش نەوتی ناوچەی كەندێناودیە، كەندێناوە دەشتێكی پان و بەرینە، پێگەیەكی جوگرافی گرنگی هەیە، دەروازەیەكی فراوانی تەواوی دەشتی هەولێرە، چاڵە نەوتییەكانی كەندێناوە درێژە پێدەری چاڵگەی نەوتی بابە گوڕگوڕە، كە بە سێیەمین ناوچەی نەوتی جیهانی دادەنرێت، لە دوای چاڵگەی بەرەكاتی كوێت و چاڵگەی ئەلنحورای سعودیە[٢٩].

هەرچەندە ناوچەی كەندێناوە لە رووی ئیداری سەر بە پارێزگای هەولێرە، بەڵام لە بارەی كاروباری نەوت دەرهێنان سەر بە كۆمپانیای نەوتی عێراق (IPC) بووە، كە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ئەم ناوچەیە تووشی راگواستن و بەعەرەبكردن بێت، سەرەتای قۆناغەكانی راگواستنیشی لە ساڵی ١٩٦٣ دەستی پێكرد[٣٠].

لە ئاكامی شەڕ و كاولكاری چەندین ساڵەی شۆڕشی ئەیلول، زۆرینەی گوند و شارۆچكەكان بەر بۆمبباران كەوتوون و بوونە مەیدانی شەڕ و پێكدادان و ئەوەی سیمای ئاوەدانی بوو خاپوور و سووتماک بوو، لەو روانگەیەوە لە هەموو گفتوگۆ و رێككەوتنەكانی نێوان سەركردایەتی شۆڕش و بزووتنەوەی رزگاریخوازی كوردی، كورد لەگەڵ دەسەڵاتداران هەمیشە مەسەلەی ئاوەدانكردنەوەی كوردستان بابەتێكی گرنگی بووە و باسی كراوە و بڕگە و خاڵی تایبەتی بۆ تەرخان كراوە[٣١].

بە درێژایی شۆڕشی ئەیلول سەرباری بایەخدان بە كار و چالاكییەكانی سەربازی، بەپێی توانا، ناوچە ئازادكراوەكانی كوردستان بێبەش نەكراون لە پڕۆژەی ئاوەدانكردنەوەكان[٣٢]، رووبارەكان پاک دەكرانەوە و بیر و كارێزەكان بۆ ئاو خواردنەوە و كشتوكاڵ و ئاژەڵداری لێدەدران[٣٣].

مەسەلەی زەویوزاری كشتوكاڵی و ئاوردانەوە لە كێشەی جوتیاران لە ئەركە لە پێشەكانی شۆڕش بووە، چونكە جوتیاران چینێكی زۆرینەی گەلی كوردن، بە هۆی پاڵدانی ئاغا و دەرەبەگەكان بە دوژمنی ئەو ماوەی دەسەڵاتی شۆڕش لە ناوچەكانی كز بووە، ئەو دەرەبەگانە زەوییەكانیان بۆ خۆیان بردووە، بەڵام هەر كە دەسەڵاتی شۆڕش لە ناوچەكەدا چەسپاوە، شۆڕش دەستی بەسەردا گرتووە و داویەتییەوە خاوەنەكانیان[٣٤].

لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلولدا بایەخی بواری ئاژەڵداری و كشتوكاڵی زانراوە، دەیانزانی ئەم دوو بوارە بڕبڕەی ژیانی ئابووری و گوزەرانی خەڵكی كوردستانە، بۆیە هەوڵ دەدرا كە جۆر و نەژادی ئاژەڵ باش بكرێ[٣٥].

لە دەشتی هەولێر مەڕ و ماڵاتێكی زۆر بەخێو دەكرا، بە تایبەتی لە ناوچەی كەندێناوە لەبەرئەوەی ناوچەی كەندێناوە پاوانێكی خۆرسكی هەیە، بە تایبەتی لە بناری چیای بلباس و مام رەش (قەرەچووغ) و زوورگەزراو و لێواری كەندولەندەكانی ئاوی باران بڵاو بۆتەوە لە ناوچەكەدا، بۆیە لە

پاڵ چاندنی گەنم و جۆ مەڕداری و بەخێوکردنی ئاژەڵ بەڕێوە دەچێ[36].

هەرچی بواری پیشەسازییە بەشێوەیەکی گشتی لە کوردستان لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلول دواکەوتوو بوو، چونکە کشتوکاڵی دواکەوتوو بەشێکی تەواوکەرە بۆ پیشەسازی دواکەوتوو، بێبەش کردنی کوردستان لە پیشەسازی نوێ، کوردستانی بێبەش کرد لە چینی دەستەی کارکردن و چینی پیشەسازی نوێی بورژوازی، بەڵکو لە شوێنیدا بورژوازی بازرگانی هاتە کایەوە، کە ژمارەیان کەم بووە و ریکوپێکی پێوە دیار نەبوو، کەوتبووە ژێر کۆنترۆڵی بورژوازی بازرگانی عەرەبی لە بەغدا، بەردەوام بوون لەسەر سیاسەتی بێبەش کردنی کوردستان هەموو لایەنەکانی ژیانی گرتبووەوە[37].

## بارودۆخی کۆمەڵایەتی

لە راستیدا شۆڕشی ئەیلول بە شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی دادەنرێت، چونکە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی بە چاکی گۆڕی، هەروەها شۆڕشی ئەیلول بووە هۆکارێکی دیار و بەرچاو لە دروستکردنی پەیوەندییەکی پتەو لە نێوان جەماوەر و بە گشتی کوردستان، هەروەها ئەم شۆڕشە توانی پەیوەندییەکی پتەو لە نێوان گشت چینەکان دروست بکات، هەروەها پەیوەندییەکی بەتینیشی لە نێوان پێشمەرگە و جەماوەر بە گشتی دروست کرد[38].

شۆڕشی ئەیلول توانی گیانی هاریکاری و یارمەتیدانی یەکتر لە نێوان رۆڵەکانی کورد بردو پێبدات، بە جۆرێ ئەو شۆڕشە لەلایەن خەڵکی پارچەکانی تری کوردستان یارمەتی دەدرا، ئەم شۆڕشە لە ناخی جەماوەرەوە هەڵقوڵاو بوو، بۆیە بە باشترین شێوە یارمەتی دەدران و خەڵک و شۆڕش لێک جیا نەبوو[39].

لە شۆڕشی ئەیلول هیوای هەموو جەماوەری کوردی بوو لە هەر چوار پارچەی کوردستان و هیچ لایەک دریغی نەدەکرد، بەوەی کە دەستی یارمەتی درێژ بکات بۆ شۆڕش، بە هەموو شێوازێکی یارمەتی و ئەو کەسانەی کە پەیوەندییان بە شۆڕش دەکرد بە فەخر و شانازییەکی گەورەیان دەزانی، پێشمەرگەکان لە گشت چینەکانی کۆمەڵگەی کوردی پێکهاتبوون[40].

ئەگەر باسی بەرگرییەکانی خەڵکی هەولێر بکەین، چ لە پێش زایین و لە کاتی سۆمەری و ئەکەدی و ئاشووری و ئەسکەندەردا یان لە دوای زایین لە کاتی ئەمەوی و عەباسی و مەغۆل و هۆلاکۆدا ئەم ئازایەتییەی هەولێرمان بە درێژایی مێژوو بۆ دەردەکەوێت، هەروەها دەشتی هەولێر بە هەمان شێوە لە شۆڕشی ئەیلولی مەزنیشدا توانی رۆڵێکی کاریگەر و بەشداربوونێکی کارا و بەرچاوی هەبێت، ئەم بەشداریکردنە چ بە شێوەیەکی راستەوخۆ و پێشمەرگایەتی چ بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ بوو بەهۆی یارمەتیدانیان بۆ شۆڕش و پێدانی ئازووقە و جل و بەرگ و حەوانەوەیان و لە باوەش گرتن و شاردنەوەیان لە کاتی تەنگانە، چونکە خەڵکی هەولێر بەوە ناسراون کە لەسەر پەیمان و بڕیاری خۆیان سوورن[41].

لە ئەنجامی ئەم بەشدار بوونەشیان لە شۆڕش لەلایەن رژێمی بەعس تووشی ئەشکەنجە و ئازار و کوشتن و برینێکی زۆر بوونەوە، هەر لە سەرەتای هاتنە سەر حوکمیان بە هەموو شێوەیەک پیلانیان دانابوو بۆ لەناوبردنی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردی، ئامادە بوو هەموو رێگایەک بگرێتە بەر وەک ئەنفالکردن و راگواستن و بەعەرەبکردن[42].

سەرەتای ئەنفالکردنیش لە مانگی ٩ و ١٩٦٣/٧ لە باشووری کوردستان دەستی پێکرد، کە دەشتی هەولێری بە شێوەیەکی بەرفراوان گرتەوە، جگە لەوەش دەشتی هەولێر بە هۆی بەشدار بوونیان و یارمەتیدانیان بۆ شۆڕش گوندێکی زۆریش لە دەشتی هەولێر بە عەرەب کران و راگوێزران وەک کەندێناوە و شارۆچکەی دیبەگە و قەراج، خەڵکی ئەم ناوچانەیان راگواست و لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٣ حکومەتی ئەوکاتی عێراق رێگایان بە هۆزانی عەرەب دا بچنە چیای بڵباسان لە هەردوو بەری قەراج و کەندێناوە نیشتەجێ بن[43].

خووڕەوشتی خەڵکی هەولێر و دەوروبەری لە باوەڕەوە دڵپاک و بێ ئەملاوئەولان، خەڵکی غەریبیان زۆر لەلا بەڕێزە و بۆ میوانداری زۆر

چاکن، هەروەها بۆ رابواردن و ژیانی ئاسوودەش دریغی ناکەن[٤٤]، نموونەی ئەوەش بەشداریکردنیانە لە زۆربەی بۆنە و ئاهەنگەکان لە هەموو سات و وەختێکدا، بەتایبەتی لە ئاهەنگی جەژنی نەورۆزدا، لە سەردەمی شۆرشی ئەیلول لە سەرەتای شەستەکان لە دەشتی هەولێر دوو جار بە بۆنەی جەژنی نەورۆز ئاهەنگ گێردرا، جاری یەکەم لە گوندی (سەردەشت) ئاهەنگ گێردرا، جاری دووەمیش ئاهەنگی نەورۆزی ساڵی ١٩٦٢ لە شارۆچکەی مەخموور سازدرا[٤٥].

گەلی کورد بە گشتی لە شارەکان و گوندەکان و دەشتاییەکان و چیاکان پێشوازییەکی زۆر گەرم لە جەژنی نەورۆز دەکەن، خەڵک هەر هەموویان خۆیان ئامادە دەکەن بە جوانترین جل و بەرگ و پۆشاک، هەر لە پێش جەژنی نەورۆز بە چەند رۆژێک کوردەکان خۆیان ئامادە دەکەن بۆ گەشت و گوزار، هەروەها لە جەژنی نەورۆزی ساڵی ١٩٧٠ دوای بەستنی رێککەوتننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ لە دەشتی هەولێر ئاهەنگێکی زۆر گەورە سازدرا، خەڵکێکی زۆر بەشداری ئەم ئاهەنگە بوون، ئەم بۆنە کۆمەڵایەتییانە دەبێتە هۆی پەیوەندییەکی گیانی بەگیانی لە نێوان خێزان و ئەندامەکانیان و یان ئەوانەی لەیەک شوێن دەژین یان یەک وڵات[٤٦].

کۆمەڵگەی کوردی چەندین نەخۆشیی درێژخایەنی کۆمەڵایەتی هەبوو، کاتێک شۆرشی ئەیلول هەڵگیرسا هەوڵدرا بۆ چارەسەرکردنی زۆربەیان و نەهێشتنیان، یەکێک لەوانەش بە زۆر بەشوودانی ئافرەت بوو، لە ماوەی شۆرشی ئەیلول یاسای خێزانی دەرچوو، کە بەپێی ئەم یاسایە، نەدەکرا هیچ کچێک بەزۆر بە شوو بدرێت، نەدەبوو گەورە بە گچکە بکرێ، سزای توند دانرابوو بۆ هەر جۆرە پێشێل کردنێکی مافی ئافرەت[٤٧]، بارزانی بڕوای بە رۆڵی ئافرەت هەبوو، کە بتوانێ لە تەک پیاو رۆڵی کاریگەری خۆی ببینێت لە پێشخستن و خزمەتکردنی کۆمەڵگای کوردەواری و شان بەشانی باوک و برا و هاوسەری خزمەت بکات[٤٨].

جگە لەوەش لەناو کۆمەڵگەی کوردستانی لە کاتی هەڵگیرساندنی شۆرشی ئەیلول پەیوەندی خێڵایەتی و عەشیرەتگەری باو بوو، هەموو تاکەکانی عەشیرەتەکە پەیوەست بوون بە دەسەڵاتی سەرۆکی عەشیرەت، ملکەچی هەموو فەرمان و بڕیارێکی سەرۆکی عەشیرەت بوون، جا ئەو فەرمانە راست با یان چەوت(٤٩)، بەڵام بەهۆی شۆرش، ئەو پەیوەندییە لەگەڵێ شوێن و خێڵ کز و لاواز بوو، خەڵک پتر هەستی نەتەوەیی و نیشتمانی لا دروست بوو.

شۆرش گرنگی زۆری بە دابینکردنی خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکان دەدا، بە تایبەت لەلایەنی رۆشنبیری و پەروەردەیی و نەهێشتنی نەخوێندەواری[٥٠]، لە پێناو نەهێشتنی نەخوێندەواری، شۆرش پلانی بۆ فێرکردن و کردنەوەی قوتابخانە و بڵاوبوونەوەی رۆشنبیری دانابوو[٥١].

بارزانی رابەری شۆرش رێزی زۆری لەوانە دەگرت، کە خاوەن پلەی زانستی و خوێندنی باڵایان وەدەست هێنابوو، هەوڵی دەدا، کە پلە و پایەی باڵا و پێشکەوتوویان پێ ببەخشێ[٥٢]، تەنانەت لە بەهاری ١٩٦٩دا، بە فەرمانی بارزانی پەیمانگای کادیران لە چۆمان و پەیمانگای پێگەیاندنی مامۆستایانی شۆرش لەناوپردان کرایەوە، بۆ پێگەیاندن و ئامادەکردنی مامۆستایان بۆ قوتابخانەکانی ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستان[٥٣].

هەروەها کردنەوەی چەندین قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی لەو ناوچانەی، کە لە ژێر دەسەڵاتی شۆرش بوون و دوور بوون لە شەرگەکان، لەو ناوچانەی کە لە ژێر هێرشی ئاسمانی بوون، خوێندن هەر بەردەوام بوو، تەنانەت زۆرجار لە ژێر سێبەری دارەکان و لە ئەشکەوتەکان دەخوێندرا، هەروەها لایەنێکی تری خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی لە شۆرشی ئەیلول، گرنگی دابوو بە لایەنی تەندروستی، کە چوار نەخۆشخانەی جێگری هەبوو لەگەڵ چەند بنکەیەکی تەندروستی، کە چەندین کارمەندی تەندروستی تێدابوو لە برینپێچ و فەرمانبەری تەندروستی و کردنەوەی چەندین خولی مەشق بۆ راهێنانی پێشمەرگە و چەندین کارمەندی تەندروستی لەم

خولە دەرچوون، لەدوای ڕێککەوتنی ١١ی ئادار ئەو مامۆستا و کارمەندە تەندروستییانەی لەو خولانە دەرچوون لە دامەزراوەزگا تەندروستی و پەروەردەییەکان دامەزران[٥٤].

هەروەها لایەنێکی تری ئەم خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییانە لایەنی دادگا و دادپەروەری دەگرتەوە، هەرچەندە شۆڕش ژمارەیەکی پێویست لە پیاوانی یاسایی نەبوو، بەڵام ئەمە نەبووە بەربەست، توانرا چەندین فەرمانبەری دادگا بەکار بهێندرێت، کە پێشتر لە فەرمانگەکانی داد لە کوردستان سوودیان وەرگرتبوو و شارەزاییان هەبوو، کوردستان ئازاد کرا و دابەش کرا بۆ چەند ناوچەیەکی دادگایی لە هەر ناوچەیەکدا دادگایەکی شارستانی و دادگایەکی شەرعی دانرا، کە لەلایەن دادپەروەری شەرعی بەڕێوە دەچوو[٥٥].

لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلول لە ناوچەی (بێستانە)ی دەشتی هەولێر، بۆ چارەسەر کردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکان و کێشەی زەویوزار لە نێوان جوتیاران دادگا هەبوو، ئەو دادپەروەرانەی لەو دادگایە دادەنیشتن (حاکم نوری) بوو، لە دوای ئەویش (مەحموود عەدۆ) بوو، کە ئەو کەسایەتییانە زۆر دادپەروەرانە و یاسایی کێشەکانیان چارەسەر دەکرد. هیچ جیاوازییەکیان لە نێوان پێشمەرگەیەک و جوتیارێکی ئاسایی نەدەکرد، هەندێک خەڵک کێشەی خۆیان لەناو هەولێر لە دادگاکانی ناو هەولێر چارەسەر نەدەکرد بەنهێنی کێشەکەیان دەبردە ناوچەی بێستانە و لەوێ چارەسەریان دەکرد، ئەو دادگایانە یاسای عێراقیان پیادە دەکرد لەگەڵ هەندێک یاسا کە شۆڕش داینابوو[٥٦].

سەرچاوەکان:

١- مسعود البارزاني: البارزاني والحركة التحررية الكوردية، ج٣، (اربيل، ٢٠٠٢)، ص٢٦.
٢- سەروەر عەبدولرەحمان عومەر: یەکێتی نیشتمانی کوردستان دامەزراندن و دەست پێکردنەوەی شۆڕش ١٩٧٥-١٩٧٦، (سلێمانی، ٢٠٠٢)، ل١٦.
٣- البارزانی، هەمان سەرچاوە، ل٧١.
٤- عبدالفتاح علي بوتاني: الحركة التحررية الكوردية، دراسات ووثائق، اربيل، ٢٠٠٤، ل٣١١.
٥- ڕۆژنامەی برایەتی، ژمارە ٣٩٠٠، ٢٠٠٣/١/٢٥.
٦- شێرکۆ فتح الله عمر: الحزب الديمقراطي الكوردستاني وحركة التحرر القومي الكوردية في العراق ١٩٤٦-١٩٧٥، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل١٦٨.
٧- جویس بلۆ: دۆزی کورد (لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی و سوسیۆلۆجی)، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل٩١.
٨- میرزا محەمەد ئەمین مەنگوڕی: بەسەرهاتی سیاسی کورد، کوردستان، ١٩٩٨، ل٣١.
٩- البارزانی: سەرچاوەی پێشوو، ل٧١.
١٠- خورشید شێرە: خەبات و خوێن، هەولێر، ٢٠٠٦، ل١٨٥.
١١- دیدار، ڕەشید ئیبراهیم، ٢٠٠٧/٢/٢٥، هەولێر.
١٢- البارزانی: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٠١.
١٣- خورشید شێرە: هەمان سەرچاوە، ل١٨٩.
١٤- خورشید شێرە: سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٠.
١٥- البارزانی: سەرچاوەی پێشوو، ل١٩٩.
١٦- ئازاد عوبێد: کاریگەری شۆڕشی ئەیلول لەسەر پێشخستنی ڕۆژنامەوانی کوردی لە کوردستانی باشوور لە ١٩٦١-١٩٧٥، (نامەی ماستەر) بڵاو نەکراوەتەوە، کۆلێژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەدین، ٢٠٠٣، ل١١٧.
١٧- مجموعة من المؤلفين الكورد والروس: البارزاني وشهادة التاريخ، اربيل، ٢٠٠٥، ل٩٢.
١٨- شێرە: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٠٧.
١٩- حەمە ئەحمەد جاف: چل ئەیلولی پڕ خەبات و شانازی چل چەپکە گوڵیش بۆ سەر مەزاری نەمران، گۆڤاری دەنگی پێشمەرگە، ژ٤٥، ٢٠٠١/٩/٣٠، ل٢٥.
٢٠- ئیسماعیل بێشکچی: کوردستان کۆلۆنییەکی نێودەوڵەتی، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل٢٩٨.

٢١- عوبێد: سەرچاوەی پێشوو، ل١٧٢.
٢٢- عەباس سلێمان سمایل: مێژووی دەشتی هەولێر، بەرگی یەکەم، ل١٤٢.
٢٣- کاوس قەفتان: الحركة القومية التحررية الكردية في كوردستان العراق ١٩٥٨-١٩٦٤. سلێمانی، ٢٠٠٤، ل٢٧.
٢٤- صلاح الدين الحفيد وآخرون: القطاع الزراعي وأهميته في تحقيق الأمن الغذائي، اربيل، ١٩٩٠، ص٩.
٢٥- لە بلاوکراوەکانی مەکتەبی ناوەندی دیراسات و توێژینەوە: رەوشی زەویوزاری کشتوکاڵی لە سەرەتای دەرچوونی یەکەم یاسای چاکسازی کشتوکاڵی ژمارە (٣٠) ساڵی ١٩٥٨ هەتا ١٩٧٠، بەشی سێیەم، ش. (مەکتەبی ناوەندی دیراسات و توێژینەوە، ١٩٩٦، ل٢٧.
٢٦- عوبێد: سەرچاوەی پێشوو، ل١٧٣.
٢٧- عوبێد: سەرچاوەی پێشوو، ل١٧٢.
٢٨- جەلال ئەمین بەگ: جوگرافیای کوردستان، سلێمانی، ١٩٩٨، ل١٧٧.
٢٩- عوبێد: سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٥.
٣٠- کاوە نادر: کەندێناوە لەنێوان راگواستن و بە عەرەبکردن، هەولێر، ٢٠١٠.
٣١- ئەمین قادر مینە: ئەمنی ستراتیژی عێراق سێ کوچکەی بەعس، سلێمانی، ١٩٩٩، ل١٧٩.
٣٢- نادر: هـ. س، ل٢٤-٣٩.
٣٣- عوبێد: سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٥.
٣٤- ناصح غەفور رەمەزان: چەند لایەنێک لە کەلەپووری نیشتمانی و خەباتگێری بارزانی نەمر، هەولێر، ١٩٩٩، ل٤١.
٣٥- رەمەزان: هەمان سەرچاوە، ل٤١.
٣٦- خەبات، ١-٥، نیسان ١٩٦٨.
٣٧- رەمەزان: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٦.
٣٨- نادر: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٠.
٣٩- قەفتان: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٧-٣٩.
٤٠- رۆژنامەی خەبات، ژمارە ٤٧٤، تشرینی دووەم ١٩٦٤.
٤١- محەمەد ساڵح: دیمانەیەک لەگەڵ پێشمەرگەی دێرین، دەنگی پێشمەرگە، گۆڤار، ژمارە ١٠٣، تشرینی یەکەمی ٢٠٠٦، ل٥٥.
٤٢- بارزانی: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٥٧.
٤٣- یوسف ئەحمەد دەرگەڵەیی: مێژووی شاری هەولێر لە کۆنەوە تا ساڵانی شەست، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل١٣٧.
٤٤- کاظم حبيب: لمحات من نضال حركة التحرر الوطني للشعب الكردي في كردستان العراق، اربيل، ٢٠٠٥، ل٣١٠.
٤٥- سمایل: سەرچاوەی پێشوو، ١٣٣-١٣٥.
٤٦- دەرگەڵەیی: سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٧.
٤٧- سمایل: سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٧.
٤٨- زبير بلال ئیسماعیل وآخرون: اربيل بين الماضي والحاضر، اربيل، ١٩٨٧، ل٨٩..
٤٩- البارزانی: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٨٧.
٥٠- رەمەزان: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٠.
٥١- البارزانی: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٨٧.
٥٢- البارزانی: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٨٦.
٥٣- رەمەزان: هەمان سەرچاوە، ل٣٣.
٥٤- گوتنەر دشنەر: بارزانی نەیدەهێشت قوتابییان ببن بە پێشمەرگە، رۆژنامەی برایەتی، ژمارە ٣٨٦٩،١٧/١٢/٢٠٠٢.
٥٥- رەمەزان: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٦.
٥٦- البارزانی: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٨٦.
٥٧- البارزانی: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٨٦.
٥٨- دیدار، رەشید ئیبراهیم، لە رێکەوتی ١/٣/٢٠٠٧، لە هەولێر.



# سیاسەتی سووتماک لە دەشتی هەولێر (١٩٦٣)

عەباس سلێمان سمایل

لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٣ حکومەتی ئەوکاتی عێراق ڕێگایان بە هۆزانی عەرەب دا بچنە چیای بلباسان و لە هەردوو بەری قەراج و کەندێناوە نیشتەجێ بن، ژمارەیەک لە هۆزانی عەرەبی چەکدار بە پاڵپشتی هێزی پۆلیس، سەرەتا هاتن بۆ دیاریکردنی ئەو ناوچانەی کە دەیانەوێت، لە نزیک گوندی (دارەخورما) دەکەونە بۆسەی پێشمەرگە و دەوروبەری (٤-٥) کەس لەپۆلیس و هۆزانی عەرەب بریندار دەبن و دەکوژرێن، ئینجا بە شکستهێنان دەکشێنەوە، دوای ١٥ ڕۆژ لە بەسەرچوونی ئەو ڕووداوە حکومەت هێزێکی گەورە لە سەرباز و پۆلیس و هێزی دیکەی هۆزانی عەرەب ئامادە دەکات، سەرەتا بە تۆپ و فڕۆکە ناوچەکەیان تۆپباران کرد و دواتر هێرشێکی دڕندانەیان هێنایە سەر گوندەکانی کەندێناوە، کە ژمارەیەک لە گوندەکانی شەمامک و قەراجیشیان تاڵان کرد، ئیتر کۆی گشتی گوندە تاڵانکراوەکان گەیشتە ٧٢ گوند، جا لە ئەنجامی ئەو هێرشە بۆ سەر گوندەکانی کەندێناوە خەڵکێکی زۆر لە گوندنشینەکان ڕایانکرد، لە ئەنجامی هێرشکردن بۆ سەر هەر گوندێک لە ڕێگا و دەوروبەری گوند چەند کەسێک کوژران و بریندار بوون، دواتر سوپا مەڕ و ماڵاتی تاڵان کرد و هۆزانی عەرەبیش کەلوپەلی وەک ئاش و کەلوپەلی دیکەی ناوماڵی تاڵان کرد، ئەو پیاوانەی لەناو گوندیش مابوونەوە ئەوانەی کە تەمەنیان لە دەوروبەری (١٤-٧٠) ساڵ بوو، لە گوندەکان لەناو مزگەوتەکان کۆیانکردنەوە، لە هەندێک لە گوندەکان ئامادەیان دەکردن بۆ ئەوەی بیاندەنە بەر دەستڕێژی گوللە و بیانکوژن، بەڵام پاشان فەرمان دەگۆڕدرا.

دوای ئەوەی ئەو گیراوانە بە ڕێگای دوبز هەموویان گەیاندە زیندانی کەرکوک، کە ژمارەیان دەوروبەری ١٠٠٠ کەس دەبوو، هەموویان دابەشی سەر هۆڵەکان کرد

و جلەکانیشیان پێ لەبەرکردنەوە و لەبەر دەرگای هۆڵەکان فڕێیاندانە سەر یەک و تەنها کراس و دەرپێی سپییان لەبەر ما و بۆ ماوەی ١٦ ڕۆژ لەم زیندانە مانەوە، سەرەتا ڕۆژێ یەک ژەمیان دەدرایێ، ئەویش نان و ماست یان نان و مرەبا بوو، هەموو ڕۆژێکیش دوای خۆرئاوابوون بەرپرسی زیندانەکە لەگەڵ سێ ئینزیبات هۆڵ بە هۆڵ پێدا دەهات و زیندانەکانی ریز دەکرد، لە هەر هۆڵێک (٤-٥) زیندانی دەردەهێنا و رووتی دەکردنەوە و لەبەردەم زیندانییەکانی دیکە ئازار و ئەشکەنجەی دەدان و خەڵتانی خوێنیان دەکردن.

حاجی عومەر دانیشتووی گوندی دێمەکار یەک لە زیندانییەکان بوو، گوتی: من و سێ زیندانی دیکە ڕۆژێکیان بەیانی زوو تکامان لە پاسەوانەکە کرد، بۆ ئەوەی ڕێگامان پێ بدا خۆمان بشۆین، پاسەوانەکە گوتی دەبێ زۆر بە خێرایی خۆتان بشۆن، نەوەک بەرپرسی زیندان بتانبینێت، جا من و دوانی دیکە خۆمان شوشت و گەیشتینەوە هۆڵەکە، بەڵام ئەوەی دیکە دواکەوت و بەرپرس بە ئاگاهات و زانی گەرماو زیندانی تێدایە، بۆیە خۆی بە گەرماوەکەدا کرد و ئەو زیندانییەی بە رووتی دەرهێنا و هێنایە ناو هۆڵەکە، لەبەردەم زیندانییەکان دایە بەر قامچیان، ئینجا بە دوو پەنجە چیلچیلەی گوێی زیندانییەکەی گرت و نینۆکی پەنجەی گەورەی زۆر درێژ بوو دەتگوت چەقۆیە، رای تەکاند و چیلچیلەی زیندانییەکەی پچڕاند، دەیگوت ئێوەی زیندانی لەسەرتان نییە خۆتان بشۆن، چونکە کوردن، ئینجا مام عومەر گوتی: زیندانێکی سیاسی لە تەنیشت زیندانەکەی ئێمەوە بوو، ئەوان خواردنیان باش بوو، زانیبوویان خواردن کەم دەدەن بە ئێمە، بۆیە خواردنیان بۆ فڕێدەدایە ناو بەرمیلی زبڵەوە، کە لە دەوری زیندانەکە لەسەر ڕێگای ئاودەستەکانەوە داندرابوو، ئێمەش کە دەچووینە ئاودەست دەستمان بۆ ناو بەرمیلەکان درێژ دەکرد و سەموونمان دەردەهێنا و دەمان خوارد، کاتێک پاسەوانەکان بەم شتەیان زانی ئێمەیان خستە ژێر چاودێری، نەوەک لە بەرمیلەکانی زبڵ نزیک بینەوە، ڕۆژێکیان زیندانییەک لەکاتی چوونی بۆ ئاودەست لە بەرمیلەکان نزیک بووەوە و سەموونێکی دەرهێنا، پاسەوانەکە لێی قیڕاند و سەموونەکەی پێ فڕێدا و نەیهێشت بچێتە ئاودەست و گەڕاندییەوە و کراسەکەی لەبەرکردەوە، لەبەردەم زیندانییەکان بە شێوەیەکی دڕندانە سەر و گوێلاکی کوتایەوە، تا زیندانییەکە لە هۆش خۆی چوو و بۆ ماوەی هەفتەیەک لەناو جێگا کەوت، دوای ئەوەی ١٦ ڕۆژ لە زیندانی کەرکووک بە ناخۆشترین ڕەوش ماینەوە، ئینجا بەرپرسی زیندانەکە، کە مرۆڤێکی زۆر بەدفەڕ بوو هەواڵی گواستنەوەی پێراگەیاندین، بۆ ئەم مەبەستە قورێکی خەستیان گرتەوە، ئینزیباتی سەربازیش بە دار و قامچی و قازمەوە لە هەردوولای قوڕەکە بە ریز وەستابوون و لەدوای ئەوانەوە ئۆتۆمبێلی سەربازی وەستابوو، جا ناوی هەر کەسێکیان بخوێندبوایەوە دەبوایە زۆر بە خێرایی بەناو قوڕەکەدا رابکا و بچێتە ناو ئۆتۆمبێلەکە، جا ئەگەر زیندانییەکە زۆر بە خێرایی ڕای نەکردبوایە، ئەوا هەموو سەر و گوێلاکی بە دار و قامچی و قازمە دەشکا.

بەم جۆرە دەوروبەری دوو هەزار زیندانیان خستە ناو ئۆتۆمبێلەکان، ئینجا زیندانییەکانیان بەرەو وێستگەی شەمەندەفەر برد و لەوێوە لەسەر فارغۆنەکانی بار دابەشیان کردن و بەرەو (موسەیەب) بەڕێکەوت، لە ڕێگا گەیشتنە شارۆچکەیەک و لە وێستگەکە راوەستا، دیاربوو منداڵانی ئەم شارۆچکەیەیان بە هەڵە تێگەیاندبوو، کە گوایە ئەمانە دوژمنی گەلی عەرەب و ئیسلامن، بۆیە منداڵان کەوتنە بەردبارانیان، کاتێک گەیشتنە زیندانی (موسەیەب) بە هەڵسوکەوتێکی دڕندانە زیندانییەکانیان خستە حەوشی زیندانەکە، بەرپرسی زیندانەکە کە چاوی بەو هەڵسوکەوتە دڕندانەیەی پاسەوانەکان کەوت زۆری پێناخۆش بوو، گوتی: زیندانی کە

گەیشتە ئێرە لێدانی لەسەر نامێنێ، دوای ئەوەی ناوی زیندانییەکانیان خوێندەوە، دابەشی سەر هۆڵەکانیان کردن، پاسەوانە تایبەتییەکان رۆیشتن و ئەرکی پاسەوانی زیندانییەکان کەوتە سەر ئەستۆی سوپا.

دوای ئەوەی عەبدولڕەحمان عارف دەبێتە سەرکۆماری عێراق، ئەم زیندانییانە بەرەبەرە ئازاد دەکرێن، بەشی یەکەمیان دوای ٨ مانگ ئازاد دەکرێن و دوا بەشیش دوای مانگ و نیوێک ئازاد دەکرێن، کە ژمارەی دوابەش ٢٥٠ زیندانی بوون.

**بیرەوەری بەڕێز حەوێز جوکل:**

لە ساڵانی سەرەتای شەستەکان لە دەشتی هەولێر دووجار ئاهەنگ بە بۆنەی جەژنی نەورۆز گێڕدرا، جاری یەکەم لە گوندی سەردەشت ئاهەنگ گێڕدرا و منیش ئەم پارچە شیعرەم بەبۆنەی جەژنی نەورۆز دانا و خوێندمەوە، ئەمە بەیتی یەکەمی شیعرەکەیە:

**جەژنتان پیرۆز نەتەوەی کاوە**
**بووکی بەهاری تازە رازاوە**

بۆ جاری دووەمیش ئاهەنگی نەورۆزی ساڵی ١٩٦٢ لە شارۆچکەی مەخموور سازدرا، کە ئەو کات بە ئاشکرا بوو، چونکە رێکەوتنێک هەبوو، منیش پارچە شیعرێکم لەسەر نەورۆز دانا و لەم ئاهەنگەدا خوێندمەوە، جا لەبەر ئەوەی شیعرەکە هەر هەمووی هێرش بوو بۆ سەر حکومەت، قایمقامی مەخموور فەرمانی گرتنی بۆ دەرکردم، منیش ئەوکات ماڵم لە گوندی خدرجیجە بوو، پەیوەندیم بە هێزی کەندێناوە کرد، لە مانگی ٩ی ساڵی ١٩٦٢ بوو، ئەوکات ١٤ پێشمەرگە بوون، بەڵام من هەر لە ساڵی ١٩٤٧ واتا دوای رووخانی کۆماری مەهاباد چوومە ریزی شۆڕشەوە. (٩ مانگ بەر لە ئەنفالی دەشتی هەولێری ساڵی ١٩٦٣).

حکومەت بە باوک و برامی راگەیاند ئەگەر حەوێز خۆی نەدا بەدەستەوە، ئەوا هەمووتان زیندانی دەکەین، ئینجا براکەم هاتە لام و پێی راگەیاندم و هەموو پێشمەرگەکانیش داوایان لێ کردم، کە بنەماڵەکەم رزگار بکەم و خۆم بەدەستەوە بدەم، منیش وتم لەوانەیە ئازادم بکەن لە خۆبەدەستەوەدانم ئیتر هەر ئەم رۆژە خۆم بەدەستەوە دا، لە ناوەڕاستی مانگی ٨ی ساڵی ١٩٦٢ بوو، منیان لە هەولێر زیندانی کرد، رۆژێکیان پارێزگاری هەولێر بەدوای ناردم، ئینجا پۆلیسێکیان لەگەڵ رەوانە کردم و چوومە لای پارێزگار.

پارێزگاری هەولێر پێی وتم ئێوە ئاغای ناوچەکەن و هێزێکی گەورەن دەتوانن یارمەتی حکومەت بدەن و ناوبانگی تۆشم بیستووە، بۆیە ١٠٠ تفەنگت دەدەمێ و دەبێ ١٠٠ کەسم بۆ ناونووس بکەی و خۆشم ئاگام لێت دەبێت و یارمەتییەکی باشیشت دەدەم، منیش گوتم ئێمە دانیشتوانی گوندین، خاوەن مەڕ و ماڵاتین و بەردەوامیش خەریکی کاری جوتکردن و دروونە و راوین، بۆیە بواری چەک هەڵگرتنمان نییە، ئەوەش کاری ئێمە نییە، پارێزگار وتی ئێوە بۆ ناتانەوێ چەک هەڵگرن، دووبارە پێم گوتەوە ئێمە کاسبین، نەک چەک هەڵگر، ئینجا پارێزگار دەری کردم و رەوانەی زیندانی کردمەوە، لە زیندانی هەولێر مامەوە، دوای ٩ مانگ (٧٠٠-٨٠٠) زیندانی کە من لەگەڵ ئەوان بووم بڕیاری گواستنەوەمان بۆ زیندانی موسەیەب درا، ژمارەیەکی زۆرکەم نەبێت، کە خەریکی حیزبایەتی بوون، ئەگینا ئەوانی دیکە تەنها دژی رژێم بوون، بەڵام بە بیانووی حیزبایەتی گیرابوون، زۆریشیان دانیشتووی گوندەکانی دەشتی هەولێر بوون، لەبیرمە مانگی شەشی ساڵی ١٩٦٣ شەوێک لە شەوان هەواڵی گواستنەوەیان پێڕاگەیاندین، بەڵام نەمانزانی بۆ کوێ دەمانگوازنەوە، ئەوەبوو بۆ بەیانییەکەی بە (١٩) زیلی سەربازی ئێمەیان بەرەو شاری موسڵ برد، هەر ئۆتۆمبێلێکیش حەوت پۆلیسیان لەگەڵ بوو، چوار لە دواوە و سیانیشیان لە پێشەوە، دوای ئەوەی لە زیندانی هەولێر بەڕێکەوتین لە رێگا هەر کوردێکیان بدیبایە دەیانخستە ناو زیلەکان و دەبوونە زیندانی هەروەها لە رێگاش بەردەوام

لێمان دەدرا و ئاماژەیان بە سەر برینمان دەکرد و پێیان دەگوتین ئێوە کافرن و دژ بەم وڵاتەن.

منیش کە لەناو یەک لە زیلەکان بووم، زۆر لەم پۆلیسانە بێزاربووم، بۆیە بە هەردوو برادەرەکانم گوت با ئەم پۆلیسانە چەک بکەین و رابکەین، بەڵام بۆیان نەسەلماندم و بە گوێیان نەکردم، جا کاتێک گەیشتینە گەراجی گواستنەوەی موسڵ ئۆتۆمبیلەکان راوەستان، دیاربوو بەرپرسەکان هەر پەڕاویان دەهێنا و دەبرد، دوای نیو کاتژمێر راوەستان ئۆتۆمبیلەکان بەرەو باشووری موسڵ بەڕێکەوتن و بەناو گەڕەکێکیاندا بردین، پۆلیسەکان دابەزین و گەڕەک کەوتبوونە دوامان بە بەردان و چەندەها کەس سەر و گێلاکی شکا و منداڵەکان دەیانگوت ئێوە دژی ئیسلامن، ئێوە کوردن، پاشان زانیمان ئەوکات، لەلای گەراجی گواستنەوە رامانگرتبوو، تومەز بەرپرسی زیندانەکان چووبووە ئەو گەڕەکە و تێیگەیاندبوون ئێستا ئەم جۆرە کەسانەمان بە دیل لە شەڕ گرتووە و، بەردبارانیان بکەن، دوای ئەوەی لە گەڕەکەکە دەربازبووین گەیشتینە قوتابخانەیەکی گەورە، هەموو پۆلەکان رەحلە و کورسی تێدابوو، کات بەرەبەری نیوەڕۆ بوو، بێ ئەوەی هیچ خواردنێکمان بدەنێ، کە لە ئێوارەی رۆژی پێشوو هیچمان نەخواردبوو، ئەفسەری پۆلیسی بەرپرسەکەش زوو زوو بە پۆلیسەکانی دەگوت ئەوەی جووڵایەوە بیکوژن.

کاتژمێر بەرەو یەکی دوای نیوەڕۆ رۆیشت، زۆرمان تینووبوو، منیش چوومە لای دەرگە و بانگی پۆلیسەکەم کرد، پۆلیسەکە گوتی سەگی کوڕی سەگ چیت دەوێ (زیندانییەکان زۆر پێیان گوتم لێی گەڕێ ئەگەر نا هەمووومان دەکوژن)، منیش گوتم هیچ لەشەڕ نەگیراوین، هەموومان کاسبین لەسەر ئیشوکاری ئێمەیان هێناوەتە ئێرە ئەوە ١٠ دینار ئەگەر هەندەک ئاو و سەهۆڵمان بۆ بێنی پۆلیسەکە کە ١٠ دینارەکەی دیت، کەوتە جنێودان بە ئەفسەرەکە و گوتی با بڕۆن ئێستا بۆتان دێنم، هەر هێندەم زانی یەک کێلە سەهۆڵ و تەنەکە ئاوێکی بۆ هێناین و، هەر بە خێرایی خستمانە ژوورەکەمان و سەهۆڵەکەم کردە چوار پارچە و پارچەیەکم خستە ناو ئاوەکە و، بە گاڵتە بە زیندانییەکانم دەگوت ئاوی خۆمە و ناتاندەمێ، ئەوانیش دەیانگوت ئێستا کاتی ئەو گاڵتانە نییە.

هەر ئەوەندەمان زانی بە جنێودان زیندانی هەموو پۆلەکانیان دەرکردە دەرەوە و لە حەوشەی قوتابخانەکە ریزیان کردین، پێیان راگەیاندین لەگەڵ دەنگی فیکەلێدان هەریەکە و لە شوێنی خۆی دادەنیشی و دەست بە ئاو دەگەیەنن و لەگەڵ دەنگی فیکەلێدانیش هەڵدەستنەوە، (هەڵبەت ئێمەش هیچ ئاومان پێ نییە).

لەناکاو فیکەلێدرا هەر بابا بوو شەرواڵەکەی هێنا خوارەوە و دانیشت، ئەوەندەی چەند قومێک لە جگەرە بدەی فیکەی هەڵستانیان لێداوە، لەو (٧٠٠-٨٠٠) کەسە سەد کەسی تەواو نەبوو، ئەوانەی تەواو نەبوون پۆلیسەکان بە لێدان و کوتان و جوێندان هەموو زیندانییەکانیان لە ژوورەکان پەستاوە.

زیندانییەک بەناوی حاجی هەینی کە دانیشتووی گوندی کاوانیان بوو پێی گوتم: بە زمانی عەرەبی بەو پۆلیسە بڵێ بواری نوێژکردنم بدات، منیش بە پۆلیسەکەم گوت مام حاجی دەیەوێ نوێژ بکات ئەگەر بواری بدەیت، پۆلیسەکەش هەندێک جوێنی بە حاجی هەینی دا و گوتی تۆ کافری چۆن نوێژ دەکەی، چەند دارێکیشی لێدا.

کات بووە بەرەبەری خۆرئاوا، یەک یەک ناویان خوێندینەوە دەبووایە زۆر بە خێرایی یاتاغەکانمان هەڵبگرین و بچینە ناو ئۆتۆمبیلەکان، ئەگینا ئەوەی دوابکەوتبایە، ئەوا لێدانی دەخوارد، ئینجا ئێمەیان بردە وێستگەی شەمەندەفەر و بەسەر فارگۆنە بارهەڵگرەکانیان دابەش کردین، هەر فارگۆنێک دوو پۆلیسیان وەک چاودێر لەمسەر و ئەوسەری فارگۆنەکە دانا، پۆلیسەکانیش پۆلیسی جاران نەبوون، فارگۆنەکەی ئێمە ٢٠

زیندانی تێدابوو، منیش خۆم لە پۆلیسێکیان نزیک کردەوە، دوای ئەوەی تێمگەیاند کە ئێمەیان بەخۆرایی گرتووە، ئینجا تکام لێ کرد کە ٢٢ نەفەر کەبابمان بۆ بێنێ و ٧ دینارم دایێ، پۆلیسەکە رازی بوو، گوتی با ئەفسەری بەرپرس بروات، دوای کەمێک هەر هەندەم زانی کاکی پۆلیس ٢٢ نەفەر کەبابی بۆ هێنام و قسوریەکەشی دامەوە، منیش قسوریەکەم لێ وەرنەگرتەوە و یەک نەفەر نان و کەبابیشم دایێ و زۆر سوپاسم کرد، ئەویش زۆر کەیفی پێهات، ئینجا پۆلیسەکە گوتی هەر کەسێک ویستی بچێتە ئاوودەست هەرچەندە قەدەغەیە، بەڵام من بواری پێدەدەم، ئینجا دوای خۆرئاوا شەمەندەفەر بەرێکەوت، بەیانی گەیشتینە شاری بەغدا و لەوێوەش شەمەندەفەرەکە بەرەو باشوور کەوتە رێ، کاتێک گەیشتینە پردی موسەیەب لە نزیک پردەکە وێستگەیەکی شەمەندەفەر هەبوو، لەوێ دابەزین، ئەفسەرێک هات لەگەڵ کۆمەڵە سەربازێک، ناوەکانی ئێمەیان خوێندەوە و ئێمەیان بەرەو زیندانی موسەیەب برد، ئەم گرتووخانەیە کاتی خۆی سەربازگەی (غازی داغستانی) بوو بەر لە شۆرشی ١٤ی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨، هەروەها کارگەیەکی دروستکردنی چەک و تەقەمەنیشی لە تەنیشت بوو، ئینجا ئێمەیان دابەشی سەر چەند هۆڵێک کرد، پاشان دەوروبەری ٢ هەزار کەسیان لە دانیشتوانی گوندەکانی دەشتی هەولێر و ناو کەرکووک و گوندەکانی دەوروبەری هێنا و بە بیانووی جۆراوجۆری حیزبایەتی و یاخیبوونەوە.

سەرەتا پێیان راگەیاندین هەموو جۆرە شتێکی تیژی وەک چەقۆ، مووس، دەرزی... قەدەغەیە لەلاتان بێت، هەروەها هەموو جۆرە نووسراو و گۆڤارێکیش قەدەغەیە.

ماوەیەک ماینەوە ژیانمان باش نەبوو، خواردنمان کەم بوو، ئازار و ئەشکەنجەیەکی زۆریان دەداین، بەڵام دوای ماوەیەک بارودۆخمان تا رادەیەک باش بوو، چێشتلێنەر و سەرتاشیان لە زیندانییەکان هەڵبژارد، بەڵام ژمارەیەک زیندانی دەوروبەری (١٢٠) کەسێک دەبوون تووشی نەخۆشی (سیل) بوون، منیشیان هەڵبژاردبوو، کە دەرزییان لێبدەم.

رۆژێک یەکێک لە زیندانییەکان توانی لە زیندان رابکات، دوابەدوای ئەو ٧ کەس لە زیندانییەکان هەواڵیان لەسەر هاتبوو، بۆیە هەر حەوتیان لەژێر سایەی (نائب عەریف)ێک و سێ سەرباز رەوانەی کەرکووک کردن بۆ دادگا، بەڵام لە نزیک توزخورماتوو ئەم حەوت کەسە نائب عەریفەکە و سەربازەکان چەک دەکەن و بە شوفێرەکەش دەڵێن ئەمانە بگەیەنەوە زیندانی موسەیەب، ئینجا بەرەو چیا رادەکەن، کاتێک کە نائب عەریف و سەربازەکان دەگەنەوە زیندانەکە، ئەوانیش زیندانی دەکەن، دوای ئەوەی هەموو زیندانییەکان ئازاد دەکرێن، نائب عەریف و هەر سێ سەربازەکە هەر لە زینداندا مابوون.

جا دوای ئەم رووداوە گرنگییان پێ نەدەداین و ئازاریان دەداین، بەڵام دوای ئەوەی (عەبدولسەلام عارف) لەناو فرۆکە سووتا ئەوەندەی پێ نەچوو ژمارەیەک لە زیندانییەکان ئازاد کران، بەتایبەتی نەخۆشەکان و ئەوانەی واسیتەیان کردبوو، یەک لەوانەش من بووم ئازاد کرام.

ئەوەبوو من ٨ مانگ لە زیندانی موسەیەب مامەوە و لە مانگی ١٢ی ساڵی ١٩٦٣ ئازاد کرام، پێشتریش ٩ مانگ لە زیندانی هەولێر زیندانی کرابووم، واتە ١٧ مانگ لە زینداندا مامەوە.

**پەراوێزەکان:**

هەر گوندێک لە گوندەکانی دەشتی هەولێر، کە لە ساڵی ١٩٦٣ کەوتبێتە بەر ئەنفال و کاولکردن، چەندان رووداوی دڵتەزێنی بە دواوەیە، بەداخەوە، تاکو ئەمرۆ ئەم رووداوانە هیچی ئەوتۆی لەسەر نەنووسراوە، خۆزیا هەمووشیان لە شوێنی رووداوەکان دەکرانە فیلم و درامای تەلەفزیۆنی.

ئەم بابەتە لە کتێبی مێژووی دەشتی هەولێر لاپەرە (١٣٥-١٤٢) وەرگیراوە.

# ئەنفالی پارێزگای هەولێر

یوسف دزەیی
کۆلێژی ئاداب - زانکۆی سەلاحەددین

سەرەتا پێویستە کەمێک باس لە وشەی ئەنفال و کارەساتی ئەنفال بکەین، ئینجا باسی ئەنفالی هەولێر بکەین.

کارەساتی ئەنفال، یان راستتر تاوانی ئەنفال، یەکێکە لە گەورەترین و ترسناکترین ئەو تاوانانەی کە لە کۆتاییەکانی سەدەی بیست بەگشتی بەرامبەر بەمرۆڤایەتی و بەتایبەتی بەرامبەر بە گەلی کورد کراوە. ئەمە وەک نوێترین هەولی رەگەزپەرستانە بوو بۆ پاکتاوکردنی نەتەوەیەک لەسەر خاک و زێدی باب و باپیرانی، ئاشکرایە ئەم کارەساتە بەشێکی گرنگ و سەرەکی کۆمەلی لادێیی کوردەواری گرتەوە.

ئەنفال ناونیشانی سورەتی هەشتەمە لە قورئانی پیرۆزدا، کە بە واتای دەستکەوت (الغنیمە) هاتووە، بەلام لەم باسەدا مەبەست ئەو کۆمەلە شالاوەیە، کە سوپای عێراق لەماوەی نێوان مانگی شوبات تاکو ئەیلوولی سالی ١٩٨٨ کردییە سەر گوندنشینانی کوردستان و دەیان هەزار ژن و مندال و پیر و گەنجی تێدا بەچەند قۆناغێک شوێنبزر کرد، ئەمەشی بە (پرۆسەی ئەنفال) ناوزەد کرد.

(ئەنفال ناوێکە بۆ زنجیرەیەک هێرش و پەلاماری چڕ و پڕی سەربازی، کە سەرجەم هەشت پەلامار بوو لە شەش ناوچەی جوگرافی جیاوازدا بەڕێوەچوو، فەرماندەی گشتی عەمەلیاتەکە لەدەستی نووسینگەی باکووری ڕێکخراوی حزبی بەعسدا بوو و بنکەی لە شاری کەرکووک بوو، لە مارتی ١٩٨٧ بەدواوە لەلایەن عەلی حەسەن مەجیدەوە سەرۆکایەتی دەکرا).

پرۆسەی ئەنفال، بەپێی پلان و نەخشەیەکی رەسمی پێشوەخت لەلایەن رژێمی بەعسەوە ئامادەکراو پاش چەندان تاوتوێکردن بڕیاری لەسەر درا، بۆ ئەم مەبەستەش عەلی حەسەن مەجید کرا بە حاکمی رەها (مطلق)ی هەرێمی کوردستان و دەسەلاتی تەواوی سەربازی و ئەمنی و مەدەنی پێدرا، ئەوەش بەپێی بڕیاری بەناو ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی عێراق ژمارە ١٦٠ لە ٢٩ی ئازاری ١٩٨٧دا.

لەلایەن مخابەرات و ئەمن و جەیشی شەعبی و پۆلیس و هەموو فەرماندە سەربازییەکان و جاشەکان پیادە کرا، بۆ جێبەجێ کردنی ئەم بڕیارەش بودجەیەکی تایبەتی تەرخان کرا.

لەگەل وەرگرتنی دەسەلات، بەعسییەکان بە شێوەیەکی نوێ و دڕندانەتر کورد قڕانییان پیادەکرد، وەک ئەو تالان و کوشت و بڕینەی ١٣ی حوزەیرانی ١٩٦٣، کە لە ناوچەی کەندێناوە کردیان، لە ئەنجامدا چەندان گوندیان بە مزگەوت و قوتابخانەوە سووتاند، چەندان کەسی بێ تاوانیشیان ئەشکەنجەدا و کوشت و مال و سامانیشیان بە تالان بردن، لە ناوچەی دووبزیش ٢١ گوندیان رووخاند و ١٥٠٠ خێزانیش دەربەدەر کران، هاوکاتیش دەستیان کرد بە تەعریبکردنی ناوچەکە، دواتریش لە سالی ١٩٧٥ تاکو ١٩٨٨ سەرجەم ناوچەی کەندێناوە و دەوروبەری تەعریب کرا، ناوی هەندێ لە گوندەکانیش کران بە ناوی عەرەبی.

لە کۆتایی مانگی تەمووز و سەرەتای ئابی سالی ١٩٨٣ هێزێکی تایبەتی گاردی کۆماری ئابلوقەی ئۆردووگا زۆرەملێکانی قوشتەپە و بەحرکە و هەریر و دیانا و شوێنانی تریان دا و نزیکەی (٨) هەزار پیاوی بارزانییان

راپێچ کرد.

لە ١٥ی نیسانی ١٩٨٧ (٣٠) گوند بە چەکی کیمیاوی وێران کراون، بۆ نموونە گوندی شێخ وەسانی دۆڵی بالیسان لە پارێزگای هەولێر ١٠٧ کەسی تێدا شەهید کرا، جگە لە ٣٥٠ بریندار ژاراوی بوو، سەرەڕای سووتاندنی رەز و باغ و کوشتنی هەزاران گیانلەبەری ماڵی و کێوی لە ناوچەکە.

سەبارەت بە رووخاندن و راگوازتنی گوندەکان لە ساڵی ١٩٨٧، لە نێوان مانگی نیسان و سەرەتای حوزەیران ٩١٢ گوند رووخێنراون، لەوانە (٤٤٨)یان لە پارێزگای هەولێر بوون.

لە ١٤-١٨ی تشرینی دووەمی ١٩٨٧ (٣٢) کەسی شارۆچکەی شەقلاوە لەناو جەرگەی شاری هەولێر درانە بەر رێژنەی گوللە لە تۆڵەی هێرشێکی پێشمەرگە بۆ سەر سەربازگەیەکی سوپا لە هەمان ساڵدا.

پێنج رۆژ پاش کیمیابارانکردنی ناوچەی بالیسان لە مانگی نیسان، وێرانکردنی گوندەکان لە کوردستان دەستی پێکرد، کە بەلای کەمەوە ٧٠٣ گوندی گرتەوە، لەوانە ٢١٩ گوند لە ناوچەکانی هەولێر بوون.

هەردوو ناحیەی خۆشناو و دیبەگەی لە پارێزگای هەولێر هەڵوەشاندەوە بە بڕیاری ژمارە ٤٤٢ لە ١٨/٧/١٩٨٧.

ئەنفالی چوار ئەم ناوچانەی پارێزگای هەولێری گرتەوە، تەق تەق و دەشتی کۆیەی بەنەوت دەوڵەمەندی دەست لێ نەدراویش دەکەوێتە باکوورییەوە، بەلای باکووری رۆژئاواش شاری هەولێر و زۆربەی گوندەکانی دەشتی هەولێرە، کە لە ساڵی ١٩٨٧ چۆڵ کرابوون و تەخت کرابوون هەروەها سەدان کەسی گوندەکانی گلنجاغ و گردخەبەر و جەلەمورد و قەسرۆک و مامشە و ٥٠ کەسی گوندی گۆگتەپە و ٦٠ پیاو و ١٢٩ ئافرەت و ٣٩٦ منداڵ لەگەڵ ٣٧ پێشمەرگە لە نزیک شارۆچکەی تەق تەق خۆیان داوەتە دەست سوپا بەپێی راپۆرتی مەیدانی رۆژانەی ژمارە (٨٠٢٨٠)ی فەیلەقی یەک لە ٦ی مایس.

هەروەها لەنێو ئەنفالکراوانی دەشتی کۆیە خێزانێک، کە پێکهاتبوو لە دایک و باوک و چوار منداڵ بە تەمەنی (٤، ٧، ٩، ١١) ساڵی و دایک و باوکەکەش هەردووکیان ئەندازیاری کشتوکاڵی بوون، لە دایەرەی کشتوکاڵی هەولێر کاریان دەکرد، پیاوەکە پلەی خوێندنی ماستەر و ژنەکەش بەکالۆریۆسی هەبوو.

**قۆناغی دووەمی ئەنفال:**

شاڵاوی پێنجەم (ئەنفالی پێنج و شەش و حەوت): دۆڵی نێو چیاکانی شەقلاوە و رواندز/ ١٥ی مایس-٢٦ی ئابی ١٩٨٨:

هەفتەیەک پاش لە رەگ و ریشەوە هەڵتەکاندنی ناوچەکانی ئەنفالی چوارەم، لە رووی مرۆیی و ئابوورییەوە، ئینجا سوپا رووی کردە دۆڵە سەختەکانی ناوچەی شەقلاوە و رەواندز، لە ناوەڕاستی مانگی مایسی ١٩٨٨ هێرش گەیشتە دۆڵی بالیسان، بە توندترین شێوە پەلاماری ناوچەکەی دا، بەڵام خەڵکی دۆڵەکانی باشوور و باشووری رۆژهەڵاتی رەواندز لە پاش پەلامارە کیمیاوییەکەی نیسانی ١٩٨٧، زۆربەی ناوچەکەیان بەجێهێشتبوو، بۆیە لەم پەلامارەدا راگواستن و کوشتنی بە کۆمەڵی گوندنشینەکان نەبووە کێشەیەکی گرنگ و ئەوتۆی سوپای عێراق.

زۆربەی هەرە زۆری ناوچە سنوورییەکانی پارێزگای هەولێر لە ساڵانی ١٩٧٧-١٩٧٨ و ١٩٨٣-١٩٨٤دا چۆڵ کرابوون و خەڵکەکەی راگوێزرابوونە کۆمەڵگا زۆرەملێکانی دەوروبەری شارە گەورەکانی هەولێر و سلێمانی و دهۆک.

سەدان پێشمەرگەیان لە نزیک گوندەکانی گەرەوانی سەروو و خوارووی باشووری رۆژهەڵاتی رەواندز و سەدانی دیکەشیان لە گوندەکان و مەلەکان و ئاکۆیان و وەرتێ لە سەنگەر دابوون، گوندنشینەکانیش چۆڵیان کردبوو، تەنها گوندی بلەی خواروو خەڵکی تێدا مابوو، ئەویش لەبەر سەختی شوێنەکەی.

یەکەم پەلاماری سوپا لەم هێرشەیدا، کاتژمێر ٦ی ئێوارەی

١٥ی مایسی ١٩٨٨ بوو، کە دوا رۆژی رەمەزان بوو، خەڵکەکە خۆیان بۆ جەژن ئامادە دەکرد، ئەوەبوو چەند فرۆکەیەک کەوتنە کیمیابارانکردنی گوندەکانی (وەرە، نازەنین، کاموسەک، ئەسپیندار، عەلیاوە، سماقوڵی و بوونێ)، لەم پەلامارەدا تەنها لە گوندی وەرە ٣٦ کەس کوژران کە حەڤدەیان ردگەزی نێر و نۆزدەشیان مێ بوون، ئەمانە تەمەنیان لە نێوان ٢-٥٥ساڵی دابوو، دەربازبووانی ئەم پەلامارە تەرمی ٣٣ قوربانییان لە گۆڕێکی بە کۆمەڵ لە نزیک گوندەکە ناشتووە.

ئەوانەی لە ئەنفالی پێنج دەسگیر کران یاخود خۆیان دا دەست، هەندێکیان لە سەربازگەی سپیلک و هەندێکیش لە گرتووخانەی ئەمنی هەولێر شوێنبزر کران، بەهەمان سیاسەتی توندوتیژی پێشتر.

سوپای عێراق بەخێرایی ٢٠ گوندی دۆڵی بالیسان و ناوچەکەی داگیر کرد، بەڵام سروشتی ناوچەکە مەرامی رژێمی پووچەڵ کردەوە، کە رێگای بەرەو سنووری ئێران لە خەڵکی ناوچەکە بگرێت.

ئەم شاڵاوە بە شێوەیەکی نارێک بەرێوە دەچوو، تاکە شاڵاو بوو، کەوا بێسەروبەر بێت، ئەویش بەهۆی خۆڕاگری و بەرپەرچدانەوەی توندی پێشمەرگە بوو، کە هەرگیز سەرکردەکانی سوپا بەم شێوەیە حیسابیان بۆ نەکردبوو، هەروەک لە بروسکەکانی ئەمن ئاماژەی پێکرابوو، بەتایبەتیش لە رۆژی ٤ی حوزەیران لە چیای کۆڕەک تووشی بەرەنگارییەکی بەهێز بووبوون، بەڵگەنامەیەکی بایەخداری سەربازی لە شێوەی راپۆرت لە فەرماندەی فەیلەقی پێنجی لیوا روکن (یونس محەمەد ئەلزەرب) بۆ فەرماندەی گشتی سوپا بەرز کراوەتەوە بە ناوی (شیکردنەوەی کردەی ئەنفالی کۆتایی)، بەشێکی ئەم راپۆرتە باس لە دواخستنی (پاکتاوکردن)ی کەرتی رواندز-شەقڵاوە دەکات، بەهۆی بەرگرییەکی توند و بەهێزی پێشمەرگە لەلایەک و سەختی سروشتی ناوچەکەش، کە یارمەتیدەری پێشمەرگە بوو لەلایەکی دیکە، بەم شێوەیە لە رۆژی ٧ی حوزەیران شاڵاوی ئەنفالی پێنج کۆتایی پێهات، لەوانەشە ئەم هۆکارانە یارمەتیدەرێکی باشی خەڵکی ناوچەکە بووبن بۆ رزگار بوونیان لە بێسەروشوێن کردن و فەوتان.

لەپاش ٢٠ی مایس سوپای عێراق لەم قۆڵانەوە هێرشی کردە سەر ناوچەکان، قۆڵی یەکەم بۆ گوندی گەرەوان، کە نیازی کێل کێل و شاخەکانی دەوروبەری گەرەوان و هەندرێن و کارۆڵا بوو داگیریان بکات، قۆڵی دووەمیش لە ٢٣ی مانگ لە هەلەمۆند بۆ وەرتێ و زینی گەلی و سەری ئەحمەدە و دەرەبی و جاوەل و دەرگەڵە و کەلیتە، کە ئێوارەی ٢٣/٢٢ی مایس گوندی وەرتێی کیمیاباران کرد، بەڵام قۆڵی سێیەم لە سەروچاوە و بەنی هەریر و خەلیفان بە شێوەی بازنەیی بوو، ئەم هێرشە نزیکەی (٧٢٠) حەوت سەد و بیست خێزانی دەربەدەر کرد و ماڵیشیان تاڵان کرا، لەپاش نیوەرۆی ٢٣ی مایسی ١٩٨٨ گوندەکانی بالیسان و هیران و دۆڵەکانی دەوروبەری، چەند جارێک بەبێ پسانەوە بە خەستی درانە بەر بۆمبی کیمیاوی، ئەمە پاش کپییەکی نائاسایی روویدا، کە پتر لە هەفتەیەک پاش کیمیاباران کردنی گوندی وەرە بوو.

گوندی بلەی خواروو زۆرترین ژمارەی خەڵکی لێ شوێنبزر کرا لەچاو گوندەکانی دیکەی ناوچەکە، بۆ نموونە لە راپۆرتێکی مەیدانی دایەرەی ئەمن هاتووە: (شەوی ٣/٢ی حوزەیران سێ خێزانی گوندی بلەی خواروو لەلایەن فیرقەی (٤٥)وە گیران، بەم زووانەش لیستی زانیاری لەبارەی (٢٧٦) دوو سەد و حەفتا و شەش کەسیان بۆ دەنێرین)، پیرەمێردێکی خەڵکی گوندی بلەی خواروو گوتی: (پێش ئەوەی سوپا بگاتە گوندەکەمان ئێمە دەرچووین و رۆیشتین بۆ سپیلک، کە پاش نیوەرۆیەکی درەنگ بوو، هەموو شتێکمان لەگەڵ خۆمان برد، شەو لە رێگا ماینەوە، بۆ بەیانییەکەی کەوتینە دەست سوپا و گوازراینەوە بۆ سەربازگەی سپیلک و چوار

پێنج رۆژ لەوێ مـابنەوە، پاشـان رەوانەی هەولێـر کـراین ئینجـا بە نزیکەی سـێنزە ئۆتۆمـبـیل بۆ کەرکـووکیـان گـواسـتینەوە، لەوێ ئێمەیان کردە سێ بەش، گەنجەکان بە تەنیـا دواتر بزر کـران، ژن و منداڵیش بۆ دووبز گـواسـترانەوە، پیرەژن و پیرەمێردەکـانیش پاش دوانزە شەو بۆ نوگرەسەلمان راپێچ کـراین، کـە (١٨) هەژدە کـەس بووین، ماوەی دوو مانگ و بیست رۆژ لەوێ مـابینەوە، لەم مـاوەیەدا ئەوەندەی من ئاگادار بووم (١١٥) کـەس مردن: لەوانە دوو ژن و دوو پیـاو خـەڵکی گـوندەکـەی ئێـمـە بوون، شـەو و رۆژ تەنهــا سێ سـەمـوونی رەق خـواردمان بوو).

هەروەها لەم رووەوە سـەربازێکی ئەوسـای سـوپای عـێـراق دەڵێت: (خـەڵکی گـوندی بلەی خـواروو و گـوندی کـەندۆڵ هێنرانە بارەگـای فـیـرقـەی (٤٥)ی پیـادەی سـوپا، لەوێ هەندێک لە گـیـراوەکـان بەهۆی سەربازە کـوردەکـانی ئەوێ دەرباز کـران، بەڵام پاشـــان ئیستخباراتی فیرقە هەندێکیانی) گـرتەوە. هەروەها ژنێکی گـیـراوی ئەم گـوندە لە چاوپێکەوتنێکدا باسی بەندکـردنی ئافـرەتانی گوندەکەی دەکـات و دەڵێ: (پاش ئەوەی نۆ شـەو لە تۆپزاوەی لای کـەرکـووک مـاینەوە، پاشـان بۆ بەندیخـانەی دووبز گـواسـتراینەوە، لەوێ ژمـارەیەکی زۆری خـەڵکی ئەنفـالکراوی ناوچەکـانی دیکە هەبـوون، پاشــــان هەندێکی دیکەشــیـان هێنا، مـاوەی چوار مـانگ و دە رۆژ لەوێ مـاینەوە، ئینجا لێبووردنەکەی ٦ی ئەیلوول ئێمەیان گواستەوە بۆ سلێمـانی و لەوێ ئازادیان کردین).

لە یاداشتنامەیەکدا کە ساڵی ١٩٩٨ پێشـکەش بە رێکخـراوی خاچی سووری نێو دەوڵەتی کراوە، بە بۆنەی سـاڵیـادی پەیماننامـەی قەدەغەکردنی جینۆساید، لیستی ناو و تەمـەنـی (٣٣) سی و سێ کەسی شوێنبزرکراوی گوندی بلەی خـواروو و کـەندۆڵ هاتووە، لە پەلاماری ئەنفالی ساڵی ١٩٨٨ لە شەشی حوزەیران، پاش گـیـرانیـان براون بۆ تۆپزاوە و لەوێ کـراون بە سێ بەشـەوە، ژن و منداڵەکـان بۆ زینـدانی دووبـز راپێچ کــراون، پیرەمێرد و پیرەژنەکانیش بۆ نوگرە سەلمان، گـەنج و جوامێـرەکـانیش شـوێنبـزر کـراون، هەروەها لەم یاداشـتنامـەیەدا هاتووە، زانیـاری هەیە کە تا سـاڵی ١٩٩٣ ئەم سی و سێ کـەسـە لەگـەڵ نزیکەی چل هەزاری دیکە لە نێوان زیندانەکانی ئەبو غــرێب و رەزوانیــەدا جێگۆڕکێیان پێدەکرێت.

سـەرەڕای ئەوەی خـەڵکی گـوندی بلەی خـواروو، زۆربەی گەنجەکـانیان سەریان تیاچوو، لە تـۆپـزاوە بـەبـەر چـاویـان ئـەو شتومەکانەیان ئاگر تێبەردا، کە خەڵکەکە لەگەڵ خۆیان هێنابوویان.

لە ئەنجامی کیمیابارانکردنی ناوچەکـە بە لایەنی کـەمـەوە سێ منداڵی گـوندی بلەی خـواروو لە تەمەنی دوو سـاڵی و سێ سـاڵی، لە گـوندی نازەنینیش دوو کـەس بوون بە قـــوربـانی، هەروەها گوندەکانی سوێرە و ئاکۆیان لەگەڵ چیای رەشکی بانەشانیش کەوتنە بەر هێرشی کـیـمـیـاوی، پاشـان لە ٢٣ی مایسدا هێرشی زەمینی بۆ ناوچەکــان دەســتـی پێکرد و خەڵکەکەش ئەوانەی لە گوندەکانی ئاکۆیان و ناوچەکە مابوونەوە بەرەو سێ لا بڵاوبوونەوە، هەندێک بە پێ و بە ولاغ بەرەو سنووری ئێـران رۆیشتن، کە (٣٥ کم) سی و پێنج کـیلۆمـەتر دوور بوو، هەندێکیش رووەو کۆمەڵگای حاجیاوا چوون، کــە سێ چوار رۆژ دوور بـوو بە پێـیــان، کـۆمـەڵێکیش لەناو چیـاکـانـدا خـۆیان شـاردەوە، کۆمـەڵێک لەوانە هەڵاتن پەنایان بردە بەر ئاغـای گـوندی گولان، کـە سـەرۆک عـەشـیـرەتی ئاکـۆ بوو، ئەویش رێگای ئێـرانی بۆ دابین کـــردن، ئـەوانەی لەلای ئـەویش مـــانەوە بێ زیان بوون، پاشـــان هەندێک لەوانە خۆیان دا دەست و لەژێر چاودێری پۆلیس رەوانـەی کۆمەڵگای حـاجیـاوا کـران، بەڵام هیچیان شوێنبزر نەکران.

ئەو کۆمەڵە خەڵکەی لە ترسی سـوپا خـۆیان لەناو چیـاکـان شاردەوە، لەوانە پەنجا خێزانێکی گــوندی بلە و گــەرەوان پاش ماوەیەک چوونە گوندی جولەمێرگی ژێر دەسـەڵاتی حکومـەت، لەبەر ئەوەی زۆر هیـلاک بوون و توانای خۆڕاگرتنیان نەمابوو، لە بێ نان و

ئاوی و مـاندوویەتی، بەڵام كـە گەیشتنە خاڵی پشكنینی گوندەكە جاشەكان پێیان گوتن: (ئێستا كاتێكی گونجاو نییە بێنە بەر دەستی قەسابەكە)، پاشان سەرباز دەوری خـەڵكەكـەیان گـرت و لیـسـتـیـان بۆ كـردن و رەوانەی سەربازگەی سپیلكیان كردن، لەوێ هەشت نۆ خـێـزانیـان لە چادرێك كرد و دەورەیان تەلبەند كـردن، لە هەمـان ئەو شـوێنەی، كـە ژن و منداڵی خۆ بەدەستەوەداوی گوندی بلە تێـیدا بەند كـرابوون، گـوندی جۆلەمێرگیش لە پەلاماری ئەنفال دەرباز نەبوو، چونكە بروسكەیەكی ئەمنی شـەقـلاوە تێـیـدا هاتووە، جـۆلەمێـرگ و دۆڵی ئالانە لە ٣ی ئەیلوولی ١٩٨٨ لەلایەن فـیرقـەی (٣٧)ی سـوپاوە پاكـتـاوكـراوە. هەروەها تەلەگـرافی ژمـارە (١١٣٧) لە ٧ی حوزەیران لەلایەن ئەمنی قـەزای سـۆران (صـدیق) دراوە، باس لە گـرتـنی هەردوو گوندی گەرەوانی سـەروو و خواروو دەكـات، گـەرەوان بە شـێـوەیەك وێران كـرا، كە هەرچی شوێنەواری ژیانی تێدا هەبوو سڕایەوە، هەتا گـــــۆڕی رازاوەی نـاو گۆڕستانەكەشیان تەقاندەوە و كانی و درەخت و خـانووەكـانیـش وێران كران.

پاش ئەوەی ئەنفـالی پێنج كۆتایی پێهات، ئینجا نەخشە و پلانی ئەنفالی شەش دانرا و خۆی بۆ سـازدرا لەلایەن سـوپاوە، هەرچەندە لە راپۆرتی فـەرماندەی فـەیلەقی پێنجـدا هاتووە: (بۆ تێكشكاندنی تێكدەران لە دۆڵی بالیسان و ئالانە، پلانەكە لە ٣٠ی مـایس نێـردرا بۆ سـەرۆكـایەتی دەستەی ئەركانی سوپا بە نامـەی (ئەوپەڕی نهـێنی و شـەخـسی) ژمارە (١٤٧٥) لە ٧ی حوزەیرانی ١٩٨٨، كـە داوای دواخـسـتنی هێرشەكە دەكات بۆ كاتێكی دیكە، بەڵام بەپێی نامەی ژمارە (٥١٩) لە ٧ی هەمـان مـانگدا وەڵام هاتەوە، كـە نەخشـەكە جێبـەجێ بكرێت لە ناوچەكانی بالیسـان و سمـاقوولی، ئەم دواخستنە لەبەر بەرگـری توند و بەهێـزی پێشمـەرگەكانی چیای كۆڕەكی (٧٠٠٠) حەوت هەزار پێ بەرز و دەوروبەری بوو، كـە دۆڵی ئالانەی لەژێر كۆنترۆڵدایە، ئەو راپۆرتەی جەنەراڵ (ئەلزەرب) بە ئاشكرا و بە روونی رەوشی شالاوەكانی ئەنفالی پێنج شی دەكـاتەوە، كـە سـوپای عـێراق توانای هێرش و پەلاماری ئەم ناوچانەی نیـیـە، هەرچەندە چەكی قـورس و كـیـمـیـاویشی پاڵپشت بێت، چونكە پێشمـەرگە خۆی بۆ ئەم پەلامارە ئامادە كردبوو و بەرگری لە ناوچەكە دەكرد، شەڕی مان و نەمانی دەكرد.

جـەنەراڵ (ئەلزەرب) پێی راگـەیەنراوە، كـە لەدوای جـەژنی قوربان، كە دەكاتە ٢٥ی تەمووز، دەبێ شـالاوی ئەنفـال بە گـوڕ و تینێكی بەهێزەوە ئەنجام بدات، بە پێی نامـەی نهـێنی و شـەخسی ژمارە (٨٦١)ی دەستەی ئەركانی سوپا لە ٢٠ی تەمووز، ئەمەش بە فـەرمـانی سـەدام حـوسـێن بوو، هەرچەندە دواتر لە كـۆبوونەوەی ٢٩ی تەمـووز لە بارەگـای فەیلەقی یەك لە شـاری كـەركـووك راگـەیەنرا، كـردارەكـانی ئەنفـالی شـەش و حـەوت دواخـرا، تاكـو پێـداویسـتـیـیـەكـانی بۆ دابین دەكـرێت، ئەم راگـەیاندنە لەژێر ژمارەی (٩٤٣)ی نهێنی لە ٢٩ی مـانگ بوو، هەرچەندە ئەم نامـە و نامەكارییە و كۆبوونەوانە دەكران، بەڵام سـوپا لەدوای ٢٦ی تەمـووز ناوچەكـانی بالیـسـان، دۆڵی مـەلەكـان، دۆڵی وەرتێ، دۆڵی هیـران و سـمـاقـوولی دایە بەر بۆمبـای كـیـمـیـاوی، خـەڵكەكەی دەرپەڕاند، پێشمەرگەش كشانەوە ناو چیا سەختەكان و پەرت بوون. پاش ئەو بۆردومـانە لە سـەرەتای مـانگی ئابدا، خـەڵكی دۆڵی سـمـاقـوولی، لەبەر بۆردومـان هەڵاتـن، پـاشـــان لەلایـەن جاشەكانەوە داگیر كرا، داواشیان لە خەڵكەكە دەكرد خۆیان بدەنە دەست، لێـبـووردن هەیە، بۆیە ژمارەیەكی زۆر لە ماوەی پێنج رۆژ كۆبوونەوە و حكومەتیش هەمووی بەپێی تەمەن و رەگەز جیاكردەوە، پیـاوەكـانیش ئاگـادار كـران ئەگـەر چەك لەگەڵ خۆیان تەسلیم بكەن، ئەوا دەبەخشرێن، بۆیە خەڵكەكە بەدوای ئەو چەكـانە دەگـەڕان كـە پێـشـمـەرگـە شـاردبوویەوە لە ناوچەكە، پاشان دان پیانانێكیان پێ مـۆركـردن، كـە بە راسـتی

پێشمەرگەن، پاشان هەموو پیاوەکان شوێنبزر کران.

لەدوای سەری مانگی ئابەوە چەند هەفتەیەک ڕۆژانە بۆمبی کیمیاوی لە ناوچەکە دەدرا، تەنانەت لەپاش راوەستانی شەڕی ئێرانیش بۆردومانکردنی ناوچەکان خەستتر بوو، لەگەڵ ئەوەشدا سوپا نەیتوانی دوو ڕێگا سەرەکییەکەی دەربازبووان بگرێت بەرەو ئێران، یەکێکیان ئەو ڕێگایە بوو، کە ئاغای گوندی گولآن بۆ رزگاربووانی دابین کردبوو، کە لە ٢٦و٢٧ی مانگ یارمەتی زۆر خێزانی دا.

عەلی حەسەن مەجید لە ٧ی ئاب کۆبوونەوەیەکی سازدا لەگەڵ جێگری دەستەی ئەرکان و بەرێوەبەرانی جموجۆڵی سەربازی و هێزی ئاسمانی، فەرمانی کۆتایی هێنانی (تێکدەرانی) دا لە هەرێمی (باکوور)، بۆ ئەم مەبەستە فەیلەقی یەک کەرتی بالیسان-سماقوولی لە ئەستۆ گرت، بە پێی ئەو ڕاگەیاندنەی لە ١٦ی مانگ دەرکرا بە نهێنی و شەخسی بە ژمارەی (١٠٧٦) بەم جۆرە سوپای زەمینی لە ٢٨ی ئاب بە کۆپتەر سەربازی دابەزاندە دۆڵی بالیسان و داگیری کرد، لە ئەنجامی (٤٢) بروسکەی ئەمنی، کە ڕۆژانە بوون سەبارەت بە بارودۆخی مەیدانی شەڕ لە ٣ی حوزەیرانەوە تاکو ١٩ی ئەیلوول، باسی ئەنفالی (٥، ٦، ٧)ی لەسەر بنیات دەنرێت.

لە ١٧ی تەمووزی ١٩٨٨ سەرۆکی کۆماری ئیسلامی ئێران، ڕایگەیاند کە بە نیازە بڕیاری ژمارە (٥٩٨)ی ساڵی ١٩٨٧ی ئەنجومەنی ئاسایش قبووڵ بکات، کە داوای ڕاگرتنی شەڕی نێوان عێراق-ئێران دەکات، ئەم ڕاگەیاندنە کارێکی زۆر خراپی کردە سەر وورەی پێشمەرگە و وای کرد ئومێدیان کەم بێتەوە لە بەرگریکردن، چونکە ئەگەر سوپا شەڕی ئێرانی لە کۆڵ بێتەوە، ئەوا هێزێکی گەورەی دیکە دێنێتە سەر پێشمەرگە، پێشمەرگەش ماندوو بووە و ژمارەی دیارە، سەرەڕای ئەوەش چەک و زەخیرەی کەم بۆتەوە، بەرامبەر بە نوێترین و کوشندەترین چەک زەحمەتە بەرگری پێ بکرێت، چونکە زۆر بێ بەزەییانە ئەم چەکە قەدەغەکراوانەی بەکار دەهێنا بەرامبەر بە گوندنشین و پێشمەرگە، بۆ نموونە لە ٣٠ی تەمووزی ١٩٨٨ ڕژێم کیمیابارانی گوندەکانی بالیسان و بالووکاوە و خەتێی کرد و (٢٢٧) دوو سەد و بیست و حەوت کەسی مەدەنی کوشت، کە (٩١) نەوەد و یەکیان منداڵ و (٤٢) چل و دوو بەساڵاچوو و (٩٤) نەوەد و چوار گەنج بوون، ئەمە لە کاتێکدا لە ٢٥-٢٧ی ئایار لە پایتەختی عێراق کۆنگرەی جیهانی بۆ ئاشتی دەبەسترا بۆ جێبەجێکردنی بڕیاری ژمارە (٥٩٨)، ئەم کۆنگرەیە زیاتر لە (١٠٠٠) نوێنەر و کەسایەتی جیهانی بەشدارییان تێدا کرد، کە لە لایەن حیزب و ڕێکخراو و پەرلەمانی دەوڵەتانەوە هاتبوون، ئەوە بوو سیاسەتی حکومەتی عێراق، لەلایەک داوای ئاشتی دەکرد بۆ گەلانی ناوچەکە، لەلایەکی دیکەش بە درندانەترین شێوە ناوچەکانی کوردستانی بە چەکی قەدەغەکراو وێران دەکرد و خەڵکەکەشی شوێنبزر دەکرد، بۆیە هەر کاتێک ئەم ڕژێمە داوای ئاشتی بکات، ئەوا هەوڵی لەناوبردنی کۆمەڵە خەڵکێک دەدات، داواکارییەکەشی بۆ چەواشەکردنی ڕای گشتی جیهان بووە.

لە میانەی شاڵاوەکانی ئەنفالی (٥، ٦، ٧) زیاتر لە (٥٢) پەنجا و دوو گوند لە ناحیەکانی خەلیفان و ڕواندز و خۆشناو وێران کران، کە سەرجەم خێزانەکانیان (٢٦٠٢) دوو هەزار و شەش سەد و دوو خێزان بوو، هەروەها (٢٤) بیست و چوار قوتابخانە و (٥٢) پەنجا و دوو مزگەوتی ئەم گوندانەی رووخاند، ئەمە جگە لە کوێرکردنەوەی سەدان کانی و جۆگە و سووتاندنی سەدان ڕەز و باخی ناوچەکان، کە ئەمانە ژێرخانی ئابووری ناوچەکانی پێکدەهێنا، بە ئەمان و وێرانکردنیان ڕەگ و ڕیشەی بژێوی خەڵکی ناوچەکانی بنبڕ کرد و هەموو ماڵ و سامانیشی بە تالان بردن.

# راگوێزانی پاشماوەی ئەنفالەکان بۆ هەولێر (جێژنیکان)

ئاسۆ حەسەن

## ١- ئێوارەیەک کە ئەنفالکراوەکان گەیشتنە جەژنیکان

دوژمن لە درێژایی مێژوودا کارەساتی گەورە گەورەی بە سەر میللەتی کورد هێناوە، چونکە کورد میللەتێکی بێ کەسە هەر خۆی یارمەتیدەری خۆی بووە، لەو یارمەتیدانانەش ئازایەتی کوردایەتی و پیاوەتی گەورە گەورە تۆمار کراوە، چ لەسەر ئاستی تاک تاک و چ لە سەر ئاستی گوندو شاریش، ئەوەش کە خەڵکی هەولێر و دەوروبەری بۆ پاشماوەی ئەنفالکراوەکانی بادینان کردووە، نموونەیەکی بەرزی ئەو خۆ یارمەتیدانەیە، کە نەک هەر ماڵی خۆیان داونەتێ، بەڵکە بۆ ئەو کارە گیانی خۆشیان خستۆتە مەترسییەوە. هەر ئەوەشە کە ئەو ژن و پیاوانەی کە هێنراونەتە جەژنیکان هەموویان، وەک لە لێکۆڵینەوەکەی مامۆستا (ئاسۆ حەسەن)دا دەردەکەوێ، بە قەناعەتەوە گوتوویانە: "ئەگەر یارمەتی خەڵکی هەولێر نەبوایە هەمووومان لە برسان دەمردین

ئەم نووسینەش بەشێکە لە لێکۆڵینەوەیەکی مامۆستا (ئاسۆ حەسەن) کە لە بارەی ئەو کارەساتەوە کردوویەتی و لێرە وەرمان گرتووە. هەرچەندە ئەم کارەساتە زۆرتر هەڵدەگرێ.




یەکەمین کۆمەڵ[1] گەیشتنە جەژنیکان، ئەو ژن و منداڵ و چەند پیرو پەککەوتەیە بوو کە لە سەربازگەی سەلامیە زیندانی بوون و هەموو نێرینەو پیاوەکانیان لە تەمەنی ١٢ ساڵی بەسەرەوە تا (٧٠) ساڵی شوێنبزر یان گوللە باران کرابوون. لەوانەش ژن و منداڵی گوندی گوێزێ پاش ئەوەی ٩٦ مێردمنداڵ و پیاویان لێ شوونبزر کرا هێنرانە جەژنیکان. لەم بارەوە خاتوو (هیرێ عەبدولقادر) کە خەڵکی گوندی گوێزێ بوو، دەڵێت: یەکەم وەجبە ئێمەیان هێنایە جەژنیکان، تا ئەو کات کەسی لێ نەبوو، دەشتێکی پڕ دڕک بوو. ئێمەش گێژو هوڕ بووین. پاش ڕۆژ ئاوابوون کە دانراین، هەر ئەو شەوە خەڵکی جەژنیکان خواردنیان بۆ هێناین، بەڵام رایەخ و نوێنمان نەبوو، بە دەست دڕکمان لا دەدا، جێیەک بۆ خۆ خۆش بکەین لێی پاڵ بدەینەوە).[2] (ا- ک) یەکێک بوو لەو پێشمەرگانەی دوای لێبووردنە گشتییەکە دەکەوێتە نێو بۆسەی سوپای ئێراقی و بواری نابێت دەست بکاتەوە، بۆیە ناچار خۆی دەداتە دەست دەڵێ: (من کە لەقەڵای نزارکێ بووم، چونکە پێشمەرگە بووم ئاگاداریان کردبووم خۆم بزرنەکەم و لەبەر چاویان بم، بەڵام رۆژی ١٥/ ٩/ ١٩٨٨ کاتێک ئیڤای عەسکەرییان هێنابوو خێزانیان بار دەکرد، منیش خۆم دزییەوەو سواری ئیڤایەک بووم لە نێو ژن و منداڵەکان خۆم حەشاردا تا لە قەڵا دەرچووین و

یەکسەر ئێمەیان بردە جەژنیکان. تا ئەو کاتە (١٥/ ٩) هیچ بۆ جەژنیکان نەکرابوو، تەنها بیرێکی ئاو هەبوو، یەک بینایەش هەبوو ئەویش دەزگای ئەمنی لێ بوو)[٣]. هەر لەبارەی جەژنیکانەوە خاتوو مریەم ئەحمەد، کە خەڵکی گوندی ئیکماڵەی بەری گارە بوو دەڵێت: وابزانم شەوی ١٠/ ٩/ ١٩٨٨ بوو، ئێمەیان هێنایە جەژنیکان، پێش ئێمەش خەڵکیان هێنابوو، ئێمەشیان فڕێدایە نێو دڕکان[٤]. دوو ساڵ بەر لە ئەنفالەکان رژێمی بەعسی ئێراق بەرنامەی ئەوەی هەبوو شالاوی ئەنفال بکاتە سەر کوردستان و شوێنی نیشتەجێ کردنی بەزۆریشی ئامادە کردبوو. کاتێکیش بۆی رەخسا، بەرنامەکەی جێبەجێ بکات، لە ئەنفالی بادینان بە هەزاران خێزانی هێنایە سەر ئەو زەوییەی لە ساڵی ١٩٨٦ وە لە جەژنیکان تەرخانی کردبوو، بەڵام بێ ئەوەی خانوویان بۆ دروست بکات، یان هیچ جۆرە پێداویستییەکی بژێو و ژیانیان بۆ دابین بکات، تەنانەت هێندە زەحمەتیشی نەکێشابوو زەوییەکەیان بە دوو گرێدەر یان بۆلدوزەر بۆ تەخت و خۆش بکات. بەڵکە مرۆڤە لێقەوماو و کۆست کەوتوو، بریندارە جەستەیی و دەروونییەکان، نەخۆش و شەکەتەکانی هێنا لە دەشتێکی پڕ لەدڕک و داڵ و زیندەوەر، بە شەو ساردو بە رۆژ گەرم دانا، وەک سزایەک و بۆ چەندین مەبەست کە لە بابەتێکی دی روونیان دەکەینەوە. ئەمەش بەرانبەر بەکێ کرا! بەرانبەر بە ژن و منداڵ و پیرو پەککەوتەکان، کە بەرای هەمـوو ئەو نموونانەی دیدارمان لەگەڵ کردوون، رێژەی ژن و منداڵ بەرانبەر بە پیاو ٨٥- ٩٠٪ بوو. دیارە لە کۆمەڵگەی باوکسالاری ئێمەشدا ژن و منداڵ بێدەسەڵات و دەست و پێ سپین.

## ٢- مردن لە جەژنیکان و باری تەندروستی

کۆمەڵ کۆمەڵ خەڵکی هەموو دەڤەرەکانی بادینانیان دەگواستەوە بۆ جەژنیکان و لەو دەشتە فڕێیاندەدان. لەم بارەوە راپۆرتی رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ بڵاوی کردۆتەوە کە (زۆر کەس بەتایبەتی منداڵە شیرخۆرەکان لە جەژنیکان و بەحرکە مردن، لەبەر ئەوەی حکومەتی ئێراقی هیچ وەسیلەیەکی بنەرەتی و ژیانی بۆ ئەو راگـوێزراوانە دابین نەکردو هۆیەکانی مردنیش بریتی بوون لە بریندار بوون بە گازی ژەهراوی، بەدخۆراکی، وشک هەڵگەڕان، بڵاوبوونەوەی نەخۆشی ترسناک وەک تایفۆئید و کولێرا لە نێو چادرگەکەدا. رێژەی مـردنی منداڵان ٢/ ٣ ی هەموو مردنەکان بوو)[٥]. لە بارەی مردنی خەڵک بەگشتی و منداڵان بەتایبەتی زانای ئایینی و نووسەر مامۆستا مەلا تاهیری بەحرکە دەڵێ: (نەخۆشی وایان تێدا بڵاوبۆوە رۆژ هەبوو (٣- ٤) منداڵیان دەمرد، هەندێکیان کە منداڵەکانیان دەمرد دەیانهێنایە بەحرکەو جێیان دەهێشت، یان بەدیارییەوە دادەنیشتن، لێرە لە مزگەوت بانگەوازمان بە بڵندگۆ دەکرد، خەڵکی گوندی دەهاتن دەیانشوشت و کفنیان دەکردو دەمانبرد لە گۆڕستانی بەحرکە دەمانشاردەوە، گۆڕەکانیشیان ماون)[٦]. بەرای زۆر لەو کەسانەی دیدارمان لەگەڵ کردوون لەماوەی (٤- ٥) مانگی دوای هێنان بۆ بەحرکە (٤٠٠- ٥٠٠) منداڵیان مردوون، ئێمە سەردانی هەردوو گۆڕستانمان کرد، بەڵام لەبەر نەبوونی کێلی گۆڕەکان و تەختبوونی هەندێکیان نەمان ژماردن. ئەگەر منداڵی گوندەکانی جەژنیکان و بەحرکە لەگەڵ ئەوان نەنێژرابن لە (٤٠٠) گـۆڕیان پتر هەیە نەک کەمتر. بەڵام لە دیمانەکەی حاجی فازیل ئاغا و عەلی کوریدا.. ئاماژە بەمردنی، (٧٠- ٨٠) منداڵ دەکەن کە مردوون و عەلی دەڵێ (منداڵ زۆر دەمردن (٧٠ تا ٨٠) منداڵیان پتر لێ مردن گۆڕستانەکەیان لێرەیە. ئێمە لێرە کفنمان بۆ کڕیبوون و دەمانشوشتن و دەمانشاردنەوە هەروەها پیرەکانیش دەمردن)[٧]. سەبارەت بەهۆکارەکانی مردنیش زۆر بوون.. کاک (ا. ک) دەڵێ (کەش و هەوای دەشت و گەرماو برسێتی و دڵەڕاوکێ و خەمخواردن بۆ ئەو کوڕو مێردو برایانەی گوللە باران کران یان شـوونبزر کـران، یان ئەوانەی کاریگەری کیمیابارانیان لەسەر مابوو هەمـوو دەبوونە هۆکـاری مردن)[٨].. بەڵام خاتوو (سەعدیە حامد) هۆیەکانی دەگەڕێنێتەوە بۆ (نەخۆشی بڵاوبۆوە، زۆربەی ئەوانەی گیران چەندین رۆژ تا دوو هەفتە و

پتریش لە چیا تووشی سەرماو گەرماو شەکەتی و کەمخۆری ببوون، پاشان لەگرتووخانەی ئاکرێ و دهۆک و سەلامیەو قەدش برسی ببوون. دایک شیری نەمابوو، هەموو منداڵەکان تووشی بەدخۆراکی ببوون، هەندێ لە ئەنفالکراوەکانیش بەر کیمیا کەوتبوون، پاشان کاریگەری دیارکەوت[٩]. کاک زریان حاجی پاشاش لەمەڕ هۆیەکان دەڵێ: (منداڵ زۆر دەمردن. بەڵام پیرەکان لە ژێر کاریگەری دەروونی و خەمخواردن دەمردن، هەبوو کوڕیان گوللە باران کرابوو، بۆ نموونە پیرەمێردێک بە ناوی (مام ساڵح) بۆی باس کردم کە چوار کوڕ و کوڕەزایەکی لە بەر چاوی گوللە باران کرایە و گوتی: گوتم منیش بکوژن، پیاوانی بەعس پێیان گوتم نا تۆ بۆ خەمان بمێنەوە.. ئەو پیاوە خەڵکی بەری گارە بوو)[١٠]. لێرەدا بۆمان روون دەبێتەوە کە هۆکارەکانی مردن بۆ منداڵان بریتی بوون لە:

١- بەدخۆراکی یان بێ خۆراک. بەتایبەتی لە کاتی مانەوەیان لە چیا و پاشانیش لە قەڵا و زیندانەکان.
٢- بڵاوبوونەوەی نەخۆشی.
٣- وشکبوونی شیری مەمکی دایکان، لەبەر دوودڵی و خەمخواردن و ترس و کەمخۆراکی.
٤- کاریگەری گازی ژەهراوی.

سەبارەت بە پیرەمێرد و پیرەژنەکانیش هۆیەکان بریتی بوون لە:

١- بڵاوبوونەوەی نەخۆشی.
٢- بەدخۆراکی.
٣- کاریگەری گازی ژەهراوی.
٤- خەم و خەفەت خواردن بۆ ئەو خۆشەویستانەی گوللە باران، یان شوونبزر کران.
٥- ترسان لە چارەنووس و داهاتوویەکی نادیار.

### ٣- مەبەستی حکومەتی بەعسی ئێراقی لە هێنانی ئەنفالکراوەکان بۆ جەژنیکان

سەبارەت بە مەبەستی حکومەتی بەعسی ئێراق لە هێنانی ئەنفالکراوەکان بۆ جەژنیکان، کاک عەبدوڵای حاجی فازیل، کە ئەوکات موختاری گوندی جەژنیکان بوو، دەگێڕێتەوە: "ئەبو مەیسون کە سەرۆکی لیژنەی وەرگرتن بوو، گوتی: حکومەت مافی ئەوەی هەبوو ئەوانەش گوللە باران بکات، بەڵام بەزەیی پێیاندا هاتەوەو لێی بوردن، ئێستاش لەو ئاقارەیان دادەنێ". پێم گوت: بەم هاوینەو لەم چۆلەوانییە چۆن دەبێ، ئەبو مەیسون وەڵامی دامەوە "باشترە لەوەی گوللە باران نەکراون و لێی بوردون، ئیتر ئێرە جێگەیانە، با ئەو خەڵکە تێبگات ئەوەی ناپاکی لەگەڵ حکومەت بکات ئەمە چارەنووسییەتی". هەروەها دەگێڕێتەوە: "هەفتەیەک پاش هێنانی ئەنفالکراوەکان یەحیا جافی پارێزگاری هەولێر و سوبحی عەلی خەلەف/ ی سەرۆکی لقی هەولێری حزبی بەعس، چوونە نێو جەژنیکان و سوبحی پێی گوتن: ئەمە چارەنووستانە، چونکە ئێوە تێکدەر بوون و دەستی دوژمنتان هێناوەتە ناو خاکی ئێراق، دەبێ لەسەر ئەم زەوییە وشکە بمرن و هیچ یارمەتییەکتان نادەین[١١]. گەر لەم قسەیە ورد ببینەوە بۆمان دەردەکەوێت رژێم ئەگەر راستەوخۆ نەیکوشتوون و گوللەباران، یان شوونبزری نەکردوون، بەڵام دەیەوێ بە شێوەیەکی دی بیانکوژێ.. لەم بارەوە مامۆستا مەلا تاهیری بەحرکە دەڵێ (دیارە رژێم بۆ ئەوە ئەوانەی هێنایە ئێرە تا چی شتی خراپە پێیان بکات، بیان کاتە کرێگرتەی خۆی، یان چی بیهەوێ بۆی بکەن، یان بۆ ئەوەی بوو رۆژێک لە رۆژان ئەوانەش قووت بدات، بیانبات لە خواروو زیندەبەچاڵیان بکات، یان بۆ ئەوەی بوو خەڵکی پێ تەمبێ بکات و نەوێرن سەریان بڵند بکەن"[١٢]. هەر لەم بارەوە عەلی حاجی فازیل پێی وایە بۆ ئەوەی بوو چاوی خەڵکی ئەم ناوچەیە، (هەولێرو دەراندەوری) پێ بشکێنێ"[١٣]. بەڵام زریان حاجی پاشا رای وایە: "ئەوەی من تێگەیشتبم، ئەوکات بەعس لەو پەڕی بەهێزیدا بوو، چۆن خەڵکی گەرمیان و بارزانییەکانی ئەنفال کرد، ئاواش دەیتوانی ئەوانە بکوژێ، یان زیندەبەچاڵیان بکات، پێش ئەوەی بگەنە شارەکان. بەڵام دەیویست: نیشانی خەڵکی بدات.. ئەوا لەو ساکەگۆڕە دایان دەنێ با لەبرسان بمرن، ئەوەش نارازی بێت، وای لێ دەکات. دەیویست چاوی خەڵک

بشکێنێ"[١٤]. هەر بەرانبەر بەو پرسیارەی مەبەستی رژێم چی بوو. حاجی سوارە عوسمان بەرستەیەکی کورت وەڵامی دایەوە و گوتی: " بەمنیان گوت: (واتە پیاوانی رژێم پێیان گوتووە) تا بۆئەوەی لەبرسان بمرن"[١٥].

لەکاتی شیکردنەوەی گوتەی پیاوانی حکومەتی بەعس و شایەتەکان، ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە نیازی حکومەتی بەعسی ئێراق لە هێنانی ئەو ئەنفالکراوانە بریتی بوون لە:

١- رەزیلکردن و لەبرسان و بە نەخۆشی مردنی ئەنفالکراوەکان بە مردنێکی لەسەرخۆ.

٢- بۆ چاوشکاندنی خەڵکی هەولێرو دەوروبەری و هەموو کوردستان بوو کە ئەوەی بەرانبەر بە فەرمانەکانی حکومەتی بەعسی ئێراق بوەستێ ئەمە چارەنووسییەتی.

٣- بۆ ئەوەیان بوو هەموو خەڵکی کوردستان لە ئۆردوگای زۆرەملێ کۆبکەنەوە و لە نزیکەوە چاودێرییان بکەن، وەک عەلی حەسەن مەجید لە کۆبوونەوەی نووسینگەی باکوور لە ١٥/ ی ئەپریلی ساڵی ١٩٨٨ ئاماژەی پێداوە[١٦].

٤- بۆ ئەوەیان بوو هەرکاتێ چییان لێ بوێ و چی شتی خراپە پێیان بکەن و لە دابونەریتە رەسەنەکانی کوردەواری و شەهامەتی کلتووری و رەسەن دایانشۆرێن.

**پەراوێزەکان:**

١- سەبارەت بە گەیشتنی یەکەمین وەجبەی ئەنفالکراوەکان، چەند رایەکی جیاواز هەبوو، لەبەر ئەوەی ئەوانەی دیمانەیان لەگەڵ کردوون، کەسیان رۆژی گەیشتنی یەکەمین کاروانیان تۆمار نەکردووە و دیارە بەباشیش لەبیریان نەماوە چ رۆژێک بوو کە لە نێوان رۆژی ٧ تا ئابی ١٩٨٨ دایە و زۆربە پێیان وایە رۆژی (٧- ١٠) ی ئەیلوول بوو.

٢- دیمانە لەگەڵ خاتوو هێرێ عەبدولقادر/ ٩/ ٥/ ٢٠٠٦، جەژنیکان.

٣- دیمانە لەگەڵ (ا- ک) پێشمەرگە ١٣/ ٤/ ٢٠٠٦، هەولێر.

٤- دیدار لەگەڵ خاتوو مریەم ئەحمەد ٩/ ٥/ ٢٠٠٦، جەژنیکان.

٥- میدل ایست ووچ/ حملة الانفال في کوردستان العراق/ تدمیر قریة کوریمي/ ت: د. رزگار/ دار آراس للطباعة و النشر/ اربیل ٢٠٠٢ ص٩٢.

٦- دیمانە لەگەڵ مامۆستا مەلا تاهیری بەحرکە ١٢/ ٥/ ٢٠٠٦/ بەحرکە.

٧- دیمانەیەکی هاوبەش لەگەڵ حاجی فازیل ئاغای جەژنیکان و عەلی کوری ٥/ ٥/ ٢٠٠٦/ جەژنیکان.

٨- دیمانە لەگەڵ ا- ک. سەرچاوەی پێشوو.

٩- دیمانە لەگەڵ خاتوو سەعدیە حامد/ ٢٥/ ٤/ ٢٠٠٦/ هەولێر.

١٠- دیمانە لەگەڵ زریان حاجی پاشا بەحرکە/ ١٠/ ٥/ ٢٠٠٦/ هەولێر.

١١- دیمانە لەگەڵ عەبدوڵای حاجی فازیل/ ١٠/ ٥/ ٢٠٠٦/ هەولێر.

١٢- مامۆستا مەلا تاهیری بەحرکە/ سەرچاوەی پێشوو.

١٣- دیمانەیەکی هاوبەش لەگەڵ حاجی فازیل ئاغاو عەلی کوری/ سەرچاوەی پێشوو.

١٤- زریان حاجی پاشا/ سەرچاوەی پێشوو.

١٥- دیمانە لەگەڵ حاجی سوارە عوسمان ئاغای گرد ئارەق/ ٥/ ٥/ ٢٠٠٦/ گرد ئارەق.

١٦- رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ/ خۆرهەڵاتی ناوەڕاست/ تاوانی جینۆساید لە ئێراق/ شاڵاوەکانی ئەنفال دژی کورد/ و: جەماڵ میرزا عەزیز/ بەرلین ٢٠٠٠/ ل٢٦٠.

### هەڵمەتی بەهاناوەچوونی خەڵکی هەولێر و دەوروبەری

١- یەکەمین هەڵمەتی بەهاناوەچوون.

٢- دووەمین دەستپێشخەری.

٣- هەڵمەتە مێژوویەکەی شاری هەولێر.

٤- هاوکاری دوکاندارەکانی هەولێر.

٥- جۆرەکانی دی یارمەتی.

### ١- یەکەمین هەڵمەتی بەهاناوەچوون

رێکخراوی چاودێری مافی

مـــرۆڤ/ خـــۆرهەڵاتی ناوەڕاست لە ڕاپۆرتەکەیدا ئاماژە بەوە دەکات کە (٤٢٤١) خـــێـــزان لە ئۆردوگــــای جەژنیکان لەزەوییەکی پڕ دڕک و داڵ دەژیان بێ ئەوەی هیچ شـــتـــێکی تێدابێ، هیچ شتێکیـان بدەنێ. لای ئەنفالچییـەکـان گرنگ نەبوو ئەوانە بژیابایـەن یان بمردبایـەن، بـەڵام لـە ئەنجـامی هەولێکی بەهاناوەچوونی خـۆکـاری تایبـەتی گـەورە زۆربەیان ڕزگاربیـان بوو. یەکەمین کەسانێ کە یارمـــەتـیـــــان پێــشـکەش کــرد هاوڵاتییەکانی هەولێر بوون، کە زۆر جار بەکاروانێکی گەورەوە خواردن و پێویستییەکانی ژیانیان بۆ دەبردن[١]. هەروەها ئەلبـێــرت کـامــوس لە ڕێکخـراوی (مـــیـدل ئیـست ووچ) کـتـێـبـەکـەی (شاڵاوی ئەنفال لە کـوردسـتـانی ئێـراق/ وێرانکردنی گوندی کوردیی) پێشکەش بە خەڵکی هەولێـــر دەکـــات و تیـــایدا دەڵێ (دیارییە بۆ ڕۆڵەکانی شاری هەولێر، ئەوانەی ژیانی خـۆیان خـســتــە مـەترسی. کـاتێک بۆ فریاکـەوتنی هەزاران لە گوندنیـشینی کوردیی لە چادرگەکانی بەحرکە، جەژنیکان.. کــەوتنە ڕێ)[٢]. هەروەها عـــەلی بەندی: بەرگی یەکەمی کـتـێبـەکـەی (ئەنفالکرنا بەهدینان) دەکاتە دیاری بۆ خەڵکی هەولێر و لە لاپەڕە سێدا نووسـیویەتی: (دیارییـە بۆ خـەڵکی شـەرەفـمـەندی هەولێـرا خـۆڕاگـر و دەوربەران، ژ بۆ هاریکاریا بێ سنوریا کــو ل ســاڵێ ١٩٨٨ پێــشـکەشی خـەڵکی ئەنفـالبـووی کـری و بۆبە ئەگەرا پاراستنا جانێ خەڵکی قورتال بووی ژ کـوشـتنێ و کـیـمـیـابارانێ و ژیانا خۆ ئێـخـسـتـیـە د مـەترسیێ دا)[٣]. سـەرەڕای ئـەمـانە جـەمـاوەری ئەنفـــالکراوی پارێزگــای دهۆک لە ڕۆژی ٣١/ ٨/ ١٩٩٩ و بــــــە نووسراوی ژمارەی (١٧٨٩) لە یادی یازدەمین ســالڕۆژی ئەنفـــالکردنی خەڵکی بادینان، سوپاسنامەیەکیان بۆ خـەڵکی هەولێـر ناردووە و تیـــایدا هاتووە: (ئەم بناڤێ جـــەمـــاوەرێ پارێزگەها دهۆکێ و دەوروبەرا پڕ ژدڵ سـوپاسـیا خـەڵکێ باژێرێ پایتـەختـا خۆڕاگر هەڤلێرا خۆشتڤی دکەین لسەر هەڵوێـسـتێ وان یێ نیـشـتـیـمـانی کوردەواری کو براستی ئەو هاریکاریا وان کـری دڤێت ب پیـتـێن زێڕین ل مێژوویا کوردی دا بهێنێتە نڤیسین داکــو حــەتا حــەتایێ نەهێــتــە ژبیـرکـرن...)[٤]. هەر لەم بارەوە لە کتێبی شاڵاوی ئەنفال لە دژی کورد لە کوردستـانی ئێراق، کە میدل ئیست ووچ ئامـــادەی کــردووە نووســـراوە: (ڕزگـــار بوونی دانیـــشـــتـــوانی چادرگـەکـــانی دەوروبەری هەولێـــر لەنێـویشـیـانـدا ئەوانەی بەحرکـەو جەژنیکان بەهۆی ئەو هەوڵ و کۆششە گـەورەیەی نەتەوەکەی خـۆیان بوو لە هەولێر کە هەڵـمـەتێکی فریاکـەوتنی مەزنیــان ڕێکخست و خواردن و ئاوو نوێن و کـەرەسـەی پێـویسـتی شـوێنی حــەوانەوەی ســەرەتاییــان بۆ دابین کــردن)[٥]. کــاتێک کـە یەکـەمـین کـــاروانی بە ژن و منداڵ بارکــراوی پاس و لۆرییــە ســەربازییــەکــانی حکومـەتی ئێراق گـەیشـتە خۆرئاوای شـاری هەولێـرو بە نێـو عـەنکاوەدا بەرەو باکــوور هەڵکشـــا، ئەوانەی بینییان حەپەسان و هەر ئەو ئێوارەیە هەواڵ بـەنێــــو تـەواوی شــــاردا بڵاوکـرایەوە، بەڵام کـەس نەیدەزانی ئەو گیراوانە بەرەو کوێ بردران، شار لە چاوەڕوانییەکی بێ ئارامیدا دەژیا تا هەر هەمــان شــەو لێــرەو لەوێ بڵاوبۆوە کە حکومەتی بەعسی ئێراق بـە هـەزاران لە پاشــــمــــاوەی ئەنفالکراوەکانی بادینانی هێناوەو لە ئاقـــاری گـــوندی جــەژنیـکان لـەنێــو بــەرپـایــەکـی پــڕ لــە دڕک وداڵ و زینـدەوەر، بێ نـان و ئـاو و ڕایـەخ و نوێن و هیچ پێداویستییەکان ژیان و حــەوانەوە فـرێی داون. دیارە هەر لە هەمـان شـەودا حاجی فـازیل ئاغـای جەژنیکانی هەواڵ بۆ هەندێ دۆست و برادەری خــــــۆی دەنێـــــــرێ و باروودۆخەکەیان بۆ باس دەکات! وەک عـــــەبدوڵا گـــــۆران لە هەولێـــــرێ دەگێڕێتەوە (د هەمان شەڤدا فازیل ئاغـایێ جەژنەکـانی هەوارا خـەڵکێ بەهدینان (مێهڤانێن خۆ) گەهاندنە مـــــە ل هەولێـــرێ، بلەز ئەم چەند ڕیهـســپــیـێن هەولێـر یالێک خرڤـە بووین، هەوارا فـازیل ئاغـای مـە ل باژێرێ وەشـــاند و گـــەهاندە دهەر ماڵەکی دا)[٦].

ئەمانەی خستمانە ڕوو ڕای چەند ڕێکخـــراو و نووســـەرێکن لە مـــەڕ ئەنفـــالکردنی خـــەڵکی بادینـان و یارمەتی خەڵکی هەولێرو دەوروبەری نووسیـویانە. لێرەدا دەمانەوێ بزانین ڕای نموونەی توێژینەوەکەی ئێمە چۆنە و چەند لەگەڵ ئەو ڕایانەی خستمانە ڕوو یەکـدی دەگـرنەوە!. لەم ڕووەوە

حاجی فازیل ئاغای جەژنیکان لەدیمانەیەکی تایبەت کە عەلی کوریشی بەشداربوو لەرۆژی ٥/ ٥/ ٢٠٠٦ لە جەژنیکان گوتی: لەگەڵ گەیشتنی یەکەمین کاروانی ئەنفالکراوەکان و لە رۆژی یەکەم و دووەم جارمان بە نێو گوندی دا، خواردن و ئاومان گەیاندن و هەموو خەڵکی جەژنیکان بێ جیاوازی بەشدار بوون. هەروەها دەڵێ سەرەتا تەنها خۆراک و ئاومان بۆ بردن، چونکە زۆر برسی بوون، پاشان هێندەی پەیدابوو هەرچی ژیان پێویستی بوو بۆمان دابین کردن، بە تایبەتی لە رووی رایەخ و بەتانی و کەلوپەلی نانخواردن. سەبارەت بەو پرسیارەی کە چۆن ئاویان دەستکەوت.. بەرێز حاجی فازیل دەڵێ: سەرەتا بە هەموو شتێک کە لەبەر دەستدا بوو، تا بە دۆلکەی بچووک ئاومان گەیاندن، پاشان کە ئامانیان گەیشت خۆیان دەچوون لە کارێزەکەی جەژنیکان دەیان هێنا کە بۆ بەختی ئەوان ئەو ساڵە ئاوی هەبوو. بەڵام پاش هەفتەیەک لە هاتنیان بە تانکەر لە هەولێرەوە حکومەت ئاوی بۆ دەهێنان[٧]. لە بارەی دەست پێشخەرییەکەی حاجی فازیل ئاغا.. عەبدوڵا حاجی فازیل ئاغا دەگێرێتەوە: "کە یەکەمجار هێنایانن باوکم خەڵکی گوندی بانگ کرد بۆ بەهاناوەچوونیان، پێی گوتم: بابە فەرمانی حکومەت ئەوەیە نابێ کەس یارمەتییان بدات، حاجی فازیل جوێنی پێدام و گوتی: ئەگەر ئەمرۆ نەکوژرێین ئەدی کەی دەبێ؟ ئەگەر ئەمرۆ پیاو داکۆکی لەشەرەفی خۆی نەکات، داکۆکی لە میللەتی خۆی نەکات، کەی غیرەتی پیاوەتی دەجوولێ؟!!. خەڵکێکی لێقەوماو بێت داوای ئاو بکات من نەیدەمێ! لەبرسان بمرێ من نانی نەدەمێ! ئەمە لەچ زەمانێک بووە؟!! با حکومەت ئیعدامم بکات!... یاڵڵا خەڵکینە، ئیدی خەڵکەکە چی لەماڵی خۆی هەبوو بۆی بردن، ژن دەستیان کردە نانکردن، حاجی فازیلیش چی گەنمی هەبوو تەرخانی کردو فەرمانی دا بیبەنە ئاش و بیکەنە ئارد. هەرکەسێ ئاردیان نییە بابێت لەو ئاردە بیبات بۆ نانکردن.. تا سەعات ١٢/ ی شەو هەموو خەڵکەکە نان و ئاویان گەیشتێ.. رۆژی دووەم و سێیەمیش یارمەتییەکانی خەڵکی جەژنیکان بەردەوام بوو"[٨]. هەروەها کاک زریان حاجی پاشا دەڵێ: "ئەوەی حاجی فازیل کردوویەتی، ناتوانم بڵێم خزمانی گوندەکانی دی کردوویانە، چونکە ئەو کات ئەو توانای مادی باشتر بوو، دوو سێ ئوتومبێلی هەبوو لە خزمەت خەڵکەکەدا بوون. هەر لەبارەی بەهاناوەچوونی خەڵکی جەژنیکان و دەستپێشخەری حاجی فازیل، کاک سوارە عوسمان ئاغای گردئارەق بۆی گێڕاینەوە: "یەکەمین رۆژ، تەنها جەژنیکان گەیشتنە هانایان، پاشان گوندەکانی دی و هەولێر. خوا هەڵناگرێ دەوری حاجی فازیل زۆر گەورە بوو". هەروەها دەڵێ: "زۆرکەس یارمەتی دەهێناو دەیدایە حاجی فازیل دابەشی بکات، چونکە ئەو بە ئاشکراو بێ ترس سەرپەرشتی ئەنفالکراوەکانی دەکرد"[١٠]. لە پشت بەستن بە رای ئەم نموونانە، یەکەمین دەستپێشخەری لە جەژنیکان لە سەر دەستی حاجی فازیل ئاغا بووە بۆ ماوەی ((٣)) رۆژیش ئەو گوندە کە (٣٥) ماڵ بووە، یارمەتی خۆراک و کەلوپەلی گەیاندۆتە هەزاران کەسی کاروانی یەکەم، دیارە یارمەتییە زۆرەکەش هەر لە لایەن حاجی فازیل خۆی بووە و ئەو توانایەشی هەبووە ئەو کات. پاشتریش جگە لە سەرپەرشتیکردنی ئەو یارمەتییانەی بۆ خەڵکەکە دەهاتن خۆشی بەردەوام یارمەتی دەدان.

**٢- دووەمین دەستپێشخەری... خەڵکی گوندی بەحرکە و گوندەکانی دەوروبەر**

بۆ رۆژی دوایی، کە هەواڵ گەیشتە گوندەکانی دەوروبەری جەژنیکان، ژمارەیەکی زۆر ژن و منداڵی ئەنفالکراوی بادینان لە ئاقاری گوندی جەژنیکانی ئەبابەکرئاغا، بێ خۆراک و ئاو و هەموو کەلوپەلێک، لەنێو درک و داڵ فرێدراون، هەڵمەتی یارمەتیدان سەرەتا لە بەحرکە و پاشان لە گوندەکانی دی وەک گردئارەق و گردەچاڵ و پەرپیتان و گەزنە و هەموو گوندەکانی بەرانەتی دەستی پێکرد. لەم بارەوە بەرێز حاجی فازیل دەڵێ: "بۆ رۆژی دووەم خەڵکی بەحرکە یارمەتییان هێنا پاشان هەموو گوندەکانی گەردییان و تەنانەت ناوچەی زرارەتیش..."[١١]. سەبارەت بەهاناوەچوونی خەڵکی بەحرکە بەرێز

مامۆستا مەلا تاهیری بەحرکە دەڵێ: "خەڵکەکە شەو هێنران و سەرەتا خەڵکی بەحرکە ئاگاداری تەواویان نەبوو، بەڵام بۆ بەیانییەکەی زوو خەڵک بەهانایانەوە چوون... خەڵکی بەحرکە هەموویان بەخۆ کەوتن و گیانی کوردایەتییان جوولا، لەبەر ئەوەی دوژمن ئەو کارەساتەی بەسەر هێنابوون. هەروەها مامۆستا مەلا تەیبی برام، فەرمانیدا بە بڵندگۆی مزگەوت بانگ رادێران تا خەڵکی بەحرکە یارمەتی ئەو لێقەوماوانە بدەن، ئێمە خۆشمان چووینە مزگەوت، بێ ئەوەی ترسی رژێم لە دڵماندا بێت، چونکە خوای تەعالا غیرەتی خستینە ناو دڵ. زانیبوومان خەڵکەکە لە تێنان موبتەلا بوون، بۆیە یەکەم ئیشمان ئەوە بوو تانکی بخەینە ناو ئوتومبێلان و ئاویان بۆ ببەین، خەڵکەکە هێندە زۆر بوون شانیان دایە بەریەک و بە تەنەکان ئاویان لە کانی بەحرکە هەڵدێنجا و ئەو دەیدایە دەستی ئەوی دی.... تا ئاوی کانی تەواو دابەزی"[١٢]. سەبارەت بەخواردنیش مامۆستا مەلا تاهیر دەڵێ: "ئوتومبێلان بەناو گوندیدا گەڕان و دەستیان کردە خۆراک گردکردنەوە. هەموو ماڵەکانیش دەستیان کردە نانکردن، بۆ جاری سێیەم جا دەستیان کردە کۆکردنەوەی کەلوپەلی ناوماڵ و پێویست. بەخۆم بینیم یەکێک لە خەڵکی بەحرکە- پێویست ناکات ناوی بهێنم چونکە بۆ خوای کرد- رایەخێکیان هەبوو، لە ناوەندیدا کردییە دوو لەت و بەشێکی بۆ لێقەوماوەکان نارد، هەموو شتیان بۆ کۆکردنەوە، بەڵام خەڵکەکە زۆر بوون بەشیانی نەدەکرد". زریانی حاجی پاشاش کە ئەوکاتی گەنجێکی خوێنگەرمی خوێندەوارو هوشیار بوو، وەک شایەتحاڵ و بەشدارێکی یارمەتییەکانی خەڵکی بەحرکە دەڵێ: "یارمەتی گەورەی خەڵکی بەحرکە لە نیوەڕۆی رۆژی دووەمی هێنانییان دەستی پێکرد. شەو زانیارییان لەسەر رێ و جێگەی ئەنفالکراوەکان نەبوو. خەڵکی بەحرکە هێمەتێکی زۆر باشیان کرد رۆڵی سەرەکیش مامۆستا مەلا تەیب و حاجی پاشا بوون... گوتیان بۆ ئەوەی نەهێڵین بمرن با سەرەتا ژنانی گوند هەموو دەست بەنانکردن بکەن، ئەوەش ئاردی دەوێت دەرگەی عەمباری گەنم کراوەتەوەو ئاش ئامادەیە با گەنم لێبکەن. ئەوانەش کە ئوتومبێلیان هەیە ئامادەیان کردن بۆ کەلوپەل بردن و کڕین. سەرەتا نان و ئاو بوو، پاشان پێخۆر جا هەموو شتی تر تا ئەوەی چادریان هەبوو بۆیان بردن)[١٤].

خاتوو ف. ت لە گوندی بەحرکە چەندین یادەوەری بەرانبەر بەخەڵکی ئەنفالکراوی بادینان هەیە، سەبارەت بە بەهاناوەچوونی خەڵکی گوندەکەی دەڵێ: "رۆژی دووەم بوو، هەموو خەڵکی بەحرکە خەریکی خواردن دروستکردن بوون، ئێمەش یەکێک بووین لەو ماڵانەو بۆ نیوەڕۆکەی نزیکەی (٢٠) ژن و منداڵمان هێنایە ماڵی خۆمان و ئەو رۆژە باشترین خواردنمان بۆ دروست کردن". هەروەها لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێ: "هەر لەهەفتەی یەکەمەوە باوکم مووچەی مانگانەی بۆ چەندین ئافرەتی پیاو ئەنفالکراو بڕیبەوە، هەموو رۆژانی هەینیش بڕێک پارەی لەگەڵ خۆی دەبرد بەسەر ئەو خەڵکەی دابەش دەکرد تا رۆژێکیان منداڵ دەیخەنە بن دەست و پێیان و بەچەند پیاوان رزگاری دەکەن"[١٥].

ئەمە رای چەند نموونەیەکی توێژینەوەکە بوو لەگوندی بەحرکە... بەڵام گوندەکانی دی دەوروبەریش یارمەتی و کۆمەکی باشیان گەیاندنێ، بابزانین حاجی سوارەی عوسمان ئاغای گردئارەق چۆن باسی دووەم رۆژی هێنانی ئەنفالکراوەکان دەکات: "دووەم رۆژ لەدوای مامۆستا مەلا حوسێن، مەلای گوند و کاک عەزیزی شێخ محەمەد و کاک ئەحمەد سوارە و کاک عەبدوڵا سلێمان و کاکلی برام نارد، لیژنەیەکمان لەو پێنج کەسە پێکەوەنا بۆ کۆکردنەوەو بردنی یارمەتی.... سەرەتا ئێمە بڕێک پارەمان خستنە بن دەست و پاشان مامۆستا مەلا حوسێن، ماڵ بەماڵ گەڕا بۆ کۆکردنەوەی یارمەتی و کۆمەک. هەروەها حاجی عەزیز و چەند برادەرێکیش چوون بۆ هەولێر بۆ خواردن و کەلوپەل کڕین و بە ٦ تا ٧ کاروان هێنایانەوە و بەسەر خەڵکەکە دا بەشیان کرد. پاشان لەبەرئەوەی کاک ئەحمەد و کاک عەبدوڵا قەڵابیان هەبوو، کاکلی براشم جێبێکی هەبوو، بەردەوام لە هەولێر دەسووڕانەوەو یارمەتی و کۆمەکییان

بۆ دەهێنان"...[16].

هەر لەدرێژەی دیمانەکەدا حاجی سوارە دووپاتی دەکاتەوە: ...یەکەم رۆژ تەنها جەژنیکان بوو، بەڵام رۆژی دووەم بەحرکە و گردئارەق و تەواوی گوندەکانی دەوروبەر بوون.... نابێ ئەوەش لەبیر بکەین کۆمەکی گەورە خەڵکی هەولێر بوون"[17]. هەر لەم بارەوە کاک کاکل عوسمانی برای حاجی سوارە گوتی: "رۆژی دووەم بەیانییەکەی زانیمان ئەو خەڵکەیان هێناوەتە جەژنیکان، لەگەڵ مامۆستا مەلا حوسێن و عەزیز شێخ محەمەد و برادەرانی دی کاروانێک کەلوپەل و خۆراکمان لە گوندی گردئارەقەوە بۆ بردن، لەگەڵ برێک پارە لەبیرم نەماوە چەند بوو..."[18].

کاتێ ئەم زانیارانە دەخەینە بەر شیکردنەوە، دیارە لە خەڵکانێک وەرگیراون خۆیان شایەتحاڵی رووداوەکەو لەنێویدا ژیاون. ئەمەمان بۆ روون دەبێتەوە بەو هۆیەی ئۆردوگاکە لە تەنیشت گوندی جەژنیکانی ئەبابەکرئاغا بووە، بۆیە یەکەمین کەس ئەوان بەهانایانەوە چوون، کە ئێوارە درەنگانێک بوو. بەڵام کە رۆژ بووە و هەواڵەکە بەدەوروبەردا بڵاوبووە، هەموو گوندەکانی دەوروبەر کەم و زۆر بەفریایان کەوتن، بەڵام گوندی بەحرکە، کە لە هەموان نزیکتر بووە و گوندێکی گەورەیە و خەڵکەکەی بەخەڵکی باش ناسراون، هەروەها گوندی گردئارەقیش لە دوو بەحرکە دێت، رەنگە زووتر لە گوندەکانی دی پێراگەیشتبن، هەڵبەتە مامۆستایانی ئاینی و براگەورەی گوند و ریشسپییەکان رۆڵی بەرچاویان هەبووە بۆ هاندانی خەڵک وەک لە بەحرکە و گردئارەق بیستمان.

بەڵام دیارە ئێمە پێرانەگەیشتین سەردانی گوندەکانی دی بکەین و شایەتحاڵەکان بدوێنین، بەتایبەتی گوندەکانی گەزنە و پەرییستان و گردەچاڵ و.... تد ئەگینا رەنگە ئەوانیش کەمتریان نەکردووە.

### ٣- هەڵمەتە مێژووییەکەی شاری هەولێر و سەنگی مەحەک

دیارە لە هەموو دیمانەکان و ئەو سەرچاوانەش کە سوودمان لێیان وەرگرتووە، هەموو بەرێزو سەرسامی و شانازییەکی بێ وێنەوە لەو هەڵمەتە بەهاناوەچوونەی خەڵکی شاری هەولێر دەدوێن، کە لە رۆژی دووەم و سێیەمی گەیشتنی ئەنفالکراوەکان و بۆماوەی چەندین مانگ بەردەوام بووەو یەکسەر ئەو بریارەی پیاوانی رژێمی بەعسیان پووچەڵ کردووەتەوە، کە ئاگاداری دابوو نابێ کەس یارمەتییان بدات، هەڵبەتە یارمەتیش نەبووایە هەموو لەبرسان دەمردن.

با سەرەتا بە گێرانەوەی مامۆستا مەلا تاهیری بەحرکەی دەست پێ بکەین کە گوتی: "خەڵکی هەولێر، وەک ئێمە شارەزا نەبوون و سەرەتا پارەو یارمەتییان دەهێنا لە پێش مزگەوت دەوەستان، داوایان دەکرد یەک دوو کەسیان لەگەڵ بنێرین، یان داوایان دەکرد ئێمە بیبەین و دابەشی بکەین." هەروەها مامۆستا مەلا تاهیر لە درێژەی دیمانەکەدا دەڵێ: ...دوایی خەڵکەکە بەخۆیان شارەزابوون پێویستییان نەبوو بێنە بەحرکە، لێرەوە دەمانبینی لۆری بەدوای لۆری و پیکاب لەدوای پیکاب وەک ریزە شارە مێرووستان بۆ جەژنیکان دەچوون، تا وای لێهات خەڵکە لێقەومااوەکە نەختێ بووژانەوە... جا خەڵک بلۆک و نایلۆن و دار و قەمیش و حەسیر، لە ناوچەی پیشەسازیش بۆدی لۆری و قەلابیان بۆ دەبردن بۆ دروستکردنی شوێنی حەوانەوە..."[19]. هەر لەم بارەیەوە مامۆستایەک بەناوی هەڵاڵە ع. م بۆی گێرایەوە: " من وەک خۆم کەمێک یارمەتیم دان، بەڵام لە دۆست و لایەنگر و ئەندامی حزبەکەم وخزم و کەسان (لە هەولێر) لەو ماوەیە بری پتر لە (٢٥٠٠٠) بیست و پێنج هەزار دیناری " ئەوکاتە کە دەیکردە پتر لە (٧٥٠٠٠$))م بۆ کۆکردنەوەو بەسەر ئافرەتە هاوسەر ئەنفالکراوەکان دابەشم کرد". هەروەها ئەو ژنە سەلارە لەمەڕ بەهاناوەچوونی ئەنفالکراوەکان دەڵێ: هەڵمەتی هەولێر بێ وەستان بوو، بەچاوی خۆم دیم و خەڵکی عەینکاوە دەهاتنە سەر شەقام و نان و سەموون و جلوبەرگ و خواردنیان دەدایە خەڵکەکە و بۆیان فرێدەدانە ناو لۆرییە سەربازییەکان"[20].

لەلایەکی دیکەوە کاک ئەحمەد سوارە رەسوڵ خەڵکی گوندی گردئارەق کە ئەو کات (قەڵاب)ی هەبوو لەمەڕ هەڵمەتی شاری هەولێر دەڵێ: "زۆر لەخزم و ناسیاو و برادەر

داوایان لێکردم ئەو یارمەتییەی کۆیان کردۆتەوە بۆیان بگەینمە جەژنیکان. بۆ ماوەی (١٥) رۆژ بەو کارەوە خەریک بووم کاتێ کەلوپەلی ئەوانیش تەواو بوو، لەگەڵ ژمارەیەک لە گەنجانی خزم بەناو کۆڵانەکانی شاری هەولێردا دەسووڕاینەوە، هەر هێندە بەس بوو، بتگوتایە جەژنیکان.... جەژنیکان.. ئیتر ماڵ نەبوو برێک کەلوپەلی پێویستی ژیان یان خۆراکی نەهێنابایە تا ئۆتومبێلەکە پڕ دەبوو"[٢١]. لەگەڵ ئەم گێڕانەوەیەی کاک ئەحمەد ئەو گوتەیەمان دێتەوە بیر کە ئێستاش لەنێو هەولێرییەکان دەگێڕنەوە ئەوانەی یارمەتییان خۆبەخشانە گرد کردۆتەوە دەیانگوت: " ئەوەی دەیەوێت بچێتە بەهەشت، با یارمەتی خەڵکی جەژنیکان بدات!!. ئەوەی دەیەوێ بچێتە حەج... ! حەج وا لە جەژنیکانە.".

سەبارەت بەوەی کە چییان بۆ خەڵکەکە دەبرد.. دەڵێ: " هەموو جۆرە ترومبێلێک دەچوونە جەژنیکان.. خەڵک هەبوو تەنها پارەی دەبرد، هەبوو تەنها قاپوقاچاغ، لۆری دەچوو تەنها لانکی پێبوو، برادەرێک بەناوی عەبدوڵا سلێمان کە هاوکار بووین، هەموو رۆژ دوو کاروانی (لە سەر حسابی خۆی) بەفری دەکڕیو دەیبرد بە سەر خەڵکەکەیدا دابەش دەکرد"[٢٢]. سەبارەت بە هاریکاری خەڵکی هەولێر کاک سەلاح عوسمانی بەڕێوەبەری کتێبخانەی عەنکاوە دەگێڕێتەوە "حاجی سەرهەنگ مەجید، هەموو مانگێ (٥٠٠) دیناری ئەوکاتی دەدایە من بۆ (١٠) ئافرەتی بێ پیاو، منیش بۆ ماوەی چوار مانگ ئەم پارەیەم بەسەردا دابەش کردن".

سەبارەت بەوەی کە کێ بوون ئەوانەی یارمەتییان بۆ ئەنفالکراوەکانی جەژنیکان دەهێنا، سەرەتا کاک زریان حاجی پاشا گوتی: "نا.. من دەپرسم کێ لە هەولێر یارمەتی نەداون؟! تا لە عەینکاوە رێگایان لە ئیقا عەسکەرییەکان دەگرت تا بوودستێ و خەڵک خۆراکیان بدەنێ...."[٢٣]. کەچی عەلی حاجی فازیل دەڵێ: "خەڵک لە هەولێرەوە زۆر دەهاتن یارمەتییان دەهێنا، کەس لە کەسی نەدەپرسی تۆ کێی؟ نەدەبوو ئەو پرسیارەش بکرێ کەس نەیدەویست خۆی ئاشکرا بکات، نەخۆ پاشان پیاوانی رژێم بیگرن، تەنانەت خەڵکی سەر بە رژێم و چەکدارەکانیش... هەروەها زۆر کەسایەتی ناسراو و ژمارەیەک لە خەڵکی عەینکاوە دەهاتن پارەیان دەدایە حاجی فازیلی باوکم تا لە جیاتی ئەوان لەسەر ئەنفالکراوەکان دابەشی بکات"[٢٤].

هەروەها حاجی سوارەی گردئارەق دەڵێ: "ئەوانەی یارمەتی ئەلفانکراوەکانی جەژنیکانیان نەداوە، تەنانەت لە هەولێریش کەمن، زۆر لە یارمەتییەکان دەدرانە حاجی فازیل ئاغای جەژنیکان، چونکە ئەو بە ئاشکرا و بێ ترس سەرپەرشتی ئەنفالکراوەکانی دەکرد"[٢٥].

سەرەڕای خەڵکی هەولێر، کوردی دڵسۆزو نیشتمان پەروەری دیکەش زۆر بوون لە شارەکانی موسڵ و بەغدادیش یارمەتییان بۆ ئەنفالکراوەکان دەهێنا لێرەکا یەک نموونە دەخەینە روو کە کاک زەێتۆ عبدالرزاق جەژنیکانی دەڵێ: "پیاوێک بە ناوی حاجی محەمەد ئەحمەد کە ماڵی لە موسڵ بوو لەگەڵ پیاوێکی دی ناوی حاجی حافیز بوو هاتنە لای باوکم.. دیار بوو چووبوونە جەژنیکان، بەڵام نەیانتوانیبوو پارە بەسەر خەڵکدا دابەش بکەن، بۆیە بڕی (٢٥٠٠٠) هەزار دیناری ئەوکات کە دەیکردە (٧٥٠٠٠) حەفتا و پێنج هەزار دۆلاریان دایە باوکم بەسەر ئەنفالکرداوەکان دابەشی بکات، باوکم هەندێک پارەی خۆشی هاویشتە سەرو چوو دابەشی کرد.

### ٤- هاوکاری دووکاندارەکانی هەولێر لەگەڵ ئەوانەی یارمەتییان بۆ جەژنیکان دەبرد

لەو دیمانانەی کە بۆ زانیاری وەرگرتن لەمەڕ بەهاناوەچوونی خەڵکی هەولێر بۆ ئەنفالکراوەکانی بادینان لە جەژنیکان ئەنجاممان داون، زۆریان باسی هاوکاری و هاریکاری دوکاندارو خودان کارگەو شوێنگەکان (محلات) دەکەن لەوانە.. کاک کاکل عوسمان دەڵێ: " دەچووینە هەر دوکانێک کە دەمانگوت ئەمە بۆ خەڵکی جەژنیکانە، ئەوانیش پشکی خۆیان دەخستە سەر.. بمانگوتایە (١٠٠) سەموونمان دەوێ، کابرای فرنی دەیکرد بە(٢٠٠) بۆ نموونە:

چووینە دوکانێک لە گەرەکی تەیراوەی هەولێر، ژمارەیەک (فانووس)مان کڕی، خاوەن دوکان خۆیشی (٣٠)سی دانەی دانایە سەر"(٢٦). کەچی کاک زریانی حاجی پاشا کە ئەو ماوەیە زۆر خەریک بووە بەکۆکردنەوەی زانیارییەکی زۆرتری لەم بارەوە هەیە و گوتی: "گەنجێکی گوندی بەحرکە" هاتەوە گوتی منداڵ زۆر دەمرن، ئێمەش ویستمان هۆکارەکەی بزانین، دیارکەوت لەبەر ئەوەی ئافرەتەکان ماوەیەک بوو لە دڵەڕاوکێی مەرگ و ژیان بوون، نانیان نەخواردبوو، خزم و کەس و کاریان گوللە باران و شوێن بزر کرابوون، شیریان لە مەمکاندا نەمابوو... بەڕاستیش منداڵێکی زۆریان پێ بوو، پێم باش بوو هەڵمەتێک بکەین بۆ شیرکڕین. بە حاجی پاشای باوکم و باپیرم گوت: "کە ئەوکات هەردووکیان لە ژیاندا مابوون"، وتیان بڕۆ بۆیان بکڕە.. ئەوکاتیش ئەزمەی شیر بوو، چەند دوکانداری هەولێر هەڵمەتێکی زۆر چاکیان کرد، ئەو هەموو شەکرو شیر و (٤٠٠) مەمەیان بۆ پەیدا کردن.. لەوانە: یەکێکییان ناوی ئەحمەد یاسین بوو، ئەو کات دۆڵدرمەی دەفرۆشت. یەکێکی دی ناوی حاجی یونس بوو(خوا لێی خۆش بیت) نەماوە، ئەو کات کارگەی فافۆنی هەبوو، یەک لۆری قاپ و قاچاغی نارده جەژنیکان.. شەکر کە بە بایەع دەدرا، دەست نەدەکەوت. چووم بۆ لای شەربەت فرۆشەکان، یەکێک کە ناوی خۆی پێ نەگوتم (وابزانم ناوی مەحمود بوو) و گوتی کوردم و بۆ کوردی دەکەم، بۆت پەیدای دەکەم بە مەرجێ یەک فلستان لێ وەرناگرم، لە ماوەی دوو ڕۆژان نزیکەی سەد فەردە شەکری پەیدا کرد، شەکرەکەمان بەرە بەرە گواستەوە گوندی بەحرکە لەگەڵ گەنجەکان، هەر پێنج کیلۆمان دەکردە ناو عەلاگەیەک و دابەشمان دەکرد(٢٧). خەڵکی هەولێر وا بەهانای خوشک و برا ئەنفالکراوەکانیانەوە چوون، بۆیە ناهەق نییە کە کاک زریان بڵێ (هەڵمەتی خەڵکی هەولێر لە مەزندەی کەسدا نەبوو، حکومەتی بەعسیشی تاساند.. دەڵێن لەو ڕۆژییەوە هەولێر گەمارۆی بەعسی شکاند.. وەک بەکوردەواری خۆمان دەڵێن (قەپۆزی شکاند)(٢٨).

٥- جۆری دیکەی یارمەتی

دیارە یارمەتییەکانی خەڵکی هەولێرو دەوروبەری هەر بەوە نەوەستاوە کە خۆراک و پێداویستییەکانی ژیانیان بۆ دابین بکەن، لەبەرئەوەش دابەشکردنەکە بە شێوەیەکی (رێکخراو)و لەلایەن دەستەو لیژنەی تایبەتی نەبووە، رەنگە خێزانی وا هەبووبن پێویستییان مابووبێ، یان ئەو بڕە پارەیەی دابەشیش کراوە دیسان بە مانگانەو بەر هەموو کەس نەکەوتووە. بۆ ئەوەی خەڵکەکە هان بدەن، بە تایبەتی ئەو پیاوانەی توانای کارکردنیان هەیە ئیشیان بۆ بدۆزنەوە و ژیانی خۆیان دابین بکەن، لەم بارەیەوە ژارۆ دهۆکی کە یەکێک بوو لە ئەنفالکراوەکانی بادینان لە جەژنیکان دەڵێ: " دەمێ ئەم چووینە هەولێرێ بۆ خۆ ل کارەکی بگەڕێین، ئێکسەر خودان کار خەڵکێ خۆیێ هەولێرێ ژکاری ڤەدکرن، ئەم وەر دگرتین و پارەکێ زێتر دا مە.."(٢٩).

سەبارت بەهاندانی خەڵکەکە بۆ ئیشکردن یاریدەدەری پزیشکی" کاک لوقمان بەڕێوەبەری بنکەی تەندروستی جەژنیکان لە دیدارێکی کورتدا گوتی: (ئەو کاتە من لە بنکەی تەندروستی گردەچاڵ بووم، لەگەڵ د. جاسم شێخانی، کە ئێستا لە دەرەوەی وڵاتە.. بیرۆکەیەکمان بۆ هات، با هانی ئەو خەڵکە بدەین بچن بۆ ئیشکردن، بۆیە ڕۆژانە لە بنکە پسوولەمان بۆ چەندین کەس دەکرد بەو بیانووەی پێویستییان بە پشکنینی پزیشکییە لە هەولێر، بەم پسوولەیە ڕێگای خەڵکیان دەدا دابەزن و تا ئێوارە بۆ خۆیان کاریان دەکرد، بەڵام پاش ماوەیەک لێمان ئاشکرا بوو، لە دائیرەی ئەمنی هەولێر گیراین). لە درێژەی گێڕانەوەی ئەم ڕووداوە دەڵێ: "دوای ئەوە یەکسەر لە وەزیفە دەربان کردین، تا دوای ڕاپەڕین".

سەبارەت بە یارمەتی پزیشکەکانی هەولێر هەر کاک لوقمان گوتی" زۆر لە دکتۆرەکان، داوای لێبوردن دەکەم ناوی هەموویانم لە بیر نییە، یارمەتی خەڵکە ئاوارەکانیان دەدا، پارەی پشکنین (فحص)یان لێ وەرنەدەگرتن، هەندێک پارەی دەرمانیشیان دەدانێ، و یارمەتی دی وەک پارە و کەلوپەلیشیان دەدانێ لەوانەی ناویانم لە بیرە (د. هیوا سەید

ئەحمەد دکتۆری چاو، د. جاسم شێخانی نوژدار، د. فەرهاد جەلیل خەیات (قورگ و لووت)، د. محەمەد شەهاب و دەیانی تر)[٣٠].

هەروەها لەو دیمانانەی کە لەگەڵ نموونەکانی توێژینەوە ئەنجامان داون زۆربیان باس لەوە دەکەن کە خەڵکی هەولێرو دەوروبەری ئیشیان بە ئافرەتەکانیش دەکرد لە کێڵگەو کارگەکان، بۆ ئەوەی پێویست نەبن هەر یارمەتی وەربگرن.

لە کۆی رای ئەوانەی شایەتحاڵی بەهاناوە چوونەکە بوون، یان خۆیان یارمەتییان بردووە، دەگەینە ئەو راستییەی کە ئەو پرسیارەمان هەڵە بووە کاتێ پرسیومانە (کێ یارمەتی داون؟ بەڵکو راستییەکەی ئەوەیە کێ یارمەتی نەداون؟ چونکە ئەو کەسانەی یارمەتی ئەنفالکراوەکانیان نەدابێ زۆر کەمن)، یەکێک لە هۆکارەکانی ئەمەش بۆ ئەو خەڵکە خۆبەخشە دەگەڕێتەوە، کە بەئوتۆمبێلی جۆراوجۆرو لۆرییان بە کۆڵانەکاندا دەسووڕانەوە و یارمەتییەکەیان کۆ دەکردەوە، ئەرکێکی زۆری ئەو خەڵکەیان کەم کردەوە کە رەنگە خۆیان نەیان توانیبێ، یان نەیان زانیوە چۆن یارمەتییەکە بگەیەنن. هەروەها دەگەینە ئەو راستییەش نەپرسین چییان بۆ دەبردن؟ بەڵکو لەمەودوا باشترە بڵێین چییان بۆ نەبردن؟ چونکە خەڵکی هەولێر لە ماڵی خۆی دەروانی چی پێویستە بۆ خۆیان، بۆ ئەوانیشیان دەبردن. دایکم (بەهیە محەمەد رەشید) هەموو جارێ دەگێڕێتەوە: "کە لۆری هاتە کۆڵانێ و گوتیان جەژنیکان.. جەژنیکان. منداڵەکان تەنەکەیەک رۆنی شکاو کە تازە بایی جەمە شیوێکی لێ دەرهاتبوو، وتیان ئەو تەنەکە شکاوە بیەن. گوتم: راوەستن! ئەوانە هەژار نین، ئەوانە لە سەر کوردایەتی لێیان قەوماوە، ئەو تەنەکە رۆنە ساغەیان بۆ بنێرن.

**پەراوێزەکان:**

١- رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ/ خۆرهەڵاتی ناوەڕاست/ تاوانی جینۆساید لە ئێراق/ و: جەمال میرزا عەزیز/ بەرلین ٢٠٠٢/ ل ٢١٧.
٢- ئەلبێرت کاموس/ ئامادەکاری راپۆرتەکەی ((میدل ایست ووچ/ حملة الانفال في كوردستان العراق/ تدمير قرية كوريمي/ ت: د. رزگار. دار آراس ٢٠٠٢/ اربيل ص٧.
٣- عەلی بەندی/ ئەنفالکرنا بەهدینان/ ب١/ دهۆک/ چاپخانەی خەبات ٢٠٠١. ل ٣.
٤- هەمان سەرچاوە. ل ١٠٥.
٥- میدل ایست ووچ/ سەرچاوەی پێشوو. ل ٧٨.
٦- عەلی بەندی/ سەرچاوەی پێشوو ل ١٠٨- ١٠٩.
٧- دیمانەیەکی هاوبەش لەگەڵ حاجی فازیل ئاغاو عەلی کوری لە رۆژی ٥/ ٥/ ٢٠٠٦- جەژنیکان.
٨- عەبدوڵا حاجی فازیل (دیمانە)/ ١٠/ ٥/ ٢٠٠٦ هەولێر.
٩- زریان حاجی پاشا بەحرکەیی (دیمانە) ١٠/ ٥/ ٢٠٠٦ هەولێر.
١٠- حاجی سوارە عوسمان ئاغا (دیمانە) ٥/ ٥/ ٢٠٠٦، هەولێر.
١١- دیمانەیەکی هاوبەش لەگەڵ حاجی فازیل ئاغا/ سەرچاوەی پێشوو..
١٢- دیمانە لەگەڵ مامۆستا مەلا تاهیری بەحرکە/ ١٢/ ٥/ ٢٠٠٦.
١٣- هەمان سەرچاوە.
١٤- زریانی حاجی پاشا/ سەرچاوەی پشوو.
١٥- کورتە دیمانەیەک لەگەڵ خاتوو ف. ت./ بەحرکە ٦/ ٥/ ٢٠٠٦.
١٦- حاجی سوارە عوسمان ئاغا/ سەرچاوەی پێشوو.
١٧- هەمان سەرچاوە.
١٨- کورتە دیمانەیەک لەگەڵ کاکل عوسمان گردعارەقی/ ٦/ ٥/ ٢٠٠٦. گرد ئارەق.
١٩- مامۆستا مەلا تاهیری بەحرکە/ سەرچاوەی پێشوو.
٢٠- دیمانە لەگەڵ خاتوو هەلالە. ع. م (مامۆستا) ٢٠/ ٥/ ٢٠٠٦ هەولێر.
٢١- دیمانە لەگەڵ کاک ئەحمەد سوارە رەسول/ ٥/ ٥/ ٢٠٠٦/ گرد ئارەق.
٢٢- هەمان سەرچاوە.
٢٣- زریان حاجی پاشا/ سەرچاوەی پێشوو.
٢٤- دیمانەیەکی هاوبەش لەگەڵ حاجی فازیل ئاغا/ سەرچاوەی

پێشوو.
٢٥- حاجی سوارە عوسمان ئاغا/ سەرچاوەی پێشوو.
٢٦- کاکل عوسمان/ سەرچاوەی پێشوو.
٢٧- زریان حاجی پاشا/ سەرچاوەی پێشوو.
٢٨- هەمان سەرچاوە.
٢٩- عەلی بەندی/ سەرچاوەی پێشوو. ل ١١٨.
٣٠- دیمانەیەکی کورت لەگەڵ د. لوقمان، ب. تیمارگەی جەژنیکان.

**بەشی چوارەم: رای ئەو خەڵکەی یارمەتی وەرگرتووە**

**١- تاماوین لە چاکەی خەڵکی هەولێر دەرناچین**

دیارە ئەو خەڵکانەی کۆمەکییان وەرگرتووە، هەموویان بە یەک دەنگ دەڵێن: (ئێمە هەتا ماوین لە چاکەی خەڵکی هەولێرو دەوروبەری و حاجی فازیل ئاغای جەژنیکان دەرناچین، ئەوان ئێمەیان لەمردن رزگار کرد). لەم بارەوە کاک (أ. ک) دەڵێ، (تا مانگی ئەیلولیش تەواو بوو، بەلێشاو یارمەتی و کۆمەک لە هەولێر و دەوروبەری بۆ خەڵکەکە دەهات، تەنها شەوی یەکەم ئێمە کەلوپەلمان نەبوو، بۆ رۆژی دوایی کۆمەکمان پێ گەیی، هەرچی ماڵ پێویستی بوو لە وانە ئاو بەجلیکان، نان، پێخۆر، دانەوێڵە بە هەموو جۆرەکانییەوە، نوێن و رایەخ، شیرو مەمەی منداڵان، شەکروچا، لانک و هەموو کەلوپەلێکی پێویست ئەمە سەرەڕای (پارە)ی نەغد، تەنانەت هەندێ سەرۆک جاشیش یارمەتییان دەهێنا!). هەروەها کاک (أ. ک) دەڵێ: " زۆربەی هەرەزۆری پێویستییەکانی خەڵک دابین کران و تەنانەت نایلۆن و حەسیرو داریش بۆ دروستکردنی شوێنی حەوانەوە هێنران.. خەڵکی هەولێر بە شێوازێکی دی یارمەتی ئەنفالکراوەکانی دەدا وەک: ئیشپێکردنیان لە کێڵگەو کارگەکان.

پارە وەرنەگرتنی پزیشکان لە کاتی چارەسەرکردن، هەروەها دوکاندارەکان بەردەوام پارەیان لێ وەرنەدەگرتن یان کەمیان وەردەگرت. هەروەها کاک (أ. ک) دەڵێ: "هەموو خەڵکی.. کە من یەکێک بووم لە ناویان، سەدان جار دەیانگوت تا ماوین لە چاکەی هەولێر دەرناچین"[1]. هەروەک مەلا ئەنوەر مەلا محەمەدی ئەنفالکراو دەڵێ: " بەراستی هەر دشەڤا ئێکێ دا خەڵکێ هەولێرێ خۆ بمە راگەهاندو ئەم ژ مرنێ رزگارکرین، شیاون خەمێن مە سڤک بکەن"[2]. هەروەها خاتوو وەجیهە ئەحمەد حاجیش دووپاتی دەکاتەوە کە "خەڵکی هەولێر ئەم ژ مرنێ رزگارکرین"[3].

خاتوو سەعدیە حامد لە مەڕ جۆری یارمەتییەکانی بۆ جەژنیکان دەبردران ل دیمانەیەکدا گوتی: " باسی چی بکەم، تەنها رۆژی یەکەم و دووەمان ناخۆش بوو، ئیتر هەموو شتێکمان بۆ هات.. نان، ئاو، بەفر، میوە، برنج و ساوار، شیرو مەمە، کەلوپەلی ناوماڵ، مەسینەو ئامان و لانک، چادرو دارو نایلۆن، نوێن و رایەخ، جلوبەرگ". لە درێژەی دیمانەکەدا ئەو خاتوونە دەڵێ: "هەر چەند بڵێی ناتوانی ئەو هاریکارییەی خەڵکی هەولێرو جەژنیکان و بەحرکە و گوندەکانی دی باس بکەی "هەروەها دەڵێ: (ئەوەی لە هەولێر کرا لە چ شارێکی دی کوردستان نەکراوە و باوەڕم وایە دووبارەش نابێتەوە، ئێمە بە ئاکرێ و دهۆک و شاری دیش داهاتین، لە دهۆک بووین کەسمان نەبینی یارمەتییەکمان بدات.. خەڵکی هەولێرێ ئیسپاتیان کرد کوردن و کوردینی دەکەن، ئازاو پەیتن، چاوی دوژمنیان شکاند)[4].

بەڵام خاتوو هیرێ عەبدولڕەزاق، خەڵکی گوێزێ، ئەو گوندەی (٩٦) پیاو و مێردمنداڵی لێ شوونبزر کراو ئێستاش خەمەکان بەسەر روویەوە ماون و لەگەڵ هەر پەیڤێکدا ئاهی خەم و حەسرەت لە دەروونییەوە دەردەچێ.. دەڵێ: (خەڵکی گوندی جەژنیکان و پاشان بەحرکە، زوو خواردن و ئاویان بۆ ئێمە هێنا، شەوی یەکەم نوێنمان نەبوو تا لە هەولێرەوە هانامان پێ گەیشت، شەوێک بێ نوێن و رایەخ بووین، بەدەستی جێی خۆمان خۆش کرد. رۆژی پاشتر زۆر زۆر شتیان بۆ هێناین لە نان و خۆراکەوە بگرە تا دەگاتە مەمەو شیرو لانک بۆ زارۆکان، چ جارا ئێمە ناتوانین چاکەی ئەوان بدەینەوە و سوپاسیان دەکەین ئێمەیان بە خودان کرد، ئەوان نەبایەن ئێمە هەموو دەمردین، کەس نەدەما)[5].

خاتوو مریەم ئەحمەدیش کە خەڵکی گوندی ئێکماڵەی دەڤەری بەری گارەیە لە دیمانەکەیدا دەڵێ: " ئێستاش هەر خۆشەویستی خەڵکی هەولێرە لە جەژنیکان ماوین، حکومەتی هەرێم هیچی بۆ نەکردووین، بەڵام خەڵکی هەولێر لەمردن رزگاری کردین.. چونکە ئەگەر خەڵکەکە بەهانامانەوە نەهاتبا هەموو لە برسان دەمردین".

هەروەها سەبارەت بەو کۆمەکەی پێیان گەیشتووە ئەو خاتوونە کۆست کەوتووە کە دایکی (گولستان)ی باوک ئەنفالکراوەو رۆژی پێش شالاوەکەی بادینان لەئێکماڵە لە دایک بووەو ئێستا قوتابییە، واتە تەمەنی هێشتا هەفتەیەک نەبوو کە ئەنفالکران و ئێستا تەمەنی (١٨) ساڵە.. ئەو خاتوونە دەڵێ: "هەر ئەو شەوە خواردنیان بۆ هێناین لەوانە.. دۆڵمە، برنجە سۆر، سندووقە تەماتە، میوە، ئاڤک (شلە) و گۆشت، ئامان، هەروەها جلوبەرگ و نوێنیان بۆ هێناین، ئەوەی کەم بوو تەنها پارە بوو"(٦). ژنێکی سەلاری دیکەی دەڤەری بادینان و خەڵکی گوندی چەمی چاڵ بە ناوی فاتیمە ساڵح رووداوێکی خۆیمان بۆ دەگێرێتەوە، رێک لەگەڵ یارمەتی و بەتەنگەوە هاتنی پزیشکانی هەولێرو یاریدەدەرەکانیان و نەخۆشخانانی هەولێر یەکدی دەگرێتەوە کە یاریدەدەری پزیشکی کاک لوقمان لە بەشی پێشتر باسی کرد.. فاتیمە خان دەڵێ: "سەرەتا کە رژێم هێرشی هێنا، کیمیای لێداین و کاریگەری لەسەرمان ما، کە گەیشتینە جەژنیکان من گەلێ نەخۆش بووم، بردمیانە نەخۆشخانە، لێیان پرسیم چیتە؟ گوتم: کیمیایان لێداوم.. من نەمزانی ئەمە خراپەو نابێت وابڵێم، ئەو کاتە ئافرەتێکی عارەب لەوێ پزیشک بوو گوتی.، پێویستە بیبەن و منیان راکێشا ببەن، ئەو کاتە دکتۆرو سستەرە کوردەکان هەموو هاتنە وەلام و گوتیان وای نەگوتووە، ئەو پزیشکە ژنە بەهەڵە لێی گەیشتووە، بەزۆر نەیانهێشت ببەن، ئەگینا عارەبی دیش هاتن.. ئەو ژنە پزیشکە وای لە زۆر خەڵکی دیکەش کردبوو."(٧). کەچی سەبارەت بە بەهاناوەچوونی خەڵکی هەولێر فاتیمە خان دەڵێ: "کە گەیشتین پێش نیوەرۆ، وەجبەی ئەوان گەیشتبوونە جەژنیکان نەیانهێشت بگاتە نیوەرۆ هەموو خواردنێکیان بۆ هێنییاین، بەڵام خەڵکەکە هێندە زۆر بوو دەرەقەت نەدەهاتن، ئەو دەم برنج و شلەو نانیان بۆ هێناین، خودا دەزانێ یارمەتییەکی زۆر باشیان داین..."(٨).

بۆ وەرگرتنی رای پتر دیمانەیەکمان لەگەڵ کاک نەبەز ئورفەیی کرد(٩) دەڵێ: "ئەو ماوەیەی لە ئۆردوگا ماینەوە بەردەوام یارمەتی دەهات، بۆ ماوەی دوو رۆژان رژێم زۆر هەولیدا خەڵکی یارمەتی نەهێنێت، خەڵک بە قاچاغەرێ، یان شەوان بەنهێنی دەیان هێنا". هەروەها دەڵێ: "هەموو شت دەهات، خواردن، کەلوپەل، پێداویستی ماڵ و ئافرەتان، بەڵام بەهێزی و بێهێزی لە دابەشکردندا هەبوو ئەوەی توانای جەستەیی زۆرتر بوو زۆرتری وەردەگرت، ئێمەی پێشمەرگە (کە سەڵت بوون) کەلوپەلێکمان وەردەگرت، یان لەماڵی هەڤالانی هەولێرەوە بۆمان دەهات، دەماندایە ئەوانەی بەریان نەکەوتبوو، تەنانەت هەر شەوی یەکەم من و دلشادو سالاری هەڤالمان یەکەو بەتانییەکمان هەبوو، ئەویشمان دایە ماڵێک کە منداڵەکانی لە سەرمان دەگریان"(١٠) کاک دلشادی هەڤاڵی نەبەزیش کە خەڵکی کۆیێیە، لە مەڕ یارمەتییەکانی خەڵکی هەولێر دەڵێ: "خەڵکی هەولێر.. جا چ لە رووی نیشتمانی و کوردایەتییەوە بێت، یان ئایینی، هەرچی لە دەستیان هات یارمەتییان دا، دەتوانم بڵێم خەڵکەکە هەموو ماڵیان بۆ خۆ دانایەوە لە کەلوپەلەوە بگرە تا دەگاتە جلوبەرگ، بەڵام لەمەدا جیاوازییەکی دی دەرکەوت لە نێوان ئەوانەی برێک پارەی حەشاردراوی هەبوو. ئەوانەش بێ پارە بوون"(١١).

ئەگەر بە شێوەیەکی سەرپێیش بێت، بەراوردێک بکەین لە نێوان قسەکانی ئەوانەی شایەتحاڵی یارمەتیدانەکە بوون، لەگەڵ ئاخافتنی ئەوانەی یارمەتییان وەرگرتووە، لێکچوونێکی تەواو هەیەو پتر لە ٩٠٪ی رایەکانی هەردوو لایان یەکتر دەگرنەوەو هاوجووتن، بەمەش دیار دەکەوا کە هەڵمەتەکەی فریاکەوتن سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێناوەو بۆتە داستانێکی نیشتمانی مێژوویی لە هاریکاری

کۆمەلآیەتی و سیاسی نێوان تاکەکانی یەک کۆمەڵگەو پتر لە (٢٠٠٠٠) بیست هەزار مرۆڤی لە مردن و رووخانی دەروونی و هەڵوەشانەوەی کۆمەڵآیەتی و داماڵین لە دابونەریتە رەسەنەکانی کوردەواری رزگار کرد.

**٢- هۆکارەکانی بەهاناوەچوون**

سەبارەت بەو هۆکارانەی بوونە هاندەر بۆ ئەوەی خەڵکەکە دەست بەو هەڵمەتە بکات، یەکێک بوو لەو پرسیارانەی ئاراستەی ئەو نموونانەمان کردووە کە شایەتحاڵی یارمەتیدانەکە بوون یان خۆیان یارمەتییان دابوون. بۆیە هەولدەدەین رای یەکە یەکەی نموونەکان بە کورتی بخەینە روو. سەرەتا بەڕای مامۆستا مەلا تاهیری بەحرکە.. هۆکارەکان بریتین لە:

یەکەم: گەلی کورد گەلێکی خواناس و ئاییندارو بە بەزەییە.

دووەم: هەڵوێستێکی کوردایەتی بوو.. چونکە ئەوانەی لێیان قەومابوو لەبەر کوردبوونیان و هەڵوێستی کوردانەیان وایان بەسەرهاتبوو.

سێیەم: هەڵوێستی خەڵکەکە بۆ دژایەتیکردنی رژێم بوو[١٢].

کاک عەلی حاجی فازیل چەژنیکانیش دەڵێ: ئەو یارمەتیدانە زۆر هۆکاری هەبوون.. لەوانە:

١- هۆکاری نەتەوەیی.
٢- ئەرکی ئینسانی و خێرخوازی.
٣- لە رقی رژێم وەک بەگژداچوونەوە و بەرەنگاربوونەوەیەکی سیاسەتی رژێم[١٣].

دیارە ئەم دوو رایە لێک نزیکن خاتوو هەلآڵەش لەم بارەوە دەڵێ:

یەکەم: کوردایەتی و هاوچارەنووسی
دووەم: ئاینی
سێیەم: مرۆڤایەتی
چوارەم: هەولێر بە یارمەتیدانی خەڵکی لێقەوماو بەناوبانگە[١٤].

٤/ (عەبدوڵا حاجی فازیل) یش بەم شێوەیە هۆکارەکان پۆلین دەکات:

یەکەم: نەتەوەیی.
دووەم: ئایینی.
سێیەم: دابونەریتی رەسەنی خەڵکی هەولێر[١٥].

٥/ کاک زریان حاجی پاشا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە:

١- هۆکاری سەرەکی یارمەتیدان گیانی کوردایەتی بوو.
٢- هەروەها هۆی ئایینی هەبوو.
٣- کاتی ئەنفالەکان بوو خەڵک لە دوژمن زۆر پەست بوو، رەتکردنەوەی بەعس بوو، بۆ ئەوە بوو بڵێین کورد ماوە[١٦].

٦/ کاک (أ. ک)ی پێشمەرگە، بەشێوەیەکی وردتر هۆکارەکان دەستنیشان دەکات:

١- یارمەتیدانی خەڵکی غەریب و لێقەوماو وەک کارێکی ئینسانی سروشتی خەڵکی هەولێرو دەوروبەریەتی.
٢- هەستی نەتەوەیی و کوردینی.
٣- گەورەیی کارەساتەکانی ئەنفال بەردی بەدەنگ دەهێنا.
٤- شێوازێک بوو لە رەتکردنەوەی دەسەڵآتی رژێم و بەرەنگاربوونەوەی.
٥- دەکرێت بە بەشێک لە چاولێکەری دابنرێ[١٧].

کاک ئەحمەد سوارە رەسوڵ، بەم شێوەیە باس لە هۆکارەکان دەکات:

١- کوردایەتی.
٢- نەریتی خەڵکی هەولێر[١٨].

کەچی خاتوو فاتیمە سالح دەڵێت:

١- ئێمەش وەک ئەوان کورد بووین، واتە لایەنی نەتەوەیی.
٢- مرۆڤ بووین، واتە لایەنی مرۆیی.
٣- موسڵمان بووین، واتە لایەنی ئایینی.
٤- خەڵکی هەولێر بە ناندان و یارمەتیدەرو جوامێری بەناوبانگن[١٩].

هەروەها خاتوو سەعدیە حامد رای وایە هۆکارەکان ئەمانەی خوارەوە بوون:

١- هۆکاری نەتەوەیی.
٢- خەڵکی هەولێر یارمەتی لێقەوماوان دەدەن[٢٠].

کەچی مریەم ئەحمەدیش پێی وایە هۆکارەکان..

١- کوردینی، واتە نەتەوەیی.
٢- خەڵکی هەولێر بە یارمەتیدانی لێقەوماوان بەناوبانگن.
٣- شۆڕشگێڕن، واتە لایەنی

دژایەتیکردنی ڕژێم دەگرێتەوە[٢١].

خاتوو هێرۆ عەبدولرەزاقیش هەمان رای مریەم ئەحمەدی هەیە کە بریتییە لە:

١- کوردینی.

٢- خەڵکی هەولێر یارمەتی لێقەوماوان دەدەن.

٣- شۆڕشگێڕی[٢٢].

هەروەها کاک نەبەز ئورفەیی هۆکارەکان بەم شێوەیە دەستنیشان دەکات:

١- (نەتەوەیی)

٢- مرۆڤایەتی.

٣- نەریتی خەڵکی هەولێر[٢٣].

بەڵام کاک حاجی سوارەی گردئارەق بە کورتی و بە کوردی دەڵێ هۆکارەکە کوردایەتی بوو[٢٤].

دوا کەس کە کاک دڵشاد حوسێنە دەڵێ هۆکارەکانی یارمەتیدانی خەڵکی هەولێر بۆ ئەنفالکراوەکان لە جەژنیکان بریتین لە:

١- کوردایەتی.

٢- مرۆڤایەتی.

٣- نەریتی خەڵکی هەولێر.

٤- دژایەتیکردنی ڕژێم[٢٥]

- لێرەدا دەگەینە ئەو ئەنجامەی:

١- سەبارەت بە هۆکاری نەتەوەیی: دیارە هەر شەش کەسەکە رایان وەک یەکە. واتە (١٤) لە (١٤).

٢- هۆکاری ئایینی: لە (١٤) کەس (٦)یان رایان وەک یەک بوو، واتە (٦) لە (١٤).

٣- بەرەنگاربوونەوەی سیاسەتی ڕژێم و دژایەتی نواندن لە بەرانبەری.. لە (١٤) رایەکە، (٧)یان ئەم هۆکارەیان ئاماژە پێداوە.. واتە (٧) لە (١٤).

٤- هۆکاری ئینسانی: دیارە لەو (١٤) رایە (٦) یان ئاماژەیان بە ویژدان و هۆکاری ئینسانی کردووە.

٥- هۆکاری خەڵکی هەولێر بە یارمەتیدانی غەریب و لێقەوماو بەناوبانگە.. وەک کلتووورو نەریت، لە (١٤) کەس (١٣) نموونە ئاماژەیان پێکردووە، واتە (١٣) لە (١٤).

بەڵام تەنها کاک (ا. ک) ئاماژەی بە خاڵێکی گرنگ داوە کە (چاولێکەری) بووە. دیارە ئەمەش تەواوە، چونکە وەک پێشتر ئاماژەمان پێکردووە، چاولێکەری دەچێتە خانەی (کۆ رەفتاری کۆمەڵایەتی).

لە ئەنجامدا دەگەینە ئەو رایەی هۆکارەکان بەم شێوەیە پۆلێن بکەین:

١- هۆکاری نەتەوەیی.

٢- هۆکاری نەریتی خەڵکی هەولێر بۆ یارمەتیدانی لێقەوماو و غەریبە.

٣- هۆکاری بەرەنگاربوونەوە و دژایەتی ڕژێم.

٤- هۆکاری ئایینی، هەروەها هۆکاری ئینسانی.

٥- هۆکاری چاولێکەری، یان کۆ رەفتاری کۆمەڵایەتی.

**٣- هەڵمەتی بەهاناوەچوونەکە چی لێکەوتەوە؟**

وەک لە بەشەکانی پێشەوە پتر لە جارێک ئاماژەمان پێکرد، هەڵمەتی بەهاناوەچوونی خەڵکی هەولێر دەوروبەری بۆ ئەنفالکراوەکانی جەژنیکان سەرکەوتنێکی گەورەی گەلی کوردستان بوو، داستانێکە پێویستە لە مێژووی بزاڤی رزگاریخوازی کوردستانیدا بە ئاوی زێڕ بنووسرێتەوە، چونکە سەرهەڵدانێک بوو: لە کاتێکدا:

١- حکومەتی بەعسی ئێراق شاڵاوەکانی ئەنفالکردنی خەڵکی کوردستانی تەواو کردبوو، سەرکەوتنیشی بەدەست هێنابوو، بەو سەرکەوتنانە مەست و سەرخۆش بوو.

٢- شەڕی ٨ساڵەی نێوان ئێراق- ئێران تەواو ببوو، چونکە ئەو ئامانجەی کە ئێراق شەڕی بۆ هەڵگیرساندبوو بریتی بوو لەوەی نەهێڵێ شۆڕشی ئیسلامی بەسەر پێ بکەوێ و بەرەو وڵاتانی عەرەب و ئیسلامی تەشەنە بکات، هاتە جێ.. هەرچەندە ئامانجەکە، ئامانجی ئێراق نەبوو بە تەنیا، بەڵکو ئامانجی سەرانی عەرەب و رۆژئاواو بلۆکی رۆژهەڵاتیش بوو لە ئەو کات.

٣- هەموو وڵاتانی جیهان و موسڵمانانیش بەرامبەر ئەو سیاسەتەی بەعس دژ بە گەلی کوردستان وەک کیمیاباران و راگواستن و بەعەرەبکردن و ئەنفال و

کوشت و بڕ خۆیان لە گێلی دابوو، تەنانەت ڕژێمی ئێراق خۆیشی لەو بێدەنگییەی جیهان سەرسام ببوو.

لەوکات و ساتە ناسکەدا هەڵمەتی فریاکەوتنی خەڵکی هەولێر بۆ ئەنفاکراوەکان لەجەژنیکان و بەرەنگاربوونەوەی ڕژێمێکی وا دڕندەی دەست بەرەڵاکراو، کارێکی ئاسان نەبوو.

بۆیە ئەو بەهاناوەچوونە چەند ڕەهەندێکی لێکەوتەوە.. لەوانە:

١- لە ڕووی گۆڕینی سیاسەتی سەرکوتکارانەی حکومەتی بەعسی ئێراق

لە هێنانی ئەنفالکراوەکانی بادینان بۆ دەوروبەری هەولێر بە (٤) خاڵ مەبەستەکەمان ڕوون کردۆتەوە، کە بریتی بوون لە برسان مردن و چاوشکاندنی خەڵکی هەولێرو کۆکردنەوەی خەڵک لەبن دەستی خۆیان و، بەکارهێنانیان بۆ مەبەستی جیاجیا.. بۆ ئەم مەبەستەش زوو ئاگاداری موختارو سەرۆک جاش و کەسایەتییەکانی هەولێرو دەوروبەری کردنەوە، کە کەس نابێت یارمەتییان بدات، کاتێکیش خەڵکێک ئەو بڕیارەی ڕژێمی شکاند، زۆری لێ گرتن و ئازاری دان. بەڵام ڕاپەڕینی خەڵکەکە پێکڤە بە بەشداری ژمارەیەک لە سەرۆک جاش و چەکدارانی خودی ڕژێمەوەش، پیاوانی بەعسی خستە بەردەم دووڕیانییەک.. یان دەبێ خۆ لە یارمەتیدانی خەڵکەکە بۆ ئەنفالکراوەکان گێل بکەن، یاخود دەبێت ڕێگەکان بگرن و پەنا ببەنە بەر هێزی سەربازی، ئەو کاتەش دوور نییە ڕاپەڕینێکی جەماوەری ڕوو بدات، بۆیە بە ناچاری ڕێگەی نەرمی نواندنیان گرتەبەرو لەو بڕیارە پەشیمان بوونەوە کە دەری کردبوو: "نابێ کەس یارمەتییان بدات و بۆ ئەوە هێناومانە ئێرە تا لە برسان بمرن"[٢٦]. بەمەش دیارە حکومەت قەپۆزی شکاو ملکەچی ئیرادەی خەڵکی هەولێر بوو.

٢- لە ڕووی ڕزگارکردنی ئەنفالکراوەکان لە مردن:

دیارە هەڵمەتی بەهاناوەچوونەکە هێندە خێراو چڕو زۆر بوو، هیچ بوارێکی بۆ برسیبوون و بەدخۆراکی نەهێشتەوە لە ماوەیەکی کەمدا توانرا قەرەبووی ئەو نەبوونی و کەمی و بەدخۆراکییە بکرێتەوە کە خەڵکەکە لە چیا و لە کاتی هەڵاتن و خۆحەشاردان و پاشگرتنیان لە قەڵا سەربازییەکان تووشی هاتبوون، پاش ماوەیەکی کەم نەک مردن بەڵکو بووژانەوەو هێز و توانای جەستەییان هاتەوەبەر. ئەمە لە لایەک، لە لایەکی دیکەوە حکومەتی بەعس تێگەیشت گیانی کوردایەتی و باوەڕی ئایینی و ئیرادەی بەرەنگاربوونەوەو هەستی دژایەتیکردنی ڕژێم و نەریتی فریاکەوتنی هەولێرییان بۆ لێقەومان هەر ماوە و پێویستە بە سیاسەتی خۆیدا بچێتەوە.

٣- لە ڕووی بەرزکردنەوەی وورەی خەڵک:

ئەنفالکراوەکان تا نەگەیشتنە جەژنیکان و بەچاوی خۆیان ئەو هەڵمەتەی فریاکەوتنیان لە خەڵکی هەولێرو دەوروبەرییەوە نەبینی، لە ژیان بێ هیوا بوون و پێیان وابوو چارەنووسی ئەوانیش وەک خەڵکی دەڤەرەکانی دۆڵی جافان و قەرەداغ و گەرمیان و دەشتەکانی شوان و شێخ بزێنی و کۆیەو خۆشناوەتی و ڕەواندز ئەنفالکردن و زیندەبەچاڵکردنە لە بیابانەکانی خوارووە.

هەروەها بەو هۆیەی تەنیا بە جلکی بەری لەسەر ماڵ و موڵک و زێدی خۆیان هەڵکەنرابوون و باوک و براو کەس و کاریان گوللە باران و شوونبزر کرابوون و هێندە هێزە سەرکوتکارەکانی بەعس ئیهانەیان کردبوون، وردیان بە تەواوی دابەزیبوو. هەڵمەتی بەرەنگاربوونەوەی سیاسەتی ڕژێم و بەهاناوەچوونی ئەنفالکراوەکان لەلایەن خەڵکی هەولێرەوە نەک هەر هیوای بە ژیان لای خەڵکی بادینان ژیاندەوە، بەڵکە وورەی خەڵکی کوردستانی بەگشتی بەرز کردەوە و سەلماندی هێشتا کورد ماوە و گەر یەکگرتوو و هاوکار بێت دەتوانێ کاری مەزن بکات.

٤- لە ڕووی پتەوکردنی گیانی هاوکاری و هاریکاری نێوان کورد:

حکومەتی بەعسی ئێراق لە ماوەی (٢٠) ساڵی حوکمی خۆیدا (١٩٦٨- ١٩٨٨) هەوڵی زۆری دابوو شیرازە و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و کلتووری کوردەواری لە بەریەک هەڵوەشێنێ،

بە تایبەتی دیوارێکی وێنەی (دیواری بەرلین) لە نێوان خەڵکی (سۆران) و (بادینان) دروست بکات. پێشی وابوو سیاسەتەکەیان تا ئاستێکی باش سەرکەوتوو بووە، بەڵام لە هەردەم لەناکاو تەقینەوەی خەڵکی هەولێر بێ ئاگا بوو.. هێنانی ئەنفالکراوەکان بۆ دەوروبەری هەولێر، نەک چاوی خەڵکی پارێزگای هەولێری پێ نەشکا، بەڵکو بووە هۆکارو هاندەرێک گۆمی تووڕەیی خەڵک پتر بشڵەقێ و شێوازی بەرەنگاربوونەوە و (تەحەدا) کردن وەربگرێ. هەڵمەتەکە.. یەکێک لە هۆکارەکانی ئەو بەرەنگاربوونەوەیە بوو کە جارێکی دی گیانی هاریکاری و هاوکاری لە نێوان خەڵکی سۆران و بادینان لە لایەک و خەڵکی هەولێریش لە نێوان خۆیاندا پەرە پێدا. هەولێرییەکان لەگەڵ جیاوازی بیروباوەڕی سیاسی و حزبییان، لەگەڵ جیاوازی چینایەتی و پلەو پایەی کۆمەڵایەتییەکان، پێکڤە رابوون و هەر کەسە بە پێی توانای ماددی خۆی بوونە یەک کۆمۆنە.

تەنانەت ئەوانەش پیاوی بەعس و چەکداری رژێم بوون بەشێکیان لەم هەڵمەتە بێبەری نەبوون و هاوڕێ لەگەڵ رۆڵەکانی گەلەکەیان بەشدارییان کرد.

**پەراوێزەکان:**

١- دیانە لەگەڵ کاک ا. ک (پێشمەرگە)، ١٣/ ٤/ ٢٠٠٦، هەولێر

٢- عەلی بەندی/ ئەنفالکرنا بەهدینان/ ب١/ دهۆک، ل٢٠٠.

٣- هەمان سەرچاوە/ ل١٦٧.

٤- دیانە لەگەڵ خاتوو سەعدیە حامد لە ٢٠/ ٤/ ٢٠٠٦، هەولێر.

٥- دیانە لەگەڵ خاتوو هیرێ عەبدولڕەزاق/ ٩/ ٥/ ٢٠٠٦ جەژنیکان.

٦- دیانە لەگەڵ خاتوو مریەم ئەحمەد لە ٩/ ٥/ ٢٠٠٦، جەژنیکان.

٧- دیانە لەگەڵ خاتوو فاتیمە سالح/ ٩/ ٥/ ٢٠٠٦، جەژنیکان.

٨- هەمان سەرچاوە.

٩- دیانە لەگەڵ کاک نەبەز ئورفەیی/ هەولێر

(ناوبراو خەڵکی باکووری کوردستان و شاری ئورفەیە، ئەو کات پێشمەرگەی حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان بوو، پاش نزیکەی (٢٠) رۆژ مانەوە لە شاخ لە دەڤەری گارە لە سەردەستی سەرۆک جاشێک کە بەڵێنیان پێدەدان ناکوژرێن و دەنێردرێنە جەژنیکان و دەتوانن لەوێ پەیوەندی بە پێشمەرگەوە بکەن، لەگەڵ دوو هەڤاڵی دیکەی خۆ دەدەنە دەست و نەبەز ماوەی ١٢ رۆژێک لە ئۆردوگا دەمێنێتەوە، پاشان لەگەڵ دڵشاد حوسێنی هەڤاڵی لە ناوچەی خەیلانییان بە یارمەتی هەڤاڵانی رێکخستنەکانی ناوشار پەیوەندی بە مەفرەزەیەکی حزبەکەیان دەکەنەوە).

١٠- دیانە لەگەڵ کاک نەبەز ئورفەیی (پێشمەرگە)/ ١٨/ ٥/ ٢٠٠٦، هەولێر.

١١- دیانە لەگەڵ کاک دڵشاد حوسێن (پێشمەرگە)/ ١٩/ ٥/ ٢٠٠٦، کۆیێ.

١٢- دیانە لەگەڵ مامۆستا مەلا تاهیری بەحرکە/ ١٢/ ٥/ ٢٠٠٦، بەحرکە.

١٣- دیانە لەگەڵ بەڕێز حاجی فازیل ئاغای جەژنیکانی/ ٥/ ٥/ ٢٠٠٦، جەژنیکان.

١٤- دیانە لەگەڵ خاتوو هەلالە/ ٢٠/ ٥/ ٢٠٠٦ هەولێر.

١٥- دیانە لەگەڵ کاک عەبدوڵای حاجی فازیل/ ٩/ ٥/ ٢٠٠٦ هەولێر.

١٦- دیانە لەگەڵ کاک زریان حاجی پاشا/ ٩/ ٥/ ٢٠٠٦، هەولێر.

١٧- دیانە لەگەڵ کاک (ا. ک) سەرچاوەی پێشوو.

١٨- دیانە لەگەڵ کاک ئەحمەد سوارە رەسوڵ/ ٥/ ٥/ ٢٠٠٦، گردناڕەق.

١٩- دیانە لەگەڵ خاتوو فاتیمە سالح حامد، سەرچاوەی پێشوو.

٢٠- دیانە لەگەڵ خاتوو سەعدیە حامد/ سەرچاوەی پێشوو.

٢١- دیانە لەگەڵ خاتوو مریەم ئەحمەد/ سەرچاوەی پێشوو.

٢٢- دیانە لەگەڵ خاتوو هیرێ عەبدولڕەزاق/ سەرچاوەی پێشوو.

٢٣- دیانە لەگەڵ کاک نەبەز ئورفەیی/ سەرچاوەی پێشوو.

٢٤- دیانە لەگەڵ حاجی سوارەی عوسمان ئاغا/ ٥/ ٥/ ٢٠٠٦، گردناڕەق.

٢٥- دیانە لەگەڵ کاک دڵشاد حوسێن/ سەرچاوەی پێشوو.

٢٦- دیانە لەگەڵ کاک عەبدوڵای حاجی فازیل/ سەرچاوەی پێشوو.

# خەڵکی هەولێر
# چییان بۆ کەسوکاری ئەنفالی بارزانییەکان کرد

ئاراز جەلال- زیرەک عەبدوڵڵا

(١)

لە ژێر سێبەری دیواری مزگەوتی (حاجی جەواد) لەسەر رێگای گشتی گەڕەکی کوردستانی شاری هەولێر دانیشتووە، جەمەدانییەکی لەسەر بەستووە، گۆچانێکی لەتەنیشت قاچییەوە داناوە، جگەرەیەکی پێکردووە و بەدەستی چەپی گرتوویەتی، ئەوەندە بەهێز قوم لە جگەرەکە دەدات و هەناسەی پڕ لە دووکەڵ هەڵدەکێشێت وەک ئەوەی لە پرسەی مردنی کەسێکی زۆر خۆشەویستی دانیشتبێت وایە، دەڵێت "وام دەزانی جەرگەکانی خۆمن دەربەدەر و بێکەس بوون"، ئەوە قسەی (بایز عەزیز)ە، ئەو کە تەمەنی (٧٥) ساڵە و (٨) منداڵی هەیە، دانیشتووی گەڕەکی کوردستانە، خاوەنی کەسایەتییەکی بەهێزە و لەنێو هاوڕێیانی رێزێکی زۆری دەگیرێت و بە (مام بایز) ناسراوە، کاتێک ئەو قسە دەکات ئەوانی دیکە تەنها گوێ دەگرن، ئەمەش لەبەرئەوەی وەک خۆی ئاماژەی پێدەکات خاوەنی ئەزموونێکی دەوڵەمەندە و دنیادیدەیە، ئەو ئەم قسەیەی لەبارەی کەسوکاری کەسانی ئەنفالکراو کرد، کە لە رێکەوتی (١٩٨٣/٧/٣١) لەلایەن رژێمی بەعسەوە لە ناحیەی قوشتەپە، بەتایبەتی هەردوو کۆمەڵگای (قادسیە و قودس) ئەنفال کران.

ئەو باس لەو کاتە دەکات کە لە شاری هەولێر کەلوپەل و یارمەتییان بۆ کەسانی ئەنفالکراوی بارزانییەکان و خورشیدییەکان و شێروانییەکان و مزووریەکان کۆدەکردەوە، کە هەمووی ئەمانە لەلایەن زۆربەی زۆری خەڵکی هەولێر لەو کاتەدا بە بارزانییەکان ناسرابوون، "ئێمە نازانین ئەوانە خورشیدین یا مزووری یا ئەوانی دیکە، تەنها دەمانگوت بارزانین"، ناوبراو جەخت لەوە دەکاتەوە کە لەوکاتەدا خەڵکی هەولێر وەکو سروشتی مرۆڤدۆستانە و هەژاردۆستانەی خۆیان یارمەتییەکی گەلێک زۆری ئەو لێقەوماوانەیان دەدا و وتی "بە هەموو شێوەیەک پارە و مارمان لۆ خڕ دەکردنەوە و هەر کەسێک پێویستی هەبایە دەماندایێ"، وتیشی "تەنها لەبۆ ئەوەی شتمان نەدەدانێ کە موسڵمان و لێقەوماون، لەبۆ ئەوەش بوو کە کوردن و نەوەی مەلا مستەفان، لەبەرئەوە هەرچییەکیان بویستبا ئەمن دەمدانێ".

مام بایز یەکێکە لەو هەزار کەسە هەولێرییانەی کەوا لە ساڵانی (٨٠)کان یارمەتییەکی زۆری کەسوکاری ئەنفالکراوەکانیان داوە، ئەوانەی بە بارزانییەکان ناوزەد دەکران.

لە رێکەوتی (١٩٨٣/٧/٣١) رژێمی بەعسی رووخاو لە هەردوو کۆمەڵگای بە زۆر (قادسیە و قودس)ی سەر بە ناحیەی قوشتەپە، ژمارەیەکی زۆر رەگەزی نێری ئەو (٢) کۆمەڵگایە، ئەوانەی تەمەنیان لە سەرووی (١٥) ساڵییەوە بوو برد، ئەوان وەکو زۆر لە خەڵکانی دیکەی ئەنفالکراوی ناوچەکانی دیکەی کوردستان، وەکو هەریر و رەواندز و ناوچەکانی گەرمیان و بادینان...هتد ئەنفال و شوێنبزر کران، تا ئێستاش تەنها روفاتی (٥٠٤) لە بارزانییەکان دۆزراوەتەوە، ئەوانی دیکە نادیارن، هەرچەندە ئەنفالکراوەکان لە پاش خۆیاندا کەسانێکی بێناز و بێلانەیان جێهێشت، بەڵام خەڵکانی

ناوچەکانی دیکەی کوردستان، هەولێر وەک پێشەنگ یارمەتی زۆری کەسوکاری ئەنفالکراوانیان داوە.

"بەلۆری کەلوپەلمان لۆ بارزانییەکانی جەژنیکان خڕ دەکردەوە و هەموو جارێکیش پارەم دەدایە ژن و منداڵە بارزانییەکان"، (یوسف محەمەد)ی تەمەن (٤٥) ساڵ وای وت. ئەو لەناو بازاڕی قەیسەری شاری هەولێر دووکانی هەیە، دەڵێت کەوا هەرچەندە لە ترسی حکومەتی بەعس نەیاندەوێرا بە ئاشکرا کەلوپەل و شتومەک بدەنە کەسوکاری ئەنفالکراوەکان، بەڵام "زۆر جار برنج و روون و ئاردم دەکردە ناو عەلاگەیەکی رەش و بەدزی دەمدانێ"، ئەو ئاماژە بەوە دەکات لەوکاتەدا هەموو کەسێک نەیدەوێرا بەئاشکرا یارمەتی کەسوکاری ئەنفالکراو بدات، ئەمەش لە ترسی پیاوانی هەواڵگری و جاسووسی دامەزراوەی ئەمنی حکومەت.

(مامەند رەسول)ی تەمەن (٤٣) ساڵ و خاوەنی (٦) منداڵ وتی "کاتێک ئەوانم دەدیت جەرگم ژانی دەکرد، زۆرجار پارەم دەدا منداڵەکان و بەعەلاگەش شتم دەدا ژنەکان"، ئەو دەڵێت هەندێک جار لە هەڵسوکەوتی هەندێک کەس رازی نەدەبوو، کە بەخراپ باسی ئافرەتەکانی دەکرد، یان رەفتاری ناشیرینی لە بەرامبەر دەنواندن "چەند جار لەسەریان بەشەرهاتووم، دەمگوت ئەگەر یەکێک لێی بقەومێت نابێت خەڵک ئیستغلالی بکات".

"ئەگەر خوا پێی ناخۆش نەبێت بیڵێم زۆرجار یارمەتی ئەو ژن و منداڵانەم داوە"، (مستەفا ئەبوبەکر)ی تەمەن (٥١) ساڵ وای وت "هەر جارەی شتێکم دەدانێ هەستم بە ناڕەحەتی دەکرد، دەمگوت بۆ شتێکی باشترم نەدایێ". ئەو ئەوان بە کەسوکاری خۆی دەزانێت، هیچ جیاوازییان پێناکات لەگەڵ خزمەکانی خۆی، هەروەکو دەڵێت "زۆرجار هیواخواز بووم شتی گەورەیان بۆ بکەم، بەڵام بەپێی توانا یارمەتییانم دەدا". ئەو لەو کاتەدا ژنی هێنابوو، بەڵام وەک خۆی دەڵێت کوڕی گەورەی نەبوو تاوەکو یەکێک لەو کچانەی لێ مارە بکات و ماڵێکی بۆ دابنێت، ئەو پێیوایە "باشترین شت ئەوە بوو کوردەکانی هەولێر بەرێگای شەرعی خوا کچەکانیان لەخۆ مارە کردبا و خێزانیان لەگەڵ پێکهێنابان" ئەسەفیش لەوە دەخوات کە ئەم رەفتارەیان نەکردووە و ئەمە بە کەمتەرخەمی دادەنێت، ئەوەش لەبەرئەوەی رەوشی کچەکان باش نەبوو پێویستییان بەیارمەتی هەبوو "گوناحە کچی گەنج بەو شێوەیە بژیت".

(جەواهیر نەبی) تەمەن (٧٢) ساڵ و خاوەنی (١٣) منداڵ دەڵێت "هەر جارەک ژنەک بهاتبایە کۆڕانی مە داوای شتی بکردبا تا نانم نەدابایێ نەمدەهێشت بڕوات"، ئەو باسی ئەو ساتانە دەکات کە ژن و کچەکانی دەبردە ماڵی خۆی "هەموو جارێک دەمگۆت وەرن خۆتان بشۆن، نانی بخۆن، خۆیان نەدەشوشت، بەس نانیان دەخوارد، وەکی لە نان خواردن تەواو دەبوون، جلکم دەدانێ، زەخیرەم دەدانێ، ئارد و روون و شەکرم دەدانێ، دەمگۆت ئەگەر خەلاس بوو وەرنەوە بیەن لۆ خۆتان". ئەو جەخت لەوە دەکاتەوە کە قەت نەیتوانیوە بەچاوێکی غەیرە کچانە سەیری ئەو ئافرەتانە بکات "وەختی دەمدیتن وامدەزانی کچی خۆمن وا بێکەس و لێقەوماو بوونە، زۆرم زگ پێیان دەسووتا، هەموو جارێک بە کچەکانم دەگۆت قسەیان لەگەر بکەن بزانن چییان نوقستانە بیاندەنێ".

"زۆر سەربەرزم کە توانیم یارمەتی کەسوکاری ئەنفالکراوەکان بدەم"، (موسا مامە)ی تەمەن (٤٤) ساڵ وای وت، ئەو ئێستا کاری دەستگێڕی لەناو بازاڕی شاری هەولێر دەکات، دەڵێت کەوا لە ساڵانی (٨٠) کان رەوشی ئابووری باش بووە، ئەویش بەهیچ شێوەیەک دەستی لە چاکەکاری و خێرکردن نەگێڕاوەتەوە، بەتایبەتی لە بەرامبەر کەسوکاری ئەنفالکراوان.

بەم شێوەیە خەڵکی شاری هەولێر هەر یەکێک بەپێی توانای خۆی یارمەتی کەسوکاری ئەنفالکراوانیان داوە، ئەمەش نیشانەی بەوەفایی و هەستی بەرپرسیاریتی و نیشتمانپەروەری خەڵکی شاری هەولێرە.

**(٢)**

گوندی شرێ یەکێکە لەو گوندانەی کە دەکەوێتە دەڤەری بارزان، لەو گوندەدا خەڵکێکی زۆر ئەنفال کراوە، کە ژمارەیان دەگاتە نزیکەی (١٠٠) کەس، ئێستا لەو گوندەدا (١٦٨) خێزان هەیە،

ژمارەی دانیشتوانیان (٧٢٠) کەسە، کە (٤٠٠) کچ و ژن، (٩٠) پیاو و کور، ئەوانی تریش منداڵ. لەو گوندەدا (٣٥-٤٠) خێزان پیاویان نییە، واتا لە نائامادەیی پیاودا ژیان دەگوزەرێنن، هەروەها لەو گوندەدا (١٠١) بێوەژن هەیە، لە (١٩٨٤) تاوەکو (١٩٩٢) تەنها یەک کەسیان هەیە لە دایک بووبێت. هەروەها تەنها (٢) پیاوی پیریان هەیە، ئەوانیش یەکێکیان لە دایکبووی ساڵی (١٩٣٠) و ئەوی تریش ساڵی (١٩٣٥)، جگە لەمە (٣) کەس لە دایکبووی ساڵی (١٩٥٥)ن.

(حەسەن خورشید عیسا) موختاری گوندی شرێ خاوەنی (٧) منداڵ و تەمەنی (٣٤) ساڵە، لەنێو خێزانی ئەودا (١٥) کەس ئەنفال کراوە، دەڵێت لە ساڵی (١٩٧٥) حکومەتی بەعس گواستوونییەتەوە بۆ شاری دیوانیە، لەگەڵ خەڵکانێکی زۆری ناوچەی بارزان، دواتر لە ساڵی (١٩٨٠) هێنراونەتە ناحیەی قوشتەپە. لە ڕێکەوتی ٣١-٧-١٩٨٣ لە قوشتەپە کۆمەڵگای (قودس و قادسیە) ئەنفالکردن دەستی پێکرد، لە ڕێکەوتی ١٢-٨-١٩٨٣ ناوچەکانی هەریر و دیانا ئەنفال کران. پاش (٣) مانگ دیسان حکومەتی بەعس چۆتە سەریان و نزیکەی (٨٠) کەسی تری ئەنفال کردووە.

ئەو باس لە ڕۆژی کارەساتی ئەنفالەکە دەکات و دەڵێت "دەوری سەعات (٣)ی شەو بوو، جەیشەکەی (بارزان تکریتی) دەوری کۆمەڵگای قوشتەپەی گرتبوو، راستی جاری یەکەم عەسکەر نەهاتنە ناو قوشتەپە، بەڵام دەوریماڵی (شێخ خورشید)ی گیرا بوو، ئەوان شێخیان لەگەڵ خۆیان بردە کۆمەڵگای قوشتەپە، دوای شێخ خەڵکی گوند هەمووی چوونە کۆمەڵگای قوشتەپە، بە بڕوای من جاری یەکەم هەرکەس بەویستی خۆی چووە قوشتەپە، بەڵام بۆ جاری دووەم بە خورتی دەیان برد، ئەو عەسکەرانە تەنها پیاویان لە تەمەنی (١٥) بەرەو سەرەوە دەبرد".

ئەو بەهۆی ئەوەی بەتەمەن بچووک دەبێت، بەرشاڵاوی ئەنفال ناکەوێت، ماوەیەک خەریکی کارکردن دەبێت لەناو باخچە و شینایییەکان، لەو ماوەیەشدا هیچ ئازادییەکی نییە، تاوەکو ڕاپەرینەکەی ساڵی (١٩٩١) دەکرێت و ئیدی دەتوانێت بە ئازادانە بژیێت، لە ساڵی (١٩٩٣) سەرەتا نزیکەی (٢٠) خێزان گەڕاونەتەوە گوندی شرێ، دواتر لە ساڵی (١٩٩٦) نزیکەی (١٤٠) خێزان گەڕاونەتەوە ئەو گوندە.

هەر چەندە ئەو گوندە لە هەموو گوندەکانی تری ئەو ناوچەیە گەورەتر و خۆشترە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تەنها (١) قوتابخانەی سەرەتایی تێدایە بەناوی (قوتابخانەی "شرێ"ی سەرەتایی). ژمارەی قوتابییەکان (٢٨) کەسە لە هەموو پۆلەکانی سەرەتایی، لەم گوندەدا خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی تارادەیەکی بەرچاو کەمە، لەم بارەیەوە موختاری گوند دەڵێت "لە ڕووی خزمەتگوزارییەوە هیچی وا نەکراوە، هەر لە نەخۆشخانەوە بیگرە تاوەکو قوتابخانەی ناوەندی و یاریگای منداڵان و نەبوونی کارەبا، شەقامەکانیش هەمووی خراپە و هیچی قیرنەکراوە".

دوای گەڕانەوەی کەسوکاری ئەنفالکراوان بۆ ئەو گوندە هەر خێزانێک بۆخۆی هەوڵیداوە خانوو دروست بکات، بێ ئەوەی حکومەت یارمەتیان بدات، وەک موختار دەڵێت "هەر کەس بۆخۆی خانوو دروست دەکات و حکومەتی هەرێم یارمەتی خەڵکە ئەنفالکراوەکەی نەداوە، بۆ ئەوەی جێگا و ڕێگایەکی باشیان هەبێت"، ئەو خانووانەی کردوویانەش هەموو قوڕن و زستان دڵۆپە دەکات، "پێشتر ڕێکخراوێکی منداڵپارێزانی بەریتانی هات خانوو دروست بکات، ئەویش هەموویان بەخەراپی دروست کرد و بەجێیان هێشت".

لەو گوندەدا کۆمەڵێک دابونەریتی کۆمەڵایەتی هەیە، کە بەهای کۆمەڵایەتییان زۆر بەرزە، هەروەک حەسەن دەڵێت "لێرە ژن بە ئازادی خۆی مێرد دەکات، ژنهێنان بەپارە نییە، دیاردەی ژن بە ژن، گەورە بەگچکە نییە"، ئەو باس لە مەراسیمی پرۆسەی هاوسەرگیری دەکات لەو گوندەدا و دەڵێت "ژن گواستنەوە دەبێت لە دوای مەغریبدا بێت و بەبێدەنگی بێت، واتا ئاهەنگ گێڕان نییە"، بۆ پرسی خۆشەویستی و داواکردنی کچ لەلایەن کوڕێک کە خۆشی بوێت، ئەوا (٣) جار بە فەرمی داوا دەکرێت، ئەگەر ماڵی کچەکە بە کوڕەکە رازی نەبن، ئەوا کوڕەکە بۆی هەیە کچەکە بباتە

ماڵی هاوسێی کچەکە، دواتر لەوان داوای دەکات، ئەوانیش ئازادن لەوەی پێی دەدەن یا نا.

ئەگەر بوونی تەلەفزیۆن و سەتەلایت ئامرازێک بێت بۆ وەرگرتنی زانیاری و لە هەمان کاتیشدا بۆ سەرگەرمکرنی مرۆڤ، ئەوا لەم گوندەدا (TV) و سەتەلایت نییە، چونکە هەروەک موختار دەڵێت "ئەوە عادات و تەقالیدی باب و باپیرمانە چۆن دەیگۆڕین" جگە لەمە "رەنگە منداڵەکانمان نەزانن سەتەلایت و تەلەفزیۆنی بەکاربهێنن و شتی خراپ بکەنەوە"، لەگەڵ ئەمەشدا لەو گوندە رادیۆ هەیە. پیاوەکان و کوڕەکانی ئەو گوندە لە شاری دهۆک و زاخۆ کار دەکەن، ئافرەتانیش لە باخچە و شینایی و رەزەکان کار دەکەن بۆ دابینکردنی پێداویستی خۆیان "ژنەکان بۆخۆیان کار دەکەن".

"لەبەرئەوەی نەخۆش بووم نەیانبردم" ئەوە قسەی (مام حەسەن)ە. ئەو ناوی (حەسەن تاهیر محەمەد)ە، لە دایکبووی ساڵی (١٩٣٠) و خاوەنی (٩) منداڵە. لە بنەماڵەکەیدا (١٥) کەس ئەنفال کراوە. ئەو یەکێکە لەو (٢) پیاوە پیرەی کە لەو گوندەدا لەگەڵ میراتی ئەنفال ژیان بەسەر دەبەن، بەڵێ ئەوان هەردووکیان میراتی ئەنفالیان پێ براوە و نێوچاوانیان ئاسەواری رۆژانی تاڵ و پڕکارەساتی پێوە دیارە، مام (حەسەن) پشتی لە ژێر باری مەینەتییەکاندا چەماوەتەوە و خەم دایگرتووە، خەمێک کە هەناوی تەنیوە و ئازاری رۆح و جەستەی دەدات، بە کەمترین بیرەوەری و یادکردنەوەی رۆژانی ئەنفالکردنی خەڵکی گوندەکەیان، چاوی پڕ لە فرمێسک دەبێ، ئەو چەند دڵۆپە فرمێسک تێکەڵ بە قسەکانی دەکات و بە قورگێکی نووساوەوە دەڵێت "سپێدە بوو (زوهێر)ی جیرانم مە گاز کرد و گوتی حەسەن مە دەبەنە بەسرا، دەورمان گیراوە، لە ناو ئەو قسەیەدا بوو، دەنگی قیژەقیژی ژنان بەرز بۆوە، شەوێ خڕ دەورا گوندی مەیان بە عەسکەر گرتبوو، نەمانزانی بۆ ئەنفال هاتوون، ئەز نەخۆش بووم، ئەگەر نا دەچوومە ناو موشائەکەوە، یەکێک پیلی گرتم و پێی گوتم، وەرە هەرۆ حەبا خۆ بینە، ئەو حەب و دەرمانم هینا تانیوەی رێ هاتم، دەست بە تەقە کرا، تەقەیان لە عایلەکان کرد، دوو ژن بریندار بوون، مرۆڤێکی مە ویستی هەر دوو ژنی بباتە خەستەخانەی هەولێرێ، بەلاّم ئەوانیش هاتنە گرتن و بە برینداری بردنیان"، لەو کاتەی پیاوانی سوپا و ئەمنی بەعس دەست بە تەقە دەکەن، مام حەسەن خۆی لە هەڵمەتی ئەنفال رزگار دەکات و خۆی دەشارێتەوە، لەم بارەوە دەڵێت "ماوەی دوو مانگان لە ژێرخانی ماڵی خۆ نەهاتمە دەرێ، خۆم شاردەوە".

لەنێو خانووی (مام حەسەن)دا (٤) خێزان نیشتەجێن، خێزانی خۆی و (محەمەدئەمین)ی کوڕی و کچێکی کە مێردەکەی ئەنفال کراوە و کوڕی کچەکەشی. لەم بارەیەوە (محەمەد ئەمین)ی تەمەن (٣٠) ساڵ و خاوەنی (١) منداڵ دەڵێت "ئەو وەزعە زۆر ناخۆشە باسکردنیشی ئاسان نییە".

"نازانم تەمەنم چەند ساڵە" (ستی تاژدین هەمیرە) وای وت، لە خێزانەکەی ئەو و مێردەکەی (٩) منداڵ هاتۆتە دنیا، بەلاّم مێردەکەی (عەلی خان عەلی) و دوو کوڕی (شاکر و ساڵح)، هەروەها (٤) برای بەناوەکانی (مستەفا، ئیبراهیم، محەمەد، رەسول)ن لەگەڵ (١٠) برازای ئەنفال کراون.

ئەو دەڵێت "سپێدەبوو تێکهاتن و تێکچوون، گۆتن عەسکەرێ دەورەیێ ل گوندی دایی، مە نەزانی چییە، مێرا من ب جلکێ عەمەلێ بوو، نەهاتەڤە، کوڕەکێ من تازە عەسکەر بوو، دەفتەرا عەسکەریێ وەرگرتبوو، بەلێ کوڕێژ گێ دی، گچکە بوو، نەدزانی، بخۆ سواری مەنشەئێ بوو، وە دزانی دێچیتە گوندی، پاش ئەوەی مێر هەمی گرتن و سواریی مەنشەئا کرن، ژن و زارۆک بدویڤ مەنشەئا کەفتن، بەلێ سوپایێ رژێمێ زۆر بدڕندەیی ئاگر ل سەر واندا باراند، ئەم ژنک هەمی بدوڤراچۆین، عەسکەرا تەقە ل مە کر و هندەک ل مە بریندار بوون، من هەر هند دیت".

ئەو باسی کوڕە ئەنفالکراوەکانی خۆی دەکات و دەڵێت "کورەکێ من تازە عەسکەر بوو، دەفتەرا عەسکەریێ وەرگرتبوو، بەلێ کوڕێژ گێ دی، گچکە بوو، هیچ نەدزانی، بخۆ سواری مەنشەئێ بوو، وە دزانی دێچیتە گوندی".

ئەو باسی ئەو هەڵوێستە و هەڵسوکەوتانە دەکات، کە ئافرەتەکان لە رۆژی ئەنفالکردن وەریانگرت و جێبەجێیان کرد، دوای گرتنی

پیاوەکان ئافرەتەکان بەکۆمەڵ بەرەو رووی پیاوانی رژێم و سەربازەکان رۆیشتوون، ئەوانیش داوایان کردووە بگەرێنەوە، بەلام نەگەرانەوەیان سەرەنجام بۆتە هۆی ئەوەی سەربازەکان تەقە بکەن و لە ئەنجامدا (٢) ژن بریندار بوون "ئەم ژنک هەمی بدوڤراچوین، عەسکەرا تەقە ل مە کر و هندەک ل مە بریندار بوون"، ئەو دەڵێت بەخۆی و هەر دوو ئافرەت (ستی، حەبیبە)ی بە عارەبانەی دەستی کە تەنها (١) تایەی هەیە لە کۆمەڵگای رێگای بیستانە بۆ قوشتەپە بردووە، کە دووری رێگاکە نزیکەی (٢-٣) کیلۆمەتر دەبێت.

لە دوورەوە ئافرەتێک کە جلێکی رەش و فانیلەیەکی شینی نیلی لەبەردابوو، وێنەی ئافرەتێکی سیهر ـبانی دەنواند، بەچاوە پڕ لە بەخشندەییەکەی دەیویست باسی ئازارەکانی خۆی بکات "چەند رۆژێکە ناتوانم کار بکەم، تەنانەت هەڵسمەوە سەرپێ"، ئەمە قسەی (سیدرەت محێدین)ی تەمەن (٣٩) ساڵە، ئەو تەنها ماوەی ساڵێک لەگەڵ مێردەکەی دەبێت، منداڵی لێ نابێت، بەلام دواتر مێردەکەی لەگەڵ (٤) برا و کورە خاڵی ئەنفال دەکرێن، (سیدرەت) بەراشکاوانە دەڵێت" ئێستاش چاوەڕێمە کەس و کارمان بگەرێنەوە". ئەو گلەیی لە حکومەتی هەرێم دەکات و پێیوایە ئەو گوندە گەورەی ئەو دەڤەرە بەسەر نەکراوەتەوە و بێ خزمەتگوزارییە، دەڵێت "لێرە چەند ماڵێکی زۆرین کارەبا و ئاو و قوتابخانە و خەستەخانەمان نییە".

لە گوندی شرێ (١٠١) بێوەژن هەیە، ئەمانە ناخۆشترین ژیان دەگوزەرێنن، ژیانیان بەهیچ شێوەیەک حەسوودی پێ نابردرێت، (ریچ)ی تەمەن (٦٥) ساڵ یەکێکە لە ئافرەتە بێوەژنەکان، ئەو ئافرەتێکی بەرچەڵەک روسییە، بەلام ماوەی (٤٦) ساڵە لە کوردستانە، ئەو گوتی "(٧) منداڵم هەیە هیچ یەکیان بە روسیا ناگۆرمەوە"، ئەو حەوت زمان دەزانێ و دیپلۆمی لە بەشی ئەندازیاری کشتوکاڵی هەیە، کاتێک بارزانییەکان دەچن بۆ رووسیا تەمەنی (١٩) ساڵ بووە، ئەو کات (ریچ) مێرد بە یاوەرێک و پێشمەرگەیەکی بارزانی دەکات، بەلام لە کارەساتە بەدناوەکەی ئەنفالدا هاوسەرەکەی و (٢) کوری ئەنفال دەکرێن، ئێستاش بەتەنیا خۆی و کورێک و (٤) کچی ماون، بەلام کچەکانی مێردیان کردووە، ئەو کورێکی ئەنفال نەکراوە، ئەمەش لەبەرئەوەی وەک خۆی دەڵێت "کاتێک باوکیان ئەنفال کرا کورە بچووکەکەم ماوەی دوو مانگ بوو لەناو سکمدا بوو".

"لەبەر پەلاماری بەعسییەکان خۆمان چاودێری خۆمان دەکرد تاوەکو بەیانی" (بەسنا یاسین) ی تەمەن (٣٨) ساڵ وای وت، وتیشی "لەترسی ئەوەی بمانبەن خۆمان شاردەوە"، ئەمە سەبارەت بەوەی پەلاماری ئافرەتانیان داوە، ئەو دەڵێت لەترسی ئەوەی دەستدرێژییان بکەنە سەر تا بەیانی حەرەسیاتیان گرتووە، ئەو هاوسەرەکەی و (٢) شووبرای و خەزووری ئەنفال کراون، ئیستا (٣) کچی هەیە، لە ماڵەکەیدا دوو ئافرەتی بێوەژن دەژین، بەسنا باس لە چاوەڕوانی کچ و ژنەکان بۆ گەرانەوەی پیاوەکانیان دەکات و دەڵێت "کچمان هەیە بەدەسگیران بووە، تاوەکو ئێستا جلەکانیان ماوە چاوەڕێی دەزگیرانەکەی دەکات".

وەک خۆی ئاماژەی بۆ دەکات ئێستا خەسوو و منداڵەکانی بەخێو دەکات، "لە ساڵی (١٩٩٣)ەوە لە قوشتەپەوە بۆ بارزان گەراینەوە، لە ژێر خێمەدا بووین تاوەکو خانوویان بۆ دروستکردین".

(حەبیبە عەزیز)ی تەمەن (٥٠) ساڵ هاوسەرەکەی و (٣) برا و برازای و (٦) کورە مامی و (٣) کورە خاڵی و زاوایەکی ئەنفال کراوە، ئەو (٣) کور و (٣) کچی هەیە، لەوکاتەی پیاوەکانیان بردوون حەبیبە دوای سەربازەکان دەکەوێت و لە ئەنجامدا گوللەیەکی لەلاقی دەدەن، ئەو دەڵێت (٢) ژن بریندار کراین، بە عەرەبانەی دەست بردینیان بۆ نەخۆشخانە، حەبیبە دەڵێت "ئێستاش قاچم چاک نەبۆتەوە و ئیلتیهاب دەکات"، هەندێک لەو ژنانە لە ژوور هێنایانە دەرەوە، "هەر لەوکاتەدا پیاوێکیش رمی کرا"، لەبارەی ئەوەی نەخۆشخانەیان نییە دەڵێت "حاڵەتمان هەبووە نەخۆش نەتوانراوە بگەیەنرێتە نەخۆشخانە مردووە". حەبیبە وەکو تەواوی ئەوانەی لەو راپۆرتەدا دواندراون، داوا دەکەن بەسەربکرێنەوە ئاگاداری باری گوزەرانیان بن، چونکە پێداویستی زۆریان هەیە.

# هەڵەبجەییەکان لە هەولێر بەسەرهاتی گردەچاڵ دەگێڕنەوە

خەبات نەوزاد- رێدار ئەحمەد

کارەساتی ١٩٨٨/٣/١٦ ئەستەمە کەسێک بدۆزیتەوەو ئاشنا نەبێت پێی، ئەو مێژووە گەورەترین رووداوی لەمێژوودا تێدا تۆمار کرا کە دەوڵەتێک بەگەورەترین و قەدەغەترین چەکی دونیا بەرامبەر بە بەشێک لە نەتەوەکەی کارەساتێکی ژینۆسایدی تۆمار کرد و ژمارەیەکی ئێجگار زۆر ئینسانی لە گەورەو بچووک، پیرو منداڵ، ژن و پیاوی شەهید، و بەهەزارانی بریندار کرد "کە بەشێکی زۆر لە بریندارەکان تاهەنوکە بە ئازاری گەورەوە دەناڵێن و بەردەوام لەگەڵ ژەمە خواردندا دەواو دەرمان بەکار دەهێنن، لەو مێژووە بەدواوەش بەردەوام لەو کەسە بریندارانە بەچەکی کیمیاوی شەهید دەبن"

رووداوی١٩٨٨/٣/١٦ بە تەنها رووداوێک نەبوو کە وێرانکردن و شەهید و برینداری شارێکی لێبکەوێتەوە و بەس، ئەو مێژووە بەجارێک تەواوی خەسڵەتەکانی ئەو شارەی گۆڕی کە زۆربەکەمی تائێستا بەشێک لەو گوڕانانە لەلایەن لێکۆڵەردوانەوە ئاوڕی لێدراوەتەوە، بەهەر حاڵ ردنگە نەکرێت ئێستا ئاوڕ لە هەموو ئەوانە بدرێتەوە.

ئەوەی ئێستا قسەی لەسەر دەکرێت بەسەرهات و چیرۆکی ژیانی ژمارەیەک ماڵی ئاوارەی ئەو کارەساتەیە کە لە دەوروبەری هەولێری پایتەختی کوردستان ژیاون کە بەداخەوە ئەمەش لەخانەی ئەو شتانەیە تا هەنوکە باسی لێ نەکراوە، ئەم قۆناغە وەک بەشی زۆری ئەوانەی قسەی لەسەردەکەن "قۆناغێکە، کە هەرگیز ناکرێت باسی هەولێر بکەیت و ئەم مێژووەت لە بیرچێ" و بەقۆناغێکی هەردگەورەی ئەو شارە دا ئەنرێت.

هەر کەس لەوانەی کە ئەو سەردەمە لە ئۆردوگاکانی "گردە چاڵ، جێژنیکان." ژیابێت هەریەکەو بەشێوەیەک گێڕانەوەی ئەو سەردەمەی لایە، ئەوکات نزیکەی ٣٠٠٠ هەزار ماڵی هەڵەبجەی لە گردە چاڵ ژیانیان بەسەر بردووە کە ئێستا کارەکتەری سەرەکی ئەم چیرۆکە سەید تۆفیق کە زیاد لە دووساڵ و نیو لەوێ ژیاوە لەبری هەموو ئەوانە بەشێک لە گوزەرانی ئەوکاتەیان ئەگێڕێتەوە.

سەید تۆفیق بەر لەهەموو شتێک سەرەتای رووداوەکەی گێڕایەوە دوای کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجە، هەڵەبجەیان جێهێشت ئەویش بە ماڵ و منداڵەوە رووە و ئێران وەرێ کەوتووە کە ئەوکات ژمارەیەک ئۆردوگا لە ئێران بۆ هەڵەبجەییەکان کرابۆوە ئەمانیش لە ئۆردوگای "کەنگاودر" نیشتەجێبوون، بنەماڵەی سەید تۆفیق لەو کارەساتەدا جگە لە ئاوارە بوون، گەورەترین قوربانیان داوەو لە بنەماڵەکەی هەشت کەس شەهیدبوون کە "پورزایەکی خۆی و سێ منداڵی، ئامۆزایەکی، خوشکێکی کە بەبریندار

گەیەنراوەتە ئێران و لەوێ شەهید بووە و پووریکی و خالێکی".
لەمێژووی مانەوەی خەڵکی هەڵەبجە لە ئێران چەندجارێک حکومەتی ئەو کاتەی عێراق بەناو لێبوردنی دەردەکرد و داوی گەڕانەوی هەڵەبجەییەکانی دەکرد بۆ عێراق "کە هەندێک لەوانەی دەگەڕانەوە تائێستا بێ سەرو شوێن و ئەنفال کراون"، ماڵی سەید تۆفیق لە کۆتایی لێبوردندا و بە یەک کاتژمێر بەر لەوادەی تەواو بوونی لێبوردنەکە لەئێرانەوە گەڕاونەتەوە بۆ عێراق کە ئەو کات خێزانەکەی لە پێنج کەس پێکهاتووە و ماڵی کوڕەکەشی هاوڕێ لە گەڵیاندا بووە، ئەم پیاوە لەسەر ئەو هۆکارە قسەدەکات و دەڵێت، تاکە هۆکارێک کە هانیداین بۆ ئەوەی بێینەوە خوێندنی هەردوو منداڵەکەم گۆران و ئاشتی بوو کە هەردووکیان خوێندکاری ناوەندی بوون. لەدرێژەی قسەکانیدا وتی "تەواو کردنی خوێندنی ئەو دوومنداڵەم بەڕاستی بەکتێبێک نایەتە کۆتاو هەمووی لە چاکەو پیاوەتی هەولێر بوو" کە ئەمە بە وردی دێنە سەر باسکردنی.
سەرەتای گەڕانەوەی ئەم خێزانە بۆ کوردستان چارەنووسیان نەزانراو بووەو وەک هەموو ئەو خێزانە هەڵەبجەییانەی دی، چوونیان نەزانراوە بۆکوێییە، لەپاش گەڕانەوەیان بۆ کوردستان لە شارۆچکەی عەربەت لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ کراوەو دواتر براونەتە باینجان و پێنج رۆژێک لەوێ ماونەتەوە، سەید تۆفیق کە گەورەی خێزانەکەیەتی ئەگێرێتەوە ئەڵێت: ژیانی ئەو کاتەمان گەلێک ناخۆش بوو نەماندەزانی بۆ کوێ دەبرێین بەڕێوەبەری ناحیەی ئەو کاتەی بازیان هاتە ماڵی ئێمە دانیشت و پێی وتین "ئەم سمێڵە سمێڵی پیاو نە بێت ئەگەر بۆ هەڵەبجەیان نەبردنەوە وەرن تف بکەنە ناو چاوم و سمێڵم بتاشن" ئەو دەڵێت، بەڵام دواتر وا دەرنەچوو، دوای ئەوەی پروپاگەندەیان بڵاوکردەوە ئەتانبەنەوە بۆ هەڵەبجە خەڵکەکە هەمووی خۆی کۆکردەوە ژمارەیەکی ئێجگار زۆر لۆریان هێنا بۆ بار کردنی ئێمە، دەستیان بە بارکردن کرد کە ئاخر ماڵ بارکراین ماڵی ئێمە بوو. "ئەوان بۆ ئەوەی نەزانین بۆ کوێ ئەبرێین تا کۆتا ماڵ بارنەکرا نەیانهێشت یەک لۆری بچێتە سەر جادەی قیر" دواتر کەوتینە رێ بەرەو کەرکووک بوو "کە هەمووومان سەرسام بووین، چونکە وتمان تەواو، ئێمە لەخانەی نەماندایین و زیندە بەچاڵمان دەکەن. تا چوینە کەرکووک، لەکەرکووکەوە کە قافڵەی لۆریەکان بەرەو هەولێر رێکەوت کەمێک دڵمان خۆش بوو، چونکە بەرەو خوارووی عیراقیان نەبردین، ئەو دەڵێت: کە لەوێ دەرچووین کەمێک هۆشمان هێنایەوە.
یەکەمین لەحزەی داخل بوون بەهەولێر دەگێرێتەوە، دەڵێت: هەرگیز لەیادم ناچێت "کاتژمێر ١٠ یان ١١ی شەو بوو کە گەیشتینە هەولێر، هەموو خەڵکەکە هاتبوونە سەر جادەو ئەگریان کە چاویان بەئێمە ئەکەوت. شەوێکی ئێجگار حەزین بوو"، ئەم ماڵە هەڵەبجەیانە بەرەو گوندی گردەچاڵ بەڕێکران کە نزیکەی ٢٠ دەقیقەیەک لە هەولێرەوە دوورە هیچ شتێکی تێدا نەبووە و هەڵەبجەییەکان نزیک لە گوندە بەدووری چەند کیلۆمەترێک نیشتەجێ کراون.
کەسایەتیە ناودارەکانی ئەو کاتە چاکەیان تائێستا لە ئەندێشەی هەڵەبجەییەکاندا ماوە. سەید تۆفیق باس لە پیاوەتی حاجی فازل ناوێک دەکات ئەو کات گەورەی ناوچەی جێژنیکان بووە و لە ناوچەی ئەواندا ژمارەیەکی ئێجگار زۆر ماڵی بادینی ژیاون و لەسەر حسابی خۆی چەند بیری ئاوی بۆلێداون.
ئەو باس لە خراپی ئەو

جێگایە دەکات کە تێدا ژیاوە و دەگێڕێتەوە کە یەک دڵۆپ ئاو دەست نەکەوتووە، لە گردەچاڵ ئاغایەک هەبووە بەناوی رەشید کە پێچەوانەی حاجی فازل هەڵسوکەوتی بووە. ئەو دەڵێت "لەیەک ملیۆن کەس پیاو خراپێکیش هەر دەبێت" نارەحەتی ژیانی ئەو سەردەمە باسکردنی کۆتایی نایەت.

بەعس چواردەوری ئەو گردەچاڵەی دابوو، ڕێگەی نەدەدا بەهیچ شێوەیەک هاتوچۆی هەولێر گردەچاڵ هەبێت، سەید تۆفیق لەسەر گێڕانەوەی ڕۆژەکانی گردەچاڵ بەردەوام دەبێت دەڵێت: ئەوکات بەعس وا تێگەیەنرابوو کە ئێمەی هەڵەبجەییە گەڕاوەکان لەئێران وا راهێنراوین کە جاسوسی بۆ ئێران بکەین، بۆیە کەسێکی بۆ لێکۆڵینەوە نارد بۆ گردەچاڵ "کەسێکی خراپ نەبوو باش بوو"، بەڵام کە ئەو نەما، دۆخمان خراپ بوو کە کابرایەکی تری کورد هات ئێستاش هەرماوە لێکۆڵینەوەکانی ئەکرد.

ئەوەی هەمیشە لەبەرچاوی سەید تۆفیق و تەواوی بنەماڵە هەڵەبجەییەکان ون نابێت و هەمیشە دەیڵێنەوە پیاوەتی و چاکەی خەڵکی هەولێرە، لەم بارەیەوە قسەکانی درێژە پێ دەدات و دەڵێت: دوای سێ چوار رۆژ کە نەیاندەهێشت کەس بێتەناو و بچێتە ژوورەوە و زۆر بێتفاق بووین، هەرچۆن بێت هەوڵماندا بگەینە هەولێر لەگەڵ عەتیەی خوشکم چووینە هەولێر "لەوێ نەماندەویرا بڵێین هەڵەبجەین گەر بیانزانیایە هەڵەبجەیین نەیاندەهێشت پارەی هیچ شتێک بدەین یان زۆر بەکەمتر بۆیان حساب دەکردین، بەڵام ئێمە ویژدانمان ئەمەی قبوڵ نەدەکرد"، پاش چەندرۆژێک هەولێرییەکان کەوتنە هێنانی هاوکاری و کۆمەک "ئەگەرچی ڕێگەشیان پێنەئەدرا" بەیانیەک زوو کاتێکمان زانی سەیارەیەک بە سەمونەوە خۆی کرد بە ناو گردەچاڵدا، دواتر سەیارەیەک ئەهات گەنمی پێ بوو، دانەیەکی دی ئاردی پێ بوو سەیارەیەکی تر خێمەی پێ بوو، ئەم کەسە هەڵەبجەییە لەمەڕ پیاوەتی هەولێرییەکان دەڵێ "شەرەفمەندی ئەوان، پیاوەتی ئەوان قیاسێک نییە بۆ پێوانەکردنی".

سەید تۆفیق ناوی هەندێک لەوکەسانە دەڵێت کە هەڵەبجەیی بوون و ئەو کات لەو کۆمەڵگایە لەگەڵی ژیاون لەوانە "شێخ محێدین، شێخ محەمەدی، مەلا عومەر، شێخ محەمەدی ریش، مەلا حەمەمینی مزگەوتی ئوسامە" کە ئەمانە ئێوارانیان بەیەکەوە بەسەر دەبرد.

ئەو هۆکارەی ئەم خێزانەی لە ئێرانەوە پێهاتنەوە خوێندنی منداڵەکانیان بوون کە پاش چونیان بۆ گردەچاڵ چارەنووسیان نادیار بوو، سەید تۆفیق دەگێڕێتەوە دەڵێت: رۆژێک دوو ئەفەندی دەگەڕان و ناویان دەنووسی وامان هەست کرد جارێکی تر سەرژمێرییە، دوای ئەوەی هاتنەماڵی ئێمە سڵاویان کرد، وتیان، ئێمە هەولێرین "کە وایان وت دڵمان خۆش بوو، چونکە هەولێریین" وتیان هاتووین ناوی ئەوانە بنووسین کە منداڵەکانیان خوێندکارن تا بڕۆنەوە بەر خوێندن، پێمان وتن: ئێوە گاڵتەمان پێدەکەن چۆن شتی وادەبێت، بەهەر حاڵ پاش قسە کردنێکی زۆر "دڵیان خۆشکردین و وتیان بەخوا ئێمە بۆ ئەوەدهاتووین بڕیارێکە لە پەروەردەی هەولێر دەرچووە"، ئیتر من ناوی دوو منداڵەکەم نووسی، تۆفیقی باوەیس ناوی منداڵەکەی نووسی، حاجی سەعید کچ و کوڕێکی نووسی، هەموومان نووسیمان، بۆ بەیانیەکەی ئەوانەی کە لەمە پەلەیان بوو ئێمە کە هەر لەئێرانەوە بۆ ئەوە هاتبووینەوە رۆیشتین بۆ بەحرکە کە ناحیەیەکە لەنزیکی هەولێر، لەوێ چووینە ئامادەیی بەحرکە، وتمان ئێمە خوێندکارمان هەیە، خەڵکی هەڵەبجەین. بەڕێوەبەرەکەی زۆر کەسی مەردبوو، ئەوەندە پیاوەتی لەگەڵ

کردین ئیمە شەرمان دەکرد. وتی "من خۆم هەموو شتێکتان بۆدەکەم، مەسئولی ڕێکخراوی ئێردم هەمووکارەکان بەئەستۆی من، چی بڵێن ئەوەتان بۆ ئەکەم، وتی: هەر ڕۆژە ئۆتۆمبیل نەبوو بە ئۆتۆمبیلەکەی خۆم دێم بەدوایاندا، ئەگەر خانووشیان دەوێ بۆیان دەگرم" کچەکەم وێژەیی بوو ئەوان بەشی ویژەییان نەبوو بەرێوەبەر وتی دوو کەسی تر بهێنن بەسێیانەوە بەشێکی ویژەییان بۆ دەکەمەوە، بەهەر حاڵ پاشان لێکمان دایەوە بۆ ئێمە جێژنیکان نزیکترە بابڕۆینە ئەوێ. بەر لەوەی بگەینە گوندەکە گەنجێک لەسەر ڕێگاکە هاتە ڕێمان، وتمان ئێمە هەڵەبجەیین ئەمانەوێت منداڵەکانمان لێرە بخوێنن، پێشمان کەوت و بردینی بۆ قوتابخانەکە هەر کەگەیشتین مامۆستاو بەرێوەبەر هەمووی لەبەرمان هەستان و بەکوڕە گەنجەکەیان دەوت فەرموو.. فەرموو... کوڕەکە زۆر بەتەوازع بوو، نەماندەزامی ئەمە کێیە، دوای ئەوەی شتەکانی پێوت هەموو مامۆستاکان و بەرێوەبەرەکە وتیان: ئێوە هەرچی بڵێن ئێمە ئەوەتان بۆ دەکەین. دواتر کە کوڕە هەستا ڕۆیشت بەرێوەبەرەکە وتی: ئەوە کوڕی حاجی فازل بوو. وتی: گەر بڕۆن و حاجی فازل بزانێ هەڵەبجەین

هەموو مەسروفاتێکی ئەو منداڵانە ئەکات، چونکە ئەو پیاوێکی زۆر باش بوو، هەرچی ئاوارە بادینیەکانە ئەو هاوکاری دەکردن نەوەی ئەو ناوچەیەی هەموو بووژاندبووەوە.

بەرهەرحاڵ ئەم پیاوە هەڵەبجەیە بەردەوام دەبێت لە گێڕانەوەو ئەسەف بەوە دەخوات کاتی خۆی ئەمانەی نەنووسیوەتەوە تا بۆ مێژوو بمێنیت.

وتی: بڕیاری ئەوەماندا بۆ ئەم بابەتە سەردانیکی هەولێر بکەن. لەوێ چاومان بە یاریدەدەری بەرێوەبەری پەروەردەی هەولێر کەوت کە کابرایەتی زۆر بەئینساف بوو "هەر کەزانی ئیمە هەڵەبجەین فرمێسک لەچاوی نەوەستا و بڕیاریدا لەسەر بەرپرسیاری خۆی هەموو کارێک بکات" لەوێ لەبەشی بڕوانامە ئافرەتیکی تری زۆر باشمان ناسی کە خەریکی قورئان خوێندن بوو وتی: بەیاریدەدەرەکە ئەوانە منداڵی منن، بڕیاریان دا هەچی ئەکرێت بۆ مان بکەن، کوڕەکەیان نارد بۆ ناوەندی شۆڕشی نموونەیی و کچەکانیشیان نارد بۆ ئامادەیی سەلاحەدین، سەید تۆفیق دەڵێت ئەو ئافرەتە کە بەداخەوە ناویم لەیادنەماوە بەهیچ شێوەیەک لێمان جیانەبوویەوەو هەموو کارەکانی بۆ ڕایی کردین.

ئەمە وەک سەید تۆفیق دەڵێت بەشێکی زۆر کەمی ئەو ژیانەیە کە نزیکەی ٢سالٌ و نیو لە گردەچاڵ بەسەریان بردووە، ڕووداوێکی زۆر گرنگ کە بۆتە یادەوەری لای هەموو ئەوانەی ئەوسەردەمە ژیاون بەهەڵەبجەیی و هەولێریەوە، بارینی بەفریکی زۆربووە سەید تۆفیق دەڵێت "پێیان وتین ٤٨ ساڵە بەفر نەباریوە ئەمساڵ باری" کە بەهی ئێمەیان دەزانی، ئەم بەفر بارینە پلانێکی بەعسیەکانی تێکدا "چەندرۆژێک چەندین ئامێری زەبەلاح کاریان دەکرد و خەندەقیان لیدەدا نەمان دەزانی بۆچییە ئەوان دەیانوت بۆ تەنکی ئاوە، بەلاَم من دڵنیا بووم بۆ زیندە بەچاڵکردنە سوپاس بۆ خوا ئەو بەفرە لێی تێکدان".

نووسین و تۆمارکردن هەرچەندێک بێت ڕەنگە کۆتایی نەیەت وەک خودی سەید تۆفیق دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ئەستەمە بتوانیت بەئاسانی "پیاوەتی و مەردایەتی هەولێریەکان بگێڕیتەوە و بینووسیتەوە" هەولێر بەشێکی گرنگی ژیانی خۆی کە مێژوو بەشانازیەوە ئەینووسێتەوە خزمەتی هەڵەبجەییەکان و ژیانی گردەچاڵ و کۆمەڵگەکانی ترن "ئەوکاتەی هەڵەبجە پارەی ئەکردو ئەفرۆشران. ئەوان خزمەتی خەڵکی هەڵەبجەیان دەکرد".



# راپەڕین و هەولێر

حەمید ئەبوبەکر بەدرخان
شێخ سەربەست بەرزنجی

کاتێ کە یادی راپەڕینە مەزنەکەی بەهاری "١٩٩١"ی، خەڵکی کوردستان و پێشمەرگەی کوردستان دەکرێتەوە، هەموو ساڵێک لە"٣/٥" یادی راپەڕینەکە دەکرێتەوەو شاری رانیە بە دەروازەی راپەڕینەکە ناوزەد کراوەو حکومەتی هەرێمی کوردستانیش ئەم رۆژەی کردووە، بە پشووی فەرمی لە کوردستان، بەڵام لەلایەکی دیکەوەو لەشوێنێکی تری کوردستان، لە کۆمەڵگای خەبات، خەڵکی ئەوێ قسەیەکی دیکەیان هەیەو ئەوان دەڵێن: رۆژێک بەرلەمە واتا لە"١٩٩١/٣/٤" ئێمە لە کۆمەڵگای زۆرەملێی خەبات، خەڵکی راگوێزی گوندەکانی کەندێناوەو قەڵادزێ و سەنگەسەری لێ کۆ کرابوونەوەو رژێم بەزۆر ئەوانی لەم شوێنە نیشتەجێ کردبوو، راپەڕینمان کردو ئەو رۆژە دوو شەهیدیشمان بەناوی" محەمەد فاروق سەدیق گەلاڵی و بەختیار عومەر قەڵادزێیی" بەکوردستان بەخشی. لەم بارەیەوە، فاروق سەدیق گەلاڵی، باوکی یەکەم شەهیدی راپەڕین لەکوردستان، لەکۆمەڵگای خەبات گوتی: کە باس لە راپەڕین دەکرێ، دەبێ بەر لە هەموو شتێک باس لە راپەڕینەکەی ئۆردوگای خەبات بکرێت لە "١٩٩١/٣/٤" لەبەرئەوەی یەکەم شوێن لە کوردستان ئێمە بووین کە راپەڕینمان بەرپا کرد لە کوردستان و هەموو میدیای جیهانییەکانیش باسیان لەم راپەڕینەی خەڵکی کۆمەڵگای خەبات کرد، وەکو دەنگی ئەمریکاو رادیۆی مۆتیکارلۆ، نابێ ئەوەشمان لەیادبچێت کە رادیۆی دەنگی گەلی کوردستان رۆڵێکی جوامێرانەی بینی لە بڵاوکردنەوەی هەواڵەکەو هاندانی راپەڕیوی کۆمەڵگای خەبات "ئۆردوگای خەبات کە لە خەڵکی لەتیفاوە و قەڵادزێ و سەنگەسەر و دیبەگە پێکهاتبوون"، گوێبیستی ئەوە بووین کە لە بەسرا راپەڕین کراوە، دیاربوو شانە چەکدارەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و بەرەی کوردستانی خۆیان بۆ راپەڕینەکە ئامادە کردبوو لە تەواوی شارو شارۆچکەکانی کوردستان "ئەوەبوو لەرۆژی"٣/٤" راپەڕینەکە

لە کـاتژمـێـر"٩"ی بەیانی دەسـتی پێکردو لەدوای نوێژی عەسری هەمان رۆژ کـۆتایی هات. هۆکـارەکـەشی ئەوەبوو کە نەخەڵکی کەلەک هەروەها خـەڵکی خـەباتی کـۆنیش بەشـدار نەبوون لە راپەڕینەکـــە، لەلایەکی دیکەوەش بەهۆی دووری شـوێنەکـە هێـزی پێـشـمـەرگـەی کـوردسـتـان و یەکێتی نیشتیمانی نەیانتوانی بگەنە خـەبات و لەولایەش رژێم بەتەواوی هێـزو جـبـەخـانـەی خـۆی هات و راپەڕینەکـەی سـەرکـوت کـرد، بەڵام رۆژی دواتر کە لە رانیە راپەڕین کرا، هێـزی پێـشـمـەرگـە هەر ئەوکـاتە گەیشتە رانیە، بۆیە راپەڕینەکە سەری گرت و بەجۆش و خرۆش بوو.

هەروەها فـاروق سـەدیق گـەلاڵی باوکی یەکـەم شـەهیـدی راپەڕین لە کوردستان کە ناوی شەهید "محەمەد" گـوتیـشی: ئەو رۆژە، بەعـسـیـیـەکـان هێـزێکی زۆریان هێنایە خـەبات بە پاڵپـشـتی خۆفـرۆشـەکان و مـەفـرەزە خاسەکـان کە ناتوانم ئێـسـتـا ناویان بهـێـنم، لەبەرئەوەی کـاربەدەست و شـۆڕشگـێـڕن لە دام و دەزگـاکـانی حکومـەتی هەرێمی کـوردسـتـان و شـەهیـدانەکـەشـیـان بەقـەد چوار شەهیدانەی ئێمەیە.

"خـەڵکی خـەبات ئەو رۆژە دوو شەهیدی پێشکەش بەکوردستان کرد بەناوەکانی محەمەد فاروق گەلاڵی و بەختیار عومەر قەڵادزەیی".

بەخـتـیـار عـومـەر خـەڵکی قـەڵادزێیـەو پاش راگـواسـتنی زۆرەملێی گوندو شارۆچکەکانی کـوردسـتـان هاتۆتە ئۆردوگـای زۆرەمـلـێـی خــــەبـات و لەرۆژی"١٩٩١/٣/٤" کـاتژمـێـر " ١.٣٠"ی، دوای نیـــوەڕۆ لـە راپەڕینەکـەی خـەبات شـەهیـدکـرا. هەروەها مـحـەمـەد فـاروق سـەدیق گـەلاڵی، لەدایکبـووی "١٩٧٣" گـوندی مـەلا کـاغـەی بناری چیـای قەرەچووغەو لە رۆژی"١٩٩١/٣/٤" لە کـاتژمـێـر "١١"، سـەرلەبەیانی گـیـانی خـۆی بەخشی و بووە یەکـەم شەهیدی کوردستان.

هەروەها "جەلال قەدڵادزەیی"یش، لەبارەی رووداوەکانی ئەورۆژە گوتی: بەڵێ، یەکەم راپەڕینی کوردستان لە کـۆمـەڵگەی خەبات دەستی پێکردو لەرۆژی "١٩٩١/٣/٣" بارگرژییەک لەناو کـۆمـەڵگەی خـەبات دروست بـوو، رژێمـیش دەسـتی کـرد بە کۆکردنەوەی هێز لەگەڵ خۆفرۆشەکاندا "لـەرێـکـەوتـی ١٩٩١/٣/٤ جەماوەری خەبات کە پێکهاتبوون لە خـەڵکی حـەوزی پشـدەرو دیبـەگـەو کەندێناوە، راپەڕینیـان دەست پێکردو توانییـان تەواوی کۆمەڵگاکە لە دام و دەزگاکانی رژێم پاک بکەنەوە".

وەسـتـا سـەربەست دیبـەگـەیی، ئەویش لەبارەی راپەڕینەکـەی خەبات دەڵێ: من خوێندکاری پۆلی سێیەمی ناوەندی بووم، لەم رۆژە خـەڵکێکی زۆرم بینی کە هوتافـیـان دەکـێـشـا، لەبیرمە دەیانگوت: هێزی گەل لەبن نایە، شەهیدبوون دکتۆرایە، کاتێکم زانی، بوو بەتەقـە لەهەمـوو لایەک، ئەوکـات زانیم کـە راپەڕین لەدژی داروودەستـەکەی سەدامی دیکتاتۆر و خوێنمژ دەستی پێکردووە، ئەو رۆژە دوو خـوێندکـاری کـورد بەناوی " محەمەد فاروق و بەختیار قەڵادزەیی" شـەهیـد کـران و لەم راپەڕینە شـانە چەکـدارەکـانی بروسک و خـەڵکی خەبات پێی هەڵسان و ئەنجامیان دا.

هەروەها "گەلاوێژ سالح خدر" لە کۆمەڵگای خەبات، گوتی: ئەو رۆژە "١٩٩١/٣/٤" رژێم نەیتوانی بێتە ناو کۆمەڵگای خەبات، هەر لە شەوی "١٩٩١/٣/٣"یـش، بـنـکـەو بارەگاکانیان گواستبۆوە بۆ ئەوبەری "کـەلەکی یاسین ئاغـا"ی، لەیادی راپەڕینی خـەبات سـلاو دەنێـرم بۆ تەواوی خـەڵکی کـوردسـتـان و کـۆمـەڵگەی خـەبات کـە دەروازەی راپەڕین بوون لە کـوردسـتـان. هەر راپەڕینی کـوردسـتـان و خـوێنی شـەهیـدانیش بوو کـە ئەم رۆژەیان دروست کـردووە، سـەرۆک کـۆمـاری عێراق و پەرلەمان حکومەتی هەرێمی کوردستانی لێکەوتەوە.

هەروەها "قـوباد دیبـەگـەیی"یش، گـــوتی: راپەڕین و یـەکــــەم بەگـژداچوونەوەی هێـزی زەبەلاحی سـەدام ئێـمـە بووین، بەڕاستی کـە لەسایەی راپەڕینە مـەزنەکـەی ساڵی "١٩٩١" دەکرێت، گریانم بۆ خۆمان و خـەڵکی خـەبات دێت، چونکە بەڵـگـەی زیـندوومـــان لایـەو شەهیدیشـمـان داوە لەم رۆژە" ئێـمـە لەرێگەی شانە چەکدارەکانی ی.ن.ک ئاگادار کرابووینەوە کە جموجۆڵێکی سیـاسی بەهێـز هەیە" ئەگـەری ئەوە هەیە کە لەهەموو کوردستان راپەڕین بکرێت دژی رژێـمی دیکـتـاتۆری سـەدام، رۆژانەش دەنگی گـەلی

کوردستان باسی لە راپەڕین و نزیکبوونەوەی مەرگی دیکتاتۆری دەکرد. ئەوەبوو لە ڕۆژی "٣/٣" کە ڕۆژی یەک شەممە بوو خەڵکی کۆمەڵگەی خەبات کۆبوونەوەو رژێمیش هەندێکی لێ گرتن و بەندی کردن، بۆ ڕۆژی "٣/٤" خەڵکەکە چوونە بەردەم دائیرەی ئەمن و ناحیەو مونەزەمەو رژێم دەستی کرد بە تەقەکردن و پاشان لەلایەن جەماوەر بەتەقە وەڵامی رژێم درایەوەو لەم نێوانەدا دوو خوێندکاری خەڵکی کۆمەڵگای خەبات شەهیدکران، بەڵام زۆر بەداخەوە شەهیدەکانمان وەکو سەربازی ونیان لێهاتووەو کەس باسیان ناکات.

هەروەها "سەید محەمەد نۆغەرانی" ئەویش لەم بارەیەوە گوتی: یەکەم راپەڕین و یەکەم شەهیدیش ئێمە بووین، بەڵام جێگەی داخە کە باس لەو قارەمانییەتەی کۆمەڵگای خەبات و لەم دوو شەهیدەی کە لەم پێناوە بەخشییان، ناکرێت و دەبوا خەبات بە دەروازەی راپەڕین دابندرێت و شەهید محەمەد فاروق سەدیق گەلالیش بەیەکەم شەهیدی راپەڕین دابنرێت لە کوردستاندا.

## چۆن راپەڕین دەستی پێکرد؟

رژێمی بەعس لە شەڕی هەشت ساڵەیدا لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێران کە بەپاڵپشتی راستەوخۆی دەوڵەتە زلهێزەکانی دونیاو یارمەتی دارایی دەوڵەتە عەرەبییەکانی کەنداو بەتایبەتی (کوێت و سعوودیە) ئەنجامی دا بە جۆرێک کۆتایی بەشەڕەکە هێنا کە بەبەرژەوەندی خۆی نەشکایەوە، هێزەکەی هێندە گەورە بوو نەدەگەڕایەوە دۆخی جارانی، زیادلەوەش لەماوەی شەڕی دوورو درێژی لە کوردستان فێری راووروت و شڕەخۆری ببوون، ئەو شوێنانەی دەستیان دەیگەیشتێ دەکەوتە بەر شاڵاوی تاڵان و بڕۆ ئەوی دەمایەوە تەنها ماڵێکی وێرانەو خاکێکی سووتماکراو بوو هیچی تر. پیادەکردنی ئەو سیاسەتە وای لە هێزە چەکدارەکانی بەعس کرد لە پاشەکشەکردنیشیان ئەو دیدو بۆچوونە لە هزری سەرکردەکانیان بەردەوام بێ .

بەماوەیەکی کورتی تەواوبوونی شەڕی داسەپاوی (بەعس - ئێران) لە کاردانەوەیەکی چاوەڕوان نەکراودا ڕۆژی ٢/٨/ ١٩٩٠ پەلاماری دەوڵەتی (کوێت) ی دا و لەماوەی چەند کاتژمێرێک دەستی بەسەر داگرت، ئەوی دەستگیر کرا، ئەوەی رایکرد لەترسی ئەنفال و رەشەکوژی خۆی دەربازکرد، بەم جۆرە سامانێکی زۆری پارەوپول، ئاڵتوون، کەلوپەل و شتومەکی بازرگانی کەرتەکانی تایبەت و دەوڵەتی فەرهوود کرد دەستی کرد بە گوێزانەوەی بەجۆرێکی وا بووە مایەی ڕق و بێزاری هەموو دونیا.

راپەڕینەکان لە ڕۆژانی کۆتایی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٩١ دەستی پێکرد لە سنوورەکانی بەغداو رومادی و موسڵ و تکریت گیرسایەوە، ئەو چوار پارێزگایە بەشێوەیەکی کاریگەر بەشداری راپەڕینەکانی نەکرد، رەنگبوو بەشداریکردنی ئەو چوار پارێزگایە بووبایە مایەی یەکلایی کردنەوەی بارودۆخی سیاسی هەموو عێراق و رژێمی فەرمانڕەواو دامودەزگاکانی بۆ هەتاهەتایە لە زبڵخانەی مێژوودا بەر لەعنەتی زەمانە کەوتبان، هەروەکو لە کۆتاییدا دوای ئازادکردنی عێراق روویدا، ناویان لەلاپەڕەی ڕەشی پڕ لە شەڕمەزاری و سەرشۆڕی و درندەییدا تۆمار بکرابا وەک چۆن لەکاتی خۆیدا (هۆلاکۆو جەنگیزخان، تەتەرو هیتلەرو مۆسۆلینی، رژێمی ڕەگەزپەرستی ڕۆدیسیا ) و گشت دیکتاتۆرەکانی تر لەناوچوون و ناویان تۆمار کرا بەچەشنێ تا دونیا ماوە بەمرۆڤ کوژو درندەکانی مێژوو ناودەبرێن، فەرمانڕەوایی بەعس ئەوکات یەکێک دەبوو لەو رژێمانەو دەچووە لاپەڕە تاریکەکانی مێژووی سەردەمی تازەوە، خەڵکی عێراق و کوردستانیش دووچاری نەهامەتییەکی تر نەدەبوونەوە بەدەست ئەو رژێمە نگریسەوە.

لەگەڵ راپەڕینی شارەکانی باشوورو کشانەوەی هێزەکانی هاوپەیمانان لەخاکی عێراق تیشکی سەوزیش بۆ رژێمی بەعس هەڵکرا بەبیانووی ئەوەی راپەڕینەکان لەئاستی مەرامی ئەواندا نییە ئەو گرووپ و کەسایەتییانەی جڵەوی دەسەڵات لە عێراق وەردەگرن ڕەنگە کەسانێک بن لەهێزە ئیسلامییەکان و عێراقییەکی ئیسلامی دوور لەخواست و ئیرادەی رۆژئاواو ئەورووپا

بەدی دا بەوەش بەدەستی خۆیان کۆمارێکی تری ئیسلامی لەهاوشێوەی کۆماری ئیسلامی ئێران دروست دەکەن و دەکەوێتە بەربەرەکانێ لەگەڵ بیری رۆژئاواییەکان بەگشتی و ئەمریکا بەتایبەتی ئەوەش لەبەرژەوەندی بالای سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکاو هاوپەیمانان نەبوو بۆیە بێ پەردەو شاردنەوە رایان گەیاند کە حکومەتێکی (سەدامی بێ هێز) گەلێ باشترە لە حکومەتێکی عێراقی ئیسلامی یا دەوڵەتێکی خاوەن دەسەڵاتی جەماوەری بەگرتنەبەری هەڵبژاردنی ئازادانە کورسی دەسەلات وەرگرێ، ماوەی دەست تێوەردانی بلۆکە رۆژئاواییەکان نەدا بەئارەزووی خۆیان دەست بخەنە کاروباری ناوخۆی حوکمرانییەوە و گاڵتە بەچارەنووسی خەڵکییەوە بکەن.

پاش راگەیاندنی فەرماندەی لەشکری هاوپەیمانان بەوەی نیازیان نییە رژێمی عێراق برووخێنن و تەنیا مەبەست لەو شەرە رزگارکردنی (کوێت) بووە، هێزەکانیان لە عێراق دەکێشنەوە ئەودیوی سنوور، فەرمانەکەیان جێبەجێ کرد دوای ئەوەی چەند بریارێکیان بەلیژنە سەربازیەکەی رژێم مۆر کرد لەژێر چەتری (سەفوان)، هەر بۆ گاڵتەجاری ناویان لەئەندامانی لیژنە سەربازیەکەی رژێم نابوو لیژنەی (مستەر یێس) چونکە هەر بریارێکیان بۆ ئامادە کردبوون بێ وردبوونەوەو گفتوگۆکردن پەسندیان کردبوو ئەوەش بەنزمترین ئاستی گفتوگۆکانی وەفدی سەرانی رژێمی بەعس دادەنرێ کە بەو زەلیلی و چۆکدادانە بەرامبەر ویست و داخوازی هاوپەیمانان سەری بەڵێ و پابەندبوونیان بۆ بریارەکان دانەواندو پەسەندیان کردن، دیار بوو پەسندکردن و بەڵێندان بەجێ بەجێکردنی هەموو داخوازیەکان لەبەرامبەر مانەوەی رژێمی دیکتاتۆری بوو وازهێنانیش بوو لە جەماوەری راپەریوی عێراق و کوردستان کە هاوپەیمانان بەڵێنی یارمەتی و هاریکارییان دابوو، هاندانی رژێمی سەدامیش بوو بۆ سەرلەنوێ بەگەرخستنەوەی ماشێنی جەنگی لە فیرقەکانی گاردی کۆماری کە بەدرێژایی جەنگی (بەعس- کوێت) لە چەند شوێنێک مۆڵدرابوون تارادەیەک لەشەرو پێکدادان دوورو پارێزراو بوون.

راپەرینەکانی باشوورو ناوەراستی عێراق بەهۆی بارودۆخی ناسەقامگیری دەڤەرەکە لە هەڵکشان و داکشاندا بوو لە کوردستانیش هەر لەسەرەتای مانگی ئازاری ساڵی١٩٩١ لەشاری (هەولێر) خۆنیشادانێکی جەماوەری بەرپا بوو کە بەیەکەم هەوێنی راپەرینی خەڵکی کوردستان دەزانرێ بەڵام ئەو خۆنیشاندانە زۆری نەخایاند دامرکایەوە، رژێم ئەو جۆرە هەڵچوونەی بەستەوە بەوەی گۆیا کەسانی گێرەشێوێن دەیانەوێ سەقامگیری وئاسایش لەو هەرێمە تێکدەن، هەر زوولە رێگەی دەزگا جاسوسییەکان و هێزە سەرکوتکەرەکان بۆ ماوەیەکی کاتی زۆر کورت ئەو دەنگانەیان کپ کردەوە.

لە رۆژی ٤/٣/١٩٩١ لە شارۆچکەی (خەبات) ی کەڵەکی یاسین ئاغا خەڵکی لەدام و دەزگاکانی بەعس راپەرین پەیامێکی بەهێزیان ئاراستە کرد بەوەی هەرچەندە هەرەشە و تۆقاندن لەئاست مەسەلەی رەوای گەلەکەمان بازنەی گەمارۆی توندکا لە بەرامبەردا کاردانەوەی بەهێزی لێ دەکەوێتەوە.

ئەو پەیامە کورتانەی رۆژانی یەکەمی راپەرین دەسپێکی راپەرینی فراوانی جەماوەری کوردستان بوو بەهەموو چین و توێژو کەسایەتی و لایەنە سیاسییەوە.

راگەیاندنی بەرەی کوردستانی زەمینەی خۆش کرد، رق و بێزاری گەیشتە لووتکە، پەیوەندی کرا بەزۆربەی ئەو چەکدارانەی لەکاتی خۆیدا لەلایەن رژێمەوە چەکدار کرابوون بەمەبەستی کوردانەوەی شەر، نامەو نووسراویان ئاراستە کرا تا لە بەرەی راپەرین و مقاوەمەت بەشداری بکەن، رۆژانەش پەیامی وریایی و دڵنیاکردنەوە بەجەماوەر دەگەیەنرا، لێبووردنی گشتی بۆ هەموو هەڵخەڵەتاوان دەرچوو، ئەو چالاکییە راگەیاندنانە پێشەکیەکی باش بوون بۆ گەیاندنی پەیامی راپەرین و لەپاشدا رامالینی دەزگا سەرکوتکەرەکان لە سەرتاسەری کوردستان.

بەرنامەی (بەرەی کوردستانی)

بەرنامەیەکی پلاندارێژراوی تۆکمە بوو، ڕۆژانە بەپێی هەلومەرجی فراوان بوونی مەودای ڕاپەڕینەکان پیادە دەکرا.

لە بەرەبەیانی ٥/٣/ ١٩٩١ بەپێی بەرنامەی بەرەی کوردستانی لە هەلمەتێکی قارەمانانەدا پەلاماری بنکە و بارەگاکانی بەعس درا لەشاری (ڕانیە) لەماوەیەکی بەرچاودا جەماوەری بەئەمەگ بەیارمەتی هێزی پێشمەرگە توانییان دەست بەسەر تەواوی شاردا بگرن و مستەکۆڵەیەکی توند بسرەوێننە ڕژێمی بەعس.

ئەو ڕۆژە بەیەکەم ڕۆژی ڕزگاری خاک و نەتەوە دادەنرێ هەر لەبەر ئەوەش بوو شاری (ڕانیە) ی شیرین ناونرا بە(دەروازەی ڕاپەڕین). ناکرێ و ناشبێ ڕۆڵی جەماوەری بەشەرەفی ئۆردوگاکانی خەبات و کەلەک، فەرامۆش بکرێ چونکە لە ١٩٩١/٣/٤ جەماوەر بەرووی سەربازو بەعسییەکان تەقینەوەو لەئەنجامدا محەمەد فاروق سەدیق گەلالی و بەختیار عومەر شەهید بوون، بۆیە دەکرێ بڵێین یەکەم شەهیدی ڕاپەڕین لە خەبات بوو...

دوژمن هەرچەندە هەوڵیدا هێزەکانی لە ناوچەکە کۆکاتەوەو پەلاماری خەڵکەکە بدا بەڵام بە بەرگری قارەمانانەی جەماوەرو پێشمەرگە هەموو هەوڵەکانیان پووچەڵ کرایەوە ناچار بەرەو (چوارقورنەو کۆیە) پاشەکشەیان کرد، هێزەکانی ڕاپەڕین لە ناوچەی چوارقورنەش لێیان هاتنە دەست و لەماوەیەکی زۆر کەمدا توانییان دەست بەسەر هەموو بنکەو شوێنە سەربازییەکانی چوارقورنەو ئۆردوگای سەروچاوەدا بگرن، ژمارەیەکی زۆری سەربازان و ئەفسەران خۆیان دا بەدەستەوە.

ڕژێم ویستی بەهۆی هێزەکانی کە لەناوچەی شەقڵاوەو کۆیەو دوکان و شوێنی تر مۆڵی دابوون فریای هێزە شکست خواردووەکەی کەوێ لە دەڤەری ڕانیە کەچی نەک هەر نەیتوانی ئەو کارە ئەنجام دا بەپێچەوانەوە پانتایی ڕاپەڕینەکان مەودایان فراوانتر بوو شەقڵاوەو کۆیەو ڕەواندزو تەق تەقیشی گرتەوە هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان بەسەر ئەو میحوەرانە دابەش کران تا لەکاتی پێویست و دیاریکراودا لەگەڵ جەماوەری ناوچەکان ڕووبەڕووی دوژمن ببنەوەو کۆشک و تەلاریان بەسەر یەکدا برووخێنن و بواری دژەهێرشیان نەدەن.

لە ١٩٩١/٣/٦ حەوزی بیتوێن و ناحیەی چواقورنەو بێتواتەو بازیان یەک و بازیان دووو سەربازگەی سەلام و تەیناڵ ئازادکران.

لە ١٩٩١/٣/٧ شاری هەڵمەت و قوربانی، شاری شەهیدان، شاری سولەیمانی، بروسک ئاسا زەماوەندی سازدا، هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان و جەماوەری بەشەرەفی شارەکەو شانە چەکدارەکانی لە هەموو کووچەو کۆڵان و شەقام و گەرەکێکی شار لە هێزە فشۆڵ و زەبەلاحەکەی بەعس ڕاپەڕین، یەکەمین پەیامی ڕزگارکردنی شارێکی گەورەی کوردستانیان بەگوێی دونیا گەیاند، لە ماوەیەکی کەمدا شاری سولەیمانی و دەوروبەری لە پیس و پۆخڵی بەعسییەکان پاک کرایەوە، ئەوی گیرا گیرا ئەوی زاتی بەرەنگاربوونەوەی کورد بەسزای عادیلانە گەیشت.

تاوانبارە بەعسییەکان ساڵەها بوو ڕۆڵەی بەشەرەفی کوردیان لەو سنوورە تووشی گرتن و دەربەدەری کردبوو، بەهەزاران ماڵ و خێزانیان ئاوارەو پەراگەندە کردبوو، چی لەیاسای مرۆڤایەتییەوە دوور بوو دەرهەق جەماوەرەکەی دریغیان نەدەکرد وایان دەزانی هەتا سەر بۆیان دەلوێ و ڕۆژێک نییە لە مێژوودا ناوی تۆڵە سەندنەوەیە لەو تاوانبارانە.

بەرزگارکردنی سولەیمانی ڕاپەڕین ئاسۆیەکی تری وەرگرت، کۆمەلانی خەڵکی کوردستان ئەو کۆت و زنجیرەی لەدەست و قاچیان کرابوو بەتەواوی پچڕا، ترس و دڵەڕاوکێ نەما، حەماسەتی پڕ لە جۆشی خەڵکی و هێزەکانی پێشمەرگەی بەرەی کوردستانی بەبڕوایەکی پتەوتر بەسەرکەوتن درێژەیان بەبەرنامەی ڕاپەڕین داو بازنەیان فراوانتر کرد.

لە ١٩٩١/٣/٨ هەموو شاری سولەیمانی و ئەمنە سوورەکەو هەڵەبجە، ئۆردوگای پیرەمەگروون قەزای دوکان، سوسێ و کۆتەڵ و موغاغ، کەڵەوانان و ناحیەی عەربەت و ئۆردوگاکەی، ئوردوگای زەڕایەن و نەسر و باریکە و برایەتی، هەورامان و قەزای پێنجوین و

حەوزی پێنجوین، شارەزوورو هەڵەبجەی شەهید، قەزای چەمچەماڵ و تاسلوجەو ئەڵڵایی رزگار کران.

لە ٩/٣/١٩٩١ قەزای شەقلاوەو مەسیف وسەری رەش، چیای سەرکەشی سەفین، قەزای دەربەندیخان و حەوزی دەربەندیخان، قەزای کەلارو گشت ناوچەکانی ئازاد کران دوژمن هێزەکانی کشاندەوە بەرەو ناوچەی حاجی ئۆمەران.

لە ١٠/٣/١٩٩١ قەزای کۆیەو تەق تەق، چیای سەرکەشی هەیبەسوڵتان و ناحیەی حەریرو باسرمە، چیای بەنی حەریرو خەلیفان، رێزانۆک و قەزای رەواندوزو دیانە، قەزای کفری و ناحیەی مەیدان، باوەنوورو چیمەن و شوان و قەرەهەنجیر لە تەوقی دیلی و ژێر چەپۆکی بەعس رزگار کران، لەو شوێنانە زیاتر لە پەنجا هەزار سەربازو ئەفسەرو دەرەجەدار خۆیان تەسلیم بەهێزەکانی بەرەی کوردستانی کرد، دوژمن لە پاشەکشەدا بوو.

لە ١١/٣/١٩٩١ بەبروسکەیەکی پەلەو نهێنی نرکەو نەعرەتەی پیرە قەڵای دێرین لە نەعرەتەی دا چەخماخەی هێندە بەتەوژم بوو بورکانی رق و تۆڵەی بەسەر سەری داڵەکەرخۆر بەشان و بێچووەکانی داباراند، رۆژی رووناکی لێ کردنە شەوەزەنگ.

شاری هەولێری هۆلاکۆ بەزێن لەلای بەعسییەکان پێگەیەکی زۆر قایم بوو چی دەزگا سەرکوتکەرەکانی وەک (مەنزوومە و موخابەرات و بارەگای فەیلەق و بنکە جاسووسیەکانی تر) کە سەرپەرشتی ناوچەی (حوکمی زاتی!)یان دەکرد لە شاری هەولێرەوە فەرمانیان پێدەدرا.

هەولێر لەبەرئەوەی لەلایەن رژێمەوە کرابووە پایتەختی هاوینەی عێراق و ئەنجوومەنە کارتۆنیەکانی (یاسادانان و جێبەجێ کردن) لەو شارە بوون زۆر مەبەستیان بوو وەزعیان تێک نەچێ بەهەر نرخێک بووە تێیدا بالادەست بن، بەڵام کاتێ ئیرادەی جەماوەر بریاردەر بێ ئەو دەزگا گەورەو بێ خێرانە دەتوانن چ کاردانەوەیەکیان هەبێ؟

شاری (قەڵاو منارە) شاری شەهیدانی بەرەی کوردستانی، شاری تێکۆشەرانی میللەت لە یەکەم بانگەوازی خۆئامادەکردن بۆ پەلامار وهێرشکردنە بنکەو بارەگاکان، ترسنۆکەکان زوو تووشی دڵەراوکێ و چۆکداادان و لەرزین بوون، لە شەودا بەرێگەی قەدەغەکردنی هاتوچۆ ژمارەیەکی زۆری فس فس پاڵەوانەکانی بەعس لەترسی تۆڵەسەندنەوەی جەماوەر خۆیان و ماڵ و منداڵیان بەهۆی هەندێ خەڵکی نەفس نزم هەڵاتن و مەیدانیان چۆڵ کرد، ئەو کاتەی شالاوی راپەرینی جەماوەرو هێزی پێشمەرگە لە هەولێر دەستی پێکرد دوژمن ورەی نەما هەرچی خۆی دا بەدەستەوە لە مردنی حەتمی رزگاری بوو، ئەوی زاتی بەرەنگاربوونەوەی کرد بەر لەعنەتی مێژوو کەوت.

هەولێری شاری گەورەی کوردان بەڵێنی رەسەنایەتی سەلماندەوە کە برۆڵەکانی دابوو بەوەی هەرگیز زاڵم و زۆرداران جێی حەوانەوەیان تێیدا نییە.

بە رزگارکردنی هەولێر دەروازەی کوردستان بەتەواوی والا بوو بۆ تێکۆشەرانی بیرو بازوو، لە هەر شارو شارۆچکەیەک زەمینەی راپەرین سازو ئامادە با باسکە پۆڵایینەکەشی لەگەڵ بوو جەماوەرو پێشمەرگە وەک ماسی و ئاو بوون، هەر لەو رۆژەدا بوو شاری (خانەقین و دوزخورماتو و قوشتەپە) رزگار کران هەرچەندە ماوەی ئازادکردنی شاری خانەقین کەم بوو دوژمن بەساروخ و بۆمبای قورس بۆردومانی کرد و هێرشی درندانەی کردە سەری و داگیری کردەوە.

لە ١٢/٣/١٩٩١ قەزای ئاکرێ و چەند شارۆچکەیەکی دەوروبەر ئازاد کران هەروەها کۆنترۆڵی تەواوی رێگای سولەیمانی هەولێر- بەغدا کرا.

١٣و١٤ / ٣ / ١٩٩١ ئەو ساتەوەختانە بوو کە دەڤەری بادینانی بریندار، بادینانی لانەی بەچکەشێران، ئەو بادینانەی تەنانەت زمانی شیرینی کوردیشیان لێ قەدەغەکردبوو، هەموو قوتابخانەکانی خوێندن بەزمانی عەرەبی بوو، دوژمن وای دانابوو بەسنوورێکی دەستکردی ئاویی زۆربەی ناوچەکە دەکاتە دەریاچەیەک و لەدانیشتوانی بەشەکانی تری دادەبرێ ئەوی تریشی

بە سیاسەتی (بەعەرەبکردن و ڕاگواستن) بەدەردی ناوچەکانی کەرکووک و شەنگارو خانەقینی دەبا و بەتەواوی سیمای کوردی لەسەر دەسڕێتەوە خەڵکەکەی ڕادەگوێزێ و عەرەبی خێڵەکی تێدا نیشتەجێ دەکا تا لەدواڕۆژدا سیاسەتی (ئەمری واقیع) فەرز کا و ئەو دەڤەرەش وەک شوێنە بەعەرەبکراوەکانی تر بخاتە سەر نەخشەی وڵاتی عەرەبی و سنووری وڵاتەکەی پێ فراوان بکا، داهات و سامانەکەی تالآن کا، بیکاتە دیارییەکی ڕازاوە لەسەر مێزی گەورە دەسەڵاتدارانی عەرەب شارۆچکەکانی (ئاکرێ و ئامێدی، سوارەتووکەو سەرسەنگ، دەشتی سلێڤان و سمێل و شێخان، زاخۆ و خابوور و دەرکار عەجەم) سەرکەوتنەکانیان لەگەڵ بووکی کوردستان (دهۆک)ی دەلال تێکەڵ کردەوە، تەپڵی سەرکەوتن و سەرفرازییان لێدا بۆ دونیایان سەلماند کە خەون و خەیاڵ و پیلانەکانی دوژمن لەو دەڤەرە دەبێ هەمیشە گۆڕستانی هزرە چەوتەکانیان بێ، جەماوەری بەشەرەفی بادینان هەرگیز ماوەیان نەداوەو نادەن دوژمنان بەئارەووزی خۆیان نەخشەو مەرامیان بێننە دی لەسەر دەستی قارەمانانی بادینان وردوخاش دەکرێ .

ئەو شارو شارۆچکانەی کەوتبوونە نێوان هەولێرو ناوچەی بادینان بەرگی دیلی و ژێردەستییان فڕێداو ئاڵای سەرکەوتنیان شەکاندەوە، دوژمنیان سەرشۆڕو شەرمەزار کرد.

ڕۆژانی ١٥ و ١٦ و ١٧ ڕۆژەکانی خۆسازدان بوون بۆ سەرکەوتنی یەکجارەکی و ئازادکردنی کەرکووکی قودسی کوردستان، یادەوەری کیمیابارانکردنی شاری هەڵەبجەش بوو.

لە ١٩٩١/٣/١٨ جەماوەری ئازاو گیان لەسەر دەستی قەزای (مەخموور و دوبز)ی کەرکووک لە داروودەستەکانی بەعس ڕاپەڕین، لە چاوتروکانێکدا توانییان هەردوو شارۆچکەکە و دەوروبەری لە دوژمن پاک بکەنەوە.

ڕۆژمێری ڕاپەڕین ڕۆژانە داستانی قارەمانیەتی جەماوەرو لەشکری شۆڕشگێڕی کوردستانی تۆمار دەکرد، دوای ئازادکردنی سولەیمانی، هەولێر، دهۆک بەشارو شارۆچکەکانیانەوەو ئازادکردنی بەشێکی بەرچاوی ناوچەکانی کەرکووک و گەرمیان، هێزەکانی پێشمەرگەو جەماوەری ڕاپەڕیوی ناوچە جیاجیاکان بەپێی نەخشەی سەرکردایەتی بەرەی کوردستانی بڕیاریان دا بەرەو شاری (زێڕی ڕەش) کەرکووکی گڕوگڵپە، کەرکووکی دڵ، کەرکووکی قودس، کەرکووکی دیل و ژێرچەپۆکی بەعس پێشڕەوی بکەن، هێزێکی تریش بەرەو موسڵ.

کەرکووک گرنگی تایبەتی هەبوو، سەرچاوەی زۆرترین کانە نەوتەکانی وڵات لەو شارەیە و شادەماری ئابووری عێراقە، ئەو شارەی کوردان لەلایەن ڕژێمە یەک لەدوای یەکەکانی عێراق هەر لە سەردەمی پاشایەتی تا ئەمڕۆ لە هەوڵی بەعەرەبکردنیدان و نەخشەی دیموگرافی و جوگرافی دەگۆڕن، سیمای نەتەوایەتی کوردیان لێ سڕیوەتەوە، هەر حکومەتە بەشێوازێک ئەو سیاسەتەی پەیڕەو کردووە، دانیشتوانەکەیان کۆچ پێکردووەو گوندەکانیان خاپوورو تێکداوە، لە شوێنیدا بەدەیان ئۆردوگای عەرەبیان دروست کردووە، زۆربەی عەشیرەتە عەرەبەکانی خواروو و ناوەڕاستیان هانداوە بۆ نیشتەجێبوون، هەموو چەشنە پێویستییەکی ژیان و بەرگرییان بۆ دەستەبەر کردوون، ناوچە عەرەبکراوەکانی دوزخورماتوو و تازەو دووز و کفری، خانەقین و شارەبان و تەلەعفەرو بێجی و شەنگار، زۆر شوێنی تر شایەتی هاتنی عەرەبەکانن.

شوێنە بەعەرەبکراوەکان کاریگەری زۆریان هەبوو خەڵکی ناوچەکان لە زێدی باپیرانیان ڕادەگوێزران بە بیانووی (ستراتیجی ئەمنی عەرەبی) و پاراستنی چاڵە نەوتیەکان لە دەستدرێژی تێکدەران چەندەها بیانووی تر بۆ خەڵکی ڕەسەنی ناوچەکە دروست دەکرا بۆ دەرکردنیان.

کورد لە مێژووی کۆن و تازەیدا پەلاماری خاکی کەسی نەداوە، شەروگێچەڵی بەکەس نەفرۆشتووە و ئارەزووی لە کوشتارو خوێن ڕشتن

نەبووە، تا شەڕیان پێ نەفرۆشتبێ دەستی بۆ چەکەکەی نەبردووە ئەویش بۆئەوەی پارێزگاری لە نەتەوەو خاکەکەی بکات، لەبەر گرنگی ئەو ناوچەیە دوژمن لەسەر ڕاگواستن و بەعەرەبکردن بەردەوامە تا ئێستا، هەموو گفتوگۆو دانووسانەکانی نێوان کورد و ڕژێمەکان لەدوایین سات لەسەر کەرکووک گیرساوەتەوەو تەنگژەی تێ کەوتووە، شەڕو ماڵوێرانی بەرۆکی کوردی گرتۆتەوە.

کەرکووک بە شار و شارۆچکەکانی، دەشتە بەپیت و فراوانەکانی، بەسنوورە جیاکەرەوەکەی لەگەڵ ناوچەکانی تری عێراق لە یەکەم ڕۆژانی ڕاپەڕین باوەشی بۆ ڕۆڵە بەئەمەکەک و قارەمانەکانی کردەوە، وەک هەموو شارو ناوچەکانی هەرێمەکە بەدەم بانگەوازی ڕاپەڕینەوە هات.

لە ١٩ /٣ /١٩٩١ خۆسازدان و ئامادەکارییەکان تەواو بوون بە رزگارکردنی زۆربەی شوێنە گرنگ و ستراتیجەکانی دەوروبەری کەرکووک.

لە ١٩٩١/٣/٢٠کاتی بەرەبەیان هێزەکانی بەرەی کوردستانی لە هەموو قوڵەکانەوە بەهاوکاری خەڵکە خۆڕاگرەکەی ناو شارو جەماوەری ڕاپەڕیوی ناوچەکانی تر ڕژانە شارو لەشەڕو پێکدادانی خوێناوی و دەستەویەخە گەڕەک بەگەڕەک و شەقام بەشەقام، کۆڵان بەکۆڵان دوژمنی لێ دەرپەڕێندرا تا ئێوارەی ٢٠ /٢١ ی ئادار بۆ یەکەمین جار توانرا کەرکووک ئازاد بکرێ بێ هیچ یارمەتییەکی دەرەکی، یەکەم جار بوو لە مێژووی تازە خەڵکی هەوای ئازادی و سەرفرازییان لە شارەکەی بابەگوڕگوڕ هەڵمژی، گەردی ژێردەستیان لەسەر کەرکووک تەکاند، کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان ئەو ڕۆژەیان پیرۆز کرد.

ئازادکرنی کەرکووک لەگەڵ جەژنی نەورۆز یەکی گرتەوە، شاپلیتەکەی کاوەی ئاسنگەری مەزن لە قەڵا دێرینەکەی کەرکووک گڕی بەرز بۆوە لەگەڵ گڕوگڵپەی چاڵە نەوتەکانی بابەگوڕگوڕ ئاوێتەی یەک بوون، ئاسمانی کوردستانیان هێندەی تر جوانترو ڕازاوەتر کرد، شادی و خۆشی بەجەماوەر بەخشی بووە ئاهەنگ و زەماوەندو هەڵپەڕکێ لە کەرکووک و دەوروبەری.

ئەو سەرکەوتنە مێژووییە وانەیەکی گەورەی نیشتمانی دایە هەموو کوردێک بەوەی هەر کاتێ ئیرادەی خەڵک و لایەنە سیاسییەکان بۆ یەکیەتی ڕیزەکانی گەل بێ مومکین نییە هیچ هێزێک بتوانی لە ڕوویدا بوەستێ، بەردی بناغەی هەموو سەرکەوتنێک لە یەکیەتی ڕیزەکانی گەلدایە.

بەئازادکردنی کەرکووک کوردستانی داگیرکراو یەکەم جاری بوو باوەشی گەرمی بۆ خەڵکە تێکۆشەرو پێشمەرگە قارەمانەکانی کردەوە کە ساڵەها بوو خەونی بەرۆژێکی وا دەدی و هاتە دی بەئومێد بوون داستانی سەرکەوتن بکەنە دیاری و پێشکەش نەوەی داهاتووی کەن تا پەندو دەرسی لێ وەرگیرێ لە بەرامبەردا ترسنۆکی و زەلیلی دوژمنان ببینن کە لەبەردەم ئیرادەی جەماوەرو هێزی پێشمەرگە توانای خۆڕاگریان نەمابوو، نەیاندەتوانی مقاوەمەت بکەن، ئەو بنکە و بارەگاو ئۆردوگایانەی دروستیان کردبوون بوونە بڵقی سەر ئاو و لە ماوەیەکی کورت لەباریەک هەڵوەشانەوە، هەرچی چەک و جبەخانەی سەربازی بوو کەوتە دەست جەماوەرو پێشمەرگە.

ڕۆژانەی ڕاپەڕین لەڕێگەی (دەنگی گەلی کوردستانەوە) کە بەئێزگەکە دەناسرا دەگەیشتە شارو شارۆچکەکان، ڕاگەیاندن ڕۆڵی بەرچاو و دیاری هەبوو لە وشیارکردنەوەو ڕێنماییکردن، ئاگادارییەکان، بروسکەو پەیامەنهێنییەکان بە (جفرە) دەدرایە شانە چەکدارەکان و ڕیزەکانی ڕێکخستنی ناو شارەکانی ژێردەستی دوژمن.

لەو ماوەیەدا ڕاگەیاندن سەرکەوتووانە ئەرکەکانی بەجێ دەگەیاند چ بەسازدان و وشیارکرنەوە یا وەک پێشمەرگەی هەڵمەتبەر، گواستنەوەی دەنگوباسی ڕۆژانەی ڕاپەڕین و سەرکەوتنەکانی زۆربەی دەوڵەتانی ئیقلیمی و جیهانی بەئاگا هێنابووەوە لەو زوڵم و ستەمەی لە کورد کراوە بەدرێژایی مێژوو، لەڕێگەی ڕاگەیاندنەوە ڕۆژانە دەزانرا چ شارو دەڤەرێک ئازاد کراوە.



# هەولێر و راپەڕینی ١٩٩١

## " توێژینەوەیەکی مێژوویی- سیاسییە "

هۆشمەند عەلی مەحمود شێخانی

**پێشەکی:**

باشووری کوردستان لە دوا دەیەی سەدەی بیستەم قۆناغێکی تایبەتمەند و جیاوازتر بوو لە مێژووی نەتەوەی کورددا، لەم سەردەمەدا گۆڕانکارییەکانی جیهان کاردانەوەی راستەوخۆیان بۆسەر ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەگشتی و باشووری کوردستان بەتایبەتی هەبوو، و بە هۆیەوە راپەڕینێکی جەماوەری سەرتاسەری ناوچەکانی گرتەوە، کە لە شارۆچکەی (ڕانیە)وە دەستی پێکرد و دواتر زۆربەی ناوچەکانی دیکەش ئازاد کران، تا لە رۆژی ١٩٩١/٣/١١دا شاری هەولێریش ئەو ئازادییەی بەخۆیەوە بینی.

راپەڕینی ئازاری ١٩٩١ی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان بەگشتی و راپەڕینی شاری هەولێر بەتایبەتی رووداوێکی مێژوویی گرنگ بوو لە مێژووی نەتەوەی کورددا، چونکە ئەو شارە یەکەم جار بوو ئەو ئازادییە، بەخۆیەوە ببینێ، هەروەها کاریگەری گەورەشی بەسەر شار و شارۆچکەکانی دیکەی کوردستاندا هەبوو، بەتایبەتی بوو بەڕێگایەکی سەرەکی بۆ ئازادکردنی شاری کەرکوک لە دواتردا، بەڵام تائێستاش ئەم رووداوە مێژووییە بەشێوەیەکی


راپەڕینی رانیە ١٩٩١/٣/٥

زانستییانە لێی نەکۆڵراوەتەوە، بەڵکو نووسینەکان زیاتر لەشێوەی وتاردا بڵاوکراونەتەوە یاخود گوزارشتی لە بۆچوونی لایەنێک لەلایەنە سیاسییەکانی کوردستان کردووە. هەموو ئەمانەش هاندەری سەرەکیم بوون تا بەشێوەیەکی زانستییانە قۆناغەکانی راپەڕینی شاری هەولێر لە ئازاری ١٩٩١دا لە توێژینەوەیەکی زانستی سەربەخۆدا بە پشت بەستن بە چەندین سەرچاوەی زانستی و مەیدانی، بخەمە روو.

ئەم نووسینەی لەبەر دەستدایە لە دەستپێکێک و چوار بەشی سەرەکی پێکهاتووە و بەم شێوەیە دابەشمان کردووە:

لە دەستپێکدا باس لە سەرەتایەکی مێژوویی شاری هەولێر کراوە، کە تیایدا ئاماژە دراوە بە مێژووی دێرینی هەولێر و سنووری جوگرافی و گرنگی ئەم شارە لە سەردەمە مێژووییەکاندا.

بەشی یەکەم: بارودۆخی سیاسیی باشووری کوردستان و ناوچەکە بەر لە راپەڕین و رۆڵی لە هەڵگیرساندنی راپەڕینی بەهاری ١٩٩١ لە باشووری کوردستان کردووەو لە دوو باسدا خراوەتە روو:

باسی یەکەم: بارودۆخی سیاسیی باشووری کوردستان بەر لە راپەڕین شی کراوەتەوە بە باسکردنێکی کورتی هەریەکە لە: سیاسەتی بەعەرەبکردن (التعریب)، سیاسەتی بەبەعسیکردن (التبعیث)، سیاسەتی جینۆساید بەرامبەر بەکورد، وەک: (ئەنفال، بەکارهێنانی چەکی کیمیایی، وێران کردنی گوندەکانی کوردستان، گرتن و لە سێدارەدانی بەکۆمەڵ).

جگە لە مانەش لەم قۆناغەدا تیشک خراوەتە سەر: یەکگرتنەوەی پارتە کوردییەکان لەیەک بەرەدا، و

گرنگیدان بە راگەیاندن، وەک: رادیۆی دەنگی گەلی كوردستان، رادیۆی دەنگی كوردستانی عێراق.
ئەمانەش دەكرێت وەک چەند هۆكارێكی گرنگی ناوخۆیی سەیریان بكەین بۆ هەلایسانی راپەرینی باشووری كوردستان لە ساڵی ۱۹۹۱دا.

باسی دووەم: بارودۆخی عێراق و ناوچەكەو رۆڵی لە هەڵگیرساندنی راپەرینی بەهاری ۱۹۹۱ی كوردستان خراوەتە روو، بە باسكردنی هەربەكە لە بابەتە جیاوازەكانی وەک: داگیركردنی كوێت لەلایەن عێراق، كۆتایی هاتنی جەنگی ساردی نێوان یەكێتی سۆڤیەت و ئەمریكا، هاندان و پشتگیری ولاتانی دونیا بۆ هەلایسانی راپەرین، هەلایسانی راپەرین لە خوارووو ناوەراستی عێراق.

بەشی دووەم: تایبەت كراوە بە: بارودۆخی شاری هەولێر بەر لە راپەرین و تیایدا رووداو و پێشهاتە گرنگەكانی هەولێر بەچەند رۆژێک بەر لەراپەرین، ئەو شارە باسكراوە باسی یەكەم: راپەرینی ئۆردووگای خەبات لە ۱۹۹۱/۳/٤ باسكراوە و باسی دووەم: خۆپیشاندانەكەی حیزبی شیوعی عێراق لە ۱۹۹۱/۳/٦ دا شیكراوەتەوە، باسی سێیەمیش: هەڵوێستی حیزبی بەعس بەرامبەر بەدانیشتوانی هەولێر، بەچەند رۆژێک بەر لە راپەرینی خەڵكی ئەو شارە خراوەتە روو.

بەشی سێیەم: خستنە رووی راپەرینی شاری هەولێرە لە ۱۹۹۱/۳/۱۱داو بەسێ باسدا خراوەتە روو، وەک: دەربارەی هەنگاونان بۆ زەمینە خۆشكردنی راپەرینی هەولێرد، كە تیایدا هەوڵەكانی سەركردایەتی سیاسیی كورد بۆ دابەشكردنی شاری هەولێرو شارۆچكەكانی دەوروبەری و دابەشكردنی بەسەر چەند بەشێكدا (میحودر)، لەسەر بنەمای نەخشەی بنەرەتی و سەربازی هەولێر و


شەهید خەجە باوە



شەهید مامۆستا بەهرام جەمیل حسەن

دروستكردنی شانەی چەكدار، مەفرەزە پارتیزانەكان بەشێوەیەكی گشتی كراوە.

باسی دووەم: بەرنامەی ئازادكردنی هەولێر خراوەتە ڕوو تیایدا، ڕۆڵی هێزی پێشمەرگەی كوردستان بە پاڵپشتی جەماوەر لە دوای ئازادكردنی ناوچەكانی ڕانیەو سلێمانی و شەقلاوەو.....هتد، بە هاوبەشی لەگەڵ ڕێكخستنە نهێنییەكان و شانە چەكدارەكان بەرنامەی ئازادكردنی ئەوشارە دادەڕێژن و سەرجەمیان لەسەر ڕۆژی ١٩٩١/٣/١١ ڕێك دەكەون وەك ڕۆژی ڕاپەڕین.

باسی سێیەم: باسكردن لە ڕۆژانی ئازادكردنەكەی خراوەتە ڕوو، كە باس لە قۆناغەكانی هێرشكردن بۆ ئازادكرنی شاری هەولێر دەكرێت لەلایەن هێزەكانی پێشمەرگە بەهاوبەشی و هاوكاری شانە نهێنییەكانی ڕێكخستن و چین و توێژە جیاوازەكان و هەڵوێستیان لەم ڕۆژەدا

بەشی چوارەم: باس لەشاری هەولێر و شكستی ڕاپەڕین دەكات، كە لە دوو باس پێك هاتووە:

باسی یەكەم: دەربارەی هێرشی سوپای عێراق و داگیر كردنەوەی هەولێرە، كە ئاماژە بەوە دراوە چۆن سوپای عێراق لە چەند قۆڵێكەوە هێرشی بۆ سەر ئەو شارە هێناوە، پاش بەرگری چەند ڕۆژەی هێزەكانی پێشمەرگە لە دەرەوەو ناوەوەی شار، بەڵام سەرەنجام شارەكە لەلایەن ڕژێمەوە داگیر كراوەتەوە.

باسی دووەم: دەربارەی هۆكارەكانی شكستی ڕاپەڕینی ١٩٩١ی باشووری كوردستانە بەگشتی، كە دابەشكراوەتە سەر دوو تەوەرە (هۆكارە دەرەكییەكان و هۆكارە ناوخۆییەكان)، وە هەریەكە لەو تەوەرانەش دابەشكراون بەسەر چەند خاڵێكدا.

ئەم لێكۆڵینەوەیە هەوڵێكە بۆ نووسینەوەی مێژووی هاوچەرخی گەلی كورد لە باشووری كوردستان، مێژوویەك كە گرنگی تایبەتی خۆی هەیە لەم بەشەی كوردستان بەتایبەتی لە كۆتاییەكانی دەیەی سەدەی بیستەم، چونكە گۆڕانگاریەكان دواتر ئەو گرنگییەیان زیاتر دەرخست

بەتایبەتی لەبەرجەستە بوونی ئەنجامە باشەکانی ئەو راپەرینە بەگشتی، وەک دامەزراندنی حکومەتی کوردستان و هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان وەک گۆرانکاریەکانی ریشەیی لەمێژوووی هاوچەرخی کورد لەباشووری کوردستاندا، بۆیە گرنگە زیاتر بایەخ بدرێت بەم رووداوە مێژووییانە بەمەبەستی روونکردنەوەی زیاتر بۆ نەوەی داهاتوو.

هاورێ قادر رەسوڵ: لێکۆڵینەوەیەک لەبارەی راپەرینەکەی بەهاری ١٩٩١ی باشووری کوردستان. چ لەبڵاوکراوەکانی بنکەی کوردۆ سۆران لەهەندەران، هۆڵندە، ١٩٨٤، هەروەها ماستەر نامەی (ئاراس عەبدولرەحمان مستەفا)، راپەرینی باشووری کوردستان لەساڵی ١٩٩١دا پێشکەشی بەشی مێژووی کۆلێژی زانستە کۆمەڵایەتییەکان زانکۆ کۆیەی کردووە لەساڵی ٢٠٠٨دا. بۆیە هیوادارم ئەم هەوڵەی من بەشێکی کەم بێت لەو هەوڵە زانستیانەی کە لەم بوارەدا دراون و لە داهاتووش دەدرێن، بەمەبەستی زیاتر خزمەتکردنی کتێبخانەی کوردی لەلایەک و نووسینەوەی مێژووی هاوچەرخی گەلەکەمان لەلایەکی دیکە.

لە کۆتاییشدا ئەنجام و لیستی سەرچاوەکان و پوختەی توێژینەوەکە بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی خراونەتە روو.

**نووسەر**

**٢٠٠٧/٨/١٥ - کۆیە**

### سەرەتایەکی مێژوویی شاری هەولێر:

هەولێر هەر لەدێر زەمانەوە پلەو پایەکی گرنگی لەجیهاندا هەبووە، بەتایبەتی لەمێژووی رۆژهەڵاتی کۆندا، چونکە چەندین وڵات و میرنشین حوکمرانییان بەسەر داکردووە و ململانێیەکی زۆر لەنێوان ئەو نەتەوە دێرینانەی کە لەم ناوچەیەو دەوروبەریدا ژیاون، روویداوە.

ئەم تایبەتمەندیەش لەرووی مێژووییەوە وای لە هەولێر کردووە ببێتە شوێنێکی مێژوویی و جوگرافی ئەوتۆ کە مێژوونووسان و لێکۆڵەرەوان بەرەو ناخی رابردووی ئەم شارە شۆڕببنەوەو زیاتر لە بنج و بنەوانی و لە رەوشە جیاجیاکانی بکۆڵنەوەو بەدوای شوێنەوارە دێرینەکانی دا بگەرێن بۆئەوەی رابردوو ئیستای ئەم شارە لە زنجیرەیەکی توندوتۆڵدا بەیەکترەوە ببەستنەوە.

هەولێر یەکێکە لەشارە گرنگەکانی مێژوو، چونکە هەر لە سەردەمە دێرینەکانەوە یەکەمین جار کە مرۆڤ فێری نیشتەجێبوون بوو لەوشارەو ناوچەکانی دا نیشتەجێبوون دروست بووە، یەکەم جار بەشێوەی گوندی کشتوکاڵی لە نزیکەی شەش هەزار ساڵی بەر لە زایین، واتە لەوکاتەوەی مرۆڤ گوندی کشتوکاڵی و ژیانی کۆمەڵایەتی ساکاری پێکەوە ناوە[1].

سەبارەت بەناوەکەی، لە مێژوودا بەچەند شێوەیەک هاتووە، بۆ نموونە کۆنترین ناوی (٢٠٠٠ ساڵ پ.ز) لە نووسینەکانی شای سۆمەری (شولگی) بە (ئوربیلم) هاتووە[2]، لە دەقە بابلی و ئاشوریەکانیش دا بە (ئەربائیلۆ) هاتووەو واتای (أربعة ألهة-چوار خوا) دەگەیەنێ[3]، لە دەقە فارسیە کۆنەکاندا کە بەرێنووسی بزماری نووسراون ناوی بە (ئەربیرا) هاتووە[4]، لە سەرچاوە یۆنانی و رۆمانیەکانیشدا بە (ئاربیلا) یان (ئەربەلا) ناوی براوە[5]، لە سەردەمی ئەسکەندەری گەورەش (٣٣١پ.ز) بە (ئەربیلا و ئەربلا) ناوبراوە[6]، هەروەها لە سەردەمی ئیسلامیدا بە (أربل) ناوبراوە[7]، هەندێکی دیکە دەڵێن ناوەکەی لە (هیلۆ)ی خوای رۆژ وەرگیراوە، بۆیە بە واتای (شاری رۆژ) دێ[8]، کوردیش پێی دەڵێن (هەولێر)[9]، لێرەدا ئەگەر (هەولێر) بێ، یان (ئەربیل-ئەربیلا-ئەرابیلو-ئەربیلو-ئەربەئیلو-ئەربائیلا-ئەربائیلو-ئەربل)، ئەوا هەمووویان لەیەک نزیکن و دەچنەوە سەر یەک بنچینە، کە ئەویش مانای بوونی چوار خوایە لەم شوێنەدا[10].

بۆیە لەگەڵ ئەوەی مێژوونووسانیش کۆک نین لەسەر ناوی ئەم شارە، بەڵام پێمان وایە کە ناوی شاری هەولێر لە (ئەربائیلۆ)ی ئاشوریەکانەوە هاتووە، مانای بوونی چوار خواوند دەگەیەنێ لەم شوێنەدا.

زەوییەکانی ناوچەی هەولێر دەکەوێتە دەشتێکی فراوان و لەنێوان دۆڵی هەردوو زێی گەورەو بچووک دا، هەروەها هاوسنوورە لە باکوورەوە لەگەڵ تورکیا، لەباشوورەوە لەگەڵ لیوای کەرکوک، لە رۆژهەڵاتیشەوە

لەگەڵ ئێران و بەشێک لە لیوای سلێمانی و لە رۆژئاواشەوە لیوای موسڵ هاوسنووریەتی[11]، و دەکەوێتە سەر هێڵی پانی (11-36) پلە باکورو هێڵی درێژی (2-42) پلە رۆژهەلاَت، واتە ناوەراستی باشووری کوردستان، ئەم شارە شوێنێکی ستراتیژی گرنگی هەیەو هەر لە کۆنەوە مەڵبەندی بووژاندنەوەی ئابووری ناوچەکەو چەقی جمووجۆڵە سەربازی و بازرگانیەکان بووە[12].

لەرووی جوگرافیشەوە گرنگی تایبەتی خۆی هەبووە، بۆیە دەبینین فراوانخوازیەکانی سەرجۆنی ئەکەدی (2371-2316پ.ز) بەهەولێریش گەیشتووە، ئەمەش بەمەبەستی دەست بەسەراگرتنی ئەو رێگاو بانانەی لە باکورەوە بۆ ناوەراست و باشوور دەچوون و دەرامەتیان پێدا تێدەپەری[13]. ئەم شارە لە سەردەمە جیاجیایە مێژووییەکاندا، وەک پێگەیەکی گرنگی ناوچەکە تووشی شالاَوو داگیرکاری بۆتەوە، بۆیەش کاتێک (گۆتیەکان)[14] دەستیان بەسەر دەوڵەتی ئەکەدی داگرت، هەولێرو کەرکوکیش کەوتنە چوارچێوەی ئەودەسەلاَتەوە، هەولێر لەوماوەیەدا یەکێک بوو لەپێگە هەرە سەرەکیەکانی گۆتیەکان[15].

دوای گۆتیەکان هەولێر رووبەرووی هێزێکی تازە بۆوە ئەویش فەرمانرەوایانی ئوری سێیەمین (2050-1950پ.ز) دەستیان گرت بەسەر گۆتیەکان لەرووی سیاسیەوە، بەلاَم لەتوانایاندا نەبوو پارێزگاری لە هەولێر بکەن، ئەمەش بەهۆی دووری ئەوشارە لە مەملەکەتی ئوری سێیەم لە باشوور[16]. کاتێکیش کە (کاشیەکان)[17] دەرکەوتن، هەولێر کەوتە چوارچێوەی دەسەلاَتی ئەوانەوە[18].

سەرهەڵدانی دەوڵەتی کاشیەکان هاوکات بوو لەگەڵ پێگەیشتنی مەملەکەتی ئاشوری لەباکوورو دەرکەوتنی چەند نەتەوەیەکی تازە لەناوچەکەدا، وەک (میتانی)[19]، (خووریەکان)[20] لەناوچەیەکی فراواندا بلاَ وبوونەوە، کە لە چیای زاگرۆسەوە درێژ دە بۆوە تادەریای ناوەراست. دەسەلاَتی میتانیەکان لەوماوەیەدا لە کوردستان زۆرتر بلاَ وبوو بۆوە، تەنانەت ئاشوریەکانیش کەوتبوونە ژێر رکێفیانەوە، دەشتەکانی ئاشورو هەولێر و کەرکوک لە چوارچێوەی ئەودەوڵەتە تازەیەدابوون[21]. لەسەردەمی دەوڵەتی ئاشووریدا هەولێر بەجوانترین رۆژگارەکانی دا تێپەردەبوو، بە تایبەتی کە ببووە پایتەختێکی ئاینی ئاشووریەکان، لەوکاتەدا بەیەکێک لە مەڵبەندەکانی پەرستنی خواوەند (عشتار) ناوبانگی دەرکردبوو، کە ئەوخواوەندە بەناوی عشتار (أربلا) دەناسرا،و ناوی پەرستگاکەشی لە نووسینە بزماریەکاندا بەشێوازی (ای-کشان-کلاما) هاتووە، واتە ماڵی خاتوونی هەرێم، هەروەها پەرستگایەکی بۆ خواوەند ئاشوور تێدابووە[22].

هەولێر وەک شارێکی دێرین چەند گرنگیەکی تایبەت بەخۆی هەیە، کە هەردوو مێژوو نووس (زبیر بلال و عبدالرزاق الحسنی) بەم شێوەیە ئاماژەیان پێداوە:

١- دەکەوێتە ناوچەیەکی بەپیت و بەرەکەت.

٢- هەروەها بەهۆی پێگە گرنگەکەی ببووە مەڵبەندی سەرەکی کاروانە بازرگانیەکان، کەوا دەکەوتە سەر رێگا بازرگانیەکان، کە دەکەوتە سەر رێگای مێژوویی لەسەردەمی بابلی-ئاشوریەکان، ئەم رێگایەش سەرەتا لە نەینەوا دەستی پێکرد، بۆ (أربا-أیلو)، دوایی بۆ (آرابخا-کەرکوک) پاشان بۆ ولاَتی بابل.

٣- هەرێمی هەولێر بەشی گەورەی دەوڵەتی ئاشوری پێک دەهێنا، هەروەها پێگەی شارەکە کە کەوتۆتە ناوەراستی دەشتێکی بەپیت، وای لێکرد، ببێتە شارێکی سەرەکی لەسەدەکانی کۆن[23].

٤- ئەم شارە سەرباری پێشکەوتنی ژیاری و ئاوەدانی، یەکێک بوو لە بنکە سەربازیەکانی ئاشوریەکان بۆ شالاَوە سەربازیەکانی بەرەو ناوچەکانی رۆژهەلاَت.

٥- هەروەها مەڵبەندێکی گرنگی پەرستگای خواوەندی (عشتار) بوو، وەپەرستگاکەی مەڵبەندێک بوو بۆ (فاڵ) وەکو (دلفوس)ی یۆنانی.

٦- لەبەر ئەوەی ناوچەی هەولێر دەوڵەمەند بوو بەئاوی ژێرزەوی و کارێزەکانی، کە رۆڵی سەرەکی هەبوو لەسەر ژیان لەشارەکەدا، وداگیرکەران نەیان توانی کارێزو سەرچاوە ئاویەکان تێک بدەن، وەک چۆن سەرچاوەکانی ئاوی بابل و شارەکانی باشووریان تێک دا[24].

هەولێر وەک شارێکی کۆن

ناسراوەو وەبەردەوام بووە و پارێزگاری لەناوی کردووە تا ئەمڕۆ بە هۆی ئەو ئەدگارو خەسڵەتانەی لە سەرەوە ئاماژەمان پێیاندا، بۆیە بەکۆنترین شاری زیندوو و ئاوەدانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و جیهان دادەنرێت[٢٥].

ئەو شارە بۆ ماوەیەک لەژێر فەرمانڕەوای هەخامەنشینەکان مایەوە تائیمپراتۆریەتەکەیان زەوت کرا لەلایەن ئەسکەندەری مەکەدۆنی لە شەڕێکی یەکلا کەرەوە کە لەنزیک شاری هەولێر هەڵگیرسا[٢٦]. بەمەش بوو بە بەشێک لە ئیمپراتۆریەتە فراوانەکەی ئەسکەندەر، ئەوکاتەش ساڵی (٣٢٣پ.ز) کە ئەسکەندەر لەبابل کۆچی دوایی کرد، هەولێر بوو بە موڵکی یەکێک لە سەرکردەکانی کە ناوی (سلۆقس[٢٧])بوو[٢٨]. هەروەها فرثیهکانیش لەسەر شانۆی ناوچەکە دەرکەوتن (١٤٨پ.ز-٢٢٦ز) دەستیان بەسەر ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی سلۆقیەکان داگرت و بەداگیرکاری وڵاتێکی یەکگرتوویان قووت کردەوە، کە لە ژمارەیەک میرنشینی یەکگرتوو وەک: میرنشینی روهاو تدمرو سنجارو حضر، دواتریش میرنشینی حدیاب پێکهاتبوو، هەولێر لە گرنگترین شارەکانی بووە[٢٩]. ئەم گۆڕانە لە هێزی سیاسی ناوچەکە بەردەوام دەبێت، بۆیە پاش فرثیهکان، هەولێر تووشی داگیرکاری دەبێتەوە لەلایەن رۆمانەکان، لە بەناوبانگترین ئەو مەلیکانەی رۆمانیش کە هەولێری داگیر کرد (کراکلا) بوو[٣٠]. دوای ئەو قۆناغە مێژووییانەی کە هەولێر پێیدا تێپەڕیوە، تیایداچەندین هێزی سیاسی جیاجیا لەو ناوچەیە حوکمیان کردووەو رۆڵی مێژوویی خۆیان هەبووە لەسەری بەڵام ئەمجارە رووبە رووی هێرش و پەلاماری هێزێکی تازە دەبێتەوە ئەویش هێزی ئیسلامە، و لەسەردەمی خەلیفە (عمر بن خطاب خ.ل) دا دەکەوێتە چوارچێوەی دەوڵەتی ئیسلامیەوە[٣١]. دوای ئەوەی (عقبە بن فرقد) دەستی بەسەر موسڵ داگرت، توانی زۆربەی شارەکانی کوردستان یەک لە دوای یەک داگیر بکات، وەک ناوچەکانی زاخۆ و ئامێدی و دهۆک و ئاکرێ، وێڕای هەولێر و سلێمانیش[٣٢].

لە نزیک هەولێر شەڕێکی گەورە و بەهێز لەنێوان عەباسی و ئومەویەکاندا ساڵی (١٣٢ک/٧٥٠ز) هەڵگیرسا و بەشەڕی (الزاب) ناسرا، تیایدا مەروانی کوڕی محمدی دوامیرنشینی بەنی ئومەییە شکستی هێنا[٣٣]، وهەولێر بووە شارێک لە چوارچێوەی ئیمپراتۆریەتە فراوانەکەی دەوڵەتی عەباسی.

بەم جۆرە لەچوار چێوەی دەسەڵاتی ئیسلامیشدا هەولێر بارێکی ئاسایی و ئارامی بەخۆوە نەبینیوە، بەڵکو چەندین میرنشین حوکمی تیادا کردووە، بۆ نموونە لەسەردەمی بویهیەکاندا کاتێک دەستیان بەسەر خەلافەتی عەباسیدا گرتبوو (٣٣٤-٤٤٧ک ٩٤٤/-١٠٥٥ز)و (هەزبانیەکان[٣٤]) توانییان میرنشینایەتییەکی شیاو بۆ خۆیان دروست کەن، هەولێریشیان کرد بە پایتەختی خۆیان، بەڵام هەرزوو بەزوو ئەم میرنشینە کوردییە کەوتە ناکۆکییەوە لەگەڵ میرنشینێکی دیکەی کورد بەناوی (میرنشینی عقر الحمیدیة)[٣٥]. ساڵی (٥٣٩/١١٤٤ز) زین الدین علی



کۆسرەت رەسوڵ

کوچک کوڕی بکتکین کوڕی محمد، کە سەرکردایەتی قەڵای موسڵی بۆ عـــــمادالدین دەکـــرد، توانی میرنشینێکی ناوچەیی لەهەولێرو دەوروبەری دروست بکات کە بەناوی میرنشینی بەکتیکی ناسراوە، جگە لە هەولێـــریش شـــارەزورو چەند ناوچەیەکی دیکەشی دەگرتەوە[٣٦].

کـــــاتێک زین الدین (٥٦٣ک/١١٦٨ز) کـــۆچی دوایی کرد، کوڕە بچووکەکەی (زین الدین یوسف) شوێنی گرتەوە، دوای ئەویش (مظفرالدین کوکبری) برای لەساڵی (٥٨٦ک/١١٩٠ز) دەسەڵاتی گرتە دەست و هەولێر لە فەرمانڕەوایەتی ئەم مـــیرەدا بوو بە بەهێـــزترین میرنشینە ئیسلامیەکان[٣٧]، هەر لە سەردەمی ئەمیشدا بەجوانترین و باشترین و گەشترین رۆژگاریدا تێپەڕی، کە بەدرێژایی سەدەکانی ناوەڕاست گەشەکردنێکی وای بەخۆوە نەدیبوو[٣٨].

شـــایانی باســـە لەســـەردەمی مظفرالدین و دوای ئەویش هەولێـــر تووشی داگیرکاریەکانی مەغۆل بووبووەوە، ئەوکـــاتەشی ســـاڵی (٦٥٦ک/١٢٥٨ز) کـــە بەغـــدا بەدەستی هۆلاکۆ رووخا، هەولێر یەکێک بوو لەو (سێ شارەی)[٣٩] کە بەرگری و بەرەنگاریـــەکی زۆریان کـــرد[٤٠]. لەکـــاتی ئەم هێـــرش و پەلامارانەدا، هەولێـــر زوڵمی زۆری بەدەستی مەغۆلەکان دیوە و بەشێکی زۆریشـــیـــان لێی رووخـــاندوە[٤١]. جەلائیریەکان پاش ئیلخانیەکان ناوچەکەیان داگیرکرد ساڵی ١٣٣٧ز، پاشـــانیش شـــاری هەولێـــر چووە ژێر دەسەڵاتی تورکمانی قەرە قۆینلو و ئاق قـــۆینلو ســـاڵی ١٤١٠ز[٤٢]، لە ســـاڵی ١٥٠٨زدا کەوتە ژێردەستی سەفەوییەکان تا ساڵی ١٥١٤ز کاتێک کە سەفەوییەکان لەشەڕی چاڵدێران دا بەرامـــبـــەر بە عوسمانیەکان شکان، بۆیە ئیدی لەوێوە شـــاری هەولێـــر کـــەوتە ژێردەسەڵاتی عوسمانیەکان[٤٣]، پاش ئەوەی ناوچەکـــە بەتەواوی کـــەوتە ژێرئاڵای عوسمانی لەساڵی ١٥٤٣ز، و بوو بە بەشـــێـــک لەدەوڵەتی عوسمانی و والیەکیان بەپلەی وەزیر بۆ دانا و بەمـــەش هەولێـــر کـــەوتە چوارچێوەی دەسەڵاتی عوسمانیەوە، چونکە ئەوکاتە هەولێر قەزایەک بوو سەر بە بەغدا[٤٤]. لەسەردەمی محمد پاشای ڕەواندزیش لە ساڵی ١٨٣٦ز پایتەختی سەردەمی میرانی سۆران بووە[٤٥].

دوای عـوســـمـانیـەکـان هەولێـر لەلایەن بەریتـــانیـــاوە لە (١٠ی تشرینی دووەمی١٩١٨) داگیرکراوەو یەکەم یاریدەدەری حاکمی سیاسیان بەناوی نەقیب (های) لەحوزەیرانی ١٩١٩ بۆ داناوەو لە رۆژی تشرینی دووەمی ١٩١٩ لیـوای هەولێریان پێکهێناوە[٤٦]. بەمەش هەولێر کەوتە قۆناغێکی مێژووی هاوچەرخەوە، قۆناغـێک لە ژێر ستـەم و زوڵمی حکومەتە یەک لە دوای یەکەکانی عێـراقی تازە دامەزراو، هەتا دوای نەمانی دەسەڵاتی پاشایەتی لە عێراق و راگەیاندنی کۆماری عێـراق، بە دەسەڵاتی رژێمی بەعسیشەوە، تا ساڵی ١٩٩١ی باشووری کوردستان، کـە چەندین گـۆڕانکاری و رووداوی مێژوویی تیایدا خوڵقاو رەنگدانەوەی راســـتـەوخـۆیان بەســـەر بارودۆخی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و رۆشنبـیـری و... هتـد. ئەو شـارە هەبووە کە سـەرجەمیـان لەقۆناغـە مێـژووییەکانی دوابەدوای سەدەی بیستەمدا لە باشووری کوردستان بەتایبەتی و عێراق بەگشتی رەنگیان داتەوە.



زرێ پۆش لەژێر پێی راپەڕیوانی هەولێر

### باسی یەکەم
### بارودۆخی سیاسیی باشووری کوردستان بەر لە راپەڕین:

ماوەی نێوان سالانی ۱۹۸۰بۆ۱۹۹۰، کوردستان تووشی گەلێک رووداو و کارەساتی ناهەموار بۆوە، وەگەلێک دەرفەتی بۆ رەخساو نالەبارییەکی زۆریش رووی تێکرد بۆ لەناوچوونی بەری ئەم دەرفەتانە.

پاش شەڕی جیهانی دووەم هیچ رووداوێک هێندەی (شەڕی عێراق - ئێران)[*] کاریگەری لەسەر کوردستان نەبووە، ئەو شەڕە هەر لە سەرەتاوە تاکۆتاییەکەی لەبەرژەوەندی کورد دابوو، بە قازانج بۆ شۆڕشی کورد و میللەتی کورد دەگەڕایەوە،[٤٧] دەسپێکردنی ئەو جەنگە هەلی گەشانەوەی بۆ بزووتنەوەی چەکداریی کورد رەخساند، چونکە بەغدای ناچارکرد بەشێکی زۆری هێزەکانی بکێشێتەوە بۆ بەرەکانی شەڕ لەناوەندو باشووری عێراق دا[٤٨]، بەم کشانەوەیەش سنووری چالاکی پێشمەرگەی کوردستان فراوان بوو[٤٩]، بۆ کورد ئەم جەنگە وەهای کرد جگە لەو چەند سەد پێشمەرگەیەی پاش نسکۆی ۱۹۷۵ لە دەرەوەی عێراق لەگەڵ سەرکردەکانیاندا مابونەوەو دەستیان بەشەڕی دژ بەرژێم کردبۆوە، هەزارەها کەسی دیکە لە (ئۆردووگا زۆرەملێیەکان)، کە رژێم بۆ خەڵکە راگوێزراوەکانی دروستکردبوو، روو لە ناوچە شاخاوییەکانی کوردستان[٥٠].

لەرووی ژمارەوە هێزی پێشمەرگەی کوردستان بەتەواوی گەشەی کردبوو، بەسەدان، بگرە بەهەزاران کەس لەو سەربازانەی کە سوپای عێراقیان بەجێ دەهێشت چوونە ریزی هێزی پێشمەرگەی کوردستان، لەوانە دەیان کەسیان وەک کادیری سیاسی و پێشمەرگە رۆڵی خۆیان گێڕا لە گەشەکردنی شۆڕشی کوردستان.

بۆیە دەبینین کە شەڕی عێراق- ئێران سوودی زۆری بۆ هێزی پێشمەرگەی کوردستان هەبووە لە رووی زیاد بوونی ژمارەی هێزی پێشمەرگەوە، چونکە پێش روودانی ئەم شەڕە هەموو هێزی پێشمەرگەی کوردستان خۆی لە نزیکەی (٤٠٠٠- ٥٠٠٠) کەس نەدەدا[٥١].

جگە لەمەش حکومەتی عێراقی بەهۆی ئەم شەڕەوە توانای سەربازی کەم ببۆوە، شپرزە بوو بوو، توانای هێرشی بۆ سەر بنکەو گروپە پارتیزانەکانی پێشمەرگە لاواز ببوو، هەروەها بەهۆی ئەم شەڕەوە هەر زوو هێزی پێشمەرگەی کوردستان دەسەڵاتی بەسەر کوردستان زیاد بوو، بەهۆی کشانەوەی هێزەکانی دوژمن لە هەندێ ناوچە، هێزی پێشمەرگە بارەگای لێ دامەزراند[٥٢]. هەروەها حکومەتی بەعس نە دەپرژایە سەرکارەکانی وەک پێویست، هەروەها بەهۆی جەنگەوە نەی دەتوانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان تەواو کۆنترۆڵ بکات و رێگری بکات لەبەردەم چالاکی و هاتوچۆکانیان لەنێوان دێهات و هەتابگرە لەنێوان شارە گەورەکانی کوردستان، هێزی پێشمەرگە جیا لەجاران دەیانتوانی بەرۆژ هاتوچۆیکەن لە دەوروبەری شارەکان، کە پێشتر ئەمەیان بەئاسانی بۆ مەیسەر نەدەبوو لەبەر درندەیی دوژمن، لەم بارەیەوە (رێباز) لە کتێبی (قەندیل بەغدای هەژاند)دا، دەڵێت: "ئەو رۆژەی کە شەڕی عێراق-ئێران دەستی پێکرد لە ناوچەی دەشتی هەولێر بووین،



خرۆشانی تینووانی ئازادی

ڕۆژێکی زۆر خۆش بوو بۆیەکەمین جار بەڕۆژ لەگوندەکان سووڕاینەوە بە ئوتومبێل هەتا دەوروبەری بێستانەی گەورە لە ناحیەی قوشتەپە هاتین، ئومێدی شۆڕشگێڕان بە شۆڕشەکەیان زیاتربوو خەڵکیش هەرچەندە ترس و سامی بەعسیەکانی لەسەر نیشتبوو، بەڵام بەو شەڕە کوردایەتی سەرلەنوێ لەدڵ و دەروونیان بووژایەوە هیواو ئاواتیان پەیدا کردەوە"[٥٣].

تاپێش کۆتایی هاتنی جەنگی عێراق-ئێران، بارودۆخەکە لەبەرژەوەندی بزووتنەوەی رزگاری خوازانەی کورد بوو، بەڵام کاتێک (جەنگی عێراق-ئێران)[**] وەستا، بارودۆخەکە پێچەوانە بۆوە، کۆتایی هاتنی شەڕو پێکداداان بەپێی هەلومەرجی عێراق دەرفەتێکی مێژوویی لەباری بۆ بەغدا رەخساند هەوڵ و تەقەلای دەمێ ساڵی خۆی بگەیەنێتە لوتکەو کورد بێنێ بەچۆکدا[٥٤]، چونکە راوەستانی شەڕ بووە هۆی شکستێکی گەورەی هێزە چەکداریە کوردیەکان لە خوارووو رۆژهەڵاتی کوردستان، بەتایبەتی کاتێک رژێمی عێراق یارمەتی ئەو هێزە کوردیانەی دەدا کە شان بەشانی شەڕی ئێرانیان دەکرد، وەهەروەها رژێمی ئێرانیش یارمەتی ئەوهێزە کوردیانەی دەدا کەشان بەشانی شەڕیان دەکرد دژی عێراق، عێراق و ئێران وایان دەربڕی کە دەوری هێزە کوردیەکان کۆتایی هات، بەکۆتایی شەڕی نێوانیان[٥٥]. ئەحمەد بامەڕنی نوێنەری (ی.ن.ک) لە فەرەنسا، پێش ئەم رووداوانە ئەوەی راگەیاندبوو کە ئەگەری ئاگربەسی نێوان عێراق و ئێران ئەنجامەکەی کارەساتێکی گەورە دەبێت بۆ کورد[٥٦].

لە هەل و مەرجێکی وادا بارودۆخی کوردستان پێش راپەڕین بارودۆخێکی زۆر نالەباربوو، بەتایبەتی کاتێک کە جەنگ وەستا، چونکە سوپای عێراق بەهەموو توانای خۆی هاتەوە سەر کوردستان[٥٧].

رۆژی ٥ی ئابی ١٩٨٨ تەنانەت پێش ئاگر بەس لەگەڵ ئێران، بە ١٢ لەشکری عێراق و ١٨تیپی (جاش خەفیفە) (جاشی کورد)، بە پشتیوانی هێزی ئاسمانی هێرشیان کردە سەر جێگاکانی پارتی لە ناوچەی سیدەکان لەپارێزگای هەولێر[٥٨]، هەوڵی خاپوور کردنی ئابووری و ژیانی کۆمەڵایەتی دێهاتی کوردستانی لەرێی دەرکردن و کاولکردنەوە دا، ئەو دێهاتانەی راستەوخۆ لەبەرەی جەنگدا نەبوون، هەموو جۆرە خزمەتگوزاریەکی کۆمەڵایەتی، تەندروستی و رۆشنبیریان لێ برا، ئەمەش بۆئەوەی دانیشتوانی ئەو دێهاتانە ناچار بکات کۆچ بەرە و باژێڕ و شارەکان بکەن، بۆنموونە، بریاری داخستنی (٧٤٨) قوتابخانەی سەرەتایی دا لە دێهاتەکانی سەربە هەولێر و سلێمانی و دهۆک[٥٩]. لە ئەنجامی ئەو کارەساتانەدا بارودۆخی ئابووری خەڵکی کوردستان، بە تایبەتی ئەوانەی لەلادێکانەوە دەگوێزرانەوە زۆر شپرزە ببوو[٦٠]، شۆڕشی کوردیش بە ئەندازەی نیوەی شۆڕشی ١٩٧٤ هێزو توانای نەمابوو[٦١]، بەڵام ئەگەر ئەو رۆژگارانەی ئەوسەردەم بەراورد بکەین بەنسکۆی شۆڕشی ئەیلولی ١٩٧٥، ئەوا ساڵی ١٩٨٨ کارەساتەکە زۆر نالەبارتر بوو، چونکە هیچ دێهاتێکی کوردستان نەمابوو، هەروەها حکومەتی عێراقیش چەندین سیاسەتی جۆراوجۆری گرتبووە بەر بۆ تواندنەوەی نەتەوەی کورد، بەدرێژایی ساڵانی دەسەڵاتی تا بەر پەرپابوونی راپەڕین لەباشووری کوردستان بەردەوام بوو، کە دەکرێت بەم شێوەیە بیانخەینە روو:

**یەکەم: سیاسەتی بەعەرەبکردن (التعریب):**

سیاسەتی بەعەرەبکردن، یەکێکی ترە لە سیاسەتەکانی رژێمی عێراق بەرامبەر بە کورد، کە مەبەستی داگیرکردنی کوردستان و تواندنەوەی نەتەوەی کورد بوو، و بۆئەوەی نیشتمانی کورد بکاتە خاکی مێژوویی عەرەب و بەشێکیش لە کورد بەعەرەب لەقەڵەم بدا، تا لەلایەکەوە چەند بۆی بکرێ باشووری کوردستان پارچە پارچە بکات و بەعەرەبی بکا، لەلایەکی تریشەوە نەخشەی دیمۆگرافی کوردستان و عێراق بگۆڕێ بۆئەوەی بەشێک لە نەتەوەی کورد بکاتە عەرەب[٦٢].

ئەم سیاسەتە لە باشووری کوردستان سیاسەتێکی نوێ و کاتی نەبوو، بەڵکو مەبەست و ریشەی مێژووی درێژ خایەن و ستراتیژی خۆی هەبوو، لەپێناوی چەسپاندنی بۆچوون و تیوریە شۆڤینیەکانی خۆیان، لەسەر دەست بەسەر داگرتنی بەروبووم و سامانە سروشتیەکانی

کوردستان و تواندنەوەی گەلەکەی لەناو گەلی عەرەبی سەردەستدا[٦٣].

لەگەڵ بەهێزبوونی تەیارە نەتەوە پەرستەکانی عەرەب و پاش ئەوەی توانی جێگەی خۆی لەسەر شانۆی سیاسی ناوچەکە بکاتەوە، دەبینین هەر لەسەرەتاوە جووڵانەوەی کوردیان بەکۆسپی بەردەمی یەکێتی عەرەب داناوە، و کوردیان بە بەشێک لە عەرەب و کوردستانیش بە بەشێک لە نیشتمانی عەرەب دادەنا، بۆیە بەربەرەکانی کورد و بزووتنەوەی نیشتمانی کوردستان و مافەنەتەوایەتییەکەیان، لەرێگەی بەعەرەبکردنەوە گرتبووە بەر[٦٤].

بۆیە ئەگەر چاوێک بەجوگرافیای کوردستان و مێژووی پێکهاتەکەی دابگێڕین بەر لە راپەڕین، دەبینین زۆر شێواندن و گۆڕان بەدی دەکرا، کە نەخشەی باشووری کوردستان و باری دیمۆگرافی و لایەنی ئابووری و کشتوکاڵ و سامانی ئاژەڵ و باغ و بێستان و سەرچاوەی ئاو و بیرو کانی و ناوچە دێهاتیەکان...هتد، زۆربەی لە جێگەی خۆی نەمابوون[٦٥].

سیاسەتی بەعەرەبکردن سەرتاپای کوردستانی گرتبۆوە بێ جیاوازی، بۆیە شاری (هەولێر)یش وەک شارەکانی دیکەی کوردستان بێبەش نەبووە لەم سیاسەتە. کە سنووری ئەم پارێزگایە دووچاری ئەم سیاسەتە چەواشەیە بۆوە و زۆرێک لە زەویەکانی خەڵکی عەرەبی تێدا نیشتەجێ کراون[٦٦]، ئەم پرۆسەیەش لە رێگای هێنانی خەڵکی خێڵەکی عەرەبی باشووری عێراق، بەهاندان و



لەگەرمەی راپەڕیندا

دەم چەورکردن و یارمەتیدان و خانووبەرە بۆ دروستکردن ئەنجامدەدرا، پاش ئەوەی دەخرانە سەر کەڵکەڵەی ئەوەی بێن بۆ باشووری کوردستان، سەرەنجام جوتیارە کوردەکانی لە رەگ و ریشە هەڵدەکەندو لە ئۆردووگا زۆرەملێیەکانی ژێر دەسەڵاتی کە بەدرێژایی رێگا و بانە سەرەکیەکان دروست کرابوون، نیشتەجێ دەکرد[٦٧]. لە شاری هەولێر بێ رەوشتی دەزگاکانی (بەعس و ئەمن) گەیشتبوە رادەیەکی وا کە کەس پێی قبوڵ نەدەکراو لەهەمان کاتدا بەعەرەبکردنیش بێ کۆسپ و تەگەرە بووە لەبەردەم بەعسیەکاندا[٦٨].

ئەم سیاسەتە زۆربەی شارەکانی کوردستانی گرتەوە، بۆیە دەتوانین بەعەرەبکردن بەیەکێک لە هۆکارەکانی دیکەی راپەڕینی ئازاری ١٩٩١ دابنرێت.

## دووەم: سیاسەتی بە بەعسیکردن (التبعیث):

حیزبی بەعس لە ناوەراستی چلەکانی سەدەی بیستەم، لەسوریا، لەبارودۆخێکی (ئابووری، سیاسی، کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی)ی دواکەوتوودا جووڵانەوەیەکی نەتەوە پەرست بەناوی (جووڵانەوەی بەعسی عەرەب)و بەقۆستنەوەی ئەو بۆشاییە سیاسی و ئایدۆلۆژیەی ئەو سەردەم سەری هەڵداو، لە دەروازەیەکی نەتەوەپەرستانەی قاڵب و لەناوبۆتەی نازیزمدا هاتە کۆڕی ژیانی سیاسی عەرەبەوە، کە بۆیەکەم جار لەعێراقدا "١٩٦٣/٢/٨" بۆچەند مانگێک دەسەڵاتی گرتە دەست وو پاشان بۆجاری دووەم لە "١٩٦٨/٧/١٧" بەپێی پیلانێکی ئیمپریالیستانە، دەسەڵاتی لە عێراق گرتەوە دەست و تاراپەڕینی ١٩٩١، لەکوردستان جڵەوی ئەو دەسەڵاتەی هەر

بەدەستەوە بوو[٦٩].

بەگرتنە دەستی دەسەڵات لەلایەن حزبی بەعس لەعێراقدا، گەلی عێراق بەگشتی و نەتەوەی کورد بەتایبەتی لە سەختترین رۆژانی (سیاسیی-کۆمەڵایەتی) خۆیاندا دەژیان، چونکە هەڵگرتنی هەر جۆرە ئایدیایەک، جگە لە ئایدیای بەعس قەدەغە بوو، و ئەنجامەکەشی گرتن و کوشتن بوو، چونکە بەعس بەگوێرەی ئەو سەرەتایە هەنگاوی هەڵدێناو دەیگوت: "ئەوەی لەگەڵمدا نەبێ دژمە"[٧٠].

هەر بۆیە دەبینین سەرجەم شارو شارۆچکەکانی کوردستان رووبەرووی ئەم سیاسەتە بوونەتەوە، کە بە بەعسیکردنی هاوڵاتیان کارێکی رۆژانەی بەردەوام بووە، بۆ نموونە زۆربەی خوێندکارانی کچ و کوڕ لەخانەی مامۆستایان، یان لە پەیمانگاو کۆلێژەکان وەرنەدەگیران ئەگەربە (واژۆ) یەک بە بەعسیبوونی خۆیان نەسەلماندبوایە[٧١].

بۆیە دەبینین رژێمی بەعسی عێراق بەشێوەیەکی چروپڕ ئەم سیاسەتەی بەرامبەر بەکورد گرتبووەبەر، لەچوارچێوەی جێبەجێ کسرەنی ئەم سیاسەتە شاری (هەولێر)یش لێی بەدەر نەبووەو رژێم چەندین رێگای جیاجیای بەکارهێناوە بۆ بە بەعسیکردنی هاوڵاتیان لەم شارەو سەرجەم شارەکانی دیکەی کوردستان. بەشێوەیەکی گشتی ئەو رێگایانەی کە گیرابوونە بەر بۆ بە بەعسیکردنی کورد لە باشووری کوردستان، ئەمانە بوون:

١- دامەزراندنی بەعسییەکان لە دام و دەزگاکان.

٢- بە بەعسیکردنی خوێندکاران لە ناوەندەکانی خوێندن.

٣- بە بەعسیکردنی نەتەوەکان (کورد، تورکمان، ئاشووری،...هتد).

٤- دابەشکردنی گەڕەکەکان لەسەر بنەمایەکی حیزبی و بەعساندنی بەزۆر[٧٢].

پاش بێزار کردنی خەڵک لەرێگەی ئەم سیاسەتەوە، دەتوانین بە بەعسیکردنیش بەیەکێک لە هۆکارەکانی دیکەی ئەم راپەرینە دابنێین.

**سێیەم: سیاسەتی جینۆساید بەرامبەر بەکورد:**

سیاسەتی جینۆساید (قڕکردنی بەکۆمەڵ)ی حکومەتی عێراق بەرامبەر بە نەتەوەی کورد، مێژوویەکی لەپێشینەی دوورو درێژی هەیە، بەڵام ئەوەی کە زیاتر کاریگەر بوو لەسەر کورد پەلامارەکانی ساڵی (١٩٧٨-١٩٨٩) بوون، چونکە بەقووڵی رەگیان لە مێژووی نەتەوەی کورد لە باشووری کوردستاندا کوتاوە[٧٣]. ئەم پەلامارانەش چەند خاسیەتێکی پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤیان لە خۆ گرتبوو، کە ئەمانەن:

**١- (ئەنفال):**[٧٤]

لە ٢٨ی ئابی ساڵی ١٩٨٨دا عێراق بەهێزێکی سوپایی گەورە، هێرشێکی درندانەی کردە سەر کوردستان و پێش چەند مانگێکیش هەزاران گوندی بەناوی (عملیات الانفال) تەخت کردو، خەڵکە بێتاوانەکەی ئەوانەی بەردەست کەوتن کوشتیان[٧٥] و بەشێوەیەکی بەرنامەرێژ چەکی کیمیاوی لەچوارچێوەی ئۆپەراسیۆنی ئەنفال لە دژی کورد بەکارهێنا، کە ئەو چالاکیە بووە هۆی ترس و بێ هێزی و لاوازی بزووتنەوەی کورد، چونکە حکومەتی عێراقی بەردەوام بوو لە کارە درندانەکانی بەرامبەر بە گەلی کورد، لە هێرش و پەلامارە بێ شومارەکانی بۆ قڕکردنی کورد، ئەنفالەکان بەدناوترین و نەگریسترین پەڵەیە لە مێژووی رژێمی عێراق و حیزبی بەعس و خودی سەدام حسێن، هەروەها ئۆباڵێکی سیاسی و مرۆیی گەورەشە لەسەر شانی ئەو وڵاتانەی رۆژهەڵات و رۆژئاوا، کە لەبەر بەرژەوەند بازی خۆیان لەجەنگی ساردا، رژێمی عێراقیان پڕچەکی کوشندەی کیمیاوی کردو لەکاتی بەکارهێنانیشی دژی کورد، تاوانی بێدەنگییان هەڵبژارد، جگە لەوەی دەوڵەتانی عەرەبی (سوریاو لیبیای لێ دەربهاوێن)، سەرجەم راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ، پشتیوانی سەدام بوون[٧٦].

ئەنفال تەنیا پرۆسەی جینۆسایدکردنی کتوپڕی مرۆڤی کورد نەبوو، بەڵکو ئەزموونێکی (٣٠) ساڵەی بەرنامە بۆ داڕێژراو بوو لەسەر نەخشەیەکی بەربڵا و بۆ لە ناوبردن و تواندنەوەی رەچەڵەکی کورد و گۆڕینی رەگەزی کورد بەعەرەب و شێواندنی جوگرافیا و دیمۆگرافی کوردستان، ئەم پرۆسەیە بەپێی هەل و مەرجە دژوارو تایبەتیەکانی گۆڕانی بەسەردا هاتووەو بەچەندین تاکتیک و قۆناغی جیاوازدا تێپەڕیوە[٧٧].

قۆناغی یەکەمی ئەنفالەکان

لەمانگی (٢/١٩٨٨) تامانگی (٣/١٩٨٨) و دووەمیان لەمانگی (٤ تا ٥ /١٩٨٨) و سێیەمیان لەمانگی (٥ تا ٨/١٩٨٨) و دوا قۆناغیش لەمانگی (٨) دەستی پێکردو لەمانگی (٩)دا کۆتایی پێهات[٧٨].

پرۆسەی ئەنفال لەساڵی ١٩٨٨دا سەراپا ناوچە ئازادکراوەکانی گرتەوە، بەتایبەتی ئەو ناوچانەی لەژێر دەسەڵاتی هێزی پێشمەرگەو شۆڕشدابوون، بەتایبەت ناوچەکانی (دۆڵی جافایەتی، شاربازێڕ، مەرگە، پشدەر، قەرەداغ، تەواوی گەرمیان، شارەزوور، هەورامان، پێنجوێن، گۆێژەو عەسکەر، دەشتی هەولێر، بالیسان، باڵەکایەتی، بادینان)ی دەگرتە خۆ، ئەم پرۆسەیە گەورەترین و سامناکترین شێوەی ئەنفال بوو، لەهەمان کاتدا هێزی پێشمەرگە چی لەتوانا بوو بەرگری کرد، بەڵام دەرەنجامەکەی بێ سەرو شوێنکردنی (چارەکە ملیۆنێک) کوردی لێ کەوتەوە[٧٩].

هێرشە سەربازیەکانی سوپای عێراق راستەوخۆ بۆ وێرانکردنی گوندەکانی کوردستان و بێ سەرو شوێنکردنی بەکۆمەڵی دانیشتوانی ئەو گوندانەو تاڵانکردنی ماڵ و سامانیان ئاراستە کرابوو، لەگەڵ کارەساتی (هۆلۆکۆست*)دا، بەراوردکردنی جیاوازی لە ژمارەی قوربانیانی ئەو دوو رووداوە گەورەیە، جیاوازیەکی ئەوتۆی نەبووە[٨٠].

لەگەڵ ئەوەی کە پرۆسەی ئەنفال زۆربەی شارو شارۆچکەکانی کوردستانی گرتەوە، دەبینین پارێزگای (هەولێر)یش وەک سەرجەم ناوچەکانی تری کوردستان، بەدوور نەبووە لەم پرۆسەیە، چونکە ئەم پارێزگایە دەوڵەمەندە بەسامانی کانزایی بەتایبەتی نەوت، کە نەوت کەوتۆتە خوارووی پارێزگاکە لە ناحیەی (تەق تەق)ی سەر بەقەزای (کۆیە)، کاری ئەنفالیش بەپلەی یەکەم دانیشتوانی ئەم گوند نشینانەی گرتەوەو، سەرەنجام گوندەکانی سەر بەم پارێزگایە لەقەزای (کۆیە) و ناوچە دەشتاییەکانی دەوڵەمەند بەکانزا و ناوچە شوێنەواریەکان، یەک لەدوای یەک خاپوورکران و بەرپرۆسەی ئەنفال کەوتن[٨١]، دواتر هێرشەکانی ئەنفال بەردەوام بوو بۆسەر ناوچەکانی هەولێر تا بە (عملیات خاتمە الانفال) لەرۆژی ٢٦/ئابی/١٩٨٨ لە بادینان تەواو بوو[٨٢].

بۆیە دەبینین ئەنجامی ئەم کردارانەی رژێمی عێراق، (١٨٢) هەزار کوردی لەنێر و مێ کۆکردەوە کە تەمەنیان لەنێوان (١٢-١٨) ساڵان دابوون، لەناوچەو گوندە جۆر بەجۆرەکانی کوردستان، پاش ئەوەی کۆیان کردنەوەو باریان کردن لەبار هەڵگری گەورە، دواتر بردیانن بۆ بیابانەکانی خوارووی عێراق و، بەدۆزەر چەندین چاڵی گەورەیان بۆ هەڵکەندن و سەرجەمیان تێدا زیندەبەچاڵ کردن[٨٣].

## ٢- بەکارهێنانی چەکی کیمیایی:

یەکەم هێرشی کیمیاوی نەخشە بۆکێشراو لە ١٥/٤/١٩٨٧ ئەنجامدرا، بەڵام دۆکۆمێنت و سەرچاوە کوردیەکان هاوباوەڕن لەوەدا کە لەشکری عێراق بۆیەکەم جار لەناوەندی مانگی چواری ١٩٨٧دا چەکی کیمیاوی بەکارهێناوە[٨٤]، پاشان لە ١٦/٤/١٩٨٧ بۆچەند کاتژمێرێک زیاتر بە چەکی کیمیایی بۆردومانی گوندەکانی (شێخ وەسانانی دۆڵی بالیسان)ی سەر بەهەرێمی هەولێری کردووەو، زیاتر لە (٣٠٠) هاوڵاتی ژن و منداڵ و پیر، شەهیدو بریندار بووینە[٨٥].

بەڵام گەورەترین کارەسات بەهۆی چەکی کیمیایی لە شارۆچکەی هەڵەبجە روویدا، کە کاتێک گەرمەی شەڕی نێوان عێراق-ئێران بوو، ئێران لەزۆرلاوە بەشێوەیەکی پەرش و بڵاو هێرش و پەلامارەکانی بۆسەر ناوچەکانی (کوردستانی باشوور) دەست پێ کردبوو، تادواجار بەهاوکاری هێزی پێشمەرگەو لەروو بەروو بوونەوەی شەڕێکی گەورە بەرامبەر بەعێراق، کە تیایدا لە ٨٠٪ هێزەکانی عێراق کوژران و ئەوانی تریش بەدیل گیران، دەستیان بەسەر شارۆچکەی هەڵەبجەدا گرت. بەم رووداوەش رژێمی بەعس بەبۆمبارانکردنی هەڵەبجە لە ١٦ و١٧/٣/١٩٨٨ بەگازی کیمیایی وەڵامی ئێران و دانیشتوانی هەڵەبجەی دایەوەو، سەرەنجام (٥) هەزار هاوڵاتی کورد لەناوچوون[٨٦].

پەلاماری کیمیایی بۆسەر هەڵەبجە نوقڵانە لێدەری سیاسەتی لەوەدو پاشی ئەنفال بوو، کە لەو هەشت قۆناغەی پەلامارە سەربازییەکەدا ئەم چەکە قەدەغانە

دژ بەگوندەکانی کوردستان بەکار دەهات، بەرادەیەکی وا کە دانیشتوانیان بتۆقێنێ و ئەوەی لە هەڵەبجەدا رووی دا وەبیری بێنێتەوە، لەگەڵ ئەوەی کەوا هەڵەبجە بەشێک نەبوو لە ئەنفال، بەڵام بەگەورەترین کاری دڕندەیی جەنگ دەژمێردرێت دژ بە کورد[٨٧].

### ٣- وێرانکردنی گوندەکانی کوردستان:

لەناوەراستی هەفتاکانەوە، واتە بەر لەهاتنە پێشەوەی بیرۆکەی ئەنفال، حکومەتی عێراقی پلانی تێکدانی گوندەکانی کوردستانی بەپێی رێبازو قۆناغی جیاجیا، دارشتبوو. یەکێک لە قۆناغەکانی تێکدانی گوندەکان بۆ پاش ساڵی ١٩٧٤ دەگەرێتەوە، بەتایبەتی پاش سازکردنی چەند کۆنگرەیەکی کشتوکاڵی لەلایەن دەزگا پەیوەندیدارەکانی حکومەتی عێراق، کە تیایدا پلانی راگواستنی گوندنشینەکانی خستە ناو چوار چێوەیەکی (زانستی)یەوە بۆ جێبەجێکردنی ئەم پلانەی کەپێیان دەگوت (أصلاح الزراعي)[٨٨].

حکومەتی عێراق لە ژێر ئەم پلانەدا، سەرەتا سەدەها گوندی بەناو (هاوچەرخ) و(سۆسیالیستی) و(زانستی)، لە سەرانسەری عێراق دروست کرد، هەر لە چوارچێوەی ئەم پلانەدا، چەندەها گوند لە باکوورو ناوەراست و باشووری عێراقدا خاپوورکران و لەجێگایاندا ئۆردوگای زۆرەملێ دروست کران[٨٩].

بۆیە دەبینین لەنێوان ساڵانی ١٩٧٤-١٩٧٩ ژمارەی ئەو گوندانەی خاپوورکران، گەیشتە (٧٤٢) گوند کە زۆربەیان کەوتبوونە ناوچە سنووریەکانی (باڵەک، چۆمان، مێرگەسور، ناودەشت، زاخۆ، گۆرەتوو، مەیدان، شێروان، گرمک، خورماڵ، خانەقین و بیارە)[٩٠].

پاش باڵادەست بوونی میلیتاریانەی رژێمی دیکتاتۆری بەغدا، سەرجەم کاولکاری و کارەساتی تراژیدی سەیرو سەمەرەی بەدوای خۆی داهێناو زیاتر لە (٤٠٠٠) چوار هەزار گوند خاپوورکران، بەمەش سەرجەم ناوچە گوندنشینەکان خاپوورکران و چیاو گردۆڵکەکان کرابوونە پایەگای سەربازی و مینرێژ کرابوون[٩١].

ئەم سیاسەتە لەهەموو جێگەیەکی کوردستاندا پیادە دەکراو، بەمەش کوردستان ببوە تاقیگەی جێبەجێکردنی بیرو ئایدۆلۆژیاکانی حزبی بەعس[٩٢].

### ٤- گرتن و لە سێدارەدانی بەکۆمەڵ:

یەکێ لە سیاسەتەکانی تری حیزبی بەعس کە بەرامبەر بە نەتەوەی کورد پیادەی دەکرد، گرتن و لەسێدارەدانی بەکۆمەڵ بوو. بۆیە دەبینین ئەم رژێمە بەشێوەیەکی هەرەمەکی هەڵدەستا بەگرتنی گوندنشینەکان لەناوچە (قەدەغەکراوەکان)، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ناوچانە زێدی باب و باپیرانی خۆیان بوون، کە تیایدا لەسێدارەدانی بەکۆمەڵ و بێ سەرو شوێنکردنی دەیان هەزار خەڵکی بێ تاوانی ئەنجام دەدا، کە زۆرجار ژمارەیەکی زۆر ئافرەت و منداڵی لەخۆ دەگرت، جاری واش هەبوو کۆمەڵکوژی بەرامبەر تەواوی دانیشتوانی گوندێک ئەنجام دەدرا[٩٣].

بەشێوەیەکی گشتی ئەم سیاسەتە لە شارەکانی هەولێرو دهۆک و سلێمانی، پیادە دەکراو بەهەزاران کەس لە سێدارە دەدران و بەهەزارانیش لە گرتووخانەکاندا چاوەروانی چارەنووسی نادیاریان دەکرد[٩٤].

زەبرو زەنگی رژێم بەرامبەر بەخەڵکی کوردستان گەیشتە رادەیەک، تەنانەت کە ئەم زەبرو زەنگ و ترسە لەسەر دەروونی پیاوانی رژێم و ئەڵقە لە گوێیەکانیشی رەنگ بداتەوە، چونکە هیچ کەسێک نەمابوو کەسێکی یان ناسیاوێکی بەدەستی رژێم نەکوژرابێت یان زوڵمی دەرهەق نەکرابێت، بۆیە خەڵک کەوتە نارازیی دەربرین و چیتر ئەم رژێمە قبوڵ نەکەن[٩٥].

لەلایەکی ترەوە حکومەتی عێراقی پشتیوانی گەورەی هەبوو لەلایەن دەوڵەتانی ناوچەکەو جیهانەوە، هێزێکی بەهێزی هەبوو کە پێک هاتبوو لە (٤٠) فرقەی سەربازی و زیاتر لە (١٧٠) فەوجی خەفیفە، و بەهەزاران تانک و تۆپخانەی هەبوو[٩٦].

نەوشیروان مستەفا لەباسی ئەو رۆژگارانەی ئەوسەردەم نووسیوێتی:" هێرشەکانی ئەنفال و بەدوای ئەوەدا گرتنی هەموو بارەگا گرنگەکانی ی.ن.ک و ئینجا داگیرکردنی هەموو

کوردستانی عێراق و، گیران و بزرکردنی دەیان هەزار کەس لە دانیشتوانی ناوچە ئازادەکان و وێرانکردنی هەموو دێهاتی کوردستان، کارەساتێکی نەتەوەیی بەسەر کورد دا هێنا، بەمەش کوردستان بوو بەزیندانێکی تەنگ و کورد بەگەلێکی دیل"[٩٧].

لەگەڵ هەموو ئەو کارەساتانەدا، خەڵکی کوردستان ئیرادەی هەر بەهێز بوو، هێزی پێشمەرگە لە گورز وەشاندن نەکەوت بەرامبەر بە رژێم، پێش ئەنفالەکان گەورەترین چالاکی هێزی پێشمەرگە بە سەرکردایەتی ی.ن.ک، بەرامبەر بە حکومەتی عێراقی ئەنجامدرا، کە گرتنی (سەری رەش) بوو لە (٢٦/١/١٩٨٨) توانیان زەرەرو زیانێکی زۆر بە دوژمن بگەیەنن و (٢٥٠٠) کلاشینکۆف دەست بەسەر دابگرن، کە بۆیەکەم جاربوو لە مێژووی بزووتنەوەی کوردایەتیدا، هێزی پێشمەرگە بتوانێت لە چالاکیەکدا زەبرێکی ئاوا کوشندە بە دوژمن بگەیەنێت[٩٨]. بەقسەی مسعود بارزانی ئەو جەنگەی کە لەرۆژی ١٩ی تەموز تا ٥ی ئەیلول لە ناوچەی خواکورک لە باشووری سنووری هاوبەشی ئێران- عێراق و تورکیا رووی دا، یەکێک بوو لە گەورەترین داستانەکانی مێژووی بەرگری کورد، پێشمەرگەکان سەرەڕای بەکارهێنانی گازی کیمیایی لە بەرامبەریاندا نیشانیان دا کە لەم ٤٨ رۆژەدا (١٩تموز- ٥ئەیلول)، تەنها جەنگی کەنداوی نێوان ئێران-عێراق نەبووە، بەڵکو جەنگێکی دیکە بەناوی جەنگی کوردستان هەبووە[٩٩].

ئەگەر جاروباریش ئاکامی خۆپیشاندان و راپەرینی ئەم و ئەو شاری کوردستان، هەولدرابێ جەماوەری شارەکان هانی شێوەکانی دیکەی خەبات بدرێن، بەڵام لەبەرئەوەی خەباتی چەکداری کرابووە ستراتیژو سوننەتی رزگاری کوردو جەماوەر، بەگیانی پشت بەستن بەم ستراتیژە گوێ دەکراو ئومێدی هەرە گەورەیان سەرکەوتنی خەباتی چەکداری بوو، هاوشانی بەردەوامی جەنگی ناوخۆ لەکاتی خۆپیشاندان و راپەرینەکانی سالانی ١٩٨٢-١٩٨٦دا نەتوانرا خرۆشانی جەماوەری شارەکان پەرەپێبدرێ و ستراتیژێکی نوێ بۆ گەلەکە گەلاڵە بکرێ، سوور بوون لەسەر ستراتیژی چەکداری و لەناو خەباتی چەکداریشدا سووربوون لەجەنگی ناوخۆ، ساڵانی زێرین لەکیس دران و هەڵکەوتی کەم وێنە لەمێژووی راپەرینە چەکدارەکانی کوردستان بەفیرۆ چوون[١٠٠].

بەم جۆرە باری کوردستان وای لێهات کە جێگەی هیچ جۆرە بەرخودانێکی تێدا نەبێتەوە، نە بەچەکداری و نە نا چەکداری، لە کۆتاییەکانی ١٩٨٨دا سەرکردایەتی کورد بەو پێشمەرگانەوە کە رزگاریان ببوو، ناچار سنووریان بڕی و خۆیان بەئێران و سوریادا کرد، دەرگاش بۆ بەغدا خرایە سەرپشت کە بەشێنەیی پلانەکانی (ئاسایشی ستراتیجی) سەر سنوورەکان ئەنجامبدات[١٠١]، بەم شێوەیە هێزی پێشمەرگە لەخاکی کوردستان نەمان، تەنیا چەند مەفرەزەیەکی پێشمەرگە، لەشێوەی پارتیزانی لەناوچە جیا جیاکانی کوردستان مابۆوە[١٠٢].

ئەمەش کۆتایی قۆناغێک بوو، قۆناغی خەباتی چەکدار-سیاسی لە شاخەکانی باشووری کوردستان، بەڵام کۆتاییەکی زۆر تراژیدی[١٠٣].

بەڵام دوای ئەو هەموو کارەساتانە، جارێکی دیکە پارتە سیاسیە کوردستانیەکان چەند هەنگاوێکی گرنگی سیاسییان هەڵێنا وەک بەرنامەی کاری سیاسیی خۆیان و لە هەمان کاتیشدا وەک ئامادەباشیەک بۆ هەر گۆڕانێکی گەورەی سیاسیی کە بەسەر حکومەتی عێراقی دابێت، ئەم هەنگاوانەش دەکرێت گرنگترینیان بەم شێوەیە بخەینەڕوو:

### یەکەم- یەکگرتنەوەی پارتە کوردیەکان لە یەک بەرەدا:

یەکگرتن و یەک دەنگی پارتە کوردیەکان لەکۆتایی هەشتاکاندا، بە هۆکارێکی دیکەی گرنگ دادەنرێت بۆ راپەرینی بەهاری ١٩٩١.

بۆیە دەبینین پارت و رێکخراوە سیاسیەکانی کوردستان لە ناوەراستی هەشتاکاندا، هەوڵی لێک نزیکبوونەوەیان لەگەڵ یەکتری دا، کە زۆر دانیشتنی دوولایەن لەنێوان (ی.ن.ک) و حیزبی سۆسیالیستی کوردستان و پاسۆک و پاشان پارتی دیموکراتی گەل (سامی عبدالرحمن)، لە بەهاری ١٩٨٦ بەمەبەستی بەدیهێنانی زەمینەیەکی گونجاو ئەنجام درا، دواتریش لەکۆتایی ساڵی ١٩٨٦ دیدارێک لەنێوان مام جەلال

و ئیدریس بارزانی هەربۆ ئەم مەبەستە پێک هات، پاشان لەساڵی ١٩٨٧ بۆ نزیکبوونەوە لە یەکتری کۆبوونەوەیەک لەنێوان (پ.د.ک) و پارتی سۆسیالیستی کوردستان (رەسوڵ مامەند) و پاسۆک، لە سەرکردایەتی پارتی لەراژانی خاکی ئێران ئەنجام درا[١٠٤]. ئامانجی هەموو ئەم کۆبوونەوانە بۆ یەک دەنگی نێوانیان بوو بەرامبەر بەرژێمی بەغدا.

سەرجەمی ئەم کۆبوونەوانەی کە باسکران بۆیەک دەنگی پارتە کوردیەکان، حزبی شیوعی عێراقی بەشداری تێدا نەکرد، لەهەمان کاتدا ئەوەشی راگەیاند کە دژی ئەم کۆبوونەوانە نییە، تادواجار لەناوەراستی ١٩٨٧ لەبارەگای (یەکێتی) نزیک سەردەشتی خاکی ئێران کۆبوونەوەیەک ئەنجام درا، کە ئەمجارەیان نوێنەرێکی حزبی شیوعی عێراقی (د. رحیم عەجینە) بەشدار بوو، پاشان بەشدار بووان لە سەر پێویستی پێکهێنانی بەرەیەک لە پارتەکانی کوردستان پێک هاتن[١٠٥].

بەم شێوەیە بەرەی کوردستانی لە ١٩٨٧/٥/٧زدا پێک هات و ئەندامانی جگە لە (ی.ن.ک) و (پ.د.ک)، بریتی بوون لە (سۆسیالیست) و (پاسۆک) و (پارتی گەل) و (حزبی شیوعی عێراق- لقی کوردستان) و پاشان لەساڵی ١٩٩٠ دوو حزبی تریش هاتنە ناو ئەم بەرەیەوە، کە ئەوانیش (حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان) و (جووڵانەوەی دیموکراتی ئاشووری) بوون[١٠٦].

دوای پێکهێنانی بەرە بەرنامەیەکی کاریان داناو کە تیایدا بەرەی کوردستانی بریاری دا بەدوو هێڵی هاوسەنگ جووڵە بکات بەم شێوەیە:

هێڵی یەکەمیان: هەوڵدان بۆ کردنەوەی کەناڵی پەیوەندی لەگەڵ سەرکردایەتی رژێمی دەسەڵاتدار لەبەغدا، ئەوەش بەناردنی وەفدێکی بەرە بۆ (تونس) بەسەرۆکایەتی (د.محمود عوسمان)، بۆ ئەوەی لەوێوە کەناڵی پەیوەندی لەگەڵ بەغدا بکەنەوە[١٠٧]، بەڵام هەوڵەکانیان سەری نەگرت چونکە رژێمی بەغدا لەلایەن خۆیەوە لە ساڵانی (١٩٨٩و ١٩٩٠) خۆی ئەوەندە پێ بەهێز بوو، کە پەیام بۆ هەموو سەرکردەکانی ئۆپۆزسیۆن بەکوردەکانیشەوە، بنێرێ و داوایان لێ بکات کە بگەرێنەوە ریزەکانی بەرەی نیشتمانی[١٠٨].

هەرچەندە (مام جەلال) پێی وابووە شەر روودەدات و سەدام حسین پاشەکشە ناکات و گفتوگۆ لەگەڵیدا سوودی نییە، چونکە پاش ئەوەی لە (تونس) چاویان بە (حکم بلعاوی) کەوتووە، بەڵێنی پێداون بچێت بۆ بەغدا و لەرێگەی (سبعاوی) برای سەدام حسین (سەرۆکی مخابەراتی گشتی بۆ ئەو کاتە)، پێشنیاری گفتوگۆیان بۆ بکات لەگەڵ رژێم، بەڵام مام جەلال ئاماژە بۆ ئەوە دەکات گوێ بیستی هیچ وەڵامێک نەبووینەوەو شەر رووی داو عێراق دۆرا[١٠٩].

بەڵام هێڵی دووەم: بەشداریکردن بوو لەو هەوڵانەی کە گروپەکانی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی دەستیان پێ کردبوو بۆ گەیشتن بەدارشتنی کاری هاوبەش، بەپێکهێنانی لیژنەی کاری هاوبەش کۆتایی پێ هات و لە ١٩٩٠/١٢/٢٧ بەیانی دامەزراندنی دەرچوو، ناوەرۆکەکەی تێکۆشان بوو بۆ جێبەجێکردنی کۆمەڵێک ئامانج، لەوانە:

(هەڵوەشاندنەوەی سیاسەتی جیاکاری نەتەوەیی و نەهێشتنی پاشماوە سیاسی و دیمۆگرافیەکانی دانیشتوان، بۆ هەوڵدان بۆ گۆرینی واقیعی نەتەوەیی و مێژوویی ناوچەی کوردستانی عێراق، وەچارەسەر کردنی کێشەی کورد بەشێوەیەکی راست و پێ دانی مافە نەتەوەیی و سیاسیە رەواکانیان لە رێگای جێبەجێکردن و گەشەپێدانی بەندەکانی رێککەوتننامەی، (١١/٣/ ١٩٧٠) وەکو خۆی، ئەوەی کە گەلی عێراق سەپاندی لەچوارچێوەی یەکێتی نەتەوەیی عێراقیدا، وەبۆ چەسپاندنی برایەتی عەرەب و کورد، وەمسۆگەر کردنی مافە رۆشنبیری و کارگێریەکانی کەمە نەتەوەکان وەک تورکمان و ئاشووری و....هتد[١١٠]).

بەم شێوەیە دەبینین پارت و رێکخراوە سیاسیەکانی کوردستان رۆڵیان هەبووە لەهاندانی کۆمەڵانی خەڵک بۆ راپەرین، لە رێگەی دەزگاکانی راگەیاندن و دروستکردنی شانەی چەکدارو هەڵگەرانەوەی تێکرای رۆڵەکانی کوردستان لە چەکدارەکانی فەوجەکان و گەرانەوەیان بۆ کۆری خەبات و

تێکۆشانی کوردایەتی[١١١]، ئەمەش لەڕێگەی دەرکردنی لێبووردنێک بەناوی (ئاشتبوونەوەی گشتی) لەلایەن بەرەی کوردستانییەوە بۆ چەکدارەکانی فەوجەکان و مستەشارەکان و سەرجەم پیاوانی رژێم، کە رۆڵی گەورەی بینی بۆیەک ریزی گەلی کورد بۆ راپەڕین[١١٢].

بۆیە دەتوانین بڵێین کە (بەرەی کوردستانی) رۆڵی سەرەکی بینی لەیەک ریزی پارتە کوردیەکان و رووبەڕوو بوونەوەیان بۆ رووداو و پێشهاتەکان، چونکە ئەو خۆڕاگرتنەی (بەرەی کوردستانی) ئەگەر قازانجی سیاسی ئەوەی تێدا نەبوو رژێم ئاوری مفاوەزاتیان لێ بداتەوە، ئەم قازانج نەکردنە نەک بەزیان نەگەڕایەوە بەڵکو بەڕاستی بوو بە گەورەترین قازانج و، دوای داگیرکردنی کوێت بەرەی کوردستانی بەهۆی راپەڕینەوە کردی[١١٣].

**دووەم- گرنگیدان بە راگەیاندن:**

پێش راپەڕین و لە کاتی چەخماخەی بەرپابوونی راپەڕینی ئازاری ١٩٩١زدا، راگەیاندنی کوردی رۆڵی گرنگی بینی بۆ جۆشدانی جەماوەرو هۆشیار کردنەوەی خەڵک بۆ هەستان بەبەرپاکردنی راپەڕین. بۆ ئەم مەبەستەش (ڕادیۆی) پارت و رێکخراوە سیاسیەکانی کوردستان رۆڵی گرنگیان بینی کە لەسەرووی هەمووشیانەوە رادیۆی (دەنگی گەلی کوردستان) و رادیۆی (دەنگی کورستانی عێراق).

لێرەدا هەوڵدەدەین رۆڵی هەریەکە لەم دوو رادیۆیە بخەینە روو:

**١- رادیۆی دەنگی گەلی کوردستان[١١٤]:**

ئەم رادیۆیە کە رادیۆی (ی.ن.ک) بوو رۆڵی سەرەکی و بەرچاوی بینی لە راپەڕینی ١٩٩١ز، وەبەچەند رۆژێک بەر لە راپەڕین کاری ئامادەباشی بۆ ئەم مەبەستە بۆ کرابوو، چونکە لە ١٧/٢/١٩٩١دا (نەوشیروان مستەفا ئەمین) لە قاسمەڕەش رێنمایی دەرکرد بۆ نووسینگەی ناوەندی راگەیاندنی (ی.ن.ک) بەوەستاندنی هەموو بلاوکراوەو چالاکیەکانی تر، پێکهێنانی کادیر بۆ (رادیۆی گەڕۆک)[***] لە سەر شەپۆلی (٤١م) کاربکات و، بگوازرێتەوە ناوچەی زەڵێ لەناو خاکی عێراق، کە شان بەشانی رادیۆی جێگری (یەکێتی) کە لەشاری سەقزی ئێران لە سەر شەپۆلی (٧٥م) بوو کاربکات، بۆیە دەبینین رادیۆ گەڕۆکەکە دەستی کرد بەبانگەوازەکانی بەهەردوو زمانی کوردی و عەرەبی پاش جێگیر بوونی لە (زەڵێ)، لەبەرنامەکانیدا بانگەوازی هاولاتیانی دەکرد بۆڕاپەڕین دژی رژێمی دەسەلاتدار، هەروەها ئەم بانگەوازانە سوپاو سوپای میللی و فەوجەکانی بەرگری نیشتمانی (جاش) و دەزگاکانی ئاسایشی دەگرتەوە[١١٥].

دەنگی گەلی کوردستان رۆڵی گرنگی بینی لەبەیەک گەیشتنەوەی هێزەکانی پێشمەرگەو ئاگادارکردنەوەیان لەیەکتری، چونکە ئەو سەردەم هێزی پێشمەرگە جیهازی بێ سیمی کەم بوو، هەروەها رۆڵی باشی گێڕا بۆشانە چەکدارەکانی ناو شارو ئاگادار کردنەوەیان لەڕاسپاردەکانی سەرکردایەتی، پاشان رۆڵی زۆر کاریگەری بینی لە جۆشدانی جەماوەر بۆڕاپەڕین[١١٦]، چونکە کە ناوچەیەک ئازاد دەکرا یەکسەرو راستەوخۆ هەواڵەکەی دەگەیاندە جەماوەرو، بەمەش خەڵکی هاندەدا بۆ راپەڕین لەناوچەیەکی تر، بۆیە دەبینین ئەم رادیۆیە رۆڵی بەرچاوی بینی لەگەیاندنی راپەڕینی ناوچەیەک بەخەڵکی ناوچەیەکی دیکە(١١٧).

**٢- رادیۆی دەنگی کوردستانی عێراق:**

دەنگی کوردستانی عێراق کە رادیۆی (پ.د.ک) بوو، لەسالانی پێش راپەڕین رۆڵی بەرچاوی بینی لەپیشاندانی زوڵم و ستەمەکانی رژێمی بەعس کە بەرامبەر بەگەلی کورد ئەنجامی دەدا، ئەمەش بەشێوەی پێشکەش کردنی بەرنامەو خوێندنەوەی وتارو خستنەرووی تاوانەکانی رژێم دەرهەق بەگەلی کورد، لەڕێگای ئەم رادیۆیەوە ئەنجام دەدرا. هەروەها لەکاتی راپەڕینیش بەرنامەی تایبەتی هەبوو بۆ ئەو رۆژە مێژووییەو هانی خەڵک و جەماوەری کوردستانی دەدا بۆ هەڵسان بەراپەڕین[١١٨].

بۆیە کاتێک بارودۆخی راپەڕین هاتە کایەوە، رادیۆی دەنگی گەلی کوردستان سەرکەوتووترین رۆڵی بینی و پاشان رادیۆی کوردستانی عێراق شان بەشانی ئەو، کوردستانیان سەراپا خرۆشاند[١١٩].

دەتوانین بڵێین کە رادیۆی (دەنگی کوردستانی عێراق) لەرۆژانی راپەرین، رۆڵێکی کەمتری بینی لە بەرامبەر رادیۆی (دەنگی گەلی کوردستان)، چونکە چەند هۆکارێکی (دەرەکی و ناوەکی) وایان کرد کە ئەم رادیۆیە، زیاتر لەهەموو رادیۆکانی تری ئۆپۆزسیۆنی عێراقی بەگشتی و رادیۆی پارتەکانی ناو بەرەی کوردستانی بەتایبەتی، رۆڵی سەرەکی ببینێت بۆ راپەرین.

ئەو هۆکارە دەرەکییانەی کە وایانکرد ئەم رادیۆیە، رۆڵی سەرەکی و گرنگ ببینێت لە راپەرین، ئەمانەن:

١- گەلی کورد تینووی ئەوە بوو کە گوێ لەم دەنگە بگرێ، چونکە دەنگی شۆڕشگێرانەی کوردستان و پێشمەرگە بوو بەمانا رەسەنەکەی.

٢- نەبوونی باوەڕ بەرادیۆی عێراق بەگشتی، چونکە ئەم رادیۆیە شکانەکانی سوپای عێراقی بەسەرکەوتوو بڵاودەکردەوەو رایدەگەیاند کە گوایە عێراق سەرکەوتنی بەسەر دوژمنەکانی بەدەست هێناوە کە بەداستانی (آم المعارك) ناوی دەبرد.

٣- پاش رووخان و شکستی رژێمی عێراق ئارەزووی جەماوەری کوردستان بۆ چاودێری کردنی رووداو و پێشهاتەکان زیادی کرد، لەهەمان کاتدا نەمانی پەخشی تەلەفزیۆن و پچڕانی وزەی کارەباو نەبوونی رۆژنامە، یەکێک بوو لەو هۆکارانەی کە خەڵکی زیاتر گرنگی بەم رادیۆیە بدەن، چونکە سەرجەم ناوچەکانی کوردستان و ناوچەکانی تری عێراق، پەخشی ئەم رادیۆیەی پێ دەگەیشت[١٢٠].

٤- زۆر بەئاسانی شەپۆلەکەی دەدۆزرایەوە، لەهەمان کاتدا بەهۆی لێدانی هاوپەیمانان لە عێراق مەڵبەندی تەشویشیان تێک چوو، بۆیە تەشویشی بەعس لەسەر ئەم رادیۆیە نەماو لە سەرجەم ناوچەکانی کوردستان و دەوروبەری وەردەگیرا[١٢١].

٥- یەکێکی تر لەو هۆکارە دەرەکییانەی کە وای کرد ئەم رادیۆیە رۆڵی سەرەکی ببینێت، ئەوە بوو کە لەو کاتەدا رادیۆکانی تری پارتەکانی ناو بەرەی کوردستانی لاوازبوون، چونکە رادیۆی (دەنگی کوردستانی عێراق) کە رادیۆی (پ.د.ک) بوو، بەشێوەزاری بادینی بەرنامەکانی پێشکەش دەکرد، کە خەڵکانێکی زۆر لێی تێ نەدەگەیشتن، هەروەها رادیۆی (حزبی سۆسیالیست) ئەوکات لای (p.k.k) بوو، نەتواندرا سوودی لێ وەربگیرێت، بۆیە ئەمانە وایان کرد کە زیاتر گرنگی بەرادیۆی (دەنگی گەلی کوردستان) بدرێت[١٢٢].

لە گرنگترین ئەو هۆکارە ناوخۆییانەی وایانکرد کە ئەم رادیۆیە رۆڵی سەرەکی ببینێت لە راپەرین، ئەمانە بوون:

١- راستگۆیی رادیۆکە لە گەیاندنی هەواڵ و راستی رووداوەکان بەجەماوەر.

٢-پەخشکردنی سروودە حەماسییەکان کە ئەبووە هۆی بەرزکردنەوەی گیانی شۆڕشگێری و وردی جەماوەر.

٣- رادیۆکە بانگەوازەکانی ئاراستەی گەلی عێراق بەگشتی و گەلی کوردستان بەتایبەتی دەکرد، بانگەوازەکان تایبەت نەبوون بەکورد، بەڵکو سەرجەم کەمە نەتەوەکانی کوردستانی دەگرتەوە بە (عەرەب و تورکمان و ئاشووری) بێ جیاوازی.

٤- ئەم رادیۆیە بە هەرسێ زمانی (عەرەبی، کوردی، تورکی)، بەیان و بانگەوازەکانی بەشێوەیەکی حەماسی پەخش دەکرد، کە کاریگەری زۆر بوو لەسەر گوێگران(١٢٣).

٥- لەو کاتانەی کە رادیۆ ئیشی دەکرد، لە زۆر جێگا خەڵک دەیان بەست لە میکرۆفۆنی مزگەوتەکان، بەمەش ناوچەکە سەراپا گوێ بیستی هەواڵەکانی راپەرین دەبوون.

٦- گەڕۆکی ئەم رادیۆیە، کە سەرەتا لە (زەڵێ) بوو، دواتر هاتە (رانیە)و پاشان (سلێمانی)، ئەمەش یەکێک بوو لەو هۆکارانەی کە ئەم رادیۆیەی سەرخست لە راپەریندا[١٢٤].

لە سەرووی هەموو ئەمانەوە، پاش رزگارکردنی ناوچەکانی کوردستان، بەتایبەتی ناوچەکانی دەوروبەرو نزیکی هەولێر، وەک (کۆیە، شەقڵاوەو هاوینەهەواری سەلاحەدین....هتد)، وەپاشان نزیکبوونەوەی چەخماخەی راپەرین لە هەولێر، رادیۆی دەنگی گەلی کوردستان رۆڵێکی گرنگی بینی لە جۆشدانی خەڵک و پێشمەرگە بۆ رزگارکردنی هەولێر، لە رێگەی بانگەوازو وتارە حەماسیەکانی بەوەی کە هەولێر (پایتەختی هەرێمی

کوردستانە[١٢٥]).

لە ئەنجامی ئەو زوڵم و زۆرەی رژێم بەرامبەر بەگەلی کورد، پاشان بەهاتنە پێشەوەی هەلومەرجەکان لە بەرژەوەندی جەماوەر، راپەڕینی ئازاری ١٩٩١ی لێ کەوتەوە.

دوای گەورەترین کارەسات، بزووتنەوەی کورد چۆکی بەتەواوی دانەداو بەشێوەی پارتیزانی درێژەی بەخەبات دا هەتا توانی درێژەی خەبات بگەێنێتە رۆژگاری داگیر کردنی کوێت، و ئەوساتە بووژانەوە بۆ زەمینە خۆشکردنی راپەڕین ساز بوو(١٢٦).

## باسی دووەم

## بارودۆخی عێراق و ناوچەکەو رۆڵی لە هەڵگیرساندنی راپەڕین:

### یەکەم: داگیرکردنی کوێت لەلایەن عێراق [١٢٧]

دەسپێکی رەوشێکی نوێ لە داگیرکردنی کوێت لەلایەن سوپای عێراقەوە لە (١٩٩٠/٨/٢) دوە دەست پێدەکات، هەرچەندە لەگەڵ ئەم داگیرکردنە سوپای عێراق کەوتە حاڵەتی ئامادەباشی و بەم شێوەیە حاڵەتی نائاسایی راگەیاند و سەرجەم گەشتە ئاسمانیەکانی بۆناوەو دەرەوەی وڵات یاساغ کراو وەستێنرا، ئەم دۆخە کە لەرووکەشدا نواندنی هێزو دەسەڵات بوو، بەڵام لەناوەرۆکدا پەلەقاژێی مەرگ بوو، چونکە دەستبەجێ ناڕەزایی فراوان لەسەر ئاستی نێو دەوڵەتی و ئاستی وڵاتانی عەرەب بەرامبەر بەدەسەڵاتی دیکتاتۆری رژێمی بەغدا دەستی پێکردو داوای کشانەوەی دەستبەجێ و بێقەیدو مەرجیان کرد[١٢٨].

کاتێک عێراق کوێتی داگیرکرد، هەڵوێستی وڵاتانی دنیا گۆڕا بەرامبەری، بۆ نموونە هەڵوێستی وڵاتانی عەرەب، کە زۆربەی هەرەزۆریان دژی ئەم کارەی عێراق هەڵوەستەیان کرد و هەشت رۆژ دوای داگیرکردنی کوێت، سەرانی وڵاتانی عەرەب بەشێوەیەکی نائاسایی، رۆژی هەینی (١٩٩٠/٨/١٠) کۆنگرەیەکیان بەست لە قاهیرە، لەم کۆنگرەیەدا بەزۆرینەی دەنگی (١٢) وڵات و (٣) (***)دەنگی دژو (٥) (****)یش هەردەنگیان نەداو (تونس)یش لەبنەڕەتدا ئامادەی کۆنگرەکە نەبوو، بە توندی داگیرکردنی کوێت لەلایەن عێراقەوە مەحکوم کراو، کۆنگرە خوازیاری کشانەوەی هێزەکانی بەغدا بوو لەکوێت[١٢٩].

لەهەمان کاتدا ئەو دەوڵەتانەی کە بەڕووکەشیش وایان نیشاندەدا گوایە لەگەڵ عێراقدان، ئەوانیش ئامۆژگاری (صدام) یان کرد لەکوێت بکشێتەوە، بەڵام صدام نەک هەر بەقسەی نەکردن بەڵکو دەستی بەمانۆڕی سەربازی کرد و بەیانێکی ئاگرینی دەرکرد، تیایدا بانگەوازی گەلانی عەرەبی دەکرد بۆئەوەی پشتگیری رژێمی عێراق بکەن، لەهەمان کاتدا هەڕەشەی لەئیسرائیل دەکردو مەسەلەی کوێتی بەمەسەلەی فەلەستین بەستەوە، وای لەخەڵکی گەیاند تا ئیسرائیل نەکشێتەوە لە فەلەستین، ئەویش لەکوێت ناکشێتەوە[١٣٠].

هەروەها صدام جووڵاندنی هەستی نەتەوەیی، سۆزی دینی بەکارهێنا، بۆئەوەی پشتگیری وڵاتانی عەرەب بەدەست بێنێت، بەڵام بەنەکشانەوەی پشتگیری عەرەبی لەدەست دا[١٣١].

سەبارەت بەهەڵوێستی وڵاتانی ئەورووپا بەرامبەر بەعێراق ئەوانیش کەوتنە خۆ، چونکە بەداگیرکردنی کوێت بەرژەوەندیان کەوتە مەترسیەوە لەدوو لا:

١-دروستبوونی شەڕوئاژاوە لەو ناوچە ستراتیژیە، کە خۆیان دروستی نەکەن ئەوا لەبەرژەوەندی هیچ رۆژئاواییەک نییە، چونکە ئەو وڵاتانە بەهۆی کۆمپانیا مۆنۆپۆڵەکانیانەوە پەیوەندیەکی پتەویان لەگەڵ عێراق و وڵاتانی میرنشینی عەرەبی هەبوو، بۆیە هەر شەڕێک هێمنایەتی ناوچەکە بشێوێنێ، بەرژەوەندی ئابووری ئەوانیش دەکەوێتە مەترسیەوە.

٢- هاتنەوەی ئەمەریکا بۆ ناوچەکە بەبەرگێکی دیکەو، کۆتایی پێ هێنان بەنفوزی هەموو لایەک لەم ناوچەیەو قۆرخکردنی بەرهەمهێنان و گواستنەوە و فرۆشتنی نەوتی ناوچەکە، هەر تەنها بۆ مۆنۆپۆڵەکانی خۆیان دەبێت و بەس. بۆیە پاش ئەوەی نەیانتوانی کار لەهەڵوێستی چەوتی صدام بکەن، وڵاتانی رۆژئاوا سیاسەتێکی دژ بەعێراقیان گرتەبەر و، تێکڕا بەشداریان کرد لەیارمەتیدانی ئەمەریکا و دەزگاکانی راگەیاندنیشیان دژی صدام خستەکار[١٣٢].

پاشان (ئەنجومونی ئاسایش)یش، کەوتە هەوڵدان بۆچارە

سەرکردنی دۆخەکە ئەوەبوو چەند بڕیارێکی یەک لەدوای یەکی دەرکرد، هەر لەگەمارۆدانی ئابوورییەوە تا بەکارهێنانی هێز بۆدەرکردنی لە کوێت، دواجار لە (١٥/١٢/١٩٩٠)ە وە مۆڵەتدرا بەعێراق تا (١٥/١/١٩٩١) لەکوێت دەربچێت[١٣٣].

پێش لێدانی عێراق لەلایەن هاوپەیمانانەوە، بارودۆخی عێراق زۆر خراپ بوو، چونکە لەکاتی دەست پێکردنی کێشەی کەنداو بارودۆخی عێراق گۆڕانکارییەکی زۆر خراپی بەسەر داهات، رۆژ لەدوای رۆژ دامودەزگاکانی دەوڵەت بەرەو هەڵوەشانەوە دەچوون، سەربازەکانی لەکاتی وەرگرتنی مۆڵەت رایان دەکرد لەبەرەی کوێت و بەمەش هەڵهاتن رۆژ بەرۆژ لەزیادبوون دابوو[١٣٤]. ئەم دۆخەش زۆر کاری لەعێراق کرد، پێش شەڕ و دوای شەڕیش. بەپێی بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایش و رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دەبوو لە (١٦/١/١٩٩١) عێراق بکشێتەوە لەکوێت، بەڵام عێراق لەکاتی دیاریکراو بڕیارەکەی جێبەجآ نەکردو کوێتی چۆڵ نەکرد، بۆیە ئەمەش ترسناک بوو بۆ جیهان و ناوچەکە، بەتایبەتی گەلی عێراقی کە شەڕێکی وێرانکار هەڕەشەیان لێ دەکات، بەڵام (کورد و کودیتییەکان) پێ دەچوو ئەم شەڕەیان پێ خۆش بووبێ، چونکە هەردوولایان هیچیان نەمابوو تا لەدەستی بدەن[١٣٥]. بۆیە دەبینین پاش ئەوەی کە عێراق هەر سوور بوو لەسەر دەرنەچوونی لە کوێت، شەوی ١٦-١٧ی کانوونی دووەمی ١٩٩١ گێژەڵوکەی بیابان دەستی پێکرد[١٣٦]، هێزی هاوپەیمانان کاتژمێر (٢)ی شەو بەهێرشی ئاسمانی دەستی پێکرد بۆ سەر یەکە سەربازی و دامەزراوە سەربازی و پیشەسازی و نەوتیەکان و هێڵەکانی راگەیاندن و وێستگەی کارەباو شوێنە گرنگەکانی تری عێراق کە نزیکەی یەک مانگی خایاند، کە بەتەواوی وزەو تواناو جووڵەی رژێمی بەغدای دووچاری ئیفلیجی کرد، دوابەدوای ئەوەش هێرشی زەمینی دەستی پێکرد، بەبێ ئەوەی سوپای عێراق توانای بەرگری و بەرپەرچدانەوەیەکی ئەوتۆی هەبێ، ئەوە بوو لەماوەیەکی کەمدا شکستێکی بێ وێنەی بەخۆیەوە بینی، هەر زووش لە وڵاتی کوێت پاشەکشەی کرد و تەسلیم بەئیرادەی هێزە هاوپەیمانەکان بوو سەرجەم مەرجە سەپێنراوەکانی هێزە هاوپەیمانەکانی بێ قەید و مەرج پەسەند کرد و پاشان لە (٢٨/٢/١٩٩١)دا ئاگر بەست راگەیەنرا[١٣٧].

بۆیە پاش ئەوەی کە هاوپەیمانەکان لەبەر بەرژەوەندی خۆیان، عێراقیان لەکوێت دەرکرد و لەشەڕ شکاندیان، پاشان دەبینین هۆشیاری خەڵک و رابەرانی بۆ راپەڕین دەرکەوت، بەتایبەتی کاتێک کە خاڵی لاوازی رژێمیان قۆستەوەو سازدانی راپەڕینیان کردە بەرنامەی خۆیان[١٣٨].

بۆیە دەتوانین بڵێین داگیرکردنی کوێت لەلایەن عێراق و پاشان تێکشکان و لاوازکردنی لەلایەن هێزی هاوپەیمانان، یەکێک بووە لە هۆکارە هەرە گرنگەکان بۆ هەڵایسانی راپەڕین لەباشووری کوردستان و ناوەڕاست و خوارووی عێراق.

**دووەم: کۆتایی هاتنی جەنگی سارد:**

جەنگی سارد، لە رواڵەتدا ساردو لە ناوەڕۆکدا گەرم بوو، کە لەجەنگی دووەمی جیهانی بەدواوە تاپێش راپەڕین (١٩٤٦-١٩٩٠) درێژەی کێشا[١٣٩].

لەم جەنگەدا سۆڤیەت دەیویست سیستەمی سۆسیالیستی دامەزرێنێ لەو شوێنانەی کە دەستی تێدا هەبوو، ئەمەریکاش بەگژ ئەو سیاسەتە دادەهاتەوە، لەهەمان کاتدا لەزۆربەی وڵاتانی دنیا شەڕو پێکدادان هەبوو، گەلانی ئەو وڵاتانەش ببوونە قوربانی سیاسەتی ئەو دوو زلهێزەو میللەتی کوردیش بێ بەش نەبوو لەزیانی ئەم جەنگە[١٤٠].

لەگەڵ ئەوەشدا سەرکردایەتی سیاسیی کورد، بە درێژایی نیو سەدەی جەنگی سارد، چاوەڕێ بوو شوورەوی ببێتە پشتیوانی شۆڕشی چەکداری کورد و، بەو ئومێدە لە دوای کۆماری مهابادەوە شۆڕشی ئەیلول سەری نایەوە، دوای ئەمەش سەرلەنوێ خەباتی چەکداری هەتا ئەنفالەکان (١٩٧٦-١٩٨٨) بەنائومێدی لە پشتیوانی شوورەوی دوچاری نوشستێکی ترسناک هات و تەنانەت شوورەوی بەئەندازەی فەرەنساش زاتی دژایەتی چەکی کیمیایی بەعسی نەکرد[١٤١].

عێراق سوودی زۆری بینی لە جەنگی ساردو سیاسەتەکانی یەکێتی

سۆڤیەت، چونکە پێش کۆتایی هاتنی ئەم جەنگە، عێراق بەشێکی زۆری چەک و کەل و پەلی سەربازی لە یەکێتی سۆڤیەتی جاران دەکری[١٤٢]، کە عێراقی لەڕووی سەربازیەوە زۆر بەهێز کردبوو، تا وای لێهات نەشەڕی هەشت ساڵەی لەگەڵ ئێران، نەشەڕی بەردەوامی بزووتنەوەی کورد لەگەڵی، نەتوانن ئەم رژێمە بڕووخێنن، چونکە توانیبووی لەپەنای سیاسەتی بەرژەوەند بازی جەنگی سارددا، لەڕۆژهەلات و رۆژئاواوە پێویستیەکانی دابین بکات[١٤٣].

بۆیە دەبینین دوای ئەوەی ئاڵوگۆڕە جیهانیەکان رووی دا، کە سەرەنجامەکەی بەشکستی خۆرهەلات کۆتایی پێهات، لەبەر ژەوەندی رژێمی عێراق نەبوو[١٤٤]، چونکە بەدۆڕاندنی سۆڤیەت لەم جەنگەدا، عێراق دەروازەی کرینی کەل و پەلە یەدەگە سەربازییەکانی لە دەست دا[١٤٥].

بۆیە بە هۆی نەمانی جەنگی ساردو ئەو بارودۆخە تازەیەی هاتەکایەوە، راستەوخۆ لەقازانجی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی گەلی کورد و گەلی عێراق و ناوچەکە دابوو، چونکە عێراق لەڕووی ئابووری و سەربازییەوە بەرەو لاوازی و دارمان دەچوو، لەهەمان کاتدا بارودۆخی بزووتنەوەی کورد روو لەباشی بوو بە هۆی گۆڕان لە ناوچەکەدا[١٤٦]، چونکە رووخانی بلۆکی رۆژهەلات و پاشان داگیرکردنی کوێت لەلایەن عێراقەوە، وەک دوو فاکتەری دەرەکی رۆڵی پۆزەتیڤیان بینی لە هەستانەوەی شۆڕشی خەڵکی کوردستان، کە سەرەنجام راپەڕینە جەماوەرییەکەی ئازاری ١٩٩١ز. لێ کەوتەوە[١٤٧].

سێیەم: هاندان و پشتگیری ولاتانی دنیا بۆ هەڵایسانی راپەڕین:

یەکێک لە هۆکارە سەرەکیەکانی دیکە، کە سەرکردەکانی کوردی خستە جووڵەو خەڵکی هاندا بۆ راپەڕین لەراستیدا ئەو بانگەوازەی سەرۆک کۆماری ئەمریکا (جورج بوش) بوو لە رۆژی ١٥شوباتی ١٩٩١دا، کە داوای لەخەڵکی عێراق کرد، لە دژی (صدام حسێن)ی دیکتاتۆر راپەڕن و بیڕووخێنن[١٤٨]، هەروەها سەرۆکی ئەمەریکا لە وتارێکیدا باسی تاوانەکانی رژێمی عێراقی کرد بەرامبەر بەگەلی کورد و گوتی: "ناتواندرێت وێنەی ئەو ژنە کوردەی منداڵەکەی لەباوەش گرتبوو بۆ بەرگریکردن لێی، لە کاریگەری بۆمبی کیمیا لەبیر بکرێت...." بۆیە داوای لە گەلی کورد کرد کە تۆڵەی بکاتەوە[١٤٩].

لەهەمان کاتدا ئاژانسەکانی دەنگ و باسی جیهانی هەرەشەکانی سەرۆکی ئەمەریکایان دژی صدام حسێن بلاو دەکردەوە، کە ئەگەر بێت و ملی بکەن بە پەتا نابێت هیچ قسەبکات[١٥٠].

لە راستیدا ئەمانە هەمووی پشتیوانێکی مەعنەوی زۆر گەورە بوون، چونکە خەڵک وایان دەزانی ئەمەریکا پشتیوانییان لێ دەکات لەکاتی راپەڕیندا، ئەگەر هات و عێراق پەلاماری خەڵکی راپەڕیو بداتەوە[١٥١].

لەگەڵ ئەوەشدا دەبینین ولاتانی دراوسێی کوردستان رۆڵی بەرچاویان بینی لەهاندان و خرۆشاندنی سەرکردایەتی کورد و ئۆپۆزسیۆنی عێراق بۆ راپەڕین، چونکە لەو سەردەمەدا گروپەکانی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی، گۆڕەپانی (سووریا)یان کردبووە بارەگای خۆیان بۆگفتوگۆکردن لەپێناو دروستکردنی بەرەیەکی عێراقی بەرین بۆ رووبەڕوو بوونەوەی دیکتاتۆریەت لەبەغدا[١٥٢].

لەلایەکی دیکەوە (ئێران)یش رۆڵی کەمی نەبینی لەهاندان و پشتیوانی کردنی ئۆپۆزسیۆنە عێراقیەکان، بۆ بەرپاکردنی راپەڕین دژی حکومەتی عێراق، چونکە زۆرێک لەسەرکردەی هێزە کاریگەرەکان لەئۆپۆزسیۆنی عێراقیدا، کۆبوونەوەیەکیان بەست لەشاری (کرماشان)ی ئێران ساڵی (١٩٩٠)بۆ لێکۆڵینەوە لەبارودۆخی ئایندەی عێراق[١٥٣].

هەروەها ولاتانی تری ناوچەکە رۆڵی گرنگیان بینی لە نزیککردنەوەی گروپەکانی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی، بۆیە دەبینین کۆمیتەیەکی رێکخستن بەپشتگیری (سعودیە- سوریا- ئێران)پێک هێنرا، کە لە شەش ئەندام پێک هاتبوو بەبەشداری دوو نوێنەری کورد تیایدا کە بریتی بوون لە (مام جەلال و سامی عبدالرحمن)، پاشان سەرکردەکانی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی لە دیمەشق کۆبوونەوەو دواجار لە (٢٧/١/١٩٩٠)لە بەیروتی پایتەختی لوبنان بەبەشداری پتر لە(٢٠) پارت و بزووتنەوەی

ئۆپۆزسیۆن بەیاننامەیەكیان راگەیاند، كە تیایدا ئۆپۆزسیۆن دژ بەداگیركردنی كوێت وەستاو، پەیمانی خەباتی دا بۆ رووخاندنی رژێمی بەغداو دابینكردنی مافی كورد[١٥٤].

بۆیە هەموو ئەمانەی كە باسكران دەتوانین بڵێین، هاندانی دەرەكی و پشتگیری دەوڵەتان بوو بۆ راپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١.

چوارەم: هەڵایسانی راپەڕین لەخوارووو ناوەراستی عێراق:

دوای ئەوەی هێزی هاوپەیمانان گورزێكی كوشندەیان لە صدام وەشاند و لەكوێت دەریانكرد، پاشان گەمارۆی ئابووریان بەسەر داسەپاند و بەمەش بارودۆخی وڵات ئاڵۆز بوو، لەم دۆخەدا زەمینەی راپەڕین بۆ عەرەبە شیعەكان لەباشووری عێراق هاتە كایەوە و چەند شارێكی گرنگیان ئازاد كرد[١٥٥].

ئەم راپەڕینە بەشێوەیەكی خۆرسك بوو وەك دژە كردارێك گەلی عێراق پێی هەڵسا پاش تێكشكانی صدام و بەردەوامی لەبەهەڵەدابردنی رای گشتی، ودنیشاندانی تێكشكانەكەی بەسەركەوتن بۆ عێراق و نواندنی زوڵم و زۆری بێ ویژدانانەی بەرامبەر بەگەلەكەی[١٥٦].

پاش ئەوەی ئەم راپەڕینە بەرەو سەركەوتن چوو ئەمەریكا هەڵوەستەی لە بەرامبەردا كرد، چونكە ئەمە لەچوارچێوەی پلانەكەی ئەمەریكادا نەبوو، كە نەی دەویست شیعە لەعێراقدا حوكم بگرێتە دەست[١٥٧].

بۆیە رێگەخۆشكرا بۆ عێراق بەبەكارهێنانی هێز، كە دوو فەیلەقی لە مودەرەعەو دەبابە گەراندەوە بۆ سەركوتكردنی ئەم راپەڕینە لە رۆژانی "١-١٩٩١/٣/٢"، بۆیە دەبینین زۆری نەبرد ئەم راپەڕینە كپ كرایەوە[١٥٨]، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا راپەڕینی عەرەبە شیعەكان لە باشووری عێراق، بە یەكێك لە هۆكارە كاریگەرو گرنگەكانی راپەڕین دادەنرێت لە باشووری كوردستان[١٥٩].

## بەشی دووەم
## بارودۆخی شاری هەولێر بەر لە راپەڕین

چەند رۆژێك بەر لەراپەڕینی شارو شارۆچكەكانی كوردستان، بارودۆخی هەموو ناوچەكانی كوردستان بەشێوەیەكی گشتی و شاری هەولێر بەتایبەتی روو لە ئاڵۆزی و پشێوی دابوو، خەڵكەكەی لەبارێكی دەروونی خراپدا ژیانیان بەسەر دەبرد، تێكرا لەچاوەڕوانی دۆخێكی سیاسی دژواردا بوون. پێش بەرپابوونی چەخماخەی راپەڕین لە شاری هەولێر چەند رووداوێك هاتنە پێشەوە، هەریەكەو بەگوێرەی خۆی كاریگەری (پۆزەتیف - نێگەتیف)ی بەسەر دۆخی شارو خەڵكەكەوە هەبووە، كە گرنگترین رووداوەكانی ئەم شارە بەرلە راپەڕین بریتی بوون لە:

### باسی یەكەم
### راپەڕینی "ئۆردووگای خەبات[١٦٠]" لە ١٩٩١/٣/٤دا:

هەرچەندە لە باشووری كوردستان (١٩٩١/٣/٥) بەرۆژی راپەڕین تۆماركراوە، چونكە لەم رۆژەدا بوو دانیشتوانی رانیەو دەوروبەری راپەڕین و شارەكەیان ئازاد كرد، بەمەش بوون بە دەروازەی راپەڕین، بەڵام دەكرێت بشڵێین (١٩٩١/٣/٤) رۆژی زەنگی راپەڕین بوو، كە جەماوەر لە ئۆردووگای خەبات راپەڕین و پەلاماری دام ودەزگا دزێوەكانی رژێمی بەعسیان دایەوە[١٦١].

بەجۆرێك نیوەڕۆی رۆژی ١٩٩١/٣/٤ چەند پۆلیس و چەكدارێكی دەستەی تایبەت (مفرزة خاصة) لە گەڕەكی سەنگەسەریەكان گەلاڵییەكان داوای ناسنامە لەچەند كەسێك دەكەن و یەكێكیان ناسنامەی پێ نابێت و رادەكات، دواتر چەكدارەكانی بەعس دوای دەكەون و بەمەش دانیشتوانی ناو ئۆردووگاكە دێنە وەڵام و بەرپەرچی چەكدارەكانی رژێم دەدەنەوەو سەرەنجام تەقە دەست پێ دەكات و شێوە راپەڕینێكی عەفەویانە لە خۆدەگرێت[١٦٢]، كە دەبێتە هۆی بریندارکردنی پۆلیسێك بەناوی (قەیس) و كوژرانی دوو چەكداری هەركی و شەهیدبوونی دوو هاوڵاتی كوردی دانیشتووی ئۆردوگاكە بەناوەكانی (بەختیار عومەر هورێوەیی و محەمەد فاروق گەلاڵی)[١٦٣]، بەڵام هەرزوو ئەم راپەڕینە كۆنترۆڵ كراو كپ كرایەوە، چونكە نزیك بوو لە چەقی قورسایی و توانایی حكومەتی عێراق لە شاری كەركوك و موسڵ و هەولێر[١٦٤].

پێویستە بوترێت ئەم راپەڕینە لەشێوەی هەڵچوونێكی لە ناكاو هاتە

کایەوەو بێ بەرنامە بوو، هەرچەندە لە کاتی راپەرینەکەش چەند کەسانێکی سەر بەرێکخستنەکانی " شانە چەکدارەکانی بروسک[165] " بەشداریان تێدا کردبوو، بەڵام بەهیچ شێوەیەک سازدانی ئەم راپەرینە و خرۆشاندنی جەماوەر لە ژێر کۆنترۆڵی رێکخستنەکانی پارتە سیاسییەکانی کوردستاندا نەبوو.

**باسی دووەم**

**خۆپیشاندانەکەی حیزبی شیوعی عێراق لە ٦/٣/١٩٩١دا**

پاش ئەوەی لە ٥/٣/١٩٩١ شاری رانیەو دەوروبەری ئازادکرا(١٦٦)، رێکخستنەکانی حیزبی شیوعی عێراق لە شاری هەولێر کەوتنە خۆ بۆ سازدانی راپەرینێکی جەماوەری بەمەبەستی ئازادکردنی شارەکە لە دەست رژێمی بەعس، هەرچەندە لەلایەن رێکخستنەکانی بروسکەوە حیزبی شیوعی ئاگادار کرابۆوە کە کاتی راپەرینی هەولێر نەهاتووە، بەڵام حیزبی شیوعی یەکلایەنە بێ یارمەتی لایەنەکانی دیکەی "بەرەی کوردستانی[167] " بڕیاری بەرپاکردنی راپەرینی لە هەولێردا[168]. بۆ ئەوەی قورسایی و هێزی خۆی تێدا تاقی بکاتەوە، بەڵام لایەنە سیاسیەکانی دیکەی کوردستان لەگەڵ ئەم بۆچوون و بەرنامەیەیدا نەبوون، چونکە پێیان وابوو هێشتا بۆ راپەرینی هەولێر چەند رۆژێکی دیکەی پێویستە تا سەرکەوتووبن تێیدا[169].

بەڵام حیزبی شیوعی سوور بوون لەسەر بڕیارەکەی خۆیان و بۆ ئەم مەبەستەش رێکخستنە نهێنییەکانی لە هەولێر دوو رۆژ پێشتر لە رۆژی ٣/٣/١٩٩١دا کۆبوونەوەیەکیان کردبوو ئامانجی خۆپیشاندانەکەیان لەم خاڵانە دیاری کردبوو:

١- شکاندنی ئەو ترسەی کە خەڵک هەیەتی بەرامبەر بە حکومەتی عێراق.

٢- جەماوەر تا چەند لەگەڵ خۆپیشاندان و راپەریندایە.

٣- حکومەتی عێراق تا چەند توانای بەرپەرچدانەوەی هەیە[170].

بە بڕیاری مەکتەبی سیاسی حیزبی شیوعی عێراق، رێکخستنە نهێنیەکانی ناوشاری هەولێر ئاگادارکرانەوە کە خۆسازدەن بۆ خۆپیشاندانێکی جەماوەری گەورە، ئەوەبوو رێکخستنە نهێنیەکانی حیزبی شیوعی عێراق بۆئەم مەبەستە دووبارە رۆژی ٤/٣/١٩٩١ لە گەڕەکی سەیداوەی شاری هەولێر لە ماڵی یەکێک لە کادیرە چالاک و دیارەکانی حیزبی شیوعی کە بە ماڵی (دایکە خەجیج) ناودێریان کردبوو، کۆبوونەوەیەکی نهێنییان ئەنجام دا، بەشداربووانی ئەم کۆبوونەوەیە بریتی بوون لە: " سەلاح مەزن، م. سروود، ئەحمەد گچکە، دڵشاد، بەکر حاجی"[171].

لەم کۆبوونەوەیەدا باس لەپلان و دروشم و رێڕەوی خۆپیشاندانەکە کرا، کە کاتژمێر (٩)ی بەیانی لەناوەندی بازاڕی شێخەڵلا دەست پێ بکات و بەرەو کۆتری ئاشتی بچێت و لەوێوەش بەرەو قەڵا بچێ و بەچواردەوریدا بسووڕێتەوە، هەروەها چەند دروشمێکیش پێشنیارکران لەوانە: بژی هێزی پێشمەرگە سەدام نزیکی مەرگە، ئازادی و دیموکراسی، سەدام لاچێ لە کورسی...هتد[172].

بەم شێوەیە رۆژی (٦)ی ئادار بەچەند دەقیقەیەک پێش کاتژمێر (١٠)، پێداویستییەکان ئامادەکران و یەکێک لە کادیرەکانی حزبی شیوعی بەناوی هۆگر (فوئاد)، کە بەرپرسی رێکخستنەکانی ناو شارو سەرپەرشتیاری خۆپیشاندانەکە بوو، یەکەم هەنگاوی ناو هوتافی دژی رژێمی بەعس بەرز کردەوەو خۆپیشاندەرانیش بەدوای کەوتن و بەم شێوەیە خۆپیشاندانەکە بەردەوام بوو تا گەیشتە گەڕەکی سێتاقان[173]، بەڵام زۆری پێنەچوو خۆپیشاندەران رووبەڕوی شاڵاوی بێ بەزەییانەی بەعس بوونەوەو تەقە دروست بوو، لەئەنجامدا چەند کەسێک بریندار بوون و ئەوانی دیکەش پەرتەوازە بوون و هەندێکیشیان دەستگیر کران، بەم شێوەیە خۆپیشاندانەکە کۆتایی پێ هات[174].

هەرچەندە خۆپیشاندانەکەی (٦)ی ئادار ١٩٩١ ماوەیەکی کەمی خایاند و زوو کپ کرایەوە، بەڵام رۆڵی کاریگەری بینی لەهاندان و جۆشدانی جەماوەر بۆ بەرپەرچ دانەوەی بەعس، چونکە خۆپیشاندانەکە بۆ مەبەستی رەواندنەوەی دێوەزمەی بەعس بوو، هەروەها ترسێکی گەورەشی خستە دڵی پیاوانی بەعس و لەلایەکی دیکەشەوە سووڕانەوەی کۆیتەرەکانی حکومەتی عێراق بەسەر هەولێردا، گرنگی خۆپیشاندانەکەی دەخستە

روو[175].

بەمەش دەکرێت بڵێین خۆپیشاندانەکەی (٦)ی ئادار بەسەرپەرشتی رێکخستنەکانی حیزبی شیوعی عێراق، تارادەیەک رۆڵی کاریگەرو بەرچاوی گێڕا لەڕەواندنەوەی ترسی بەعس لەسەر دانیشتوانی هەولێر.

**باسی سێیەم**

**هەڵوێستی حیزبی بەعس بەرامبەر دانیشتوانی هەولێر:**

چەند رۆژێک پێش دەستپێکردنی راپەڕین، بەعس هەستی بەبارودۆخەکە کردبوو، وەرچاوی ئەگەری رووداني تەقینەوەی گەلی کردبوو، بۆیە "لیوا روکن عەلی شەلال[176] " فەرماندەی فەیلەقی (٥) کۆبوونەوەیەکی فراوانی لە بارەگای فەیلەق لە هەولێر لەگەڵ سەرۆک عەشیرەتەکان و فەرماندەکانی فەوجەکانی بەرگری نیشتیمانی بەست، کە (٣٠٠) کەسیان ئامادەبوون، لیوا شەلال لەقسەکانیدا هەڕەشەی کرد بە بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی دژی هەر جووڵانەوەیەک لەناوچەی کوردستان، ئەمەی بۆ دروستکردنی ترس بوو لەگیانی پێشمەرگەو هاوڵاتیان وەک یەک، لەگەڵ ئەوەشدا هەڕەشەی کرد بە لە سێدارەدانی هەر پێشمەرگەیەک گەر خۆشی بە دەستەوە بدات، بە مەبەستی ئاگادارکردنەوەی هاوڵاتیان بوو بەسەرکوت کردنیان لەبیرکردنەوەی هەرجۆرە هاوکاریەک لەگەڵ هێزەکانی ناو بەرەی کوردستانی لەناوەوەو لەسەر سنوور[177].

لەگەڵ ئەوەی بەعس بۆ سەرکوتکردنی دانیشتوانی هەولێر هەڕەشەی بەکارهێنا، هاوکات هەوڵی زۆری دەدا بۆ ئەوەی بەهەر جۆرو رێگایەک بێت یەکێک لە لێپرسراوانی شانە چەکدارەکانی بروسک دەستگیر بکات و بەبەرچاوی جەماوەر لەسێدارەی بدات، بۆیە چەند رۆژێک بەر لە راپەڕینی هەولێر (پارێزگار و فەرماندەی فەیلەقی ٥ی هەولێر) لە رێگای کەسێکەوە کە پێشتر پەیوەندی بەرێکخستنە نهێنییەکانی بروسکەوە هەبوو، پەیامێک ئاراستەی لێپرسراوی شانە چەکدارەکانی بروسک دەکەن بەوەی کە بارەگای پارێزگاو فەیلەقیان تەسلیم دەکەن بەمەرجێک راپەڕین بەرپا نەکرێت و خوێن نەڕژێت، بەڵام لێپرسراو و کادیرەکانی شانە چەکدارەکانی بروسک لەفێڵەکەی بەعس گەیشتوون و ئەم پرۆژەیەیان رەت کردۆتەوە و بەمەش خۆیان لە گەورەترین تەڵەی رژێمی بەعس دەرباز کردووە، چونکە بەرازی بوونیان دەبووە هۆی هەڵوەشاندنەوەی بەرنامەی ئازاد کردنی هەولێر و دەستگیرکردن و لەسێدارەدانی رێکخستنەکانیش بە بەر چاوی جەماوەر[178].

لەگەڵ نزیکبوونەوەی بەرپابوونی راپەڕین لە هەولێر ترس و دڵەڕاوکێیەکی زۆر کەوتە دڵی پیاوانی بەعس، بۆیە لەشەوی (١٠ی ئازاری ١٩٩١) دەسەڵاتدارانی بەعس هەموو جۆرە هاتوچۆیەک قەدەغە دەکەن، پاشان هەرئەم شەوە پارێزگار و سەرۆکی دەزگای ئەمن و لێپرسراوانی حیزبی بەعس لەگەڵ (شێخ جەعفەر بەرزنجی)، کە سەرۆکی ئەنجومەنی خودموختاری کوردستانی سەر بە بەعس بوو، بە هۆی پشێوی دۆخەکە لە هەولێر هەڵاتن[179].

پاش ئەوەی حکومەتی عێراق بۆی دەرکەوت کە ناتوانێت کۆنترۆڵی ناوچە ئازاد کراوەکان بکاتەوە، وەک: رانیە و سلێمانی و...هتد، هەوڵبدا لەرێگەی پلانێکەوە بتوانێت کۆنترۆڵی هەولێر لەدەست نەدات، بۆ ئەم مەبەستە لە رۆژی ١٠/٣/١٩٩١ هێزێکی زۆری هێنا بۆ دەوروبەری هەولێر بەو نیازەی رۆژی ١١/٣/١٩٩١ دەست بکات بەرەشبگیری دانیشتوانی شار وەک ئەو "رەشبگیریەی کە لە کەرکوک[180] " ئەنجامی دا، بەشێوەیەک مەبەستی بوو هەموو گەنج و پیاوەکانی بگرێت و دووریان بخاتەوە لە هەولێر، بۆ ئەوەی راپەڕین روونەدات، بەڵام بەرلەوەی رژێم رۆژی ١١/٣ پلانەکەی جێبەجێ بکات، رێکخستنە نهێنیەکانی پارتە سیاسیەکانی کوردستان بەتایبەتی شانە چەکدارەکانی بروسکی سەر بە (ی.ن.ک) و جەماوەر بە پشتیوانی پێشمەرگە سەرجەم نەخشەکانی بەعسیان پووچەڵ کردەوەو هەنگاوی پێویستیان گرتەبەر بۆ راپەڕینی هەولێر[181].

## بەشی سێیەم
## ڕاپەڕینی شـــاری هـەولێـــر لە (١١/٣/١٩٩١)دا

### باسی یەکەم
### هەنگاونان بۆ زەمینە خۆشکردنی ڕاپەڕین:

چەند مانگێک بەر لە ڕاپەڕین، ئەوکاتەی عێراق کوێتی داگیرکرد لە ٢ی ئابی ١٩٩٠، ئەگەری لێدانی عێراق لەلایەن هاوپەیمانانەوە هاتە کایەوە، لەگەڵ ئەمەشدا ئۆپۆزسیۆنی عێراق چاوەڕوانیان دەکرد بەم لێدانەی حکومەتی عێراق بڕووخێت، بەمەش بۆشایی لە دەسەڵاتی سیاسی عێراقدا پەیدا دەبێت، بۆیە هێزە کوردییەکان هەوڵیاندا لە کاتی ڕوودانی هەر گۆڕانێک لەناوچەکە، شارە کوردییەکان ئازاد بکەن[١٨٢].

بۆ ئەم مەبەستەش چەند هەنگاوێکیان نا، وەک: لەسەر نەخشەی بنەڕەتی و نەخشەی سەربازی هەولێر هێزەکانی خۆیان بەسەر چەند بەشێک (میحوەرێک) دابەشکرد. جگە لەوەش بەمەبەستی دانانی بەرنامەیەک بۆ ئازادکردنی هەولێر، ئاگاداری ڕێکخستنەکانی ناوشاریان کرد، هەر زانیاریەکیان هەیە بۆیان بنێرن، هەروەها دروستکردنی شانەی چەکدار، بۆنموونە: (ی.ن.ک) هەستا بەدروستکردنی شانەی چەکدار لەناو شارەکانی کوردستان، لەئەندامانی ڕێکخستن و ئەو پێشمەرگانە پێک هاتبوو کە خۆیان دابوودەوە دەست حکومەتی عێراق، ئەمانەش دوو بنکەی سەرەکیان هەبوو لە کوردستان، لە سلێمانی (شالاو)، لە هەولێر (بروسک) بوون[١٨٣].

هەروەها (پ.د.ک) چەند شانەیەکی چەکداریان هەبوو، یەک لەوانە شانە چەکدارەکانی (٤٤٤) بوو، کە ئەم شانەیە لەجەماوەری ناوچەی بیستوێن پێک هاتبوو، کۆمەڵێک شانە بوون ژمارەیان دەگەیشتە نزیکەی حەفتا شانە، هیچ شانەیەکی لە حەوت ئەندام کەمتر نەبوو، سنووری ئەم شانە چەکدارانە جگە لە حەوزی بیستوێن ناوچەکانی (هەولێر، بازیان یەک، کەورگۆسک، خەبات، جدیدە) ی دەگرتەوە، کە هیوا ئەحمەد مستەفا ناسراو بە (سوارە) لێپرسراوی هەموو شانەکان بوو[١٨٤].

جگە لەمانەش چەندین گروپ و ڕێکخراو و دەستەی نهێنی دیکە لە هەولێرو دەوروبەری ڕۆڵیان بینی لە زەمینە خۆشکردنی ڕاپەڕین، وەک: ڕەوتی کۆمۆنیست، کە ڕێکخراوێکی مارکسی عێراقی بوو، ڕێکخراوی تێکۆشان، درێژکراوەی کۆمەڵەی ڕەنجدەران بوو، ڕێکخراوی کۆمۆنیستی کرێکاری، کە بزاوتێکی چەپی توند بوو، ڕێکخراوی دەستەی ڕاپەڕین، کە جووڵانەوەیەکی چەپی کوردستانی بوو، ڕێکخستنەکانی جگە لە شارەکانی دیکەی کوردستان لە هەولێر و ئۆردووگاکانی دەوروبەری هەبوون و کاریان بۆ سەرهەڵدانی ڕاپەڕین دەکرد[١٨٥]. هەموو ئەمانە بەهۆی ئەوەی لەباری نهێنی دابوون، نەیان دەتوانی وەک ڕێکخراو و حیزب و بەرە خۆیان بە جەماوەر بناسێنن.

لە ڕێگەی ئەم شانە نهێنییانەوە نامەی نهێنی پارت و ڕێکخراوە سیاسییەکانی کوردستان بەردەوام بوو لەگەڵ سەرۆک عەشیرەتەکان و سەرکردەی فەرماندەکانی بەرگری نیشتمانی[١٨٦].

جگە لە مانەش دروستکردنی دەستە (مەفرەزە) پارتیزانەکان و ناردنەوەی پێشمەرگە پۆل پۆل بۆ ناوچە داگیرکراوەکانی ژێر دەستی حکومەتی عێراق، بە مەبەستی پەیوەندیکردن بە شانە چەکدارەکانەوە، کە بۆ مەبەستی ڕاپەڕین ساز کرابوون. بۆیە هەر ناوچەیەک دەستەیەکی لێ بوو وەک کۆمیتەیەک لە سنووری پارێزگای هەولێر، بەم شێوەیە: سنووری هەولێر: بورهان سەعید سۆفی، جەلال ئیلنجاغی، مەلا سلێمان. سنووری ڕەواندز: جەلال حاجی، هەڵۆ حەسەن. سنووری شەقڵاوە: تەحسین کاوانی، جەلال سۆرکانی. سنووری کۆیە - تەق تەق: م. باپیر، ئاشتی سابیر میرە، مەلا جەمال، م. زیرەک. ئەم کۆمیتانە پێک هاتبوون لە چەندین کادیری سەربازی و سیاسی و سەرجەمیان نزیکەی (٧٠) پێشمەرگە بوون[١٨٧].

بەم شێوەیە چەند "دەستەیەکی پارتیزان[١٨٨]" لە ١٠/٢/١٩٩١ لە زەڵێوە کەوتنە ڕێ بۆ ناوچەکانی سۆران و شەقڵاوەو کۆیەو هەولێر، پۆل پۆل بەبناری قەندیل بەهەموو ڕێگا سەخت و بەفراویەکان کە زۆربەی ناوچەکان لە دانیشتوان چۆڵ کرابوون، جگە لە مۆڵگە (ڕەبایە)و سەربازگەی ڕژێم هیچ ئاوەدانییەکی دیکەی لێ نەدەبینرا[١٨٩]. بەم جۆرە

پاش چەند رۆژێک هەریەکــــە لەو دەستە پارتیزانانە گەیشتنە شوێنی مەبەستی خۆیان، کە دەستەکانی سنووری پارێزگای هەولێر بەم شێوەیە بوون: دەستەی ئۆردوگاکانی کانی قــرژاڵە و تۆبزاوە و بەرانەتی، مــەلا سلێــمــان ســەرپەرشــتــی دەکــردن. دەستــەی ئۆردوگــاکــانی شــاوەیس و پیــرزین، بورهان ســەعــیــد سـۆفی ســەرپەرشــتــی دەکــردن. هەروەها دەستــەی قــوشــتــەپەو ئۆردوگــاکــانی کــەسنەزان و دارەتوو و بنەســلاوە، جــەلال ئیلنجــاغی ســەرپەرشــتــی دەکردن(١٩٠).

**باسی دووەم**

**بەرنامەی ئازادکردنی هەولێر:**

دوای داگیرکردنی کوێت سەرجەم پارت و رێکخراوە سیــاســیــەکــانی کــوردســتــان کــەوتنە خۆ بۆ ســازدانی بەرنامــەیەک بۆ بەرەنگار بوونەوەی بارودۆخــەکــە، ئەوە بوو لە تەمموزی ١٩٩٠دا زنجــیــرەیەک کــۆبوونەوە بەســـــترا لەلایەن ســــەرکــــردایەتی پارتەکان بۆ رێکخستنەوەی کارەکان و بەرنامەدانان لەم قۆناغە ناسکەدا، ســـەرکـــردایەتی بزووتنەوەی کـــورد لەوکــاتەدا مــەبەســتی بوو شـــارە کوردییەکان رزگــار بکات و بیــخاتە ژێر دەســــەڵاتی خــــۆیەوە، بۆ ئەم مەبەســتــەش بۆ هەمــوو پارێزگــایەک لیژنەیەک دانرا بۆ ئەوەی سەرپەرشتی رزگارکردنی بکات، بە هەمــوو ناحیەو ئۆردوگاو شارەکانەوە، کە بۆ هەولێر (کۆسرەت رەسول عــەلی) دەستنیشان کرا(١٩١).

بەرنامــەی ئازادکــردنی هەولێــر ناتواندرێ لەبەرنامـــەی گــشــــتی راپەڕینی شارەکانی دیکەی کوردستان جــیــابکرێتــەوە، چونکە بەپێی ئەو بەرنامەیەی کە دانرابوو دەبوو سەرەتا شـاره بچـووکـەکـان و ئۆردوگـاکـان بەهاوکاری شانە چەکدارەکان و دەستە پارتیزانەکان و جەماوەر ئازاد بکرێت و پاشــان شــارە گــەورەکــانی وەک هەولێــــر و سلێـــمـــانی و دهۆک و کەرکوک ئازاد بکرێت، بەم شێــوەیە دوای ئازادکــردنی رانیــەو سلێــمــانی و...هتــد و کــۆکــردنەوەی هێــزەکــان، لەلایەن ســەرپەرشــتــیــاری هەولێــر پلانێـک دانرا بۆ گــرتنی هەولێـــر، ئــەویــش بــڕیــاردرا بــەدابــەشــکــردنــی هێــزەکــان بۆ ســەر دوو قــۆڵ: قــۆڵی کــۆیە: پێک هاتبــوو لە (م. چەتۆ، رێباز، م. بەکر مــســتــەفــا)، کە (م. چەتۆ) سەرپەرشتی دەکرد، و قۆڵی شەقڵاوە: پێک هاتبوو لە (کۆسرەت رەســـوڵ، عـــبـــدالرزاق، حـــەســـەن کــوێســتـــانی، ســەفین مــەلا قــەرە، عـــبـدالله بۆر، رەحـمـان سـەیدە)، بە سەرپەرشتی کۆسرەت رەسول(١٩٢).

شــەقــڵاوە پێگەیەکی گــرنگی هەبوو، چونکە هێــزەکــانی فــەیلەقی (٥) لە دەوروبەری رێگای هاملتۆن بەم شێــوەیە بوو: تیــپەکــانی سوپای عێراق یەکیان لە بەرسلێن و ئەویتریان لە ســیــدەکــان و ســێــیــەمــیــشــیــان لە ســپــیلک بوو، کــە دابڕینی ئەم سێ تیــپــە لە فــەیلەقی (٥)ی هەولێــر گـــــرنگ بوو، چونکە دەبــوە هۆی ئاســانکاری بۆ ئازاد کــردن و بەرپا کردنی راپەڕینی هەولێر، بەم شێوەیە بەهــۆی شــــــارەزایی هەنــدێ لە پێــشــمــەرگــەکــانی ناوچەکــە و رێکخستنە نهێنیەکانی ناو گوندی کــاوانیــان، توانرا شــاری شــەقــڵاوە لە ١٩٩١/٣/٨دا بەشەڕ ئازاد بکرێت، کــە لە دوای ئازادکــردنی شــەقــڵاوە هەواڵ نێـــردرا بۆ رێکخــســـتــنــە نهێنیەکانی ناو شاری هەولێر، بێن بۆ شەقڵاوە بەمەبەستی ئەوەی لەگەڵ ســەرکــردەکــانی هێــزی پێــشــمــەرگــە بەرنامەی ئازادکردنی شاری هەولێر دابڕێژن، چونکە کــاتێک شــەقــڵاوەو دەوروبەری ئازادکران دەرگــا کــراوە بۆ هێــزی پێــشــمــەرگــە بەرەو هەولێــر هەنگاو بنێن(١٩٣).

بەم جــۆرە مــەلا قــادر(١٩٤)، بە هاوڵتی لەگەڵ جەبار شێخە و زاهیر (نــەدار)(١٩٥)، لــە ١٩٩١/٣/٨ گـەیشــتنە شــەقــڵاوە و لەدێی (بانە نۆک) لەگــەڵ ســەرپەرشــتــیــاری راپەڕینی هەولێـــر کـــۆبوونەوەو ســەرجەمیــان رێک دەکەون بۆ ئەوەی رۆژی ١٩٩١/٣/١١ بـــــۆ رۆژی راپەڕینی هەولێر دەستنیشان بکرێت، هەرچەندە رێکخــستــنە نهێنیــەکــانی ناوشــار پەلەیان بوو، مەبەســتیــشــیــان بوو زووتر لە (٣/١١) راپەڕین بەرپا بکەن، بەڵام ســـەرپەرشـــتـــیـــاری راپەڕینی هەولێر سووربووە لەسەر ئەم مــێــــژووە، ئەمــەش لەبەر دوو هۆ: یەکــەمــیـــان: رێککەوتن نامـــەی (١١/ئازاری/١٩٧٠) کـــــە لەو ساڵەدا رژێمی بەعسی بەغدا بەپێی رێکەوتنێکی رەسمی دانی نا بەمافی گــەلی کــورد. و دووەمــیــان: پێی وابــووە نــابــێــت پــەلــە بــکــرێــت لــە راپەڕینی هەولێـر، چونکە ئەم شــارە پێگەیەکی گــرنگی هەیەو پەلەکــردن دەبێــتە هۆی ئەوەی بەباشی خــۆی بۆ

ئامادە نەکرێت و پاشان ئەگەری شکستی دەبێت[١٩٦].

دوای ئەوەی بڕیاردرا لەسەر (١١/٣/١٩٩١) بۆ ڕاپەڕینی هەولێر، دەست کرا بەدانانی نەخشەیەکی ورد بۆ ئازاد کردنی ئەم شارە، هەستان بەدابەشکردنی شانە چەکدارەکان و دابەشکردنی بەشەکان، بەپێدانی چەندین پارچە چەکی بچووک لە جۆری (کلاشینکۆف) و ناردنەوەیان بۆ هەولێر لە ڕێگەی ڕێکخستنەکانی بروسک، لە هەمان کاتدا هێمایەکی نهێنی بۆ شانە چەکدارەکان و ڕێکخستنە نهێنیەکانی بروسک لە ناو هەولێر دانرا، کە بڵاو کردنەوەی ئەم هێمایە لەڕێگەی رادیۆوە، مانای ئەوە دەگەیەنێت هێزی پێشمەرگە گەیشتۆتە هەولێرو دەست بکرێت بەڕاپەڕین، لەگەڵ ئەوەش چەندین نامەی تایبەت لە لایەن سەرپەرشتیاری ڕاپەڕینی هەولێر نێردرا بۆ کەسایەتی و سەرۆک عەشیرەت و سەرۆکی هێزەکانی بەرگری نیشتمانی لەناوچەکانی دەوروبەرو ناوەوەی هەولێر، لەنامەکاندا هاتبوو (هێزی پێشمەرگە گەیشتۆتە ناوچەکانتان و پێویستە هاوکاریان بکەن)، بەشێک لەو کەسایەتی و سەرۆکی هێزەکانی بەرگری نیشتمانی، بریتی بوون لە: حسێن ئاغای سورچی، عومەر ئاغای سورچی، محمد قادر ئاغای هەرکی، ئەحمەد لاوکۆ، کەریم خانی برادۆست، قادر بەگی برادۆست و عەشیرەتەکانی دیکەی ئەو ناوچەیە[١٩٧]، کە پاشان بەشێکی زۆریان ڕۆڵی باشیان گێڕا لە ڕاپەڕین[١٩٨].

شانە چەکدارەکانی بروسک بەپێی بەرنامەیەکی وردی خۆیان، لە ڕووی ڕێکخستنەوە هەولێریان بەسەر (٥) بەش دابەشکردبوو، بەم جۆرە: بەشی یەکەم لە خەتی کۆیەوە بۆ خەتی مەخمور، دێدەوان سەید محەمەد لێپرسراوی بوو، بەشی دووەم لە خەتی کۆیەوە بۆ خەتی شەقڵاوە، زاهیر (نەدار) لێپرسراوی بوو، بەشی سێیەم لە خەتی مەخمورەوە تا ناو سەربازگەی هەولێر، سالارە شەل لێپرسراوی بوو، بەشی چوارەم لە خەتی شەقڵاوەوە بۆ سەربازگەی هەولێر، مام خدر لێپرسراوی بوو، هەروەها بەشی پێنجەم، کە بەناوی بەشی ناوخۆ بووەو تایبەت بووە بەناو شار، ئەحمەد ئیسماعیل (ئەحمەد گەل) لێپرسراوی بوو[١٩٩]. بەم جۆرە دوای ڕێکخستنی پلانەکان، هەنگاونرا بۆ ڕۆژی ئازادکردنی هەولێر.

**باسی سێیەم**

**ڕۆژانی ئازادکردنی هەولێر:**

دوای ئەوەی جەماوەری کوردستان شانبەشانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان، شارەکانی شەقڵاوەو سۆران و ڕەواندز و کۆیەو دوکان یان ڕزگارکرد، بەرەو هەولێر کەوتنە ڕێگا، هێزەکان بەگشتی لە شارو شاخ بۆ ئازادکردنی هەولێر چاوەڕێ و لە ئامادەباشیدا بوون[٢٠٠]. ئەوە بوو هێزی پێشمەرگە بۆ ڕۆژی ڕاپەڕین لە دوو قۆڵەوە هەڵمەتیان هێنا:

١/ قۆڵی ڕێگای شەقڵاوە: دوای ڕزگارکردنی هاوینە هەواری سەلاحەددین و سپیلک و سەرجەم ناوچەکانی دیکە، هێزەکان گەیشتنە ئۆردوگای بەستۆڕە، بەڵام کاتێ پێشمەرگە گەیشتە ئەم ئۆردوگایە، لەلایەن سوپای عێراقەوە لەناو "سەربازگەی خانزاد[٢٠١]" ڕوو بەڕووی بۆردومانێکی سەخت بوونەوە، بۆ ئەوەی کۆنتڕۆڵی ئەم هێزەی عێراق بکەن و بۆردومانەکە کۆتایی پێ بێت، پلانێک دانرا کە (بورهان سەعید سۆفی) و چەند پێشمەرگەیەک وەک فێڵێک بەناوی چەکدارەکانی (بارامی شێخەی هارون) خۆیان بگەیننە ناو ئەم سەربازگەیە، ئەوەبوو (بورهان سەعید سۆفی) توانی پلانەکە وەک خۆی جێبەجێ بکات و دەست بگرێت بەسەر سەربازگەکەو سەرجەمی سەربازەکان بەدیل بگرێت و چەکیان بکات[٢٠٢].

دوای ئەوەی هێزەکانی پێشمەرگە کۆنتڕۆڵی ئۆردوگای بەستۆڕەو دەوروبەریان کرد، لە هەولێر زیاتر نزیک کەوتنەوە، بۆیە لەم کاتەدا لەڕووی سەربازیەوە پلانێک دانرا بۆ ئازادکردنی هەولێر، کە بەرەبەیانی ١٩٩١/٣/١١ ڕێگای موسڵ-هەولێر کۆنتڕۆڵ بکرێت، هەروەها هێزێک بنێردرێت بۆ هاندانی جەماوەری ئۆردووگای بەڕانەتی و پاک کردنەوەی ناوچەکە، و هێزێک بنێردرێت بۆ ڕۆژهەڵاتی هەولێر بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەو هێزەی لە کۆیەوە دێت تێکەڵ بن[٢٠٣].

بۆ جێبەجێکردنی ئەم پلانەی

دانرابوو بۆ هەولێر، هێزەکانی پێشمەرگە دابەش کران بۆ دوو بەش: بەشێکیان بەسەرپەرشتی (بورهان سەعید سۆفی) و ژمارەیەک پێشمەرگە بەرێ کەوتن بۆ ناوچەکانی (بەرانەتی، زرارەتی، ئۆردوگای کەلەکی یاسین ئاغا، تۆپزاواو کەورگۆسک)، بۆ ئەوەی سەرجەمی ئەم ناوچانە رزگار بکەن و هەوڵ بدەن رێگای نێوان (موسڵ-هەولێر) بپچرێنن. بەشی دووەمیان بەسەرپەرشتی (کۆسرەت رەسوڵ عەلی) لە ئۆردووگای بەستۆرەوە بەرێ کەوتن بۆ ئۆردووگای شاوەیس، بۆ ئەوەی بتوانن زیاتر لە هەولێر نزیک بکەونەوە[٢٠٤].

٢/ قوڵی رێگای کۆیە: دوای ئەوەی سەرجەمی سەنگەرەکانی سوپای عێراق لە سەر کێوەکانی هەیبەت سوڵتان لە (٩ مارسی ١٩٩١) بەهێرشی پێشمەرگەکانی سۆسیالیست و یەکێتی رزگارکرا، پانتایی راپەرین بە بەشداری جەماوەرو پێشمەرگە دوای ئازادکردنی کۆیە بەرەو رۆژئاوا بلاوەبۆوە. بەمەش تیپێکی پێشمەرگە کە ژمارەیان نزیکەی (٢٠٠) پێشمەرگە دەبوون لە کۆیەوە بەرەو هەولێر بەرێ کەوتن، بەڵام پێشرەوی ئەم پێشمەرگانە لە دەربەندی گۆمەسپان بەهۆی بەرگری (٥) تانکی سوپای عێراقەوە دواخرا، بۆ ئەم مەبەستەش یەکێک لە فەرماندەکانی ئەم پێشمەرگانە وتی: "شەوی بەسەرداهات، باران دایکرد، پێشمەرگەکان ماندوو بووبوون... ئێمە بریارماندا بۆ کۆیە بگەرێینەوە و رۆژی دوایی لە گەرانەوەماندا هێرشیان بۆ بکەین، پاشان لەگەڵ هاتنی ئێمە بۆ هەولێر هەموو شتێک تەواو بووبوو، تەنها کاربەدەستانی ئەمن تائەو کاتە بەرگریان دەکرد"[٢٠٥]. بۆیە دەکرێت بڵێین تەنها بەشی سەرەکی بۆ رزگارکردنی هەولێر لە قوڵی رێگای شەقلاوەوە بوو.

سەبارەت بەرێکخستنە نهێنیەکان و شانە چەکدارەکانی بروسک لەناو شار، هەموو ئاگادار کرابوونەوە ئەگەر شەوی ١٠-١١/٣/١٩٩١ ئێوارەکەی گوێیان لەو بروسکەیە بوو، کە بەشێوەی هێما بۆیان دانرابوو، ئەوا هەموو دەبێت لە کاتژمێر (١٢)ی شەوەوە بچن بۆ ئەو شوێنانەی بۆیان دیاری کراوە و بەیانی کاتژمێر (٦) دەست بەکاردەبن و راپەرین بەرپادەکەن، بۆیە دوای ئازاد کردنی ئۆردوگای (بەستۆرە) لەرۆژی ١٠/٣/١٩٩١، هێزەکانی قوڵی رێگای شەقلاوە چاوەروانی هێزەکانی قوڵی کۆیە بوون تاوەکو ئەوانیش بگەنە گۆمەسپان و پاشانیش کەسنەزان، لەگەڵ ئەوەی هێزەکانی قوڵی کۆیە دواکەوتن، شەوی ١٠-١١/٣/١٩٩١ رێنمایی درا بەهەموو شانە چەکدارەکان و رێکخستنە نهێنیەکانی ناوشار بەیانی (٣/١١) دەست بەکاربن بۆ راپەرین، کە لە ئێزگەی دەنگی گەلی کوردستانەوە ئێوارەی (١٠-٣/١١) لەکاتژمێر (٨)ی شەو، چەندین جار بروسکەی: ((لە باوکی رێناسەوە بۆ گشت شانە چەکدارەکانی بروسک، دەست بەکاربن)) خوێندرایەوە، بەمەش چەخماخەی راپەرینی هەولێر کاتژمێر (٦)ی بەرە بەیانی ٣/١١ دەستی پێکرد[٢٠٦].

دوای ئەوەی راپەرینی هەولێر لەلایەن شانە چەکدارەکان و جەماوەری هەولێر بەسەرجەم چین و توێژە جیاوازەکانی وەک: (ژنان، خوێندکاران، لاوان، مامۆستایان، فەرمانبەران و کرێکاران و...هتد) بەرپاکرا، هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە قوڵی شەقلاوە شالاوی هێنا بۆ رزگارکردنی هەولێر و کاتژمێر (٨)ی بەیانی ٣/١١ گەیشتنە بازگەی شاوەیسی نزیک هەولێر، دوای روو بە روو بوونەوە و شەرێکی نیو کاتژمێری توانرا تانکەکانی سوپای عێراق لەوێ تێک بشکێنن و هەڵ بکوتنە ناو شار و تێکەڵ بە جەماوەری راپەریو ببن[٢٠٧].

بە گەیشتنی پێشمەرگە بۆ ناو هەولێر، هێزەکان کران بەدوو رەتڵەوە، رەتڵی یەکەم: هێزێک بەسەرپەرشتی کۆسرەت رەسوڵ بۆ سەر بارەگای فەیلەقی (٥)، و رەتڵی دووەم: هێزێک بەسەرپەرشتی عەبدولرەزاق بۆ سەر دەزگای ئەنجومەنی یاسادانان و جێبەجێکردن و رێکخراوی هەواڵگری باکور[٢٠٨]، لەبەرئەوەی ئەم شوێنانە بۆ رۆژی رزگارکردنی هەولێر لەرووی ستراتیجیەوە گرنگی تایبەتی خۆیان هەبوو، چونکە قورسایی هێزی حکومەت زیاتر لەم شوێنانەدا بوون، کە شان بەشانی پێشمەرگەکانی (ی.ن.ک)، دەستەیەکی پێشمەرگەکانی (پ.د.ک) بەسەرپەرشتی جەمال مورتکە بەشداربوون لە ئازادکردنی شاری هەولێر[٢٠٩].

بەپێی ئەو بەرنامەیەی دانرابوو بۆ ئازادکردنی هەولێر، پێیان وابووە هەمان رۆژ پاک دەکرێتەوە، جگە لەفەیلەقی (٥) و سەربازگەی "رەشکێن[٢١٠] " نەبێت دەمێننەوە بۆ رۆژی دوایی، بەلام کاتێک راپەڕین بەرپابوو زۆربەی شوێنەکان ئازادکران، کە دیارترین و گەورەترین شەڕ بۆ ئازادکردنی هەولێر، شەڕی رێکخراوی هەوالگری باکوور (منظومة الاستخبارات الشمالية) بوو، کە تیایدا زیاتر لە (٤٠) کەس لە پیاوانی ئەمن و بەعسی و دەست و پێوەندەکانیان کوژران و چەندین کەسی دیکەشیان بریندارببوون و بۆ ماوەیەک خۆیان لە ماڵەکانی گەڕەکی حی عدل و ئازادی حەشاردا، بەلام پاش بەرگریەکی کەم کاتژمێر (٤)ی دوای نیوەڕۆی هەمان رۆژ ئەویش ئازاد کرا[٢١١]. بەمەش بارەگای فەیلەق و ئاسایشی باکوورو سەرکردایەتی لقی هەولێر و بارەگای سوپای گەل (جيش شعبي) و پارێزگاو بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس و هەوالگری، هەر هەموویان بەهەشت کاتژمێر پاکسازی کران و کەوتنە ژێر دەسەلاتی جەماوەرو پێشمەرگە، ئەوەی کە بەعسیەکان چەندان ساڵ بوو بۆ تۆقاندنی خەڵک بنیاتیان نابوو، بە هەشت کاتژمێر کۆتایی پێهێنرا[٢١٢].

هەربۆیە دوای نیوەڕۆی رۆژی ١١/٣/١٩٩١ هەموو شتێک تەواو بوو، و نزیکەی هەزار زیندانی کە زۆربەیان لەجەنگ هەلاتبوون و لەو زیندانانەی کە پێشتر وێستگەی شەمەندەفەر بوو (سجني محطه)، لەلایەن جەماوەر ئازاد کرا، بەئازادکردنی هەولێر رێگاکانی کەرکوک کەوتنە ژێر چاودێری پێشمەرگەوە، کە پاشان ئەو رێگایانە رۆلی سەرەکیان لە راپەڕینی ئازادکردنی کەرکوک دا بینی.[٢١٣]

پاش ئازادکردنی شار و پاک کردنەوەی لە دام ودەزگاکانی حکومەتی عێراق، بۆ پاراستنی ئەم راپەڕینەی هەولێر و نەهێشتنی مەترسی لەسەر ئەو شارە، بڕیاردرا دەست بکرێ بە پاک کردنەوەی شارو شارۆچکەکانی دەوروبەری، وەک: شارۆچکەی مەخمور، ئۆردووگای خەبات و پردێ[٢١٤].

دەکرێت بلێین لەرۆژانی ئازادکردنی هەولێردا، جەماوەر بەسەرجەم چین و توێژە جیاوازەکانەوە لەوپەڕی خۆشی و شادی دابوون، لە هەمان کاتدا کاردانەوەی راستەوخۆیان بۆ سەر دام و دەزگا حکومی و نا حکومیەکانی حیزبی بەعس خستەڕوو، بەوەی هەم وەک نارەزاییەکی بوێرانە بەرامبەر بە سیاسەتە چەوتەکانی بەعس لەچەند ساڵی رابردوو بەرامبەر کورد بەگشتی و خەلکی هەولێر بەتایبەتی، هەمیش بۆ بژێوی ژیان و لەتا وی ئازار و برسیەتی و تێرکردنی خۆیان، سەرجەمی کەل و پەلەکانی ئەم دام و دەزگایانەیان بە تالان بردو بەسەریەکدا خاپووریان کرد، ئەمەش ئەوەی دەخستە روو کە جەماوەر چەندە تینووی ئازادی و نان و خۆراک و بژێوی ژیانن، دوور لە ستەم و چەوساندنەوە.

**بەشی چوارەم**
**شاری هەولێر و شکستی راپەڕین**

**باسی یەکەم**
**هێرشی سوپای عێراق و داگیرکردنەوەی هەولێر:**

دوای (٢٠) رۆژ ئازادی، سوپای عێراق بەهەموو هێزو توانایەوە خۆی کۆکردەوەو هێرشی بەربلاوی چەند قۆلی هێنایەوە سەر کوردستان، کە بەرە بەیانی رۆژی ٢٧/٣/١٩٩١ هێرش و پەلاماری بۆ سەر کەرکوک و پردێ دەست پێکردو سەرەنجام داگیری کردنەوە[٢١٥].

لەگەڵ داگیرکردنەوەی شاری کەرکوک و پردێ و ناوچەکانی دەوروبەری، سوپای عێراق نزیک کەوتنەوە لە شاری هەولێر، بۆیە لەم شارە رۆژی ٢٨/٣/١٩٩١ لەلایەن بەکرێگیراوانی بەعسەوە پڕوپاگەندەی ئەوە بلا و دەکرایەوە، کە بەعس هێرش دێنێتەوە سەر کوردستان و هەموو جۆرە چەکێکی قورس و کیمیایی بەکاردێنێت[٢١٦]، بۆیە پاش تێکچوونی بارودۆخی هەولێر بڕیاردرا بەرگری بکرێت لە هەولێر و رێگە نەدرێت ئەو شارە جارێکی دیکە بکەوێتەوە دەست رژێمی بەعس، لە بەرئەوە هێزەکانی رژێم لە سێ قۆلەوە هێرشیان هێناو پێشمەرگەش لە سێ قۆلەوە دامەزرابوو بۆ بەرگریکردن لە هەولێر، بۆ نموونە هێزەکانی (ی.ن.ک) بەم جۆرە دابەش بووبوون: قۆلی (هەولێر-کەرکوک)، کۆسرەوت رەسوڵ سەرپەرشتی دەکرد، قۆلی (هەولێر-موسڵ)، سەفین مەلا قەرە

سەرپەرشتی دەکرد، قۆڵی (هەولێر- کەندێناوە)، ڕێباز سەرپەرشتی دەکرد[٢١٧].

ئێوارەی ١٩٩١/٣/٢٩ هێزێکی گەورەی سوپای عێراق لە ڕێی کەڵەک دەپەڕێتەوەو دەگاتە ناوچەی کەندێناوە، هەرچەندە لە گوندی (بیرە بات) هێڵێکی بەرگری لەلایەن هێزی پێشمەرگە دانرا، بەڵام ڕۆژی ١٩٩١/٣/٣٠ دوژمن هەموو ناوچەی کەندێناوەی گرتەوەو هێزی پێشمەرگە نەی توانی بەرگریەکی ئەوتۆ بکات[٢١٨]. پاش ئەوەی هێزی پێشمەرگە لە هەرسێ قۆڵەوە شکست دێنن و دوژمن هەمان ڕۆژ قوشتەپەی نزیک هەولێر داگیر دەکاتەوە، بەمەش سەرجەم هێزەکانی پێشمەرگە پاشەکشێ دەکەن بۆ ناوشار[٢١٩].

بەداگیرکردنەوەی قوشتەپە لەلایەن سوپای عێراقەوە، پشێویەکی زۆر دەکەوێتە ناو هەولێر، بۆیە لەلایەن هێزەکانی (ی.ن.ک و.پ.د.ک) پلانێک دادەنرێت بۆ گرتنەوەی قوشتەپە بەم جۆرە: هێزەکانی (یەکێتی)، بەسەرپەرشتی شاخەوان عەباس، و هێزەکانی (پارتی)، بەسەرپەرشتی یونس ڕۆژبەیانی، کە هەریەکەو بەجیا لە دووقۆڵەوە هەڵبکوتنە سەر قوشتەپەو ڕزگاری بکەنەوە، بۆ ئەم مەبەستەش شەوی ٣٠-١٩٩١/٣/٣١ کاتژمێر (١)ی شەو تەقە بۆسەر قوشتەپە دەستی پێکرد، بەڵام سەرەنجام هێزی پێشمەرگە شکستی هێناو بەرەو دواوە پاشەکشەی کرد[٢٢٠].

شەوی ٣٠ ئازاری ١٩٩١ نزیکەی (٨) تۆپخانەو ژمارەیەکی زۆر لە تانکەکانی سوپای عێراق بەرەو ڕووی هەولێر کەوتنە کار، لە هەر کاتژمێرێکدا گوللە تۆپێک دەکەوتە ناوشارەوە، ئەمەش بەمەبەستی ترساندنی خەڵکەکە بوو لەو کارەشیدا سەرکەوتوو بوو[٢٢١]، چونکە ڕۆژی ١٩٩١/٣/٣١ چەند دەستەیەکی سەر بەڕژێمی عێراقی لەشاری هەولێر دەردەکەون بەمەبەسی تەقەکردن لە خەڵکی و تێکدانی ئارامی و ئاسایشی شار[٢٢٢]، بۆیە پاش ئەوەی ڕۆژی ١٩٩١/٣/٣١ هێزی پێشمەرگە بێ ئومێد دەبێت لە گرتنەوەی قوشتەپە، بیر لەوە دەکەنەوە لەناوشار بەرگری بکەن، بۆ ئەم مەبەستەش هێزێک بەسەرپەرشتی (ڕەهبەر سەید برایم) دەچێتە سەر ڕێگای (هەولێر-کەسنەزان) و هێزێکی دیکەش کەپێک هاتبوون لە (حەسەن کوێستانی، شاخەوان عەباس، سەفین مەلا قەرە، فاقە مەخموری، مەلا سلێمان)، دەچنە گەڕەکی کوردستان لە ڕۆژئاوای شارو بڕیاری بەرگری کردن دەدەن، بەڵام هەر ئەوڕۆژە هێزەکانی ڕژێم لەخەتی قوشتەپەوە پەلاماری سەر هەولێر دەدەن و نزیکەی کاتژمێر (١١)ی نیوەڕۆ تانکەکانی دەگاتە ناو شار[٢٢٣]. هەرچەندە پێشمەرگە ئەوەندەی بۆی کرا بەرگری کرد، بەڵام سەرەنجام ڕۆژی ١٩٩١/٣/٣١ شاری هەولێر بەهێرش و پەلاماری سوپای عێراق داگیر دەکرێتەوە[٢٢٤].

بەم جۆرە جارێکی دیکە هەولێر پاش بیست ڕۆژ ئازادی دەکەوێتەوە ژێر دەسەڵاتی ڕژێمی بەعس، کە لەئاکامی بەرگری کردندا وێرای شەهید بوون و بریندار بوونی ژمارەیەکی زۆری پێشمەرگەی پارتە سیاسییەکانی کوردستان، لە هەمان کاتدا ژمارەیەکی زۆریش لە چین و توێژە جیاوازەکانی شاری هەولێر و دەوروبەری شەهیدو برینداربو ئەوانی دیکەش بەشی هەرە زۆریان دەربەدەر بوون بۆ ناوچە سەر سنووریەکان، کە دەکرێت بوترێت ئەم ئاکامانەش هەم بەهۆی نا هاوسەنگی هێزەکان و هەمیش بەهۆی لێک نەگەیشتنی نێوان پارتە سیاسیەکانی کوردستان و نەبوونی یەک دەنگی بوو بۆ بەرنامەی دوای ڕاپەڕین.

## باسی دووەم
## هۆکارەکانی شکستی ڕاپەڕین بە گشتی:

بۆیە بەسەرنجدانێکی وردی بارودۆخی بەهاری ١٩٩١، دەبینین کۆمەڵێک هۆکاری کاریگەر هەبوون کە وای کرد ئەم ڕاپەڕینە نەتوانێت مەبەستەکانی خۆی لە ئازادکردنی تەواوی ناوچەکانی کوردستان لەدەست ڕژێم بپێکێت، کە لەماوەیەکی کورتدا جەماوەری ڕاپەڕیو بەهەمان لێشاوی پەلاماردان و بەرەو پێشەوە چوون بەرەو دواوە کشانەوەو تووشی شکست هاتن. کاتێک کە ڕژێم گشت شارەکانی گرتەوە توانی زیانی گەورە لە جەماوەری ڕاپەڕیوی کوردستان بگەیەنێت لە سەرجەم بوارەکانی (ماددی و مەعنەوی و مرۆییەوە).

لێرەدا هەوڵ دەدەین ئەم هۆکارانە بەدوولایەنی (دەرەکی و ناوەکی)، بخەینە ڕوو:

**یەکەم: هۆکارە دەرەکییەکان:**
چەند هۆکارێکی دەرەکی ڕۆڵیان هەبووە بۆ شکستی ڕاپەڕینی ۱۹۹۱ی کوردستان، کە گرنگترینیان ئەمانەن:

۱-هەڵوێستی خراپی ڕۆژئاوا و ئەمەریکا بەرامبەر بەڕاپەڕین، چونکە وڵاتانی ڕۆژئاوا لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنیانەوە وایان بڵاو دەکردەوە کە مەبەستی سەرەکی هاوپەیمانەکان ڕووخاندنی ڕژێمی عێراقە، بەتایبەتی ئەمەریکا کە (جورج بوش)ی سەرۆک کۆمار بەڕاشکاوانە داوای لەگەلی عێراق دەکرد ڕاپەڕن و سەدام برووخێنن، بەڵام هەموو ئەوانە لەکاتی بەرپاکردنی ڕاپەڕین پێچەوانە بۆوەو نەک پشتیوانی گەلی عێراق بەگشتی و گەلی کوردیان بەتایبەتی نەکرد، بەڵکو هەرزوو شەرەکەیان وەستاند و پلانی لەناوبردن و کپکردنەوەی ڕاپەڕینیان دارشت[۲۲۵]. ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە ئەمەریکا بڕیاری گفتوگۆ کردنی لەگەڵ ڕژێم دا لە ۲۸/۲/۱۹۹۱ز، کە ئەوکات ڕژێم لەوپەڕی لاوازی و شکستیدا بوو، بەڵام ئەم ڕێکەوتنە کارێکی زیان بەخشی گەیاندە ورەی خەڵک و لە هەمان کاتیشدا ڕژێمی پێ بەهێز بۆوە[۲۲۶].

بۆیە دەبینین ڕاپەڕین دەستی بەبەر تەسک بوونەوە کرد پاش ئەوەی (جورج بوش) تیشکی سەوزی دا بەڕژێم و دەست کردن بەدژە هێرش لەسەر ڕاپەڕین، کە لەهەمان کاتدا گەمارۆی سەر یەکەکانی سوپای پاسەوانی کۆمارییان هەڵگرت لەڕۆژئاوای فورات و، ماوەشی دا هەڵیکۆپتەر بەکاربێنێ دژی گەلەکەی، کە ئەمانەش هەموو پێچەوانەی بەندەکانی ڕێکەوتنەکەی نێوان ڕژێم و هاوپەیمانان بوو کە لەژێر چادری (سەفوان) مۆرکرابوو[۲۲۷].

پاش ئەوەی ڕژێم سەرجەم هێزەکانی کە لەکوێت و بەسرەو ناسریە گەمارۆ درابوون، بەڕێگە پێدانی لەلایەن هاوپەیمانان سەرجەمیانی گەیاندەوە ناوەڕاستی عێراق، بۆ نمونە ڕژێم بەیەک ڕۆژ نزیکەی (۹۰۰) تانکی لە فوراتەوە پەڕاندەوە بۆ دەوروبەری شاری بەغدا[۲۲۸]. بۆیە دەتوانین ئەم هەڵوێستەی هاوپەیمانان بەرامبەر بە ڕاپەڕین بەیەکێک لە هۆکارە دەرەکی یەکانی دابنێین بۆ شکستی ڕاپەڕین.

۲- شکستی ڕاپەڕین لە ناوەڕاست و خوارووی عێراق:
دوای ئەوەی ڕاپەڕین لە باشوری عێراق دا سەری هەڵدا و بەرەو شارەکانی ناوەڕاستی عێراق پەرەی سەند هێزی هاوپەیمانان لەسەروشیانەوە ئەمەریکا ترس کەوتە دڵیانەوە نەوەک حکومەتی عێراقی بروخێت و شیعە لەشوێنی حوکم بگرێتە دەست، چونکە دەبووە هۆی هاوپەیمانی لەگەڵ ئێران، کە پێشتریش لەماوەی (۸) ساڵ شەڕی نێوان عێراق- ئێران خەریک بوو تاشتێکی وا ڕوو نەدا، بۆیەش ئەمەریکا تیشکی سەوزی بە سەدام دا بۆ ئەوەی پەلاماری ئەو ڕاپەڕینە بدات و سەرکوتی بکات، بەمەش ڕژێم هەڵسا بەبەکارهێنانی تانک و تۆپ و بۆمبە دوکەڵاویەکانی کە هاوشێوەی دوکەڵی بۆمبی کیمیاوی بوون، توانی ڕاپەڕین لەناوەڕاست و باشوور کپ بکاتەوە[۲۲۹]، کە ئەمەش بەیەکێک لە هۆکارەکانی شکستی ڕاپەڕین دادەنرێت لە کوردستان، چونکە کاتێک ڕژێم ڕاپەڕینی شیعەکانی لە خواروو کپ کردەوە، توانی زیاتر بێتە سەر کوردستان بۆ کپ کردنەوەی ڕاپەڕین[۲۳۰].

۳- نەبوونی پەیوەندیەکی پتەو لە نێوان ڕاپەڕینەکانی خوارووی عێراق و باشووری کوردستان:
پێش ڕاپەڕین لیژنەیەکی هاوکاری هەبوو لە نێوان بەرەی کوردستانی و مجلسی اعلی (دعوەو منظمەی عملی اسلامی)، کە بڕیار بوو پێکەوە ڕاپەڕین بەرپابکەن لەیەک کاتدا، بەڵام (مجلسی أعلی) ئەم بڕیارەی نەبردە سەرو بەبێ ئاگاداری بەرەی کوردستانی ڕاپەڕین یان لە باشووری عێراق بەرپاکرد، کەتوانی بوو یان زۆربەی شارەکانی خواروو ناوەڕاستی عێراق هەتا (حلە)ش ئازاد بکەن، کەدوای ئەوان بەرەی کوردستانی بەهاوبەشی لەگەڵ جەماوەر ڕاپەڕین یان گەیاندە شاری کەرکوک، بۆ یە لێرەدا ئەگەر (مجلس أعلی) بڕیارەکەی جێ بەجێ بکردایە دۆخەکە بەشێوەیەکی تر دەبوو، چونکە دەتوانرا پێکەوەو بەهاو بەشی پەلاماری شارەکانی تری عێراق وەک (بغداو تکریت و موسڵ) بدرێت و ڕژێم بەتەواوی لەناو ببرێت[۲۳۱].

کاتێک ڕاپەڕین لە خوارووی عێراق بەرپابوو، لە دوولاوە کاریگەری خراپی هەبوو بۆ ڕاپەڕینی کوردستان، کە لە لایەک وای لە سەرکردایەتی بەرەی کوردستانی کرد

کەخێراو بەپەلە بڕیاری ڕاپەڕین بدەن لە شارەکانی کوردستان، کەئەم پەلەیەش دەرئەنجامێکی خراپی لێکەوتەوە لە دوای ڕاپەڕین، لە لایەکی تریشەوە شکستی ئەم ڕاپەڕینە کاریگەری خراپی هەبوو لە سەر دەروونی خەڵکی کوردستان، بەهۆی ئەوەی کە ڕژێم ڕێگای زۆر دڕندانەی گرتەبەر بۆ کپکردنەوەی ئەو ڕاپەڕینە[٢٣٢]، هەروەها سەرکردایەتی ئۆپۆزسیۆن بەهاوبەشی بیریان لە پەیوەندیەکی ڕێکخراو نەکردبووەوە لەگەڵ دەوڵەتانی دراوسێ و هەوڵیان نەدابوو بۆ پیادەکردنی نەخشەکانیان لەکاتی ڕاپەڕین دژی ڕژێم[٢٣٣].

کە ئەمانەش بۆ خۆی خاڵێکی لاوازی ڕاپەڕینەکان بوون، وەدەتوانرێ بەخاڵێکی شکستی هەردوو ڕاپەڕینەکە دابنرێت.

٤- ناهاوسەنگی هێز لە نێوان پێشمەرگە و ڕژێم:

لەگەڵ ئەوەی کە ڕژێم لە ئەنجامی جەنگەکانیدا شکستی گەورەی خواردبوو، بەڵام هێشتا لە رووی سەربازییەوە پڕچەک بوو ئەوهێزەی پێشمەرگە بەرهەڵستی پێ نەدەکرا[٢٣٤]، هەرچەندە ئەمەریکا و هاوپەیمانان لە ڕێگای دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە بڵاویان دەکردەوە کەلە کۆی (٥٦) تیپ سەربازی (٤٤) تیپیان لە ناو بردووە، کە ئەمەش بەشێکی زۆری سوپای عێراقی دەکرد، کەلە ڕاستی دا سەرکردایەتی کورد پێی وابوو کە ئەم وڵاتانە درۆ ناکەن، بەڵام دواجار دەرکەوت کەئەمانە دوورن لە ڕاستیەوە، چونکە بەشێکی زۆری سوپای عێراق لە باشوور بێ زیان مابۆوە، لە لایەکی تریشەوە هێزە بنەڕەتیەکەی ڕژێم بەتەواوی مابۆ وە کەبریتی بوو لە (پاسەوانی کۆماری) بەمەش نابەرامبەریەکی زۆر هەبوو لە نێوان هێزی پێشمەرگەو سوپای عێراق[٢٣٥]، بۆیە دەبینین ڕژێم هێشتا توانای جەنگێکی دیکەی لە کوردستاندا مابوو، وەلە هەڵێکی ڕەخساو دەگەڕا بۆ ئەوەی درێژە بەتەمەنی کورتی خۆی بدات، کە دەبینین بەپێچەوانەی هێزی ڕژێم هێزی بەرەی کوردستانی لە هەموو ڕوویەکەوە لاواز بوو لە بەرامبەری[٢٣٦]، کە ئەمەش بۆ خۆی هۆکارێکی تری شکستی ڕاپەڕین بوو.

**دووەم: هۆکارە ناوخۆییەکان:**

چەند هۆکارێکی ناوخۆیی ڕۆڵی بەرچاویان بینی بۆ شکستی ڕاپەڕین لە شاری هەولێر بەتایبەتی و کوردستان بەگشتی، کە گرنگترینیان ئەمانەن:

١- پێکهاتەی بەرەی کوردستانی لە بنەڕەتەوە لەسەر بنچینەیەکی (تێگەیشتن و ڕەزامەندیەکی دەروونی لەناخەوە) نەبوو لە نێوان لایەنە سیاسیەکانی بەرەی کوردستانی دا، کە چەند ساڵ بوو لە (شەڕو ناخۆشی) دابوون لەگەڵ یەکتری دا و درز و بەینێکی گەورە لە نێوانیاندا بوو کە بەئاسانی سارێژ نەدەکرا[٢٣٧]. بۆیە دەبینین لەسەردەمی ڕاپەڕینەکەدا پێکهێنەری ڕاپەڕین کە بەرەی کوردستانی بوو، بەرنامەیەکی ڕوون و ئاشکرا و شیاوی بۆ قۆناغی دوای ڕزگارکردن نەبوو، واتە پارتە سیاسیەکان پێکەوە بڕیارێکی یەکگرتوویان نەدا بۆ چارەسەر کردنی دۆخەکە و بەرگری کردن[٢٣٨].

هەرچەندە (ی.ن.ک) هەر لەسەرەتای ڕاپەڕینەوە بەرنامەی هەبوو بۆ ڕاپەڕین، بەڵام ئەم بەرنامەیە لەلایەن پارتەکانی تری کوردستان پەیڕەو نەکرا لەبەر ناکۆکی نێوانیان، بۆیە ئەم بێ بەرنامەیەی بەرەی کوردستانی خاڵێکی لاوازی ڕاپەڕینەکەبوو، هەروەها خاڵێکی سەرەکیش بوو بۆ شکستی ڕاپەڕین لە باشووری کوردستان[٢٣٩].

٢- لەڕووی سەربازیەوە، هەموو لایەنەکانی ناوبەرەی کوردستانی بیریان لە پێکهێنانی سوپایەکی یەکگرتوو نەکردبۆوە، لە هەمان کاتدا نەتوانرا لەکاتی ڕاپەڕین دا وەک پێویست هێزی پێشمەرگە ڕێک بخرێت، لە لایەکی ترەوە هەر حزب و گروپەی چەکداری خۆی هەبوو یەکگرتوو نەبوون، هەروەها هەموو خەڵک چەکداربوو بەڵام وەکو پێویست بەرگری نەدەکرد[٢٤٠].

ئەمەش لە ڕووی سەربازیەوە هۆکارێک بوو بۆ شکستی ڕاپەڕین.

٣- دوای ئەوەی شاری کەرکوک لە ١٩٩١/٣/٢١ز لە لایەن هێزی پێشمەرگەی کوردستان ئازادکرا، بەڵام پاش چەند ڕۆژێک ڕژێمی عێراق توانی لە ١٩٩١/٣/٢٨ز دەستی بەسەر دابگرێتەوە، هەرچەندە بەرگری کرا لە شاری کەرکوک لەلایەن هێزی پێشمەرگەوە، بەڵام ئەمانە بێ سوود بوون و دووبارە کەرکوک کەوتەوە ژێردەستی ڕژێم[٢٤١]،

| ز | ناوی تەواو | ساڵی لەدایکبوون | پیشە | بەرواری ئەنفالکردن | شوێنی دانیشتن |
|---|---|---|---|---|---|
| .٣١ | عباس محمد احمد | ١٩٤٨ | جوتیار | ١٩٨٧/٧/١ | هەولێر |
| .٣٢ | احمد مراد شمس الدين | ١٩٦٨ | كاسب | ١٩٧٢ | بعقوبه |
| .٣٣ | بهاءالدين علي محمد | ١٩٧٠ | شوان | ١٩٨٨/٢/٩ | – |
| .٣٤ | لزاد سليمان وسمان | ١٩٧١ | كاسب | ١٩٩١/٩/١١ | هەولێر-شۆڕش |
| .٣٥ | فيصل رحمن محمد علي | ١٩٧٠ | كرێكار | ١٩٩١/٤/٧ | هەولێر-تەیراوە |
| .٣٦ | رحمان حسن پيرداود | ١٩٦٩ | كاسب | ١٩٩١/٤/١ | هەولێر منتكاوه |
| .٣٧ | لقمان سيروان محمد | ١٩٦٦ | شوفێر | ١٩٩١ | كركوك – رەحیماوە |
| .٣٨ | حيدر ياسين صابر | ١٩٦٥ | كاسب | ١٩٩١ | هەولێر-كوران |
| .٣٩ | پيرداود شريف اسماعيل | ١٩٥٩ | شوفێر | ١٩٩١/٤/٢ | هەولێر- تعجيل |
| .٤٠ | عمر حمه رشيد ابراهيم | ١٩٣٩ | كاسب | ١٩٩١/٤/١ | هەولێر-سێتاقان |
| .٤١ | شعبان محمد احمد | ١٩٧٢ | كاسب | ١٩٩١/٤/١٠ | كركوك –تازه |
| .٤٢ | ابراهيم خليل كريم | ١٩٥٥ | شوفێر | ١٩٩١/٤/٢ | هەولێر-جيش الشعبي |
| .٤٣ | ابراهيم سعيد علي | ١٩٧٣ | كاسب | ١٩٩١/٣/١٣ | كركوك |
| .٤٤ | رەمەزان ابوبكر صديق | ١٩٧١ | كاسب | ١٩٩١/٣/١٣ | هەولێر-بنەسراوه |
| .٤٥ | عمر علي عبدالله | ١٩٦٩ | قوتابی | ١٩٩١/٤/٤ | هەولێر-خەبات |
| .٤٦ | امير تاهير رشيد | ١٩٧٢ | بێ ئیش | ١٩٩١ | كركوك- رەحیماوە |
| .٤٧ | عبدالخالق محمد خدر | ١٩٦٢ | بێ ئیش | ١٩٩١/٣/٢١ | كركوك- رەحیماوە |
| .٤٨ | سرتيب محمود خدر | ١٩٦٤ | كاسب | ١٩٩١/٤/٥ | كركوك |
| .٤٩ | ئامانج جعفر سعيد | ١٩٦٧ | كرێكار | ١٩٩١/٣/٣١ | كركوك |
| .٥٠ | فؤاد احمد فقێ حسن | ١٩٧١ | كاسب | ١٩٩١/٤/١ | هەولێر-قوشتەپە |
| .٥١ | خديجه محي الدين خدر | ١٩٥٦ | ژنی ماڵ | ١٩٩١/٣/٣١ | هەولێر-مخمور |
| .٥٢ | عماد يونس خدر | ١٩٧٣ | قوتابی | ١٩٩١/٤/٥ | كركوك |
| .٥٣ | ادريس شاكر محمد | ١٩٧٠ | كاسب | ١٩٩١/٤/١ | ئاكرێ |
| .٥٤ | فتاح صابر عزيز علي | ١٩٧٢ | كاسب | ١٩٩١/٣/١٦ | كركوك |
| .٥٥ | سربست محمود خدر | ١٩٦٤ | كاسب | ١٩٩١/٤/٥ | كركوك –عەرەفە |
| .٥٦ | عثمان عبدالله مستەفا | ١٩٣٩ | خانەنیشین | ١٩٩١/٤/٢ | هەولێر-تۆبزاوە |
| .٥٧ | نورالدين محمود احمد | ١٩٥٦ | خانەنشین | ١٩٩١/٨/١٤ | هەولێر-پیرمام |

• سەرچاوە گۆڤاری (K21) ژ٤، ٢٠٠٩
گۆڤارێکی کلتوری مێژوویی سیاسی بەڵگەنامەییە لە هەولێر لەلایەن نووسەرو روناکبیر مومتاز حەیدەری دەردەچێ.




# پەرلەمانی کوردستان - عێراق

**تاریق جەوهەر سارمەمی**

**هەرێمی کوردستانی عێراق**

مەبەست لە هەرێمی کوردستان، بەشی خوارووی کوردستان و بەشی باکووری عێراق دەگرێتەوە کە بەپێی رێکەوتنامەیەک لەنێوان بەریتانیا و تورکیا لەساڵی ١٩٢٥ بەسترا، هەرێمی کوردستان بەعێراق لکێنرا، لەو کاتەوە بەشی باکووری عێراق پێکدەهێنێت. رووبەری هەرێمی کوردستان - عێراق نزیکەی ٨٠ هەزار کیلۆمەتر دووجایە و نزیکەی ١٨٪ی سەرجەم رووبەری گشتی عێراق پێکدەهێنێ کە دەکاتە ٤٣٥ هەزار کیلۆمەتر دووجا.

بەپێی سەرژمێرییەکان، ژمارەی کورد لە عێراق زیاتر لە ٦ ملیۆن کەسە. نزیکەی ٢-٣ یان لە پارێزگاکانی ((هەولێر و سلێمانی و دهۆک دەژین و رێژەکەی تریشیان لە بەشەکانی سەر بەپارێزگاکانی کەرکوک و نەینەوا و دیالە دەژین، کە لەسەردەمی رژێمی سەدام دووچاری پاکتاوی رەگەزی و تەعریب و دەرکردنی کورد بۆوە، و دوای پرۆسەی ئازادی عێراقیش ئێستا لە ناوچە دابڕاوەکانی کوردستان دەژمێردرێن و بەپێی نەخشەی رێگا کە لەمادەی ١٤٠ دەستووری عێراقدا هەنگاوەکانی چارەسەرکردنی ئەم کێشە گرنگەی دەستنیشان کردووە، بەگشتی هەرێمی کوردستانی عێراق لەنێوان شەش پارێزگای عێراق دابەش کراوە کە هەولێر و سلێمانی و دهۆک و کەرکوک و هەندێ ناوچەی هەردوو پارێزگای نەینەوا و دیالە دەگرێتەوە.

**لکاندنی کوردستان بە عێراق**

دوای رووخانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە جەنگی جیهانی یەکەم، ١٩١٤- ١٩١٨ لە وڵاتی نێوان دوو زێدا، دەوڵەتێکی نوێ دروست بوو بەناوی دەوڵەتی عێراق لە ساڵی ١٩٢٥. کە بەشێکی خاک و گەلی کوردستان بێئەوەی پرسیان پێ بکرێت کەوتنە سەر ئەم وڵاتە نوێیەی کە بەرێژەی جیاواز چەندین نەتەوە و پێکهاتەی ئایینی جۆراوجۆری لە خۆ گرتووە، لە رووی نەتەوەییەوە لە نەتەوەکانی: عەرەب، کورد، تورکمان، کلدان، ئاشووری، ئەرمەن، سابئەی مەندائی، لە رووی ئایینیشەوە لە: موسڵمان و مەسیحی و ئێزیدی پێکهاتووە.

لەو وڵاتە نوێیەدا لەبەر ئەوەی مافەکانی کورد هەمیشە لەلایەن رژێمە یەک لە دوا یەکەکانی عێراق پێشێل دەکرا و رەت دەکرایەوە، بەئاگر و ئاسن وەڵامی خواست و مافەکانیان دەدرایەوە، بۆیە گەلی کوردستان لەپێناو

پاراستنی ناسنامەی نەتەوەیی و سەلماندنی مافەکانی لەو عێراقە نوێیەدا، بە پشتیوانی چیاکان و گیانی خۆڕاگری، دەستی بەخەباتی شۆڕشگێڕی کرد، لەم پێناوەشدا دەیان هەزار شەهید و قوربانی دا، بەڵام لەساڵانی ١٩٨٧-١٩٨٨ ڕژێمی سەدام حوسێن کە خاوەنی گەورەترین هێزی سەربازی ناوچەکە بوو گەورەترین پەلاماری سەربازی و شاڵاوی لەناوبردنی بەکۆمەڵی دژی گەلی کورد و وێرانکردنی کوردستان دەست پێکرد تیایدا بۆ یەکەمین جار لەدوای جەنگی جیهانی دووەم چەکی کیمیاوی لەدژی ناوچەکانی هەڵەبجە و بالیسان و شێخ وەسان و ناوچەی بادینان بەکارهێنا و لە ساڵی ١٩٨٨ پرۆسەی جینۆسایدکردنی گەلی کوردی بەناوی کردەوەکانی ئەنفال لە هەشت قۆناغ جێبەجێ کرد کە تیایدا زیاتر لە ١٨٢ هەزار کەس لەژن و منداڵ و پیاوی کورد لە تاوانەکانی جینۆسایدی کورد زیندەبەچاڵ کران، پێشتریش لە ساڵی ١٩٨٣ زیاتر لە هەشت هەزار پیاوی بارزانی بێسەروشوێن کرد، هەروەها زیاتر لە ٤٥٠٠ گوند و شارۆچکەی کوردستانی وێران کرد و خەڵکەکەی بۆ گۆڕی بەکۆمەڵ و ئۆردوگای زۆرەملێ گواستەوە و گەورەترین زیانی بەژیان و ژینگەی کوردستان گەیاند، بەڵام خەبات و شۆڕشەکانی گەلی کوردستان لەسەر بنەمای بڕوابوون بەئازادی و دیموکراسی درێژەی هەبوو، تا ئەو ڕۆژەی هێزە کوردستانییەکان لەساڵی ١٩٨٨ بەرەی کوردستانییان دامەزراند و لە ئەنجامی ئەو هەلومەرجە سیاسییە نوێیەی کە بەهۆی داگیرکردنی دەوڵەتی کوێت لەپاش ١٩٩١/٨/٢ لە عێراق و ناوچەکە هاتە ئارا، بۆ یەکەم جار لە مێژووی خەباتی گەلی کوردستان لە عێراقدا، بەرەی کوردستانی بەپشتیوانی و بەشداری جەماوەری کوردستان توانییان بەشێکی زۆری خاکی کوردستانی عێراق بەشاری کەرکوکیشەوە ڕزگار بکەن، بەڵام دواتر ڕژێمی سەدام بەشێکی زۆری شارە گەورەکانی کەرکوک و سلێمانی و هەولێر و دهۆکی داگیر کردەوە، بۆ دەربازبوون لە شاڵاوی کوشتنی دڕندانەی ڕژێمی سەدامیش، گەلی کوردستان بەکورد و تورکمان و مەسیحییەوە لە کۆڕەوێکی ملیۆنیدا بەرەو ناوچە سنوورییەکانی ئێران و تورکیا کۆچیان کرد، هاوکاتیش هێزی پێشمەرگە لە ناوچە شاخاوییەکان لە هەردوو ناوچەی کۆرێ لە هەولێر و چیای ئەزمەڕ لە سلێمانی سەنگەری بەرگرییان قایم کرد و ئازایانە هێزی پەلاماردەری سوپای عێراقیان تێک شکاند. دواتریش بەپێشنیازی فەرەنسا و پشتیوانی ئەمریکا و بەریتانیا ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی بڕیاری ٦٨٨ ی دەرکرد، بە هۆیەوە ناوچەی (پەناگەی ئارام) بۆ خەڵکە ئاوارەبووەکەی ناوچە سنوورییەکان لەدژی فڕینی فڕۆکەکانی سوپای عێراقی لە سەرووی هێڵی پانی ٣٦ پلە بۆ پاراستنی گەلی کوردستان دیاری کرا. دوای شکست هێنانی گفتوگۆکانی نێوان بەرەی کوردستانی و ڕژێمی سەدام، لە ١٩٩١/١٠/٢٦ حکومەتی عێراق دەستی کرد بەکێشانەوەی دام و دەزگا ئیدارییەکان لە ناوچەکانی کوردستان. ئەمەش بۆشاییەکی یاسایی و ئیداریی دروست کرد، بەرەی کوردستانی کە لەحەوت حزب پێکهاتبوو وەک دەسەڵاتی دیفاکتۆی ناوچەکە لە ئاستی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو تەنگەژە سیاسی و ئیداری و یاساییەدا بوو کە ڕژێم لە کوردستان دروستی کرد، ئەوەبوو لەپێناو بەڕێوەبردنی هەرێم و دانانی دەسەڵاتی یاسا، بەرەی کوردستانی بیری لە دامەزراندنی سیستمێکی پەرلەمانی کردەوە لە ڕێی ئەنجامدانی هەڵبژاردنێکی سەربەخۆی ئازاد و دیموکراتیەوە. بۆ ئەمەش سەرکردایەتی بەرەی کوردستانی لیژنەیەکی تایبەتی لە ١٣ کەس لە حاکم و پارێزەر و مافپەروەران و نوێنەرانی لایەنە سیاسییەکانی ناو بەرەی کوردستانی پێکهێنا بەم شێوەی خوارەوە:

١- ڕەشید عەبدولقادر سەرۆکی دادگای پێداچوونەوەی هەرێمی کوردستان.
٢- مەعروف ڕەئوف یەکەم وەزیری داد لە وەزارەتی هەرێم.
٣- نازم حەوێزی سەرۆکی دادگای تێهەڵچوونەوەی هەولێر.
٤- حاکم ئەمیر حەوێزی ئەندامی دادگای تێهەڵچوونەوەی هەولێر و دواتر بووە سەرۆکی لیژنەی باڵای سەرپەرشتی هەڵبژاردنەکانی کوردستان.
٥- شەمسەدین موفتی
٦- مەحمود بابان
٧- د. سەعدی بەرزنجی ڕاگری کۆلیژی یاسا و سیاسەتی زانکۆی سەلاحەدین.
٨- د. خورشید شەوکەت ڕواندزی مامۆستای کۆلیژی یاسا و سیاسەتی زانکۆی سەلاحەدین.

٩- پارێزەر مستەفا عەسکەری
١٠- فەرسەت ئەحمەد کە لەساڵی ١٩٩٢ەوە تا ئەمڕۆ سکرتێری ئەنجومەنی نیشتیمانی کوردستانە.
١١- د. قەیس دیوالی دواتر بووە ئەندامی خولی یەکەمی هەڵبژاردنەکانی پەرلەمان.
١٢- حەسەن عەبدولکەریم بەرزنجی دواتر بووە ئەندامی پەرلەمانی کوردستان.
١٣ - بەختیار حەیدەری ئەندامی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان.
١٤- قادر جەباری دواتر بووە وەزیری داد لە کابینەی دووەمی حکومەتی هەرێم.
١٥ - فەرەنسۆ هەریری سەرۆکی فراکسیۆنی پارتی دیموکراتی کوردستان لە پەرلەمان ساڵی ٢٠٠٠ تیرۆرکرا.

ئەم لیژنە تایبەتییەی پێکهات دوای ئەوەی چەند دانیشتنێکی لەماوەی نێوان ٢٣/١٢/١٩٩١ تاوەکو ٨/١٢/١٩٩٢ ئەنجامدا، پرۆژەی یاسایەکیان پێشکەش بەسەرکردایەتی سیاسی بەرەی کوردستانی کرد و لە رۆژی ٢٨/٤/١٩٩٢ لەلایەن بەرەوە بڕیاری لەسەر درا و بەناوی یاسای ژمارە (١) بۆ ساڵی ١٩٩٢ یاسای هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان - عێراق پەسەن دکرا.

هەڵبژاردنەکانی پەرلەمان و رابەری گشتی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان لەرێگای دەنگدانی گشتی و نهێنی و راستەوخۆ لە ١٩/٥/١٩٩٢ بەبەشداری نزیکەی یەک ملیۆن دەنگدەر کە نوێنەرایەتی زیاتر لە سێ ملیۆن و نیو مرۆڤیان دەکرد ئەنجامدرا. کە بەهاوکاری و پشتیوانی چاودێرانی بیانی و دۆستانی گەلی کورد بەڕێوەچوو. بەپێی یاسای هەڵبژاردن هەر حزبێک دەبوایە ٧٪ی دەنگەکان بەدەست بهێنێ بۆ ئەوەی کورسییەکی پەرلەمان مسۆگەر بکات.

## پێکهاتەی سیاسی و ئەنجامی خولەکانی هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان

لەماوەی ١٦ ساڵی رابردوودا لە هەرێمی کوردستان، دوو خولی هەڵبژاردن ئەنجامدراوە:

یەکەمین ئەزموونی هەڵبژاردنەکان بەشێوەیەکی دیموکراسی لە کوردستانی عێراق بەپێی یاسای ژمارە (١)ی بەرەی کوردستانی لە ١٩/٥/١٩٩٢



دانیشتنی یەکەمی پەرلەمانی کوردستان ١٩٩٢

بەسەرپەرشتی و چاودێری نوێنەرانی چەندین رێکخراوی بیانی لە بواری مافی مرۆڤ و دیموکراسی و ئەندامانی پەرلەمانی وڵاتانی ئەوروپا و رۆژنامەنووسانی بیانی ئەنجامدرا، کە (٩٦٧٢٢٩) دەنگدەر بەشداربیان تێدا کرد، ئەو لیستانەی خوارەوە بەشدارییان لە هەڵبژاردنەکاندا کرد:

| لیستی پارتەکان | ژمارەی دەنگەکان | رێژەی سەدی |
|---|---|---|
| پارتی دیموکراتی کوردستان | ٤٣٧٨٨٩ | %٤٥,٥ |
| یەکێتی نیشتمانی کوردستان و حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان | ٤٢٣١٣٣ | %٤٣,٦١ |
| یەکگرتن (پارتی سۆشیالست و پارتی سەربەخۆیی کوردستان) | ٢٤٨٨٢ | %٢,٥٦ |
| یەکێتی دیموکراتی کوردستان و حزبی شیوعی و بێلایەنەکان | ٢١١٢٣ | %٢,١٧ |
| لیستی ئیسلامییەکان | ٤٩١٠٨ | %٥,٥ |
| لیستی پارتی گەلی دیموکراتی کوردستان | ٩٩٠٣ | %١,٠٢ |
| لیستی سەربەخۆی دیموکراتەکان | ٥٠١ | %٠,٠٥ |
| کۆی دەنگەکان | ٩٧١٩٥٣ | %١٠٠ |

بەپێی ئەنجامەکانی هەڵبژاردن، کە لەلایەن دەستەی باڵای سەرپەرشتیاری هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان راگەیەندرا، کە بەسیستمی نوێنەرایەتی رێژەیی (التمثیل النسبي) بەڕێوە چوو، تەنیا (لیستی پارتی دیموکراتی کوردستان) و لیستی هاوبەشی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان و حزبی زەحمەتکێشان)، هاتنە نێو پەرلەمان لە کۆی ١٠٥ کورسی پەرلەمان هەریەک لە یەکێتی و پارتی ٥٠٪ کورسییەکانیان بەرکەوت، بەپێی بڕیارێکی سەرکردایەتی سیاسی بەرەی کوردستانیش کە لە ٨/٤/١٩٩٢ دەرچوو (٥) کورسی بۆ مەسیحییەکانی کوردستان تەرخان کرا، کە ٤ ئەندامیان لە لیستی بزووتنەوەی دیموکراتی ئاشووری و ١ ئەندامیش بۆ لیستی یەکگرتووی مەسیحیەکانی کوردستان تەرخان کرا.

بەهۆی هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ، لە٢ی مایسی ١٩٩٤ نەتوانرا هەڵبژاردنی خولی دووەم ئەنجام بدرێ، بەڵام پەرلەمانی کوردستان هەوڵێکی زۆری دا بۆ ئەوەی رێگا لە تەشەنە سەندنی ئاگری ئەو شەڕە ناوخۆییە بگرێ. بۆ ئەمەش هەڵوێستی خۆی لە راگەیاندنێکی دیکۆمێنتیدا کە لە ١٩ خاڵ پێکهاتبوو دژی ئەم شەڕە دەرکرد و چەندین لیژنەی مەیدانیشی بۆ چاودێری کردنی جێبەجێکردنی پرۆسەی ئاگربەس و بڕیاردانی ئاشتی لە بەرەکانی شەڕدا پێکهێنا، هەروەها ٥٩ ئەندام بۆ ماوەی ١٠١ رۆژ لە هۆڵێکی نێو پەرلەمان دژی شەڕی ناوخۆ پەناگیری خۆیان راگەیاند. ئەم هەڵوێستەش لەئاستی ناوخۆ و دەرەوەی کوردستان پشتیگرییەکی زۆری لێکرا. لەم رۆژەوە ئەو هۆڵە ناوی لێنراوە هۆڵی پەناگیری. تەشەنە سەندنی گرژی ناوخۆ و زیادبوونی مەترسییەکان بۆ سەر ئەو دیموکراسیەتە ساوایەی کوردستان سەرەنجام پەرلەمانیشی کردە قوربانی شەڕی ناوخۆ و بۆ ماوەیەکی زۆر پەکی کەوت و نەیتوانی رۆڵی خۆی ببینێ و ئەرکەکانی خۆی جێبەجێ بکات، بەڵام دواجار بەهۆی رێکەوتنامەی ئاشتی واشنتۆن کە لەساڵی ١٩٩٨ بەئامادەبوونی وەزیری دەرەوەی ئەوسای ئەمریکا ((خاتوو مادلین ئۆلبرایت)) لەنێوان (مام جەلال و کاک مەسعود) ئیمزا کرا، پەرلەمانی کوردستان یەکی گرتەوە، ئەوەبوو لە ٤/١٠/٢٠٠٢ بەدوو دانیشتن، کە یەکەمیان: لە تەلاری پەرلەمان، و دوای هەفتەیەکیش دانیشتنی دووەم: لە ئوتێلی سلێمانی پالاس بەڕێوەچوو.

پەرلەمانی کوردستان یەکی گرتەوە و بەشێکی زۆری ئەندامانی هەردوو فراکسیۆنی یەکێتی و پارتیش گۆڕان، لەبەر ئەوەی ئەرکی پەرلەمان گواستنەوەی پرۆسەی سیاسی و ئاشتی بوو بۆ قۆناغێکی پێشکەوتوتر، کە ئەویش یەکگرتنەوەی هەردوو ئیدارەی کوردستان بوو کە لەئەنجامی شەڕ لە هەولێر و سلێمانی دروست بوون، بۆیە ئەم خولە بەخولی گواستنەوە ناونرا، ماوەی سەرۆکایەتی ئەم خولەی پەرلەمان ٣ مانگ بۆ پارتی دیموکراتی کوردستان بەسەرۆکایەتی ((د، رۆژ نوری شاوێس)) و ٢ مانگیش بۆ یەکێتی نیشتمانی کوردستان بەسەرۆکایەتی ((د. کەماڵ فوئاد)) دیاری کرا، بەڵام بەگشتی ئەم خولە درێژە پێدەری خولی یەکەمی هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٩٢ بوو. لە خولی گواستنەوەدا پەرلەمان چەندین یاسا و بڕیاری گرنگی دەرکردووە. ئەمەش ناوی ئەندامانی یەکەمین خولی هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستانە:

**یەکەم: لیستی پارتی دیموکراتی کوردستان**

١- ئیبراهیم سەعید محەمەد.
٢- ئیدریس هادی سالح
٣- ئازاد فەتاح رەشید میران.
٤- ئەحمەد سالار عەبدولواحید
٥- ئەحمەد عەلی عومەر
٦- ئەکبەر حەیدەر موسا
٧- ئەکرەم عزەت نەجیب
٨- بارزان خالید عەزیزی
٩- جەعفەر شێخ عەلی
١٠- جەمیل عەبدی سندی
١١- جەوهەر ئەحمەد شاواز گەلاڵی
١٢- جەوهەر نامق سالم
١٣- حەسەن حوسێن بەفری
١٤- حەمە نەجم حەمە فەرەج جاف
١٥- حەمید سەلیم میران
١٦- خەیری سەعید عەلی بەگ یەزیدی
١٧- د. رۆژ نوری صدیق شاوێس
١٨- سەعید محەمەد سەعید هەروری
١٩- سەفەر محەمەد حوسێن دۆسکی
٢٠- سەلیم عەلی حاجی مەلۆ
٢١- شەفیقە فەقێ عەبدوڵلا
٢٢- شێروان ناصح حەیدەری



٢٣- مەلا تەڵحە سەعید قەرەنی
٢٤- صەلاحەدین ئیبراهیم دەلۆ
٢٥- عەدنان محەمەد حوسام نەقشبەندی
٢٦- عەفان عوسمان شێخ حوسامەدین
٢٧- فازل رەئووف جەقزی
٢٨- فەرحان عەبدوللا ئاغا شەرەفانی
٢٩- فەرسەت ئەحمەد عەبدوڵلا
٣٠- فەرەنسۆ تۆما کانون حەریری
٣١- فەلەکەدین سابیر کاکەیی
٣٢- فەوزیە عزەدین رەشید
٣٣- قاسم محەمەد قاسم
٣٤- قەیس دیوالی سەعید دۆسکی
٣٥- کانەبی عەزیز ئەحمەد دزەیی
٣٦- مەئمون نور محەمەد بریفکانی
٣٧- شێخ موحسین خالید موفتی
٣٨- موحسن سالح کەتانی
٣٩- محەمەد ئەمین مەولود ئەمین
٤٠- مەلا محەمەد تاهیر زەین لعابدین
٤١- محەمەد سەعید ئەحمەد یەعقوبی
٤٢- مەلا محەمەد شەریف تاهیر دۆسکی
٤٣- محەمەد عەبدولقادر ئەحمەد
٤٤- مەلا مەحمود فەندی دێرشەوی
٤٥- مامەند محەمەد ئەمین بابەکر
٤٦- نیهاد نورەدین رەشید
٤٧- مەلا هادی خدر کوێخا
٤٨- وریا ئەحمەد محەمەد ئەمین
٤٩- یەحیا محەمەد عەبدولکەریم بەرزنجی
٥٠- یونس محەمەد سەلیم رۆژ بەیانی.

**دووەم: لیستی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و زەحمەتکێشانی کوردستان**

١. ئەبوبەکر حاجی سەفەر غولام
٢. ئەحمەد ئەبوبەکر حەسەن بامەرنی
٣. ئەحمەد تاهیر ئەحمەد نەقشبەندی
٤. ئەرسەلان بایز ئیسماعیل
٥. ئەیاد حاجی نامق مەجید بەقاڵ
٦. پەریخان مەحمود عەبدولقادر (شەمام)
٧. جەلال جەوهەر عەزیز
٨. جەلال شەفیق عەلی
٩. حەسەن حەمید رەحیم (رۆستەم)
١٠. حەسەن کانەبی خدر بلباس
١١. حەسەن عەبدولکەریم بەرزنجی
١٢. حوسین عارف عەبدولرەحمان
١٣. خەسرەو گوڵ محەمەد
١٤. حەسەن ئەحمەد عەبدوڵلا کوێستانی
١٥. سەعدی ئەحمەد محەمەد
١٦. سەعید عەلی خان عەبدول سلێڤانی
١٧. سەلام کەریم خان مەحمود خەلیفە
١٨. سیروان محەمەد نورول
١٩. شەوکەتی حاجی موشیر محەمەد
٢٠. شێرکۆ فایەق عەبدوللا بێکەس
٢١. سەلاحەدین عەبەدولحەمید عەبدوللا
٢٢. سەلاحەدین محەمەد حەسەن حەفید
٢٣. تەها محەمەد تەها (مەلا)
٢٤. تاریق محەمەد سەعید جامباز
٢٥. عەبدوللا رەسول عەلی (کۆسرەت)
٢٦. عەبدوللا حاجی ئیبراهیم عەبدوللا
٢٧. عەبدولخالق محەمەد رەشید زەنگەنە.
٢٨. عەبدولکەرەم کاکە حەمە عەبدولکەریم
٢٩. عزەدین مستەفا رەسول
٣٠. عەلی عەبدوللا ئەحمەد
٣١. عەلی رەسول رۆستەم
٣٢. عومەر سەید عەلی حوسێن
٣٣. عومەر عەبدوڵلا مجەمەد(ملازم عومەر)
٣٤. قادر عەزیز حەمەدەمین
٣٥. قادر مامەند بابەکر ئاغا
٣٦. کەمال ئیبراهیم فەرەج شالی
٣٧. کەمال جەلال غەریب
٣٨. کەمال عەبدولکەریم فوئاد
٣٩. گەلاوێژ عەبدولجەبار مەجید جەبار
٤٠. محەمەد ئەمین عەبدولحەکیم محەمەد
٤١. مەحەمەد توفیق حەمە رەحیم
٤٢. محەمەد فزل محەمەد عەزیز (قەفتان)
٤٣. محەمەد فوئاد مەعسوم خدر

٤٤. موستەفا قادر موستەفا
٤٥. مەزهەر عەلی موستەفا کاکی
٤٦. نەوشیروان فوئاد مەعروف مەستی
٤٧. نەجمەدین عەزیز ئیسماعیل
٤٨. نەژاد ئەحمەد عەزیز ئاغا
٤٩. نەهلە محەمەد سەعدوللا
٥٠. هێرۆ ئیبراهیم ئەحمەد.

**سێیەم لیستی بزووتنەوەی ئاشووری**
١- یونادەم یوسف کەنا
٢- شەمائیل نەنۆ بنیامین
٣- فەرەنسیس یوسف شابا
٤- ئەکرەم عاشوور عودیش

**چوارەم لیستی یەکگرتووی مەسیحیەکانی کوردستان**
٥- سەرکیس ئاغاجان مامەندو.

**خولی دووەمی هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی کوردستان**

- لەرۆژی ١٥ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٥ خولی دووەمی هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی کوردستان ئەنجامدرا کە هاوکات بوو لەگەڵ هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق و هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکان، کە ئەم دوو هەڵبژاردنەی دوایی جگە لە کوردستان لە سەرتاسەری عێراق لە هەمان رۆژدا بەڕێوەدەچوو، ئەمەش یەکەمین هەڵبژاردنی گشتی بوو کە دوای رووخانی رژێمی سەدام لە کوردستان و عێراق ئەنجام درا.

- لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ٢٠٠٥ دانیشتوانی کوردستان جیا لەدانیشتوانی ناوچەکانی تری عێراق لەیەک کاتدا دەنگیان بۆ هەڵبژاردنی سێ ئەنجومەنی جیا دا ئەوانیش: ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان، کە لەسنووری پارێزگاکانی (سلێمانی و هەولێر و دهۆک) ئەنجامدرا، لەم هەڵبژاردنەدا خەڵکی ناوچە دابڕاوەکانی کوردستان: لە (شەنگار و شێخان پارێزگای نەینەوا- پارێزگای کەرکوک و ناوچەکانی خانەقین لە پارێزگای دیالە رێگایان پێ نەدرا دەنگ بۆ پەرلەمانی کوردستان بدەن، لەبەر ئەوەی هێشتا چارەنووسی گەڕانەوەیان بۆ سەر هەرێم یەکلایی نەکرابۆوە، وەک چۆن لەمادەی ٥٨ی قانونی TAL کە پاشانیش بووە مادەی ١٤٠ لە دەستووری عێراق، خەڵکی ئەو ناوچانە وەک خەڵکی ناوەڕاست و باشووری عێراق تەنها دەنگیان بۆ هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەران، ئەنجومەنی پارێزگاکان دا.

لە هەڵبژاردنی خولی دووەمی پەرلەمانی کوردستان ١٣ لیستی جیاواز بەشدارییان لە ململانێتیکاندا کرد کە بەسیستەمی (نوێنەرایەتی رێژەیی) بەڕێوەچوو. تیایدا ١٧٥٣٩١٩ کەس لە دانیشتوانی هەرێمی کوردستان لە کورد و تورکمان و کلدان و ئاشووری و موسڵمان و مەسیحی و ئێزیدی بەشدارییان تێدا کرد.

لەم هەڵبژاردنەدا، ژمارەی ئەندامانی پەرلەمان لە ١٠٥ ئەندام بۆ ١١١ ئەندام بەرز کرایەوە. لە ئەنجامدا تەنها سێ لیست لەکۆی ١٣ لیست کە بەشدارییان لە هەڵبژاردنەکاندا کردبوو، توانییان بگەنە نێو پەرلەمان، ئەوانیش لیستی نیشتمانی دیموکراتی کوردستان کە (١٠٤) کورسی و لیستی کۆمەڵی ئیسلامی کوردستانی عێراق (٦) کورسی و لیستی حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان و سەربەخۆکان (١) یەک کورسییان بەدەست هێنا، ئەمەی خوارەوەش ئەنجامی کۆتایی هەڵبژاردنەکانی ساڵی ٢٠٠٥ ی پەرلەمانی کوردستانە:

ئەنجامی کۆتایی خولی دووەمی
هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان ٢٠٠٥

| | ناوی لیستەکان | کۆی دەنگەکان | رێژەی دەنگ | ژمارەی کورسی |
|---|---|---|---|---|
| ١ | لیستی نیشتمانی دیموکراتی کوردستان | ١٥٧٠٦٦٣ | %٨٩,٥٥ | ١٠٤ |
| ٢ | کۆمەڵی ئیسلامی کوردستانی عێراق | ٨٥٢٣٧ | %٤,٨٦ | ٦ |
| ٣ | لیستی زەحمەتکێشان و سەربەخۆکان | ٢٠٥٨٥ | %١,١٧ | ١ |
| ٤ | پارتی کاری دیموکراتی کوردستان | ١١٧٤٨ | %٠,٦٧ | ٠ |
| ٥ | بزووتنەوەی دیموکراتی گەلی کوردستان | ١٠٩٥٢ | %٠,٦٢ | ٠ |
| ٦ | لیستی بێلایەنەکان | ١٠٢٦٢ | %٠,٥٩ | ٠ |
| ٧ | پارتی چارەسەری دیموکراتی کوردستان | ٩٠٨١ | %٠,٥٢ | ٠ |
| ٨ | ئەنجومەنی کۆماری عێراق | ٩٤٩٩ | %٠,٥٤ | ٠ |
| ٩ | بەرەی نیشتمانی وەحدەی عێراق | ٨٢٥٥ | %٠,٤٧ | ٠ |
| ١٠ | بزووتنەوەی دیموکراسیخوازانی کوردستان | ٦٦٩٠ | %٠,٣٨ | ٠ |
| ١١ | پارتی پارێزگارانی کوردستان | ٥٥٠٦ | %٠,٣١ | ٠ |
| ١٢ | حزبی ئەخای وەتەنی عێراقی | ٣٤٢٢ | %٠,٢٠ | ٠ |
| ١٣ | رەوتی نیشتمانی کوردستان | ٢٠١٨ | %٠,١٢ | ٠ |
| | کۆی گشتی دەنگەکان | [illegible] | %١٠٠ | ١١١ |
| | دەنگە رەتکراوەکان | ٢٣٧٦٠ | | |

**بنەما و پرەنسیپە یاساییەکان لە پەرلەمان**
١- پرەنسیپی دەنگدانی گشتی و نهێنی و راستەوخۆ.
٢- پرەنسیپی یەکسانی ژن و پیاو لە هەڵبژاردن و خۆ کاندیدکردندا.

٣- لە خولی یەکەم و دووەمی هەڵبژاردنەکاندا پشت بەسیستمی نوێنەرایەتی رێژەیی (التمثیل النسبي) بەسترا. کە کاندیدەکان لەسەر بنەمای لیستی حزبی خۆیان دەپاڵاوت بۆ پەرلەمان.

٤- لە خولی یەکەمی هەڵبژاردنەکاندا مەرج بوو هەر حزبێک رێژەی ٧٪ دەنگ بەدەست بهێنێ تا ببێتە خاوەنی کورسییەک. بەڵام لەخولی دووەمی هەڵبژاردنەکاندا کە لە ٢٠٠٥ بەرێوەچوو ئەو رێژەیە بۆ ١٪ کەم کرایەوە. تەنیا بۆ هەڵبژاردنی نوێنەرانی تورکمان و مەسیحییەکانی کوردستان لەم رێژە دیاریکراوانە بەدەر بوون.

٥- لە خولی یەکەمی هەڵبژاردنەکاندا هەر ئەندامێک نوێنەرایەتی ٣٠ هەزار کەسی دەکرد. لە خولی دووەمدا هەر ئەندامێک نوێنەرایەتی ٥٠- ٥٥ هەزار کەس دەکات.

٦- نابێت لەیەک کاتدا ئەندامی پەرلەمان بێت و کارێکی تری رەسمی حکومەتیشت هەبێت.

**مەرجەکانی خۆ کاندیدکردن بۆ ئەندامێتی پەرلەمان**

هەرکەسێکی خۆی بۆ ئەندامێتی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان- عێراق دەپاڵێوێ، پێویستە چەند مەرجێکی تیدابێت لەوانە:

١- دەبێت هاووڵاتی کوردستانی عێراق بێت و نیشتەجێی ئەوێ بێت.

٢- تەمەنی ٣٠ ساڵ بێت و ئەهلیەتی تەواوی هەبێت. (بەڵام رەنگە ئەو تەمەنە بۆ ٢٥ ساڵ کەم بکرێتەوە).

٣- خوێندن و نووسین بزانێت.

٤- بەتاوانی پەڵەی رەوشت و ئادابی گشتی و پاکی حوکم نەدرابێت.

٥- بەتاوانی کوشتنی ئەنقەست و دزی حوکم نەدرابێت.

٦- لەو تاوانانەی کە لەلایەن دەسەڵاتی داپلۆسێنەرەوە نەخشەیان بۆ کێشرابوو لە کوردستان جێبەجێ کران بەشدار نەبووبێ.

٧- نێر و مێ وەک یەک مافی بەشداری و خۆکاندید کردنیان لە هەڵبژاردنەکاندا هەیە.

**مەرجەکانی دەنگدەر**

١- دەنگدەر دەبێ هاووڵاتی هەرێمی کوردستان -عێراق



بێت.

٢- دەبێ تەمەنی ١٨ ساڵی تەواو کردبێت.

٣- نێرو مێ وەک یەک مافی بەشداری و دەنگدانیان لە هەڵبژاردنەکاندا هەیە.

**دەسەڵاتەکانی پەرلەمان**

١- بریاردان لەسەر رێکەوتنەکان و یەکلایی کردنەوەی کێشە چارەنووس سازەکانی گەلی کوردستانی عێراق.

٢- دیاریکردنی پەیوەندی سیاسی هەرێم لەگەڵ دەسەڵاتی فیدراڵی (السلطة الاتحادیة) وەک بریاری راگەیاندنی فیدرالیزم لە ٤/ ١٠/ ١٩٩٢ بۆ پەیوەندی لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەندی.

٣- دەستنیشانکردنی سەرۆک وەزیران لەدوای راگەیاندنی ئەنجامی هەڵبژاردنەکان.

٤- متمانەدان بەکابینەی ئەنجومەنی وەزیران، یان سەندنەوەی متمانە بە کابینەی حکومەت لەکاتی پێویستدا.

٥- پێکهێنانی لیژنە هەمیشەیی و کاتییەکان بۆ چاودێری کردنی وەزارەتەکانی حکومەت.

٦- پێکهێنانی لیژنەی تایبەت و لێکۆڵینەوە لەکاتی پێویستدا.

٧- دانانی پەیرەوی ناوخۆ و دیاریکردنی پێکهاتەکەی و بریاردان لەسەر هاوسەنگی و دامەزراندنی کارمەندەکانی.

٨- دانانی لیستی گوناهبارکردن و لێپرسینەوەی ئەندامان لەکاتی شکاندنی ئەو سوێندەی خواردوویانە.

٩- جیاکردنەوەی تانە (طعون) پێشکەشکراوەکان لە دروستی هەڵبژاردنی ئەندامەکان.

## رۆڵ، ئەرک، دەسەڵاتەکانی پەرلەمان بەپێی پەیڕەوی ناوخۆی پەرلەمان

- ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان بارەگاکەی لە هەولێری پایتەخت دەبێت. دەشگونجێ لەکاتی پێویستدا لە هەر شوێنێکی تر کۆبوونەوەی خۆی ببەستێ.
- کۆبوونەوەی ئەنجومەن یاسایی نابێت ئەگەر زۆرینەی ئەندامان ئامادە نەبن. بڕیارەکانی بەزۆرینەی دەنگی ئەندامان دەدا. جگە لەو حاڵەتانەی کە پێویستی بە زۆرینەی تایبەتی هەیە. ئەگەر دەنگەکانیش وەک یەک بوون، دەنگی ئەو لایە پەسەند دەکرێت، کە دەنگی سەرۆکی ئەنجومەنی لەگەڵدا دەبێت.
- ئەنجومەن لە ساڵێکدا دوو خولی هەیە، یەکەمیان: لە سەرەتای مانگی ئادار دەست پێ دەکات و لە کۆتایی مانگی حوزەیران دوایی دێ.

دووەمیان: لە سەرەتای مانگی ئەیلولەوە دەست پێ دەکات و لە کۆتایی مانگی کانوونی یەکەمدا دوایی دێت..

- ئەنجومەن دەتوانێت بەزۆرینەی ٢-٣ی ئەندامان، ماوەی هەریەکێک لەدوو خولەکەی بۆ ماوەیەک درێژ بکاتەوە، بەمەرجێ لە یەک مانگ زیاتر نەبێت.
- ماوەی ئەنجومەن چوار ساڵە، لە یەکەم دانیشتنەوە دەستپێدەکا کە ١٠ رۆژ دوای راگەیاندنی ئەنجامی هەڵبژاردنەکان دەبەسترێت و بەدانیشتنی کۆتایی کە لەساڵی چوارەمدا دوماهی دێت، بەڵام لە خولی یەکەمی هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٢ سەرەتا ماوەی ئەنجومەن بۆ ٣ ساڵ بوو.
- کۆبوونەوەکانی ئەنجومەن بەشێوەیەکی ئاشکرا دەکرێن، بەئامادەبوونی نوێنەری کەناڵەکانی راگەیاندن بەڕێوەدەچن، بەڵام دەکرێ لەسەر داخوازی سەرۆک یا ژمارەیەک لە ئەندامان کە لە چواریەکی کەمتر نەبن و بەبڕیاری زۆربەی ئامادەبووان کۆبوونەوەکان بەنهێنی بکرێت.

### کۆبوونەوەی نائاسایی چۆن دەبەسترێت؟

- ئەنجومەن بۆی هەیە لەم حاڵەتانەی خوارەوەوە کۆبوونەوەی نائاسایی ببەستێت:

١- سەرۆک یاچواریەکی ئەندامانی ئەنجومەن، بۆیان هەیە داوای کۆبوونەوەیەکی نائاسایی ئەنجومەن بکەن، بەڵام دەبێ تەنیا لەو یاسایانە بدوێت کە بۆی دەستنیشان کراوە.

٢- سەرۆک لەسەر داوای سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران، بۆی هەیە لەکاتی پێویستدا، داوای کۆبوونەوەیەکی نائاسایی لە ئەنجومەن بکا.

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| مانگەکانی پشوو | | مانگەکانی خولی بەستنی یەکەم | | | |
| کانوونی دووەم | شوبات | ئادار | نیسان | مایس | حوزەیران |
| مانگەکانی پشوو | | مانگەکانی خولی بەستنی دووەم | | | |
| تەمووز | ئاب | ئەیلول | تشرینی یەکەم | تشرینی دووەم | کانوونی یەکەم |

## ئەرکەکانی پەرلەمان

١- دارشتنی یاسا
٢- چاودێری کردنی وەزارەتەکانی حکومەت
٣- بڕیاردان و پەسەندکردنی بودجە

## هەڵبژاردنی دەستەی سەرۆکایەتی پەرلەمان و ئەرک و دەسەڵاتەکانیان

- ئەنجومەن ١٠ رۆژی دوای راگەیاندنی ئەنجامەکانی هەڵبژاردن، یەکەمین کۆبوونەوەی دەبەستێت و بەتەمەنترین ئەندام سەرۆکایەتی دەکات. پاشان هەریەک لە ئەندامان سوێندی یاسایی دەخۆن بەم شێوەیە: «سوێند بەیەزدانی مەزن پارێزگاری لە یەکێتی گەل و خاکی کوردستانی عێراق و بەرژەوەندییە



بالآکانی دەکەم».

- دوای سوێند خواردن سەرۆکی کاتی، دەرگای خۆپاڵاوتن دەکاتەوە بۆ هەڵبژاردنی سەرۆک و جێگر و سکرتێری ئەنجومەن. هەڵبژاردنەکەش بەنهێنی ئەنجام دەدرێ و ئەوەی زۆرینەی دەنگەکانی هێنا ئەو پلەوپایەی پێ دەبرێ. ئەگەر ژمارەی دەنگەکانی رکابەرەکان لەسەر یەکێک لە پۆستەکانی سەرۆک، جێگر، سکرتێر وەک یەک بوون، لە دانیشتنێکی تردا هەڵبژاردن دووبارە دەکرێتەوە بۆ پایەکەیان. ئەگەر ئەم حاڵەتە دووبارە بۆوە، ئەمجارەیان تیروپشک (قورعە) لەنێوانیان دەکرێت.

### ئەرک و دەسەڵاتەکانی سەرۆکی پەرلەمان

١- پیادەکردنی یاسا و پەیڕەوی ناوخۆی ئەنجومەن.
٢- کردنەوەی خول و دانیشتنەکانی ئەنجومەن و سەرکردایەتی کردنیان و کۆتایی پێهێنان و دواخستنیان و دیاریکردنی کاتەکانیان.
٣- بەڕێوەبردنی گفتوگۆکان و پاراستنی رێکوپێکی ئەو بەڕێوەبردنە.
٤- خۆئامادەکردنی پێویست بۆ پاراستنی هێمنی و رێکوپێکی لەناو ئەنجومەندا و بۆی هەیە دەستنیشانی هێزی نیزامی پێویست بۆ ئەو مەبەستە بکاو لەژێر رکێفی دابێ.
٥- ئیمزاکردنی کۆنووسی دانیشتنەکانی ئەنجومەن لەگەڵ دوو ئەندامەکەی دەستەی سەرۆکایەتیدا.
٦- ئەنجامدانی هەموو کردارێکی یاسایی و بەڕێوەبردن و دارایی کە پەیوەندییان بەئەنجومەنەوە هەبێ، بۆ ئەو مەبەستەش بۆی هەیە دەسەڵات بەکەسانی تر بدا لە ئەندامانی دەستەی سەرۆکایەتی.
٧- ئیمزاکردنی هەموو نووسراوە رەسمییەکان لەگەڵ دەسەڵاتی راپەڕاندن و لایەنەکانی تر لەناو هەرێم و دەرەوەدا.
٨- ئیمزاکردنی هەموو ئەو نووسراو و موخابەرانەی کە لە ئەنجومەنەوە یان یەکێ لە لیژنەکانیەوە دەردەچێ دوای مۆرکردنی بەمۆری خۆی.
٩- دڵنیابوون لە تەواوبوونی رێژەی یاسایی (النصاب) بەیارمەتی دوو ئەندامەکەی تری دەستەی سەرۆکایەتی.
١٠- ئیشوکارەکان لەئەنجومەن دەخاتە روو بۆ دەنگدان لەسەریان لەکاتی پێویستدا.
١١- سەرپەرشتی کاری لیژنەکانی ئەنجومەن دەکات.
١٢- نوێنەرایەتیکردنی ئەنجومەن لە بۆنە و ئاهەنگە نیشتمانییەکان و بۆنەکانی تردا، دەتوانێ بۆ ئەو مەبەستە دەسەڵات بەئەندامانی تر بدات.
١٣- دەرهێنانی ئەو یاسا و بریار و پەیڕەوانەی کە ئەنجومەن لەسەریان پێکهاتووە.

### ئەرک و دەسەڵاتەکانی جێگری سەرۆک

جێگری سەرۆک ئەم ئەرک و دەسەڵاتانەی خوارەوە ئەنجام دەدات:

١- لەکاتی ئامادەنەبوونی سەرۆک هەموو دەسەڵاتەکانی ئەو پیادە دەکات، هەروەها سەرۆک دەتوانێ هەندێ ئەرکی دیارکراوی پێ بسپێرێ.
٢- بەشداری لە کاروبارەکانی دەستەی سەرۆکایەتیدا دەکات.
٣- چاودێری و بەداواداچوونی کاروباری لیژنەکانی پەرلەمان دەکات، راپۆرتیان لەبارەیەوە پێشکەش بەسەرۆک دەکات.

### ئەرک و دەسەڵاتەکانی سکرتێری پەرلەمان

١- سەرپەرشتی نووسینی کۆنووسی کۆبوونەوەکانی ئەنجومەن و بەرنامەی کاری دانیشتنەکان و چاپکردن و دابەشکردنیان لەسەر ئەندامان دەکات.
٢- ناوی ئەو ئەندامانە تۆمار دەکات کە دەیانەوێ قسە بکەن.
٣- بەشداری لە کۆبوونەوەکانی دەستەی سەرۆکایەتی دەکات بەو سیفەتەی ئەندامە لەو دەستەیەدا.
٤- سەرپەرشتی کاروباری ئەندامانی ئەنجومەن دەکات.

### دەسەڵاتە هاوبەشەکان

جگە لەو دەسەڵاتانەی کە بۆ هەریەک لە ئەندامانی دەستەی سەرۆکایەتی دیاری کراوە، چەند دەستەیەکی هاوبەشیش لە نێوانیاندا هەیە وەک:

١- دەستەی سەرۆکایەتی بەهاوبەشی بەرنامەی کاری کۆبوونەوەکان دادەنێت کە دەبێ دوو رۆژ پێش بەستنی

کۆبوونەوەکانی ئەنجومەن پرۆژە و پێشنیاز و راپۆرتەکان بەسەر ئەندامانی ئەنجومەن دابەش بکرێت.

٢- یەکلایی کردنەوەی ململانێی پسپۆرایەتی لەنێوان لیژنەکاندا و بنەمایەکی تایبەت بۆ رێکخستن و نووسینی کۆنووسەکان دادەنێ.

٣- ئەگەر سەرۆک و جێگر نەیانتوانی ئەرکی سەرۆکایەتی بەجێ بێنن، بەتەمەنترین ئەندام لەناو ئامادەبووان سەرۆکایەتی ئەنجومەن دەکات.

٤- لە کاتی ئامادەنەبوونی سکرتێر یەکێک لە ئەندامان لەسەر بڕیاری زۆربەی ئامادەبووان بۆ جێگیرکردنی ئەرکەکانی دەستنیشان دەکرێ.

٥- هەر کات بەپێویست زانرا دەستەی سەرۆکایەتی لەسەر داوای سەرۆک کۆدەبێتەوە و دەبێ کۆنووسی کۆبوونەوەکانی رێک بخا، ئەو باس و بیروڕا و بڕیار و بنەمایانەی تێدا جێگیر بکرێ کە بۆی نێردراون و ئەندامەکانی ئیمزای دەکەن و لەگەڵ بەڵگەنامەکانی ئەنجومەندا دەپارێزرێ.

## پرۆسەی دارشتنی یاسا و بڕیارەکان

بەپێی پەیڕەوی ناوخۆی پەرلەمان پرۆسەی پێشنیاز و دەرکردنی یاسا و بڕیارەکان لە ئەنجومەنی نیشتمانی بە دوو شێواز بەڕێوە دەچێت:

١- ئەو پرۆژە یاسایانەی کە لەلایەن ئەنجومەنی وەزیرانی حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە پێشکەش دەکرێن.

٢- ئەو پرۆژە یاسانەی لەلایەن ژمارەیەک لە ئەندامانی ئەنجومەن کە لە دە کەس کەمتر نەبن پێشکەش بەپەرلەمان دەکرێت.

٣- پرۆژەی یاسا و بڕیارەکان کە بۆ ئەنجومەن دێن لەگەڵ هۆکارە پێویستییەکان بەسەر ئەندامان دابەش دەکرێن و پوختەکانیان لە یەکەم دانیشتندا دەخوێندرێتەوە بەبێ گفتوگۆکردن، هەر لەو دانیشتنەدا ئاراستەی لیژنەی یاسایی و لیژنە پەیوەندیدارەکانی تر دەکرێت بۆ دیراسەکردن و دەوڵەمەندکردنیان.

٤- پرۆژەی یاسا پێشنیازکراوەکە لەگەڵ راپۆرتی هەردوو لیژنەکە لەلایەن سکرتێرەوە بەسەر هەموو ئەندامان دابەش دەکرێت و پاشان لە رێی سەرۆکی پەرلەمان دەخرێتە بەرنامەی کاری دانیشتنەکان.

٥- ئەنجومەن سەرەتا گفتوگۆ لەسەر راپۆرتی لیژنەی یاسایی و لیژنە پەیوەندیدارەکان دەکات، دواتر گفتوگۆ لەسەر دەقی پرۆژەکە خۆی دەکات، ئەگەر بڕیار لەسەر بنەماکانی درا ئەوسا دەنگ لەسەر یەک بەیەکی ماددەکانی دەدرێ.

٦- دوای گوێگرتن لەقسەی دواکەس لەوانەی خۆیان ناونووس کردبوو، سەرۆک دەرگای گفتوگۆ دادەخا و باسەکە دەخاتە دەنگدانەوە.

٧- یاسا و بڕیار بەزۆربەی دەنگی ئامادەبووان دەردەکرێن، جگە لەو حاڵەتانەی کە زۆرینەیەکی تایبەتییان دەوێ.

٨- سەرۆک بەپێی ئەنجامی دەنگدان، بڕیاری ئەنجومەن بە((بەڵێ)) یان ((نەخێر)) رادەگەیەنێ.




## شێوازی دەنگدان بەئاشکرا

١- دەنگدان بەئاشکرا و بەدەست بەرزکردنەوە دەبێت، ئەگەر گومان لە بەدیهاتنی زۆرینەی دەنگدانەکە کرا، دەنگدانەکە لەشێوەی خوێندنەوەی ناوی ئەندامان دووبارە دەکرێتەوە.

٢- ئەگەر دەنگەکان وەک یەک کەوتنەوە واتە (یەکسان بوون)، ئەو لایە سەردەکەوێ کە دەنگی سەرۆکی لەگەڵدا دەبێ، بەمەرجێ ئەو دەبێ دواکەس بێت دەنگ بدا.

**شێوازی دەنگدان بەنهێنی:**

دەنگدان لەم حاڵەتانەی خوارەوە بەنهێنی دەبێت:

١- لەکاتی باوەڕ (متمانە) سەندنەوە لە ئەنجومەنی وەزیران یا یەکێ لەئەندامانی.

٢- نەمانی مەرجەکانی ئەندامیەتی لە یەکێک لە ئەندامانی ئەنجومەندا.

٣- ڕێدانی ئەنجومەن بەگرتنی یەکێک لە ئەندامانی، لەسەر داوای دەسەڵاتی دادوەری.

٤- ئەگەر دەستەی سەرۆکایەتی و بەبڕیاری زۆربەی ئامادەبووان وەهایان بەباش زانی.

**ناونیشان لیژنەکانی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان.**

ئەنجومەن بەگشتی دوو جۆر لیژنەی هەیە: -

**١- لیژنە هەمیشەیەکانی ئەنجومەن**

ژمارەی ئەو لیژنە هەمیشەییانە بەقەد ژمارەی وەزارەتەکانی حکومەتی هەرێمە و ئەرکی ئەوانە چاودێریکردن و بەدواداچوونی کارو چالاکییەکانی وەزارەتەکانە، بۆ ئەم مەبەستەش پەرلەمان ١٦ لیژنەی هەمیشەیی هەیە کە لەمانە پێکهاتوون:

- لیژنەی کاروباری یاسایی.
- لیژنەی دارایی و ئابووری.
- لیژنەی کاروباری ناوخۆ.
- لیژنەی پیشەسازی.
- لیژنەی ڕۆشنبیری و پەیوەندییەکان.
- لیژنەی پەروەردە و فێرکردنی باڵا.
- لیژنەی خزمەتگوزارییە گشتییەکان و تەندروستی و کاروباری کۆمەڵایەتی.
- لیژنەی سکاڵاکان و مافی مرۆڤ.
- لیژنەی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی.





- لیژنەی کاروباری پێشمەرگە.
- کاروباری کشتوکاڵی و ئاودێری.
- لیژنەی شاردوانییەکان.
- لیژنەی ئاوەدانکردنەوە و گەشەپێدان.

**٢- لیژنە کاتییەکان و لیژنەکانی توێژینەوە**

- لیژنەی بەدواداچوونی ماددەی ١٤٠.
- لیژنەی نووسینەوەی پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان.

**پشتیوانە (حەصانە)ی ئەندامانی پەرلەمان**

- ئەندامانی پەرلەمانی کوردستان پشتیوانە (حەصانە)ی یاساییان هەیە، کە پاراستنی یاسایی پێویستیان بۆ دابین دەکات تاکو بەئازادی ئەرکەکانیان جێبەجێ بکەن.
- ئەندامی پەرلەمان لەسەر دەربڕینی بیروڕای لەکاتی ئەنجامدانی کارەکەی لە ئەنجومەندا لێپرسینەوەی لەسەر ناکرێت و نابێ ڕاودەوو بنرێت، یا بگیرێت لەکاتی خولەکانی کۆبوونەوەی ئەنجومەندا، بەبێ ڕەزامەندی ئەنجومەن، تەنیا لەو حاڵەتە نەبێت کە لە تاوانێکدا گیرابێ، هەروەک نابێ ئەندام ڕاودەوو بنرێت یان بگیرێت لە دەرەوەی کاتی خولی بەستنی ئەنجومەن بەهۆی تاوانێک بەبێ وەرگرتنی ڕەزامەندی سەرۆکی ئەنجومەن، تەنیا لەو بارەدا نەبێت کە لە تاوانێکدا گیرابێت.

**پەرلەمان و بودجەی هەرێم**

- بەپێی پەیڕەوی ناوخۆی پەرلەمان ساڵانە بودجەی هەرێم،

لە سەرەتای تشرینی یەکەم بەر لەوەی ساڵی دارایی کۆتایی بێت لەلایەن ئەنجومەنی وەزیرانی حکومەتی هەرێم پێشکەش بە سەرۆکایەتی پەرلەمان دەکرێت، پاش ئەوەی بودجەکە لەلایەن وەزارەتی دارایی و ئابوورییەوە بەسەر چەند دەروازەیەک دابەش دەکرێت. هەر دەروازەیەکی تایبەتە بەوەزارەتێک لە وەزارەتەکانی هەرێم.

- دوای ئاگادارکردنی ئەنجومەن، و خوێندنەوەی یەکەم بۆ پرۆژەی یاساکە، پەرلەمان پرۆژەکە ئاراستەی لیژنەی دارایی و ئابووری و لیژنەی یاسایی دەکات. لیژنەی دارایی و ئابووری راپۆرتی خۆی لە ماوەیەکدا پێشکەش دەکات کە نابێ لە (٣٠) رۆژ تێپەڕ بکات لەو رۆژەوەی ئاراستەی دەکرێت. هەر یەکێک لە دەروازەکانی بودجەش کە پەیوەندیدارە بە وەزارەتێکی دیاریکراو، ئاراستەی لیژنەی پەیوەندیداری پەرلەمانی دەکرێت.

دوای کۆتایی هاتنی گفتوگۆ و دیراسەکردنی پرۆژەی یاساکە و ئامادەکردنی راپۆرت لە بارەیانەوە، رۆژێک دیاری دەکرێ بۆ گفتوگۆکردن لەسەری لەلایەن پەرلەمانەوە، لە دانیشتنێکی گشتیی کراوەدا، بەئامادەبوونی وەزیری دارایی و ئابووری و وەزیری هەرێم بۆ کاروباری پەرلەمان گفتوگۆ لەسەر یاسای بودجەی هەرێم دەکرێت.






**شێوازی پرسیار و لێپێچینەوە لە بەرپرسانی حکومەت**

چاودێری کردنی حکومەت و لێپرسینەوە لە وەزیر و بەرپرسانی تری کابینەی حکومەت، هەر ئەندامێکی پەرلەمان بۆی هەیە لە رێی سەرۆک و بەپێی پەیڕەوی ناوخۆی پەرلەمان پرسیار و وەڵام بەنووسراو یان بە زار لە رێی سەرۆکی پەرلەمان، ئاراستەی سەرۆک و ئەندامانی ئەنجومەنی وەزیرانی حکومەت بکەن، لەبارەی ئەو راپۆرت و تێبینییانەی کە لەسەر کارو چالاکی وەزارەتەکان لەلایەن لیژنەکانی پەرلەمان ئامادە کراوە و پێویستە حکومەت وەڵامیان بداتەوە.

- پرسیاری نووسراو ئاراستەی سەرۆک دەکرێ ئەویش ئاراستەی لایەنی تایبەتمەندی دەکات و پوختەکەی دەخاتە ناو یەکەم دانیشتنی کە دوای پێشکەشکردنی پرسیارەکان دەبەسترێ.
- هەر ئەندامێک بۆی هەیە کەی ویستی پرسیاری زارەکی (شەفەهی) بکا، سەرۆک بۆی نییە لە سێ پرسیار وەربگرێ تا بتوانرێ بەسەر دانیشتنەکە دابەش بکرێت، تەنها ئەو کەسی پرسیارەکەی کردووە بۆی هەیە بەشداری گفتوگۆکردن بکات و بۆی نییە لە ١٠ دەقیقە زیاتر قسە بکات. ئەگەر ئەو ماوە بەشی نەکرد دەتوانرێ بەنووسراو پێشکەش بکات.

**وەڵامەکانی ئەنجومەنی وەزیران**

- دەسەڵاتی جێبەجێکردنێ بۆی هەیە دەستبەجێ وەڵامی پرسیارەکان بداتەوە یا بۆ دانیشتنی داهاتوو دوای بخات. یان بەنووسین لەماوەی ١٥ رۆژدا لەمێژووی بەدەست گەیشتنیەوە وەڵامی پرسیارەکان بدەنەوە.
- وەڵامی دەستەی جێبەجێکردن دوای گەیشتنی لەیەکەم

دانیشتندا دەخوێندرێتەوە، ئەگەر ئەوەی پرسیاری کردووە بەوەڵامەکە رازی نەبوو، یان ئامادە نەبوو، جگە لە خۆی ئەندامەکانی تر پرسیارەکەیان خودان نەکرد، بابەتەکە وا دادەنرێت کۆتایی هاتووە.

- ئەگەر حکومەت لە دەرفەتی یاساییدا، وەڵامی پرسیارەکەی نەدایەوە، ئەندامەکەی پەرلەمان بۆی هەیە داوای لێپێچینەوە بکات و داوا لە دەسەڵاتی جێبەجێکردن دەکرێت هۆیەکانی هەڵسوکەوتی خۆی یان مەبەستی خۆی یان مەبەستی لە کارەکەیدا روون بکاتەوە.
- هەر ئەندامێکی پەرلەمان ویستی لێپرسینەوە لە ئەندامێکی دەسەڵاتی جێبەجێکردن بکات، دەبێ لێپرسینەوەکە بەنووسین پێشکەش بکا.
- سەرۆکی پەرلەمان لێپرسینەوەکە بەدەستی جێبەجێکردن رادەگەیەنێ، دوای ئەوەی دەیخاتە بەرنامەی کاری یەکەم دانیشتنەوە کە لەدوای پێراگەیاندنەکە دەبەسترێت، کاتی گفتوگۆکردنەکەش دوای هەفتەیەک دیاری دەکرێت.
- ئەگەر گفتوگۆکردن لەسەر لێپرسینەوەکە بەدەنگدان کۆتایی پێهات، ٢-٣ دوو لەسەر سێی ئەندامان پشتگیریان لە لێپرسینەوەکە کرد، ئەم پشتگیرییە بە بەخشینی ئەو ئەندامەی دەسەڵاتی جێبەجێکردن دەژمێردرێ لە پلەوپایەکانی کە بەپێی یاسا لێپێچینەوەی لەگەڵدا دەکرێت.

### نەخشەی لێپێچینەوەی پەرلەمان لە بەرپرسانی حکومەت

### ١- پرسیارکردن




وەزیران یا وەزیری پسپۆر، وەڵام دەداتەوە، ئەمەش بە ئامادەبوونی پرسیارکار و وەڵامدەرەوە دەبێت، لە کۆڕێکی تایبەتی پەرلەمان.

پاش هەفتەیەک لەرۆژی راسپاردنی پرسیارەکە بەنووسین یا بەزاری، بەپێی خواستی ئەندامی پەرلەمان، سەرۆک پرسیاری ئاراستەکراو لەم حاڵەتانەی خوارەوە کاریگەری نامێنێ:

١- کۆتایی هاتنی خولی پەرلەمان.
٢-دەست هەڵگرتن یان هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنی وەزیران.

لەکاتی پرسیارکردندا کەس لەو وتووێژەدا بەشداری ناکات لەنێوان ئەندامی پەرلەمان (پرسیارکار) و سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران تەنیا ئەندامی پەرلەمان.

### وەڵامدانەوەی پرسیارەکان

نەخشەی لێپێچینەوەی پەرلەمان لەبەرپرسانی حکومەت

١- پرسیارکردن




ئەگەر وتووێژ بەدەنگدانی وەڵامدانەوە کۆتایی هات، دەنگدانەکە بوو بەمایەی رەتکردنەوەی وەڵامدانەوە، ئەوە مەسەلەکە کۆتایی هاتووە و دەبڕێتەوە.

- لەحاڵەتێکدا ئەگەر پەرلەمان پشتگیری وەڵامدانەوەی کرد، بەزۆرینەی دەنگ، ئەوا سێ یەکی ئامادەبووان پشتگیری کردنەکە ئیعفا دەکرێت. بەدەست هەڵگرتوو حیسابی بۆ دەکرێت ئەگەر ئەو کەسەش سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران بێت ئەو هەموو کابینەی وەزارەت ئیعفا دەکرێت (دەست لەکار دەکێشێتەوە).

# مێژووی تیرۆر لە هەولێر یەکی شوبات بەنموونە

قاسم زرار عەبدولرەحمان شێروانی



**پێشەکی**

هەر کاتێ وشەی تیرۆرمان بەر گوێ دەکەوێ کوشتن، ترس و بیم و تۆقاندن و رەشەکوژی و وێرانکاری و غافڵکوژیمان دێتە بەرچاو، چەمکی تیرۆر وەکو زاراوەیەک، کە لە سەراپای جیهاندا بڵاو بووەوە و ناسرا بووە مایەی هەڵوەستە لەسەر کردن و وردبوونەوەی کەسانی شارەزا لەو بوارە جگە لەوەی تا ئێستا بەدەیان لێکۆڵینەوەی گرنگ لەسەر ئەم چەمکە نووسراوەتەوە و دەیان کۆڕ و سیمینار بۆ ناساندن و خستنە رووی رووە راستەقینەو شاراوەکانی تیرۆر ئەنجام دراون، وەک گوتمان تیرۆر وەک زاراوەیەک بۆ رەشە کوژی و دەست نەپاراستن بۆ لەناوبردنی مرۆڤەکان لە هەموو جیهاندا بڵاوبۆتەوە وەک ترسناکترین دیاردەی ئەم سەردەمە، بووە مایەی سەرنجی سیاسەتمەداران و توێژەرەوە و کەناڵەکانی راگەیاندن و میدیاکانی جیهان لە ئاستی نێودەوڵەتیشدا وردبوونەوەو لێکۆڵینەوەی زۆری لەسەر کرا بە تایبەتی لە دوای رووداوە گەورەکەی ١١ /ی

سێپتەمبەری ساڵی ٢٠٠١، کە لە دواتریش بە کۆمەڵێک جۆرو شێوازی تری جیا جیا کردەوە تیرۆریستییەکان تەشەنەیان کردو بە جیهاندا بڵاو بووەوە، تا ئێستا بە هەزاران و بگرە بە سەدان هەزار مرۆڤی سڤیل و بێگوناه و بێدەرەتان بوونەتە قوربانی دەستی تیرۆر هەروەها لە پاڵ ئەمەشدا بە هەزارانیش بوونەتە قوربانی فیکری تیرۆر و تێوە گلاون بە هەڵخەڵەتاندن و فریودان و لە خشتەبردن بۆ خۆشکردنی کوورەی ئەو ئاگرە ترسناک و بێ ئامان و تۆقێنەرە.

هەروەها وەک زانراوە جۆرەها شێوازیش بۆ هەڵخەڵەتاندن و فریودان و چاو بەستەکردنی کەسانێک بەکار دەهێنرێت کە دەبنە سووتەمەنی بێ ئەوەی لە بنەڕەتدا بروایان بەو کارە قێزەونە هەبێت یا کردەوە تیرۆریستییەکان بەشێک بێت لە کلتووری ئەوان، دەتوانین بڵێین تیرۆر بەشێک نییە لە کلتووری کۆمەڵە کەسانێک رەنگە بە ئاسانی بتوانرێ گەمارۆ بدرێن و لەناوببرێن، بەڵکو تیرۆر لە ئەژدیهایەکی چەند سەر دەچێ سەرێکی دەپەرێنی سەرێکی نوێی لێ دەڕوێتەوە، بۆیە دەبینین تیرۆر پەلوپۆی بۆ هەموو شوێنێکی جیهان هاویشتووە، لە زۆر شوێنی جیهان گورزی کوشندەو جەرگبڕی وەشاندووە، بەڵام ئەو تیرۆرەی لە فۆرمێکی ئایینی خۆی دەنوێنێ لە هەموو جۆرەکانی تر مەترسیدارترو و سەرسەختتر و دژوارترە، چونکە شەرعییەتی خودایی دەداتە کارەکەی.

لە بەرامبەر ئەمەشدا هەڵمەتێکی جیهانی گەورە و فراوان و دەست پۆڵایین هەیە بۆ بەرەنگاربوونەوەیان و ئاشکرا کردنی تۆڕەکانیان و بنکەو بارەگاکانیان و گرتن و لەناوبردن و سڕینەوەیان، کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی لە پێشەوەو هێزی دیارو بەر چاوی ئەو هەڵمەتەی رووبەڕووبوونەوەو جەنگی لەناو بردنی تیرۆرن، هەروەک لە ماوەی (٧) ساڵی رابردوو رۆژانە و بەردەوام دەبینین و دەبیستین چەند کەس و دەستە و تاقم و گروپ و سەرکردە باڵادەستەکانی رێکخراوەکانی تیرۆریستان لە شوێنی جیا جیای دنیا دەکەونە بەر شاڵاوی ئەو هەڵمەتانە، زۆریان دەگیرێن و دەکوژرێن و لەناو



دەبرێن، بەڵام دەبینین لە پڕ لە شوێنێکی ترو بە شێوازی تر پەیدا دەبنەوە و کاری دڕندانە و نامرۆڤانە ئەنجام دەدەن، نابێ ئەو راستییەش لەبیر بکەین کەوا لە بنەڕەتدا تیرۆریزم ئایدیۆلۆژیایەکە هەمیشە بەرامبەرەکەی رەفز دەکا، فکرێکە باوەڕی بە ململانێی سیاسی و دیالۆگ و ئازادی بیروڕا و ململانێ دیموکراسییەکان و چەمکی دیموکراسییەتیش نییە، هەمیشە هیچ پرۆژەیەکی سیاسیشی نییە، بۆیە ناچارە پەنا دەباتە بەر ترس و تۆقاندن و شتە دزێوەکانی تر.

گەر بمانەوێ تەواو لە دیاردەی تیرۆر بدوێین و تێبگەین دەبێت خوێندنەوەیەکی زانستی و دەروونی چڕ و قووڵ بۆ شیکردنەوەی سایکۆلۆژیەتی تیرۆر و جۆرە کانی تیرۆر و بنەما سەرەکییەکانی تیرۆرو رەهەندەکان و هۆکارە کاریگەرەکانی سەر تیرۆر و چۆنیەتی هەڵسوکەوتکردن لە بەرامبەریدا و قۆناغەکانی ئەو گۆڕانەی بەسەر تاکەکانیدا دێت تا دەبێت بە کەسێکی تیرۆریست چین ؟ چۆن پەروەردە دەکرێن دەبێت ئەمانە بە گشتی و بە وردی لە لایەن کەسانی شارەزا و پسپۆڕەوە لێکۆڵینەوەی وردی زانستییان لەسەر بکرێ، کە بێگومان ئەمە کارێکی قورسە و من بۆم نییە خۆم لە قەرەی بدەم، بەڵام دەکرێ بە پێی توانا و لێزانینمان لە هۆکارو رەهەندەکانی سەرهەڵدانی تیرۆر بدوێین، کەوا چۆن و بۆ لە کوردستانیش تیرۆر توانی جێ پێی خۆی بکاتەوەو دەستییش بوەشێنێ و شێوە مەترسییەک لە کوردستان پەیدا بکاو هەڕەشە لە ئاسایشی هەرێمی کوردستان بکا.

دەگوترێ تیرۆر کوشندەترین دەردی سەدەی بیستەمە، چونکە دەست ناپارێزی لە هیچ شتێک و جگە لەوەی پێشێلی هەموو مافەکانی مرۆڤ دەکاو هەڕەشەیەکی گەورەیە بۆ سەر مرۆڤ و مرۆڤایەتی بۆ سەر ئایندە و جگە لەوەش ئابووری هەڵدەتەکێنی و ڕێگریشە لەبەر دەم گەشەسەندنی شارستانیەت و ئاوەدانکردنەوەو پێشکەوتنی کۆمەڵگا هۆکارێکیشە بۆ شێواندنی ئایین و کلتوورەکان و کۆسپێکی گەورەیە لە بەردەم دیموکراسییەت.

**پێناسەی تیرۆر: terror**

وشەی **terror** ترس و تۆقاندن یەکەمین جار ساڵی ۱۳۵۵ بەپێنووسی قەشە **BERSUIVE** لە زمانی فەرەنسی دا بەکارهاتووە، دوای ئەوە پاش لەسێدارەدانی ڕۆبسپێر شێوازێکی نوێی وەرگرت و بە فراوانتر بەکار هات.

ئەم وشەیە بۆ یەکەم جار لە میانەی سیاسەتدا بەکارهات کە وشەیەکی فەرەنسییە، **terreur** پێکهاتووە لە هەردوو وشەی **tersere-terrere** کە دوو فرمانن بەمانای وای لێ کرد بتۆقێ و هەڵبلەرزێ، لە ئەنجامدا وشەی تیرۆر دروست بوو کە لە فەرهەنگی ئەکادیمیای فەرەنسیدا بە مانای تۆقاندن و ترسێکی گەورە دێ.

تیرۆری سیاسی وا پێناسە دەکرێ: بەکارهێنانی توند و تیژی لەرێی کەسانی نەتەوەخواز یا ڕێکخراوێکی نهێنی یا گرووپێکی ئایینی لە پێناو بەدەستهێنانی مافی سیاسی یان کۆمەڵایەتی یان ئایینی، کە مەبەستیش لەم شێوازە ترساندنی هەموانە یا ورووژاندنی هەستی ئەوانەیە کە چاودێرن، یا بۆ کاریگەری بوون لەسەر هەڵسوکەوت و هەڵوێستەکانی ئەندامانی کۆمەڵگایە، بەرلەوەی



مەبەستەکە کوشتن و لەناوبردنی کەسەکان بێ.

هەندێ نووسەر و لێکۆڵیار وای دەبینن کەوا تیرۆر بریتییە لە شێوازێکی تۆقاندن، کەسانی لادەر لەیاسای رژێمی دەسەڵاتدار و یاخیبووەکانی دژ بە دەسەڵات پێ هەڵدەستن، هەروەها هەندێکیش پێیان وایە کەوا تیرۆر شێوازێکە لە سەخڵەتکردن و ترساندن و تۆقاندن بە مەبەستی سیاسی، کەوا کەسانێکی بەدڕەوشت و نایاسایی بێ هیچ پاساوێکی ڕەوا و بێ ئەوەی ڕەچاوی تیاچوونی گیانی کەسانێک بگرێتەوە کە دوورن لە ئامانجی راستەقینە.

وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکاش وا پێناسەی تیرۆر دەکا: توند و تیژییەکی سیاسی ئامادەکراو و ئاراستە کراوە دژی ئەو ئامانجانەی توانای بەرگری لەخۆکردنیان نییە.

زاراوەی تیرۆر زاراوەیەکی نوێیە لە زمانی ئینگلیزی و فەرەنسی و عەرەبیشدا، بۆ یەکەم جار لە زمانی عەرەبی لە (مختار الصحاح) لە ساڵی ۱۹٦۲ دا بەکار هاتووە و مانای لێکدراوەتەوە.

(احمد عظیم الله) لە ساڵی ۱۹٦۸ لە فەرهەنگی سیاسیدا بەم شێوەیە پێناسەی تیرۆر دەکات:

هەوڵێکە بۆ بڵاوکردنەوەی ترس و تۆقاندن بە مەبەستی سیاسی هۆکارێکە کە حکومەتە داپلۆسێنەرەکان بەکاری دێنن دژی گەل بۆ ملکەچکردن و خۆ بەدەستەوەدان: بۆ نموونە دروستبوونی حکومەتی تیرۆر لەکاتی شۆڕش لە فەرەنسا ساڵی ۱۷۹۳ بۆ مەبەستی سیاسی. تیرۆر هۆکارێکە دەسەڵات دەیگرێتەبەر بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی خۆی بەسەر گەلدا بۆ بڵاوکردنەوەی گیانی رووخان و تۆقاندن و ملکەچکردن بۆ داخوازییە نارەواکانی، یان شێوازێکە کە کۆمەڵێکی کەمینە بەسەر زۆرینەدا دەی سەپێنێ وەک (تیرۆری جوولەکەکان) ئەمەو جگە لەوەش لە قورئان و ئینجیل و تەوراتیش وشەی تیرۆر بەمەبەستی ترس و تۆقاندن بەکارهاتووە یاراستر بەمانای ترس و ناثارامی بەرامبەر بەخودا و تواناو دەسەڵاتی ئەو هەروەها دەتوانرێ بگوترێ: تیرۆر ستراتیژێکی توندو تیژییە کە لەجیهاند قەدەغەو حەرام کراوە ئەگەرچی هۆکاری

ئایدۆلۆجی و بیروباوەڕی لەپشتەوەیە کە دەبنە هۆکاری ترس و تۆقاندن و کوشتن لەلایەن کەسانێکەوە بۆ مەبەستی دەسەڵات سەپاندن بەکار دەهێنرێ، هەروەها پێویستە ئاماژە بەوەش بکەین کەوا تیرۆر چەندین جۆرو شێوازی هەیە بەڵام دیارترین و مەترسیدارترینیان ئەمانەن:

١- تیرۆری تاکەکەسی
٢- تیرۆری سیاسی
٣- تیرۆری ئایدۆلۆجی

بێگومان لە پیادەکردن و بەئەنجام گەیاندنی هەر یەکێک لەم جۆرانەی تیرۆر گەلێک شێوازی جیاجیا هەن بەکاردەهێنرێن کە زیاترینیان کوشتن و خوێن ڕشتن و ترس و تۆقاندنە، بەڵام کوشتنێکی ئاسایی ناچێتە خانەی تیرۆرەوە، واتە هەموو کوشتنێک تیرۆر نییە، دەتوانین بەگشتی ئەم شێوازانە بژمێرین کە دەخرێنە خانەی تیرۆرەوە وەک ١- رفاندنی کەسەکان. ٢-رفاندنی هۆیەکانی گواستنەوە. ٣- کوشتن و لەناوبردن. ٤-سەربڕینی مرۆڤەکان. ٥-رفاندن و دەست بەسەرکردن. ٦- تەقاندنەوە. ٧-وێران کردن. ٨-بەکارهێنانی تەقەمەنی کوشندە. ٩- بەکۆمەڵ کوشتن. ١٠-هەڵمەتی لەناکاو و لە پڕ. ١١-سەپاندنی هەڵوێستێک و پاشگەز پێکردنەوە لەسەر هەڵوێستێک لە ژێر هەڕەشەیەکی مەترسیدار. ١٢-بلاو کردنەوەی دەردو بەڵاو نەخۆشی ڤایرۆسی. ١٣-ژەهر دەرخواردان. ١٤- شێواندنی فەزای ئازادی رادەربڕین و ئازادی سیاسی ١٥- شێواندنی مافە مەدەنییەکان. ١٦-سەپاندنی بیرو باوەڕێک بەسەر خەڵک و کۆمەڵگادا لەژێر هەڕەشەی کوشتن و تۆقاندن. هەروەها گەلێک شێوازی تر، جگە لەوە کاری توند و تیژی و تۆقاندن و تیرۆر بەزۆر جۆر و شێواز و ئیتیکی جیا جیاو لەپێناو ئامانج و مەرامی جیاجیاش لەلایەن گروپ و ڕێکخراوی جیا جیا زۆرجار لای نەتەوەخواز و توندڕەوەکان دژ بە دەسەڵات یان بە پێچەوانەوە دەسەڵات دژ بە شۆڕشگێران و هێزی ئۆپۆزسیۆن کاری تیرۆر و تۆقاندن ئەنجام دەدا، کە بە تیرۆری فەرمی یا تیرۆری دەوڵەت ناسراوە، کە دەوڵەت تیرۆر وەک ئامرازێک بەکاردەهێنێ بۆ سەرکوتکردنی



نەیارەکانی یان ڕەنگە تیرۆر دژ بە داگیرکاری بیانی لەلایەن هێزە شۆڕشگێڕە نیشتمانپەروەرەکانەوە بەکاربێ بۆ مەبەست و ئامانجی رزگاری نیشتمانی و سەربەخۆیی، هەروەها لە کۆنەوە تا ئێستا جۆرەها ئامراز و چەک لە کرداری تیرۆریستی بەکارهاتوون، بە پێی گەشەکردن و بەرەو پێشەوەچوونی ژیان و تەکنەلۆجیا و گەشەی ئابووری ئامرازەکانیش گۆڕانیان بەسەردا هاتووە، بۆیە لەگەڵ ئەو گەشەکردن و بەرەو پێشەوە چوونە، چەمکی تیرۆریش لە ئێستادا بەناوی (تیرۆری نوێ) ناوزەد دەکرێ.

لە سەرەتای نەوەدەکان لەلایەن زۆرێک لە ئەکادیمیست و توێژەر و سیاسەتمەدارانەوە زاراوەی تیرۆری نوێ کەوتە نێو ئەدەبیاتی سیاسەتەوە، وەک شێوەیەکی جیا لە شێوازەکانی پێشووی تیرۆر، کە دەبینین (تیرۆری نوێ) بەو دوو ئاراستەیە دەوترێ کە هەڵگری ئایدیۆلۆژیای نەتەوەیی توندڕەو یا ئایینی دەگرێتەخۆ، کە تۆڕی ڕێکخستنەکانیان زۆر نهێنی و فراوان و کاریگەرن و کرداره تیرۆریستییەکانیان کۆمەڵکوژی و وێرانکارییە شەپۆلاوییە لە سروشت و ناوەڕۆکدا جیاوازییان زۆرە لەگەڵ تیرۆری سەردەمانی پێشوو لەڕووی ڕێکخستن و ئامانج و ئامرازە کاریگەرییەکانیشی، هەروەها تیرۆری نوێ لەڕووی خەسڵەتیشەوە هەڵگری رقێکی ئەستوورە و هەمیشە بەرامبەرەکەی رەت دەکاتەوە و زۆر بە توندیش هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکا.

### کارەساتی ١ی شوبات و وەرگەڕانی چەرخی تیرۆر

دوای شەڕی ئازادی عێراق و رووخانی رژێمی

دیکتاتۆری سەدام لە ساڵی ۲۰۰۳ یەکەمین کردەوەی تیرۆریستی لەلایەن توندڕەوە تاریکی پەرستەکانی کوردستان لە کوردستان ئەنجام درا ۱/ی شوباتی ساڵی ۲۰۰٤ بوو کە لە یەکەمین ڕۆژی جەژنی قوربانی پیرۆز کاتژمێر ۹,٤٥ بەیانی لە ڕێگای دوو خۆ کوژی عەرەب توانییان هەردوو بارەگای مەڵبەندی سێی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و لقی دووی پارتی دیموکراتی کوردستان لە شاری هەولێر و لەیەک کاتدا بتەقێننەوە، کە هەریەکە لە خۆکوژەکان پتر لە (٥) کیلۆ ماددەی TNT فۆسفۆری کاریگەر لە تەقینەوەدا هەڵگرتبوو کە لە دواییدا کۆمەڵی ئەنسار سوننە و بە فەرمانی ابو عەبدوڵلا حەسەن بن مەحمود بەرپرسیاریەتی خۆیان لە ئەنجامدانی ئەو کارە دڕندانەو نا مرۆڤانەیە ڕاگەیاند.

دیارە کارەساتی یەکی شوباتی ۲۰۰٤ یەکێکە لە دیارترین نموونەی ئەو هەستە نا مرۆڤانە ویژدان کوژیەی ئەوان کە لە ڕۆژێکی پیرۆز لە یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان شارێک خەڵتانی خوێن و ئازارو فرمێسک بکەن، ئەمە چی دەگەیەنێ (۱۰٥) ڕۆڵەی کورد لە سەرکردەو و کادیری پێشکەوتوو خەڵکی ڕۆشنبیر و ڕۆژنامەنووس و خەڵکی سادە و سڤیل و چەندین منداڵ شەهید بکەن، پتر لە (۲٤٦) کەسی تریش بریندار و کەمئەندام بکرێن لە پێناوی چی ئایا ئەمە لەپێناوی خواو قورئان و ئیسلام بووە، دیارە ئەم کارەساتە گەورەیە دەرفەتێکی باشیشی بۆ ڕۆڵەکانی نەتەوەکەمان و ڕای گشتی خستە ڕوو کەوا زۆر بە ڕوون و ئاشکرا ناسنامەی حیزب و ڕێکخراو و گرووپە ئسیلامیەکانی خستە ڕوو، دیارە ئەم ڕووداوە کاریگەری



زۆری هەبوو بۆ ڕەواندنەوەی ئەو دوودڵییەی لای خەڵکی موسڵمانی کوردو هێزە سیاسییەکان و هەندێ لە ڕێکخراوە مەدەنییەکان و ڕووناکبیران هەبوو لەسەر ئاشکرا کردنی ماهیەتی ئیسلامگەراکان یا ئیسلامی سیاسی لە کوردستان، ئیتر بەم کردارەیان هیچ شک و گومانێکیان لەسەر خۆیان نەهێشتەوە و ڕووی ڕاستەقینەی خۆیان دەرخست و دەمامکەکانیان لەسەر ڕوو هەڵماڵدرا، هەروەها ئاشکرا بوونی گرووپە خوێنخوار و مرۆڤ کوژەکەی شێخ زانا بەڵگەیەکی ترە بۆ پەردە لادان لەسەر ڕووی شەرمەزارانی دنیاو قیامەت، بێگومان تا ئێستاش لە کوردستان و لە هەموو جیهاندا لایەنە ئیسلامیەکان و تەکفیریەکان و تۆڕە توند ڕەوەکان و حیزب و گرووپە سیاسی و ئیسلامگەراکان ئەوانەی خۆیان بە دوژمنی دیموکراسی و عەلمانیەت دەزانن ئەوانەی لە ژێر ناوی ئیسلام لە جوولە و بزاڤدان سەرچاوەی سەرەکی پەیدا بوون و گەشەسەندنی تیرۆر و تۆقاندن و کوشتار و ماڵوێرانین لە نەهامەنی زیاتر هیچیان جێ نەهێشتووە.

تیرۆر بەر لە هەموو شتێک تیرۆرە بە دوو ئاراستە، بە دوو مانا تیرۆری جەستەیی و تیرۆری عەقل کوشتنی جەستەی بەرامبەر لەسەر بیروباوەڕ تیرۆرە کوشتنی عەقڵی بەرامبەر لەسەر ئازادی بیرو ئازادی ویژدان هەر تیرۆرە جەستە بکوژرێ مرۆڤێکی ئازاد لەناو ببرێ ئەقل بکوژرێ کردارێکی نامرۆڤانە و تیرۆرستانەیە، لە پێشدا باسی تیرۆرمان کرد کەی و چۆن و لە کوێ و کوێ تیرۆر هەبووە، بە کورتی دەتوانرێ بگوترێ تیرۆر لە کوردستاندا لە هەناوی ئەو گرووپ و ڕێکخراوانەوە سەریان هەڵداوە و دروست کراون، کە وەک حزب و ڕێکخراوی سیاسی ئیسلامی کوردستانی دروستبوونی خۆیان ڕاگەیاندووە، کە ئەوانیش لە بنەڕەتدا لە ڕێکخستنەکانی ئیخوان موسلمین بە نهێنی لە کوردستان کاریان کردووە، واتە سەرچاوەی هەموو نەهامەتییەکانی تیرۆرستان ئیخوان موسلمینە. ئەمە نەک هەر لە کوردستان، بەڵکو لە هەموو جیهاندا.

بەڵام تیرۆر ئەو ڕەشە کوژیەی کە لەسەر دەستی گرووپە تیرۆریستە ئیسلامگەراکان ئەنجام دەدرێ ڕەنگە بۆ بەر

چاوی ئێمە شتێکی نوێ بێ، بەڵام بە گەڕانەوە بۆ ناو مێژووی ئیسلام و هەڵگرانی بیری ئیسلامی سیاسی ئەوا دیارە رەگوریشەیەکی زۆر کۆنی هەیە بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی خولەفای راشیدین کە لە هەر چواریان سێیان تیرۆر کراون و دوای ئەوانیش چوار ئیمامەکە زۆر ئازار دراون و لێیان دراوە زیندانی کراون و هەندێکیشیان کوژراون، هەروەها ئەو کوشت و کوشتارەی سەردەمی ئیمامی عەلی و معاویە کە چۆن لایەنگرانیان یەکتریان تەسفیە کردووە و دواییش ئیمامی عەلییان کوشتووە، هەروەها کوشتنی ئیمامی حوسێن و قەتلوعامی کەربەلا و کوفە و قەتلوعامی نێوان ئەمەوی و عەباسییەکان ئەبو عەباسی سەفاح و حەجاج و گەلێکی تر نموونەی زەق و دیاری ئەم جۆرە تیرۆرانەن کە ئێستاش درێژەیان هەیە - کە دەبینین سەلەفییەکانی ئێستای ولاتانی عەرەبی و ئیسلامی میراتگری هەمان رەوتی تیرۆرن، وەک لە پێشدا باسمان کرد هەردوا بە دوای رووخانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی (ئیخوان موسلمین) دروست کرا بۆ درێژەدان بە هەمان رەوت لە کوشتار و خوێن رشتن، ئیتر دیارە دروستبوونی ئەو هەموو حیزب و دەستە و گروپ و رێکخراوە ئیسلامگەرایانەی لە پێشدا ریزبەندمان کردن کە لە کوردستان دروست بوونە هەمیشە هیچ جیاوازیەکیان لەگەڵ تیرۆریستەکانی تر نییە، چونکە هەموویان دەسکردی ئیخوان موسلمین و حەماس و قاعیدە و سەرکردە دیارەکانیانن کە بۆ هەمان مەبەست دروست کراون، خۆ دیارە هەر هەموویان پەیرەوی تیۆرەکانی سەید قوتب و حەسەن بەننا و عەبدوڵلا عەزام و زەواهیری و ئوسامە بن لادن دەکەن بەیاننامەی دروستبوون و دەست بەکاربوونیان تێکدانی ئەم رەوشی ئازادی و گەشە سەندنی دیموکراسیەتە ئەوە بینیمان لەماوە (۷) ساڵی دەسەڵاتیان لە هەڵەبجە و خورماڵ و بیارە و تەوێڵە و سیروان بزانن چ کارەساتێکی دژواریان بەسەر خەڵکی ئەو ناوچەیەدا هێنا بوو کە دەیانەوێ رۆژێک لە رۆژانیش هەموو کوردستان بەم شێوەیە بکەوێتە ژێر رکێفی شمشێرە ژەنگاویەکانیان و بە بیری بۆگەن و تاریک پەرستی بانگەڕێننەوە سەردەمی جەهالەت



وتاریکی و دەیانەوێ حکومەتێکی وەکو ئەوەی تالیبان لە کوردستانی ئازاد دروست بکەن، بەڵام هەموو خەونەکانیان بوونە بڵقی سەر ئاو دوای ریسوابوونیان بەو هەموو دزێوی و ناشیرینی و ساختەکاری و نابووتیەی پێیانەوە دەرکەوت و بوونە پەندی زەمانە و کارەساتی "۱ی شوبات"یش بووە هاندەر و هۆکارێکی گرنگ بۆ یەکێتی ریزەکانی گەل و رێکخستنەوەی نێومالی کورد و گێڕانەوەی تەبایی و برایەتی نێوان هێزە سیاسییەکانی کوردستان، بەمەش تەختی تیرۆر بە تەواوی وەرگەڕا.

**خوێنی بە ناهەق رژاوی یەکی شوبات چی لێکەوتەوە**

ئەگەرچی کارەساتێکی زۆر تاڵ و دژوارو جەرگبڕ بوو، بەڵام تارادەیەک دەرەنجامی باش و جوان و پیرۆزی بە قازانجی گەل و نیشتمان و ئەزمونەکەمان لێکەوتەوە، دیارە هەموو جۆرە قوربانی و فیداکاری و گیانبازییەک لەپێناوی بیر و ئامانجی رەوا بەرهەمی گەورەو بە برشتی دەبێت لەم رووەوە تاقیکردنەوەی گەورەترو تاڵترمان هەبووە لە رەوتی خەباتی نیشتمانی و نەتەوەییماندا کیمیا بارانی هەڵەبجە و هەڵمەتی نارەوای ئەنفالەکان کە بەعسی رەفتار فاشیزم و درندە دژ بە گەلەکەمان ئەنجامی دا بۆ ئەوێ رۆژی بوونە هەوێنی تەبایی و برایەتی هێزە سیاسییەکانی خەباتی شاخ و دروستبوونی بەرەی کوردستانی کە هەموو هێزو باڵە سیاسییە شۆڕشگێڕەکانی کوردستان تیایدا کۆبوونەوەو بڕیاری کاری بەرەیی شۆڕشگێڕانەیان دا دژی رژێمی دیکتاتۆری رووخاو کە یەکدەست و یەکدەنگ کەوتنە خۆ بۆ دارشتنی بەرنامەی راپەڕینی سەرتاسەری لە کوردستانی

خۆشەویستا. بەم جۆرە (١/ی شوبات)یش توانی هێزە ناکۆکەکان لەیەکتر نزیک بکاتەوە و نێو ماڵی کورد ڕێکبخاتەوە.

کارەساتی (١)ی شوبات بە هەموو ئێش و ئازارەکانییەوە دەڕژێتە خانەی کارەساتە دژوارەکانەوە لە مێژووی خەباتی ڕزگاری نیشتیمانیمان. جارێکی تر خەباتی شار و شاخی بەیەکەوە گرێ دایەوە و کاروانی شەهیدان گەورەتر بوو، کارەساتەکە ئەگەرچی بەشێوازێکی دڕندانەترو بە پیلانی کەسانێکی تر بوو. بەڵام ئامانجی دوژمنان کوشتن و بریندار کردن و زیان گەیاندن بە کوردو بزووتنەوە شۆڕشگێڕەکەی بووە، نەوەک دژی حزبێک و دووان و لایەنێک لەلایەنە سیاسییەکانی کوردستان، دیارە هەموو کارو کردەوەیەک کاردانەوەی خۆی بە دواوەیە، بۆیە هەر دوای ئەم کارەساتە لەماوەیەکی کورت و نزیکدا هێزە سیاسی و شۆڕشگێڕەکانی کوردستان بە تایبەتی هەردوو حیزبی سەرەکی یەکێتی و پارتی کەوتنە خۆ بۆ هاوکاریکردنی یەکتری و بەیەک هەڵوێست بەرەنگاری تیرۆریستان و دوژمنانی خواو گەل و ئەزمونەکەمان بوونەوە بۆ لەرەگ و ریشەوە هەڵتەکانیان، کە ئەمەش ڕێگا خۆشکەر بوو بۆ بەخۆداچوونەوەی زیاتر پابەندبوون بە پرنسیپەکانی بیری نەتەوەیی و نیشتمانی کە بەرجەستەیە لە خواست و ئاواتەکانی ڕۆڵەکانی گەلەکەمان کە دەمێک بوو داوایان دەکرد یەک بگرن و یەکدەنگ و یەکدەست و یەک هەڵوێست بن و نێو ماڵی کورد ڕێک بخەنەوە، بۆیە بەدیهاتنی ئەم داخوازیەی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان خۆی لە خۆیدا دەسکەوتێکی گەورەو سەرکەوتنێکی گەورە



بوو بۆ چەسپاندن و گەشە پێدانی ئەزمونی فیدرالیزم و دروستکردنی کۆمەڵگایێکی مەدەنی دیموکرات و پێشکەوتنخواز و هوشیار.

**ناوی شەهیدانی کارەساتی ١ / ی شوباتی ٢٠٠٤ ی شاری هەولێر لە لقی ٢ و مەڵبەندی ٣**

١- سامی عەبدولرەحمان ٢- شاخەوان عەباس ٣- خەسرۆ شێرە ٤- سەعد عەبدوڵلا ٥- شەوکەت شێخ یەزدین ٦- دیدەوان سەید محەمەد ٧- ئەکرەم مەنتک ٨- قادر قەرەچووغ ٩- بەکر جۆلا ١٠- مەهدی خۆشناو ١١- خەسرۆ عوسمان ١٢- نەریمان عەبدولحەمید ١٣- ملازم محەمەد ١٤- هاوار ڕەحمان ١٥- ئەوزاد ڕەجەب ١٦- ئیسماعیل شێخ محەمەد ١٧- مەحمود هالۆ ١٨- هیوا تاریق ١٩- وریا قادر ٢٠- ئەنوەر حەسەن. ٢١- زەردەشت مەهدی خۆشناو ٢٢- ئاسۆ موعەلیم ٢٣- ئەحمەد ڕۆژبەیانی ٢٤- خەبات شەریف ٢٥- شوان حەمە سالح ٢٦- ئیدریس سنجاوی ٢٧- سەلاح سامی عەبدولرەحمان ٢٨- خالید مەلا نەعمان ٢٩- خەسرۆ سمایل ٣٠- مەهدی عەبدولواحید مستەفا ٣١- عەلی محەمەد برا کاکەیی ٣٢- هۆگر شێخ ڕەقیب ٣٣- عامر عەبدوڵلا شەریف ٣٤- جەعفەر عەبدولمەجید ٣٥- فەریق تۆفیق ئەحمەد ٣٦- دارا محەمەد حوسێن جاف ٣٧- زرار عەبدوڵلا میرۆزی ٣٨- نەقیب باران جەوودەت ئەحمەد ٣٩- جەلیل خدر ڕەوەند ٤٠- حەسەن ئەحمەد پیرە ٤١- زریان باسم ٤٢- باسم حەسەن پیرە ٤٣- عەبدوڵلا سلێمان ٤٤- بروا خەلیل هیدایەت ٤٥- کامەران عەبدوڵلا سابیر ٤٦- حەسەن حوسێن ئاوماڵی ٤٧- مەغدید حەمەد ئیسماعیل ٤٨- فەرهاد ئەحمەد ڕەواندزی ٤٩- عەدنان محەمەد حەلاق ٥٠- هاشم عەزیز ٥١- فاتیح زراری ٥٢- کانەبی عوسمان ڕەسول ٥٣- سەلاح سەلیم سەیدۆک ٥٤- غەریب محەمەد ٥٥- ئەیوب محەمەد ٥٦- جەمشید خورشید ٥٧- مەلا عەبدوڵلا مەولود ٥٨- حوسێن حاجی مستەفا ٥٩- ئەحمەد حاجی نۆغەرانی ٦٠- زاهیر شۆڕۆ ٦١- حیکمەت عەزیز (نەبەز) ٦٢- هێمن حەمە سالح ٦٣- هیوا خەلیل مەولود

٦٤- هێدی جەبار ٦٥- کامەران محەمەد عومەر ٦٦- سەفیر نادر رەشید ٦٧- شەمسەددین سلێمان حوسێن ٦٨- فوئاد جەوهەر حەمەدەمین ٦٩- ناسیح سەلیم بلباس ٧٠- حەسەن ئەحمەد بانی مارانی ٧١ - حوسێن ئەحمەد مامەشێخ ٧٢- یوسف مستەفا ٧٣- مەعروف عەبدولغەنی ٧٤- هەیسەم سۆلاقا ٧٥- ماجید بویا ٧٦- عەبدولستار کەریم ٧٧- شوان سەید کاکە ٧٨- عەلی رەشید بەکر ٧٩- هۆگر فاروق ٨٠- سەلام حوسێن وەیسی ٨١- ئارام سەباح حەیدەر ٨٢- تاریق ئیبراهیم ٨٣- عەزیز ئەنوەر حوسێن ٨٤- جوتیار عەبدوڵڵا ٨٥- سەعید محەمەد سەعید ٨٦- یاسین لیری ٨٧- رەزا حەمەدەمین رەزا ٨٨- عەزیز ئەنوەر حوسێن ٨٩- جوتیار شەمسەدین موحسین ٩٠ - سمکۆ کەریم محێدین ٩١- هەڵمەت کەریم ٩٢- شەوکەت ئالکان ٩٣-دانا ئەبوبەکر حوسێن ٩٤- حاجی لوقمان عومەر ٩٥- بەهرۆز حەمەد قەشقە ٩٦- ئەنوەر حەمەدەمین ٩٧- شێخە محەمەد عەزیز ٩٨- دارا محەمەد جەلال ٩٩-ئیبراهیم حەمید هەڵمەت ١٠٠- عەبدولواحید مستەفا خۆشناو ١٠١- ماهیر قەرەنی ئاغا ١٠٢- هۆشەنگ زەیتۆ ١٠٣- مام موسلیح عەبدوڵڵا ١٠٤- سەباح حەیدەر یەکێک بوو لە بریندارە سەختەکانی کارەساتی ١/ ی شوبات، کە (ئارام)ی کوڕی لە کارەساتەکە شەهید ببوو خۆیشی لە دوای دوو ساڵ تلانەوە لەنێو ئازارەکانی ئەو کارەساتەو پاش چەندین نەشتەرگەری، ئەویش کۆچی کردو گەیشتە کاروانی سەربەرزی شەهیدان و ئارامی جگەر گۆشەی، ١٠٥- زرار ئەحمەد.

درووود بۆ گیانی بەرزەفڕی شەهیدانی کارەساتی ١/ ی شوباتی ٢٠٠٤ و سەرجەم شەهیدانی رێگای رزگاری گەلی کوردستان.

## برین و قەڵەم

((منیش یەکێک بووم لە قوربانییانی ئەم کارەساتە قاچی راستم لە سەرووی ئەژنۆ بڕایەوە و کورەکەشم (زیڤار) بە سەختی بریندار بوو کە هەردووکمان لە هۆڵی



مەڵبەندی سێی ی. ن. ک لە هەولێر بەرکەوتین و هەردووکمان کەمئەندام بووین، من ماوەی دوو هەفتە لە خەستەخانەی کۆماری شاری هەولێر مامەوە و هەر لەوێ قاچم بڕایەوە، چەند رۆژێک دوای بڕینەوەی قاچم کورتە نووسینێکم بۆ رۆژنامەی کوردستانی نوێ نووسی و هەر لەو هەفتەیە بلاوکرایەوە بە ناوی (قاچێکیشم بڕایەوە هەر پێشمەرگەیەکی قەڵەم بە دەستم) ژمارەکەو رۆژەکەیم لە بیر نەماوە، بەلام هەر لەمانگی شوباتی ٢٠٠٤ بلاوکرایەوە، هەروەها ئەم کورتە نووسینەشم بۆ مانگنامەی بەدرخان نووسی هەر لە خەستەخانە کە لە ژمارە ٤١/ ی ٢٠٠٤/٢/٢٢ دا بلاوکرایەوە، کە ئەمەش دەقەکەیەتی:

یەکدەنگی رووناکبیران کاریگەری زۆری لەسەر سەرکردایەتی سیاسی کورد دەبێت

وشەی کوردی کە مەبەستم لە وشەی راست و پیرۆز و ئامانج پێکەر (هادف)ە، ئیمرۆ لە هەموو سات زیاتر دەتوانێ خزمەت بە کوردو کێشەی رەواکەی بکا. دیسان لەم مینبەرەوە بانگەشەی هەموو نووسەرو ئەدیب و رۆشنبیران و رۆژنامەنووسان دەکەم، کەوا ئەم دەرفەتە

بقۆزنەوەو کارەساتی ۱/ ی شوبات بکەنە هەوێنی یەکدەنگی و یەکڕیزی بۆ زیاتر فشارکردنە سەر سەرکردایەتی سیاسی کورد، بۆ یەکگرتنەوەو یەکڕیزی و یەک هەڵوێستی بۆ ئەوەی بتوانین بویرانە بەرەنگاری هێزی رەشی تاریک پەرستی تیرۆریستان ببینەوە و فیدرالیەت بۆ کوردستانی ئازاد بچەسپێنین، چونکە یەکدەنگی رۆشنبیران کاریگەری زۆری دەبێ لەسەر هێزە سیاسییەکان، کە هەمووان یەکدەنگ بین و لە خزمەت نەتەوەکەمان ستراتیژی نەتەوەییمان. )) دوای ئەوەش کە لە خەستەخانە دەرچووم هێشتا برینم هەر تەڕ بوو شیعرێکم نووسی بە ناوی (سوورەتێکی تری مەرگ) کە لە چلەی شەهیدانی یەکی شوبات لە رۆژنامەی کوردستانی نوێ بڵاو بووەوە، هەروەها لە ۲۰۰٤/۳/۲٦ لە ژمارە ۳۳۲٥ هەمان رۆژنامە بابەتێکم لە ژێر ناوی (یەکێتی و پارتی بە تەمای چین ؟) بڵاوکردەوە، هەروەها کە هێشتا هەر لە خەستەخانە بووم بۆ دوا لاپەڕەی کوردستانی نوێ کورتە نووسینێکی ترم نووسی لە ژێر ناوی (چۆن دەتوانین دەستی رەشی تیرۆر ببڕین)، کە لە دوا لاپەڕەی ژمارە ۳۳۰۱ لە ۲۰۰٤/۲/۲٤ بڵاو کرایەوە، کە ئەمەش دەقەکەیەتی:

**چۆن دەتوانین دەستی رەشی تیرۆر ببڕین**

کارەساتە گەورەکەی ۱/ ی شوبات لە رووی ستراتیژییەوە قەوارەیەکی گەورەی بۆ هەلومەرجە سیاسییەکانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد دیاری کردووە، بێ ئەوەی سەرکردایەتی سیاسی کورد ئاگای لە دەور و رەهەند و ماهیەت و قەوارەی خۆی هەبێت، چونکە بەر لە هەموو شتێک ئێمە سەرکردایەتییەکی یەکگرتوومان نییە، دوو ئیدارەی لێکترازاو دوو هەڵوێست، زۆر جار لێکنەچوو زۆر جار جیاواز، بەڵام دوژمنانی کورد چ گروپە تیرۆریستییە ئیسلامییەکان چ شۆڤێنیستە عەرەبە توندڕەوەکان چ پاشماوە دۆڕاوو سەرشۆڕەکانی رژێمی لەناوچوو لە ئاستی دوژمنایەتی کردنی کورد، ستراتیژیەتی کورد، یەکگرتوو تەبا و یەکدەست، ئەوان زۆر جدین، زۆر بە وردی بەرنامە دادەڕێژن تا رەوشی کورد بشێوێنن، بەڵام کورد بۆ خۆی زۆر شەرمن و سەرەڕۆیە لە بەرامبەر رووداوەکان لە چاو توندوتیژی دوژمنان، بۆ کورد ئەمڕۆ باشترین چەک کە بتوانێ بەرگری پێ لە خۆی بکا یەکگرتنەوەو یەک ئیدارەییە یەک هەڵوێستی روون و ئاشکرایە، کە بەمە پێگەی کورد بەهێزترو کاریگەرتر دەبێت. تەمەڵی کردن و پشتگوێ خستنی یەکگرتنەوە تاوانێکە و بە دەستی خۆمان دژی خۆمان ئەنجامی دەدەین، بەڕای من بەر لە هەموو شتێک هەوڵی تێکەڵکردنەوەو دروستکردنەوەی حکومەتێکی نوێی یەکگرتوو دەبێت دەستپێکی کاری سەرکردایەتی سیاسیی کورد بێ، حکومەتێک بە مەرجێک پڕ بێت لە دەستکەوت و خزمەتگوزاری و تێکەڵی ژیانی خەڵک بێ، واتا حکومەت ژیان و گوزەرانی هاوڵاتیانی خۆی باش کرد و چاودێری باری ژیانیان بوو، ئەوا هەموو تاکێک لە کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان، وەک کارمەند و کادیرێکی ئاسایش بەرامبەر بە ئەرکە نیشتمانی و نەتەوەییەکانی خۆی بە بەرپرسیار دەزانێ واتا دەبێ هاوڵاتیان لە خەم و ئازارەکانی نیشتمان نزیک بکرێنەوە و یەکڕیزی لەناو میللەتدا دروست بکرێ، بۆ ئەوەی هاوڵاتیان هاوکاری یارمەتی زیاتر بە حکومەت پێشکەش بکەن، بێگومان بمانەوێ و نەمانەوێ ئەم هاوکاری و هەماهەنگییە بە بەرامبەرە گەر حکومەت پڕ خزمەتکردن و چالاکی بێ بەرامبەر هاوڵاتیان، ئەوا بێگومان ئەوانیش پڕ هاوکاری و یارمەتی و هەماهەنگی دەبن دەتوانن بە جوانترین شێوە دەوری ئاسایش ببینن، کە ئەمەش خاڵێکە بۆ دابینکردنی ئاسایشی نەتەوەییمان. با بۆ یەکگرتنەوە و یەک ئیرادەیی و یەک ئیدارەیی خۆمان دوا نەخەین هەر چەند زوو بێن هەر درەنگە.

هەروەها لە ۲۰۰٤/۷/۲۰ لە ژمارە ۳٤۲٤ بابەتێکم لە لاپەڕەی ئازاد لە کوردستانی نوێ لە ژێر ناوی (کێ بەرپرسە لە ئایندەی کورد) بڵاوکردەوە، کە تیایدا دەڵێم هیچ بروبیانوێکی مەنتیقی نەماوە بۆ یەکنەگرتنەوەی ئەم

دوو ئیدارەیە، تەنیا بەرژەوەندییە حزبییە تەسکەکان و بەرژەوەندی هەندێ لە کەسایەتییەکان نەبێت، ئایا ڕەوایە لەم دۆخە ناسکەدا کێشەی ڕەوای گەلێک بە قوربانی حیزبێک و لایەنێک و کەسانێک بکرێت؟.

دوای ئەوە من لە ٢٠٠٤/٨/٢٨ لەسەر بڕیاری جەنابی مام جەلال نێردرامە دەرەوەی وڵات لەگەڵ کوڕەکەم زیشار بە مەبەستی چارەسەر و نەشتەرگەری، چووین بۆ یۆنان حەوت مانگ لەوێ بووین و دوایش چووینە ئەڵمانیا، بەر لە ڕۆیشتنم بۆ یۆنان شیعری (قاچێک بۆ شمشاڵ)م نووسی، کە لە ٢٠٠٥/٢/١٠ لە پاشکۆی (ئەدەب و هونەری) کوردستانی نوێ بڵاوکرایەوە، هەروەها لە یۆنان بابەتێکم نووسی لە ژێر ناوی (خوێنی بە ناهەق ڕژاوی یەکی شوبات چی لێ کەوتەوە)، کە لە ئەسیناوە بە فاکس ناردم بۆ کوردستانی نوێ و لە ژمارە ٣٥٨٥ لە ساڵیادی ١ / ی شوبات ٢٠٠٥ بڵاو کرایەوە. کە بەشێکی ئەم نووسینە لێرەشدا بڵاو کراوەتەوە.

هەروەها لە دووەمین ساڵیادی ١/ ی شوبات ستوونێکم لە کوردستانی نوێ بڵاو کردەوە لە ژێر ناوی (یەکی شوبات و کڵاوڕۆژنەی یەکگرتنەوە)، کە لە ژمارە (٣٨٨٥) لە ٢٠٠٦/٢/١ دا بڵاوکراوەتەوە.

هەروەها لە دوای تەقینەوەکەی مەخموور وەزارەتی ناوخۆ بابەتێکی ترم بەناوی (تیرۆر، حکومەت، گەل) لە ژمارە ٤٢٨٤ لە ڕۆژی ٢٠٠٧/٦/٣ هەر لە کوردستانی نوێدا بڵاو کردەوە، کە بەشێکی کراوەتە پێشەکی ئەم لێکۆڵینەوەیە. تیرۆریستان لە قیامەتەکەیاندا چ وەڵامێکی من دەدەنەوە!

ئەمەو پێویستە ئاماژە بەوەش بکرێ کەوا کارەساتی ١/ی شوباتی ٢٠٠٤، یەکەم کردەوەی تیرۆریستی نییە دژ بە گەلەکەمان و شاری هەولێری هۆلاکۆ بەزێن کرابێت.

**هەولێر و تیرۆر**

مادام لێکۆڵینەوەکەمان تایبەتە بە هەولێر و کاریگەری دەستی تیرۆر لەسەر تێکدانی ڕەوشی ئەم شارە مێژووییە پێویستە وردتر بچینە ناو بابەتەکە و جگە لە کارەساتی ١/ی شوباتی ٢٠٠٤، ئەو یادەوەرییە تاڵ و جەرگبڕانەش بخەینەوە بەرچاو باسی ئەو کارەسات و تەقینەوەکانی بەر لە ڕاپەڕین و دوای ڕاپەڕینیش بکەین کە لە هەولێر ڕوویانداوە، کە ژمارەیان زیاتر لە ٢٠ کردەوەی تیرۆریستییە.

١- تەقاندنەوەی گازینۆ باکوور لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٤ کە ئەو گازینۆیە لە نزیک دەرگای قەڵات بوو، ئەوسا دەکەوتە بەرامبەر چاپخانەی مەچکۆ خاوەنەکەی ناوی مام بیلال بوو، کە تیایدا پێنج شەهید و زیاتر لە دە بریندار لێکەوتەوە، کە هەندێکیان سەربازی ڕژێم بوون لەو کاتە بۆ پشوودان هاتبوونە ناو گازینۆکە. ئەم ڕووداوە بە دەستی سیخوڕەکانی ڕژێم بوو، بەر لە تێکچوونی ڕێککەوتننامەی ١١ی ئادار و بەر لە دەستپێکردنەوەی شۆڕش لەدژی ڕژێم لە ساڵی ١٩٧٤ ڕوویدا.

٢- تەقاندنەوەی کەبابخانەی سەید میکائیل کە بەیانی زوو خاوەن کەبابخانە دەچێت دوکانەکەی بکاتەوە، لەگەڵ کردنەوەی قەپەنگی دوکان تەقینەوەکە ڕوودەدا. مام سەیدی کەبابچی و کوڕێکی شەهید دەبن و کوڕێکی تریشی بەناوی شێرزاد شێت دەبێت. ئەم ڕووداوەش هەر لە ساڵی ١٩٧٤ ڕوویدا.

٣- تەقاندنەوەی ئۆتۆمبێلێکی جۆری بەرازیلی لەبەردەم چێشتخانەی (مشوار)، لە بازاڕ نزیک قەڵا. لە ١٩٩٣/١/٢٣ کە لە ئەنجامدا شەش کەس شەهید و بەدەیانیش بریندار بوون، کە ئەمەش هەر بەدەستی بەکرێگیراوەکانی ڕژێم بوو.

٤- تەقینەوەیەک لەناو گەراجی مەنتکاوە و گەڕەکی ٩٢ کە لەناو ماڵان بوو، کەسێک کوژرا و سێ کەسیش بریندار بوون.

٥- کوشتنی فەرەنسۆ هەریری ئەندامی سەرکردایەتی (پ. د. ک) لەلایەن کۆمەڵی تەوحید لە ٢٠٠١/٢/١٨ لە هەولێر بە شێوەی تیرۆری غافڵکوژی.

٦- دانانی بڕێک tnt لەناو سندوقی پایسکیلێک و تەقاندنەوەی لەبەرامبەر چاپخانەی مام حەسەن نزیک تەکیەی شێخ عارف بەرزنجی لە کۆڵانی بەرامبەر باتا لە ساڵی ٢٠٠٢ کە حەوت کەس شەهید بوون و بیست و چواریش بریندار بوون.

٧- تەقینەوەیەک بەماددەی tnt لەناو باخچەی گازینۆ بروسک لە ساڵی ٢٠٠٢ کە بیست و نۆ هاوڵاتی تێدا بریندار بوون.

٨- تەقاندنەوەی ئۆتۆمبێلێک لە شەقامی شۆڕش نزیک بارەگای ڕێکخراوێکی ئەمریکی لە ٢٠٠٣/٩/١٠دا. کە زیانێکی زۆر بە ماڵەکانی دەوروبەری ڕێکخراوەکە گەیاند.

٩- لە ٢٠٠٣/١٢/٢٣ تەقینەوەیەک لەبەردەم وەزارەتی ناوخۆی حکومەتی هەرێم لە سەرووی یاریگای هەولێر کە پێنج شەهید و پازدە بریندار لێکەوتەوە، جێی ئاماژەیە لە ٢٠٠٣/١٠/١٦ هەوڵێکی خۆکوژی لە بەردەم هەمان وەزارەت پووچەڵ کرایەوە و خۆکوژەکەش کوژرا کە ناوی (ابو البراء العتیبی) بوو، ئۆتۆمبێلێکی سوپەری تەکسی پێ بوو، نەیتوانی بیتەقێنێتەوە و کوژرا.

١٠- کارەساتی ١/ی شوباتی ٢٠٠٤ لە مەڵبەندی سێ و لقی دوو لە هەولێر لە یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان کە ١٠٦ شەهید و زیاتر لە سەد و سی (٢٤٦) برینداری لێکەوتەوە.

١١- لە ١/ی شوباتی ٢٠٠٥ نزیک فلکەی کوران تەقینەوەیەک ڕوویدا لە ئەنجامدا دوو کەس لە کارمەندانی هێزەکانی ناوخۆ شەهید بوون.

١٢- لە ٢٠٠٥/٥/٤ کاتژمێر ٩. ٣٠ بەیانی لەبەردەم بارەگای ناوچەی هێزەکانی ناوخۆ خۆکوژێک خۆی تەقاندەوە لەنێو قەرەباڵغییەکی گەنجاندا کە بۆ وەرگرتنی تەسکیەی حزبی بە مەبەستی دامەزراندن لە ڕیزەکانی پۆلیسدا ریزیان بەستبوو، لە ئەنجامدا (٥١) کەس شەهید و (٧٠) برینداری لێکەوتەوە، کۆمەڵەی ئەنسار سونە بەرپرسیارییەتی خۆیان لەم تەقینەوەیە ڕاگەیاند لەسەر هێڵی ئەنتەرنێتەوە.

١٣- تەقینەوەی لۆریەکی بار هەڵگر لەبەردەم بینایەی نوێی وەزارەتی ناوخۆ نزیک ئاسایشی گشتی هەولێر لە ٢٠٠٧/٥/٩ کە (١٥) شەهید و (٩٠) برینداری لێ کەوتەوە.

١٤- تەقینەوەی بازاری شێخەڵڵا، لە ١٩٩٢/٣/١٦.

١٥- تەقینەوەی بازاڕی شێخەڵڵا، لە ١٩٩٢/١١/١.

١٦- کردەوە تیرۆریستییەکەی هاوینەهەواری گەلی عەلی بەگ، لە ٢٠٠٢/٦/٧.

١٧- کردەوەکەی قوتابخانەی تەبایی لە باداوە، لە ٢٠٠٣/٩/٦.

١٨- کردەوەکەی فلکەی زراعە، کە لیوا جوامێری بەرکەوت لە ٢٠٠٣/١٢/٢٨.

١٩- تەقینەوەکەی سێتاقان، پشت نەخۆشخانەی ڕەسولی تایبەت، لە ٢٠٠٤/٥/١٥.

٢٠- تەقینەوەکەی نزیک هۆڵی زەرد، کە بۆ مەحمود محەمەدی ئەندامی مەکتەبی سیاسی (پ. د. ک) دانرابوو، لە ٢٠٠٤/٦/٢٦.

٢١- تەقینەوەکەی یاریگای هەولێر، نزیک گەڕەکی ئازادی، لە ٢٠٠٥/١/١٩.

جگە لەوە کۆمەڵێک کردەوەی تری تیرۆر و تەقاندنەوە و کاری خۆکوژی و هەوڵی ڕفاندنی کادیران و فەرمانبەرانی ڕێکخراو و (N.G.O)یەکان و خەڵکی بیانی دراوە، هەروەک ئەوانەی لە چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین و تەقاندنەوەی ساڵۆنەکانی ئارایشتگای ژنان و گازینۆ بەیان و چێشتخانەی نێرگز و گەلێ ڕووداوی تر.

جگە لەوە گروپەکەی شێخ زانا، کە لە شێخ زانا و (١٢) تاوانباری تر پێکهاتبوو، کە لە ساڵی (٢٠٠٦) لەناو شاری هەولێر گیران و دوای ئەوەی کۆمەڵێک خەڵکی بێ گوناهیان سەر بڕیبوو، لاشەکانیشیان پارچە پارچە کردبوو، دوای گیران و دادگایی کردنیشیان زۆربەیان حوکمی لە سێدارەدانیان بەسەردا سەپێنرا.


سامی عەبدولڕەحمان


شاخەوان عەباس


خەسرۆ شێرە


سەعد عەبدوڵڵا


شەوکەت شێخ یەزدین


دیدەوان سەید محەمەد


ئەکرەم مەنتک


قادر قەرەچووغ


بەکر جۆڵا



مەهدی خۆشناو



خەسرۆ عوسمان



نەریمان عەبدولحەمید



ملازم محەمەد



هاوار رەحمان



نەوزاد رەجەب



ئیسماعیل شێخ محەمەد



مەحمود هالۆ



هیوا تاریق


وریا قادر


ماهیر قەرەنی ئاغا


زەردەشت مەهدی خۆشناو


ئاسۆ موعەلیم


ئەحمەد رۆژبەیانی


خەبات شەریف


شوان حەمە سالح


ئیدریس سنجاوی


سلاح سامی عەبدولرەحمان


خالید مەلا نەعمان


خەسرۆ سمایل


سەباح حەیدەر


عەلی محەممەد برا کاکەیی


هۆگر شێخ رەقیب


عامرعەبدوڵلا شەریف


جەعفەر عەبدولمەجید


فەریق تۆفیق ئەحمەد


دارا محەممەد حوسێن جاف



زرار عەبدوڵلا میرۆزی



نەقیب باران جەودەت ئەحمەد



جەلیل خدر رەوەند



حەسەن ئەحمەد پیرە



زریان باسم



باسم حەسەن پیرە



عەبدوڵلا سلێمان



بڕوا خەلیل هیدایەت



کامەران عەبدوڵلا سابیر


حەسەن حوسێن ئاومالی


مەغدید حەمەد ئیسماعیل


فەرهاد ئەحمەد رەواندزی


عەدنان محەمەد حەلاق


هاشم عەزیز


فاتیح زراری


کانەبی عوسمان رەسول


سەلاح سەلیم سەیدۆک


غەریب محەمەد



ئەیوب محەممەد



جەمشید خورشید



مەلا عەبدوڵلا مەولود



حوسێن حاجی مستەفا



ئەحمەد حاجی نۆغەرانی



زاهیر شۆڕژ



حیکمەت عەزیز (نەبەز)



هێمن حەمە ساڵح



هیوا خەلیل مەولود



هێدی جەبار



کامەران محەممەد عومەر



سەفیر نادر رەشید



شەمسەددین سلێمان حوسێن



فوئاد جەوهەر حەمەدەمین



ناسیح سەلیم بلباس



حەسەن ئەحمەد بانی مارانی



حوسێن ئەحمەد مامەشێخ



یوسف مستەفا



مەعروف عەبدولغەنی

هەیسەم سۆلاقا

ماجید بویا



عەبدولستار کەریم

شوان سەید کاکە

عەلی رەشید بەکر



هۆگر فاروق

سەلام حوسێن وەیسی

ئارام سەباح حەیدەر



تاریق ئیبراهیم



عەزیز ئەنوەر حوسێن



جوتیار عەبدوڵڵا



سەعید محەممەد سەعید



یاسین لێری



رەزا حەممەدەمین رەزا



جوتیار شەمسەدین موحسین



سمکۆ کەریم محێدین



هەلمەت کەریم


شەوکەت ئالکان


دانا ئەبوبەکر حوسێن


حاجی لوقمان عومەر


بەهرۆز حەمەد قەشقە


ئەنوەر حەمەدەمین


شێخە محەمەد عەزیز


مام موسلیح عەبدوللا


هۆشەنگ زەیتۆ


عەبدولواحید مستەفا خۆشناو



ژنانی جەرگ سووتاوی کورد لە کارەساتی (۱ی) شوباتی شوم ۱-۲-۲۰۰٤

سەرچاوەکان:

١- ژمارە ٤٢٨٤ رۆژنامەی کوردستانی نوێ (تیرۆر، حکومەت، گەل) نووسینی قاسم شێروانی ٢٠٠٧/٦/٣

٢- موسوعە الارهاب - بەرگی یەکەم (الارهاب) پشتیوان سادق - ٢٠٠٦- هەولێر- چاپخانەی حاجی هاشم

٣- لێکۆڵینەوە لە ئیسلامی سیاسی- نیاز سەعید عەلی بڵاوکراوەی مەکتەبی بیرو هوشیاری ی- ن - ک سلێمانی.

٤- مێژووی پەیوەندییە نهێنییەکانی نێوان پشتیوانانی ئیسلام و رێکخراوی قاعیدە، حەسەن یاسین، مەکتەبی ناوەندی راگەیاندنی (ی. ن. ک) ٢٠٠٦- چاپخانەی شەهید ئازاد هەورامی- کەرکووک.

٥- واعیزەکانی سوڵتان - عەلی وەردی - و: عەبدوڵلا جەبار.

٦- لەبارەی ئیسلامی سیاسی (کورتە باسێک) شەهید دیدەوان سەید محەمەد - لە بلاوکراوەکانی مەکتەبی بیرو هوشیاری ی - ن - ک سلێمانی.

٧- سەید قوتب و تیۆریی تەکفیرکردنی کومەڵ و دەوڵەت / فەرید ئەسەسەرد بلاوکراوەکانی مەکتەبی بیرو هوشیاری ی - ن - ک، سلێمانی

٨- ئیسلامی سیاسی / شوان ئەحمەد. چاپی سێیەم/ لە بلاوکراوەکانی مەکتەبی بیر و هوشیاری (ی. ن. ک)/ سلێمانی.

٩- دیموکراسی و دوژمنانی / مەلا بەختیار - سلێمانی- ٢٠٠٦- چاپخانەی دلێر.

١٠- الارهاب في كوردستان / موسوعە الارهاب بەرگی سێیەم - پشتیوان سادق. ٢٠٠٦- چاپخانەی حاجی هاشم.

١١-کوردستانی نوێ ژمارە ٣٥٨٥ رۆژی ١/٢/٢٠٠٥ ل٧ - (خوێنی بە ناهەق رژاوی ١/ ی شوبات چی لێکەوتەوە) نووسینی قاسم شێروانی.

١٢- ساڵنامەی ١/ ی شوبات ٢٠٠٧ - ناوی شەهیدەکان.

١٣- الارهاب: الظاهرة وابعادها النفسية، د. ماجد موریس ئیبراهیم/ بیروت.

١٤- ریشە و بنچینەکانی توند و تیژی ئایینی. سەروەر عەبدولڕەحمان پێنجوێنی، سلێمانی ٢٠٠٧.

١٥- ساڵنامەی یەکی شوبات، ژمارە ١ ئاداری ٢٠٠٤- بە بۆنەی چلەی شەهیدانی یەکی شوبات، ٢٠٠٤.

١٦- گۆڤاری رێگا، ژمارە (٤)، ١٠/١٠/٢٠٠٨ چاوپێکەوتن لەگەڵ مەلا سەدیق عەبدولعەزیز، بەشی یەکەم.

١٧- گۆڤاری سەروەری، ژمارە ١١ ساڵی ٢٠٠٤، دەزگای شەهیدانی شۆڕشی گەلی کوردستان. رێوشوێنەکانی بەرپەرچدانەوەی تیرۆریزمی ئیسلامی، فەرید ئەسەسەرد، هەروەها دیدارێک لەگەڵ رووناکبیر فوئاد مەجید مسری.

١٨- گۆڤاری گوڵان، ژمارە (٧٢٠)، ٩ی شوباتی ٢٠٠٩.

**١٠ / ٦ / ٢٠٠٨- هەولێر**



# کۆتەڵی شەهیدانی (١)ی شوباتی ساڵی ٢٠٠٤

ئا: ئینسکلۆپیدیا

* پێناسە:
کۆتەڵی شەهیدانی (١)ی شوبات (مۆنیمێت- Monument) یەکە بۆ ڕێزلێنان و بەرزڕاگرتنی یادی شەهیدانی کارەساتی (١)ی شوبات بەشێوەیەکی هاوچەرخ و مۆدێرن لەناو پارکی (سامی عەبدولڕەحمان) لە هەولێر بنیات نراوە، یەکێکە لە کارە گرنگ و پڕ مانا و بەهاکانی خۆشەویستی خاک و گەل ونیشتمان، جگە لەوەی ئەم کۆتەڵە بەشێوەیەکی ئەندازیاری و هونەری بەرز ئەنجامدراوە، بۆتە بەشێکیش لە مێژووی سیاسی گەلەکەمان، چونکە ئەوانەی لەم کارەساتەدا شەهید

کران لە هەموو چین و توێژەکانی گەلی کوردستان بوون بەبێ جیاوازی، کارەساتەکەش دژ بە ئەزموون و گەلی کوردستان بوو.

*** بیرۆکە:**

بیرۆکەی ئەم کارە لە ئەنجامی پێشنیارێکی خاتوو (فەوزیە ئەمین عەبدولڕەحمان) بووە، لە دوا لاپەڕەی ڕۆژنامەی (خەبات)ی ڕۆژی ٢٠٠٤/٣/١٣ بڵاوکرابۆوە. داوای دروستکردنی (دیواربەند - مۆنیمێنت) ێکی کردبوو بۆ یادکردنەوەی شەهیدانی کارەساتەکە.

*** بوودجە:**

بوودجەی ئەم پرۆژەیە لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستان دابینکراوە و هەروەها لە ڕێگەی وەزارەتی شارەوانی بە نوسراویان ژمارە (٧٥١٤) لە ٢٠٠٥/٧/١١ جێبەجێکردنی ئەم پرۆژەیە بە کۆمپانیای (Tas yapi) ی تورکی سپاردووە بە گوژمەی (١٤٤٦٦٢٥) یەک ملیۆن و چوارسەد و چل و شەش هەزار و شەش سەد و بیست و پێنج دۆلار. بە سەرپەرشتی کردنی لێژنەیەکی تایبەت لە سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران کارەکە ئەنجامدراوە.

*** لێژنەی دیزاین و سەرپەرشتی کارەکە:**

دیزاین و سەرپەرشتی کردنی کارەکە لەلایەن لێژنەیەکی تایبەت لە سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیرانەوە بووە، لێژنەکەش بەسەرۆکایەتی ڕۆژنامەنووسێک و ئەندامیەتی چەند ئەندازیار و هونەرمەندێک بووە، بەڵام لەبەرئەوەی ناوی بەڕێزانی لێژنەی دیزاین و سەرپەرشتی کۆتەڵەکە لەسەر پرۆژەکە تۆمار نەکراوە و بۆ وونەبوونی مافی هیچ کەسێک و ڕاستییەکانیش وەک خۆیان بۆ مێژوو تۆمار بکرێت بۆیە بە پێویستی دەزانین لێرەدا ناوەکان تۆمار بکەین بەم شێوەیەی خوارەوە بووە:

١- مەهدی عەباس قادر - ڕۆژنامەنووس - سەرۆکی لێژنە.
٢- عیماد ئەحمەد نەجار - ئەندازیار - ئەندام
٣- بورهان عوسمان گەردی- ئەندازیار - ئەندام
٤- کامەران عەبدولکەریم - ئەندازیار - ئەندام
٥- فارس سەعدی - ئەندازیار - ئەندام
٦- سەربەست عومەر - هونەرمەند - ئەندام
٧- هۆشەنگ عەبدولڕەحمان - هونەرمەند - ئەندام

* لە کۆتاییدا ئەوە ماوە بڵێین ڕۆژی دانانی بەردی بناغەی ئەم کۆتەڵە لە ڕێکەوتی ٢٠٠٥/٤/٢٧، لەلایەن خودی بەڕێز نێچیرڤان بارزانی سەرۆکی حکومەتی هەرێم و سەرجەم خانەوادەی شەهیدانی کارەساتەکە دانراوە، هەروەها لە ڕۆژی ٢٠٠٦/٤/١، بەهەمان شێوە لەلایەن خودی سەرۆکی حکومەتی هەرێم و سەرجەم خانەوادەی شەهیدانی کارەساتەکە لە مەراسیمێکی شایستە لە پارکی شەهید سامی عەبدولڕەحمان لە هەولێر کرایەوە.

# ڕەواندز

**بۆ کورد پەروەران...**
**تۆپی ڕەجەبە بۆ ڕۆشنبیران...**
**زاری کرمانجییە بۆ ئاشقانی**
**ناکام... خەرەندە**

ڕەواندز شارێکی مێژوویی باشووری کوردستانە، پایتەختی میرنشینی سۆران بوو، بە ١١٣ کیلۆمەتر لە شاری هەولێری پایتەختی کوردستانەوە دوورە، کەوتووەتە ڕۆخ ڕێگای ستراتیژی هاملتۆن، کە هەولێر و سنووری ڕۆژهەڵاتی کوردستان بەیەکتر دەبەستێتەوە.

ڕەواندز قەزایەکی پارێزگای هەولێری سەردەمی پاشایەتی و کۆماری و ناحیەیەکی سەر بە قەزای سۆرانە لە سەردەمی حوکمی بەعس تاکو ئەمڕۆ.

لە قەدپاڵی بەرزاییەکی شاخاوی نێوان خەرەند و سەرەتای گەلی و گەردە گەرد و شوێنێکی سەختی هەیە، چەند چیایەکی بەرز لە سێ لاوە دەوریان داوە، لە باکوور و باکووری ڕۆژهەڵاتی چیا



بەرزەکانی زۆزک و هەندرێن، لەلای باشوور چیای (کۆرەک) بەرز بۆتەوە. لەلای خواروو و ڕۆژئاوایشی بە دووری ١٠ کیلۆمەتر تاڤگەی بێخاڵ هەڵکەوتووە، کە خۆشترین هاوینەهەواری کوردستانە و لەگەڵ هاوینەهەواری جوندیان، کە کەوتووەتە دامێنی چیای هەندرێن، نرخێکی گەشتوگوزاری باشیان بە شار و ناوچەکە داوە.

ناوی ڕەواندز لە دوو برگە پێکهاتووە (ڕەوان) یان (ڕەوەن) کە سووککراوەی (ڕەوەند)ە، ئەمەش بە مانای کۆچەر دێت، لەگەڵ برگەی (دز) یان (دژ) کە بە مانای (قەڵا) دێت و بە هەردوو برگەکە مانای (قەڵای ڕەوەندان یان کۆچەران) دێت و لێکدانەوەی دیکەش هەڵدەگرێ...

مێژوونووسی کورد حوزنی موکریانی لە ژمارە (٢)ی ساڵی ١٩٢٦ی گۆڤاری زاری کرمانجیدا، لە بارەیەوە نووسیویەتی و دەڵێ: (ڕەواندز پایتەختی میرانی سۆران و پەناگەی زۆرلێکراوانی پارچەکانی دیکەی کوردستان، لە سەردەمی محەمەد پاشا ئەستێرەی بەختی لەگەڵ مانگ و ڕۆژ پێشبڕکێی دەکرد و لە هەموو لایەک میر و حوکمڕانەکان بە ڕووگەی هیوا و ئاواتی خۆیان دەزانی، خان و بازاڕەکەی پڕ لە کوتاڵ و کەلوپەل بوون، شوورەکی قایمی بە قۆنگر و قەڵای هەبوو".

لە سەردەمی محەمەد پاشای گەورە پیشەسازی چەک

دروستکردن، بەتایبەتی دارشتنی تۆپی گەورە چاک پێشکەوت و کارگەی ئەو چەکە قورسانە لە کاولۆکان دامەزرا و لە ژێر چاودێری و سەرپەرشتی وەستا رەجەبی بلیمەت، کەوتە کار و گەلێک تۆپی زلی دارشت.

### موزیک لە رەواندز

ئێمە وەکو لێکۆڵەر و شەیدای گەران بەدوای سامانە هونەرییەکانمان دەبێ هەموو سەرچاوەیەکی نووسراو و بیستراو و مادی بە زمان بێنین، لەوانە: باپیرە ساڵحی حاجی نەورۆزی مستەفای کوڕی (وەستا رەجەب)ی تۆپچی بۆی باس کردین، کە چۆن لە دەوروبەری سالآنی (١٩٢٠) بەدواوە کاتێ هێزە عەسکەرتارییەکان هێرش دوای هێرشیان دەهێنایە سەر ئەو قەلا سەختەی کوردەواری و بەردەوام دەیانویست پێگەیەک بۆ پۆستاڵە رەشەکانیان دابنێن. لەو ساتەدا و لە نمایشی عەسکەری بۆ یەکەمین جار بە دەنگی (بوق و دەهۆڵ) خەڵک بانگ کراوە بۆ بانگی ناهەق.

لە رەواندز و دوای حوکمی (سەید تەها شەمزینی) و ئەوەی لە پیاو ماقوولان و رۆشنبیرانی ئەم شارەمان بیستووە، وەکو خوالێخۆشبوان: (سەبری نەجیب حاجی نەورۆز) و (شێخ سلێمان مستەفا ئەفەندی) رواندز هەمیشە مەنزڵگای رۆشنبیران بووە و پاش ئەوەی، کە سەرقافڵەی فیکرو ئەدەب (حوزنی موکریانی) چاپخانە و هەگبەی داهێنەرانی لە رواندز خست، جموجۆڵێکی گەورە کەوتە نێوەندی شار. ئەوە بوو لە ناوەراستی سالآنی (سی)دا شانۆگەری (نیرۆن) نمایش کراوە و دواتریش بە بەردەوامی چالاکی هەمەجۆر هەبووە و لە نێو یادەکانیشدا هەمیشە گرنگییەکی تەواو دراوە بە یادی نەورۆز و بۆنە نیشتمانییەکان و لە قوتابخانەکانیشدا بەتایبەت قوتابخانەی پاشای گەورە، کە پێش نزیکەی (٨٠) ساڵ لەمەوبەر دامەزراوە، سروودە نەتەوەیی و نیشتمانییەکان دەنگ و سەدای لاوان بوون. دوای ئەوەی مامۆستا (سەردار بێبەخت)، وەکو هونەرمەند و خەمخۆرێکی گەورە و پەرۆشی بواری میوزیک و گۆرانی هاتۆتە رەواندز، چەند بەهرەمەندێکی چاکی لەخۆ کۆکردۆتەوە و بە ئامێرە موزیکییەکان توانیویانە کلّپە و حەز و ئارەزووەکانیان دەربرن، لەوانە (هونەرمەندان زرار محەمەد مستەفا و سەردار محەمەد عەلی و شاکر سابیر و کاک عوسمان و ساللار سەبری و فەوزی جەودەت) و کۆمەڵێ لاوی دیکەش. هەرگیز ئەم رۆژانە لە یاد ناچن، کە پێش (٢٩) ساڵ لەسەر دەستی رابەری هونەر لە رەواندز مامۆستا زرار محەمەد، کۆمەڵێ بەهرەمەند بۆ یەکەمین جار ئامێرەکانی (کەمانچە و عود و ئۆکۆردیۆن و گیتار و ئۆرگن و دەهۆڵ)مان گرتە باوەش و بەشێوەیەکی ئەکادیمی و بەزمانی نۆتە فێری موزیک بووین و هەر دوای ساڵێک لەگەڵ منالآنی هەولێر لەسەر ئاستی (عێراق) لە چالاکی قوتابخانەکانی هەولێر لە بواری گۆرانی و موزیکدا بە یەکەم دەرچووو!!. دوای ئەوەی هونەرمەندان کەوتنە قۆناغی ناوەندی، تێکرا بریاریاندا بچنە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی موسڵ.

تیپی موزیکی (پاشای گەورە) دامەزرا، کە سەر بە کۆمەڵەی هونەر و وێژەی کورد بوو. ئەم تیپە لە ماوەیەکی کورتدا و پاش مامەڵەکردنی لەگەڵ بابەتە میللی و فۆلکلۆرییەکاندا، کۆمەڵێ بەرهەمی رەسەنی گۆرانی و بەیت، بالۆرە و لاوک و لاواندنەوەی تۆمار کرد، ئەم تیپە بووە قیبلەنوما و سەرنجی هونەرمەندانی هەموو کوردستانی بۆ خۆی راکێشا. ئەوە بوو ئەم تیپە لە ساڵی (١٩٨٩) و لە گەرمەی شالآوی سەرکوتکردنی شۆرش، بەرهەمی نۆبەرەی تیپ بۆ هونەرمەندی رۆژهەڵاتی کوردستان، کاکە (نەجمەی

غـولامی) تۆمـار کـرد، بە نـاوی (پـایز) دواتر پێـشـوازی لە هونەرمـەندانی پایە بەرز (شـڤـان پەروەر و ناسری رەزازی و مەرزیە) و دەیان هونەرمـەندی دی کـراو بەرهەمی بەپێـزیان بۆ تۆمـارکـرا. وەلـێ دوای راپـەریـن و لـەبـەر پەرتەوازەیی هونـەرمـەنـدان و مەشـغـەڵەتی ژیان و کـەوتنە نێـو داوی حزبایەتییـەوە چالاکی تیپ بەربەرە بەرەو لاوازی رۆیشت تـا کار گەیشتە ئەوەی چالاکییەکـان نەمان!!.

بـەڵام ئـەوە نـزیـکـەی (٣٠) ساڵە بە بەردەوامی خولی فێربوون و نزیکبـوونەوە لە هونەری رەسـەن لە هەموو بوارەکانی ژیاندا (شانۆ، شێوەکاری، خۆشنووسی، موزیک، ئەدەب) بە بەردەوامی دەستگرتنی دەسـتـەی بەڕێوەبەری کـۆمـەڵەی هونەر و وێژە و هونەرمـەنـدانی لەخـۆبردوو و لـە سـەرووی هەمـووشـیـانەوە (مـامـۆسـتـای هونەرمەند زرار محەمەد مستەفا) کوڕان و کچانی شار بەردەوامن لە چالاکی و بگرە هەر خـانەوادە و مـاڵێکی رەواندزییـان، ئێـسـتـا هونەرمـەندێکی تێدایە، مـوژدەی ئەوەش دەدەین، کە تیـپی پاشـای گـەورە لە مـاوەیەکی نزیکدا بە هەیبـەت و قـورسی و گـەورەیی جـارانی، دووبارە دێتـەوە نێـو گـۆڕەپانی رەسـەنی پاڵپـشت بە هاوچەرخێتی ئەمڕۆ.

**داستانی شاری خەرەند**

سێ بەشی شـاری رواندز بەو خـەرەندە گـیـراوە، لە بەشی رۆژئاواوە، لە دەشتایی (بیـرۆیی) دەست پێدەکا، تا دەگـاتە گـوندی کـاولۆکـان، واتە بەدرێژایی بناری چیـای هەندرێن، دیسـان لە گوندی کـاولۆکـانەوە درێژ دەبێـتـەوە، تا دەگـاتە شـاخـەکـانی گـەلی عـەلی بەگ. ئەو زنجـیـرە خـەرەندە وای کردووە، کە رەواندز وەک شارێکی عاسێ بێتە بەرچاو، جاران تەنیا لە خـاڵی بەیەکگەیشـتنەوەی خەرەندی هەندرێن و گـەلی عـەلی بەگ، خـەڵکی توانیـویانە بچنە رەواندز ئەویش بە یارمـەتی ئەو پردەی، کـە لە کـاولۆکـان دروست کرابوو.

مـنـداڵ زۆر لـە خـەرەنـد دەترسـێت، لەبەر ئەوەی زۆریان بۆ باس کـردوون، هەست دەکـەن خەرەند زۆر لێیان نزیکە و بەردەوام چاوەڕێی دیداریانە. پێـتـان سـەیر نـەبێ چەند لێی دەترسـێن، ئەوەندەش هۆگـری دیتنی بوون، لەگەڵ داستانە پڕ کارەسات و سەیر و سـەمـەرەکانی خەرەند دەژین، تۆ هەر بەسەر زەوی دەڕۆیت، لە ناکاو ناچار دەبیت لەسـەر رۆخی ئەو عـەردە بوەسـتیت، کە سـەدان مەتر قووڵ بۆتەوە و لە نێـوەڕاستی ئەو دوو دیوارە شـاخ ئاسایەی، کـە لە شـەقبـوونی زەوی دروست بووە، باریکە رووبارێک دەبینی، هەر لەوە دەچێ لە ژێر قـووڵایی ئەو زەوییەدا دنیایەکی دیکە هەبێت.

دەچووینە سـەر خـەرەند. خەڵکمان لە کەلێن و ئەشکەوت و شـوێنە عـاسـێکانی هەردوولا شاخەکەی خەرەند بینیوە، ئەو کات تەواو لەوە دڵنیابووین، کە لە نێو قـووڵایی ئەو زەوییـە لەتبـووەدا خـەڵکانێک دەژیان و لە ئێـمـە نەدەچوون، ئێمە ئەو کەسانەمان لە خەوندا بە شێوەی سەیر و سەمەرە دەدیت، لەگـەڵیـان دەفـڕین، وەک باڵندەیەکی گـەورە وابوون. ئەوان دەیانگوت ئێرە دنیای ئێمەیە. ئێوە لەسـەر زەوین، ئێـمـەش لە خـوار خـوارەوەی ئێـوەین، هەر ئەو خەونانە لای منداڵەکانی دیکەش هـەبـوون، ئـەوان دەیـانـگـوت خەڵکانی نێو خەرەند ئەسپ و کەر و سـەگ و گـورگی باڵداریشـیـان هەیە...

منداڵ هەر کـە دوا دەرسی تەواو کـرد، یەکـسـەر خـۆیان دەگەیاندە قەراغەکانی خەرەند و لە نێـوان ئەو کـەڤـر و بەردانە دادەنیشتن، کە لەسەر زەوییـەکەی لێـواری خـەرەند هەڵتـۆقـیـبوون، لەوێ لە دنیـای نێـو خـەرەند رادەمان، لە خوار خوارەوەی نزیک رووبارەکـە هەستـیـان بە جوولەی کـەسـانێک دەکـرد، بەقـەد مێـروولەیەک بوون، هەقـیـان بوو بڵـێن ئەو کـەسـانە لە ئێـمـە

نەدەچوون، ناوە ناوە خرکە بەردیان فرێ دەدایە خوارەوە، کۆلارەیان هەڵدەدا، هەر یەکە و دەفتەرێکیان لەگەڵ خۆیان دەبرد و کۆلارەی بێ داویان هەڵدەدا و لە بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی کۆلارەکان هەڵدەبەزین و دادەبەزین و هاوار هاواریان دەکرد، ئەو کەسە زیاتر دڵخۆش دەبوو، کە کۆلارەکەی زیاتر بە ئاسمانی خەرەند بمابایەوە، زۆر جار هەوڵیاندەدا لەنێو کەلێن و دەرزی ئەو بەردانە خۆیان لە یەکتر بشارنەوە، جاروباریش ترسێک دایدەگرتن، نەبادا یەکێک لەو کەسانەی نێو دنیای خەرەند لێیان راپەڕێ و پەلکێشی نێو خەرەندیان بکا.

خەرەند لەگەڵ ئەوەی دنیایەک لە خەیاڵ و دیمەنێک لە جوانی پڕ سیحر و شوێنێکی بۆ یاری و بەزمەکانی منداڵیمان دروست کردبوو، لە بەرامبەریشدا ترسی لە وجودی ئێمەدا دەخولقاند، وەک ئەوەی ئێمە مەحکوم بووبین، دەبوایە رۆژانە بچینە ئەوێ، وەک ئەوەی خەرەندیش لە کەمین بووبێ و بەردەوام چاوەڕێی ئێمە بووبێ، ئەو رۆژە ترسناکە قەت لەبیر ناچن، کاتێ من و چەند منداڵێکی دیکە لەسەر تەپۆڵکەی بەردێکی رۆخ خەرەند، لە ناکاو گوێمان لە قیژەیەک بوو، قیژەیەک هەمووومانی لە شوێن خۆیدا تاساند، تاسانێک لەگەڵیدا زەمانمان لە گۆ کەوت. (عادل) ی (پلکە بووکێ)مان بینی، کە چۆن کۆلارەکانمان دادەبەزی و لە پڕ بەلایەکی دیکەدا بەرز دەبوون، عادل سێ جار قیژاندی، سێیەمین جار هاواری کرد و رەنگیشی نەما، تەنیا گرمەیەکی بەدواداهات، گرمەکە لە شاخەکەی دیکەی بەرامبەرمان دەنگی دایەوە، ئیدی هیچ شتێکی لەدوادا بەجێ نەما، تەنیا ئێمە نەبین، ئێمەی لێوان لێو لە ترس و هەیبەتی ئەو خەرەندەی وەک راوچییەک (عادل)ی لە ئێمە رفاند و بۆ هەتا هەتایێ لێی جیا کردینەوە. وەنەبێ ئەوە یەکەمین، یا دواهەمین داستانی رووداوەکانی خەرەند بێ.

هەر لەوەتەی شارۆچکەی رەواندز هەبووە ساڵانە چەند کارەساتێکی وای بەخۆوە بینیوە، چەندان کەسی دیکە چ کەوتبێتە ناو خەرەند یا بەخۆیان خۆکوژیيان هەڵبژاردبێ، خەرەند قووتی داون و پەلکێشی خوارەوەی کردوون. بە تایبەتی ئەو کەسانەی تووشی ئەو کارەساتە هاتوون، کە لە لێواری هەزار بە هەزاری خەرەند ئیش و کاریان کردووە و یاخود ماڵیان کەوتۆتە رۆخ خەرەندەوە.

لە نێو ئەو کەسانەدا چیرۆکی ئەو کچانەش هەن، کە لە عەشقدا نەگەیشتوون بە مرازیان، داستانی ئەو کورانە دەبیسترێن، کە لەحزەی تووڕە بوونیان لە ماڵەوە هەڵاتوون و یەکسەر خەرەند پەلکێشی کردوون...

**کفتەی رەواندز**

کفتەی رەواندز هەر کفتەیە، بەڵام تۆزێک تایبەتمەندی ناوچەی پێوەیە، لە برووش، ئاردە ساوار، یاخود پیرخەنی واتە (تازیلە)، کە وردە ساواری تێدایە لەگەڵ قیمەی بە گۆشت دروست دەکرێ، نە زۆر خڕە نەزۆر پانە پڕ بە لەپییە، قەبارەی لە کفتەی ناوچەکانی دیکە برێک گەورەترە، بەهۆی ئاردە ساوار و وردە ساواری تازیلە (پیرخەنی) تێیدا، لە کفتەی تر نەرمترە، لەبن کەوچک یان مڵاک بە ئاسانی دەشکێ، بەڵام کفتەی دیکە لەبەر ئەوەی رەقە لەبن مڵاک بە ئاسانی گیرنابێ و زوو ناشکێ، بەهۆی بوونی وردە ساوارەوە زووتر دەکوڵێ، زۆر جار (جاترە) کە گیایەکی چیاییە بۆنی خۆشە لەگەڵ (قیمە) یا شلەکەی دەکرێ، هەروەها پیاز و گۆشت و هێسک دەخرێتە ناوی تاوەکو تامی خۆش بێ، کفتەی رەواندز برنجی لەگەڵ تێکەڵ ناکرێ، چونکە کفتەی رەق دەکا.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری مێرگ ژمارە (١) ساڵی یەکەم ٢٠٠٥ بڵاوکراوەتەوە.



# ڕەواندز (١٩١٨-١٩٢٣)

ئەحمەد حەمەدئەمین ئۆمەر
كۆلیژی ئاداب -زانكۆی سەلاحەددین

**سەرەتا**

ڕەواندز وەكو بەشێك لە كوردستانی گەورە گوورزێكی كوشندەی لە جەنگی یەكەمی جیهانی بەركەوت لە ئەنجامی هاتنی هێزی رووسەكان بۆ ناوچەكەو كاولكردنی لەسەر دەستی ئەوان. هەر بۆیە بە كۆتاهاتنی جەنگی یەكەمی جیهانی خەڵكی ناوچەكە ئاهێكی كەمیان بۆ ماوەیەك بە بەر هاتەوە، بەڵام ئەو بارە زۆری نەخایەند بەهۆی ئەوەی ناوچەكە ئەمجارەیان كەوتە بەر بەرداشی ململانێی توركیاو بریتانیا. جا بۆ ئەوەی پەردە لەسەر ئەو ئەو ململانێیەو كاریگەری لەسەر ناوچە دەربخەین هاتووین ئەو باسەمان ئەنجامداوە كە لە دوو تەوەرە پێكهاتووە.

تەوەرەی یەكەم: تایبەت كراوە بۆ داگیركردنی رەواندز لە لایەن ئینگلیزەكان و سەرهەڵدانی راپەرین لە دژیاندا.

تەوەرەی دووەم: هاتنەوەی تورك بۆ رەواندزو رۆڵی ئۆزدەمیر پاشا لە ناوچەكەدا.

**تەوەرەی یەكەم:**
**داگیركردنی رەواندز لە لایەن ئینگلیزەكان و سەرهەڵدانی راپەرین لە دژیاندا**

ئاگربەستی مۆدرۆس لە ٣٠ی تەشرینی یەكەمی ١٩١٨ كۆتایی بە جەنگی یەكەمی جیهانی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی هێنا. بەڵام ئینگلیزەكان تا ئەو كاتەش دەسەڵاتیان نەگەیشتبووە هەندێ لە ناوچەكانی ویلایەتی مووسڵ كە خۆیان مەرامیان بوو[١].

پاش ئەوەی شاری سلێمانی كەوتە نێو بازنەی داگیركاری ئینگلیزەوەو شێخ مەحموود بە حوكمداری دەستنیشان كرا[٢]، مێجەر نۆئێل[٣] (حاكمی سیاسیی ئینگلیز لە كوردستاندا)، بە مەبەستی دانانی حاكمێكی سیاسیی ئینگلیز لە لایەك و، لە لایەكی

دیکەشەوە، بۆ پەلکێشکردنی ناوچەکانی کۆیەو رانیەو رەواندز، بۆ نێو قەلەمرەوی حوکمدارییەتی سلێمانی لە کانوونی یەکەمی ١٩١٨، سەری لەو ناوچانە دا[٤]. لە بەرانبەر ئەوەشدا دانیشتوانی ئەو هەرێمانە رەزامەندییان نیشان دا بۆ دەسەلاتدارییەتی شێخ مەحموود بەسەریاندا. هەر بۆیە کاتێک شێخ مەحموود یاداشتێک بۆ کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس رەوانە دەکات شێخ عەبدولسەمەد زادە عەبدوللا کە لە شێخانی سەرانە بە ناوی خەلکی رەواندزەوە دەنگی خەلکی ناوچەکە دەخاتە پال دەنگ و داواکاری شێخ مەحموود[٥].

مێجەر نۆئێل لە ماوەی مانەوەی لە رەواندز دەستی کرد بە رێکخستنی کاروباری ناوچەکەو راکێشانی سەرۆک هۆزەکان، لە رێگای برینەوەی مووچەی مانگانەو دانی قەرزی کشتوکالی پێیان، تا بتوانن باری لەنگی خۆیانی پێ راست کەن و، خەلکی رەواندزیش لەو بارە نائارامی و نا ئاساییە رزگار بکەن، کە دەرئەنجامەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی بە گشتی و هێرشی رووسەکان بە تایبەتی ناچاری کردبوون گژوگیاو گۆشتی پشیلەو سەگ و بگرە مرۆڤیش بخۆن[٦].

حوسێن حوزنی موکریانی ئاماژە بە هاتنی مێجەر نۆئێل دەکات بۆ رەواندزو دەلێ: "کانونی یەکەم سالی هەزارو نۆ سەدو هەژدەی میلادی میجەر نۆیل بۆ ادارەکردنی قەضای رەواندز کرا بە معاونی حاکمی سیاسی، لە دوای داگیرکردنی انگلیز ئەو پیاوە یکەمین حاکمیکی انگلیزە کە لە سەر قەضای رەواندز داندراوە"[٧]. لێرەشدا دەتوانرێ بوترێ، حوزنی بە هەلەدا چووە، ئەگەر بزانین مێجەر نوئێل خۆی یاریدەدەری حاکمی سیاسیی لە رەواندز دامەزراندووە[٨]. هەروەها جگە لەوە هەر ئەوە بە تەنیا ئاماژە بۆ سێ حاکمی تر دەکات کە دوای نۆئێل هاتوونەتە رەواندزی بە پلەی یاریدەدەری حاکمی سیاسیی (ASSISTANT POLITICAL OFFICER)وە[٩].

شیاوی باسە دوای ئەوەی کاپتن بێل بە سیفەتی یاریدەدەری حاکمی سیاسیی لە رەواندز دامەزرا، هێندەی پێ نەچوو شۆرشی شێخ مەحموود لە سلێمانی هەلگیرسا[١٠]، دایسانی شۆرش لە سلێمانی، کاریگەری کردە سەر ناوچەکانی رەواندزو دەوروبەری. ئەوەتە رەفیق حلمی، وەکو شایەتحالێک لە رەوشی ئەو سەردەمەی رەواندز دەلێ: "کە دەنگی شۆرشی (شێخ مەحمود) لە رەواندزو لە ناو عەشایرا بلاو بووەوە، گەلێ کەس پێی خۆش بوو، بە تایبەتی ئەوانەی، کە لە ئینگلیزەکان نارەزا بوون و لە کردەوەی دەس و پێوەندەکانیان وەرز بووبوون، ئیتر هەر چیت ئەبینی چەکی لە خۆی ئەداو لە رووداو خۆی بۆ شەر ئامادەکرد، خۆ دێهاتی و عەشایرەکە باسی هەر ناکرێت ئەوەی دوو پیاوی هەبوو ئەیکرد بە چوار چەکی پێ هەلئەگرتن و شانازی پێوە ئەکردن زۆر لەمانە ئۆقرەیان لێ هەلگیرا بوو بە تەمابوون شۆرشەکەی (شێخ مەحمود) پەرە بسێنێت، بتەنێتەوە، بگاتە ئەم دیوی (زێ) [مەبەستی ئەودیوی زێی کۆییە- توێژەر]. چاوەرێ بوون، کە لەشکری شێخ مەحمود نزیک بکەوێتەوەو بەری کۆیێ بگرێتەوە تاوەکو ئەمانیش لە ئاستی خۆیانەوە راست بنەوە، دەس بدەنە چەک و شۆرش بگێرن ..."[١١]. لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت، کە شۆرشەکەی شێخ مەحموود کاریگەری زۆری کردۆتە سەر خەلکی ناوچەی رەواندزو تەنانەت بۆی کەوتوونەتە پروپاگەندە کردنیش. هەر بۆیە رەفیق حلمی بەدەم گێرانەوەی رەوشەکە بەردەوام دەبێت و دەلێ: "... هەر لەبەر ئەم مەبەسەش زۆریان لە مانە باسی سەیر سەیریان هەل ئەبەست و بلاویان ئەکردەوە شتی ئەوتۆیان رێک ئەخست، کە ئینسان سەری تێیدا سوور ئەما. هەچی کارەسات و رووداوی راست ودرۆ هەیە وە یا بیسراوە ئەوەندەی تریشیان لە خۆیانەوە ئەنایە سەرو ئەیانگێرایەوە ..."[١٢]. بۆیە دەتوانرێ بوترێ، ئەو هەموو کاریگەرو هەلوێستە جگە لە هاندەری نیشتمانی هاندەری مادیشی بەدواوە بوو، لە بەر ئەوەی لەو کاتەدا کۆگاکانی حکومەت لە رەواندز زەخیرەیەکی زۆری تێیدا بوو، تالان کردنی لە لایەن هێزە عەشائیرییەکان لە رۆژێکی وادا شتێکی کەم نەبوو".

دەرئەنجامی گردبوونەوەی ژمارەیەکی بەر چاو لە سەرۆک

هۆزەکانی دەوروبەری ڕەواندز بە خۆیان و چەند چەکدارێکەوە، مەترسی بۆ یاریدەدەری حاکمی سیاسیی ئینگلیزو هاریکارەکەی دروست کردبوو، چونکی لەو ڕۆژانەدا کاپتن بێڵ هەر بە تەنیا لەگەڵ هاوکارەکەی لە ڕەواندز بوو، هاوکارەکەشی مەشقی سەربازی بەو هێزە چەکدارە بەکرێگیراوە دەکرد کە لە ژێر سەرکردایەتی نووری باویل ئاغا[١٣] دابوون و ژمارەیان نزیکەی (١٥٠ - ٢٠٠) چەکدارێک دەبوو[١٤]. بۆیە کاپتن بێڵ کەوتەخۆ و دەستی کرد بە بەخشینی پارە بە سەر ئەو سەرۆک هۆزانە. سەبارەت بەو ڕەوشە شایەدحاڵێک دەڵێ: "... لە سەر دەسی(خۆم)دا ئەم لێشاوە ڕوپیەیەی بە سەر ئەوانەدا بلاوکردەوە کە لە(ڕەواندز) چاوەڕوانی تالان بوون[مەبەستی سەرۆک هۆزەکانە- توێژەر]، بەمە تالانی لە بیر بردنەوەو چاو بەرەو ژێری کردن"[١٥].

جێگای ئاماژە بۆکردنە کاپتن بێڵ دوای دەست بە تاڵبوونی لە سەرۆک هۆزەکان بایدایەوە بە لای گەورە پیاوانی ڕەواندزو کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ ساز کردن، بۆ ئەوەی لە بیروڕای ئەوانیش بگات سەبارەت بە شێخ مەحموودو شۆڕشەکەی، ڕەفیق حملی کە یەکێک بووە لە بەشدار بووانی کۆبوونەوەکە دەڵێ: "بێل پیاوە ناسراوەکانی (ڕەواندز)ی لە ماڵی خۆیان کۆکردەوەو ویستی لە لایەن بیروباوەڕیانەوە بەرامبەر بە (شێخ مەحمود)و شۆڕشەکەی گفتوگۆیان لەگەڵ بکا، مەبەستی ئەوە بوو بزانێت کە ئەگەر هاتوو دەستەیەک لە هێزەکانی شێخ مەحمود لە زێی بپەڕێتەوەو یا بێت و (شێخ مەحمود) جواب بۆ عەشایری دیوی کۆیێ و ڕەواندز بنێرێت و داوای یارمەتی یا تێکەڵ بوون بە شۆڕشەکەیان لێ بکا، بە قسەی ئەکەن و شوێنی ئەکەون یان نا؟. جگە لەمەش لێی پرسین، کە ئاخۆ بە لای ئەوانەوە ئەم کارەی شێخ مەحمود یاخی بوونی لە ئینگلیز کارێکی ڕاست و باش و بەجێیە یان نە؟ لەوە گەیشتون کە مەبەستی تەماعەو کەڵکی تایبەتی خۆی و بەس ..."[١٦].

ئەڵبەتە کۆبوونەوەو دانیشتنی لەو جۆرە بیروڕای جیاواز لە خۆی دەگرێت و دەمەقاڵێ و مشتومڕی تێدەکەوێت، لێرەشدا کاتێک باویل ئاغای[١٧] گەورە ناوداری ڕەواندز دێتە وەلام و لە دژی شێخ مەحموودو شۆڕشەکەی دەدوێت، دەبێتە هۆی توورە بوونی ڕەفیق حلمی و کاپتن بێل لە لایەک و، ڕەفیق حلمی و باویل ئاغا لە لایەکی دیکەدا، لەبەر ئەوەی ڕەفیق حلمی دەڵێ: "... داخەکەم باویل ئاغا ئازایی و جوامێری خۆی لە سووکی (شێخ مەحمودا) ئەبینی..."[١٨]. بۆیە دەتوانرێ بوترێ، باویل ئاغا بۆ مەبەستی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی و چاک ڕاگرتنی پەیوەندی نێوان بنەماڵەکەی و دەسەڵاتی ئینگلیز لە ڕەواندز قسەی بە شێخ مەحموودو شۆڕشەکەی وتووە، بەلام کاتێک ئەو بەرژەوەندییە پێچەوانە بۆتەوە ئەویش بە چەشنی شێخ مەحموود لە ئینگلیزەکان هەڵگەڕاوەتەوە. کە دواتر باسی لێوە دەکەین.

سەرچاوە مێژووییەکان بێدەنگن لە باسکردنی ڕەوشی سیاسیی ڕەواندزو دەوروبەری تا ئەو کاتەی هەولێر دەبێتە لیوا لە سەرەتای مانگی تەشرینی دووەمی ١٩١٩ و کاپتن هێی دەبێتە حاکمی سیاسیی تێیدا[١٩]. ئیتر لێرەوە ڕەواندز وەکو شارۆچکەیەک دەکەوێتە ناو بازنەی ئەو دەسەڵاتەوەو نەقیب کێرک دەبێت بە یاریدەدەری حاکمی سیاسیی ئینگلیز لە وێدا، بەلام هەر زوو ناکۆکی و ململانێ دەکەوێتە نێوان یاریدەدەری حاکمی سیاسیی ئینگلیزو نووری باویل ئاغا[٢٠]، لە بەر ئەوەی نووری باویل ئاغا سەرپێچی فەرمانی نەقیب کێرک دەکات و، ئەنجام دەستگیر دەکرێت، وەلێ نووری دەتوانێت لە ڕێگادا، خۆی لە دەست پاسەوانەکان ڕزگار بکات، ئەوە لە لایەک، لە لایەکی دیکەش نەبوونی هێزێکی سەربازی لە ناوچەکە بۆ ئەوەی پارێزگاری لە دەسەڵاتی یاریدەدەری حاکمی سیاسیی بکات نەقیب کێرک ناچار دەکات بارەگاکەی لە ڕەواندز بگوازێتەوە بۆ باتاس[٢١]. بەمەش بۆشاییەکی کارگێڕی لە ڕەواندز دروست دەبێت و، خەڵکی ڕەواندز ناچار دەکات بە پیل داواکارییەوە بچن بۆ گێڕانەوەی دەسەڵات. هەر بۆیە هێی ئاماژە دەکات و دەڵێ: لە ژێر داواکاری زۆری ئەوان ناچار بووین حاجی نەورۆز ئەفەندی[٢٢] لە

رەواندز دابمەزرێنین[٢٣].

هێی حاکمی سیاسیی هەولێر بە مەبەستی سەردان و تێگەیشتن لە رەوشی رەواندز لە ١٠ی کانوونی یەکەمی ١٩١٩ دەچێتە ئەوێ و لەگەڵ گەورە پیاوانی ناوچەکە کۆبوونەوە ساز دەکا، کاتێکیش حاجی نەورۆز ئەفەندی دەست لە کار کێشانەوەی خۆی رادەگەیەنێت، بڕیاری ئەوە دەدرێت ئیسماعیل بەگی رەواندزی[٢٤] بکرێت بە حاکمی رەواندز. سەبارەت بەمە حاکمی سیاسیی هەولێر دەڵێ: " دوای نیوەڕۆی ١٥ی مانگ هەموو گەورە پیاوانمان بانگێشت کرد، هەروەها گەورەی هۆزی (شێروان) و (برادۆست)یش ئامادەبوون، دڵنیەگەرانی خۆمم راگەیاند بە دەست لە کار کێشانەوەی حاجی نەورۆز لە کارەکەی، بەیانمان کرد کەوا ئیسماعیل بەگ لە شوێنی ئەوە، ....، هەموو ئامادەبووان بە کۆمەڵ رازی بوون لە سەر هەڵبژاردنی و هەر یەکە لە محەمەد ئاغا و ئەحمەد ئاغا [مەبەستی محەمەد ئاغای باڵەکیان و ئەحمەد ئاغای سەرۆکی هۆزی شێروانە- توێژەر] وتارێکیان پێشکەش کردو داوایان کرد کەوا هەموویان لە تەک ئیسماعیل بەگ هاوکاری بکەن لە چاککردنەوەی رەوشی خراپی رەواندز، لە جێگەی ئەوەی کاری خراپ و ململانێی شەخسی و نانەوەی ئاژاوە ئەنجام بدەن، ....، باویل ئاغا ئەوەی وت (من لە پەیوەندیم لەگەڵ ئیسماعیل بەگ چاک دەبم مادام چاکە بە چاکە بگۆڕدرێتەوە)"[٢٥]. بۆیە دەتوانرێ بوترێ، ئەگەرچی باویل ئاغا دڵ سافی و دڵ پاکی خۆی بۆ ئیسماعیل بەگ دووپات کردۆتەوە، بەڵام ئەوە نەبۆتە هۆی کۆتایی هێنان بە ململانێ و دوژمنداری ئەو دوو بنەماڵەیە، ئەگەر بزانین لە دواتر هەڵکردنی ئاگری نێوانیان ئینگلیز رۆڵی تێیدا بینیوە.

بەردەوامی سەرکێشی نووری باویل ئاغا لە دەسەڵاتی ئینگلیز ئەوەندەی دیکە رک و کینەی ئینگلیزەکان بە گشتی و هێی بە تایبەتی ئەستوورتر کرد، بۆیە لە کاتی گەڕانەوەکەی لە رەواندز فەرمانی بە نەقیب لیتلدیل یاریدەدەری حاکمی سیاسیی دا کەوا بە هەر شێوازێک بێت دەبێ نووری دەستگیر بکرێت. دوای گەڕانەوەی هێی، نووری دەگەڕێتەوە رەواندز بێ ئەوەی چەند رۆژێک قسەی لەگەڵدا بکرێت، بەڵام دواتر نەقیب لیتلدیل یاریدەدەری حاکمی سیاسیی توانی فریوی بداو دەستگیری کات و رەوانەی هەولێری بکات[٢٦]. دەرئەنجام نووری باویل ئاغا لە ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٢٠ لە هەولێر لە لایەن هێیەوە دادگایی دەکرێت و، حوکمی پێنج ساڵ زیندانی بە سەردا دەسەپێنرێت. بەڵام لێرەدا دەبێت لە لایەک ئاماژە بۆ ئازایی و چاو نەترسی نووری بکەین. کە جوامێرانە توانیویەتی لە بەردەم دادگا پارێزگاری لە خۆی بکات لە بەرانبەر ئەو تاوانانەی کە خرابوونە ئەستۆی، هەروەها لە لایەکی تریش پێشانی ئەوە بدەین کە ترس و دڵەڕاوکێی ئینگلیزەکان لە نووری گەیشتۆتە ئەوپەڕی، ئەگەر بزانین بە بەندکردنی حاکمی گشتی مەلەکی بریتانی لە بەغدا بروسکەی دەستخۆشی بۆ حاکمی سیاسیی هەولێر رەوانە کردووەو، رەوشی ئارامی و هێمنی رەواندزی بە بەندکردنی نووری باویل ئاغا بەستاوەتەوە[٢٧].

حاکمی سیاسیی هەولێر ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە لە خافلەتی بڕیاری گواستنەوەی نوورییان داوە لە هەولێرەوە بۆ کەرکوک لە جێگای ئەوەی رەوانەی مووسڵی بکەن، لەبەر ئەوەی نەکا نووری لە رێگای هاورێکانییەوە لە مووسڵ بتوانێت رابکا، ئەوە لە لایەک و، لە لایەکی دیکەش ئەو کاتە مووسڵ بنکەی پروپاگەندە بوو لە نێوان کوردەکانی ئاکرێ و رەواندز، کە ئینگلیز لێی دەترسا[٢٨]. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نووری باویل ئاغا دوای رەوانەکردنی بۆ کەرکوک لە وێشەوە بۆ بەغدا توانی لە دەست پاسەوانەکان خۆی رزگار بکا. ئەڵبەتە بڵاوبوونەوەی ئەو دەنگ و باسەش ئینگلیزەکانی هەراسان کرد، بۆیە نەقیب دیکینسن هەڵسا بە بەندکردنی باویل ئاغاو، هێیش بە تەلەفۆن فەرمانی بە ئیسماعیل بەگ، کرد کەوا براکانی نووری دەستگیر بکا. بۆ ئەو مەبەستەش ئیسماعیل بەگ لە ٢٩ی تەمووزی ١٩٢٠ پیاوەکانی رەوانەی سەر ماڵی باویل ئاغا کرد تا کورەکانی دەستگیر بکا. دەرئەنجام لە نێوان پیاوەکانی ئیسماعیل بەگ و براکانی نووری بووە شەڕە تەقەو

دوو برای بە ناوی کەریم و مستەفا لەگەڵ کوڕێکی کوژران و دوو براکەی تریشی رایان کردە چیا. سەبارەت بەو رووداوەش بیروڕای جیاواز هەن، هەندێک ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کەوا کوشتنی دوو کوڕەکەی باویل ئاغا بە دەستی پیاوەکانی ئیسماعیل بەگ دەستی ئەنقەستی تیادا بووەو مەبەستیان تۆڵە سەندنەوە بووە، ئەوە لە لایەک، لە لایەکی تر دەڵێن نەخێر کوڕەکانی باویل ئاغا سەرکێشییان کردووەو خۆیان بە دەستەوە نەداوە، بۆیە پیاوەکانی ئیسماعیل بەگ تەقەیان لێ کردوون و کوژراون[٢٩]. لێرەدا دەتوانرێ بوترێ، کوشتنی دوو کوڕەکەی باویل ئاغا بە هەر پاساوێک بووبێ، ئەوەندەی دی رک و کینەی نووری بەرانبەر ئینگلیزەکان ئەستوورتر کردووەو کێشەو دوژمنداری نێوان دوو بنەماڵەی ئیسماعیل بەگ و باویل ئاغایشی جارێکی دی هێناوەتەوە گۆڕێ و ململانێیەکەی نێوانیانی گەرمتر کردووە.

نووری دوای گەڕانەوەی بۆ ناوچەکە دەستی کرد بە پەیوەندیکردن بە نەیارانی ئینگلیز، لەوانە حارس ئاغای بیاوی و شێخانی بارزان و شێخەکانی سورچی کە هەموویان بە رووی ئینگلیزەکاندا هەڵگەڕابوونەوە، چونکی پشێوی ناوچەکانی زاخۆ، ئامێدی، بارزان و ئاکرێی گرتبۆوەو، ئینگلیزەکان بێ پسانەوە رووبەڕووی گرفت هاتن و گەلێک لەو ئەفسەرانەی کە بە مەبەستی راوێژو سەپاندنی دەسەڵات رەوانەی ناوچەکان کرابوون کوژران[٣٠]. بێگومان ئەو پشێوییە رەواندزیشی گرتەوەو، شەڕو هەرای ناوەخۆش ئەوەندەی تر خەڵکی تووشی نائومێدی کرد. هەر بۆیە لە ١٢ی ئابی ١٩٢٠ لە رێگای گەڕانەوەی لە گەرووی گەلی عەلی بەگدا هێی و خێزانەکەی کەوتنە بەر دەستڕێژی تەقە و پەرجووانە رزگاریان بوو[٣١].

بەردەوامی گەڕان و سووڕان بەناو هۆزەکانی ناوچەکە، ئەنجام زیادبوونی ژمارەی هەوادارانی نووری لێکەوتەوە. بە تایبەت کاتێک هۆزی گەورەی هەروتی هاتنە پاڵییەوە، بە مەش مەترسی خستە سەر دەسەڵاتدارانی ئینگلیز بە گشتی و حاکمی سیاسیی هەولێر بە تایبەتی هەر لەبەر ئەوە بیری لە چۆڵکردنی رەواندز کردەوە، بەڵام نەقیب لیتلدیل یاریدەدەری حاکمی سیاسیی ئینگلیز لە رەواندز ئەوە رەت دەکاتەوە و دەڵێ: "پێویستە ئەوە نەوترێ کە ترسی نووری، بریتانییەکانی ناچار کرد بە خێرایی و بەبێ بەرگری رەواندزییان چۆڵ کرد"[٣٢].

سەرەنجام دوای پەڕینەوەی هۆزی سورچی[٣٣] لە بەری بادینان بە سەرۆکایەتی شێخ عوبەیدوڵلا و شێخ رەقیب و شێخ مازۆ لە "زێبوە" بۆ ئەم دیو و تێکەڵاو بوونیان لەگەڵ هێزەکەی نووری باویل ئاغا. ئەوە بوو هێرشیان کردە سەر بنکەی ئینگلیزەکان لە گوندی بەردین[٣٤]، هەروەها لە رۆژی ٢٧ی ئاب ١٩٢٠ توانییان هێڵی پەیوەندی نێوان باتاس و هەولێر ببڕن و بۆ رۆژی دواتریش دەستی بەسەردا دابگرن، بەمەش مەترسییان خستە سەر هەریر و هەڵیان کوتایە سەری و توانییان ئینگلیزەکانی لێ وەدەرنێن. سەرچاوەکان ئاماژە بۆ زیانێکی زۆری ئینگلیزەکان دەکەن لەگەڵ دەسکەوتێکی چاک بۆ راپەڕیوان لە کاتی دەست گرتنیان بە سەر ناوچەکان[٣٥].

جێگای ئاماژە بۆ کردنە دابەشبوونی هێزی راپەڕیوان بە سەر سێ قۆڵدا کە پێک هاتبوون لە: شێخانی بجێل کە ئەرکی پاراستنی هەریر و باتاسیان لە ئەستۆ بوو، هەروەها باویل ئاغا گرتنی بەری شەقڵاوەی پێ سپێردرابوو، نووریش هێزە سەرەکییەکەی سەرپەرشتی دەکرد و کاری ئەو گرتنی خەلیفان[٣٦]و کانی وەتمان[٣٧]و رەواندز بوو. بۆیە نووری هێرشی کردە سەر بنکەی ئینگلیزەکان لە کانی وەتمان کە ئامانج لە دەستگرتن بە سەریدا نەهێشتنی بنکە سەربازییەکە و دەستگرتن بە سەر ئەو چەک و تفاق و خۆراکە زۆرەی ئەوێ بوو، ئەوە سەرەڕای ئەوەی دەستگرتن بە سەر کانی وەتمان کۆنترۆڵکردنی رێگای نێوان رەواندز هەولێر و نیمچە گەمارۆدانێکی رەواندز بوو. بۆیە لە ٢٩ی ئابی ١٩٢٠ دەستیان گرت بە سەر کانی وەتمان و ئینگیزیان لێ وەدەرنا[٣٨].

هەواڵی دەستگرتن بە سەر کانی وەتمان کاریگەریی کردە سەر گیانی ئەو هێزەی لە رەواندز بوو کە پێک هاتبوو لە: نەقیب دیکینسن و

هێزەکەی، ئیسماعیل بەگ، شێخ محەمەد ئاغای والاش[٣٩]، محەمەد عەلی ئاغای جوندیانی (؟ - ١٩٥٣)[٤٠]، میر محەمەد بەگی دەرگەلەیی و ئاغاکانی برادۆست، بۆیە کەوتنە خۆ ئامادەکردن بۆ رووبەڕوو بوونەوەی راپەڕیوان، بەڵام ئەمانیش خۆیان نەگرت و لە رێگای والاش و دەربەندی رانیە بۆ کۆیە و لەوێشەوە بۆ هەولێر هەڵاتن[٤١]. ئیتر لە ئەیلولی ١٩٢٠ ئینگلیز دەسەڵاتی لە رەواندز نەما، بەڵام جارێکی تر رەواندز کەوتە بەر تاڵان و برین و کاولکردن لە سەر دەستی سورچییەکان، بۆیە حوسێن حوزنی موکریانی دەڵێ: "... بەم جۆرە ئەوەی لە دەست رووس و ئەرمەنی و ئاسوری رزگاربوون، ئەمجارە لە دەست سورچییەکان دا تووشی ئەزیەت و نەبوونی بوون"[٤٢]. سەرئەنجام رەواندز جارێکی تریش ئاوەدانی کەمی تێیدا مایەوە، ئەوەی مابوونەوەش تەنیا چەکدارو هەوادارانی بنەماڵەی باویل ئاغا بوون، بۆیە هاملتۆن لە سەر زاری خەڵکی دەڤەرەکە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: "...باویل ئاغا و کوڕەکەی، نووری لە رەواندز حوکمڕانییان دەکرد، بەڵام بەبێ رەعییەت، چونکی خەڵکی شارۆچکەکە کۆچیان کردبوو"[٤٣].

دەتوانرێ بوترێ، خراپی مامەڵەکردنی هێزی راپەڕیوان بە گشتی و سورچییەکان بە تایبەتی لە رەواندز، خەڵکی ناچارکردووە کەوا کۆچ بکەن و رەواندز بەجێ بهێڵن. لەبەر ئەوەی راپەڕینەکە ئامانجی



سەربەخۆیی و ئازادیی و بەرنامەیەکی ئەوتۆی بە دەستەوە نەبوو، بەڵکو لە چەند لایەک پێک هاتبوون کەوا لە رک و کینەیان بەرانبەر ئینگلیز و پیاوەکانیان راپەڕیبوون، لەوانە شێخانی بجێل خۆیان لە ناوچەکانی ئاکرێ لە سەر داواکاری زێبارییەکان و شێخانی بارزان بەرانبەر بە ئینگلیزەکان راپەڕیبوون و شکابوون و هەڵاتبوونە ئەو ناوچانە[٤٤]. لەولاشەوە براکانی یوسف بەگی بگۆک براکەیان لە سەر دەستی ئینگلیزەکان کوژرابوو، هەولی تۆڵە سەندنەوەیان دەدا[٤٥]. هەروەها بنەماڵەی باویل ئاغاش دوژمن و قین لە دڵی ئینگلیزەکان و ئیسماعیل بەگی رەواندزی بوون، بەتایبەت دوای کوشتنی دوو کوڕەکەی. کەواتە راپەڕینەکە تەنیا دژە کردارێک بووە.

هەڵبەت، بوونی رەواندز بە شوێنگەی حەوانەوەی ئەو کەسانەی لە دەسەڵاتی ئینگلیز یاخی ببوون، پێویستی بە هێزێک هەبوو بۆ ئەوەی پشتی پێ ببەستن و هاریکارییان بکات، بۆیە کاتێک ئەحمەد تەقی[٤٦] بە مەبەستی تێگەیشتن لە رەوشی سیاسیی سەردانی ناوچەکانی قەڵادزەو پشدەر دەکات، بە بیستنی دەنگوباسی رەواندز دەچێتە ئەوێو دەڵێ: "... بۆ سبەینێ گەیشتمە رەواندزو چوومە لای غەفورخان [مەبەستی غەفورخانی ناودەشتە- توێژەر] تێم گەیاند، کە هەموو لایەک [مەبەستی ناوچەکانی قەڵادزەو پشدەرە- توێژەر] ئامادەن پەیوەندیی دۆستایەتی لەگەڵ شۆڕشی رەواندز ببەستن، پاش کەمێک لەگەڵ غەفورخان چووینە لای شۆڕشگێڕەکان و لەگەڵیاندا کۆبوونەوە، لەم کۆبوونەوەیدا باویل ئاغاو نوری کوری و حەمەشینی سەر چیا و خدری کوری و شێخانی بجێل و شێخ کاکە ئەمین و ئەحمەد بەگی بگۆک شۆڕشگێڕەکانی تر ئامادە بوون... هەموویان هاتبوونە سەر ئەوەی کە پێویستە هێزێکی وا هەبێ کورد پشتی پێ ببەستێ. گومانیش نەبوو کە مەبەستیان لەم هێزە تورک بوو، کە دژی ئینگلیز پشتی پێ ببەستن و دەریشیان خست کە لە ئینگلیز تەواو مەئیوس بوون و هیچ هیوایەکیان پێی نەماوە... هەر کردەوە ناڕەواکانی ئینگلیزیش بوو، کە هێنابوونییە سەر بیروڕایەک کە بە تێکرایی هەموویان بڕیار بدەن لەشکری تورک بهێننە رەواندز، بۆ رزگار بوون لە دەسەڵاتی ئینگلیز بە رادەیەکی وا کەوتبوونە پەیوەندی بەستن لەگەڵ والی (وان)دا وتیان کە وەڵامی پشتگیریشیان لێ وەرگرتۆتەوە و نامەکەی والییان

پیشان دام کە پڕ بوو لە هاندان و پشتگیری"[47].

ماوە بڵێین ڕاپەڕیوانی ڕەواندز پێشتر پەیوەندییان بە سمکۆی شکاک[48] کردبوو و داوای هاوکارییان لێ کردبوو، بەڵام سمکۆ وەڵامی دابوونەوە کە سەرەتا ڕاپەڕینەکە لە ناوچەکانی ئێران ئەنجام بدەن و دواتر بگەڕێنەوە ئەو ناوچەیە، بۆیە ئەوانیش بە داواکارییەکەی سمکۆ ڕازی نابن[49]. کەچی نووسەرێک لەو بارەیەوە دەڵێ: "ئەمانە ویستیان کە ئیسماعیل ئاغا سمکۆشیان لەگەڵ بێت، نووسراوێکیان بۆ نارد داوای یارمەتییان لێ کرد، ئەویش کە زانی ئەمانە جووڵانەوەکەیان بێسەرییە و ئامانجێکی نیشتمانی نییە یارمەتی نەدان و وەڵامی نەدانەوە..."[50].

بەڵام لە ڕاستیدا سمکۆ لەو ڕۆژانەدا نەیدەویست دڵی ئینگلیزەکان لە خۆی بڕەنجێنێت و بە هیوای ئەوە بوو هاوکاری بکەن بۆ ئەنجامدانی ڕاپەڕینێک لە دژی ئێرانییەکاندا[51].

ئیتر لێرەدا تاکە هیوا و ئاوات و پشتیوانی ڕاپەڕیوانی ڕەواندز هێنانی هێزێکی تورک بوو، تا پارێزگاری خۆیانی پێ بکەن. بۆیە ئەحمەد تەقی دەڵێ: "... کە لێکم دایەوە بیروڕای عەشایر و ئەهالی قەزای پشدەر و ڕانیەش هەمان شتە، لە بەر ئەوە بە داواکاری شۆڕشگێڕەکان ڕازی بووم کە بە نوێنەر و ناوی ئەوانەوە بچمە وان و لە بارەی هێنانی سوپا و هێزی تورکەوە بۆ ڕەواندز لەگەڵ قەدری بەگی والیدا گفتوگۆ بکەم"[52].

بەم شێوەیە کوردەکانی ناوچەکە خۆیان جارێکی دیکە چوون بە پیل داواکاریی و هێنانەوەی هێزی داگیرکەری تورک بۆ نێو خاکی کوردستان. ئەو تورکانەی کە بە درێژایی چەند سەدە بوو دەیان چەوساندنەوە و هیچ مافێکیان پێ ڕەوا نەدەدیتن. تورکەکانیش لە بەرانبەر ئەو داواکارییە نزیک کرێتەوە بێ سێ و دوو لێکردن، دوای ماوەیەک توانییان هێزێک ڕەوانەی ڕەواندز بکەن، کە لە تەوەرەی داهاتوو بە چڕی باس لە هاتنی ئەو هێزە و چالاکییەکانی لە ناوچەکەدا دەکەین.

**تەوەرەی دووەم:**

هاتنەوەی تورک بۆ ڕەواندز و ڕۆڵی ئۆزدەمیر پاشا[53] لە ناوچەکەدا

دوای ئەوەی ڕاپەڕیوانی ڕەواندز کەوتنە بیری ئەوەی هاوکاری و هەماهەنگی لە تورکەکان وەرگرن و، ئەحمەد تەقیش ڕازی بوو ببێت بە نوێنەری ئەوان. لە تەشرینی یەکەمی ١٩٢٠ ئەحمەد تەقی بە هاوڕێیەتی لەگەڵ فەتاحی شانەگەر و حەمیدی پیاوی شێخ ئەمینی سندۆڵان لە ڕەواندزەوە بەرەو نەهری[54] بە ڕێکەوتن[55].

ئەحمەد تەقی لە نەهری چاوی بە مەحموود فازڵی وەکیلی قائیمقام کەوت و، لە گفتوگۆی نێوانیان مەحموود فازڵ ئاماژەی بە باشیی پەیوەندیی کەمالییەکان لەگەڵ کوردەکانی باکوور و سمکۆی شکاک دەکات. هەر بۆیە ئەحمەد تەقی ئەو هەڵە دەقۆزێتەوە و لە ڕێگای گەوەرەوە[56] دەچێتە چاری[57] لای سمکۆی شکاک تا لە ڕەوشی ڕەواندز ئاگاداری بکات، بەڵام سمکۆ لە وتەکانیدا بە ئەحمەد تەقی دەڵێ: "ئێستا ئینگلیز زۆر بە هێزە و بەرەنگاری کردنی لەشکرەکانیان زۆر گرانە. لەو بڕوایەشدانیم کە تورک بە هێزەوە بەشداری بزووتنەوەکەی ڕەواندز بکات، من وا بە باشتر ئەزانم کە هەوڵ بدەین لە ئێراندا بزوتنەوەکەمان بە هێز بکەین و لێرە بتوانین کورد یەک خەین و پارێزگاری بکەین ئەمە بۆ وەزعی ئەمڕۆمان زۆر باشترە"[58].

شیاوی باسە لە دەمی مێوانداری ئەحمەد تەقی لای سمکۆی شکاک، تەلەگرافێک لە قەدری بەگی والی وانەوە بۆ سمکۆ دێت و داوای ئەوەی لێ دەکات کە بە زووترین کات نوێنەری ڕاپەڕیوانی ڕەواندزی بۆ ڕەوانە بکات، کاتێکیش ئەحمەد تەقی دەچێتە وان بۆ ماوەی چەند هەفتەیەک گفتوگۆ و ڕاوێژ لە تەک والیدا دەکات سەبارەت بە ڕەوانەکردنی هێزێکی تورک بۆ ڕەواندز، قەدری بەگیش حکومەتی ئەنکەرەی لێ ئاگاردار دەکات، تا سەرئەنجام بڕیاری هەناردنی هێزێکی تورک بە سەرکردایەتی محێدین بەگ بۆ ڕەواندز دەدرێت[59]. بەڵام دەبێ ئەوەش بزانین کە کەمالییەکان دەمێک بوو لە دەرفەتێکی وا دەگەڕان تا سوود لە ڕقی هەڵچووی کوردەکان وەربگرن لە دژی ئینگلیزەکان و، شوێن پێگەیەک بۆ

خۆیان لە ناوچەکەدا دامەزرێنن و، لە ڕێگای ئەوەوە پڕوپاگەندە بۆ گێڕانەوەی دەسەلاتیان بۆ ویلایەتی مووسڵ بکەن(٦٠).

ئەحمەد تەقی لە سەر فەرمانی قەدری بەگی والی، فەتاحی شانەگەر بۆ ڕەواندز ڕەوانە دەکاتەوە تا لە هەواڵی ناردنی هێزی تورک ئاگاداریان بکاتەوە، ئەوە لە لایەک، لە لایەکی تریش قەدری بەگ، حەمیدی پیاوی شێخ ئەمین و قومانداتێکی خۆی ڕەوانەی لای عەباسی مەحموود ئاغای پشدەری دەکات بۆ دڵنیابوون لە هەڵوێستی ئەوانەوە. کاتێکیش هەر یەک لە فەتاحی شانەگەرو حەمیدی پیاوی شێخ ئەمین بە جیا دەگەڕێنەوە و هەواڵی پەلەکردن لە چوونی هێزی تورک بۆ ئەو ناوچانە دەهێننەوە، وەرزی بەهار دادێت و هێزەکەی تورک بەرەو نەهری دەکەوێتە ڕێوە(٦١).

لە سەرچاوە مێژووییەکان سەبارەت بە مێژووی هاتنی هێزەکەی تورک بۆ ڕەواندز زانیاری جیاواز دەدەن بە دەستەوە. ئەحمەد تەقی لە یادداشتەکانیدا دەڵێ: "... لە نیسانی ١٩٢٢دا لەگەڵ محێدین بەگی یوزباشیدا حەرەکەتمان کرد"(٦٢). کەچی ڕەفیق حیلمی لە سەر زاری ئەحمەد تەقی دەگێڕێتەوە، گوایە هێزەکە لە مایسی ١٩٢١ هاتۆتە ڕەواندز(٦٣). بەلام هەندێکی تر ئاماژە بۆ حوزەیرانی ١٩٢١ دەکەن(٦٤). هەروەها لە تەلەگرافێکی کۆمیسیاری بالای بریتانی لە بەغدا کە بۆ وەزیری موستەعمەراتی بریتانی لە لەندەن ڕەوانەی کردووە، سەبارەت بە گەیشتنی هێزی تورک بۆ ڕەواندز دەڵێ: " ئێمە ڕۆ ناوەڕۆکی نامەیەکمان دەسگیر بوو کە بۆ غەفورخانی ناودەشت و نوری باویل ئاغا نێردرابوون کە لە لایەن محێدین بەگەوە کە سەرکردەی هێزی تورکە لە (وان) کە بە مێژووی ١٩٢١/٤/١٣ بۆ هەر دووکیانی ناردووە دەڵێ: [مەبەستی محێدین بەگە-توێژەر] بەرامبەر بەو شەڕەی لەگەڵ ئینگلیزەکان کردبوتان [مەبەستی شەڕەکانی هەریر و باتاسە-توێژەر] پیرۆزبایتان لێ دەکەم، بەم زووانە ئومێدەوارم تفەنگ و ڕەشاشتان بۆ بنێرم کە ئێستە گەیشتوونەتە (نەهری)، من خۆشم لە دوای ٥-٦ ڕۆژی تر دێمە ڕەواندز و لەگەڵ ئەحمەد ئەفەندیدا کە خەڵکی سلێمانییە ئیستکشافێک دەکەین و لەدوای ئەوە، هێز دەهێنمە ڕرواندز و هەرچیتان پێویست بێ جێبەجێ دەکەم و ئێستە (١٠) صندوق فیشەک ئامادەیە بەلام ولاغ دەس ناکەوێ، پێویستە خۆتان ولاغ بنێرن بۆ ئەو صندوقانە بۆ ئەوەی بیانگوێزنەوە لای خۆتان، کە خۆشم هاتم جبەخانەی تریش دەهێنم. هەروەها نامەیەکی والیی (وان)تان بۆ دەنێرم و هەرچی پێویست بێ تێیدا باس کراوە و روون کراوەتەوە، پێویستە هەمووی جێبەجێ بکرێ و(٥) ئێستر بنێرن بۆ گواستنەوەی فیشەکەکان"(٦٥). سەرئەنجامی ئەو بیرورا جیاوازانەی کە ئاماژەمان بۆ کردن سەبارەت بە مێژووی هاتنەوەی تورکەکان، بە پشتبەستن بە ناوەڕۆکی تەلەگرافەکەی کۆمیسیاری بالای بەریتانی لە بەغدا ڕەنگە هێزەکەی تورک لە بیستەکانی نیسانی ١٩٢١ هاتبێتەوە ڕەواندز.

هێزەکەی تورک دوای تێکەلبوونی لەگەڵ هێزێکی تر لە نەهری ژمارەیان بوو بە سەد سەربازو چوار پێنج ئەفسەر، کە هەموویان یەک تۆپ و دوو ڕەشاش و چەند تفەنگ و جبەخانەیەکیان پێ بوو(٦٦). بەلام نەبوونی متمانەی تەواو بە ڕاپەڕیوان محێدین بەگی هێنایە سەر ئەو بڕیارەی کە سەرەتا خۆی و چواردە سەرباز لەگەڵ ئەحمەد تەقی بچێتە ڕەواندز تا بە تەواودتی لە هەڵوێستی ناوچەکە تێبگەن. کاتێکیش محێدین بەگ لە هاتنی بۆ ڕەواندز چاوی بەو ئاپۆرە جەماوەرییە دەکەوێت، بە ناوی خۆی و کەمالییەکانەوە سوپاسیان دەکات و دەڵێ: " ... زۆر جێی داخی ئێمەی تورکەکان بوو، کە بۆ ماوەک لە یەکتری جیا بوو بوونەوە ئێستە وا سوپاس بۆ خوا دووبارە یەکمان گرتەوە... لە بەر ئەمە تکام وایە کە دوای ماندوو حەسانەوە، ئێزنم بدەن بگەڕێمەوە (شەمدینان)و عەسکەرەکانی لەوێ بە جێم هێشتوون بیانهێنمە ڕەواندز..."(٦٧). کاتێکیش ڕاپەڕیوانی ڕەواندز گوێ بیستی ئەو بڕیارە دەبن بە محێدین بەگ دەڵێن هەر لێرەوە دەنگ لە هاتنی هێزەکە بگێڕەوە، بەلام دوای گفتوگۆیەکی زۆر لە سەر ئەوە ڕێک دەکەون کە چواردە سەربازەکە لە ژێر

سەرکردایەتی نووری باویل ئاغا لە ڕەواندز بمێنێتەوەو، محێدین بەگ و ئەحمەد تەقیش بۆ نەهری بگەڕێنەوە. ئەحمەد تەقی سەبارەت بەو هەڵوێست و جەختکردنە لە هێنانی هێزی تورک دەڵێ: "... ئینجا بزانن بێ مەعنایی و کردەوەی حاکمە سیاسییەکانی ئینگلیز لەگەڵ دۆست و هاوکارەکانی خۆیاندا گەیشتووەتە چ رادەیەک کە وای لەو کوردانەی کوردستانی جنوبی کردبێ، بە زۆر وا لە تورک بکەن لەشکری خۆیان بنێرن بۆ یارمەتیدانیان لە دەرپەڕاندنی ئینگلیزدا، بە رادەیەکی وا کە سەربازەکانی (محی الدین) بەگ وەک بارمتە بنێرنەوە بۆ ئەوەی ناردنی مەفرەزەکە مسۆگەر بکەن و منیش بکەن بە(مباشر) کە هەوڵی ئەوە بدەم مەفرەزەکە زوو بگات. دیارە مەفرەزەیەکی سەد کەسی نرخێکی جەنگیی ئەوتۆی نییە و گومانی تێدا نییە کە هەموو زەحمەتی جەنگ و بە خێوکردنی شەرکەران هەر لە سەر ئەهالییەکە خۆی ئەبێ، ئەمەیان هەر بۆ ئەوە کرد کە خەڵک بزانن گوایا حوکومەتی تورکیان لە پشتە و بەمە هانیان بدەن و مەعنەویەتیان بەرز بکەنەوە..."[٦٨]. لێرەدا دەتوانرێ بوترێ، جگە لە خراپی مامەڵەکردنی حاکمەکانی ئینگلیز، سۆزی ئایینیش ڕۆڵی خۆی هەبووە، کە کەمالییەکان پروپاگەندەیان بۆ دەکرد، لەگەڵ لایەنگیری هەندێ لە کوردەکانی خواروو بۆ کەمالییەکان کە ئارەزووی هێنانەوەی دەسەڵاتی ئەوانیان دەکرد

و، لە دواتر بە "جلخوار" یان "تورکخوا" ناویان دەرکرد.

ئەگەرچی محێدین بەگ و ئەحمەد تەقی بە نیازی هێنانی پاشماوەی هێزەکە گەڕانەوە نەهری، بەڵام گۆڕانکاریی نێو سوپای تورک لە لایەک و، راسپاردنی محێدین بەگ بە ئەرکێکی سەربازی تازە لە لایەکی دیکەدا، ماوەیەکی تریشی لە هێنانی هێزەکە بۆ ڕەواندز دواخست، تا ئەوکاتەی بڕیاری ئەوە درا هێزەکە بخرێتە ژێر سەرکردایەتی مەحموود فازڵەوە. کاتێکیش مەحموود فازڵ بە خۆی و هێزەکەیەوە رووی کردە ڕەواندز، ئینگلیزەکان شێخ محەمەدی باڵەک و محەمەد عەلی ئاغای جوندیانیان لێهاندان تا ڕێگایان لێ بگرن، بەڵام بە هاویشتنی یەک تۆپ لە لایەن هێزەکەی تورک خۆیان نەگرت و بڵاوەیان لێکرد و تەسلیم بوون[٦٩].

بە هاتنی دەسەڵاتی تورک و بەپێی دەستووری ئەو کاتەی کەمالییەکان ئەنجومەنێکی میللی بۆ بەڕێوەبردنی ڕەواندز دامەزرا کە پێک هاتبوو لە:

- شێخ ڕەقیبی سورچی، سەرۆک
- ئەحمەد تەقی، جێگری سەرۆک
- ئەندامەتی هەریەک لە شێخ ئەمینی سەران، شێخ جەواد سەران، غەفورخانی ناودەشت و خدر ئاغای سەرچیا.
- ئەحمەد بەگی بگۆک، قائیمقامی ڕەواندز
- نووری باویل ئاغا، قوماندانی جەندرمە
- شەوکەت ئەفەندی، سەرۆکی شارەوانی[٧٠].

ئەنجومەنی میللی لە ڕەواندز دوای ڕێکخستنی کارەکانی لە یەکەمین کاریدا لە تەمووزی ١٩٢١ هێرشی کردە سەر ناوچەکانی هەریر و باتاس و توانییان دەسەڵاتی ئینگلیزەکانی تێیدا بکەنە دەرەوە[٧١]. بیستنی ئەو هەواڵە کاریگەری کردە سەر ناوچەکانی دەوروبەری، ئەوەتە میرانی قادر بەگ حاکمی ئینگلیزەکان لە شەقڵاوە بە نهێنی دەکەوێتە پەیوەندییەوە لەگەڵ هێزی ڕاپەڕینەکە لە ڕەواندز، فارس ئاغای زێباریش بۆ مەبەستی پیرۆزبایی لە شێخ ڕەقیب دێتە هەریرەوە و، شێخ ئەحمەدی بارزانیش سەردانی ڕەواندز دەکات و بیست لە چەکدارانی خۆی لە ژێر سەرکردایەتی شەریف ناوێک جێ دەهێڵێ و خۆی بەرەو بارزان دەگەڕێتەوە[٧٢]، ئەوە لە لایەک، لە لایەکی تریش ناوچەکانی رانیە و دەوروبەری پشێوی تێ کەوت و شەڕ و پێکدادان لە نێوان هێزەکانی ئینگلیز و بابەکر ئاغا لە لایەک و، هێزی هۆزەکانی ناوچەکە بە پاڵپشتی هێزی میللی ڕەواندز لە لایەکی ترەوە ڕوویدا[٧٣].

ئەوەی جێگای ئاماژە پێدان بێ، ئەو پشێوییە هاوکات بوو لەگەڵ مەسەلەی دەنگدان بۆ دەستنیشانکردنی فەیسەڵی کوڕی حوسێن (١٨٨٥-١٩٣٣) بە شای عێراق، وەلێ لە سۆنگەی ئامادەیی هێزی تورک لە ڕەواندزێدا، ئاکنجێیانی ناوچەکە نەیانتوانی لەو

بارەوە هیچ هەڵوێستێک وەرگرن[٧٤]. بۆیە ئینگلیزەکانیش لە بەرانبەر ئەو پێشڕەوییەی هێزەکانی تورک و بۆ بە دەستهێنانی مەرامەکانیان دەستەوەستان ناوەستن، بەڵکو لە سەرەتا بە هێزی ئاسمانی دەکەونە بووردومانکردنی ڕەواندز و ناوچەکانی دەوروبەری، ئینجا لە پاشان دەست بە هێرش دەکەن، ئەوەتە لە بروسکەیەکی کۆمیسیاری باڵا لە عێراق کە بۆ وەزیری موستەعمەرات ڕەوانەی کردووە دەڵێ: "... هێرشێکمان بە هاوکاری هێزە ئاسمانییەکان کرد لە ڕۆژی ٢٧ی کانوونی یەکەم، هێزەکانمان لە دوو فەوج و دوو پەلی پیادە، لە هێزەکانی (لیڤی)[٧٥]و هێزێکی پۆلیس لە هەولێر، کە هەموویان هەزار تفەنگێک دەبوون، ئەمڕۆ برووسکەیەکمان پێگەیشت تێیدا ئاگادارمان دەکاتەوە لە کشانەوەی هێزەکانی تورک و عەشایەری سوورچی لە باتاس و حەریرەوە بۆ ڕەواندز... "[٧٦]. واتە بەم شێوەیە بریتانییەکان توانییان دەست بەسەر ئەو ناوچانەدا بگرنەوە.

بە هاتنەوەی محێدین بەگ بۆ ڕەواندز و هێنانی هەندێ هێز و جبەخانەی تر هێزەکەی ڕەواندز گروتنیی زیاتری تێ کەوت، ئەوە لە لایەک، لە لایەکی دیکەش لەولاوە کەمالییەکان کەوتنە زیاتر خۆ تەیارکردن بۆ گێڕانەوەی دەسەڵاتیان بۆ ویلایەتی مووسڵ، هەر بۆیە مستەفا کەماڵ لە ١ی شوباتی ١٩٢٢ لە تەلەگرافێکیدا کە بۆ وەزیری بەرگریی ڕەوانەی کردووە دەڵێ: " ئێستا لە پێشڤە چوونە سیاسییەکاندا دەفامرێتەوە کە فەیسەڵ خەریکە حکومەتێک لە عێراق دابمەزرێنی، ئینگلیزەکانیش لە خۆ ئامادەکردن دان بۆ ئەوەی موسڵ لە ژێر ماندێتی خۆی دابی، ئیدی بۆ ئەوەی مووسڵ ڕزگار بکەن، کە بەشێکە لە میساقی نیشتمانیمان[٧٧] دەبێ سوپا بەرەو ناوچەی ڕەواندز بنێرین"[٧٨]. لە بەر ئەوە لە ١٧ی مارتی ١٩٢٢ ڕەمزی بەگیان وەکو قائیمقام لە ڕەواندز دامەزراند[٧٩]. کاتێکیش ڕەمزی بەگ لە کۆتایی مایسی ١٩٢٢ گەیشتە ڕەواندز جەختی لە سەر هاتنەوەی هێزەکانی تورک بۆ ناوچەکانی هەولێر و کەرکوک و سلێمانی لە ماوەیەکی کورتدا کرد[٨٠].

هەروەها کەمالییەکان بە مەبەستی گەیشتن بە مەرامەکانیان کەوتنە پەیوەندیکردن بە سەرۆک عەشیرەت و پیاوانی ئاینی ناوچەکەو لە ڕێگای پروپاگەندەی ئاینیەوە توانییان سەرنجی زۆربەیان بۆ لای خۆیان ڕابکێشن، ئەوەتە لە وەڵامی نامەیەکیدا والی دیاربەکر کە بۆ شێخ عەبدولسەمەد زادە و شێخ عەبدوڕڕەحمانی سەران[٨١] ڕەوانەی کردووە دەڵێ: " ... بزانن بە زانینێکی (یەقین) کە سەرکەوتنی کۆتایی هەر بۆ موسڵمانان دەبێ و ڕزگار دەبن لە سەلیبییەکان و بەکرێ گیراوە تێکشاوەکانیان. وە لە پێناوی ئەوەدا (ئۆزدەمیر بەگ)ی قایمقام و ئەوانەی لەگەڵیدان دەنێرین بۆلاتان و لە دواییدا هێزی تر ڕەوانە دەکەین بۆ ئەوەی بەشداریتان بکەن و تەنسیقی لەگەڵدا بکەن لە خودای بەرز دەپاڕێمەوە سەرتان بخات"[٨٢].

کاتێکیش ئۆزدەمیر لە ناوەڕاستی حوزەیرانی ١٩٢٢ گەیشتە ڕەواندز دەبوو لە پلە یەکی نانەوەی کێشە و ئاژاوەی تەواو دابێت و نەخشەیەکی گرنگ بۆ هاندانی خەڵک لە ناوچەکەدا بگێڕێت، هەربۆیە ڕایگەیاند کە ئەرکی گرتنەوەی سەرلەنوێی ویلایەتی مووسڵی لە ئەستۆدایە[٨٣]. کەچی لە نامەیەکیدا بۆ مستەفا کەماڵ دەڵێ: "هەر وەکو من تەماشا دەکەم و لێی ورد دەبمەوە، کوردی ئەو جێگایانە وەکو پێشوو نەماون، هەموو چاویان کردۆتەوە، بۆنی ئازادییان کەوتۆتە دەماغەوە هەوای حکومەتیان لە مێشکدا دەجوولێتەوە، ئەگەر ئێمە بۆ ئەمانە ئیدارەیەکی سیاسی پێک نەهێنین، زۆر دووری دەبینم بتوانین وەکو پێشان بیانخەینەوە ژێر حوکمەوە، دەبێنرێت کە لە هەموو لایەکەوە دەکۆشن بۆ ئەمە خۆیان لە ژێر حوکمی ئەو و ئەم ڕزگار کەن"[٨٤]. بەڵام لە پەیوەندیکردن و نامە گۆڕینەوەیدا ئۆزدەمیر لەگەڵ سەرۆک هۆزە کوردییەکاندا بە شێوازێکی دیکە گوزارشت دەکات و دەکەوێتە هاندانیان لە دژی ئینگلیزەکاندا. ئەوەتە لە نامەیەکیدا کە لە ٢٦ی حوزەیرانی ١٩٢٢ بۆ ڕەسوول ئاغای سەرۆکی هۆزی دزەیی ڕەوانەی کردووە دەڵێ: "... سوپاس بۆ خواوەند کە ئێمە هاتووینەتە ئەم

ناوچەیە تا پێی هێزە دەرەکییەکان کە لێرە حوکم دەگێرن، کورت بکەینەوەو ولاتە پیرۆزەکەمان رزگار بکەین، بە یارمەتی خوا بە زوویی دەست بە رێکخستنی خەڵک بۆ بەشداری لە راپەڕینێکی گشتی دەکەین"(٨٥). ئۆزدەمیر بە زیرەکی و لێهاتوویی خۆی رۆڵی کاریگەری گێڕا لە راکێشانی سەرۆک هۆزەکان و خەڵکی ناوچەکە بۆ لای خۆی، هەر بۆیە ئەحمەد تەقی لەو بارەیەوە دەڵێ: " ئۆزدەمیر کە بە رەگەز لە چەرکەسەکانی (میسر) بوو، پیاوێکی چالاک و زیرەک و خوێندەوارێکی باش بوو، شارەزاییەکی تەواوی لە رەوشت و خووی کوردەکاندا هەبوو، لە دەستووری عەشایری چاک ئەزانی قسە خۆش و قسەزان و وریا بوو، زۆر ئاقڵتر لەگەڵ سەرەک هۆزە کوردەکاندا ئەجوولایەوە، بۆیە بە پێچەوانەی حاکمە ئینگلیزەکان هەموویانی کردبوو بە ئەموستیلەو کردبوونی پەنجەی خۆی"(٨٦). هەروەها کەمال مەزهەریش لەو بارەیەوە دەڵێ: "... ئۆزدەمیر توانی لە نزیکەوە پێوەندی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری سەردارانی کورد دابمەزرێنی، هەزارو یەک گفتی شیرینی درۆی دانێ..."(٨٧). بۆیە دەتوانرێ بوترێ، ئۆزدەمیر یەکێک بوو لەو کەسایەتییە سیاسییانەی، کە زیرەکانە ناخی کۆمەڵگای کوردەواری خوێندبۆوەو دەیزانی خاڵی دەستەبەرکردنیان لە کوێیە، هەروەها ئاگاداری ئەوەش بوو کە سۆزی ئاینی چەند کاریگەرە بە سەر ئەو نەتەوە موسڵمانەوە. بۆیە سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە رۆژانە پێنج فەرزە قامەتی دەبەست و نوێژی دەکرد بە بەرچاوی خەڵکەوە(٨٨).

شپرزەیی باری ئینگلیزەکان بە گشتی و بوونی رەواندز بە پەناگای نەیارانیان بەتایبەتی، ئینگلیزەکانی هەراسان کرد، بۆیە لە ١٠ و ١١ی تەمووزی ١٩٢٢ فڕۆکەکانیان بۆردوومانی رەواندزیان کرد(٨٩). هەروەها کاتێکیش کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند کاپتن بۆند و کاپتن ماکنتی لە رۆژێکدا کوشت لەگەڵ سەید محەمەدی جەباری رووی لە رەواندز کرد، ئەوەندەی دیکە ئینگلیزەکانی ترساند(٩٠). چونکی لە راستیدا هاتنی هێزێکی وا بە سەرۆکایەتی رێبەرێکی فیداکاری لە خۆ بوردوو بۆ ئۆزدەمیر سەرکەوتنێک بوو، کە ئاواتی بۆ دەخواست و بەختی ئەوی بۆ هاندان و بەهێزکردن و راپەڕاندنی هۆزەکان دەجوولاند(٩١). کاتێکیش پشدەرییەکان پاڵپشتی خۆیان بۆ ئۆزدەمیر رەوانە کرد، ئۆزدەمیری هێنایە سەر بیری ئەوەی هێرش بکاتە سەر ناوچەکانی رانیەو دەوروبەری، سەرئەنجام لە کۆتایی ئابی ١٩٢٢ لە قوڵی شاور(٩٢) بۆ سەر دەربەندی رانیە بە سەرۆکایەتی ئاغاکانی پشدەر و، قوڵی ناودەشت(٩٣) بۆ سەر شەهیدان(٩٤) بە سەرۆکایەتی ئۆزدەمیر دەستیان بە پێشڕەوی کردو لەگەڵ ئینگلیزەکان کەوتنە شەڕەوەو لە ناوچەکانیان دەرکردن(٩٥).

سەرکەوتنی ئۆزدەمیر لە ناوچەکانی پشدەر کاریگەری کردە سەر تورکخواکانی کۆیە، هەر بۆیە هاتن بە پیل داواکاری ئەوەوە کە ئۆزدەمیر هێزێک رەوانەی ئەوێ بکا، بەڵام لەگەڵ چوونی هێزەکە بۆ رۆژی دواتر فڕۆکەکانی ئینگلیز بوردوومانی کۆیەیان کردو خەڵکی شارەکەی هێنایە سەر ئەوەی داوا لە تورکەکان بکەن هێزەکانیان لە کۆیە بکەنە دەرەوە(٩٦). ئەوە لە لایەک، لە لایەکی تر ئەو سەرکەوتنەی ئۆزدەمیر زەنگی مەترسی بۆ ئینگلیزەکان لە سلێمانی لێداو لە ئەیلولی ١٩٢٢ چۆڵیان کردو رەوشی شارەکەیان بە شێخ قادری برای شێخ مەحموود سپارد(٩٧). بۆیە ئۆزدەمیر لە نامەیەکیدا بۆ شێخ قادر دەڵێ: " ئەبێ باش بزانن... بستێ جێ لەو خاکانەی کە لە(میثاقی میللی)مانا دانراوە لە ژێر چنگی بێگانەدا نابێ بمێنێتەوە. ئینجا من بۆ ئەوە هاتمە کوردستان کە ئەم (حەقیقەت)ە لە برا خۆشەویستەکانی سەر بە ئێمەو هاوپەیمانەکانمان تێ بگەیێنم، تا وەک کوردەکانی برای دین و دۆستی دێرینمان نەبنە قوربانی سیاسەتی ئینگلیزە خائنەکان و بە هاندانی ئەوان کۆسپ و تەگەرە نەهێننە رێگەمان... لە بەر ئەوە کە سەرپاکی ولاتی (موصل) خراوەتە میثاقی میللی تورکەوە، هێزێکی خائینی وا بە بیر نایەت کە بتوانی و لە ناو سنوورەکانی میللی ئێمەدا فەرمان رەوائی بکا..."(٩٨).

ئینگلیزەکان لە ئاکامی ئەو

تێکشکانە گورچوبڕەی کە دووچاری هێزەکانیان هاتبۆوە، بۆ ماوەی چەند هەفتەیەک کەوتنە بۆردومانکردنی دێیەکانی (مەرگەو پشدەرو دۆڵی شاور)، کە سەرە ڕێگای هاموشۆی تورکخواکان بوو بۆ ڕەواندز، کە زەرەرو زیانێکی زۆری گیانی و ماڵی بە خەڵکی بێ سووچ و تاوانی ناوچەکە گەیاند[۹۹]. هەر بۆیە کەماڵ مەزهەر لەو بارەیەوە دەڵێ: " ... بڕواناکەم ئەو ڕۆژگارە لە هیچ قوژبنێکی وڵاتە ژێر دەستە فراوانەکانیان ئینگلیز بە ڕادەی کوردستان چەکی هەمە جۆرو، بە تایبەتی فڕۆکەیان بەکار هێنابێت ..."[۱۰۰].

ئەڵبەتە ڕێگا چارەی ئینگلیزەکان بۆ لێدان و دەرکردنی تورکەکان لە ڕەواندزو ناوچەکە دۆزینەوەی کەسێک بوو، تا بتوانن سوودی لێ وەربگرن، ئیتر لە ژێر پاڵەپەستۆی بوونی هێزی تورک و داواکاری زۆر هێنانەوەی شێخ مەحموود، لە کۆتایی ئەیلولی ۱۹۲۲ شێخ مەحموودیان هێنایەوە لە سلێمانی کردیانەوە بە حوکمدار[۱۰۱]. هەر چەندە شێخ مەحموود لە بەغدا بەڵێنی دەرکردنی تورکەکانی بە کۆمیسیاری باڵا دابوو، بەڵام نەچووە ژێر باری جێبەجێکردنی ئەو بەڵێنەوە، لە بەر ئەوەی وای خرابووە مێشکەوە، کە تورکەکان ویلایەتی مووسڵ وەردەگرنەوە یان بە زۆری چەک دەیگێڕنەوە، ئەوە لە لایەک و، لە لایەکی دیکەش لە ڕۆژنامەکانی ئەورووپا بە گشتی و بریتانییەکان بە تایبەتی گەلی بریتانی داوای دەکرد هێزەکانی لە عێراق و کوردستان بکشێنێتەوەو خۆیان نەخەنە ژێر باری دارایی جەنگەوە[۱۰۲]. ئیتر لە ژێر ئەو کاریگەرییەو ناڕاستی ئینگلیزەکان لەگەڵی، شێخ مەحموود هەوڵی نزیکبوونەوەی دا لە ئۆزدەمیر، ئۆزدەمیریش ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ هەوڵی ڕاکێشانی شێخ مەحموودی دەدا، ئەگەر بزانین لە کاتی هاتنەوەیدا بۆ سلێمانی لە نامەیەکیدا بۆ شێخ مەحموود وتوویەتی: "لەوە کە (مەفرەزەیەکی تورک)م ناردوەتە دەوری سلێمانی، زۆر تکام هەیە، خەیال نەفەرموون شتێکی خراپم بە دڵا هاتبێ لە لایەن کردەوەیەک کە خوانەخواستە لەوانە بێ لە ئێوەوە ڕووبدا، ئێمە هەر لەدەمێکەوە باسی ڕاستی و یەک ڕەنگی و پاکیی ویژدانی ئێوەمان بیستووە و تێگەیشتووین کە بەرامبەر بە دەوڵەت و میللەت (دەوڵەت و میللەتی تورکی مەبەستە) پەیوەستەییەکی بە هێزو خۆشەویستییەکی بیریاتان هەیە. لە بەر ئەوە ناوی ئێوە (واتە شێخ مەحموود) لە دڵ و گیانی ئێمەدا جێگەیەکی بەرزو بەرێزی داگیر کردوە..."[۱۰۳]. لێرەدا دەتوانرێ بوترێ، ئۆزدەمیر زیرەکانە هەوڵی داوە شێخ مەحموود بە لای خۆیدا ڕابکێشێت و لە دڵ پاکی و دڵی سافی خۆی و تورکەکان دڵنیای بکاتەوە، ئەگەرچی تا ئەو کاتەش هەڵوێست و سیاسەتی شێخ مەحموودی لا ڕوون نەبووە، لە بەر ئەوەی لە بەشێکی تری نامەکەیدا دەڵێ: " ئێمە ئیتر بەمانەوە ئەوەندە مەبەس نییە کە(مەفرەزە)کەمان بێتە ناو شاری سلێمانییەوە یان نە؟ چونکە هاتنی ئێوە (واتا شێخ مەحمود) بۆ سەرکار لە ڕووی مەسڵەحەتی دەوڵەت و غایەی نیشتمانییەوە، ئێمە (واتا بۆ تورک) بەسە ئینجا تا نامەتان ئەگاو ئەو سیاسەتە، کە بە تەمان لە سەری بڕۆن بۆمان ڕوون ئەکەنەوە مەفرەزەکەمان لەو جێگەیەدا ئەوەستێنین، کە ئێستە لێیەتی ئەگەر بێتو ئێوە بە مەسڵەحەتی بزانن تادەوری (ڕانیە)ش ئەیکێشینەوە"[۱۰٤].

جێگای ئاماژە بۆ کردنە هاتنی لە ناکاوی سمکۆی شکاک بۆ خواروی کوردستان دوای تێکشکانی لە دەست تورکەکان وەرچەرخانێکی نوێی لە ڕەوتی ڕووداوەکاندا پێک هێنا[۱۰۵]، لە بەر ئەوەی لە لایەک مێجەر نۆئێلی خستە سەر بیری ئەوەی کە لەگەڵ سەید تەهای نەهری و شێخ مەحموود یەکیان خات و بیانکا بەگژ ئۆزدەمیرا[۱۰٦]، لە لایەکی دیکەش سەید تەها بێ هاوکاری سمکۆ کەوتە ڕێکەوتن لەگەڵ ئینگلیزەکان و بە هێزێکی ۱۵۰ کەسی لە ناوەڕاستی تەشرینی دووەمی ۱۹۲۲ هێرشی کردە سەر ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئۆزدەمیر، ئەگەرچی سەید تەها لە شەڕەکاندا سەرکەوتنی تەواوی بە دەست نەهێنا بە هۆی باران بارینێکی زۆر لە ناوچەکەدا، بەڵام توانرا دەست بگرنەوە بە سەر ناوچەکانی ڕانیەو

دەوروبەریدا لە ژێر کاریگەری هێزی ئاسمانی ئینگلیزەکاندا[١٠٧]. لێرەشدا دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە ئەو هێرشانە هاوکات بوو لەگەڵ دانیشتنی نوێنەری ئینگلیزەکان و کەماڵییەکان لە لۆزان، هەر بۆیە وەزارەتی کۆلۆنیای بریتانی فەرمانی دا بە کۆمیسیاری باڵا کە ئیتر هێرش نەکرێتە سەر سەنگەرەکانی تورک هەتا لە ناو خاکی عێراقیش دابێت، بەڵام کۆمیسیاری باڵا، دەڵێت: خۆشبەختانە ئەو فەرمانە درەنگ گەیشت[١٠٨].

بە هاتنی سمکۆ تورکەکان بە گشتی و ئۆزدەمیر بە تایبەتی ترسی ئەوەیان لێ نیشت، نەکا بداتە تەک ئینگلیزەکان و هاوکارییان بکات. لەبەرئەوەی بەسری بەگی قوماندانی جەبهە نامەیەک ئاراستەی ئۆزدەمیر دەکات و دەڵێ: " سمکۆ کابرایەکی فێڵبازە بە هۆی زرنگی خۆیەوە ئەو خەنجەرە، کە هەڵیگرتووە بۆ کاتی خۆی ئەشارێتەوە... دەرکەوتنی سمکۆ لە ناو عەشایری کوردا بەم جۆرە گەورە بوونی و دەسەڵات پەیاکردنی بۆ (حکومەتی میللی) ئێمە (واتا بۆ حکومەتی تورک) دەس نادا..."[١٠٩]. هەروەها کاتێکیش سمکۆ بەرەو سلێمانی بۆ لای شێخ مەحموود دەکەوێتە رێ، ئۆزدەمیر دەکەوێتە ئەندێشەیەکی گەورەوە، بۆیە لە لایەک فەوزی بەگ، رەمزی بەگ و ئەحمەد تەقی رەوانەی سلێمانی دەکات[١١٠] لە لایەکی دیکەش لەگەڵ کۆمەڵەی (کرکوک مدافعە حقوق جمعیتی[١١١])دا دەکەوێتە نامە گۆڕینەوەو دەڵێ: " ئەو نامانەی کە (سمکۆ) بۆ سەرەک عەشیرەتەکانی کوردی ناردبوو، لە رێگە کەوتە دەس ئێمە. بە راستی (خەیانەت و جەنایەت) هەر ئەمەندە ئەبی (سمکۆ) لەم نامانەدا ئەڵێ: بەو هێزانەوە کە لە هەولێر و سلێمانی پێکیەوە ئەنێم پەلاماری تورکەکانی (رەواندز) ئەدەم. ئێوەش بە خۆتان و عەشایرتانەوە بە رواڵەت بۆ کۆمەک تورکەکانی و یارمەتیدانی ئەوان بچنە لای ئۆزدەمیر بۆ رەواندز و بیگرن. دوای ئێوە منیش بە هێزەکەی خۆمەوە هەڵ ئەکوتمە سەر (رەواندز)و هەر زابت و عەسکەرێکی کە لە وێ بێ ئەیانکوژین و شارەکە لە تورک پاک ئەکەینەوە ..."[١١٢]. لێرەدا بە دیاردەکەوێت کە سمکۆ بۆ مەبەستی ئەوە چۆتە سلێمانی تا هاوکاری و هەماهەنگی لە شێخ مەحموود وەربگرێت و لە هێزەکەی ئۆزدەمیر بدات هەر بۆیە لە نامەکەیدا بەردەوام دەبێت و دەڵێ: "... من لەو باوەڕەدام کە تا سمکۆ لە سلێمانی بێ هەرچی ئەکرێ و یا بمانەوێ بیکەین، لەوانەیە سەر نەگرێ و یا بە پێچەوانەی مەبەسی ئێمە، بێتە دی... "[١١٣]. لێرەدا رای خۆمان دەخەینە تەک ئەو لێکۆڵەرەوەیەی، کە دەڵێ: " دوور نییە ئینگلیزەکان هەر خۆیان ئەو نامانەیان بە ناوی سمکۆوە نووسیبی و وێنەیەکیشیان بۆ ئۆزدەمیر رەوانە کردبی تا نێوانی بە تەواوەتی لەگەڵ تورکەکان تێک بچێت و لە کاتی چوونیشی بۆ سلێمانی سمکۆو شێخ مەحمود لە تورکەکان دوور بخەنەوە"(١١٤). چونکی ئینگلیزەکان لەو بارەیەوە دەستێکی باڵایان هەبووە.

سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە سمکۆ لە دوای گەیشتنی بۆ سلێمانی بە پێچەوانەی ویستی ئینگلیزەکان و لە ژێر کاریگەری تورکخواکان دەکەوێتە رێکەوتن و لە رێگای سنووری دەسەڵاتی ئۆزدەمیرەوە دەگەڕێتەوە ناوچەکانی سەر سنوور[١١٥]. بەڵام دەتوانرێ بوترێ، کە سمکۆ لە ژێر گوشاری جگەرگۆشەکەی (خەسرەو) کە دیل بوو لای تورکەکان، لە لایەک و، دەستکەوتنەوەی خەزینە دەست بە سەر گیراوەکەی لە لایەکی دیکەدا، کەوتە ژێر کاریگەری تورکخواکان و لەگەڵ تورکان کەوتە رێکەوتن.

سەرئەنجامی گفتوگۆی نێوان نوێنەری ئۆزدەمیرو شێخ مەحموود لە سلێمانی هەر دوولا دێنە رێکەوتن لە سەر رەوانەکردنی وەفدێک بۆ رەواندزو لە وێشەوە بۆ ئەنقەرە، هەر بۆیە شێخ مەحموودی حەفید، فایەق تاپۆ، فەتاحی ژن برای، ئەحمەد تەقی و رەفیق حلمی رەوانە کرد[١١٦]. بەڵام لە کاتی چوونی نوێنەری شێخ مەحموود بۆ رەواندز رەوشی ناوخۆی ئەوی گرژی تێ کەوتبوو بە هۆی ململانێی نێوان حاجی نەورۆز ئەفەندی، محەمەد عەلی ئاغای جوندیانی و شێخ محەمەد ئاغای وەلاش لە لایەک و نووری باویل ئاغاو شێخ رەقیب لە لایەکی دیکەدا کە ئۆزدەمیر رۆڵی کاریگەری تێیدا دەگێڕا[١١٨].

ئیتر بە بیستنی ڕێکەوتنی شێخ مەحموودو تورکەکان و بێ هیواییان لە هاوکاری کردنیان، ئینگلیزەکان بە دوو قۆڵەوە هێرشیان کردە سەر ڕەواندز، قۆڵی کۆیە بە سەرکردایەتی سەرهەنگ ڤنست کە مەبەستی دابڕان و دوورخستنەوەی شێخ مەحموود بوو لە تورکەکان، لەگەڵ قۆڵی سنوور بە سەرکردایەتی سەرهەنگ دوبس، بە هاوکاری لەگەڵ هێزی ئاسمانی چوونە پێشەوەو، ئۆزدەمیر بە بێ بەرگری لە ڕێگای سنووری ئێرانەوە هەلات و لە ٢٢ی نیسانی ١٩٢٣ ئینگلیزەکان ڕەواندزیان داگیر کردەوە[119]. ئەنجام ئینگلیزەکان بە هاوکاری لەگەڵ حکومەتی عێراقی کە بە پرس و ڕای ئەوان بەڕێوە دەچوو کەوتنە بەڕێوەبردنی ئەو ناوچانەوە[120]. بە مەش ڕەوشی سیاسیی ڕەواندز پێ ینایە قۆناغێکی نوێترەوە.

**پەراوێزو سەرچاوەکان:**


١- سیسیل جۆن ئیدمۆندس، کورد تورک عەرەب، وەرگێڕانی: حامید گەوهەری، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٤، ل ٥٤.
٢- بۆ زانیاری زیاتر لە مەڕ ڕاگەیاندنی حوکمداریەتی شێخ مەحموود بڕوانە: ڕەفیق حلمی، یادداشت-کوردستانی عیراق و شۆڕشەکانی شێخ مەحمود، بەرگی یەکەم، بەغدا، ١٩٥٦، ل ٦٢.
٣- مێجەر نۆئێڵ کە لە پێشتر کاپتن نۆئێڵ بوو: ئەفسەرێکی بریتانی چالاک و هێمن بوو و شارەزایی باشی لە زمانی فارسیدا هەبوو، هەروەها زانیاری باشی لە سەر هۆزەکانی ڕۆژهەلات هەبوو و چاکیش لە سەرکردەکانیان دەگەیشت. لە سەرەتا لە ناو بەختیارییەکان کاری دەکرد، کەچی دواتر لە سالآنی کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانی توانی پەیوەندی باش لەگەڵ سەرۆک هۆزە کوردەکان پەیدا بکات و زمانی کوردی بە باشی فێر بێت. هەرچەندە مێجەر نۆئێڵ ماوەیەکی کورت لە کوردستاندا مایەوە، بەلآم سەرنجی زۆر خەلکی بەلای خۆیدا ڕاکێشا تا نازناوی (لۆرانسی کوردی)یان پێ بەخشی. د. كمال مظهر أحمد، كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، ص ص ١٨٦-١٨٧.
٤- السر أرنولد ويلسن، الثورة العراقية، ترجمة: جعفر الخياط، مطبعة دار الكتب، بيروت، لبنان، ١٩٧١، ص ١٨٤: لوسيان رامبو، الكرد و الحق، ترجمة: عزيز عبدالاحد عوديش، الطبعة الاولى، مطبعة وزارة الثقافة، اربيل، ١٩٩٨، ص ٧٥: جرجيس فتح الله، المصدر السابق، ص ص٢٠٩-٢١٠.
٥- کەماڵ نوری مەعرووف، یادداشتەکانی شێخ (لەتیف)ی حەفید لەسەر شۆڕشەکانی شێخ مەحموودی حەفید، چاپی یەکەم، لە بلاوکردنەوەی مەکتەبی ناوەندی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنی پارتی دیموکراتی کوردستان، بێ شوێنی چاپ، ١٩٩٥، ل ل ٤٠-٤٢.
٦- المس بيل، فصول من تاريخ العراق القريب، كتاب يبحث عن العراق في عهد الاحتلال البريطاني بين سنتي ١٩١٤و ١٩٢٠، ترجمة: جعفر الخياط، ١٩٧١، ص ١٩٢.
٧- حسین حزنی موکریانی، مێژووی میرانی سۆران، چاپی دووەمین، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، ١٩٦٢، ل ١١٤.
٨- سير أرنولد ويلسن، المصدر السابق، ص ١٨٤.
٩- حسین حزنی موکریانی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٤.
١٠- بڕوانە: م. ر. هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان و دەولەتەکەی خوارووی کوردستان، بەرگی یەکەم، لەندەن، ١٩٩١، ل٤٩٤و بەدواوە: ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی، شاری سلێمانی ١٩١٨-١٩٣٢ لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی/ سیاسییە، چاپی یەکەم، چاپخانەی زانست، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل ١١٥.
١١- ڕەفیق حلمی، سەرچاوەی پێشوو ل ١٢٩.
١٢- ڕەفیق حلمی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٩.
١٣- نووری باویل ئاغا کوڕی باویل ئاغا کوڕی مەلا عەزیزە و ساڵی ١٨٩٢ لە ڕەواندز لە دایک بووە، بە منداڵی لە حوجرە

خـــوێندوویەتی و دواتریش لە قوتابخانەی روشدیە لە رەواندز. دوای ئەوەی کـە ئینگلیـزەکـان رەواندزیان داگیـر کـرد کـردیانە بەڕێوەبەری پۆلیـسـی رەواندز، بەڵام زۆری پێ ناچێت نێـوانی لەگەڵ حاکمی ئینگلیزەکان تێک دەچـێـت و بـەرووبـانـدا هەڵدەگەڕێتەوە (کە دواتر باسی لێـوە دەکـەین). نووری ئاغـا بەشـداری شـۆڕشی (١٩٤٣-١٩٤٥)، بارزانی کـردووە لەگەڵ شـۆڕشی ئەیلول تا لە سـاڵی ١٩٦٣ بە هۆی نەخـۆشـیـیـەوە کۆچی دوایی کردو لە گۆڕستـانی گـەردە گـەرد لە رەواندز نێـژراوە. عـــەلی بـاویـل ئـاغـــا، بیـرەوەرییـەکـانی عـەلی باویل ئاغا.

١٤- أي، ام، هاملتـون، طريق في كردستان، ترجمة: جرجيس فتح الله، الطبعة الثانية، دار ئاراس للطباعة والنشر، مطبعة وزارة التـربيـة، اربيل، ١٩٩٩، ص ٢٢٠.

١٥- رەفـيـق حلمي، سـەرچاوەی پێشوو، ل١٣٠.

١٦- رەفـيـق حلمي، سـەرچاوەی پێشوو، ل ١٣١-١٣٢.

١٧- بـاويـل ئاغـــا، ناوی تەواوی ئەبوبەکر کوڕی مەلا عەزيز کوڕی مـەلا عـەبدوڵڵایە و لە رەواندز لە دایک بووە، دایکی مـیـمـەخـان کـچی حـوسێن بەگی داسنیـیـە. ناوبراو بەشـداری لە جـەنگی جیهانی یەکەم کردووە و بەرگری لە شـاری رەواندز کـردووە لە دژی سـوپای رووسـەکـان. دواتریش لەگـەڵ هاتنی ئینگلیـزەکـان (دەکـرێتـە حـاکـمی رەواندز)و پەیوەندی باشی لەگەڵ یاریدەدەری حـاکـمی سـیـاسـیی ئینگلیـز دادەبێت، بەڵام بە هۆی کێشەیەک لە نێـوان نووری کـوڕی و حـاکـمی ئینگلیزەکان ئەو پەیوەندییە تێک دەچێت و نامێنێت. کە دواتر بە تەسـەلتـر باسی لێـوە دەکـەین. عـــەلی بـاویـل ئـاغـــا، بیـبـرەوەرییـەکـانی عـەلی باویل ئاغا.

١٨- سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣٣.

١٩- دبليــو. أ. هي، سنتــان في كــردســتــان ١٩١٨-١٩٢٠، ترجمة: فؤاد جميل، الجزء الاول، الطبعة الاولى، مطبعة الجاحظ، بغداد، ١٩٧٣، ص ٢١٩.

٢٠- کـێـشـەی نێـوان حـاکـمی ئینگلیـزەکـان لە رەواندز لەگـەڵ نووری باویل ئاغـــا لە ســەر پۆلیسێکی لاوی خەڵکی دەرگەڵە بوو، لە بەر ئەوەی ئەو پۆلیـسە بە غـەدر و بە دەستی ئەنقـەست لە ڕێگای نێـوان رەواندز و دەرگـەڵە کـابرایەکی عـەرەبی مـووسـڵاوی بازرگـان دەکـوژێت و هەڵدێتـە گـوندی رۆسـتی. یاریدەدەری حاکمی سیاسیی بریتانیش نووری بـاویـل ئـاغـــا بـە کـــاری دەسـتـگـیـرکـردنی ئەو تاوانبـارە رادەسـپـێـرێت و نووریش دەسـتـگـیـری دەکـات. بەڵام دوای هێنانەوەی بەندییەکە بۆ رەواندزو دەرکردنی فەرمانی لە سێدارەدانی لە لایەن کـاپتن کـێـرک، نووری باویل ئاغـا لە سـەر فـەرمـانی باوکی سـەرپێچی لە فـەرمـانی یاریدەدەری حـاکـمی سـیـاسـیی دەکات، لە بەر ئەوەی ناوبراو ئەو لاوەی دەستگیری کردووە نەکا لە دوارۆژ دوژمنداری بۆ بنەماڵەکەی لەگـەڵ مـیـرانی دەرگـەڵە دروست بکات. ئیتر سەرکێشی کردن لەو بڕیارە دەبێـتە سـەرەتای ناکـۆکی نێـــوان نووری باویل ئاغـــاو ئینگلیزەکان. عەلی باویل ئاغا، بیبـرەوەرییـەکـانی عـەلی باویل ئاغا.

٢١- سـتـيـفن همـسلي لونـگريك، العـراق الحديث من سنة ١٩٠٠ الى سنة ١٩٥٠ تاريخ سياسي، اجتماعي، واقتصادي، ترجمة: سليم طه التكريتي، الجزء الاول، الطبعة الاولى، بغداد، ١٩٨٨، ص ١٧٠: المس بيل، المصـــدر السابق، ص٢١٥.

٢٢- حاجی نەورۆز لە نەوەی وەستا رەجـەب دروسـتـکـەری تۆپەکـانی سـەردەمی مـیـر مـحـەمـەد پاشـای رەواندزە، ئێستاش بنەماڵەیەکی بەناوبانگن لە رەواندز، بە داخەوە زۆرم هەوڵدا شـتـێـک دەربـارەی مـێـژووی ژیان و مـردنی بزانم لەگـەڵ کـارەکـانی، بەڵام دەسـتم نەکەوت.

٢٣- المصدر السابق، الجزء الاول، ص ٢٣٧.

٢٤- ئیسماعیل بەگ کوڕی سەعید بەگ کـوڕی عـەولا پاشـا کـوڕی

بەکر بەگ کوڕی بایز بەگی باپشتییە، بەکر بەگ مامی میر محەممەد پاشای ڕەواندزییە. ئیسماعیل بەگ ساڵی ١٨٩٥ لە ڕەواندز لە دایک بووە، لە تەمەنی نۆزدە ساڵی بۆتە حاکمی ڕەواندز و دواتریش بە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی حکومەتی عێراقی کە ڕۆڵی کاری تێیدا لەو ماوەیەدا بینیوە (کە دواتر باسی لێوە دەکەین)، ناوبراو گەلێک بە پەرۆشی خزمەتکردنی کوردستان بە گشتی و ناوچەکەی بە تایبەتی بووە تا لە ٨ی حوزەیرانی ١٩٣٣ لە دۆڵی نیشاوی لە لایەن بنەماڵەی باویل ئاغا کە دوژمنداری یەکتر بوون دەکوژرێت. ئەسعەد عەدۆ، کارەساتی دۆری نیشاوی لە نێوان فۆلکلۆر و مێژوودا، کۆڕێک لە یەکێتی نووسەرانی کورد لقی هەولێر، لە سەر کاسێت تۆمارکراوە.

٢٥- هي، المصدر السابق، الجزء الثاني، ص ٢٥.

٢٦- عەلی باویل ئاغا، بیرەوەرییەکانی عەلی باویل ئاغا: مستەفا جندیانی، چەند لاپەڕەیەکی پشنگدار لە مێژووی شۆڕشی گەلی کورد لە ڕواندز ١٩١٨-١٩٢٢، بەشی یەکەم، گۆڤاری ڕواندز، ژمارە(٢)، ساڵی ١٩٩٨، ل ٤٠.

٢٧- هي، المصدر السابق، الجزء الثاني، ص ص ٧٣، ٧٩.

٢٨- هي، نفس المصدر، ص ٧٩.

٢٩- هاملتون، المصدر السابق، ص ٢٢٢.

٣٠- جەماڵ نەبەز، کوردستان و شۆڕشەکەی، وەرگێڕانی: کوردۆ، بێ شوێنی چاپ ١٩٨٥، ل ١٤٦: د. کمال مظهر أحمد، دور الشعب الكردي في ثورة العشرين العراقية، مطبعة الحوادث، بغداد، ١٩٧٨، ص ٨٧-٨٨: د. عەبدوڵڵا ئەبریشەمی، نەتەوەخوازی، وەرگێڕانی: سەلاحەدین ئاشتی، چاپی یەکەم، چاپخانەی شڤان، بێ ساڵی چاپ، ل١٥٩.

٣١- السر آرنولد ويلسن، المصدر السابق، ص ١١٦: د.کەماڵ مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم، ١٩٨٥، ل ١٦٨.

٣٢- هي، المصدر السابق، الجزء الثاني، ص ١١٥.

٣٣- هۆزی سورچی: هۆزێکی گەورەن و بەشێکی زۆریان لە ناو سنووری ئێراندان و بەشەکەی تریش لە عێراق لە ناوچەکانی ڕەواندز و ئاکرێ هەن. عباس العزاوي، المصدر السابق، ص ١٣٧.

٣٤- گوندی بەردین. دەکەوێتە بەرانبەر گوندی بێخمە-قەندیل سەر بە ناحیەی هەریرە.

٣٥- عبدالمنعم الغلامي، ثورتنا في شمال العراق ١٣٣٧-١٣٣٨هـ ١٩١٩-١٩٢٠م، الجزء الاول، مطبعة شفيق، بغداد، ١٩٦٦، ص ٨٩: د. حامد محمود عيسى، المشكلة الكردية في الشرق الاوسط، مكتبة مدبولي، مطبعة اطلس، القاهرة، ١٩٩٢، ص ١٣١: عوسمان عەبدولرەحمان سمایل، هەولێر و شۆڕشی (١٩٢٠)ی عێراقی، گۆڤاری هەولێر، ژمارە(١٦)، هەولێر، پاییزی ٢٠٠٢، ل ١١٣.

٣٦- خەلیفان: بە دووری نەوەد کیلۆمەتر لە باکووری ڕۆژهەڵاتی هەولێرەوەیە.

٣٧- کانی وەتمان: ئێستا گوندێکە دەکەوێتە پشتی خەلیفان.

٣٨- عەلی باویل ئاغا، بیرەوەرییەکانی عەلی باویل ئاغا: مستەفا جوندیانی، چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی شۆڕشی کورد لە ڕواندز، بەشی دووەم، گۆڤاری ڕواندز، ژمارە(٣-٤)، ساڵی ١٩٩٩، ل ٣٠.

٣٩- والاش دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی شارۆچکەی قەسری ئێستاکە.

٤٠- محەممەد عەلی ئاغای جوندیانی، یەکێک بووە لە کەسایەتییە ناودارەکانی ناوچەو ڕۆڵی کاریگەری هەبووە، دوای جەنگی یەکەمی جیهانی یەکێک بووە، لە پیاوە نزیکەکانی ئینگلیز. دواتریش ماوەیەک بۆتە سەرۆکی شارەوانی ڕەواندز. هەروەها ناوبراو لە خولی حەوتەمی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراقی بە نوێنەرایەتی لیوای هەولێر بۆتە ئەندامی ئەنجوومەن.

محەمەد عەلی ئاغا لە ساڵی١٩٥٣ کۆچی دوایی کردووە. دیمانەیەک لەگەڵ ئەحمەد محەمەد عەلی ئاغای جوندیانی لە ١٢ی حوزەیرانی٢٠٠٥ هەولێر: ئەحمەد حەمەد ئەمین ئۆمەر، ئەندامە کوردەکانی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراقی لە رۆژگاری پاشایەتیدا (١٩٢٥-١٩٥٨)، لە ئامادەکردندایە بۆ چاپ.

٤١- هي، المصدر السابق، الجزء الثاني، ص ١٦٦: د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم، ل ١٦٩.

٤٢- سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٩.

٤٣- المصدر السابق، ص ٢٢٤.

٤٤- عبدالمنعم الغلامي، المصدر السابق، ص ٨٤ و مابعدها: د. حامد محمود عيسى، المصدر السابق، ص ص١٢٩-١٣٠: د. عزيز الحاج، القضية الكردية في العشرينات، الطبعة الثانية، مطبعة الانتشار، بغداد، ١٩٨٥، ص ص ١١٥-١١٧.

٤٥- یوسف بەگ: زاوای حاجی نەورۆز ئەفەندی بوو کاتێک مێجەر نوئێڵ هاتە ناوچەکە کردی بە سەرداری هەندێ لە ناوچەکانی دەوروبەری رەواندز، بەڵام بە هۆی سەرکێشی کردنی لە دەسەڵاتی ئینگلیزەکان لە دواتردا هەوڵی ئەوەیان دا لە ناوی ببەن، سەرئەنجام دوای گیرانی لەسەر مەسەلەکی کەسیی لە شەوێکدا خنکێنرا. هی، المصدر السابق، الجزء الثاني، ص ص ٩-١٠، ١٥-٢٢.

٤٦- ئەحمەد تەقی کەسایەتییەکی نشتیمانپەروەری خەڵکی سلێمانی بوو و بە یەکێک لە کەسایەتییە نزیکەکانی شێخ مەحموود دەژمێردرێت، ناوبراو رۆڵی کاریگەری هەبوو لە هێنانەوەی هێزی تورکەکان بۆ باشووری کوردستان بە گشتی و رەواندز بە تایبەتی، کە دواتر باسی لێوە دەکەین. ناوبراو لە ١٣ی کانوونی دووەمی ١٩٦٠ کۆچی دوایی کردووە. جەلال تەقی، خەباتی گەلی کورد لە یادداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا لاپەڕەیەک لە شۆڕشەکانی شێخ مەحمود، سمکۆ، "هەستانەکەی رەواندز و پەیوەندی بە وڵاتانەوە"، چاپخانەی سلمان الاعظمي، بەغدا، ١٩٧٠.

٤٧- جەلال تەقی، هەمان سەرچاوە، ل ل ٤٤-٤٥.

٤٨- ئیسماعیل ئاغا (١٨٩٥-١٩٣٠) ناسراو بە سمکۆ کوڕی محەمەد ئاغای سەرۆکی هۆزی شکاکە، دوای مردنی باوکی و کوشتنی جەعفەر ئاغا برای دەسەڵات دەگرێتە دەست و سەرکردایەتی بزاڤی رزگاریخوازی کوردستان لە رۆژهەڵاتی کوردستان دەگرێتە ئەستۆ، ناوبراو گەلێک جار بەر رووی دەسەڵاتدارانی ئێرانی و تورکی شۆڕشی هەڵگیرساند هەر ئەوەش بوو مەترسی بۆ ئەوان دروست کرد، بۆیە بەردەوام هەوڵی لەناوبردنیان دا تا بۆسەیان بۆ نایەوە لە شنۆ ساڵی ١٩٣٠ کوشتیان. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: کریس کۆچێرا، کورد لە سەدەی نۆزدە و بیستدا، وەرگێڕانی: حەمە کەریم عارف، چاپی یەکەم، چاپخانە و ئۆفسێتی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل٥١ بەدواوە.

٤٩- جەلال تەقی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٥.

٥٠- رەمزی قەزاز، بزووتنەوەی سیاسی و رۆشنبیریی کورد لە کۆتایی چەرخی نۆزدەهەمەوە تا ناوەڕاستی چەرخی بیست، چاپخانەی ژین، ١٩٧١، ١٣٦.

٥١- محەمەد رسول هاوار، سمکۆ (ئیسماعیل ئاغای شوکاک)و بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کورد، چاپخانەی ئاپێک، سوید، ستۆکهولم، ١٩٩٥، ل ٣٣٣: حەسەن ئەرفەع، کوردەکان، وەرگێڕانی: سەردار محەمەد، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠١، ل ١٦٦،

٥٢- جەلال تەقی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٥.

٥٣- عەلی شەفیق ناسراو بە ئۆزدەمیر ئەفسەرێکی لێهاتووی تورک و لایەنگیری مستەفا کەماڵ بوو، بە رەگەز لە چەرکەسییەکانی میسر بوو، لە حوزەیرانی ١٩٢٢ هاتە رەواندزو

رۆڵی کاریگەری بینی (کە دواتر باسی لێوە دەکەین). د. کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم، ل ١٢٠.
٥٤- نەهری: مەرکەزی ناوچەی شەمدینانە لە هەرێمی هەکاری، کە دەکەوێتە سنووری کۆماری تورکیای ئێستاوە.
محەمەد امین زکی، المصدر السابق، ص ٧٣.
٥٥- جەلال تەقی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٦.
٥٦- گەوەر: دەکەوێتە هەرێمی هەکارییەوە لە دیوی سنووری کۆماری ئێرانی ئێستاوە. محەمەد امین زکی، المصدر السابق، ص ٣٣٩.
٥٧- چاری (چەهریق) مەڵبەند و شوێنی سەرەکی سمکۆی شکاک بوو کە دەکەوێتە نزیک سنووری تورکیاوە لەو پەڕی باکووری دەریاچەی ورمێ وە. محەمەد رسول هاوار، سمکۆ (ئیسماعیل ئاغای شوکاک)، ل ٢٦٤.
٥٨- جەلال تەقی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٧.
٥٩- هەمان سەرچاوە، ل ٤٩.
٦٠- ئەحمەد باوەڕ، ئۆزدەمیر و کورد، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئۆفسێتی بابان، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل ٢٦: سیامەند قادر عەلی، هاتنەوەی تورک بۆ کوردستانی خواروو ١٩٢١-١٩٢٣، گۆڤاری بیری نوێ، ژمارە (٢٣)، تشرینی یەکەم- تشرینی دووەم ١٩٩٩، ل ٦٥.
٦١- جەلال تەقی، سەرچاوەی پێشوو، ل ل ٤٩-٥٠.
٦٢- هەمان سەرچاوە، ل ٥١.
٦٣- رەفیق حلمی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٤٩.
٦٤- ئیدمۆندس، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٩٨: کریس کۆچیرا، سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٣: دیڤید ماکداول، سەرچاوەی پێشوو، بەرگی یەکەم، ل ٢٩١.
٦٥- م. ر. هاوار، شێخ مەحموودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، بەرگی دووەم، لەندەن، ١٩٩١، ل ١٨٠.
٦٦- جەلال تەقی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥١: رەفیق حلمی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٥١
٦٧- رەفیق حلمی، هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.
٦٨- جەلال تەقی، سەر چاوەی پێشوو، ل ل ٥٢-٥٣.
٦٩- م. ر. هاوار، شێخ مەحمودی قارەمان، بەرگی دووەم، ل ١٧٣.
٧٠- جەلال تەقی سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٥. تێبینی: لێرەدا جیاوازییەک بەدی دەکرێت لە بەر ئەوەی رەفیق حلمی ئاماژە بۆ ئەندامیەتی باویل ئاغا، سەعید بەگ و سالح بەگ دەکات، بەڵام ئاماژە بۆ ئەندامێتی خدر ئاغای سەرچیا ناکات. سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٥٢. هەروەها رەمزی قەزاز ئاماژە بۆ ئەندامێتی باویل ئاغا دەکات، بەڵام بۆ سەعید بەگ و سالح بەگ ناکات. سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤٢.
٧١- عەلی باویل ئاغا، بیرەوەرییەکانی عەلی باویل ئاغا: د. ولید حمدی، کورد و کوردستان لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیادا، وەرگێڕانی: محەمەد نوری تۆفیق، چاپی دووەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ١٩٩٩، ل ١١٢.
٧٢- جەلال تەقی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٧.
٧٣- عەلی ناجی کاکەحەمە ئەمین عەتتار و سیروان بەکر سامی، رۆژنامەی پێشکەوتن، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ١٩٩٨، ل ٣١٨، پێشکەوتن، ژمارە (٦٩) ساڵی دووەم، ١٨ ئۆگستی ١٩٢١ ل ٤: ئیدمۆندس، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٨١.
٧٤- د. محمد مظفر الادهمي، المجلس التاسيسي العراقي، الجزء الاول، دار الشؤون الثقافية العامة، الطبعة الثانية، بغداد، ١٩٨٩، ص ١٦٠: السيد عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، الجزء الاول، الطبعة السابعة، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ١٩٨٨، ص ٥٩.
٧٥- هێزی لیڤی، هێزێکی سەربازی بوون کە دەسەڵاتدارانی بریتانی لە شوێنی هێزی بەکارهاتوویان لە عێراق دایانمەزراندبوو بە مەبەستی کەمکردنەوەی تێچوونی سەربازی خۆیان. ئەو هێزە کە لە

بەشێک لە خەڵکی عێراق و ئاشوورییە ئاوارەکان پێک هاتبوون فەرمانیان لە ئەفسەرە ئینگلیزەکان وەردەگرت. د. کماڵ مظهر أحمد، دور الشعب الكردی فی ثوره العشرین العراقیه، ص ٣٧.

٧٦- د. ولید حمدی، سەرچاوەی پێشوو، ل ل ١٢٧-١٢٨.

٧٧- میساقی نیشتیمانی، دوای بەستنی کۆنگرەی سیواس لە ٤-١١ی ئەیلولی ١٩١٩ بە سەرۆکایەتی مستەفا کەماڵ، کۆنگرەکە بڕیارێکی دەرکرد کە لە شەش خاڵ پێک هاتبوو ئەمە لە دوایی بوو بە میساقی نیشتیمانی بزاڤی رزگاریخوازی تورکی. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: حنا عزو بهنان، التطورات السیاسیة في ترکیا ١٩١٩-١٩٢٣، رسالة ماجستیر، کلیة الاداب، جامعة بغداد، ١٩٩٠، ص ٦٠.

٧٨- پرۆفیسۆر د. میم کەماڵ ئۆقە، کرنۆلۆژیای مەسەلەی ویلایەتی موسڵ ١٩١٨-١٩٢٦، وەرگێڕانی: سەلام ناوخۆش، چاپی یەکەم، چاپخانەی خەبات، دهۆک، ٢٠٠٠، ل٣٥. وەرگیراوە.

٧٩- دیڤید ماکداول، سەرچاوەی پێشوو، بەرگی یەکەم، ل٢٩٥: کریس کۆچیرا، سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٣.

٨٠- أ. م. منتشاشفیلیي، العراق في سنوات الانتداب البریطاني، ترجمة: د. هاشم صالح التکریتي، مطبعة جامعة بغداد، ١٩٧٨، ص ٣١٨.

٨١- شێخ عەبدوڕەحمانی سەران، ساڵی ١٨٨٠ لە بنەماڵەیەکی بەناوبانگ لە دۆڵی ئاکۆیان لە دایک بووە و بەشداری بەرگریکردنی ناوچەکەی کردووە لە دژی سوپای رووسەکان لە جەنگی جیهانی یەکەمی، هەروەها بەشداری زۆری شەڕەکانی دژ بە ئینگلیزی کردووە، دواتریش رۆڵی کاریگەری بینیوە تا لە ساڵی ١٩٦٠ کۆچی دوایی کردووە. طالب سەرانی، نامەی والی دیاربەکر بۆ (شێخ عەبدولڕەحمانی سەران)، گۆڤاری رواندز، ژمارە(٢)، رەواندز، هاوینی ١٩٩٨، ل٥٥.

٨٢- طارق جامباز، وثیقة عمرها ٧٥ عاما تنشر لاول مرة رسالة جوابیە من والی دیاربەکر الی الشیخ عبدالرحمن سەرانی عام ١٩٢٢، صحیفة خبات، العدد(٨٤٦)، ١٧/ تشرین الاول/١٩٩٧: طالب سەراني، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٦.

٨٣- ئیدمۆندس، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٩٩.

٨٤- مەلا ئەسعەد خەیلانی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٠.

٨٥- رۆبەرت ئۆڵسن، راپەڕینی شێخ سەعیدی پیران ١٨٨٠-١٩٢٥، وەرگێڕانی: ئەبوبەکر خۆشناو، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ١٩٩٩، ل ل ٢٨٢-٢٨٤.

٨٦- جەلال تەقی، سەرچاوەی پێشوو، ل ل ٦٢-٦٣.

٨٧- د. کەماڵ مەزهەر، چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم، ل ١٢٠.

٨٨- ئەحمەد خواجە، سەرچاوەی پێشوو، بەرگی یەکەم، ل ٨٣.

٨٩- ئیدمۆندس، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٠٣: م. ر. هاوار، شێخ مەحمودی قارەمان، بەرگی دووەم، ل ٢١٣.

٩٠- دارا ئەحمەد کەریم بەگ، کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند بەشێک لە مێژووی رزگاریخوازی گەلی کورد، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١، ل ١٤٤.

٩١- ئیدمۆندس، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٠٥: د. عثمان علي، دراسات في الحرکة الکوردیة المعاصرة ١٨٣٣-١٩٤٦ دراسة تاریخیة وثائقیة، الطبعة الاولی، مطبعة الثقافة، اربیل، ٢٠٠٣، ص ٣٩٠.

٩٢- دۆڵی شاور: دەکەوێتە باکووری خۆرئاوایی شارۆچکەی رانیەی ئێستاکە.

٩٣- دۆڵی ناودەشت: دەکەوێتە باکوور و باکووری خۆرهەڵاتی شارۆچکەکەی رانیەی ئێستاکە.

٩٤- دۆڵی شەهیدان: بە درێژایی دۆڵی ناودەشت دەکەوێتە

باکووری خۆرهەڵاتی شارۆچکەی ڕانیەی ئێستاکە.

٩٥- کریس کۆچێرا، سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٥: جلال طالباني، كردستان والحركة القومية الكردية، الطبعة الاولى، دار الطليعة، بيروت، ١٩٦٩، ص ٢١٦: میرزا محەمەد ئەمین مەنگوڕی، حقائقی بەسەرهاتی شێخ مەحمود لە پەنای ئیستقلالی کورددا، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٣، ل١٦.

٩٦- طاهر ئەحمەد حەویزی، مێژووی کۆیە، بەرگی دووەم، بەشی یەکەم، مطبعە نمیر، بغداد، ١٩٨٤، ل١٤٩-١٥٠: مەسعود محەمەد، گەشتی ژیانم، چاپی یەکەم، ستۆکهۆلم، سوید، ١٩٩٢، ل ٣٦.

٩٧- ڕەفیق حلمی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٥٨: کریس کۆچێرا، سەرچاوەی پێشوو، ل ل ٧٤-٧٥.

٩٨- ڕەفیق حلمی، سەرچاوەی پێشوو، ج٦، ل ٥٩٥.

٩٩- حوسێنی مەدەنی، کوردستان لە ئیستراتیژی دەوڵەتان، بەرگی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٠، ل ٣٣٦.

١٠٠- چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم، ل ١٢٠.

١٠١- جرجيس فتح الله، المصدر السابق، ص ٢٥٩: جەعفەر عەلی ڕەسول، ناسیۆنالیزم و ناسیۆنالیزمی کوردی، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل ٢٠٤: فؤاد عارف، مذكرات فؤاد عارف، تقديم وتعليق، د.كمال مظهر أحمد، الجزء الاول، الطبعة الاولى، مطبعة خبات، دهوك، ٢٠٠٠، ص ٣١.

١٠٢- ڕەفیق حلمی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٦٢.

١٠٣- هەمان سەرچاوە، ل ٥٦٥.

١٠٤- سەرچاوە ی پێشوو، ل ل ٥٦٥-٥٦٦.

١٠٥- د. عثمان علي، المصدر السابق، ص ٤١٢: عەلائەدین سەجادی، مێژووی ڕاپەڕینی کورد، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئیران، سەقز، ١٩٩٦، ل ١٧١.

١٠٧- ئیدمۆندس، سەرچاوەی پێشوو، ٣٧٥: کریس کۆچێرا، سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٠.

١٠٨- ئیدمۆندس، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٧٢: کریس کۆچێرا، سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٠: لونگریک، المصدر السابق، ص ٢٩٣.

١٠٩- دیڤید ماکداول، سەرچاوەی پێشوو، بەرگی یەکەم، ل ٢٩٨.

١١٠- ڕەفیق حلمی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٨٣.

١١١- ئەحمەد خواجە، سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٦.

١١٢- ئەو کۆمەڵەیە لە کەرکوک لە لایەن ئەو کەسانەوە دامەزرابوو کە خۆیان بە تورک دەزانی. ڕەفیق حلمی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٠٨.

١١٣- ڕەفیق حلمی، هەمان سەرچاوە، ل ٦١٣.

١١٤- ڕەفیق حلمی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦١٥.

١١٥- محەمەد رسول هاوار، سمکۆ...، ل ٥٩١.

١١٦- عبدالرقیب یوسف و سدیق ساڵح، بیرەوەرییەکانی ئەحمەدی حەماغای پشدەری، چاپخانەی ئازاد، سلێمانی، ٢٠٠١، ل ٩٨.

١١٧- جەلال تەقی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٠: ڕەمزی قەزاز، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥٣.

١١٨- ڕەمزی قەزاز، هەمان سەرچاوە، ل ل ١٥٣-١٥٤.

١١٩- د. محمد مظفر الادهمي، المصدر السابق، الجزء الثاني، ص ٤١: حەسەن ئەرفەع، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦٨: عەلی سەیدۆ گۆرانی، لە "عەممان"ەوە بۆ "ئامێدی" گەشتێک بە کوردستانی باشووردا، وەرگێڕانی: تالیب بەرزنجی، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل ٢٠٢: حوسێنی مەدەنی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٥٨-٣٥٩.

١٢٠- ئەحمەد باوەڕ، ئۆزدەمیر و کورد، ل ٣٥.

# ڕەواندز لە ڕۆژگاری قائیمقامییەتی سەید تەهای نەهری[١] ١٩٢٣-١٩٢٩

**ئەحمەد حەمەد ئەمین ئۆمەر**
**کۆلیژی ئاداب - زانکۆی سەلاحەددین**

سەردەمی قائیمقامییەتی سەید تەهای نەهری بە یەکێک لەسەردەمە زێڕینەکانی قۆناغی مێژووی ڕەواندز لەقەڵەم دەدرێت، چونکی ناوبراو خزمەتێکی زۆری ناوچەکەی لە ڕووی سیاسیی، کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری کردووە. بەڵام ئێمە لێرەدا تەنیا ئاماژە بۆ ئەو ڕەوشە سیاسییە دەکەین لەو ماوەیەدا، کە سەید تەها لە ڕەواندز قائیمقام بووە. کە دوای دەرکردنی تورکەکان لە ڕەواندز دەست پێدەکات[٢].

دەست گرتنەوە بە سەر ڕەواندز لە لایەن هێزەکانی بریتانیا لە ٢٢ی نیسانی، ١٩٢٣ کە هاوکات بوو لەگەڵ ڕۆژێک بەر لە دانیشتنی دووەمین کۆنگرەی لۆزان، مشتومڕ و گلەیی و گازاندەی زۆری خستە نێوان نوێنەری بریتانی و تورکی لە کۆنگرەکەدا، چونکی تورکەکان داگیرکردنەوەی ڕەواندزیان بە مایەی بێزاری کورد و تورک لە قەڵەم دەدا و بە دەرچوون لە ئاگربەستی مۆدرۆسیان دەزانی[٣]، لەبەرانبەریشدا ئینگلیزەکان داگیرکردنەوەکەیان بە مافێکی ڕەوا لێکدەدایەوە و دژی هاتنەوەی دەسەڵاتی تورکی بوون بۆ ئەوێ[٤]. هەر بۆیە بێ گوێدانە ئەو گلەیی و گازاندانە دەسەڵاتدارانی بریتانی لە عێراق بە هاوکاری لەگەڵ حکومەتدا کەوتنە خۆ بۆ دامەزراندنەوەی دەسەڵاتی ناوەندیی لە ڕەواندزدا، بۆ ئەو مەبەستەش لە ٢٩ی نیسانی١٩٢٣ نوێنەری کۆمیسیاری باڵا لەگەڵ ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوخۆی عێراقی سەردانی ڕەواندزیان کردوە لەگەڵ ناوداران و سەرۆک هۆزەکانی ناوچەکەدا کۆبوونەوە و بڕیاری ئەوەیان دا، کە ڕەواندز لە ڕووی کارگێرییەوە بە لیوای هەولێر ببەسترێتەوە و قائیمقامی تیایدا دابمەزرێ[٥].

ڕەواندز لای بریتانییەکان گرنگی و بایەخی خۆی هەبوو بە هۆی شوێنە جیۆگرافییەکەی، کە کۆنترۆڵی ڕێگای سنووری باکووری ڕۆژهەڵاتی دەکرد، چونکی کۆنترۆڵکردنی دەبووە بەربەستێک لە بەردەم جموجۆڵ و پروپاگەندەی تورکەکان[٦]. ئەگەر بزانین تا ئەو کاتەش تورکەکان پروپاگەندەیان بۆ ئەوە دەکرد، کە دەسەڵاتیان بۆ ولایەتی موسڵ دەگەڕێتەوە. هەر بۆیە دەبوو ئینگلیزەکان لە ناوچەکەدا دەسەڵاتێک دابمەزرێنن و کەسێکیش تیایدا بکەن بە فەرمانڕەوا لە خۆیان نزیک بێت و جێگای متمانەی ئەوان بێت، لێرەشدا سەید تەهای نەهری چاکترین و شیاوترین کەس بوو بۆ فەرمانڕەوایی ناوچەکە لە بەر ئەوەی لە لایەک دەسەڵاتێکی فراوانی لە ناوچەکەدا هەبوو و جێگای ڕێزی خەڵکی دەڤەرەکە بوو، لە لایەکی تریش دوژمنی سەرسەختی کەمالییەکان بوو. ئیتر ئەوە وای کرد کە ئینگلیزەکان دوای پرسکردن بە سەرۆک وەزیرانی حکومەتی عێراقی، سەید تەهای نەهری لە ٤ی مایسی١٩٢٣ بە قائیمقام لە سەر ڕەواندز دابمەزرێنن[٧].

بریتانییەکان بە مەبەستی پاراستنی ڕەوشی ئاسایشی ڕەواندز

جگە لە هێزی سەید تەها و سەردارانی ناوچەکە هێزێکی سەربازی ئاشوورییەکانیان لە دەڤەرەکەدا جێ هێشت بۆ ئەوەی هاوکاری و هەماهەنگی سەید تەها بکەن لە رێکخستن و دابینکردنی ئاسایش تیایدا[8]، ئەوە لە لایەک، لە لایەکی تریش لەگەڵ حکومەتی عێراقیدا کەوتنە راوێژ کردن تا دەسەڵاتی سەید تەها جێگیرتر بکەن. چونکێ لە نامەیەکیدا پشکنەری کارگێری بریتانی لە ٩ی مایسی١٩٢٣ کە بە زمانی عەرەبی بۆ سەید تەهای رەوانە کردووە دەڵێ: " بە پێی ئەو راگەیاندنەی، کە لە وەزارەتی ناوخۆوە لە بەغدا پێمان راگەندراوە ئێوە کراون بە قائیمقامی شارۆچکەی رەواندز، کە سەر بە لیوای هەولێرە. بۆ ئەوە پێویستە کاربەدەستانی دادگا و دارایی و کارگێری و پۆلیس دامەزرێن بە پێی ئەو بودجەی کە رەزامەندی لە سەر کراوە، دەسەڵاتی ئەوەشتان پێدراوە کە تا شەش هەزار روپیە لە مانگێکدا خەرج بکەن بۆ مەبەستی دامەزراندنی دەزگاکانی حکومەتی عێراقی بریاردرا، کە سێ هەزار روپیەتان بۆ تەرخان بکرێت، لەبارەی دەسەڵاتی دادگاییتان لە ژێر گفت وگۆدایە هیوادارین بەو زووانە لە مەش ئاگادارتان بکەین لەگەڵ هەندێ زانیاری تر کە پەیوەندی بەوەزیفەکەتانەوە هەیە"[9].

شیاوی باسە، نەمانی تورکەکان لە رەواندز و دەرکردنی شێخ مەحموود لە سلێمانی رێگای لە بەردەم حکومەتی عێراقی خۆش کرد تا هەڵبژاردن بۆ دامەزراندنی ئەنجومەنی دامەزران دەست پێبکاتەوە، هەر بۆیە لە ١٢ی تەمووزی ١٩٢٣ دەست بە هەڵبژاردن کرایەوە و، لە دوو رۆژی دواتر وەزارەتی ناوخۆ داوای لە پشکێنەری کارگێری بریتانی لە هەولێر کرد، کە دەنگ و باسی ناوچەکەی سەبارەت بە هەڵبژاردن بۆ رەوانە بکات، پشکێنەری کارگێریش لە وەڵامدا لەگەڵ رەوانەکردنی هەواڵەکان ئەوەی بە بیر حکومەت هێنایەوە کە قائیمقام و خەڵکی رەواندز ئارەزووی بە شداریکردن لە هەڵبژاردن دەکەن و بە گوێرەی توانا کار بۆ جێبەجێ کردنی رێنماییەکان دەکەن[10]، بەڵام دەتوانرێ بوترێ، کە ئەو بۆچوونەی پشکێنەری کارگێری بریتانی لە راستییەوە دوور بووە، چونکێ کاتێک موتەسەریفی هەولێر فەرمان بە سەید تەها دەدات، کە سێ مەئمور بە شێوەی گرێبەستی کاتی بۆ مەبەستی ناونووسکردنی خەڵکی ناوچەکە دابمەزرێنێت، سەید تەها گومانی خۆی لەو ناونووسکردنە پێ رادەگەیەنێت و داوای ئەوەی لێ دەکات کە رێنماییەکانی تایبەت بە سیستەمی هەڵبژاردنی بۆ رەوانە بکات. هەر بۆیە لە ناوچەکەدا هەڵبژاردن رووبەڕرووی تەنگەژە دەبێتەوە و دەفتەری زانیارییەکان سەبارەت بە رەواندز و دەوروبەری دوادەکەوێت، ئەگەرچی سەید تەها لە پاشان لیژنەیەک دادەمەزرێنێ، بەڵام ئەو لیژنەیە ناتوانی زانیاری تەواوی ناوچەکە بە حکومەت بدات و، تۆماری رەواندز لەو هەڵبژاردنە لە سەر بناغەی تەخمین پشتی پێدەبەسترێت[11].

ئەنجومەنی دامەزراندن لە ٢٧ی مارتی ١٩٢٤ دەستی بە کارەکانی کرد و لە کۆی ١٠٠ ئەندام هەژدە ئەندامی کورد بوون کە لە ناویانا عەبدوڵلا موخلیس بەگ[12] نەوەی پاشای گەورەی رەواندزی تیایدا بوو. یەکێک لە کارەکانی ئەو ئەنجومەنە پەسندکردنی پەیمانی ١٩٢٢ی عێراقی بریتانی بوو، بەڵام کاتێک ئەنجومەن پەیمانەکە دەخاتەدەنگ دانەوە نوێنەرە کوردەکان داوای ئەوە دەکەن، کە پەسندکردنی پەیمانەکە دوا بخرێت تا کێشەی مووسڵ چارەسەر دەکرێت، کەچی بێ گوێدانە ئەو داواکارییە ئەنجومەن پەیمانەکە پەسند دەکات[13]. ئەوە لەلایەک، لە لایەکی دیکەوە ئەنجومەنی دامەزراندن دەبوو کار بۆ ئەوە بکات و زەمینە بۆ ئەوە خۆشکات تا هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەران ئەنجام بدرێت. هەر بۆیە لە ئەنجامی کارەکانی ئەو ئەنجومەنە بوو حکومەتی عێراقی بریاری دامەزراندنی ئەنجومەنی نوێنەرانی دا و لە ١٦ی تەمووزی١٩٢٥ یەکەمین ئەنجومەنی نوێنەران دەستی بە کارەکانی خۆی کرد، کە ژمارەیەکی

نوێنەری کوردی تیایدا بوو لە وانە: عەبدوڵڵا موخلیس بەگ و ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی[١٤] کە نوێنەری هەولێر بوون.

جێگای وەبیر هێنانەوەیە مانەوەی کێشەی مووسڵ بە هەڵواسراوی لە دوای بەستنی پەیماننامەی لۆزان لە ٢٤ی تەمووزی١٩٢٣ و چارەسەر نەکردنی لە کۆنگرەی قوستەنتینییە لە مایس- حوزەیرانی ١٩٢٤[١٥]، کێشەکەی خستە بەردەم کۆمەڵەی گەلان لە ٦ی ئابی١٩٢٤دا، هەر بۆیە کۆمەڵەی گەلانیش بڕیاری پێکهێنانی لیژنەیەکی دا لە ٣٠ی ئەیلولی ١٩٢٤ تا ڕەوانەی ناوچەکەی بکا، سەرئەنجام لیژنەکە لە ١٦ی کانوونی دووەمی ١٩٢٥ گەیشتە بەغدا و دواتریش سەری لە مووسڵ و شار و شارۆچکەکانی تردا. فازڵ حوسێن لە بارەی ڕەواندزەوە دەڵێ: "لە مەرکەزی ڕەواندز کە دانیشتوانێکی دواکەوتووی تێدا بوو زۆربەی ئەوانەی پرسیاریان لێکرا مەیلیان بە لای عێراق دابوو"[١٦]. هەروەها ڕۆژنامەی (ئەل ئیستقلال)یش لە دوو ژمارەی خۆیدا بیروڕای خەڵکی ڕەواندز بڵاودەکاتەوە کە وتوویانە: " مووسڵ بەشێکە لە عێراق و جیاناکرێتەوە وە ناشێ عێراق بە بێ ئەو بژی" و "ئێمە فەیسەڵی یەکەمان هەڵبژارد کە لە نەوەی پێغەمبەرمانە، وە خۆمان بە عێراق بەستایەوە کە بەشێوەیەکی وا هێزێک نەبێت لێکمان بکاتەوە، ئەگەر تورک ویستی دەست بگرێت بە سەر شارۆچکەکەمان ئێمە ئامادەین کە پارێزگاری بکەین هەتا دوا توانامان..."[١٧]. هەروەها سەرەڕای ئەوەش مەعرووف چیاووک[١٨] وەکو کەسایەتییەکی ناوچەکە دەنگی خۆی خستۆتە پاڵ دەنگی ئەوانەی کە (مووسڵ) یان بە بەشێکی جیانەکراوە لە عێراق داناوە[١٩].

کاتێکیش لیژنەکە گەڕایەوە بۆ مەبەستی چارەسەرکردنی کۆتایی و دوا بڕیاری کۆمەڵەی گەلان، حکومەتی عێراقی لە ٢٠ی ئابی ١٩٢٥ بۆ مەبەستی بەدواداچوونی چارەسەرکردنی کێشەکە بڕیاری دا، کەوا وەفدێک ڕەوانەی کۆمەڵەی گەلان بکا بە سەرۆکایەتی ناجی سوێدی (١٨٨٢-١٩٤٢) وەزیری داد و ئەندامیەتی هەریەک لە جەعفەر عەسکەری (١٨٨٥-١٩٣٦) نوێنەری سیاسیی عێراق لە لەندەن و بەتریک یوسف عەمانوئیل ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەران و ئەرشەد عومەری نوێنەری مووسڵ و ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی نوێنەری هەولێر، بەڵام ئەنجومەنی نوێنەران و نەباوەڕپێکراوی کۆمیسیاری بریتانی لە عێراق بەو بڕیارەی حکومەت ڕازی نەبوون. چونکێ باوەڕپێکراوی کۆمیسیاری بریتانی لە نامەیەکیدا کە ئاراستەی مەلیک فەیسەڵی کردووە وتوویەتی: "... من ڕازی نەبووم لە سەر دانانی ئەرشەد عومەری و ئیسماعیل ڕەواندزی، ئەرشەد من لێی بە گومان بووم کە نوێنەری تورکی لە جنێف بە لای خۆیانی کێش بکەن و، ئیسماعیلیش گەنجە و بۆ ئەوکارە دەست نادا..."[٢٠].

شیاوی باسە، لە سەرچاوەکاندا ئاماژەیەکی کەم دەکرێت بۆ دامەزراندنی کۆمەڵەیەک لە لایەن سەید تەهای نەهری لە ڕەواندزدا. ئەوەتە لەو بارەیەوە کریس کۆچێرا دەڵێ: " تەها لە ڕەواندز دا هەوڵ دەدات ئەنجومەنێکی ئەدەبی«هۆگر» (Hogir) بە مەبەستی پەرەپێدانی زمانی کوردی و ئاشنابوون بە مێژوو و ریشەی کورد دابمەزرێنێ، بەڵام لایەنی سیاسی نەخشەکەی هەر لە سەرەتاوە هێندە زاڵ دەبێت، کە دەوڵەت ڕێگەی نادات"[٢١]. ئەوە لە لایەک، لە لایەکی دیکەوە فەیسەڵ دەباغ بە زیادە لە سەر قسەکانی ئەو و بێ ئەوەی ئاماژە بەو سەرچاوەیە بکات کە زانیارییەکەی لێ وەرگرتووە دەڵێ: "بە پێی زانیاری من ناوی ئەو کۆمەڵەیە (هۆگری) بوو و، لە ساڵی ١٩٢٥ دامەزرابوو، بە ئامانجی بڵاوکردنەوەی زمانی کوردی و ئاشنابوون بە مێژووی کوردی و تایبەتمەندییەکانی نەتەوەی کوردی، بەڵام ئەو کۆمەڵە لە دواتر شێوەیەکی سیاسیی بە خۆیەوە دی و لە لایەن حکومەتەوە هەر ئەو ساڵە داخرا"[٢٢].

کەواتە لێرەدا جۆرە جیاوازییەک بەدی دەکرێت ئەویش نەک تەنیا لە

ناوی کۆمەڵەکەیە کە هەر یەکەیان بە شێوەیەک باسی لێوە دەکەن، بەڵکو لە سەر هاتنە دامەزراندنیشی کۆک نین، یەکێکیان دەڵێت: لە سەرەتاوە ڕێگەی دامەزراندنی نەدراوە و، ئەوەی تریان دەڵێت: دامەزرا، بەڵام بە خەریکبوونی بە کاری سیاسی دواتر لە لایەن حکومەتەوە داخراوە.

ماوە بڵێین وێڕای دانانی سنوور و بەستنی پەیمانی عێراقی- تورکی- بریتانی لە ٥ی حوزەیرانی ١٩٢٦[٢٣] و یەکخستنی هەوڵی دەوڵەتە هاوسێیەکان، کە یەکێک لە ئامانجەکانیان بنەبڕکردنی بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردستان بوو. بەڵام ئەمجارەیان شۆڕشگێڕان هەوڵیان دا بە شێوازێکی تۆکمەتر بێنەوە مەیدان. هەر بۆیە ئەو سەرکردە کوردانەی باکووری کوردستان کە لە ئەنجامی سەرنەکەوتنیان لە شۆڕشی ١٩٢٥[٢٤] ئاوارەی پارچەکانی تری کوردستان ببوون، دەکەونە پەیوەندییەوە لەگەڵ هەندێ لە ئەفسەر و پلەداری کورد لە ناو حکومەتی عێراقیدا وەک سەید تەهای نەهری لە ڕەواندز و محەممەد ئەمین ڕەواندزی[٢٥]، ئیسماعیل حەققی شاوەیس[٢٦] و مەعروف چیاووک لە مووسڵدا[٢٧]، تا بە یەکەوە نەخشە و پلانی ئەوە دابڕێژن و تۆڵەی قوربانییانی شۆڕشی ١٩٢٥ی باکووری کوردستان بکەنەوە[٢٨]. هەر بۆیە شێخ مەهدی برای شێخ سەعیدی پیران لە نامەیەکیدا لە ١٩ی حوزەیرانی ١٩٢٦، کە بۆ ئەمین ڕەواندزی و مەعروف چیاووکی ڕەوانە کردووە داوای هاوکاری چەک و تفاق و پێداویستی جەنگی و چەند ئەفسەرێکیان لێ دەکات، بەڵام لە بەر ئامادەنەبوونی ئەمین ڕەواندزی یەکێکی تر کارەکە و لە وەڵامدا لە ٢٢ی تەممووز هەندێ لە داواکارییەکانی بۆ ڕەوانە دەکات[٢٩]. کە ئەمەش جەخت لە سەر یەکریزی و گیانی هاوکاری نێوان شۆڕشگێڕانی کوردستان دەکات کە هەموویان یەک ئامانجیان هەبووە. ئەوە لە لایەک، لە لایەکی دیکەدا ئەوەی لێرەدا جێ سەرنجە ئەوەیە کە ئەمین ڕەواندزی لەم مانگەدا بە سەردانێک دەچێتەوە ڕەواندز و هاوکاتیش هەریەک لە شێخ عەلی کوڕی شێخ سەعیدی پیران، سەید عەبدوڵڵای کوڕی شێخ عەبدولقادری نەهری، ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی و شێخ سەدیقی برای شێخ ئەحمەدی بارزانی هاتوونە ئەوێ[٣٠]. بۆیە دەتوانرێ بوترێ، کە هاتنی ئەوانە لە یەک کاتدا بۆ ڕەواندز دوورنی یە بۆ ئەوە بوو بێت تا بیروڕای خۆیان سەبارەت بە هاوکاری و هەماهەنگی شۆڕشگێڕانی باکووری کوردستان لەگەڵ سەید تەها تاوتوێ بکەن. چونکێ شێخ مەهدی لە دوابەشی نامەکەیدا داوای ئەوە لە ئەمین ڕەواندزی دەکات، کە زانیاری لەبارەی کوڕەکانی شێخ سەعید و سەید تەها و شێخی بارزانی بۆ ڕەوان بکات[٣١].

لە لایەکی دیکەوە، پەناهێنانی سمکۆی شکاک لە تشرینی یەکەمی ١٩٢٦ بۆ ڕەواندز جارێکی تریش دەسەڵاتی ناوەندی لە ناوچەکە کردە دەرەوە، چونکێ بە هاوکاری و هەماهەنگی سەید تەهای نەهری و خەڵکی ڕەواندز توانی دەست بە سەر ناوچەکەدا بگرێ و دەسەڵاتی ناوەندی تیایدا نەهێڵێ[٣٢]. لێرەشدا لە ڕاپۆرتێکی بریتانیدا هاتووە: "... دەوروبەری کۆتایی مانگی تشرینی یەکەم سمایل ئاغای سەرەک هۆزی شوکاک، کە بە سمکۆ ناسراوە دژی حکومەتی ئێران شۆڕشی بەرپا کرد، ... خۆی و سەد کەس لە پیاوەکانی پەنایان هێنایە بەر عێراق دوای ئەوەی لە ڕێگەی تورکیاوە نزیک نەهرێ سنووری بڕی و هاتە ڕەواندزی سەر بە هەولێر"[٣٣]. ئەنجام حکومەتی عێراقی کەوتە هەڵپەی ئەوە، کە هێرش بکاتە سەر ناوچەکە و سمکۆی لێ بکاتە دەرەوە، بەڵام لەگەڵ سەرنەکەوتنی لە هێرشەکانی ڕازی بوو، کە سمکۆ لە ناوچەکانی دەوروبەری ڕەواندز بمێنێتەوە[٣٤].

بە پەنابردنەوەی سمکۆ بۆ سنووری تورکیا لە مایسی ١٩٢٨ جارێکی تر هێزەکانی حکومەتی تورکی تەنگەتاویان کرد و سمکۆ گەڕایەوە ئەو شوێنانەی کە لە سنووری عێراقدا لێ بوو، ئەمەش مەترسی زیاتر بۆ هەموو لایەک پەیدا کرد، هەر بۆیە عەلائەدین سەجادی لەم بارەیەوە دەڵێ: "... مەندوبی

سامی بەغدا سەیری کرد ئەگەر «سمایل ئاغا» بەم جۆرە لە سەر ئیش بڕوا، ئارەزووەکانی ئەو و تەونەکانی هەموو تێک ئەچن!. ئەمجا هێنای حوکومەتی عێراقی هەڵخران بۆ ئەوە کە لەگەڵ حوکومەتی ئێرانا قۆڵ بکەن بە قۆڵی یەک بۆ لەناوبردنی«سمایل ئاغا»!. لە عەینی وەختا ئەمانەی هەموو کرد و هەر دوو حوکومەتەکە بە جارێ کەوتنە پەلاماردانی سمکۆ، (سمکۆ) لە پاش شەڕێکی زۆر دیسان گەڕایەوە بۆ خاکی تورکیا"[٣٥].

لێرەدا دەتوانرێ بوترێ، هاتنی سمکۆ بۆ ڕەواندز و دەوروبەری و مانەوەی بۆ ماوەیەک لەوێدا، دەسەڵاتی ناوەندی لە ناوچەکەدا نەهێشتووە و لەگەڵ ئەوەشدا مەترسی و دڵەڕاوکێیەکی زۆری بۆ هەر دوو حکومەتی عێراقی ئێرانی و دەسەڵاتدارانی بریتانی لە ناوچەکەدا دروست کردووە، هەر بۆیە بە هەموو لایەک هەوڵی خۆیان خستۆتە گەڕ و هاوکاری یەکترییان کردووە. هەروەها لە دواتریش هەوڵی ئەوەیان داوە کە دەستی ئەو هاوکاری و هەماهەنگییەی سمکۆ لە باشووری کوردستان بە گشتی و ڕەواندز بە تایبەتی ببڕن، کە سەید تەهای نەهری داینەمۆی ئەو هاوکارییە بووە. چونکێ ئەگەر تەماشا بکەین سەید تەهای نەهری لە ماوەی قائیمقامیەتی لە ڕەواندزدا ڕۆڵێکی کاریگەری لە بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردستاندا بینیوە، جگە لە هاوکاری بۆ پەناهەندانی شۆڕشی ١٩٢٥ و یارمەتیدانی سمکۆ، لەگەڵ هەندێ گەورە پیاوانی تری کورد پەیوەندی بە شۆڕشگێران لە ئاراراتیشەوە کردووە[٣٦]، هەر بۆیە لە دواتر فیڵێکیان بۆ سەید تەها نایەوە و کەوتە داوییەوە. لەو بارەیەوەش عەزیز شەمزینی دەڵێ: "سیاسەتی بریتانیا بە ناوەڕۆک لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی گەلی کورددا ڕێک نەدەکەوت. هەڵسووڕێنەرانی سیاسەتی ئیمپریالیستی بریتانیا لەو بڕوایەدا بوون، کە بۆ ئەنجامدانی سیاسەتی ناوخۆیان دەبێ بەشێکی ڕابەرانی کورد لە ناو بەرن. یەکێ لەوانەش کە بڕیاری لە ناوبردنی درا سەید تەها بوو، لە بەر ئەوە ئینگلیزەکان پەنایان بردە بەر ڕەزا شا و هەر بە فیتی ئەوانیش ڕەزا شا ناردی بە شوێن سەید تەها و داوای لێ کرد سەری لێبدا بەو بیانووی گوایە دەیەوێ دوایی بە گیروگرفتەکانی سەر سنوری عیراق و ئێران بێنێ و ئەو مەسەلانە ساغ کاتەوە، کە پەیوەندییان بە موڵکی تایبەتی سەید تەهاوە هەیە، کە بەشێکی لە چوارچێوەی سنووری ئێران دابوو"[٣٧]. ئیتر سەید تەها لە سەر بانگهێشتی ڕەزا شا لە ١٣ی تەشرینی دووەمی ١٩٢٨ بە سەردانێک دەچێتە تاران و لە ژێر پاڵەپەستۆی دەسەڵاتدارانی ئێران لە وێدا دەمێنێتەوە و لە ٢٩ی کانوونی دووەمی ١٩٢٩ دەست لە کار هەڵگرتنی خۆی لە قائیمقامیەتی ڕەواندز بۆ حکومەتی عێراقی ڕەوانە دەکاتەوە[٣٨]. بەمەش ڕەوشی سیاسیی ڕەواندز پێدەنێتەوە قۆناغێکی نوێترەوە[٣٩].

**پەراوێز و سەرچاوەکان:**

١- سەید تەهای نەهری کوڕی شێخ محەمەد سەدیق کوڕی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهرییە و لە ساڵی ١٨٩٢ لە دایک بووە، بە هۆی ئەوەی لە بنەماڵەیەکی شۆڕشگێڕ چاوی هەڵێناوە ڕۆڵێکی کاریگەری لە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستاندا بینیوە بەر لە جەنگی یەکەمی جیهانی. دوای جەنگیش بە هۆی خزمایەتیانەوە لەگەڵ سمکۆی شکاک بە یەکەوە هەوڵی خۆیان خستۆتە کار و شۆڕشیان بە ڕووی حکومەتی ئێران ڕاگەیاندووە تا ئەو کاتەی دەشکێن و پەنا دەهێننە بەر باشووری کوردستان. سەید تەها پەیوەندی بە ئینگلیزەکانەوە دەکات بە ئومێدی ئەوەی یارمەتییان لێ وەربگرێت بۆ دروستکردنی دەسەڵاتێکی هاوشێوەی شێخ مەحموود لە ناوچەکانی ڕەواندز کە سەرئەنجام لە ٩ی مایسی ١٩٢٣ بە قائیقامیەتی ڕەواندز ڕازی دەبێت

و خزمەتێکی زۆری لایەنی ئاوەدانکردنەوە و رۆشنبیری و سیاسیی ناوچەکە دەکات تا ١٣ی تەشرینی دووەمی ١٩٢٨ لە سەر بانگێشتی رەزا شا دەچێتە تاران و لە ژێر پاڵەپەستۆی ئەوان لە ٢٩ی کانوونی دووەمی ١٩٢٩ دەست لە کارکێشانەوەی بۆ حکومەتی عێراقی رەوانە دەکاتەوە و لە وێدا دەمێنێتەوە تا لە ساڵی ١٩٣٦ دەرمانخوارد دەکرێت. د. عزیز شەمزینی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥٠-١٥٦: حسێن جاف، سەید تەهای شەمزینانی، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٣٥) ئابی ١٩٩٥، ل ٦٢:، بەڵگەنامەی بزووتنەوەی کورد، وەرگێرانی: نەزەند بەگی خانی، گۆڤاری هیوا، ژمارە، (٧)، پایزی ١٩٩٠، ل ٣٢.

٢- بۆ زانیاری لەبارەی هاتنەوەی تورک بە رەواندز و ماوەی مانەوەیان بروانە: ئەحمەد حەمەدئەمین ئۆمەر، رەواندز لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی-سیاسییە (١٩١٨-١٩٣٩) نامەی ماستەر بلاو نەکراوە، کۆلێژی ئەدەبیات زانکۆی سەلاحەدین هەولێر، ٢٠٠٥، ل ل٢٧-.٣٨

3- FOREGN OFFICE 9005/371, E4474, From Sir. H. Rumbold (Lausanne), 4 May 1923, P86.

4- FOREGN OFFICE, 9005/371, Lord Curzon to Sir H. Rumbold (Lausanne), 5 May 1923, P162.

٥- د. محمد مظفر الادهمي، المجلس التاسيسي العراقي، الجزء الثاني، الطبعة الثانية، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ١٩٨٩، ص٥٢.

٦- أ. م. مينتشاشيفيلي، العراق في سنوات الانتداب البريطاني، ترجمة: هاشم صالح التكريتي، مطبعة جامعة بغداد، ١٩٧٨، ص ص٣٢٦-٣٢٧.

٧- د. ولید حمدی، کورد و کوردستان لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیادا، وەرگێرانی: موحەمەد نوری تۆفیق، چاپی دووەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ١٩٩٩، ل١٤٣: د. کەماڵ مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەرەیەک لە مێژووی گەلی کورد، ئامادەکردنی: عەبدوڵلا زەنگەنە، بەرگی دووەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١، ل٤٨٢.

8-FORIGNOFFICE 9005/371, Telegram From the Acting High Commissioner for Iraq to thesecretary of State for theColonies, 11may 1923, :P.66

قسطنطين بيتروفيج ماتفيف بارمتي، الاشوريون والمسالة الاشورية في العصر الحديث، الطبعة الاولى، دمشق، ١٩٦٨، ص١٣٠: کریکار عەبدوڵلا حسێن، کورد و ئاشووری، چاپی یەکەم، لە بلاوکراوەکانی بنکەی ئەدەبی گەلاوێژ، ئۆفسێتی داناز، سلێمانی، ١٩٩٨، ل ١٣٨.

٩- ئەحمەد حەمەدئەمین ئۆمەر، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٣.

١٠- د. محمد مظفر الادهمي، المصدر السابق، ص ص ٩٥-٩٦.

١١- نفس المصدر، ص ص٩٧-٩٨.

١٢- عەبدوڵلا موخلیس بەگ کوری ئەسعەد بەگ کوری رەسوڵ پاشایە لە ساڵی ١٨٥٩ لە بەغدا لە دایک بووە و لای مامۆستای تایبەتی خوێندوویەتی. لە دوای کۆچی دوایی باوکی ماڵەکەی دەباتە کەرکوک و لە قەڵەمی تەحریرات دادەمەزرێت تا دەبێتە بەرێوەبەر. ساڵی ١٨٨٩ بە ناو مەئموریەتی لێکۆڵینەوە دەچێتە کۆیە و رەواندز و لە پاشانیش لە چەند شوێنێک دەبێتە قائیمقام، لە وانە ١٩٠٦ لە رەواندز. لە ساڵی ١٩٢٤ دەبێتە ئەندامی ئەنجومەنی دامەزراندن و لە ١٩٢٥ بە نوێنەری هەولێر لە ئەنجومەنی نوێنەران ئیتر ماڵەکەی دەباتەوە بەغدا تا لە ساڵی١٩٤١ لەوێدا کۆچی دوایی دەکات. حسێن حزنی موکریانی،

مێژووی میرانی سوران، چاپی دووەمین، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، ١٩٦٢، ل ل ١٠٥-١٠٦. ئەحمەد حەمەدئەمین ئۆمەر، ئەندامە کوردەکانی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقی لە رۆژگاری پاشایەتیدا (١٩٢٥-١٩٥٨)، لە قۆناغی ئامادەکردندایە بۆ چاپ.

١٣- عبد الرزاق الحسني، تاريخ الوزارات، الجزء الاول، الطبعة السابعة، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ١٩٨٨، ص ص٢٣٣-٢٣٦: رەمەزان داودی، هەڵوێستی کورد لە دامەزراندنی دەوڵەتی نوێی عێراق ١٩٢١-١٩٣٠، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە(٩)، هەولێر، کانوونی یەکەم ١٩٩٨، ل ٤٠.

١٤- ئیسماعیل بەگ کوڕی سەعید بەگ کوڕی عەولا پاشا کوڕی بەکر بەگ کوڕی بایز بەگی باپشتییە، بەکر بەگ مامی میر محەمەد پاشای ڕەواندزییە. ئیسماعیل بەگ ساڵی ١٨٩٥ لە ڕەواندز لە دایک بووە، لە تەمەنی نۆزدە ساڵی بۆتە حاکمی ڕەواندز و دواتریش بە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی حکومەتی عێراقی کە ڕۆڵی کاری تیایدا لەو ماوەیەدا بینیوە (کە دواتر باسی لێوە دەکەین)، ناوبراو گەلێک بە پەرۆشی خزمەتکردنی کوردستان بە گشتی و ناوچەکەی بە تایبەتی بووە تا لە ٨ی حوزەیرانی ١٩٣٣ لە دۆڵی نیشاوێ لە لایەن بنەماڵەی باویل ئاغا کە دوژمنداری یەکتر بوون دەکوژرێت. ئەسعەد عەدۆ، کارەساتی دۆری نیشاوێ لە نێوان فۆلکلۆر و مێژوودا، کۆڕێک لە یەکێتی نووسەرانی کورد لقی هەولێر، لە سەر کاسێت تۆمارکراوە.

١٥- کۆنگرەی قوستەنتینییە لە ١٩ی مایسی ١٩٢٤ لە باڵەخانەی کۆنی عوسمانی بە ناوی قاسم پاشا لە ئەستەنبۆل لە نێوان نوماینەدەی بریتانی بە سەرۆکایەتی سیر برسی کۆکس کۆمیسیاری باڵای بریتانی لە عێراق و نوماینەدەی تورکی بە سەرۆکایەتی فەتحی پاشا سەرۆکی ئەنجومەنی نشتیمانی تورکی گەورە بەسترا بۆ مەبەستی چارەسەر کردنی کێشەی ویلایەتی مووسڵ. ئەگەرچی کۆنگرەکە بەردەوام بوو لە کارەکانی تا ٢٤ ی تەمموزی ١٩٢٤، بەڵام چارەسەری کێشەکەی پێ نەکرا و خستیە بەردەم کۆمەڵەی گەلان. بۆ زیاتر زانیاری لە مەڕ ناوەڕۆکی کۆنگرەکە بڕوانە: بیار مستقفا سيف الدين، السياسة البريطانية تجاه تركيا واثرها في كوردستان ١٩٢٣-١٩٢٦، الطبعة الاولى، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠٤، ص١٦١ ومابعدها.

١٦- د.فاضل حسين، کێشەی ویلایەتی مووسڵ لێکۆڵینەوەیەک لەبارەی دبلۆماسیەتی عێراق- بەریتانیا- تورکیا و رای گشتی، وەرگێرانی، محەمەد شاکەلی، چاپی یەکەم، چاپخانەی خاک، سلێمانی، ١٩٩٩، ل ١٦٢.

١٧- جريدة الاستقلال (الموصل)، العدد ان (٩/٢/ ١٩٢٥، ٢٧/٢/١٩٢٥). لە: د. عبدالامير هادي العكام، الحركة الوطنية في العراق ١٩٢١-١٩٣٣، مطبعة الاداب، النجف الاشرف، ١٩٧٥، ص ص١٩٧-١٩٨. وەرگیراوە.

١٨- مەعروف چیاووک، ناوی تەواوی مەعروف کوڕی عەلی ئەسغەر ئەفەندی کوڕی حاجی مەولوود ئەفەندی یە، دایکی ئامینە خان لە بنەماڵەی بابانەکانە، بە ئەسڵ خەڵکی دێی سرێشمەی سەر بە ناوچەی ڕەواندزە و لە دایکبووی ساڵی ١٨٨٥ ە، خوێندنی سەرەتایی و ڕوشدیەی لە بەغدا تەواو کردووە دواتر بۆ مەبەستی خوێندن ڕووی کردۆتە ئەستەنبۆل و بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە کۆلیژی ماف بە دەست هێناوە. لەگەڵ ڕاگەیاندنی دەستووری عوسمانی ١٩٠٨ دەچێتە ڕیزی حزبی ئازادیخوازی عوسمانی و گەلێک گوتار لە ڕۆژنامەکانی ئەو کاتە دەنووسێ، دوای گەڕانەوەشی بۆ بەغدا لە ١٩١٢ ڕۆژنامەیەک بە ناوی (ئەلحقوق) لە بەغدا بە زمانی عەرەبی دەردەکات. ئینجا لەگەڵ

سەرهەڵدانی جەنگی یەکەمی جیهانی بەشدار دەبێت و سەرئەنجام دیل دەکرێت و رەوانەی وڵاتی بۆرما دەکرێت. لە پاش جەنگیش کە دەگەڕێتەوە رۆڵێکی کاریگەر دەگێڕێت و دەبێتە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەران و دواتریش ژمارەیەک پلە و پایەی کارگێڕی وەردەگرێت تا خانەنشین دەکرێت. چیاووک لە ٢١ی کانوونی دووەمی ١٩٥٨ لە بەغدا کۆچی دوایی دەکات و لە سەر وەسیەتی خۆی لاشەکەی دەهێننەوە هەولێر بە خاکی دەسپێرن. بۆ زیاتر زانیاری لە مەڕ ئەو کەڵە پیاوە بڕوانە: د. ئیسماعیل شوکر رەسول، مەعروف چیاووک ١٨٨٥-١٩٥٨ لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویيە، گۆڤاری زانکۆ، ژمارە (٢٢)، ئابی ٢٠٠٤، ل ٥-٢٦: کەریم شارەزا، لە کەسایەتییە ناودارەکانی هەولێر مافپەروەر و کارگێڕ و نووسەر و کورد پەروەر مەعروف جیاووک ١٨٨٥-١٩٥٨، گۆڤاری هەولێر، ژمارە (٢)، بەهاری ١٩٩٩، ل ل١٨٣-١٩١: ئەحمەد جمال جیاووک، جیاووك في دائرة الضو و، مجلة زاگروس، العدد (١٤)، ٢٧ كانون الثاني ١٩٩٩، ل ٧٢.

١٩- معروف جياووك، القضية الكردية، مطبعة الاستقلال، بغداد، ١٩٢٥، ص٢٢.

٢٠- عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارت العراقية، الجزء الثاني، الطبعة السابعة، دار الشؤون الثقافية العامة «أفاق عربية» بغداد، ١٩٨٨ ص ص٧٩-٨٠.

٢١- کریس کۆچیرا، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣٦.

٢٢- فيصل الدباغ، اضواء على كتاب الجمعيات والمنظمات والاحزاب الكوردية في نصف قرن ١٩٠٨-١٩٥٨، الطبعة الاولى، مطبعة الثقافة، اربيل، ١٩٩٧، ص٦٠.

٢٣- پەیمانی ١٩٢٦ دوای برانەوەی کێشەی ویلایەتی مووسڵ لە نێوان عێراق و تورکیاو بریتانیا بەسترا بۆ مەبەستی چارەسەر کردنی کێشەکانی کە لە نێوانیاندا بە هەڵواسراوی مابۆوە بە تایبەت کێشەی نەوت. بۆ زیاتر زانیاری لە مەڕ ناوەڕۆکی پەیماننامەکە بڕوانە: د. فاروق صالح العمر، المعاهدات العراقية-البريطانية واثرها في السياسة الداخلية ١٩٢٢-١٩٤٨، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٧٧، ص١٣٩ ومابعدها: بيار مصطفى سيف الدين، المصدر السابق، ص٢٦١ وما بعدها.

٢٤- بۆ زیاتر زانیاری لە مەڕ شۆڕشی ١٩٢٥ بڕوانە: رۆبەت ئۆلسن، راپەرینی شێخ سەعیدی پیران ١٨٨٠-١٩٢٥، وەرگێڕانی: ئەبوبەکر خۆشناو، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ١٩٩٩.

٢٥- محەمەد ئەمین رەواندزی کوڕی مەلا حەسەنی رەواندزییە و ناسراوە بە ئەمین رەواندزی، لە ساڵی ١٨٩٨ لە رەواندز لە دایک بووە و هەر لەوێ خوێندنی سەرەتایی تەواو کردووە، ئینجا کۆلێژی سەربازی تا لە ساڵی ١٩٢٢ لە سوپای عێراقی پلەی مولازمی دووەمی وەرگرتووە و هەر لەو ساڵەدا لەگەڵ چەند ئەفسەرێکی تر بەشداری لە حکومەتی شێخ مەحموود کردووە، وانەی مەشقی سەربازی لە یەکێک لە قوتابخانەکانی سلێمانی وتۆتەوە، ئەمین رەواندزی رۆڵی کاریگەری دیوە لە بزاڤی رزگاریخوازی کوردستاندا تا لە ساڵی ١٩٤٦ خانەنشین کراوە. لە ٧ی تەشرینی دووەمی ١٩٥٥ بە نەخۆشییەکی گران کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی (باب المعظم) لە بەغدا نێژراوە. بەڵام وەسییەتەکەی نەهاتۆتە جێ کە داوای کردبوو لە سەر یەکێک لە چیایەکانی رەواندز بیشارنەوە. عەبدوڵڵا زەنگەنە، ژیانەوە و شوێنی لە رۆژنامەنووسی کوردیدا ١٩٢٤-١٩٢٦، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠١، ل ل ٤٨-٤٩: کەماڵ رەئوف محەمەد،

لاپەرەیێکی روونی رۆژنامەنووسی کوردی یەکەم رۆژنامەی هەولێر، گۆڤاری کاروان، ژمارە (٤٨)، ئەیلولی ١٩٨١، ل ل ٧٤-٩٥: ئەمین چاورەش رەواندزی، مرۆڤی نیشتمان پەروەر و رۆژنامەنووس ئەمین رەواندزی، رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە (٦٧٥) لە ٣ ی ئایاری ١٩٩٤.

٢٦- ئیسماعیل حەققی شاوەیس، ناوی تەواوی ئیسماعیل حەققی عەلی رەسووڵ ئەحمەد ئاغایە و لە ساڵی١٨٩٤ لە مووسڵ لە دایک بووە، سەرەتا لە حوجرە خوێندوویەتی و لە دواتریش چۆتە قوتابخانەی رووشدیەی عەسکەری لە سلێمانی کە لە ساڵی ١٩٠٤ خوێندنی تیایدا تەواو کردووە، ئینجا بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچێتە بەغدا لە وێشەوە بۆ ئەستەمبۆڵ تا قوتابخانەی جەنگیی تەواو دەکات و دەبێتە ئەفسەری سوپا و پلەی مولازمی دووەمی وەرگرتووە. ئەو کەڵە پیاوە رۆڵێکی کاریگەری گێراوە لە بزاڤی رزگاریخوازی کوردستان تا لە ١٢ی مایسی ١٩٧٦ لە نەخۆشخانەی سلێمانی کۆچی دوایی کردووە. بۆ زیاتر زانیاری لە مەر خەباتی ئەو کەڵە پیاوە بروانە: دڵشاد مەحموود عەبدورەحمان، ئیسماعیل حەققی شاوەیس (١٨٩٤-١٩٧٦) توێژینەوەکی مێژووییە «لە بارەی چالاکییە رامیاری و رۆشنبیرییەکانەوە»، چاپی یەکەم، بەرێوەبەرایەتی چاپخانەی رۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٤.

٢٧- لە راستیدا زۆری ئەمانەی کە پەیوەندییان پێوە کردبوون ئەندامی کۆمەڵەی ئیستیقلالی کوردستان (پارتی ئازادی) لقی مووسڵ بوون. بۆ زیاتر زانیاری لەمەر لقی مووسڵی ئەو کۆمەڵەیە، بروانە: ئەحمەد حەمەدئەمین نۆمەر، سەرچاوەی پێشوو، ل ل ٦٦-٦٨.

٢٨- د. عبدالفتاح علي يحيي البوتاني، وثائق عن الحركة القومية الكوردية التحررية ملاحظات تاريخية ودراسات اولية، الطبعة الاولى، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠١، ص٦٦٩: رەفیق ساڵح، گۆڤاری دیاری کوردستان، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠١، ل ٩١.

٢٩- د. عبدالفتاح علي يحيي البوتاني، وثائق عن الحركة القومية الكوردية التحررية، ص ص٦٧١-٦٧٥.

٣٠- زاري كرمانجي، ژمارة ٢، ١٢ ذي العقدة ١٣٤٤، ل ٢٠.

٣١- د. عبدالفتاح علي يحيي البوتاني، وثائق عن الحركة القومية الكوردية التحررية، ص٦٧٣.

٣٢- عەلائەدین سەجادی، مێژووی راپەرینی کورد، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئیران، سەقز، ١٩٩٦، ل ل ١٧٥-١٧٦: ساڵح محەممەد ئەمین، کورد و عەجەم «مێژووی سیاسیی کوردەکانی ئیران»، چاپی یەکەم، بێ شوێنی چاپ، ١٩٢٩، ل ٣٩١: ياسين خالد حسن، كردستان الشرقية دراسة في الحركة التحررية القومية فيما بين الحربين ١٩١٨-١٩٣٩، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الاداب جامعة صلاح الدين / اربيل، ١٩٩٥، ص١٣٢.

٣٣- د. کەماڵ مەزهەر، چەند لاپەرەیەک لە مێژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم، ل ١٢١.

٣٤- عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، الجزء الثاني، ص ص١٩٣-١٩٤.

٣٥- عەلائەدین سەجادی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧٦.

٣٦- د. عثمان علي، دراسات في الحركة الكوردية المعاصرة ١٨٣٣-١٩٤٦ دراسة تاريخية وثائقية، الطبعة الاولى، مطبعة الثقافة، اربيل، ٢٠٠٣، ص٥٢٧.

٣٧- عەزیز شەمزینی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥٦.

٣٨- زاری کرمانجی، ژمارە (١٨)، ٢٧ ی ئازاری ١٩٢٩.

٣٩- بۆ زانیاری لەبارەی ئەو رەوشە بروانە: ئەحمەد حەمەدئەمین نۆمەر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٩ بەدواوە.

# رواندزییەکان لە حیزبی هیوادا

تاریق جامباز

رواندز: ئەم شارەیە کە لە مێژووی نەتەوەکەماندا جێ پەنجە و رۆڵی دیارو بەرچاوی هەبووە و هەیە، بۆیە زۆر کەڵەمێردی تێدا هەڵکەوتووە، کە لە بزاڤی رزگاریخوازی گەلی باشووری کوردستاندا پێشەنگایەتییان کردووە: "ئەمین رواندزی و مەعرووف جیاوک" هەردووکیان لە حیزبی هیوا و حیزبی سەربەخۆیی کوردستان (١٩٢٢-١٩٢٦)و پاشان "جیاوک" لە پەرلەمانی عێراقی هەڵوێستی جوامێرانەی لە دانیشتنەکاندا تۆمار کراون.

لێرەدا هەر باسی حیزبی هیوا و رۆڵی رواندزییەکان دەکەین کە پێشەنگانە بیروباوەڕی نەتەوایەتی ئەم حیزبەیان بڵاوکردۆتەوە و گەنجانیان هانداوە بچنە نێو رێکخستنی حیزبی هیوا و بڵاوکراوەی (کوردستان)ی حیزبی هیوایان لە رواندز بە دەستخەت نووسیوەتەوە و بەسەر ئەندامانیان دابەش کردووە، لەم بارەیەوەش هەوڵمانداوە، چ لە بارەی حیزبی هیوا بڵاوکراوەتەوە یان سەردان و بەسەرکردنەوە و داوای نووسین لە ئەندامانی کراوە (ئەوانیش بە سینگ فراوانییەوە بۆیان ناردووم) یان چاوپێکەوتنم لەگەڵ کردوون (کە پڕ بە دڵ سوپاسیان دەکەم) لێرەدا کۆی بکەمەوە و پوختەکەی بخەمە ڕوو:

## ١- دامەزراندن

کە فێرخوازانی رواندزێ خوێندنی سەرەتاییان تەواو دەکرد، لەبەرئەوەی قۆناغی ناوەندی لەوێ نەبوو، بۆیە بە ناچاری بۆ تەواوکردنی خوێندن دەهاتنە هەولێر و لەم بارەیەوە بە ڕێز جەلال بەگی میر حەمەدەمینی دەرگەڵەیی فەرمووی[1]:

من لە شاری هەولێر کە قوتابی دواناوەندی بووم، لەگەڵ کۆمەڵێک لاوی رۆشنبیرو خوێنگەرم لە قوتابخانەکە حیزبێکمان دروست کرد، وەکو گروپێکی سیاسی رزگاریخواز، ئەمەش لە ساڵی ١٩٣٩ بوو، ناومان لەو حیزبە نا (ئەستێرەی هیوا).

هەروەها شێخ سلێمان مستەفا لە نامەیەکی تایبەتیدا دەفەرمووێ[2]:

من کە لە هەولێر بووم و لە قوتابخانەی دواناوەندیم دەخوێند، لە پۆلی چوارەم دوای ئەوەی برادەرانی سەرەوە لە حیزبی هیوا، وای بۆ چووبوون کە من شایانی ئەوەم بچمە ناو ریزەکانی حیزب.. رۆژێکیان برادەرێکی خۆشەویستم (عوسمان بەگ میران) کە پەیوەندییەکی برادەرایەتی بەهێزمان هەبوو، منی جودا کردەوە و پێی گوتم: لە حیزبی هیوا، کە من یەکێکم لە ئەندامانی، راسپێردراوم کە پێت رابگەیێنم حزب تۆی دەسنیشان کردووە، کە پاش هەڵسەنگاندن بێیتە ریزی رێکخستنەکانی حزب.. منیش لەبەرئەوەی لە کۆنەوە بیری کوردایەتیم لە مێشک جێگیر بوو، بۆیە رەزامەندی خۆم نیشاندا و لەو کاتەوە (١٩٤٢) بووم بە ئەندامی حزبی هیوا و سوێندم خوارد.

بەڕێز (سەبری نەجیب نوری)یش لە نامەیەکی تایبەتیدا

دەفەرمووێ[٣]:

کە لە هەولێر قوتابی پۆلی دووەمی ناوەندی بووم، لە ساڵی ١٩٣٩ بووم بە ئەندام... پاش کۆتایی ئەم ساڵەی خوێندن ئێمە بەرەو رواندز گەڕاینەوە. کە هاتینە شارەکەمان بە نهێنی دەستمان بە رێکخستنی حزب کرد[٤]. دیارە ئەو کات حزبی هیوا باڵا دەست بوو. ئێمە کۆمەڵێک بووین (من و شێخ سلێمان و عەلی مەکتەبە و محەمەد ئەمین نووری و نەجات سەعید و حوسێن میرزا حەسەن) هەروەها کۆمەڵێک مامۆستاش بەرپرسی ئەوکاتی حزب لە رواندز (مامۆستا شەفیق سەعدوڵلا) بوو، کە مامۆستای قوتابخانەی (پاشای گەورە) بوو.

## ٢- سوێند خواردن

پاڵێوراوانی حزبی هیوا کە دەبوونە ئەندام لە بەردەم چەند ئەندامێک سوێندیان بە ئاڵای کوردستان و قورئانی پیرۆز و خەنجەرو گوڵە گەنم دەخوارد، لەم بارەوەش بەرێز شێخ سلێمان مستەفا فەرمووی[٥]:

ئەو کەسەی ببوایە ئەندامی حزبی هیوا پێویست بوو دەست لەسەر قورئانی پیرۆز و خەنجەری کوردی دابنێت، ئینجا سوێند پاکی بخواردبا.

## ٣- کۆبوونەوەی حزب لە کوێ دەکرا؟

لەم بارەوە رێزدار جەلال بەگی دەرگەڵەیی فەرموویەتی[٦]:

ئێمە لە کارەکانماندا بەشفرە و شتی لەم بابەتە چالاکییەکانی خۆمان ئەنجام دەدا. هەمیشە نهێنی خۆمان بەباشی دەپاراست، ئەگەر لە شوێنێک کۆبوونەوەمان بکردایە و بمانزانیبا مەترسییەک هەیە، یەکسەر دەمانکردە گاڵتەجاڕی و شایی.

بەرێز شێخ سلێمان مستەفاش لەم باردوە دەفەرمووێ[٧]:

کۆبوونەوەکانمان بە دزی دەکرد، ئەگەر دنیا خۆش بوایە دەچووینە دەرەوەی شار. یەکە یەکە دەگەیشتینە ئەو جێگایەی، کە بۆ کۆبوونەوە دیاری دەکرا، مامۆستا عەلی مەکتەبەش دەفەرمووێ[٨]:

لە ماڵی (نەجات سەعید ئاغا) بەشداری یەک کۆبوونەوەی حزبی هیوام کردو بە دروشمی (بژی هیوا- بژی سەرۆک) دەست بە کۆبوونەوە دەکراو، تەنیا لایەنگیرێکی ئەم حزبە بووم، چونکە بەرەو بیری پرۆلیتاریەت دەچووم.

## ٤- بلاوکراوەی (کوردستان) دەستخەتی حزبی هیوا لە رواندز

ئەوەی دیارو ئاشکرایە، حزبی هیوا بایەخێکی زۆری بە رۆشنبیری و وشیاری نەتەوایەتی داوە، بۆیە لە هەر شوێنێ رێکخستنی هەبووایە ئەوا بلاوکراوەیەکی دەستخەتی لە لایەن چەند ئەندامێکی کارامە و لێزان دەنووسراو بلاو دەکرایەوە، بۆ خۆ رۆشنبیرکردنیش گۆڤاری (گەلاوێژ) لە نێو ئەندامەکانی دەخوێندرایەوە و لە کۆبوونەوەکانیش مشتومڕ لە سەر بابەتە نەتەوایەتییەکان دەکرا.

لە بارەی بلاوکراوەی (کوردستان) لە رواندز بەرێز سەبری نەجیب نووری دەفەرمووێ[٩]:

ئێمە کە لە حزب ئەندام بووین، لە رواندز بلاوکراوەی (کوردستان)مان دەردەچواند و زۆر شتمان لەسەر شۆڕشەکانی میللەتی کورد (شۆڕشەکانی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری و شێخ سەعیدی پیران و شێخ عەبدولقادری پیران و سمکۆی شکاک و شێخ مەحموودی نەمرو بە تایبەتی، شێخ عەبدولسەلامی بارزانی) دەنووسی و بەرگەکەش لە لایەن ئەندام عەلی مەکتەبە (بە چیا و رۆژ) دەرازانرایەوە، کە بەیداغی کورد بوو، وابزانم چوار پێنج ژمارەی لێ بلاوکرایەوە، بەڵام بەداخەوە لە بەر حوکمڕانی ئەو کاتی (نوری سەعید) نەمانتوانی دانەیەکیشی بپارێزین.

لەبارەی چۆنیەتی و شوێنی دەرکردن و نەخشەکێشان بەرێز (سەبری نەجیب) فەرمووی[١٠]:

لە سەر داوای حزب و بەرپرسی رواندز دەرکردنی بلاوکراوەیەک خرایە ئەستۆی (من و عەلی مەکتەبە)، ئەوە بوو ئێمەش دوای کۆکردنەوەی

وتارەکان پاکنووسمان دەکردن و بەنهێنی لە مزگەوتی (خانەقا) دەرمان دەکرد و ئەرکی نەخشەکێشانی (تصمیم) لە ئەستۆی (عەلی مەکتەبە) بوو، دوای دەرکردنی چەند ژمارەیەک و هەندێک بلاوکراوەی حزب، من لەبەرئەوە ئاشکرا بووم و لە سالی ١٩٤٤ گیرام و بۆ ماوەی سێ مانگ حوکم درام و پێنج سالیش لە ژێر چاودێریدا بووم.

## ٥- بە راسپاردەی حزبی هیوا کتێبخانەیەک لە رواندز دەکرێتەوە

لە سالی (...) هەولدرا یانەیەکی رۆشنبیری لە رواندز بکرێتەوە[١١]، بەلام مۆلەتیان نەدا، سەرەرای ئەمەش عاشقانی وشەی رەسەنی کوردی بەردەوام لەم پێناوەدا بێ پسانەوە هەنگاویان نا و چاپخانەی زاری کرمانجیش بە پێی توانا هەولیدا رۆشنبیری بلاوبکاتەوە.

بایەخدان بەم لایەنە بۆ بەرزکردنەوەی وشیاری نەتەوایەتی، بەتایبەتی دوای نەمانی چاپخانەی زاری کرمانجی، بۆشاییەکی گەورەی لە رواندز تێکەوت، بۆیە بەرێز (سەبری نەجیب) دەفەرموێ[١٢]:

ئەوە بوو بە راسپاردەی حزبی هیوا (من و عەلی مەکتەبە) بەهاریکاری چەند نیشتمانپەروەرێکی دلسۆز کتێبخانەیەکمان کردەوە، سەرەتا ناومان لێنا (سەرکەوتن)، لە راستیدا ناوەکەشمان لە پیتی (V)ی دروشمی هاوپەیمانەکان وەرگرت، کە بە مانای سەرکەوتن دێت، بەلام دواتر (پیرەمێرد)ی نەمر، کە رۆژنامەی (ژین)ی بۆ دەناردین: رۆژێک لە سەر بەستەکێکی (رزمە)یەکی رۆژنامەکە بۆی نووسیبووین "پێشکەوتن"، بۆیە ئێمەش گۆریمان بۆ پێشکەوتن، لەم بارەیەوە (عەلی مەکتەبە) هەر هەمان راو بۆچوونی هەیە.

لەبارەی رۆلی وشیارکردنەوەی جەماوەریش بەرێز جەلال بەگی دەرگەلەیی دەفەرمووێ[١٣]:

حزبەکەمان (حزبی هیوا) لەو کاتەدا رۆلێکی گرنگی لە وشیارکردنەوەی کۆمەلی کوردەواری دەگێرا و جێگای شانازی بوو، بەتایبەتی لە ناو توێژی رۆشنبیرو قوتابییاندا کاریگەرییەکی بەرچاو و دیاری لە سەر جوولانەوەی رۆشنبیرییەکانی ئەو کات هەبوو، لەم بارەیەوە بەرێزیان دەفەرمووێ[١٤]:

ئەو کات قوتابخانەکان رۆلی سەرەکییان لە بلاوکردنەوەی رۆشنبیری و خوێنەیاندن دەگێرا، بەلام (چاپخانەی زاری کرمانجی) مامۆستا (حوسێن حوزنی موکریانی) برای مامۆستا (گیوی موکریانی) وەک بنکەیەکی مەزنی رۆشنبیری لە شاری هەولێرو، هەروەها سەید تەها فەندی شەمزینی لە رواندز، کاریگەرترین سەرچاوەی رۆشنبیری ئێمە بوون لەو سەردەمەدا.

هەر لەم بارەوەش (سەبری نەجیب نوری) فەرمووی[١٥]:

سەبارەت بە رۆشنبیری، هەموو کوردستان کەم و کورتی تێدا هەبوو، لەگەلێک شوێن قوتابخانە نەبوو، (حزبی هیوا)ش لە (١٩٤١-١٩٤٢) کتێبخانەیەکی پێشکەوتنی بە سەرپەرشتی (عەلی مەکتەبە) کردەوە.

## ٦- بلاوکراوەیەک لەبارەی بەردانی دادوەری بەرایی دادگای زاخۆ

بە داخەوە بلاوکراوەکانی حزبی هیوا بە دەستخەت دەنووسران و بلاودەکرانەوە، لە بارەی یەکێک لەم بلاوکراوانە مامۆستا (سەبری نەجیب نووری) دەنووسێ[١٦]:

یەکێ لەو بلاوکراوانە ئەوەیە، کە لە سالی ١٩٤٣ مامۆستا (عەونی یوسف) لە قەزای زاخۆ دادوەری بەرایی دەبێ، لەبەر ئەوەی ئەندامێکی دیاری حزبی هیوا بوو و چالاکییەکانی بە ئاشکرا ئەنجام دەدا بە فەرمانی نوری سەعید بۆ بەسرە دوور دەخرێتەوە، دوای دوورخستنەوەی (نەفی) مامۆستا (عەونی یوسف)، حزبی هیوا بریاری دا بلاوکراوەیەکی سەرتاسەری لە کوردستان، لەم بارەیەوە بلاو بکرێتەوە.. وا بزانم مانگی کانوونی دووەمی سالی ١٩٤٣ بوو دانەیەکی بلاوکراوەکە بۆمان هات، کە ئەو

کاتی بەڕێوەبەری حزبمان مامۆستا (شەفیق سەعدوڵلا زاخولی) بوو..

لە بلاوکراوەکەدا هاتبوو، کە دەبێ مامۆستا (عەونی یوسف) بگەڕێتەوە شوێنی خۆی و ئەگەر نەگەڕایەوە ئەوا شۆڕش هەڵدەگیرسێنین، ئەم راستییەش بە عەرەبی لە بلاوکراوەکەدا نووسرابوو (و في حالە عدم عودة السيد عوني يوسف، حاكم بداءة قضاء زاخو، اننا نقوم بثورة مسلحة).

### ٧- ناوی هەندێ لە ئەندامانی حزبی هیوا لە رواندز

لە بەر ئەوەی زۆربەی زۆری ئەندامانی حزبی هیوا لە ژیاندا نەماون، بۆیە نەمانتوانی ناوی هەموویان بزانین، کە هەر ئەندامێکیش ناوی نهێنی هەبوو..

مامۆستا سەبری نەجیب نووری[١٧] ژمارەیان لە هەموو کوردستاندا بەهەزارو چوارسەد ئەندام دادەنرێت، بێگومان ئەم ژمارەیەش لەگەڵ هی ئەوانەی لەم بارەوە نووسیویانە جیاوازییەکی زۆری هەیە.

ئەمانەی خوارەوەش ناوی ئەو بەرڕێزانەیە کە توانیمان بیزانین:

١- شێخ سلێمان مستەفا (جەنگاوەر)
٢- سەبری نەجیب نوری (زرینگ)
٣- عەبدولوەهاب محەمەد عەلی جوندیانی
٤- ئەحمەد محەمەد عەلی جوندیانی
٥- ئیبراهیم حەسەن
٦- محەمەد عەلی حوسێن
٧- نەشئەت شەوکەت
٨- سەید عومەر سەید ئەحمەد
٩- سەید فەتاح رواندزی
١٠- جەلال سەعید خەیلانی
١١- محەمەد محەمەد ئەمین
١٢- عەلی مەکتەبە (عەلی عەبدوڵلا)
١٣- سەعید محەمەد عەلی
١٤- ئەنوەر مستەفا مەزهەر
١٥- حەسەن حاجی میرزا حەسەن
١٦- حوسێن میرزا حەسەن
١٧- نەجات سەعید قادر
١٨- جەلال بەگی دەرگەڵەیی
١٩- عەزیز مەلا حەکیم
٢٠- سامی رواندزی
٢١- ئەنوەر عەبدوڵلا (ئەنوەر کۆیی)
٢٢- محەمەد محەمەد ئەمین
٢٣- سەعید محەمەد عەلی
٢٤- عەبدوڵلا سامی
٢٥- ئەحمەد حەوێز
٢٦- محەمەد قودسی
٢٧- مستەفا بایز بەگ
٢٨- شەفیق سەعدوڵلا (زاخۆیی بوو)
٢٩- بەکر سامی
٣٠- حەمید بەگی میران
٣١- وسو ئاغا رەشید ئاغا کاولۆکان
٣٢- مستەفا حاجی عەبدولڕەزاق
٣٣- ساڵح نادر

### ٨- پەیوەندی رێکخستنی حزبی هیوا

پەیوەندییەکی پتەو و بەردەوام لە نێوان رێکخستنەکانی حزبی هیوا هەبووە، لەم بارەیەوە مامۆستا جەلال بەگی دەرگەڵەیی فەرموویەتی[١٨]:

من و کاک رەشید عەبدولقادر (سەرۆکی دادگای تەمیزی ئێستای کوردستان)، لیژنەی پەیوەندییەکانی نێوان هەولێرو موسڵ و شوێنەکانی دیکە بووین...

لەبارەی پەیڕەو و پرۆگرامی ناوخۆش، مامۆستا دەرگەڵەیی دەفەرمووێ:

نیزام داخلی حزب، ساڵ بە ساڵ دەسکاری دەکراو ئابوونەش بە گوێرەی توانای ئەندام بوو، بۆ نموونە شێخ سلێمان مستەفا مانگانە سەد فلسی ئابوونە دەدامێ.

### ٩- هۆیەکانی هەڵوەشانەوەی (حیزبی هیوا) چی بوون:

لەبارەی هۆیەکانی بابەتی و خودی هەڵوەشانەوە و نەمانی حزبی هیوا بەڕێز جەلال بەگی دەرگەڵەیی دەفەرمووێ[١٩]: بەڕای من یەکێ لە هۆیە سەرەکییەکانی هەڵوەشانەوەی حیزبی هیوا دەست تێوەردانی سەربازی بووە، کاتێ ئەفسەرە کوردەکان هاتنە ریزی حزبی هیوا، ئەوە بەلای منەوە بە زیانی حزب تەواو بوو، نەک بە قازانجی. چونکە وای لێهاتبوو لە ساڵی ١٩٤٣ لە ناو

حزب گەورەترین پلەی سەربازی دەکرایە لێپرسراوی یەکەمی حزب. هەروەها موتەسەریفەکانیش (متصرف - محافظ) دەستیان لەکاروباری حزب و لە لیواکانی خۆیان وەردەدا. بۆیە بەرە بەرە رووەو لاوازی دەچوو: تا لەئەنجامدا حزبی هیوایان هەڵوەشاندەوە. بەڕێز (شێخ سلێمان مستەفا)ش دەفەرمووێ[20]:

حزبی هیوا لە ناو خۆی گیروگرفتی تێدا بوو ئەوەش لە بەر هەندێ نارەزایی لە ئەندامانی سەرەوەی (سەرکردایەتی) حزب، بۆیە هەر لەوکاتەی رێکخستن پچڕا، منیش یەکێک بووم لەوانەی خۆم دوورخستەوە. ئەمە بەشێکە لە رۆڵی رواندزییەکان لەنێو حزبی هیوا و ئەگەر ئەم نووسینە پێش چەند ساڵێک بوایە ئەوا مسۆگەر دەوڵەمەندتر و بە برشتتر دەبوو، چونکە ئەو کاتە هەندێ لە ئەندامانی حزبی هیوا لە ژیاندا مابوون، بۆیە دەتوانرا پوختتر بنووسرێتەوە، دەتوانم بڵێم زۆر بەڵگەنامەو دەستنووس سەبارەت بە زۆر لایەنی نەتەوەکەمان لە پایتەختەکانی دوور و نزیک هەن، بەڵام خەمخۆریان گەرەکە و ئەگەر بەدوایاندا بگەڕێن ئەو دەم زۆر لایەن روون و ئاشکرا دەبێت.

**پەراوێزەکان:**

١- رۆژنامەی کوردستانی نوێ-ژمارەی (٥)، ١٩٩٢ ل ٥.
٢- لە نامەیەکی تایبەت بۆ نووسەر ئەم باسە لە ١ / ٩ / ١٩٩٧ ناردوویەتی.
٣- لە نامەیەکی تایبەت بۆ نووسەر ئەم باسە لە ١٧ / ٣ / ١٩٩٨ ناردوویەتی.
٤- گۆڤاری رواندز، ژمارە (١)، ١٩٩٨ ل ٦٠ و ٦١.
٥- لە هەمان نامەی پێشووی بەڕێز شێخ سلێماندا هاتووە.
٦- هەمان ژمارەی (کوردستانی نوێ)ی پێشوو.
٧- لە هەمان نامەی پێشووی بەڕێز شێخ سلێماندا هاتووە.
٨- چاوپێکەوتنێک لەگەڵ رێزدار مامۆستا عەلی مەکتەبە لە رواندز لە ١٤ / ٣ / ٢٠٠٠ لە مەکتەبەی خۆی.
٩- لە هەمان نامەی پێشووی سەبری نەجیب هاتووە.
١٠- لە هەمان نامەی پێشووی سەبری نەجیب هاتووە.
١١- رۆژنامەی ئاڵای ئازادی، ژمارە (١٧٤)١٩٩٥.
١٢- لە هەمان نامەی پێشووی سەبری نەجیب هاتووە.
١٣- لە هەمان ژمارەی پێشووی کوردستانی نوێ.
١٤- لە هەمان سەرچاوەی پێشوو.
١٥- لە هەمان نامەی پێشووی سەبری نەجیب هاتووە.
١٦- لە هەمان نامەی پێشوودا.
١٧- لە هەمان نامەی پێشوو دا.
١٨- هەمان ژمارەی پێشووی کوردستانی نوێ.
١٩- هەمان رۆژنامە.
٢٠- لە هەمان نامەی بەڕێز شێخ سلێمان مستەفا هاتووە.

**سەرچاوەکان:**

١- گۆڤاری رواندز-ژمارە (١)- س١-١٩٩٨ (چاوپێکەوتن لەگەڵ چەند کەسایەتێکی رواندزیدا).
٢- گۆڤاری گولان العربی-العدد ٦ / ١٩٩٦ امین الرواندزی و معروف جیاوک و دورهما فی جمعیە استقلال کوردستان.
٣- رۆژنامەی کوردستانی نوێ-ژمارە (٥) ساڵی ١٩٩٢ حزبی هیوا و چەند بیرەوەرییەک.
٤- ئاڵای ئازادی ژمارە (١٧٤)/ ١٩٩٥.
٥- نامەی تایبەتی بۆ نووسەری ئەم باسە نێردراوە:
١- لە بەڕێز شێخ سلێمان مستەفا لە ١/ ٩ / ١٩٩٧.
٢- لە بەڕێز سەبری نەجیب نوری لە ١٧ /٣/ ١٩٩٨.
٣- لە بەڕێز سەبری نوری لە ١٥ / ١ / ١٩٩٩.
٦- چاوپێکەوتنێک لەگەڵ رێزدار عەلی مەکتەبە لە مەکتەبەی خۆی لە رواندز لە ١١ / ٣ / ٢٠٠٠.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەولێر-ژمارە ٩ ی زستانی ٢٠٠١ وەرگیراوە.



# کۆیە و هاتنی بەریتانیا بۆ کوردستان

## کەریم شارەزا

کاتێک دەوڵەتی عوسمانی لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا شکا و لە رۆژی ١١/ ١٩١٨/١١ ئاگربەست لە نێوانی سوپای بەریتانیای داگیرکەر و دەوڵەتی عوسمانی شکست خواردوو راگەیەنرا و هەموو عێراق و باشووری کوردستان کەوتنە بەر حوکمی ئەو دەوڵەتە سەرکەوتووە، بۆ رۆژی ١٩١٨/١٢/١٥ هێزێکی سوپای بەریتانیای سەرکەوتوو لەو جەنگە جیهانییەدا بە سەرکردایەتی (کاپتن هەی) گەیشتە کۆیە و لە دەرەوەی شار شاندێکی گەورە لە کەسایەتی دەسەڵاتدار لە پێشوازییاندا بوون و لە سەرووی هەمووشیانەوە عەولاغای تایەر ئاغای حەوێزی و حەماغای غەفووری و جەمیل ئاغای حەوێزی و مەلا ئەحمەد ئاغای سلێمان ئاغای غەفووری و مەلا محەمەدی جەلی زادە (مەلای گەورە) بوون.

دوای بەخێرهێنانی سەرکردەی سوپاکە، هەموویان بەرەو ناوەندی شار و ناو سەرای حکومەت چوون.

یەکەمین کاری (کاپتن هەی) دامەزراندنی کاروباری قەزای کۆیە بوو، بۆیە هەر ئەو رۆژە دوای تێگەیشتنی باری کۆمەڵایەتی و عەشایری شارو ناوچەی کۆیە و زانینی ئەو واقیعەی، کە شارەکە دوو بنەماڵەی گەورەی لێیە، ئەوانیش بنەماڵەی حەوێزی و بنەماڵەی غەفوورین و لەگەڵ بنەماڵەی جەلی زادە، کە لە سەرووییانەوە جەنابی مەلای گەورەی خاوەن کەسایەتی بەهێز بوو، بۆیە (هەی) بیری لەدابەشکردنی پایە و فەرمانی کارگێڕی شار و ناوچەکە لە نێوان کەسایەتییە ناودارەکانی ئەو بنەماڵەیە کردەوە و بۆ رۆژی دوایی دەستەی کارگێڕی ئەو قەزایەی بەم شێوەیەی خوارەوە دامەزراند:

١- حەمەغای غەفووری، حاکمی ئیداری کۆیە و ناوچەکەی.
٢- جەمیل ئاغای حەوێزی، جێگری حاکمی ئیداری.
٣- مەلا محەمەدی جەلی زادە (مەلای گەورە)، قازیی شەرع.
٤- مەلا ئەحمەد ئاغای سمایل ئاغای غەفووری، دادوەری سولح.
٥- عەبدولفەتاح ئاغای حەوێزی، سەرۆکی شارەوانی.
٦- مەلا حەوێز ئاغای غەفووری، بەڕێوەبەری پۆلیسی پیادە.
٧- حاجی جەلیل ئاغای حەوێزی، بەڕێوەبەری پۆلیسی سوارە.

٨- حاجی عەبدوڵلا بەگ، بەڕێوەبەری ئەوقاف.
٩- مەلا سدیق نازەنینی، بەڕێوەبەری تاپۆ.

بەم جۆرە کاپتن هەی ئیدارەی کۆیەی بە کەسایەتی بنەماڵەکانی حەویزی و غەفووری و جەلی زادە رێکخست و شارەکە هێمن و ئارامی دوای شەڕ و ناخۆشی نێوان عەشیرەتی پیران و بنەماڵەی حەویزی بە تایبەتی عەولاغای بەخۆوە بینی و خەڵکەکەی دوای گرانییە گەورەکەی (١٩١٧- ١٩١٨) هەناسەیەکی خۆشی و ئاسوودەییان هەڵکێشا.

کاتێک کە شێخ مەحموودی حەفید، حکومەتی باشووری کوردستان (١٩١٨/١١/١٥) لە سلێمانی و دەوروبەری دامەزراند، هەستی کوردایەتی بە دروستبوونی ئەو حکومەتە کوردییە لە هەموو لایەکی کوردستان ورووژاو وردە وردە دەستەلاتی پەرەی سەند تا گەیشتە رانیە و کۆیە و رەواندز، خەڵکی شاری کۆیە لەگەڵ حوکمی شێخ مەحموود بوون و دەستەلاتی ئینگلیزیان نەدەویست و لە سەرووشیانەوە عەولاغای حەویزی کۆنە سەرۆکی شارەوانی کۆیەی سەردەمی عوسمانی بوو، لەگەڵ (کاپتن هەی) ناکۆک بوو، لەو دەمەدا شێخ مەحموودی حوکمداری کوردستان، شێخ عوسمانی سەرگەڵوویی وەک قائمقامی حکومەتی کوردستان ناردە کۆیە و لەم بارە نوێیەدا شارەکە دوو قائمقامی بۆ دامەزرا، لێرەدا کاپتن هەی کەوتە نێوان دوو هێزەوە، هێزی بەریتانیا و هێزی حکومەتی شێخ مەحموود. ئایا حەماغای بهێڵێتەوە یاخود دان بە قائمقامیەتی شێخ عوسمان دابنێ و حەمەغای بنێرێتەوە ماڵ؟

حەمەغا لە (هەی) پرسی: "بۆم ساغ کەوە من قائمقامم یان شێخ عوسمان؟"

لە راستیدا حەماغا چاوی لەوە بوو شێخ مەحموود رووی لێ بنێ بۆ قائمقامیەتی کۆیە و ناوچەکەی، کەچی پشتگوێی خستبوو. کاپتن هەی پەیوەندی بە مەندووبی سامی لە رێگەی مەرجەعی خۆیەوە کرد تاکو کام لەو دووە هەڵبژێرێ و لە ئەنجامدا سیاسەتی بەریتانیا وای دەخواست، کە باشووری کوردستان بەسەریەکەوە نەبێ، بۆیە وای پەسەند کرد، کە حەمەغا و جەمیل ئاغا لە پایەی خۆیان بمێننەوە و شێخ عوسمان بەرەو سلێمانی بنێرنەوە بۆ شێخ مەحموود. لەم گۆڕانکارییەدا (هەی) عەولاغای حەویزی لایەنگری شێخ مەحموودی بۆ ماوەی ساڵێک دوور خستەوە، ئنجا کردییە بەڕێوەبەری ناحیەی تەق تەق تاکو لە شاری کۆیە دوور کەوێتەوە.

حەماغای حاکمی ئیداری کۆیە و ناوچەکەی لە رۆژی (١٩١٨/١٢/١٥)ەوە تاکو رۆژی کۆچی دوایی لە بەرەبەیانی (١٩٢٠/٨/٣)دا بە یارمەتی و پشتگیریی جەمیل ئاغای حەویزی کە لە کاروباری هۆزەکانی ناوچەکە زۆر شارەزا بوو کاروباری قەزاکەیان بە چاکی بەڕێوە برد و راوێژکارێکی ئینگلیز لە رووی هونەریی و کارگێریی و داراییەوە یارمەتی دەدان و فێری بەڕێوەبردنی حوکمڕانی لەسەر بنچینەیەکی نوێی دەکردن، بۆ یەکەم جار ئەنجومەنی شارەوانی کۆیە نوێنەری جوولەکە و دیانەکانی کۆیەی گرتەخۆ و خزمەتێکی زۆری شارەکەیان کرد، بەتایبەتی لە رووی پاک و خاوێنی شەقام و کۆڵانەکانی.

لە پاش کۆچی دوایی حەمەغای غەفووری، جێگرە چالاکەکەی: جەمیل ئاغای حەویزی لە جێی ئەودا بووە حاکمی ئیداری کۆیە و ناوچە فراوانەکەی و ئەم زاتە نموونەی رەوشت بەرزی بوو، بەردەوام هەوڵی دەدا هیچ ناخۆشییەک لە نێوان هەردوو بنەماڵەکەی کۆیە: حەویزی و غەفووری روونەدات و هیچ گوشارێکی ئایینی و کۆمەڵایەتی لەسەر جوولەکە و دیانەکانی شارەکە نەهێشت و بەوە ناسرا، کە پشتیوانی ئەو دوو کەمایەتییە ئایینییەی جوولەکە و دیانانە.

سەرچاوە:
١- تایەر ئەحمەد حەویزی- مێژووی کۆیە- بەرگی یەکەم- بەغدا (١٩٦٢)
٢- کاپتن هی- سنتان فی کردستان- ج (٢)- بغداد- ترجمه فؤاد جمیل.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری مێرگ ژمارە (٢٣)ی نیسانی ٢٠٠٧ لا ٣٤-٣٧ وەرگیراوە.

# کۆیه و دامەزراندنی حکومەتی عێراق له ساڵی ۱۹۲۱دا

جەماڵ فەتحوڵلا تەیب- زانکۆی کۆیه

کۆتایی هاتنی یەکەم جەنگی جیهانی، بووه هۆی دارمانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کە لەدوای خۆی بۆشاییەکی سیاسی و ئیداری گەورەی لەناوچەکەدا دروست کرد[۱]. هەڵبەت ئەو بارودۆخە دەرفەتی بۆ ناوچەکانی ویلایەتی موسڵیش رەخساند کە بزووتنەوەی ئازادیخوازیی نەتەوەیی کوردی بەرەو گەشەسەندن ببات و زەمینەیەکی لەبار بۆ دروستکردنی کابینەیەکی فەرمانڕەوایی بەسەرکردایەتی شێخ مەحمود لە سلێمانی و دەوروبەریدا فەراهەم بکات[۲].

کۆیه هەروەک زۆربەی ناوچەکانی دیکەی کوردستان لەنێوچوونی دەوڵەتی عوسمانییان بەرووداوێکی گرنگ کە بە قازانجی دۆزی رەوای کورد دەزانی، چونکە ئەو دەسەڵاتە رۆژانە ژمارەیەک لە لاوی کۆیەی لەبەردەم سەرا لەسێدارە دەدا، تەنها لەبەر ئەوەی کە ئامادە نەبوون ببن بەسەرباز. ئەمە جگە لە پێڕەوکردنی سیاسەتی سەرکوتکردن و بەتاڵانبردنی سامانی خەڵکی، کە قات وقری لێ کەوتەوە و گیانی هەزاران مرۆڤی کوردی بێ تاوانی بەفیڕۆدا[۳].

بەڵام عوسمانییەکان تەنها پاش برانەوەی شەڕو شکستی هێنانیان لەم ناوچانە کشانەوە، دوای چوونە دەرەوەی لەشکری تورک و بەر لە هاتنی هێزەکانی ئینگلیز بۆ ناوچەی کۆیه، خەڵکی شارەکە ئیدارەیەکی شاریان دروست کرد[٤].

کۆیه وەک شارۆچکەیەک تا کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانی، سەر بە سنجەقی کەرکوک بوو. دواتر لە سەردەمی یەکەم حوکمداری شێخ مەحمود (۱۵/۱۱/۱۹۱۸-۱۹/٦/۱۹۱۹)[٥]، بوو بە قەزایەک سەر بە سلێمانی. بەڵام لە مانگی یازدەی ساڵی ۱۹۱۹ کۆیه بوو بە قەزایەکی سەر بە هەولێر، کە تازە بووبووه لیوا و لە موسڵ جیا کرابۆوه[٦]. لەوێ جێگری (متصرف) لیواکەی بەڕێوه دەبرد، بەڵام لەبواری ئیدارییەوە تا ساڵی ۱۹۲۳ بە کەرکوکەوە پەیوەست بوو[۷].

لە هەرسێ ویلایەتەکەی "بەغداد، بەسرە، موسڵ" دا هەندێ سیفەتی نەتەوایەتی و تایفی تایبەتی هەبوون، کە هەر یەکەیان لەوی تر جیاواز بوو. بۆ نموونە عەرەب لە رووی مەزهەبییەوە دابەش بوون بۆ شیعە و سوننە[۸]. بەڵام کورد کە زۆربەی دانیشتوانی موسڵیان پێک دەهێنا[۹]، لە رووی نەتەوایەتییەوە لە دانیشتوانی هەردوو ویلایەتی بەغداو بەسرە جیاوازبوون. گرنگترین شت کە بە عەرەبی دەبەستنەوە، ئایینی ئیسلام بوو[۱۰]، بەڵام لەو کاتەدا ئایین بۆ یەکبوونی دانیشتوانی ئەم ویلایەتانە بەس نەبوو[۱۱]. بە تایبەتی کورد، کە بەهۆی زاڵبوونی هەستی نەتەوایەتییان پاڵی بە وتاربێژانی مزگەوتەکانی هەندێ ناوچە کوردییەکانەوە نا، کە زۆر دژی بیرۆکەی چوونە پاڵ عێراق بن و لە رێگەی وتارەکانیانەوە رۆڵی کاریگەریان لەسەر هەستی جەماوەر هەبوو[۱۲].

ئینگلیزەکان بەر لە هەڵایسانی یەکەم جەنگی جیهانی و لەساڵانی جەنگیشدا بایەخێکی تایبەتییان بە کوردستان دابوو. هۆکاری ئەمەش بۆ هەڵکەوتەی ستراتیژی شوێنی کورد و دەوڵەمەندی ناوچەکە لە ڕووی کانزای ژێر زەوییەوە دەگەڕێتەوە[١٣]. ئەوەی پێوەندی بە هەڵوێستی بەریتانیاوە بێت سەبارەت بە کورد، ئەوا پاش ئەوەی کە هەموو ویلایەتی (موسڵ)یان کۆنترۆڵ کرد، سیاسەتێکی دووفاقانەیان بەکار دەهێنا کە لایەنێکی ئەو سیاسەتەیان پۆزەتیڤانە بوو بەرامبەر کوردو کوردستان. بۆ نموونە مێجەر نوئیل دوای ئەوەی هاتە سلێمانی، بەگەرمی لەلایەن دانیشتوانەکەیەوە پێشوازی لێ کراو لەوێ ڕایگەیاند کە ئەو هیچ ئاستەنگێک لەبەردەم دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی نابینێ، کە لە ژێر کۆنترۆڵی بەریتانیادا بێ. هەروەها ولسن پێی وابوو، کە ڕاپرسی ناوچە کوردییەکان بکرێت کە ئەلتەرناتیڤی نەچوونە پاڵ میزۆپۆتامیا و دامەزراندنی دەوڵەتێکی جیاوازو سەربەخۆ دەبێت، کە نزیکەی هەموو ویلایەتی موسڵ لە باشووری کوردستان بگرێتەخۆ. هەرچی لۆرد (کیرزن) یش بوو ئەوا لە سەرەتادا ڕای وابوو کە کوردستانی سەربەخۆ دابمەزرێت[١٤].

لایەنەکەی دیکەی سیاسەتمەدارانی ئینگلیز کە بۆچوونی بەرامبەر کورد نێگەتیڤانە بوو، وەک: مس بیڵ و میجەر سۆن و دواتر ئارنۆڵد ویلسۆن، دامەزراندنی قەوارەیەکی کوردییان دژ بە بەرژەوەندی بەریتانیا دەزانی، بۆیە بەردەوام لەپێش دروستبوونی ئەو قەوارەیەدا بوونە ڕێگر[١٥]. لە هەمان کاتدا بەرنامەی ئینگلیز دامەزراندنی قەوارەیەکی یەکگرتووی عێراقی لە هەرسێ ویلایەتەکەی "بەسرە و بەغداد و موسڵ" بوو بۆ لێدانی هەر جموجوڵ و بزووتنەوەیەک کە دژی سیاسەتی بەریتانیا بێت. ئەمە بۆخۆی گەورەترین فاکتەری لای کورد دروست کرد کە ملکەچی سیاسەتەکانی بەریتانیا نەبێت[١٦]. بۆ نموونە بەریتانیا لەساڵی ١٩١٩ دا لەبارەی دروستبوونی دەوڵەتی عێراق ڕاپرسییەکی ئەنجامدا، کە تیایدا دانیشتوانی پارێزگای سلێمانی چوونە پاڵ دەوڵەتی (عێراق)یان ڕەت کردبۆوە، کەچی پارێزگای کەرکوک کە "کۆیە قەزایەکی ئەم پارێزگایە" بوو، لە دژی چوونەپاڵ حکومەتی عێراق دەنگی دا، واتە نیوەی ویلایەتی موسڵ دژی یەکگرتن بوون لەگەڵ عێراقدا[١٧]. جگە لەوەی لە ڕاپۆرتێکی (لیچمن) دا کە لە ٢٢ ی ئەیلولی ١٩١٨ دا هاتبوو دەڵێ: "کوردەکان کە نیوەی دانیشتوانی موسڵ بوون لە ٢/٣ ی سەرجەمی ناوچەکە نیشتەجێ بوون، دژی عەرەب بوون،... تەنها خاوەن موڵکەکان پشتگیری حکومەتی عەرەبییان دەکرد[١٨].

کاتێک حکومەتی کاتی لەساڵی ١٩٢٠ دا لە عێراق دامەزرا، لیوا کوردییەکان کەوتنە دەرەوەی کارگێڕی ئەم حکومەتە، مەندوبی سامی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی کارگێڕی ئەم ناوچانەی دەکرد، هیچ عێراقییەک بۆ ئەم مەبەستە چ عەرەب و چ کورد وەک لێپرسراوی ناوچەکە دیاری نەکرا[١٩].

شایانی باسە کۆیە هەر لە سەرەتاوە دژی دامەزراندنی حکومەتی عێراقی عەرەبی و لکاندنی باشووری کوردستان بە عێراقەوە بوو[٢٠]. ڕاو بۆچوونی خەڵکی کۆیە وابوو کە پێویستە کورد بەپێی بەندەکانی پەیمانی "سیڤەر-١٩٢٠" سەربەخۆ بێ، مەلای گەورەی کۆیەش لەگەڵ مافی سەربەخۆیی گەلی کورددا بوو، هەرچەندە کاریگەرییەکی ئەوتۆی لەسەر ڕەوتی ڕووداوەکان نەبوو[٢١].

عێراق کە دروستکراوی ئینگلیز بوو، هەر ئینگلیزیش لە هەڕەشەی ناوەکی (کورد و شیعە) و هەڕەشەی دەرەکی کە تورکیا بوو دەیپاراست[٢٢]. لە ڕاپرسی ساڵی ١٩٢١ دا کە بەریتانیا بەمەبەستی هەڵبژاردنی شا فەیسەل، ئەنجامیدا، تا شەرعیەت بداتە فەیسەل وەک شایەکی عێراق[٢٣]، لەو ڕاپرسییەدا دانیشتوانی شاری کەرکوک دژی دانانی شا فەیسەل بوون. کەچی سلێمانی بەشداری ڕاپرسییەکەی نەکرد، بەڵکو داوای دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی دەکرد[٢٤]. لیوای کەرکوک لەوکاتەدا هەولێر و کۆیە و ڕەواندزیشی دەگرتەوە، کە لە

دژی شا فەیسەل و چوونە ژێر حوکمەکەی دەنگیان دا، خەڵکی بادینانیش لەبەرامبەر ڕەزامەندییان بۆچوونە پاڵ عێراق داوای ئۆتۆنۆمییان کردبوو[٢٥]. واتە کەرکوک و شوێنەکانی سەر بە کەرکوک بە دژی فەیسەل دەنگیان دا، هەولێرو ناوچە کوردییەکانی سەر بە موسڵ هەڵوێستی نەرمتریان نواند، ئەوانە بەسوودی فەیسەڵ دەنگیاندا بە مەرجێک مافە نەتەوایەتییەکانیان پارێزراو بێت[٢٦].

لە نێوخۆشدا ناوچە کوردییەکان یەک ڕاو بۆچوونیان نەبوو، هەر بۆ نموونە هەولێر دژی ئەوەبوو بخرێتە سەر لیوای کەرکوک وەک سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی، بەڵام کەرکوک کە لە کورد و عەرەب و تورکمان پێک دەهات، دژی چوونە پاڵ سلێمانی بوون[٢٧].

بەڵام سەبارەت بەهەڵوێستی کۆیە ئەوا دانیشتوانەکەی ئارەزووی سەربەخۆییان بووە. هەر بۆ نموونە مەلای گەورە لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ یەکێک لە ئەفسەرانی بەریتانیا لە هاوینی ١٩٢٠ دا بەم جۆرە بۆچوونی خۆی لەبارەی ئایندەی کورد دەربڕیبوو "هیچ هیوایەک نییە بۆ ڕزگاربوونی کوردستان، تەنها لەژێر پارێزگاری بەریتانیا نەبێت"، جەختی لەسەر پێویستی دانانی حاکمێکی کوردی بۆ کوردستان کردبوو[٢٨]، کە ئەویش "حەمدی بەگی" بابان بوو، ئەمەش لەنامەیەکدا هاتبوو، کە مەلای گەورەی کۆیە ئاراستەی ئەفسەری ئینگلیزی لە کۆیە لە ٦ / ٣ / ١٩٢٠ کردبوو، کە تیایدا هاتبوو "حاکمێکی بێ لایەن و بەتوانا دابندرێ، تا کورد بتوانێ شوێنی خۆی لە نێوان گەلانی پێشکەوتوودا بنوێنێ"، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مەلای گەورە مەسەلەی یەکگرتنی کوردەکانی دانیشتوانی موسڵی لەگەڵ کوردەکانی باکووردا بەدوور زانی[٢٩].

لێرەدا ئەو ڕاستییە بەدەردەکەوێ، کە خەڵکی ڕۆشنبیرو ڕەشۆکی کۆیە دژ بەدانانی شا فەیسەڵ دەنگیان دا، هەرچەندە لە ڕاپرسییەکەدا هەموو خەڵک بەشداری تێدا نەکرد، بەڵکو تەنها ژمارەیەک کەسایەتی و پیاو ماقووڵ و سەرۆک عەشیرەتەکان، کە زۆربەیان سەر بە ئینگلیز بوون ڕایان وەرگیرابوو[٣٠].

لەگەڵ ئەوەشدا وەک د. جاسم تۆفیق خۆشناو دەڵێ: "ئینگلیزەکان شا فەیسەلیان کردە پادشای وڵات کە بەڕەگەز عێراقیش نەبوو، ئینگلیز بۆ ئەوەی ئەم کارە ڕوخسارێکی یاسایی وەربگرێ ڕیفراندۆمێکی ساختەیان ئامادە کرد، سێر پێرسی کۆکس لە بەیانێکدا ڕایگەیاند کە خەڵکی ویلایەتی موسڵ (کوردستانی عێراق) لە بەشداریکردن یان نەکردن ئازادن، لەبەر ئەوەی بەپێی پەیمانی سیڤەر دەبێ بەشێک لە کوردستانی سەربەخۆ بێت"[٣١].

سەرچاوە و پەراوێزەکان:

١- محمد مظفر الادهمي: المجلس التأسيسي العراقي، دراسة تأريخية سياسية، مطبعة السعدون، بغداد، ١٩٧٦، ص٩.

٢- نادر ئینتیسار: ئیتنۆ نەتەوایەتی کوردی، وەرگێرانی: عەتا قەرەداغی، چاپخانەی تیشک، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل ١١٠-١١٢.

٣- حاجی محیەدین ئەسعەد: لاپەڕە گرنگ و باس نەکراوەکانی مێژووی کۆیە، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١٠٨)، ١٩٨٥، ل ٨١.

٤- صلاح شێخ شەرەف: کۆیە لە ئاوێنەی مێژووی کوردەواریدا، گۆڤاری (کۆسار)، ژمارە(٢-٣)، ٢٠٠٢، سلێمانی، ل ٢٥-٢٦.

٥- دبليو. ار. هي: سنتان في كردستان (١٩١٨-١٩٢٠)، ترجمة: فؤاد جميل، ج ١، ص ٢١٩.

٦- كريم شارەزا: لمحة عن تأريخ كويسنجق وانحائها، زاگروس (مجلة)، العدد (٣)، اربيل، ١٩٩٧، ص٤٠.

٧- د. كمال مظهر: كركوك وتوابعها حكم التأريخ والضمير، دراسة وثائقية عن القضية الكوردية في العراق، ج١، مطبعة رينوين، بدون مكان النشر، بدون تاريخ، ص ١١٣.

٨- حنا بطاطو: العراق، الكتاب الاول، الطبقات الاجتماعية

والحركات الثورية من العهد العثماني حتى قيام الجمهورية، ترجمة: منيف الرزاز، بيروت، ١٩٩٠، ص٣٦.
٩- د. فاضل حسين: كێشەی ویلایەتی موسڵ، وەرگێرانی: محەمەد شاکەلی، چاپی یەکەم، چاپخانەی خاک، سلێمانی، ١٩٩٩، ل ١٣٨.
١٠- شاكر خصباك: الكرد والمسألة الكردية، منشورات الثقافة الجديدة، بغداد، ١٩٥٩، ص٧٩-٨٠.
١١- غسان العطية: العراق نشأة الدولة (١٩٠٨- ١٩٢١) ترجمة: عطا عبدالوهاب، لندن، ١٩٨٨، ص٣٦.
١٢- عزيز حسن عزيز البارزاني: الحركة القومية الكوردية التحررية في كوردستان العراق،(١٩٣٩- ١٩٤٥)، ط١، مطبعة وزارة التربية، هەولێر، ٢٠٠٢، ص ١٥.
١٣- ئەژی: چەند بابەتێک دەربارەی مێژووی کورد، چاپی رووناکبیری، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل ٤٣.
١٤- کامەران مەنتک: کوردستان لەنێوان ململانێی نێو دەوڵەتی و ناوچەییدا، "١٨٩٠-١٩٣٢"، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل ١٣٦.
١٥- مەحمودی مەلا عیززەت: بازنەکانی ململانێی ئاسایشی نەتەوەیی کورد، چاپی یەکەم، چاپخانەی داناز، سلێمانی، ١٩٩٨، ل ٥٢.
١٦- د. فؤاد حمه خورشيد: القضية الكردية في المؤتمرات الدولية، ط ١، مطبعة وزارة الثقافة، مؤسسة موكريان للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠١، ص ٣٠.
١٧- د. فاضل حسين: سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٧.
١٨- د. فاضل حسين: سەرچاوەی پێشوو، ل١٢- ١٣.
١٩- عبدالرزاق الحسني: تأريخ الوزارات العراقية، ج ٥، ط ٤، مطبعة دار الكتب، بيروت، ١٩٧٤، ص٢١١.
٢٠- چاوپێکەوتن لەگەڵ مەجید ئەحمەد ئەمین (مەجید ئاسنگەر) لە ١٤ / ٨ / ٢٠٠٤.
٢١- چاوپێکەوتن لەگەڵ کەریم مستەفا محەمەد (کەریم شارەزا) لە ١٢ /٨ / ٢٠٠٤.
٢٢- نەوشیروان مستەفا ئەمین: کوردستانی عێراق و سەردەمی قەڵەم موراجەعات ١٩٢٣-١٩٣١، چاپی یەکەم، ئۆفسێتی دەزگای سەردەم، سلێمانی، ١٩٩٩، ل ٢١.
٢٣- نادر ئینتسار: سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٤.
٢٤- م. س. لازاریف: المسالة الكردية " ١٩١٧-١٩٢٣ " ترجمة: عبد حاجي، ط١، دار الرازي، بيروت، ١٩٩١، ص ٢١٨. د. فاضل حسين: سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٧. د. شيركو فتح الله: الحزب الديمقراطي الكردستاني و حركة التحرر القومي الكوردية في العراق (١٩٤٦- ١٩٧٥)، ط ١، مطبعة رون، السليمانية، ٢٠٠٤، ص ٧١.
٢٥- د. فاضل حسين: سەرچاوەی پێشوو، ل III پێشەکی.
٢٦- جەعفەر عەلی رەسول: ناسیونالیزم و ناسیۆنالیزمی کوردی، چاپخانەی رەنج، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل٢١٣.
٢٧- محمد مظفر الأدهمي: سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١٣.
٢٨- عزيز حسن عزيز: سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦.
٢٩- عبدالخالق علاءالدين: مەلای گەورە زانا و ئەدیب و شاعیر، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ١٩٩٤، ل ٦٠-٦٢.
٣٠- چاوپێکەوتن لەگەڵ کەریم مستەفا محەمەد (کەریم شارەزا) لە ١٢ /٨ / ٢٠٠٤. چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەحمەد مستەفا (ئەحمەد دڵزار) لە ١٢ /٨ / ٢٠٠٤. چاوپێکەوتن لەگەڵ صلاح شێخ شەرەف ١٧ / ١١ / ٢٠٠٤.
٣١- د. جاسم تۆفیق خۆشناو: مەسەلەی کوردو یاسای نێو دەوڵەتان، بلاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل ١٧٠.

# کۆیە لە ساڵی ١٩٦٣دا

## هۆشیار محەمەد ئەمین کۆیی

لێرە حەزدەکەم بیرەوەری رۆژگارێکی سەخت بینمەوە یاد، ئەویش رەشبگیرییەکەی ساڵی ١٩٦٣ یە کە کوردستان بەگشتی کەوتە بەر شاڵاوی کوشتن و گرتن و سووتاندن، بەڵام کۆیە پشکی گەورەی لەو تاوانانە بەرکەوت، ئەو سەردەمە لە تەمەنی هەرزەکاریدا بووم و لەناو رووداوەکاندا ژیاوم.

سەرەتا دەبێ باسی باری سیاسی ئەو سەردەمە بکەین، لە ٨ی شوبات ساڵی ١٩٦٣ بەعسییە فاشیستەکان بۆ یەکەم جار بە کودەتایەکی سەربازی خوێناوی فەرمانڕەوایی عێراقیان خستە ژێر دەستی خۆیان و لە ٢/٨ زەعیم عەبدولکەریم قاسم و هاوەڵەکانیان بە شێوەیەکی دڕندانە شەهید کردن، دواتر لاپەڕەیەکی رەش بۆ نیشتمانپەروەرەکانی عێراق بەگشتی و کورد بە تایبەتی کرایەوە و گرتن و کوشتن و ماڵوێرانی بووە پیشەی هەمیشەییان، ئەوانە سەرەتا خۆیان وا نیشان دا کە بەنیازن کێشەی کورد چارەسەر بکەن، بەڵام لە رەفتارەکانیان دیاربوو کە مەبەستیان کات بەسەربردن بوو بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ پەلاماردانی شارەکانی کوردستان.

هەر دوای کودەتایە شوومەکەیان بەچەند رۆژێک ئامادەباشییان لەناو سوپا راگەیاند و دواتر ئەو گۆڕانکارییانەیان لەناو فیرقەی (٢) ئەنجامدا کە ئەرکی پەلاماردان و داپڵۆسینی کەرکوک و هەولێر و سلێمانی بە هەموو ناوچەکانیانەوە لە ئەستۆی ئەو فیرقە سەربازییە دابوو کە بنکەکەی لەناو شاری کەرکوک بوو، گۆڕانکارییەکەش بریتی بوو لە دەستنیشانکردنی ئەو ئەفسەرانەی کە بە خوێنی کەللەی سەری کورد تێنوو بوون لە گرتن و کوشتن، چاوەڕێی هیچ کارێکی تریان لێ نەدەکرا، کە بەم شێوەیە بوو:

١- مەرسومێکی جمهوری دەرچوو بە دانانی عەمید روکن تاوانبار (ئیبراهیم فەیسەڵ ئەلئەنساری) بە فەرماندەی فیرقەی (٢).

٢- بە فەرمانێک عەقید (سەعید حەمو) بوو بەفەرماندەی لیوای (٥) لەو فیرقەیە.

٣- دانانی عەمید روکن (سەعید فەتحی سقلی) بەحاکم عەسکەری لە کەرکوک کە دەستی هەبوو لە کوشتن و لە سێدارەدانی زۆر لە نیشتمانپەروەران.

٤- دانانی زەعیم (سدیق مستەفا) بە فەرماندەی لیوای (٢٠)، دواتر تاوانەکانی بەرامبەر دانیشتوانی سلێمانی ئەنجامدا.

٥- بە هەمان شێوە ئامێر فەوجەکان داندران وەکو: (تەها شەکرچی) کە ئەفسەرێکی موسڵاوی بوو لە فەوجێکی لیوای (٥) دامەزرا و دواتر ئەرکی کوشتار و رەشبگیرییەکەی کۆیەی خستە ئەستۆی خۆی.

ئەوانەی باسمان کردن دوژمنی کورد بوون و تاوانێکی زۆریان ئەنجامدا.

لە پاش ١٩٦٣/٢/٨ ئائومێدییەک باڵی بەسەر گەلی کورد داگرت، بەڵام خەڵکەکە خۆڕاگر بوو، ئەو رۆژگارە ئەندام بووم لە یەکیەتی قوتابیانی کوردستان لەگەڵ ئەم بەڕێزانە: هەردوو خوالێخۆشبوو (حەمیدی کەریم شانە) و (عەزیز مەحموود) و کاک یونس محەمەد ئەمین و زۆری تریش، کۆبوونەوەکانمان زۆرجار لە (کانیلە) لەناو رەزەکانی کۆیە ئەنجامدەدا.

لە ١٩٦٣/٣/٩ بەڕێز مام جەلال لە تەکیەی تاڵەبانی لەلای راستی نهۆمی دووەم لە کۆیە پێشوازی لە

خەڵک دەکرد و دۆخەکەی بۆ باس دەکردن.

لە ١٩٦٣/٣/١٦ خوالێخۆشبوو مەلا مستەفا لەگەڵ کۆمەڵێک پێشمەرگە تەشریفی هاتە کۆیە و بەرۆژ بەرەو چیای باواجی دەرۆیشتن و ئێوارانیش بۆ ماڵی کاکەزیاد ئاغا دەگەڕانەوە (ئێوارەیەک لەگەڵ چەند قوتابییەک لەسەر ڕێگای (حەمامۆک) ڕووبەڕووی جەنابی بوونەوە). ئەنجامی ئەو کۆڕ و کۆبوونەوانەی کە لە کۆیە و تۆبزاوە (گوندێکە ٣ کیلۆمەتر لە کۆیەوە دوورە) ئەنجامدا، ئەوەبوو بۆ ئەوەی گەلی کورد و شارەکانی کوردستان لەکوشتن و برین و سووتاندن بەدوور بێ بڕیاردرا کە وەفدێک بە سەرۆکایەتی بەڕێز مام جەلال بۆ دانوستاندن لەگەڵ ڕژێمی ئەوسا بەرەو بەغدا بچێ، بەڵام ئاکامی ئەو دانوستاندنە هیچی لێ نەکەوتەوە و ئامادە نەبوون دان بە کەمترین مافی کورد بنێن.

ڕۆژ بە ڕۆژ بارودۆخەکە ئاڵۆزتر دەبوو و ڕەوشەکە لەخەڵک نادیار بوو، پێشمەرگەکان ئامادەباشییان ڕاگەیاند و ڕژێمیش ئابڵووقەی ئابووری بەسەر کوردستان سەپاند، هەر لە مانگی نیسانی ١٩٦٣ ڕژێم فەرمانگە سەرەکییەکانی لە کۆیە کشاندەوە، ئەو چەند پۆلیس و فەرمانبەرەی کە مابوون هاوکاری شۆڕشی کورد بوون، حکومەت سام و شکۆی نەما، پێشمەرگەکان ڕۆڵیان هەبوو لە پاراستنی ئاسایش، هیچ دەستدرێژی و ڕاووڕووتی بەرامبەر دەزگاکانی حکومەت و فەرمانگەکان نەکراو دزیش هەر بوونی نەبوو، دادوەری دادگای کۆیە بە شێوەیەکی کاتی بووە جێگری قائیمقام، لەبیرمە کە دوا فەرمانگە کە پەیوەندییەکانی لەگەڵ حکومەت مابوو فەرمانگەی پۆستە بوو، ئەو ڕۆژگارە نامەیەکم نارد بۆ کاکم لە بەغدا بەهۆی فەرمانگەی پۆستەی کۆیە، پاش ١٠ ساڵ خوالێخۆشبوو (سەعیدی بەرید) پێی ڕاگەیاندم کە نامەکەی تۆ دوانامە بوو، دواتر پەیوەندی ئێمەش نەما. لێرە دەبێ ئەوە بڵێم کە بەڕاستی خەڵکی کۆیە خۆڕاگر بوون هەموو بەیانیان دەچوونە بازاڕ بۆ کەسابەت و ئێواران دەگەڕانەوە، چایخانەکان پڕ بوون لە خەڵک هەروەک هیچ ڕووی نەدابێت ئەوها بوو، ئەوکاتە براکانم کەبابخانەیان هەبوو، یەکێکیان: (خالید) لەناو بازاڕ بوو عەبدوڵڵاش کەبابخانەی کوردستانی هەبوو لەسەر شەقامی سەردکی ناو شار، زۆرجار تا کاتژمێر ١٢ی شەو کاریان دەکرد. بارودۆخەکە بەم شێوەیە بوو تا ١٩٦٣/٦/١٩ ئێوارەکەی خەڵکەکە بەرەو ماڵ گەڕانەوە و شەو داهات و زۆربەیان کەوتنە خەوێکی خۆش، کاتژمێر ١٢ی شەو غەڵبە غەڵب پەیدا بوو، پێشمەرگەکان بە قۆنداغە تفەنگ لە دەرگاکانیان دەدا، لە مزگەوتەکان ئەو بانگەوازە ڕاگەیەنرا کە ئەمەش ناوەڕۆکەکەیەتی: (پێشمەرگەکان هەر ئێمشەو بروسکەیەکی نهێنییان بەجیهاز وەرگرتووە کە سبەی ٦/٢٠ هێرش لەلایەن جەیش و جاش دەکرێتە سەر کۆیە و بەفڕۆکە و تۆپیش بۆردومان دەکرێ، لەبەر ئەوە تا زووە خۆتان و منداڵتان ڕزگار بکەن).

خەڵکەکە بە سەرسامییەوە لەماڵ هاتنە دەرەوە، ئەو سەردەمە ئۆتۆمبێل لە کۆیە بە پەنجەی دەست دەژمێردرا، ئەو شەوە کەر و وڵاغ زۆر گرنگ بوو، بەڵام هەموو کەس نەیبوو، ناچار ئەو خەڵکە زۆرە هەندێ نان و ئازووقەیان لەپشتی خۆیان بەست و بەرەو گوندەکانی دەوروپشتی کۆیە ڕۆیشتن، هەندێ پەککەوتە و کەمئەندامی بەساڵاچوو هەبوون خۆیان لە فەرمانگەی دادگا حەشاردا و ئاڵایەکی سپی بەرزیان هەڵگرت، هەندێ خێزان توانای ڕۆیشتنیان نەبوو لە دەرەوەی شار زەوییان کۆڵیبوو، بەڵام بەداخەوە ئەمە کارەساتێکی دڵتەزێنی لێکەوتەوە و خێزانێکی تەواو گیانیان لەدەستدا.

ئێمە ڕێگای چیای باواجی و دۆڵی خۆشناوەتیمان گرتەبەر، لە سەرەوەی حەمامۆکەوە ڕێگاکە دەبێتە دوو ڕێگا، هەریەکە بۆ ناوچەیەک دەچێ، لەبەرئەوە زۆرکەس ڕێگایان بزر کرد، چەندین خێزان پەرتەوازە بوون و منداڵێکی زۆریش لە خێزانەکانیان دابڕان.

لەبەر شەکەتی و خەوبردەیی زۆر خێزان لەسەر چەقی ڕێگا کەوتبوون و لە خەوێکی خۆشدا بوون، زۆرجار لەبەر تاریکی لە ڕۆیشتن بەسەریاندا دەکەوتین. کاتژمێر (٣)ی بەیانی گەیشتینە سەر لووتکەی چیای باواجی، چایخانەیەکی بچکۆڵە لە (چڕۆ) دروست کرابوو لەسەر ڕێگای کاروانی وڵاغ هەبوو لەنزیک گوندی (فەقێیان) خەڵکێکی زۆری لێ بوو، ئاگرێکی گەورە لە کۆیە دیاربوو، دواتر زانیمان ئەمباری تووتن لەلایەن پێشمەرگەکانەوە سووتایە، (٥)ی بەیانی گەیشتینە سەر ڕووباری (کونەکرۆژ) لە بناری چیای (بنەباوی) ماڵی ئەحمەد ئاغای باغچەوان کە لە کۆیە دراوسێمان

بوون، بەمەبەستی یارمەتیدانی ئێمە کۆڵە نان و هەندێ ئازووقەیان لێ وەرگرتین و لەسەر پشتی کەرێکیان دانا، پێیان راگەیاندین کە لەدوای ئەوان بچین بۆ سەر چیای بنەماوی، چونکە شوێنێکی شیاوە بۆ خۆحەشاردان، ((بەداخەوە دواتر گەنجێکی بێتاوانی ئەو بنەماڵەیە بەناوی (حەمەدەمین) لەلایەن جەلادەکانەوە شەهید کرا)). بەڵام ئێمە بەرەو گوندی (سماقوڵی سەروچاو) کە هەندێ خزمان لەوێ بوو بەرێکەوتین، بۆ گەیشتن بۆ سماقوڵی زیاتر لە (٤) کاتژمێری ترمان مابوو، برسی- ماندوو، خەواڵوو، نانەکەشمان لانەما، سەرباری ئەوە دوو فڕۆکەی سیخوڕی بەسەرماندا رۆیشتن، بەڵام خۆشبەختانە هیچیان نەکرد، کاتژمێر (١٠)ی بەیانی گەیشتینە (سماقوڵی سەروچاو) زۆر سەرسام بووین کە بینیمان. ئەو گوندە کە (٦) کاتژمێر بە ولاغ لە کۆیەوە دوورە لەترسی ئەو فاشیستانە بەرەو چیا کە لێیان نزیکە رۆیشتوون ((ئەو زنجیرە چیایە هەمان زنجیرە چیای سەفینە)) لە باشووری ئەو گوندە بەو چیایە دەڵێن (ئاوەگرد) لەودیوی ئەو چیایە گوندی (نازەنین) هەیە، سماقوڵی سەروچاو و نازەنین پشتیان بەیەکەوەیە. ئێمەش گوندمان جێهێشت و بەرەو ئەشکەوتێکی ئەو چیایە بەرێکەوتین، ئەو ئەشکەوتە ناوی (حوتک) بوو زۆریش گەورە بوو، کە گەیشتین چەند بنەماڵەیەکی ئەو گوندە و کۆیە پێش ئێمە لەوێ بوون، بۆ سبەی فڕۆکەکان بەسەر ئەشکەوتی ئێمەدا رۆیشتن و بەچاوی خۆمان دیتمان کە مووشەکەکەی هاویشت و لە چیای (ئاوەگرد) کەوت و دووکەڵی لێ بەرزبۆوە (بارەگایەکی حیزبی شیوعی لەو چیایە بوو) ماوەیەک بەشەو و رۆژ لەو ئەشکەوتەماینەوە و یادگاری تریشم لەو شوێنە هەیە بۆ نووسینێکی تری هەڵدەگرم. لێرە دەبێ رۆڵی جوامێرانەی گوندی (سماقوڵی سەروچاو) لەبیر نەکەم بە تایبەتی خوالێخۆشبوو (کێخوا عەبدە) کە هەردەم هاوکارمان بوو، دواتریش مرۆڤێکی سەخی و نان بدە بوو، دیوەخانەکەی هەردەم پڕ بوو لە پێشمەرگە و بەرپرسەکانی شۆڕشەکانی کوردستان.

## هێرشی بەعسییە فاشیستەکان بۆ سەر کوردستان

دەڵێن هێرشی دوژمن بۆ سەر کوردستان لە ١٩٦٣/٦/٩ بووە، بەڵام راستییەکەی بەم شێوەیە بوو:

١٩٦٣/٦/٦ لە قۆڵی هەولێر پەلاماری ناوچەی دیبەگە و چیای قەرەچوغیان دا، دیبەگە و دبس، سەرگەران بەهۆی فەوجی ٢ی لیوای ٥ و کتیبەی دەبابات و جاشە عەرەبەکان لەژێر فەرماندەی عەقید (حماد شهاب) دوای ئەو پەلامارە لە ١٩٦٣/٦/٩ بۆ شاری سلێمانی دەستی پێکرد بەهۆی لیوای (٢٠) کە فەرماندەکەی تاوانبار (زعیم صدیق) بوو.

لە دوای ئەو، ئەوجا بۆ کۆیە دەستی پێکرد کە لە ١٩٦٣/٦/١١ ئەو هێزە کە لیوای (٥) لە فرقەی دوو بە فەرمانەی تاوانبار (سەعید حەمو) بوو لەو بەروارەوە لە هەولێرەوە بەرێکەوت. مەبەستیشیان لەو بەروارە جیاوازانە ئەوەبوو بۆ ئەوەی هێزی ئاسمانی بتوانی بەچڕی ناوچەکان بۆردومان بکا. لێرە دەبێ ئاماژە بەو هێزانە بکەین کە بۆ پەلاماردانی شارە کوردییەکان ئامادە کرابوون:

١- سوپای نیزامی بە هەموو چەک و جبەخانە و کتیبەی دەبابەوە.
٢- هێزی ئاسمانی فڕۆکەخانەی کەرکوک و موسڵ.
٣- هێزێکی سوپای بەعسییە سورییەکان بە جاشەکانییەوە کە بۆ کوشتنی کورد هاتبوون.
٤- جاشە عەرەبەکانی عەشیرەتی (شەمەرو) هی تریش کە ناویان نابوو (فرسان خالد بن الولید).
٥- جاشە کوردەکان لە هۆزە کوردییەکان بوون، ئەو جاشانەی بۆ کۆیە هاتبوون زۆربەیان سۆفییەکانی سەر بە هۆزی (برادۆست) بوون کە لەگەڵ لیوای (٥) بوون.
٦- هێزی (حەرەس قەومی) کە ئەندامەکانی زۆربەیان تاوانبار و چڵکاوخۆری بەعسییەکان بوون گیانیان پڕ بوو لە تاوان و مەبەستیان گرتن و کوشتنی رۆڵەکانی کورد بوو و کاری دزیشیان لە شارەکان ئەنجامدەدا. ئەوانە زۆر بەرەهایی تاوانییان ئەنجامدەدا و لێپێچینەوەیان لەگەڵ نەدەکرا.

لە ١٩٦٣/٦/١٥ لیوای (٥) و جاشەکان گەیشتنە (دێگەڵە) گوندێکە لەنێوان کۆیە و هەولێر.. لەوێ شێرانە پێشمەرگەکان لێیان دێنە دەست و دوو سریەی ئەو لیوایە دەشکێن و زیانی گیانی وماڵییان لێ دەدەن. دواتر دوژمن رێگای خۆی بۆ باشووری ئەو گوندە گۆڕی و بە دەشتاییەکە بەرێکەوت، دوژمن تا

ماوەیەک بنکەی لەنزیک گوندی (تەکەور) دانابوو زاتی ئەوەی نەبوو بەرەو گوندی (تۆبزاوە) بەرێ بکەوێ کەلە نزیک کۆیەیە، دوای بۆردومانێکی چڕی فڕۆکە و گەیشتنی هێزێکی تر لە کەرکووک بەرێگای (تەق تەق) بۆ چوار ڕیانی (تۆبزاوە) ئەوجا دوژمن توانی لە ١٩٦٣/٦/٢٢ بگاتە گوندی (هەرمۆتە) کە لە کۆیەوە (١) کیلۆمەتر دوورە و لەوێ سەربازگەیەکی کاتی دادەنێ و لە ١٩٦٣/٦/٢٣ بۆ ناو کۆیە دەچن و سەربازگەیەکی گەورەی هەمیشەیی لەرێگای (هەیبەت سولتان) (ئێستا زانکۆی کۆیەی لێیە) دادەنێن. ئەفسەرێکی تاوانبار دەکەنە فەرماندەی سەربازگەکە بەناوی (تەها شەکرچی) کە خەڵکی موسڵ دەبێ و زۆربەی تاوانەکان بە فەرمانی ئەو بووە. داگیرکردنی کۆیە بۆ دوژمن دەستکەوتێکی گەورەبوو، بۆ ئەم مەبەستە چەند بەرپرسێکی گەورە بۆ پیرۆزبایی لە بەغداوە بەهەلیکۆپتەر هاتنە کۆیە.

سەرەتا کە دیتیان کۆیە چۆڵ بووە پیلانێکیان دانا بۆ گەڕانەوەی خەڵک و هەڵخەڵەتاندنیان بەهۆی بڵاوکردنەوەی بەیاننامەیەک کە تێیدا هاتووە: ((بۆ دانیشتوانی شاری کۆیە ئەوانەی لە دەرەوەی شارن بۆ ماوەی (٣) ڕۆژ دەبێ بگەڕێنەوە و هیچ لێپێچینەوەیان لەگەڵ ناکرێ، بە پێچەوانەوە ئەگەر لەماوەی دیاریکراو نەگەڕانەوە ئەوا ماڵ و خانوو و موڵکیان دەسووتێنرێ و دەستی بەسەر دادەگیرێت و ئەگەر دەستگیریش بکرێن ئەوا بەتوندی سزا دەدرێن))، بەهۆی ئەو بەیاننامەوە زۆربەی خەڵکەکە گەڕانەوە، دوای چەند ڕۆژێک دەستیان کرد بە کوشتن و گرتن و تاڵانکردنی ماڵان، خەڵکی بێتاوانیان لە دینگەکان دەپێچاو گولله بارانیان دەکردن و زۆربشیان لە خەڵک دەکرد کە بەرامبەر ئەوکارە نامرۆڤایەتییە بوەستن و سەیری بکەن. (لە نووسینێکی پێشوو باسی ئەو شەهیدانەمان کردیە).

لەناو شەهیدەکان ژنێکی بێتاوان بەناوی منیرە مەلا تاهیر هاوسەری سابیری مەلا رەئووف لەگەڵ (شوان)ی کوڕی. ئەو ژنانەی دەستگیر دەکران لەماڵی خوالێخۆشبوو (عەبدولرەحمان) موختاری گەڕەکی (بایز ئاغا) بەند دەکران، کە جگە لە دوو برام کە رەوانەی گرتووخانەی کەرکووک کران، خوشکێکم کە هاوسەری سیاسەتمەدار (حیسام ئەلدین) ناسراو بە (شەعب) لەو ماڵە لەگەڵ چەند ژنێکی بەشەرەفی نیشتمانپەروەر بەند کرابوو، لێرە دەبێ رۆڵی جوامێرانەی خوالێخۆشبوو (حەویزی مام یەحیا) لە داکۆکیکردنی لەو ژنە بەندکراوانە و زۆر کاری باشی تر لەبیر نەکەین. لەشاری سلێمانیش تاوانبار (زەعیم سدیق) تاوانێکی زۆری لەو شارە خۆراگرە ئەنجامدابوو، کە لەنێو ئەو پلە شەهیدانە مامۆستایەکی دواناوەندی (کۆیی) نیشتەجێی سلێمانی دەبێ ئەویش مامۆستا (حاجی باقی) کە مرۆڤێکی زیرەک و خۆش مەشرەب بوو. لە ١٩٦٣/٦/٢٥ هێرشی یەکەمی دوژمن بۆ سەر چیای (هەیبەت سولتان) هەرەسی هێنا، کە تۆپ و فڕۆکەش بەشداربیان کردبوو و زیانێکی زۆریان لێکەوت.

لە ٦/٢٧ بۆ ئەم مەبەستە خودی قائید فرقەی (٢) ئیبراهیم فەیسەل ئەلئەنساری هاتە کۆیە و سەرپەرشتی هێرشی دووەمی کرد، بەو هەموو هێزە لە سوپا و جاشەکان و بەزیانێکی زۆر ئەوجا هەیبە سوڵتان گیرا. زیانی پێشمەرگەش یەک شەهید و چەند بریندارێک بوو.

لەبەغدا کۆییەکان و کوردەکان زۆر دڵتەنگ و نیگەران دەبن ڕۆژانە بۆ گۆڕەپانی مەیدان دەچن، چونکە ئەوکات گەراجی شارەکانی کوردستان لەوێ دەبێ، بەڵام هیچ زانیارییەکیان دەست ناکەوێ، چونکە پەیوەندییەکان پچڕا بوو، دەنگۆی ئەوەش هەبوو لەناو ئەوان کە زیاتر لەنیوەی دانیشتوانی کۆیە کوژراون، (کاکم) چەند جارێک ئەو نامەیە دەردەهێنێ بۆ فەرامۆشی نیشانی خەڵکەکەی دەدا و دەڵێ: ئەو نامەیە ماوەیەکی کەمە لەلایەن برایەکەم لە کۆیەوە بە پۆستە بۆم هاتووە.

لە ساڵی ١٩٦٣ ئەو بنەماڵانەی ماڵیان تاڵان کرابوو و بەند کرابوون زۆربەیان ئاوارەی شارەکانی تر بوون لەوانە بنەماڵەی ئێمە بوو کە نیشتەجێی هەولێر بووین.

لە کۆتاییدا هەزار سڵاو لە شەهیدانی ساڵی ١٩٦٣ شەهیدانی کورد و کوردستان.

تێبینی: ئەو زانیارییانە هەندێکی لە راپۆرتی یادەوەری ئامیر لیوا سەعید حەمۆ وەرگیراوە و ئەوانەی دیکەش یادەوەری خۆمە.



# مێژووی کۆن و نوێی کۆیە

**کەریم شارەزا**

**پێشەکی**

خوێنەری بەڕێز، ئەوەی لەم باسەدا دەیخوێنیتەوە پوختەیەکە لەمێژووی کۆن و نوێی شارو ناوچەیەکی گرنگی باشووری کوردستان (کۆیەو دەڤەرەکەی)و سەبارەت بەشوێنە جوگرافییەکەی و بوونی بەمەڵبەندێکی ئابووری، دەورێکی باشی لەمێژووی کورددا گێڕاوەو دەگێڕێ.

سنووری ناوچەی کۆیە لە باکوور: هەموو ناوچەی خۆشناوەتی و لە باشوورەوە (زێی کۆیە)، کە پێشی دەگوترێ (زێی بچووک) لە ڕۆژهەڵاتی دەشتی بیتوێن و لەڕۆژئاوایشی بەستی شەڵغەو بەرزاییەکانی دیدەوانی گرتۆتەوە.

ئەم ناوچە گرنگ و فراوانە لەکۆنەوە مەیدانی جەنگی نێوان زلهێزەکانی ناوچەکە بوون و لە سەردەمی میرنشینە کوردییەکانیش بەتایبەتی لە سەردەمی بابان و سۆران لە سەدەی نۆزدەمدا گەلێک شەڕوشۆڕ لەم شارو ناوچەیە لەنێوانیاندا ڕووی داوە.

**ناوی کۆیە**

ناوی کۆیە لە سەرچاوە مێژووییە کۆنەکانی پێش ئیسلام بە (کۆهسار) هاتووەو ئەمەش بەمانای شوێنێکی شاخاوی دێت و لەدواییدا ناوی (کوسان)ی بەسەردا براوە، کە بەمانای شاری سوڵتان دێت. لە سەردەمی سەلجووقییەکاندا ئەم ناوە بووە (کۆی) و لەدواییدا بووە (کۆی سنجاق). (سنجەق)یش وشەیەکی تورکییە بەمانای (ئاڵا) یاخود (لیوا) دێت و (کۆی سنجاق) بەمانای (لیوای کۆیە) دێت.

لە سەردەمی ئەردەڵانییەکاندا دووبارە شارەکە ناوی (کۆی) وەرگرتەوە. بەڵام لە سەردەمی حوکمی عوسمانیدا لەتۆمارو دەزگاکانی حکومەتدا ناوی (کۆی سنجاق)ی کەوتەوە سەر. بەڵام خەڵکی ناوچەکەو دەوروبەری هەر پێیان گوتووە شاری (کۆ) و (حاجی قادری کۆیی)یش لە هۆنراوە ناوداری (لەمەیدانی بەهارا) ناوی شارەکەی بە (کۆ) بەکارهێناوەو گوتوویەتی:

**لە مەیدانی بەهارا شارەکەی (کۆ)**
**قوبەی کشمیری دا بەرشەق وەکو گۆ**

کاتێک لەو ناوانەی (کۆیە) ورد دەبینەوە دەبینین دوو پیتەکەی (ک) و (ۆ) لەهەموویاندا دووبارە دەبنەوە، کەواتە ناوی ڕاست و تەواوی شارەکە (کۆ)یەو ئەمەش بەمانای (کێو= چیا) و کۆبوونەوە دێت، واتە بەپێی چەند سەرچاوەیەک چەند میرنشینی بچکۆلە لەناوچەکە بوون و هەموویان

کــــــۆبوونەتەوە و (کـــــۆیە)یان پێکهێناوە[1].

**ناوچەی کۆیە لە چاخە کۆنەکاندا**

ناوچەی کۆیە لە چاخە کۆنەکانی پێش ئیسلامدا مەڵبەندی حوکمڕانی و شارستانییەت بووەو نەتەوەیەکی ئاری نەژادی لێ دانیشـتـووە، کـە پێیـان گـوتوون (گـوتی) کـە کـوردی ئێستامان دەچنەوە سەر ئەم نەتەوەو چەند نەتەوەیەکی تری ئاری نەژادی وەک لۆلۆو مـیـدی و کـاردۆخی و کـالتی هتـد... گـوتیـیـەکـان لەدەوروبەری (زێی کۆیە) دانیشتوون و حوکمی ئەو ناوچانەیان کردووە تا دەگـاتە (ئارابخـا) واتە کـەرکـووکی ئێستـاو سەردەمێکیش حوکمیـان گـەیشـتـۆتە وڵاتی سۆمـەرو ئەکـەد لەناوەڕاست و خـوارووی عـێـراقی ئێستادا[2].

گـوتیـیـەکـان لەناوچەی کـۆیە گـەلێک ئاسـەواری مـێـژوویـیـان بەجێهێشتووە هەروەکو مامۆستایان تەها باقـرو فـوئاد سـەفـەر لە کـتـێـبـەکـەیان (رابەری شـوێنی ئاسـەواری ناوچەی کـۆیە)، کـە دەکـەوێتـە باکـووری ڕۆژهەڵاتی تەق تەق، کە پێی دەگوترێ (سـاتو قـەڵا) هەندێ خـشـتـی سـوورکـراوە دۆزراونەتەوە بەنووسـینی بزمـاری شێـوەی ئاری لەسـەریان نووسراوەو ناوی ئەو شـاپایەیان لەسـەر تۆمارکراوە، کە ئەو کۆشکەی دروست کـــــردووەو نـاوی هـەرێـمی ئەو شانشینەیان لەسەر نووسراوە[3].

جگە لەو ئاسەوارە مێژووییانەش گـەلێک شـوێنەواری دیکـەش لە گـوندی (خـەرابە) لە دەشـتی کـۆیەو لەگـوندی قـەیسـەری لە ڕۆژهەڵاتی شارەکەو لە چیای باواجی لە باکووری ڕۆژهـەڵاتـی دۆزراونـەتـەوە ئـەوە دەگەیەنن، کە کۆیە شارستانییەتێکی پێـشـکەوتووی لێ دروسـتـبـووەو دەورێکی زۆری لەژیـانی کـــوردا بینیوە.

کـۆیە دوای گـوتییـەکـان دەمێک ئەکـەدیـیـەکـان و دەمـێکیش ئاشـوورییـەکـان دەسـتیـان بەسەردا گــــرتووە، دوای رووخــــانی ئاشـوورییـەکـانیش لە (٦١٢ پ.ز) میدییەکان حوکمیان کردووەو ئایینی زەردەشـتی لە سـەردەمی حـوکـمی ئەمـانە لە کـۆیەدا بڵاوبۆتەوە، تاکـو ئێـسـتـاکـەش شـوێنەواری (ئاتەشکەدە)یان لە گـــردو قـــەد چیـاکـانی دیارە، دوای هاتنەوەی بابلی دووەمـــیش بۆ مـــەیدانی حوکمڕانی کوردستان ئایینی جوولەکە گـەیشـتـۆتە کـۆیەو لەدوا قـۆناغیش مـەسـیـحـیـەت لەسـەرەخـۆ لەشـارو ناوچەکەدا بڵاوبۆتەوە.

**کۆیەو ناوچەکەی لە سەردەمی هاتنی ئیسلامدا**

سـوپای ئیـسـلام لە سـەردەمی خەلیفەی دووەمی راشیدی (عومەری کوڕی خەتتاب) دوای گرتنی عێراقی عـەرەبی گـەیشـتـە کـوردسـتـان و لەڕێگای مـووسـڵـەوە ئەو سـوپایە گـــەیشـتـــە هەولێـــر، لەوێوەش بەسـەرکـردایەتی (عـەبدوڵلا کـوڕی جەندەل) بەرەو کـۆیەو ناوچەکـەی لە ٢١ی کـۆچی پێشـڕەوی دەکـەن و لە گـــوندی (هەرمـــۆتە)ی ڕۆژئاوای شـارەکـە بە لەشکری بەرگـریکاری هەرمـۆتەی مـەسیـحی نشین دەگـەن و شـــەرێکی قـــورس ڕوودەدات، لە ئەنجـامــدا سـەرکـردەی سـوپای مەسیحییەکان (میتای کوڕی سەنعا) دەکـوژرێ[4] لە هەمـان کـاتیـشـدا سـەرکردەی مـوسـڵـمـانەکـانیش لە ئەنجـامی برینداربوونێکی سـەخت دەمرێ و ئەو هێزە ڕەمزییەی لەشکری ئیـسـلام شکست دێنێ و پاشـەکـشـە دەکـات. بەڵام سـەرکـردەی سـوپا سـەرەکـییـەی ئیـسـلام ئەمـجـارە بەهەڵمەتێکی گەورەو بەسوپایەکی زۆر هێـرش دەکـاتە سـەر هەرمـۆتەو کـۆیەو داگـیـریان دەکـات، داوا لە دانیشتوانی کۆیە دەکات، کە زۆربەی هـەرە زۆریـان زەردەشـــتـی بـوون موسڵمان بن، دەنا لەسەریان دەدرێ. بۆیە ئەوەی باوەڕ بە ئیسلام دێنێ لە شارەکەدا دەمێنێتەوە، ئەوەی ئایینی خۆی ناگۆڕێ بەرەو دۆڵی سماقوولی و خۆشناوەتی ڕادەکات. دوای ئەوەی سوپای ئیسلام کاروباری خۆی ڕێک دەخــات و ئازووقــەیەکی باش بۆ هێزەکـانی دابین دەکات، دەبێـتە دوو فـەیلەق، یەکـێکیـان بەرەو "مـیـرزا ڕۆستەم و مەرگە و پشدەر" دەڕوات و ئـەوەکــــــەی تریـان بـەرەو دۆڵـی سـمـاقـوولی و خـۆشناوەتی، کـە حکومـەتی خاوەر زەمین حوکمی ئەو ناوچانەی دەکـردو پایتـەختـەکـەی لەشارە دێی (بێتواتە) بوو.

هێزەکانی ئەو حکومەتە کوردییە بەرەنگاری سوپای ئیـسـلام بوون و لەدۆڵی سـمـاقـوولی وەک پاشـمـاوەکـانی ئایینی زەردەشت کەوتنە شەڕو کوشتار لەدژی شەرکەرە موسڵمانەکان و چەند شەرکەرێکی ئازای مـوسـڵـمـانانی وەک (زراری کوڕی ئەزوەر) و (مـەغـدیدی ڕەش)

کوژران و بوونە شەهیدی موسڵمانان، تاکو ئێستاکەش گۆڕەکانیان بوونەتە مەزارگا بەخەڵکی گوندی سماقوولیش دەڵێن (ئەسحابەکوژ)[٥] چونکە لە شەڕی بەرگری لە ولاتەکەیان سەحابەیان کوشتووە.

دوای دەست بەسەرداگرتنی ئەو ناوچانەی کۆیە لەلایەن لەشکری ئیسلام، بەرگرییەکی وا لەپێش سوپاکەیان نامێنێ و کۆیەو ناوچەکانی و زۆربەی ولاتی باکووری کوردستان دەکەوێتە ژێر دەستەلاتی دەوڵەتی خەلیفەکانی راشیدی.

## کۆیەو ناوچەکەی دوای هاتنی ئیسلام

کۆیە بەو ناوەی شارێکی کوردستانە، لەکۆتایی هاتنی حوکمی خەلیفەکانی راشیدی بووە بەشێک لە دەوڵەتی ئەمەوی شام کە ئەم دەوڵەتەش لەساڵی ١٣٢ی کۆچی بەرامبەر بە ٧٥٠ی زایینی رووخا. کۆیەو ناوچەکەی بوونە بەشێک لە ئیمپراتۆرییەتی عەبباسی و ئەبولعەبباس ئەلسەففاح، ئەبو جەعفەری برای کردە والی کوردستان و دوای ئەویش، کە محەمەد ئەلمەهدی بووە خەلیفە، هارونە رەشیدی کوڕی کردە والی ئازەربایجان و کوردستان. ئەویش بەهەموو شارەکانیاندا گەڕا بەشاری کۆیەشەوە، ئەمەش لە ساڵی ٧٧٩ بوو دوای حوکمی راستەوخۆی عەباسیش کوردستان کەوتە ژێر دەستەلاتی دەوڵەتی حەمدانی، کە سەلجووقییەکانیش هاتن ناوی (کوردستان و کویێ سنجاق)یان لە تۆمارەکانیان چەسپاند، کاتێکیش دەوڵەتی ئەیووبی رووبەری حوکمەکەی فراوان بوو و گەیشتە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان، لەساڵی ٥٨٦ی کۆچی بەرامبەر بە ١١٩٠ی زایینی، حوکمی هەولێرو ناوچەی کۆیەی بەسوڵتان موزەفەرەدینی گۆکبری زاوای سپاردو مێژوونووسی کورد ئەمین زەکی بەگ دەڵێ: "سوپای سەلاحەددین لە عەشیرەتە کوردەکان و میرەکانیان بوون، لەنێویاندا کوردی سۆرانی هەبوون"[٦] زۆربەشیان لە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی سوڵتان موزەفەری گۆگبری زاوای لە هەولێرو کۆیەو ناوچەکەیان بوون.

بەر لەوەی مەغۆلەکان بگەنە بەغدا، لە ١٢٣١ی زایینیدا گەیشتنە هەولێرو ئابڵووقەیان دا و زۆر گوندو دێهاتیان وێران کردو دەستی وێرانکردنیان گەیشتە کۆیەو ناوچەکەی و هەموو لایەنەکانی باشووری کوردستان. دوای مەغۆلە ئێلخانییەکان حوکمی جەلائری دەستی پێکرد، ئینجا قەرەقۆینلوو و ئاق قۆینلووی تورکمان[٧].

کە حکومەتی ئەردەڵانی کوردی فراوان بوو کە لەنێوان ٦٠٦ تاکو ١٢٨٤ی کۆچی بەردەوام بوو، واتە لە ١٢٠٩-١٨٦٧ی زایینی، کۆیەو ناوچەکەی کەوتە نێو سنووری رۆژئاوای و ئەوساکە پایتەختی ئەردەڵان لە (قەڵای زەڵم) لە شارەزوور بوو. لەدواییدا گوێزرایەوە بۆ قەڵای (پڵنگان)، ئەمین زەکی بەگی مێژوونووسی کورد نووسیویەتی و دەڵێ لەو دەمەدا شارەکانی کۆیەو هەریرو رەواندزو ئاکرێ خاوەن قەڵاو مەڵبەندی حکومەتی نیشتمانی بچکۆلە بوون[٨].

کاتێک دەوڵەتی عوسمانی وەک هێزێکی گەورەی تازە لە کوردستان پەیدابوو، حکومەتی ئەردەڵان لە سەردەمی خدر بەگی دووەمی کوڕی ئەلیاس بەگ کە حەزی لە ئاشتی دەکرد، دەستی لە بەشێک لە ولاتەکەی لەبەر دەستی بوو هەڵگرت بۆ دەوڵەتی عوسمانی، کە هەموو ناوچەکانی هەولێرو کۆیەو هەریرو رەواندزو ئامێدی و شارباژێر بوون، بەڵام کە مەئموون بەگی کوڕی مونزیر بەگ حوکمی گرتە دەست ئەوەی خدر بەگ لەدەستی دابوو وەری گرتەوەو ئەفسەرو فەرمانبەری تایبەتی بۆ شارباژێرو ئالان و هەولێرو کۆیەو هەریرو رەواندزو ئامێدی داناو کردییە بەشی حوکمڕانی محەمەدی کوڕی[٩].

کۆیە لەسەردەمی عەبباسی و دوای نەمانیشی ئەقتاعیەک بوو وەک ئەو ئەقتاعییانەی لەکوردستان دروست بوون و گەشەیان کردو سنوورەکەی تاکو زێی کۆیە درێژ دەبووەوە. لە سەردەمی عوسمانیش بووە (لیوا) و هێزێکی عەسکەری بەقەدەر لیوایەکی لێ بوو. بەپەیدا بوونی میرنشینەکانی بابان و سۆران، کۆیە بووە مەڵبەندێکی کارگێڕی و بازرگانی و بووە شوێنێکی ستراتیژی و پاشاکانی ئەو دوو میرنشینە شەڕیان لەسەر دەکردو زۆر جاران وەک پاشانشینێک تاکو ١٧٣٠ سەربەخۆ دەژیاو هەندێ جاریش دەبووە ژێردەستی پاشانشینی بەغدا. کلودیۆس ریچ لە کتێبەکەی (گەشتێک بۆ عێراق لە ساڵی ١٨٢٠) لەبارەی رەوشی

بەرێوەچوونی کۆیەوە دەڵێ: "کۆیە لیوایەکی سۆرانی بوو، بەڵام لەدواییدا بووە لیوایەکی بابانی[10]".

مێژوونووسی عێراقی عەبباس ئەلعەزاوی پارێزەر دەڵێ: "وەختێک کە دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ ئێران کەوتە شەڕ، بەشی هەرە زۆری سوپاکەی لە کورد بوون و لەنێوانیاندا عەلی بەگی میری کۆیە بوو، کاتێکیش نادر شای ئێران کوردستانی لەرێگای زەهاو و خانەقین و تووز داگیر کردو گەیشتە دەوروبەری کەرکووک و دەیویست مووسڵ و بەغدا داگیر بکات، ئەحمەد پاشای والی بەغدا هێزێکی بەسەرکردایەتی محەمەد پاشای حاکمی کۆیە ناردە سەری تاکو بزانی هێزی سوپاکەی نادر شا چەندەو لەرێگادا پێی گەیشت، بەڵام چونکە لەشکرەکەی محەمەد پاشا کەم بوو محەمەد پاشای گرت و کوشتی[11] و هێزێکی نارد بۆ داگیرکردنی بەغداو ئابڵووقەی دا، بەڵام پێی نەگیراو هەستا هێزێکی نارد بۆ هەولێرو داگیری کردو بەرەو مووسڵ هێرشی کرد، لێرەدا دەوڵەتی عوسمانی داوای لە کوردەکانی کۆیەو هەریر کرد هێزێک بنێرنە سەر سوپای نادرشا و رێی لێ بگرن لە پێشڕۆیی کردنی بەرەو مووسڵ. لێرەدا حاکمی کۆیە (محەمەد قووچ پاشا) بەهانای سوڵتانی عوسمانی هات و لەسەر زێی گەورە (زێی بادینان) بەرەنگاری سوپای نادرشا بوو، دوای کوشتارێکی زۆر هێزی محەمەد قووچ پاشا خۆی لە مەیدانی جەنگ کێشایەوەو رووەو شوورەکانی مووسڵ چوو و نادرشا گەیشتە دەوری مووسڵ، کە زانی گەمارۆدانی بێ سوودە کشایەوە. دەوڵەتی عوسمانی محەمەد قووچ پاشای کردە حاکمی ئیداری هەولێرو کۆیەو بووە هاوپەیمانی حاکمی مووسڵ و ناوبانگی بەهەموو لایەکی کوردستاندا بڵاوبۆوە ئەمە وای لە شاعیری نەتەوەیی کورد حاجی قادری کۆیی (١٨١٧-١٨٩٧) کرد کە لە هۆنراوەیەکیدا باسی گەورەیی قووچ پاشای کوردو حاکمی کۆیەو هەولێر بکات و بڵێ:

**لە قووچ پاشاوە تا ئێستا ئەمیرێک لە (کۆ)ی پەیدا نەبوو یاخود وەزیرێک**

کاتێک میرنشینی بابان بەهێز بوو، خالید پاشا توانی کۆیە داگیر بکات و لەو ساوە بووە بەشێک لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی بابان)[12]. بەڵام پەیدابوونی ناکۆکی لەنێوان بنەماڵەی پاشاکانی بابان لە شارەزوور لەسەر حوکم و دەسەڵات وای کرد رۆڵەکانی خالید پاشا (محەمەد و ئەحمەد و مەحموود) یەک لەگەڵ یەکدا بکەونە شەڕوشۆڕ لەسەر میرنشینی کۆیەو قەڵاچوالان تاکو لەساڵی ١٧٧٤ی زایینی محەمەد پاشای بابان توانی ئەحمەدی برای بگرێ کە حوکمی کۆیەی دەکرد.

لە ساڵی ١٧٧٨دا دەسەڵاتی حوکمی سۆران گەڕایەوە کۆیەو ناوچەکەی، بەڵام کەوتە ململانێ لەگەڵ ئەحمەد پاشای بابان لە قەڵاچوالان، کە والی بەغدا حەسەن پاشا پشتگیریی دەکردو لە ساڵی ١٧٧٨دا مەحموود پاشا هاتە جێی ئەحمەد پاشای برای بۆ حوکمکردنی شارەزوور و لە سەرەتای حوکمەکەیدا کۆیە بووە بەشێک لە حوکمڕانیی بەهێزی بابان[13].

لەو کاتەی حوکمی بابانەکان لە کۆیە جێگیر بوو، سۆرانەکان لە رەواندز ئەستێرەیان لە ئاسمانی کوردستان گەشایەوە. بەڵام بەدەرکەوتنی میری گەورەی بابان عەبدوڕەحمان پاشای کوڕی مەحموود پاشا ماوە نەدرا کۆیە بکەوێتەوە ژێر حوکمی سۆران و عەبدوڕەحمان پاشا لەساڵی (١٧٨٩)وە تاکو ١٨١٣ حوکمی بابانی بە شەش جار کردو کۆیەو ناوچەکەی بەزۆری لەژێر حوکمی ئەم پاشایە بوو[14]. کاتێک عەبدوڕەحمان پاشا کۆچی دوایی کردو مەحموود پاشای کوڕی هاتە جێی، بێهێزی رووی تێ کردن و تەرازووی هێز بە بەدەرکەوتنی محەمەد پاشای رەواندزی وەک بەهێزترین پاشای حوکمڕانی سۆران گۆڕا. ئەم میرە بەدەسەڵاتەی سۆران توانی کۆیەو رانیە تاکو سەر زێی کۆیەو پردێ لە ساڵی ١٨٢٧دا بەبێ بەرگرییەکی وا بگرێ و بیانخاتە سەر میرنشینەکەی[15]. بەمە خەونەکەی هاتە دی بەدەستخستنی کۆیەو هەریر. میر محەمەد بەخۆی دەگوت: حاکمی (رەواندزو کۆیەو هەریر) و بابانەکانیش بەهیوابوون دەستەڵاتیان بگاتە شارەزوورو شارباژێڕ تا دەگاتە کۆیەو هەریر کاتێک خەونەکەیان دەهاتە دی ناوی خۆیان دەنا حاکمی بابان و کۆیەو هەریر[16] وەک بڵێ موڵکەکەیان بەبێ کۆیەو هەریری ستراتیجی تەواو نەدەبوو، کاتێک محەمەد پاشای رەواندزی لە دارشتنی تۆپ لەلایەن (وەستا رەجەب)ەوە سەرکەوت، فەرمانی دا لەسەر تۆپەکان بنووسرێت (ئەمیری

مەنسوور محەمەد بەگ موتەسەریفی (رەواندزو كۆیەو هەریر)[17]. كاتێک محەمەد پاشا دەستی لەكۆیە قایم كرد، عوسمان بەگی ئامۆزای كردە حاكمی عەسكەری ناوچەی كۆیەو گەلێک زانای ئایینی و كەسایەتی كۆمەلایەتی خەلات كرد.[18] حاجی بەكراغای حەویزی (قاسید)ی خاوەن دەسەلاتی كردە هاوپەیمانی خۆی و رایسپارد بەناوی ئەو حوكم لە شارو ناوچەكەی كۆیەدا بكات، كاتێک محەمەد پاشا بۆ فراوانكردنی میرنشینەكەی بەرەو بادینان چوو، داوای لە حاجی بەكراغای حەویزی كرد هێزێک ئامادە بكات و روو بكاتە ئامێدی بۆ یاریدەدانی سوپاكەی لەو ناوچە ستراتیجییەدا لە بەگژداچوونی داسنییە ئێزدییەكان بەسەركردایەتی عەلی بەگی داسنی. كاتێک كە هێزەكانی پاشای رەواندزو حاجی بەكراغای حەویزی گەیشتنە ناوچەی داسنییان، عەلی بەگ نەیتوانی بەرگری لەو هەموو هێزە پڕ چەكە بكات. بۆیە ناچار خۆی بەدەست حاجی بەكراغا دا و ئەویش هێنای بۆ رەواندزو لە ئۆردوگای گەردەگەرد دابەزین. محەمەد پاشا بەهێنانی عەلی بەگی زانی و داوای كرد بێتە بارەگاكەی، كە هات هەر ئەو شەوە لەسێدارەی دا و ئەم كارە ناهەموارەی پاشا، حاجی بەكرئاغای حەویزی پەست كرد، چونكە عەلی بەگ لەسەر دەستی ئەم خۆی بەدەستەوە دابوو و شەڕی نەكردبوو. بۆیە بەبێ پرسی محەمەد پاشا گەڕایەوە كۆیە[19]. لێرەدا محەمەد پاشا زۆر لەحاكمی كۆیە تووڕە بوو، ویستی تۆلەی لێ بستێنێ، بەلام هێرشی محەمەد رەشید پاشای سەدری ئەعزەمی عوسمانی و عەلی رەزا پاشای والی بەغدای پشت ئەستوور بەهێزێكی والی مووسڵ، ماوەی نەدا ئەو كارە بەدە لە دژی حاجی بەكراغا بكات. ئەو هەلمەتە گەورەیەی عوسمانی، محەمەد پاشای ناچار كرد خۆی بەدەستەوە بدات و لەحوكم نەمێنێ، ئەحمەد پاشای میری بابان، نەمانی حوكمی (پاشای سۆران)ی لەسالی ١٨٣٦دا بەهەل زانی لە سلێمانییەوە بەرەو رانیەو كۆیە هات و خستنیە سەر ولاتەكەی خۆی، بەم جۆرە كۆیەو ناوچەكەی كەوتەوە دەست حوكمی میرنشینی بابان[20]، بەلام سەربەخۆیی ناوخۆی هەر ما، بۆ بەڕێوەبردنی كاروباری خۆجێییەتی حاجی بەكراغا گەورەترین كەسایەتی ئیداری دەسترۆیشتوو بوو.

دوای چەند سالێک دەولەتی عوسمانی بۆ لەناوبردنی میرنشینی بابانیش خۆی ئامادەكردو لە دەشتی كۆیە لە لەشكری ئەحمەد پاشای دا و لەسالی ١٨٤٣ هێزەكەی ئەم پاشایەی بابان شكاو بەرەو سلێمانی گەڕایەوەو كۆیە كەوتە دەست حوكمی راستەوخۆی دەولەتی عوسمانی.

## كۆیە لەدوای نەمانی سۆران و بابان

كۆیە لە سالی (١٨٤٣)وە تاكو (١٩١٨) و رووخانی دەولەتی عوسمانی لە جەنگی یەكەمی جیهانیدا كەوتە ژێر حوكمی راستەوخۆی عوسمانی و بۆ یەكەم جار هێزی عەسكەریی نیزامی و پۆلیسی پیادەو سوارە بەناوی (هەیتە) لە شارو لە گوندو دێهاتەكانی كۆیە پەیدابوون. كاتێک كە ولایەتی مووسڵ لە سالی ١٨٧٩دا دامەزرایەوە، هەردوو سنجەقی كەركوک و سلێمانی خرایە سەرو هەر یەک لە (كۆیەو هەولێرو رەواندزو رانیەو كفری بوونە قەزای سەر بەسنجاق (لیوا)ی كەركووک)[21].

لەو ماوەیەدا تارادەیەک ئەدگارەكانی كارگێڕی تازە لەكۆیە پەیدابوون و لەسالی ١٨٧٥دا فەرمانگەی تاپۆ دامەزراو بەرپرسی بەڕێوەبردنی كاروباری ئەوقاف و مزگەوتەكانی شارەكە دامەزراو لەسالی ١٨٨٠دا بۆ یەكەم جار قوتابخانەی رەسمی لە كۆیە كرایەوە. بەلام تەنیا سالێكی خایاندو داخراو شارو ناوچەكەی لەلایەن قائیمقامەوە بەڕێوە دەبران و دەولەتی عوسمانی دوای جاڕدانی دەستوور لە ١٩٠٨دا كە پێی دەگوترا مەشروتییەت، گرنگی بەخوێندن دا و لەسەر داخوازی مەلا محەمەدی كۆیی ناسراو بەمەلای گەورە، (سولەیمان نەزیف)ی والی مووسڵ لەسالی ١٩١٣دا قوتابخانەیەكی سەرەتایی نوێی لە شارەكەدا كردەوە. لەو سالەدا (مەلای گەورە) وەک نوێنەری كۆیەی ئەندامی ئەنجوومەنی ئیدارەی ویلایەتی مووسڵ بوو. بەلام هەلگیرسانی جەنگی یەكەمی جیهانی لە سالی ١٩١٤دا خوێندنی لەو قوتابخانەیە راگرت تا كۆتایی جەنگ و هاتنی ئینگلیزەكان بۆ كۆیە[22]، ئینجا لەسالی ١٩٢٠دا قوتابخانەی سەرەتایی كۆیە لەسەر بەرنامەیەكی نوێ كرایەوە.

## کۆیە لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانیدا

کاتێک لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٨دا جەنگی یەکەمی جیهانی کۆتایی هات، دەوڵەتی عوسمانی شکا و لەعێراق و لە باشووری کوردستان کشایەوە. لە رۆژی (١٥/١٢/١٩١٨) دا هێزێکی رەمزی بەریتانیا بەسەرکردایەتی کاپتن هەی گەیشتە کۆیەو شاندێکی گەورە لە کەسایەتییە دەسترۆیشتووەکانی کۆیە پێشوازییان لێکرد. لەوانە، عەولاّئاغای حاجی تاهیراغا حەویزی سەرۆکی شارەوانی و حەمەئاغای غەفووری و جەمیل ئاغای حەویزی و مەلا محەمەدی جەلیزادەی ناسراو بە"مەلای گەورە" بوون. یەکەمین ئیشی "کاپتن هەی" دامەزراندنی کاروباری قەزای کۆیە بوو، بۆیە دوای تێگەیشتنی باری کۆمەلاّیەتی و عەشایری شارو ناوچەی کۆیە بەم چەشنە ئیدارەکەی دامەزراند:

١- حەمەئاغای غەفووری- حاکمی ئیداری کۆیەو ناوچەکەی.
٢- جەمیل ئاغای حەویزی- جێگری حاکمی ئیداری.
٣- مەلا محەمەدی جەلیزادە (مەلای گەورە)- قازی شەرع.
٤- حاجی مەلا ئەحمەد ئاغای غەفووری- حاکمی سولح.
٥- عەبدولفەتاح ئاغای حەویزی- سەرۆکی شارەوانی.
٦- مەلا حەویزئاغای غەفووری- بەڕێوەبەری پۆلیسی پیادە.
٧- حاجی جەلیل ئاغای حەویزی- بەڕێوەبەری پۆلیسی سوارە.
٨- حاجی عەبدوللا بەگ (لە بنەماڵەی قوچ پاشا)- بەڕێوەبەری ئەوقاف.
٩- مەلا سدیقی نازەنینی- بەڕێوەبەری تاپۆ[٢٣].

بەم جۆرە کاپتن هەی ئیدارەی کۆیەی لە کەسایەتییەکانی دوو بنەماڵەکەی حەویزی و غەفووری لەگەڵ بنەماڵەی جەلیزادەو کەسایەتی دیکە رێکخست.

## کۆیەو حوکمداریەتی شێخ مەحموود

کاتێک شێخ مەحموودی حەفید لە سلێمانی و دەوروبەری حکومەتێکی لە ١٥/١١/١٩١٨ دانا، هەستی کوردایەتی بەدروستبوونی ئەم حکومەتە کوردییە لەهەموو لایەک ورووژاو وردە وردە دەسەلاّتی ئەو حکوومەتە پەرەی سەند تا گەیشتە رانیەو کۆیەو رەواندز. خەڵکی کۆیە لەگەڵ شێخ مەحموود بوون و لە سەرووشیانەوە عەولاّئاغای حاجی تاهیراغای حەویزی بوو، کە لە سەردەمی حوکمی عوسمانی سەرۆکی شارەوانی کۆیە بوو. تازە حەمەئاغای غەفووری کرابووە حاکمی شاری کۆیەو ناوچەکەی، لەلایەن (کاپتن هەی)ەوە، لەو دەمەدا شێخ مەحموودی حوکمداری کوردستان، شێخ عوسمانی سەرگەلوویی وەک قایمقام و نوێنەری خۆی ناردە ئەم شارەو ناوچەی کۆیە. "هەی" کەوتە نێوان دوو هێز. هێزی ئینگلیزو هێزی حکومەتی شێخ مەحموود. بەلاّم لەدواییدا دەرکەوت ئینگلیزەکان نەیاندەویست کوردستان بەسەربەکەوە بێ و خاوەنی حکومەتێکی وابێ دەسەلاّتی بەسەر هەموو بەشەکانی ولاّتەکەیدا بشکێ، بۆیە بڕیاریان دا حەمەئاغا لەپایەی خۆیدا بمێنێ و شێخ عوسمان رەوانەی سلێمانی بکرێتەوە. لەم گۆڕانکارییەدا ئینگلیزەکان عەولاّئاغای حەویزی لایەنگیری شێخ مەحموود بۆ ماوەی ساڵێک لەکۆیە دوور دەخەنەوەو لەدوای ئەو ماوەیە دەیکەنە بەڕێوەبەری ناحیەی تەق تەق تاکو لەکاروباری سیاسی کۆیە بەدوور بێ.

## کارگێڕیی کۆیە لەژێر چاودێری بەریتانیا

حەمەئاغای غەفووری وەک حاکمی ئیداری کۆیەو ناوچەکەی لەرۆژی (١٥/١١/١٩١٨)ەوە تاکو رۆژی کۆچی دوایی لە (٣/٨/١٩٢٠)دا بەیارمەتی و پشتگیری کردنی جەمیل ئاغای حەویزی کاروباری کۆیەو ناوچە فراوانەکەی بەڕێوەبرد. راوێژکارێکی ئینگلیز لە رووی فەنییەوە یاریدەی دەداو فێری بەڕێوەبردنی حوکمڕانی لەسەر بنچینەیەکی نوێ دەکرد. بۆ یەکەم جار ئەنجوومەنی شارەوانی نوێنەری جوولەکەو دیانەکانی کۆیەی گرتەخۆو خزمەتێکی زۆری شارەکەیان لەرووی ئاوەدانکردنەوەو پاک و خاوێنی کرد. لەپاش کۆچی دوایی حەمەئاغای غەفووری جێگرد چالاکەکەی، جەمیل ئاغای حەویزی لەجێی ئەودا بووە حاکمی ئیداری کۆیەو ولاّتەکەی و ئەم زاتە نموونەی رەوشت بەرزی بوو، بەردەوام هەوڵی دەدا هیچ ناخۆشییەک لەنێوانی دوو بنەماڵە گەورەکەی کۆیە نەهێڵێ و هیچ گوشارێکی لەسەر جوولەکەو دیانەکانی شارەکە نەهێشت، بەوە دەناسرا کە پشتیوانی ئەو دوو

کەمایەتییەی جوولەکەو دیانانە[24].
لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵ و تەقەلایەی دەیدا بۆ سەیرکردنی خەڵکی شارو ناوچەکەی بەیەک چاو، لەپیلانی ناحەزانی رزگاری نەدەبوو، بەتایبەتی پیلانی رەسووڵ ئاغای غەفووری کە رازی نەبوو جەمیل ئاغای حەویزی ببێتە حاکمی ئیداری چونکە لە سەرەتادا ئەم پایەیە هی غەفوورییان بوود!
دوای دەست بەکاربوونی جەمیل ئاغا بەمانگێک یاخیبوونێکی بچووک روویداو تەقەیان لەجێگری حاکمی سیاسی بەریتانی کردو لە شەوی (2/9/1920)دا پاسەوانەکانی قشلەی حکومەت بەرەنگاری ئەو چەکدارە یاخیبووانە بوونەوە، کە گەنجینەی حکومەت لەو مەڵبەندەی پۆلیسی حکومەت بوو و یاخیبووان دەیانویست تالانی بکەن.
بۆ بەیانی (برادشۆ)ی جێگری حاکمی سیاسی بەجەمیل ئاغای گوت: من لێرە دەڕۆم، چونکە سەرکردایەتییەکەم ئەمریان پێکردووم شار بەجێ بێڵم و خۆم بگەیەنمە هەولێر. جەمیل ئاغاش حەزی بەو رۆیشتنەی دەکرد نەبادا دەستدرێژی بکرێتە سەری و لەگەڵ دەستەیەک لە پۆلیسی چەکدار رەوانەی گوندی (هەڵەجە)ی نزیک هەولێری کرد.
ئینگلیزەکان ئەم یاخیبوونەیان لەعەولائاغای حەویزی دەزانی، چونکە باوەڕپێکراوی شێخ مەحموود بوو و کۆنە لایەنگری عوسمانی و دوژمنی تازەی ئینگلیز بوو، بۆیە کە (برادشۆ) دوای چەند رۆژێک گەڕایەوە کۆیە عەولائاغای بۆ بەغدا دوور خستەوە بۆ ئەوەی ساڵێک لەو شارەدا لەژێر چاودێری پۆلیس بێ.
لەو دەمەی کە برادشۆ کۆیەی چۆڵ کردبوو دەستەیەک لە گەنجی خوێن گەرمی هۆشیار داوایان لە حکومەتی کۆیە کرد، گەنجینەی پارەی ئینگلیز بەیەکسانی بەسەر خەڵکەکەی شاردا دابەش بکات، بەشەوی تاریک پەلاماری قشلەیان دا هەندێکیان بەشی خۆیان لەو ئانەو روپیەی حکومەت چنگ کەوت.
کاتێک برادشۆ هاتەوە کۆیەو حکومەت دەسەڵاتی خۆی پەیدا کردەوە، فەرمانی دا ئەو گەنجە یاخیبووانە بگرن و پێیان گوتن جەماعەتی "بۆلشەویک (شیوعی)"، چونکە داوای دابەشکردنی پارەی حکومەتیان کردبوو بەیەکسانی، ئەمەش یەکێک بوو لە پرنسیپەکانی شیوعییەت.
لەدواییدا دەرکەوت جەماعەتی بۆلشەویک بریتی بوون لەم کەسانەی خوارەوە:

1- رەسوول ئاغای جەلیل ئاغای حەویزی.
2- عومەر ئاغای حەمەد مستەفائاغای غەفووری.
3- سالح ئاغای عەبدوڵلاغای غەفووری.
4- عەدەی دورسن.
5- عەبدوڵلای مام شێخ.
6- کەریمی گۆدە.
7- ئیسماعیل رەسوول کێشکەیی.
8- حەسەنە خرە.
9- مەعرووفە سوور.
10- رەزا فەقێ عەبدوڵلا.
11- رەشید شەوگێڕی و چەند کەسی دیکە.

کاتێک کە ئینگلیزەکان هاتنەوە کۆیە ئەم دەستەیە بەرەو پشدەرو شارەکانی تری کوردستان هەڵاتن و دوای ماوەیەک زۆربەیان هاتنەوە کۆیەو هەندێکیشیان لە قەڵادزێ نیشتەجێ بوون.
لە رووداوەکانی ئەم بزووتنەوەیەی یاخیبووانی کۆیە و داواکارییان بۆ دابەشکردنی ماڵی دەوڵەت بەیەکسانی ئەو راستییەمان بۆ ئاشکرا دەبێت، کە تروسکایی بیرو بڕوای شۆڕشی ئۆکتۆبەری رووسیا لە ساڵی 1917دا گەیشتبووە کۆیەو خەڵکەکە لای پەسەند بوو، هەموو کەسێک وەک یەک بژی.

### کۆیەو بزووتنەوەکەی ئۆزدەمیر

لە مانگی حوزەیرانی ساڵی 1922دا بزووتنەوەیەکی عەسکەری لە رەواندزو دەوروبەری بەسەرکردایەتی میر ئالای عوسمانی چەرکەسی نەژاد عەلی شەفیق روویدا، کە ناوی خۆی نابوو (ئۆزدەمیر). ئەو کابرایە ئەفسەرێکی عوسمانی بووەو لەم بزووتنەوەیەدا چەند ئەفسەرێکی دیکەی عوسمانی لەگەڵ چەند خۆبەخشێکی هەولێرو کەرکووک و خەڵکی ناوچەکە هاوکارییان دەکردن. ئەو بزووتنەوە ئامانجی گەڕاندنەوەی ویلایەتی مووسڵ بوو بۆ تورکیا، بەو بیانووەی بەبێ شەڕ بەریتانیا دەستی بەسەردا گرتووەو عوسمانی لێی کشاوەتەوە.
بزووتنەوەکەی ئۆزدەمیر بەو ناوەی تورک موسڵمانەو ئینگلیز غەیرە دینە خەڵکێکی زۆر رەگەڵی کەوتن و دەسەڵاتی گەیشتە پشدەرو رانیەو عەشیرەتەکانی میراودەلی پشدەرو

بلّباسی رانیە پشتگیریان کرد، لەشکرێکی گەورەیان رێکخست و هێرشیان کردە سەر ئۆردوگای ئینگلیز لە دەربەندنی رەمکان[٢٥] سوپای ئینگلیز شکا و پاشەکشەی کرد لە بیتوێن و لە ١٩٢٢/٩/١دا بەرەو کۆیە هاتن، دوای دوو رۆژ بەرەو کەرکووک و هەولێر چوون، کۆیە کەوتە نێو بۆشاییەکی سیاسی. لێرەدا جەمیل ئاغای قایمقامی کۆیە لەگەڵ عەولائاغای حەویزی ئامۆزای کۆبوودەوەو بریاریان دا لیژنەیەک دابمەزرێنن بۆ بەرێوەبردنی شارو ناوچەکە، جەمیل ئاغا گوتی: با مەلا محەمەدی جەلیزادەش بانگ بکەین و رای وەربگرین. بەلام عەولائاغا گوتی: ئەو پیاوێکی ئایینی بێ دەسەلاتە پێی ناوێ بانگی بکەین. بەلام جەمیل کەسێکی تێگەیشتووی دووربین بوو، پێی داگرت و گوتی: دەبێ مەلا محەمەدمان لەگەڵ دابێ.

جەمیل ئاغا لیژنەیەکی لە کەسایەتییەکانی کۆیە دانا بۆ بەرێوەبردنی کاروباری شارو ناوچەکە، کە بریتی بوونە لەم زاتانەی خوارەوە:

١- مەلا محەمەدی جەلیزادە (مەلای گەورە)- سەرۆکی لیژنەو قازی شەرع
٢-جەمیل ئاغای حەویزی (قایمقام)- ئەندام
٣- عەولائاغای حەویزی- ئەندام
٤- کەریم ئاغای واحید ئاغای حەویزی- ئەندام
٥- مەلا ئەحمەد ئاغای سمایل ئاغای غەفووری- ئەندام
٦- رەسول ئاغای غەفووری- ئەندام[٢٦].

ئەم لیژنەیە حوکمی کۆیەو ناوچەکەیان کرد تاکو ناکۆکی کەوتە نێوان سەرۆک و ئەندامانی لیژنەکەو عەولائاغای حەویزی دەیویست خۆی ببێتە قایمقام، بەلام سەرۆکی لیژنە (مەلای گەورە) رازی نەبوو و دەیویست هەر جەمیل ئاغا قایمقام بێ. لێرەدا هەندێک لە ئاغاکانی کۆیە ئەو ناکۆکییەیان بەهەل زانی، لەوانە ئەندامی لیژنە کەریم ئاغای حەویزی لەگەڵ مەلا حەویز ئاغای غەفووری چوونە بیتوێن و رانیە، داوای هاتنی هێزەکانی ئۆزدەمیریان کرد بێنە کۆیەو حوکمرانی شارو ناوچەکەی بکەن.

لە رانیەوە هێزێکی تاقمەکەی ئۆزدەمیر، کە بریتی بوو لە ٧٠ سەربازو ئەفسەر گەیشتە کۆیەو سەرکردەکەیان ناوی "رامز" بوو و ناوی خۆی نا "رەمزی" و خۆی کردە قایمقامی کۆیەو ئەفسەرێکی دیکەیش، کە ناوی (ناجی ئەفەندی) بوو، کردییە بەرپرسی عەسکەری لە ناوچەکەدا[٢٧].

یەکەم کاری ئیداری رەمزی، هەڵپەساردنی جەمیل ئاغا بوو و بەلادراو لە فەرمانەکەی دانا. کاتێک کە ئینگلیزەکان لە هەولێر زانییان هێزەکەی ئۆزدەمیر هاتۆتە کۆیە، ئینزاری دانیشتوانی شارەکەیان کرد گەر تا ماوەی هەفتەیەک ئەو تورکانە لە شارەکەیان دەرنەکەن، بۆمبارانیان دەکەین و بەفرۆکە ئەم بەیاننامە عەسکەرییەیان بەسەر خەڵکەکە داباران، کە لەسەرەتای تشرینی یەکەمی ١٩٢٢ نووسرابوو: "دەبێ لای هەموو لایەک روون بێت دەستەیەکی تێکدەر پێدزەیان کردووە بۆ ناو سنووری ویلایەتی مووسڵ و دەیانەوێ پیلانێک بنێنەوە، بۆیە دەوڵەتی بەریتانیای مەزن هەڵمەتێکیان لەدژ ئەنجام دەدات بۆ دەرکردنیان لە ناوچەکەو هەر کەسێکی دەیەوێ سەلامەت بێ، با خۆی لەو پیاو خراپانە دوورخاتەوە، دەنا تووشی سزا دەبێت"[٢٨].

سەرکردەی ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکەی ئینگلیز ماوەی حەوت رۆژی دانا بۆ دەرکردنی هێزەکەی تورک، کاتێک ماوەی دیاریکراو کۆتایی هات، فرۆکە جەنگییەکانی بەریتانیا کەوتنە بۆردومانکردنی شارەکەو زیانی گیانی و ماڵییان پێگەیاند. رەمزی ویستی بە یەکجاری لە جەمیل ئاغا رزگاری بێ هەستا بەدوایدا نارد بێتە سەرای حکومەت تاکو بۆ رەواندز دووری بخاتەوە کە جەمیل ئاغا بەو پیلانەی زانی بەخۆی و دەستەیەک لە چەکدارەکانی خۆی بەرەو سەرا چوون، رەمزی پێشوازی لێکرد، خەریکبوو فەرمانی گرتنی و رەوانەکردنی بۆ رەواندز بدات، بەلام کە بینی ئەو هەموو چەکدارەی لەگەڵەو یەکێک لە خزمەکانی کەناوی (حەویزی حەبیب ئاغای حەویزی) بوو چۆکی داداو لوولەی تفەنگەکەی لە رەمزی و سەربازەکانی کردو گوتی: دەست بۆ جەمیل ئاغا درێژ بکەن بەم تفەنگەم لەناوتان دەبەم. کە رەمزی ئەمەی بینی بەقسەی خۆش و دڵدانەوە جەمیل ئاغای بەرەو ماڵ ناردەوەو نەیوێرا چی بەرامبەر بکات.

کە جەمیل ئاغا گەیشتەوە ماڵە قایمەکەی خۆی بریاری دا ئاو و ئازووقە لەو چەتە تورکانە ببڕن. ئەوانیش کە لە بێ ئاوی و بێ

خۆراکی هەراسان بوون داوایان لە جەمیل ئاغا کرد ئاویان بداتێ، لەگەڵ هەندێک زادو زەخیرە تا شارەکە جێبێڵن و ئەویش ئاو و ئازووقەو کەمێک خەرجی پێدان و بەرەو رانیە کشانەوە. لەوێوەش بەرەو رەواندز، سوپای ئینگلیز بەیارمەتی عەشیرەتەکانی کورد، ئۆزدەمیرو هێزە شکستەکەیان لە باشووری کوردستان وەدەرنا.

## گەڕانەوەی ئینگلیز بۆ کۆیە

دوای کشانەوەی هێزەکەی ئۆزدەمیر لەکۆیە، هێزەکانی بەریتانیا، کە بریتی بوون لە سەربازی ئینگلیزو هیندۆسەکان لەگەڵ فەوجێکی لیڤی لە هەولێر، لە هەڵەجەوە بەرەو کۆیە هاتن و لەنیوەی رێگا قایمقامی کۆیە جەمیل ئاغای حەوێزی بەپێشوازییانەوە چوو. سەرکردەی سوپای بەریتانیا بەجەمیل ئاغای گوت: "گەڕانەوەمان بۆ کۆیە لەسەر فەرمانی مەندووبی سامییە و نابێ لەو فەرمانەی لابدەین". بۆ رۆژی دوایی لە بەرەبەیاندا سوپاکەی بەریتانیا گەیشتە کۆیەو لە قشڵەی سوارە دابەزین و هەندێکیشیان لە دەرەوەی شارەکە سەربازگەیان رێکخست.

ئینگلیزەکان تۆڵەیان لەو کەسانە ساندەوە، کە دەستی یارمەتییان بۆ تورکەکان درێژ کردبوو. بۆیە زۆربەیان هەڵاتن بۆ دەرەوەی کۆیە، سەربازە هیندییەکان ماڵی عەولائاغای حەوێزییان تاڵان کرد بەو ناوەی لایەنگری تورکەکان بووە، هەروەها دەستی تاڵان گەیشتە ماڵەکانی رەسووڵ ئاغای غەفووری و کەریم ئاغای حەوێزی و وردە وردە کاروباری ئیداری شارەکەیان رێکخستەوە.

## کۆیە لەسایەی حکومەتی عێراقدا

دەوڵەتی عێراق بە تاج لەسەرنانی مەلیک فەیسەڵی یەکەم، بەمەلیکی وڵاتی عێراق لە ١٩٢١/٨/٢٣دا داندرا. بەڵام دەسەڵاتی حکومەتی عێراق لەسەر خاکەکەی تەواو نەچەسپا تاکو (ئینتیدابی بەریتانی) لەساڵی ١٩٢٢دا لەسەر نەسەپێنرا. پاشان ئینگلیز کەوتە بەکارهێنانی سیاسەتێکی دوو لایەنی. لەلایەک وادەو بەڵێنی بەکورد دەدا حوکمێکی نیشتمانی بۆ دابمەزرێنێ و لەلایەکی تریش دەیویست لەگەڵ عێراق بێ و دوای ئەوەی حوکمی شێخ مەحموودی هەڵوەشاندەوە، ناوچەکانی سلێمانی و کۆیەو هەڵەبجەو شوێنەکانی دیکەی باشووری کوردستانی خستە سەر عێراقی عەرەبی.

لەگەڵ دروستبوونی لیوای هەولێرو دابڕانی لەمووسڵ، کۆیە بووە قەزایەکی ئەم لیوا نوێیەو لە ١٩٢٦/٧/٥یش ویلایەتی مووسڵ بەهەموو پێکهاتە ئیدارییەکانییەوە خرایە سەر وڵاتی عێراق و کۆیە بە بەر ئەو گۆڕانکارییە سیاسییە کەوت و جەمیل ئاغا وەک قایمقامێکی ئیداریی لێهاتوو قەزایەکەی بەباشی بەڕێوەبردو خزمەتێکی باشی خەڵکی شارەکەی کرد، تاکو لەساڵی ١٩٣٢دا گوێزرایەوە بۆ قەزای رانیە.

دوای ئەم قایمقامە لێهاتووە، چەند قایمقامێکی دیکە هاتنە کۆیە، بەڵام چ کارو چاکسازییەکیان بۆ کۆیە ئەنجام نەدا، تەنها قایمقامی نیشتمانپەروەری لێهاتوو جەنابی ساڵح زەکی ساحێبقران نەبێ، کە لەساڵی ١٩٣٣دا هاتە کۆیەو هەندێ شەقامی لەگەڵ پرۆژەی ئاوی پاکی خواردنەوەو دابەشکردنی بەبۆری بەسەر ماڵانی شارەکەدا. هەروەها کردنەوەی یەکەمین قوتابخانەی کچان لە کۆیە لە پایزی ١٩٣٣ و کردنەوەی قوتابخانەی سەرەتایی دووەمی کوڕان لەم شارەدا.

لە سەردەمی قایمقامیەتی جەمیل ئاغای حەوێزی تا دەگاتە ناوەڕاستی چلەکانی سەدەی بیستەم، لەکۆیە نامەی رەسمی فەرمانگەو دادگا بەزمانی کوردی دەنووسران و زمانی خوێندنی سەرەتاییش لەوساوە تاکو ئێستاش هەر کوردی بووەو ساڵ بەساڵ پەرەی پێدراوە تا گەیشتۆتە ئاستی زانکۆ.

## بزووتنەوەو رێکخراوی سیاسی لە کۆیە

بزووتنەوەکانی شێخ سەعیدی پیران و شێخ مەحموودو بارزان و رۆژهەڵاتی کوردستان هەستێکی نەتەوەیی لەلای لاوە هۆشیارەکانی کۆیەو سەرجەم کوردستان خوڵقاندو هەموو هاتنە سەر ئەو ڕایەی، کە دەبێ کورد کیانی سیاسی خۆی هەبێت. لەنێو ئەو هەست و سۆزو بۆچوونە نەتەوەییانەدا لە ساڵی (١٩٢٠)ەوە تاکو ١٩٣٧ گەلێک رێکخراوی سیاسی رێکوپێک دروست بوون و لق و پۆپیان گەیشتە کۆیە. مێژوونووسی کورد ئەحمەد خواجە لە کتێبەکەی (چیم دی؟)دا دەڵێ: لەمانگی شوباتی ١٩٢٠دا پێنج رێکخراوی نهێنی دروست بوون کە ئەمانەن:

١- تەعالی وەتەن.
٢-كوردستان.
٣- شروق.
٤- فیداكارانی كوردستان.
٥- وەتەنییەكان.

وەک لە هەندێ كەسی بەسالاچوومان بیستووە، چالاكییەكانی ئەو ڕێكخراوە سیاسییانە بەشارەكانی هەولێرو كەركووک و كۆیەو پشدەر گەیشتووە.

كاتێک كە بەریتانیا لە ساڵی ١٩٢٤دا حكومەتەكەی شێخ مەحمودی مەلیكی كوردستانی، تێكداو ڕۆشنبیرو مامۆستا دڵسۆزەكانی كوردایەتی لە سلێمانی دوور خستەوە، هەندێ لەو مامۆستایانە وەک: "ساڵح قەفتان" و "عەزیز محەمەد فەرەج" و "ئەحمەد فەخری" و "عەلی شەوقی، ناسراو بەعەلی ئاگا" گوێزرانەوە بۆ كۆیە. ئەوانە بیروباوەڕی "بزووتنەوەی ڕزگاری كوردستان"یان لەناو قوتابی و لاوان بلاوەدەكردەوە، كە مەڵبەندی ئەو ڕێكخراوە نەتەوەییە سیاسییەی كورد لە سلێمانی بوو، خەباتی دەكرد لەپێناوی دامەزراندنی كیانێكی سیاسی بۆ كورد[٢٩].

لاوی كورد لە سەرەتای سییەكانی سەدەی بیستەمدا هەستێكی نەتەوەیی و هۆشیارییەكی نیشتمانی پەیدا كردبوو و داوای لە حكومەتی ئینتیداب دەكرد مافی نەتەوەیی كورد لە پەیمانی (عێراق-بەریتانیا) بچەسپێنێ، كاتێک كە ئەو پەیمانە لە ٣٠ی حوزەیرانی ١٩٣٠ بەستراو پێویستی بەمتمانەی پەرلەمان بوو، پەرلەمانیش لە سەردەمی حكومەتەكەی نوری سەعید هەڵوەشابووەوە، پێویستی بەهەڵبژاردنێكی نوێ بوو. بۆیە ڕۆژی ٦ی ئەیلوولی ١٩٣٠ بۆ دەستنیشان كرا بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردنەكە[٣٠]. كە میللەتی كورد زانی چ مافێكی كورد لەو پەیمانەدا نەچەسپاوە، بۆیە ڕێكخراوە سیاسییەكانی كورد داوایان لە لاوان كرد لەڕۆژی ٦ی ئەیلوول خۆپیشاندانێكی گەورە ساز بدەن و ماوە نەدەن ئەو هەڵبژاردنە بكرێت تاكو مافی نەتەوەیی كورد دیاری نەكرێت و لەهەموو لایەكی كوردستان لاوان ڕوویان كردە سلێمانی و لە كۆیە دەستەیەک لەلاوی هۆشیارو خوێن گەرم بەسەرۆكایەتی كاكەی حاجی مەحموود (١٩٠٠-١٩٧٣) دوو ڕۆژ پێش خۆپیشاندانەكە چوونە سلێمانی، لەڕۆژی دیاریكراودا بەشدارییان تێداكرد. كاكە بەگوللەی سەربازەكانی سەرا بریندار بوو و بەنهێنی لەو شارەدا مایەوە تاكو برینەكەی سارێژ بوو، ئینجا گەڕایەوە كۆیە. ئەو ڕووداوە دڵتەزێنەی كوشتنی دەستەیەک لاوی خوێن گەرمی كوردی بۆ دەستەی لاوانی كۆیەی گێڕایەوەو هەستی كوردایەتی بەرز كردنەوە[٣١].

دوای بزووتنەوەكەی شەڕی بەر دەركی سەرای سلێمانی لاوانی كورد پتر سوور بوون لەسەر بەردەوامبوون لەسەر خەباتی سیاسی و لە شارەكانی كوردستان لقی ڕێكخراوی (حزبی خۆیبوون) كرایەوە. لە شاری كۆیە بەرپرسی ڕێكخراوەكەی (ئاسەف رەئووف)ی برا گەورەی دڵداری شاعیری ناوداری كورد بوو لەكۆتایی ساڵی ١٩٣٠یەوە كەوتە چالاكی سیاسی نواندن لەپێناوی سەربەخۆیی كوردستاندا.

لە ساڵی ١٩٣١دا ڕێكخراوێكی ڕۆشنبیریی سیاسی لە كۆیە بەناوی (كۆمەڵی منەوەران) دروست بوو، كەسایەتی وەک كاكە زیاد ئاغای غەفووری و مستەفا خۆشناو و عوسمان عەونی حەبیب و عەبدولسەمەد محەمەد بەنناو تاهیر سادق و سابیر ئیسماعیل محەمەدو زەكی هەناری ئەندامی چالاكی ئەو ڕێكخراوە بوون و پەیوەندییان بەكۆمەڵەی (یادگاری لاوان) لەبەغداوە هەبوو، بۆ ڕۆشنبیركردنی لاوان و خەبات لەپێناوی مافی نەتەوەیی كورد چالاكی بەرچاویان دەنواند.

### كۆیە وەک تاراوگەی ئازادیخوازان

كۆیە شارێكی ئاوەدانە، بەڵام جاران لەبەر دووری لە شارەكانی دیكەی كوردستان و بەغداو خراپی ڕێگاكەی ببووە تاراوگەی ئازادیخوازان. حكومەتی عێراق هەر كەسایەتییەكی خەباتگێری رای لێ نەبایە، زۆرجاران بۆ كۆیەی دوور دەخستنەوەو لەژێر چاودێری پۆلیسی دادەنان، خەڵكەكەی ئەم شارەش ڕێزێكی زۆریان لێ دەنان و خزمەتیان دەكردن.

ئەم كەسایەتییە سیاسی و كۆمەڵایەتییانە بۆ كۆیە دوور خراونەتەوە:

١- ڕوفائیل بەتی

ئەم كەسایەتییە نیشتمانپەروەرە خاوەنی ڕۆژنامەی (ئەلبیلاد) بوو، وتاری لەدژی سیاسەتی چەوتی حكومەتی عێراق دەنووسی. لە

ناوەڕاستی سییەکانی سەدەی بیستەمدا بەرێگای کۆیەوە بۆ رانیە دوور خرایەوە بەڵام کە گەیشتە کۆیە خۆی بەئەرز داداو گوتی: گەر بشمکوژن ناچم بۆ رانیەو خۆی هاویشتە ماڵی جەمیل ئاغای حەویزی. ئەویش کە ناسی هەوڵی بۆ دا لە کۆیە بمێنێتەوەو پارێزگاری هەولێریش رازی بوو. تا لە کۆیە بوو، رێزێکی زۆری لێ گیرا و وەک نیشتمانپەروەرێکی گەورە سەیری کرا تاکو حکومەتی بەغدا رێگای پێدا بگەڕێتەوە پایتەخت.

٢- شێخ بەهلوولی رومێسەیی

کاتێک کە (شێخ خەووام)ی سەرۆک عەشیرەتەکانی رومێسە لە فوراتی ناوەڕاست شۆڕشێکی لە ساڵی ١٩٣٦دا لەدژی وەزارەتەکەی دووەمی یاسین هاشمی بەرپا کرد، حکومەت دوای شەڕو کوشتار توانی شۆڕشەکە دابمرکێنێ و شێخ خەووام بگرێ و (شێخ بەهلوول)ی برای و چوار شێخی تریش نەفی بکات. شێخ بەهلوول بۆ کۆیە هات و رێزێکی زۆری لێنراو بەخاو و خێزان و دەست و پێوەندەوە چاودێرییەکی باش کران، بەتایبەتی لەلایەن جەمیل ئاغای حەویزی و عومەر جەلالی برازای، کە خانوودەکەی خۆی لەقەبەڵ کردبوون. لەو شارەی کۆیە مانەوە تاکو حکومەت دوای کودەتا سەربازییەکەی بەکر سدقی عەسکەری لە ٢٩/١٠/١٩٣٦ لێبوردنی گشتی بۆ دەرکردن و گەڕانەوە.

٣- عەبدولقادر سیبانی

عەبدولقادر سیبانی خاوەنی رۆژنامەی (ئەلشەباب)ی بەسرایی بوو، بیروباوەڕێکی نەتەوەیی هەبوو، حکومەتی عێراق لە بەسراوە دووری خستەوە بۆ شاری کۆیە، چونکە وتارێکی لەدژی رێککەوتننامەکەی مەلیک فەیسەل لەگەڵ ئینگلیزدا لەساڵی ١٩٣٣دا نووسیبوو. بەپێی ئەو رێککەوتننامەیە بەشێک لە رۆژهەڵاتی "شەتولعەرەب" درا بەحکومەتی رەزا شای پەهلەوی. ئەو زاتە لەکۆیە رێزێکی زۆری لێگیراو چەند مانگێک لە کۆیە مایەوە تاکو لێبوردنی بۆ دەرچوو و گەڕایەوە بەسرا.

٤- زەنوون ئەیووب

زەنوون ئەیووبی کەسایەتی پێشکەوتنخوازی کۆمۆنستی خاوەن گۆڤاری (ئەلمەجەللە)ی مارکسی دوور خرایەوە بۆ کۆیەو ماوەیەکی لێ مایەوەو رۆشنبیرەکانی شارەکە رێزێکی زۆریان لێدەنا تاکو گەڕایەوە بەغدا[٣٢].

**کۆیەو حیزبە سیاسییەکان**

کۆیەو لاوەکانی دەورێکی گرنگیان لە دامەزراندنی کۆمەڵەی سیاسی کوردیدا هەبوو. کاتێک کە قوتابییەکانی هەولێرو کۆیەو کەرکوک و سلێمانی کۆمەڵەیەکی سیاسییان بەناوی (کۆمەڵەی دارکەر) لەساڵی ١٩٣٧دا دامەزراند، لاوەکانی ئەم شارەی کۆیە لە پێشەنگەکانی دامەزراندنی ئەو کۆمەڵەیە بوون. وەک مامۆستا مووسا سەمەد دەیگێڕایەوە دەستەی دامەزرێنەری کۆمەڵەی دارکەر بریتی بوون لە: یونس دڵدار لە (کۆیە) و مستەفا عوزێری و فەتاح جەبار و مووسا سەمەد لە (هەولێر) و نوورەدین بەهائەدین لە (کەرکوک)[٣٣]. (دوکتۆر موکەڕەم تاڵەبانی)ش لەبارەی دامەزراندنی کۆمەڵەی دارکەرەوە دەڵێ: "کۆمەڵەی دارکەر لەنیوەی یەکەمی مانگی ئەیلوولی ساڵی ١٩٣٧دا لە کەرکوک دامەزراو خوالێخۆشبوو یونس دڵدار دامەزرێنەری بوو و لەو کاتە لە کۆیەوە هاتبووە کەرکوک بۆ خوێندنی قۆناغی ئامادەیی لە دواناوەندیی کەرکووک[٣٤].

کاتێک کە "کۆمەڵەی دارکەر" لەساڵی ١٩٣٩دا بووە حزبی هیوا بەسەرۆکایەتی مامۆستا رەفیق حیلمی (١٨٩٨-١٩٦٠)، یونس دڵدار بەسکرتێری گشتی حزبی هیوا هەڵبژێردرا. رێکخراوەکانی لە کوردستان و بەتایبەتی لە کۆیە چالاکییەکی زۆریان نواند ئەمەش بەهۆی خەبات و کۆششی (دڵدار)ی سکرتێری گشتی بوو. گەلێک لاو و کەسایەتی ناسراوی هێنایە ناو ریزەکانی حزبی هیوا، لەوانە کاکە زیاد ئاغای غەفووری و تاهیر سادق و عوسمان حەبیب و مەلا محەممەدی دلاوەرو عومەر عەبدوڵڵاو ئەحمەدی حەمە مەلاو شاعیری پێشکەوتنخواز ئەحمەد دلزارو کامیل بەهجەت و رۆستەم حەویزی و تاهیر ئەحمەد حەویزی و تۆفیق سدیق (قەندیل) و ئەسعەد محەممەد حەویزی.. هەر جارە لەماڵی یەکێکیان کۆ دەبوونەوەو زۆرجار سکرتێری حزبیش ئامادە دەبوو. گەر ئەندامێکی نوێ بۆ بوونە ئەندامی ئەو حیزبە سوێندی خواردبا، ئەوا سوێند خواردنەکەی بەقورئان و نەخشەی کوردستان و خەنجەر بوو، کە خیانەت لەگەڵ حزب و نەتەوەی کورد نەکەن و لەدژی فاشییەت و

نازییەت تێ بکۆشن[35].

دەستەیەک لەلاوە هۆشیارە پێشکەوتنخوازەکان لەپایزی ١٩٤٤دا حزبی شیوعی کوردستانیان دامەزراندو بلاوکراوەیەکیان وەک ئۆرگان بەناوی (شۆرش) دەرچواند، بۆیە پێیان دەگوتن (حزبی شۆرش). لەدەستەی سەرکردایەتی حزبەکە (٣) ئەندامی کۆیی هەبوون، ئەو سەرکردایەتییە بەم جۆرە هەڵبژێردرابوو:

١- سالح حەیدەر عاسم حەیدەری (هەولێر) سکرتێری مەکتەبی سیاسی
٢- نافیع یونس (هەولێر) ئەندام.
٣- رەشید عەبدولقادر (هەولێر) ئەندام.
٤- نوری محەمەد ئەمین (سلێمانی) ئەندام.
٥- عەلی عەبدوڵلا ئەمین (کۆیە) ئەندام.
٦- عەبدولکەریم تۆفیق (کۆیە) ئەندام..
٧- عەبدولسەمەد محەمەد بەننا (کۆیە) ئەندام[36].

زۆربەی ئەندامانی حزبی هیوا دەیانویست حزبێکی نەتەوەیی دیموکراتی جەماوەری لەپێناوی رزگاریی نیشتمانی دابمەزرێنن، بەتایبەتی لەکۆتایی جەنگی دووەمی جیهانی قۆناغی مافی چارەنووسی نەتەوە ژێردەستەکان هاتبوو. بۆیە لە ساڵی ١٩٤٥دا حزبێکیان دامەزراند بەناوی حزبی رزگاری کورد، بەلام هەندێک لەئەندامە چالاکەکانی چوونە پاڵ حزبی شۆرشی مارکسی.

ئەو گۆرانکارییەی لە بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد لە رۆژهەلاتی کوردستان روویداو کۆماری دیموکراتیی کوردستان بەسەرۆکایەتی قازی محەمەد لە ١٩٤٦/١/٢٢دا دامەزرا، ئەمە بووە هاندەرێک بۆ دروستبوونی حزبێکی نەتەوەیی دیموکراتی پێشکەوتنخواز لە باشووری کوردستان بە ناوی "پارتی دیموکراتی کورد"، کە لەدواییدا لەکۆنگرەی سێیەمدا، کە لەشاری کەرکوک لە ١٩٥٣/١/٢٦دا بەسترا ناوەکەی کرا بە (پارتی دیموکراتی کوردستان). یەکەمین سەرکردایەتی پارتی لە رۆژی دامەزراندنیدا بەم جۆرەی خوارەوە هەڵبژێردرا:

١- مەلا مستەفای بارزانی-سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان
٢- شێخ لەتیفی شێخ مەحموود-جێگری یەکەمی سەرۆک
٣- کاکەزیاد ئاغای غەفووری-جێگری دووەمی سەرۆک.
٤- هەمزە عەبدوڵلا- سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی
٥- د. جەعفەر محەمەد کەریم-ئەندام
٦- میرحاج ئەحمەد- ئەندام
٧- عەلی عەبدوڵلا موهەندیس-ئەندام
٨- سالح یوسفی- ئەندام
٩- عەبدولکەریم تۆفیق- ئەندام
١٠- رەشید عەبدولقادر- ئەندام
١١- رەشید باجەلان- ئەندام
١٢- مەلا حەکیم خانەقینی- ئەندام
١٣- عەونی یوسف- ئەندام
١٤- مستەفا خۆشناو- ئەندام
١٥- محێدین مەعروف- ئەندام
١٦- عەبدولسەمەد محەمەد بەننا-ئەندامی یەدەگی یەکەم

ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی کۆبوونەوەو لەنێوان خۆیاندا بەم جۆرە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی حزبیان هەڵبژارد:

١-هەمزە عەبدوڵلا-بەسکرتێری کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردرا.
٢- د. جەعفەر محەمەد کەریم-ئەندام.
٣- عەلی عەبدوڵلا موهەندیس-ئەندام.
٤- عەبدولکەریم تۆفیق-ئەندام.
٥- رەشید عەبدولقادر- ئەندام[37].

کاتێک لەپێکهاتەی کۆمیتەی ناوەندیی ئەم حزبە نەتەوەییە دیموکراتییە ورد دەبینەوە، بەتەواوی هەست دەکەین خەباتگێرە کۆییەکان دەورێکی دیاریان بووە لەو سەرکردایەتییەی پارتی، بەو واقیعەی کاکەزیاد ئاغا بەجێگری دووەمی سەرۆک و هەر یەک لە عەلی عەبدوڵلا و عەبدولکەریم تۆفیق بەئەندامی مەکتەبی سیاسی و مستەفا خۆشناو وەک لە هەندێ سەرچاوەدا هاتووە بەئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و عەبدولسەمەد محەمەد بەنناش بەئەندامی یەدەگی یەکەمی کۆمیتەی ناوەندیی حزبەکە هەڵبژێردراون، کە هەر پێنجیان کۆیی بوون و دەورێکی چالاکیان لەپارتیدا بینیوە.

چالاکی پارتی دیموکراتی کوردستان لە هەموو لایەکی کوردستان پەرەی سەندو لە کۆیە بەناو جەماوەری رۆشنبیرو کاسبکارو جوتیارو بورژوازی نیشتمانیدا بلاوبوودوە، لەپاڵ ئەم حزبە کوردستانییە نەتەوەییە دیموکراتیەدا، حزبێکی تر بەناوی (حزبی رزگاری

نیشتمانی) لە ناوچەکەدا کەوتە جموجۆڵ، کە لەراستیدا باڵێکی نیمچە ئاشکرای حیزبی شیوعی عێراق بوو. لە سەرەتای ساڵی ١٩٤٦دا رێکخراوێکی ئەو حزبە بەسەرکردایەتی عوسمان مستەفا خۆشناو لە کۆیە کەوتبووە چالاکی نواندن لەناو جەماوەری کرێکارو جوتیارو رۆشنبیراندا و لە مانگی تشرینی یەکەمی ١٩٤٦دا مامۆستا کەریم ئەحمەد داود بەرپرسیارییەتی چالاکییەکانی ئەو حزبەی گرتە ئەستۆ، چونکە لەو مانگەدا بەمامۆستای وەرزش لەقوتابخانەی ناوەندی کۆیە دامەزرابوو، کادیرێکی باوەڕ بەهێزی حیزبی شیوعی عێراق بوو. رێکخراوەکەی کۆیەی وەستایانە بەرێوەبردو متمانەی خەلکەکەی وەرگرت.

کاتێک چالاکییەکانی پارتی و رزگاری نیشتمانی بەرەنگاری یەکتر بوون، لیژنەیەکیان پێکەوەنا بۆ هاریکاری کردنی یەکترو ئەم دوو حزبە بەهاوبەشی نەورۆزی ساڵی ١٩٤٧یان سازداو خۆپیشاندانەکانی سەردەمی راپەرینە نیشتمانییەکەی مانگی کانوونی دووەمی ١٩٤٨یان بەیەکەوە ئەنجامدا بۆ هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی (جەبر-بیڤن)، کە ناودار بوو بەپەیمانی (پۆرتسمۆث) و کاکە زیادی نوێنەری کۆیە لەسەر لیستی پارتی دیموکراتی کوردستان لەدژی ئەو پەیمانە وازهێنانی خۆی لەئەندامییەتی پەرلەمانی عێراق لەخۆپیشاندانێکی هاوبەشی پارتی و حزبی رزگاری نیشتمانی راگەیاندو کاک عەلی عەبدوڵڵا دەقی وازهێنانەکەی ئەو ئەندامەی پەرلەمانی بەردو رووی جەماوەری خۆپیشاندەر خوێندەوە.

چالاکییەکانی پارتی و رزگاریی نیشتمانی هەرچەندە نهێنی بوون، بەڵام هەموو کەسێکی هۆشیار هەستیان پێ دەکرد. چونکە هەریەکەیان کتێبخانەیەکی حزبیان لەناو بازاڕی کۆیەدا هەبوو، بەزۆری ئەندام و لایەنگرانی حزبەکان لێیان کۆدەبوونەوە. پارتی کتێبخانەی (حاجی قادری کۆیی) و رزگاریی نیشتمانیش کتێبخانەی (کوێسنجاق)ی هەبوو و گەلێک کتێبی مارکسی گرتبووە خۆ. لەسەرەتادا سەید ئەنوەر سەید ئەحمەد بەرزنجی بەرێوەبەری بوو، لەدوای ئەویش شاعیری کورد ئەحمەد دڵزار لەپایزی ساڵی (١٩٤٦)دوە بەرپرسی بوو.

دوای دامرکاندنەوەی هەڵچوونی جەماوەری میللەتی کوردو عەرەب لە راپەرینە نیشتمانییەکەی کانوونی دووەمی ١٩٤٨دا، حکومەتی سەید محەمەد سەدر لە ١٥/٥/١٩٤٨دا بەبیانووی پاراستنی ئاسایشی عێراق لەکاتی شەڕی دەوڵەتە عەرەبییەکان لەدژی دروستبوونی دەوڵەتی ئیسرائیل، ئەحکامی عورفی راگەیاند. لەسایەی عورفی، گرتنی تێکۆشەران دەستی پێکردو لە کۆیە ئەم زاتانەی خوارەوە گیران و رەوانەی هەولێر کران:

١- ئەحمەد دڵزار.
٢- رۆستەم حەوێزی.
٣- سادق جەمیل ئاغای حەوێزی.
٤- مەجید کاکەی حاجی مەحموود.
٥- مەلا مەجیدی موفتی.
٦- عەبدولرەحمانی مەحموود ئاغای حەوێزی.
٧- فایق جەلیل حەوێزی.

ئەم تێکۆشەرانە درانە دادگای عورفی عەسکەری و هەریەکە بۆ ماوەی جیا جیا حوکمدران[٣٨] و ناردران بۆ بەندیخانەی مەرکەزیی بەغدا.

دوای بەندکردنی ئەندامانی حزبی رزگاریی نیشتمانی کە لەساڵی (١٩٤٩)وە چووبووەوە ناو حزبی شیوعی عێراق. نۆرە هاتە سەر ئەندام و کادیرانی پارتی دیموکراتی و گەلێک کادیری پێشکەوتووی وەک (عەلی عەبدوڵڵا) و (عومەری حەبیب)ی ناسراو بە (عومەرە سوور) و عومەر مستەفای ناسراو بە (عومەر دەبابە) بڕیاری گرتنیان بۆ دەرچوو، بەڵام خۆیان بەدەستەوە نەداو خۆیان لەبەرچاوی پیاوانی رژێم شاردەوە.

مێژووی سیاسی کۆیە، بریتی بوو لەململانێی حزبایەتی نێوان پارتی و حزبی شیوعی. لەو کاتەی کە پارتی هەنگاوی لەسەرەخۆی بۆ پێشەوە دەناو نەیدەویست لەرێگای خۆپیشاندانەوە لەشارێکی بچووکی وەکو کۆیە قوربانی بەکادیرو ئەندامانی خۆی بدات، دەبینرا حزبی شیوعی لەو شارە خۆپیشاندانی وای دەکرد زۆرجار دەگەیشتە خۆپیشاندانی چەکدارانەو بریندارو گیراوێکی زۆری لێدەکەوتەوە، تاگەیشتە ئەو رادەیەی لە هەڵبژاردنی ئەندامانی پەرلەمانی عێراق لە ١٧ی مانگی کانوونی دووەمی ١٩٥٣دا حزبی شیوعی لەدژی ئەو هەڵبژاردنە خۆپیشاندانێکی چەکدارانەی سازدا، یەکێک لە سەرکردەکانی رێکخراوی

کۆیەی ئەو حزبە، کە ناوی (ئەسعەد محەمەد حەویزی) بوو، کفنێکی سپی لەسەر جلەکانی لەبەرکردو دەمانچەی رووتی گرتە دەست و بەپێش جەماوەری خۆپیشاندەرانی دژی هەڵبژاردنەکە کەوت و لەمزگەوتی گەورەی کۆیە سندوقی هەڵبژاردنەکەی شکاندو هاواری کرد: (تا بەند کراوە سیاسییەکان ئازاد نەکرێن نابێ چ هەڵبژاردنێک بکرێ). ئینجا چوونە مزگەوتی بایز ئاغاو سندوقی ئەو مەڵبەندەی هەڵبژاردنەکەشیان شکاند ئینجا جەماوەرەکە بڵاوەیان لێکرد.

کاتێک پەیمانی بەغدا لە شوباتی ١٩٥٥دا لەنێوانی عێراق و تورکیا بەستراو لەدواییشدا ئێران و پاکستان چوونە پاڵی. لە کۆیە خۆپیشاندانێکی گەورە لەلایەن ئەندام و کادیرانی حیزبی شیوعی و پارتی ئەنجام دراو پۆلیس تەقەی کردو چەند کەسێکی بەسەختی بریندار کرد و لە ئەنجامیشدا گەلێک کەس گیران و درانە دادگاو حوکمدران.

لەو دەمەدا مێژووی سیاسی کورد لەکۆیە بووە مێژووی ململانێی نێوان حکومەت و میللەت، کە حزبی شیوعی و پارتی دیموکراتی لە کوردستان پێشرەویان دەکرد، کاتێک کە لەساڵی ١٩٥٧دا (بەرەی یەکگرتووی نیشتمانی) بە بەیاننامەیەک لەرۆژی ١٩٥٧/٣/٩دا راگەیەنراو (حزبی نیشتمانی دیموکراتی و حزبی شیوعی عێراق و حزبی سەربەخۆیی و حزبی بەعس)ی گرتە خۆ، پارتی دیموکراتی کوردستان لەگەڵدا نەبوو. بەڵام پارتی و حیزبی شیوعی لیژنەیەکی هاوکارییان لەنێوان خۆیاندا پێکهێناو بووە بنچینەیەک بۆ بەرەیەکی دوو قۆڵی نێوان هەردوو حزبەکە.

ئەگەر لەماوەی پەنجاکانی سەدەی بیستەمدا سەرنج بدەینە گۆڕانکاریی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لەچوارچێوەی پارتی دیموکراتیی کوردستان، دەبینین زۆر کادیرو سەرکردەی بەتوانا لەو حزبە جەماوەرییەدا دەورێکی باڵایان بینی. لەمانگی مارتی ١٩٥١دا کۆنگرەی دووەمی پارتی بەنهێنی لە بەغدا بەستراو کۆمیتەیەکی ناوەندیی کاتی لەم زاتانە هەڵبژێردرا:

١- مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد فەتاح.
٢- عومەر مستەفا (عومەر دەبابە).
٣- بەکر ئیسماعیل محەمەد.
٤- محەمەد ئەمین مەعروف.
٥- نوری شاوەیس.
٦- جەلیل هوشیار[٣٩].

کاتێ سەرنج دەدەینە ئەم ناوانە دەبینین لە شەش کەسیان سێیان کەسایەتی تێکۆشەری کۆیین.

کاتێکیش کە لە ١٩٥٣/١/٢٦دا کۆنگرەی پارتی دیموکراتی کورد لە کەرکوک بەستراو ناوی حزبەکە بووە (پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق)، ئەندامانی لیژنەی ناوەندی و سەرکردایەتی لەم بەرێزانە هەڵبژێردران:

١- مەلا مستەفای بارزانی- سەرۆک.
٢- میرحاج ئەحمەد- ئەندام
٣- دوکتۆر جەعفەر محەمەد کەریم- ئەندام
٤- ئیبراهیم ئەحمەد فەتاح- ئەندام
٥- نووری سدیق شاویس- ئەندام
٦- عەلی عەبدوڵڵا موهەندیس- ئەندام
٧- نوری ئەحمەدی تەها- ئەندام
٨- جەلال تاڵەبانی- ئەندام
٩- عومەر مستەفا (دەبابە)-ئەندام
١٠- رەشید عەبدولقادر- ئەندام
١١- محەمەد ئەمین مەعروف- ئەندام
١٢- جەلیل هوشیار- ئەندام.

لەدوای کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندیش "مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد فەتاح" بەسکرتێری کۆمیتەکە هەڵبژێردراو[٤٠] پارێزەر "هەمزە عەبدوڵڵا" لە حزب دوور خرایەوە.

لەساڵی ١٩٥٦دا کوتلەی هەمزە عەبدوڵڵاو شیوعییە کوردستانییەکان هاتنە ناو حزب و ناونرا (پارتی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستان) و دەستەی کۆمیتەی ناوەندیی حزبەکە بەم جۆرەی لێهات:

١- ئیبراهیم ئەحمەد فەتاح- سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی
٢- نوری شاوێس- ئەندام
٣- عەلی عەبدوڵڵا- ئەندام
٤- جەلال تاڵەبانی- ئەندام
٥- عومەر مستەفا (دەبابە)-ئەندام
٦- محەمەد ئەمین مەعروف- ئەندام
٧- هەمزە عەبدوڵڵا- ئەندام
٨- حەمەکەریم فەتحوڵڵا- ئەندام
٩- نەژاد ئەحمەد عەزیزاغا- ئەندام
١٠- خەسرۆ تۆفیق- ئەندام
١١- حەمید عوسمان ئەبوبەکر- ئەندام
١٢- ساڵح حەیدەری- ئەندام
١٣- کەماڵ فوئاد- ئەندام

دوای هاتنی کوتلەی هەمزە عەبدوڵڵا و جەماعەتی ساڵح

حەیدەری بۆ ناو ریزەکانی پارتی، مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستان بەم جۆرە دامەزرایەوە:

١- ئیبراهیم ئەحمەد- سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی

٢- سالح حەیدەری و جەلال تاڵەبانی و هەمزە عەبدوڵلا و حەمید عوسمان بوونە ئەندامی مەکتەبی سیاسی[41].

دوای ئەو گۆڕانکارییانەی نێو پێکهاتەی سەرکردایەتی پارتیش کادیرو سەرکردەکانی کۆیی دەورێکی بەرچاویان هەبوو و کەسایەتی وەک مام جەلال تاڵەبانی و عەلی عەبدوڵلای موهەندیس و عومەر دەبابەو محەمەد ئەمین مەعروف هەر لەپایەی خزمەتگوزاریی کوردایەتی مانەوە.

کاتێک کە شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ هەڵگیرسا، پەیوەندیی نێوان حزبی شیوعی عێراق- رێکخراوی هەرێمی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان لەرێگای رێککەوتننامەیەکی دوو لایەنی پتەو بوو، چونکە هەردوولا پشتگیریی شۆڕشەکەو کۆماری دیموکراتی عێراقیان دەکردو لەشاری کۆیە هیچ گیروگرفتێکی سەرەکییان لەنێوانیاندا نەبوو. کە شۆڕشی رزگاریخوازی ئەیلوولیش لە ١١/٩/١٩٦١دا لەدژی چەوساندنەوەی میللەتی کوردو پشتگوێ خستنی ماددەی (٣)ی دەستووری کاتیی کۆماری عێراق، کۆیە بووە قەڵایەکی قایمی کوردایەتی و سەرهەڵدان و پشتگیری کردنی شۆڕشە مەزنەکەی کوردو گەلێک سەرکردەو کادیری پێشکەوتووی پارتی دیموکراتی کوردستان دەورێکی سەرەکییان تێدا بینی وەک عەلی عەبدوڵلا ئەمین و مام جەلال تاڵەبانی و عومەر دەبابەو کاکەزیاد ئاغاو دوکتۆر فوئاد مەعسوم و خالید سەعید، لە ئەفسەرە نیشتمانپەروەرەکانی کۆییش بەکر عەبدولکەریم حەوێزی و نافیز جەلال حەوێزی و نامیق عەبدوڵلا حەوێزی و مولازم خدر عەبدوڵلاو چەندانی تر لە کۆیە دڵسۆزەکانی کوردو کوردستان.

لەهێنانە کایەی بەیاننامە مێژووییەکەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠دا کەسایەتی عەسکەری وەک نافیز جەلال حەوێزی لە شاندی دانوستان لەگەڵ حکومەتی عێراق بوو، کاتێکیش بەیاننامەکە مۆرکرا ئەم زاتە کرا بەوەزیری کشتوکاڵ لە حکومەتی عێراق لەگەڵ چوار وەزیری دیکەی شۆڕشی ئەیلوول نوێنەری میللەتی کورد بوون لەو وەزارەتەی عێراق، کە سەرۆک کۆماری ئەوسا ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر پێکی هێنابوو.

لەدوای راپەرینە مێژووییەکەی جەماوەری کوردستان لەبەهاری ساڵی ١٩٩١دا لەدژی رژێمی بەعسی فاشی و لەدواییدا دامەزراندنی دەزگاکانی پەرلەمان و وەزارەتی هەرێمی کوردستان، یەکەمین سەرۆک وەزیرانی حکومەتی هەرێمی کوردستان د. فوئاد مەعسومی کۆیی بوو. کاتێکیش لەساڵی ١٩٩٣دا کابینەی دووەمی حکومەتی هەرێمی کوردستان دامەزرا، دیسان بەسەرۆکایەتی سەرکردەیەکی کوردستان و هەولێرو کۆیە (کاک کۆسرەت رەسوول عەلی) بوو.

لەدوای رووخانی رژێمی بەعسی فاشی لە ٩/٤/٢٠٠٤دا لە کۆییان جەنابی مام جەلال ماوەیەک بووە سەرۆکی کاتی ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنی کاروباری عێراق و ئێستاکەش کە ساڵی(٢٠٠٧)ە سەرۆک کۆماری عێراقی فیدراڵەو د. فوئادیش سەرۆکی فراکسیۆنی هاوپەیمانی کوردستانە لە پەرلەمانی عێراقی فیدراڵدا.

*-ئەم باسە مێژووییە کاتی خۆی بەعەرەبی لە (گۆڤاری زاگرۆس) لە ژمارەکانی (١) و (٢)ی ساڵی ١٩٩٧دا بڵاوکراوەتەوەو نووسەر کردوویەتییە کوردی.

**پەراوێزەکان:**

١- تاهیر ئەحمەد حەوێزی- مێژووی کۆیە ب١ بەغدا ١١٩٦٢، ل٢٢.
٢- محەمەد امین زکی- تأريخ الدول والامارات الكردية- ترجمة محمد علي عوني، القاهرة ١٩٤٥، ص٢.
٣- طه باقر و فؤاد سفر- المرشد الى مواطن الاثار والحضارة- الرحلة الرابعة- بغداد ١٩٦٥، ص٣٧.
٤- مەلا ردنوفی سەلیم ئاغای حەوێزی- کوردستان و ئاینی ئیسلام- بەغدا ١٩٧٠، ل١٢.
٥- تاهیر ئەحمەد حەوێزی- سەرچاوەی پێشوو، ل٣٩.
٦- محەمەد ئەمین زەکی- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٧.
٧- تاهیر ئەحمەد حەوێزی- سەرچاوەی پێشوو، ل٤٣.
٨- محەمەد ئەمین زەکی- سەرچاوەی

پێشوو، ل١٩.

٩- ئایەتوڵلا محەمەد مەردۆخ- مێژووی کوردو کوردستان- بەرگی دووەم- وەرگێرانی محەمەد فیدا- بەغدا ل٩٢-٩٣.

١٠- رحلة ريج الى العراق سنة ١٨٢٠، ترجمة لواء بهاءالدين نوري- بغداد ١٩٧٥، ص١٠٩.

١١- د. علاء نورس- العراق في العهد العثماني- بغداد ١٩٧٩، ص١٥٧.

١٢- زبير بلال ئیسماعیل- أربيل في أدوارها التأريخية- بغداد ١٩٧٥ ص٣٣٩.

١٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣٤٠.

١٤- لونطريك- أربعة قرون من تأريخ العراق الحديث- ترجمة جعفر الخياط- بغداد ص١٩٤.

١٥- زبیر بلال ئیسماعیل- سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥.

١٦- د.علاء نورس- حكم المماليك في العراق- بغداد ١٩٧٥- ص٨٥.

١٧- حسين حزني المكرياني- موجز تأريخ امراء سوران- ترجمة محمد الملا عبدالكريم بغداد، ص٥١.

١٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٥٠.

١٩- تاهیر ئەحمەد حەویزی- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٠.

٢٠- حسین حزنی موکریانی- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٧١.

٢١- تاهیر ئەحمەد حەویزی- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١١٠.

٢٢- تاهیر ئەحمەد حەویزی- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٣.

٢٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٠.

٢٤- كابتن هاي- سنتان في كردستان، ص١٦٣.

٢٥- تاهیر ئەحمەد حەویزی- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٤.

٢٦- عەبدولخالق عەلائەدین- مەلای گەورە- هەولێر ١٩٩٤، ل٣٣.

٢٧- تاهیر ئەحمەد حەویزی- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٠.

٢٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٢.

٢٩- ئەحمەد خواجە- چیم دی- ب(١) و مێژووی کۆیە- ب(١)، ل١٥٥.

٣٠- السيد عبدالرزاق الحسني- تأريخ العراق السياسي الحديث- ج(٣) بغداد ١٩٨٩، ص١٠٣.

٣١- چاوپێکەوتنێک لەگەڵ شاعیر عوسمان عەونی لە کۆیە لە ١٩٨٨/٨/١٢.

٣٢- تاهیر ئەحمەد حەویزی- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٦.

٣٣- فەیسەڵ دەباغ- حزبی هیواو شۆرشی ١٩٤٣-١٩٤٥ی بارزان- ل١٤.

٣٤- گۆڤاری رەنگین- ژمارە (٥٢)ی ساڵی ١٩٩٣.

٣٥- ئەحمەد دڵزار- بیرەوەرییەکانی رۆژانی ژیانم ب (١) ستۆکهۆڵم ١٩٩١، ل٧٥.

٣٦- د. عبدالستار طاهر شريف- الجمعيات والمنظمات والاحزاب الكردية ١٩٠٨- ١٩٥٨، بغداد ١٩٨٩، ص١١٠-١١١.

٣٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١١٢.

٣٨- ئەحمەد دڵزار- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٧٦.

٣٩- د.عبدالستار طاهر شريف- هەمان سەرچاوە، ل١٥٤.

٤٠- هەمان سەرچاوە، ل١٧٥.

٤١- هەمان سەرچاوە، ل١٧٧-١٧٨.

## سەرچاوەکان


١- زبير بلال ئیسماعیل- أربيل في أدوارها التأريخية- بغداد ١٩٧٥.

٢- محمد امين زكي- تأريخ الدول والامارات الكردية- ترجمة محمد علي عوني- القاهرة١٩٤٥.

٣--ئایەتوڵلا محەمەد مەردۆخ مێژووی کوردو کوردستان- و. محەمەد فیدا- بەرگی دووەم- بەغداد.

٤- تاهیر ئەحمەد حەویزی- مێژووی کۆیە ب١ بەغدا ١٩٦٢.

٥- حسين حزني المكرياني- موجز تأريخ امراء سوران- ترجمة محمد الملا عبدالكريم.

٦- ئەحمەد دڵزار- بیرەوەرییەکانی رۆژانی ژیانم ب (١) ستۆکهۆڵم ١٩٩١.

٧- د. عبدالستار طاهر شريف- الجمعيات والمنظمات والاحزاب الكردية.

٨- فەیسەڵ دەباغ- حزبی هیواو شۆرشی ١٩٤٣-١٩٤٥ی بارزان.

٩- رحلة ريج الى العراق سنة ١٨٢٠، ترجمة لواء بهاءالدين نوري- بغداد ١٩٧٥.

١٠- مەلا رەئووفی سەلیم ئاغای حەویزی- کوردستان و ئاینی ئیسلام- بەغدا ١٩٧٠.

١١- طه باقر و فؤاد سفر- المرشد الى مواطن الاثار والحضارة- الرحلة الرابعة- بغداد ١٩٦٥.

١٢- د. علاء نورس- العراق في العهد العثماني- بغداد ١٩٧٩.

١٣- د. علاء نورس- حكم المماليك في العراق- بغداد ١٩٧٥.

١٤- گۆڤاری رەنگین- ژمارە (٥٢)ی، بەغدا، ساڵی١٩٩٣.

# کۆنگرەی مامۆستایانی کورد (شەقلاوە)

زرار سەرتاش

کۆنگرەی یەکەمی مامۆستایانی کورد لە ڕۆژانی ١٠-١٣/ ئەیلوولی ١٩٥٩دا لە هاوینەهەواری شەقلاوە بەسترا، ئەم کۆنگرەیە لەژێر چاودێری سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی کۆماری عێراق زەعیم روکن (عەبدولکەریم قاسم) بوو لە جیاتی (قاسم) زەعیم روکن (عەلائەدین مەحمود)ی پارێزگاری هەولێر کردییەوە. دوای خوێندنەوەی وتاری لقەکانی نەقابەی مامۆستایان وتاری مەڵبەندی گشتی خوێندرایەوە. دوایی چەند لێژنەیەک بۆ کار لە مامۆستا پسپۆڕەکان و ئەدەب و زمانی کوردی پێکهات، کە ئەم لێژنانەی خوارەوە پێکهاتن:

١- لێژنەی زمانی کوردی.
٢- لێژنەی مێژووی کورد.
٣- لێژنەی بەرنامە و پەیڕەو.
٤- لێژنەی دانان و وەرگێران و بڵاوکردنەوە.
٥- لێژنەی بەڕێوەبردن.
٦- لێژنەی نەهێشتنی نەخوێندەواری.

ئەم لێژنانەی کە داندران دوو ڕۆژ کۆبوونەوە و گەلێک ڕاسپاردەی گرنگیان بۆ کۆبوونەوەی گشتی کۆنگرەکە بەرزکردەوە لەدوا ڕۆژی کۆنگرەکەدا ئەم ڕاسپاردانە پەسندکران و کران بە بڕیار:

١- دامەزراندنی (کۆڕی زمانی کوردی) بۆ دانانی فەرهەنگی یەکگرتووی زمانی کوردی.
٢- خوێندنی مێژووی نەتەوەی کورد لە قوتابخانەکانی کوردستان. لە قۆناغی ناوەندی و دواناوەندی کوردستان بە تایبەتی و عێراق بە گشتی.
٣- دانانی دەستووری زمانی کوردی (ڕێزمانی کوردی) لە لایەن لێژنەیەکی پسپۆڕ و شارەزا.
٤- قوتابی کورد بە لایەنی کەم دەبێت خوێندنی سەرەتایی بەزمانی کوردی و عەرەبی لە پۆلی سێیەمی سەرەتایی بخوێنن.
٥- لە پۆلی پێنجەم و شەشەمی سەرەتایی دەبێ ژمارەی وانەکانی کوردی بەقەد وانەکانی عەرەبی بێت.
٦- بەشی زمانی کوردی لە زانکۆی بەغداد بکرێتەوە.
٧- زمان و ئەدەبی کوردی بە ڕەسمی لە قوتابخانەکانی ناوەندی و ئامادەیی و خانەی مامۆستایان بخوێندرێ.
٨- زمانی فێرکردن لە باخچەی ساوایانی کوردستان بە کوردی بێت.
٩- هەر کتێبێک کە بە کوردی دابندرێ دەبێ هەوڵبدرێ لە هەموو دیالەکتێک و زاراوەکان پێکبێ.
١٠- ناردنی ئەو قوتابییانەی کە سەرکەوتووی باش وەدەست دێنن بۆ دەرەوەی وڵات، بۆ مەبەستی تەواوکردنی خوێندنی باڵا.
١١- یارمەتیدانی شاعیر و نووسەرانی کورد بۆ چاپکردنی بەرهەمەکانیان.
١٢- دامەزراندنی چاپخانە و بایەخ بە بزووتنەوەی ڕۆژنامەگەری بدرێت.

لەم کۆنگرەیە جگە لە دەیان مامۆستای شارەزاو لێهاتووی قۆناغە جیاجیاکانی خوێندن. دەیان میوانی پسپۆڕ لە بواری زمان و ئەدەبی کوردی بانگهێشت کرابوون بۆ بەشداریکردن لەم کۆنگرەیە. کە لەم بەڕێزانەی خوارەوە پێکهاتبوون، کە هەموویان خەڵکی دیار و بەرچاو

بوون. لەم سەردەمانیدا دەورێکی دیار و بەرچاویان هەبوو بۆ پێشکەوتنی بواری رۆشنبیری کوردی وەکو:

١- م. جگەر خوێن (شاعیر و نووسەر لە سوریا).
٢- مامۆستا عەلائەدین سەجادی لە بەغدا.
٣- د. ئیبراهیم ئەحمەد. بەغداد.
٤- د. ناجی عەباس. بەغداد
٥- د. عەبدولرەحمانی قاسملۆ بەناوی (عەباس نوری)- چیکۆسلۆڤاکیا.
٦- م. شاکر فەتاح- سلێمانی.
٧- م. موحەرەم محەمەد ئەمین- سلێمانی.
٨- م. حەمەساڵح دیلان- سلێمانی
٩- م. حوسێن عارف- سلێمانی.
١٠- مامۆستا گیوی موکریانی- هەولێر
١١- م. عوسمان عەونی- هەولێر
١٢- م. ئەحمەد دڵزار- هەولێر
١٣- م. محەمەد مەولود مەم- هەولێر
١٤- م. تایەر سادق- هەولێر
١٥- م. موسا سەمەد- کەرکووک.
١٦- م. محەمەد جەمیل رۆژبەیانی- کەرکووک.
١٧- م. عەبدولعەزیز پشتیوان- خانەقین.
١٨- م. ناهیدە شێخ سەلام- موسڵ- بادینان.
١٩- م. ئیبراهیم رەمەزان- موسڵ- بادینان

لەناو کۆنگرەدا کۆڕێکی ئەدەبی شیعر خوێندنەوە بۆ ئەم شاعیرانە سازکرا:

١- جگەرخوێن
٢- محەمەد تۆفیق
٣- کەریم شارەزا
٤- م. تایەر ئەحمەد.
٥- م. ئەحمەد حەوێزی.
٦- م. سابیر ئیسماعیل محەمەد.

ئەم دوو بەڕێزەی لە ریزبەندی دواوەن لەجیاتی شیعر چەند قسەیەکی خۆش و ئامۆژگاری بەکەڵکیان پێشکەش بە ئامادەبووان کرد.

بەم جۆرە کۆتایی بە کۆنگرە هات و بڕیاردرا لە هاوینیساڵی ١٩٦٠ کۆنگرەی دووەم ببەسترێت.

### کۆنگرەی دووەمی مامۆستایانی کورد

لە رۆژانی ١٥-١٧ی مانگی ئابی ١٩٦٠ کۆنگرەی دووەمی مامۆستایانی کورد لە شەقلاوەی رەنگین لەژێر چاودێری سەرۆک وەزیرانی عێراق عەبدولکەریم قاسم بەسترا. لەجیاتی ئەو زەعیم روکن ئیسماعیل عارف لەشاری هەولێر لەهۆڵی گەل کۆنگرەی کردەوە و وتارێکی لە بارەی زانیاری و خوێندنی کوردی و رۆڵی مامۆستایانی لەو پرۆسەیە خستەڕوو. ئینجا پارێزگای هەولێر (عەلائەدین مەحمود) سکرتێری گشتی خوێندنی کوردی (د. جەمال حاجی شەفیق)یەکەو وتارێکیان خوێندەوە. رێورەسمی کردنەوەی کۆنگرە لەلایەن هەردوو مامۆستایان (مەجید ئاسنگەر و نەجمەدین موفتی)یەوە بەڕێوە دەچوو. دوای رێورەسمی کردنەوەی کۆنگرە. سەرجەم ئەندامانی کۆنگرەو میوانان بەرەو هاوینەهەواری شەقلاوە بەڕێکەوتن.

هەر لە ئێوارەی هەمان رۆژ ١٥/٨/١٩٦٠. یەکەمین دانیشتنی کۆنگرە دەستی پێکرد، کە نوێنەری نەقابەی مامۆستایانی کوردستان وتاری خۆی خوێندەوە. بۆ رۆژانی ١٦-١٧ی ئاب کاروباری لیژنەکانی کۆنگرە کە لە قوتابخانەی شەقلاوەی سەرەتایی بەردەوام بوو، یەکەمین چالاکی کۆنگرە پێشکەشکردنی راپۆرتی (لیژنەی زانیاری کوردستان) بوو لەبەر رۆشنایی بڕیارەکانی کۆنگرەی یەکەمی مامۆستایان لە شەقلاوە. لەشاری بەغداو لیژنەکە دروست کرابوو، کە لەم بەڕێزانە پێکهاتبوو.

١- دکتۆر سەدیق ئەتروشی - سەرۆک
٢- د. جەمال حاجی شەفیق - ئەندام
٣- د. موراد عەزیز - ئەندام
٤- د. رەفیق حیلمی - ئەندام
٥- م. سادق بەهادین - ئەندام
٦- م. محەمەد عەلی مستەفا - ئەندام
٧- خوشکە ناهیدە شێخ سەلام- ئەندام
٨- م. رەشید کوێی- ئەندام
٩- م. کازم فەرمان- ئەندام
١٠- د. عزەدین مستەفا رەسول، کە ئەوسا خوێندنی باڵای تەواو نەکردبوو- ئەندام.

لە دواییدا ئەم لێژنەیە راسپاردەو پێشنیارەکانی پێشکەش بە ئەندامانی کۆنگرە یان دەتوانین بڵێین

دەستەی بەڕێوەبەری کۆنگرە کرد، لە لایەن ئەندامانەوە خرایە دەنگدان و پەسندکرا.

**گرنگترین پێشنیاز ئەم خاڵانەی خوارەوە بوون:**

١- شێوەزاری کرمانجی خواروو بکرێتە بنچینە بۆ زمانی ئەدەبی یەکگرتوو.

٢- کۆنگرە داوا بکات بە زووترین کات (کۆڕی زمانەوانی کوردی) دابمەزرێ، بۆ لێکۆڵینەوە لە هەموو بوارێکی زمانی کوردی. هەوڵدان بۆ پێشخستن بەم شێوەیەی خوارەوە.

ا- یەکخستنی چۆنیەتی نووسین و هەڵبژاردنی باشترین و گونجاوترین ئەلف و بێ بۆ زمانی کوردی.

ب- دانانی زاراوەی پێویست.

ج- دانانی ڕێزمانێکی گشتی بۆ زمانی کوردی.

د- دەرکردنی گۆڤارێکی زانستی زمانەوانی.

٣- لێژنەی زمان رادەسپێردرێت کە بەڕێوەبەرایەتی خوێندنی کوردی بە زووترین کات لێژنەیەک لە شارەزایانی زمانی کوردی پێک بێت بۆ دانانی فەرهەنگی قوتابخانەیی.

٤- هەروەها لێژنەی زمان رادەسپێردرێ، کە بەڕێوەبەرایەتی گشتی زانیاری کوردی کە گۆڤارێکی زانیاری و ئەدەبی و کۆمەڵایەتی دەربکا.

٥- وەرگرتنی خوێندکارانی کورد لە کۆلیژەکانی بەغدا و بەجۆرێکی وا ئامانجەکانی زانیاری کوردی بێتەدی.

٦- بەشی کوردی لە کۆلیژی ئەدەبیات لە زانکۆی بەغدا بکرێتەوە.

٧- وەرگرتنی قوتابیانی کورد لەم کۆلیژە بەپێی پێویستی ناوچەی کوردستان.

٨- وەرگرتنی مامۆستایانی بەتوانای سەردتایی لەو بەشەدا، کە شارەزاییان هەبێت لە ئەدەب و مێژووی زمانی کوردی.

٩- کردنەوەی بەشی کوردی لە کۆلیژی پەروەردەی زانکۆی بەغدا.

١٠- کردنەوەی کۆلیژی پەروەردە لە کوردستان تاکو ببێتە بنچینەیەک بۆ زانستگای کوردستان لەدوا رۆژدا.

١١- مێژووی کورد لە هەموو قوتابخانەکانی کوردستان بخوێندرێ، لێرەوە بۆمان دەردەکەوێ، کە ئەو نەخشەیەی دڵسۆزانی پەیڤی کوردی لەم کۆنگرەیە دایانرشت. وردە وردە بە هەوڵی دڵسۆزان هاتەدی و ئەمڕۆکە، بەرهەمی هەوڵ و ماندووبوونی ئەو پێشمەرگە ماندوونەناسانە بووین بە خاوەنی حکومەتی هەرێمی کوردستان و پەرلەمان و سێ زانکۆ. هەر لەناو رۆژانی کۆنگرەدا شەو کۆڕێکی شیعر خوێندنەوە بۆ دەستەیەک لە شاعیر و نووسەرانی کورد سازکرا. کە م. عەلائەدین سەجادی کۆڕەکەی بەڕێوە دەبرد. ئەم بەڕێزانە بەرهەمەکانیان تیادا پێشکەش کرد:

١- "گۆران"ی نەمر بە هۆنراوەی (بەڕێگاوە بەرەو کۆنفرانس) بەشداری کرد.

٢- م. ئەحمەد دڵزار- هۆنراوەی (باغەکەمان).

٣- م. عوسمان عەونی- بە هۆنراوەی (کوردستانی ئازاد)

٤- م. ا-ب- هەوری- بە هۆنراوەی (دەردی بێ یاری).

٥- شەهید ئەنوەر مائی. بە لێکۆڵینەوەیەک بەناوی شیعر و شاعیرییەتی شێخ ئاوی.

٦- م. کەریم شارەزا- بە هۆنراوەی دووڕوو

٧- م. د. کامل بەسیر- بە باسێکی ئەدەبی و بەسەرهاتێکی خۆی.

٨- م. محەمەد مەولود (مەم) بە باسێک دەربارەی چیرۆک.

٩- م. محەمەدی مەلا کەریم- بە باسێک لەسەر کێشەی زمانی کوردی.

١٠- م. عەبدوڵڵا میدیا- بە باسێک دەربارەی ئەدەب و چیرۆکی کوردی.

١١- م. کەریم زەند- پارچە شیعرێکی مەولەوی پێشکەش کرد و دەنگانی شەو بە وتەیەکی بەنرخی م. عەلائەدین سەجادی کۆتایی هات.



# کورتە باسێکی مێژوویی لەسەر یەهودییەکانی هەولێر*

**شێرزاد شێخ محەمەد**

بوونی یەهودییەکان لە عێراق مێژوویەکی کۆنی هەیە بەتایبەتی لەشاری هەولێر لەگەڵ ئەمەشدا زۆربەی زۆری یەهودییەکان لە گەڕەکی تەعجیلی شاری هەولێر بوون ئەوگەڕەکەش بۆیە ئەم ناوەی هەڵگرتووە چونکە زۆربەی زۆری دانیشتوانی کوچەکانی ئەم گەڕەکە یەهودیی بوون. هەر لەدامەزراندنی ئەم گەڕەکە ئەوان لەم کوچانە نیشتەجێ ببوون. وا بیستوومانە لە پیاوە پیرەکانی ئەم گەڕەکە یەهودییەکان پێشتر زۆربەیان لەگەڕەکی تۆپخانەی قەڵات دەژیان. مێژوونووسەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە یەهودییەکان لەسەردەمی شای ئاشوری نەبوخدنەسر روویان کردۆتە شاری هەولێر. نەبوخدنەسر پێش زایینی شەڕێکی زۆر توندی دژ بە یەهودییەکان ئەنجام داوە لە فەلەستین (بیت المقدس)ی سوتاندووە پەیکەری داوودی تێک داوە ٦٠ هەزار دیلی یەهودیی بۆ عێراق هێناوە.لە شارەکانی نەینەوا و بابل و کرکوک و ئەربلی نیشتەجێ کردوون. دەڵێن یەکێ لەو دیلانەی کە بۆ هەولێر هاتووە حەزرەتی نەبی عوزێر بووە ئەم پێغەمبەرە شکۆدارە لە هەولێر نیشتەجێ بووە ئیستاکەش مەقامی شەریفی لە نزیک مزگەوتی شێخی چۆلی یە[٢]

ئەم گەڕەکە سنووری لەبەشی رۆژ هەڵاتی مزگەوتی شیخ نورالدینی بریفکانی دەست پێدەکات تاکو دەگاتە قوتابخانەی موزەفەریەی کوڕان و تاکو بانکی رافیدەین بەڵام سنووری لە باکور لە بازاڕی هەولێر واتە لە هەردوو مزگەوتی بازاڕی گەورەو مزگەوتی حاجی نووری حاجی شهاب تاکو بەستە کۆنەکەی هەولێر. لەو سەردەمە لە هەولێر دوو (بەیعە) کەنیسە هەبووە یەکێکیان لەگەڕەکی تەعجیل. ئەویش پاش کۆچکردنیان بۆ فەلەستین کراوە بە تەکیەی خلیفە تەهای ریفاعی. ئەم بینایە تاکو

سەردتای حەفتایەکان مابوو کوڕەکەی خەلیفە تەها. خوالێخۆشبوو خەلیفە جەلال تەکیەکەی رووخاندو ئەم بینایە تازیەی ئێستای دروست کرد. بەیعەکەی دیکە لە گەڕەکی تۆپخانە لە قەلات بووە. پاش کۆچ کردنی یەهودییەکان ئەم بەیعەیە خراوەتە سەر تەکیەی شێخ عبدالکریمی تلعفرلی. یەهودییەکان رۆژانی شەممە لەم دوو شوێنە کۆدەبوونەوە رێوڕەسمە ئاینییەکانیان ئەنجام دەدا یەهودییەکانیش بە زانا ئاینییەکانیان دەوت مالم.

**داب و نەریتەکانی یەهودییەکان:**

یەهودییەکانی هەولێر دابو نەریتیان ئەوەندە جیاواز نەبووە لە گەڵ تورکمانەکانی هەولێر جل و بەرگیشیان زۆر جیاوازی نەبووە لە گەڵ یەکتردا. پیاوەکانیان وەکو هەولێرییەکان چاکەت و زبوونیان و کەوێ و سەڵتەیان لەبەر دەکرد. جەمەدانی و مشکی سۆریان لەسەر دەبەست بەڵام زانایەکانیان عەبای رەش و قاوەییان لەسەر شان دادەنا. جل و بەرگی کەنجەکانیشیان وەکو گەنجەکانی هەولێری بووە ئەویش کورتەک و شەرواڵی مرادخانی و پێلاوەکانیشیان یەمانی سوور بووە. لە موسڵ لە پێست دروست دەکرا.

دیسان پێلاوی ئاساییان لە پێ دەکرد وە لە وەرزەکانی هاوینیش نەعالی پێستیان لە پێ دەکرد ئەویش هەر لە هەولێر دروست دەکرا ئافرەتانی یەهودی وەکو ئافرەتانی هەولێری کراس و کەوایان لە بەر دەکرد (کۆلەگ زبوون) هەندیکیشیان جلی عەسری لەبەر دەکرد ئافرەتە خانمەکانیان روویان بە پێچە دادەپۆشت هەندێکیشیان پێچەی رەنگاورەنگیان بەکار دەهێنا بەڵام خواردن و چێشتەکانیان ئەوەندە جیاوازی نەبووە لە گەڵ خواردنی هەولێرییەکان. خۆشەویستترین خواردنیان ئەمانە بوون: (دۆڵمە، تکمە، کفتە[3] کبە) و هی تربووە. یەهودییەکان قەسابی خۆیان هەبووە رەشە وڵاغ و مەڕو بزنی خۆیان هەر ئەم قەسابانە سەریان دەبڕی. پیشەی یەهودییەکان زێرنگرو عەتارو بەقال و خمچی بوون مامەڵەو بازرگانی لەگەڵ ئەسنافەکانی یەهود زەحمەت و ناخۆش نەبووە تەنها لە لای ئەوان مامەڵەی ریبا (فایز) حەلال بووە. هەژارو لێ قەوماوی یەهودییەکان لە بازارو گەڕەکەکان دەرۆزەیان نەدەکرد بەڵکو لەماڵەکانیان سەندوقێکی



یارمەتییان لە بەیعە دانابوو بۆ یارمەتیدانی هەژارەکان و کەمدەرامەتەکانیان. یەهودییەکان هەموو جارێ رۆژانی شەممە حاخامەکانیان ئەم سەندوقەی دەشکاند بە دادپەروەری دابەشی سەر هەژارەکانی دەکرد. ژمارەی یەهودییەکانی هەولێر بەپێی ئاماری ساڵی ١٩٤٧- ٣١٠٩ سێ هەزارو سەدو نۆ کەس بووە. ماڵم و پیاوە پیرەکانیان ردێنێکی پان و بەرینیان هەبووە. هەروەها یەهودییەکان عەقلیەتێکی تجاریان هەبووەو لە زۆر پیشە ئەوان لە هەولێرییەکان ئازاتر بوون.

**جەژنی کەپرشینە:**

یەهودییەکان هەموو ساڵێک مانگی تشرینی یەکەم جەژنێکی ئاینییان هەبووە لەم رۆژە ئاهەنگیان دەگێڕا خەڵکی هەولێر بەم جەژنەیان

دەوت جەژنی (کەپرە شینە) واتە (عید العریش) دەیان گوت لەم رۆژە خوا نەجاتی موسا و بەنی ئیسرائیلیەکانی داوە لە دەست فرعەونیەکان. ماوەی ئاهەنگ گێرانیان دە رۆژ بووە باوریشان بەمە هەبوو کە لەم دە رۆژەدا جارێک یا زیاتر باران دەبارێت چونکە سەرەتای وەرزی پایزە. حاجی قادر بەننا کە یەکێکە لەو کەسانەی یەهودییەکانی دیوە دەڵێ من زۆر جار نۆژەنی خانوو بەرەکانیانم کردووە. هەروەها دەڵێ ئەم جەژنە دەهات یەهودییەکان لە نزیک منارە کەپرێکی لە لق و پەلکە داری رووەکی پەلکی بچووک وەکو روەکی مورتک دروست دەکرد بۆنی خۆشیان لێدەدا بۆیە ئەم کەپرە بۆنیکی خۆشی لێ دەهات. هەروەها هەڵدەستان بە هەڵواسینی چەند جۆرە مێوە بە لقەکانیانەوە جیرانەکانیان و برادەرانیان لە موسڵمانانی شار پیرۆزباییان لێ دەکردن و سەردانیان دەکردن. رۆژی پشوودانی یەهودییەکانیش رۆژی شەممە بوو رۆژانی شەممە لە لایان جەژنێکی زۆر پیرۆز بوو. لەم رۆژەش خێزانە یەهودییەکان ئاگریان هەڵدەکرد بۆیە داوایان لە منداڵەکانی موسڵمان دەکرد رۆژانی شەممە ئاگریان بۆ دابگیرسێنن چرایەکانیان بۆ پێ بکەن هەروەها سەر برینی ئاژەڵ و خوێن رژان لە رۆژانی شەممە قەدەغە بووە. هیچ جۆرە نووسینیشیان نەدەنووسی. هەر لە وەرزەکانی بەهار هەموو ساڵ یەهودییەکان رۆژانی شەممە دەچوونە دەوراوپشتی منارەی چۆلی خواردنیان لەگەڵ خۆیان دەبرد.

### ئاهەنگی یەهودەکان:

گەنج و پیری یەهودییەکان شێوەی تەراش کردنیان جودا بوو لەگەڵ موسڵمانەکان چونکە ئەوان زولفیان هەبووە خۆشەویستترین ناو لە لای یەهودییەکان ناوی (موشێ، داوود، یوسف، بنیامین، یەهودا، یەعقوب، ئیبراهیم، شەمعون، هارون، فیحناص، نەسیم و دانیال و هی تر) بووە بەڵام ناوی ئافرەتان بە زۆری ناوەکانی (هاجر، ئاسیا، رفقە، راحیل ونجیە) و هی تر بووە. هەروەها گۆڕستانی تایبەتی خۆیان هەبووە لە خوار گۆڕستانی چراغ پاش کۆچ کردنیان ئەم گۆڕستانە تێک درا ئیدارەی مەحەللی هەڵسا لەو شوێنە چەند خانووبەرێکی نوێی دروست کرد. بەڵام ئاهەنگی ژن هێنان و بووک گواستنەوەیان بە ئاهەنگەکانی هەولێرییەکان دەچوو. وە لەم ئاهەنگانەدا جیران و برادەرانی موسڵمانیان دەعوەت دەکرد هەروەها لە حەوشیماڵەکانیان ئاهەنگی گۆرانییان ئەنجام دەدا لەو ئاهەنگانەش گۆرانی تورکمانی و کوردی عەرەبیان دەوت حاجی ئیبراهیم کوورەچی کە ماڵیان ئێستاش لە گەڕەکی تەعجیلە دەڵێ من تەمەنم ١٥ ساڵ بوو جیرانێکی یەهودییمان هەبوو بۆ کوڕەکەی ژنی دەهێنا ئێمەی دەعوەت کرد لە حەوشی ماڵیان چەند گۆرانی بێژێکی هەولێریان بانگ کرد بو ئەم ئاهەنگە ئێستاش جوان لەبیرمە هەردوو گۆرانی بێژ مشکۆو و کۆرە گۆرانییان دەوت ژنە جولەکەکانیش جلی رەنگاو رەنگیان لە بەردابوو هەلهەلەیان لێدەدا وکۆردش ئەم گۆرانیەی دەگووت:

**لێ لێ وەسو وەرە لێلێ**
**وەسی دایێم وەی وەی**
**حاویشمیزدە بیر توت وار**
**توت ئوستوندە بلوت وار**
**بلۆتلار گەلیب گێدەر**
**کاکامە سەلام ئێدەر**
**لێلێ وەسو وەی وای**

ئافرەتانی جوولەکە بەدەنگێکی زۆر بە سۆز ئەم گۆرانییەیان دەگووتەوە.

دەڵێن یەهودییەکان زۆر شەیدای



مۆسیقاو قوریات وتن و مەقاماتی عێراقی بوون لەو کەسانەی کە گۆرانی بێژ بوون نەسیم بازرگان و حسقیل خمچی دەنگیان خۆش بووە قۆریاتیان لە بەر بووە هەروەها شارەزایشیان هەبووە لە ئەدای مەقاماتی عێراقی.

**کۆچ کردنی یەهودییەکان بۆ فەلەستین:**

بەرێز حاجی سەعید کوڕی حاجی عبداللای کورەچی دەگێڕێتەوە دەڵێ یەهودییەکان کە کۆچیان کرد بۆ فەلەستینی عەرەبی ساڵی ١٩٤٨بوو لە قۆناغی یەکەمی ئەم کۆچ کردنە گەنجەکان کۆچیان کرد بەلام لە قۆناغی دووەمدا ئافرەت و پەککەوتەکان کۆچیان کرد، حاجی سەعید دەگێڕێتەوە دەڵێ:

یەهودییەکان چەند مانگێک خۆیان ئامادە کردبوو بۆ ئەم کۆچ کردنە هەروەها زۆریەیان خانووبەرەی خۆیان بە پارەیەکی زور کەم فرۆشت لەگەڵ ئەم پارەیە هەڵسان بەکرینی زێرو لیرەی زێڕ هەتا بە ئاسانی لەگەڵ خۆیان بیبەن لەو کاتەی کە ئامادەبوون هەولێر جێبهێڵن. کە سواری شەمەندەفەر بوون پیرو منداڵ ئافرەت و گەنج هەموویان بەیەکەوە دەگریان یەکێ لە پیاوە پیرەکانیان رووی کردە ئەو هەولێرییانەی کە بەرێیان دەکردن ئەم قۆریاتەی گوت:

**قالاسیز**
**اربیل آولماز قالاسیز**
**اودی بیز قویدوغ گیتتیغ**
**سیز صاغلیغتەن قالاسیز**



مامۆستای خوالێخۆشبوو ئەنوەر سلێمان صالح کە پسپۆری زیندەوەرزانی بوو لە ساڵی ١٩٩٥ ماڵئاوایی کرد جارێکیان باسی بۆ کردم دەیگوت لە ساڵانی شەستەکان ئێمە چەند مامۆستایەک بووین سەفەری لوبنانمان کرد. رۆژێکیان لە یەکێ لەجادەکانی بیروت دەڕۆیشتین یەکێ لە یەهودییەکان هاتە بەرانبەرمان کە ئێمەی ناسی باوەشی کردەوەو زۆر پەرۆشی ئێمە بوو تەندروستی ئێمەی پرسی گوتی بەخوا بەجێتان ناهێڵم هەتا سەفەرێکی قودس نەکەین باوکە پیرەکەم هەر کات ئاە و ناڵینێتی بۆ شاری هەولێرو قەڵاو منارەکەی ئێمەش داواکاری ئەومان قەبول کرد سەردانی قودسمان کرد هەر لەگەڵ ئەم برادەرە یەهودییە هەولێرییە سەردانی ماڵی ئەوانمان کرد باوک و دایک و خزم و کەسی کە ئێمەیان بینی گریان بابەکەی کە تەمەنی لە حەفتاو پێنج ساڵ زیاتر بوو. ئەمەی دیت ئاە و نالەی دەهات دەیگۆت:

**قالاسیز**
**اربیل اۆلمز قالاسیز**

تاکو بەیانی میوانییان بووین بابەکەیان داوای لە ئێمە کرد کەوا چەند رۆژێکی تر میوانیان بین پاش ئەوەی کە نانمان خوارد بابەکەی هەڵسا بەپرسینی حاڵو ئەحوالی پیاوە ماقوولەکانی هەولێر وەکو شێخ و مەلاکانی هەولێر هەروەها گوتی.. پێش هەموو شتێک پێم بلێن شێخ محی الدین شێخ صالح سحەتی چۆنە ئەدی حاجی حەمدی علی خان داخوا تەندروستی باشە ئەدی مەلا ئەفەندی و ئەصنافەکانی بازاڕ. کورە خوشەویستەکانم توخوا کە گەیشتنە هەولێر سەلامێکی گەرم و گوڕم هەیە بۆ شێخ محی الدینی توخوا سەلام لە قەڵا شکوداردکەی هەولێر بکەن واتێدەگەم لەمەودوا من هیچ هەوا خۆشەکەی هەولێر ودرناگرم بۆچی

نەختێک ماستی هەولێرتان بۆ من نەهێنا بۆچی پەنیری ژاژیتان بۆمن نەهێنا ئێستاش بمێنین با زیاتر خزمەتتان بکەین چونکە بۆنی رەیحان و گوڵ و گوڵزاری هەولێرتان لێ دێت.

گوتمان: مامە گیان ببوورە لە رۆژێک زیاتر ناتوانین لێرە بمێنین چونکە ئێمە خولێکی تایبەتیمان هەیە لە بەیروت بەخوات دەسپێرین سوپاسی هەستی بەرێزی جەنابت دەکەین. خوا حافیز....... خوالێخۆشبوو ئەنوەر سلێمان گوتی هەتا بزر بووین هەر فرمێسکی رژاند. خۆزگەم ئەهلی ئەم شارەش وەکو ئەم پیاوە پیرە وەفاداریان بۆ شارەکەیان. هەروەها بەرێز مامۆستا فوئاد وەلی کە لە مامۆستا کۆنەکانی هەولێر دەژمێردرێت پێش خانەنشینی مامۆستای قوتابخانەی شێخی چولی بوو دەڵێ لەو کاتەی کە یەهودییەکان کۆچیان کرد من لە قوتابخانەی ئەربیلی سانیە پۆلی سێیەم بووم. دوو مامۆستای یەهودییمان هەبوو ناوی یەکێکیان حسقێل ئەفەندی بوو. ئەوی دیکەش ناوی زکی باروخ بوو مامۆستا زەکی مامۆستایەکی هونەرمەندو مۆسیقی رەسام بوو لە قوتابخانەی ئەربیلی سانیە. دەڵێ رۆژێکیان مامۆستا زەکی خودا حافیزی کرد لەگەڵمان گوتی کوڕەکانم بەیانی ئێمە سەفەر دەکەینە فەلەستین داوای سەرکەوتنتان بۆ دەخوازم بەیانی دیسان مامۆستا هاتە قوتابخانە گوتی سەفەرەکەمان حەفتەیەک دواخرا مامۆستا حەفتەیەکی دیکە دەوامی کرد وەفاداری خۆی نواند بۆ ئەرکە پیرۆزەکەی خۆی..

## پیاوە ناودارەکانی یەهودییەکان لە هەولێر

سەرۆکی هەموو یەهودییەکان لە هەولێر کە دەمڕاستی یەهودییەکان بووە ناوی صالح یوسف نوری بوو ئەم پیاوە وەکو بڵێی موختاری گەڕەکی تەعجیلی یەهود بووە هەر شتێک روویدابا ئەم پیاوە پەیوەندی لە گەڵ دەسەڵاتدارانی ئەو کاتەی هەولێر هەبوو بۆ چارەسەرکردنی و رێزێکی تایبەتیشی هەبووە لای موسڵمانان. پیاوێکی زۆر موخلیس بوو، یەهودییەک هەبوو دوو دوکانی گەورەی هەبووە لە بەرانبەر کۆتری سەلام ئێستا ئەم دوکانە دەرمانخانەیە ناوی حسقیل ردێن سوور بوو ئەم پیاوە ردێنی خۆی بە خەنە سوور دەکرد بۆیە هەولێرییەکان پێیان دەگوت (صقالی خنالی) حسقێل چوار کوڕی هەبووە گەورەکەی ناوی شمعون، ئەبرەهام بووە. کەسێکی تر هەبووە ناوی بەشیر بوو ئەم پیاوە کاتبی کەسایەتی ناوداری هەولێر احمد چەلەبی بوو لەناوەکانی دیکەی یەهودییەکانیش دانیال عزرا قەساب مام فەرەج داوود قەساب واصلان قصاب ئەم پیاوە شێتۆکە بوو لە پێش خۆی قسەی دەکرد غەریبۆکە بوو.لە مامۆستاکانیانیش مامۆستا زەکی باروخ مامۆستا سەلمان ئیسحاق موراد ئەفەندی سیمون ئەفەندی مەتی ئەفەندی بەناوبانگترین پارێزەریان ناجی شائول و شەمعون فرەنسیس بوو. لە بازرگانەکانیانیش نەسیم بەغدایی موراد سیتو ئیلیاهو بەغدایی هەروەها ساسۆن ردێن پان و مۆشێ گوج و عزرە رەحیم و ناتانە کەچەل هارون تەنەکەچی ئیسحاق خەیات و ناحۆم بیغلی.

پەراوێزەکان:

١) لە مانگی تشرینی یەکەم بەرێز ئەسعەد کوورەچی ئەم زانیارییەی پێدام.

٢) مەزارگەی نەبی عوزێر لە مەزارگە کۆنەکانی شاری هەولێر دەژمێردرێت لە نزیک مزگەوتی شێخی چۆلی لە گەڕەکی عەرەبی کۆنە مەقامی حەزرەتی نەبی عوزێر هەولێرییەکان لە کۆنەوە سەردانی دەکەن.

٣) حاجی ئیبراهیم سەرخۆش دەڵێ لە کۆنەوە کفتەی یەهودییەکان زۆر ناودار بووە. هەولێرییەکان یەکێکیان ئەگەر تووشی نەخۆشی تیفۆ بهاتبایە دەچوون لە دەرگەی ماڵێکی یەهودییان دەدا داوای شیوی کفتەیان دەکرد نەخۆشەکە هەر کە ئەم شیوەی دەخوارد شفای دەهات.

سەرچاوەکان:

١) الدكتور هاشم خضر الجنابي/ مدينة اربيل دراسة في جغرافية الحضر.

٢) عادات وتقاليد اليهود/هارفي لوتسك ترجمة مصطفى محمود.

* رۆژنامەی سەرای ژمارە ٧ی ٢٠٠٩/٨/٣١.